# حەمەدۆك

(بەرگی سێیەم)

نووسینی

**یەشار کەمال**

وەرگێڕانی

**عەبدوڵلا حەسەن زادە**

هەولێر - ٢٠١٢

## وتەیەك

زیاتر لە دوو ساڵ بەسەر وەرگێڕانی بەرگی دووهەمی "حەمەدۆك"دا تێدەپەڕێ, هێشتا وەرگێڕاوە کوردیی‌یەکە لە قوژبنێکی کتێببخانەکەم دا خەوتوەو بۆی رێ نەکەوتوە چاپ بکرێ. بەو حاڵەش ئێستا کە ئەو دێڕانە دەنووسم پتر لە دوو مانگە لە وەرگێڕانی بەرگی سێهەمیش بوومەوە. تا ئێستا بەرگی چوارەمی ئەو رۆمانە شیرنەم دەست نەکەوتوە. بەڵام بەنیازم هەر رۆژێك دەستم کەوێ ـ دیارە بە زمانی فارسی ـ دەست بکەم بە وەرگێڕانی و ئەویش بخەمە پاڵ بەرگەکانی دیکەی.

لەمێژە گوتوویانە کتێب چاپ کردن عومری نوح و سەبری ئەییوب و گەنجی قاڕوونی دەوێ. دەزانم عومری نووحم نابێ و باسی گەنجی قاڕوون و ماڵی دنیاش هەر ناکەم. بەڵام لەبارەی زۆر شت و یەك لەوان چاپی کتێبەوە دەتوانم بڵێم لە رێبوارانی رێگای ئەییوبم, بەو مانایە کە ناهومێد نیم و هەر بە تەمام رۆژێك بەرهەمی رەنجی خۆم لەسەر لاپەڕەی کاغەزو لەبەر دەستی خوێنەری کوردو لەنێو کتێبخانەی کوردی دا ببینم. خۆ ئەگەر پێش وەدی هاتنی ئەو ئارەزووەش ئەجەل بەربینگی پێ‌گرتم, دیسان بە دووری نازانم پاش خۆم خێرخوایەك دەستی یارمەتی بۆ چاپی پاشماوەی ئەو شاکارەی یەشار کەمالی مەزن بە زمانی کوردی درێژ بکا.

شتێك کە دەبوو لە "پێش بار"ەکەی بەرگی یەکەمی حەمەدۆك دا بی‌نووسم و بەهەر هۆیەك بووە کەوتوەتە ئێستا, ئەوەیە کە لەم رۆمانەو لە زۆربەی بەرهەمەکانی یەشار کەماڵ دا زۆرجار چاومان بە جنێودان دەکەوێ و هێندێ کەس ئەمەیان لە شانان گرانەو تەنانەت ئی وا هەیە پێشنیار دەکا لایبرێن. بەڵام بەباوەڕی من هەرکەس بەرهەمەکانی ئەو نووسەرە پایەبەرزە بکاتە کوردی, هەقی نیە جنێوەکانی دەرباوێ یان بیان کاتە هێندێ وشەو زاراوەو تەعبیری "بێ‌ئازارتر" کە ئەگەر نووسەر

بێویستایە زۆر باشتر لە مەمانان دەیتوانی بەکاریان بێنێ. وەرگێڕان  نووسین نیە کە بە ئارەزووی خۆت بتوانی شتێك بنووسی و شتێك ببوێری. یەکێك لە مەرجە سەرەکیەکانی وەرگێڕان ئەوەیە کە سەبکی نووسەر بەو جۆرە کە هەیە, بە وەرگێڕاوەکەوە دیار بێ.

پاشان بە باوەڕی من بوونی ئەو جنێوو قسە کاڵانە بە هیچ جۆر بە نوختەیەکی لاوازی نووسینەکانی یەشار کەماڵ دانانرێ. ئەو نووسەرە ناودارە جیهانیە بۆخۆی جنێوفرۆش نیە. بەڵام وەختێك لە زمانی قارەمانەکانیەوە قسە دەکا, دەیەوێ تابلۆیەکی واقیعی لە راستیەکانی ئەو کۆمەڵە کە رۆمانەکەی لەسەر نووسراوە بخاتە بەرچاو. دەش زانین کە تا ئێستا لە تورکیاو وڵاتانی دیکەی ئەم ناوچەیەی جیهان دا جنێودان بەشێك لە فەرهەنگی کۆمەڵانی خەڵکە. بەهەرحاڵ, یان نووسینەکانی یەشار کەماڵ ناکەینە کوردی, یان ئەگەر کردمان ناتوانین یەشار کەماڵ فێری قسەکردن بکەین! ئەو زۆر زۆر لە مەمانان شارەزاترەو بۆخۆی باش دەزانێ چ دەنووسێ.

**سەرەتای پاییزی ساڵی ١٩٩٠**

**- وەرگێڕ-**

## (۱)

هێندێ ساڵان بەهاری چوکووراوا لە نەکاو دێ. خونچەکان, گوڵەکان, باڵندەکان, میشەنگوینەکان, جڕوجانەوەرو گیاکان لە نەکاو سەر دێننە دەرو هەتاوێکی نەرم دنیا پڕ دەکا لە ڕووناکایی. هەموو گیانداران, لە باڵندەو پێڕۆوە بگرە تا مارو مێروو و جڕوجانەوەر لە هێلانەکانیان دێنەدەر, بە سەرسوڕماوی و هەژاوی, نوقم لە سەرخۆشیی دۆزینەوەی دنیایەکی تازەو پڕ لە سەرسەوزی, بە ئارامی لە دەوروبەردا دەخولێنەوە. پەڵە هەوری سپی, لەسەر دەریای مێدیترانە (دەریای سپیی نێوەڕاست) هەڵدەستن و لە کاتێك دا سێبەری ڕوونی خۆیان بەسەر زەوی دا بەرداوەتەوە, بەرەو چیاکانی "تووڕووس" دەچن. لەنەکاو بارانێکی وەك لافاو کە سەرچاوەکەی دیار نیە, دەبارێ و دەوروبەر لافاو دایدەگرێ. ئاوەکان هەڵدەستن و لەکاتێك دا لیتەیەکی زەردو نەرم بەجێ دێڵن بە خێرایییەکی شێتانە بەرەو خوار دەچن و ئاوی ڕەنگ ئاسمانی ڕەنگێکی سوور بە خۆیەوە دەگرێ. سوێسنەی کێوی زەردو بریقەدار لەنێو گابەردە نووك تیژو شینەکان دا دەپشکوون و کێوەکان دەبنە باغێکی گەورەو شەپۆلداری سوێسنەی زەرد. لەم لاو لەولا, لەسووچێکی چۆڵ و دوورکەوتوو بێپسانەوە دەنگی کەودەری دێتە بەرگوێ.

بە تەقینەوەی لەنەکاوی بەهار خەڵکی دەشتێ چاوەڕوانی هاتنی ئاسکە خەنەیی و سرکەکان دەبن. پێشتر, ئەودەم کە بە هار لە دەشتی خوارەوەڕا دەهات, هەزاران ئاسکی خەنەیی شۆڕ دەبوونەوە بۆ دەشتێ و لە کاتێك دا وەك مەشخەڵی سوور لەنجەو لاریان دەکرد, مێگەل مێگەل لە "ئاناوارزا"وە بەرەو خوارەوەی "کووزان"و لەوێوە بەرەو دەشتی "تارسووس"و خاکی "یوورەگیر"و لەوێوە بەرەو "پاپاس"و بەرەوەی "عوسمانیە"و لەوێوە بەرەو "دوومەلی" وەڕێ دەکەوتن و لەو کاتەدا دانیشتووانی چوکووراوا بە ڕاونانی ئاسکان ئەسپەکانی خۆیان تاقی دەکردەوە. ڕەسەن ترین ئەسپ, ئەو ئەسپە بوو کە سوارەکەی چالاك ترین

ئاسکی دەگرت. ئەسپە بۆرەکانی چوکووراوا لە سەردەمی ئاشووریەکانەوە تا ئێستا رەسەنایەتیی خۆیان پاراستوەو ناوبانگی خۆیان لە دەست نەداوە.

لەگەڵ بەهارێك کە وا لەنەکاو دەهاتە چوکووراوا، رەنگێکی شینی لە شۆق و بریسکاوە دەکەوتە سەر دەریای مێدیتێرانە. ئەم بریسکانەوە شینە کە لەگەڵ بەهار دەکەوتە سەر دەریا، تیشکی دەخستە سەر دەشت و سەر هەورە سپیەکان و بە ئارامی بەسەر خاکی بەرێژەوو بەگوڵو گیاداپۆشراودا تێدەپەڕی و لەگەڵ کێوەکانی تووڕووس کە وەك مانگی یەك شەوە دەوری دەشتەکەیان داوە، تێکەڵ دەبوو و ئەو کێوانە کە سێبەرێکی شین کەوتوەتە قووڵایی دۆڵەکانیان، لە نەکاو رەنگی ئاسمانیان دەگرت و لەگەڵ دارەکان و باڵندەکانیان، لەگەڵ گابەردەکان و لێرەوارەکانیان بەو رەنگەوە دەدرەوشانەوە، دەکەوتنە ترووسکەدان و دەستیان دەکرد بە جموجۆڵو هەڵقوڵین. هەتاوی نەرم و شنەبایەك کە لە قەراخی دەریاوە هەڵدەستا، لە باغەکانی پرتەقاڵ و لیمۆو ترونجەوە کە گوڵەکانیان وەك پەڵە هەورێکی سپی دەچوون، بۆنی خۆشی گوڵە نارنجی لەگەڵ خۆی دێناو هەموو بوونەوەرەکانی ئەو دەشتەی لە سەرخۆشیی کەیفێکی شێتانەدا سەرمەست دەکرد.

ئەو ساڵانە کە لە چوکووراوا بەهار وا لەنەکاو دادەهات، هاوینیش لە نەکاو پەیدا دەبوو و زەردەگەرما وەك گوللە بەسەر سەری دانیشتوانیدا بەردەبووەوەو کەیف و خۆشیی بەهارێکی زووپێگەیشتووی لە دڵیان دا نیوەچڵ دەهێشتەوە. هەتاو وەك تەپۆلکەیەکی گەورەی ئاگر، پریشکی داویشتە دەوروبەرو خاك و گوڵ و رووەکەکانی دیکەی دەسووتاند. ئاوی دەکردە هەڵم و لەگەڵ خۆی دەبرد. ئاورۆی چۆمە چووکەکان قەڵشتی دەدان و زەوی وەك داوێکی گەورەی جاڵجاڵوکە دەچوو. خەڵك لە پەسنی ئەو گەرما بێوەختەدا زۆر گۆرانییان دادەنان کە بەشی زۆریان بەم سەرەتایە دەست پێ دەکران:

چوکووراوا دەسووتێ بەم بەهارە
هەموو مێشێکی، خۆی گورگێکی هارە

دەشت نشینەکان کە لەگەڵ هەموو شکۆو سەرمەستیی بەهاردا دەژیان، لە ژێر ئەو زەردەگەرمایەدا کە وەك شمشێرێکی تیژ لە نەکاو دەهاتە خوار" سەریان لێ دەشێواو نەیان دەزانی چ بکەن. ئەوان لە تاریکایی تیشکێك دا کە چاویانی دەبرژاندەوە دادەهێزان، بێ ئەوەی بەخۆیان بزانن هەروا کە خوویان پێوە گرتبوو بەرێ دا دەڕۆیشتن و کاریان دەکرد هەتا سەرەنجام بە تاریکایی ئەو تیشکە رادەهاتن. ئەمجار با لە جیاتی بۆنی گوڵ، تۆزوخۆڵی لەگەڵ خۆی دێناو گوندەکان، شارۆچکەکان، ماڵەکان، گیاکان، دارەکان و ئینسانەکانی لە ژێر توێژێکی ئاسکی خۆڵی سپی دا ون

دەکرد. بە بەرزبوونەوەی تۆزوخۆڵ پەلاماری مێش و مەگەز و بڵاوبوونەوەی مالاریا دەستی پێدەکرد. لە شارۆچکەکان, گوندەکان, کێڵگەکان, جادەکان و بێستانەکان دا نۆبەتێداران لەگەڵ تاولەرز دەستەویەخە دەبوون و مردن بەنێو منداڵان وەردەبوو و گۆڕستانی گوندەکان پڕ دەبوو لە تەپۆلکەی چووکە چووکەی خاکی تازەو رەش. مێشوولە وەك هەورێکی پڕ لە گۆلاوو قامیشەڵان و مەرەزەجارەکان هەڵدەستان و پەلاماریان دەبردە سەر ئینسان و حەیوان و خوێنیان دەمژین.

لە رۆژگارێکی کۆنەوە خەڵکی چوکووراوا لەگەڵ داهاتنی هاوین و تەنانەت زووتریش واتە لەگەڵکوو بەهار دادەهات, باروبنەی خۆیان تێکەوە دەپێچاو کۆچیان دەکرد بۆ چیا سەرسەوزەکان. ئەوان لە قەراخ ئاوە ئاسمانی ڕەنگەکان چادریان هەڵدەداو ساباتیان ساز دەکرد. بەڵام ئەمڕۆ کوێستان بۆ وان, تەنیا بەهەشتێکی ون بوو و ئەزرەتێکی تاڵە. ئێستا ئیدی ئەو کانیاوە فێنکانە کە پنگیان لێدەڕوێ, گوڵە هەمیشە سەوزەکانی کوێستان, شوورە خاڵدارەکان و ئەو مێشوولانە کە لەسەر سەردەرانەی ماڵەکان دەنیشن, ئەو ئەسپە عەرەبی‌یە راکشاو و چاو گەورانە کە یاڵیان دەڵێی کەزیەی کچانەو ئەو تاژی‌یانە کە لاقی درێژو راکشاویان هەیە, بۆ وان خەون و خەیاڵێکی دوورەدەستن. ئێستا, ئەو چادرانە کە لە موو دروست دەکران ـ یادگاری باب و باپیرانیان ـ لە قوژبنی ئەو ماڵانەدا کە بە قامیش و پووش و پەڵاش پێکەوە نراون و لە سووچی تەویلەو کادێنان دا خەریکن دەڕزن. ئێستا ئەوان, بە چاوی رق و ئەزرەتەوە کە لەگەڵ خۆشحاڵی‌یەکی کەم تێکەڵە, دەڕواننە ئەو کوێرە ڕێ‌یانە کە بەرەو چیا دەڕۆن و لەنێو دەردو ئازاری کار لە کێڵگە پڕ لە نووسەکەو مالاریاکان داو لەبەر گەرمای چوکووراوا کە ئاوەکەی وەك خوێن شیلەو گەرمە, بەو هیوایە کە رۆژێك رۆژگاری رابردوو دەگەڕێتەوە, دڵخۆشیی خۆیان دەدەنەوە. هەر بەو ئەندازەیە کە دانیشتووانی چوکووراوا خەفەتی کێوە سەرسەوزەکان و تامەزرۆیی ئەو بەهەشتە ون بووەیان لە دڵ دایە, چیانشینەکانیش ئەوەندە ـ و ڕەنگە زیاتریش ـ خەفەتی خاکی خوارەوە ـ خاکی چوکووراوا, ئەو خاکە بەپێزە کە هەر دەنکێکی لێبچێنڕێ سەد دەنك بەرهەم دەدا ـ یان لەسەر دڵ ماوەتەوەو بە دوای رێگایەك دا دەگەڕێن کە لەو شاخ و داخ و بەردەڵان و لێرەوارەو لەو هەژاری و نەداری‌یە باوەڕ پێنەکراوە رزگاریان بێ و لەوێ, لە لێوارەکانی مێدیترانە دەستیان بە کێڵگە گەرم و پڕ بەرەکەتەکان رابگا.

پاش دەشتە بەرێژەوو لمی‌یەکان, بنارە بەردەڵان و شۆرەکات و ئەزۆکەکانی توورووس دەست پێ دەکەن, ئەم بنارانە بێبەرەکەت ترین و بەیارترین زەوی‌یەکانی دەشتێن. دێنشینەکانی دانیشتووی ئەم بەردەڵانە شۆرەکاتە لە لایەك لەگەڵ گەرماو مێش و مەگەزو دەردو بەڵای چوکووراوا

دەستەویەخەن و لە لایەکی دیکەش زەوییەکانیان تەنانەت گیاشیان لیٚ نارویٚ. دەشتەکانی ئاناوارزا, یوورەگیر, تارسووس, زەوییە راوندەکانی عوسمانیەو زەوییەکانی خواروی کووزان, لەو مەڵبەندانەن کە جووتیاران بە ئاواتەوەن دەستیان ویٚ رابگا. لە کۆنەوە تا ئیٚستا دیٚهاتییەکانی بناری توورووس لەسەر ئەوەی باب و باپیرانیان دیٚیان لەم ناوچەیە دروست کردوون تووك و نەفرینیان بۆ ناردوون و بیریان کردوەتەوە: لە کاتیٚك دا خاکی بەرپیٚژەوو بوورەی چوکووراوا بە کفەڵی و نەکیٚڵراوی چاوەروانی پیاوی بەکارو نیرو ئاموور بووە, باپیرەکانیان بۆچی و چۆن لەم بەردەڵانەدا نیشتەجیٚ بوون؟ لەم ساڵانەی دوایی دا, دوای دابەش کرانی خاکی بەرپیٚژەوی چوکووراوا, لە بنارەکانیش وردە وردە جموجۆڵ دەست پیٚ کرابوو.

کە لە بنارەکان تیٚدەپەری, لە نەکاو لە لیٚرەوارەیٚکی چرو پر, کانیاوی پر لە پنگ و پەڵە زەویی راوندی کەم بەرو بەگیا داپۆشراو دەست پیٚ دەکەن, کە لە قەراخ و قوولایی ئەو یەکەیان دوو خانووی چووکەڵەش بەرچاو دەکەون. ئەو پارچە زەوییە بچووکانە کە لەنیٚو گابەردە نووك تیژەکان دا گیریان کردوە, ناتوانن زگی تەنیا سیٚ بنەماڵەش تیٚر بکەن. لە دیٚهاتی کیٚوپارەی دەوروبەری میٚدیٚرانەدا لە ماراشەوە بگرە تا ئەنتاکیە, خانووەکان یەکجار لیٚك دوورن. بە جۆریٚك کە مەودای نیٚوان یەکەمین و دوامین خانوو بە سواریی ئەسپ پیٚنج تا شەش سەعاتە ریٚیە.

ئەو زەوییە کەمانەش بە تیٚپەرینی رۆژگارو لە ئاکامی داچاندنی زۆردا لە تاقەت کەوتوون و ناتوانن زگی دانیشتووانی دەوروبەریان تیٚر بکەن. لافاو, بەشی زۆری زەوییە گۆرەکانی بناری لەگەڵ خۆی بردوەو ئەو بنەماڵانەی لەو زەوییانەدا نیشتەجیٚن لەنیٚو رایەخیٚکی شاخ و بەرد دا بە بیٚ هیچ دەرەتانیٚکی ژیان و گوزەران بە خۆیان و چەند سەر بزنەوە ماونەوە.

هەرچی کیٚوەکان هەڵدەکشیٚن, چروپریی لیٚرەوارەکان کەمتر دەبیٚتەوەو ئەگەر هەورازتر بچی دەگەیە هیٚندیٚك بیشەڵان کە دارەکانیان نزمن. پاشان درووەڵان دەست پیٚدەکا بە برکە درووی کورت کورت و ریٚکی زەوییەوە. پاش ئەم خەلەنگ جارە زەوی هەتا دوندی چیا رووتەنەو گویٚنی بەرچاوترین رووەکی ئەم زەوییە رووتەنەیە. لەسەرانسەری هاوین دا لەنیٚو برکە گویٚنییەکان دا ـ ئەگەر سەوزو تازە بن و گوڵە رەق و زبرەکانیان وشك نەبووبن ـ سەدان و هەزاران خاڵخاڵۆکە کە هیٚلانە دروست دەکەن, بە جۆریٚك کە لە هیٚندیٚك سەعاتی رۆژدا, کۆرەوی برکە گویٚنییەکان لە دوورەوە وەك گری ئاگر سوور دەچیٚ.

ئەو ساڵانە کە بەهاری چوکووراوا لە نەکاو دەست پیٚ دەکا, باران و لافاو و تۆفانی لە نەکاو و بیٚوەختیش دەبنە میوانی چیاکان و لافاوەکان کە رووبارەکانیان سەرریٚژ کردوەو شیوو دۆڵە وشکەکانیان پر کردوە, بە خیٚراییەکی سەرسورهیٚنەر خاکی پارچە زەوییە بچووکەکانی

سەر کێوەکان و قوولایی دۆڵەکان دەشۆنەوەو لەگەڵ خۆیان دەیبەنە دەشت و نێو دەریای مێدیترانە. بە دوای ئەم بەهارە پێش وەختەدا, چیانشینەکان, نوقم لە سەرخۆشیی جوانیی ئەو گوڵانەدا کە لە نەکاو بە هەزاران رەنگ هەڵ دەچن و سەرمەست لە بۆنی ئەوانەو درەوشانەوەی ئەستێرە جوان و تەمیزەکان لە چیاکان دا دەکەونە شەپۆل دان, سەریان لێ‌دەشێوێ و نازانن چ بکەن. لەگەڵ ئەوەی لە بلێسەی ئەو گەرمایەی داباریوەتە سەر چوکووراوا, مێشوولە کوشندەکانی هەڵگری مالاریاو ئاوە ژاراوییە وەك خوێن شیلەو گەرمەکەی ئاگادارن, دیسان چوکووراوایان وەك خەونێکی دوورو بەهەشتێکی ون بوو و دەست وێ رانەگەیشتوو لەبیرەو لەگەڵی دەژین. بەو حاڵەش هەموو چیانشینەکان لە چوکووراوا دەترسێن, هەروەك لەم سالانەی دوایی دا دەشت نشینەکانیش لە کێوپارە دەترسن.

## (٢)

گوێنی لە بنارە بڵندەکان و لووتکە بێ ئاوو گیاو بێدارو بارەکان دەڕوێ, یەکێك لەگیاکانی چۆڵگە بەربڵاوەکانی ئاناتوولیشە. برکە گوێنی کۆڕەوێکی خڕە بە بەرزایی سێ تا حەوت بست. ئەم کۆڕەوانە لە بنارەکان و دوندی چیا بەرزەکان کە دارو دڕکیان لێنیەو لە چۆڵگە نزمەکان و زەوییە بەرزو هەموارەکان بە چڕو پڕی و پۆل بە پۆل دەڕوێن. جاری وایە دەبینی پێنج, دە, پەنجاو تەنانەت سەد چڵ لەیەك جێگا سەوز بوون و جاری واشە خاکی بەتاڵ لەدارو دڕك بێبڕانەوەو بێسنوور بە گوێنی داپۆشراوە. چڵە گوێنییەکان هێندێ جار پڕو بە تەنیشت یەکەوەن و هێندێ جاریش تەنك و کەم پشت و دوور لە یەکتر دەڕوێن. نێوانی چڵە گوێنییەکان لە هێندێ جێ هەنگاوێکەو لە جێی واشە دەگاتە دە شەقاو. هەر چڵە گوێنییەك هەزاران گەڵای وەك دەرزیی هەیە کە لە هەر لاسکێکی دا لانی کەم سی تا چل گەڵای بەشێوەی ئەستێرە, ڕێك و پێك بە دوای یەکتر دا ریز بوون. سەدان لاسك کە لە ڕەگەی سەرەکیی گیایەکە رواون و لەسەر زەوی تێکەوە تەنراون چڵێکی خڕو گەورە دروست دەکەن. گوڵە گوێنییەکان بە لاسکە بڵندەکانیانەوە, لەسەر ئەو گەڵا دڕووییانە دەپشکوون.

لە سەرەتای بەهار دا, ڕەنگی سەوزی نەرمی ئەو گوێنییانە کە لە بەرقەدی چیا بەرزەکان و چۆڵگەکان دا رواون هەموو جێیەك دادەپۆشێ. لەو کاتەدا دەڵێی هەورێکی سەوزو ڕەنگ پەڕیوی وەك دووکەڵ کەوتوەتە سەر بەرقەدی کێوە بەرزەکان و سەرانسەری چۆڵگەکە. نووکی گەڵا گوێنییەکان کە لەمەوپێش تورت و ناسك بووە, لەگەڵ ڕەش بوونی ڕەنگی گەڵایەکە دەست دەکا بە ڕەق بوون و زبر بوون و بەم جۆرە, دڕووەکە باشتر پێ دەگاو تیژتر دەبێ. وەختێك گیایەکە ڕەنگێکی سەوزی تاریکی بە خۆیەوە گرت, دڕووەکانی پڕ دەبن لە گوڵ و

ئەمجار رووبەری تەپۆڵکە بەرزو رووتەنەکان و رووبەری بەرقەدەکان هەورێکی رەنگ سووراوی دایان دەپۆشێ کە لە نێو ئەو هەورەدا هێندێ پریشك بە رەنگی شینی پۆڵاوە دەدرەوشێنەوە. لەسەر لاسکی ئەو گوڵانە کە لەنێو گەڵا ئەستێرەیی‌یەکانی درووەکە دەروێن و پێنج تا بیست و پێنج سانتی میتر بەرزن، دەوروبەری دە هەتا سی گوڵ دەپشکوون. گوڵی بەختی سووراویی پڕ رەنگی مەیلەوشین و زۆر چووکەڵە، بە رادەیەك کە تەنیا مێروولەیەك یان زەرگەتەیەك دەتوانێ خۆی تێدا بشارێتەوە. گوڵە سووراوی‌یەکان، پڕو پاڵ وێك داون و بە پریشکە ئاسمانی رەنگەکانی خۆیانەوە تا ماوەیەکی زۆر لە پانایی چۆڵگە پان و بەرینەکان و بەرقەدی چیا بەرزەکان و تەپۆڵکە بڵندەکان دا دەبریسکێنەوەو دەدرەوشێن.

بن تەپۆلکەکان و نێو ئەو کۆڕەوە چڕو پڕە گوێنی‌یانە، پەناگەو حەشارگەی جرِوجانەوەر، باڵندە چووکەکان و گیاندارانی دیکەیە.

✧ ✧ ✧

سوارێك کە بە لینگدان "ئاسیاب چەشمە"ی بەجێ هێشتبوو، لە دەشتێکی پان و بەرین تێپەڕی و بەرەو چیاکەی رووبەڕووی کە لە دوورەوە شین دەچوو، لێی خوڕی. بولێڵ داهاتبوو کە گەیشتە لێرەوار. پێش ئەوەی بچێتە نێو نزار، تاوێك لەغاوی ئەسپەکەی کێشاو لەجێی خۆی راوەستا. دارستانی مەیلەو تاریك خشەخشی لێ‌دەهات و لە قوولایی دا دەی‌نەڕاند. لە دوورەوە دەنگی باڵندەیەك دەهاتە بەرگوێ. سوارەکە لەوەپێش شارەزای لێرەوار بوو. دوودڵ دیار بوو. وێ دەچوو ئەو جەندرمانەی بە دوای دا دەگەڕان، لەنێو دارستان دا بۆسەیان بۆ نابێتەوە. لەوانەبوو ئەگەر لە دارستانەکە تێپەڕێ کارەکان کەمێك وەڕێ کەون. ئەگەر نەدەچووە نێو نزارو بەلای چەپ دا بای دەدایەوەو بەرەو خوار دەچوو، دیسان جێی مەترسی بوو. چونکە لەولایە، نە شارەزای دێیەك بوو و نە ئاشنایەکی شك دەبرد. ئەو هەرگیز ئەسپی خۆی بەرەو ڕێبازێکی نەناسراو لێ‌نەدەخوڕی. ئەگەر لە دارستان تێپەڕیباو گەیشتبایە ناوچە کوێستانەکە، دەی‌توانی خۆی بگەیەنێتە چادری عەشیرەتەکان و رەنگە چادری کەریم ئۆغلیش. گەیشتن بە چادرنشینەکان بە مانای رزگاربوونی بوو. عەلی‌یەشەلیش دەتوانێ لە نێو چادرنشینەکان دا بی‌بینێتەوە. لەحزەیەك بیری کردەوە کە بگەڕێتەوە گوندی سڵەمانەزلە. بەڵام هیچ گومانی تێدا نەبوو کە لەمێژە ئەو دێیە لەلایەن جەندرمەوە گەمارۆ دراوە. یاوەر فارووق و وەکیل باشی عاصم دەیان زانی ئەو دەچێتە لای چادرنشینان. بەڵام بەڵکوو ئەوان تا ئێستا نەچووینە نێو

دارستان. پێستی ئەسپەکەی کەفی کردبوو و سنگی وەك کوورەی ئاسنگەران هەڵدەستاو دەپووکایەوە. کونە لووتی حەیوانەکە لێك رەویبوونەوەو بە دەنگی بەرز هەناسەی دەدا. بێجگە لە جادەی "قۆرخ سوو" رێگایەکی دیکە بۆ تێپەڕبوونی بە وەخت لە لێڕەوار نەبوو. ئەسپەکە نەیدەتوانی بەنێو دارستانی چڕو پڕ دا, بە بەردەڵان و دڕووەڵانەکان دا بڕوا. ئەگەر ئەسپەکەی بەرەڵلا دەکردو بە پێیان خۆی بە نێو دارستان دا دەکرد, هەرچەند وەك بەری دەستی خۆی شارەزای بوو, دیسان بە زەحمەت دەیتوانی بە سێ رۆژان لێی تێپەڕ بێ. لە ئەسپەکەی دابەزی. هەوسارەکەی لە بنە دڕوویەك خست. دانیشت و پاڵی وە چنارێك دا. بەرە بەرە نەڕوهۆڕی لێڕەوار زیادی دەکرد. لە دوورەوە دەنگی ناڕوون و نووساوی باڵندەکە لەگەڵ دەنگی قرچەقرچ و هێندێ دەنگی دیکە, لێڕەواریان دەبڕی و دەهاتنە بەر گوێ. کابرا گوێی بە زەوییەوە ناو چەند لەحزەیەك لە هەڵلاو هەنگامەی دارستان ورد بووەوە. بێجگە لە دەنگی باڵندەکەو دەنگی قرچوهۆڕو نەڕەی لێڕەوار لە دوور دەنگی لێڵ و ناڕوونی زەنگوڵەیەکیشی گوێ لێبوو. وای هاتە بەرچاو کە زەنگوڵەکە سێ جاری دەنگ لێهات و بێدەنگ بوو. کابرا هەروا کە گوێی بە زەوییەوە نابوو جارێکی دیکە چاوەڕێی بیستنی دەنگی زەنگوڵەکە بوو. بەڵام بێسوود بوو. نەیتوانی جارێکی دیکە گوێی لە دەنگەکە بێ. دەنگەکە لە رێیەکی ئەوەندە دوورەوە دەهات کە نەیتوانی بزانێ دەنگی زەنگوڵەی وشتر, ئێستر یان گاجووت, یان بزن و نێرییە... ئەگەر دەنگەکە نەختێك نیزیکتر بووایە رەنگ بوو بە ئاسانی بزانێ. دەنگی زەنگەکەش دەسبەجێ بێدەنگ ببوو. هەستاو روانیە لك و پۆپی گەورەو بەربڵاوی چنارەکەی ژوور سەری. گەڵای دارەکە چووکترین لەرینەوەیان نەبوو. لەسەر ئەستوورترین و بەرزترین لکی چنارەکەوە, قەتارێکی مێرووە سوورکە بە رێچکەیەك دا بەرەو قەدی دارەکە دەهاتنە خوارو لەوێوە دەهاتنە بن دارەکە کە پڕ بوو لە بەری سنۆبەر. لەسەر پشتی چووك و خڕو سووری مێرووەکان دوا رووناکایی خۆر دەدرەوشا. لە نەکاو کابرا کە جارێکی دیکەش پشتی وە قەدی دارەکە دابوو, خەو بردیەوە. لە بەرامبەریەوە ئەسپەکە, ماندوو و خەواڵوو سەری بەردابووەوەو دەستی راستی بەبەر زگیەوە نووساندبوو. موی لەشی ببوونە نەشتەرو رەنگی, خەنەیییەکی مەیلەو رەش بوو. یاڵە درێژەکانی دەگەیشتنە سەر زەوی. کابرا بەردەوام روخساری زەردو زەعفەرانیی هەمزە کەچەڵی دەهاتەوە بەرچاو کە شیوەنی مەرگی وەبیر پیاو دێنایەوەو بە زاری داپچڕاوو چاوی دەرتۆقیوەوە دەپاڕایەوەو لە تەیری ئاسمان و مێرووی زەوییەوە بگرە تا دۆست و دوژمن داوای کۆمەگی دەکرد. کابرا لە نێوان خەوو بێداری دا بیری دەکردەوە کە رەنگە بنیادەم بۆ پاراستنی گیانی حازر بێ خۆی سووك بکا. داخوا گیانی مرۆڤ ئەو هەموو سووکایەتییە دێنێ؟ داخوا بنیادەم دەبێ بە هەر قیمەتێك بێ درێژە بە ژیانی خۆی بدا؟ مالاریا, نەخۆشی, زوڵم و

زۆر, برسیەتی و هەژاری نەیان توانیوە خۆراگریی بەرەی ئادەمیزاد لە ڕێگای درێژەدانی ژیان دا تێك بشکێنن و مرۆڤ پاش ئەو هەمور زوڵم و زۆرو سووکایەتی و بەڵاو موسیبەت و کوشتارە هەروا درێژەی بە ژیانی خۆی داوە. ئەم هێزە سامناکەو ئەو خۆراگرییە لە بڕانەوەنەهاتووەو قبووڵ کردنی خەراپ ترین سووکایەتی لەبەرچی و بۆچییە؟ هەمزە کەچەڵ لەنێو دێی وەپێش ئەسپەکەی وی کەوتبوو و بە ترس و لەرزەوە بەردەوام رادەوەستاو بە چاوێك کە وەك چاوی سەگێکی خەریك پاڕانەوە دەچوو, بە جۆرێك لەوی دەڕوانی کە لە توانا بەدەر بوو. لەبەر کوشتنی وی, زۆر لەگەڵ خۆی بەکێشە هات و سەرەنجام بیری کردەوە کە درێژەدانی ژیان بۆ کەسێك کە ئەوەندە لە ئینسانەتی دوور کەوتوەتەوە حەرامە. عەلی سەفا بەگیش وەختێك ئەوی دیت و بیستی کە دەیگوت:"ناوم حەمەدۆکە, دەم ناسی ئاغا؟" نێوچاوانی گرژ بوو. پێڵووی چاوە لەکالانە دەرپەڕیوەکانی لێك دەدران. لەحزەیەك بە پاڕانەوەیەکی دوور لە باوەڕەوە چاوی لە لولەی تفەنگەکەیەوە بڕی. ڕەنگە لەو ڕوانینە پڕ لە پاڕانەوەیە بکرابا بزانرێ کە مرۆڤ چۆن دەتوانێ بەرەو ئەوپەڕی نزمی و سووکایەتی شۆڕ بێتەوە. داخوا گیانی بنیادەم ئەو هەموو نزمی و سووکایەتییە دێنێ؟ بۆ وێنە ئەگەر دایە حۆری کەوتبایە بەرامبەر مەرگێکی لەو بابەتەو لە سەداسەد دڵنیابا کە بە قبووڵ کردنی سووکایەتییەکی وا, گیانی خۆی نەجات دەدا, ئاوای دەکرد؟ یان عەلییەشەل؟ بە وەبیر هاتنەوەی عەلییەشەل تاوێك دوودڵ مایەوەو پاشان لەو جۆرە بیرکردنەوەیە دەرهەق بەو پەژیوان بووەوە. شەلە هیچ وەخت و لە هیچ هەل و مەرجێك دا خۆی خوێڕی و چووك نەدەکردەوە. بیری کردەوە: ئەگەر گیانی من بکەوێتە خەتەر, داخوا دیسانیش بۆ نەجاتی گیانی من لەبەر ئەو کەسە کە دەیەوێ من بکوژێ ناپاڕێتەوە؟ دوودڵ بوو, نەیتوانی بگاتە ئاکامێکی ڕوون. ئەگەر مەلافەرهاد لێرە بایە هەموو ئەو پرسیارانەی لەو دەکرد... بە وەبیر هاتنەوەی مەلا فەرهادی زیندانی ئاگر لە دڵی بەر بوو. داخوا ئێستا ئەو پیاوە لەسەرەخۆو نەرم وەك ئاوریشمە خەریکی چی بێ؟ داخوا سووکایەتیی پێناکەن؟ داخوا لەوێ یۆبازئۆغلی بەو جۆرەی شیاوەو پێویستە خزمەتی دەکا؟ داخوا سەیران بەرگ و پارەو خواردنیان بۆ دەبا؟ مەلا هەر کە گیرا جگەرەی فڕێ دا, لە کاتێك دا زۆری حەز لە جگەرە دەکرد. وەختێك جگەرەیەکی دادەگیرساندو دووکەڵەی هەڵدەمژی, چاوی لەسەر یەك دادەنان و دەچووە گەشەو نەشەیەکی بێئەندازەوە... بەڕاست بۆچی وازی لە جگەرە هێنا؟ ئێستا مەلا لە بەندیخانە بەو ئاهەنگی دلگرو دەنگی خۆشی خۆی قورئان دەخوێنێ و هەموو ئایەتەکان بۆ یەك یەکی بەندییەکان لێك دەداتەوە؟

لەم جیهانەدا لەبەرچاوی مەلا ئاقڵ و شێت و گەورەو چووك وەك یەك بوون. ئەو لەگەڵ هەمووان بە سۆزی دڵ قسەی دەکرد. ئاقڵ و شێت و گەورەو چووك هەرکەس بە پێی توانای خۆی بەهرەی

لێوەردەگرت. ئەگەر مەلا فەرهاد بیستبای کە ئەو دیسان دوو کەسی کوشتوون, دووبارە چووەتەوە چیاو جارێکی دیکە لەگەڵ مردن بەرەورِوو بووە چیی دەگوت؟ بەڵام کەسانێك کە ئەو کوشتبوونی, وەدوای دەکەوتن و بە خوێنی سەری تینوو بوون. ئەو چ شتێکی چارەسەر کردوە؟ داخوا ئێستا گوندی وایوای رزگار بووە؟ داخوا یەکێکی دیکە جێگەی عەلی سەفا یان هەمزە کەچەڵ ناگرێتەوە؟ ئەگەر وابێ, باشە ئەو شەرِە بۆ؟ لەمەولا چ دەبێ؟ ئێستا تەنانەت جێگایەکیشی نیە بێچێتێ. لەوانەیە هەر ئێستا جەندرمە لە چوار لاوە گەمارۆیان دابێ. ئەگەر دێهاتییەکان تەنانەت سەری قامکیشی ببینن نایدەنە دەستی حکوومەت.

دێهاتییەکی بێئەژماری فیلینتا لەشان, لە رێگای سەرسەوزو باریکەوە بەنێو چڵەگوێنی و کۆمای ئەو گوڵە سووراوییانەدا کە بڵێسەیەکی شینی بە رەنگی پۆڵایان تێدا دەدرەوشا, بەرِیزو بە شوێن یەك دا وەك شارە مێرووڵە دەهاتنە خوارو لەزەویی راوندی رووبەرِووی عەلیکۆدا کۆ دەبوونەوە. مەلا لەسەر تەپۆلکەیەك قورئانی دەخوێندو ئایەتەکانی لێك دەدانەوە. گەردنی هەڵدێناو لە کاتێك دا گرێی قرتۆمەی هەڵداو پێدای دەکرد, لە کانگای دڵەوە قسەی لەگەڵ خەڵك دەکرد. دەیگوت:"ناهومێدی نابێ دەست و پێمان ببەستێ". دەیگوت:"بەربەرەکانی هەقە"و ئەودەم ئاپۆرای خەڵك وەك لافاو لە توورِووسەکان, دارستانەکان, بەردەڵانەکان و لافاوگەکان بەرەو خوار, بەرەو دەشتەکانی ئاناوارزا دادەگەرِان و دەشتی ئاناوارزاو مەودای نێوان ئیلان قەڵاو دووملی و لەوێ رِا هەتا خوارەوەی کووزان و مێسیس و هەنجیراوی و پاشان سەرانسەری دەشتەکانیان هەتا دەریای مێدیترانە پرِ دەکرد. ئاپۆرای خەڵك لە دەشتی هەموارو بەرینی چوکووراوادا وەك دەریایەکی ئارام, بە بێدەنگی شەپۆلیان دەدا.

مەلا فەرهاد باسی قەڵای ئاناوارزای دەکرد. وەك هەورە تریشقە دەی گرماند. قسەی جوان, پرِ ماناو گیاندار. ئاپۆرِای خەڵك کە ئەفسوون گرتووی جادووی قسەکانی بوون بەرەو شار دەبزووتن. مەلا فەرهاد یەك بێن قسەی دەکردو ورەو غیرەتی وەبەر دەنان و حەشیمەتیش کە دەت گوت لافاو هەڵی گرتوە بێوچان دەرۆیشت. هەوری تەپ و تۆز سەرانسەری ئاسمانی چوکووراوای داگرتبوو. ئاپۆرای خەڵك شارو لادێی دادەگرت و شارو لادێ لەنێو حەشیمەت دا ون دەبوون. حەمەد کە لەگەرمای ئاگرێکی بڵێسەداردا لە دوندی چیایەکی بەرز مابووەوە, دەکەوتە بەر لافاوێك کە لەو سەرەوە دەهاتە خوار, لەگەڵ دارە هەڵکەندراوەکان و تاتەبەردەکان بەسەر زەوی دا دەخشاو بە خێرایی خلۆر دەبووەوە. ئاو قومی دەکرد. مەلافەرهادیش هاواری دەکرد:"ئەو پیاوەی لافاو بردوویە نەجاتی دەن. ئەو حەمەدۆکە. نەجاتی دەن." کەسیش گوێی نەدەدایە

هاوارو دادوڕۆیەکەی. حەشیمەت وەك بەرد لە جێگای خۆی ڕەق ببوو. بە چاوێکی داپچڕاوو بێهەستەوە, تەماشایان دەکردو لە جێی خۆیان نەدەبزووتن. لەدوور دەنگی سمی ئەسپان هات. مەلا فەرهاد لاچاوی بە زەوییەوە نابوو, گوێی بۆ دەنگی ئەودیوی چیا هەڵخستبوو. دەنگی سمی ئەسپەکان بەرە بەرە نیزیکتر دەبوو, زۆرتر دەبوو. ئاپۆرای سواران گەیشتە جێ و بە پڕتاو لە ژوور سەری حەمەدۆکەوە تێپەڕین. سوارەکان دەهاتن و بەخێرایی بەسەر حەمەد دا دەخزین و تێدەپەڕین و حەمەد نەیدەتوانی سەری هەڵبڕێ. تاریکایییەکی‌ئەوەندە خەست هەموو جێگایەکی داگرتبوو کە گوللەی تێنەدەچوو. چاو چاوی نەدەدی و هەناسە لە سنگی بنیادەم دا رادەوەستا. خۆزگە سوارەکان لەحزەیەك لە ڕۆیشتن دەکەوتن و حەمەد دەیتوانی سەر هەڵبڕێ. خوێنێکی سوورو بۆن ناخۆش چۆڕ چۆڕ دەڕژایە سەر تاریکایی, ئەم خوێنە کە خوێنی عەلی سەفاو هەمزە کەچەڵ بوو, بە هیچ جۆرێك ڕانەدەوەستا. جەندرمەکان و یاوەر فارووق لەنێو خوێنەکەوە دەردەکەوتن. بە چاوی مۆڕو چەکمەی سوورو قەمچییەکەوە کە دەنگی وەك گرفەگرفی بڵێسە ئاگر دەچوو... لە نەکاو دەنگی ئەو ئەسپانە کە لە ژوور سەرییەوە تێدەپەڕین کپ بوو. ئاپۆرای حەشیمەتەکە کشایەوەو ڕۆیشت, لەمێژ نەبوو مێرووەکانیش چووبوونەوە شارەکەی خۆیانەوە. باران لێی نەدەکردەوە. عەلی سەفابەگ و هەمزەکەچەڵ بە چاوی داقڵیشاوو دەمی داپچڕاوەوە لە هەڵپە هەڵپ دا بوون. شتێکی خەراپتر زیاتر لە بێدەنگی بەسەر فەزادا زاڵ بوو. ئاوازەی بێدەنگی وەك دەنگی زەنگوڵە بەرز بووەوەو حەمەد لەنێو دەشتێکی بێبڕانەوەدا کە لە ڕۆژهەڵات تا ڕۆژئاوای داگرتبوو, مایەوە. میچی ڕووخاوی ئاسمانێکی زۆر شین بە هەموو قورسانی خۆیەوە بەسەری دا دەکەوتە خوارو حەمەد بەرەو ئەم لاو ئەولا ڕای دەکرد. بەڵام لە ژێر ئەو ئاسمانە کە وەك مەرمەڕێکی شینی گەورەو ئەستوور دەچوو ڕزگاربوونی نەبوو. غاری دەدا ئەولا, ڕزگار بوونی نەبوو, بۆ ئەولا هەڵدەهات, دەرباز نەدەبوو, بۆ ڕاست, بۆ چەپ... لەو نێوەدا بەرەو هەموو لایەك ڕای دەکرد. ئەو ئاسمانەی ژوور دەشتەکەی داپۆشیبوو, هەناسەی لە سنگی دا ڕادەگرت. لایەکی ئاسمان نیشتە سەر دەریاو بە هەموو قورسایی خۆی ئاوە قووڵەکەی کوتا. تەپۆڵکەکان, کێوەکان و شاخەکان و دارەکان ڕێك و تەخت بوون. دارستانەکە لەرزی. ڕاتلەکا. دارەکانی بەو هەموو مەزنییە لەسەر زەوی ڕاکشان و دووبارە هەستانەوە. دنیا دەستی کرد بە قەڵشین و ئەرزو ئاسمان کەوتە جوجۆڵ و ڕاست لەو لەحزەیەدا حەمەد لە جێی خۆی ڕاپەڕی. ئەسپەکە بەرامبەری و چەند هەنگاو لەولای خۆی بوو, بە گوێی قووت کردووی وا دەهاتە بەرچاو کە سەری هەڵبڕیوەو دەڕوانێتە قووڵایی لێڕەوار. حەیوانەکە لە نەکاو بە لاقی پێشەوەی دەستی کرد بە زەوی هەڵکۆڵین و پاشان کەوتە سمکۆڵ. بە نارەحەتییەوە دەیفیشقاندو زەویی هەڵدەکەند. بە هەژانەوە سمکۆڵی دەکردو هەوڵی دەدا هەوسارەکەی بپسێنێ و خۆی بەر هەڵبدا. حەمەد لەنێو خەوو بێداری دا, لەنێو خەون و ڕاستی دا مایەوەو گوێی بۆ دەنگی لێڕەوار هەڵخست. دنیا بە

تەواوی تاریك ببوو و لێڕەوار بە توندی دەی‌نەڕاند. دەنگی مەلێکی تەنیا کە لە دوور دەی‌خوێند هێشتا دەهاتە بەرگوێ. لەو دەوروبەرە شتێك نەبوو کە ئەسپەکەی ئەوەندە ناڕەحەت و تووڕە بکا. ئەسپی ڕەسەن وایە. ئەو ئەسپانە لە چل قۆناخ ڕێگاوە ڕێك خشانی دوو گەلا هەست پێ دەکەن و کونە لووتیان بە تەواوی دەکرێنەوە. دەبێ وشیارو ئامادەی شەڕ بێ. ئەسپەکە جار لە جار تووڕەتر دەبوو و ئارام و ئۆقرەی لێ‌بڕابوو. تووشی شێتی‌یەکەی پێشووی, واتە بە دەوری‌خۆداسووڕان ببوو. ئەگەر ماوەیەکی دیکە هەروا مابایەوە, ئەسپی تووڕەو وەهەژان کەوتوو لێ‌نیزیك بوونەوەی نەدەکرا. ران و لاڕانی حەمەد ئەوەندە دێشان کە دەت گوت ئێستا نا ئێستا دەپچڕێن. ئەگەر چەند ڕۆژ بە پێ‌یان ڕۆیشتبا هێشتا ڕانی ئەوەندە نەدەکوتران و ئەوەندە قالبی گران نەدەبوو. ئەسپەکە سات بە سات تووڕەتر دەبوو. بە دەوری هەوسارەکەی دا دەسووڕا. بەلاقان لووشکی لە فەزا دەدان و ئەوەندە بە توندی دەهەندمی کە دەنگی هەناسەی هەتا دوور دەڕۆیشت.

حەمەد ئیدی نەی‌توانی بیر لە هیچ بکاتەوە. لەپڕ لە جێی خۆی ڕاست بووەوە. هەوساری لە دڕووەکە کردەوە. سواری ئەسپەکە بوو و خێرا بەرەو ئەولایە کە لێی ڕا هاتبوو گەڕایەوەو بەرەو عەلی‌کۆ لێی خوڕی. ئەسپ کە بە پڕتاو دەڕۆیشت, کاتێك لە خڕێك تێ‌دەپەڕی, سڵەمیەوە لە جێی خۆی چەقی. حەمەد کە هێندەی نەمابوو بەربێتەوە, بە زەحمەت توانی خۆی بگرێتەوە. بەسپایی جڵەوی ئەسپەکەی بەرەو لێڕەوار وەرسووڕاندو بە غاردان چووە نێو دارستان. نزارەکە وەك ڕووبارێك بە هەردوو لای دا دەڕۆیشت و لەبەر ئەو بایە کە لە غاردانی ئەسپەکە ـ کە جار لە جار خێراتر دەڕۆیشت ـ پەیدا دەبوو هەستی بە فێنکایی‌یەکی دڵگر دەکرد. ئەو لکە دارە ڕەقانە کە دەورەیان دابوو ناچاریان دەکرد بەم لاو ئەولادا خوار بێتەوەو جار جار ڕووشاڵی سەر پێستی لێ‌هەڵدەبوون و هێندێ جاریش برینی قووڵی تێ‌دەبوون. لەگەڵ زیادبوونی هاڕەو گرمەیەك کە دەهاتە بەرگوێی, دەنگی ئەو پەلەوەرەش کە لە دوور دەی‌خوێند, نیزیك تر بووەوە. وای هاتە بەرچاو کە بە سیلەی چاوە نیوە کراوەکانی تیشکێکی لە تەنیشت خۆی دیوە. خێرا بەجێی هێشت. ڕووناکایی‌یەك, بە دوای وی دا ڕووناکایی‌یەکی دیکە, یەکی دیکە, یەکی دیکە... یەك لە دوای یەك ئەو ڕووناکایی‌یە نادیارانەی بەجێ دەهێشت. ڕووناکایی‌یەکان بە دوای یەك دا دەڕژان و تێکەڵ دەبوون. تێ‌گەیشت کە بە ڕێچکە بزنێکی باریك دا دەڕواو جار بە جار لە هێندێ گۆلاوی چووکیش تێ‌دەپەڕێ. تا ڕادەیەك لێکی دایەوە لە کوێ‌یە. لە تاوی ئێشێك کە کەمێك پێش ئێستا, ڕاست لە موورەگەی پشتی وەستابوو, جینگڵی دەدان. لەوە کە دیتی چەند لەحزەیەك ژانەکەی هێدی بووە, کەمێك خۆشحاڵ بوو. پێویست نەبوو ئاوزەنگی لە ئەسپەکەی بدا. ئەسپەکە بەملی ڕاکشاوەوە لە حاڵێك دا فیشقە فیشقی بەرز ببووەوە, لینگی دەدا. تێ‌گەیشت کە خۆی و ئەسپەکەی شەلاڵی ئارەقن. بەرە بەرە لە تەواوی لەشی دا هەستی

بە سەرما دەکرد. لاقی کە لە کەلەکەی ئەسپەکەی توند کردبوون، سڕ دەبوون. بێ ئەوەی بزانێ بەو سڕییە چەندی ئەسپ لـێخوڕیوە، دەچووە پێش و وەختێك ئەسپەکەی بن رانیی وەبیر دەهاتەوە کە حەیوانەکە لە گۆلاوێك، قوولکەیەك، مووەرەدارێکی سەر ڕێگای یان گابەردو خڕو دۆڵەکان بازی دەدا، یان ئەو وەختانە کە لکە دارەکان بە توندی لە کەلەکەو سەرو پشتی دەدران. بە کەم بوونەوەی چالاکیی ئەسپەکەو هەست کردن بە فێنکایی ئاو لەسەر لاقی بۆی دەرکەوت کە لە لێڕەوار دەرکەوتوە. لە نەکاو هەڵلاو هەنگامەی هەزاران باڵندە کە وێکڕا دەیان خوێند هاتە بەرگوێی، وا دیار بوو بەرەبەیان نیزیکە. وەختێك لە ئاوەکە دەپەڕیەوە، سەری وەرسووڕاندو تەماشای ئەو لایەی کرد کە پێی وابوو ڕۆژهەڵاتە. ئەستێرەکان مردبوونەوەو ئاسمان نەختێك سپی هەڵگەڕابوو. بەرە بەرە دەنگی باڵندەکان زیادی دەکرد. دەنگەکە گوێی بنیادەمی کەڕ دەکرد. لە دڵی خۆی دا گوتی:"پاساری" و زەردەیەکی هاتێ. بەوە کە شاخێکی گەورە هاتە سەر ڕێگای، ئەسپەکە لەحزەیەك ڕاوەستاو ئەنجار بە پڕتاو وەڕێ کەوتەوە. دەوروبەری ئەو شاخە دارستانێکی لەمێژینە بوو، کە دارەکانی سەریان لە ئاسمان دەداو ئەگەر سێ کەس دەستیان وێك دابایە، دەستیان لە قەدیان نەدەگەیشتەوە. وەختێك تەواوی ئەو ساتانەی هێنایەوە بەرچاوی کە لەو دارستانەدا ڕای بواردبوون، کەمێك شل بووەوە. تیشکێکی کەم نووری هیواو شادمانی لە هەناوی دا درەوشاو پاش دەمەساتێك کووژایەوە. تاوێك دواتر لێڕەواری بەجێ دەهێشت و دەگەیشتە شوێنی ئەو عێلاتە کەلە نیزیك کانیاوەکانی بناری پان و بەرین و بێ داروباری کێوەکان هەڵیان دابوو. هۆبەی کەریم ئۆغڵی لەو نیزیکانە هەڵی دەداو زۆرتریش لە پەنای کانیاوێکی پڕ ئاو لە ڕۆژهەڵاتی کێوەکەو لەو بنارە کە گابەردی نووك تیژی سوورو شینی هەبوون، هەڵی دەدا. ئەدی ئەگەر کەریم ئۆغڵی لە جێگایەکی دیکەی هەڵدابێ؟ ئەگەر عێلات بیگرن و تەسلیمی جەندرمەکانی بکەن؟ ئەگەر...؟ لەو کاتەدا بیری لەحاڵی خۆی دەکردەوەو هەر لەو حاڵەدا مەلا فەرهادی بەو چاوە خەمناکانەو بەو ریشە رەش و جوان و تێك چڕژاوەوە لەبەر چاو ون نەدەبوو. ئەسپەکە نەختێك لە پڕتاو کەوت. فکرو بیری حەمەد روون تر ببوون و لەگەڵ دەنگی هەنگاوە ڕێك و پێکەکانی ئەسپەکە دەهاتنەوە. ئەگەر مەلا فەرهاد یان وەسمانەزلە لێرە بان، ئەویان ڕێنوێنی دەکردو پێیان دەگوت کە دەتوانێ متمانە بە عێلاتییەکان بکا یان نا. ترسێکی گەورەی سوار بوو. لە نەکاو جڵەوی ئەسپەکەی وەرگێڕاو ئەسپە کەف کردووەکەی بەو ڕێگایەدا کە پێی دا هاتبوو، تاو دا. وەختێك ئاوی فێنکی ئەو ڕووبارە کە تاوێك پێشتر لێی پەڕیبووەوە، لە لاقانی دا وەخۆی هاتەوە. ئەسپ دیسان بەنێو چۆمەکەدا تێپەڕی و دووبارە گەیشتەوە شاخی گۆڕین. باڵندەکان زۆرتر ببوون. هەزاران هەزار باڵندە لەسەر لکەکان دەستیان بە قاووقیژ کردبوو. لەغاوی ئەسپەکەی کێشا. ئاسمان کەم کەم روون

دەبوو و رەنگێکی شینی نەرم لەسەری دەکەوتە باڵەفڕە. ئەسپەکە ماندوو بوو. لەخۆوە راوەستا. کەمێك دواتر ئەو ترسەی کەوتبووە دڵی حەمەدەوە زیادی کرد. ترس وەك شمشێرێك بەسەری دا بەر بووەوەو کەوتە سەر لەشی. ئەسپەکە دووبارە گەڕایەوەو گەیشتەوە چۆمەکە. حەمەد پێش ئەوەی ئاوی فێنکی رووبار لە پەنجەی پێی بدا، چۆمەکەی دی.

تاریکاییەیەکی خەست کە بە شێوەیەکی نادیار وەك ئاو دەچوو، بە پێش چاوی دا تێدەپەڕی و لە چۆڵترین قوژبنی لێڕەوار دا لەبەر چاو ون دەبوو. لەخوارەوە دەنگی خوڕەی ئاوێ دەهات. دەنگی هاڕەی تاڤگەیەکی چووکەڵەی دەبیست. ئەسپەکە دیسان بەرەو دوا گەڕایەوەو پاش ئەوەی ماوەیەك هەروا رۆیشت و گەڕایەوە، لەبن دارێك کە راست لەسەر لووتکی بەردەڵانەکە روابوو و لك و پۆپێکی چڕوپڕی هەبوو، راوەستا. حەمەد هیچ خۆی تێنەگەیاند، توانای ئەسپەکەش و توانای خۆشی تەواو ببوو. کەمێك دواتر ئەسپەکە گوێی بەردانەوەو لاقی راستی بە بەرزگیەوە نوشتاندەوە. حەمەدیش داهاتەوە سەر ملی ئەسپەکەو هەروەك بۆن بە کەفی ملیەوە بکا تاوێکی چاك هەروا مایەوە. هەردووکیان ـ ئەسپ و حەمەدـ چەند لەحزەیەك بەو جۆرە مانەوە. ملی ئارەق دەرکردووی ئەسپەکە بۆنێکی قورسی لێدەهات. ئەسپ کە لە دەنگێکی بەرز تێك رابوو، سڵەمیەوە. گوێی قوت کردن، گوێی بۆ دەنگی دەوروبەری هەڵخست و سەرەنجام کەوتە لینگدان. ئەسپ و سوار بەنێو دەنگی ئەو باڵندانەدا کە دەت گوت شێت بوون، تێپەڕین. گەیشتنە بەستێنێکی پان وخیزەڵان کە لێوارەکانی، داری "زەققووم"ی گوڵ پەمەیییان لێڕوابوون. لەنەکاو لەگەڵ دەسرێژی کۆمەڵێك کە لە پشت دارەکانی لێواری چەپی بەستێنەکەوە تەقەیان دەکرد بەرەوڕوو بوون. ئەسپ خۆی پان کردەوەو پاشان بەرەو راست بای دایەوەو لە کاتێك دا بەسەر خیزەڵانەکەدا دەخزی کەوتە لینگدان. حەمەد کاتێك لە قۆرتەکەی رووبەڕووی و کلکەی رووبارەکە تێدەپەڕی، لە شانی راستی دا هەستی بەشتێکی وەك برژانەوە کرد. کەمێك خوارتر برژانەوەیەکی دیکە... و راست لە ژوور رەفیسکیەوە برژانەوەیەکی ئاشکراتر... لەسەر ملی ئەسپەکە راکشابوو و ئەسپ ئەوی بەرەو بەستێنی چۆمەکە هەوراز دەبرد. کەم کەم برژانەوەی شانەکانی حەمەد زیادی دەکردو دەنگێکیش لە دواوە لە پەستا دەیگوت:"حەمەدۆك... حەمەدۆك، ئەم جارە لە دەستم رزگار نابی، ئەم جارە لە دەستم، لە دەستم... سەرانسەری لێڕەوارەکە گەمارۆ دراوە، گەمارۆ دراوە."

ئەسپ لەنێو لێڕەوارو دەوەنە دڕکەکان دەچووە دەرو لە بەستێنی خیزەڵانی رووباردا خوارو ژووری دەرد. بۆنی پنگەڵی وشك، بۆنی شیلەی سنۆبەرو بۆنی دووکەڵی داری تەڕ دەهات.

ئەوانەی لە پشتەوە لە پاش بەردەلآنەکە سەنگەریان گرتبوو, دەستیان لە تەقە هەڵنەدەگرت. لێکدا لێکدا بارانی گوللە دەباری. بەرە بەرە بەیان دەنگووت. دارو گیاو گوڵ دەبینران.

ئەسپەکە دیسانیش, ئەولاتر رۆیشت و گەیشتە شوێنێکی هەموارو کاتێك دەنگی زەنگوڵەی مێگەلێك تێکەڵ بە دەنگەکانی دیکە بوو, دەمێك راوەستا. سەرانسەری بنارە رووتەنەکە هەر لە بن پێی ئەسپەکەوە هەتا دوندی چیاکە, دڕووە گوێنی بە گوڵی پەمەیی بریسکەدارو بلێسەی ئاسمانی رەنگەوە دایگرتبوو و ئاسۆی خۆرهەلآت لە خەرمانەیەکی رووناکی‌دا نوقم ببوو. حەمەد گوێی بۆ دەوروبەری هەڵخست. دەنگی تەقە کپ ببوو. هێزی ئەوەی نەبوو ئەسپەکەی بەرەو دارستان لێ‌خوڕێ. وای هاتە بەرچاو لە پشت گابەردێکی بنەوشیی مەیلەو سوورەوە کە دوندێکی تیژو بریقەداری وەك شمشیری هەبوو, چەند هەودا دووکەڵی شین بەرەو ئاسمان بەرز دەبنەوە. هەموو پەلەوەری دنیا لە کاسەی سەری دا دەستیان کردبوو بە قاووقیژ. هەستی کرد خوێنێکی شیلەو گەرم لەسەر شانی ڕا بۆ سەر سنگی و لەوێ ڕا بەسەر زگی دا دێتە خوار. لەبن لێوانەوە گوتی:"ئەی دادو بێداد مەلا فەرهاد. چارەنووس ئەمە بوو." ئەمجار دەنگی ئادەمیزادی بەرگوێ کەوت. کۆمەڵێك ژن و پیاو و منداڵی دیتن کە ئارام و بێدەنگ لە کاتێك دا وردە وردە دەڕۆن و متەقیان لێوە نایە, لە سەرێ ڕا دێنە خوارێ و مەلا فەرهاد لە حاڵێك دا سەری بەسەر سنگی دا شۆڕ بووەتەوە لە پێش هەموویانەوە دەڕوا... هەموو ئەندامی لەشی, لە تەپڵی سەریەوە هەتا نینۆکی لاقی خۆشحاڵ بوون. چاوی بە تەواوی هەڵێنان و ویستی لە پشتی هەوری سوورو بریقەداری سەر بڕکە گوێنی‌یەکانەوە جارێکی دیکە چاوی بە مەلا فەرهاد بکەوێ کە بە ماندوویی و شەکەتی, بەلآم بە ئارامی و سەنگینی دەهاتە پێش. بەلآم پەردەیەکی تاریك بەری چاوانیی گرت و راست لەو لەحزەیەدا لە ئەسپەکە بەربووەوەو درێژاو درێژ لەسەر بڕکە گوێنی‌یان کە پێیان دەڵێن سەرینی شوانان, راکشا. لە چاوی ئەو ئەسپەدا کە لە ژوور سەری چاوەڕوان بوو بلێسەیەك رەنگی دایەوە. بلێسەکە گەشایەوە, دامردەوەو دووبارە گەشایەوە. هەڵلآو هەنگامەو هەستی پێ‌یانیش پتر بوو. ئەسپەکە پاش ئەوەی ماوەیەك گوێی قوت کردن و چاوەڕێ ما, بەرەو پێش دەخۆی نووساو لە کاتێك دا خەرمانەیەکی بە قەدەر جێ خەرمانێکی لەسەر گوڵە گوێنی‌یەکان دەکێشایەوە دەستی کرد بە هەڵسووڕان. حەیوان لەگەڵ هەر خولێکی دەی‌دا خەرمانەکەی چووك و چووکتر دەکردەوە. پاش ئەوەی ماوەیەك وەك خولخولە بە دەوری خۆی دا سووڕا, سەری بە دیمەنی خۆی بە گوێی قوتەوە هەڵێناو بەچاوە گەورەکانی روانیە دوندی چیا. بە دوای ئەوەدا بە پڕتاو بەرەو چیا دەخۆی نووسا.

## (٣)

دوێنێ شەوێ کاتێك لە ماڵی عەلی سەفابەگ دەنگی تەقە بەرز بووەوە, خەڵك غاریان دایە وێ. ئێستا ماڵەکە پڕ ببوو لە حەشیمەت. خەبەری کارەساتەکە گەیشتبووە دێهاتی زۆر دوور. چەند سەعات پێشتر ژمارەیەك ژنی شین گێڕ لە گوندەکانی نیزیکەوە هاتبوون و شیوەنیان دەکرد. ئەوان کاتێك لەسەر تەرمی خوێناویی عەلی سەفابەگ شیوەنیان دەرکرد, لەبەر داخ وخەفەتی زۆر خۆیان رادەژاند, پلەو پایەی مردووەکەیان دەگەیاندە ئاسمانی حەوتەم, باسی ژیانی پڕ شکۆی ئەویان دەکرد, ئاکارە باش و ئینسانییەکانییان هەڵدەداو حەمەدۆکی پیاوکوژی دڵڕەشی چنگ بە خوێنیان دەدایە بەر تووك و نەفرین.

"... هەر ئەم رۆژانە جەندرمەکان حەمەدۆکی دەگرن و دەیهێننە شارۆچکە. ئەودەم عارف صائم بەگ و تاشکەن بەگ, لە پێش چاوی ژن و کەس و کاری عەلی سەفاو هەموو خەڵك, لە دارچناری حەوشی مزگەوتی سووری شاری دەبەستن و بە زیندوویی کەولی دەکەن. چما ئەقڵ دەیگرێ ئاغاکان, ئەو هەڵۆ شێرکوژانە, بهێڵن ئەو خوێنخۆرە, ئەو دوژمنە نزمە بە زیندوویی درچێ؟ پارچە پارچەی دەکەن. خۆزگە عەلی سەفابەگ, ئەو پیاوە ئازایە, ئەو خاوەن ملکە مەزنە, ئەو نووری چاوی حکوومەتە, بە دەستی پیاوێکی پیاو کوژرابایە, نەك بە دەستی دێهاتییەکی بستە بالای مل باریکی ریوەڵەی چاو هەڵمساو, نەك هەتیوێکی سواڵکەری پێپەتی. کابرا هێندی زەردەکوولەکە خواردوە, زگی بای کردوەو لەبەر مێروولەیەکیش هەڵدێ.

ئەگەر عەلی سەفا, ئەو پیاوە ئازایە, ئەو ئاغا ئینسان و نەجیب زادەیە, ئەو پشت و پەنایەی فەقیرو هەژاران, بەدەستی پیاوێکی پیاو کوژرابایە, پیاو پەرۆشی نەبوو. بەڵام نەك بە

دەستی منداڵێکی چڵمنی لە هەموو جێیەك دەرکراو. ئەگەر قاتڵی عەلی سەفا پیاوێکی پیاو بووایە, پیاو خەمی نەدەبوو..."

لە ژووری حەوشەی حەشیمەت زیاتر بوو. ئەو قسانە لە حەوشەوە چوونە شەقام و لە شەقامەوە بەرەو خوار هەتا حەوشی مزگەوتێ رۆیشتن. لای نیوەڕۆیە ئاپۆرای خەڵك, سەرانسەری بازاڕ, مەیدان و خوار بازاڕیان پڕ کردبوو, لافاوی حەشیمەت لەوێشەوە خەریك بوو پاڵی وە لێواری چۆمی دەدا. شوێنی بازاڕی لێواری رووبار پڕ ببوو لە ئەسپ و عارەبانەو عەرڕابە.

هێندێك لە خزمانی مردووەکەو پیاوماقووڵانی شارۆچکە دەیانەویست دەسبەجێ تەرمەکە بنێژن. بەڵام خێزانی عەلی سەفابەگ, مورتەزا قەرەداغلی ئۆغلی و بەکر چۆیماغ زادەو تاشکەن خەلیل بەگ و رۆستەم بەگی مامۆستا بەوە رازی نەبوون. ئەوانەی دەیانەویست بنێژرێ, دەیان گوت:"بەم گەرمایە,, تەرمەکە هەر ئێستا ئاوساوە, بۆنی کردوە." دەستەکەی دیکە پێیان دەچەقاند کە:"با برزێ و بۆن بکا. تەرمە خوێناوییەکەی دەبێ هەموو کەس بیبینێ و هەموو خەڵك دەبێ لە بەخاك سپاردنی تەرمێکی وا پیرۆز دا بەشدار بن." سەرەنجام قسەی خێزانی عەلی سەفا سەرکەوت و تەرمەکە هەتا رۆژی دواتر نەنێژرا. هەرچی کۆلۆنیای لە شار دا هەبوو, لە بازاڕەوە بگرە تا ماڵەکان, هەموویان هێناو بە تەرمی پیرۆزی عەلی سەفابەگیان دا کرد!! تەرمەکە زیاتریش ئاوسا. وەك دەهۆڵی لێهاتبوو. بۆگەنەکەشی لە ماڵ و حەوشەی ماڵێ تێپەڕیبوو و گەیشتبووە لێواری چۆم و شوێنی بازاڕ. بۆنی تەرمی هەڵمساو کەوتبووە سەر ئاوو دارو خاك و ئەندامی لەشی خەڵك. لەو گێرەو کێشەیەدا, عارف صائم بەگ نوێنەری مەجلیس, فەرماندەری جەندرمە, جێنشینی والیی ئەدەنەو فەرمانبەرە پایەبەرزەکانی دیکەو هەروەها ژمارەیەك لە خاوەن ملکە سەر زلەکان کە لەگەڵ عارف صائم بەگ دۆست بوون, خانە لەمێژ ساڵەکانی تورکمەن لە کووزان, عوسمانیە, جەیهان و...ود بۆ بەرێ کردنی تەرمەکە گەیشتبوونە جێ. مورتەزاغا قەرەداغلی ئۆغلی خۆی هاویشتبووە نێو مەسەلەکەو لە سەرو سنگی خۆی دەداو دەگریاو دەستی وە هەرکەس راگەیشتبا, پێی دەگوت:

"کوشتی, حەمەدۆکە مل باریك بە خۆی و بستە باڵایەکەوە کوشتی. نێرە شێرێکی وك عەلی سەفای کوشت. هاوڕێیان, خزمینە, براینە, کوشتی. پیاوی ئازاو گەورەی شەڕی سەربەخۆیی کوشت. هاواڵی دۆغان پاشای کوشت. تایفۆن پاشای کوشت. باری ئەم موسیبەتە هەڵناگیرێ. لێرە لەنێو ئەو جەهەننەمە گەرمەدا کەوتوەو خەریکە دەڕزێ. ئەم موسیبەتە بە کەس هەڵناگیرێ. پێشتریش عەبدیخانی کوشت. ئاغای گەورەی پێنج دێیان. کۆڵەکەی دینمان بوو. عەبدیخانیشی

هەروا کوشت, هێرشی کردە سەر دێ و کوشتی, چاوە گەشەکانی ئەو بەستەزمانەی پڕ کرد لە قوڕقوشم. حەمەدۆك کێی نەکوشت...؟ دەڵێن بە خەنجەر, زگی ژنە ئاغاکانی هەڵدڕیوە. منداڵی لە زگیان دەرکێشاوەو کردوویەتە نیشانە تفەنگ و گوللەبارانی کردوە. ئەو, تەنیا خاوەن پارەو دەوڵەمەندەکانی ئەزیەت و ئازار نەکردوە! نازانی ئەو والیکراوو واپێکراوە چیی بەسەر فەقیرو هەژاران هێناوە! ژن و کچەکانیانی ئەتك دەکرد. پاشانیش سەری دەبڕین, بەسەر دارێکیەوە دەکردو لە قەراخ جادەکان دەیچەقاند. ئێستاش رووی کردوەتە چیاو چووەتە گەڵی شکۆفە, هەتا مەحموودئاغای گەڵی شکۆفە, قارەمانی شەڕی سەربەخۆیی بکوژێ. دەزانی بەرنامەی داناوە کە ئەو کارە بکا؟ دەزانی کێ ئەمەی بە من گوت؟ عەلیەشەلی بەناوبانگ. هەر ئەو عەلیەیە کە تەنانەت شوێنی باڵی تەیری ئاسمانیش هەڵدەگرێ. ئەو عەلیەشەلە کە دۆستی گیانی بە گیانیی عەبدیخان بوو. ئەو عەلیەشەلە کە ئەگەر بکەوێتە دەستی ئەو کافرە, گۆشتی لەشی لە قیمە دەدا. تەنانەت عەلیەشەلیش دەرەقەتی نەهات."

ئەو عەلیەشەلەش کە مورتەزا پەنجەی بۆ رادەداشت و بە خەڵکی دەناساندو لە دەریای تاریف و پێهەڵاگوتن دا نوقمی دەکرد, سەری بەردابووەوەو لە لای راستی ئاغا مورتەزاوە, هەنگاوێك لەو دواتر لە حاڵێك دا نوقمی خەفەتێکی قووڵ بوو, بە دوای دا دەڕۆیشت. دەت گوت ئەو هەموو پێهەڵاگوتنە لەبارەی کەسێکی دیکە دایە, نەك دەرهەق بەو. چونکە بێئەوەی چووکترین جووڵە یان ئاڵوگۆڕ لە هێڵەکانی نێوچاوانی دا پەیدا بێ, گوێی لە قسەکانی دەگرت:

"ئەگەر جەندرمەکانمان پێش ئەوەی بچێتە گەڵی شکۆفە, خۆیان نەگەیەننە وێ مەحموودئاغای گەڵی شکۆفە قارەمانی شەڕی سەربەخۆیی کە سنگی کردبووە قەڵغانی گوللەی دوژمن, دەکوژرێ. ئاغاکانی دیکەش, ئەوانەی سنگیان کردبووە قەڵغان دەکوژرێن... ژنەکانمان... هاوار بە ماڵم بۆ کچەکانمان. پاشانیش حەمەدۆك بە رەوەیەك جانەوەری تەناف پساندووەوە کە هەموویان شیاوی تەنافی دارو ئیعدامن, لە کێوپارەی دێتەخوار. لە پێش دا هێرش دەکاتە سەر شارۆچکەکەمان. پاشان ئەدەنەو کووزان و سەرانسەری چوکووراوا دەگرێ. هەمووانمان یەك بە یەك کەوڵ دەکا. گۆش تا بە گۆش سەرمان دەبڕێ. هاوار بە ماڵم بۆ ژنەکانمان. هاوار بە ماڵم بۆ کچەکانمان, هاوار بە ماڵم بۆ مەزراکانمان... وەی. وە, وەی کە چیمان بەسەر دێ... بەڵام با پێتان بڵێم ئەگەر هەموو چوکووراواش بگرێ, دیسان ئێمە هەروەك لە شەڕی سەربەخۆییدا, فەڕانسەییەکانمان لە هەرێمی نیشتمان دەرکردن و لە چیاکانی تووڕووس دا لەنێومان بردن, ئەویش, حەمەدۆکیش دەگرین و دەیخنکێنین."

وەختێك مورتەزاغا بەو جۆرە قسەی دەکردو خۆی رادەنا, عەلیەشەل جاروبار رادەوەستا, برۆی هەڵدەتەکاندن, بە چاوێکی فێڵبازانەوە بە شێوەیەکی سەیر لە تەنیشتەوە تەماشایەکی دەکردو سەرلەنوێ ملی رێگای دەگرتەوە.

وەزعی فیکریی مورتەزاغا قەرەداغلی ئۆغلی زۆر شپرزە بوو. ئەوەی دەیگوت لە ناخی دڵەوە بروای پێی هەبوو. لە ترسی حەمەدۆك خەریك بوو زراوی بچێ. لە ترسی ئەو خوێنخۆرەو ئەو کابرا درندە سروشتە خەوو ئارامی نەبوو. بە بیستنی خەبەری کوژرانی عەلی سەفابەگ بە جارێك خۆی دۆڕاندو تووشی ترسێکی کوشندە بوو. عەلیەشەل تەنیا پەناگەو تەنیا کەسی جێی باوەڕیو تەنیا لکە دارێك بوو کە وەك لاولاو خۆی لێ‌هاڵاندبوو. ئەگەر عەلیەشەل نەبووایە, مورتەزا قەرەداغلی ئۆغلی زۆر لەمەوبەر لە ترسان شێت ببوو و کەوتبووە کێوان. وەك سرێش پێیەوە نووسابوو, حازر نەبوو دەمەساتێکیش لێی جیا بێتەوە. کاتێك عەلیەشەلی لە پەنا نەدەبوو, دەکەوتە چۆڵ و بیابانی تاریك و تەڵەمی ترسەوە. باوەڕی بە عەلی هەبوو. ئەگەر ئەودەم کە عەلی چووە مەخفەری جەندرمەو هاواری کرد:"فریا کەون, حەمەدۆك خەریکە بچێ عەلی سەفابەگی بکوژێ", جەندرمەکان جووڵابان, ئێستا عەلی سەفابەگ زیندوو بوو. ئا...خ, ئێستا زیندوو بوو. عەلیەشەل گریا, ناڵاندی, خۆی رنی. بەڵام نەیتوانی جەندرمەکان لە جێی خۆی ببزێوێ, ئەو حەمەدۆکە فیلینتا بە دەست و ئەسپی رووت سوارەش چوو عەلی سەفابەگی کوشت.

لەبەر ئەو هۆیانە عەلیەشەل پیاوێك بوو ئازا, فیداکارو جێگای متمانە. ئەو هەموو شتێکی باش دەناسی. کێوەکان, دەشتەکان, هێلانەی درندەکان و شوێنی گیاخۆرەکان و نێو دڵی بنیادەمەکان:

"ئەمن سەد جارم گوت, مار هەتا چووکەڵەیە دەبێ سەری پان بکرێتەوە. بەڵام پان نەکرایەوەو ئێستا کۆماری گەورەی تورکیە کە لەگەڵ حەوت دەوڵەتی گەورە بەشەڕ هات و هەموویانی تەفروتونا کرد, لەسەر قامکی خۆی دەسووڕێنێ! لەسەر قامکی... ئێستا, ئەگەر ئێمە یارمەتیی سوپا نەدەین, کێوەکان گەمارۆ نەدەین و دەسبەجێ حەمەدۆك و تاقمەکەی نەگرین مەسەلەکە گەورەتر دەبێتەوە. کلکەی مەسەلەکە دەکێشێتە چیاکان و لەوێش ڕا دەگاتە سەرانسەری ئاناتۆلی. ئەودەم ئیدی پێشی ئەو قوون رووتانە ناگیرێ. ئەودەم نیشتمانێك کە مردبوو و ئێمە زیندوومان کردەوە, نیشتمانی وەك گوڵ جوانمان کە لە چنگی بۆگەنی دەوڵەتە گەورەکانمان دەرهێنایەوە, لەنێو دەچێ. ئەگەر شوێن گێرە ئازاکەمان, عەلیەشەل نەدەبوو, ئەم نیشتمانە زۆر لەمەوبەر لە دەستمان دەرچووبوو و کەللەسەری ئێمە بەسەر دارێکەوە کرابوو و دێ بە دێ دەیان گێڕا."

مورتەزاغا بەئارەق ڕشتن و بە لیچ و لێوی داچۆڕاوو لەرزۆکەوە قسەی دەکرد. خۆی دەڕنی و دەیئەڕاند. لەلای سیاسەتبازی عەریزەنووسەوە دەچووە لای قایمەقام و لە لای قایمەقامەوە دەچووە لای ئاشکەن خەلیل. ئەو لەنێو دێ و لەنێو خەڵك, بە شڵەژاوی بە دوای چارەدا دەگەڕا. سیاسەتبازی عەریزەنووس, تایپ لەبەردەست لە کاتێك دا ئاغاکان بەسەر سەریەوە وەستابوون, یەك تەکان برووسکەی دەنووسی بۆ ئەدەنەو ئەنکەرە. سەرۆکی پۆستەخانەش بە پەلەو لە پەستا برووسکەکانی بۆ ئەدەنەو ئەنکەرە لێدەدا. سیاسەتباز هەم دەقی برووسکەکانی دەنووسی و هەم دەیئەڕاند:

"تەنیا هۆردووە سەربازێك دەتوانێ باشاری بکا, لەشکرێك. ئێستا لەو توورووسە هەر بنە دڕوویەك بووەتە حەمەدۆکێك. ئەوە پێتان دەڵێم مورتەزاغای سەروەرمان هەقیەتی".

هەر جارەش کە ئەم قسانەی دووپات دەکردەوە, مورتەزاغا بە دزیەوە دە لیرەییەکی لە گیرفانی داویشت. ئەویش هەروەخت دەیدی سەروسەکوتی مورتەزاغا لەبەر دەرکی دووکانەکەی پەیدا بووە, باسی هەر شتێکی کردبایە, دەیبڕی و بە دەنگی بەرز دەیگوت:"جەنابی موبارەکی مورتەزاغا هەقیەتی. لەو توورووسە هەر بنە دڕوویەك بووەتە حەمەدۆکێك. نایەڵێن خاکی نیشتمانمان بکەوێتە بن پێی ئەو دێهاتییە کاڵەلەپێیانە. ئەو پێپەتییانە خەریکن پیاوە گەورەکانمان کە هەریەکەی بایی هەزار لیرەی زێڕن, سەر دەبڕن. بەڵام دەبێ بزانن کە سزای خۆیان وەردەگرن. تەنانەت پێش ئەوەی لەشکر لە ئەنکەرەشەوە بێ..."

سیاسەتباز هەروا شەڵاڵی ئارەق بوو, بەردەوام ئەو عەریزانەی دەنووسی و دەیدانە دەستی ئەو کەسانە کە بە ژوور سەریەوە وێستابوون, بێئەوەی کەسیش گوێیان بداتێ. ئەو, پارەی خۆی وەردەگرت و لە حاڵێك دا لە دڵەوە دوعای بۆ حەمەدۆك دەکرد پارەکەی داویشتە نێو داخڵەی مێزەکەی و دەسبەجێ دەستی دەکرد بە نووسینی عەریزەیەکی دیکە.

لەو نێوەدا هیچ کام لە ئاغاکان نەدەچوونە لای فەخرییە شێتی عەریزەنووس. فەخرییەشێت لە حاڵێك دا مۆڕەی لە سیاسەتباز دەکرد کە دوکانەکەی وەك کارخانە لە کاردا بوو, هەرچی جنێوی دەیزانی حەواڵەی ئەو و ئاغاکانی دەکرد:

"ئاغاکان لێم بوونە دوژمن. نایەنە لام. بۆچی؟ چونکە ئەمن خەجیجێ خێزانی حەمەدۆکم بە عەریزەیەك لە بەندیخانە ئازاد کرد. چونکە ئەمن عەریزە بۆ مەلا فەرهاد, ئەو پیاوە نوورانییە زیندانییە کە ناوەکەشی وەك خۆی جوانە, دەنووسم. چونکە عەریزەکانی من کار

دەکەنە سەر بەردی ڕەقیش, نەجاتی دەدەن. ئەوە کە دەڵێن مەلا فەرهاد پیاوی کوشتوە, قسەی قۆڕە... بوختان بەو پیاوە موسوڵمانە خوایی‌یە دەکەن... پیاوکوژیی حەمەدۆکیش هەر درۆیە..."

وەختێك دەی‌دی خەڵك لە پێش دوکانەکەی خڕ بوونەوە, هەستی دەکرد زۆری پێ لـێ هەڵێناوە. قسەکەی دەگۆڕی. بەڵام دیسان خۆی پێ ڕاگیر نەدەکراو هەڵدەچوو:

"ڕەنگە, ڕەنگە حەمەدۆك عەلی سەفابەگی کوشتبێ... لەوانەشە... لەوانەشە کرێکارێك کە عەلی سەفا هەقدەستەکەی خواردوە, یان دێهاتی‌یەك کە عەلی سەفا زەوی‌یەکەی لە دەست دەرهێناوە, ئەوی کوشتبێ. ئەو هەڵڵاو هەنگامەیە بۆچی‌یە؟ ئەو کەڵەکبازی‌یە یانی چی؟... بۆ تاقە زەلامێك داوای لەشکرێکیان لە ئەنکەرە کردوە. گوناح نیە بۆ تاقە زەلامێك لەشکرێکی بەو گەورەیی‌یە لە ئەنکەرەوە بێتە ئێرە...؟ هۆردوویەکی گەورە, حەمەدۆکێکی نابوتە لە کوێ بدۆزێتەوە؟ زۆر کەسان, زۆر لەو دێهاتی‌یە بەدبەختانە چارەڕەش دەکەن, زۆر کەسان..."

ڕاست لە کاتی یەکێك لەو نوتقانەدا بوو کە سەروسەکوتی مورتەزاغا لە پشت دەرکەی دوکانەکەی دەرکەوت و نەڕاندی:

"هەتیوە تووتکەسەگە, سەگی شێتی قەڵەدەکراو". ئەمجار دوو قامکی دەستی وەك دوو تیر کە لە کەوانێك دەرچووبن, بەرەو هەردوو چاوی فەخری درێژ کردن:

"ئەم دوو قامکەت لە چاوان ڕۆکەم و هەردوو چاوت دەربێنم؟"

قامکەکانی مورتەزاغا ئەوەندە خێرا گەیشتنە سەر چاوەکانی کە ئەگەر فەخری سەری نەبردبایە دواوە, هەردوو چاوی لە کالانە دەرهێنابوون:

"وست بە تووتکەسەگ". فەخری ڕەنگی وەك بەفر سپی هەڵگەڕاو گوتی:

"بەچاوان ئاغا. ئەوە وست بووم". پاشان لە حالێك دا ملی بە لاوە نابوو گوتی:

"چما چیم گوتوە" و چاوەڕێ ما.

مورتەزاغا لە حالێك دا لە ڕقان ڕەگی ملی هەستابوون, نەڕاندی:

"تووتکەسەگ, هەرچی گوتت گوێم لـێبوو... ئەو قسانەی تۆ کردتن ئەگەر فەرمانبەرێکی حکوومەت بیان بیسێتەوە لە دارت دەدەن. دەسبەجێ لە دارت دەدەن... ئەویش ڕاست لەو گۆڕەپانە. لەو دارەت دەبەستن. ئەویش بێ ماتڵ بوون. کوڕە, گوێت کەڕ بووە قسەکانی خۆت نابیسی, ها؟!"

فەخرییەشێت بە مل کەچی هەستایە سەرپێ و لە حاڵێك دا دەستی بەسنگیەوە گرتبوو, دوولا هاتەوە:

"ئەمان ئاغا, ئەمان. دەکەومە بەر پێت. ئەمان ئاغا... تۆیە... تۆیە. ئەتۆ عەریزەیەك نادەی بە من بۆت بنووسم. هەمووی سیاسەتباز... هەمووی سیاسەتباز... سیاسەتباز دەوڵەمەند بووە... لە بەیانییەوە تا ئێوارێ هەر دەنووسێ... هەمووش هەر ئەو..."

"وست بە. سەگی گرویێ, قەرزداریشمان دەکاتەوە. وست بە."

"وست بووم ئاغا. باسی ئەو حەمەدۆکە کافرەم دەکرد. دەم گوت ئەمشەو نا, سبەی شەو, مسۆگەرە. بەخۆی و سەدو یازدە کەس لە پیاوەکانیەوە لە چیاڕا دێتە خوار. دەیانەوێ شارۆچکە جوانەکەمان بسووتێنن. ئەمن ئەمەم دەگوت. ئەگەر باوەڕ ناکەی بپرسە. بپرسە ئیدی. ئەمانە هەموویان گوێیان لـێبوو".

بە چاوێکی پڕ لە پاڕانەوەوە تەماشایەکی ئەو دێهاتییانەی کرد کە لەپێش دوکانەکەی خڕ ببوونەوە:

"ئێوە قسە بکەن براینە, چما ئەمن وام نەدەگوت؟"

موڕتەزاغا بە نیگەرانی و پەرێشانی پرسی:

"چ...ی؟ ئەمەت لە کوێ زانی؟"

فەخرییەشێت لە حاڵێك دا هەناسەیەکی ڕەحەتی هەڵدەکێشا, گوتی:

"ئەمن خەبەرم هەیە, ئەویش لە جێیەکی باوەڕ پێکراوەوە."

موڕتەزاغا لە حاڵێك دا تەماشای دەوروبەری دەکرد, گوتی:

"ئێستا کەوایە... ڕاوەستە بزانم..."

سەرنجی بۆ لای پیرەپیاوێکی لادێیی ڕاکشا. بانگی کرد:

"ئەتۆ وەرە ئێرە".

دێهاتییەکە لە حاڵێك دا بە زەحمەت دڕی بە حەشیمەتەکە دەدا بۆ لای چوو:

"ئەتۆ وەرە ئێرە."

"هەر ئێستا ئەو برووسکەیە کە فەخریەفەندی دەینووسێ بەرەو بەرێی بکە بۆ ئەنکەرە. ئەگەر خوێندەوار نی, قامکی پێوە نێ."

فەخری دەسبەجێ خۆی هاویشتە سەر کورسییەکەو لە حاڵێك دا کاغەزی دەخستە نێو تاپیەکە گوتی:

"موڕتەزاغا. ئەتۆ هیچ نیگەران مەبە. برووسکەیەکی وا دەنووسم کەلە ئەنکەرە کێو و بەردو مستەفا کەمال و سوپاو جەندرمە بکەونە جموجۆڵ."

موڕتەزاغا کە نەرم ببوو, پرسی:

"دەتەوێ چ بنووسی؟"

"دەست خۆش مورتەزاغا, بەگم دەست خۆش خانی بمرێ. یانی فەخرییەشێت نازانێ دەبێ چ بنووسێ؟"

مورتەزاغا کە نەختێك تووڕەیی لە دەنگی دا دەردەکەوت پرسی

دەتەوێ چ بنووسی؟"

"دەنووسم کە حەمەدۆك چۆن بەخۆی و پیاوەکانیەوە سەر چیاکانی گرتوە... هەموو ڕێگاکان و لاڕێیەکان... نامووسی کچان و ژنانی دووگیان... پیرێژنی حەفتا ساڵە..."

"نا, سوودی نیە. هەمووی ئەوانەی باست کردن نووسراون. شتێکی دیکە. شتێکی دیکە, شتێکی دیکە... مێشکت وەکار خە."

"ئەمشەو حەمەدۆك دەیەوێ بە سێسەد سوارەوە بێ... شارۆچکەکەمان..."

مورتەزاغا بە پێکەنینەوە گوتی:

"ئێ, ئەمە شتێکە. ئێستا بوو. ئێستا دە کەسی دیکە پەیدا بکە, هەریەکەی برووسکەیەکیان بۆ بنووسە. پاشانیش بۆخۆت وەپێشیان کەوە, بیان بە تەلگراف خانە. ئێمە لەوێ حیسابمان هەیە. کاغەزەکان بدە بە بەڕێوەبەری تەلگراف خانە. وەرە ئەم پارەیەش بگرە..."

پاشان لە حاڵێك دا پارەیەکی باشی لە چنگی خۆی دا دەکوشی, لەسەری ڕۆیشت:"دەویتی قورمساخ, ئەگەر تاوێك درەنگتر هاتبام, بەو مێشکە شێتەت خۆت بە تەنافەوە کردبوو."

"بەسەرچاو ئاغا. خوا دەستت دە عومری بگری. خوا لە گەورەییت کەم نەکا." دەستی فەخری کە پارەکەی وەرگرتبوو, دەلەرزی.

مورتەزاغا خێرا دوور کەوتەوە. عەریزەنووس رووی کردە ئەوانەی لە پێش دوکانەکەی خڕ ببوونەوەو هاواری کرد:"وەرنە ژووری, ژووری... ناتوانن بڕۆن. قامك بەم برووسکانەوە نەنێن تاوانبار دەبن. تاوانەکەشی زۆر قورسە... هەمووومان تووش دەبین. هەر ئێستا بە چاوی خۆتان دیتان کە... بە چاوی خۆتان دیتان کە خەریك بوو ملمان بە پەتی سێدارەوە بێ."

دەوری پازدە کەس خەڵکی لادێ هاتن و بە زەحمەت خۆیان پەستاوتە ژووری دوکانەکە. فەخرییە شێت کاغەزی خستبووە نێو تایپەکەو تەقەتەق خەریك بوو تایپی دەکرد:

"پەژیوان بوونەوە, پەژیوان بوونەوەو ئاخرەکەی هاتنەوە لای خۆم. ئەو سیاسەتبازە چووزانێ تەلگراف چۆن دەنووسرێ, دەبێ چۆن بنووسرێ کە لە ئەنکەرە ببێتە هەنگامە. ئەگەر لە ئەنکەرە یەکێك تەلگرافی منی خوێندەوەو چاوی نەبوونە دوو گۆمی خوێن, ئەو تایپە هەڵدێنم و...

دەزگا تایبە شەق و شرەکەی هەڵێنا:

...لە بەردێکی رادەکێشم و وردوخاشی دەکەم. ئەو سیاسەتبازە چووزانێ عەریزە نووسین یانی چی؟ ئەو نازانێ کونی قوونێشی لە کوێیە. ئەگەر ئەنکەرە بەو عەریزەیە کە ئەو نووسیویەتی, تاقە جەندرمەیەك, تەنانەت تاقە جەندرمەیەکیش بنێرێ, لە پێش چاوی من ئەو جوانی و شکۆیەی نامێنێ. ئێستا راوەستێ بزانن هەر سبەینێ, تەنانەت زووتریش, سوپامان چۆن هێرش دەکاتە سەر توورڕووس".

فەخری لە حالێك دا زەردەخەنەی لەسەر لێوان بوو, خەریکی نووسین بوو. لەمێژ بوو دەیزانی عەریزەکانی لەلای کاربەدەستە پایەبەرزەکان کار دەکەن و هەر بۆیە شانازیی پێوە دەکردن و ئێستاش دەیەویست هەرچەندی بکرێ خەلکی پەیدا بکا. پەنجەمۆر وەربگرێ و تەلگراف بەرێ بکا. سوپاس بۆ خوا لەنێو دێ چ زۆر بوو خەڵك. لەلایەك زۆر بە وردی برووسکەکانی دەنووسی و لەلای دیکەوە هێندێك کەسی تازەی پەیدا دەکرد هەتا جێی ئەوانە کە کاریان تەواو ببوو, پڕ بکەنەوە. فەخرییەفەندی بەو دەستوورە هەتا ئێوارێ هەر نووسی و نووسی. ئەگەر مورتەزاغا نەهاتباو نەیگوتبا:

"بەسە فەخرییەفەندی, بەسە براله. بەسە ئیدی. داری سوالێت وەدەستی دام. خوا دەزانێ بەو پارەیەی لە برووسکەکانی تۆم داوە, دەم توانی دێیەك بکڕم. بەسە فەخرییەفەندی, بەسە..." و پێشی پێ نەگرتبا, ئەو هەتا بەیانی تەلگرافی دەنووسین.

فەخرییەفەندی بە قسەکانی مورتەزاغا زۆر قەلس بوو. لە دڵی خۆی دا گوتی ئەوانە هەموو بێسفەتن, چاکەی کەسیان لە چاودا نیە... سەری هەڵبڕی و بە چاوی سوور هەڵگەڕاوەوە, وەك سەگی تڕۆکراو تەماشای کردو بە دەنگێکیماندووەوە گوتی:

"ئەگەر هەموو قازییەکانی ئەدەنەو ئەنکەرەو ئەستەمبووڵ کۆ ببنەوە ناتوانن ئەو تەلگرافانەی من بنووسن. ئەمن بۆ ئەو تەلگرافانە لە گیان و دڵ و جەرگم مایەم داناوە."

ئەمەی گوت و بە تووڕەییەوە رووی لێ وەرگێڕا.

مورتەزاغا لە قسەکەی خۆی پەژیوان بووەوەو بە پێکەنینەوە گوتی:

"زۆر باشە. زۆر باشە فەخرییەفەندی. هاوڕێ, کوڕە, ئەتۆ بۆ هێندە دڵناسکی...؟"

پاشان بە نیشانەی دڵدانەوە شەقەزلەیەکی لێڕاکێشاو گوتی:

"براکەم دڵی نەیەشابێ؟"

"بەرێ وەڵڵا دڵم ئێشاوە. چونکە شارەزای کاری خۆمم. چونکە قەڵەمی من قەڵەمی..."

پاش نەختێك راوەستان لەسەری رۆیشت:

"... خواردنەوە, خواردنەوە ئێمەی بڕیەوە."

لێوی هەڵچنین. نێوچاوانی تێك ناو فرمێسك لە چاوانی دا قەتیس ما:

"ئا...خ سەرخۆشی..."

"ئەی بابە. وادیارە پیاو ناتوانێ گاڵتەشت لەگەڵ بکا. دەزانی هاوڕێ. هەتا ئێستا تەلگرافەکانت لە ئەنکەرە عەرزو عاسمانیان پڕ کردوە. ئێستا هەرکام لەو تەلگرافە جوانانەی تۆ لەسەر بەردی دابنێن کونی دەکا. هەرکامێکیان دڵی بنیادەم وەجۆش دێنێ. لە ئەنکەرە قیامەتیان بەرپا کردوە. دەستت نەرزێ. بژی. هەر خۆش بی... بەیانییش پێش خۆرهەڵات دەبێ بێی و دووبارە کاری دڵسۆزانەی خۆت دەست پێ بکەیەوە. هەرچەندی دەتوانی بنووسە. ئەتۆ فەخرییەفەندیی. گەورەترین, گەورەترین عەریزەنووسی ئەم شارۆچکەیەی, عەریزەی تۆ پۆڵای کون دەکا. هەتا دەتوانی بنووسە. ئەوەندە بنووسە... ئەوەندە بنووسە هەتا حەمەدۆکی داوێنە سەر پشتی کەرێك و دەیهێننە شارۆچکەکەمان... پاشانیش بە گاڵتەی من دڵت نەیەشێ, ئاخر پیاو دڵی لە مورتەزاغای خۆی دێشێ؟!..."

فەخرییەشێت کەیفی ساز بوو. گوتی:

"نا دڵم نەیەشاوە. جا چۆن لە قسەی تۆ عاجز دەبم؟ مورتەزا ئەفەندی قەرەداغلی ئۆغلی, ئەمن لە هیچ شتێك عێجز نابم. ئەمن دڵم لە تۆ بێشێ؟ لە سەروەری خۆم, وەلی نیعمەتی خۆم, دڵم لە سوڵتانی ئاغاکان بێشێ؟! ئەگەر غەکی تۆم لە چاوان دا نەبێ خوا ئەو دوو چاوانەم دەرتۆقێنێ و بیان خاتە سەر لەپی دەستم... ئەو عەریزانەی نووسیومن نایاب بوون. زۆر چاك بوو. لەسایەی سەری تۆوە, لە سایەی گوڵی روخسارتەوە, عەریزەکانی من بوونە سەرمەشقی عەریزەنووسەکانی دیکە. هەرکەس بیان خوێنێتەوە لە سەیران زمانی رەق دەبێ... لە راستی دا دەبێ بڵێم ئەوانە ئەتۆ نووسیوتن. واتە ئەتۆ بوویە هۆی نووسینیان. چما پیاو دەتوانێ دڵی لە سوڵتانی هەموو ئاغاکان بێشێ؟"

هەڵستا. دەستی راستی هێنایە پێش و وەك ئەوەی خەریکی وتار خوێندنەوە بێ, هاواری کرد:

"ئەمشەو, ئەمشەو چاوەڕوانی عەریزەی من بە. شەوان بەیانیی کاکۆڵ زێڕینیان لە زگ دایەو عەریزەی کاکۆڵ زێڕین... ئەمن ئەمشەو وەستایانەترین و جوانترین عەریزەکانی ژیانی خۆم دەدۆزمەوەو بە کەلك وەرگرتن لە نووسراوەی گەورەترین مامۆستایانی عەریزەنووس, عەریزەی وا دەنووسم بە ئەقڵی کەس دا نەهاتبێ و هەرکەس بیخوێنێتەوە سەری سوڕ بمێنێ... حەمەدۆکی

خوێنخۆر دەگرن و تەرمی ئەو خوێنخۆرە لە حاڵێك دا هەزاران مێشەکەرە لە کالانەی چاوە گەش و رەشەکانی نیشتوە، داوێنە سەر پشتی کەرێکی گرویێ، ئەویش کەرە گرویێەکی بێکورتان و دەیهێننە شارۆچکە. پاشان تەرمی کەوڵکراوی بەنێو شەست و حەوت گوندی کووزان و قەدیرلی و دێهاتی ناوچەی نەدەنەو بەنێو ئەنکەرەو ئەستەمبووڵ دا دەگێرن و ئەمجار کەرەکە لەبەر دەرکی مەجلیسی گەورەی میللەت دەبەستنەوەو بە چەقۆی تیژی قەسابان جوان جوان کەوڵی دەکەن."

فەخرییەفەندی کاتێك ئەم قسانەی دەکرد، چاوەکانی کە بریسکەیان تێدا دەدرەوشایەوە، بڕیبوونە چاوی مورتەزاغاو چاوەڕوانی لە مل دان و ئافەرینی وی بوو. مورتەزاغاش بە نێوچاوانێکی خەفەتاوی و بە گاڵتە پێ هاتنەوە گوێی بۆ قسەکانی رادەگرت و جارجار بە حاڵو باڵ سەری بۆ رادەوەشاند. وەختێك فەخرییەفەندی کەوتە هەناسەبڕکەو لە جێی خۆی دانیشتەوە، مورتەزاغا هەستی کرد دەبێ قسەیەك بکا:

"بەڵێ هەقتە، دنیایەکت هەقە. ئیشەڵڵا چۆنی گوتت وا دەبێ و حەمەدۆکیکەوڵ دەکەن هەتا ئی دیکەی پێوە تەمبێ بن."

"بەڵێ. دەبێتە پەند بۆ ئی دیکەش."

دووبارە بە ماندوویی و هەناسەبڕکەوە دانیشتەوەو پاشان لە حاڵێك دا بەداخەوە سەری رادەوەشاند گوتی:

"ئاخ، ئاخ ئا...خ. ئەمن دەبوو ئەمە رۆژگارم بێ؟ دەبوو هەروا بە عەریزەنووسی بێنمەوە...؟ ئەی چەرخی چەپگەڕ، یاخوا کوێر بی. ماڵت خەرابێ ئەی فەلەك... بەڵات لێدا مەستی و بێدراوی... نەحلەت لە بابی بێپارەیی کە سەرچاوەی هەموو چارەڕەشییەکە، بە..."

"چارەنووس وابوو فەخرییەفەندی. چ بکەین، چارەنووس... بنیادەم هەرچی بڵێی لە دەستی دێ براڵە. بزانە هەتیوە دێهاتییەکی پێپەتی کە کەوڵی پووڵەڕەشکەیەك ناهێنێ، چۆن لە چاوترووکانێك دا، قارەمانی ئازای شەڕی نیشتمانی دەکوژێ. پاشانیش لێدەداو دەچێتە کێو و بەندەنان و شەمامە خاڵ خاڵمان بۆ دەڵێ."

مورتەزاغا لە کاتێك دا بە راوێژێکی دڵسۆزانەو پڕ لە خۆشەویستی ئەم قسانەی دەکردن، لەسەرەخۆو بە لاواندنەوە دەستی لە پشتێ فەخری دەدا:

"شارۆچکەکەمان چاکەی تۆی لەبیر ناچێ، قەرەبووی دەکاتەوە. ئەوەندە بەسە کە ئەتۆ خۆتی بۆ ماندوو بکەی. لەبیریشت نەچێ ئەو گوللەبارانە بەرەو ئەنکەرە درێژە پێبدەی."

فەخرییەفەندی نەڕاندی:

"درێژەی دەدەم... درێژەی دەدەم... درێژەی دەدەم. ئەویش بە هاوەنێك کە کێوان لەبن هەڵکەنێ... ئەنکەرەی ئاگر تێبەردەدەم."

"ئەدی براله. دنیایە ئاگر تێبەردە. ئاگری دە. ئاگری دە. ژیانی من و تۆ، نیشتمانەکەمان و ژیانی هەموو خەڵك، ژیانی تۆپی زەوی و هەموو بوونەوەرەکان کەوتوەتە مەترسییەکی گەورەوە."

قەرەداغڵی ئۆغلی پاش ئەوەی هێندێك پارەی بۆ راداشت، هێدی هێدی وەڕێ کەوت بۆ سەر پردێ. دێهاتییەکان کە چاویان پێ دەکەوت، بە حورمەتی وی وەك خەبەردار رادەوەستان و خۆیان دەخزاندە قوژبنێك و رادەوەستان تا تێپەڕێ. ئەویش خۆی قەپ دەکردو سنگی ڕەپێش دەکردو ملی هەڵدێناو بە فیزو دەمارەوە سڵاوی دێهاتییەکانی دەستاندەوەو دەڕۆیشت.

لەسەر پردێ چەند لەحزەیەك لە ئاوەکەوە ڕاما کە هەتا دوور دیار بوو دەڕۆیشت. بە دیتنی پۆلە ماسیی چالاك و سرك لەنێو ئاوەکەدا، خۆشحاڵ بوو. لە دڵی خۆی دا گوتی:

"ئێستاش چاوم وەك سەردەمی لاوەتی دەبینن، زۆر باشە."

ئەمجار سمێڵەکانیی باداو بە خۆشحاڵییەوە ماوەیەکی دیکەش سەیری ئەو ئاوەی کرد کە بە بنەوەدا دەڕۆیشت. بیری لە لای حەمەدۆك بوو. بۆچی ئەوەندە دوژمنی ئەو منداڵە بوو یانی ئەوەندەی لێدەترسا؟ لە منداڵێکی بێ کەس و کار کە هەتیویش بووەو وەك باسی دەکەن زۆریش ریوەڵەیە. منداڵێك کە تەنانەت خوێندەواریش نەبوو، چیی لە دەست دەهات؟

"ئەگەر ئاگر بێ و لە جێیەك بەربێ، هەر بە قەد جەستەی خۆی دەسووتێنێ. بەڵێ دەسووتێنێ. بەڵام خەڵکی هەموو دێهاتی کێوپارەی لایەنی دەگرن. داخوا عەلی سەفاش هەر بۆیە الفاتحە مع الصلوات؟! ئەگەر هەموو خەڵکی وایوای پشتیوانییان لێنەکردو نەیان شاردەوە ئەی کێ بوو؟ ئەی کێ هانی دا عەلی سەفای بکوژێ؟ چما حەمەدۆك چ قەرزێکی لەسەر عەلی سەفا هەبوو؟ هەروا لە هیچ و خۆڕا کابرای کوشت؟ کەوابێ ئەو دوژمنی توخمی ئاغایە. کەوابوو ئەو بە خوێنی هەرچی پیاوی باش و شەریفی چوکووراوایە تینوویە. رەنگە بە خوێنی منیش." بە بیرکردنەوە لەو مەبەستە هەموو گیانی مورتەزاغا لەرزی.

"وادیار بوو حەمەدۆك بە خوێنی منیش تینوو بووە. ئەو لادێییە پێپەتییانە بەخوێنی هەموومان تینوو بوون. ئەگەر حەمەدۆك مانگێکی دیکە لەو چیایە بمێنێ؟! نا ناکرێ، نابێ. دێهاتییەکان فێر دەبن. فێر دەبن دوژمنایەتیمان بکەن. وەختێکیش دێهاتییەکان فێر بوون وەرە گوێت لە بڕەم بڕەمیان بێ. ئەودەم لە چوکووراوا چ ماڵێك وێران ناکرێ. چ وەجاخێك کوێر

ناکرێتەوە. ئەگەر نۆرە بگاتە دەستی ئەو دێهاتی‌یانە، ئەو خەڵکە دووڕووە، هەر لە هەوا کەوڵمان دەکەن. تەنگاو کردنی ئەنکەرە، کارێکی راستە، پێویستە. ئەوەندەمان گوت مار هەتا چووکەڵەیە دەبێ سەری پان بکرێتەوە، مووممان لە زمانی هات. گوتمان فریا کەون. حەمەدۆك بووەتە رێبەری دێهاتی‌یەکان. کەس باوەڕی نەکرد. گوتمان بۆ خاتری خوا نیشتمان خەریکە لە دەست بچێ، بەڵام کوا گوێی بیستن؟ گوتیان ئەو بستە منداڵێکەو لەبیر خۆیان بردەوە. ئێستا فەرموون ئەوە بستە منداڵەکەتان! ئەوەتا لێی دا عەلی سەفای کوشت. زۆران دەکوژێ..."

ئەم جار کوژرانی خۆیشی هێنایە بەرچاوی خۆی. ئەو هەتیمچە بێ ئەسڵ و نەسەبە، ئەو جانەوەرە کە بۆنی ئینسانەتیی بۆ نەچووە، گوللە راست لە بنی چاوی قوربانی‌یەکانی دەدا. دەڵێن عەبدی‌خانی بەستەزمانیشی هەر بەو دەستوورە کوشتوە. ئەویش پاش ئەوەی ناچاری کرد سێ سەعاتی لەبەر بپاڕێتەوە. عەبدی‌خانی ناچار کرد بەری پێ‌یانی ماچ بکات، بەری پێ‌یانی بلێسێتەوە. ئەویش پاش ئەوەی ناچاری کرد وەك مار لەسەر زەوی بخزێ.

عەلی سەفابەگ لەبەری پاڕابووەوە. گوتبووی:"حەمەدۆك... زەوی‌یەکانم، ماڵ و ملکم، هەرچی هەمەو نیمە بۆ تۆ. لە گیانم خۆش بە..." زۆر گریا، زۆری شیوەن و فغان کرد، لەبەری پاڕایەوە، لەبەر پێ‌یانی لەسەر زەوی خزی، بەری کاڵەکانیی لستەوە، بەری ئەو کاڵە چەپەڵانەی... کەچی هەر مێشێکیشی میوان نەبوو. پاش ئەوەی لە ئێوارێ وە تا لای بەیانی ناچاری کرد بپاڕێتەوە، راست لە وەختی کازیوە ئەنگوتن دا گوتی:"باش تەماشای هەتاو کەوتن بکە. چونکە ئیدی نای‌بینیەوە. پاشانیش لوولەی تفەنگەکەی لەسەر چاوی داناو دەستی لێ‌کێشا. کەللە سەری عەلی سەفا ببووە هەزار کوت، گۆشت و ئێسکی عەلی سەفا بە دارو دیوارەوە نووسابوو. ئەگەر ئەنکەرە ئەم بەسەرهاتەی پێ بگاتەوە، دەی‌کاتە قیامەت و تێ‌دەگا کە نیشتمان خەریکە لە دەست بچێ. بەو برووسکانە کە لادێی‌یەکان دەیان نێرن هیچ شتێك چار ناکرێ. بناخەی حکوومەت خەریکە لەق دەبێ. ئێستا حەمەدۆکێکمان هەیە، سبەینێ دەبێتە دوو، دووسبەی دەبێتە سێ... پاشانیش سەد، دووسەد، سێ‌سەد، هەزار... دووهەزار، سێ‌هەزار... ئێستا فەرموو وەری گرە!... هەر دێهاتی‌یەك دەبێتە حەمەدۆکێك.

بەدەم ئەم بیرانەوە لە پردەکە چووە خوار. بە ترس و رقێکی بێزلێ‌کراوەوە چاوی لەو دێهاتی‌یانە کرد کە لە دەوروبەری بوون و گوتی:

"خوا نینۆکتان نەداتێ خۆی پێ بخورێنن." بە غاردان خۆی گەیاندە ماڵی تاشکەن خەلیل. حەوشەی ماڵەکە بە گیای خۆرسك داپۆشرابوو. زۆر خۆشحاڵ بوو. وادیار بوو هێشتا کاربەدەستە پایەبەرزەکان نەڕۆیشتبوون. زۆری قسەی کاریگەر هەبوون پێیان بڵێ. ماوەیەك لەمەوبەر تاشکەن خەلیل گوتبووی:

"مورتەزاغا ئەتۆ زۆر قسە مەکە". با وا بلێ. زۆرمان قسە نەکرد. زۆریش بەرێ و جێ قسەمان کرد. بە چی دەچێ. عەلی سەفا کوژرا. زۆر کەس بەو گوللەیە کە ئەو جانەوەرە لە چاویان دەدا دەکوژرێن.

مورتەزاغا لە کاتێك دا دارزەیتوونەکەی دەرکی ماڵێی نیشانی عەلی دەدا, گوتی:

"ئەتۆ لێرە چاوەڕوان بە."

کەمێك بە پارێز, لە کاتێك دا دڵەکوتەیەکی توندی گرتبوو, لە پلیکانەکانی خانوویەرەی تاشکەن خەلیل وەسەر کەوت. تاشکەن خەلیل لە نێوەڕاستی ساڵۆنێك کە لە سەرەوەی پلیکانەکان بوو, پێشوازیی لە مورتەزاغا کرد:

"دەخیل, دەستم بە داوێنت مورتەزا. عارف صائم بەگ, جێگری پارێزگارو سەرهەنگی جەندرمە, هەتا بۆخۆیان باس نەکەن, ئەتۆ باسی حەمەدۆکیان لەلا مەکە. دەستم بە داوێنت. عارف صائم بەگ لە دوێنێ ئێوارێ وە وەك هەوری بەهار دەگرمێنێ و دەبارێنێ. وەك شێتانی لێ هاتوە. هەموو دەڵێن ئەگەر ئەنکەرە پێ بزانێ ئاگر لە چوکووراوا بەر دەدا. دەستم بە داوێنت مورتەزا. دەستم بە داوێنت, ئارام بە."

مورتەزاغا نێوچاوانی تێك ناو گوتی:

"با وابێ, زۆر باشە. ئەدی حەمەدۆك چیی لێ دێ؟"

"عارف صائم بەگ بۆخۆی وەشوێن مەسەلەکە کەوتوە. ئەو ئیدی کاری کراوە. ئەمڕۆ نەبێ, سبەینێ... ئەتۆ لەو بارەیەوە خاترجەم بە. چیاکان پڕ لە جەندرمەن..."

مورتەزاغا گوتی:

"دەترسم خەلیل. ئەمن زۆریش دەترسم. چما ئەو جارەی عەبدیخانیشی کوشت نەیان گوت ئەو هەتیوە کاری تەواوە؟"

تاشکەن خەلیل گوتی:

"ئەم جارەیان ئیدی تەواوە."

چوونە ژووری میوانان. مورتەزاغا پێش ئەوەی دوگمەی چاکەتەکەی داخاو ئیکلام بکێشێ, غاری دایە لای عارف صائم بەگ و دەستی گرتن. ئەگەر بەگ خێرا دەستی نەکێشابایەوە دواوە, ماچی دەکردن. مورتەزا پاشان دەستی جێگری قایمەقام, دەستی سەرهەنگ و بە دوای یەك دا دەستی چەند کەسی نەناسیاوو هەروەها دەستی دوو نەقیبی جەندرمەی گوشی. ئەمجار چووە قوژبنێکی هۆڵەکەو لەسەر نیوتەختێك کە لەبەر پەنجەرەیەکی گەورە بوو, دانیشت.

نیوتەختەکە رووپۆشێکی هومایلی سپیی بە سوورگوڵدۆزیکراوی لەسەر بوو. لە هۆڵەکەدا چەند قەنەفەیەکی دارگوێزی نەخشاویان دانابوون. بەڵام مورتەزاغا نەیدەتوانی لەسەر قەنەفەیەکی گەورەی وەك ئەوە کە نوێنەری مەجلیسی لەسەر دانیشتبوو, دابنیشێ. ئەمە چەشنە بێحورمەتییەك بوو.

روخساری عارف صائم بەگ تووڕەیی پێوە دیار بوو. لە بەرامبەر خۆیەوە رامابوو و قسەی نەدەکرد. هەتا ئەو قسەی نەکردبایە, ئەوانی دیکەش زمانیان نەدەگەڕا. لەو کاتەدا مە لادۆران ئەفەندی, بە دوای وی دا روشدی بەگی بازپورس و بە دوای ویش دا فەخری بەگی کووزان تۆغلی و زولفۆی تاپۆچی هاتن. عارف صائم بەگ هەمیەتی وە هیچیان نەدا. بە سەری قامکان دەستی ئەوانەی دەگرت کە تۆقەیان لەگەڵ دەکردو بەرەڵای دەکردەوە. بەڵام هەر کە چاوی بە زولفۆی تاپۆچی کەوت هەستا. دەستی کردە ملی و بە زەدەخەنەوە گوتی:

"لە کوێی براله زولفۆ. لەمێژ بوو لێت بێخەبەر بووم. خێزانیشم نارەحەت بوو. هەر دەیپرسی زولفۆ لەکوێیە. ئەرێ بەڕاست لە کوێ بووی؟".

زولفۆ لە کاتێك دا دەیگوت:"باشم بەگ, زۆر باشم..." لەسەر قەنەفەیەکی دارگوێز کە گوڵی گەورەی لێهەڵکەندرابوون و عارف صائم بەگ نیشانی دابوو, دانیشت و لاقی لەسەر لاقی دانا:

"... باشە, ئەتۆ چۆنی بەگ, برای بەڕێز. وەزعمان لێرە باشە. جگە لە خەمی تۆ نارەحەتییەکم نیە. زکرو فکرم تۆی برای خۆشەویست. سڵاوی من بەخزمەت خێزانی بەڕێزت بگەیەنە. دەستە پیرۆزەکانی ماچ دەکەم. ئەو دار هەنارانەی لەگەڵ بەڕێزتان ناشتبوومانن گەورە بوون. هەناری سووریان گرتوون بە قەد سەری بنیادەم. ئەوەندەیان بەر گرتوە کە لکەکانیان رایناگرن. کەڵەژم وەبەر داون. ئەم رۆژانە سەوەیەکی گەورەی هەنار بۆ دەنێرم کە دڵی نەیە یەکێکیان لێبشکێنێ. خێزانی بەڕێزتان لە پێش خۆیان دادەنێ و تەنیا تەماشایان دەکا. هەنارەکان وەك گڕی ئاگر سوورن. تەنانەت شەبەقی ئێوارانیش بە قەد وان سوور نیە. بەڕاست کاکە ئەو هەنجیرانەی بۆ خانمم ناردبوون پێی گەیشتن؟".

عارف صائم بەگ دەم بە پێکەنین و خۆشحاڵ گوتی:

"گەیشتن. ئەی خوایە... لە ژیانم دا هەنجیری وام نەدیبوون. برادەرێکم کە نوێنەری "ئایدین"ە, هاتبووە ماڵێ. وەختێك هەنجیرەکانی دی, زاری پێ داپچڕاو گوتی:"نە لە ئایدین و نە لە ئەزمیر هەنجیری وام نەدیوە". کاکە نازانی چەند خۆشحاڵ بووم. خێزانیشم لە خۆشییان

هەر هێندە بوو باڵی نەدەگرت. خێزانم ئەم زولفۆیەی وەك برایەك خۆش دەوێ. برا چییە؟! بڵێ وەك کوڕی خۆی، وەك دایکیی، وەك بابی. بەڵێ کاکە... بێینەوە سەر هەنجیرەکان. هەریەکەی ـ مستی پێکەوە ناو نیشانی دا ـ تا ئەوەندە... ئاوا گەورە... زۆر ببوورە، لە قوونی هەرکامێکیان، ببوورە لە قوونێ هەر کامێکیان چۆڕ چۆڕ هەنگوین هەڵدەڕژا. زۆر دەبووری لە قوونێ ئەو هەنجیرە بریقەدارو کارەبایی‌یانە دلۆپ دلۆپ هەنگوین هەڵدەڕژا. هەر دلۆپێکی وەك دەنکی کارەبا.

بەڵێ، ئەم زولفۆ قوماربازە هەنجیری وا ڕەنێو دێنێ. هەنارەکانیشی دەبێ ببینن، هەنارێك کە فەڕانسەیی و ئەڵمانی و ئینگلیزی‌یان نەیان توانیوە شتی وا ڕەنێو بێنن."

زولفۆی تاپۆچیش قسەکەی بۆ تەواو کرد:

"ئیتالیایی‌یەکانیش..."

دۆستایەتی و برادەرایەتیی زولفۆ لەگەڵ عارف صائم بەگ زۆر کۆن بوو. زولفۆ هەرچەند دەفتەرداری شارۆچکەیەکی چووکەڵە بوو، بەڵام پیاوێکی زیرەك و بەهۆش بوو. لە کاتی خۆی دا بەقەدەر قایمەقامێك و نوێنەرێکی مەجلیس کاری لە دەست دەهات. لەگەڵ "یەکیەتی خوازەکان" هاوکار ببوو. پاشان لە وەختی گیرانی چوکووراوادا لەگەڵ سەربازانی فەڕانسە هاتبووە ئەدەنە. دەکرێ بڵێین وەك بەردەستێك کەوتە خزمەتی فەڕانسەیی‌یەکان. لەو ڕۆژانەدا بوو کە لەگەڵ عارف صائم بەگ کە فەرماندەری جەندرمەی شارەدێ‌یەکی چووکەڵە بوو یەکتریان ناسی و ئەو یەکترناسینە قووڵ بووەوە تا گەیشتە ڕادەی پێوەندیی برایانە. لە سەرانسەری چوکووراوا زولفۆ یەکەم کەس بوو کە بیستی فەڕانسەیی‌یەکان بە نیازی پاشەکشەن. دەسبەجێ عارف صائم بەگی هاوڕێی کە هاوکاریی لەگەڵ دەکرد، لە مەسەلەکە تێگەیاند. لە کووزان سێ شەوو ڕۆژان بە تەنیا پێکەوە قسەیان کرد ، بێ ئەوەی لەو ماوەیەدا بخەون یان دەم لە زەوادی بدەن، تەگبیرو ڕاوێژیان کردو بە دوای ئەوەدا چوونە پاڵ "هێزی نیشتمانی". چونکە ماوەیەکی زۆر لە ژێر دەستی فەڕانسەیی‌یەکان دا خزمەتیان کردبوو، چوونیان بۆ پاڵ هێزی نیشتمانی بە هاسانی سەری نەگرت. بەڵام زولفۆ کە شەیتانی دەرس دادەدا، هەموو گیروگرفتێکی پێ چارەسەر دەکرا. ئەوان سەرەنجام شان بە شانی هێزی نیشتمانی کەوتنە شەڕی سەربەخۆیی.

بەڵام زولفۆ هیچی لە دەوڵەت نەویست. تەنیا داوای کرد کە بیکەنەوە دەفتەرداری شارە چووکەڵەکەی جاران. ئەو بە وەستایەتی و کارامەیی کارناسێك ئەو زەوی‌یانەی کە هەر بستێکیان خوێنی گیانبازێك بوو لەنێو ئەو خەباتگێڕانەدا کە دژی داگیرکەرانی تووڕووس بەشەڕ هاتبوون و لە سەرووی

هەمووشیانەوە عاف صائم بەگ بوو, دابەش کرد. گەورەترین بەهرەی ئەم خوێن بایی‌یەش بە عارف صائم بەگ و دۆستە خۆشەویستەکەی, زولفۆ برا. پاش تەواو بوونی شەڕی رزگاریخوازی و دامەزرانی حکوومەتی تازە لەلایەن ئەتا تورکەوە, قارەمانانی شەڕ وەك کارگ لە زەوی هەڵتۆقین. بە ئەندازەی تەواوی ئەو کەسانە کە لە سەرانسەری ماوەی شەڕ دا لە تووڕووس شەڕیان کردبوو و بگرە دە هێندەی وانیش. زولفۆ ئەم جاریش بە هاواری عارف صائم بەگ و حکوومەتی ساوا گەیشت بە یارمەتیی زەینی تیژی خۆی توانی ریزی ئەوانەی شەڕیان کردبوو و ئەوانەی لە سەربازی رایان کردبوو, لێك جیا بکاتەوە. بەڵێ! زولفۆ هونەرێکی هەبوو کە دەسبەجێ دەیزانی و لێکی دەکردەوە کێ شەڕی کردوەو کێ بە درۆ ئەو ئیددیعایە دەکا. ئەگەر زولفۆ بیویستایە, تا ئێستا دەبوو بە نوێنەری مەجلیس. پاشانیش دەگەیشتە وەزارەت. بەڵام زولفۆ هیچ وازی لەو کارانە نەبوو. ئەو دەفتەرداریی شارۆچکەیەکی چووکەڵەی پێنسەد کەسیی لە تەواوی ئەو شانازی‌یانە پێ باشتر بوو. ئەو کەسێك بوو کە سەرەڕای داواو پاڕانەوەی عارف صائم بەگ, تەنانەت نەچوو میداڵی سەربەخۆییش وەربگرێ. ئەو میداڵە عارف صائم بەگ بۆخۆی بۆی لە فەرماندەری گشتی وەرگرتبوو. زولفۆ تەنیا نەخۆشی‌یەکی هەبوو. ئەویش زەوی بوو. دەیەویست لەو خاکە بە پیتانەدا, باشترین میوەو جوانترین گوڵی دنیا ڕەنێو بێنێ. بە نیاز بوو لە لۆکە چاندنیش دا شۆڕشێك بەرپا بکا. لەم بارەیەوە بەڵێنی دابوو و بێگومان لە دەستیشی دەهات. ئەو عارف صائم بەگەش بە پێچەوانەی ئەوە کە خەڵك بیریان لێ‌دەکردەوە, هیچی لە باران دا نەبوو. غیرەتی نەبوو ئەو هەنجیرانە کە زولفۆ ناردبوونی, ئەو هەنجیرانە کە:"...زۆر ببوورن دڵۆپ دڵۆپ هەنگوینی وەك کارەبایان لە قوونێ هەڵدەڕژاو ئەوەندە روون بوو کە ئەگەر کەسێك تەماشای ئەو هەنگوینەی کردبایە کە بە قوونی هەنجیرەکانەوە بوو, زۆر ببوورن وێنەی خۆی تێدا دەدی." بداتە دەستی مستەفا کەمال پاشا. خوا بۆخۆی ئاگادارە کە زولفۆ ئەو هەنجیرانەی هەر بۆ خۆشیرن کردن و بە تەمای شتێك بۆ پاشا نەناردبوو. بۆیەی ناردبوون تا بەو هۆیەوە بە پاشا بڵێ کە لە وڵاتی خۆمان دا ئەو جۆرە میوە بەهەشتی‌یانە ڕەنێو دێن. بۆیەی ناردبوون تا سەرپەرست و سەرکردەی ئەم میللەتە دڵخۆش بکا.

"ترێم ناشتوە کاکینە. چ ترێ‌یەك! یەك بە یەك پێوەندم کردوون. لە ئیسپانیاوە ئەمامە نارنجم هێناون. لیمۆم لێ موتوربە کردوون. پێوەندی لیمۆو پرتەقاڵ کارێکە پێویستیی بە ئەزموون هەیە. متمانەم بە خۆم نەکرد. لە دورگەی رۆدیسەوە وەستای پێوەند کردنم هێنا. پاشانیش عەرزی ئاغای خۆم بکەم دارهەنارم پێوەند کردن.

ئا...خ عارف صائم بەگ ئا...خ, ئاخ براله, ئەو هەنجیرانەت دەگەیاندە دەستی پاشا, ئەگەر پاشا لە هەنجیری وەك هەنگوینی چوکووراوای دەچاشت, یان ئەو هەنجیرانەی کە... زۆر

ببوورن له فلانه جێیان دڵۆپه هەنگوینی وەك کارەبا هەڵدەڕژێن, لانی کەم چاو پێ دەکەوت, لەوانەبوو سەرپەرستی ئەم گەل و نیشتمانه خۆشحاڵ بێ."

عارف صائم بەگ پاش ئەوەی داردەسته دەسك زێڕەکەی خۆی سێ جار له زەوی راکێشا, گوتی:

"پاشا له دەرفەتێکی لەبار دا هەنجیرەکانی تۆ دەبینێ..."

زۆر به دڵنیاییەوە قسەی دەکرد. زولفۆ لەو بارەیەوە زۆر خۆشحاڵ بوو و هەستی به بەختیاری دەکرد:

"لەوانەشه رۆژێك پاشای بێنمه باغ و مەزراکەت. پاشا وەختێك پیاوی وا زرینگ دەبینێ و دەیان ناسێ, زۆر کەیف دەکاو له خۆشییان چاوی پڕ دەبن له فرمێسك, جا ئەگەر ئەو پیاوە زرینگانه ئەو هاوالانەی بن که شان به شانی وی شەڕیان کردوە, له خۆشییان هەر باڵ دەگرێ... ئەتۆش دەناسێ."

پێکەنی. زگی هەڵدەبەزیەوەو لەگەڵ هەڵبەزینەوەی زگی, داردەسته دەسك زێڕەکەشی دەجوولا. پاشان خۆی قەپ کرد. نێوچاوانی تێك ناو چەند دەقیقەیەك له لووتکەی سوولەمیشەوە که له پەنجەرەوە دیار بوو, ڕاما. مورتەزا قەرەداغلی ئۆغلی بەو حالەت گۆڕینەی خۆشحاڵ بوو. بیری کردەوە: ئێستا دەگاته کوژرانی عەلی سەفابەگ و باسی حەمەدۆك دێنێته گۆڕێ. به بێسەبری چاوەڕوانی قسەکردنی عارف صائم بەگ بوو. ئەگەر ئەو مەسەلەکەی هێنابایه گۆڕێ, باسی مەسەلەکه بۆ ئەمیش جێی خۆی بوو:

"زولفۆی ئەحلەتییش دەڵێی مێشێکی لێ میوان نیه, باسی حەمەدۆك ناکا. هەتیوە دەویته! جارێکیش بڵێ (حەمەدۆك). چ دەقەومێ ئەگەر ئەو زمانه سەگباب خێوەت بکەیەوەو بڵێی گوللەیان راست لەنێوبەندی چاوی عەلی سەفابەگ داو له خوێنی سووری خۆی دا گەوزاندیان!؟

له رقان شێت ببوو, دڵی دڵیی دەخوارد. ددانی له چیرەوە دەبردن و هەناسەی له سنگی دا رادەگرت و پاشان هەناسەی دەدا:

"زولفۆ! هەتیوە دوو هەزار رووە. نەم دەزانی لەگەڵ بەگ ئەوەندە یەکی, ئەگینا وەك تووتی دەم گرتی و ناچارم دەکردی هەرچی بەلای حەمەدۆك بەسەر ئەو میللەته بەستەزمانەی هێناوە لەبەری کەی و پاشان له حوزووری وی وەك ئێستا, راست وەك بلبل هەمووی بگێڕیەوە. ئاخ, خوا بکا یەکێك لەمانه ناوی عەلی سەفابەگی له زاری دەرچێ... ئەودەم بزانه مورتەزاغا قەرەداغلی ئۆغلی دەڵێ چی و چ هەڵدەڕێژێ. قسەی وا به هاوڕێی گیانیی فەرماندەری گشتی دەڵێ که کەیفی پێ بکەی."

عارف صائم بەگ چاوی لەو لووتکە کێوە وەرگێڕا کە تێیەوە رامابوو. هاتەوە نێو خەڵکەکەو پاش ئەوەی چەند لەحزەیەك بە ماتی و بێمەبەست چاوی بە دەوروبەری خۆی دا گێڕا, بە وەزعێکەوە وەك ئەوە کە لە نەکاو شتێکی بیر کەوتبێتەوە سەری داردەستەکەی بستێك لە زەوی هەڵبڕی و گوتی:

"زولفۆ خۆت ئامادە کە. خۆت بۆ بەهاری دادێ ئامادە بکە. دەمەوێ بە سەرۆکایەتیی کۆڕێك بت نێرمە ئورووپا. دەچی؟."

زولفۆ بە پێکەنینەوە گوتی:

"جا ئەوە قسەیە, دەچی؟ دەچی یانی چی؟ لە خوام دەوێ..."

"ئێستا کەوایە, خۆت سازکە."

"ئەمن سازم."

"ئەم میللەتە پاداشی هەموو قارەمانانی شەڕی دایەوە, یەکێك نەبێ, قارەمانێکی خۆیەکەم گر بەشی خۆی لەو پاداشە وەرنەگرت. ئەویش برای لە گیان خۆشەویست تر, برای میهرەبانم زولفۆیە. ئەوەی کە لە ئەنجومەنی دەوڵەت دا دیبووتان, ئەم پیاوەیە. دەفتەرداری شارۆچکەیە. راست ئەم زاتە. ئەگەر بمانەوێ بیکەینە بەڕێوەبەری گشتیی تاپۆ, بیکەینە وەزیری کشت و کاڵ, بە قبووڵ کردنی ئەم کارانە خۆی چووك ناکاتەوە. ئەم زولفۆی لە گیان خۆشەویست ترەم دەڵێم. پاشا هەروەخت دەم بینێ, دەپرسێ زولفۆت نەدیوە؟ زولفۆ لەکوێیە. زولفۆ دەڵێ چی...؟ حەزرەتی پاشا, ئەم نەجات دەرەی نیشتمان, ئەم پیاوە مەزنە, ئەگەر ئەم هەنجیرانە کە... زۆر ببوورن, لە قوونێ هەر کامێکیان وەك کارەبا هەنگوین دەڕژێ, ببینێ, شێت دەبێ, کاروبارەکەی بەجێ دێڵێ و راستەڕێ دێتە چوکووراوا."

قەرەداغلی ئۆغلی لەبەر خۆیەوە بۆڵاندی:

"با بێ چوکووراوا ببینێ. بێتە نێو ئەو درووەڵانە کە زولفۆی گەوواد پێی دەڵێ باخی پرتەقاڵ, گوللەی حەمەدۆکی لە نێوەڕاستی گلێنەی هەردوو چاوان بدرێ. راوەستە لێی بدرێ با ئەقڵی بێتەوە بەر خۆی, عارف صائم بەگی سەگباب, سەگبابی دورزی. دووڕووی سەد جار لە زولفۆ دووڕووتر. راوەستە یەکتر دەبینینەوە, راوەستە. ئەگەر شەش مانگی دیکە نەهات و هێرشی نەکردە سەر ئەنکەرە, ئەوە حەمەدۆك پێپەتیەکی قوون ڕووت زیاتر نیە. ئەگەر لە نێوانی هەردوو برۆیانتی نەدا, لەنێوەڕاستی هەردوو چاوانت! نا, دەبێ راست لەنێو هەردوو برۆیانت بدا هەتا تێبگەی کێ تۆی کوشت."

"بەڵێ, پاشامان زۆری حەز لەو جۆرە شتانەیە. لە دوورت یۆڵ باخێکی پرتەقاڵی هەیە بە دەستی خۆی چەقاندوویە. زۆر ئۆگری زەوی‌یە. هەتا ئێستا هەزار دۆنمی زەوی کڕیوە. بۆخۆی زەویی بۆ چیە؟ ئەمەی هەر بۆیە کردوە هەتا خەڵکی دیکە چاوی لـێ‌کەن. ئێمەش بۆ ئەوەی ڕێگای ئەومان ڕەچاو کردبێ زەوی دەکڕین."

پاشان ئاوڕی دایەوە لای زولفۆ و بە میهرەبانی‌یەوە زەردەیەکی کرد:

"ئەتۆ دیسانیش زەوی دەکڕی؟"

"دەکرێ نەکڕم بەگ؟ دیارە دەکڕم. ئەمن لە پێش چاوی خەڵکی چوکووراوا نموونەیەکی زیندووی پەیڕەوی لە پاشام... ئەمن دەبێ بە دروست کردنی باخی پرتەقاڵ و هەنارو هەنجیر ببمە نموونەیەك بۆ ئەو پەیڕەوی‌یە کە... دەبێ پەمۆجارێك وەڕێ بخەم کە ئورووپایی‌یەکان سەریان لێی سوور بمێنێ. خوا تۆمان بۆ ڕاوەستاو کا. خوا سێبەری تۆمان لەسەر کەم نەکا."

"سوپاست دەکەم زولفۆ. ئێستا با تۆ بنێرمە ئورووپا کە زانیاریت پتر ببێ لەوێ وەرەوە جا..."

"بەگ لە سایەی سەری زاتی مەبارەکتەوە زۆر شت فێر دەبم... زۆر شت, زۆر زۆر. بەگم! دەزانی چ دەکەم؟"

"چ دەکەی زولفۆ؟"

"بەگ... باشت گوێ لـێ‌بێ, پاشانیش کە باشت گوێ لە قسەکانم بوو, نەڵێی شێت بووە."

"نا بابە, ئەمە چ قسەیەکە؟"

"خەڵکی شارۆچکەی هەموو بە من دەڵێن شێتە."

" با ئەوان وا بڵێن. ئەمن وا ناڵێم."

"ئێستا ئەمن... دەزانی چی؟ ئەمن ئێستا هەموو پارەکەم دەدەم بە نەمامە زەیتوون. بە دێهاتی‌یەکان دەڵێم لە چیای ڕا نەمامە زەیتوونم بۆ بێنن. هەمووان لێرە دەچەقێنمەوە. سەری تۆ سلامەت چوکووراوا دەبێتە باخە زەیتوونێکی گەورە. دەزانی چەند نەمامە زەیتوونم چەقاندوە؟ زۆر... زۆریشیان گووراون..."

"چەندیان؟"

"سێ هەزاریان."

"ئەمڕۆ کۆمارەکەمان ئەم جۆرە داهێنانەی پێویستە. ئەتۆ هەرچی ویستت لە پاشای داوا بکە. لە بارەی تۆوە "نا" لە مەزەبی دا نیە".

"دەزانم بەگم. لێرە زۆر قسەی بێمانا هەڵدەبەستن. دەڵێن ئەم کارەی بۆ خاتری نیشتمان ناکا, مەبەستی هەر زەوی کڕینە."

عارف صائم بەگ پاش پێکەنینێکی درێژ کە زگی لەگەڵ هەڵدەبەزیەوە, گوتی:

"ئەی بۆ خاتری خوا, ئەتۆ چ پێویستیت بەم فێڵ و تەڵەکانە هەیە...؟! هەموو چوکووراوا بۆخۆت. ئەتۆ هەروەخت پێت خۆش بێ, دەتوانی چەندی دڵت حەز بکا مەزرات هەبێ. ئەو جەنابانە ئەو مەسەلەیە نازانن؟ ئێمە بووین کە ئەم نیشتمانەمان نەجات دا. نازانن کە هەر نەبێ ئەوەندەمان هەق هەیە لەم مەملەکەتە مەزرایەکمان هەبێ. گوێ مەدە ئەم قسانە. کاری خۆت بکە. هەرچەندی بتەوێ دەتوانی زەوی بکڕی. لە هەر شوێنێك کە پێت باش بوو... کەس ناتوانێ قسە بکا. خەڵکی ئەم شارۆچکەیە ئەمەی نازانن؟ هەر کەس ڕەخنەیەك بگرێ خائین بە نیشتمانە. ئیعدامی دەکەم و دەڵێم لە داری دەن. چما ئەمانە نازانن ئەتۆ کێی؟ چما ئەتۆ خۆت نازانی کێی؟!"

"دەزانم بەگ!".

مورتەزاغا لەوبەرەوە لەسەر نیوتەختێك خەریك بوو لە رقان بتەقێ. بە چاوو برۆو دەست و لاق داوای لە تاشکەن خەلیل و مەلا دۆران و ئەوانی دیکە دەکرد کە باسی حەمەدۆك بێننە گۆڕێ, ئەوانیش وەك پەیکەری بەرد, بەوپەڕی خۆیەکەم گرتنەوە گوێیان دەدایە قسەکانی زولفۆو بە چاوی داپچڕاوەوە تەماشای عارف صائم بەگیان دەکرد. مورتەزاغا لە ناخی دڵەوە هەناسەی هەڵدەکێشاو لە دڵی خۆی دا هەرچی جنێو بوو بە عارف صائم بەگ و ئەوانی دیکەی دەدا. لەحزەیەك لە رقان دەگەیشتە سنووری تەقین, پاشان ئەو هیوایەی بۆ پەیدا دەبوو کە بەڵکوو یەکێك لە حازریان لەبارەی عەلی سەفابەگ و حەمەدۆکەوە سەری قسە بکاتەوە, بۆیە دیسان چاوەڕێ دەما. بەڵام حازریان دەت گوت مێشێکیشیان لێ میوان نیە. ئەوان جارجار بە قینەوە تەماشای مورتەزاغایان دەکردو چاویان لێ مۆڕ دەکردەوە. لە دڵی خۆیان دا دەیان گوت: ئەو کابرایە لە پێش چاوی بەگ ئابڕوومان دەبا. لەو بارەیەوە ترسیان ڕێ دەنیشت.

کەمێك دوای نیوەڕۆیە چەند مێزیان هێنان. لە نێوەڕاستی سالۆنەکەدا پێکیانەوە نووساندن و سفرەیەکی هومایلی سپیان لەسەر ڕاخست کە گوڵی گەورەی نارنجیی لەسەر چنرابوون. بتڵە راکی و شەڕابیان لە سەتڵی پڕ لە بەفردا هێنان و کەبابی تەندوور, دۆ, پڵاوو زۆر جۆرە کەبابی دیکە حازر کران. تەنانەت لەنێو باخی بەرخێکیان بە ساغی بە شیشەوە کردبوو. لە مەدبەقێکی خوارەوە لێشاوی خواردنی جۆراوجۆر بۆ سەر مێزەکە وەڕێ کەوتبوو. عارف صائم

بەگ راکیی دەخواردەوەو هەر خواردنێکی دەیان هێنا لێی دەچەشت و بە دەم جوینەوە لە گژ فکران ڕادەچوو. ئەگەر لەو وەختانەدا نەختێك نێوچاوانی تێك نابایە, دەسبەجێ دەوریەیە مسە سپیکراوەکەیان لە پێش هەڵدەگرت و دەفرێکی دیکەیان بۆ دادەنا. ڕێوڕەسمی نیوڕۆژخواردن ڕاست هەتا ئێوارێی کێشا.

عارف صائم بەگ کەبابی بەرخ بەشێوەی چەتەکانی, واتە بەو جۆرە کە بەرخەکە بە ساغی لە شیش بدرێ, زۆر پێ خۆش بوو:

"ها! تاشکەن ئاغا. ئەودەم کە لە چیاکانی تووڕووس دا لەگەڵ دوژمن بەشەڕ دەهاتین ئەم جۆرە کەبابەت بۆ دروست نەدەکردین؟"

تاشکەن کە نوقمی خۆشحاڵی بوو, پێکەنی و گوتی:

"بۆخۆت پێم بڵێ, لە جێ دا ئەودەم دەرفەتی نان خواردنمان هەبوو؟"

عارف صائم بەگ بە پێکەنینەوە گوتی:

"ڕاست دەکەی, ڕاست دەکەی. بە تەواوی هەقتە."

موڕتەزاغا ئاگری گرتبوو:"ئەم گەووادانە بە جۆرێك لە چیاکانی تووڕووس و کەلێن و کونەکانی دا لەگەڵ دوژمن بەشەڕ هاتن کە دەرەتانی نان خواردنیشیان نەبوو. ئێستا هەقی خۆی نیە بڵێم (...)ی هەموو عالەمێ خوای بە (...)ی ژنی هەرچی پیاوی درۆزنە؟".

لە کاتێك دا لە بنەوە, جنێوی بە حازریان دەدا, بە ڕوانینێکی پڕ لە ماناوە لە چاوی یەك بە یەکیانەوە ڕادەما. ئەوانیش بە تەواوی بە بوونی موڕتەزاغا لە مەجلیس دا, قەڵس بوون. جارێکیان موڕتەزاغا لە حاڵێك دا هەروا دەستی بە بەرزگیەوە گرێ دابوون, بێ ئەوەی پشت ڕاست بکاتەوە لە جێی خۆی هەستاو چووە لای زولفۆ. داهاتەوەو بە گوێی دا چپاند:

"کوڕە, زولفۆ! کوڕە... وەجاخت کوێر بێتەوە کوڕە. سەگی سەگباب... ئێستا وەختی باسی باخە زەیتوونە؟ میللەت ئاسوودەیی لـێ هەڵگیراوە! حەمەدۆکیش تووشی هەرکەس بێ, ڕاست لە گلێنەی چاوەکانی دەدا. کێوو بەندەن پڕ بوون لەو ڕێگرانە کە گوللە بە گلێنەی چاوی خەڵکەوە دەنێن. دەستم بە داوێنت زولفۆ. کوڕم کوشتووی و خۆم لە ماڵێ هاویشتووی. دەستم بە داوێنت. ئەمە چ وەزعێکە؟ بە بەگ بڵێ فەوجێك, لیوایەك, لەشکرێك بنێرێتە کێو و بەندەنان. دێهاتیەکان خەریکن یاغی دەبن."

زولفۆ نێوچاوانی گرژ کردو گوتی:

"ئارام بە کابرا. خوا بکا بەگ گوێی لە قسەکانت نەبووبێ."

بەگ لە پەنجەرەوە دەیڕوانیە دەرێ. پاش ئەوەی لایەکی بەرخی برژیوی ڕەوانەی جەهەننەمی ورگی کردبوو, لەسەرەخۆ خەریك بوو قامکی دەلستنەوە. وەختێك لستنەوەی قامکەکانی تەواو بوو, پیاڵەی ڕاکیەکەی وەرگرت و لە حاڵێك دا چاوی لەسەر یەك دانابوون بە ئیشتیاوە خواردیەوە.

مورتەزا ناڵاندی:"دەڕۆم زولفۆ. بەڵام ئەتۆش لەبیرت نەچێ. ئەوە پێم گوتی."

مورتەزاغا سالۆنەکەی بەجێ هێشت. بەڵام لە پشت دەرگای سالۆن گوێی هەڵخست. عارف صائم بەگ لە پشت دەرگاکەوە ئەوی دەدی. ئەویش لە حاڵێك دا قیروسیای لێکردبوو, بە دەست و بە چاو زولفۆی بانگ دەکردە نیزیك دەرگاو هەوڵی دەدا بە ئیشارەت حاڵیی بکا کە قسەیەکی گرنگی هەیە پێی بڵێ. بەڵام زولفۆ نەدەچوو. نێوچاوانی تێك دەناو بە دەست ڕاوەشاندن دەری دەکرد. کێشەی بێدەنگی ئەم دووانە درێژەی کێشا. سەرەنجام مورتەزا ئیشارەتێکی وای کرد کە زولفۆ نەیتوانی لە جێی خۆی دانیشێ. ڕاست بووەوە. هاتە نیزیك دەرگای سالۆن و لە کاتێك دا ددانی لە چیرەوە دەبردن, وەك مار وشاندی و گوتی: "چیت دەوێ سەگبابی کەللە وشك. ئێمە لە هیچ جێیەك نابێ لە دەستی تۆ ئاسوودە بین؟! بڵێ بزانم چیت لە من دەوێ؟"

مورتەزا لە کاتێك دا چاوی لێ مۆڕ دەکردەوە, گوتی:

"زولفۆ, براله... ئەتۆ ئاگات لێنیە... ئێمەش بە مردوو حیسابین. ئەمڕۆ نۆرەی عەلی سەفابەگە, سبەینێ نۆرەی منە, دووسبەش نۆرەی تۆیە. حەمەدۆك چیاکانی توورووسی گرتوە. چیا خەریکە ڕادەپەڕێ. ئەگەر سەری مارەکە تا جووچکەیە پان نەکەیەوە حەمەدۆکێك دەبێتە دوو. دوو حەمەدۆك دەبن بە چوار. چوار حەمەدۆك دەبن بە... پشت ئەو کێوانە حەشیمەتێکی زۆری لێیە. ئەو ئاناتولیە پان و بەرینە خەڵکی زۆر لێیە, حەشیمەتی زۆرە. دەستم بە داوێنت. نابێ بیخەیە پشت گوێ. دەرفەت لە کیس مەدە. ئەمان... هەر ئێستا بە بەگ بڵێ... پیس قەوماوە. بڵێ ئەمڕۆ وەزعی مەمانان شپرزەیە... شەش مانگی دیکەش وەزعی وان شپرزە دەبێ... ئەگەر حەمەدۆك هەتا شەش مانگی دیکە پاڵی بە دەروازەی ئەنکەرەوە نەدا, هەرچی پێم دەڵێی بڵێ..."

زولفۆ لە کاتێك دا بە دەست زاری وی پێکەوە دەنا, گوتی:

"وســ...س! بەگ گوێی لەم قسانە بێ, دەڵێ لە دارت بدەن. حەمەدۆك سەگی کێیە کە پاڵ وە دەروازەی ئەنکەرە بدا؟ بێدەنگ بە. کەس ئەم قسانەت لێ نەبیسێ. وســ...س!"

"ئێمە فاتیحەمان خوێندراوە."

"هیچ کەس هیچی لێنایە. تکات لێدەکەم بێدەنگ بە."

مورِتەزاغا نووزاندی, پاڕایەوە, بەری پێی زولفۆی ماچ کرد. بەڵام سوودی نەبوو. کابرا هەر پێی پێدەکەنی. سەرەنجام مورِتەزاغا گوتی:

"باشە, کەسێك کە بۆخۆی دەکەوێ نابێ بگری."

لە پلیکانەکان چووە خوارو بە غاردان ئەوێی بەجێ هێشت. عەلیەشەل لەبن دارزەیتوونەکە چاوەڕێی بوو. بۆ لای ماڵی عەلی سەفابەگ وەڕێ کەوتن. حەوشە, سالۆن, بەرهەیوان و هۆدەکانی ماڵی عەلی سەفا پڕاو پڕ لەو میوانانە بوون کە لە دوورەوە هاتبوون.

مورِتەزاغا بە سەرسوڕماوی گوتی:

"ئەو هەموو حەشیمەتە! ئەو هەموو حەشیمەتە! چەندی دۆست و برادەر هەبوون! ئۆۆ...ۆی."

مورِتەزاغا نەختێك راوەستاو لە گژ فکران ڕاچوو:

"ئەگەر عەلی سەفا بە مردنی خوای مردبایە, ئەو هەموو حەشیمەتە بۆ بەرِێ کردنی تەرمەکەی کۆ دەبوونەوە؟"

"نا ئاغا, کۆ نەدەبوونەوە."

"بەڵێ عەلی. کۆ نەدەبوونەوە. کۆ نەدەبوونەوە. باشە عەلی. ئەتۆ ئاقڵترین پیاوی ئەم جیهانەی. گیان و ماڵم بە فیدای تۆ... دەمەوێ شتێکت لێبپرسم, دەبێ بێترس و گومان وەڵامم بدەیەوە."

"باشە ئاغا."

"ئەگەر لە جیاتی حەمەدۆك کەسێکی دیکە عەلی سەفای کوشتبایە, دیسان ئەو هەموو حەشیمەتە دەهاتنە دیتنی تەرمەکەی؟"

"بەڵێ... نەدەهاتن. یەك لە سەدی ئەو حەشیمەتەش نەدەهات, لە سایەی سەری حەمەدۆکەوە, عەلی سەفا وەك پاشای ئێران بە خاك دەسپێردرێ."

لە راستی دەرگای حەوشەرا گەڕانەوە.

"عەلی... زۆری بۆن کردوە!"

"بەڵێ, بۆنی کردوە."

"بۆنەکەی بە مێشکی سەرمەوە نووسا!"

عەلی گوتی:

"ئەمنیش هەروا!"

"عەلی."

"فەرموو ئاغا."

"تێگوشینی بە هیوای جیرانان هەر وشکە. دەزانی چیان بە مام گورگ گوت؟"

ئەمەی گوت و چاوەکانی وەك خەدەنگ لە چاوی عەلی‌یەوە بڕین.

"گوتیان ملت بۆ هێندە ئەستوورە. مەبەستت ئەمە نیە ئاغا؟"

"گورگیش وەرگەڕایەوەو گوتی: چونکە کاری خۆم بۆخۆم دەکەم... عەلی! ئێمەش دەبێ بۆخۆمان کاری خۆمان بکەین. نە لە ئەنکەرەو نە لە جەندرمە نانێکمان پێ نابڕێ."

عەلی گوتی:

"راستە, پێمان نابڕێ."

"حەمەدۆك ئەم جار کێ دەکوژێ؟"

"کێ دەکوژێ ئاغا؟ دیارە... تۆ."

"بریا هێندەم خۆ لە کاری حەمەدۆك وەرنەدایایە."

عەلی بەدەم هەناسە هەڵکێشانەوە بۆی سەلماند:

"بریا خۆت تێ وەرنەدابایە."

"هەر بۆیە دەبێ ئێمە کارێك بکەین کە حەمەدۆکی بکوژن."

"بەڵێ بی‌کوژن."

"لەم شەو بەدواوە نابێ لە ماڵێ وەمێنین. هەر شەوەی لە جێیەك. حەمەدۆك تۆش دەکوژێ."

"پاش تۆ نۆرەی منە."

"بە چی دەزانی؟"

"دەزانم. حەمەدۆکی ناڵێی؟ بەڵای رۆژگارە."

"دەزانم بەڵایە."

"ئەو هەموو شتێك دەبینێ و دەزانێ. تەنانەت ئێستا کە ئێمە قسان دەکەین دەی‌بینێ و دەی‌بیسێ. ئەو لە هەموو جێیەك چاوو گوێی هەن. ئەو هەموو شتێکی لێ روونە. تەنانەت خەبەری ئەو مەلەی بە ئاسمان دا دەفڕێ و ئەو مێرووەی لەسەر زەوی دەڕوا, بە کورتی هەرچی لەم دنیایەدا روو بدا پێی دەگەیەننەوە. ئەگەر لەو دیو ئەم کێوەوە بڕوانێ, چاوەکانی کێوەکە دەقەڵێشن و هەرچی لەم دیویەوە بێ دەی‌بینێ."

"یانی ئێستا ئەم قسانەی ئێمەی گوێ لێیە؟"

" جا ئەمە قسەیە گوێی لێبووە؟! دیارە گوێی لێبووە... شتێك نیە ئەو نەیبیسێ. گەڵای دارەکان چاوی وین. ئەو ئاوانەی دێنە خوار, گیا سەوزەکان, ئەو بارانەی دەبارێ, ئەو بایەی هەڵی دەکا, هەموویان گوێی وین."

"چاوورِاوە, دەنگۆیە, ئەگینا کارمان تەواوە."

"کارمان تەواوە ئاغا. ئێمە مردووین... بەڵام کەس بۆمان ناگری."

"چاوورِاوە, دەنگۆیە... بەڵام بە راستی دایکی زەمانەش رۆڵەی وای نەدیوە."

"نا, نەیدیوە."

"گوتت ئەو هەموو شتێك دەبینێ و دەبیسێ. باشە, ئەگەر بچینە جێیەکی داپۆشراوو بە ئیشارەتی چاوو برۆیانیش قسە بکەین, دیسان ئەو دەیبیسێ؟"

"بەخوا ئاغا ئەمەیان نازانم."

"چاوورِاوە, دەنگۆیە."

"دەنگۆیە ئاغا."

لە شارۆچکە دەرکەوتبوون و بەرەو "قابە سەقز" دەچوون. ماوەیەکی زۆر بێئەوەی قسەیەك بکەن, رۆیشتن. نێوچاوانی مورتەزاغا گرژ ببوو و لە کاتێك دا نوقمی بیرو خەیاڵ بوو, جار جار رادەوەستاو لە سەرتاپای عەلیەوە ـ کە سێ هەنگاو لە پشتیەوە دەرۆیشت ـ رادەما. هێندێك جار بە سەرسورِمانەوەو جاروباریش بە چاوی سووکایەتی تەماشای دەکرد. عەلییش بێئەوەی بتوانێ سەر لە بیرو خەیاڵی وی دەرکا, بیری لە حەمەدۆك دەکردەوە.

داخوا توانیویەتی راکاو نەجاتی بێ و بە ساغی بگاتە جێی خۆی؟ داخوا جەندرمەکان کوشتوویانە؟ بەدیلیان گرتوە؟ یان پەنای بردوەتە بەر کونێك و بێ کەس و کارو برسی و تینوو ماوەتەوە؟

راستییەکەی ئەوەیە عەلی زۆر نیگەران بوو. چیاو بەندەن پڕ لە جەندرمە بوون. جگە لەوە, حەمەدۆکیش جێو رێیەکی نەبوو کە بتوانێ خۆی تێدا حەشار بدا. منداڵێکی بێئەزموون بوو. هێندێك جار لەوە کە لەگەڵی نەچووبوو, هەستی بە پەژیوانی دەکردو جاری واش بوو لەو مەسەلەیە خۆشحاڵ بوو. چونکە لەمەودوا لەشارو لە پەنای مورتەزاغاوە دەیتوانی کۆمەگ بە حەمەدۆك بکاو لەزۆر بەڵایان نەجاتی بدا. بەڵام هەرچۆنێك بێ رۆژگارێکی زۆر تووش بوو. ئەگەر حەمەدۆك توانیبای ئەم رۆژە تووشانە تێپەرِێنێ, ئەوی دیکەی شتێك نەبوو. ئیشەڵڵا چووەتە لای چادرنشینەکان. ئەوان لەبەر دڵی کەریم ئۆغڵی ئەویان خۆش دەوێ. وێ دەچێ نەیدەنە دەستی جەندرمەکان. کێ دەزانێ؟ پیاو سەر لە کاری بنیادەم دەرناکا. لەوانەیە وەك گلێنەی چاو بیپارێزن و لەوانەشە دەسبەجێ بیگرن

و بێدەنە دەستی جەندرمە. ژانێکی بێهێدی بوون و پەژیوانییەکی بێبڕانەوەی لە دڵی خۆی دا هەست پێ دەکرد. بۆچی لەگەڵی وە کێوان نەکەوت... ئەگەر پێکەوە بایەن، کێ دەیتوانی لەو شاخە بەرزو گەردنکێشانەدا بیان گرێ؟ لەو چیا شینانەدا، قوولکەیەك نەبوو، کونێك نەبوو و نەشکەوتێك نەبوو کە ئەو پێی نەزانێ و کەس نەبوو ئەو نەیناسێ...

هێندەی نەمابوو، عەلی مورتەزاغای ـ کە قیت لە پێشی راوەستابوو و لە تەپڵی سەریەوە هەتا بەری پێی تەماشای دەکرد ـ پان و پلچ بکاتەوە. ئاغا رێك چاوی دە چاویەوە بڕیبوو و بە رقەوە تەماشای دەکرد. نەڕاندی:

"قسە بکە عەلییەشەل. دەبێ راستەکەیم پێ بلێی کە..."

عەلی دڵی داخورپا. داخوا مورتەزاغا هەموو شتێکی زانیوە؟ زانیویەتی و هەتا ئێستا وەك پشیلەیەك کە گاڵتە بە مشك دەکا سەری خستۆتە سەر وی؟ دیار بوو ئەو هەر بەم شێوەیە دەیکوشت و ئەمیش هەرگیز روخساری حەمەدۆکی نەدەدیتەوە؟ عەلی دەمانچەی پێ نەبوو. ئای بۆ خەنجەرێکی چووکەڵە. ئای بۆ چەقۆیەك. دەبوو تەردەستی بکا. لەوانەبوو بتوانێ هەر کە مورتەزاغا دەمانچەکەی هەڵکێشا، لە دەستی دەربێنێ ، بیکوژێ. بەم جۆرە دەکرا بلێی حەمەدۆك لە راستی دا ئاغایەکی دیکەشی کوشتوە.

عەلییەشەل کە وەك گۆچان کۆم ببووەوە گوتی:

"فەرموو ئاغا، ئەتۆ بپرسە ئەمن یەك بە یەك پێت دەڵێم."

لە راوێژی دا پاڕانەوە دیار بوو.

"بڵێ بزانم ئەتۆ بۆ ئەوەندە دوژمنی حەمەدۆکی؟"

شەلە کە بە هیچ جۆر چاوەڕوانی پرسیارێکی وا نەبوو، لەگەڵ ئەوەی خۆشحاڵ بوو تێك چوو، شڵەژا، بەڵام دەسبەجێ هاتەوە سەرخۆی:

"بڕوانە ئاغای... بڕوانە ئاغامان. بڕوانە ئاغای ئازاو دلێر. بە قوربانی چاوە ڕەشەکانت بم. یانی ئەتۆ نازانی ئەمن دوژمنی حەمەدۆکم؟"

"نا، نازانم."

"ئێستا کەوایە، بزانە. عەبدیخان ئەو ئاغا باشە کە قەبرەکەی پڕ بێ لە نوور، بابی فەقیرو هەژاران، ئەو جوامێرە دڵ پڕ لە ئینسانەتییە، ئەو تاقانەی رۆژگارە، ئەو ئاغا پیاو چاك رەوشتە، ئاغای کێ بوو؟ گلێنەی چاوی کێ بوو؟ دەزانی؟ ئاغای من... ئاغای من. ئەوەی کوشتی کێ بوو؟ کەسێك کە چوار کتێب، چوار کتێب و چوار مەزەب، کوشتنی بە واجب دەزانن دەزانی کێیە؟ حەمەدۆك... بەسە؟"

مورتەزاغا کە سەری هەڵبڕیبوو و لەنێوی چاوانیەوە رامابوو, گوتی:
"نەخەیر, بەس نیە."
"بەس نیە کە نان بڕاوی کردم. پشت و پەنای خۆم و ژن و منداڵمی کوشت. بەس نیە؟"
مورتەزاغا بە پێکەنینەوە گوتی:
"با, بەسە."
"چەند ساڵە ترسی مردن لە دڵم دا هێلانەی کردوە. خوا ئەو ترسە لە دڵی دوژمنیشت ناوێ. لەم دنیایەدا یەك شت لە هەموو شتێك خراپترە. لە مردنیش زۆردارترە. ئەویش ترسی مردنە. ئەمن لە ترسی مەرگ مردم و خەلاس بووم. مردم... عەبدیخان, ئاغای خۆشەویستیشم, زۆر پێش مردن, لە ترسی مەرگ مردبوو و لەدەست چووبوو."
"ئێستا کەوایە ئێمەش دەبێ پێش ئەوەی وەك عەبدیخان و عەلی سەفابەگمان لـێبێ, مشووری حەمەدۆك بخۆین. ئەتۆ لەمەولا برای منی. کوڕی منی. بیلبیلەی چاوی منی. کەوایە ئەو چەند ساڵە ئەتۆ لەگیانەڵادا بووی؟"
"لە ترسان, مردووم و ئێستاش هەر دەمرم."
"ئەمنیش هەروا."
"ژیان لەم جیهانەدا بۆ مەمانان حەرامە.؟"
عەلیپەشەل دووپاتی کردەوە:
"حەرامە."
گەڕانەوەو لەسەرەخۆ بەرەو شار وەڕێ کەوتن. هەتاو بە تەواوی شۆڕ ببووەوەو سێبەرەکان درێژ ببوون. لە شووشە پەنجەرەی خانووەکانی شارۆچکەوە لافاوی تیشك و روناکی وەڕێ کەوتبوو. ماڵەکان و تەپۆلکەکان کەوتبوونە نێو خەرمانەیەکی رووناکی.
"عەلی."
راوێژی دەنگی پڕ لە سۆز بوو.
"فەرموو ئاغا."
"عەلی. ئەتۆ ئەم شوێن هەڵگرتنە لە کوێ فێر بووی؟"
"لە هیچ کەس ئاغا."
"ئەتۆ بە شوێن گێڕی لەدایك بووی؟"
"نا... بەڵام دەکرێ بڵێین شتێکی وا بوو."

"شتێکی وا بوو یانی چی؟ یان بە شوێن گێڕی لە دایك بووی, یان نا..."

"هەم بەڵێ, هەم نەخەیر!"

"باشە... ئەم هونەرە لە کوێ فێر بووی؟"

"بە چاو لێ‌کردن."

"لە هەموو شتێك پتر تەماشای چیت کردوە؟"

" لە هەموو شتێك زیاتر لە شوێنەکان ورد بوومەوە."

"لە شوێنەکان دا چیت دیوە؟"

"شوێنەکان وەك خاوەنیان دەچن. ئەگەر تەماشای شوێنی ئەسپێك بکەم, بە کەمێك ئەم لاو ئەولا دەتوانم بزانم چ جۆر ئەسپێکە. بە کەمێك زیادوکەم دەتوانم پێت بڵێم. بڵێم کلك و یاڵی چۆنن. ملی چۆنە. ئێستا دەگەینە شوێنی ئادەمیزاد... لە شوێنی بنیادەمەوە کتێبی دڵی دەخوێنمەوە. دەزانم بۆ کام لا چووە. بیری لە چی کردوەتەوەو چۆنی بیر کردوەتەوەو ڕۆیشتوە. خۆشحاڵ بووە, تووڕە بووە, دڵئێشاو بووە, خەفەتبار بووە, دڵی پڕ بووە؟ هەمووی دەزانم, ئەگەر شادو بەدەماخیش بووبێ دیسان دەزانم. دۆست بووە یان دوژمن, ئەمەش دەزانم."

"چاووڕاو دەکەی."

"چاووڕاو نیە ئاغا."

"ئێستا کەوایە, بڕوانە شوێنی من و بزانە بیر لە چی دەکەمەوە."

عەلی دەسبەجێ کشایەوە دواوە. ئەمجار داهاتەوەو لە حاڵێك دا تەماشای شوێنەکەی دەکرد, هەتا بەستێنی خڕەکە هاتە پێش.

"ئێستا گوێت لە من بێ ئاغا... جارێ پێش هەموو شتێك لە من بە گومانی, زیاتر لە حەمەدۆك لە من دەترسێی, ڕاستە؟"

"ڕاستە..."

"پاشان هەتا زیاتر ڕۆیشتووی ترسەکەت ڕەویوە. ئیدی نە لە حەمەدۆك دەترسی نە لەمن. دڵێکت هەیە ئاغا... بە تەنیا دەتوانی بە گژ دنیادا بچی. پاشان دووبارە ترسێك دات دەگرێ کە ڕزگاربوونت لێی نیە. لەنێو خەڵك دا, یەکێك سووکایەتیت پێ دەکا. ئەتۆ ددان بە جەرگی خۆت دا دەگری و دەنگ ناکەی پاشانیش لەبەری دەپاڕێیەوە. ئەودەم لە داخان وەك شێتانت لێ‌دێ و دەتەقیەوە. ئەمجار دڵت بەرامبەر بەو کەسەی لەگەڵتە, نەرم دەبێ. ئەویش دەبێ من بم. دڵت پاك دەبێتەوە. شك و گومانت نامێنێ. وەك برایەك ئۆگری دەبی..."

عەلی‌یەشەل لە نەکاو ڕەق ڕاما. چاوی لە شوێنی پەنای چڵە دڕوویەکەوە بڕی کە گوڵێکی زەردی پێوە بوو. ڕەنگی وەك زەردەچێوەی لـێ هات. تفی لە زاری دا وشك ببوو و بە زەحمەت قسەی بۆ دەکرا. دەت گوت قسەکان لە دەمی دا پینە دەکرێن:

"لەم شوێن پێ‌یەدا نووسراوە کە من دەکوژی."

هەستا, بە پاڕانەوەوە لە چاوی مورتەزاغاوە ڕاماو پرسی:

"ئاغا, بۆ دەتەوێ بم کوژی؟ چما چ خەراپەیەکی تۆم کردوە؟"

مورتەزاغا شڵەژاو خێرا دەستی بە قسان کرد:

"پەنا بەخوا. ڕاستە... ڕاستە. لێت دەترسم. تەنانەت هەر ئێستا. ئەمن لە حەمەدۆك ناترسێم. بەڵام لەو شتانەی لە بنی چاوی تۆ دان تۆقیوم. ڕاستە, دەبێ تۆ بکوژم."

عەلی‌یەشەل لە کاتێك دا ملی بەلاوە دەنا, گوتی:

"ئێستا کەوایە, ئەمن دەڕۆم ئاغا. تێدەگەم, بنیادەم دەکرێ لە یەکێك بترسێ... بەڵام ئاخر لە منیش دەترسێ؟"

"بەڵێ بنیادەم لە تۆ دەترسێ... دەترسێ. جا چۆن ترسانێکیش... ئێستا جێ‌پێ‌یەکانی دیکەش تەماشا کە... دەبینی کە لە کوشتنت پەژیوان بوومەوە..."

عەلی بە دیتنی شوێن پێ‌یەکانی دیکە خۆشحاڵ بوو گوتی:

"ئا... وا!"

بە میهرەبانی‌یەوە قۆڵی ئاغای گرت:

"لێرە ڕا ئیدی بووینە برا."

عەلی هەروا تەماشای شوێنەکانی دەکرد. ڕادەوەستاو لە ڕوخساری ئاغاوە ڕادەما. هەتا مورتەزاغا گوتی:

"ئیدی بەسیەتی عەلی, لەمەولا ئەتۆ برای گیانی بەگیانیی منی."

"براتم؟!"

"دایکمی, باوکمی, هەموو کەسمی."

"هێندەش لە حەمەدۆك مەترسە ئاغا! لەمەودوا ئەمنت لەگەڵم."

ئاغا بە خۆشحاڵی‌یەوە پێ‌کەنی.

عەلی شوێنی باڵی پەلەوەر چی...؟"

"ئەمە خوا دەیزانێ..."

"شوێنی ماسیی نێو ناوێ...؟"
"ئەوە خوا دەیزانێ."
"عەلی... شوێنی پێی عارف صائمی گەوواد؟"
"ئەویش خوا دەزانێ."
"ئەی هاوار, کاك عەلی! بەڕاست ئاخر ئەمە ویژدانە؟ قارەمانێکی گەورەی شەڕی نیشتمانی, وەك عەلی سەفابەگ کوژراوە... ـ قۆڵی عەلیی گرت ـ ئێستا هەرکەس دەبینی تەنانەت زولفۆش, تەنانەت عارف صائمیش بووەتە قارەمانی نیشتمانی! بۆچی عەلی سەفای بەستەزمانی ترسەنۆك کە لە مێروولەیەکیش دەسڵەمیەوە, نەبێتە قارەمان... خوا دەزانێ بەستەزمانە وەختێك حەمەدۆکی دیوە چەند ترساوە... بێشك وەختێك تفەنگی حەمەدۆکی دیوە پێش ئەوەی تەقەی لێبکا بەستەزمانە لە ترسان گیانی دەچووەو ئەو رێگرەش هەروا گوللەکانی لێداون. چووم تەرمەکەیم دی. یەك دڵۆپە خوێنی لێ نەهاتبوو. هەروا کە گوتم کەللە سەری پارچە پارچە ببوو و بە دارو دیوارەوە نووسابوو. تەواتورە براله تەواتور (رستەیەکە کە مورتەزاغا زۆر جار بێجێ بەکاری دێنێ. مەبەستی چاوڕاوە.م.) وەختێك گوللە لەمردوو بدرێ, دڵۆپە خوێنێك چیە لێی نایە."
عەلی قسەکەی بۆ سەلماند:
"بەڵێ دەزانم. خوێنی لێنایە."
"حەمەدۆك ئەو بەستەزمانەی ـ کە تەنانەت لە مێروولەیەکیش دەترساـ بێ گوللە لێدان کوشتبوو. ئەوانەش ئێستا لەسەر جەنازەکەی دانیشتوون. راکیی دەخۆنەوەو کەیفەی دەکەن. یەکێکیان لە رێی خوادا خەفەت بۆ عەلی سەفا ناخوا, کە لە مێروولەش دەترسا. کوڕە! ئاخر ئەمەش بوو بە ئینسانەتی؟!"
"ئەمەش بوو بە ئینسانەتی؟!"
"بەڵام حەمەدۆکەکان دێن. ئەوانەش دڵیان بەوە خۆشە کە پێش مەڕەکانیان, ژنەکانیان هەڵدەگرن و دەیان بەنە چیاو بەندەنان"
عەلیپەشەل گوتی:
"بەڵێ, دڵیان بەوە خۆشە."
"بەڵام دوایە دێن ماڵ و داراییەکەشیان بە تالان دەبەن."
عەلیپەشەل لێی زیاد کرد:
"دوای ئەوەش سەریان دەبەن."

"با ئەوانە ئێستا لەسەر گلکۆی عەلی سەفا قژقژ پیّبکەنن. ئەو کوتە مێشکانە کە بە دارو دیوارەوە نووسابوون, بە گاڵتە بگرن... عەلی! دیسان ئەو فەقیرو هەژارە جۆرێك تازیەبارن دەڵێی برایان مردوە. دەڵێی هەر یەکەی جەنازەیەکیان لە ماڵێ چووەتەدەر, شیوەن و فغان دەکەن و پێی هەڵڵا دەڵێن... بەڕاست ئەگەر ئەمانە ڕۆژیان بێتەوە پارچە پارچەمان ناکەن؟"

"نا ئاغا, شتی وا ناکەن."

"چیت گوت؟ گوتت لەت و کوتمان ناکەن؟!"

"کاری وا ناکەن. ئەوان دڵیان نایە. ئەگەر ئەوان بێبەزەیی بوونایە, دنیا وا نەدەبوو. جۆرێکی دیکە دەبوو. ئەوان دڵیان زۆر نەرمە, وەك ئاوریشم."

مورتەزاغا لە حاڵێك دا دەیگوت وەك ئاوریشم, هەناسەیەکی قووڵ و ڕەحەتی هەڵکێشا:

"کەوایە, ئەگەر ڕۆژی خۆی هات, ئەوان پارچە پارچەمان ناکەن؟"

عەلی لە کاتێك دا سنگی ڕەپێش کردبوو, بە خۆشحاڵییەوە گوتی:

"پارچە پارچەمان ناکەن."

مورتەزاغا ڕەنگ و ڕووی کرایەوە. لە جێی خۆی ڕاوەستاو چاوەڕێ بوو تا عەلی گەیشتە لای:

"ئەمنیش دەزانم عەلی. ئەوان ئێمە لەتوکوت ناکەن. ئەگەر بیان کردایە دنیا ئاوا نەدەبوو". بەڵام دەسبەجێ لێی بڕیەوە. سەری داخست و لە گژ فکرێکی قووڵ ڕاچوو. پاش ماوەیەکی دوورودرێژ سەری هەڵبڕی. نێوچاوانی زۆر خەماوی بوو. لە عەلیی پرسی:

"ئەتۆ ناوی مراد پاشای چاڵ هەڵکەنت بیستوە؟"

عەلییەشەل وەڵامی دایەوە:

"نەخەیر. نەم بیستوە."

"ڕۆژێك, ڕۆژگارێك, ڕەنگە دوو سەد ساڵ پێش ئێستا بووبێ ئەم چیایانەی توورووس وەك ئەمڕۆ هەوایەك لە سەری دابوون و ئاوا یاغی ببوون. هەر ئەو قوون ڕووتانە کە ئەتۆ دەڵێی کەس ناکوژن و ئەمیش هەر پێم وایە, باڵەخانەکانیان وێران کرد, ماڵەکانیان سووتاند, زۆر کەسیان سەر بڕی و ڕۆژ بە ڕۆژ شێت ترو تووڕەتر بوون. ئەو وەختیش ئەو حەمەدۆکە بستە باڵایانەو ئەو مەلا فەرهادانە سەرکردەیان بوون. ئەرێ بەڕاست مەلا فەرهادێك هەیە نا... کەسیش نازانێ کێیەو چ کارەیە. لەوانەشە جاسووس بێ. عارف صائم بەگ لە داری دەدا. لە داری دەداو ئێمەش هەناسەیەکی ڕەحەت هەڵدەکێشین. ڕاستە دەڵێن ڕێنوێن و ڕاوێژکەری حەمەدۆکە؟"

"بەڵێ ڕاستە."

"دەڵێن حەمەدۆك ئەو لە دژی ئاغاكان هانی دەدا."

"بەڵێ راستە. دەزانم."

"ئەتۆ ئەگەر حەمەدۆکی ببینی, دەتوانی بیناسی؟"

"پێشتر دەم ناسی."

"ئێستا؟ ناتوانی بیناسیەوە؟"

"نازانم. ئەودەم کە دەم ناسی بنیادەمێکی ریوەڵە بوو. منداڵێکی نابوتە, ئێستا دەڵێن بووەتە لەندەهۆرێك. باڵای بەقەد سپیدارێکی لێهاتوە. پیاو ناوێرێ تەماشای بکا."

وا دەڵێن, ئەمنیش وام بیستوە. باشە, کەوایە ئەتۆ ناوی مراد پاشای چاڵ هەڵکەنت نەبیستوە؟"

عەلیەشەل بە نارەحەتیەوە وەڵامی دایەوە:

"نا. نەم بیستوە."

"بەڵێ, ئەمانە دیسان دەستیان کردبوو بە سەرپێچی و یاغی بوون. هەوساریان پساندبوو و لەغاویان دەجوی. حەمەدۆك و مەلا فەرهادەکانیشیان بە سەرەوە بوون و دووبارە چیاکانی تووڕووس و وڵاتی رۆم راپەڕیبوون. میللەتی ئێمە تووڕە ببوون و وەك رەوەی گاکێویی تووڕە بە دەشت و دەر وەر ببوون. بەردیان بەسەر بەردەوەو سەریان بەسەر شانەوە نەهێشت. کەسیش پادشامانی لەم وەزع و حاڵە ئاگادار نەدەکرد. چونکە دەترسان پادشامان رقی هەستێ. جەماعەت هار ببوون و سوێندیان خواردبوو بچن ئەستەمبوڵ بگرن و سەری پادشامان ببڕن. بەرەو ئەستەمبوڵ وەڕێ کەوتن. پادشامان پێی زانی. کاك عەلی... ئەمن ئەمانەم لە مێژووە گەورەکان دا خوێندوەتەوە."

"دەزانم ئاغا. دەزانم ئەتۆ خوێندەواریت زۆرەو ئەقڵت بە هەموو شتێك رادەگا. تەنیا ئەمن نیم, هەموو دنیا دەزانێ ئەتۆ پیاوێکی زۆرزانی. هەموو کەس دەزانێ ئەتۆ چەند خوێندەواری..."

"خۆش بی کاك عەلی. پایەدار بی کاك عەلی. پادشامان کە ئەوەی دەبیسێ زۆر دەترسێ. نەفەرێك دوو نەفەر نەبوون کە بەرەو ئەستەمبوڵ دەچوون... سەد هەزار کەس, سەد میلیۆن کەس وەڕێ کەوتبوون و بەرەو ئەستەمبوڵ دەهاتن.

پادشامان مراد پاشای سەرعەسکەر بانگ دەکاو پێی دەڵێ: مراد پێم بڵێ بزانم ئەمە چ حاڵ و وەزعێکە؟ چیا مەزنەکانی تووڕووس, دەشتەکانی قوونیەو سێواس, رۆخەکانی دەریای سپی و دەریای رەش و گۆلی وان بە هەموو دانیشتوانیانەوە کە لە ئەژمار بەدەرن, بەرەو ئێمە

هاتوون. دەسبەجێ ئامادە بەو خێرا برۆ بۆ تووڕووس. سەری ئەم مارە لە چیاکانی تووڕووسە. برۆ سەری مارەکە کە لەو چیایانەیە پان بکەوە. ویژدان و بەزەیی؟ بە هیچ جۆر. سەرانسەری تووڕووس لە منداڵی حەوت ساڵەوە تا پیری حەفتا ساڵە وەبەر مەودای شمشێر بدە."

عەلی‌یەشەل گوتی:

"تەواتورە ئاغا, تەواتور."

"مراد پاشای چاڵ هەڵکەن لەشکری دەنگ داو هاتە تووڕووس و لەوێ ڕا رووی کردە چیاو بەندەنان. لە پێش دا چەند رۆژێك بەخۆی و لەشکرەکەیەوە لەبن دار سنۆبەرەکان و لە قەراخ ئەو کانی‌یانە کە بەخوڕە خوڕ هەڵدەڕژان و بۆنی پنگیان لێ‌دەهات, حەسایەوە. دەستووری دا بەرخی ساوا سەر بڕن و بی‌برژێنن. کەبابی خوارد. مراد پاشای دەڵێم. هەر ئەو پیاوە هەشتا نەوەد ساڵە بە ئەزموونە کە ئیمپڕاتۆریی عوسمانیی نەجات دا. سێ رۆژ دواتر هۆردووی دەنگ دا. هەر یەکەی پاچ و پێمەڕەیەکی دانە دەست. خەڵك کە ئەمەیان دەدی, یان ئەو باسەیان دەبیست پێ‌یان سەیر بوو. تەنانەت پادشاش پێی سەیر ببوو...

"ئەی دادو هاوار, ناکا ئەو مراد پاشا پیرە شێت بووبێ؟ پاشا دەستووری دەدا لێکدا لێکدا چاڵ هەڵکەنن. لە تووڕووس جێ نەمابوو چاڵیان لێ هەڵنەکەندبێ. یەك دوو حەوتوو لەسەر یەك چاڵیان هەڵ کەندن. پاشا لەشکری بردە شەڕی یاغی‌یەکان و هەتا لووتکەی چیاکان راوی نان و ئاخرەکەی هەموویانی گرت. پاشانیش دەستی کرد بە لەت و پەت کردنی ژن و منداڵ. لەت و کوتی دەکردن و فڕێی دەدانە نێو ئەو چاڵانە کە هەڵیان کەندبوون. یاغی‌یەکان ئەوەندە زۆر بوون کە چاڵەکان بەشیان نەدەکرد. فەرمانی دا دووبارە چاڵیان هەڵکەندن. بەڵام دووبارە بەشیان نەکرد. فەرماندەرەکان چوونە لای و گوتیان: سەرداری مەزن! بۆ ئەو هەموو خەڵکە چاڵ چۆن هەڵکەنین؟ دەرەقەت نایەین! مراد پاشای دەڵێی؟! پیاوی موسوڵمان و دیندار, زۆر توورە دەبێ. دەنەڕێنێ. لە دەنگی نەڕاندنەکەی و لە سامی توورەبوونەکەی دارو بەرد دەلەرزێ و زەوی دەقەڵشێ. دەڵێ: ئەمن ناتوانم تەرمی موسوڵمانێك بە بێ ناشتن لەسەر عەرزی خوا بەجێ بێڵم قەل و داڵ بی‌خۆن. لە پاش ئەم رووداوە, لەشکرەکەی دەکاتە دووبەش. نیوەیان چاڵ هەڵدەکەنن و نیوەکەی دیکە منداڵ و لاو و پیرو ژن و کچی موسوڵمان سەر دەبڕن. مراد پاشا پیاوێکی دیندارو موسوڵمان بوو. لەو شەڕە دا هەرچەند لە مووی سەری هەتا نینۆکی لاقی شەڵاڵی خوێن بوو, دیسانیش سوپاس بۆ خوا رکاتێك چیە, نوێژی نەچوو. مراد پاشا موسوڵمانێکی وا دیندار بوو کە نەی‌هێشت ژن و پیاوان, پێکەوە لە چاڵێك دا بنێژن. چما دەکرێ ژن و پیاو پێکەوە بنێژرێن؟!"

ئەمەی گوت و لە بنی چاوی عەلی‌یەوە راما:

"عەلی گوتی:"نا."

"مراد پاشا ئەو پیاوە دیندارە. تەواوی ئەو موسوڵمانانەی لەت و کوتی کردبوون, جیا جیا ناشت. شیر خۆرەکان لە چاڵێك دا, منداڵەکان لە چاڵێك دا, کچەکان, ژنەکان, پیرەکان و لاوەکانی هەر دەستەیەی لە چاڵێکی جیاوازدا ناشت. دوایەش سەرکردەی یاغی‌یەکانی گرت و لێی پرسی: بۆچی لە شای یاغی بووی؟ سەرکردەی یاغی‌یەکان گوتی: زوڵمیان لێ‌کردووین. رەفتاری پێچەوانەی شەرع و ئاییینیان لەگەڵ کردووین. لەشکری‌یان و نیزیکان و پیاوەکانی پادشا بێ‌حورمەتی‌یان بە ئاییینمان کردوە, کچەکانمانیان ئەتك کردوە.

مراد پاشا پرسی: ئەی ماڵ وێران, ئێوە لەسەر ئەمانە یاغی ببوون؟ سەرکردەی یاغی‌یەکان گوتی بەڵێ... لەسەر ئەمانە.

"ئەتۆ بۆیە یاغی نەببووی کە ببی بە شا؟" کابرا کە لاوێکی زۆر رێك و پێك بوو و چاوێکی رەش و گەورەی هەبوون و لە قسان زۆریش شەرمێون بوو, بە سەرسوڕمانەوە گوتی:

"ئەمن چۆن دەبم بە شا؟ ئەمن چووکترین نۆکەری پادشامانم. تەنانەت بە ئەقڵیشم دا نایە کە ببم بە شا. ئەمن تەنانەت بیریشی لێ ناکەمەوە کە ببمە پاشا. زوڵمیان لێمان کردو ئێمەش یاغی بووین."

سەروەرمان چاڵ هەڵکەن پاشا بە بیستنی ئەم قسانە هەناسەیەکی هەڵکێشابوو کە کێو و بەندەنی وە ناڵە خستبوون. گوتبووی: ئەی هاوار! قوڕ بە سەرم, ئەو هەمووو ئینسانەم هەر لەسەر ئەوە لە چاڵ هاویشت؟ هاوار بۆ من هاواااار. ماڵم وێران بێ کە ئەو هەمووو خەڵکەم لە چاڵ هاویشت. زۆری زگ پێ سووتابوون. پیاوی دیندار, مراد پاشا زۆر گریابوو, بەڵام تازە کار لە کار ترازابوو. سەرکردەی یاغی‌یەکانی لەگەڵ خۆی بردبووە لای پادشاو گوتبووی خاوەن شکۆ! بەسەرهاتەکە واو وایە. لە چیاکانی تووڕووس زیندەوەرم نەهێشتوە. بنیادەم, دڕندە, باڵندەو مارو مێروو, هەمووم لە چاڵان هاویشتوون. بەڵام مەسەلە شتێکی دیکە بوو. پاشان لە سیرێ تا پیوازێ هەموو شتێکی بە پادشا گوتبوو. لە پادشای دەپرسی؟ چاوەکانی لە جیاتی فرمێسك خوێنیان رشتبوو. گریابوو و گوتبووی: وەی بۆ هاونیشتمانەکانم, وەی‌ڕۆ بۆ هاونیشتمانەکانم کە لە چاڵەکان دا خەوتوون. پادشامان, جێ و مەکانی بەهەشت بێ ئەوەندە ناڕەحەت ببوو هەر مەپرسە. پاشا سەرکردەی یاغی‌یەکانی بانگ کردبوو, هەر دوو چاوی ماچ کردبوون. گوێت لێ‌بوو چیم گوت کاك عەلی؟"

عەلی‌یەشەل گوتی:

"گوێم لـێبوو. هەردوو چاوی ماچ کردبوون."

"پاش چاوماچ کردنەکەی گوتبووی: رۆڵە سەرکردەی یاغییان، ئەوە کردمی بە وەزیر. ئەویش نەك وەزیری سێ تۆغەو حەوت تۆغە، بەڵکوو وەزیری نۆ تۆغە. (لە سەردەمی ئیمپراتۆریی عوسمانی دا تاجێکیان لە پەڕە مریشك یان داموسك دروست دەکرد، پێیان دەگوت تۆغ و دەدرا بە وەزیران و پاشاکان.) جگە لەوە کردمیە بەگلەربەگی ئاناتۆلی و سەرانسەری خاکی رۆمیش.

ئەدی کاکە، ئەدی برای خۆشەویست عەلی‌یەشەل... کاری دنیا ئاوایە. مەبەستی شا لە رۆم قەیسەریەو دەوروبەری سێواس بوو."

عەلی‌یەشەل لە حاڵێك دا وای دەنواند باوەڕی بە قسەکانی کردوە، گوتی:

"ئاوا!!"

"ئەدی ئەرێ وەڵڵا راست وا بوو. پاشانیش دەزانی چ بوو؟"

عەلی پرسی:

"چ بوو؟"

"بە کاکی خۆم بڵێم، ئەو سەرکردەیەی یاغی‌یەکان کە باسم کرد دەبێتە سەرعەسکەر. دەچێتە چیاکانی وان بۆ سەرکوت کردنی یاغی‌یەکان. دەزانی هەر کە دەگاتە چیاکانی وان چ دەکا؟"

"چ دەکا؟"

"دەتەویست چ بکا؟ پێش هەموو شتێك فەرمان دەدا چاڵ هەڵکەنن... دەزانی چیە؟ ئاخرەکەی ئەنکەرە لە مەسەلەکە ئاگادار دەبێ... مەبەستم مەسەلەی حەمەدۆکە...

وەختێك هەموو تووڕووس یاغی بوو، ئەو وەخت ئاگادار دەبێ. ئەودەم عیسمەت پاشا بە فەرماندەرایەتیی سەنانە شێت لەشکر دەنێرێ. سەنانە شێت ئەو نێوە نێوە باش شارەزایە، ریشێکی پانیشی هەیە. ئەتۆ قەت ناویت بیستوە؟!"

عەلی گوتی:

"بیستوومە..."

"ئەتۆ دەزانی ئەو چ شێت و پێت و بەڵایەکە؟"

عەلی، بێ‌ئەوەی چووکترین ئاڵو گۆڕ بەسەر روخساری دا بێ، گوتی:

"دەزانم."

"عیسمەت پاشا هۆردوویەك بە فەرماندەرایەتیی وی دەنێرێ کە دارو بەرد هەڵی نەگری."

"سەنانە شێت چ دەکا؟"

"هیچ... لە پێش دا فەرمان دەدا چاڵ هەڵکەنن..."

"خوا نەکا!"

"خوا دەکا. ئەگەر وا بڕوا. ئەگەر قەرار بێ حەمەدۆك لەو چیایانە ببێتە پادشاو ڕەگ و ریشەی ئەم نیشتمانە لە بن دەربێنێ, سەنانە شێت پاشا دێ. پاشانیش هەزار دانە چاڵ هەڵدەکەنێ."

"خوا نەکا."

"ئەگەر سەری ماری هەتا چووکەڵەیە پان نەکەنەوە, خوا دەکا."

"ئاغا... مردووەکەی کەنگێ دەنێژن؟"

موڕتەزاغا ئاوڕی دایەوە, وەڕێ کەوت و گوتی:

"ئێستا ناکرێ..."

ئەرەسیەیەکانی بەنێو ئەو خاکەدا کە وەك خەنە ورد بوو, ڕۆدەچوون و دەهاتنەوە دەرو تۆزوخۆڵیان بەم لاو لادا بڵاو دەکردەوە.

"کاك عەلی, ئێستا وەختی نیە. مردووەکە دەبێ سەبر بگرێ. بۆ ئەوەی خەڵك تەمبێ بن, دەبێ هەموو هاونیشتمانان لە کۆماری تورکیە جەنازەکە ببینن."

"جەنازەکە بۆنی کردوە. دنیا زۆر گەرمە..."

"با بۆن بکا. ئەم مردووە دەبێ چاوەڕێ بێ. دەبێ سەبر بگرێ. سێ ڕۆژ, حەوتوویەك..."

"لەبەر بۆگەنی کەس لە نێو شاری گیر نابێ. ئەگەر مردووەکە ئەمڕۆش بێنێتەوە. هەموومان لەبەر بۆنی تەرمەکە دەبێ روو لە چیا بکەین. بۆنی کەلاکی زۆر ناخۆشە. ئەگەر تەرمەکە تا سبەینێ وەمێنێ, باڵندەو کرم و مێروولەو سەگیش بەند نابن. دنیا زۆر گەرمە."

موڕتەزاغا ڕاوەستا. چەند لەحزەیەك لە ئاسمان و گیاو گۆڵی سووتاوی قەراخ جادەی ـ کە لە تۆزو خۆڵ دا ون ببوو ـ ڕوانی, لەپڕ چاکەتەکەی داکەندو بەسەر قۆڵی خۆی دادا.

"بەڵام بەڕاست زۆرم ئارەق کردوە... بەڕاستی دنیا زۆر گەرمە."

ئەودەم بە چاوێکی بە گومان و پڕ لە ترس بە جۆرێك لە تەپڵی سەر هەتا قامکی لاقان لە عەلی ورد بووەوە کە دەت گوت یەکەم جارە دەیبینێ. ماوەیەك تێیەوە ڕاما. ئەمجار قامکی لەسەر سەری عەلی داناو, گوتی:

"وا نابێ کاك عەلی. ئەتۆ برای خۆشەویستی منی. خۆ ئەمەت قبووڵە؟"

عەلی دەسبەجێ خۆی کۆ کردەوەو خەبەردار راوەستا:

"چ دەفەرمووی قوربان؟ ئێمە لە کوێ و ئێوە لە کوێ؟! پاش ئەوەی جەنابت بە برای خۆت قبووڵ کردم..."

"کاك عەلیاغا... هەربۆیەش نابێ برای مورتەزا قەرەداغلی ئۆغلی قارەمانی شەڕی سەربەخۆیی کە وەختی شەڕ خۆی بە ئاوو ئاوردا داوەو سنگی کردوەتە قەڵغان، تەقیلەیەکی وا دڕاوی لەسەر بێ."

"چ بکەین ئاغا؟ رووی بێ پارەیی رەش بی..."

"ئێستا بێ ماتڵ بوون دەچین کڵاوشەبقەیەکی فووتێر دەکڕین کە ئەو عارف صائمە خوێڕییەش لە سەری نەنابێ."

پاشان قۆڵی کەوا ماراشیـیە دڕاوەکەی ـ کە رۆژێك لە رۆژان کەوایەکی قۆڵ کورتی گوڵدۆزیکراوی خەت خەت ببوو ـ گرت و گوتی:

"ئەمە چیە؟"

"کەوایە، ئاغا."

"ئیدی نەبوو، برای من... هەر ئێستا بۆ لای بازاڕ... راستەڕێ، بۆ لای بەرگدروو."

هەر کە چاوی لە پانتۆڵەکەی کرد، زۆر تووڕە بوو، پاشان بە پێکەنینێکی تاڵەوە گوتی:

"نەبوو، هەر نەبوو کاك عەلی. برای گیانی بە گیانیی من چۆن دەبێ پانتۆڵێکی دەستچنی ئاوا لەبەرکا کە ئەگەر دەزوویەکی لـێ راکێشێ هەزار بینەی لـێ هەڵدەوەرێ؟!"

"چ بکەم...؟ نەدارییە. ماڵی نەدارییە خەرابێ!"

"ئیدی لەمەودوا ئەتۆ نەدار نی، بڵێ کە ئیدی هەژار نی."

عەلی رەنگی پەڕی. زمانی گیرا:

"لە سایە سەری تۆوە، هەژار نیم. نیم و ناش بم..."

"یاڵڵا بۆ لای بەرگدروو. ئەم کراسەش جاوی ماراشە! خزمەتکارەکانیشم ئەمە لەبەر ناکەن، جا ئەمە کارە؟"

عەلی ئیدی قسەی نەدەکرد. بێدەنگ رامابوو.

"... زۆر باشە. ئەم کەوشە سوورانە چین عەلی؟ لاقت هەڵێنە بزانم هەڵێنە دەی. سوێندێ دەخۆم بەرەکەیان کونە. نیشانم بدە، بەرەکەیانم نیشان بدە. شەرمێ مەکە. نیشانم بدە بزانم."

عەلی بە شەرمەوە لە پێش دا لاقە شەل و خێچ و خوارەکەی نیشان دا. لە بەری کەوشەکەی، پینەیەکی گەورە وەك کۆڵەمست هەڵتۆقیبوو. مورتەزاغا قەرەداغلی ئۆغلی چاوی پڕ بوون لە فرمێسك و گوتی:

"وەی برالە, وەی...ی... ئەمن لە جل و بەرگێك دا بگەڕێم كە لە ئورووپاوە بۆم هاتوەو ئەتۆش رووت و پێخواس بگەڕێی... ئەمن ئەرەسی دانستەی ئەستەمبووڵ لەپێ بكەم و ئەتۆش بەو كەچە پێڵاوەوە بگەڕێی؟ ئەمە بوو بە برایەتی؟ یاڵلا, راستەڕێ بۆ بازاڕ."

"بەڵام ئاغا."

"بەڵام چی؟"

"ئەمن كەوشی ئاوا نەبێ ناتوانم لە پێ بكەم. ئەم لاقەی من كەوشی تایبەتیی دەوێ."

"هەر ئێستا دەچینە لای قووجامانی كەوشدروو. هەتا ئێوارێ جووتە ئەرەسییەكت بۆ دەدروێ كە لینگەی لە ماراشیش دەست نەكەوێ."

بە پەلە وەڕێ كەوتن. لە پێش دا چوونە دوكانی كوتاڵ فرۆش. كوتاڵ فرۆشەكە زۆر پیر بوو. چنگێك ئێسك و پێست بوو. لەو موهاجیرانە بوو كە شاڵی سوور لە پشتیان دەبەستن.

"زوو, زوو قوماشێكی چاكەت و پانتۆڵ بۆ برا شیرنەكەم, بۆخۆت تەماشاكە, تەماشاكە, بۆخۆت هەڵبژێرە, هەركامت پێ باشە بیكرە. خوایە گیان... بڕوانە چەندی قوماش لێیە!"

بەدەم تەماشاكردنی تۆپە قوماشەكانەوە بە دەوری عەلیدا هەڵدەسووڕاو دەیپرسی:

"ئەمەت دەوێ؟"

عەلی مات و بێدەنگ, بە زمانی گیراوەوە تەماشای تۆپە قوماشەكانی دەكرد.

"ئەمەت دەوێ؟"

عەلی هیچی نەدەگوت.

"كاك عەلی, ئەمەت دەوێ؟ بڕوانە خەت خەتی بنەوشی تێدان. خالیس خورییە."

عەلی بێدەنگ بوو, دوكانداریش لە پەستا قوماشی نیشان دەدان. سەرەنجام فرۆشیار كە دیتی ئەم دوانە ناتوانن قوماشێكی باش و لەبار هەڵبژێرن, لە پشتی تۆپەكانەوە, تۆپە قوماشێكی شینی پڕ ڕەنگی هێنایەخوار كە خەت خەتی وردی تێدا بوون:

"ئەگەر لە قوماشی باش دەگەڕێن, ئەمە قوماش! لەم دوكانەدا قوماشێكی دیكە كە شیاوی ئاغایەكی جێگەورەی وەك مورتەزاغا بێ شك نابەم."

مورتەزاغا كە لە رەفتاری فرۆشیارەكە خۆشحاڵ بوو, چەند جار بە دەوری عەلی دا سووڕاو پرسی:

"پەسندت كرد, بە دڵتە كاك عەلی؟"

عەلی وەك منداڵێكی شەرمێون سوور هەڵگەڕاو گوتی:

"بەدڵمە... بەڵام ئاخر بۆ جەنابت زەحمەتە. پێت حەیف نیە كۆڵێك پارەی پێ بدەی؟"

فرۆشیارەکە گوتی:

"ئەتۆ بیر لە پارەکەی مەکەوە... مورتەزاغا تۆنێك پارەی هەیە."

مورتەزاغا لە حالێك دا بۆ سەلماندنی قسەی کابرا سەری دەلەقاند گوتی:

"هیچ قیمەتی نیە."

قوماشەکەیان کڕی و دوکانەکەیان بەجێ هێشت. مورتەزاغا کاتی کڕینی قوماشەکە پارەی نەدا. هەر ئەوەندە گوتی:"لە دەفتەرێ بینووسە."

بەرگدروو دوو دوکان هەورازتر بوو. زۆر زوو گەیشتنە لای. بەرگدروو پیاوێك بوو سەرو ریش سپی بە سمێلێکی ئەستوور، بەژنێکی کورت و دەم و چاوێکی خڕەوە کە چاوە چووکەلەکانی لە کالانەی خۆیان دا دەگەڕان.

"دەسبەجێ، دەسبەجێ، دەسبەجێ وەستای خەیات... ئەم جلانەم سبەینێ دەوێتەوە. دەسبەجێ، سبەینێ. خەمی پارەت نەبێ. هەر سبەینێ. زۆر زووش. ئەمە عەلیاغایە. برای هەقی منە. پیاوی وا نە تا ئێستا هاتوەتە چوکووراوا نە لەمەولاش دێ."

"ئاغا، فەرمایشتت لەسەر چاوم. بەلام تا سبەینێ ئێوارێ حازر نابێ."

"دەبێ تەواوی کەی."

"تەواو نابێ."

"تەواو دەبێ."

بەرگدروو دەستبەجێ نەرم بوو. پاش ئەوەی تاوێکی چاك تەماشای عەلیەشەلی کرد گوتی:

"باشە ئاغا. خۆ بۆ دەستە جلێك ناتوانین دلی جەنابت بشکێنین... شەوێ تا بەیانی کاری لەسەر دەکەین و تەواوی دەکەین."

مورتەزاغا قەرەداغلی ئۆغلی لە حالێك دا کەیفی ساز ببوو و دەیگوت: بژی. سلامەت بی. دەستی لە پشتی بەرگدرووەکە دا.

لە خەیاتخانەکەوە چوونە لای کەوشدروو، لەوێ ڕا چوونە لای کراسدروو. ئێوارەی ڕۆژی دواتر، وەستاکارەکان هەموو شتێکیان بە سازی وێ دەدانەوە.

مورتەزاغا لە پێشەوەو عەلی بە دوای دا، چەند جار بازارەکەیان لەم سەر تا ئەو سەر پێوا. چەند لەحزەیەك لەلای نالبەند کە لەبن چنارێکی لەمێژ سالە بوو، راوەستان.

مورتەزاغا عەلیی بەم جۆرە بە زیندروو ناساند: پیاوی وا نەهاتوەتە چوکووراوا تا دنیاش دنیایە نایە."

زیندروو لەگەڵ گوتنی سبحان اللە... نەیتوانی سەرسوڕمانی خۆی بشارێتەوە. ئەمجار چوونە مزگەوت و پاش دەزنوێژێکی دووردرێژ نوێژیان کرد. پاش نوێژ کردنیش چوونە ماڵی عەلی سەفا. ماڵەکە بێدەنگ بوو. نە دەنگی گریان دەهات و نە دەنگێکی دیکە. بێدەنگی‌یەکی رووت و هیچی دیکە. دێهاتی‌یەکانی دانیشتووی شارۆچکەش رۆیشتبوون. هەموو جێ‌یەك چۆڵ و بێدەنگ بوو.

عەلی لە حاڵێك دا لە چاوی مورتەزاغاوە رامابوو گوتی:

"ئەم گوت؟"

"چیت نەگوت؟"

"بۆنەکە. بۆن بکە ئاغا... بۆن دنیای داگرتوە. لە هەموو شارۆچکە گەڕاوە. هەتا سبەینێش... ئەی خوایەگیان, ئەی..."

"ئیشەڵڵا ئەم بۆنە بە بەر لووتی عارف صائم بەگ هەڵڵا دێ و باسی مەسەلەی حەمەدۆك دێتە گۆڕێ. ئەودەم سەنانە شێت پاشا..."

پاش ئەوەی ماوەیەکی زۆر لە چاوی عەلی‌یەوە راما, گوتی:

"عەلی, ئەمانە کارێکیان لە دەست نایە, لە دەستیان نایە؟"

عەلی گوتی:

"نا..."

"سەنان پاشاش زۆر پیرە. لەوانەشە خانەنشین کرابێ. ناوی نەماوە. لەوانەشە لە داریان دابێ. لەو شێت و ماخولیایانە بوو."

"بیستوومە مەشقی سەربازیی بە دارو درەخت کردوە. دەڵێن ئیست و خەبەردار (قف و استعد)ی بە دارو درەخت داوە. هەر دارێکی قیت رانەوەستابێ, فەرمانی داوە دارکاری بکرێ."

مورتەزاغا پێ‌کەنی:

"لەوانەشە لەداریان نەدابێ. لەوانەشە عیسمەت پاشا بی‌نێرێ. ئەگەر ئەو بێتە تووڕووس کارێك دەکا خەڵك بڵێن سەد رەحمەت لە چاڵ هەڵکەن پاشا... ئەتۆ یاوەر فارووق دەناسی؟"

"ئەوم دیوە."

"دەتوانێ حەمەدۆکی بگرێ."

"ناتوانێ."

"بۆچی؟"

"ئەو زۆر زوڵم لە دێهاتی‌یەکان دەکا."

"ها, ڕاستە. لە وەختی وا دا نابێ زوڵم لە دێهاتی‌یەکان بکەی. وا نیە؟"

"خەڵکی لادێ زوڵم و سووکایەتیی هیچ پێ خۆش نیە..."

دووبارە وەڕێ کەوتنەوە. مورتەزاغا ڕادەوەستا. تەماشایەکی وی دەکردو دووبارە وەڕێ دەکەوتەوە. ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوون. لە حاڵێك دا سەریان داخستبوو تا نیزیك پردێ ڕۆیشتن. لە پەنا میلە ئاسنی پردەکە ماوەیەك بە تەنیشت یەکەوە ڕاوەستان و تەماشای خوارێ, تەماشای ئاوەکەیان کرد. لە نەکاو مورتەزا پرسی:

"ئەتۆ چەکت پێیە؟"

"نا."

"ئەگەر ئێستا حەمەدۆك بێ و بیهەوێ لە پێش دا ئەتۆ و دوایە ئەمنیش بکوژێ چیمان پێ دەکرێ؟"

"هیچمان پێ ناکرێ."

"زۆر باشە, پیاوی ساحێب دوژمن بەبێ چەك دەگەڕێ؟!"

"بێ‌گومان, نا..."

"زۆر باشە ئەی ئەتۆ بۆچی چەکت پێ نیە؟"

"ڕووی بێ‌دراوی ڕەش بێ."

"تفەنگچیی چاکی؟"

عەلی لە حاڵێك دا بەبێ فیزی سەری بەلاوە دەنا, گوتی:

"بۆچی, لەوانەیە..."

"دەمانچە, یان ماوزەر؟"

"هەردووك..."

"زۆر چاکە, حەمەدۆك تفەنگچی‌ترە یان ئەتۆ؟"

عەلی‌یەشەل بە خۆی دا شکایەوە. جینگڵی دان. چاوی بڕیە ئاوی بن پردەکە. زەردەیەکی هاتێ و لەئاغاوە ڕاما.

ئاغا چاوەڕوانی وەڵامی وی بوو.

"بڵێ, بڵێ... ڕاستی‌یەکەی بڵێ. ئەمن براتم دەبێ ڕاستی‌یەکەی بزانم."

"بەخوا لەبارەی حەمەدۆکەوە..."

"حە... حەمەدۆك چیی بووە؟"

"مەبەستم ئەوەیە کە..."

دووبارە بە شەرمەوە بێدەنگ بوو. رووی وەرگێڕاو چاوی لە ئاوەکەوە بڕی. پاشان چاوی بڕیە شەنگەبی‌یەکی باخەکەی ئەوبەری.

"بڵێ بزانم دەتەوێ بڵێی چی؟".

"حەمەدۆك منداڵی دوێنێیە. ئێمە... بە ئێمە دەڵێن عەلی‌یەشەلی شوێن هەڵگر...".

"یاڵڵا بڕۆینەوە ماڵێ. لەمەودوا ئەتۆ، لە ماڵێ خۆمان دەمێنیەوە. باشترین دەمانچەو فیلینتات دەدەمێ. دەمانچەکەت دەبێ هەر ناگان بێ. نەچی لە ناگان بەولاوە هەڵگری. ئەوانی دیکە گیر دەکەن".

"راستە".

"چاردە ناگانی دەسك عاجم هەن. هەڵبژێرە. هەر کامێکیانت پێ باش بوو، هەڵی‌گرە".

"هەر بژی ئاغا".

"ئەوەندەم فیلینتای ئەڵمانیی قۆنداخ نەخشاو هەیە کە دەتوانم لەشکرێکیان پێ چەکدار بکەم. هەمووی تازە لە کارخانە هاتوەتە دەر. یەکێك لەوانیش هەڵبژێرە".

"باشە".

"بە سندووقیشم فیشەك هەن...".

"خۆش بی ئاغا".

"چەند ساڵە تەقەت نەکردوە؟".

"دەوری بیست و یەك ساڵە".

"دەستت سـنـت بووە؟".

"ئەدی ئاغا".

"سبەینێ و دووی پاش ئەوەی جەنازەکەیان بەرێ کرد، سواری ئەسپ دەبین، دەچینە ئاغریچە، لەوێ مەشقی تفەنگ هاویشتن دەکەین و دەستمان رادێ".

"قسەی تۆیە ئاغا".

"ئێستا با بچینەوە ماڵێ".

"باشە ئاغا...".

"دەبێ هەر لە ماڵێ خۆمان بی".

"باشە ئاغا...".

"مندالّت هەن؟".

"یازدە نۆکەری تۆم هەن".

"خوا پێت بێڵێ. ئەوان هەر لەوێ لە چیای دەمێننەوە, یان بیان هێنینە خوارێ بۆ نێو کێڵگەی خۆمان؟".

"ئەوان هەر لەوێ وەمێنن باشترە. ئەگەر بێنە دەشتێ, حەمەدۆك شك دەکا".

"راستە... حەمەدۆك لە تۆ دەترسێ؟".

"ئەختێك خۆم لـێ دەپارێزێ".

"هەتا ئەتۆ لەلای منی, خۆ دەمن ناگەیەنێ؟".

"لە پێش دا دەبێ من بکوژێ, دوایە...".

مورتەزاغا دووبارە ئاوڕی وێ دایەوە. ماوەیەکی درێژ تەماشای چاوی عەلیی کردو پاشان, بە ترسەوە دەستی بۆ پشتێنی برد, دەمانچەکەی خۆی وێ داو گوتی:

"هەتا دەگەینەوە ماڵێ با دەمانچەکەم بە تۆ بێ. قسەشی لـێ مەکە. چاوەکانت ماچ دەکەم کاك عەلی. گیانی بێهێزم بە ئەمانەت لە دەست تۆ دایە".

"هیچ خەم مەخۆ ئاغای خۆشەویستی... چاوڕەشم, لەمەودوا بۆخۆم بەرپرسی گیانتم".

"بەراستتە عەلیەشەل ئاغا؟ ئەم قسەیە لە نێوەڕاستی دڵت ڕا دێ؟"

"لەنێوی دڵم ڕا دێ, ئەویش چۆن نێوی دڵێك!"

"هێشتا لێت دەترسم. لە بنی ئەو چاوانەت دا شتێك شاراوەتەوە".

مورتەزاغا چووە سەر دیواری نزمی دەوری باخێك و دانیشت, عەلیەشەلیش چووە بن دەستی:

"ئەگەر لێم دەترسی, بۆچی دەمانچەکەت وەمن دا؟".

عەلی ئەم قسانەی بە نەرمی و میهرەبانیەوە کرد.

"بێ و نەبێ ئەتۆ ئەمن دەکوژی. ئەتۆ لە پیاوەکانی حەمەدۆکی".

ماوەیەکی زۆر هەردووکیان سەریان بەردایەوەو لە نووکی کەوشەکانیانەوە ڕامان. عەلی, زۆر بە نارەحەتی هەستاو هەروەك هیچیان لەنێو دا ڕانەبردبێ, چوو بەرەورووی مورتەزاغا ڕاوەستاو چاوی دە چاویەوە بڕی. هەردووکیان ماوەیەکی درێژ وەك جادوویان لـێکرابێ تێکەوە ڕامان.

"ئەتۆ لە پیاوەکانی حەمەدۆکی. لەم دنیایەدا هەر ئەمن ئەوەی دەزانم. ئەتۆ گیانت بە قوربانی حەمەدۆك دەکەی. چونکە دێهاتیەکی ئاقڵی. شتێکی دیکە... ئەم ژانسەرانە ئەتۆ بۆ حەمەدۆکت دروست نەکردوون؟".

عەلی بە پێکەنینەوە گوتی:
"با... ئەمن دروستم کردوون".
پێکەنینەکەی لەنێوی دڵیەوە بوو.
"هەر بۆیە گیانی خۆتی بۆ بەخت دەکەی؟".
عەلی بێدەنگ بوو.
"عەلی, بۆ قسە ناکەی. بۆ هیچ ناڵێی؟ عەلی, بڵێ بزانم, ئەگەر حەمەدۆك بیهەوێ, من دەکوژی؟".
عەلی وەڵامێکی نەدایەوە. روخساری کز دیار بوو و سمێڵە سوورەکانی داچۆڕابوون.
"نا مورتەزاغا, نات کوژم. ئەمن حەز لە پیاوکوشتن ناکەم. گیانێك کە خوا داویە, هەر بۆخۆی دەبێ وەری گرێتەوە. پیاوکوشتن کارێکی دزێوە".
مورتەزاغا بە خۆشحاڵیەوە گوتی:
"دزێوە, بەڵام حەمەدۆك دەکوژێ".
عەلی بە دەنگێکی دلێرو بڕوا بەخۆ بوونەوە گوتی:
"ئەو فەرقی هەیە".
"ئەو فەرقی هەیە؟ فەرق دەکا؟ یانی ئەو هەقیەتی... ئاوا!".
پاشان سەرانسەری لەشی ترس دایگرت و چاوەکانی لە ترسان داپچڕان:
"کەوایە ئەتۆ من دەکوژی. چونکە ئەمە فەرق دەکا. حەمەدۆك من دەکوژێ, ئەویش فەرق دەکا...".
مورتەزاغا جار لە جار زیاتر دەترسا. عەلیەشەلیش ئەو ترسی مردنەی ـ کە بە چاو دەبینراو بە دەست هەست پێ دەکرا ـ لەگەڵ وی بەش دەکرد.
عەلی دەستی بۆ پشتێنێ بردو گوتی:
"ئاغا! بگرە دەمانچەکەت. هەتا وەختێك ئەتۆ وا بترسی و ئەمن وا قسەلەڕوو بم دانوومان پێکەوە ناکوڵێ. ئەو دەمانچەیەم لێ وەرگرە با ئەمن بڕۆم. بچم قوڕێك وەسەری خۆم بکەم".
مورتەزاغا بە هیچ جۆر نەیدەتوانی ئەو دەمانچەیە کە عەلی بۆی راداشتبوو, وەربگرێ. بە چاوەڕوانیەوە چاوی لە چاوی عەلیەوە بڕیبوو.
"دەمانچەکەت وەرگرە ئاغا".
مورتەزاغا بە روخسارێکی زەردو لە حاڵێك دا دەت گوت تەواوی گیان و هەست و شعووری لە چاوە پڕ پرسیارەکانی دا کۆبوونەوەو هەروا بزانە لە دوور تەماشای رووناکایەکی بە قەدەر نووکی دەرزی دەکا, ملی درێژ کردبوو و تەماشای عەلیی دەکرد.

راوێژی دەنگی عەلی ئەمجار بڕیاردەرانەو رووهەڵماڵاوانە بوو:

"مورتەزاغا, دەمانچەکەت بگرە".

بەڵام مورتەزاغا دەستی نەبرد دەمانچەکە وەرگرێ. عەلی دەمانچەکەی لە پەنا دانا. بەرەو دوا گەڕایەوەو سەربەرەژێر بۆ لای پردێ وەڕێ کەوت.

مورتەزاغا لە ترسی رووحی خۆی هاواری کرد:

"راوەستە عەلی, راوەستە. دەقیقەیەك راوەستە برالە. ئەمن لەگەڵ تۆ بوومە برا. دەزانم ئاخرەکەی من دەکوژی. بەڵام ئەگەر قەرارە بکوژرێم با برای خۆم بم کوژێ. راوەستە, دەسبەجێش وەگەڕێ".

چەند هەنگاوی هەڵێنانەوە, قۆڵی گرت, بۆ لای خۆی راکێشاو بە توندی و فەرماندەرانە گوتی:

"دەمانچەکەت هەڵگرەوە. ئەمن ئەوم داوە بە تۆ عەلی! نێستێ باشت گوێ لێ بێ. ژیانی من بە تۆوە بەستراوە. هەڵی گرە. چیی لێ دەکەی بیکە. پێت خۆشە بم کوژە پێت خۆشە مەم کوژە. ئەگەر پێشت خۆش بوو بم بە بم دە دەستی حەمەدۆك بەڵام لەمەودوا نەکەی بەجێم بێڵی و بچیە جێگایەك!".

عەلی لەسەرەخۆ چەکەکەی هەڵگرت, لە پشتێی بەست و لە ئاغای نیزیك بووەوە:

"بم بوورە مورتەزاغا".

"تکایە عەلی. خەتای من بوو. یاڵلا بڕۆینەوە ماڵێ".

وەختێك گەیشتنەوە ماڵێ خەریك بوو رۆژ ئاوا بێ٫ رووناکایی تاوپەڕ بە هەموو جوانیی خۆیەوە لە شووشەی پەنجەرەی ماڵەکانی شارۆچکەی دەداو شارەکەی ـ کە پاڵی وە تەپۆلکەیەکی بە دارزەیتوون داپۆشراو دابوو ـ کردبووە کۆشکی پەرییان.

لەو وەختانەی رۆژێ دا ئەگەر لەم شوێنەی ئاناوارزاوە تەماشای شارۆچکەت دەکرد, لە دوورەوە وەك ماشەرێکی رەنگاوڕەنگ دەچوو کە دەوروبەرەکەی هەتا دوور دەخستە نێو رووناکاییەکی لە تاریف نەهاتوو.

مورتەزاغا کوڕی یەکێك لە خانەکانی تورکمەن بوو. بابی ـ کەکمە ئادەم ئاغا لەو دەوروبەرە زۆری حورمەت هەبوو. پیاوێکی پیاوو نان بدە بوو. لە هاوینە هەوارەکەی زەوییەکی بڕ داو قەباڵەشی وەرگرت. دووربین بوو. رەنگە بێکێشەو گێرەترین قەباڵەی ئەم شارۆچکەیە هی وی بووبێ. قەباڵەیەکی حەوت هەزار دۆنمی. بەڵام لە چوارچێوەی سنوورەکانی ئەم قەباڵەیەدا لەوانەبوو کێڵگەی چل هەزار دۆنمییش خەوتبێ. هەرچۆنێك بێ. ئەو وەك خەڵکی دیکە دەستی بەسەر زەوی و زاری ئەرمەنییەکان دا نەگرتبوو. مورتەزاغا لەو بارەیەشەوە بەخۆی دەنازی. تەنیا خانووبەرەیەك کە تێی دا دەژیا دۆستە ئەرمەنییەکەی, قاراپیت گلیکیان وەختێك هەڵاتبوو بە وی بەخشیبوو. هەموو

کەس دەیگوت خانووەکەی بە زۆر لە قاراپیت ئەستاندوەو مورتەزاغا بەم درۆیانە لە دین دەردەچوو. "هەرگیز ئەم خانووە بەشکۆیەی بە زۆر نەستاندوە, بەڵکوو جرینگ جرینگ پارەی ژماردوەو داویە بە گلیکیان. ئەوە, زولفۆو تاشکەن خەلیل بەگ و مەلا دۆران ئەفەندی و روشدی بەگی بازپورس و ئی دیکە بوون کە بە زۆر خانوویان لە خەڵك ئەستاندو... پاپاسی‌یەکیان نەدا, نە بە دەوڵەت و نە بە خاوەنەکانیان. هەرکە ئەوان رۆیشتن, ئەمانیش هەروا بزانە میراتی باب و باپیریانە, هاتن جێیان لـێ خۆش کرد."

مورتەزاغا سێ جار بە پەلە لە دەرکەی دا. دەسبەجێ دەرگا کرایەوە. خانووبەرەکە دوو حەوشەو چاردە ژووری هەبوون. ژوورێکیش لەبن شیروانی‌یەکەوە بوو کە لەنێو میچەکەوە بە نەردیوانێکی چووکەڵەدا دەچووە سەربان و لەوێ را بە پلیکانێکی وەختی تەنگانەدا دەچووە سەر کۆڵانێ. خانووەکە بە رووکاری سپی‌یەوە یەکێك لە جوانترین و گەورەترین خانووبەرەکانی شار بوو. قاراپیت گلیکیان وەستای بۆ لە سێواسەوە هێنابوو. وەختێك خانووبەرەکە ساز بوو, کەوتە سەر زمانی ئەرمەنی‌یەکانیش و تورکەکانیش. دیواری ژوورەکانی لە دار بناوی پڕ نەخش و نیگار دروست کرابوو. هەر ژوورەی جۆرێك دروست کرابوو. بانی نهۆمی یەکەمی وردە بەردی رەنگاورەنگی تێ‌گیرابوون. راست لەنێوبەندی ئەو فەرشە رەنگینەدا موزائیکێکی دەورەی بیزانس دانرابوو, کە لە ئاناوارزاوە بێ ئەوەی ئازارێکی پێ‌بگا, هێنابوویان. نەخش و نیگاری گاکێوی و قەرقاوڵ و گوڵە وەنەوشەی لەسەر بوو.

بە پلیکانە دارەکان دا کە لەبەر خاوێنی دەدرەوشان, چوونە نهۆمی سەرێ. لەسەر دیواری رووبەڕوویان مووزائیکێکی دیکە قایم کرابوو کە لە ئاناوارزاوە هێنرابوو. نەخشی ئەم مووزائیکە باخچەیەکی باڵندان بوو. ئەو لەك لەکانە کە بە نێو جەگەن دا دەڕۆیشتن, ئەو قورینگانە کە بە هەوادا دەفڕین, مارێکی سوورو چەند کەوی رەنگ خەنەیی...

عەلی لە نێوەڕاستی هۆدەکە چەقیبوو و بە سەرسوڕماوی تەماشای موزائیکەکەی دەکرد.

"تەواتورە ئاغا, تەواتورە ئاغا! ئەمە کێ دروستی کردوە؟"

"لە کافران ماوەتەوە. قاراپیت لە بن خاکێی دەرهێنابوو. زۆر بە قیمەتە. وا دەڵێن. لەمانە سێ دانەی دیکەش لە ژوورەکان هەن."

"تەواتورە, هەر دەڵێی زیندوویە. مارەکە دەڵێی دەخزێ."

چوونە ژووری کەللە یەك کە راست رووبەڕووی پلیکانەکان بوو و لەسەر قەنەفەیەك کە دۆشەکەکانی گوڵدۆزی کرابوون, دانیشتن. بۆنی قاورمە دەهات.

مورتەزاغا گوتی:

"بەڵام چاك برسی بووین, ها."

عەلی گوتی:

"ئەری, برسیمانە."

"قاورمەو پیوازت پێ خۆشە؟"

"جارێك لە سەفەرێ خوادوومە. هێشتا تامەکەی لە بنی ددانم دا ماوە."

"هەرشتەپلاو بە رۆنی تازەوە چۆنە؟"

عەلی بە پێکەنینەوە گوتی:

"کێ پێی خۆش نیە."

"سەرقەپاغەکەشی فەریکە هەنگوین."

عەلی گوتی:

"لە کوێستانەکانی ئێمە زۆرە. رادەسپێرم بۆ ئاغای بێنن, سپی و جوانە وەك شیر بەڵام ئێمە زۆر بە دەگمەن لێی دەچێژین."

"خۆش بی عەلی, برالە."

کەس لەو دەوروبەرە نەبوو. لە نەکاو ژنێکی قەڵەوی سمت پان بە سنگی تێهەڵپەڕیو و داوێنێکی خەت خەتی درێژەوە (کە لاقەکانیی داپۆشیبوون) بەرەڵبێنەیەکی سەوزو سووری گوڵێنگەدار بە بەرەوە, کەوشێکی بریقەدار لە پێ دا, چارشێوێکی سەوزی ئاوریشم بە سەرەوە, کە قیت و قنج بە رێ دا دەرۆیشت و گەردنێکی زۆر بڵندو لێوێکی سووری هەبوون و کەمێکیش رەنگی پەڕیبوو, لە یەکێك لە ژوورەکان هاتەدەرو گوتی:

"بەخێر بێی عەلیاغا, برالە."

عەلی کە چاوی لە زەوییەوە بڕیبوون وەڵامی دایەوە:

"خۆش بی یاخوا."

ژنەکە دەسبەجێ دەستی بە قسە کرد:

"وەی, وەی, وەی. تەرمی عەلی سەفابەگ بووەتە دەهۆڵ, لە لێفەو دۆشەکان دا جێی نابێتەوە. بووەتە کێوی ئوحود. دەڵێن زۆر خەراپیش بۆنی کردوە. دەڵێن ئەمشەو بۆنی جەنازەکە هەموو شارەکە پڕ دەکا.

دەڵێن ئەمشەو ئێمە شارەکە بەجێ دێڵین و دەرۆین."

حەسنەخان یەکەمین ژنی مورتەزاغا بوو. سی و پێنج ساڵ تەمەنی بوو. کچی تاقانەی یەکێك لە خانەکانی تورکمەنی دەوروبەری ئەسکەندەروون بوو. مورتەزاغا بۆ ئەستاندنی ئەو ژنە هەرچی لە دەستی هات, کردی و هەرچی بە دەستیەوە بوو, خەرجی کرد. ئەوی لە تەواوی ئەو ژنە گەنجانە کە دواتر هێنابوونی, خۆشتر دەویست. حەسنەخان پێنج منداڵی لێی هەبوون کە سێیان کوڕ بوون. لە ژنە گەنجەکانی دیکەش لە هەر کامێکیان شەش منداڵی هەبوون و هێشتاش منداڵیان دەبوو. ژنەکانی دیکە نەهاتنە بەخێراتنی عەلی. بە پێی دابی لەمێژینە کەسێکی بێگانە هاتبایەو کابرا خزم و دۆست نەبووایە, ئەوان دەرنەدەکەوتن.

مورتەزاغا گوتی:

"با بۆن بکا. هەرچۆنێك بێ ئاخرەکەی رۆژێك دەنێژرێ. خاك هەموو بۆنێکی دادەپۆشێ."

حەسنەخان گوتی:

"ئەدی دای دەپۆشێ, دایدەپۆشێ... حەمەدۆك لە کوێیە, خەبەرێك مەبەرێکی هەیە؟".

مورتەزاغا گوتی:

"نا".

"ئەو کابرایە کێیە؟ جنۆکەیە؟ پەرییە؟ هەیە؟ نیە؟ ئەو ئاغا رەشیدانە ئەو خانانە دەکوژێ و کەسیش ناتوانێ بڵێ پشتی چاوت برۆیە".

مورتەزاغا گوتی:

"ئێمە پیاو نیین. ئەگەر ئێمە پیاو باین, ئەو نەیدەتوانی عەبدیخان بکوژێ. عارف صائم بەگ لێرەیە, لە ماڵی خەلیل. لە ترسان کەس هیچی پێ ناڵێ. زاری منیشیان بەستوە, دەڵێی عارف صائم بەگ نوێنەری تایبەتیی خوایە... هەمووان زراویان لێی چووە, لە ترسانی لە دەرپێیەکانیان دەرین, عەلی سەفاش لە رێی خۆی چوو. پاش وی نۆرەی ئێمەیە, پاش ئێمەش نۆرەی عارف صائم و پاش عارف صائمیش...".

حەسنەخان دووبارەی کردەوە:

"تەرمی ئەو بەستەزمانە بەقەد کێوی ئوحود هەستاوە. تەرمەکەی بۆنی کردوە. نانەکەتان بخۆن ئیدی".

"حەمامی ماڵێ گەرم کە خانم, مەنجەڵێکی گەورە ئاو گەرم کە. کاك عەلیم لە رێیەکی دوورەوە هاتوە, با باش پاك و خاوێن بێتەوە. پارووە سابوونێکی بۆن خۆشیش دابنێن. دەستێکیش لە کراس و دەرپێیەکانی من دابنێن. جێی کاك عەلییش لە ژوورەکەی من چاك

بکەن. لەمەودوا ئێمە لە یەك ژووردا دەخەوین. ئەو کابرایە, حەمەدۆك لە کەللەی داوە, پیاو چووزانێ چ دەبێ...؟".

حەسنەخان بە دەم هەناسە هەڵکێشانەوە دووپاتی کردەوە:

"پیاو نازانێ چ دەبێ. ئەو جۆرە شێت و پێتانە حیساب و کیتابێك لەکاریان دا نیە, چ بەڵایەکیان بەسەر عەلیەچکۆڵ, هەڵۆی چیاکان هێنا, هێرشیان کردە سەر ماڵەکەی, کوت کوتیان کرد. هەموویم خۆم بەم دوو چاوانەم دیوە. ئەوانەی کوت کوتیان کرد غەوارە نەبوون, عێل و عەشیرەتی خۆی بوون, خەڵك شێت بوون شێت... زۆرم تاریفی کاك عەلی بیستوە. نانی بێنن؟".

مورتەزاغا تەماشای عەلیی کردو گوتی:

"بەڵێ بێنن".

حەسنەخان لە حاڵێك دا لە تۆقی سەری تا بەری پێی, لە عەلی ورد دەبووەوە, لە جێی خۆی هەستا. ئارام ئارام بە وردە تەکانێك کە بە ئەندامی خۆی دەدا چووە چێشتخانە. پاش تاوێك کچێکی گەنج بە سینیەیەکی مسی زۆر گەورەی نەخشێندراو و سفرەیەکی جاجمەوە هاتەوە. جاجمەکەی لەسەر بەڕەکان راخست و سینیەیەکەی لەسەر دانا. لە پاشان نانی قەد کراو و لە پێش خۆریی قووڵی مسین دا قاورمە, پلاو, ماست و گۆشتی برژاویش هات. لەسەر سفرە چۆکیان داداو بە کەوچك دەستیان کرد بە نان خواردن. خواردنەکەیان درێژەی کێشا, پاش نان خواردن, دیسان هەر ئەو کچە بە ئافتاوەو لەگەن و خاولیەیەکی سپیەوە کە بەسەر شانیدا دابوو هاتەوە. ئاوی لە دەستی عەلی کرد.

مورتەزاغا بانگی کردە ژوورێ:

"ئاوەکە گەرم بوو؟".

دەنگی حەسنەخان لە ژوورێ را هات کە دەیگوت:"حازرە".

کچەکە وەپێش عەلی کەوت و حەمامی ماڵێ نیشان دا. عەلی دەسبەجێ خۆی رووت کردەوەو دەستی کرد بە خۆشوتن. چرا نەوتیەیەکی گەورە لە ژووری خەوێ داییسا, شووشەکەی بریسکەی دەدا, بێئەوەی تۆزقاڵێك دووکەڵی گرتبێ. کووپەی چرایەکە زۆر گەورە بوو, رەنگێکی سووراویی هەبوو بە گوڵ و نەخشێکی ئاسمانیەوە.

مورتەزاغا لە جێی دا راکشابوو و پۆپەشمینێکی تەنکی هەتا ملی بەسەر خۆی هەڵکێشابوو. زۆری پێ چوو هەتا عەلی کراس و دەرپێی ئاغای لەبەر خۆی دا رێك و پێك کردن و بە شەرمێونی

هاتەوە ژووریّ. هەموو لەشی بۆنێکی خۆشی لیّدەهات و دەت گوت تازە لەدایك بووە. دەسبەجیّ لە جیّ وبانێك دا کە لە تەنیشت جیّوبانی ئاغا راخرابوو, راکشاو ئەویش مەلافە ئاوریشمەکەی هەتا ملی بەسەر خۆی هەڵکێشا. لە سەرانسەری ژیانی دا جیّ وبانی وای نەدیبوو. لە نەکاو بە بیری دا هات کە داخوا عەلی سەفابەگ ئەو کەسەی ئێستا وەك کێوی ئوحود هەڵمساوە, سەرانسەری ژیانی لە نوێنی وادا نووستوە؟ نوێنی ئاوا سپی وەك بنێشت, ئاوا نەرم کە ئەگەر ئاوریشمەکەی لە لەشی بنیادەم دەدریّ, پیاو دەکەوێتە هەژان.

"عەلی, کەوایە, ئەتۆ شوێنی هەموو ئافەریدەیەك لێك دەکەیەوە, تەنانەت شوێنی مێشەنگوینەش؟".

"تا رادەیەك ئاغا".

"ئەمەی چۆن فێر بووی؟".

"هەر بۆخۆم, چونکە ئۆگری بووم لە وەختی راووشکاردا فێری بووم".

"وەستایەك مەستایەکت نەبوو, یەکی وا پێت نیشان بدا؟".

"با, یەکێك هەبوو, پیّیان دەگوت حاجییە کەچەڵ. ئەو تەنانەت شوێنی قورینگی ئاسمان و مێشوولەو شوێنی ماری راخزیوی هەڵدەگرت. بە خوادانە... ئەمجار هەموو شوێنێکیشی دەناسی. ئەمن لە پێش دا ئەوم ناسی. دۆستی گیانی بە گیانیی بابم بوو. جگە لەوەش, ئەمن زۆر حەز لە کەو دەکەم. لە پێش دا شوێنی بارە کەوم هەڵدەگرت. زۆر باش شارەزای ئەخلاقی کەوان بووم. شوێنەکەیانم هەڵدەگرت و راستەریّ دەچوومە سەر هێلانەکەیان. سالیّ لەوانەبوو پێنسەد کەوبارە بگرم و گەورەیان بکەم. بەلیّ بەم جۆرە, بەم جۆرە... بێینە سەر باسی حاجییەکەچەڵ. ئەو هونەری خۆی فێری هیچ کەس نەدەکرد, تەنانەت کوڕی خۆشی. هیچ کاتێك شاگردو ماگردی رانەدەگرت... ئەو لە کویّ و ئێمە لەکویّ... شوێن هەڵگری وەك خۆی نە هاتوەتە سەر دونیاو نە دێتە سەر دنیا. ئێمە لە چاو وی منداڵین. تەنانەت مووسا سەرسەڕیش بە قامکە چووکەڵەکەی نابیّ".

"تەواتورە".

عەلییش دووپاتی کردەوە:

"تەواتورە".

✧ ✧ ✧

عەلی دواتر بەرە بەرە ئۆگری باڵندەکانی دیکەش بوو. ڕۆژێکیان کە بۆ گرتنی جووچکە شەهێنێك وەشاخێك هەڵدەگەڕا کە سێ هێندەی سپیدارێك بەرز بوو, کەوتە خوارو لاقی شکا, هەربۆیەش لاقی شەل بوو. بەو حاڵەش دەستی لە هەلگرتنی شوێنی باڵندەکان هەڵنەگرت و لەو ڕێگایەدا لە چیاو دۆڵ و دارو بەرد باکی نەبوو. ئەگەر شوێنێکی لە جێیەك دیبایە, بە قیمەتی گیانیشی بووایە وەدوای دەکەوت و خاوەنی شوێنەکەی دەدۆزیەوە. لە شوێنی باڵندان بگوزەرێ, عەلی شێت و شەیدای شوێنی گیان لەبەرانی کێوی بوو. بەدوای ئەم ئاواتەشی دا بێ ترس لە شیو و دۆڵ و شاخ و چیا تووڕووسی هەزار بە هەزاری پشکنی. ئەمجار شوێنی جڕوجانەوەری چووکەڵە, مێرووڵەو پەپوولەو نینۆکە شەیتانە فێر بوو و بە دوای ویش دا شوێنی بنیادەم... عەلی لەم دنیایەدا جگە لەمە کارو هونەرێکی نەبوو, هونەرێك کە زۆر جار خەریك دەبوو بە قیمەتی گیانی تەواو بێ. عەلی بەدوای ئەم خولیایەدا ئەخلاقی ئاوو دارو ماسیی نێو ئاوو هەموو شتێکی دیکە شارەزا بوو. لە شوێنگێڕان دا جارێکیان عەلی لووت و بزووت لەگەڵ مارێك بەرەوڕوو بوو. ڕووبەڕووی یەکتر وێستان و چاویان لە چاوی یەکترەوە بڕی. نە مارەکە ڕووی لە عەلی وەرگێڕاو نە عەلی لە مارەکە... ئەم دووانە ڕۆژێك تا ئێوارێ ئاوا چاویان دە یەکەوە بڕی و وەك تەلیسمیان لێکرابێ, ڕەق ڕامان. لەو تێکەوە ڕامانەدا عەلی هەرچی لە دڵی مارەکەدا بوو, خوێندیەوەو مارەکەش هەرچی لە دڵی عەلیدا بوو... ئێوارێ مارەکە سەری خستە سەر زەوی و گەڕایەوە, بێئەوەی دەنگ لە زەنگوڵەکانی خۆی بێنێ. پاش ماوەیەکی زۆر دەنگی خۆشی زەنگوڵەکەی لە دوورەوە هاتە بەر گوێ.

✧ ✧ ✧

"عەلی ئەتۆ غەیبیش دەزانی؟".

عەلی دەسبەجێ هەستاو لەسەر جێیەکەی دانیشت و بە ترسەوە گوتی:

"نا, حاشا! ئێمە لە کوێ, غەیب زانین لە کوێ... نا, حاشا!"

"ئەمن وام بیستبوو".

عەلی لە کاتی گەشت و گوزار بە تووڕووس دا شوێنی ڕێوی, گورگ, پڵنگ, دەڵەك, پشیلەی کێوی و ورچانیشی هەڵدەگرت و لان و کونەکانیانی دەدۆزیەوە. تەنانەت چەند شەوی زستانێشی لەگەڵ چەند ورچ دا کە لە خەوی زستانێدا بوون لە ئەشکەوتێك دا بەسەر برد.

چەندی بزنە کێوی، شوورو سمۆرەو سەگلاوك راو کردن. وەختێك شوێنی شەهێن و بازو هەڵۆشی هەڵدەگرت و هێلانەکانیانی دەدۆزیەوە" لە رێگادا لەگەڵ گوڵەکان قسەی دەکرد. حەمەدۆك لەبەرچاوی رەسەنترین و نەجیب ترین ئافەریدەی ئەم جیهانەو رووناکایی هەردوو چاوانی بوو.

"عەلی! منداڵەکانیشت لە چیا بێنە خوارێ".

"ئاغا، عەرزم کردی، ئەگەر ماڵ و منداڵەکەم بێنمە ئێرە، حەمەدۆك شك دەکا. تێگەیشتی؟".

مورتەزاغا لە حاڵێك دا لە خۆوە هەناسەی هەڵدەکێشا، گوتی:

"تێگەیشتم" و لەسەری رۆیشت:

"ئا...خ عەلی، ئا...خ!".

هەناسەیەکی هەڵکێشا دەت گوت جەرگی بریندارە، پاشان لەسەر قسەکەی رۆیشت "ئا...خ، ئەگەر سەری ئەو کافرە چەپەڵە هەڵکەنی، دەزانی چیت بۆ دەکەم و چەندەت چاکە دەرهەق دەکەم...".

عەلی ئاورِی وێ دابووەوە تەماشای دەکردو چاوەرِێی درێژەی قسەکانی بوو.

"فەرموو ئاغا".

"دەزانی چیت دەرهەق دەکەم. دەت نێرمەوە دێیەکەتان، ماڵ و منداڵەکەت پێ دێنمە ئێرە. لەنێو کێڵگەدا خانوویەکت بۆ ساز دەکەم، پێشت خۆش بوو لە شارۆچکە خانووت بۆ دروست دەکەم. لە نێو شاری بێ باشتریش، هەتا دەمرم لێت جیا نابمەوە. لەنێو کێڵگەدا چەند پارچە زەویت دەدەمێ. ئەسپێکی عەرەبییشت دەدەمێ سواری بی. ئەسپێك کە لە چوکووراوا دا تاق بێ ـ گەرم داهاتبووـ عەلی!".

"فەرموو ئاغا".

"سبەینێ دەمەوێ ئەسپێکت بدەمێ، ئەسپێکی عەرەبی بە زینی چەرکەسییەوە. با حەمەدۆك ببیسێتەوەو بتەقێ، بتەقێ. وا نیە؟".

عەلی گوتی:

"بتەقێ".

"ئێستا کەوایە با بخەوین. لەبیرت نەچێ. سبەینێ قەرارە جلەکانت وەرگرینەوە. سبەینێ ئێوارێ. کڵاو شەبقە فووتێرەکەشت لەبیر نەچێ. سبەینێ دەبی بە پیاوێکی دیکە. پاشانیش... ئا...خ، پاشانیش جووتە کەوشی ئەرەسی نەك ئەو پێڵاوانە، ئەگەر بریقەدار بن...وەختێك ئەتۆ برای من بی،

دەبێ وەك مستەفا کەمال پاشا پۆشتە بی, لەژیانت دا چاکەت و پانتۆڵت لەبەر نەکردوەو کڵاو شەبقەی فووتێرت لەسەر نەناوە, وانیە؟".

"نا ئاغا".

"با بخەوین, بۆگەنێکی پیس دێ".

"بۆنی جەنازەکەیە".

عەلی دەسبەجێ خەوی لێکەوت, بەڵام هەتا تولعی بەیانی خەو لە چاوی مورتەزاغا نەکەوت. بۆ ئەوەی بزانێ عەلی خەوی گرانە یان نا, چەند جار تاقی کردەوە, بەڵام خەوی عەلی وەك خەوی پەلەوەر سووك بوو. بە کەمترین دەنگ دەسبەجێ وەخەبەر دەهات و هەر لەو ساتەدا دەستیشی بۆ ئەو چەکە دەبرد کە لەبن باڵنجەکەی دا بوو. کاتێکیش تێدەگەیشت کە دەنگی مورتەزاغا بووە, زەردەیەکی دەهاتێ, سەری وەسەر سەرینەکەی دەکردو خەوی لێدەکەوتەوە.

بەیانی کە لە خەو هەستان هەردووکیان خۆشحاڵ بوون. عەلی کەم کەم ئۆگری مورتەزاغا دەبوو و ئەم هەستە, ئەوی دەترساند.

ئەو بەیانیيە حەسنەخان بەرچایيیەکی زۆر خۆشی بۆ میوانە بەرێزەکەیان ئامادە کردبوو: بەرە مەشکەیەك رۆنەکەرەی تازە کە هێشتا بڵقە دۆیەکانی لەسەر بوون, هەنگوینی سپیی تازە براوەوە, سەرشیری تازە, شیر, چاو نانی گەرمەتەندوور کە بە دەستی خۆی هەویرەکەی شێلابوو... سفرەکە تەنیا شیری مریشکی لەسەر نەبوو. دیسان وەك شێوی دوێشەو, بێ ئەوەی قسەیەك بکەن, بەرچایيیەکەیان تەواو کرد. بەیانی ئەو رۆژە لە روخساری حەسنەخان دا ئارامیيیەك بەدی دەکراو بە هەر هۆیەك بوو هەستی بە خۆشحاڵی دەکرد.

"یاڵڵا با برۆین عەلی, بەلکوو بتوانم ئەو سەربازە راکردووە خوێڕیيەی جاسووسی فەرانسەیيیەکان کە پێی دەڵێن عارف صائم, تاوێك بە تەنیا بەگیر بێنم و لەبارەی ئەو بەلایەوە کە پێی دەڵێن حەمەدۆك نەختێکی قسە لەگەڵ بکەم. بەلکوو تێی بگەیەنم کە ئەو مارە بووەتە چ هەژدیهایەك. یەك یەك هەموو شتێکی تێبگەیەنم کە ئەگەر مانگێکی دیکە پێ بچێ, تەنانەت جەنابی چاڵ هەلکەن پاشا ئەفەندییش بێتە چیاکانی تووڕووس ئیدی ناتوانێ دەرەقەتی بێ. ئەو وەخت ئەقڵیان دێتەوە بەر خۆیان. بەڕاست بزانم ئەو پیاوکوژە دەتوانێ دەردی ئێمە بگەیەنێتە گوێی ئەنکەرە؟".

خانم بە دڵنیایی تەواوەوە گوتی:

"دەتوانیٚ, بەقوربانت بم ئاغا, هەر ئەوەندە بەسە جارێك دەستت بگاتە داوێنی".

مورتەزاغا بە پەلە راپەڕی بۆ لای پلیکانەکان. کڵاو گەرگەرییە رەشە فووتێرەکەی بەدەستیەوە گرتبوو. ئەمڕۆ دەستێك جلکی سوورمەیی لەبەردا بوون و لەگەڵ کراسە سپییەکەی بۆینباغێکی سووری بەستبوو کە خەت خەتی سەوزی تێدا بوون. کەوشە بریقەدارەکانی بریسکەیان دەدا. دەسرۆکەیەکی سووری لەگیرفانی چاکەتەکەی چەقاندبوو. چاوە دەرپەڕیوەکانی هەروەك جاران لە ترسان لە کالانەدا زەق دەچوون. روخساری لەڕو لاوازو گنجی دەم و چاوی قووڵ و نێوچاوان و سیلەی چاوانی پڕ گنج و لۆنج بوون. وەختێك پێدەکەنی بە ئێسکی قورتۆمەی و گنج و لۆنجی قووڵی روخساریەوە وەك ئینسانێکی راست و گەرم و لەبەر دڵان دیار بوو.

ئەو لە پێشەوەو عەلی بە دوای دا لە پلیکانەکان چوونە خوارو بەرەو ماڵی تاشکەن خەلیل رۆیشتن. کە گەیشتنە وێ مورتەزاغا کەیفی ساز بوو. ترۆمبێلی بەگ لە حەوشەی ماڵێ راگیرابوو, پاك و خاوێن و نوێ نوێ.

مورتەزاغا رووی کردە ترۆمبێلەکەو گوتی هەر لەوێ بە, با مورتەزاغا بێ چاوە رەشەکانت ماچ کا. ئاوڕی دایەوە سەر عەلی کە لە دوایەوە دەڕۆیشت. گوتی ئەتۆ لەبن ئەم دارە چاوەڕێ بە, بەلکوو ئەم خوا گەورەیە لایەکم لێ بکاتەوە. ئۆ...ی لەم بۆگەنە, مێچکی سەری پیاوی دەگرێ. خەریکە بێهۆش بم. دەمانچەکەتت پێیە؟".

"پێمە".

"ئێستا کەوایە زۆر باشە, بەڕاست, نێوانت لەگەڵ ئەم بۆگەنە چۆنە؟"

"وەختە بمرم".

"ئێستا کەوایە زۆر باشە. چاوەڕێ بە. دنیا زۆر گەرمە, ئی جەنازەکەیە. دەبێ تەحەممول بکەین".

دەرگا کرابووەوە, بێ سێ و دوو چووە ژوورێ و لە پلیکانەکان وەسەر کەوت. تاشکەن خەلیل بەگ لەسەر پلیکانەکان پێشی پێ گرت و بە تووڕەیی گوتی:

"مورتەزاغا, بابت گاین, ماڵت وێران کردین, زەلیلی دنیات کردین, ئەم برووسکانە چین؟ ئەنکەرەت وەبەر تۆپ داوە. ئەتۆ چتە, شێت بووی؟ چەتەیەکی بێقیمەت کابرایەکی بێقیمەتی کوشتوەو وەکێوان کەوتوە. کەس نازانێ گرتوویانە یان نا. دەڵێی هەموو خەلکی دنیا راپەڕیون, هەر کەست لە شارۆچکەدا دەست کەوتوە تەلگرافێکت پێ کردوە, شێت بووی؟ بەگ ئێستا لە خەو هەڵدەستێ. ئەمانە ببیسێتەوە... ئەو جۆرە ناتەمنییە, ئەویش لە ناوچەی هەڵبژێرانی وی دا.

ئەگەر بەگ ئەمەی ببیسێ, کە ئاخرەکەی هەر دەشی بیسێ, ئەمن خۆم تێکەڵ ناکەم, چوار مێخەت دەکێشێ, یان لە پشتی ترۆمبێلەکەیت دەبەستێ و هەتا ئەدەنە رات دەکێشێ ئەودەم کوتی گەورەت گوێچکەت دەبێ".

میوانەکانی دیکەی تاشکەن خەلیل لە کاتێك دا مورتەزاغا بە حەبەساوی تەماشای تاشکەن خەلیلی دەکرد, دەورەیان داو لە تاشکەن خەلیل توندتریان پێ گوت. شوکری خوای دەویست کە بەگ خەوتبوو, بە دەنگی بەرز قسەیان نەدەکردو نەیان دەنەراند. بەڵام هەر وشەیەك کە لە دەمیان دەهاتەدەر, وەك خەنجەرێکی ژەهراوی لە دڵی مورتەزاغا دەچەقی. لەو نێوەدا تێمابوو, و لە حاڵێك دا لە پەستا چاوی دەترووکاندن, نەیدەزانی چ بکاو چۆن بەرگری لە خۆی بکا. سەرەنجام هاواری کرد:

"بۆگەن دێ. ئەی کە چ بۆنێك دێ, ئەی بە گۆڕی بابی مردووی, بە گۆڕی بابی زیندووی, بە گۆڕی بابی تەلگراف و گۆڕی بابی هەموو شتێك... ئەی کە ئەو بۆنە مێچکی سەری بردم. ئەی خوا بکا بەگ وەخەبەر نەیە, بەڵێ وەخەبەر نەیە. ئەگەر بەگ خەبەری بێتەوە ئەم بۆگەنە چ لێبکەین, دەبێ چ بکەین".

"چ دەتوانین بکەین. ماڵە مردووەکە لەبن لووتمانە. بەڕاستی ئەم بۆنە زۆر سامناکە... پیاو چ بکا باشە؟".

"هەتا بەگ هەڵنەستاوە, مەیتەکە لە ماڵێ لابەین و بیبەینە مزگەوت".

روشدیی بازپورس گوتی:

"دەبێ بیبەین".

قایمقامیش هاتبوو:

"دەبێ دەسبەجێ بیبەین".

داواکاری گشتی:

"ئەویش هەر ئێستا... ئەگەر بەگ خەبەری بێتەوە...".

هیدایی, قازیی خانەنشین, بە شڵەژاوی گوتی:

"کۆلۆنیا کۆلۆنیا".

"هەرچی کۆلۆنیا بووە, پێشتر بردوویانەتە ماڵی مردووەکە".

لە نەکاو لە ژوورێ دەنگێك وەك دەنگی گاجووت بەرز بووەوە. خەلیل بەگ گوتی:

"بەگ هەڵستا. مومکین نیە ئەم بۆنەی بۆ نەچێ." و دەسبەجێ بەرەو ژوورەکە رایکرد.

بەگ هەستابوو, لەنێوەڕاستی ژوورەکەدا دەگەڕا, دەرپێیەکەی دادەکەندو دووبارە دەپێی دەکردەوەو گێژو پەرێشان لە کراس و پانتۆڵەکانی دەگەڕا.

تاوێك پاش ئەوەی هاتەوە سەر خۆی پڕ بە گەرووی دەستی کرد بە نارەتە کێشان:

"بۆگەن دێ, بۆگەن, لە توانا بەدەرە, بۆگەن دێ, ئەمە چیە ئەوەندەی بۆن کردوە؟ ئەم بۆگەنە ئی چیە؟ پانتۆڵەکەم کوا".

"ئەمەتا بەگ, ئەمەتا".

"بۆگەن دێ".

"فەرموو چاکەتەکەت".

عارف صائم کە بە پەلەو بە دەستی لەرزۆکەوە جلەکانی لەبەر کردبووەوە, بە سەرو قژی ئاڵۆزەوە دەرپەڕی:

"ئەمان خەڵکینە, بۆگەن دێ. ئەمن لە ژیانم دا بۆنی وام بۆ نەهاتوە. هەموو جێیەك بۆنی گرتوە. ئەو بۆنە من دەکوژێ کۆلۆنیا کۆلۆنیا... شتێك... هەرچی بێ, بۆگەن دێ ئەم بۆنە چیە؟".

مورتەزاغا غاری دایە نێوەڕاستێ:

"حەمەدۆکی چەتە... چەند ڕۆژ لەمەوبەر عەلی سەفابەگی کوشت و ئێستا وەکێوان کەوتوە. گۆیا بەنیازە هەموو چیانشینەکان بکوژێ, دار لە قوونێ هەموانیان ڕابکا. سەری ئەم مارە... دەستم بە داوێنت بەگ... مراد پاشای چاڵ هەڵکەن... هەر ئەم ڕۆژانە ئەو مارە دەبێتە هەژدیهایەك...".

"کۆلۆنیا... کۆلۆنیا...".

"حەمەدۆك... مار... کوشتی... بۆنی کردوە".

عارف صائم بەگ لە حاڵێك دا قایش پشتێنەکەی دەبەست غاری دایە سەر پلیکانەکان:

"بۆگەن دێ... شۆفێر... دەسبەجێ... کوڕم زوو ترۆمبێلەکەت هەڵکە... جەنابی فەرماندە, جەنابی والی, هاوڕێیان! زووبن دەرفەتی ماڵئاوایی نیە, ئەمن مردم, خنکام, خەریکە بێهۆش دەبم".

ئەوانی دیکەش بە پەلە چوون و ترۆمبێلەکەیان پڕ کرد.

"زووبە, وەڕێ کەوە".

ترۆمبێل بە هەموو خێرایی خۆی لە حەوشەی دەرپەڕی, لە حاڵێك دا هەورێکی تۆزوخۆڵی بە دەوروبەردا بڵاو کردبووەوە لە شارۆچکەی دەرکەوت و ڕۆیشت.

عارف صائم بەگ بە خۆشحاڵی‌یەوە گوتی:

"ئەجاتمان بوو, ئەجات".

مورتەزاغا بە خۆڕانانەوە بە خەڵکی شارەکەی ـ کە لە پشتەوەڕا سەیری ترۆمبێلەکەیان دەکرد ـ, گوت:

"پێم گوت, حاڵیم کرد. هەر ئەم رۆژانە هۆردوویەکی گەورە هەروا بزانە هۆردووی مراد پاشای چاڵ هەڵکەنە دێتە ئێرە".

لە وەختی قسەکردن دا روانیە دەوروبەری خۆی, کەسی لێ‌نەمابوو, هەرکەسەی چووبووە قوژبنێك. هاواری کرد:"عەلی, عەلی یاڵڵا وەڕێ کەوە با ئێمەش برۆین. هەموو شتێکم بە بەگ گوت. بۆنی مەیتەکە کاری خۆی کرد. ئەگینا ئەو سەگبابانە نەیان دەهێشت زار هەڵپچرم. یاڵڵا غاردە با لێرە دەرکەوین, بۆ دەری شارۆچکە".

بە سەرەوژێرەکەدا بەرەو پردێ دەخۆ نووسان, پاش ئەوەی لە پردەکە پەڕینەوە, لە بەستێنەکە لەنێو بڕکە ئاڵەتە کێوی‌یەکان دا راوەستان. بۆنی مەیتەکە لە چۆمی نەپەڕیبووەوە لەوبەری ئاوەکە گیر ببوو.

"عەلی دیتت؟ شار چۆڵ بووە. لادێیی‌یەکان رایان کردوە. ئەتۆ دەڵێی کێ مردووەکە دەنێژێ؟".

"کەسێك هەر پەیدا دەبێ ئاغا".

"عەلی! راوەستە بزانم, دەکرێ ئێمە برۆین؟".

"دەکرێ ئاغا, بەڵام با نەڕۆین".

دەمانچەکەت بە دڵ بوو؟".

"زۆرم پێ باش بوو ئاغا".

"دەمانچەی خۆم بوو".

"زۆر مەمنوون ئاغا".

"ئەسپەکەش سبەینێ لە کێڵگە دێننەوە. پێم وایە ئەو حکوومەتە خوێڕی‌یە دەرەقەتی حەمەدۆك نایە. کاك عەلی ئێمە خۆمان دەبێ کارەکە یەك لا بکەین".

"کێ دەزانێ, هیچ روون نیە".

"ئەوە هات و بوو؟".

"ئەودەم بیری لێ دەکەینەوە ئاغا".

مورتەزاغا چاوی بڕیبووە بنی چاوی عەلی‌یەشەلەوەو تەماشای کرد. دەت گوت لەو قووڵاییەوە لە زۆر دوور بە دووی شتێك دا دەگەڕێ. عەلییش کە دەیزانی ئەو لە چی دەگەڕێ, لە ناخی دڵەوە پێدەکەنی.

"عەلی. لەنێوەڕاستی دڵت دا بەمن پێدەکەنی؟".

"وازی لـێ بێنە ئاغا".

"واز لە چی بێنم".

"ئەوەی بە دوای دا دەگەڕێی. مورتەزاغا. پیاو ناتوانێ بنیادەمی بناسێ. ئەمڕۆ لە حاڵێك دایەو سبەینێ لە حاڵێك دا. ئاغا بنیادەم ئەگەر بیەوێ هەموو ڕۆژێ دەتوانێ دووبارە لە دایك بێتەوە. هەر ڕۆژەی بەیانی بنیادەمێکی دیکەی تازە لە دایك دەبێ, بنیادەمێکی باش... یان بنیادەمێکی خەراپ... ئێستا ئەو کەسەی تەماشای دەکەی ئەمنم, عەلی, لەوانەیە سبەینێ کارێکم لە دەست بقەومێ کە بە ئەقڵی من و تۆش دا نەهاتبێ. بۆیە دەڵێم لێی گەڕێ, زۆری قووڵ تێمەگرە, زۆری وەدوا مەکەوە. ناسینی بنیادەم ئەوەندەش ئاسان نیە. تەنانەت باڵندەو جڕوجانەوەریش دەرو ژووریان پێکەوە فەرقی هەیە. هەیەتی. بڕوانە ئاغا, تەنانەت ئەگەر یەکێك بڵێ لەم جیهانەدا توانیومە یەکێك, خێزانم, برام, خوشکم, کچم, کوڕم, دایك و بابم بناسم, بزانە درۆ دەکا".

"پیاو ئەو کەسەی کە پێی وایە ناسیویەتی, لەگەڵ خۆی بەراورد دەکاو دەیناسێ".

"ڕاستە, بەراوردی دەکا".

"بنیادەمێك هەرچەندی وەك تۆ بچێ, ئەوەندەش وەك تۆ ناچێ. هیچ مرۆڤێك وەك مرۆڤێکی دیکە ناچێ".

مورتەزاغا گوتی:"ڕاستە وێك ناچن." و بە ڕاماوی‌یەوە لە سەری ڕۆیشت:"ئاش کرێ وێك بچن".

"ئێستا کەوایە هەوڵ مەدە من بناسی".

مورتەزاغا پێکەنی و لە حاڵێك دا دەستی ڕاستی لەهەوادا ڕادەوەشاند, گوتی:

"وازم لـێهێناو تەواو بوو. پەژیوان بوومەوە, بەڵام نازانی چەندە حەز دەکەم بزانم ئەتۆ کێی؟ چیی؟ ئەمن بنیادەمی وەك تۆم نەدیوە, لەم دنیایەدا کەسی دیکە وەك تۆ پەیدا نابێ".

"پەیدا دەبێ, زۆریش پەیدا دەبێ. وەختێك کەسێك هونەرێکی هەیە, دەکرێ بڵێی هەموو کەس هەیەتی, هەر ئەوەندە بەسە کە بتەوێ, لە دڵەوە بتەوێ. هیچ شتێك لەدەستی بنیادەم دەرباز نابێ".

"ئێستا ئەگەر ئەمن لە دڵەوە بم ویستایە ببمە شوێن گێڕێکی وەك تۆ, دەم توانی؟"

"دەت توانی, ئەگەر بە دڵ و گیان بت ویستایەو پێیەوە نووسابای, دەت توانی".

"ئەتۆ بۆچی تۆگری ئەم کارە بووی, هەموو ژیانت لەسەر شوێن گێڕان داناو بە شتێکی دیکەوە نەنووسای. ئەم شوێن گێڕانە, هونەرێکی وا بە کەلکی چی دێ, بە کەلکی چی دێ... وەختێك ئەم

کارەت دەست پێکرد, یانی ئەودەم کە تازە خەریك بووی فێر بی هیچ بیرت کردەوە کە ئەم هونەرە بە کەلکی چی دێ, یان نا؟".

"ئەودەم هیچ بیرم لێنەکردەوە. پاشان وەختێك بە ساڵ دا چووم دەستم کرد بە بیرکردنەوە".

"ئێستا چۆنی تێدەگەی, ئەم هونەرە وردەی تۆ کە هیچ کەس نیەتی, کەلکی چیی بۆ تۆ هەبووە؟".

زۆرم بیر لێکردۆتەوە, بەڵام ماوەیەکی زۆر نەم توانیوە وەڵامێکی بۆ بدۆزمەوە".

"پاشان؟".

"پاشان لە پڕ بە فکرم دا هات".

"چیت بە فکردا هات؟".

"لە خۆمم پرسی ژیان بە کەلکی چی دێ؟ مورتەزاغا ئەتۆ پێم بڵێ ژیان بە کەلکی چی دێ؟"

مورتەزاغا چەند لەحزەیەك بێدەنگ بوو. دیسان چاوی لە چاوی عەلیەوە بری و پاش تەماشایەکی درێژ, لە حاڵێك دا لەدڵەوە پێدەکەنی بن پیلی عەلیی گرت:

"بەڕاست عەلی, ژیان, ئەو هەموو لە مەرگ ترسانە, بۆ ژیان ئەوەندە خۆ نزم کردن, زوڵم کردن, ماڵی حەرام خواردن و پیاوکوشتن بە کەلکی چی دێ؟ پاشانیش یان شارۆچکەیەکی ئاوا, یان گۆڕێکی تەنگ پڕ دەکەین لە بۆگەن. ئای, مەیتی بنیادەم ئەوەندەی بۆن هەبوو و ئەمن نەم دەزانی, لە کەلاکە سەگ خەراپتر. ئەمنیش رۆژێك ئاوا بۆن دەکەم؟"

"خوا نەکا!".

"بۆچی, بۆچی... رەنگە لەمەش خەراپتر بێ... عەلی!".

"فەرموو ئاغا".

"لێت وەسیەت بێ ئەگەر حەمەدۆك کوشتمی, دەسبەجێ بێ ماتڵی بم نێژە".

"حەمەدۆك تۆ ناکوژێ".

مورتەزاغا لە کاتێك دا سێ جاری پێ بە زەویدا دەدا, گوتی:

"دەم کوژێ, دەم کوژێ".

خیزی بن پێی بەم لاو لادا بڵاو بووەوە.

"ئەمەیان ئیدی نازانم ئاغا".

"راستە ئەتۆ نازانی. نازانی. بەڵام دەبینی. لەم شارەدا ئێستا نۆرەی منە. بریا هێندەم سەر ناویشتبایە سەر".

عەلی قسەی نەدەکرد.

ماوەیەکی زۆر لە لێواری رووبارو باغە پرتەقاڵەکان دا گەڕان. چوونە گوندەکەی خوارەوە. تەماشای پرتەقاڵ و لیمۆو نارنجەکانی مورتەزاغایان کرد. پرتەقاڵەکان هێشتا چووك بوون. هەر یەکەی هێندەی هێلکە کۆترێك. مورتەزاغا باسی نەکرد. بەڵام ئەم باغەشی لە دۆستە ئەرمەنیەکەی پێ گەیشتبوو.

بە بیستنی بانگی نیوەڕۆ لەدوورەوە، لە جێی خۆیان راوەستان. هەتاو لە شووشە پەنجەرەکانی شاری دەداو رەنگدانەوەکەی دەوروبەری رووناك دەکرد. نەك هەر شارۆچکە، بەڵکوو دەوروبەریشیان هەتا دوور، هەتا لێڕەوارەکەی سەرەوە لەو رەنگدانەوەیەدا دەدرەوشا.

"خەریکن نوێژێ دەکەن".

"تاوێك دواتر عەلی سەفابەگی دەنێژن".

خزمان و رەعیەتەکانی عەلی سەفابەگ جەنازەکەیان بە زەحمەت هەتا مزگەوتێ برد، تەنانەت یەکێك لەوانەش کە تابووتەکەی هەڵگرتبوو، بێهۆش بوو، و تەرمەکە لەسەر زەوی کەوت. بە هەزار زەحمەت بردیانە مزگەوت و لەسەر بەردە نوێژیان دانا. لەبەر بۆنی زۆر، مەلا حازر نەبوو مەیتەکە بشوا بەڵام یەکێك لە پیاوەکانی عەلی سەفابەگ دەمانچەکەی هەڵکێشاو سێ گوللەی بە بن پێی مەلاوە نان. لە ناکام دا مەلا لە حاڵێك دا لە ترسان دەلەرزی چەند قاپ ئاوی بەسەر تەرمی عەلی سەفابەگ دا رشت و کارەکەی تەواو کرد. لە سەفی نوێژی مردوو دا شەش کەس مابوونەوەو هەتا گەیشتنە گۆڕستان تەنیا سێ کەس بە دوای جەنازەکەوە مابوون.

دەرگاو پەنجەرەی ماڵەکانی شار توند توند داخرابوون. وەختێك ئەو دووانە گەیشتنەوە شار، شارەکە چۆڵ و بێدەنگ بوو. حاشا لە پشیلەیەك یان سەگێکیش. ئەوەندە بێدەنگ بوو دەت گوت هەموو بوونەوەرێکی زیندووی ئەو شارە هەزار ساڵ لەمەوبەر، لەبەر ئەم بۆگەنە لەبڕان نەهاتووە ئەوێیان بەجێ هێشتوە.

"هیشتا بۆن دێ".

"بەڵێ ئاغا".

"بەڵام کەمتر بووە".

"سبەینێ جلکەکانت وەردەگرینەوە".

"باشە سبەینێ ئاغا".

"سبەینێ ئەسپەکەش لە کێلگە ڕا دێننەوە. تازە یەکێکم ناردە کێلگە".

"زۆر سوپاس ئاغا".

## (٤)

موسلیم کوڕە شوانەوێڵەی چاردەساڵە لەدوێنێ شەوێوە تا ئێستا لەم بنارە دانیشتبوو, جار جار خەوی لێ‌دەکەوت, بەڵام بەشی زۆری بەخەبەر بوو, و لەخۆوە چاوەڕوان بوو, داردەستە بەخەڵوز نەخشاوەکەی هەتا قامکی لاقی لە پێش خۆی درێژ کردبوو. کەپەنکەکەی کە وێنەی هەتاوی بە ڕەنگی نارنجی لەسەر سنگی نەخشابوو, لە پەنای خۆی بەسەر گوێنێیەك دا دابوو. سەگێکی زەردو گەورەی بەر مێگەل سەری وەسەر چەمۆڵەی کردبوو, و لەبن شاخەکە لە قوژبنێك خەوتبوو. ئەو بزمارانەی لە قەڵەدەکەی ملی درابوون, هێندی خەنجەرێك درێژ بوون. مەڕەکان لە دەشتە پان و سەوزەکەی خوارێ دا کە تاق تاقە داری لێ‌ڕوابوون, مۆڵیبوون. گوێنێیە سووراوییەکان لەو شوێنەوە کە کوڕەکەی لێ‌خەوتبوو هەتا دوندی کێوەکە سەرانسەری بناریان داپۆشیبوو. هەتاو کە بەرز ببوو تیشکی خۆی بە بەربلاوی و دڵفرەوانی بە دەورووبەردا بەرەڵا کردبوو, و لێڕەوارو شاخ و بەردو ئاسمانی پڕ لە تیشکی سوور دەکرد.

موسلیم ئەو کوڕە شوانەوێڵەیە ئارامی نەبوو. هەر ئاوە ناتاوێك هەڵدەستاو هەتا دوندی شاخێکی بەرز کە کەوتبووە ڕۆژئاوا, پێ هەڵدەگەڕاو لەوێ ڕابە چاوەڕوانی‌یەوە چاوێکی لەو جۆگە ئاوە باریکە کە لە ڕۆژهەڵاتەوە بە خوارەپێچە دەهات, ئەو لێڕەوارە کە بە هەزاران ڕەنگی سەوزەوە هەڵدەقوڵی و شەپۆلی دەدان و ئەو جادەیەکە لە بناری رووتەنی کێوەکەی ئەوبەرەوە پێ‌هەڵدەگەڕاو بەودیوی کێوەکەدا شۆڕ دەبووەوە, دەکردو دەهاتەوە لە پەنای کەپەنکەکەی درێژ دەبوو. ڕەنگی ڕوخساریشی بەردەوام دەگۆڕا. دوێ‌شەوێ لە نێو دارستان, لە پشت شاخێکی بڵیندەوە کە لەوێ هەبوو, دەنگی تەقەیەکی بەربلاو هەستاو دوایە بێدەنگ بوو, لای بەیانییش لە دەشتایی‌یەکەی خوارێ لەو شوێنە کە مەڕەکانی لێ‌بلاو ببوونەوە هاوارێك هەستاو بە دوای ئەو هاوارە دا دەنگی سێ تفەنگان هات.

✧ ✧ ✧

موسلیم شوانی هۆیەی ساری کەچیلی بوو. هۆیەکە لە جێی هەمیشە, واتە لە دۆڵی گەورەی قزڵ کارتاڵ لای رۆژهەڵاتی کێوەکە هەڵی دابوو. راست لە نێوەڕاستی لەوەڕگەی سەرسەوزو لەبن شاخێکی گەورە کە راست لەبن لووتکەی کێوەکە بوو, کانیاوێك هەڵدەقوڵی کە کەفە سپی‌یەکەی بە دەوروبەردا دەپرژاند.

لە دوێنێ شەوێ وە بێدەنگی‌یەك بەسەر هۆیەکەدا کشابوو. هەمووان بە سرتە قسەیان دەکرد, هاتوچۆ لە چادرێکەوە بۆ چادرێکی دیکە, شڵەژان, کەمێك ترس و شادمانی‌یەکی زۆر. موسلیم شوان ئاگای لە هەموو شتێك هەبوو, مەڕەکانی کێشابووە ئەم لایەو لە دوێنێ ئێوارێوە چاوەڕێ بوو. ئەو, ترس و شادمانیی هۆیەکەی بە هەموو گیانی خۆی هەست پێ‌دەکرد. کەس لەو بارەیەوە شتێکی پێ‌نەگوتبوو, کەسیش داوای لی‌نەکردبوو کە بڵێ: کوڕە, موسلیم! وا بکەو وا مەکە. لە چاوە سەوزە چیمەنی‌یەکانی دا شادمانی و چاوەڕوانی پێکەوە شەپۆلیان دەدا. قسەی خۆمان بێ جاروباریش ترس و بە دوای ویش دا هەستێکی بەژان لە هەناوی دەگەڕا, بەڵام نەی‌دەزانی چ بکا. هەرکەس لە خوارەوە, لە هەر نوختەیەکی چوکووراوا ڕا دەهات دەبوو بەو ڕێ‌یەدا تێ‌پەڕێ کە بەنێو دارستان و بە بن بەردەڵانەکەدا دەڕۆیشت و چۆمێکی چووکەڵەشی بە پەنادا رادەبرد. ئەم جادەیە کە تەواو دەبوو, دەگەیشتە رێگایەکی دیکە. ئەم رێگایە بە مەڵبەندێك دا تێ‌دەپەڕی کە مەرێکی زۆری تێدا بڵاو ببوونەوە. ئەم جادەیە یان دەگەیشتە دۆڵی قزل کارتاڵ یان تێکەڵ بەو رێ‌یە دەبوو کە لە کێوەکە بەودیودا دەڕۆیشت. موسلیم کەوتبووە هەناسەبڕکەو دڵی خێرا خێرا لێی دەدا.

ماوەیەکی زۆر هەر لەو جێی لێی بوو, لەسەر زەوی, لەنێو گوڵە گوێنی‌یەکان دا نووست. لەبن چڵە گوێنی‌یەکان کۆمەڵێك خاڵخاڵۆکە بە خاڵی سوورو ڕەشەوە تێکیانەوە داویشت. هەر بەو جۆرە کە گوڵە سووراوی‌یەکان دەدرەوشانەوەو تیشکیان داویشت, خاڵخاڵۆکەکانیش سوورتر بوون وەك مەشخەڵێکی سوور دەدرەوشانەوە.

موسلیم شوان بە پەلە بوو. چاوی لە هەموو تارمایی‌یەکی چووکیشەوە دەبڕی و گوێی بۆ هەر دەنگێکی سووکیش هەڵدەخست. مەڕەکان لە دەشتایی‌یەکەی خوارێ بە ئارامی دەلەوەڕان, و سەگەکە لە پەنای خۆی وەرکەوتبوو. کەمێکی برسی بوو, بەڵێ بەڵام لەبەر بێ‌سەبری و چاوەڕوانی خەریکی خۆ تێرکردن نەبوو. سەرەنجام دەستی دایە ئەو کۆجەڵەیە کە لە پشتێ خۆی بەستبوو, و رۆیشتە خوارێ بۆ لای مەڕەکان.

مەرێکی رەش بەشی گەورەی گرت و دەستی کرد بە دۆشینی، وەختێك کۆجەڵەکە پڕ بوو لە شیری گەرم و کەف کردوو، گەڕایەوە کن کەپەنکەکەی کە وێنەی خۆرەتاوی لەسەر سنگی بوو. نانی لە خورجێنێ دەرهێناو دەستی کرد بە خواردنەوەی شیری بۆن خۆش. هەورێکی سپی لە ژوور دارستانەوە بەرەو خوار دەچوو. شنەبایەکی نەرم هەڵی کردو خستیەوە. هەتاوی بەربەیانی هاوین بەرە بەرە رووناکایی خۆی بڵاو دەکردەوە. لێرەوار بە سەوزایی زۆریەوەو گوڵە گوێنێیەکان بە رەنگی جوانیانەوە تێکەڵ ببوون و هەڵمیان لێ هەڵدەستا. لێرەوار لێرەوە لەبناری کێوەکانەوە تا خوارێ، بگرە تا چوکووراوا راکشابوو، و ئەو گوڵە گوێنێیانەش کە بنارە رووتەنەکەیان داگرتبوو، بە تیشك هاویشتن و رەنگی سووراوی و شین و سوورەوە لەگەڵ پەراوێزی زێڕکفتی هەتاو هەتا دوندی کێوی دەچوونە سەر. لە دوور دەنگێکی نەرم وەك گرم و هۆڕ بە شێوەیەك کە روون نەبوو چیە دەهاتە بەر گوێ. لە پەرپەرۆچکەی ئاسمانێ هەڵۆ گەورە گەورەکان بە جۆرێك باڵیان لێك کردبوونەوەو دەفرین دەت گوت لە جێی خۆیان نابزوون و بە میچی ئاسمانەوە چەسپاون. گوڵێك بە لاسکی درێژو هێشووی سووریەوە لەنێو درووەڵانێك بەرەو هەتاو تێ‌هەڵچووبوو، و گوڵی کورتەباڵا، شین و زەرد، نێوان بڕکە گوێنێیەکانیان پڕ دەکرد. مێشەنگوینەی گەورەو درشت، رەش و بەهێز بە وزەوزی وەك گرماندن لە گوڵێکەوە دەفڕینە سەر گوڵێکی دیکە. باڵندەی چووك و رەنگین، چووك بە ئەندازەی قامکی گەورە، لە گوێنێیەکەوە دەفڕینە سەر گوێنێیەکی دیکە. موسلیم کە تێری خواردبوو، حەوسەڵەی بەسەر چوو، لە کاتێك دا ئەو هەرگیز بێ‌تاقەت نەدەبوو. چەندین سەعات تەماشای باڵندەیەکی چووکەڵە، پیاوێك، مێشەنگوینێك، کرمێك یان هەڵۆیەکی دەکرد، لەگەڵ ژیانی ئەوانە تێکەڵ دەبوو، و خۆی لەبیر دەبردەوە. ئاسمانیش لە پێش چاوی گوڵێکی گەورەی شین و جوان، یان باڵندەیەکی زۆر گەورە بوو کە باڵەکانی لێك کردبوونەوە. موسلیم پاش ئەوەی نانی دەخواردو تێر دەبوو، دەچوو بنە سوێسنەی هەڵدەکەند. لە گوڵە سوێسنەکە را دەی‌زانی درشت ترین بنە سوێسنە لە کوێ دایەو هەڵی دەکەند. ئەو گوڵە سوێسنانەی سیس و وشك بوون بنەکانیان درشت ترو پڕ شیر بوون. موسلیم بە یەك جار دەی‌توانی بنە سوێسنەکان هەڵکەنێ، لەو کارەدا بە تەواوی کارامە ببوو. درشت ترین سوێسنەکان لە تەنیشت بەردەکان، نێو درووەکان و بن بڕکە گوێنێیەکان شین دەبوون. گوڵە لاسك کورتە زەردە پڕ رەنگەکەیان ئەوەندە زەردو بریقەدار بوو، پیاوی دەحەبساند. وەختێك موسلیم بنە سوێسنەکانی هەڵدەکەند، بۆنێکی نەناسراوی هەڵماوی لە خاك هەڵدەستا کە سەری دەسوورەوە دەبردو سەرخۆشی دەکرد.

سوێسنە هەڵکەندن درێژەی کێشا، هەتاو بەرەو رۆژئاوا شۆڕ ببووەوەو ئەو هەروا لە خۆشیی هەڵکەندنی بنە سوێسنە هەموو شتێکی لەبیر چووبووەوە. وەختێك توورەکەکەی پڕ بوو لە بنە سوێسنە پشتی ـ کە نەختێك وەژان کەوتبووـ هەڵێنایەوە. تەماشایەکی خوارێ، نێو دارستانی کردو پاشانیش روانیە سەرەوە،

روانیە ئەو هەڵۆیانە کە بەسەر دوندی چیاکەوە هەڵدەفڕین. ئەمجار دانیشت و بەخەمگینی دەستی بە هەڵکەندنی بنە سوێسنەکان کردەوە. بنە سوێسنەکان توێژاڵێکی قاوەیی کەم ڕەنگی وەك تۆڕیان بەسەرەوە بوو. ئەگەر ئەو پێستە لادەچوو, بنێکی بەقەدەر دەنکە نۆکێکی گەورەو نەختێك گەورەتر دەردەکەوت. بنە سوێسنەکانیان بەکاڵی دەخوارد یان لەنێو شیردا دەیان کوڵاندن ئەمجار دەیان خواردن و بە دەرمانی هەموو دەردێکیان دەزانین. بۆنەکەی تا ماوەیەکی زۆر لەبەر لووتی بنیادەم دەمایەوە.

موسلیم لەلایەك وردە وردە سوێسنەکانی سپی دەکردو لەلایەکی دیکە لەسەرەخۆ دەیجوین و دەیخواردن. دەم و چاوی ئارەق کردووی وەك گوڵە گوێنییەکان داگیرسابوو, و چاوە سەوزە چیمەنییەکانی وەك چاوی هەڵۆ بەردەوام دەوروبەریان دەپشکنی. لەحزەیەك چاوی لە سەگەکەی بوو کە سەری هەڵێناو گوێی قوت کردن. هەستایە سەرپێ. لەلایەك ئەو بنە سوێسنانەی سپیی کردبوون بە مستان وەزاری دەکردو بە پەلە دەیخواردن و لە لایەکی دیکە چاوی بە لێڕەوارو دەوروبەردا دەگێڕا. پاشان سەگەکە هەستاو بەرەو دارستان دەستی کرد بە وەڕین. ئەمجار بە دەم وەڕینەوە غاری دایە لای مەڕەکان. ڕاست لەو دەمەدا لەنێو لێڕەوار مانگ و ئەستێرەی برنجەیی کڵاوی یەکەم جەندرمە درەوشایەوەو کووژایەوەو بەدوای ئەوەدا یاوەر فارووق بە سواری ئەسپێکی بۆر لە لێڕەوار هاتە دەر. روخساری توورە دیار بوو. بە دوای وی دا جەندرمە تفەنگ لە شانەکان وەدەر کەوتن. لە تەنیشت کانییەکە, لەلای ڕاست دەشتێکی هەموار هەبوو. یاوەر لە ئەسپەکەی دابەزی. لە یەکەم ڕوانین دا, ئەو دووربینەی بە سنگیەوە هەڵاوەسرابوو دەبینرا. دەمانچەکەی ڕاست لەبن قایش پشتێنە سەربازییەکەی بەستبوو. دەمانچەیەکی گەورە بوو. چەکمەیەکی بریقەداری لەپێدا بوون. سمێڵەکانی گشت بادابوون و سامێکیان دابوو بە روخساری. جلەکانی دەت گوت تاوێك لەمەوبەر ئوتوو کراون و لەبەری کردوون. جەندرمەکان لەسەر کانیی ئاوەدانی مانەوەو مەتارەکانیان لەبەر پلووسکی دار سنۆبەر پڕ لە ئاو کردو خواردیانەوە. موسلیم بۆ دەرکردنی سەگەکەی کە بە وەڕین بەرەو جەندرمەکان دەچوو, وەك بریسکە غاری دا, چووە خوارێ بۆ دەشتاییەکە, سەگەکەی گرتەوەو بە چاوێکی پڕ لە سەرسوڕمانەوە لە جێی خۆی چەقی و دەستی کرد بە تەماشاکردنیان.

سەرجووخە عەلی کەرتیش لە کاتێك دا کوڕە شوانەکەی نیشانی یاوەر دەدا, گوتی:"شوان! ئەمە یەکەم جارە لێرە کەسێك دەبینم".

یاوەر سەری هەڵبڕی, تەماشایەکی منداڵەکەی کرد کە نەختێك ئەولاتر ڕاوەستابوو, چەند لەحزەیەك یاریی بە قەمچییە دەسك درێژە زێوینە نەخشاوەکەی کردو ئەمجار سەری داخستەوەو بەسپایی گوتی:

"ئەمە منداڵێکە".

عەلی کەرتیش خەڵکی ئەو دێیە بوو کە لە بناری شۆڕەکاتی کێوەکەی ئەوبەر هەڵکەوتبوو. دێیەکی بێ ئاوو گیاو بێ بەرهەم و لە هەژاری دا داماو. عەلی لەبەر ئەوەی لە کاتی سەربازی دا ماوەیەك خۆی ون کردبوو, زێدە خزمەتی بۆ دانرابوو. ئەو پاش ئەوەی چەند جار بوو بە فەرماندەری مەخفەر, کرا بە فەرماندەری جەندرمەی شارۆچکە. لەو بارەیەوە زۆر خۆشحاڵ بوو. هەرچەند لە شارۆچکە نەیدەتوانی وەك مەخفەرەکان بەرتیل وەربگرێ, بەڵام ئەوەی تا ئێستا پەیدای کردبوو, بەشی وی دەکردو بە زیادەوەش. بە جۆرێك کە ئێستا خانوویەکی گەورەی هەبوو. ئەم خانووەی لەنێو باغی ئەرمەنیەیەك دا دروست کردبوو. دەیەویست خۆی بنوێنێ و ئەو ناوبانگەی لەنێو دێی خۆی دا پەیدای کردبوو, بەرێتە سەرترو لە سەرانسەری چوکووراوادا ناوبانگ پەیدا بکا. پووڵ و پایە لەبەر چاوی بێنرخ بوون, لە فکری ناقیسی خۆی دا ناوو ناوبانگی بۆ بنیادەم بە پێویست دەزانی. بۆ گەیشتن بەو ئامانجەش دەبوو حەمەدۆك بگرێ یان بیکوژێ. ئەگەر حەمەدۆك کوژرابا یان گیرابا. هەموو شانازییەکە بۆ یاوەر دەبوو بەڵام بەهەرحاڵ بەشێکی هەرچەند کەمیش با, بەو دەبڕا. بێینە سەر باسی وەکیل باشی عاصم. ئەو نە وەدوای ناوبانگ کەوتبوو, نە وەدوای شانازی. لە جێ دا ئەو لە ژیانی خۆی بێزار ببوو. جگە لەوەش, ئاشقی حەمەدۆك بوو, ئاشقی ئەو خوێنخۆرە کە ژمارەیەك لە شەخسیەتە بەنرخەکانی کۆمارە ساواکەمان وەك عەبدیخان, هەمزەفەندی و عەلی سەفابەگی کوشت, بێئەوەی گوێ بداتە گریانەکەیان. گوللەی راست لە گلێنەی چاویان دا, لەشی منداڵە ساواکانیانی لە بێشکەدا بە سەرنێزە دابێژدابێژ کرد, زمانی ئاغاو بەگەکانی لەبن ڕا بڕی و داری دەو ئینسانە شەریفانە بڕی.

ئەم چیایانە پڕ لە چەتە بوون. سەرجووخە عەلی کەرتیش باش دەیزانی کە نابێ سەر باوێتە سەر زۆر لەو دەستە ڕێگرانە. یاوەر فارووقی مستەفا پاشا سەولەت بە جێی خۆی, تەنانەت عیسمەت پاشاش نەیدەتوانی کاری وا بکا. چونکە زۆر لەو تاقمانە پیاوی بەگ و ئاغاکانی چوکووراوا بوون. هێندێکیشیان چەتەی بێکەس و کار بوون. حەمەدۆك بە ناوبانگ بوو, هەمیشە فەقیرو هەژارو جووتیاران پشتیوانییان لێدەکردو وەك گیانی خۆیان و گلێنەی چاویان دەیان پاراست. بەڵام ئەوانی دیکە هەرگیز یاریدەی کەسیان نەدابوو... نە یاریدەی ئاغاکان و نە یاریدەی جووتیاران... ئەوانیان دەکوشت, بەڵام ژمارەیان لە چیاو بەندەنان زۆر بوو. هەرچەند هەموو مانگێك پێنج تا دە کەسیان لێ دەکوژران, بەڵام دیسان دواییان نەدەهات.

عەلی بە چەتە کوشتن و بەوە کە گوللەیان لە نێوێ چاوان دەدا، بەناوبانگ بوو. هەر لە ئێستاوە ناویان نابوو قەسابی رێگران و عەلی کەرتیشی لە خوابێخەبەر. لەنێو جەندرمەکان دا بۆ دارکاری کردنی جووتیاران و بە تایبەتی چیانشینان کەسی نەدەگەیشتێ. لەماوەی خزمەت لە مەخفەرەکان دا بە جۆرێك لە فەلاقەکێشان دا کارامە ببوو، کە فەلاقە کێشەکانی ئەنکەرە دەبوو دە ساڵ لەبن دەستی دا شاگردی بکەن. درندەو باڵندە، مارو هەزارپێ و تەنانەت داروبەردیش لە بەردەستی دا وەزمان دەهاتن، هەتا دەگا بە خەڵکی لادێ. هەمیشە دەیگوت: خوای گەورە بە قوربانی بم ئەم دێهاتی‌یانەی هەر بۆ لێدان دروست کردوە. دەبێ هێندەیان لێدەی هەتا لە دەرپێ‌یەکانیان دەمیزن و لەبن خۆیانەوە دەرین. بریاری دابوو هەتا چەند ساڵی دیکە واز لە سەرجووخەیی بێنێ و لە دەشتی ئاناوارزا لە نیزیك ئاکچاساز کێڵگەیەك پەیدا بکا. هەر لە ئێستاشەوە خەریك بوو ئەو نیازەی جێبەجێ بکاو هەر بۆیە دەبوو خۆی لە زولفۆ ئەفەندی و عارف صائم بەگ نیزیك بکاتەوە.

عەلی کەتیش کە بەرامبەر بە یاوەر قیت و بێجووڵە وەك بەرد، سنگی رەپێش کردبوو، و خەبەردار وێستابوو، گوتی:

"جەنابی یاوەر، منداڵان بۆ شتی وا باشترن. قسە، یان لە شێتی ببیسە یان لە منداڵی".

"ئێستا کەوایە بڵێ با بێ".

عەلی کەرتیش بە غاردان چووە لای موسلیم. منداڵەکە لەوێ راوەستابوو، قەڵەدەی سەگەکەی لە دەست دا بوو، و تەماشای جەندرمەکانی دەکرد. بە دیتنی عەلی کەرتیش کە بەغار بۆ لای دەهات زۆر خۆشحاڵ بوو، بەڵام هەوڵی دا خۆشحاڵی‌یەکەی بشارێتەوە.

"ئەو سەگەی بەرەڵلا کەو زوو وەرە، یاوەر کاری پێتە".

نێوچاوانی گرژ کردبوو، و رەگی ملی هەستابوون:

"ئەو سەگەی بەرەڵلا کەو زوو وەرە".

موسلیم سەگەکەی بەرەڵلا کردو دەنگی دا بۆ لای مەرەکان. سەگ فەرمانی وی بەجێ گەیاندو چووە لای مێگەلەکە. کەرتیش لە پێشەوەو موسلیم بە دوای دا هاتنە لای یاوەر.

یاوەر سەری هەڵێناو پاش ئەوەی لەسەر تا پێ لە موسلیمەوە راما، گوتی:

"ئەتۆ خەڵکی ئێرە نی، لێرە چ دەکەی؟".

موسلیم لە حاڵێك دا رەنگی سوور هەڵگەرابوو، و دەست ولاقی دەلەرزین. وەڵامی دایەوە:

"شوانم".

"لە کوێ دادەنیشی. لە کام عەشیرەتی؟".

"خەڵکی ساری کەچیلیم".

"ساری کەچیلی عەشیرەتی کێیە؟".

"عەشیرەتی خۆمان".

یاوەر پێکەنی:

"لە کەنگێوە لێرەی؟"

"شەوێك و دوو ڕۆژ دەبێ".

"سوارێك, پیاوێك, پیاوێکی چەکدار, پیاوێکی بریندارت نەدیوە بێرەدا تێپەڕێ؟".

"کەسم نەدیوە. ئەگەر لە کەسێك دەگەڕێن دەبێ لەو خوارانە بێ".

"تێگەیشتم جەنابی یاوەر. ئەم تووتکە سەگە درۆ دەکا".

"ئەتۆ دوێشەوێ گوێت لە دەنگی تەقە نەبوو؟".

"گوێم لێنەبوو".

"چۆن دەبێ. چۆن گوێت لێنەبوو؟ لەنێو لێرەواردا دەنگی تەقە دنیای پڕ کردبوو و شەڕ بوو. چۆن گوێت لێنەبوو؟".

"خەوتبووم. خەوم زۆر گرانە".

"ئەتۆ چۆن شوانێکی کە دەتەوێ گورگ مەڕەکانت نەخوا؟".

کوڕە شوانەکە گوتی:

"نایان خوا" و بە شێوەیەکی پێهەڵلاگوتنەوە گوتی:

"زەردەی دەبینی؟ دە گورگان بە جارێك دەخوا. لینگەی پەیدا نابێ".

ئەو "زەردە"یە, سەگەکەی موسلیم وەك ئینسان وابوو, هەموو شتێکی دەزانی, تێدەگەیشت, بیری دەکردەوە. هەر ئەوەندە بوو قسەی نەدەکرد. لەوانەش بوو ئەگەر بێویستایە بتوانێ قسە بکا.

"زەردەی دەبینی, دەتوانێ حەوتوویەك, دە ڕۆژ, سێ مانگ مێگەلێك بەرێتە کێو و ئاگای لێبێ. شوانیشی ناوێ. دەیبینی؟ ئەگەر ئەمن بخەوم و مەترسییەکی چووکەڵە بێتە پێش, جا مار بێ, دووپشك بێ, بنیادەمێك بێ, دێ و بەسپایی قۆڵم دەگرێ و خەبەرم دەکاتەوە".

"ئەمشەو خەبەری نەکردیەوە؟ دەنگی تەقەی گوێ لێنەبوو؟".

"ئەگەر گوێی لە دەنگی تەقە بایە وەخەبەری دێنام".

عەلی کەرتیش نەڕاندی:

"وەخەبەری هێناوە, بەڵام ئەو درۆ دەکا کە دەڵێ گوێم لێ‌نەبووە".

موسلیم وەڵامی دایەوە:

"ئەگەر گوێی لێ‌بایە وەخەبەری دێنام. حەتمەن گوێی لێ‌نەبووە. ئەو دەنگی تەقەی تفەنگ دەناسێ, چەتە, جەندرمە, پیاوی چاك و خەراپ لێك دەکاتەوە. ماوەیەك لەمەوبەر لەو خوارە لەنێو نزار ملی یەکێکی گرت, کابرا خەریك بوو بخنکێ. ئەو کابرایەی باسی دەکەم کچێکی بەدناوی هێنابوو, دوایەش لەت و کوتی کردبوو. زەردەی من لەو زەردانەیە. ئەو بەگزادەی سەگانە".

"سەگەکەت زۆر خۆش دەوێ؟".

"لە هەمووان پتر. ئەو هاواڵی منە".

عەلی کەرتیش بە گاڵتەپێ‌کردنەوە گوتی:

"جەنابی یاوەر ئەو سەگە بابیەتی, دایکیەتی".

دژکردەوەی موسلیم بەرامبەر بە عەلی کەرتیش توندو زبر بوو, موسلیم ئەوی باش دەناسی, هەر کە بوو بە سەرجووخە بە خۆی و پازدە جەندرمەوە چووە دێ‌یەکەی خۆیان و سێ شەوو رۆژان خەڵکی دارکاری کرد.

"چۆنی تێ دەگەی؟"

"درۆ دەکا, جەنابی یاوەر. ئەم کورە دەزانێ حەمەدۆك بۆ کام لا چووە. با تاقیقی لێ‌بکەین."

یاوەر بە هێمنی گوتی:

"تاقیقی لێ‌بکە".

"لێرە, یان لەنێو لێڕەوار؟".

یاوەر گوتی:

"هەر لێرە, لەو خوارە, بزانم ئەو شێت و پێتەی چۆن وەزمان دێنی".

کەرتیش بە نەرمی و میهرەبانی لە موسلیم نیزیك بووەوەو گوتی:

"بڕوانە کوڕم, دوێنێ بەیانی تاریك و روونی, کابرایەکت نەدی کە تفەنگی پێ بوو و سواری ئەسپێکی خەنەیی بوو, ئەسپێکی خەنەیی رووت, کە خێرا بە پێشت دا تێ‌پەڕێ؟ ئەو پیاوەی سواری ئەسپەکە بوو, نەختێك لە تۆ بەخۆوەترە... بلێ کوڕم. بڕوانە, راست لە دارستان هاتە دەرێ و بۆ لای تۆ هات, ئەتۆش لە دەنگی پێی ئەسپەکە وەخەبەر هاتی. یان سەگەکە خەبەری کردیەوە. ئەتۆش وەختێك وەخەبەر هاتی, سوارەکەت دی کە بە توندی دەڕۆیشت. ئەو سوارە بەرەو کام لا چوو؟".

"ئەمن نەم دی".

"ئەتۆ نەت دی؟".

"بە هیچ جۆر".

"ناوت چیە کورِم".

"موسلیم".

"کورِم, موسلیم, ئەگەر راستی نەلێی بۆت خەراپە ها!".

"هیچ سوارێکم نەدیوە".

چوار جەندرمە زۆر لەمێژ بوو ئامادەو چاوەرِوان بوون. ئەوی هەرە مل ئەستووریان داردەستێکی بەدەستەوە بوو.

"رای کێشن".

دەسبەجێ موسلیمیان لە عەرزی درێژ کردو قایشە تفەنگێکیان لە لاقانی هالآند.

"کاڵەکانی لەپێ دەرێنن".

کاڵەو گۆرەوییەکانیان لەپێ داکەندن و دوور فرێیان دانە سەر چڵە گوێنییەك.

"دەست پێ بکەن".

جەندرمە قەڵەوەکە بە هەموو هێزی خۆی دارە ئەستوورەکەی لە لاقی منداڵەکە ـ کە بە قایش تفەنگ بەسترابوو ـ راکێشا.

"دیسان لێی دە".

ئەو جەندرمە زەلامە بە هەموو تینی خۆی دارەکەی لە بەرەپێی موسلیم رادەکێشا. بەڵام نەیدەتوانی لێوی ئەو منداڵە بۆ دەنگێك لێك بکاتەوە.

یاوەر بە سەرسورِماوی چاوی داپچرِابوون و دەیرِوانیە ئەو دیمەنە نائاساییە.

سەروچاوی موسلیم شەلاڵی ئارەق بوون, ددانی لە چیرەوە دەبردن, لەگەڵ هەر زەبرێك کە وێی دەکەوت ئەندامی لەشی رێك دەهات و رادەچەنی و پاشان شل دەبوو. ئەم وەزعە ماوەیەکی زۆر درێژەی کێشا. بەڵام موسلیم دەنگی لەبەر دەرنەهات. یاوەر بەسەرسورِماوی و بە چاوی داپچرِاوەوە تەماشای دەکردو بەو هەموو دەنگ نەکردنەی پتر رقی هەڵدەستا. بە توورِەیی فەرمانی دا:

"عەلی بۆخۆت دارەکە وەرگرە, ئەمە چ وەزعێکە؟".

عەلی کە دارەکەی لە جەندرمە زەبەللاحەکە وەرگرتبوو بە هەموو هێزو تەواوی هونەرو وەستایەتیی خۆیەوە بەسەر کورەکەدا رووخا. بەڵام موسلیم دیسان متەقی نەکرد.

سەگەکەشی هاتبوو و نەختێك ئەولاتر لەسەر کائی‌یەك کە دەوراندەوری بە پنگەڵێکی گوڵوڵوك شین داپۆشرابوو, راوەستابوو, و تەماشای موسلیمی دەکرد کە بە چاوێکی غەمگینەوە لەسەر زەوی راکشابوو, و لە پەستا زەبری داردەستەکەی لە بەری پێیان دەدرا. سەری قیت کردەوەو خۆی بۆ شەڕ ئامادە کرد. بەڵام موسلیم چووکترین دەنگی لەبەر دەرنەدەهات و چووکترین ئیشارەتیشی نەدەکرد.

یاوەر نەی‌توانی خۆی رابگرێ, هەستاو چوو لەبان سەری کوڕە شوانەکە راوەستا, روخساری عەلی کەرتیش رەش داگیرسابوو. ددانی لە چیڕەوە دەبردن و دارە ئەستوورەکەی راست دەکردەوەو بە هەموو هێزی خۆی دای‌دەهێنا. منداڵەکە جگە لە رێك هاتن و راچەنینی ئەندامی دژکردەوەیەکی لێ‌نەدەبینرا.

سەرەنجام بەرەلاقی منداڵەکە خوێنیان لێ‌هەڵچۆڕا. یاوەر گوتی:

"سەرجووخە عەلی, بێ‌سوودە ئەتۆ تا ئێستا مەخلووقی وات دیوە؟".

سەرجووخە عەلی کە شەلاڵی ئارەق بوو بە هەناسەسواری وەڵامی دایەوە: "نا" و لە حالێك دا بە هەموو هێزی‌یەوە داری دادەوەشاند بە منجە منج لەسەری رۆیشت:

"نا جەنابی یاوەر, لە ژیانم دا بەڵای وام نەدیوە".

"بلێ کوڕم. ئەتۆ حەمەدۆکت دی. وەنا؟".

ددانەکانی موسلیم داخرابوون و لێك هەڵنەدەپچڕان.

"بلێ کوڕم ئەگینا سەرجووخە عەلی دەت کوژێ, ئەو زۆر کەسی ئاوا لەبن داران دا کوشتوە".

"زۆرم کوشتوون, زۆرم کوشتوون".

ئەو دارەی لە لاقی منداڵەکە دەدرا دەت گوت دوولا دێتەوە. لاقەکانی خوێنیان لێ‌دەچۆڕشا. دارەکە بە تاوێك سوور بوو.

سەگەکە رەق لە جێی خۆی راوەستابوو. یاوەر کە لە نەکاو چاوی پێی کەوت بە خۆشحاڵی فەرمانی بە عەلی کەرتیش دا:

"راوەستە, راوەستە سەرجووخە کەرتیش".

سەرجووخە عەلی هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو دەستی راگرت.

"راستی کەنەوە".

عەلی کەرتیش دەستی منداڵەکەی گرت و بە زۆر راستی کردەوە. موسلیم خۆی بەسەر پێوە نەگرت و درێژاو درێژ کەوتەوە سەر زەوی.

"راستی کەوە, ئەو تووتکە سەگەی".

سەرجووخە عەلی, منداڵەکەی لە عەرزی بلند کردو بن قۆلی گرت. جەندرمەیەکی دیکەش چووە بن پیلەکەی دیکەی. منداڵەکە لەنێو ئەو دووانەدا وەك لەشێکی بێ‌گیان دەچەمایەوە. وەکیل باشی عاصم پاش ئەوەی بە چاوێك کە هیچی تێدا نەدەخوێندرایەوە لە هەوەڵ تا ئاخری سەیری ئەو بەسەرهاتەی کرد, هەستاو چووە لایان.

"جەنابی یاوەر, ئەم منداڵە خەریکە دەمرێ, بڕوانە خەریکە گیانی دەردەچێ".

یاوەر بە راوێژێکی توند وەڵامی دایەوە:

"ئەمە حەوت رووحی هەیە, هیچی لێ‌نایە, چما نەت دی, ئەو هەموو دارەی لێ‌درا جارێك نەی‌گوت ئاخ".

کەرتیش گوتی:

"حەوت رووحی هەن".

یاوەر گوتی:

"ئەمن دەزانم چۆنی وەقسە بێنم".

ئەودەم دەمانچەکەی هەڵکێشاو بەرەو سەگەکە کە لەوێ راوەستابوو سێرەی لێ‌گرت.

"کاکی شوان, ئێستا چاوت هەڵێنە, جوان چاوت بکەوە تا بزانی تاوێکی دیکە چ دەقەومێ".

راوێژەکەی, وەك تیغ دەی‌بڕی. پڕ بوو لە رق و سەرکەوتن و خۆشحاڵی.

منداڵەکە لەسەرەخۆ چاوی هەڵێنان. تەماشای دەمانچەکەو یاوەرو سەگەکەی کرد. یاوەر نەڕاندی:

"ئێستا بڵێ بزانم. ئەگەر ئێستا راستی‌یەکەی نەڵێی سەگەکەت دەکوژم".

منداڵەکە چاوەکانی تیژ کردن. خێرا تەماشایەکی سەگەکەی و دەمانچەکە کە لەبەر تیشکی هەتاو دەدرەوشایەوەو شەپۆلی دەدان و سەری سمێڵەکانی یاوەری ـ کە دەلەرزین ـ کردو گوتی:

"زەردەی مەکوژە, ئێستا دەی‌ڵێم, حەمەدۆکم دی".

یاوەر بە پێکەنینەوە گوتی:

"ها! ئاوا. بی‌هێنن".

ئەمجار چووەوە جێگاکەی پێشووی لەسەر سەکۆیەك دانیشت. منداڵەکەیان هێناو رووبەڕووی دایان نا.

"بە چ ڕا زانیت حەمەدۆکە؟".

"تفەنگی پێ بوو".

"چی دیکە؟".

"ئەسپەکەی خەنەیی بوو".

"چی دیکە؟".

"منداڵێك بوو بەقەد من".

"چی دیکە؟ بەرەو کام لا رۆیشت؟".

منداڵەکە لە حاڵێك دا رۆژئاوای نیشان دەدا گوتی:

"ئاووا رۆیشت... ئەمن دەزانم چووەتە کوێش".

"چووەتە کوێ؟".

"باقر گدیگی‌یەك هەیە, ئەشکەوتێکیش هەیە کە چەتە کەچەڵ بە خۆی و نۆزدە کەسەوە, لەوێ دان. حەمەدۆك چووە رەگەڵ وان کەوێ."

"ئەو هەموو شتەی لە کوێ دەزانی؟".

"ئەوان باسیان کرد".

"کێ؟".

دوێنێ چەتە کەچەڵ لەسەر ئەم کانی‌یە قسەی دەکرد. گوتی حەمەدۆك دێ. وەڵامی ناردوە. لە ئەشکەوتی باقر گدیگی چاوەڕوانی دەبین. پاشان لێیان دا رۆیشتن. تەقیلەی سووریان لەسەر بوو.

"زۆر باشە, بۆ زووتر نەت گوت؟".

"زۆر ترسابووم".

یاوەر هەستایە سەرپێ, نەختێك ماسولکەکانی لەبەر یەك کێشانەوەو پاش ئەوەی چەند جار لەسەر نووکی پەنجەی خۆی هەڵتەکاند, خۆی فڕێ دایە سەر ئەسپەکەی کە لە نیزیك خۆی بوو, و فەرمانی وەڕێ کەوتنی دا. ئەسپەکەی بۆ لای سەگەکە کە لە جێی خۆی چەقیبوو, لێ‌خوڕی, چەکەکەی هەڵکێشا, سێرەی لە سەگەکە گرت و دەستی لێ‌کێشا. سەگەکە بە توندی قرووسکاندی, کەوتە جینگڵان و بە دەوری خۆی دا دەستی کرد بە سووڕان. یاوەر هەموو فیشەکەکانی دەمانچەکەی بە دوای یەك دا لە سەگەکە دان. سەگ کە بە لەحزەیەك لە دەریای خوێن دا نوقم ببوو, بێ‌گیان لەسەر چیمەنی سەوز کەوت.

موسلیم کە گوێی لە تەقەی گوللەکان ببوو, لە جێی خۆی هەستاو دەسبەجێ خۆی گەیاندە لای سەگەکە. تۆپیبوو, و وەك تەرمی ئینسانێك درێژاو درێژ بە دەست و لاقی ئاوەڵاوە لەنێو گوێنێ‌یەکان دا کەوتبوو.

ئەودەم کە جەندرمەکان لێ‌یان داو رۆیشتن, موسلیم سەگەکەی خۆی لە باوەش گرتبوو, سەرە خوێناوی‌یەکەی لەسەر کۆشی دانابوو, دەت گوت لای‌لایی بۆ منداڵێکی مردوو دەکا. لەسەرەخۆ لە پشتێن بەرەژووری رادەژاند.

## (٥)

ئەسپی خەنەیی لە دوور لەسەر دوندی شاخێکی نووك تیژی رەنگ قاوەیی کاڵ راوەستابوو, لەسەرەخۆ کلکی رادەوەشاند. سەرجووخە عەلی کەرتیش هاواری کرد:

"جەنابی یاوەر, ئەو ئەسپە, ئەسپی حەمەدۆکە, ئەسپەکەی عەلی سەفابەگ. دیارە حەمەدۆك لەو نێوەیە. کوڕە شوانەکە راستی دەکرد: وا دیارە حەمەدۆکی لە ئەشکەوتی باقر گدیگی لە داو دەخەین".

یاوەر ئەڕاندی:

"ئەو ئەسپەی بکوژن".

سەرجووخە عەلی کەرتیش گوتی:

"زۆر دوورە, بەڵام هەر دەبێ بیکوژین".

یاوەر دووبارە ئەڕاندی:

"راوەستە".

سەرجووخە عەلی کەرتیش لە جێی خۆی راوەستا. یاوەر ئەسپەکەی دەنگ داو هاتە لای:

"تفەنگەکەت وەمن دە. هەتا ئەتۆ دەگەیە وێ, ئەسپەکە دەڕوا". بە سواری بەرەو داوێنی چیاکە غاری دا. بنارەکە بەردەلانێکی شۆرەکات بوو, ئەسپی یاوەر لەو بەردەلانە شۆرەکاتەدا بە زەحمەت دەکەوتە غارو لە پەستا سەرسمی دەبرد. چەند جار یاوەر ترسی رێ نیشت کە بەر بێتەوە, بەڵام بەر نەبووەوە. وەختێك گەیشتە بن شاخەکە ئەسپەکەی لە کەف و ئارەق دا نوقم ببوو, و وەك کوورەی ئاسنگەران دەهەندمی. ئەسپی خەنەیی لەسەر دوندی شاخەکە کە بە رەنگێکی هەنگوینی‌یەوە دەدرەوشایەوە راوەستابوو, و ئارام تر لە پێشوو, کلکی رادەوەشاند. یاوەر پاش

ئەوەی لە خوارێ ڕا بەرەو سەر جوان سێرەی لـێ‌گرت, دەستی بە پەلەپیتکەدا هێنا. لەگەڵ دەست لـێ‌کێشان ئەسپی خەنەییش لە چاو لێك نانێك دا ون بوو.

یاوەر زۆری سەر لەو کارە سوڕما, تەماشای چەپ و ڕاستی کرد, شوێنەوارێك لە ئەسپەکە نەبوو. وەختێك دەگەڕایەوە لای پیاوەکانی کە چاوەڕوان بوون, زۆر تووڕە بوو. گوتی:

"یانی چی. ئەم هەنگاوت".

سەرجووخە عەلی کەرتیش گوتی:

"ئەمن لێرەڕا تەماشام دەکرد. هەر کە تۆ تفەنگەکەت بە شانتەوە نا, ئەسپەکە ون بوو: ئیدی نەم زانی بۆ کوێ چوو, چیی لـێ‌هات. بە دەردی دێهاتی‌یەکان دەڵێن ئەم ئەسپە جادوویە".

یاوەر نێوچاوانی تێك ناو سمێڵەکانی لەرزین. لە حاڵێك دا تفی لە عەرزی دەکرد, گوتی:

"ئەم هەنگاوت, ڕۆیشت. زۆر لەمێژە ماوزەرم ناویشتوە. بریا وەکیل باشی عاصم لە جیاتی من تەقەی لـێ‌کردبایە".

وەکیل باشی عاصم بە زەردەخەنەوە گوتی:

"حاشا یاوەر, حاشا. وەختێك ئەتۆ نەت توانی بی‌هەنگێوی, ئەمن بەهیچ جۆر نەم دەتوانی. هەروەك سەرجووخە عەلی گوتی, کاتێك ئەتۆ تفەنگەکەت ڕاداشتێ, ئەو وەك مێو نەرم بوو, بوو بە هێڵێکی درێژو خێرا خزییە نێو بۆشایی و ڕۆیشت. ئەو ئەسپێکی زۆر بەدفەڕە. ئەو ئادەمە کە کووژرا... یۆباز ئۆغلی و مەلا فەرهاد لەسەر ئەمە کوشتیان, لەسەر ئەم ئەسپە...".

"ئادەمی بەستەزمان گیانی لەسەر ئەم ئەسپە دانا, خوا عافووی کا عەلی سەفابەگ دەی‌گوت ئەو گەورەترین ڕاوچی و تفەنگچی بوو. یەکی ئاوا چەند ساڵی ڕەبەق وەدوای ئەم ئەسپە کەوت و نەی‌توانی بی‌کوژێ... پاشانیش مەلا فەرهادو خاوەنی ئەسپەکە ئادەمیان...".

"مەلا فەرهادو یۆبازئۆغلی لە دار دەدەن ئیدی, وانیە؟".

"ئەرێ, لە داریان دەدەن. سەرۆکی دادگای جینایی پیاوێکی زۆر توندە".

"مووی لە ماستی دەردەکێشێ".

"دەڵێن ئەگەر قەرار بێ حەپسیان بۆ ببڕنەوە, هەژدە ساڵ دەستیان ماچ دەکا".

"ئەوان لە دار دەدەن".

"بریا زووتر لە داریان دابان. ژانە سەرمان بۆ دروست دەکەن".

"چ ژانە سەرێك".

"حەمەدۆك".

یاوەر پێ‌کەنی:

"حەمەدۆك؟ ئێستا ئیدی زووی دەگرم".

"ئەم جارەیان ئەمن زۆر لە حەمەدۆك دەترسم".

"لە زۆر داوو تەڵە دەرباز بووە. ئەگەر بێڵێن ئەمجاریش لە دەستمان دەرچێ, زۆرمان ژانەسەر بۆ دروست دەکا".

"وەك ئەسپەکەی, وانیە وەکیل باشی؟".

وەکیل باشی عاصم بە پارێزەوە زەردەیەکی کردو گوتی:

"نازانم, مەعلووم نابێ".

یاوەر ئەسپەکەی لێ‌خوڕی. وەکیل باشی عاصم لەلای ڕاست, سەرجووخە عەلی کەرتیش لەلای چەپ و جەندرمەکان بەدوای دا دەڕۆیشتن.

"وەکیل باشی عاصم! بە باوەڕی تۆ کوڕە شوانەکە ڕاستی دەکرد؟".

وەکیل باشی عاصم گوتی:

"نازانم, کەس سەر لە کاری ئەمانە دەرناکا. لەوانەشە بۆ دوورخستنەوەی ئێمە لە حەمەدۆك...".

"زۆر باشە, ئەدی ئەو هەموو لێدانەی بۆچی خوارد؟".

"بۆ ئەوەی ئێمە باوەڕ بکەین".

"کەمی مابوو بمرێ".

"تەنانەت ئەگەر مردباش... دەڵێم جەنابی یاوەر! ئەگەر ئەم جاریش بێڵێن حەمەدۆکمان لە دەست دەرچێ, وەزعمان شڕە".

یاوەر گوتی:

"نابێ بێڵێن دەرچێ".

"ئەمان توانی برایمە ڕەشیش بدۆزینەوە".

"چۆنە بە دێیەکەی وان دا بچین".

"ئەمشەو کەسێك بنێرین, بانگی کەینە ئەوبەر, دەرەوەی دێ. ئەو بە جێگای حەمەدۆك دەزانێ".

وەکیل باشی عاصم بۆی لە مل دا:

"ئەو دەزانێ".

سەرجووخە عەلی قسەی هەردووکیانی بڕی:

"بڕوانە هۆوێ جەنابی یاوەر!".

یاوەر ئاوڕی دایەوەو تەماشای ئەو جێیەی کرد کە ئەو نیشانی دەدا. ئەسپی خەنەیی لەوێ لەسەر شاخێکی بەردئەستێی بریقەدارو درەوشاوەی بە ڕەنگ هەنگوینی ڕاوەستابوو، ئارام کلکی رادەوشاند.

یاوەر، هەر کە چاوی پێی کەوت گوتی:

"عەلی، بدە ماوزەرەکەت".

تفەنگەکەی لە دەستی ڕفاند. ڕکێفی لە ئەسپەکەی داو سەربەرەژوور بەرەو لای بەردەڵانە شۆڕەکانەکە هەڵگەڕا. هەر کە گەیشتە بن شاخەکە تفەنگی بە شانیەوە ناو سێرەی لێگرت، لەگەڵ سێرە گرتن ئەسپەکەش ون بوو.

یاوەر پاش ئەوەی ماوەیەك لەبن شاخە ڕەنگ هەنگوینیەکە چاوەڕێ ما، وردە وردە ئەسپی خۆی بۆ لای جەندرمەکان کە لە خوارێ بوون دەنگ دا.

"چ بوو؟ ئەم جارە توانیم لێی دەم".

سەرجووخە عەلی کەرتیش سەری بەردابووەوەو بێدەنگ بوو.

"بگرە تفەنگەکەت، ئەم ئەسپە گاڵتەمان لەگەڵ دەکا..."

لای ئێوارێ گەیشتنە سێکانیان.

ئاوی سێکانیان لە قەدی چەند شاخێکی شینی ئەستەم کە لە بەردەڵانەکانی دا چڵەگوێنێیەکان بە چرو پڕی ڕوابوون و هەموو بڕکە گوێنێیەکانیش گوڵیان کردبوو، هەڵدەقوڵی و دەهاتە خوار. ئاوی ئەو سێ کانێیە لەسێ شوێن لەبن شاخەکە، بە کەف پرژاندن دەردەپەڕی، بە خاکێکی شین دا تێدەپەڕی، بە سێ شوێنی قەڵشتێکی سپی دا کە خەتێکی سووری تێدا بوو، دەهاتە خوارو بەسەر چەند ئاوبەرەیەك دا کەلە داری سنۆبەر دروست کرابوون، هەڵدەڕژا، دەوروبەرو بن پلووسکە دارەکان گۆمێکی چووکەڵەی پڕ لە پنگ بوو. لێوارە ڕێك و لووسەکانی ئەو گۆماوە بە چیمەنێکی سەوز داپۆشرابوون. ساڵ دوازدە مانگ ئەم چیمەنە لە زستان و سەرماداو لە قیامەت و زەمهەریردا هەروا سەرسەوز بوو. تفەنگەکانیان لە پەنای ئەو گۆماوە کە بە هەزاران ماسیی سوورو خاڵدار مەلەیان تێدا دەکرد، پێك هەڵپەساردو دانیشتن تا بحەسێنەوە.

خەریکی حەسانەوە بوون. یاوەر دانیشتبوو, و پشتی وە گابەردێك دابوو کە دەنگی عەلی کەرتیش هەستا:

"جەنابی یاوەر, جەنابی یاوەر, هۆوەتا, هۆوەتا, لە هۆوێیە".

یاوەر کە سەری هەڵبڕی, ئەسپەکەی لەسەر تەپۆلکەیەکی رووتەن دی کە لەبەر دوا تیشکی خۆر کە بەرەو خۆرئاوا دەچوو, وەك ئەڵماسێکی رەش دەدرەوشایەوە. یاوەر کە راست ببووەوە, گوتی:

"وەکیل باشی عاصم, ئەمن دەبێ ئەم ئەسپە بکوژم...".

بەڵام لەسەر قسەکەی نەڕۆیشت و لەو لەحزەیەش دا سەرجووخە عەلی ماوزەرەکەی بۆ برد. یاوەر کە تفەنگەکەی وەرگرتبوو, بەرەو دۆڵێکی قووڵ کە لە خوارێ بوو, شۆڕ بووەوە. ئەم دۆڵە بای دەدایەوەو راستەڕێ دەچووە خوار بۆ پشت ئەو تەپۆلکەیە کە ئەسپەکەی لەسەر راوەستابوو.

یاوەر ئەم جاریش سێرەی لـێگرت. نووکی قەرەوڵ و درزی سیپەی لەگەڵ نیشانە جووت کردن و پاش سێرەگرتنێکی زۆر باش ویزەی گوللە هەستا. بەڵام ئەمجاریش ئەسپەکە لەنەکاو ون بوو. یاوەر شەکەت و ماندوو بەرەو سێکانیان دەگەڕایەوە کە دەنگی حیلەی ئەسپێك لە پشت تەپۆلکەکەوە هەستاو چەند لەحزەیەك لە شاخەکان دا دەنگی دایەوە. ئەسپی یاوەریش بە حیلەیەك وەڵامی دایەوە.

لەوبەری دەشتاییەکەی خوارێ, بە باریکە ڕێیەکەی لێواری دۆڵەکەدا سوارێك بە توندی بەنێو تۆزو غوباردا لینگی دەداو دەهات.

سەرجووخە کەرتیش گوتی:

"جەنابی یاوەر, ئەوە برایمەڕەشە دێ".

"بە چ ڕا دەزانی؟".

"ئەمن لەو دوورەش ڕا ڕۆینەکەی دەناسم. ئەمجار خەبەرێکی گرنگیشی بۆ هێناوین".

وەکیل باشی عاصم گوتی:

"لە هەمووی چاکتر ئەوەیە کە زانیویەتی ئێمە دەبێ لێرە بین".

"کابرایەکی سەیرە".

"جەنابی یاوەر, برایم بنیادەمێکی زۆر سەیرە".

"هەموو تاتە بەردێك و هەموو پنچکە دروویەك و هەموو دارێك چاوو گوێی وین".

یاوەر بێدەنگ بوو و ئەوانی دیکەش لێیان بڕیەوەو چاوەڕوانی برایمەڕەش مانەوە.

برایمەڕەش کە لە پەنای گۆماوەکە خۆی لە ئەسپەکە فڕێ دابوو, غاری دایە لای یاوەر, خەبەردار ڕاوەستاو پاش سڵاو گوتی:

"جەنابی یاوەر هێندێ خەبەرم بۆ هێناوی. ڕاست نۆ کەسن. بۆخۆم یەك بە یەك ژماردوومن".

"حەمەدۆکیشت دی, لەگەڵیان بوو؟".

"نازانم جەنابی یاوەر, ئەمن حەمەدۆکی ناناسم. لەوانەشە لەگەڵیان بووبێ. یەکێکم دی وەك وی دەچوو".

"چۆن بوو؟".

"لەگەڵ ئەو تاریفەی لێی دەکەن دەهاتەوە... چوارشانە, کورتەباڵا, بڕۆپان... کەوای ماراشییشی لەبەردا بوو. ئەمجار گۆرەویی ئەژنۆشی لەپێدا بوون. تەقیلە گوڵێنگەدارەکەی بەلای ڕاستی سەریەوە نابوو. چوار قەد فیشەکدانی لە خۆی دابوون. چەکەکەی فیلینتای ئەڵمانی بوو. دەستی ڕاستی لەبەر خۆی هەڵبەستبوو وەختێك دەڕۆیشت پشتی کۆم دەبوو, وادیار بوو بریندارە".

"وەکیل باشی عاصم, ئەتۆ چۆنی تێدەگەی؟".

"نازانم. خۆ ئەمن نەم دیوە جەنابی یاوەر. بەڵام ئەو تاریفانەی لێی دەکا, لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی حەمەدۆك دێنەوە".

عەلی کەرتیش گوتی:

"ئەرێ, دێنەوە, خۆیەتی, بۆخۆم تفەنگم لێدا, لەو بابەتەوە چاك دڵنیام".

"چۆنی تێدەگەی برایم؟".

"وەختێك گرتمان دەردەکەوێ هەوە یان هەو نیە. هەر ئێستا سێ کەس وەدوای شوێنەکەیان کەوتوون. ئەمشەو کوێیان پێخۆشە با بچن خۆی لێ بشارنەوە. ئەوان لە دەستمان دان".

یاوەر فارووق گوتی:

"بەری بەیانی ئەو وەختە کە لەخەودان".

برایمەڕەش گوتی:

"جەنابی یاوەر, ئەمانە ئیدی بۆخۆم دانێ. ئەمشەو جێیەکەیان وەك بۆخۆم دام نابن, دەبینمەوە. زۆر دوور نین, فکری ئەوەش ناکەن جەندرمەیان بگەنە سەر".

یاوەر بە ئارامی و بە شێوەی لاواندنەوە دەستی لەسەر شانی برایمەڕەش دانا:

"برایمەرەش. ئەگەر حەمەدۆك لەنێو ئەو نۆ رێگرەدا بوو, هەرچی پێت خۆش بوو لێم داوا بکە. ئاغاو خاوەن ملکەکانی چوکووراوا دەوڵەمەندت دەکەن, دەبی بە قاروون. ئەگەر وایان نەکرد, ئەودەم..."

هێشتا بەیان نەنگوتبوو. تاریك و روون بوو. ئێشك گری رێگرەکان کە لە تاریك و روونی هەوادا دەکرا بزانی لاوێکی بەخۆوەیەو تەقیلەی لەسەرە, لەسەر قەدە دارێك دانیشتبوو, وا دیار بوو وڕێنگان دەدا.

برایمەرەش گوتی:

"جەنابی یاوەر, ئەمن ئەو کابرایەی دەناسم, کورە خاڵمە, پێش ئەوەی ببێتە چەتە کورێکی پیاو و ئازا بوو, چ بکەین, سەرەنجامەکەی ئەوەبوو کە بە لارێ دا بچێ, چ بکەین, چارەنووسی ئەمە بوو. لە گیانی خۆمم خۆشتر دەوێ".

یاوەر پرسی:

"وەکیل باشی عاصم ئامادەن؟".

"ئامادەین جەنابی یاوەر".

"وەختێك ئیشارەتم دانێ, لێك ڕا دەست بکەن بە تەقەو هەتا بۆخۆم فەرمان نەدەم تەقە رامەگرن. تەنانەت ئەگەر هەموو چەتەکانیش کوژرابن".

"بەسەرچاو جەنابی یاوەر".

"سەرجووخە عەلی!"

"ئەمر کە جەنابی یاوەر".

"یەکەم تفەنگ ئەتۆ باوێ".

"بەسەرچاو جەنابی یاوەر".

"بە یەکەم تفەنگ ئەو کابرای لەسەر قەدە دارەکە دانیشتوە...".

"بە یەکەم گوللە جەنابی یاوەر".

برایمەرەش هەناسەیەکی هەڵکێشاو تاوێکی چاك لەبەر خۆیەوە گوتی:

"وەی خاڵۆزا, وەی وەی. وەی بەدبەخت, وەی بێکەس, وەی کە رۆژی خۆشت لە ژینت دا نەدی, وەی, وەی, سەرەنجامت ئەمە بوو؟ وای. بریا هەردووك چاوم کوێر بان و ئەم رۆژەم نەدیبایە, هەی...".

بە یەکەم گوللە کە سەرجووخە عەلی تەقاندی, پیاوێکی بەخۆوە کە خۆی خڕ کردبووەوە لەسەر قەدە دارەکە دانیشتبوو, لەحزەیەك پەڕیە حەواو پاشان لەم دیو قەدە دارەکە بە بێگیانی کەوتە سەر زەوی. بە دەنگی تەقەکە ئەسپی یاوەریش ماوەیەکی زۆر حیلاندی, لە پشت بەردەلانەکەوە ئەسپێکی دیکە وەلامی ئەم حیلە بەقەوەتەی دایەوە.

## (٦)

ئەو خزمەتکارەی ناردبوویانە کێڵگە, ئەسپێکی بۆرەی رەسەن ئینگلیزیی گرت و لەگەڵ خۆی هێنایەوە. ئەسپەکە پێنج ساڵ بوو. ئەسپێکی پشوودرێژو خۆش رکێف و ئارام بوو. لە راستی دا مورتەزاغا پاش ئەو ئەسپە کە بۆخۆی سواری دەبوو, ئەم ئەسپەی خۆش دەویست. زۆر تیژرەو بوو. لەگەڵ عەلی بە دەوری ئەسپەکەدا کە لەحەوشەی ماڵێ راگیرابوو, دەسووڕان و بە سەرسوڕمانەوە سەیریان دەکرد. یانی عەلی دەبوو سواری ئەم ئەسپە بێ...؟ عەلی باوەڕی بەوە نەبوو کە بە چاوی خۆی دەیدی. مووی ئەسپەکە لەبەر تیشکی هەتاوی بریقەداری پاییزدا دەردەوشانەوە. ئەسپی قەشانی چوارپەل بازوو, بەو چەرخانە کە ئەوان بەدەوریان دا دەدان, سەرخۆش و بەدەماغ کلکی رادەوەشاند.

"عەلی زینی چەرکەسیت پێ باشە یان تورکمەنی؟".

عەلی بە ناڕەحەتی دەستی رێك دەخشاندن. سەری داخست و ماسوولکەکانی دەم وچاوی مچوڕکیان پێدا هات.

"ناڕەحەت مەبە عەلی, ئەتۆ برای منی".

"هەرچی ئاغا پێی باش بێ".

"بچۆ ژووری لەوێ هۆدەیەك پڕە لە زین, هەرکامێکت پێ باش بوو هەڵی گرە".

"هەرچی ئاغا بە سەلاحی بزانێ, هەر کامێکیان ئەتۆ پێت باش بێ".

مورتەزاغا جڵەوی ئەسپەکەی لە خزمەتکارەکەی وەرگرت و گوتی:

"برۆ ژووری زینە چەرکەسییە بەزیو نەخشاوەکە هەڵگرەو بیهێنە".

"بەچاوان ئاغا!"

ئەگەر زینەکەی هێنا, عەلی ئەوەی دەیدی باوەڕی پێ نەدەکرد. زینەکە, زینێکی زۆر قیمەتی بوو, تەنانەت لە ئەسپەکە خۆشی بە قیمەت تر بوو.

"عەلی بۆخۆت ئەسپەکەی زین کە".

عەلی بە دەستە لەرزۆکەکانی زینەکەی لە خزمەتکارەکە وەرگرت, چووە کن ئەسپەکە. وەك سوارێکی کارامەو لێهاتوو زینی لە ئەسپەکە کردو جوان تەنگەی توند کرد.

"سواری ئەسپەکە بە برۆ سەر پردێ, بچووە ئەو جێیانە کە دوێنێ چووبووینێ".

عەلی داگیرسابوو, شەلاڵی ئارەق بوو و دەستی دەلەرزین, نە قسەی دەکردو نە لە جێی خۆی دەبزووت.

"سواری بە عەلی".

عەلی سەرەنجام تینی بۆخۆی هێناو وەقسە هات.

"ناتوانم سوار بم ئاغا".

"بۆچی ناتوانی؟"

"چونکە ئەمن ڕێم ناکەوێ سواری ئەسپێکی وا شۆخ و شەنگ بم کە ئی ئاغایە. ئەمن حەدم چیە؟"

مورتەزاغا تێی راخوری:

"وست, وست! چما ئەتۆ برای من نی, چما ئەم ئەسپەش ئی تۆ نیە؟ دەسبەجێ سواری بە!".

عەلی بێئەوەی بەخۆی بزانێ, خۆی لەسەر پشتی ئەسپەکە دیتەوە.

مورتەزاغا پاشەوپاش کشایەوە, خۆی خاوکێش کرد. چاوێکی لە ئەسپەکە کردو چاوێك لە عەلی:

"ماشەڵڵا, یاخوا لە چاوی پیس بە دوور بی, بۆیە دەڵێن ئەسپی چاك شیاوی پیاوی پیاوە".

"عەلی".

"فەرموو ئاغا".

عەلی داهاتبووەوە سەر ملی ئەسپەکەو دەنگی ئارام و لەسەرەخۆ دەهات.

"سبەینێ جلکەکانت وەردەگرینەوە. ئاگان بە قەدەوە, فیلینتای ئەڵمانی بەدەستەوەو کلاوشەبقەی فووتێر لەسەر..." بە شادمانییەوە هاواری کرد:

"یاڵڵا, ئێستا وەرێ کەوە, وەك بای سەرسەرِ برِۆ دەری شاری و وەرەوە کارمان هەیە".

عەلی رکێفی لە ئەسپی دا, ئەسپ وەك گرێکی سەرکێش لە دەرکی حەوشەی خزییە دەرو لەبەرچاو ون بوو.

مورتەزاغا بە دوای دا نەراند:

"براڤۆۆۆ! کاکە".

حەسنەخان, ژنەکانی دیکە, منداڵان و میوانانی ماڵێ لەسەر بەرهەیوانی باڵەخانەکە راوەستابوون و تەماشای وانیان دەکرد. مورتەزاغا حەوشەی بەجێ هێشتبوو, هەروا پانایی و درێژایی حەوشەکەی دەپێواو چاوەڕێی ئەو سوارە بوو کە رۆیشتبوو. سەری بەردابووەوەو بیری دەکردەوە. جارجاریش تەماشای دەرکی حەوشەی دەکردو تاوێك رادەوەستاو دووبارە دەستی دەکردەوە بە راوێچکان. وەختێك عەلی هاتەوە, ئەو تەنانەت ئاگاشی نەکرد. هەروا لە فکرەوە چووبوو. عەلییش چاوەڕوانی ئەوە بوو کە ئاغا بیبینێ و پێی بڵێ دابەزە. عەلی لەبەر دەرگای باڵەخانەکە بەسەر ئەسپەکەوە چەقیبوو و چاوی لە ئاغا دەکرد کە دەهات و دەچوو و لەگەڵ خۆی دەدوا.

سەرەنجام حەسنەخان لەسەر بەرهەیوانەکەوە بانگی کرد:

"ئاغا, ئاغا عەلی هاتەوە, گوێت لێ نەبوو؟".

مورتەزاغا سەری هەڵبری و بە حەبەسانەوە تەماشای عەلیی کردو تاوێك دواتر ئەو تووڕەیی و ناڕەحەتییەی نەماو رەنگ و رووی کرایەوە.

"عەلی, برالە هاتیەوە؟ ئەسپەکەت چۆنە, باشە؟".

ئەمەی گوت و بۆ لای چوو.

عەلی دوودڵ بوو کە داخوا دابەزێ یان نا. مورتەزاغا چەند هەنگاو دوورتر لەو راوەستا. ماوەیەکی درێژ تەماشای عەلی و ئەسپەکەی کردو تێیانەوە راما. عەلییش چاوی تێوە بری و چاوەڕێی فەرمان بوو.

ئاخرەکەی مورتەزاغا بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی:

"زۆر باشە, زۆر چاك لێك دەکالێنەوە. لەوە باشتریش نابێ. ئێستا ببێ یان نەبێ لە هەر حاڵ دا ئەسپێکی وا رەسەن شیاوی عەلییە, باشترین شوێنگێری دنیاو برای مورتەزاغا".

بە حەبەساوی و بە چاوێکی پڕ لە خۆشەویستی تەماشای عەلیی دەکردو بە فکری دا نەدەهات کە داوای لێبکا دابەزێ. حەسنەخان لە سەرێ را دیسان بانگی کرد:

"ئاغا بفەرموو عەلییەفەندیی برامان دابەزێ, چاوەڕوانی فەرمانی تۆیە".

مورتەزاغا کە لە خۆشیی‌یان بە دەوری خۆی دا دەسوورا, هاواری کرد:

"چی؟ چی؟ حاشا, اسغفرالله. دابەزە عەلی, دابەزە براله..."،

بانگی خزمەتکارەکانی کرد:

"کورینە لە کوێن, ئەو ئەسپەی لە کاك عەلی وەرگرن".

دوو خزمەتکار پێکەوە غاریان داو جڵەوی ئەسپەکەیان لە دەستی عەلی‌یەشەل ـ کە لە ئەسپەکە دابەزیبوو ـ وەرگرت.

"براگیان, عەلی‌یەفەندی با بچینە بازار, لە پێش دا بچینە لای حاجی سمایل, لەوێ فووتێرێکت بۆ بکرم, ئەویش لەو فووتێرانە کە نوێنەرانی مەجلیس لە سەری دەنێن".

عەلی لە کاتێك دا بە نارەحەتی سەری داخستبوو, بە ترسەوە گوتی:

"ئاغا, ئەمن فووتێر لەسەر نانێم... هیچ وەخت فووتێرم لەسەر نەناوە... بم بوورە ئاغا, بە قوربانی ئەو چاوانەت بم".

"نابێ, ئەو جلکانەی بۆم بە دروون داوی بە بێ فووتێر لەبەر ناکرێن. عەلی! دەتەوێ لە پێش چاوی عالەمێ خوای ئابرووم بەری؟ خەڵك چیم پێ دەڵێن؟ پێم بڵێ خەڵك چ دەڵێن؟ دەڵێن برای مورتەزا فووتێریشی نیە. وەپێشم کەوە!".

مورتەزاغا لە پێشەوەو عەلی بە دوای دا لە دەرکی حەوشەی هاتنەدەر. ئاغا توند دەرۆیشت و لە پەستا قسەی دەکردن:

"چما دەبێ براله؟ چما کاری وا دەکرێ, لیباسی باش لەبەر کەی, سواری ئەسپی ئینگلیزی بی, ئاگانت بە قەدی‌یەوە بێ, عەلی‌یەشەلیش بی کە هونەرمەندەو وەستایانی دنیا, بە سەرکردەو شای شوێن هەڵگرانیش ناسراوە, هومێدی چوکووراواو نووری چاوی مورتەزاغا قەرەداغلی ئۆغلی بی, بەڵام کڵاوشەبقەی فووتێر لەسەر نەنێی, نابێ براله, نابێ".

راوەستا, ئاوری دایەوەو دیسان چاوی ـ کە دەت گوت بە دوای شتێك دا دەگەرێن ـ وەك بزمار لەبنی چاوی عەلی‌یەوە برین و ئەمجار گوتی:

"نابێ براله, نابێ, پیاوێکی وا, ئەویش عەلی‌یەفەندیی برام دەکرێ سواری ئەسپی عەرەبی نەبێ, کڵاو شەبقەی فووتێر لەسەر نەنێ, ئاگان و فیلینتای ئەڵمانیی نەبن, چما دەکرێ کاك عەلی‌یەفەندی شەبقەی فووتێری نەبێ, ئەویش ئەو شەبقەیە کە تەنیاو تەنیا نوێنەرانی مەجلیس و پاشا (دەرەجەیەکە لە سوپادا لە جێی ژەنراڵ ـ م ـ) خانەنشین کراوەکان لەسەریانی دەنێن!".

"بەسەرچاو ئاغا, هەرچی ئەتۆ بفەرمووی هەر ئەوەیە".

"ها... ئاوا...؟".

وەڕێ کەوتەوە. توندو بە پەلە پەل و شاکە شاك دەڕۆیشت, پاشان, راوەستاو لەگەڵ عەلی دەستی بە قسە کرد:"کاك عەلی, هەر سبەینێ دەچینە بناری ئەوبەری سوولەمیش بۆ مەشقی تفەنگ هاویشتن. با دەستمان ڕابێ. هەربینا دیت لەگەڵ حەمەدۆك تووشی یەکتر بووین. دەبێ پێش ئەوەی ئەو دەست بە پەلەپیتکەدا بێنێ, ئێمە لە دوو لاوە دەستی پێدا بێنین..." دووبارە راوەستا:

"عەلی!".

"فەرموو ئاغا".

"ئەتۆ دەتوانی گوللە لە نێوەڕاستی چاوی بنیادەم بدەی؟".

"جاران دەم توانی".

"بە ماوزەر لە دوورەوە".

"ئەگەر لەگەڵ حەمەدۆك لە راست یەك ڕا بێین...".

عەلییش راوەستابوو. ئەویش چاوی وەك بزمار لە چاوی مورتەزاغاوە بڕیبوو.

مورتەزاغا چاوی لێدەگواستەوەو تەماشای چەپ و راستی دەکرد, چاوی لە خوارەوە دەکرد, بەڵام چاوی عەلی کە دەت گوت بە چاوی وییەوە نووساون بەریان نەدەدا.

سەرەنجام ئاغا پڕ بوو, لە سەریەوە ڕژاو هاواری کرد:

"بلێ عەلی, بلێ برام, بلێ چیت لە من دەوێ؟".

عەلییش دەنگی هەڵبڕی و گوتی:

"ئاغا! ئاغا. باش بڕوانە من. ئەمن عەلیەیشەم. حەمەدۆك و مەمەدۆك ناتوانن لەمن نیزیك بنەوە. ئێستا کە ئەتۆ بە من دەڵێی برا, ئەوەندەم ڕێز لێدەگری وەك ئێرانییان کە ڕێز لە شای خۆیان دەگرن, ئاوا ڕێزم بۆ دادەنێی , ئەوی دیکەی بۆ من دانێ, هیچ کەس ناتوانێ تخوونت بکەوێ. بە من دەڵێن عەلیەیشەل, لەمەودوا بە خەیاڵی ئاسوودە لێی بنوو, نە لە کەس بترسە, نە باکت لە کەس هەبێ".

پاشان لە حاڵێك دا دەنگی بلند دەکرد,گوتی:

"ئێستا کە ئێمە لەگەڵ یەك بووینە برا, ئیدی بیر لە تاقیکردنەوەم مەکەوە چاکە؟ قسەیەکی دیکەت هەیە؟".

مورتەزاغا کە چاوی پڕ ببوون لە خۆشحالّی, لە حالّێك دا بن قۆلّی وی دەگرت, گوتی:

"نا, ئەمن کارێکی خەراپم دەکرد, ترسی گیان... هەمووی خەتای ئەم گیانە شیرنەیە, بمەوێ, نەمەوێ دەبێ بمرم, بەلاّم دیسان پیاو دەترسێ و دەکەوێتە پەلەقاژە. داوای لێبووردن دەکەم کاکە. ئەمن هەر یەکەم ڕۆژ کە پێم گوتی برا, دەبوو متمانەت پێ بکەم".

مورتەزاغا لە خۆشییان بالّی گرتبوون. بن پیلی عەلیی گرتبوو و لەگەلّ خۆی رایدەکێشا.

"بۆنی کرد, زۆری بۆن کرد".

عەلی گوتی

"دیارە بۆن دەکا".

"بای کردوە".

عەلی گوتی:

"دیارە با دەکا, بە تایبەتی پاییزی چوکووراوا زۆر گەرمە".

"عەلی!".

"فەرموو ئاغا".

"ئەتۆ سەعاتێ دەخوێنیەوە؟".

"بەلّێ دەخوێنمەوە".

"ئەتۆ سەعاتێکی زێڕت پێویستە, ئەویش بە زنجیرێکی زێڕی سەدو چل مسقالّیەوە, سەعاتێکی لۆنگێنز".

عەلی بێدەنگ بوو.

"بەلّێ بەلّێ, سەعاتێکی وا بۆ تۆ دەبێ. سەعاتەکە دەخەیە گیرفانێکی سوخمەکەت, سەری زنجیرە زێڕەکە دەخەیە گیرفانەکەی دیکەی و زنجیرە سەدو چل مسقالّیەکەش بە بەرۆکتەوە هەلّدەواسی".

لە حالّێك دا سەعاتەکەی خۆی پێ نیشان دەدا, لەسەری ڕۆیشت:

"بڕوانە, ئاوا, ئەودەم شەوو ڕۆژ دەدرەوشێتەوە".

"خۆش بی ئاغا... برالە".

هیچ شتێك وەك سەعات عەلیەشەلی کەیف خۆش نەکردبوو, نە جلەکان, نە ئەسپ, نە دەمانچەو ماوزەر. بە بیستنی باسی سەعات کەوتە هەژان, ڕەنگی روخساری زەرد هەلّگەڕا, لێوەکانی لەرزین و لاقی سست بوون. مورتەزاغاش هەستی بەم کەیف سازبوونەوی عەلی کرد.

"بەڵێ، هەزار جار بەڵێ، سەعاتێکی زێڕ کە بریقەی زێڕەکەی لە روخسارت بدا".

لەمێژ بوو گەیبوونە دوکانی حاجی سمایل و لەوێ تێپەڕیبوون، مورتەزاغا کە تێگەیبوو مەسەلەی سەعاتەکە زۆری عەلی دڵخۆش کردوە، لەو بارەیەوە درێژدادڕیی دەکرد. بن پیلی عەلی گرتبوو و باڵای لەندەهۆری خۆی بەسەردا چەماندبووەوە. لە حاڵێك دا ئاگای لە حاڵی خۆی نەبوو لە بارەی ئەو سەعاتەوە کە دەبوو بیکڕێ و ئەوە کە چ جۆر سەعاتێکەو چۆن یەکسەر لە سویسەوە بۆی دێنن، هەژدە هەژدە قسەی دەکردو چۆنیەتیی سەعاتەکەو ژمارەی بەردەکانی و نەخش و نیگارەکەی و کێشی زنجیرەکەی و جوانیەکەی باس دەکرد.

"پیاوێکی ئازا دەبێ چوار شتی هەبن، پیاوێکی ئازا ناتوانێ ئەم چوار شتەی نەبن. ئەویش پیاوێکی بەغیرەتی وەك تۆ. بە برای خۆم بڵێم... لەو چوار شتە یەکیان سەعاتە، دووهەمیان ژنێکی جوان و خڕوپڕە، سێهەمیان چەك و چوارەمیان ئەسپێکی چاکە کە گوێ مەقەست بێ و مووەکانی بریسکێنەوە".

بازاڕیان بەجێ هێشت، مورتەزاغا بە کەیف و دەماغەوە قسەی دەکرد، کەمی مابوو لە شارۆچکە وەدەر کەون. مورتەزاغا دووبارە راوەستاو ویستی دیسان بڵێ عەلی، کە لە نەکاو تێگەیشت زۆریان نەماوە لە شاری بچنە دەر.

"عەلی، لە شاری هاتینەدەر. با بگەڕێینەوە".

گەڕانەوەو هاتنە دوکانی حاجی سمایل. حاجی سمایل زۆر بە حورمەتەوە پێشوازیی لێکردن:

"فەرموو، فەرموو، فەرموو ئاغای چاوڕەشی نەجیب زادەم. لەوەتا ئەم دیوی چاوم خێل بوون هێندەی چاو لە رێیە بکەم: ئەم مەسەلەیەی حەمەدۆکیش... بیستووتە دەڵێن زگی وەك کێوی ئوحود... ئێستاش بۆگەنەکەی لە نێو شار، لەسەر داران، لەسەر خاك و لەسەر دارو دیوار ماوە..." دەسبەجێش شووشە کۆلۆنیایەکەی لەنێو داخڵەکە دەرهێنا، بە مورتەزاغاو پاشان عەلیەشەل و ئەم جار ژووری دوکانەکەو سەرەنجام بە خۆی دا کرد.

"بۆگەن دێ. حەمەدۆك راست لەنێوی چاوی عەلی سەفابەگی بەستەزمانی دا...".

مورتەزاغا دووپاتی کردەوە:

"لەنێوێ چاوی. حەمەدۆك حەزی لەو کارەیە. تفەنگ لە هەرکەس بدا، راست لەنێوێ چاوی دەدا، لەسەر خاڵە رەشەکە. وانیە عەلی؟".

عەلی گوتی:

"پیشەی خۆیەتی".

"ئەرێ پیشەیەتی. گۆیا لەمەودواش نیازی وایە لەنێوێ چاوی ئاغاکانی ئەم شارە بدا. وەلامی داوە. نەزری کردوە. بە سەری پێغەمبەرو بە ناوی خوا سوێندی خواردوە. گوتوویەتی:"یەك ئاغا لە چوکووراوا ناهێڵم کە گوللەم لە نێوەڕاستی چاوی نەدابێ. ئەویش بە گوللەی وەرەندیل, جا حاجی بێ, مەلا بێ, هەرچی بێ بۆ من فەرق ناکا".

"خوا بە نسیبمان نەکا. پەنا بە خوا کە بەنسیبمان نەکا... پەنا بە خوا... موسیبەتە, کارەساتە, بەلایە... غەزەبی خوایە... فەرموون دانیشن...".

بۆ هەر کامێکیان کورسی‌یەکی هێنایەپێش و بۆخۆشی لە حالێك دا دەلەرزی دانیشت. سەر ڕوومەتی لە پشت ریشە تێك چرژاوەکەی سوور داگیرسابوو. حاجی لە کاتێك دا بە هەژاوی و سەرلێ‌شێواوی ئەو کورسی‌یەی لەسەری دانیشتبوو, دەی‌هێنایە ڕووبەڕووی وان گوتی:

"کەوایە بەڵێنی داوەو سوێندی خواردوە هیچ ئاغایەك...؟ ئاوا کەوایە ڕاست لەنێوێ چاویشیان...".

حاجی لەبن لێوانەوە دوعای دەخوێندو لەپاش دوعایەکەش دەی‌گوت:

"مەلعوون, شەیتانی لەعین, کەوایە هەموو ئاغاکان...".

مورتەزاغا بە پێکەنینەوە بەگوێی عەلیی دا چپاند:

"تەنیا ئەمن دەمێنم کە گوللەم وەنێوێ چاوی ناکەوێ. ئەویش لە سایەی سەری تۆوە. بە حورمەتی ئەو برایەتی‌یە کە لەگەڵ تۆم هەیە".

عەلییش دەستی کرد بە پێکەنین:

"بەڵێ حاجی ئاغا کەس گوێ ناداتێ, بەلام پێم وایە ئەم بەلایە, ئەم شەیتانی لەعینە کەتنێك دەکا".

حاجی دوعایەکی خوێندو فووی لەخۆی کردو ئەمجار گوتی:

"کەتنێك دەکا".

پاشان دوعایەکی دیکەی خوێندو فووی لە خۆی کردو گوتی:

"فەرمایشتێکتان هەبوو؟".

مورتەزاغا دەستی کرد بە ناساندنی عەلی و باسی کەمالاتی وی بۆ حاجی سمایلەفەندی کرد.

حاجی سمایل گوتی:

"دەی‌ناسم, عەلیاغای برامان, کێ هەیە پیاوێکی وا بەناوبانگ نەناسێ...".

مورتەزاغا پاش ئەوەی گوتی کەس باشی ناناسێ, دەستی‌کرد بە باسی هونەرەکانی عەلیاغا کە چ شوێنگێڕێکە, چۆن شوێنی تەیری حەواو ماسیی دەریاش هەڵدەگرێ. هەمووی

یەك بە یەك باس کردن. هەتا قسەی دەکرد زیاتر دەهەژاو هەتا زیاتر دەهەژا, پتر هونەرەکانی عەلیی ـ کە بە ئەقڵ دا نەدەچوون ـ هەڵدەدان. ئاخرەکەی قسەکانی بەم رستەیە تەواو کرد:

"ئەم پیاوە برای هەقی منە. تەنیا دەسمایەی من لە جیهان دایە. ئێستا شەبقەیەکی فووتێرم بۆ ئەم برایەم دەوێ. شەبقەی وەکیل و پیاو ماقوولان, وەك کڵاوشەبقەی عارف صائم بەگ".

حاجی سمایل لە کاتێك دا دەی گوت بەسەر سەر, شەبقەیەکی وام هەیە, هەمە, بەخۆشحاڵی دەرپەڕی:"ئەمەم راگرتبوو, نرخەکەی نازانن. با بیبینن و ئەم شەبقە جوانە نەکرن, ئیشەڵڵا ئەندازەکەی بۆ سەری عەلیاغا دەبێ". چووە عەمباری دوکانەکەی و زۆری پێ نەچوو بە بوخچەیەکی گەورەوە هاتەوە دەر. بوخچەکەی لەسەر مێزەکە داناو وەك شتێکی شکانێی تێدا بێ, لەسەرخۆ بە سەری قامکان کردیەوەو شەبقەیەکی رەش کە پەڕێکی سووری بە تەنیشی راستەوە هەبوو, دەرکەوت. بەڕاستی شتێکی سەرسوڕهێنەر بوو.

مورتەزاغا دەسبەجێ هەستایە سەرپێ و گوتی:

"چەند جوانە, خوا بکا ئەندازەی سەری عەلی‌یەفەندیی برام بێ".

حاجی سمایل گوتی:

"ئەندازەیە", بەسپایی, بە سەری دوو قامکان کڵاوەکەی هەڵگرت و ئارام ئارام هاتە لای عەلی:

"برای بەڕێز, دەکرێ بێزەحمەت کڵاوەکەت لابەری؟".

عەلی دەسبەجێ ئارەقچنەکەی هەڵگرت و لەسەر ئەژنۆی خۆی دانا. هەستایە سەرپێ و سەری راست کردەوە. حاجی سمایل دیسان لەسەرەخۆ هات کڵاوەکەی لە سەری ناو پاشان تەماشایەکی وی کردو لە حاڵێك دا دەستی لێك دەدان گوتی:

"راست پڕ بە سەریەتی".

مورتەزاغا زۆر بە داوو ناو لە عەلی نیزیك بووەوە, چەند هەنگاوێك کشایەوە, تەماشای کرد, داهاتەوە, راست بووەوە, بە چەپ و راستی دا روانی و گوتی:

"زۆر باشە, دەستت خۆش بێ, جەزاکەی دەکا چەند؟".

حاجی گوتی:

"هیچ ناکا, ئێستا شەبقەکە بەرن, لە دەفتەردا دەی‌نووسم".

چایان هێنا, خواردیانەوە, تاوێکی دیکەش لە دوکانێ دانیشتن, عەلی هێشتا رەق رامابوو, تەنانەت ئاوڕی وە چەپ و ڕاستی خۆشی نەدەدا.

حاجی سمایل له حاڵێك دا دەیگوت:"ئەفەندم, حەز ناکەی لە ئاوێنەدا خۆت ببینی؟" دەستی وی گرت و لە جێی خۆی راستی کردەوە. عەلی دیسان بە رەق راماوی وەك پەیکەرێکی بێگیان هەستا, چووە پێش ئاوێنەکە. عەلی قیت لەبەر ئاوێنەکە راوەستا. ئەگەر مورتەزاغا نەیگوتبا: عەلی, براله, کارمان هەیە, با بڕۆین, لەوانەبوو عەلی هەتا رۆژی قیامەت هەروا بێجووڵە لەبەر ئاوێنەکە راوەستێ.

لەوێ ڕا چوونە لای کەوش دروو. کەوش دروو کەوشێکی لاسك درێژی لەچەرمێکی سووری جوان دووریبوو.

عەلی کەوشەکانی لەپێ کردو لەنێو دوکانەکەدا دەورێك گەڕا.

"عەلی براله. باشن؟ بۆ پێت دەبن؟".

عەلی گوتی:

"ئەندازەن, بژی ئاغا".

"ئێستا بڕوانە کەوشی پێیەکەی دیکە, کەوشی ئەو پێیە کە ئاوایە, دەڵێی ترپ لە هێلانەی شەهێن بەر بووەتەوە".

"پڕ بەو پێیەمە".

مورتەزاغا پارەی کەوشەکانی دەرهێناو دای بە کەوش دروو.

"زۆر سوپاس ئاغا, خوا بەزیادی کا, کەوشێکم بۆ عەلیەفەندیی براما دووریوە کە سێ ساڵ لە پێی کاو نەڵێ ئاخ"

"خواحافیز. عەلی با بڕۆین".

عەلی هەروا لە جێی خۆی رامابوو.

"یاڵڵا عەلی, بۆ راوەستاوی؟".

عەلی گوتی:

"ئاغا".

"بڵێ بزانم".

"کەوشە کۆنەکانم کوان؟".

"کەوشە کۆنەکانت بۆ چین؟ بنیان کونە. لەت و پەت بوون".

"پێویست دەبن ئاغا".

"یاڵڵا با بڕۆین گیانە, تا ئەو رۆژەی ئێمە ماوین ئەو کەوشە کۆنانە بە کەلکی چی دێن؟".

عەلی کڵاوشەبقەی فووتێر لەسەرو کەوشی سوور لە پێدا لە نێوەڕاستی دوکانی کەوش فرۆشەکەدا چەقیبوو. سەرەنجام کەوش درووی کەوشە کۆنەکانی هێنان و وەدەستی دان.

مورتەزاغا نەڕاندی:

"نا, نابێ. بەو کەوشە کۆنانەوە لەنێو بازاڕ پیاسە ناکرێ. بە هیچ جۆر شتی وا مومکین نیە. کارێك مەکە عالەم پێمان پێ بکەنێ عەلی, براله".

کەوشەکانی لە دەستی عەلی وەرگرت و فڕێی دانە سووچێکی دوکانەکەو قۆڵی عەلیی گرت و لەدوکانەکە وەڕێ کەوتن. ڕاستەڕێ چوونە لای بەرگدروو. خەیات کە لە دوورەوە چاوی کردبوون بە پیریانەوە هات. بە خۆشحاڵی پێشوازیی لێ‌کردن. چوونە ژووری دوکانێ.

"قوماشەکە نایابە. پیاو دەبێ قوماشی وای دەست کەوێ تا بتوانێ لیباسێکی وا جوان بدوورێ... وادیارە ئەم برایە ئاغای بەناوبانگ عەلی‌یەشەل ئاغایە! ئاغا, لیباس دوورین بۆ پیاوێکی وا بۆ من جێی شانازی‌یە".

"ئەتۆ عەلی‌یەشەل ئاغای سەرۆکی شوێنگێڕان لە کوێ دەناسی؟"

"کێ هەیە نەی ناسێ ئاغا؟ حەوت دەوڵەت ناوی وی‌یان بیستوەو دەی‌ناسن. دەڵێن شوێن گێڕێکە لەشەوی تاریك دا شوێنی مێرووە ڕەشکە لەسەر بەردی ڕەش دەدۆزێتەوە".

ئاغا قاقا پێ‌کەنی, نوقمی خۆشحاڵی بوو. پەیتا پەیتا دووپاتی دەکردەوە تەواوتورە تەواتور, ئەویش چ تەواتورێك.

پاش پێکەنینەکە گوتی:

"بڕوانە خەیات باشی, هەڵەیەکت کرد".

بەرگدروو کە نارەحەت ببوو, گوتی:

"چ هەڵەیەك؟ خەتایەکم کردوە؟".

"خوا نەکا, هەمووی ڕاست بوو. خەتای چی خەیات باشی, خوا نەکا... تەنیا لەبارەی ئەو مێروولەیەوە هەڵەیەك هەیە. ئەو کەسەی لە شەوی تاریك دا شوێنی مێرووە ڕەشکە لەسەر بەردی ڕەش دەبینێتەوە, عەلیی برام نیە, خوایە کە مێروولەی دەبینێ. عەلیی برام تەنانەت شوێنی تەیری ئاسمانیش هەڵدەگرێ.

بەرگدروو گوتی:

"شوێنی مێروولەش, هەموو خەڵکی چوکووراوا دەی‌ناسن. هەموو خەڵکی تورکیە دەی‌ناسن. تەنانەت ڕۆژنامەکانی ئورووپاش لەسەری دەنووسن. هەموو دنیاش دەی‌ناسێ".

مورتەزاغا بە جیددی گوتی:
"ئەمەیانم نەبیستبوو, کەوابێ رۆژنامەکانی ئورووپا وێنەی وی چاپ دەکەن؟".
بەرگدروو گوتی:
"دیارە کە چاپی دەکەن بەم گوێیانەم لە زەکی بەگی مامۆستام بیستوە. بەم گوێیانەم. چما زەکی بەگ رۆژنامەی حەوت دەولەتان ناخوێنێتەوە, دەخوێنێتەوە, یان نا؟".
"با, دەخوێنێتەوە, بەڵام کافرە".
"هەموو دنیا شارەزایە یان نا؟".
"شارەزایە, بەڵام کافرە".
بەرگدروو گوتی:
"با کافر بێ. ئەو دەڵێ ئەگەر پیاوی وەك عەلی لە ئورووپا بێ, لەسەر سەری خۆیانی دادەنێن. دەڵێ وەك قاروونی دەولەمەند دەبێ. لەسەر تۆپی زەوی هیچ کەس هونەری وای نیە. بەڵام زەکی بەگ دەڵێ کە...".
مورتەزاغا بە شاکەشاك پرسی:
"دەڵێ چی؟ ها, دەڵێ چی؟".
"دەڵێ بەڵام سەد مەخابن کە حەمەدۆك نایەڵێ زیندوو بێ, هەرچی بەسەر حەمەدۆك هاتوە لەبن سەری ئەم وەستا عەلیەدایە".
مورتەزاغا بۆڵاندی:
"حەمەدۆك ناتوانێ هیچ بکا. حەمەدۆك با بێ, جا خۆی دەبینێتەوە. بەڵام بێینە سەر مەسەلەی قاروون و دەولەمەند بوونی عەلی لە ئورووپا. کاك عەلی بە زوویی لیرەش دەبێتە قاروون. ئەتۆ زولفۆی دەفتەردار دەناسی؟ دیتت چۆنی لەگەڵ عارف صائم بەگ قسە دەکرد؟ سلاوی من بە زەکی بەگ بگەیەنەو پێی بڵێ کە عەلیی برام لیرەش دەبێ بە قاروون. لیرەش لەسەر سەرمانی دادەنێین".
شرینگ ها دەستێکی لەسەر شانی بەرگدروو داو گوتی:
"بڕوانە, باش بڕوانە ئەو شەبقە فووتێرەی لەسەری عەلیی برامە, تۆ ویژدانت عارف صائم بەگ و مستەفا کەمال پاشا شەبقەی وایان لەسەر ناوە؟".
خەیات باشی پاش ئەوەی چەند جار بە دەوری عەلی دا سووڕا, بە حورمەتەوە گوتی:
"وەستا دەتوانم تەماشایەکی ئەو شەبقەیە بکەم کە لەسەرت ناوە؟".

راوێژەکەی پڕ بوو لە سەرسوڕمان.

عەلی‌یەشەل کە دەت گوت وەکازی قووت داوە قیت راوەستابوو, چاوی لە نوختەیەکەوە بڕیبوو و رەق رامابوو. بە دەستی راستی ئیشارەتێکی کرد کە مانای ئەوەبوو, هەڵی‌گرە. بەرگدروو بەسپایی کڵاوەکەی لەسەر سەری عەلی هەڵگرت, تەماشای چەپ و راست و سەروبنی کڵاوەکەی کرد, چەند پتەی سووکی لێدان و ئەمجار گوتی:

"هەیهووو ئاغا. شەبقەی ئیتالیایی‌یە, هەیهوووو, جەوالێك پارە دێنێ... شەبقەی وا وەلی مەمەد ئەدەنییش لە سەری نەناوە".

مورتەزاغا بە خۆرانانەوە گوتی:

"دیارە کە لە سەری نەناوە".

"وەستا عەلی جلکەکانی لێرە دەکاتە بەری یان لە ماڵێ؟ بیان خەمە نێو بوخچە؟".

مورتەزاغا وەڵامی دایەوە:

"لە ماڵێ. ئەم جلانە دەبێ لە ماڵێ لەبەر کرێن. ئەوێ لەبارترە".

خەیات دەسبەجێ جلەکانی لە بوخچەیەك هاویشت و بۆ لای عەلی چوو:

"فەرموو وەستام, پیرۆزت بن, بە لەشی ساغیان بدڕی".

"لە دەفتەرێی بنووسە".

"بەچاوان ئاغا, بە چاوان".

مورتەزاغا لە پێشەوەو عەلی‌یەشەل بە دوای دا خەیاتخانەکەیان بەجێ هێشت و لە کاتێك دا بەرەو باڵەخانە دەڕۆیشتن, مورتەزاغا گوتی:

"زەکی بەگی گەووادی کافر, دەڵێ لە ئورووپا قەدرو قیمەتی پیاوان دەزانن. هەروا بزانە ئێمە قەدریان نازانین. وانیە کاك عەلی؟".

"بەڵێ وایە ئاغا".

"زەکی بەگی مامۆستای کافر بێ و ئەم فووتێرەو ئەم جلکانە ببینێ و ئەودەم بڵێ ئورووپا شتی وا لەبەر دەکەن. ئورووپا وەك سرێش بە زمانیانەوە نووساوە, ویردی زمانیان بووەتە ئورووپا ئا...خ ئەگەر ئەو کەوشە سوورانەت لەپێ دا نەدەبوون, هەموو تێ‌دەگەیشتن کێ قەدری پیاوان دەزانێ و کێ نا".

لەحەوشەی تێپەڕین و گەیشتنە دەرکی ژووری باڵەخانە. لە سەرێ, لەسەر بەرهەیوانەکەوە حەسنەخان بە پێکەنین و خۆشحاڵی‌یەوە چاوی لە وان بوو. ئەو, عەلیی بەردڵ کەوتبوو. ئاشقی نەجیبی و شێوەی رەفتارو ئینسانەتی‌یەکەی ببوو.

لەسەر پلیکانەکان پێشوازیی لـێکردن:

"جلەکانتان وەرگرتنەوە؟ شەبقەکە چەند جوانە. پیرۆز بێ, مەبارەك بێ..."

"ئەو ژوورە گەورەیەی ئاوێنەی تێدایە کراوەتەوە؟".

حەسنەخان وەڵامی دایەوە:

"ئاوەڵایە, کردوومەتەوە, بەڵام نەختێك راوەستن".

خێرا رۆیشت و بە خۆی و بوخچەیەکەوە هاتەوە.

"ئەمەش دیاریی من بۆ کاك عەلیم. دوو دەست کراس و دەرپێ, سێ جووت گۆرەوی و چەند دەسەسرەن. وەرە برام, وەرە عەلیەفەندی".

"وەرە".

مورتەزاغا دەرگای کردەوە. پاڵی بە عەلیەوە نا بۆ ژووری.

"ئەتۆ جلەکانت لەبەر کە, ئەمن ئەوە دێم. کراس و دەرپێیەکانیشت بگۆڕە. گۆرەوییش دەپێ کە. دوایەش دەچینە سەرتاشخانە".

دەرگای پێوەداو چووە لای حەسنەخان کە لەبەرهەیوانێ چاوەڕێی بوو.

"دەستت نەڕزێ. دەبێ زۆر بە دەوری ئەم پیاوەدا بێین. هەموو کەس دەیناسێ, دەڵێن زەکی بەگی مامۆستا گوتویە رۆژنامەکانی دنیا شتیان لەسەر نووسیوە. ئەو, کافرێکی خوێندەوارە, بتوانێ و نەتوانێ هەر ئەم پیاوەیە کە بتوانێ ئێمە لە شەڕی حەمەدۆك بپارێزێ. میللەت بەرە بەرە خەریکە هار دەبێ. بەگێکی بەو گەورەییە کوژرا, کەس هەر باکی نەبوو. عەلی سەفا بە بۆگەنەوە مایەوە...".

حەسنەخان کە رقی هەستابوو گوتی:

"تەرمەکەی ماوەتەوە لێی گەڕان هەتا تەرمی ئەو بەستەزمانە وەك کەلاکە سەگ بۆنی کرد. خوا چارەنووسی عەلی سەفابەگ بە نسیب گورگی کێویش نەکا... ئەم پیاوە وەك پیاوێکی باش دێتە بەرچاو".

"لە پیاوەکانی حەمەدۆکیشە".

"بە چ ڕا دەزانی؟".

"ئەمن دەزانم, خەبەرم هەیە. بەڵام بەرە بەرە خەریکە دێتە لای خۆمان. ئەو خاینێکە, کافرێکە, بەڵام رەگێکی ئینسانەتیی تێدایە. لەوانە نیە کە نان دەخۆن و ناندێنێ دەدڕن. لەوانەیە کە ئەگەر قاوەیەکیان خواردەوە هەتا سەد ساڵ لە چاویان دا دەمێنێ...".

"زیت و زرینگە, ئاقڵە. پیاو دەبێ متمانەی بەو جۆرە کەسانە هەبێ"

"دەستت نەرزێ خانم, ئەتۆ دیاریت دایە. لە جێ دا دەم زانی ئەو کارە دەکەی. ئێستا بچم بزانم عەلیاغامان جلەکانی لەبەر کردوون یان نا".

کە چووە ژوورێ, دیتی عەلی لیباسەکانی لەبەر کردوون. چووبووە بەر ئاوێنەو بە حەبەساوی تەماشای خۆی دەکرد.

مورتەزاغا هاواری کرد:

"وەرە خانم وەرە. وەرە عەلیی برامان ببینە, براکەمان چەند بە دیمەن بووە".

خانم بە غاردان هاتە ژوورەکە. ماوەیەکی درێژ لە عەلیەوە راماو زۆر بە شێوەیەکی جیددی گوتی:

"چ لیباسێکی جوانتان بە دوورین داوە, چەندیش لە عەلیی برامان جوانە. هەر دەڵێی نوێنەری مەجلیسە".

"پیرۆزت بن. بە لەشی ساغیان بدڕی براڵە".

دەنگی عەلی کە دەیگوت خۆش بێیاخوا, بەزەحمەت دەبیسرا.

مورتەزاغاش بە دەوری عەلی دا سووڕا, کڵاوەکەی, چاکەت و پانتۆڵەکەی و کراسەکەی تەماشا کردن, لە سەر هەتا پێ لە عەلی ورد بووەوەو سەرەنجامیش بە دەنگێکی ماندووەوە گوتی:

"چاک, جوان, لەبار. تەنیا قایش پشتێنیان کەمە, ئەومان لەبیر چووبوو. خانم یەکێك لە قایش پشتێنەکانی من بێنە".

خانم دەسبەجێ چوو و هاتەوەو گوتی:

"ها بگرە, ئەمەم تازە لە ئەدەنە ڕا هێنابوو".

مورتەزاغا قایش پشتێنەکەی وەرگرت, بە دەستی خۆی لە پانتۆڵەکەی عەلی خست و بۆی قایم کرد:"پێت خۆشە شلی کەم؟".

عەلی بە سەر تێی گەیاند کە باشە.

مورتەزاغا لە پاش ڕاو لە پێش ڕاو لە تەنیشتێ ڕا تەماشای عەلیی کرد. لە ئاوێنەش دا تەماشای کرد. بردیە بەر پەنجەرە بۆ بەر رووناکی و چەند لەحزەیەك تێیەوە ڕاماو گوتی:

"ئێستا کاك عەلی بەو تەشك و دیمەنەوە هەڵگرەو بیبە مەجلیسی گەورەی میللەت و لە نێوەڕاستێ دای نێ. هەموو کەس پێی وا دەبێ وەزیر هاتوە. ئا...خ لەگەڵ ئەم کەوشانە ڕێك ناکەون. فووتێری ئیتالیایی لە سەر بێ و کاڵەی سووری چیانشینانی لەپێ بێ..."

خانم گوتی:

"بەرێکەوت لێی جوانە, زۆریشی لێ‌جوانە... کاڵە کەوشی لەمێژینەی خۆمان و یادگاری باب و باپیرانە, چما مستەفا کەمال پاشاش ئەمەی ناوێ؟".

چاوەکانی مورتەزاغا بریسکەیان دا:

"راست دەکەی خانم. کەوشی سوور داب و شوێنی ئێمەیە, یەکێك لەدابە یادگارییەکانی خەڵکی ئاسیای نێوەڕاستە هەتا ئەم ناوچەیە. ئەگەر مستەفا کەمال پاشا ئەم باسە بزانێ یان ببیسێ, ئەویش وەك عەلیاغای خۆمان کاڵەی سوور لەپێ دەکاو لەنێو مەجلیسی گەورەی میللەت دا قیت و قنج پیاسەی دەکا... بژی خانم. زۆر سوپاست دەکەم. هەم لەگەڵ من چاکەت کردو هەم لەگەڵ میوانەکەم. مەسەلێك هەیە کە دەڵێن "گیا لەسەر پنجێ خۆی دەڕوێتەوە". ئەتۆ کچی نەجیب ترین خانی تورکمەنی دنیای. ئێمە لەگەڵ کاك عەلی دەڕۆین".

وەختێك ئەوان گەیشتنە بەر دەرکی ژوورەکە, خانم گوتی:

"بەخێرچن, خواتان لەگەڵ".

عەلی قیت و قنج و رێك و راست لە حاڵێك دا مچوڕکی بە لەش دا دەهات بە رێ دا دەڕۆیشت, چونکە تەماشا پێش خۆی نەدەکرد, نەی‌دەتوانی بەرپێی خۆی ببینێ. وەختێك لە پلیکانەکان دەهاتنە خوار, هێندەی نەمابوو بکەوێ کە مورتەزاغا توند قۆڵیی گرت. ئەگینا لەو سەرەوە بە سەرمەقولات دەهاتە خوارو هەموو ئێسکی لەشی ورد دەبوون.

"بڕۆن بەخێر چن. شەوێ بۆ نان خواردن دێنەوە؟".

مورتەزاغا بە هەژاوی و پەشۆکاوی گوتی:

"راوەستە خانم راوەستە, هێندەی نەمابوو لەبیرم بچێ, جلەکانی‌عەلیاغای باوێ نێو ئاوری کە ئیدی چاوم پێ‌یان نەکەوێ و وەبیرم نەیەتەوە کە ئەو جلی وا شڕو شەپەتووری لەبەر کردوون. خانم, نەکا لەبیرت بچێ دەسبەجێ بیان سووتێنە".

خانم لە سەرەوە وەڵامی دایەوە:

"باشە ئاغا, باشە, هەر ئێستا".

عەلی کە دەت گوت دەی‌بەنە بن داری ئیعدام لەدڵەوە ناڵاندی:

"دەست و لاقت ماچ دەکەم ئاغا, کوڕم کوشتووی و خۆم لە ماڵێ هاویشتووی. جلەکانم مەسووتێنە. ئەو پانتۆڵە حەوت ساڵ لەمەوبەر خێزانم بە دەستی خۆی تەنیویەتی. ریسەکەش بۆخۆی رستوویە, بۆ خۆشی رەنگی کردوە. بەدەستی خۆی تەنیویەو بڕیویەو دوورویە. لاقت ماچ دەکەم ئاغا جلەکانم مەسووتێنن".

مورتەزاغا تێی راخوڕی:

نابێ, نا...بێ. چاوم بەرایی نادا ئەو جلانە کە وەزعی پێشووی برایەکی وەك تۆم وەبیر دێننەوە ببینم, ناتوانم تەحەممولیان بکەم, ناتوانم بیان بینم. تاقەت ناهێنم. بیان سووتێنن, بیان سووتێنن".

دەنگی لە باڵەخانەکەدا زرینگایەوە.

خانم بڕیاردەرانە گوتی:

"هەر ئێستا, هەر ئێستا, ئاگر داییسێ".

ئاغا بن پیلی وی گرتبوو, لەگەڵ خۆی دەبردە دەرێ, ئەویش وەك کەسێك کە چاو بۆ پشتیوانێك بگێڕێ بەچەپ و راست دا دەیڕوانی.

بەو جۆرە لەبازاڕی تێپەڕین و گەیشتنە سەرتاشخانە کە لەبن دارەتوویەك بوو. سەرتاشخانە جگە لە سەرتاش کەسی لێنەبوو. مورتەزاغا فووتێرەکەی لەسەر سەری عەلی هەڵگرت و بە بزمارێکی دا کرد کە لەدیواری درابوو, ئەمجار گوتی:

"سەرو ریشی عەلیاغام بە جۆرێك بۆ چا کە کە...".

"بە چاوان ئاغا".

مورتەزاغا بن پیلی عەلیی گرت و لەگەڵ خۆی بردی لەسەر کورسی‌یەکەی دانا. سەرتاشەکە گوتی:

"وادیارە چاکردنی سەری عەلیاغای شوێنگێڕ بە نسیب ئێمە بوو هەر دەبوو خوا ئەم رۆژەمان بە نسیب بکا..."

بەروانکە سپی‌یەکەی زۆر بە جوانی لەخۆی داو مەقەست وەکار کەوت.

مورتەزاغا بە شانازی و خۆڕانانەوە کەمێك لەولاتر چوارمەشقی لەسەر نیوتەختێکی چڵکن دانیشتبوو, چاوەڕێ بوو سەرو ریش چاکردنی برا شوێنگێڕە بەناوبانگەکەی, عەلیاغا تەواو بێ.

## (٧)

هەتاو لە لوتکەی کێوەکانی دا, هەموو جێیەك لە بێدەنگیدا نوقم بوو. ماوەیەك بوو دەنگی تەقە نەدەهات. لە خوارێ لە بن چلە دڕکێك دەنگی نالە دەهات, سەرجووخە عەلی کەرتیش گوللەیەکی بەرەو ئەوێ دەتەقاند, دەنگی نالەکە کپ دەبوو, پاش ماوەیەك دووبارە دەستی پێ دەکردەوە. هەر کە دەنگی نالە دەهاتەوە بەر گوێ, عەلی کەرتیش بە قینەوە سێرەی لە چلە دڕکەکە دەگرت و گوللەیەکی دیکەی پێوە دەنا.

لە جەندرمەکان کەس نەکوژرابوو. تەنیا موحسین دۆرت یۆللی باسکی بریندار ببوو. گوللە ئێسکی جومگەی دەستی چەپیی لەبەریەك هەڵتەکاندبوو. یاوەر ئەوی ناردە دێیەکەی خۆیان کە لە خوارەوەی گەلی شکۆفە بوو. ئەوانیش لەلای جەڕاح دەستەکەیان بۆ بەست و دوایە سواری ئەسپێکیان کردو ناردیانە شارۆچکە.

بەرە بەرە زەردەی خۆر دادەکشی و تیشکی هەتاو دەکەوتە سەر بناری چیاکان. سوورایی گەشی گوڵە گوێنی وەك هەورێکی تەنك کە بەرەو ئاسمان هەڵکشێ, هەڵماوی بوو. یاوەر لەسەر تاتەبەردێك دانیشتبوو جگەرەی دەکێشا. لە فکردا بوو. ئەو وەختەی دەکەوتە بیرکردنەوە, جگەرەی لە لێوی دەکردەوەو سەری سمێڵی خۆی بە ددان دەگرت و دەیجوی. تاریکایی هەڵگیرابوو, دەوروبەر لێك دەکرایەوە. هێشتا لە بن چلە دڕکەکە دەنگی نالە دەهات و لەگەڵ بەرز بوونەوەی دەنگی نالەش سەرجووخە عەلی کەرتیش گوللەیەکی دەتەقاند.

کەمێك دواتر هەتاو بە تەواوی بڵند بوو, لە دەشتاییەیەکەی خوارێ چەند کەس لەنێو گابەردو گوێنییەکان و لە پشت قەدی دارەکان گرمۆڵە ببوون.

"وەکیل باشی عاصم!".

وەکیل باشی عاصم کە دەت گوت تازە لە خەوێکی خۆش راست بووەتەوە. بە شەکەتی لە جێی خۆی هەستا, هات بەرامبەر بە یاوەر سەلامی سەربازیی کردو خەبەردار وێستا.

"وەکیل باشی عاصم, ئەم دەستەیە, دەستەی کێ بوون؟".

"نازانم جەنابی یاوەر, ئەوەندەی ئەمن بزانم ئەم دەوروبەرە دەستەو مەستەی لـێ نین. دەستەکان لەم ناوچەیە نامێننەوە. جگە لەوەش, ئەمن نازانم چ رێگرێك دێ لە جێیەکی ئاوا خۆی بە تەڵەوە دەکا. دەبێ دەستەیەکی تازەکار بن".

"لەوانەیە حەمەدۆك لەنێو ئەوانەدا بێ کە کوشتوومانن؟".

"پێم وایە لەگەڵیان بێ, چونکە ئەو چەتەیەکی یەکجار بێئەزموونە".

"پێت وایە حەمەدۆکمان کوشتوە؟ و هەر بۆیەش نارەحەتی. لەوانەشە نەمان توانیبێ بیکوژین, رات چیە؟".

"پێم وایە کوشتوومانە".

"سەرجووخە عەلی".

"ئەمر کە جەنابی یاوەر".

"حەمەدۆك لە نێو ئەمانە دایە؟".

"بەڵێ".

"بە چ را دەزانی؟".

"چونکە یاوەر, کورە شوانێك تەنیا بۆ حەمەدۆك حازرە ئەو هەموو دارەی لـێبدرێ, عێلاتیەك هیچ وەخت بۆ چەتەیەکی دیکە نایە خۆی بە کوشت بدا".

"وادیارە سەگەکەی لەحەمەدۆك خۆشتر ویستوە".

"وەکیل باشی عاصم:

"ئەوان سەگیان تەنانەت لە دایك و باب, خوشك و براو ژن و هەرچی لەم جیهانە دایە خۆشتر دەوێ".

"ئاسان...".

"کەوابێ, ئەتۆ دەت زانی سەگ لەلای ئەمانە چەند بەنرخە؟".

"دەم زانی جەنابی یاوەر, بەڵام هەموو کەس وەك ئەو کورە شوانە نیە. ئەو کورە شێتی سەگەکەی بوو." کەلە قسەکەی بووەوە, بە دەست ئیشارەتی بۆلای بەردەڵانەکە کردو گوتی: بڕوانە جەنابی یاوەر.

یارەر سەری هەڵبڕی و روانیە ئەو شوێنە. ئەوەی دەیدی باوەڕی پێ نەدەکرد. بەمنجە منجەوە گوتی:

"هەوە؟ ئەسپەکەیە؟ چەند سەیرە، وادیارە هاتوە تەرمی حەمەدۆك ببینێ".

"زۆر سەیرە، دێهاتیەکان زۆر شت لەسەر ئەم ئەسپە دەڵێن. وەك ئەوەی کە گوللەی وێ ناکەوێ و ئەگەر لێشی بدرێ، کاری لێناکا".

یاوەر پێکەنی:

"ئێستا کەوایە، با جارێکی دیکەش تاقیی بکەینەوە".

"سەرجووخە عەلی، رای تۆ سەبارەت بەم ئەسپە چیە؟".

"با تاقیی بکەینەوە جەنابی یاوەر".

یاوەر گوتی:

"وازی لێبێنە، زۆر حەز دەکەم ئەوانە ببینم، ئەوانە کە کوشتوومانن. دەمەوێ بزانم حەمەدۆکیان لەنێو دایە".

"لەنێویان دایە جەنابی یاوەر".

"سەرجووخە عەلی. ئەتۆ لە جێ دا حەمەدۆکت دیوە؟".

"ئەم دیوە".

"ئەی تۆ وەکیل باشی عاصم".

"پێم وایە جارێکم دیوە. بەڵام ناتوانم بیناسمەوە".

"ئەدی دێهاتیەکان؟".

"ئەوان دەیناسن جەنابی یاوەر".

جووتیارەکان بەرە بەرە لە خوارەوە، لە دەشتاییەکەی ئاخری گەڵیەکە کۆ دەبوونەوە، بەڵام نەدەهاتنە سەرێ بۆ لای جەندرمەکان.

"یاڵڵا تێکڕا با بچینەخوار، بزانین کەسی ساغ یان برینداریان لە نێو دا هەیە، یان نا".

"ئەوەی دەشی ناڵاند، بێدەنگم کرد".

چوونە خوارێ، ئەو پیاوەی لەبن چڵە دڕکەکە دەیناڵاند، لەسەر گازی پشتێ درێژ ببوو، و هێشتا تەرمەکەی سارد نەببووەوە. کوڕە جحێڵەیەك بوو کە تازە خەتی دابوو تەنیا دەمانچەیەکی بە قەدیەوە بوو کە ئەویشی لە قایشەکەی دەرنەهێنابوو.

یاوەر گوتی:

"ئەمە ناکرێ حەمەدۆك بێ, حەمەدۆك دەبێ لەمە بەتەمەنتر بێ".

وەکیل باشی عاصم گوتی:

"بەڵێ, بە تەمەنترە, ناکا ئەم لاوە برازاکەی برایمەڕەش بێ؟"

یاوەر پرسی:

"ئەو لە کوێیە؟".

"ئەو ڕۆیشت نەیدەویست تەرمی برازاکەی ببینێ. وەختێك دەنگی ناڵینەکەی تەواو بوو, برایم سواری ئەسپەکەی بوو و ڕۆیشت".

چوونە ژوور سەری یەك یەکی جەنازەکان. بەهەموویان نۆ کەس بوون. بێجگە لەو لاوێژگەیە کە هێشتا لەشی سارد نەببووەوە, هەموویان تەقیلەیان لەسەر بوو, هەمووشیان جل و بەرگێکی ڕێك و پێکیان لەبەردا بوو و چەند ریز فیشەکدانیان لە خۆیان دابوو, ماوزەرەکانیشیان ئەوەندە نوێ بوون, دەت گوت دوێنێ لە کارخانە هاتوونەدەر, لوولەی چەکەکانیان لەبەر تیشکی ڕووناکایی بەر بەیان دا دەدرەوشایەوە.

هەتا لای نیوەڕۆیە لە جەنازەکان ورد بوونەوە, تەماشای موو, چاو, بەژن و باڵاو سمێڵانیان کردن, بەڵام نەیان توانی بە دڵنیایییەوە بڵێن کامەیان حەمەدۆکە.

وێ دەچوو حەمەدۆك ئەو پیاوە بێ کە سەربەرگێکی گوڵدۆزی کراوی لەبەردا بوو, قامك لەسەر پەلەپیتکە لە قوولکەیەك دا کەوتبوو و چاوەکانی هەروا کراوەوە بوون.

"وەکیل باشی, بە باوەڕی تۆ ئەو پیاوە حەمەدۆکە؟".

"ڕەنگە هەو بێ. لەگەڵ ناوو نیشانەکانی حەمەدۆك دێتەوە. چوارشانە, کورتەباڵا, لاڕوومەت قوپیو, سمێڵ تەنك, چاو گەورە, گۆرەویی قولاپە لە پێ داو خەنجەری چەرکەسی لەبەر پشتێن دا...".

"هەمووی لەگەڵی دێتەوە, وانیە؟".

"موو بە موو دێتەوە".

یاوەر لە کاتێك دا قاقا پێدەکەنی:

"ئێستا کەوایە, ڕەنگە هەو بێ, ئەوەیان کە درێژاو درێژ لەوێ کەوتوە".

ئەسپەکە لە ڕووناکایی بەیانی دا لەسەر شاخە بریقەدارەکان بێ جووڵە وێستابوو, تەنیا جاروبار کلکی دەجووڵاند. ئەگەر وای نەکردبایە دەکرا بڵێی بەشێك لە شاخەکانە. وردە وردە

جووتیارەکانیش هاتبوون و لەسەر لێواری گەلێیەکە بەڕیز ڕاوەستابوون. ئەوانیش بێئەوەی دەنگیان لێوە بێ و بێ ئەوەی تەنانەت هەناسەشیان دەربێ، بێجووڵە ڕاوەستابوون.

یاوەر رووی تێ کردن و گوتی:

"ئێوە کەستان لەنێو دا نیە کە حەمەدۆکی بناسێ، ئەوی دیبێ؟".

یاوەر چەند لەحزەیەك چاوەڕوانی وەڵامی پرسیارەکەی ما. بەڵام کەس متەقی نەکرد.

"ئێوە کەستان حەمەدۆکی دیوە؟".

دیسان متەق لەبەر حەشیمەتەکە دەرنەهات.

ئەم جار سەرجووخە عەلی کەرتیش تێی راخوڕین:

"ئێوە چ جۆر بنیادەمێکن، لەنێو ئێوەدا کەس حەمەدۆکی نەدیوە؟ شتی وا چۆن دەبێ؟ حاجی مووسا، ئەتۆ تا ئێستا حەمەدۆکت نەدیوە؟ وەرە ئێرە".

یاوەر بە رقەوە نەڕاندی:

"ئەتۆش وەرە پیرەپیاو. ئەمانە چەند خائینن، هەموویان حەمەدۆکی دەناسن. بەڵام ئاشکرای ناکەن. نیشانتان دەدەم".

حاجی مووسای پیرەپیاو بە کۆڵێك ریشی سپیەوە لە سەرێ ڕا هاتە خوارو چووە لای جەنازەکان:

"فەرموو جەنابی یاوەر".

پیرەپیاو کە تەنیا چنگێك ئێسك و پێست بوو بە ملێکی باریك و ریشێکی درێژەوە کە دەگەیشتە سەر نێوکی، یەك بە یەك دەستی کرد بە تەماشای جەنازەکان:

"ئەمەیان دەناسم، ئەمە کوڕە کەچەڵەکەی بەکرە کۆسەیە. پێی دەڵێن چەتە کەچەڵ. تەمەنەکەیم لەبیر نیە. زۆر لەمێژە چووەتە کێو و بەندەنان. کوشتیان".

یاوەر دەستی گرت و بردیە سەر ئەو چەتەیە کە بە چاوی دەرپەڕیوەوە لەسەر زەوی کەوتبوو:

"ئەمە حەمەدۆك نیە؟".

پیرەپیاو داهاتەوەو ماوەیەکی زۆر لە روخساری ئەو چەتەیەوە کە گرمۆڵە ببوو، ڕاما. گوللە لە زگی درابوو، گوللەکان لە پشتێن بەرەژێریان لەبەریەك هەڵتەکاندبوو. لاقەکانی لەنێو گۆمێك خوێن دا بوون:

"نازانم، بەڵام وەك حەمەدۆك دەچێ".

لە سەرێ ڕا کوڕە جحێڵەیەك بە غاردان هاتەخوار. هاتە پێش و گوتی:

"ئەمن دەیناسم. لە گەڵی شکۆفە نان و پێخۆرم بۆ دەبرد".

یاوەر پرسی:

"کەوایە بڵێ بزانم ئەو پیاوە هەوە؟". ئەو جەنازەیەی نیشان دا کە چاوی کرابوونەوەو لەکالانە دەرپەڕیبوون.

کوڕە جحێڵەکە داهاتەوەو ماوەیەکی زۆر تەماشای ئەو پیاوەی کرد کە زگی لەبەر یەك هەڵتەکابوو. لەحاڵێك دا پشتی راست دەکردەوە گوتی:

"ئەمە هەو نیە".

"تەماشای ئەوانی دیکە بکە. بڵێ بزانم حەمەدۆك کامەیانە؟".

کوڕە جحێڵەکە دەسبەجێ ئەو ئێشك گرەی نیشان دا کە یەکەم گوللەی لە شیرن خەودا لێدرابوو:

"ئەمە حەمەدۆکە, ئەوە کە نان و پێخۆرم بۆ دەبرد. ئەو حەمەدۆکەی بەژنی بەقەد سپیدارێك دەبوو, ئەمەیە".

"بە هەڵە نەچووی؟ کوڕە لە دەستم رزگار نابی. ئازای ئەندامت دەشکێنم".

"خۆیەتی جەنابی یاوەر, ئەمن حەمەدۆکێك کە لە گەڵی شکۆفە سێ ڕۆژان لەسەر یەك نان و پێخۆرم بۆ بردوە, ناناسمەوە. حەمەدۆك ئا ئەمەیە".

وەکیل باشی عاصم گوتی:

"پەنا بەخوا. کەوایە ئاوماڵەکانی حەمەدۆك ناوونیشانی وی‌یان بە پێچەوانە دابووینێ".

سەرجووخە عەلی کەرتیش گوتی:

"هەی نارەسەنینە".

"ئەگەر ئەمە حەمەدۆك بێ, بۆخۆم دەزانم چ لە خەڵکی ئاسیاب چەشمە دەکەم".

"لە جێ دا هەمووی ئەوانە یەکیان گرتوە, هەمزاغایان کوشتوەو بەسەر حەمەدۆکیان دا هێناوە. سزای ئەم کارەیان و سزای مەسەلەی حەمەدۆك دەبێ وەرگرنەوە".

ئەسپی خەنەیی دیسان لەوێ لەسەر دوندی شاخەکان لەنێو رووناکایی هەتاوی بەیانی دا نوقمی رووناکی وەك پەیکەرێکی ترووسکەدار رەق راوەستابوو.

"ئێوە کەسی دیکەتان تێدایە کە پێشتر حەمەدۆکی دیبێ و بیناسێتەوە؟".

ژنێك لە سەرەوەڕا هاواری کرد:

"جەنابی یاوەر, جەنابی یاوەر, بڕوانە هۆوێ. خەڵکی گەڵی شکۆفە ئەوە دێن, ئەوان هەموویان حەمەدۆکی دەناسن".

"وەکیل باشی,. چما مەحموود ئاغا, ئاغای گەڵی شکۆفە نەبوو؟ ئەگەر ئەو بێتە نێرە...".

"چما هەر ئەو نەبوو کە هەرو گیفی دەکردو دەیگوت حەمەدۆك کێیەو چ سەگێکە؟".

"با, بەرێ وەڵڵا جەنابی یاوەر".

"با راوەستین خەڵکی گەڵی شکۆفە بێن و بە تەواوی حەمەدۆکی بناسنەوە, ئەودەم خەبەر بدەینە ئاوەدانی. با لە خۆڕا نەڵێین حەمەدۆکە. ئەگینا ئابرووی بە هەزار ساڵمان دەچێ".

یاوەر بە دەم قسە کردنەوە سەری هەڵدەبڕی و دەیڕوانیە ئەسپەکە کە لەو سەرە راوەستابوو.

تاوێك دواتر خەڵکی گەڵی شکۆفە گەیشتنە جێ و لەگەڵ جووتیارەکانی دیکە هاتنەخوار. بێدەنگیەکی تەواو وڵاتی داگرتبوو.

پیاوێکی زۆر کۆنەساڵ و پشت کووڕ کە تاڵەکانی ریشی سپی و درێژ بوون هاتە نێوەڕاستێ. لە حاڵێك دا داهاتبووەوە, ماوەیەکی زۆر تەماشای یەك بە یەکی چەتەکانی کرد., ئەمجار گوتی:"نچ, حەمەدۆکیان لەگەڵ نیە".

پاشان لە کاتێك دا دەستی پاڕانەوەی بەرەو ئاسمان راگرتبوو گوتی:

"خوای گەورە سەد هەزار جار شوکرو پاش ئەوەی ماوەیەك دوعای کرد, چووە نیو حەشیمەتەکە.

یاوەر بە راوێژێکی فەرماندەرانە تێی راخوڕی:"وەرە بزانم پیرەپیاو... سەرجووخە بیهێنە نێرە".

سەرجووخە عەلی پیرەپیاوەکەی لەنێو حەشیمەت دۆزیەوە, رایکێشایە دەرو هێنایە لای یاوەر.

یاوەر نەڕاندی:

"چت گوت, گوتت چی؟ گوتت حەمەدۆکیان لەگەڵ نیە؟ پاشانیش دوعات بۆ کرد, ها؟".

پیرەپیاو بە دەنگێك کە قەت لێی چاوەڕوان نەدەکرا, هاواری کرد:

"نەخەیر حەمەدۆك لەنێو ئەمانەدا نیە, ئەمن کوڕی خۆم حەمەدۆکم خۆش دەوێ".

"ئەتۆ ئەو کافرە, ئەو پیاوکوژە چنگ بە خوێنەت خۆش دەوێ؟".

یاوەر مستی راست کردبووەوەو لاقی بە زەوی‌دا دەدا. پیرەپیاو سەری‌هەڵبڕی و لە کاتێك دا تەماشای یاوەری دەکرد گوتی:

"چتە وا دەنەڕێنی. کوڕم چ باسە خەریکی خۆت لەت و پەت بکەی, ئەودەم کە من لە چاناکالی, ساری قامیش و یۆنان سنگم دابووە بەر گوللەی دوژمن, ئەتۆ منداڵێکی قۆنداغە بووی. وا مەنەڕێنە. دەزانی ئەمن کێم؟ بەمن دەڵێن چاوەشەزەرد, قەت ناوی منت بیستوە؟"

"ئێستا ئەگەر بت دەمە دەستی سەرجووخە عەلی"

"بدە بزانم. بم دە دەست ئەو کەرتیشە بێ‌دینە, بدە با منیش بریوسکەیەك بۆ مستەفا کەمال پاشا لێ‌دەم ئەودەم دەزانین چیتان بەسەر دێنێ... با بەجوانی بەخزمەت کەرتیشیش بگا... جەنابی یاوەر, برۆ بپرسە داخوا ئەمن لە شەڕی چاناکالی دا چ کارەی وی بووم...".

ئەمجار ریشە درێژەکەی لەنێو دەستی گرت و گوتی:"هەزار جار شوکر, حەمەدۆك لەنێو ئەمانەدا نیە".

"ئێستا تۆ و کەرتیش واتان لێ‌هات بتوانن حەمەدۆکی بکوژن؟".

پاشان ئاوڕی دایەوەو بەمیهرەبانی‌یەوە تەماشای وەکیل باشی عاصمی کردو لە حاڵێك دا دەستی بۆ رادەداشت, گوتی:

"ئەو قسەیەکی نیە, ئەو وەکیل باشی عاصم نیە؟ ئەو قسەیەکی نیە, ئەم وەکیل باشی عاصمە جوامێرە, پیاوێکی پیاوە, گونی هەن ئا ئەوەندە... شەش کیلۆ, یاڵڵا زووکە بم دە دەستی کەرتیش, بم دە دەستی ئەو جەللادە بێ دایك و بابەت. وەختێك مستەفا کەمال پاشا بیستیەوە".

یاوەر بە پێکەنینەوە گوتی:

"ئەم کابرایە خەرفاوە, پیری خەرفاو. لای بەن لەپێش چاوم".

چاوەشەزەرد لە کاتێك دا ئەسپەکەی ـ کە لەسەر شاخەکان بووـ پێ‌نیشان دەدا هاواری کرد:

"بڕوانە یاوەر, بڕوانە حەمەدۆك لەوێ‌یە. ئەگەر پیاوی بچوو بی‌گرە".

ئەم جووتیارانەی کۆ ببوونەوە گوتیان:

"لێی ببوورە جەنابی یاوەر, ئەو بە جارێك خەرفاوە, نە چاوی دەبینێ و نە گوێی دەبیسێ".

یاوەر پرسی:

"چاوەشەزەرد پێشتریش وابوو؟".

"نا, ئەگەر ئەفسەرێکی لە دوورەوە دەدی, دەسبەجێ لە جێی خۆی هەڵدەستاو خەبەردار رادەوەستا".

"ئەو لەلای فەرماندەری خۆی ئاوای قسە نەدەکرد".

"ئەو خەرفاوە".

"جاران قەت ئاوای قسە نەدەکرد".

"... کە خوایە شوکر کە حەمەدۆك نەمردوە".

"ئەگەر جاران بووایە حەمەدۆکی دەگرت, دەست ولاقی دەبەستن و دەیدایە دەستی یاوەر".

"ئەودەم ئاوا پشتی دوولا نەهاتبووەوە, لەسەر زەوی چۆکی دادەدا, ماوزەرەکەی بەرەو حەوا دەگرت... ئاوا... و لەپڕ هەڵۆیەك لە ئاسمان ڕا تلپ دەکەوتە سەر زەوی".

"جەنابی یاوەر, لەچاوەشە زەردی ببوورە".

یاوەر نەڕاندی:

"ئەم خەرفاوەی بێدەنگ کەن".

دیسان دەنگی چاوەشە زەرد هات کە دەستی بۆ لای ئەسپەکە رادەداشت:

"بێ‌مێشك گیانی حەمەدۆك لە هۆویێیە. ئەگەر پیاوی بێکوژە. بڕوانە ئەو ئەسپە وەك خۆرەتاو لەوێ راوەستاوە تیشك داوێژێ., ئەگەر دەتوانی بێکوژە. دە بێکوژە".

ئەمجار جووتیارەکان بێدەنگیان کرد.

یارەر پەرێشان و دوودڵ بوو. لە کاتێك دا تێ‌دەکۆشا پێ‌بکەنێ بە لارە ملی راوەستابوو:

"باشە ئێستا پێم بلێن بزانم, ئەمانە کامیان حەمەدۆکە؟".

جووتیارەکان دەستیان کرد بە دەمەقاڵی و مشت و مڕ. ئەم دەمەقاڵێیە زۆری کێشا. سەرەنجام ژنێکی پیری قەڵەوە کە بەقەد لادەرکەیەك دەبوو و کراسێکی شینی درێژی یەخە دادڕاوی لەبەردا بوو هاتە نێویان:

"چیە, بۆچی تێك بەر بوون بێ‌ئەقڵینە".

پاشان لە حاڵێك دا یەك بە یەك لە ژوور سەری چەتەکان رادەوەستا, گوتی:

"ئاخر هەی کرمانجی نەزان, ئەمە دەتوانێ حەمەدۆك بێ؟ بڕوانە ئەمەیان, ئەو مل باریکەیان, چاوێکیشی خێلە, گرمووله بووەو لاقێکیشی وەبەر زگی داوە".

جووتیارەکان یەکدەنگ گوتیان:

"نا... ئەو ناتوانێ حەمەدۆك بێ".

پاشان چووە ژوور سەری چەتەیەکی دیکە. دەم وچاوێکی درێژووکەو ریشێکی زەردی هەبوو. گوللە, کەللەی سەریی هەڵگرتبوو, مێشکی بەدیارەوە بوو:

"یان ئەمەیان؟ یان ئەم زەردەڵەیە, ئێوە تا ئێستا حەمەدۆکی واتان دیوە؟".

دە پازدە دێهاتی یەکدەنگ گوتیان:

"نا, نەمان دیوە, حەمەدۆك وا نابێ".

"ئەمەیان ببینن کورینە, دەستی هەر لەسەر پەلەپیتکەیە. لەترسان نەیتوانیوە یەك گوللەش باوێ. بڕوانە, لاقێکیشی شەلە...".

ئەو تەرمەی باسی دەکرد پیاوێك بوو چوارشانەو کورتەباڵاً کە لاقێکی خوارو کورت تر لەوی دیکە بوو. باڵتۆی سەربازیی لەبەردا بوو. کەمێکیش پشتی کووڕ بوو. دەوروبەری پڕ لە خوێن بوو.

"بە خواتان سوێند دەدەم دێهاتی‌یەکان, تا ئێستا حەمەدۆکی ناوا شەلتان دیوە؟".

ئەم جار لە حاڵێك دا نێوچاوانی تێك دەنا لەسەری رۆیشت:

"یان ئەم کابرا کەچەڵە, لەم دەوروبەرە کەس هەیە چەتە کەچەڵ نەناسێ؟".

جووتیارەکان لێکرا, ژن وپیاوو منداڵان یەکدەنگ گوتیان: نا.

"ئەی بەستەزمان چەتە کەچەڵ... دەهاتە دێیەکان, شیعری جوانی دەخوێندنەوە, داستانەکانی کوێر ئۆغلیی دەگێڕانەوە. بەیتی وەزیرو گزیرانی دەکردو هەموو دێهاتی‌یەکانی وەپێکەنین دەخست, بە دەستێکی سازی هەڵدەگرت و بەدەستێکی تفەنگ... ئێمە ئەومان وەك چەتەیەك چاو لێنەدەکرد...".

یاوەر بە بێسەبری گوتی:

"لەسەری مەڕۆ".

ژنە لە حاڵێك دا پشتی راست دەکردەوە گوتی:

"سەبرکە جەنابی یاوەر, راوەستە خوشکێ گیان. سەبرکە ئەم کەچەڵە بەستەزمانەت پێ بناسێنم, وەختێك دەگەیشتینە کاتی چوونە هەوار, ئێمە بە چوار چاوان چاوەڕێی چەتە کەچەڵ دەبووین. کە ئەو دەهات هەموو دێهات و هۆبەو هەوارەکان پڕ دەبوون لە شادمانی".

"وازی لێبێنە".

"راوەستە جەنابی یاوەر, سەبرکە کوڕە زەردەکەم سەبرکە. کەس نەیدیوەو نەیبیستوە ئەم چەتە کەچەڵە تەنانەت مێرووڵەیەکیش ئازار بدا. ئەو نەزەرکردەی ئاخر زەمان بوو. وا نیە خەڵکینە؟ دەستتان بخەنە سەر دڵتان و بڵێن نەزەرکردە بوو یان نا".

دەنگی جووتیارەکان بەرز بووەوە کە: نەزەر کردە بوو, نەزەرکردە بوو.

لەو بەینەدا وەکیل باشی عاصم هاتە لای ژنەکەو بە دەنگێکی دۆستانەوە گوتی:

"ئەمیش خان, راوەستە کەشف و کەرامەتی ئەم نەزەرکردەیەت نیشان بدەم".

ئەمیش خان پشتی راست کردەوەو گوتی:

"بڵێ بزانم وەکیل باشی عاصم ئاغا".

وەکیل باشی عاصم داهاتەوەو لە حالێك دا کۆمەڵێك قەوانە فیشەکی نیشان دەدا کە لە پەنای چەتە کەچەڵ کەوتبوونە سەر یەك گوتی:

"بڕوانە ئەو هەموو فیشەکە ئەو بە ئێمە, بە جەندرمەکانیەوە ناوە. بڕوانە هیچ کام لە چەتەکان ئەوەندەیان قاپۆڕە فیشەك لە پەنا کۆ نەبووەتەوە".

ئەمیش خان زۆری موبالات بەو نەکردو دووبارە رووی کردەوە جووتیارەکان:

"ئەم نەزەرکردە ساز بەدەستە قسەخۆشە کە شیعرە جوانەکانی دەخوێندنەوە, دەتوانێ حەمەدۆك بێ؟".

گوتیان:

"نا, نابێ".

"یان ئەم منداڵە؟ تازە سمێڵی بۆر بوون, تەنانەت یەك فیشەکیشی ناویشتوەو یەك قاپسوونە فیشەکی لەپەنا نەکەوتوە".

"ئێمە لە تۆمان پرسی کامەیان حەمەدۆکە".

"ئەمیش خان ئێمە پرسیمان ئەمانە کامەیان حەمەدۆکە, حەمەدۆك لە نێو ئەمانەدا هەیە یان نا؟".

ئەمیش خان لە کاتێك دا هەناسەیەکی قووڵی هەڵدەکێشا گوتی:

"بەڵێ حەمەدۆك لەنێو ئەمانە دایە, وەجاخمان کوێر بووەوە وەکیل باشی, حەمەدۆك لەنێو ئەمانە دایە, لەنێو ئەم تەرمانەدا وەکیل باشی. تازە حەمەدۆکی وا نایەتەوە سەر دنیا...".

چوو لە پەنا چەتەیەکی بەخۆوە کە لەسەر کەلەکەی راست کەوتبووە سەر زەوی و رێك هاتبوو, چۆکی دادا. ئەو لاوە بوو کە لەسەر قەدە دارەکە هەر کە یەکەمین گوللەی لێدرا بە

هۆڕاندن چووە حەواو سەرەنجام پاش ئەوەی لانی کەم شەش گوللەی لـێدران لە حالێك دا چنگە کرەی لە زەوی دەکرد بە نارەحەتی گیانی دەرچوو. ژنە لە حالێك دا دەیگوت: "وەی حەمەدۆك, وەی", ئارام ئارام دەستی کرد بە شیوەن و گریان. ژنە دێهاتییەکانی دیکەش هاتن, لە دەوری جەنازەکە کۆزیلکەیان بەست و بە ئارامی دەستیان کرد بە شین و شەپۆر.

یاوەر لە حالێك دا لە رقان دەلەرزی, رووی کردە حەشیمەتەکەو هاواری کرد:

"کوێخا کێیە؟".

"ئەمنم جەنابی یاوەر".

یاوەر لە حالێك دا دەستی بۆ لای ژنەکان رادەداشت گوتی:

"ئەمە چیە, ئەمە چ وەزعێکە. ئەمانە بۆ چەتەیەك, بۆ پیاوکوژێك ئاوا دەگرین؟".

"لەنێو مەدا باوە, هەرکەس بمرێ بۆی دەگرین و شیوەنی بۆ دەکەن".

"بە گۆڕی بابی داب و شوێنی وا. وەرە پێشتر".

کوێخا هاتە نیزیك یاوەرو خەبەردار بەرامبەری وێستا.

"ئەمرکە فەرماندەر".

لەو نێوەدا یاوەر ئەسپەکەی لەنێو بەردەلان دا بەدی کرد:

"هەتا سێ رۆژی دیکە سەری ئەم ئەسپەم لە تۆ دەوێ".

"کوێخا, باشت گوێ لە قسەکانم بێ, دەبێ نۆ بارگینمان بۆ پەیدا بکەی. پێت پەیدا دەبن؟".

"دێیەکەی خۆمان تەنیا سێ بارگینی لێن جەنابی یاوەر. بەڵام لە دێهاتی دەوروبەر ئەسپ زۆرە, وەردەگرین".

عەلی کەرتیش گوتی:

"بارگینەکان دەسبەجێ پەیدا دەکەین جەنابی یاوەر".

هەتا چەند سەعاتی دیکە دەمەوێن. بارگینەکان جل و بەڕیان پێوە نەبێ".

"تێگەیشتم, جەناب, بە چاوان جەنابی یاوەر".

"پاشان چۆن دەتوانن خەبەری کوژرانی حەمەدۆك بگەیەننە نیزیکترین شارۆچکە؟... وەکیل باشی عاصم ئەتۆ بڵێ".

وەکیل باشی لەمێژ بوو بە خەفەتباری و بە نێوچاوانێکەوە کە دەت گوت ئەگەر دەستی لـێدەی گریانی دێ, وەك بەرد بەرامبەری چەقیبوو:

"لێره دەکرێ ئەسپێکی توندو چالاك پەیدا بکەین؟".

"نا جەنابی یاوەر ئەسپی وا لێره پەیدا نابێ. ئەگەر پەیداش بێ ئەسپ ناتوانێ بەو شاخە ئەستەمانەدا تێپەڕێ".

"ئەدی چ بکەین؟".

"ئەم خەبەرە خۆشەی جەنابت پیاوێکی چوست و چالاك دەتوانێ بە پێیان لە هەموو شتێك زووتری بگەیەنێتە شارۆچکە".

"کەسێکی وا دەناسی؟".

"دەناسم".

"کێیە؟".

"تاژی تەحسین".

"ئێستا لێرەیە؟".

"لەنێو حەشیمەتەکە دیتم."

یاوەر پاش ئەوەی دەستی بە چەنەگەیەوە گرت و ماوەیەك راوەستا, چووە بن ئەو چنارانە کە لە زارکی ئەشکەوتەکە روابوون. وەکیل باشی عاصمیش بە دوای دا رۆیشت. بایان دایەوە پشت تاتە نوێژەکان.

یاوەر بەسپایی پرسی:

بەڕاست ئەم چەتەیە حەمەدۆکە؟ هیچ لەگەڵ ئەو ناونیشانە کە ئێمە پێمانە نایەتەوە. حەمەدۆك پیاوێکی ریوەڵەیە, ئەم کابرایە بەقەد دێوێکە".

وەکیل باشی عاصم گوتی:

"راستیەکەی, تێنەگەیشتم. تەمەنێکم لێ رابردوە. دنیام قوونەکەو کردوە. سی ساڵە لەم چیاو بەندەنانە دەسوورێمەوە, پێم وایە ئەو کابرایە حەمەدۆك نیە. بەڵام شیوەنی بۆ دەکەن".

یاوەر ئاوڕی وەسەر دانەوە, ژمارەی ئەو ژنانە کە لە ژوور سەری مردووەکە کۆ ببوونەوە زیادی کردبوو. وادیار بوو ژنانی چەند ئاوەدانین کە وێکڕا کۆ ببوونەوەو دەگریان و شیوەنیان دەکردو بەدەم شیوەنەوە باسی حەمەدۆك و پیاوەتیەکانی, قسە خۆشیەکەی, لێوەشاوەییەکەی, ئەوین و خەجیجەکەیان دەکردو ئەوەیان دەگێڕایەوە کە چۆن عەبدیخانی

کوشت و جووتیارەکانی رزگار کردو دەیان گوت فریشتەی ئاسمان لەگەڵ خۆی دەبەن و لە دوورەوە دەرگای بەهەشتی بۆ دەکرێتەوەو هەر لە ئێستاوە لەگەڵ چل سوارەی غەیبی حەشری دەکرێ.

"بۆ ئی دیکەش, لەسەر تەرمی چەتەکانی دیکەش شین دەگێڕن؟".

"بڕوانە جەنابی یاوەر. بۆخۆت دەبینی هەشت چەتەکەی دیکە لەوێ کەوتوون, داخوا چاویش لە هیچیان دەکەن؟ تەنانەت مەیتی چەتە کەچەڵیش کە پێیان وایە نەزەرکردەیە, وەك کەلاکە سەگ بێ‌ساحێب کەوتوە, بڕوانە بزانە لاقیشیان لەسەر تەرمەکانی دیکە دادەنێن؟".

"چما حەمەدۆك لە گەڵی شکۆفە نەبوو؟".

"ئەمن ئەوم لەوێ گەمارۆ دا. سەرە موویەکیش بە هەڵە نەچووبووم. ئاشقێکیش هەبوو خەڵکی گەڵی شکۆفە پێیان دەگوت ئاشق بێچارە, ئاخرەکەی ئەویش ون بوو. بە بیرت نەماوە؟".

یاوەر لە حاڵێك دا لەخۆشی‌یان چاوەکانی دەبریسکانەوە, بە پێکەنینەوە گوتی:

"ئەرێ, وەبیرم هاتەوە. مەسەلەکە روونە, ئەو ناونیشانەی ئێمە هەمانە هەرچی دەبێ با ببێ. حەمەدۆك ئەمەیە".

لەکاتێك دا بە قەمچی لە چەکمەکانیی رادەکێشا, لێی زیاد کرد:

"ئێستا تاژی تەحسینم بۆ بانگ کەن".

بەرەو ئاپۆڕاکە وەڕێ کەوتن. وەکیل باشی عاصم دیتی یاوەر پاش ئەو شادمانی‌یە بێ‌ئەندازەیە لە نەکاو تووڕە بوو, بێ‌ئەوەی هۆیەکەی بزانێ, چاوەڕوان مایەوە. وەکیل باشی عاصم ئەخلاقی یاوەری باش دەناسی, وەختێك بەم جۆرە لەسەر نووکی چەکمەکانی وەك فەنەر هەڵدەبەزیەوە نیشانەی ئەوە بوو, زۆر تووڕەیە. جا لەو وەختانەدا وەرە بڕوانە چ قیامەتێك بەرپا دەکا.

یاوەر لە نەکاو لە نیزیك حەشیمەتەکە راوەستا, ژنان لە حاڵێك دا جار بە جار ژمارەیان زیاتر دەبوو, لە دەوری حەمەدۆکی خەریکی شین گێڕانی خۆیان بوون. دێهاتی‌یەکانی دیکەش کە خەبەرەکەیان بیستبوو, کەوتبوونە رێگاو کێو و بەندەنان. پیرو لاو, ژن و پیاو و گەورەو چووك دیار بوون دەهاتن. ئەسپی خەنەییش کە هەروا لە بەردەڵانەکە لەجێی خۆی وێستابوو, بە جارێك یاوەری لە دین دەرکردبوو:

"جەندرمەکان! ئامادە".

دەنگی فەرمانەکە لە بەردەڵانەکە دەنگی دایەوە. ژنان شیوەنیان دەکردو ئەسپەکە لە سەرەخۆ کلکی رادەوەشاند.

"هێرش بۆ لای ژنەکان, بڵاوەیان پێ بکەن".

جەندرمەکان پەلاماری کۆڕی ژنەکانیان دا, ژنەکان دەستیان کردەوە. جەندرمەکان لە پێش دا لووتیان لە دیوارێکی ئینسانی هەڵئەنگووت و دوایە تێی دا ون بوون. هات و هاوارەکە لە بەردەڵان دا دەنگی دایەوە. لەنێو هات و هاوارەکەدا هێندێ رستەی وەك "کافرینە چما ئێوە دایك و خوشتان نین, چما ئێوە ژن و دەزگیرانتان نین؟". دەهاتنە بەر گوێ.

یاوەر کە دیتی حەشیمەت جەندرمەکانیان قووت داوە فەرمانی دا:

"بە سەرنێزە".

کوێخا لە حاڵێك دا دەیگوت:"دەغیل جەنابی یاوەر", رای کردە لای یاوەر:"جەندرمەکانت بانگ کەوە, مەیەڵە شتێك رووبدا, ئێمە پیاوەکان بڵاوەیان پێ دەکەین".

یاوەر فەرمانی دا جەندرمەکان هاتنەوە بەرامبەر بە خۆی بە خەت وێستان. ئەوانیش توورە بوون. کوێخا بە غاردان چووە لای پیاوەکان. ئەوانی کۆ کردەوەو دەستی بە قسە کرد, ئەمجار پیاوەکان پەلاماری ژنەکانیان دا, یەکێك ژنەکەی و ئەوی دیکە خوشکی و دایکی دەگرت و لەسەر حەمەدۆکی هەڵدەپچڕی و بە راکێش راکێش لەگەڵ خۆی دەبردو دووری دەخستەوە. ئەو ژنانەی خۆیان لە دەستی پیاوەکان رادەپسکاوت, دەهاتنەوەو لە ژوور سەری حەمەدۆك چۆکیان دادەداو دووبارە پیاوەکانیان هێرشیان دەکردەوە سەر ئەو ژنانە کە چۆکیان دادابوو.

یاوەر بە سەرسوڕمانەوە گوتی:

"وەکیل باشی ئەمە چ وەزعێکە؟".

"ئەوەیە ئیدی, جەنابی یاوەر".

"ئەمانە زۆر دارکاری کراون جەنابی یاوەر بەڵام سەدان ساڵە کە ئیدی رام نابن و ئارام ناگرن".

"ئارامیش نابن... ئەو کابرا تاژییە لە کوێیە؟".

"تاژی تەحسین... لێرەیە جەنابی یاوەر".

تاژی تەحسین لەمێژ بوو خەبەردار لەوێ راوەستابوو.

"ئەتۆی؟".

"ئەمنم جەنابی یاوەر".

"زۆر, زۆر زوو دەچیە شارۆچکەو یادداشتێك کە وێت دەدەم دەگەیەنیە دەستی قایمقام. چەندی خێراتر بگەیەی, ئەوەندەش زووتر خەبەری مەرگی حەمەدۆك دەگەیەنیە شارۆچکە, ئاغاکانی شار لە پارەدا نوقمت دەکەن, دەبیە خاوەن پارە. چەندت پێ دەچێ تا دەگەیە شارۆچکە؟".

"نازانم, بەڵام زۆر زوو...".

کوێخا گوتی:

"ئەو تەنانەت لە ئەسپیش خۆشتر دەڕوا".

یاوەر لەسەر بەردێك دانیشت, قەڵەم و کاغەزی لە گیرفانی دەرێنان, خێرا یادداشتێکی نووسی و دایە دەستی تاژی تەحسین.

"بزانم چ دەکەی تەحسین... ئەمڕۆ بۆ ئێواری...".

"بەسەرچاو جەنابی یاوەر".

تاژی تەحسین, وەك با دەستی کرد بە غاردان, لەنێو حەشیمەتەکە تێپەڕی و بە لەحزەیەك لەبەر چاوان ون بوو. پیاوەکان هێشتا لەگەڵ ژنەکان کێشەو هەرایان بوو, دەنگی گریان و تووك کردن هەڵدەستا. بەڵام بەرە بەرە دیواری کەللەشەقیی ژنەکان دەڕووخا. لەپڕ هەموو شتێك راوەستا, هەراو هۆریاکە بە تەواوی بێدەنگ بوو. کەس متەقی لێوە نەدەهات. ژنەکان سەریان بەردابووەوەو بەرەو بنارەکە کە تیشکی سووراویی خۆی بڵاو دەکردەوە, دەچوونە پێش. چارشێوە سپیەکان لەنێو ئەو رووناکاییەدا کە هاوڕەنگی ئاوی دەریا بوو, کەوتبوونە شەپۆل دان.

یاوەر پرسی:

"مەسەلە چیە کوێخا, چۆنە کە ژنەکان ئاوا بێدەنگ و بە شەرمێونی بەرەو بنار دەڕۆن".

کوێخا تەرمی رووتی حەمەدۆکی نیشان دا. ژنەکان بێجگە لە تفەنگ و ژێرکراس و دەرپێیەکەی هەموو جل و بەرگی مردووەکەیان لەگەڵ خۆیان بردبوو.

"مەبەستیان لەم کارە چیە؟".

"کاکی خۆم. ئەگەر مردووەکەش نەبێ ژنەکان هەروەك جەنازەکەیان لەبەر دەست دا بێ, ئاوا لەسەر جل و بەرگ و کەل و پەلەکەی شیوەن دەکەن. ئێستاش ئەوە دەچنە ئەوبەری دۆڵەکە بۆ شین گێڕان".

یاوەر گوتی:"بەڵایەکی سەیر بوو". وەکیل باشی عاصمیش دووپاتی کردەوەو کەرتیش و کوێخاش گوتیان: بەڵایەکی سەیر بوو.

تاژی تەحسین غاری دەدا, نوقمی خۆشحاڵیی بوو. دەبوو خەبەرێك بگەیەنێتە شارۆچکە, هەرچەند خەبەری مەرگی حەمەدۆك کەس نازانێ کێ خۆشحاڵ دەکاو بەرامبەر بەو خەبەرە چ دیاری و خەڵاتێکی دەدەنێ. لەوانەش بوو لە کێڵگەیەکی چوکووراوادا کارێکیان بۆ پەیدا کردبا. لەوانەش بوو لە پاداشی ئەوەدا کە وەك ئەسپ لینگی داوەو هاتوە, کارێکی نابڕوداری بدرێتێ. لەوانەش بوو کاتی خزمەتی سەربازی بێنێرنە جەندرمەو ئەویش وەك سەرجووخە عەلی کەرتیش خزمەتەکەی بۆ درێژ بکرێتەوە, لەوانەش بوو بگاتە پلەی وەکیل باشیەك و لەو چیاو بەندەنانە پاشایەتی بکا. چەند کێوی لەسەر رێگا بوون. ئەگەر لە کێوەکان تێنەپەڕیبایە خوا دەزانێ, لەوانەبوو لای نیوەشەوێ بگاتە شارۆچکە.

تاژی تەحسین بێ ئەوەی نان و ناوێك بخوا, دەمێك بحەسێتەوە سەرانسەری رۆژێ و هەموو شەوەکە غاری دا. کە گەیشتە شارۆچکە لەبەر ماندوویی بە زەحمەت لاقی لە دوو دەهاتن. بەڵام نوقمی شادمانی بوو.

کەس باوەڕ ناکا کە ئاوا زوو خەبەرەکەی گەیاندبێتە شارۆچکەو مەودای نێوان ئەشکەوتی باقر گدیگی هەتا وێی بە شەو و رۆژێك بڕیبێ. سوپاس بۆ خوا کە شوێنی خانوبەرەی قایمقامیەتی پێ دەزانی و دەیتوانی بێئەوەی لە کەس بپرسێ خۆ بگەیەنێتە وێ. وەختێك لە پلیکانەکانی قایمقامیەت وەسەر دەکەوت, دوو سەعاتێکی بۆ نیوەڕۆ مابوو. ئیدی توانای هەناسەکێشانیشی نەبوو. وەختێك گەیشتە دوا پلیکانەکان هێزیشی بە تەواوی لەبەر بڕابوو. یادداشتەکەی یاوەری بە دەستەوە بوو. هێندێ شتی بە دەرکەوانەکە گوت کە لێی حاڵی نەبوو. دەستی بۆ لای ناوبراو درێژ کرد. دەست درێژکردن و پان رابوونی لەبەر دەرگاکە یەك بوو. لە هۆش خۆی چوو. قایمقام کە گوێی لە دەنگی کەوتنەکەی ببوو, بانگی دەرکەوانەکەی کرد:

"چ باسە؟".

"پیاوێك هات لەبەر دەرگا کەوت, دەڵێی گوێلکت لە مانگایە راکێشاوە... لە هەموو کونەکانی لەشی چۆڕ چۆڕ ئارەق هەڵدەڕژێ. نامەیەکیشی بە دەستەوەیە, توند توند گرتوویەتی بەری نادا".

قایمقام پیاوێك بوو کەمێك قەڵەو, چاو گەورە, بەرچۆڵەمە دارو سەر درێژووکە کە چاوەکانی هەمیشە لە کالانەدا دەسووڕان. پیاوێکی بە ئەزموون و دنیادیدە بوو. پێش کۆماریش قایمقام

ببوو. تا ئێستا ڕاست لە سی و شەش قەزادا قایمەقام ببوو. بە هەڵەداوان دەرپەڕی. تاژی تەحسین لەبەر دەرگا درێژاو درێژ لەسەر زەوی کەوتبوو. سنگی وەك کوورەی ئاسنگەران هەڵدەستاو دەپووکایەوە. چۆر چۆریش ئارەقی دەردەدا.

"خەریکە دەمرێ؟".

دەرکەوان وەڵامی دایەوە:

"خەریکە دەمرێ, زۆری غار داوە. لە زۆر دوور ڕا هاتوە, هەمووی هەر غاری داوە".

"ئەوەی بە دەستیەوە لێی وەرگرە بزانم مەسەلە چیە؟".

دەرکەوان هەوڵی دا دەستی ڕێك نوشتاوی تاژی تەحسین لێك بکاتەوەو کاغەزەکەی لێ وەرگرێ, بەڵام نەی‌توانی:

"ناکرێتەوە".

"خوایە, خوای گەورە, چۆن ناکرێتەوە. هەوڵ بدە".

دەرکەوان چۆکی داداو دەستی تاژی تەحسینی لە نێو هەردوو دەستانی گرت, هەوڵی داو هەوڵی دا, بەڵام دیسان نەی‌توانی بی‌کاتەوە.

"مومکین نیە".

قایمەقام خۆشی تاقیی کردەوە. دەستەکە داخرابوو و بەهیچ جۆر نەدەکرایەوە.

"خوایە, خوای گەورە. زۆری پێوە سەغڵەتم. بە باوەڕی تۆ چیە؟".

"بەوەڕا کە هەتا سەرە مەرگ غاری داوە, دەبێ مەسەلەیەکی گرنگ بێ. ناکرێتەوە...".

قایمەقام دووپاتی کردەوە:

"ناکرێتەوە, دەسبەجێ بڕۆ دوکتۆری بێنە, بەسەرهاتەکەی پێ بڵێ, بڵێ دەرزیەیەك دروست بکا کە دەستی ئەم پیاوەی بکاتەوە. خەریکە دەمرێ".

دەرکەوان لە حاڵێك دا بەرەو پلیکانەکان غاری دەدا, گوتی:

"خەریکە دەمرێ".

لەو بەینەدا کاتب تەحریرو مووچەخۆرەکانی دیکەش لە مەسەلەکە ئاگادار ببوون و لە بن پلیکانەکان خڕ ببوونەوە, بەڵام لە ترسان نەدەچوونە سەرێ, ئەو نهۆمە کە ژوورەکەی قایمەقامی لێ‌بوو. هەستیان کردبوو کە لە سەرێ مەسەلەیەك هەیە, بەڵام سەریان لێ دەرنەدەکرد. دەرکەوانیش کە هەر سێ پلیکانی بە هەنگاوێك بڕیبوون و بە پەنایان دا تێ‌پەڕی, دەرفەتی ئەوەی نەبوو هیچ بڵێ.

پاش تاوێك دوكتور كه لەكۆڵانەكەی ڕووبەڕوویان بوو, جانتا به دەست به غاردان هات و بێئەوەی قسەیەك بكا چۆكی داداو بەرۆكی كابرای كه درێژاودرێژ لەسەر زەوی كەوتبوو, كردەوەو گوێی به سنگیەوه نا.

"شتێك نیه, ئێستا وەهۆش دێتەوه".

قایەقام گوتی:

"دەستی ناكرێتەوه".

"چۆن شتی وا دەبێ؟".

ئەویش تاقیی كردەوه, بەڵام دەست نەكرایەوه. گوتی:"با ڕاوەستین تاوێكی دیكه وەهۆش دێتەوه".

"دەرزییەك, شتێك".

"جەنابی قایەقام, پێویست ناكا, تاوێكی دیكه... ڕاوەستین".

قایەقام دوكتۆری بانگ كرده ژوورەكەی خۆی:

"بفەرموو, به فكری جەنابت چیی بووه؟ ئیشتیات له قاوەیەك هەیه؟".

"با تاڵ بێ".

"تێنەگەیشتم چیی بووه".

"ڕەنگه خوێنی وەستابێ".

"كەس نازانێ له كوێوه هاتوه, بۆ كوێ دەچێ... ئەو كاغەزەی له دەستی دایه... هەر ئارەقیش دەڕێژێ, تەماشای كه...".

"ئێستا وەهۆش دێتەوه".

دەركەوان له دەرێ ڕا بانگی كرد:

"چاوی هەڵێنان".

قایەقام و دوكتۆر چوونه دەرێ, تاژی تەحسین چاوی هەڵێنابوون و به حەبەساوی تەماشای دەوروبەری خۆی دەكرد. جارێك چاوی له قایەقامەوه دەبڕی, جارێك له دوكتۆرو جارێك له دەركەوان و به چاوێكی پڕ پرسیارەوه لێی دەڕوانین. وردە وردە هەستا. له نەكاو تەماشای دەستی خۆی كردو كاغەزەكەی دی. به دیتنی كاغەزەكه هەموو شتێكی وەبیر هاتەوه هەستایه سەرپێ و گوتی:

"جەنابی قایەقام, جەنابی قایەقام, گەیشتمێ, به شەو و ڕۆژێك گەیشتمێ...".

"ئەوە چیە لە دەستت دایە؟".

"جەنابی یاوەر فارووق... حەمەدۆکی کوشت".

قایمەقام هاواری کرد:

"چـ...ی...کێ؟ حەمەدۆك؟ یاوەر فارووق... بدە ئەو کاغەزە".

تاژی تەحسین دەستی بۆ لای قایمەقام برد, دەستی نەدەکرایەوە.

"ئەو کاغەزەم وێ دە".

تاژی تەحسین کە هێشتا هەناسەی سوار بوو, ملی بە لاوە ناو گوتی:

"ناکرێتەوە, سەبر کە بەگم, ئەمن ئێستا دەیکەمەوە".

لەلایەك هەوڵی دەدا دەستەکەی بکاتەوەو لە لای دیکە بە هەناسەبڕکە دەیگێڕایەوە:

"لای بەیانی بوو. جەنابی یاوەر لە ئەشکەوتی باقرگدیگی دا گەمارۆی دا, هەتا خۆرهەڵات لێکیان دا. یاوەر حەمەدۆکی بە دەستی خۆی کوشت. حەمەدۆکیش چ حەمەدۆك؟ قەڵافەتی بە قەد چواری وەك ئێمەیە. شتێکە راست وەك قەدی سنۆبەر. یاوەریش گوللەی راست لەنێو هەردوو برۆیانی دا".

تاژی تەحسین کە توانیبووی دەستی بکاتەوە, بەخۆشحاڵیەوە گوتی:"کردمەوە"و کاغەزەکەی بۆ لای قایمەقام درێژ کرد. قایمەقام و دوکتۆرو دەرکەوان لە سەیران زاریان پێ داپچڕابوو. قایمەقام ئەو یادداشتەی بە دەستیەوە بوو, چەند جاری خوێندەوە:

"پێم وابوو حەمەدۆك ژانەسەرێکی زۆرمان بۆ دروست دەکا, ئاخ, ئەویش تەواو بوو. ئێستا ئیدی ئاسوودە بووین. رێگرەکانی دیکە هیچیان گرنگ نین. جانەوەری بەڕاستی ئەمە بوو, خەڵك لایەنگری بوون و ئاگایان لێی بوو. هەم ئەنکەرەو هەم ئەدەنە, تینیان بۆ ئێمە هێنابوو, بەڵێ, ئەم مارەشمان بۆ کوژرا. پیاوماقووڵانی شاریش زۆر لەم منداڵە دەترسان. لەو کاتەوە کە عەلی سەفابەگی کوشت, خەو لە چاویان نەکەوت, هەروا بزانە حەمەدۆك دێ و گوللە لە چاوی یەك بە یەکیان دەدا... بەتایبەتی مورتەزاغا شەوو رۆژ لە هیچ کوێ قەراری نەبوو. هەمیشە پێی وابوو حەمەدۆك دێ گوللەیەك لە گلێنەی چاوی دەدا. ئیدی بڕایەوە".

تاژی تەحسین بە پێوە راوەستابوو, هەروا بەلادا دەهات. قایمەقام چاوی بە تەحسین کەوت کە لەو نێوەڕاستە بەسەر پێوە راوەستابوو:

"بەو پێیە ئەو رێگرانەی یاوەر فارووق بەگ کوشتوونی, بە حەمەدۆکەوە نۆ کەسن؟".

"راست نۆ کەس، هەمووشیان مردن. جەنابی یاوەریش بە منی گوت: کوڕە تاژی، ئەگەر باڵداری هەوا بە باڵ بفڕێ، ناتوانێ لە تۆ زووتر ئەم خەبەرە بگەیەنێتە دەستی قایمەقامی خۆمان. گوتی تکات لێدەکەم هەتا سبەینێ بەیانی ئەم خەبەرە بگەیەنە قایمەقام، و منیش وەڕێ کەوتم. ئەسپیش، تەنانەت ئەسپی عەرەبیی خانەکانیش ناتوانێ لە من توندتر غاردا. مەودای نێوان باقرگدیگی و شارۆچکە چوار رۆژە رێیە. ئەمنیش غارم داو خەبەرەکەم گەیاندە خاوەنی. ناوم تاژی تەحسینە. لە جەنابت داوا دەکەم وەختێك چوومە سەربازی، بم نێرە بەشی جەندرمە. ماوەی خزمەتەکەم زۆرتر کەو بم کە بە سەرجووخە، ئەگەر پێت خۆش بوو دەبمە وەکیل باشییش. ئەودەم دەبینی چۆن چەتەکان لە رەگ و ریشە دەردێنم. عەلی کەرتیشێك هەیە تا... ئەو بەرەڵایە... هیچ هونەرێکی نیە ئەوە نەبێ کە دار لە بەرمێی دێهاتییەکان بداو ئەگەر گەیشتەوە مەخفەریش بەرتیل وەربگرێ. زۆریش ترسەنۆکە... ئەمن بکە بە سەرجووخە. ئەگەر پێشت خۆش بوو، هەموو دێهاتییەکان تەنانەت دایك و بابی خۆشم بە جۆرێك دارکاری دەکەم کە سەرجووخە عەلی کەرتیش و یاوەرو مستەفا کەماڵ پاشا دەسکانیشم لە دوو نەکەن".

"ناوت چیە؟ گوتت ناوت چیە؟".

"تاژی؟".

قایمەقام ناوی ئەوی لەسەر نامەیەك کە لەبەر دەستیدا بوو، نووسی.

"تاژی چی؟".

"پێم دەڵێن تاژی تەحسین، ئەمن بەم چیایانەدا لە ئەسپیش توندتر غار دەدەم. جارێکیان کاتێك کە منداڵ بووم کەوتمە دوای کەروێشکێك و گرتم، لەبەر ئەوە پێم دەڵێن تاژی تەحسین. ناوم "بەلەردان" بوو، مەلای ئاوەدانی ناوی لێنام تەحسین".

"دەتوانی بڕۆی".

"فەرمووت چی؟".

"دەتوانی بڕۆی".

"دەتوانم بڕۆم؟".

"دەتوانی بڕۆی".

"چت فەرموو؟ مژدانەکەم کوا؟ مزگێنییەکەم دەبێتە چی؟".

"دەتوانی بڕۆی".

تەحسین بە زارداپچڕاوی رەق رامابوو. دەیەویست هێندێ شتی دیکەش بڵێ، بەڵام دەرکەوان قۆڵیی گرت و بردیە دەرێ.

"یاوەریش پێی گوتم... مژدانەکەی... ئاغاکان... لە زێڕو زێوو زەوی و مەزرادا نوقمت دەکەن, گوتی: خانەکان...".
ئەمجار لە حالێك دا ملی بە لاوە نابوو, لەسەری رۆیشت:"ئەمن مردم, بابم بە گان چوو, رووحم دەرچوو. چما بۆخۆت بەو چاوانەت نەت دی کە خەریك بوو بمرم. قۆڵم بەردە کاکە".
دەرکەوان وەختێك قۆڵی وی بەردا کە گەیشتبوونە خوارێ, حەوشەی خانوویەرەکە:
"برۆ لاچۆ لێرە, هەتیوە بێئەقڵە, لەگەڵ قایمەقامێکی گەورەو گرانی حکوومەت ئاوا قسە دەکەن؟".
"چت فەرموو؟".
"گوتم لەگەڵ قایمەقامێکی گەورەی حکوومەت ئاوا قسە دەکەن؟".
"فەرمووت چی؟".
"چما ئەتۆ نازانی قایمەقام لە سەرجووخەش گەورەترە, لە یاوەریش هەورازترە؟".
"چت فەرموو؟ مزگێنیەکەی من کوا؟".
"هەتیوە گێژە گەوجە کەللەکەرە, مزگێنی چۆن لە قایمەقام داوا دەکرێ؟".
"فەرمووت چی؟".
"ئەگەر بە قسەی من دەکەی, لێرە مەمێنە, لێرە بمێنی, خۆت تووشی ژانەسەر دەکەی".
"چت فەرموو؟".
دەرکەوان هەر لەوێ بەرەڵای کردو چووەوە نهۆمی سەرێ. تاژی تەحسینیش چوو لەسەر بەردێکی مەرمەڕی گەورەی لەمێژینەی نەخشێندراو کە لە حەوشەی قایمەقامیەت بوو, دانیشت.
دەرکەوان هەرکە دەستی تاژی تەحسین کرایەوەو قایمەقام یادداشتەکەی یاوەری خوێندەوەو مەسەلەکە ساغ بووەوە, دەسبەجێ غاری دایە خوارێ و چووە لای ئەو مووچەخۆرانە کە لە خوار پلیکانەکان بە بێسەبری چاوەڕوان بوون, مووچەخۆرەکانیش ئەو خەبەرە خۆشەیان گەیاندە دەرێ و لە چاو لێك نانێك دا شارۆچکە بەو خەبەرە دوورلە باوەڕە کەوتە جموجۆڵ. هەرکەس دوکانەکەی داخرابوو, بە پەلە رووی کردە بازارو ئەوانەی لەسەر دوکانیش بوون غاریان دایە چایخانەکەی تۆفیق.
مورتەزاغا لە وەختێك دا خەبەرەکەی وەرگرت کە عەلیەشەلی بەرامبەر بە خۆی دانابوو. نەخشەکانی داهاتووی خۆی بۆ شی دەکردنەوەو باسی ئەوەی بۆ دەکرد کە چۆنی دەوڵەمەند دەکاو

چۆن دەی‌کاتە قاڕوون و خاوەن مووچەو مەزرا. بەیانی‌یەکەی ئەو ڕۆژە سەد لیرەی تەواوی دابوویە. بەو سەد لیرەیە دەکرا پێنج شەش جوانەگای مووزەردی شاخ کەوانی بکڕی. تەنانەت دەکرا کێلگەیەکی چووکەڵەشی پێ بکڕی. عەلی لە ناخی دڵەوەو بەڕاستی خەریك بوو موڕتەزاغای خۆش دەویست کە بە پێچەوانەی ڕواڵەتەکەی پیاوێکی بێ ڕیاو پاك و ڕاستگۆ نەبوو. کابرایەك بوو کەڵەکبازو لەو فێڵبازانەی زەمانە, پیاوێکی زرینگ, ڕیاکار, خوێنخۆر, قازانج پەرست, درۆزن و بێبار. هەرچەند عەلی بە چەند ڕۆژ هەموو ئەمانەی بۆ دەرکەوتبوو, بەڵام دیسانیش کەم کەم خەریك بوو خۆشی دەویست. بۆخۆشی حەزی نەدەکرد کابرایەکی وا بێزراوو نزمی خۆش بوێ, بەڵام بەو هەستە قووڵە کە لە هەناوی دا پەیدا ببوو, نەی‌دەتوانی ئەوی خۆش نەوێ و لەو بارەیەوە لە کن ویژدانی خۆی شەرمەزار بوو.

نوسرەتی کەبابچی خەبەرەکەی هێنا. موڕتەزاغا لە جێی خۆی ڕاست بووەوەو گوتی:

"کوڕە, ئەو خەبەرەی هێناوتە ڕاستە؟".

کەبابچیی لە ئامێز دەگرت, ماچی دەکردو بە هەناسەبڕکەوە لێی دەپرسی:"ئەم, خەبەرە ڕاستە؟ ئەگەر ڕاست بێ موڕتەزاغات... موڕتەزاغا بۆ تۆ... دوکانێکی تازەت بۆ دەکڕم... هەرچی بتەوێ دەت دەمێ. مزگێنیت لەسەر سەرم. بڵێ بزانم چت دەوێ؟...".

موڕتەزاغا بێئەوەی ئاگای لە خۆی بێ, لە پەستا دەی‌پرسی:

"ڕاستە, ڕاستە؟" و پاشان لەسەری دەڕۆیشت و ڕوو بە نوسرەت ئەفەندیی دەرکەوان ـ هەروەك لە پەنای بێ ـ دەی‌گوت:

"موڕتەزا بە قوربانی ئەو چاوە ڕەشانەت بێ. بە قوربانیشیان بێ و بە حەیرانیشیان بێ. موڕتەزا بە قوربانی ئەو زمانە شیرنەت بێ...".

لەو بەینەدا ژنەکان, وەرگێڕەکان و ئەو خزمەتکارانە کە لە ژوورەکان بوون, ڕژانە سالۆنەکە.

حەسنەخان چۆکی داکوتابوو و دەی‌گوت:

"سوپاس بۆ خوا. خوایە هەزار جار شوکر بۆ ئەم ڕۆژەت. سوپاس بۆ گەورەییت, بۆ مەسڵەحەتت. هەزار جار شوکر کە مەیتی ئەوت نیشان داین, ئێمەت لە دەستی نەجات دا. زۆر شوکر خوایە کە لە هەمووان گەورەتری". لەبن لێوانیشەوە گوتی:

"خوایە گیان, ئەگەر مەیتەکەی بەم دوو چاوانەم ببینم جووتێك قوربانیت بۆ دەکەم... ئاخرەکەی تەرمی ئەوت نیشان دام".

سەرەنجام مورتەزاغا هاتە سەر ئەوە کە چەندو چۆنی مەسەلەکە لە کەبابچی بپرسێ:

"کەبابچیی خۆم، نوسرەتەکەم، ئەم خەبەرە کێ هێنابووی، مەسەلەکە چۆنە؟ دیارە ئەم خەبەرە تۆ بۆ منت هێناوە، مژدانەشت لەسەر سەرم، دوکانی گۆرینت بۆ دەکرم، قەباڵەی دوکانەکە مژدانەتە. هیچ بۆم گرنگ نیە، کێ، کێ ئەم خەبەرەی هێناوە؟".

"کابرایەکی دێهاتی، دوێنێ بەیانی لە ئەشکەوتی باقر گدیگی‌یەوە وەرێ دەکەوێ، ئەمرۆ بەیانی تاوێك لەمەوبەر خۆ دەگەیەنێتە ژووری قایمقام و گیانی دەردەچێ. کاغەزێکی لە مستێ دا دەبێ. بە هەزار زەحمەت دەتوانن مستی جەنازەکە بکەنەوە. بە مورتەزاغای خۆم بلێم نامەیەك لە مستی دەردێنن. یاوەر لە نامەکەدا نووسیبووی:"تۆ چەتەم لە ئەشکەوتێك دا گەمارۆ دان کە حەمەدۆکیشیان لەگەڵ بوو، بەری بەیانی هەموویانم کوشت. تەنیا حەمەدۆك یەك دوو سەعات شەرِی لەگەڵ کردین. نووسیبووی کابرا سی گوللەی لێ‌دەدرێ، بەلام هەر باکیشی نابێ. نووسیبووی ئاخرەکەی بە برینداری گرتمان. نووسیبووی ئەمن بۆخۆم گوللەم راست لەنێوێ چاوی دا".

مورتەزاغا دەستی بەرەو ئاسمان بەرز کردنەوەو گوتی:

"سەد هەزار جار شوکر خوای گەورە، ئیرادەی تۆ بوو کە ئەم رۆژەمان نیشان بدەی؟".

دەسبەجێ غاری دایەوە ژوورەکەی و ئەو جلە سوورمەیی‌یانەی لەبەر کرد کە تەنیا رۆژانی جێژن و زەماوەندو ئەو کاتانە کە دەچووە ئەنکەرەو ئەدەنە لەبەری دەکردن... بۆینباغێکی سووریشی بەست. دەسەسرِەیەکی ئەو رەنگەشی لە گیرفانە چووکەڵەکەی چاکەتەکەی رۆکرد. فووتێرە ئیتالیایی‌یە نوێیەکەی بۆ یەکەم جار لە خۆشیی مەرگی حەمەدۆك لەسەر دەنا. ئەو کەوشانەش کە لە ئەستەمبوول هێنابوونی یەکەم جار بوو لە پێی دەکردن.

مورتەزاغا وەختێك لە ژوورەکەی هاتە دەرێ، زۆر پۆشتەو پەرداخ بوو. کیسەباخەڵەکەی دەرهێنا، بەستە ئیسکیناسێکی لێ هێنایە دەرو دایە کەبابچی:"جارێ با ئەمەت هەبێ، ئەمەت با هەبێ، دوایەش، دوایەش قەباڵەی ئەو دوکانەی کاری تێدا دەکەی بە ناوی تۆوە دەکەم. ئەم خەبەرە خۆشە ئەتۆ بۆت هێناوم...".

بە پلیکانەکان دا غاری دایە خوارێ و هەر دوو پلیکانی بە هەنگاوێك برِین، لە خۆشی‌یان لاقەکانی دەفرِین، وەك فەرماندەرێکی سەرکەوتوو قیت و قنج لە دەرگای حەوشەی وەدەر کەوت.

لەو ساتەوە کە خەبەرەکەی بیستبوو تاقە جارێکیش ئاورِی نەدابووەوە دوای خۆی تەماشایەکی عەلی بکا کە دوای کەوتبوو و هەوڵی دەدا بیگاتێ. عەلی بۆ ئەوەی بیگاتێ

جارو بار ناچار دەبوو غار بدا. خێرا لە بازاڕ تێپەڕین و گەیشتنە قایەقامیەت. هەر کە چوونە حەوشەی خانووبەرەکە, مورتەزاغا ئاوڕی دایەوەو پاش ئەوەی بە بێ موبالاتی تەماشایەکی کرد گوتی:

"هەتیوە شەلە. لێرە راوەستە بزانم".

عەلی لەو لەحزەیەوە کە خەبەرەکەی بیست, شتێکی وەك گلۆڵە هات و بەری ئەوکێی گرت. زۆر بە زەحمەت گریانی خۆی بۆ رادەگیرا. ئەویش لەبەر خاتری مورتەزاغا یان کەسێکی دیکە نەبوو. بەڵکوو لەبەر ئەوە بوو کە نەیدەویست دۆست و دوژمن فرمێسکی بە چاوەوە ببینن. پاش مردنی حەمەدۆك ئیدی چ پێوەندیەك لە نێوان ئەو و مورتەزاغادا دەما... بڕوانە ئەو سەگە خوێڕیە, بڕوانە چەند خۆشحاڵە... بڕوانە هەموو چەند خۆشحاڵن... شارەکە کە ئەو خەبەرەی بیستبوو, وەك دارێکی بەرز دەچوو کە تازە پشکووتبێ. هەموو پێدەکەنین و شاد بوون. رەنگە هەر عەلییش وای هاتبێتە بەر چاو. لەنێو حەوشەی خانووبەرە دەوڵەتیەکەدا, بە تاقی تەنیا مابووەوە. لەنێو ئەم جیهانەش دا هەر بە تەنیاو بێکەس مابووەوە. بێئەوەی بەخۆی بزانێ دڵۆپە فرمێسکی درشتە درشتە لە چاوەکانی هەڵڕژان. عەلی کە نەیدەویست دۆست و دوژمن چاویان لە گریانی وی بێ, چوو لە سووچێکی دیواری حەوشەکە هەڵترووشکاو سەری لەنێو ئەژنۆیانی گرت.

تاژی تەحسین کە گریانی عەلیی دیبوو, چوو لە رووبەڕووی ئەو پیاوە بە دیمەنە کە دەگریا راوەستا. پیاوێك کە کڵاوی فووتێری لەسەر بوو, راست وەك جووتیارەکانی کێوپارە دەگریاو شانەکانی هەڵدەتەکاندن. خۆشەویستیی ئەو پیاوەی لە دڵ دا هاتە جۆش. کەمێك داهاتەوە سەری و گوتی:

"مامەگیان, مەگری, بۆچی دەگریەی, چ بووە, چیت بەسەر هاتوە؟".

عەلی بە بیستنی ئەم قسانە راست بووەوەو راست بە دابی جووتیاران بە قۆڵی چاکەتە سورمەییەکانی چاوەکانیی سڕینەوە, بەڵام بە هیچ جۆر خۆی پێ راگیر نەکرا.

تاژی تەحسین فکری بە هیچ نەشکا, پرسی:

"مامە, ناکا ئەتۆ بۆ حەمەدۆك بگریەی؟ ئەویان کوشت".

لە نەکاو بۆخۆشی دەستی کرد بە گریان, دەیگوت:"کێ گریانی, بۆ حەمەدۆك نایە؟ کێ بۆ پیاوێکی وا ناگری. باسکێکی هەبوون بە قەد نێوقەدی من. ژنانی حەوت دێیان لەسەر جەنازەکەی کۆ بوونەوەو شیوەنیان کرد. یاوەریش کە ئەمەی دی جەندرمەکانی دەنگ دا پەلاماری ژنەکان بدەن.

شەڕێکی قورس لەنێو جەندرمەکان و ژنەکان دا رووی دا. پیاوانی دێهاتیش لایەنی جەندرمەکانیان گرت و پێکەوە ژنەکانیان لەسەر جەنازەی حەمەدۆك دەرکرد. ئەودەم دەزانی ژنەکان چیان کرد؟ ژنەکان بە تەواوی جلەکانیان لەبەر حەمەدۆك داکەند, چەکەکەی‌یان هەڵگرت و بۆ ئەوەی لەسەر جلەکانی شین بگێڕن چوونە کەنالی کۆیاخ. وەختێك ئەمن دەهاتم بۆ ئێرە ژنەکان لە کەنالی کۆیاخ کۆ ببوونەوەو خەریکی شین گێڕان بوون, بەردو دار لەبەر شیوەنیان دەهاتە ناڵە. بگری مامە گیان بگری, کێ بۆ حەمەدۆك, بۆ ئەم جوامێرە بەچکە شێرە ناگری؟..."

بۆخۆشی لووزەوی فرمێسکانی بەچاودا دەهاتەخوار.

عەلی‌یەشەل کە خێرا بەسەر خۆی دا زاڵ ببوو, لە تۆقی سەری هەتا بەری پێی تەماشای ئەو تازە لاوە چیایی‌یەی کرد کە بەرامبەری راوەستابوو و دەگریا. ئەمجار پرسی:

"ئەتۆ خەڵکی کوێی براکەم؟".

"خەڵکی گەڵی شکۆفەم مامەگیان".

"ئەتۆ بۆ لێرە لە حەوشی ئەم خانووبەرە حکوومەتی‌یە راوەستاوی, ببوورە, ناوت بەخێر؟".

کورە جحێڵە لە کاتێك دا چاوەکانیی پاك دەکردنەوە گوتی:

"بەمن دەڵێن تاژی تەحسین. یاوەر نامەیەکی دامێ و گوتی بە قوربانی دەستت بم برۆ هەتا دەکرێ زووتر خەبەری مەرگی حەمەدۆك بگەیەنە شارۆچکە, برۆ بزانم چ دەکەی... قایمقام, ئاغاکان, بەگەکان و خانەکان, مژدانەیەکت دەدەنێ, هەر مەپرسە. وەختێکیش چوویە سەربازی, دەت کەنە کادیر, دەبیە سەرجووخە, ئەگەر بتەوێ دەت کەنە وەکیل باشی, زۆریشت پارە دەدەنێ؟ ئەمنیش لێرە راوەستاوم مزگێنی‌یەکەم وەرگرم".

"گوتیان ئەتۆ مردووی...".

"بەڕاستییش مردبووم. لەبەر دەرگای ژووری قایمقام کەوتم و مردم. پاشان دوکتۆرێکی جانتا بە دەست هات و زیندووی کردمەوە".

"چت بوو, چ سندانێکت بوو کە وا غارت دا؟".

"دوێنێ لای نیوەڕۆیە یاوەر پێی گوتم ئەگەر سبەینێ پێش نیوەڕۆ ئەم خەبەرە بگەیەنیە شارۆچکە, هەرچیت بوێ دەت دەمێ. ئەمنیش دوێنێ لای نیوەڕۆیە لە باقرگدیگی وەڕێ کەوتم".

"چی؟ لە باقر گدیگی؟ چە...ی؟".

"لە ئەشکەوتی باقر گدیگی... ئەسپی حەمەدۆکیش لەسەر دوندی شاخەکانی سەر ئەشکەوتێ وەك هەڵۆ راوەستابوو, جووڵەی نەدەکرد. ئەسپێکی خەنەیی‌یە".

"ئەتۆ جەنازەی حەمەدۆکت بەو چاوانەی خۆت دی؟".

عەلی, ئیدی نەدەگریا.

"دیتم".

"گوتت چۆن بوو؟".

"زۆر زەلام بوو, چاوی گەورە بوون, جووتێك سمێڵی درێژو بە پشت و رەشی هەبوون".

ئەمجار باسکەکانی لێك کردنەوەو گوتی:"سنگ پان, تا ئامە دەفەی سنگی بوو. ددان زێڕ...".

"ئەتۆ پێشتر حەمەدۆکت دیبوو؟".

"نەم دیبوو".

"یاوەریش گوتی ئەو چەتە سمێڵ درێژە ددان زێڕە حەمەدۆکە؟".

"وای دەگوت, لە خۆشییان خەریك بوو شێت بێ. بەڵام لە دەستی ژنەکان و ئەو ئەسپە کە لەسەر شاخەکان بوو, زۆر جارِز بوو. هەموو خەڵکی گەڵی شکۆفە کاتێك چاویان بە جەنازەکان کەوت دەستیان بە شیوەن و گریان کردو گوتیان حەیف بۆ حەمەدۆك".

"تەماشای چەتەکانی دیکەشت کرد؟".

"یەك بە یەك تەماشام کردن. یەکیان لەنێو دا بوو تازە سمێڵی بۆر ببوون, شازدە ساڵ زیاتر نەدەبوو..."

عەلییەشەل قۆڵی تاژی تەحسینی گرت و بردیە نیزیك بەردە مەرمەرە قەدییە نەخشێندراوەکە, لەسەر بەردەکە لە پەنای یەکتر دانیشتن, عەلییەشەل پاش ئەوەی تاژی تەحسینی هان دا هەتا ناوونیشانی هەموو چەتە کوژراوەکان موو بە موو باس بکا گوتی:

"کوڕم تاژی, ئەتۆ لە مووسا سەرسەرێش زیاتری. ئەو هەموو رێگایەت چۆن بڕی و هاتی؟".

"هاتم, بەڵام مردم و زیندوو بوومەوە, ئەو دوکتۆرە جانتا بە دەستە زیندووی کردمەوە".

عەلی دەستی کردبوو بە پێکەنین, سەرانسەری گیانی نوقمی خۆشحاڵی بوو. لە سمێڵەکانی, لە چاوەکانی, لە دەستەکانی, لە جلکەکانی و لە لاقە شەلەکەی خۆشحاڵی هەڵدەقوڵی. خۆشحاڵییەکەی کاری کردبووە سەر تاژی تەحسینیش, لاوێژگە تاوێك رادەوەستاو ئەمجار لە قاقای پێکەنینی دەدا.

عەلییەشەل بە تاژی تەحسینی گوت:

"هەر لێرە چاوەڕوان بە, چاوەڕوان بەو مژدانەکەت وەرگرە. موورتەزاغا ئێستا لەو ژوورە دێتە دەر, ئەمن نیشانت دەدەم, بڕۆ پێی بڵێ مزگێنییەکە ئەمن هێناومە... بە ئاغاکانی دیکەش بڵێ. دراوت دەدەنێ. ئەگەر نەیان دایەی لێرە مەبزوو. هێندەی نەمابوو بمری".

"بمرم چیه مامه گیان, ئەمن مردم و چوومه ئەو دنیاو هاتمەوە".

پیاوماقولانی شارۆچکە یەك یەك و دوو دوو بە جل و بەرگی جوانەوە بە گالتەکردن و قاقاکێشان دەهاتن و لە پلیکانەکانی خانووبەرە دەولەتی‌یەکە وەسەر دەکەوتن, لە سەرێش ڕا دەنگی قاقاو پێکەنینیان کە لە خۆشی‌یان یەکتریان لە ئامێز دەگرت دەهاتە بەر گوێ.

عەلییش بە ئەندازەی وان خۆشحالْ بوو, بەلام کرمی گومان و دوودلی هەناوی دەجوی, شین گێڕانی ژنەکان نیگەرانی کردبوو. ئەگەر ئەو شین گێڕانە نەبووایە لە خۆشی‌یان بالی دەگرت و هەلْدەفڕی.

عەلی چەند لەحزەیەك بێدەنگ دەبوو, لە فکرەوە دەچوو, چاوە تیژەکانی لە تاژی تەحسینەوە دەبڕین و تێ‌یەوە رادەماو هەلی دەسەنگاندو پاشان دەی‌پرسی:

"ئەتۆ بۆخۆت حەمەدۆکت دیوە؟".

ئەمجار تاژی تەحسینی هان دەدا هەتا هەموو ناونیشانێکی چەتەکانی موو بە موو بۆ باس بکاو تاژی تەحسینیش دەستی دەکرد بە قسان:

"ئێمە هەتا ئێستا هەرگیز حەمەدۆکمان نەدیوە. نەمان دیوە بەلام دەی‌ناسین, تەنانەت هەموو چیاکانی تووڕووسیش دەی‌ناسن..."

پاشان باسی چەتەکانی دیکەی دەکرد کە کوژرابوون.

"جارێکی دیکە بۆم باس بکە بزانم حەمەدۆك چۆن بوو".

"ئەمن باشم نەدی, هەر کە یاوەر یادداشتەکەی دامە دەست وەڕێ کەوتم. ڕێگای سێ ڕۆژانم بە شەوو ڕۆژێك بڕی و هاتم. هێندەی نەمابوو بمرم, دیارە مردم, بەلام دوکتۆر زیندووی کردمەوە. بەلام فایدەی چی, ئەویشم بە کەلك نەهات, مژدانەکەم دەدەنێ؟".

"کێ دەزانێ, لەوانەشە بت دەنێ".

"حەمەدۆکی دەلێم ئا... ها... دەت گوت کێوە. سمێلْ گەورە کە سمێلی لە بنانگوێ‌یەوە دەرچووبوون, خالێکی لە تەختی نێوچاوانێ بوو, مۆری پێغەمبەری مەزن. هەربۆیە گوللە کاری لێ‌نەدەکرد".

"ئەگەر وایە چۆن بوو کە کاری لێ‌کرد؟".

"ئەمەیان ئیدی نازانم, ئەوەیان تەنیا خوای گەورەمان دەی‌زانێ. لەوانەشە نەمردبێ. ئاومالەکانمان وا دەلێن. خەلکی گوندەکانی دیکەش دەلێن ئەو ئەسپەش وەك ئەسپی کوێرئۆغلی نامرێ. لەدنیا دا تەنیا ئەسپێك هەبوو کە تێکەلْ بە چل سوارەی غەیبی بوو و هەرگیز نامرێ,

ئەویش ئاوی حەیاتێی خواردوەتەوە. بەڵام کوێر ئۆغڵی لەو ئاوەی نەخواردبووەوە. ئەسپەکە هەر کە ئەو ئاوەی خواردەوە تێکەڵ بە چل سوارەی غەیبی بوو, ئەویش تەنیا لەبەر ئەو چاکەیە کە لەگەڵ فەقیرو هەژارانی کردبوو. دەڵێن ئەسپی حەمەدۆك لە دوندی شاخەکانی ئەو کێوە بەرزە چاوەڕێی جەنازەی حەمەدۆکە, گۆیا دەیەوێ بێهاوێتە سەر پشتێ خۆی و بێباتە لای چل سوارەی غەیبی. ئەمن چووزانم, ئەمن نازانم, هەموو دێهاتیێیەکان وا دەڵێن".

قایمەقام لە پێشەوە, شارەدارو داواکاری گشتی و بازپورس لە تەنیشتی و بە دوای ئەوانیش دا زولفۆ, تاشکەن خەلیل و مورتەزاغا, مەلا دۆران ئەفەندی, قازی کووزان ئۆغڵی و باقیی پیاوە ناودارەکانی شارۆچکە لە دەرکی خانوبەرە حکومەتیێیەکە وەدەر کەوتن. هەموویان فێنکایێیان لە دڵ گەڕابوو و پێدەکەنین و بە دەنگی بەرز قسەیان دەکردن و گاڵتەیان دەکرد. وا دیار بوو هیچ کامێکیان لە سەرانسەری ژیانی دا رۆژی وا پڕ بەختەوەری و سەرکەوتنی نەدیوە, کاتێك عەلی و تەحسین بە دوایان دا وەرێ کەوتن, عەلی بە تاژی تەحسینی گوت:

"بڕوانە, هۆوە مورتەزاغایە, ئەوە کە دەسەسرە سوورەکەی لە گیرفانی چەقاندوە. بڕۆ لای, بڕۆ مەترسە, هەقی خۆت داوا بکە, مزگێنیێیەکەت وەرگرە".

ئەوان هێشتا لە حەوشی خانوبەرە دەوڵەتیێیەکە وەدەر نەکەوتبوون کە تاژی تەحسین سەر ڕێی پێ گرتن. هات قیت لە پێش مورتەزاغا چەقی, خەبەردار راوەستاو لە حاڵێك دا سڵاوی سەربازیی دەکرد, گوتی:

"ناوم تاژی تەحسینە, ئەمن خەبەری مەرگی حەمەدۆکم بۆ ئێوە هێناوە".

ئەمجار ئیشارەی بۆ قایمەقام کرد ـ کە راوەستابوو زەردەی لەسەر لێوان بووـ و لەسەری رۆیشت: حەز دەکەی لەویش بپرسە. رێگای سێ رۆژانم بە رۆژێك بڕی و هاتم. هێندەم غار دابوو کاتێك گەیشتمە بەر دەرگای ژوورەکەی وی کەوتم و مردم. پاشانیش ئەو پیاوە باشە دوکتۆری هێناو زیندووی کردمەوە. ئەمجار چووە لای قایمەقام و خەبەردار بەرامبەری وێستا:"وا نیە جەنابی قایمەقام؟"

قایمەقام بە پێکەنینەوە گوتی:

"بۆچی, وایە".

پاشان تاژی تەحسین بەرامبەر بە مورتەزاغا راوەستا:

"باشە ئێستا کە زانیتان ئەمن مردووم و زیندوو بوومەوە, مزگێنیێیەکەم بدەنێ. لە هەمووان زیاتر دەبێ ئەتۆ مژدانەم بدەیەی مورتەزاغا".

ئەوانی دیکەش هەر لەوێ ڕاوەستابوون و بە چاوی خۆشەویستی دەیان ڕوانیە ئەو لاوە چیاییە ڕیوەڵەو باریکەڵەیە. تەحسین لەسەر قسەکانی ڕۆیشت: ئەم پیاوە, پاشان بە دەستی ڕاستی عەلی‌یەشەلی نیشان دا ـ کە لە دوای هەموویانەوە وێستابوو و چاوەکانی و ددانەکانی لە خۆشحاڵی‌یان دەبریسکانەوە ـ و گوتی: ئەم پیاوە گوتی هەرکام لە ئێوە پیاوی زۆر سەرزلن, لە وشتریش گەورەترن, هەمووتان بەردەستی مستەفا کەمال پاشان, پیاوێکی گەورەی وەك گزیگ دۆرانن".

دیسان بە دەستی ڕاستی مورتەزاغای نیشان دان:"بە تایبەتی ئەم ئاغایە, پیاوێکی زۆر گەورەیە, باشە کەوایە بۆچی مژدانەکەم نادەنێ؟".

هەموو ئەوانەی لەوێ بوون, قاقا پێ‌کەنین, لە پێش دا مورتەزاغاو ئەمجار ئەوانی دیکە تەنانەت قایەقامیش, دەستیان بۆ گیرفانیان بردو کیسەباخەڵەکانیان دەرهێنا.

پێش هەمووان مورتەزاغا ئەسکیناسێکی سەد لیرەیی لە کیسەکەی دەرهێناو بۆ تاژی تەحسینی ڕاداشت. تاژی تەحسین کە چاوەکانی وەك زارە ئەشکەوت پێ داپچڕابوون, دراوەکەی لە دەستی وەرگرت:

"ئاغا جوانەکەم, هەمووی بۆخۆم؟".

"هەمووی هی خۆتە, بۆچی پێت سەیرە؟".

"ئاغا ئەگەر ئەمن پێم سەیر نەبێ, کێ پێی سەیر بێ. ئەمن سێ ساڵان لەسەر زەوی‌یەکانی یوورەگیر نۆکەریم کرد نیوەی ئەم پووڵەیان نەدامێ...".

شارەدار پلارێکی هاویشت:"تاژی تەحسین ڕۆڵە, ئەتۆ پێت وایە لینگەی مورتەزاغا لە یوورەگیر, لە ئاناتۆلیی پیرو لەم دنیایەدا پەیدا دەبێ؟".

تاژی تەحسین گوتی:"استغفرالله, پەیدا نابێ...".

ئەوانی دیکەش هەر یەکە پێنج لیرەیەك دە لیرەیەکیان لە دەستی تاژی تەحسین کرد. تاشکەن بەگ و زولفۆی دەفتەرداریش هەریەکەی ئەسکیناسێکی سەد لیرەیی‌یان دا بە تەحسین کە ئەم مەسەلەیە مورتەزاغای زۆر نارەحەت کرد:"چما ئەوانە کێن هەتا بۆ مردنی حەمەدۆك بە قەد من مژدانە بدەن". زۆر تووڕە ببوو. ئەم کارەی بە سووکایەتی‌یەکی گەورە بە خۆی دادەنا:"یەکیان دەفتەردارێکە کەس نازانێ کێ‌یەو لە کوێ ڕا هاتوە, ئەوی دیکەشیان لە شەڕی سەربەخۆیی دا لەو چیاو بەندەنانە ون بوو, وەك مشکەکوێرە سەری لەبن چڵە درووان ڕاکردو کەچی بەو حاڵەشەوە نیشانی سەربەخۆیی وەرگرت. گۆیا کوڕی یەکێك لەو ئاغا سوالکەرو لە برسان مردووانە بووە کە بە کوولەکان دڕاوە".

مورتەزاغا بیری کردەوە:"کارێکی زۆر خراپیان کرد, خراپەیەکی زۆریان دەرهەق من کرد".

تاژی تەحسین کە پارەکەی لە نێو دەستی دا ڕێك نوشتاندبوو, بە چاوێکی لە سەیران داپچڕاوەوە بێئەوەی بزانێ دەبێ چ بکا لەو نێوە رەق رامابوو, بە جۆرێك وەك ئەوەی داوای کۆمەگ بکا تەماشای عەلیەشەلی دەکرد کە ئەو هەموو چاکەیەی لەگەڵ کردبوو, و ئێستاش لەوبەرەوە بە تاقی تەنیا راوەستابوو, دەمی هەتا بنانگوێی پێ داپچڕابوو و کڵاوشەبقە لەگەنییەکەی هەتا سەر چاوانی هێنابووەخوار.

مورتەزاغا بە راوێژێکی زبرەوە بانگی تاژی تەحسینی کرد:

"وەرە ئێرە کوڕم, تاژی".

تاژی تەحسین ترسا, چەند جار بە دوودڵی تەماشای عەلیەشەلی کرد, پێی وابوو ئەو پیاوە توورەو تۆسنە ئەو دراوەی لە دەستی دایە, لێی دەستێنێتەوە. چاوەکانی بە ترسەوە پێشان بۆ لای قایەقام, دوایە بۆ لای عەلی و ئەمجار بۆ لای شارەدار سووڕان. ئەگەر لەوێ دەرباز بوویایە, گوللەش تۆزی نەدەشکاندو بە جۆرێك وە کێو و بەندەنان دەکەوت, تەنانەت شەیتانیش نەیدەدۆزیتەوە. تاژی تەحسین راست لەو لەحزەیەدا کە ئامادەی راکردن بوو, دەنگی ئاغای بەر گوێ کەوت و کیسەپووڵەکەی بە دەستەوە دی. مورتەزاغا دوو ئەسکیناسی سەد لیرەیی دیکەی بە دەستەوە بوون و بە خۆشحاڵی و بە گەرمی و خۆمانەوە بە دەمیەوە پێدەکەنی:

"وەرە کوڕم, وەرە, ئەم سڕو سوالکەرانە شیاوی تۆ نین, ئەتۆ یەکەم کەس بووی کە خەبەری مەرگی ئەو جانەوەرە, ئەو دوژمنی خاك و گەل و نیشتمانەو قاتڵی برای لە گیان خۆشەویست ترم عەلی سەفابەگت هێنا. ئەویش بە قیمەتی گیانی خۆت...".

پاش ئەوەی بەم قسانە بەرامبەر بە تاشکەن خەلیل و شارەدار بە خۆی هەڵڵا گوت و خۆی رانا, دراوەکەی بۆ تاژی تەحسین راداشت و تاژی تەحسینیش هەر لەوێ رەق راما, دەستەکانی لەرزین و ڕەنگی روخساری پەڕی و ئەو پووڵەی بە دەستیەوە بوو کەوتە سەر زەوی. لەو لەحزەیەدا مورتەزاغا بە شێوەیەکی دوژمنانەو تێکەڵ بە سووکایەتی تەماشای عەلیەشەلی کرد. عەلی غاری داو ئەو دراوەی لەسەر زەوی پەرش و بڵاو ببوو, کۆ کردەوەو دایەوە دەستی تاژی تەحسین.

مورتەزاغا بە شێوەی لاواندنەوە گوتی:

"تاژی تەحسین, کوڕم لەمەودوا ئەگەر کارێکت هەبوو راستەڕێ وەرە لای خۆم, بپرسە ماڵێ مورتەزاغای کامەیە, باڵەخانەکەت نیشان دەدەن و ئیدی هەروا بزانە ماڵێ خۆتە وەرە لای من. خۆ سەربازییشت کردوە...".

تاژی تەحسین زمانی رەق ببوو و نەیدەتوانی قسەبکا. تەنیا قەوەزەی سنگی لەبەر هەژان هەڵدەستاو دەپووکایەوە.

"کەوایە یاوەر فارووق حەمەدۆکی گرت و گوللەی راست لەنێویێ چاوی دا، یاخوا خۆش بێ. بەراستی کۆڵەکەی ئەم مەملەکەتەیە. کوڕی کۆمارە، قارەمانە، قارەمانی نیشتمانی... دە بڵێ کوڕم، گوتت راست لە نێویێ چاوی دا؟".

تاژی تەحسین لە پەستا تفی خۆی قووت دەدایەوەو قسەی بۆ نەدەکرا:

"پووڵەکە لە گیرفانت هاوێ کوڕم". دووبارە بە چاوێکی دوژمنانە لە سەرتاپای عەلی ورد بووەوە. عەلییش غاری دا پێشەوە، ئەو ئەسکیناسانەی لە دەستی تاژی تەحسین دابوون لێی وەرگرتن، قەدی کردن و خستنیە گیرفانی شەڵوارەکەیەوەو بە زمان لووسی گوتی:

"بە ئاغامان بڵێ، پێی بڵێ با خۆشحاڵ بێ، پێی بڵێ کە یاوەر چۆنی حەمەدۆك کوشت...".

"لە نێوەڕاستێ هەردوو چاوانی دا، یاوەر راست لە پشتی مۆری پێغەمبەری دا".

موڕتەزاغا لەو گاڵتە پێکردنە کە لە راوێژی عەلی دا هەبوو، حاڵی بوو، بەڵام لەو ساتەدا هیچ وەسەر خۆی نەهێنا. نەڕاندی:"راست لەنێوەڕاستێ، زۆر باشە با بڕۆین". دووبارە ئاوڕێکی کوشندەی دایەوە سەر عەلیەشەل، ئاوڕێکی ساردو پڕ لە رق و قین. دەیەویست بەم ئاوڕە زۆر شت بڵێ.

قایەقام لە پێشەوەو ئەوانی دیکە بە دوای دا چوونە شارەوانی. بە نیاز بوون لەوێ لەبارەی ئامادەکردنی رێوشوێنی پێشوازی لەیاوەرەوە قسە بکەن و ئەو خەبەرە گرنگە بگەیەننە ئەنکەرەو ئەدەنەو عارف صائم بەگ. جگە لەوە قەرار بوو لە بازاڕی شارۆچکەش دا جاڕ بکێشن هەتا هەموو کەس لەو خەبەرە خۆشە ئاگادار بێ و کەس نەمێنێ نەیبیستبێ.

وەختێك گەیشتنە شارەوانی یەکەم کاریان بانگ کردنی ئەحمەد پشت کووری جاڕچی بوو. هەرچی دەبوو جاڕی بدا هەموویان یەك بە یەك پێ گوت و ئەویش لەبەری کرد. بەڵام پێویستی نەدەکرد، چونکە ئەحمەد پشت کووڕ جاڕچییەکی ئەوەندە کارامە بوو کە لە سەرانسەری چوکووراوادا هیچ ئاشقێك تەنانەت ئاشق توورروون پاشاش نەیدەگەیشتێ.

عەلیەشەل لە دەرەوەی شارەوانی لە بن پلیکانەکان بە جێ مابوو. دیسان چاوەڕوانی ئاغای بوو، و بیری لەوە دەکردەوە کە بە سەری دەهات. تاژی تەحسینیش لە قوژبنی بازاڕی مابووەوەو چاوی لە عەلیەوە بڕیبوو. سەرەنجام هەموو غیرەتەکەی خۆی کۆ کردەوە، چووە لای عەلیەشەل و گوتی:

"ئاغا ئەمن دەڕۆم، زۆر سوپاس بۆ ئەو چاکەیەی دەرهەقی منت کرد، ببوورە، ئاغا... دەکرێ ناوی خۆتم پێ بڵێی؟".

"ناوم عەلییەشەلە".

تاژی تەحسین لە چەپ و ڕاستەوە لێی ورد بووەوەو ئەمجار پرسی:

"یانی ئەو عەلییەشەلی شوێن گێڕی بەناوبانگ کە تەنانەت شوێنی تەیری هەواش هەڵدەگرێ ئەتۆی؟".

عەلی وەڵامی دایەوە:"بەڵێ ئەمنم". تاژی تەحسین بە سەرسوڕمانەوە گوتی:"ئۆۆۆۆ. ئەمە چ قەڵافەتێکە ئەم جلکانە چین، ئۆۆ، وەی وەی. با ئەمن بڕۆم، دەترسم ئەقڵیان بێتەوە جێی خۆی و پووڵەکەم لێ بستێننەوە. ئەمن ئەگەر بەوێ بەم پارەیە دەتوانم دە جووت گا بکڕم وانیە؟".

"با، دەتوانی، پێنج سەر ئەسپیش بکڕی، دەتوانی بووکێکیش بەریە ماڵەکەت، یان چوار گاجووت و مێگەلە مەڕێك..."

"جارێ با ئەمن بڕۆم، دەرمانی ڕێیە ڕۆیشتنە... ئۆۆۆ عەلییەشەل ئاغا ئەتۆش قەڵافەتێکی سەیرت پەیدا کردوە ها... ئەتۆ جاران وا بووی؟".

عەلییەشەل لە کاتێك دا نێوچاوانی تێك دەنا، جوابی دایەوە:"نا، پێشتر وا نەبووم".

"هەر خۆش بی، ئەم چاکەیەی تۆم قەت لەبیر ناچێ".

"بڕۆ خوات لەگەڵ".

جارچی کاری خۆی لەبەردەرکی شارەوانی ڕا دەست پێ کردبوو. ئەحمەد پشت کووڕ دەنگێکی وای هەبوو گوێچکەی عەلیی کەڕ دەکرد:

"ئا...ی خەڵکینە، مەڵێن گوێمان لێ نەبوو. بە پێی خەبەرێك کە تاوێك لەمەوبەر لە یاوەر فارووقەوە گەیشتوە، حەمەدۆك، ئەو چەتە خوێنخۆرە کوژراوە. ئا...ی خەڵکینە پێتان ڕادەگەیەنین".

ئەو لە کاتێك دا زەنگوڵەیەکی گەورەی کە بە دەستیەوە بوو، ڕای دەوەشاندو ئەم قسانەی دەکرد، گەیشتە بازاڕو لەوێ تاوێك ڕاوەستا. پاش ئەوەی سەروسەکوتی خۆی ڕێك و پێك کرد، چەند جار گەرووی پاك کردەوەو ئەمجار بە دەنگێکی ڕەوان دەستی بە هاوار کردەوە:

"ئای خەڵکینە، مەڵێن گوێمان لێ نەبوو، دوێ شەوێ لای بەیانی حەمەدۆك لەگەڵ دەستە هەشت کەسییەکەی خۆی بە دەستی جەندرمەکان بە فەرماندەرایەتیی یاوەر فارووق لەنێو

چوو. بەم بۆنەیەوە بۆ ڕێزگرتن لە یاوەر فارووق بەگ و جەندرمەکانی ڕێوشوێنێکی بەشکۆی پێشوازی وەرێ دەخرێ. هەموو دوکانێك دەبێ ئالاّ لـێبدا, هەموو بازاڕ دەڕازێتەوە, ڕاست وەك ڕۆژانی جێژنی نیشتمانی... ئەی خەڵکینە, نەڵێن گوێمان لـێنەبوو, ئەو خوێنخۆرە, ئەو دوژمنی ناموسە کە دەستی بە هەر ژنێك ڕاگەیشتبایە دەستدرێژیی بۆسەر نامووسی دەکرد, ئەوەی زگی ژنی دووگیانی وەبەر دەسرێژ دەدا, ئەوەی بە شیشەی سوورەوە کراو چاوی پیرانی دەردێنا, ئەوەی پاش هەتك کردن گەورە کچەکانی کەوڵ دەکرد, ئەو حەمەدۆکە بە گوللەیەك کە لەنێوێ چاویییان دا, کوژرا. تەرمی خۆی و ڕەفیقەکانی ئەگەر سبەینێ نەبوو, دووسبەی دێننەوە شارۆچکەو هەموو هاونیشتمانێك تف لە جەنازەی ئەو گوناهکارانە دەکا. هەرکەس تف لە تەرمی ئەو خوێنخۆرانە بەتایبەتی حەمەدۆك نەکا سزا دەدرێ, ئەویش سزایەکی زۆر سەخت... ئای خەڵکینە, یاوەر فارووق و پیاوەکانی دەبێ لەلایەن خەڵکی شارو دێهاتەوە وەك فەرماندەرێکی گەورەو سەرکەوتوو, وەك فەرماندەرێك کە لە شەڕی سەربەخۆییدا سەرکەوتبێ, پێشوازیی لـێبکرێ. ئا...ی خەڵکینە, نەڵێن گوێمان لـێنەبوو".

ئەحمەد پشت کوورِ بازاڕی بەجێ هێشتبوو و چووبووە گەڕەکەکان. لەوێش هەتا تێن لە گەرووی دا بوو, وێڕای ڕاوەشاندنی زەنگوڵەکەی بە دەستی, هاواری دەکردو هیچ نەمابوو لەبارەی زۆرداری و خوێنخۆریی حەمەدۆکەوە بە زمانی دا نەیە. بە جۆرێك بوو کە هەرکەس گوێی لـێ بایە هەموو مووی لەشی دەبوونە نەشتەر.

عەلییەشەل لەسەر پلیکانە پاتەکانی شارەوانی داتیشتبوو, چاوەڕوانی هاتنەدەری مورتەزاغا بوو. ئەمجار زۆریش تامەزرۆ بوو بزانێ لەمەودوا ڕەفتاری ئاغا لەگەڵ وی چۆن دەبێ. زۆریش بیری لە تاژی تەحسین دەکردەوە. بازی دەوڵەتی لەسەر نیشتبوو. ئەو باشی دەزانی کە تەحسین بەو هەموو ماندوویی و شەکەتی و برسیەتییە ئێستا توندتر لەو وەختە کە هاتبوو غار دەداو بە دەم غاردانیشەوە ئاوڕ دەداتەوە پاش خۆی داخوا کەسی بە دوادا دێ یان نا:"ئاکا یەکێك بێ پارەکەمم لـێ بستێنێتەوە".

تاژی تەحسین ڕاست ئەو جۆرەی کرد کە عەلی بە بیریدا هاتبوو. بە غاردان وەرێ کەوت. لە چاولێك ئانێك دا لە شار وەدەرکەوت و بەرەو کێوپارە ملی ڕێگای گرت. هەتا سنووری مەرگ هەوڵی دەدا بە هەر جۆر بووە زووتر لە شار دوور کەوێتەوەو خۆی بگەیەنێتە لێرەوار. ئەگەر توانیبای بچێتە نێو دارستانێکی چڕ, ئیدی نەك هەر حکوومەت بەڵکوو تەنانەت عەلییەشەلیش ئەگەر دە ساڵ بە دوای دا گەڕابا نەیدەدیتەوە.

قایمەقام لە پێشەوەو ئەوانی دیکە بە دوای دا بە پێکەنین و گاڵتە کردنەوە لە شارەوانی وەدەر کەوتن. لەو بەینەش دا دەنگی تەپڵەکان لە نیوەڕۆ بازاڕەوە دەهاتە بەر گوێ. عەلیەیەشەلیش پازدە بیست هەنگاو دوورتر بە دوایان دا دەڕۆیشت. هەموویان پێکەوە راستەڕێ چوونە گازینۆکەی نەزیف ئۆغلی، تەنیا گازینۆی شارۆچکە بوو کە مەشرووبی هەبوو. وەختێك چوونە ژووری گازینۆکە، مورتەزاغا ئیزنی لە قایمەقام خواست:

"سەعاتێکم پێ دەچێ، دەچمەوە ماڵێ و دێمەوە، کارێکم هەیە".

عەلی بەرامبەر بە گازینۆکە لەبن دار تووەکە چاوەڕێی بوو. مورتەزاغا تەنانەت تەماشای سەروچاویشی نەکرد. بەڵام عەلی کە چارەی نەبوو دیسان وەدوای کەوت.

مورتەزاغا لە پێش دا لە بازاڕ سەرێکی فەخرییەشێتی داو پاش ئەوەی دەستێکی لاواندنەوەی بەسەر شانی دا هێنا، گوتی:

"براڤۆ، سەد هەزار براڤۆ! براله فەخرییەفەندی عەریزەی سەیر دەنووسی ها... لە منی ببیسە، زۆر سوپاست دەکەم و رێزی بێ پایانیشت پێشکەش دەکەم".

فەخرییەشێت هەستابووە سەرپێ. دوگمەی چاکەتەکەی داخستبوون. دەست لەسەر سنگ گوتی:

"شایەنی نیە ئەفەندی، تکا دەکەم ئەفەندی، کارێکمان نەکردوە. لەبەر خاتری زاتی مەبارەکی جەنابت، لەبەر خاتری وجوودی شەریفی بەرزی جەنابت ئێمە بە عەریزەکانمان ئەنکەرە هیچ نیە، حەوت دەوڵەت وەکار دەخەین و رایان دەپەڕێنین. هەر ئەوەندە جەنابت ئەمر بفەرمووی ئیدی بەسە".

"قسەکانت تەواو بوون".

فەخرییەشێت لە کاتێك دا ملی بە لاوە دەنا گوتی:"بەڵێ ئەفەندی، تەواو بوون". ئەمجار وەك فەنەر چەند جار لە بەرامبەری دا دوولا هاتەوەو هەستایەوە.

"ئێستا لە تۆ، لەو قەڵەمە مەبارەك و بێ عەیب و کەم و کووڕییەت کە بەردو پۆڵای دەسمێ، تکایەکم هەیە".

"بە چاوان ئەفەندی، ئەمر کە ئەفەندی، فەرمانتان دەسبەجێ بەجێ دەگەیەنم".

"ئێستا باشت گوێ لە قسەکانم بێ. دەبێ چەند برووسکەی پیرۆزبایی بنووسرێن، یەك... بۆ وەزارەتی نێوخۆ، دوو... پارێزگاری ئەدەنە، سێ... سەرۆکایەتیی ئەنجومەنی گەورەی میللەت، یەکیش بۆ خزمەتی زۆر بەرێز زاتی بەرزی نوێنەرمان عارف صائم بەگ. لەم برووسکانەدا خەبەری

لەنێوچوونی سەرکردەی گەورەی چەتەکان حەمەدۆك لەگەڵ هەشت کەس لە پیاوەکانی بە وان رادەگەیەندرێ. هەروەها, هەروەها لێی زیاد دەکەی کە مارەکە پێش ئەوەی ببێتە هەژدیها بە دەستی یاوەر فارووق و پیاوەکانی سەری پان کرایەوە... لێرەدا دەبێ یاوەر فارووقی بگەیەنیە عەرشی ئەعلا. برووسکەیەکی وەها بە جۆرێك دەیباتە عەرشی ئەعلا کە بە هیچ جۆر پێی وە زەوی نەکەوێ... هەتا پلەی سەرگوردی, قایەقامەتی, سەرهەنگی و ژەنراڵی هەڵفڕێ, یانی باڵ دەرکاو بفڕێ بۆ پلەو پایەی بەرەژوورتر".

"ئەگەر نەبێتە بێئەدەبی لە خزمەتتان ئێمە خۆمان دەزانین لەو بارەیەوە چ دەکەین".

ئەمەی گوت و چەند جار هەتا سەر زەوی دوولا هاتەوە.

"ئەمن دەزانم ئەتۆ لە هەموو شتێك شارەزای, تەنانەت بە جێگای شەیتانیش دەزانی. باشە ئێمەش هەر بۆیە نەچووینە لای سیاسەتبازو بۆ کارێکی وا گرنگ دێینە حوزوور ئێوەی بەڕێز".

"استغفرالله ئەفەندی".

دووبارە چەند جار داهاتەوەو راست بووەوە.

"بەڵێ هاوڕێی بەنرخ, فەخرییەفەندی ئەمەش دەبێ لە عەریزەکان زیاد بکەی کە بە بۆنەی لەنێوچوونی سەرکردەی ڕێگرەکان حەمەدۆکەوە هەموو خەڵکی چوکووراواو هەموو خەڵکی چیاکانی تووڕووس جێژن و شادمانیيان کردوەو وا دێتە بەرچاو کە ئەم رێ و شوێنە چل شەوو رۆژ درێژەی هەبێ. مەنووسە چل شەوو رۆژ درێژەی دەبێ. دەبێ بنووسی وا دێتە بەرچاو کە درێژەی هەبێ. پان کردنەوەی سەری مارەکە, ئەم سەرکردەیەی یاغییەکان بە دەستی یاوەر فارووق و دەستەکەی هەموو خەڵکی وا هێناوەتە جۆش و خرۆش کە بۆیە دەبێ بە چاوی خۆت بیبینی".

"بەسەرچاو قوربان, وجوودی جەنابتان خۆش بێ, پایەدار بێ... ئەمن پێش نووسی ئەو جۆرە برووسکانەم هەیە, هەموویان لە دەورەی شەڕی سەربەخۆیی ماونەوە, هەرکەس بیان خوێنێتەوە زۆر زۆر دەست دەکا بە گریان. ئەتۆ خەمت نەبێ".

"یەکەمین برووسکەکان دەبێ ئەمن بیان نێرم, یانی بە ئیمزای من بن, دەبێ ئەمن بیان نێرم. ئەو برووسکانەی بە ئیمزای من لێدەدرێن دەبێ بە وشەو رستەی زۆر جوان بنووسرێن".

"دەزانم".

"دیارە دەزانی. ئێستا گوێت لێ بێ".

"بەسەرچاو ئاغا, گوێم لێتە ئاغا".

فەخرییەشێت خەبەردار راوەستابوو, وەك بەرد جوولەی لێ بڕابوو.

"لەمەودوا ژمارەیەکی زۆر لە دێهاتەوە دێنە ئێرە. قایمەقام خەبەری بۆ هەموو کوێخاکان ناردوە کە دەبێ خەڵك بە وردو درشتەوە بۆ بەشداری لە جێژنی مەرگی حەمەدۆك دا بێنە ئێرە. ئەودەم ئەتۆ دەبێ هەر دێهاتییەکت چنگ کەوت ناچاری بکەی قامك بە برووسکەکانەوە بنێ. ئێستا کوێرە, شەلە, گرنگ نیە. ئەوەندە بەسە ناوی بنووسی و قامکی پێ پێوە بنێی".

"زۆر کەس دێن. تەنانەت ئەگەر قایمەقامیش فەرمانی نەدابایە, دێهاتییەکان بۆ دیتنی جەنازەی حەمەدۆك دەهاتنە ئێرە. دەبینی ئەمڕۆو سبەی دنیا پڕ دەبێ لە خەڵك, ئەوەندە خەڵك رووی تێدەکا شارەکە هەڵیناگرێ, وا پڕ دەبێ, دەرزی هەڵاوێی ناکەوێتە عەرزی".

"زۆ باشە, ئەتۆ بنووسە. ئەم پارەیەش بگرە. پارەیەکیش نادرێ بە نامەبەر, ئەم حەوتوویە ئیدی هەموو پارەکە تاشکەن خەلیل و مەلا دۆران ئەفەندی دەیدەن. کەوابێ سەبر بگرە, قسەش مەکە, تەنیا یەك حەوتووی تەواو وەك کارخانە برووسکە بدە دەرەوە".

بەسەرچاو بەگ, وەەك یارمەتیدەرو کۆمەگ کەلك لە سیاسەتبازیش وەردەگرم".

"چۆنت پێخۆشە وا بکە, بەڵام کارێك بکە وەك تەرزە برووسکە بەسەر ئەنکەرەدا بباری..."

"بۆ سەرۆك وەزیر پێویست نیە برووسکە بنێرین؟ بۆ یاووز عیسمەت پاشا...".

"ئەی دادو بێداد, هێندەی نەمابوو یاووز عیسمەت پاشامان لەبیر بچێ. دەغیلە, ئەوت لەبیر نەچێ".

وەختێك ئاوڕی دایەوە لەوبەر لەبن دار ئەقاقیایەکە چاوی بە عەلی کەوت کە وەك قارەمانی سەرکەوتن قیت و قنج راوەستاوە. لە روخساری, لە جلەکانی و تەنانەت لە نووکی نینۆکانیشی خۆشحاڵی هەڵدەڕژا. بۆ گاڵتەپێکردن لێوی خوار کردەوەو بۆ ئەوەی سووکایەتیی پێ بکا لەسەر هەتا پێی مۆڕ بووەوە. ئەو ئیشارەیە زۆر شتی لەبن دا بوو. بەڵام عەلی گوێی پێ نەدا. بۆ وی تەنیا یەك شت گرنگ بوو کە داخوا حەمەدۆك کوژراوە یان نا؟ بەو جۆرە کە تاژی تەحسین باسی دەکرد, ئەکوژرابوو ناوونیشانی هیچ کام لە کوژراوەکان لەگەڵ حەمەدۆك یەکی نەدەگرتەوە. بەڵام ژنەکان بۆچی شیوەنیان دەکرد, چۆن بوو پیرەکان نەیان ناسی؟ خەڵکی گەلێ شکۆفە حەمەدۆکی دەناسن, شایەتییەکەی وان چۆن لێك دەدرێتەوە؟ لە دەریایەکی گومان دا پەلەقاژەی دەکردو تووشی پەرێشانی دەهات.

لە راستی دا بە غاردان هاتنەوە ماڵێ. هەر کە گەیشتنە حەوشەی, مورتەزاغا بە رووگرژی و راوێژێکی وشك و تێکەڵ بە بێحورمەتییەوە گوتی:

"هەتیوە شەلە, تاوێك لێرە راوەستە بزانم".

عەلی لە قوژبنی دیواری حەوشەی هەڵترووشکا, جگەرەیەکی لە گیرفانی دەرێناو دایگیرساند. لەوەختی ئاسایی دا فکری نەدەچووە سەر جگەرەکێشان. بەڵام لەو جۆرە وەختانەدا ئەگەر جگەرەی نەکێشابایە, شێت دەبوو. سیغاری بە سیغاریێ دادەگیرساند. تاوێك دواتر خزمەتکارەکە هاتە سەر بەرهەیوان بانگیی کرد:

عەلی بەکاوەخۆ لە پلیکانەکان وەسەر کەوت, لەسەریێ پێنج پیاوی بەخۆوە چاوەڕیێ بوون و موڕتەزاش ژوورەکەی دەپێوا. ماوەیەك هەروا بە ڕقەوە راوێچکەی کرد, روخساری سات بە سات قیناوی تر دەبوو. حەسنەخان لەبەر دەرگای ژوورەکە وێستابوو, بە خەمناکی‌یەوە سەیری پیاسەکردنی مێردەکەی دەکردو بە ناڕەحەتی‌یەوە دەستی دە سەرپۆشە سپی‌یەکەی وەردەدا.

موڕتەزاغا هات و رووبەڕووی عەلی‌یەشەل کە نەختێك لەولای پێنج پیاوەکە راوەستابوو, قنج راوەستا:

"ها... ئاغا شەلە بڵێ بزانم بە تۆپینی حەمەدۆك زۆر خۆشحاڵ بووی, بەڵێ؟".

عەلی بەسپایی گوتی:

"ئاغام باشتر دەزانیێ".

"ئاغا باشتر دەزانیێ؟ لەسەریێ ڕا تەماشام دەکرد, لە گوێیان پێدەکەنی. کەوایە هێندە خۆشحاڵی؟ گیانت رزگار بوو, وەنا؟".

"بەڵێ".

"ئەمن و تۆ هەردووکمان رزگار بووین, چما وا نیە؟".

"بەڵێ ئاغا".

"یاوەر فارووق بەگ...".

"پیاوێکی ئازایە, ئافەریم...".

"براقۆ, دیارە کە براقۆ... مارەکەی تۆپاند. ها عەلی‌یەشەل ئاغا, ئێستا ئێمە دەبێ چ رەفتارێکت لەگەڵ بکەین؟ خۆ حەمەدۆکیش مردوە".

"خوا لێی خۆش بێ, مرد".

"چـ...ی چـ...ی؟ گوتت خوا لەو سەگە خۆش بێ؟".

موڕتەزاغا لە کاتێك دا پێی بە زەوی دا دەداو خانووبەرەکەی دەلەرزاندەوە, بە دەنگێك کە مووی لەشی بنیادەمی راست دەکردنەوە پڕ بە گەرووی دەی‌نەڕاند:

"یانی... یانی کە...".

"هەتیوە, تووتکەسەگی شەل, یانی... یانی چی... یانی, یانی کە یانی چی؟".

"یانی موسوڵمان. یانی بۆ هەموو مردوویەکی موسوڵمان دەڵێن خوا لێی خۆش بێ. لە پاش مردووان رەحمەت چاکە".

"بێدەنگ بە, بێدەنگ بە, بێدەنگ بە تووتکەسەگی شەل, بێدەنگ بە. بێچووە نۆکەرێك کە لە ماڵەکەم دا بەخێوم کردوە, پێم گوتوە براو ژووری نووستنی خۆمم لەگەڵ بەش کردوە, ئێستا رەحمەتی بۆ دەنێرێ...".

"یانی گوتمان چونکە موسوڵمانە... ئێستا هەرکەس بێ... موسوڵمانیش...".

"بەسە, سە شەلە, ئەتۆ ماری موسوڵمانت دیوە؟ ئەتۆ غوول و بەرازو کەمتیارو هەژدیهاو گەنەی خوێنخۆری موسوڵمانت دیوە؟".

عەلیەشەل سەری بەردابووەوەو وەڵامی نەدەدایەوە. کابراش یەك تەکان دەیـنەراندو عەرزو عاسمانی دێنایە لەرزین:

"هەژدیهای موسوڵمان, کەمتیاری موسوڵمان. هەژدیهای ئاناوارزا...".

رەگی ملی هەستابوون, لە ئارەق دا شەلاڵ ببوو و رەنگی شین هەڵگەڕابوو.

حەسنەخان قۆڵی گرت و هەوڵی دا ئارامی بکاتەوە.

"ئەی دادو بێداد ئاغا, بەسە, نەختێك بحەسێوە, عەلیەشەل لە زاری دەرچوو, بەسیەتی, ئەوەندە تووڕە مەبە, خۆت تووشی شتێك دەکەی".

مورتەزاغا پاش ئەوەی ماوەیەك هات و هاواری کرد, لەخۆوە دامرکاو هات رووبەڕووی عەلی کە سەری داخستبوو راوەستاو گوتی:

"هەتیوە, سە شەلە, ئەتۆ چ کارەی کە دەمانچەی یادگاری بابم لە قەدی خۆت بەستی, هەتیوە تووتکەسەگە. ئەم دەمانچەیە خوێنی هەزار پیاوی بێقیمەتی وەك تۆیە کە قەڵافەتت پێنج پاپاسی نایەنێ. بڵێبزانم ئەتۆ سەگی کێی کە دەمانچەی قەرەداغلی نۆغلی لە قەدی خۆت بدەی؟".

پێدەکەنی. لە راوێژی دا سووکایەتی پێکردنێکی کوشندە هەبوو: "عەلیەشەل ئاغا ئەو دەمانچەیە لە قەدت بکەوە".

لە کاتێك دا عەلی سەری بەر دابووەوەو دەمانچەکەی لە خۆی دەکردەوە ئەو سێ کەسەی لەژوورەکە حازر بوون هاتن کەوتنە بەینی ئەو و مورتەزاغاوە. هەرکە عەلی دەمانچەکەی لە

خۆی کردەوە پیاوێکی بەخۆوە کە لەپێش ئەوانی دیکەوە بوو دەمانچەکەی لە دەست رفاندو بۆ مورتەزاغای راداشت. ئاغا چەکەکەی وەرگرت, هەڵی هێناو پاش ئەوەی چەند جار دەستی راوەشاند گوتی:

"کوڕە, عەلیاغا. باش سواری ئەسپی عەرەبیی قەرەداغلی ئۆغلی ببووی و لە نێو بازاڕی فیزت لێدەدا ها... کڵاوی شەبقەداری نوێنەرانی مەجلیسیشت لەسەر بوو. هەتیوە ئەو شەبقەیە خوێنی هەزار سەگی وەك تۆ نابێ؟".

راوەستاو دیسان لە کاتێك دا گاڵتەی پێدەکرد, لە سەرتاپایەوە راماو پاشان لە حاڵێك دا قاقا پێدەکەنی گوتی:"بڕوانە ئەمەی, بڕوانە ئەمەی, بڕوانە ئەمەی, هێشتا ئەو کڵاوەی لەسەری هەڵنەگرتوە, تەریق نابێتەوە... هەتیوە ئەتۆ هیچ شەرم و شوورەیی و نامووس ناناسی؟ ئاخر پیاوی وەك تۆ رۆژی قیامەتێش دەتوانێ کڵاوی وا لەسەر نێ؟". ئەمجار پاشەوپاش کشایەوەو گوتی:"ها, بەڵام بەینی خۆمان بێ کڵاوی وەکیل و گەورە پیاوان زۆر باش لە عەلیەیەشەلی چیایی دەکاڵێتەوە. دەڵێی گوڵیان لەسەر [redacted] کەرێ داناوەو پەپوولەی لەسەر نیشتوە...". لە پەستا دووپاتی دەکردەوە:"گوڵیان لەسەر ...ی کەر داناوەو لەسەر... ...ی کەر داناوەو لەسەر ...ی کەر!!..."

قاقا پێدەکەنی, ئەوانی دیکەش پێدەکەنین, تەنیا حەسەنخان لە نێوەڕاستی ژوورەکەدا بە پێوە مابوو, سەری بەردابووەوەو جووڵەی نەدەکرد. لکی دەسماڵەکەی بە ددانی دەجوی.

مورتەزاغا دیسان بە دەنگێك کە شووشە پەنجەرەکانی هێنایە لەرزین بە رق هەستاوی نەڕاندی:"ئەو کڵاوە لەسەر سەرت هەڵگرە. هێشتا, هێشتا بەو شکڵ و قەڵافەتەوە لە پێش چاوم راوەستاوە, هێشتا, هێشتا".

عەلی دەستی راستی خۆی وەك دەستی کەسێك کە هەناسەی لەبەردا نەمابێ, بەزەحمەت بڵند کردو هەرکە کڵاوەکەی لەسەر سەری هەڵگرت فڕێی دایە سەر زەوی و دەسبەجێش داهاتەوەو هەڵی گرتەوەو لە حاڵێك دا پێلووەکانی لێك دەدان بە نیگایەکی تێکەڵ بە پاڕانەوە چاوی لە حازران کرد, دەت گوت لە جێیەك داوای کۆمەگ دەکا. دیسان هەر ئەو پیاوەی دەمانچەکەی لێ وەرگرتبوو, دەستی درێژ کرد کڵاوەکەی وەرگرت و لەسەر نیوتەختەکەی دانا.

"... توخوا بڕواننە ئەو کابرایە, هێشتا لەوێ راوەستاوەو وەك رێوی تەماشا دەکا. لەم دنیایەدا بنیادەمی چەند بێشەرم هەیە... (دیسان نەڕاندی) ئەو جلانەی لەبەرت دان دایان کەنە... (ئەمجار دیسان راوێژی دەنگی هاتە خوارو بوو بە گاڵتە پێکردن) بڕوانە ئەمە,

ئەمە... بڕوانە قوماشی ئینگلیزی چەند لە لەشی شەلە دەکاڵێتەوە. هێشتا راوەستاوەو تەماشا دەکا. دایان کەنە ئەو جلانە سەگەشەل. خوا لە حەمەدۆك خۆش بێ. دایان کەنە...".

عەلی دەسبەجێ ئەو چاکەتەی لەبەری دابوو دای نایە سەر زەوی.

"ئەو دراوەی پێم دابووی لەگیرفانەکەی دایە؟".

عەلی لەسەرەخۆ چاکەتەکەی هەڵگرتەوە, چەرخ و قوتووە سیغارو دەسەسڕەو چەقۆیەکەی دەرهێنان و بە دەستی چەپیەوە گرتن. دراوەکەشی لەسەر چاکەتەکە دانا.

"دایان کەنە".

عەلی دانیشتە سەر زەوی, قەیتانی کەوشەکانی کردەوە. ئەوانی دیکەش راوەستابوون. لە کاتێك دا بە رەزامەندی‌یەکی تێکەڵ بە کەمێك گاڵتە پێ‌هاتنەوە پێ‌دەکەنین سەیری‌یان دەکرد. تەنیا حەسنەخان لە جاران پتر سەری داخستبوو. لە روخساری زەردهەڵگەڕاوی‌دا کەمترین جووڵە بەرچاو نەدەکەوت.

عەلی کەوشەکانی داکەندن و لەسەر چاکەتەکەی دانان.

"دایان کەنە".

عەلی بە پاڕانەوەو بە نیگایەك کە داوای یارمەتیی دەکرد, روانیە حازران و بە دوای ئەوەش دا تەماشای حەسنەخانی کرد. ئەو جۆرێك بوو دەت گوت نە هیچ دەبیسێ و نە هیچ دەبینێ. عەلی پانتۆڵەکەشی داناو ئاخرەکەی جلیقەکەشی داکەندو فڕێی دایە سووچێك.

لە نەکاو حەسنەخان هاواری کرد:

"بەسیەتی, بەسە, رەفتاری وا لەگەڵ بنیادەم ناکرێ".

وەرگەڕایەوە رووی کردە عەلی و پێی گوت:

"وەرێ کەوە بڕۆ براکەم".

عەلی بە توێی کراس و دەرپێ‌یان, بە پێخواسی و سەر رووتی بەرەو پلیکانەکان کەوتە رێ. ئەمجار ئاوڕی دایەوەو تەماشای مورتەزاغای کرد. چاویان تێك هەڵئەنگووت, مورتەزاغا لەحزەیەك بەو روانینە مووی لەشی راست بوونەوەو هەموو گیانی کەوتە لەرزین.

عەلی لەسەر پلیکانەکان راوەستابوو دەیەویست هێندێ شت بڵێ بەڵام دوایە پەژیوان بووەوە. چەند جار دەمی کردەوە بەڵام پێکیەوە نایەوەو پاشان بە سەنگینی بەرەو پلیکانەکان چوو, دەرگای کردەوەو لێی دا ڕۆیشت.

## (٨)

عەلی‌یەشەل بۆ ئەوەی وا بە توێی کراس و دەرپێیان و بە پێخواسی و سەرڕووتی بە نێو بازاڕی دا نەڕوا، لە پشت باڵەخانەکەی مورتەزاغا بای دایەوە بۆ گەڕەکی فەقیرئاوا لە کاتێك دا لە پەنای خانووەکان دا غاری دەدا بە هەناسەبڕکە لە شارۆچکە وەدەر کەوت. شەلاڵی ئارەق بوو. لە بەستێنی چۆمەکە لە قولکەیەك دا خۆی حەشار داو راوەستا هەتا ئارەقەی لەشی وشك بێتەوە. لەدێیەکی ئەو نیزیکانە ئاشنایەکی هەبوو، بەڵام نەیدەویست بەو تەشك و دیمەنەوە بچێتە وێ. لە بەیانی‌یەوە تا ئێستا پاروو نەچووبووە سەر زمانی. لە برسان قوڕەی زگی دەهات. هێشتا لە شك و گومان دا بوو، هەمیشە بیری لەلای حەمەدۆك بوو، بەڵام نەدەگەیشتە هیچ ئاکامێك. داخوا حەمەدۆك یەکێك لەو پیاوانە بوو کە جەندرمەکان کوشتبوویانن؟ دەبوو لە رێگا چاوەڕوانی جەنازەکان بێ و وەختێك بردیانن بۆ شار بیان بینێ. بەڵام نەیدەزانی جەندرمەکان چ رۆژێك دێنەوە. لەوانەبوو ئەمڕۆ بێن، لەوانەش بوو دوو رۆژی دیکە. ئەوەندە روون بوو کە هەتا دوو رۆژی دیکە جەنازەکانیان دێنایەوە شار. هەموو کاردروستایی‌یەك کرابوو و هێندێ رێنوێنیشیان بۆ دێیەکان ناردبوو، شارۆچکە بە بێ‌سەبری چاوەڕوانی وان بوو، یاوەر فارووقیش ئەمەی دەزانی. ئەویش بە ئیشتیا تامەزرۆ بوو هەرچەندی بکرێ زووتر بێتەوە شارۆچکەو شوێنەواری ئەو کارە مەزنە کە کردوویە بە چاوی خۆی ببینێ.

لە باقر گدیگی‌یەوە دوو رێگا بەرەو چوکووراوا دەهاتنەخوار. یەکیان رێگای سەرەوە کە بە هەڵدێرێك دا دەهات و ئەوی دیکەیان رێگایەك بوو کە بە دەم رووبارەکەدا لێ‌درابوو. جادەی دووهەم دوورترو خۆشتر بوو. رێگای هەڵدێرەکەی پڕ هەورازو نشێو و نێوقەدبڕ. عەلی‌یەشەل بیری کردەوە کە ئێستا جەندرمەکان ماندوون و بە جادەی خوارێ دا دێنەوە. لە پاشان بە فکری

داهات کە یاوەر فارووق ئەوە لە خۆشیی خۆی دەمرێ و هەرچەندیش بەرداوی و ناهەموار بێ ڕێگا نێوقەدبڕەکەی پێ باشترە. لە نێو ئەو دوو فکرەدا تێمابوو. سەرەنجام بەو ئاکامە گەیشت کە بنیادەم هەرچەندی سەر ڕەقیش بێ شەکەتی و ماندوویی بەسەری دا زاڵ دەبێ. بۆیە جادەی خوارەوەی هەڵبژارد. بەڵام دیسانیش دڵی نەحەسایەوە. ئا...خ خۆزگە هەر ئێستا ئومەتەزەرد گەیشتبایە ئێرە...

ئارەقەکەی وشك ببووەوە. وەڕێ کەوت. لە کاتێك دا بەخێرایی هەنگاوی داویشت بەو هیوایە کە تووشی ئاشنایەك بێ دەستی بۆ چاوی کردبووە سێبەرو ماوەیەکی زۆر دەیڕوانیە پێشەوەو دواوەی خۆی. چۆنە هەر لێرەوە راستەڕێ بچێتە لای ئومەتەزەرد, لەگەڵ خۆی بێنێ و بێتەوە, ئەودەم لە ڕێگایەکیان ئەوو لە ڕێگاکەی دیکەش بۆخۆی چاوەڕێ بن؟ لە دڵی خۆی دا گوتی نابێ و بە قینەوە تفێکی دە زەوی کوتا. لەوانەبوو هەتا دەچێ و دێتەوە جەندرمەکان بێن و تێپەڕن. خۆی داگرت بە جنێوان: هەتیوە عەلیەشەل, هەتیوە تووتکەسەگە کە ئەو هەموو سووکایەتیەی ئەو سەگەت بیست و جیکەت نەکرد. بڕۆ لە نیزیك شاری چاوەڕێ بە, گەوجی نەفام, دامان ئا حەمەدۆکیش کوژرابوو, ئەتۆ دەتوانی مورتەزاغای هەروا بێ سزا بهێڵیەوە؟ لە دەستت دێ ئەوەندە خوێڕی بی؟ پاشان لە کاتێك دا پێدەکەنی لەبەر خۆیەوە گوتی: بەڵام کابرا زۆر وریای نێوێ چاوەکانیەتی. ئەمجار ئەو لەحزەیەی هێنایە بەرچاوی خۆی کە لەگەڵی بەرەوڕوو دەبێ. لەنێوەڕاستی ڕێگاکەدا ڕاوەستاو دایە قاقای پێکەنین. دەمانچەیەکی دەسك سەدەف بە دەستەوە... ـ هەر جۆر بووە دەبێ دەمانچەیەکی وا پەیدا بکا ـ راست ئەو کڵاوە شەبقەدارەی بەسەرەوە, چاکەت و پانتۆڵێکی وەك چاکەت و پانتۆڵە سوورمەییەکە لەبەرداو کەوشێکی وەك کەوشە سوورەکان لەپێ دا... ژوورەکە, ئەو ژوورەی لەگەڵ مورتەزاغا لێی دەخەوتن... چۆن دەتوانێ بێدەنگ بچێتە ئەو ژوورە... بەخۆشیەوە ئەمەیان باش فێر ببوو... مورتەزاغا هەر کە چاوی بەو کەوت رەنگی زەرد هەڵدەگەڕێ, زمانی رەق دەبێ. دەم دەکاتەوە قسە بکا, بەڵام لە ترسان یەك وشەی بۆ دەرنابڕێ, تەنانەت چووکترین دەنگ لە گەرووی نایەتەدەر, لەوانەشە پێش ئەوەی گوللەی لێبدرێ گیانی دەرچێ. ئەی دادو بێداد ئاغا نابێ وا بمرێ.

ئاغا. مورتەزاغا. ئەمن هاتم. حەمەدۆك نەهات ئەمن هاتم. سواری ئەسپێکی عەرەبی بووم و هاتم. هەزار سکەی زێڕیشم لە گیرفان دایە, چاوت بکەرەوە. بیکەوە بیکەوە راست لەنێوی چاوت... گوللەکان بە دوای یەك دا دەردەچن. مورتەزا نە دەنگی لەبەر دەردێ و نە هەناسە, پاشان بێئەوەی بجەجڵی دێتەدەر, تووشی حەسنەخان و ئەوانی دیکە دەبێ. بە شەرمێکەوە تەماشای حەسنەخان دەکاو دوایە دەڵێ:

حەسنەخان. هەقی خۆی بوو, وەنا؟ ئەگەر بەدەست خۆم بایە لەبەر دڵی تۆ, لەبەر خاتری نازەنینی تۆ مورتەزاغام نەدەکوشت, بۆ ئەوەی دڵی ناسکی تۆ نەیەشێنم. زۆرم هەوڵ لەگەڵ خۆم دا, بەڵام بەخۆم نەوێرام. ئەگەر ئەتۆ لە جێی من بایەی کارێکی دیکەت لە دەست دەهات؟ ئەمجار بە کاوەخۆ لە پلیکانەکان دێتە خوارێ, لەدەرێ خۆی داوێتە سەر ئەسپەکەی و خێرا بە بن بارانەی گوللەدا دەرباز دەبێ.

بنیادەمێك بەم رێگایەدا تێناپەڕێ, هەی دایك و خوشکی هەزار جادەی وام... چما ناکرێ ئەو رێگای دەچێتە دێیەکە چاوەڕێ بێ؟ بەم سەروسەکوتەوە؟ لەو شلووق پلووقییەدا کێ دەیناسێتەوە... بەڵام ئەمانە, ئەم جەندرمانە بێشك بە جادەی خوارەوەدا دەڕۆن. ئەم جەندرمانە وەك کوێرێك کە بە وەکازی دەڕوا بەو جادەیەدا دەڕۆن کە شارەزانی و هەمیشە پێی دا رۆیشتوون. ئاخر تا ئێستا کەس دیویە جەندرمەیەك لەبەر خاتری نێوقەدبڕبوونەکەی بە رێگای سەرەوەدا بڕوا؟

لەدڵی خۆی دا گوتی: ئێستا دەچم لەنێو ئەو دارە غانانە دەخەوم, جاران ئەوێ بێستان بوو, بەشکوو بێستانەوانێکیشم دەست کەوت و ژەمە نانێکم خوارد.

پێش کوشتنی مورتەزاغا دەبێ وا بکەم بە چاکی بکەوێتە پاڕانەوەو بەری پێیانم ماچ بکا. زۆر شت هەقی خۆیەتی. جارێ راوەستە با ئەو مەسەلەیەی حەمەدۆك روون بێتەوە".

چەند هەنگاوێك بەرەو خوار بۆ لای رووبارەکە رۆیشت, چۆم بە قۆرت و پێچ وەك لافاوێکی روناکایی, بە تیشك هاویشتن لە ژوور دەشتەکەوە دەهاتەخوارو دەڕۆیشت و لەخوار شارۆچکە دیسان وەدەر دەکەوتەوە, بەڵام باریکترو لە حاڵێك دا قۆرت و پێچەکەی بەو دەشتەدا بڵاو دەکردەوە لەنێو نوورێکی هەڵماوی دا تیشکی دەدا.

ئەو رۆژە لای ئێوارێ, پێش ئەوەی دنیا تاریك دابێ گەیشتە ئەو رێگایە کە بەدەم چۆمی دا دەڕۆیشت. دارە وانیلەکان کە وەك لێڕەوار سەریان لێك دابوو, گوڵە پەمەیی و سپی و سوورەکانی خۆیان لەبەر هەتاو راخستبوو, لەگەڵ هەر پشووەبایەك بۆنێکی دڵگریان لێ هەڵدەستا. وەختێك تاریك داهات لە بن چنارێکی ئەستوور کە لەسەر رێگای بوو راوەستا. هێزی ئەوەی لەبەردا نەبوو کە لەوە زیاتر هەوراز ببڕێ. ئەگەر نیو سەعاتی دیکە رۆیشتبایە دەگەیشتە لێڕەوار, پێویستییەکی بەو کارە نەبوو. دانیشت و پاڵی بە قەدی ئەستووری دارەکەوە دا.

رووداوەکانی ئەو رۆژە پتر لە رێگارۆیشتنەکە ماندوویان کردبوو, تاوێك دواتر سەری بەسەر سنگی دا لار بووەوە. عەلییەشەل کەنگێ خەوی لێکەوتبوو, بەری بەیانی بە لوورەی

چەقەڵێك کە چەند هەنگاوێکی لێ دوور بوو, یەك پێ راست بووەوە, بە خەواڵوویی تەماشای چەپ و راستی خۆی کرد. چاوی بۆ مورتەزاغای گێڕاو هەر لەو لەحزەیەدا هاتەوە سەرخۆی. تەماشای رۆژهەڵاتی کرد بەرە بەرە دنیا رووناك دەبوو و لوتکەی چیاکان دەردەکەوت. ئاسۆ رەنگێکی شین و پەمەیی بەخۆیەوە دەگرت.

لەبەر خۆیەوە بۆڵاندی: تێپەڕیون و رۆیشتوون؟ دووبارە پێکەنین گرتی و لە دڵی خۆی دا گوتی: کوڕە نەتۆ ناوت عەلی‌یەشمەلە, ئەگەر جاڵجاڵۆکەش تێپەڕێ, نەتۆ گوێت لە هەستی پێی دەبێ و وەخەبەر دێی.

چووە نێو چۆمەکە, بە لوێچان شڵپ شڵپ ئاوی بە دەم و چاویەوە داو دەم و چاوی شوتن. زۆری برسی بوو, هەتاو دەرکەوت و دنیای گەرم کرد. رێبوارێك بە جادەدا رانەدەبرد. بوو بەنیوەڕۆ دیسان زیندەوەری پێدا نەهات. عەلی تا ئێوارێ بەو هیوایە کە بێستانەوانێك بدۆزێتەوە یان تووشی شوانێك بێ بەدەم چۆمەکەدا رۆیشت, بەڵام تووشی کەس نەبوو. راوەستاو بیری کردەوە کە چ بکا. لە پێش خۆی پۆلە دڕدووکێکی دی کە لەگەڵ قامیشەڵانێکی سەوز بە بەرزایی باڵاپیاوێك سەریان لێك دابوو و مەیدانێکیان داگرتبوو. لەدڵی خۆی دا گوتی: خوا رۆزی بۆ دەعبای کوێر دەنێرێ و رۆیشت بۆ لای پۆلە تووترکەکە. گەیشتە وێ. زۆر خۆشحاڵ بوو. هەموو چڵە دڕدووکەکان بە هێشووە دڕدووکی رەش داپۆشرابوون. هەر دەنکەی بەقەد گرێ قامکێك.

لەبەر خۆیەوە گوتی: بنیادەمێکی بێ‌مێشك بووم ها, چۆن هەتا ئێستا فکری ئەو دڕدووکانەم نەکردبوو.

تووترکەکان گەیبوون, تەنانەت هێندێکیشیان وشك ببوون, عەلی بە لوێچان بە دڕك و داڵ و گەڵاوە دڕدووکی لێ دەکردنەوەو وەزاری دەکردن. لەزەتێکی نایاب و بۆنێکی سەرخۆشکەر دەنیشتە سەر زاری. بەدەم دڕدووك خواردنەوە بەنێو تووترکەکان دا دەڕۆیشت, زگی بە جارێك هەڵمسابوو. تینووی بوو, لە پۆلە دڕدووکەکە وەدەر کەوت و هاتە گوێی رووبارەکە, ئاوێکی پێدا دەهات وەك خوێن شیلەو گەرم. نەی‌خواردەوە. لەقەراخ چۆمی دانیشت. بە دەست لەنێو خیزەڵانی قەراخ چۆمەکە قوولکەیەکی هەڵکەندو ئەجار لە حاڵێك دا لەسەر زگ راکشابوو, تێرو پڕ ئاوی فێنکی وەك سەهۆڵاوی خواردەوە کە لە گۆمیلکەکە هەڵدەقوڵی. لەپڕ راست بووەوە: دوات بڕێ عەلی‌یەشمەل, کەوتیە زگ لەوەڕاندن, ناکا جەندرمەکان هاتبێ و تێپەڕیبێ. . . هاتەوە سەر جادەو گەیشتەوە بن دارە ئەستوورەکە. هەتا رۆژئاوا لەوێ چاوەڕێ بوو. زیندەوەر بە جادەدا نەدەهات. وەختێك تاریك داهات دیسان پاڵی بە قەدی دارەکەوە داو سەری بەسەر سنگی دا شۆڕ بووەوە.

کە لە خەو هەستا بەری بەیانی بوو. هەتا خۆرهەڵات چاوەڕێ ما, دیسان جادە بەتاڵ بوو. لە دڵی خۆی دا گوتی ئەوان بە ڕێگاکەی دیکەدا ڕۆیشتوون, جارێ با بچم تێر زگی خۆم دڕدووك بخۆم... بە غاردان چووە نێو دڕدووکەکان. خێرا خێرا بە هەردوو دەستان دڕدووکی وە زاری دەکردن و دەیخواردن. ئەو قولکەیەی دوێنێ هەڵی کەندبوو پڕ ببووەوە, خێرا پاکی کردەوەو تێرو پڕی ئاوی فێنك خواردەوە.

لەنێوەڕاستی ڕێیەدا بە چاوەڕوانی دامابوو, نەیدەتوانی بڕیار بدا. سەرەنجام بە خۆی سەلماند کە ئەوان بە جادەی سەرەوەدا دێن و بەرەو ئەوێ دەخۆی نووسا. لە بەردەڵانێکی گەورە وەسەر کەوت و لەوێ دانیشت. لێرەڕا دەشتی چوکووراوا دیار بوو, کە خۆی لەبەردەم چوکووراوادا ڕاخستبوو. دێهاتی چوکووراوا بە کێڵگە زەردەکانیەوە, بە قامیشەڵانەکانی, باتلاغەکانی, بە ئاناوارزاو ئیلان قەڵاو دوملی قەڵایەوە, بە چۆمە پڕ قۆرت و پێچەکانیەوە کە هەموویان نوقمی ڕووناکایی بەو دەشتەدا بڵاو دەبنەوەو بەرە بەرە شین هەڵدەگەڕێن و دەبنە هەڵم و بەرەو دەریای مێدیترانە شۆڕ دەبنەوە, هەموویان لە ژێر ڕووپۆشی هەورێکی سپی دا کە لە لێوارەکانی دەریای مێدیترانە هەڵدەستاو هێدی هێدی بەرز دەبوو و پڕتر دەبوو, ون ببوون. ڕێگاکانیش بێپسانەوە تۆزوخۆڵیان لێ هەڵدەستا, گێژەڵووکە بە تەندوورەزەنە بەرەو ئەو لایە کە عەلی لێی دانیشتبوو دەهاتن و لە نیزیك وی دەنیشتنەوە.

هەتا نیوەڕۆیە کەس بە ڕێگاکەدا نەهات. کەمێك دوای نیوەڕۆیە عەلیپەشەلی شوێن هەڵگر دەنگی فیتوویەکی گوێ لێبوو کە لە مەودایەکی زۆر دوورەوە دەهات. چاوەڕێ ما. بەڕاستی زۆری مەراق بوو بزانێ خاوەنی ئەو دەنگە کێیە. ئەم فیتووە, فیتووی شوانێك, قاچاخچییەکی دار, جەندرمەیەك یان دێهاتییەك نەبوو. ڕاوچییەکانیش وا فیتوو لێنادەن. دەنگی فیتووی عەشیرەتەکان, چیانشینەکان, چوکووراواییەکان و خەڵکی شارۆچکەش جۆرێکی دیکە بوو. هەر قەومێك و هەر ڕەگەزێك و هەر نەتەوەیەك فیتووی تایبەتیی خۆی هەیەو عەلیپەشەلیش زۆری لەو جۆرە فیتووانە بیستبوون. ئەگەر نەشی بیستبان دیسان دەیتوانی بزانێ فیتوویەك بە چ جۆرە لێوێك لێدەدرێ. هەروا کە ئەو لەو بارەیەوە بیری دەکردەوە دەنگی ئەو فیتووە کە ئەو نەیدەتوانی بە ڕاشکاوی بیروڕای خۆی لە بارەوە دەربڕێ, دوو جاری دیکە بەرز بووەوە. ئەم دەنگە کە وەك ئەوە نەدەچوو دەنگی فیتووی بنیادەم بێ وەك دەنگی باڵندەیەك وابوو. عەلیپەشەل لە مەراقان خەریك بوو شێت بێ. هەموو شتێك, تەنانەت حەمەدۆك و مورتەزاغاشی لەبیر چووبوونەوەو فکری هەر لە دەنگی ئەو فیتووە دەکردەوە کە هەر دەهات و نیزیك دەکەوتەوە.

هێشتا نەگەیشتبووە پێچی جادەکە، سەری وەڵاغێك بە گوێ درێژەکانیەوە دەرکەوت و پاشان وەڵاغەکە بە تەواوی دەرکەوت. وەڵاغێك بوو یەکپارچە رەش، دابەستە بە تووکێکی بریقەدارەوە. عەلی‌یەشەل لە دڵی خۆی دا گوتی ئەمە کەری عێلاتی‌یانە. تەنیا عێلاتی‌یەکان ئاوا وەڵاغەکانیان بەخێو دەکەن. وەڵاغەکە باری پێوە بوو و قورسایی بارەکە لە شێوەی رۆیشتنی حەیوانەکەڕا دیار بوو. بە دوای یەکەمین وەڵاغ دا دووهەمین و سێهەمینیش دەرکەوتن. پشتیان لەبن قورسایی جەواڵەکان دا چەمابووەوە. بە دوای ئەوانیش دا سێ ژنی زۆر جحێڵ دەهاتن. لە شێوەی کەزی و دەسماڵەکانیان ڕا دەکرا تێبگەی کە هەرسێکیان جحێڵن. عەلی چووە خوارێ بۆ سەر رێگا. ژنەکان بە دیتنی ئەو پیاوە کە بە توێی کراس و دەرپێ‌یان رووبەروویان دەهات زەردەیان هاتێ.

عەلی لە کاتێك دا دەی‌گوت خوشکە جوانەکانم راوەستن، چوو بەرامبەریان راوەستا. یەکێك لە کچەکان بۆ راگرتنی وڵاغەکە فیتووی لێ‌داو گوێ‌درێژەکە هەر کە گوێی لە فیتووەکە بوو لە جێی خۆی چەقی. عەلی بە پێکەنینەوە گوتی، خوشکێ گیان، کەرێکی چەند بەگوێت هەیە. کچەکە بەگاڵتەوە گوتی نەجیب زادەیە، رەسەنەکەی عەرەبی‌یە، ئەمەش کەری عەرەبی.

"لە کام هۆیەن؟".

"لە هۆیەی ساری کەچیلی".

"لە کوێ ڕا دێن، بۆ کوێ دەچن؟".

"پەنیرمان پێ‌یە، دەی‌بەینە بازاڕی شارۆچکە".

"کچینە، وەزع و حاڵم دەبینن. لێرە چاوەڕێی یەکێکم، زۆریشم برسی‌یە، دەبێ زۆر لێرە چاوەڕێ بم. هێندێك نان و پەنیرم دەدەنێ؟".

یەکێك لە کچەکان دەسبەجێ غاری دایە لای وڵاغەکەی پێشەوە، تەڕدەست سەلکە پەنیرێکی خڕو چەند نان ساجیی لەگەڵ خۆی هێنان:

"هانێ براکەم".

"خۆش بی خوشکم، خوا تووشی رۆژی رەشتان نەکا".

"کاکە لێرە چاوەڕێی چیی؟ وادیارە زۆرت بەڵا بەسەر هاتوون".

عەلی ئەم عەشیرەتانەی بەتایبەتی تایەفەی ساری کەچیلیی باش دەناسی. هیچ عەیبێکی لەوەدا نەدەدی کە پێیان بڵێ چاوەڕوانی حەمەدۆکە. ئەوان بە کەسیان نەدەگوت:

"عەلی‌یەشەل گوتی:

"دەڵێن حەمەدۆکیان کوشتوە, ئا...خ, ئاورم لە جەرگی بەربووە کچینە. دەڵێن جەندرمەکان جەنازەی حەمەدۆك و دەستەکەی بێرەدا دێننەوە, ئەمن چاوەڕێی ئەوم. دەمەوێ جەنازەی حەمەدۆکی ببینم"

هەرسێ کچەکە لە سێ جێگاوە وەك گوڵێك بپشکوێ, پێ‌کەنین.

"بۆچی پێ‌دەکەنن کچینە, جەنازەی حەمەدۆك بۆ پێکەنین دەبێ منداڵینە؟ ئێوە چ جۆرە بنیادەمێکن؟".

"حەمەدۆك چیی تۆیە کە چاوەڕێی تەرمەکەی دەکەی؟".

عەلی بە ناڵاندنەوە گوتی:

"هیچ نیە, هیچ شتێك کچەکە... بەڵام جەرگم بۆی دەبرژێ".

ئەو کچەی لە پێشەوەی هەمووان بوو قسەیەکی نەکرد, فیتووی لێ‌دا, وەڵاغە رەشەکەی پێشەوە هەر کە گوێی لێ‌بوو کەوتە رێ, کچەکانیش بە پێکەنینەوە وەرێ کەوتن. عەلییش لە کاتێك دا دەی‌بۆڵاند چوو لەسەر تاتە بەردەکەی دانیشت. هێشتا دەنگی پێکەنینی خۆشحاڵانەی کچەکانی دەهاتە بەرگوێ. لە پێش دا دەستی کرد بە جنێودان بە کچەکان: جندەینە, جندەینە, بە چی پێ‌دەکەنن؟

پاش ئەوەی دەنگی پێکەنینەکەیان دوور کەوتەوەو بێدەنگ بوو, هاتەوە سەر خۆی. فکری کردەوە: ئەم کارە سرێکی تێدایە. ئەم کچە جحێڵانە بۆچی کە باسی جەنازەی حەمەدۆك کرا, دایانە پێکەنین؟

دوای ئەوەی کەمێکی نان و پەنیر خوارد, "خوا شوکور"ێکی گوت و هەستا, کەمێك خۆی خاوکێش کرد, لە بەردەڵانەکە هاتە خوارێ بۆ لای جادەی بەرەوە دەخۆی نووسا. گەیشتە پەنا چنارەکە. ئەو نان و پەنیرەی بە دەستیەوە بوو لە چەند گەڵای پانی وەرپێچا, لە قەڵشتی چنارەکەی ئاخنی و زارکی قەڵشتەکەشی بە بەردێکی گەورە داپۆشی. هاتە خوارێ بۆ سەر ئاوەکە نەختێك ئاوی خواردەوە.

لەبن چنارەکە خەوی لێ‌کەوت, وەخەبەر هات, چاوی لە جادەکە کرد, دڵی نەحەسایەوە, رۆیشتەوە سەر رێگای سەرەوە, پاشان هاتەوە خوارێ. دووبارە چووەوە سەرێ, لە هیچ کام لەو دوو رێگایە خەبەرێك لە جەندرمەکان نەبوو. دوا پاشماوەی نان و پەنیرەکەی لە قەڵشتە چنارەکە دەرهێناو خواردی و پاش ئەوەی لە گۆمیلکەکە ئاوی خواردەوە ملی رێگای گرت بۆ شارۆچکە. چار ناچار جەنازەی حەمەدۆکیان دەهێنایەوە شارۆچکە.

هێشتا ڕێیەکی زۆری بۆ شارۆچکە مابوو کە گوێی لە دەنگی بە نازاری دەهۆڵ و زوڕنا بوو. لاقی لەرزین و لەسەر تاتەبەردێك کە لەوێ بوو دانیشت. دەوران دەوری بەردەکە چڵە سوێسنە بوو, گوڵە سوێسنە پشکووتووەکانی بە بڕکەکانەوە دیت و فرمێسك بە چاوانیدا هاتەخوار.

وەی عەلیەیەشەل وەی, قوڕبەسەر, ئێستا دەتەوێ بچیە شارو لەو جێژن و شادمانیەیەدا بەشدار بی؟ خانەخەراپی دوابڕاو عەلیەیەشەل. ئێستا دەچیە شاری جەنازەی حەمەدۆکی ببینی, ئەی عەلیەیەشەل...

دەنگی خەفەت بزوێن و بە نازاری دەهۆڵ لەو شارۆچکەیەوە کە بە بنارەوە نووسابوو و تیشکی هەتاو کە لە شووشە پەنجەرەکانی دەداو ڕەنگی دەدایەوەو دەوروبەری زۆر سەیر ڕووناك دەکردەوە, دەهاتە بەرگوێ و دڵی عەلیەیەشەلی وەژان دەخست, دیسان خۆی پێ ڕاگیر نەکرا. دیسان چاوی سڕینەوەو وەڕێ کەوتەوە, هەرچی دەبێ بلا ببێ. دەبوو جەنازەی حەمەدۆك ببینێ: بەڕاست عەلیەیەشەل. لە خۆڕا دەبینی حەمەدۆکی بە مردوویی ببینی, پێت تەحەممول دەکرێ؟ وەختێك جەنازەکەی ببینی, دڵت ڕاناوەستێ؟ یان ئەگەر نەکوژرابێ لە خۆشیەیان شێت نابی؟ وەختێك گەیشتە نیزیك شارۆچکە دیتی ژمارەیەك دێهاتی وەڕێ کەوتوون و دەچنەوە دێیەکانی خۆیان. لێیان نیزیك بووەوەو پرسی:

"لە کوێ ڕا دێن, جەنازەی حەمەدۆکتان دی؟".

یەکێك لەو دێهاتیەیانە کە بە سەرسوڕمانەوە تەماشای ئەو پیاوە نیوە ڕووتەیان دەکرد پرسی:

"بۆچی دەپرسی کاکە, ئەتۆش دەتەوێ بچی جەنازەکەی ببینی؟ ئێمە سەروچاویان نەدی, نۆ کەس بوون, هەر کامەیان دەمەوڕوو بەسەر ئەسپێکی ڕووت دا هێنابوو. ئەوەی لە پێش هەموانەوە بوو, ئەگەر حەمەدۆك بێ, پیاوێکی زەلامە بوو کە دەستەکانی بە تەنیشتی ئەسپەکەدا داچۆڕابوون, خەریك بوو لە زەوی بدرێن, لاقیشی بە تەنیشتی دیکەی ئەسپەکەدا شۆڕ ببوونەوە. ئەوەندە قورس بوو ئەسپەکە پشتی داهاتبوو. سەروچاویانمان نەدی. دەڵێن حەمەدۆك مۆری پێغەمبەری لە نێوەڕاستی نێوچاوانیەیە. هەموومان غارمان دا مۆرەکە ببینین, بەڵام دەمەوڕوو بەسەر ئەسپەکەیان دا هێنابوو, نەمان توانی بیبینین. پاشانیش بردیاننە جەندرمە. تف... نەمان توانی ڕوخساری مەبارەکی جوانی ببینین. برالە, ئەتۆ بۆچی وا ڕووت و پێخواسی؟ چەتە ڕووتیان کردووی؟".

عەلی‌یەشەل لە کاتێك دا دەی‌گوت: نا کاکە, نا, خێرا لێیان دوور کەوتەوە. جووتیارەکان دەستە دەستە لە شارۆچکە دەگەڕانەوە. عەلی‌یەشەلیش پرسیاری لە هەر کۆمەڵە دێهاتی‌یەك دەکرد هەر ئەو وەڵامەی وەردەگرت. لەدەوروبەری شار دەخولایەوە, بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو تامەزرۆیی و مەراقە کە بووی, نەی‌دەتوانی بچێتە نێو شار. هەتا ئەو کاتە کە هەتاو بڵند بوو و گەرمی کرد بە دەوری شارۆچکەدا سووڕاو ئەودەم شەکەت و ماندوو چوو پەنای بۆ ئاشێکی ناوێ برد کە لە نێو باخێکی گەورەدا بوو. ئاشەوانیش وەك هەموو خەڵکی شاری خەبەری هەبوو ئەو چیی لێ‌قەوماوە. دەی‌زانی کە موڕتەزاغا هەرکە خەبەری کوژرانی حەمەدۆکی بیستوە, چۆنی ئەو کەسە کە بە برای ناو دەبردو دەی‌ڕازاندەوەو لە خۆشەویستی‌یان خەریك بوو بی‌خنکێنێ, دەرکردوەو لە خۆی دوور خستۆتەوە.

ئاشەوان پیاوێك بوو زۆر کەڵەگەت بە ریشێکی سپیی درێژو دەم و چاوێکی درێژووکەو جووتە چاوێکی گەورەو رەشەوە. لە حاڵێك دا سەری رادەوەشاندو لەبن لێوانەوە هێندێ قسەی دەکردن بە پیر عەلی‌یەوە هات: بیستمان چت بەسەر هاتوە, گوێ مەدەیە, ناڕەحەت مەبە, بنیادەم زۆر شتی بەسەر دێن, شتی چاك و شتی خەراپ کە هەر بە ئەقڵیشی دا نەهاتوە... بنیادەم هەموو جۆرە نەگبەتی و هەموو جۆرە خۆشبەختی‌یەکی دێتەرێ. کاك عەلی ئینسان دەبێ چاوەڕوانیی هەموو شتێکی لە بنیادەم هەبێ. باشە, وەك بیستوومە حەمەدۆك دەیەویست تۆش وەك عەلی سەفابەگ بکوژێ, ئەتۆش لە چیاو بەندەنان رات کردو پەنات بۆ موڕتەزاغا برد, ئەویش ئەو بەڵایەی بەسەر هێنای. ئاوا؟ قۆڵی گرت و لەسەر سندووقێکی درێژی ئارداوی کە وەك نیوتەختێك دەچوو, دای‌نیشاند: راوەستە با ئاشەکەی راگرم. پاشان دادەنیشین و قسان دەکەین.

چوو ئاشەکەی راگرت و هاتەوە. جگە لە دەنگی ئەو ئاوە کە لە پەڕەکانی تەمبووی ئاشەکەی دەدا, هیچ دەنگێك نەدەهات.

"مام عەلی, ئەتۆش پیاوێکی زۆر ساف و ساویلکەی, ئاخر پیاو متمانە بەو ئینسانە نزم و خوێڕی‌یانە دەکا؟ ئاوا پیاوی سووك و چرووك دەکەن. هەموو خەڵکی شاری لەو کارەی لەگەڵ تۆی کرد سەریان سوڕماو ئەویش تووشی هەرکەس دەبێ بە داووناو بۆی باس دەکا کە واو وام لە عەلی‌یەشەل کردوە".

عەلی لە کاتێك دا هەناسەی هەڵدەکێشا گوتی:

"با هەر بەیت و باوان بکا, با بەیت و باوان بکا بزانین ئاخرەکەی چ دەبێ, هەتا کەنگێ بەیت و باوان دەکا...".

مام حەسەنە ڕەشی ئاشەوان چوو لە پەنای دانیشت:

"بروانە کاك عەلی, سبەینێ دەچم دەستێك چاکەت و پانتۆڵ, کراسێك و جووتێك کەوشت بۆ دەکڕم و بۆت دێنم, هەرچۆنێك بێ کابرای کەوش درووی ئەندازەی ئەو لاقەی تۆ دەزانێ. مورتەزای گەوواد کەوشەکەتی بەو بە ڕادان دابوو. ئەمن ئەمڕۆ ئێوارێ بەرادانی دەدەم. سبەینێ تا نیوەڕۆیە کەوشەکەی ساز دەکا. بەخۆی و چوار کوڕیەوە کار دەکا, ئەگەر بش مرێ دڵی من ناشکێنێ".

عەلیەشەل دەستیی گرت:

"خۆش بی, زۆر سوپاس, ئەمن چۆن دەتوانم لەبن ئەو چاکەیەت بێمە دەرێ, چۆن دەتوانم ئەو هەموو چاکەیەت بدەمەوە؟".

مام حەسەنە ڕەش گوتی:

"بەتۆ دەڵێن عەلیەشەل, قەرەبووی دەکەیەوە. هەروەخت توانیت ئەو وەخت بیکە. پێت خۆش بوو هەر قەت پارەکەی مەدەوە. ئاخرەکەی تێی هەڵدێنیەوە عەلیەشەلی شوێن هەڵگر".

شتێکی وەك گلۆڵە بە قەدەر مستی بنیادەم بەری ئەوکی عەلیی گرتبوو, هەرچەند دەیکرد, نەیدەتوانی قسە بکا. لە نەکاو حەسەنە ڕەش شتێکی وەبیر هاتەوەو هاواری کرد:

"ئەی ماڵم خەرا نەبێ. نانم لەبیر نەبوو, خەریکی لە برسان دەمری".

دەسبەجێ غاری داو مەنجەڵێکی مسی دووکەڵگرتووی لەسەر ئاگردانەکە هەڵگرت و لەسەر لێوی سندووقە درێژەکەی دانا. دوو نانی گەرمیشی هێنان, یەکێك لە کەچکەکانی دایە دەست عەلی, سەری مەنجەڵەکەی هەڵگرت, هەر کە سەری لەسەر مەنجەڵەکە هەڵگرت بۆنی گۆشت نێچیرو ڕۆنی کەرە, وەك مسك و عەبیر بڵاو بووەوە.

پاش ئەوەی نانیان خواردو لێبوونەوە عەلی زمانی کرایەوەو گوتی:

"کاك حەسەن, پێم بڵێ بزانم ئەتۆ تەرمی حەمەدۆکت دی؟".

"بەڵێ دیتم, دوێنێ بەیانی وەختێك ئەویان بەم ڕێگایەدا هێنا, چاوم پێکەوت. بەڵام دەم و چاویم نەدی. ئەوانیان بەسەر ئەسپی رووت دا هێنابوو, دەڵێن ڕاست لەنێوبەندێ چاوانی حەمەدۆك مۆری پێغەمبەر هەبووە, دەڵێن یاوەر فارووق تفەنگی ڕاست لەسەر مۆرەکە داوە. چونکە عەرزی برای خۆم کاك عەلی بکەم, لەوێی بەولاوە هیچ جێیەکی دیکەی لەشی گوللە کاری لێ نەدەکرد".

"کاك حەسەن ئەتۆ لە جێ دا تا ئێستا حەمەدۆکت دیوە؟".

"هاتبووه ئێره. شەوێکیان هات لەم ئاشەدا خەوت. نان و نمەکی منی کردوە. ڕاست وەك تۆ. ڕاست لەو جێیەی تۆ دانیشتبوو, بەڵام ئەمن نەم دی, ئێستا چ حیکمەتێك بوو, نازانم".

"یانی ئەتۆ دەڵێی کوشتوویانە؟".

"چما دەکرێ نەیان کوشتبێ؟ ئاغاکان جێژنێکیان گرتوە وەرە سەیرێی, شایی و لۆغانیانە. تەنیا بۆ کوژرانی حەمەدۆك بەزمی وا ڕێك دەخرێ. کاك عەلی ببوورە... چما حەمەدۆك دوژمنی تۆ نەبوو؟ جۆرێك جەرگت بۆی دەبرژێ دەڵێی کوڕت مردوە".

عەلی هەر ئەوەندەی توانی بڵێ ئەو لە کوڕیشم... ئیدی وەك بارانە فرمێسك لە چاوەکانی بارین.

حەسەنی ئاشەوان دەیگوت: مەگری, مەگری, مەگری بە قوربانی ئەو چاوە ڕەشانەت بم, ئا...خ پیاوی پیاوان حەمەدۆك, تەنانەت دوژمنەکانیشت بۆت دەگرین تەنانەت مستەفا کەمال پاشاش ببیسێ گریانی بۆت دێ. کێ گریانی بۆ ئەو پیاوە جوامێرە نایە؟ چیا مەزنەکانی توورووسیش بۆ ئەو لاوە ئازایە دەگرین. مەگری برام مەگری, چارەنووس وابوو, ئەگەر ئەو بمابایە تۆی دەکوشت, ئەتۆش هەربۆیە دێ و ماڵ و گوزەرانی خۆت و یازدە منداڵت بەجێ هێشت و هاتی کەوتیە دەست پیاوی ناپیاو, دەستی ئاغایان, کەوتیە بەردەستیان و گەورەترین سووکایەتی کە تا ئێستا هیچ بنیادەمێك نەی‌دیوە ئەتۆ دیت, ئێستاش وەك هەوری بەهار بۆ دوژمنی خۆت فرمێسك دەبارێنێ, بۆچی؟ چونکە یەکێك لە ڕەسەنترین پیاوانی سەر ئەرزی. ئەگەر ئەو دوژمنە کە بە خوێنی سەرت تینوویە پیاو بێ, بۆی دەگری. بگری براله, بگری, فرمێسکێك بۆ حەمەدۆکی هەڵوەرێنی بێ پاداش نابێ. خۆشی بۆ ئەو کەسەی بۆ حەمەدۆك بگری, بۆ پیاوێکی پیاو کە تەنانەت بە خوێنی سەریشی تینوو بووە.

حەسەنەڕەشی ئاشەوان دوا وشەکانی لە حاڵێك دا بە زمان دا هاتن کە گریانی دە ئەوکێ مابوو, بە دوای ئەوەدا بۆخۆشی دەستی کرد بە گریان. پاش ئەوەی هەردووکیان تێرو پڕ گریان, ئاشەوان هەستا, ئاشەکەی وەکار خستەوەو جەواڵێکی گەنم وەسەر کرد. ئاشەکە بە دەنگە دەنگێکی زۆرەوە کاری دەکرد. ئەگەر قسەشیان کردبان بە ئاسانی گوێیان لەدەنگی یەکتر نەدەبوو.

✧ ✧ ✧

پێشوازیکەران لە یانیك جۆیز چاوەڕوانی یاوەر فارووق و جەندرمە قارەمانەکانی بوون. هەروەك عەلی‌یەشەل بۆی چووبوو, ئەوان ڕێگای خوارەوە, ڕێگای دەم چۆمیان هەڵبژاردبوو.

هەر کە تارمایی جەندرمەکان و یاوەر فارووق کە سواری ئەسپ بوو لەگەڵ ئەو تەرمانە کە بەسەر پشتیٚ ئیٚسترانیان داهیٚنابوون لە دوور وەدەر کەوت, قەرەوڵەکان خۆیان هاویشتە سەر ئەسپەکانیان و بەرەو شارۆچکە وەڕیٚ کەوتن. بۆ ئەوەی زووتر خەبەرەکە بگەیەننە ئاغاکان ئەوەندە خیٚرا ئەسپەکانیان تاو دابوو کە مەترسیی سەکەت بوونیان لیٚدەکرا.

لە شارۆچکە هەموو دوکان و ماڵەکان رازابوونەوە, لە بازاڕیش سیٚ تاقی سەرکەوتنیان لیٚدابوون. پایەی تاقەکان بە لکی داری مۆرد داپۆشرابوون و نیٚو بەنیٚویش گوڵەداودیی سوورو زەردو سپیٚیان لەو لکە مۆردە سەوزو لەشۆقانە چەقاندبوون. لە ژوور هەر تاقیٚکیشەوە ئاڵایەکی گەورە هەڵواسرابوو کە دەگەیشتەوە زەوی. لە شویٚنی نیوەڕۆ بازاڕیش کورسییەکی وتار خویٚندنەوە دانرابوو کە ئاڵایان بەسەردا دابوو. لە پشت ئەو تریبۆنە دەبوو لە پیٚش دا قایمقام, پاش وی سەرۆکی شارەوانی و بە دوای وانیش دا سامی تورقوودی مامۆستا قسەیان بۆ خەڵك کردبایە. سامی تورقوود لە هەموو جیٚژنەکانی مەشرووتەدا دەچووە سەر کورسیی وتارخویٚندنەوەو ئەوەندە قارەمانانە قسەی دەکرد کە دوو چاوی خەڵك دەبوونە دوو کانی. ئەگەر ئەو لەویٚ نەبووایە جیٚژنی مەشرووتە تامی تیٚدا نەبوو.

کچان جوانترین جلکەکانی خۆیان لەبەر کردبوو و رژابوونە کۆڵانەکان. لە دویٚنیٚ شەویٚوە جووتیاران بە جلکی جیٚژنەوە, یەك لە دوای یەك لە چیاکان و لە دەشتەوە رژابوونە نیٚو شار. لە شویٚنی نیوەڕۆ بازاڕ چوار پیٚنج دەهۆڵکوت و زوڕناژەن لە پەستا لیٚیان دەدا. لاوە دیٚهاتییەکانیش سەمای "هالای"یان گرتبوو. هەموو شادو بە کەیف بوون و بە بیٚسەبری چاوەڕوانی دیتنی جەنازەی حەمەدۆك بوون و هەر کە پەیکەکان گەیشتنەجیٚ قایمقام رووی کردە ئەو ئاغایانەی لە دەوروبەری بوون و گوتی:

"سەرەنجام براینە ئەوە خەریکن بگەنەجیٚ, دەبیٚ زۆری بمیٚنیٚ بۆ شارۆچکە بە پیٚشوازیانەوە بچین" قایمقام سمۆکینگیٚکی تازەی لەبەردا بوو کە تەنیا لە جیٚژنی مەشرووتەی ساڵی پیٚشتر دا جاریٚکی لەبەر کردبوو, دەستەوانە سپییەکانیی لە دەست دا بوون و کڵاوە فووتیٚرەکەی بەدەستی چەپیەوە گرتبوو.

دەرکەوان گوتی:

"جەناب ترۆمبیٚلی هەمزە دایی لەبەر دەرگا چاوەڕیٚتانە".

قایمقام ئەمڕۆ زۆر ڕووخۆش ببوو, بە جۆریٚك کە تەنانەت سوپاسی دەرکەوانیشی کرد.

قایمقام لە پیٚشەوە, مەلا دۆران ئەفەندی بە دوای داو زولفۆی دەفتەردار لە دوایانەوە لە خانووبەرە دەوڵەتییەکە هاتنەدەرو هەر بەو پیٚیەش سواری ترۆمبیٚلی هەمزە دایی بوون.

مورتەزاغا بەسواری ئەسپێکی لەندەهۆر کە خوێنی خالیسی ئینگلیزی لە دەمارەکانی دا دەهات و دەچوو, لە شوێنی بازاڕ چاوەڕوانیان بوو. ئەمڕۆ جۆرێکی دیکەی خۆ پۆشتە کردبوو. جووتێك چەکمەی زەردی چین داری لەپێ کردبوون کە مامزەکانیان زێڕکفت بوون, پانتۆڵێکی گالیفەی سوارییەی لەپێدا بوو بە قایش پشتێنێکی سەوزی زۆر قیمەتییەوە, چاکەتێکی خەت خەتی سورمەیی لەبەر کردبوو, دەسەسرەیەکی سەوز سەوزی لەگیرفانەکەی چەقاندبوو, و بۆینباغێکی لە رەنگی ویشی بەستبوو... کڵاوێکی چەرمی بریقەداری لەسەر نابوو. ئەم کڵاوەیان لە رووسیاوە بۆ هێنابوو کڵاوە چەرمەکەی بە لایەکی سەریەوە نابوو. قەمچییە دەسك زێڕە هەڵکەندراوەکەی بە دەستی راستی گرتبوو, لەسەر ئەژنۆی دانابوو. دەستی چەپی بە ئەژنۆیەوە گرتبوو... ئەو بەو شکڵ و قەڵافەتەوە وەك هەڵۆیەك دەچوو کە نیازی رفاندنی نێچیری خۆی هەبێ. چووکترین جووڵەی نەدەهاتێ و هیچ کام لە هێڵەکانی نێوچاوانیشی چووکترین بزووتنەوەیان لێ نەدەبینرا. تەنانەت لەوانە بوو چاویش نەترووکێنێ.

ترۆمبێلی قایمەقام لە پێشەوە, بە دوای ترۆمبێلەکەدا مورتەزاغاو لە دوای ویشەوە پیاوانی هێزە غەیرە نیزامییەکانی شار کە لە جێژنی مەشرووتەدا سواری ئەسپ دەبوون, وەرێ کەوتبوون. هەریەکەی ئاڵایەکیان بەدەستەوە بوو, لە دوای وانیشەوە دەهۆڵکوتەکان دەرۆیشتن کە لاوە دێهاتییەکان بە دەم سەمای هالایەوە وەپێشیان کەوتبوون. لە دوای هەمووانیش کۆمەڵێك خەڵك ژن و پیاو, پیرو لاو و منداڵە ورتکە دەرۆیشتن.

سەعاتێکی پێچوو هەتا ئەو حەشیمەتە زۆرە کە سەروبنی دیار نەبوو, توانی لەشار وەدەر کەوێ. لای نیوەڕۆیە لە نیزیك ئاشی راوەستان و چاوەڕێ مان, لەو کاتەدا یاوەر فارووق لە قۆرتی جادەی وەدەر کەوت, قیت, دەت گوت خەدەنگی قووت داوە لەسەر ئەسپەکەی دانیشتبوو, کاتێك هەتاو لە ئاغزوونەی قایش پشتێنە عەسکەرییەکەی دەدرا وەك بریسکە دەدرەوشایەوە. بە دوای وی دا بارگینە رووتەکان و ئەو تەرمانە کە هاوێژرابوونە سەر پشتی بارگینەکان و ئەو جووتیارە کاڵە لەپێیانە کە جڵەوی بارگینەکانیان رادەکێشا, و لە دوای وانیشەوە جەندرمەکان دەهاتن. هەر کە یاوەر لە حەشیمەتەکە نیزیك بووەوە, ئاپۆرای خەڵك بە جۆرێك هاواریان کرد بژی کە دەت گوت ئاسمان دەئەرزێنێ: بژی یاوەر فارووق. بژین جەندرمە قارەمانەکانی یاوەر فارووق. بژی کۆماری تورکیە. بمرێ حەمەدۆك...

سامی تورقوودی مامۆستا کە لە پێشەوەی حەشیمەتەکەوە دەرۆیشت, پێشتر بە سەعاتێك چەقەو هەرا فێری کردبوون کە چ بکەن و چ بڵێن. وەختێك دەستی هەڵدێناو هاواری دەکرد خەڵکەکەش هاواریان دەکرد. ئەو کاتیش کە دەستی دەهێنایەوە خوارو بێدەنگ دەبوو,

حەشیمەتەکەش بێدەنگ دەبوون. سامی تورقوود بە ئارەق رشتن و کەف پرژاندن, رەگی ملی هەڵدەستان و هەم هاواری دەکردو هەم حەشیمەتەکەی ناچار دەکرد هاوار بکەن. یاوەرو ئەو تەرمانە کە بەسەر پشتی ئەسپە رووتەکان دا درابوون هەر کە گەیشتنە نیزیك قایەقام, راوەستان. وەختێك یاوەر لە ئەسپەکەی دابەزی لە نەکاو دەنگی دەهۆڵ و زورناو هاواری حەشیمەت راوەستا. دەت گوت دەنگەکانیان بە چەقۆ بڕیوە. قایەقام چوو ئەوی لە باوەش گرت و سێ جاری نێوچاوان ماچ کرد. ئەمجار قۆڵی گرت و بردی بۆ لای ترۆمبێلەکە. لە ترۆمبێل دا لە پەنای یەکتر دانیشتن. هەمزە دایی پێی نایە سەر گاز. ترۆمبێل لە پێشەوەو ئەوانی دیکە بە دوای دا هێدی هێدی لەنێو چەپڵە لێدان و دەنگی بژی بژیدا هاتنە نێو شارو راستەڕێ چوونە خانووبەرەی شارەوانی. لەنێو شاری دا زۆریان گاو گەردوون لە پێش کردن. سێ گا, یازدە مەڕو سێ بزن... سێ جوانەگایەکە مورتەزاغا دابوونی. ژمارەیەك لە مەڕەکان تاشکەن خەلیل و هێندێکیشیان مەلا دۆران ئەفەندی کردبوویاننە گاوگەردوون.

تەرمەکانیان بەسەر پشتی بارگینە رووتەکانەوە بە کۆڵانەکان دا گێڕاو سەرەنجام بردیاننە شوێنی بازاڕ. جەندرمەکان بە دەوری مردووەکانەوە کۆزیلکەیان بەستبوو, نەیان دەهێشت کەس لێیان نیزیك کەوێتەوە. لە پێش دا قایەقام چووە پشت میکرۆفۆن و ئاوای دەست بە قسە کرد:

"ئەمە سەرکەوتنێکی گەورەیە, حەمەدۆك سەرکردەی چەتەکان و هەشت کەس لە پیاوەکانی بە هۆی یاوەر فارووقەوە لەنێو بران. بەم جۆرە دەوڵەتەکەمان لە فیتنەیەك رزگاری بوو. ئێستاش ئێوە سەرەنجامی ئەو کەسانە کە دژی دەوڵەت و میللەتی ئێمە رادەپەڕن... بە چاوی خۆتان دەبینن (لە کاتێك دا ئاماژەی بۆ لای ئەو تەرمانە دەکرد کە هاویشتبوویاننە سەر ئەو بارگینە لەڕو لاوازانەو دەست و ملیان بەرەو زەوی شۆڕ ببوونەوە), بەڵێ ئەمەیەو ئاوایە چارەنووسیان".

قایەقام دیسان قسەی دیکەشی کردن و گوتی:"ئێستا کە ئاقیبەتی کاری حەمەدۆك ئەمە بوو, چارەنووسی هەموو ئەو رێگرانەی لەو چیاو بەندەنانەشن هەر ئەوە دەبێ." ئەمجار سنگی رەپێش کردو کڵاو فووتێر بەدەست ماڵاوایی لە خەڵك خواست و هاتەخوار. پاش ئەویش سەرۆکی شارەوانی چووە پشت میکرۆفۆن و بە دەنگێکی رەوان ئاوای قسەی خۆی دەست پێ کرد:

"ئا...ی نەتەوەی بەرێزی تورك..."

لە سەرەتای قسەدا هەر ملی رادەکێشاو منجە منجی دەکردو کەس هیچی لێ حاڵی نەدەبوو. پاش ئەوەی چەند جار لە خوارەوەڕا دەلینگی پانتۆڵەکەیان کێشا کابرا هاتەوە هۆش خۆی و بە ئارامی و لەسەرەخۆ دەستی بە قسان کردو گوتی:

"هەتا ئێستا هەرگیز کەس نەیتوانیوە ئەم نیشتمانە بکاتە داردەستی خۆی و لەمەولاش هەروا دەبێ. ئەمەیە سەرەنجامی ڕێگرانی وەك حەمەدۆك کە دەیانەوێ دەستدرێژی بۆ سەر هەرێمی حورمەتی میللەتمان بکەن. پاش سەلجووقییەکان ئەم میللەتە زۆری چەتە دیون, بەڵام ئاخری کاری هەموو یاغییەکان ئەمە بووە. ئەم دوژمنانی ئایین و نیشتمانە هەمیشە لەگەڵ سەددی ئەسکەندەری وەك یاوەر فارووق رۆڵەی بەرهەقی نیشتمان بەرەوڕوو بوون. بەڵێ یاوەر فارووق بەگی قارەمان هەموو کاتێك سنگی پۆڵایینی خۆی کردوەتە قەڵغانی ئەو جانەوەرە دڕندانەو تووشی ئەم چارەنووسەی کردوون و کەلاکی ئەوانی وەك جەواڵی بەتاڵ بەسەر پشتی ئەسپی گروێ و پشت بریندارادا داوە. یاوەر فارووق پلەی سەرگورد (مقدم)ی بۆ دەرچووە کە بەم زووانە پێی دەدرێ. چونکە ئەو نیشتمانی لە بەڵاو موسیبەت نەجات داوەو لەمەودواش نەجاتی دەدا".

شارەدار بێدەنگ بوو, گەرووی پاك کردەوە, ئاوێك کە لەسەر ترۆیبۆنەکە دانرابوو, هەڵی گرت و هەمووی هەڵقووڕاند, چەند جار باسکی لێك کردنەوەو نوشتاندنیەوەو چاوەکانی وەك شەهێنێك بەسەر ئەو حەشیمەتەدا کە سەرانسەری مەیدانەکەی داگرتبوو, گێڕاو پاشان بڕۆی گرژ کردن و نێوچاوانی تێك ناو لەسەری ڕۆیشت:

"بەڵێ و هەزار جار بەڵێ. بژین ئەو دایکانە کە قارەمانی وەك یاوەر فارووقیان لێ بووەو داویانن بە نیشتمان, هەزار جار بژین".

دووبارە بێدەنگ بووەوەو چاوی بەسەر حەشیمەت دا گێڕا. یاوەر فارووق بە شەرمێونی سەری بەردابووەوەو بەسپایی دارحەیزەرانەکەی دەستی لە چەکمەکانی رادەکێشا:

"ئێستا هەموو پێکەوە, وەختێك ئەمن دەستم پێ کرد هەمووتان پێکەوە... هەزار جار بژین و بەرقەرا بن ئەو دایکانە کە قارەمانی وەك یاوەر فارووق و پیاوانی ئازاو بە زیپکی فیداکاری وەك ئەویان لێبووەو لە داوێنێ خۆیان دا پێیان گەیاندوون. ئێستا هەمووتان پێکەوە...".

حەشیمەت یەکدەنگ هاواریان کرد: هەزار جار بژین".

"مردن بۆ کەسانی وەك حەمەدۆك کە نان و نمەکی ئەم نیشتمانەیان کردوە بەڵام کوڕە لێوەشاوەکانی ئەم وڵاتە وەبەر خەنجەر دەدەن و چاویان هەڵدەکۆڵن و دەیان کوژن".

"بمرن".

"بە لەعنەت بن".

"به لەعنەت بن".

سەرۆکی شارەوانی پاش ئەوەی سێ جاری دیکەشی خەلکەکە هان دا لەعنەت بنێرن, بە هەناسەبڕکە تریبۆنەکەی بەجێ هێشت. لەگەڵ هاتنەخواری وی سامی تورقوود کە لەمێژ بوو ددانی بە جەرگی خۆی دا گرتبوو, غاری دایە پشت تریبۆن, چەند لەحزەیەك بێدەنگ لە پشت تریبۆنەکە راوەستا, ئەمجار تەماشایەکی چەپ و راست و پێشەوەی کردو چاوی بەسەر حەشیمەتەکەدا گێڕا. کەس دەنگی لەبەر دەرنەدەهات. تەنیا ئەو بارگینانەی تەرمەکانیان لێ بار کرابوون, لە پەستا کلکیان رادەوەشاندو مێش و مەگەزیان لە خۆیان دەردەکرد. دەنگێك لە دەوروبەر گەڕا:"رەگەزی ئێمە..." کە هەموو خەلکەکەی بە جارێك هەژاند: "رەگەزی بەرەژوورترەو لە هەمووشمان بەژوورتر, پیاوە ئازاکانی ئێمەو ولاتەکەمانە کە لانی پیاوانی ئازایە...

خوێنی خالیسی ئێمە کە وەك ئاوی کانی خاوێنە. رەگەزی حەیاتمان بالاترین تیرەی رەگەزی ئێمە کە لە ئاسیای نێوەڕاستەوە بەخۆیان و چادرە مووبینەکانیانەوە هاتنە ئێرە, خوێنیان لە سەرانسەری جیهان دا بلاو بووەوەو هەر چادرە مووبینەیەکیان کردە کۆشکێکی بەرز. رەگەزی ئێمە ئەو رەگەزەیە کە ئالای نیشتمانی هەلکرد. ئەگەر ئێمە نەبووباین, ئەگەر ئێمە نەبووایەین...".

خێرا خێرا دەستی رادەوەشاندن, دادەهاتەوە, راست دەبووەوە, بە چەپ و راست دا دەسووڕاو لەپشت ترۆیبۆنەکە بەرۆکی خۆی دادەدڕی, وەك چەوەندەر سوور هەلگەڕابوو. لە ئارەقیش دا شەلال ببوو. دەنگیشی بەرە بەرە بەرز دەبوو, دەت گوت قسە بۆ خەلکەکە ناکا بەلکوو لەگەڵ چیای ئالاداغ دەدوێ, کە زۆر دوور دیار بوو:"ئەگەر ئێمە نەبووایەین دنیا لە رووناکی و ئازایەتی بێبەش دەما. ئەوە بەرەی بەشکۆی ئێمە بوو کە خەلکی دنیای کردە بنیادەم... ئەگەر ئێمە نەباین دنیا پەکی دەکەوت... بەرەی ئێمە بوو کە هەلمەت و دەسەلاتی خۆی لە ئاسیای نێوەڕاستەوە تا ئەم ئاسیایە پەرە پێدا... ئێمە ناوی خۆمان لە مێژوودا بە خەتی زێڕین تۆمار کرد. ئێمە مانگ و ئەستێرەمان لە ئاسمان و لەسەر شاخەکان هەلکەند (مەبەستی مانگ و ئەستێرەی ئالای تورکیە بوو.م). ئەو تیرەی لەسەر چیای عەرەب هاویشتمان سنگی چیای ئالپی شەق کردو لەو دیوی سەری وەدەرنا, پالەوانانی پەنجە ئاسنینمان خەلاتی تۆپی زەوی کردوە. وەك شێری رق هەستاو لە حالێك دا یالی بەسام و هەیبەتی خۆمان دابووە بەر باو دەشەکایەوە تۆپی زەویمان خستە ژێر پێمان, هەرکەس هاتە سەر رێمان تێکمان شکاندو ئەوەی پەناشی بۆ هێنابین ئەوەندەی سەرە موویەك ئازارمان نەدا. سەرانسەری جیهانمان لە رۆژهەلات تا رۆژئاوا گرت. لە کاتێك دا نیشانەی مانگ و ئەستێرەمان بەنێوچاوانە بوو, بە بەورە پۆلا لەبەرەکان دنیامان خستە ژێر

پێمان. بەڵێ هاوڕێیان. ئێوە لە بەرەیەکی ناوان. چۆن دەکرێ لە بەرەو ڕەگەزێکی ناوا کافری وەك حەمەدۆك پەیدا بن؟ ئەگەریش پەیدا بن, ئەم سەگانە کە خوێنی ناپاك لە دەمارەکانیان دا دێت و دەچێ, تووشی ئەم ڕۆژە دەبن. . . تەماشایان کەن کە ئێستا بەسەر پشتی ئەو بارگینە گروێیانەوە چۆن بێ گیان و بریندار کەوتوون و بڕوانن کە چۆن سەری هەڵواسراوو مل و دەستی ڕاکشاویان خەریکە ڕەزەوی بخشێ. دوایان بڕێتەوە بەرەڵڵای کوڕی بەرەڵڵا. ئەوان هەرکەس بن و خوێنەکەیان هەرچەندی ناپاك بێ ناتوانن ڕووبەڕووی ئەم نیشتمانە ڕاوەستن. با ئەوان هەرچەندی دەتوانن ڕۆڵە خوێن پاکەکانی ئەم نیشتمانە کە لە ناسیای نێوەڕاستەوە بێ ئەوەی خوێنیان بگۆڕێ و تێکەڵ بێ, هاتوونە ئێرە, بکوژن, خۆ ئەوان تەواو بوونیان نیە, ئەگەر عەلی سەفابەگێك بکوژن, خوێنە ڕەسەنەکەمان هەزار عەلی سەفابەگ, دەهەزار, سەد میلیۆن عەلی سەفابەگ پێ دەگەیەنێ. ئێمە, ئێمە. ئێمە بناخەی لەرزۆکی ئەم حکومەتەمان پتەو کرد. ئێمە هەر دوێنێ دوژمنە خائینەکانی خۆمانمان کە وەك حەمەدۆك نیازیان هەبوو دەست بۆ هەرێمی حورمەتمان درێژ کەن, لە ئاگری خوێن دا ـ کە هەرگیز ناکوژێتەوە ـ نوقم کردو هەتا ڕۆژی قیامەتیش هەر نوقمیان دەکەین. ئەمڕۆ ئێمە کۆمەڵە خەڵکێکی بێ چینین کە هیچ جیاوازیی چینایەتیمان نیە. ئێمە ئەو کافرانە کە وەك حەمەدۆك بیانەوێ ئەو بەرامبەری و یەکسانییە لەنێو بەرن لە خوێنی خۆمان و ئارەقی نێوچاوانی خۆمان دا دەخنکێنین. . . ".

لە نەکاو قسەکەی بڕی, چاوی تیژ کردو چەند لەحزەیەك ڕوانیە حەشیمەتەکە. لە پشت تریبۆنەکە شێوەی شێرێکی بەخۆیەوە گرتبوو کە یاڵی گرژ کردبن و خەریکی نەڕاندن بێ. هێدی هێدی دەستەکانیی لێك کردنەوەو پاشان بەرەو ئاسمان بەرزی کردنەوەو نەڕاندی:

"یانی نیشتمان نامرێ, ئەم نیشتمانە نامرێ, نامرێ... و تەنانەت ئەگەر بش مرێ, ئەگەر بش مرێ... پشتی جیهان ئەو تابووتە گەورە, گەورە, گەورەیەی پێ هەڵناگیرێ, پێی هەڵناگیرێ".

لە کاتی ئەم قسانەدا بە نۆرە تەماشای قایەقام و مورتەزاغاو یاوەری دەکردو لە حاڵێك دا قۆڵی لێك کردبوونەوە وەك باڵندەیەك لە پشت تریبۆنەکەوە دوو میتر بازی دایە پێشەوەو ڕووبەڕووی قایەقام کەوتە سەر زەوی. خەبەردار بەرامبەری ڕاوەستاو ئەمجار ئیکلامی بۆ کێشا.

قایەقام گوتی:

"کاك سامی تورقوود لە ناخی دڵەوە پیرۆزباییت لێ دەکەم. ئەمن تەنانەت لە ئەنکەرەش وتاردەری وەك جەنابتم نەدیوە. سوپاس بۆ خوا تەنات سوبحی بەگ و عومەرنەجاتی پاشاش لەباری توانای وتاردانەوە شیاوی ئەوە نین ئاوێشت لە دەزنوێژێ بکەن".

هێندێك کەسی دیکەش کە لەوێ بوون بە قسەی لەو بابەتە پیرۆزباییان لێکرد. بەڵام کاتێك مەرتەزاغا داهاتەوەو بە سرتە چەند قسەیەکی بە گوێ دا چپاند، وتاردەری مەزن لە گوێیان پێکەنی.

تاوێك دوای رۆیشتنی گەورەکان، جەندرمەکان تەرمەکانی سەر پشتی بارگینەکانیان گەمارۆ داو لەگەڵ خۆیان بردنە مەرکەز. چەتەکانیان لەپشتی بارگینەکان کردەوەو لەبن دیواری مەخفەر لە پەنای‌یەك ریزیان کردن. یەکەمین جەنازە، تەرمی سەررووتی حەمەدۆك بوو کە بە تەواوی پشتیان پێ بەدیوارەوە دابوو. چەتەکانی دیکەشیان دانیشاندبوو، پشتیان پێ بە دیوارەوە دابوون و لاقەکانیان وەك لاقی حەمەدۆك درێژ کردبوون. سەری هەموانیش بە لایەکی شانیان دا کەوتبوو. جەندرمەکان تفەنگی چەتەکانیشیان لە پەنای تەرمەکانیان دانابوو. فیشەکدانەکانیان هەر دەستیان لێ نەدرابوو، هێندێکیان فیشەکدانیان لە قەدیان بەستبوون و بەشێکیشیان راست و چەپ لە شانیان دابوون. چەند کەسیان دووربین، بەشێکیان نێزەو ژمارەیەکیش دەمانچەیان پێ بوو. بۆمبێکی دەسکردی گەورەش لەبەردەمی چەتە کەچەڵ دەهاتە بەرچاو. تفەنگەکەشی لە تەنیشتێ بوو...

ناوەندی فەرماندەرایەتیی جەندرمەی شارۆچکە خانووبەرەیەکی کۆنی زۆر گەورە بوو کە دیوارێکی بەردی بە بەرزایی میترێك بە دەوردا کێشرابوو. خانووبەرەی یەك نهۆمی بەندیخانەش هەر کەوتبووە نێو ئەم حەوشە گەورەیە. لەم حەوشەیەدا سێ بەردەنووسی مەرمەڕی گەورەی لەمێژینەش دەبینران. زۆر ساڵ لەوەپێش یاوەرێکی عوسمانی کە ئۆگری شوێنەواری کۆن بوو ئەم شوێنەوارانەی بە عارەبانە لە شوێنێکی نیزیك قەڵای ئاناوارزاوە هێنابوو. لەسەر یەکێك لەو بەردانە لەسەر ئەو رووەی کە بەسەر شەقامی دا دەڕوانی وێنەی ژنێکی یەکجار جوان کە لووتێکی راکشاوی هەبوو، کێشرابووەوە. دوو بەردەکەی دیکە بە وێنەی گەڵامێوو سەرە مەڕو گوڵی پێنج پەڕی وەك یەك رازابوونەوە.

حەشیمەتێکی زۆر سەرانسەری شەقامەکەی پڕ کردبوو. خەڵك لەسەر دیوارەکەوە تەماشای تەرمی چەتەکانیان دەکرد کە لەبن دیوارەکە ریز کرابوون و سەریان بەسەر شانیان دا شۆڕ ببووەوە. رەحمی چاویلکە تەنیا وێنەگری شار کە دەسبەجێ دووربینی خۆی هێنابوو، لەسەر ئیزنی یاوەر لە نێو مەخفەردا وێنەی جەنازەکانی دەگرت. بە بەر وێنەگرتنەوە هەوڵی دەدا سەری ریگرەکان بە دیوارەکەوە راست رابگرێ، بەڵام هەرچی هەوڵی دەدا بۆی نەدەکرا. سەرەنجام داوای لە یاوەر کرد کە یەکێك لە جەندرمەکان سەری جەنازەکانی بۆ راست کاتەوە. یاوەریش فەرمانی بە عەلی کەرتیش دا.

مووسلی چاوەش خەڵکی گوندی وایوای کە ئاگای لە بەرودوای بەسەرهاتەکە ببوو، بە فکری داهات کە بچێ و خەڵکی ئاوەدانی لە مەسەلەکە ئاگادار بکا. پاش ئەوەی لەنێو حەشیمەتەکەرا جارێکی دیکە تەماشای جەنازەکانی کرد کە لەبن دیواری ریز کرابوون، وەڕێ کەوت. ئەو، هەم لە شوێنی بازاڕو هەم لە مەخفەری جەندرمە لە نیزیکەوە بە باشی ئەو کەسەی دیبوو کە دەیان گوت حەمەدۆکە. بە هیچ جۆر نەی‌توانیبوو وێك چوونێك لەنێوان ئەو پیاوەو حەمەدۆك دا ببینێ. بەڵام کاتێك چەند لەحزە لەمەوبەر لەسەر دیواری حەوشەی ڕا تەماشای جەنازەکانی دەکرد، دیتی نەفەری سێهەم لەلای راستەوە وەك حەمەدۆك دەچێ. لە دڵی خۆی دا گوتی: کەوابێ جەندرمەکان ئەو لەندەهۆرەیان لەگەڵ حەمەدۆکی بستەباڵا لێ‌گۆڕاوە، لەوانەشە هەڵەکە لە خۆیەوە بووبێ، یانی ئەوان ئەو پیاوەیان نیشان دابێ کە وەك حەمەدۆك دەچوو، و ئەو پێی وابووبێ کە مەبەستیان ئەو پیاوە لەندەهۆرەیە.

وەختی رۆژئاوایە گەیشتە ئاوەدانی، دێ یەکپارچە بێدەنگ بوو، نە دەنگی میاوەی پشیلەیەك دەهات و نە حەپەی سەگێك و نە کورکەی باڵندەیەك. راستەڕێ چووە ماڵی کوێخا سەیفەلی‌یە مل درێژو خەبەری کارەساتەکەی پێ‌دا:

"مام سەیفەلی، بیستت چیمان بەسەر هات، ئەمڕۆ جەنازەی حەمەدۆکیان لە چیاڕا هێنایەوە". سەیفەلی‌یە مل درێژ لە کاتێك دا ملی درێژ دەکرد گوتی:

"وست، بێدەنگ بە مووسلی چاوەش، بێدەنگ بە وەجاخمان کوێر بووەوە، بێدەنگ بە چونکە وەسمانەزلە نەی‌زانیوە، ببیسێ دەمرێ. سەمیرانێش خەبەری نیە، لەوان بەولاوە هەموو خەڵکی ئاوایی دەزانن. دێ تۆزی تازیەی لێ‌نیشتوە... بێدەنگ بە کوڕم بێدەنگ. ئەگەر وەسمانەزلە ببیسێ دەمرێ. بەڵام چۆن دەکرێ نەیەڵێن ئەم خەبەرە بە گوێی سەمیرانێ بگا؟ سەمیرانیش تێك دەچێ، گەنجە، ساغە...".

مووسلی چاوەش وەڵامی دایەوە:

"مومکین نیە، بتەوێ نەتەوێ مام وەسمان رۆژێك بەو مەسەلەیە دەزانێ".

"پێ‌دەزانێ و هەر کە پێشی زانی گیانی دەردەچێ. وەی مام وەسمانەزلە، وەی وەی. ئاخرو ئاقیبەتی دەبوو ئەم بەڵایانەی بەسەر بێن. ئەو وەك کێو وابوو، خوا بەدبەختیی وا بە نسیب دوژمنیش نەکا...".

ئەو شەوە کوێخا سەیفەلی‌یە مل درێژو مووسلی چاوەش نەنووستن و تا بەیانی قسەیان کرد.

دێش کپ و بێدەنگ بوو. بەیان ئەنگووت، رۆژ بووەوە، دەشتیش نوقمی بێدەنگی بوو، بێدەنگی‌یەکی قووڵ و پڕئاواز. دەت گوت هەموو گیاندارانی دەشت و دێ مەرگیان بەسەردا باریوە. بێدەنگی‌یەك بوو دەت گوت ئەگەر دەنکێك لەبن خاك بقەڵشێ، گوێت لە دەنگەکەی دەبێ.

دوو سەعاتێك مابوو بۆ نیوەڕۆ کە مووسلی چاوەش لە ماڵێ سەیفەلی وەدەرکەوت و یەك دوو هەنگاوێك ڕۆیشت و دەسبەجێ بەرەو دوا گەڕایەوە. لە کۆڵانەکانی ئاوەدانی دا گیاندارێك نەدەبینرا. لەو بێدەنگی‌یە ترسابوو.

دووبارە بەرەوڕووی یەکتر دانیشتن, ماندوو بوون. هەتا تولعی بەیانی قسەیان کردبوو, هەریەکەی دارێکی درێژیان بەدەستەوە بوو, زیلکی ئاورگەکەی پێش خۆیان پێ تێك وەردەدا. بە زێڕەیەکی درێژ کە ئەو بێدەنگی‌یە قورسەی تێك شکاند, راچەنین و راپەڕین. زیڕەکە ئەوەندە درێژ بوو, ئەوەندەش وەك گوێزان تیژ بوو, دەت گوت ئاسمانی دوولەت کردو بێدەنگ بوو. سەیفەلی گوتی:

"ئەی هاوار مووسلی چاوەش, ئەمە زیڕەی سەیرانێ بوو, ئێستا ئیدی وەسمانەزلەش پێ دەزانێ. دەبێ سبەینێ و دووسبەی جەنازەیەکی دیکەش بەڕێ بکەین. یاڵڵا با بچینە ماڵێ سەیرانێ".

سەیران لەبن دیواری ماڵەکەی دەستەو ئەژنۆ دانیشتبوو رێك هاتبوو, چاوی لەسەر یەك دانابوون و وەك لەشێکی بێ‌گیان جووڵەی لێ‌بڕابوو. وەك بەردێك رەق رامابوو. هەرکەس دەهاتە ماڵێ سەیرانێ وەختێك ئەوی بەو حاڵەوە دەدی, نوتقی دەبەسترا, کوشم هەڵدەهات و لە سووچێك دادەنیشت. هەمووان چاویان لەوەوە بڕیبوو و لە دڵەوە شەریکی غەمی بوون. حەشیمەت لەبەر دەرکی ماڵێ سەیرانێ هەر دەهات و زۆرتر دەبوو و دیسانیش ئەو بێدەنگی‌یە هەروا درێژەی هەبوو. حاڵەتێکی کوشندە لە دەوروبەردا شەپۆلی دەدا. هەتا لای نیوەڕۆیە هەموو دانیشتووانی دێ‌یەکانی سەرەوەو خوارەوە هاتن و لەبەر دەرکی ماڵێ سەیرانێ هەڵتروشکان. تەنیا وەسمانەزلەو دایەقەمەر لەنێو حەشیمەت دیار نەبوون. هەموشیان چاوەڕوانی وان بوون. ئەم وەزعە ناخۆشە لەوە زیاتر نەی‌دەتوانی درێژەی هەبێ. شتێك بوو ناخۆشتر لە مەرگ و ئەشکەنجە.

سێبەری هەورێکی سپی کە بەسەر دێ‌یەکەدا رابورد, کەوتە سەر حەشیمەت و تێ‌پەڕی. لە دارچنارەکەی ژوور سەریان ڕا چەند باڵندە هەڵفڕینە سەر شۆڕەبێ‌یەکەی بەرامبەریان و راست لەو کاتەدا دەنگی پێکەنینێکی پڕ لە شادی لە دەوروبەر گەڕا. جووتیاران هەرکە ئاوڕیان دایەوە وەسمانەزلەیان دی کە جوانترین جلەکانی لەبەر کردوە, زنجیرسەعاتە زێوەکەی بە بەرۆکیەوە هەڵواسیوە, دەمانچە دەسك زێوە نەخشاوەکەی لە قەدی بەستوە, گۆرەوی‌یە نەخشینە لاسك درێژەکانی هەتا ئەژنۆی هەڵکێشاون, کەوشەکانی بۆیاخ کردوون و لەگەڵ دایەقەمەر لەولاڕا دێن. دایەقەمەریش جلکی جێژنانی لەبەرداو خەزێمی زێڕی لە لووتی‌دا بوو.

دەنگی وەسمانەزلە زرینگایەوە:

"توخوا بڕوانە ئەمانە, بۆچی وا ڕەق ڕاماون, کوێخا مل درێژ ئەمن پێم وابوو ئەتۆ پیاوێکی ئاقڵی, تف لە ئەقڵ و شعوورت".

چووە لای سەیرانێ, پاش ئەوەی تاوێك لە ژوور سەری ڕاوەستا, بە ڕاوێژێکی توندو فەرماندەرانە گوتی:

"هەستە کچێ, هەستە, ژنەتیوە بێئەقڵە بۆچی ئاوا وەك تازیەداران دانیشتووی و کز داماوی؟ ئەتۆش ئەقڵی خۆت داوەتە دەستی ئەم دێهاتێیە گەوجانەو ئەو سەیفەلێیە بێئەقڵە؟ ڕاست وەبە, ئەگینا وەبەر پێلەقەت دەدەم.

کێ دەتوانێ شەهێنەکەم, حەمەدۆکم, کوڕەکەم بکوژێ؟ چما نازانی ساڵێ چەند جار خەڵکی شارو ئاغاکان بێچووە شێرەکەم دەکوژن؟ چما ئەمە یەکەم جارە خەبەری مەرگی وی دەبیسن؟".

قاقا پێدەکەنی و بەنێو جووتیارەکان دا کە هەڵتڕووشکابوون پیاسەی دەکرد, سەری داویشتنە سەرو کەیفی دەکرد:

"هە... هە... ها. با خوێی کەین یاوەر فارووق بۆن نەکا, ئەو دەیەویست شەهێنەکەم بەر تفەنگ بدا بەڵێ؟ هە, هە, ها, کەس نازانێ چ چەتەیەکی بەدبەختی لە جیاتی حەمەدۆك کوشتوەو ئێستاش فاڕووقەفەندیی ترسەنۆك فیز دەفرۆشێ".

ئەمجار لە جێی خۆی ڕاوەستاو توند پێی بە زەوی دا دا:

"گەوجینە شێتینە لە جیاتی ئەوەی ئاوا تازیە داگرن و خوێنتان ڕاوەستێ و وەك بەردی سەرقەبران بکەونە سووچێك دەبوو یەکێکتان بچێتە بەردەرکی فەرماندەریی جەندرمەو جەنازەی چەتەکان ببینێ و بزانێ دوور لە گیانی, زمانم لاڵ بێ جەنازەی شەهێنەکەمیان لەنێو دایە یان نا... لە خەڵکی ئەم دێیە بەولاوە کێ ئەوی دیوەو دەیناسێ, کێ, کێ, کێ... بۆ بنیادەمی زیندوو تازیە داناگیرێ, یاڵڵا ڕاست وەبن".

ڕاوێژی دەنگەکەی ئەوەندە فەرماندەرانە بوو کە هەموو هەستانە سەرپێ. لەو بەینەدا سەیرانیش هەستابووە سەرپێ و بەرەو شارۆچکە غاری دەدا.

وەسمانەزلە لە حاڵێك دا لە دواوە زەردەی دەهاتێ گوتی:

"لێی گەڕێن با بچێ جندە, تازە ئەقڵی هاتوەتەوە جێی خۆی, ئێستا دەچێ و دەزانێ".

ئەمجار باسکی دایەقەمەریی گرت و لە حاڵێك دا ڕایدەکێشا گوتی:

"یاڵڵا زوو بچینەوە ماڵێ کە منیش خۆم تێر بکەم".

لە پاش ئەم بەسەرهاتە جووتیارەکان هاتنەوە سەرخۆو لەگەڵ یەکتر دەستیان بە قسان کرد.

سەیران بەنێو زیپەڵێن و قامیشەڵانەکان دا دەڕۆیشت, لە گۆمیلکەی چووکەڵە چووکەڵە دەکەوت و بەنێو پەرژی زەردی زێڕین دا غاری دەدا, ئەو بێ ئەوەی گوێ بداتە دڵ و تەپۆلکەو جۆگەلەو بێئەوەی

چاوی هیچ ببینێ، دەیەویست بە نیزیکترین ڕێگادا خۆی بگەیەنێتە شارۆچکە. تەنانەت نەیزانی کەنگێ و چۆن گەیشتە ئەو ڕووبارە کە بە پێش شارۆچکەدا تێدەپەڕی. تەنانەت بەخۆی نەزانی کە دەست و لاق و تەنانەت دەم و چاویشی رووشان و خوێناوی بوون. کە گەیشتە قەراخ ئاوەکە پاش تاوێك ڕاوەستان دانیشت. کەوشەکانی داکەندن و بەدەستیەوە گرتن، وەختێك پشتی هەڵێنایەوە تاوێك دەفکرەوە چوو، ئەمجار وەنێو ئاوێ کەوت و پەڕیەوە، لەو کاتەدا کە خەریك بوو کەوشەکانی لەپێ بکاتەوە لە دڵی خۆی دا گوتی: ئەگەر تاوێکی دیکە لەگەڵ جەنازەی حەمەدۆك ڕووبەڕوو بم چ دەکەم؟ چەند هەنگاوێکی بەرەو دێ هەڵێنانەوە، شوێنی خۆی لەسەر خیزەڵانەکە دی. مێشەرەشکەیەك کە وەك فرفرە دەچوو لە کاتێك دا وەك شێتان دەیوزاندو دەسووڕا، بە شەیپوورلێدان بە دەنگێکی وەك دەنگی فڕۆکە لە گوڵێکی شینی ئاڵەتی کێوییەوە بۆ سەر گوڵێکی دیکە لە هاتوچۆدا بوو. پەپوولەیەکی شینی گەورەی بەقەد چۆلەکەیەك کە خاڵی گەورە گەورەی لە لەش دا بوون لەسەر چڵە کەرتەشێیەك بە ئارامی باڵی لێك دەدان. مێروولە زەردکە بە لاسکە قامیشێك دا کە گەڵاکانی زەرد هەڵگەڕابوون و سەرەوەکەی گەزۆ لێی دابوو، بەرەو گەزۆیەکە دەچوونە سەر. جاڵجاڵۆکەیەکی زەردی گەورە لە سووچی ئەو داوە کە بە پانایی میترێك لە نێوان دوو چڵە زی دا تەنیبووی بۆ نێچیر لە بۆسەدا بوو. داوەکەی مێشوولەیەکی پێوە نەبوو، لەوانەبوو تازەی داوەکە تەنیبێ، لەوانەش بوو هەرچیی پێوە بووبێ دەسبەجێ خواردبێتی. سەیران هەر لەوێ ڕاوەستا. مێشوولەیەك بەداوەکەوە ببوو، مێشوولەیەکی سپیی چووکەڵە. جاڵجاڵۆکەی زەردو گەورەی وەحشی وەك بریسکە لە سووچی داوەکە هاتەدەرو غاری دایە سەر مێشوولەکە. لە چاولێك نانێك دا پڕی دایەو گەڕایەوە جێی خۆی. مێشوولە چووکەڵەکە ون ببوو... وردە وردە وەڕێ کەوت. قالۆچەکان ئەو گرمووڵانەی وەپێش خۆیان دابوون، بەنێو تۆزوخۆڵ دا بەرەژوورییان دەبردن. کە لەوان تێپەڕی تووشی باڵندەیەکی چووکەڵەی زۆر زەرد بوو کە سەرێکی شینی هەبوو. باڵندەکە پاش ئەوەی سێ جار سووڕا ـ وا وێ دەچوو کە بە دەوری وی دا دەسووڕێ ـ لێی دا ڕۆیشت. دەنگی ناسکی باڵەکانی لەگوێی سەیران دا مابوو. باڵندەکە لە پێش وییەوە دەفڕی، لەسەر دڕوویەك هەڵدەنیشت و کە ئەو نیزیك دەبووەوە هەڵدەفڕی و کەمێك بەولاوەتر لەسەر چڵێکی دیکە دەنیشتەوە، لە دوورەوە گێژەڵووکەیەکی زۆر بڵند هات، بە تەندوورەزەنەو سووڕان تۆزوخۆڵی بڵاو دەکردەوە... باڵندەکە ماوەیەك لەنێو تۆزوخۆڵ دا ون بوو. سەیران چاوی پێی کەوت و لەپڕ لەبەر چاوی ون بوو. کەمێك دواتر گێژەڵووکەکە هات و ئەویشی قووت داو بەرەو شارۆچکە وەڕێ کەوت و لە قەراخی چۆمەکە نیشتەوە. سەیران کە باڵندەکەی لێ دیار نەبوو، شتێکی وەك تاڵی، شتێکی تاڵ و بەژان و دڵتەزێن وەك ژەهری نیشتە سەر دڵ. بەڵام چەند لەحزە دواتر باڵندەکە هاتەوە ڕاست ڕووبەڕووی وی لە حاڵێك دا بەسپایی باڵی لێك دەدان دەستی بەفڕین کرد.

سەیران دووبارە بەرەو شارۆچکە گەڕایەوە, ئەگەر حەمەدۆکیان کوشتبێ چما ئەمڕۆ تا سبەینێ, سبەینێ تا دووسبەی جەنازەکەی نابینێ؟ تاوێك دواتر لەسەر لێوی رووبار دانیشتبوو, خەریك بوو کەوشەکانی دادەکەند. هەستایە سەرێ و پەڕیەوە ئەوبەر. باڵندەکەش لەگەڵی دەفڕی. لەوبەری ماوەیەك راوەستاو تێ‌ما. دووبارە لەگەڵ باڵندەکە گەڕایەوە دواوە, دیسان تاوێك راوەستاو دووبارە بای‌دایەوە.

ئەو رۆژە کەسانێکی بەوێ دا دەڕۆیشتن, ژنێکی باریکەڵەی, کەڵەگەتی رەش ئەسمەری چاوڕەشیان دەدی کەلەگەڵ باڵندەیەکی چووکەڵەی زەردی سەرشین هەتا خۆر ئاوا بوو بێ راوەستان لەو چۆمە ئەم بەر ئەوبەریان کرد, ئەمەیان دەدی و زۆریان پێ سەیر بوو, بەڵام نەیان دەتوانی لێکی بدەنەوە کە بۆ وایە.

کاتێك هەتاو رەنگی ئاوێی سوور هەڵدەگێڕا سەیران لە نەکاو وێنەی روخساری خۆی لەنێو ئاوەکەدا دی و باڵندەکەش لەلای راستی سەری لە حاڵێك دا باڵە چووکەڵەکانی لێك دەدان لە فڕین دا بوو. لەو باڵندە زەردە چووکەڵەی لەلای بوو پرسی: ئەگەر ئەویان کوشتبێ جەنازەکەی دەبینم, وانیە باڵندەی چووکەڵە؟ باڵندەکە دەنگێکی لە باڵەکانی هێنا.

بەرەو شارۆچکە غاریان دا. سەیران شوێنی خانووبەرەی فەرماندەریی جەندرمەی پێ‌دەزانی. بێ‌ئەوەی لە کۆڵانان دا وەخت بەفیڕۆ بدا خۆی گەیاندە وێ. لەم دیوی دیواری جەندرمە حەشیمەتێکی وای لێ نەبوو, هێندێك منداڵ, دەورووبەری سی چل ژن بە چارشێوی سپی‌یەوەو حەوت هەشت پیاوی لێ ریز ببوون و بەچاوی خەماوی‌یەوە بێ‌ئەوەی قسەیەك بکەن تەماشای جەنازەی چەتەکانیان دەکرد کە لەبن دیواری مەخفەر پشتیان بە دیوارەوە درابوو. هەموویان حەپەسابوون و چاویان لە مردووەکان هەڵنەدەگوازت. سەیرانیش هات و لەبەر دەرکی حەوشەی راوەستا. باڵندەکە چوو لەسەر یەکێك لە بەردە مەڕمەڕە کۆنەکان نیشت و دەستی بە جیکەجیك کرد. بۆگەنی کەلاکەکان کە بەری لووتی بنیادەمی دەگرت, دنیای پڕ کردبوو, هەموو شارۆچکە بە خاك و بەردو دانیشتووانیەوە بۆنی گرتبوو.

سەیران بە هیچ جۆر نەی‌دەتوانی لە جێی خۆی ببزوێ, چاوەکانیی توند داپچڕیبوون و هەوڵی دەدا لەو جێ‌یەوە کە لێی راوەستابوو جەنازەی حەمەدۆك بناسێتەوە. نەی‌دەوێرا بچێ لە نیزیکەوە جەنازەکان ببینێ. زەمان دەگوزەرا, ئەو باڵندە زەردە کە لەسەر بەردەکە هەڵنیشتبوو, هەڵدەستاو دەنیشتەوە. دەنگە دەنگی دەکردو سەیران بە هیچ جۆر نەی‌دەتوانی لە جێی خۆی ببزوێ. باڵندەکە دیسان هات و لە دەوری سەری دەستی کرد بە سووڕان, ئەوەندە نیزیك کە خەریك بوو باڵەکانی لە گوێ و لووتی بدرێن.

باڵندەکە رۆیشت و دیسان لەسەر بەردە مەڕمەڕەکە نیشتەوە. نە جیکەی دەکردو نە باڵی دەکردنەوە. لەسەر سەری ئەو ژنە کە لەسەر بەردەکە کێشرابووەوە بە چاوەنۆڕی هەڵنیشتبوو. ئاخرەکەی سەیران هێدی هێدی بە بەژنێکی قیت و نێوچاوانێکی گرژەوە لە دەرکی حەوشەی چووە ژوورێ و بۆ لای

جەنازەکان چوو. بە پەنای ئەو بەردەدا ڕۆیشت کە باڵندەکەی لەسەر نیشتبوو, وێنەی ژنەکەی لەسەر بەردەکە دی. وێنەی ژنەکە لەگەڵ خۆی بە موو فەرقی نەبوو. لووتی وەك لووتی خۆی ڕاست بوو و چەنەگەی وەك چەنەگەی خۆی قووڵ. کە لە جەنازەکان نیزیك بووەوە ڕاوەستا. جەندرمەی ئێشك گر خەریك بوو پێی بڵێ: لێرە چ دەکەی, قەدەخەیە. بەڵام کە ڕوخساری سەیرانێی دی قسەکان لە زاری دا بەند کران. هیچی نەگوت و لە جێی خۆی ڕاوەستا. کەمێکی دیکە نیزیکتر کەوتەوە. پاش ئەوەی خێرا چاوی بە جەنازەکان دا گێڕا, ڕوخساری لە خۆشیەیان گەشایەوە. دەستی کرد بە زەردەخەنە. خۆشحاڵیی وی تەنیەوە بۆ ئەو جەندرمەیەش کە لەوێ وێستابوو, ئەویش لەگەڵی پێکەنی.

سەیران وەختێك جەنازەکانی بەجێ دەهێشت لە شەرمی پێکەنینەکەی خۆی بە شەرمەوە زەردەی دەهاتێ. ئەو منداڵانەی بە ڕیز لەسەر دیوارەکە دانیشتبوون, بە دیتنی ڕوخساری شەرمێونی بە دەمیەوە پێکەنین, ژنان و پیاوانی بەساڵداچووش... یەکێك لە ژنەکان پرسی:

"خوشکێ گیان, خوشکێ گیان, ئی تۆیان لەنێو دا نەبوو, زۆریان بۆن کردوە".

سەیران چاوە درشت و ڕەشەکانی خۆی کە لە نێو بڵێسەی شادمانی دا گڕیان گرتبوو بە خۆشەویستیەوە بۆ لای ژنەکە وەرگێڕاو گوتی:

"نا پوورێ, دەبەرت مرم, ئی منیان لەنێو دا نیە, سوپاس بۆ خوا لەگەڵیان نیە, زۆریشیان بۆن کردوە".

ئەژنۆکانی کە دەلەرزین قورسایی لەشیەیان ڕانەدەگرت, هەر لەوێ دانیشت و فرمێسکی شادی لە چاوانی هەڵەڕژا. ژنان کۆزیلکەیان لە دەوری بەست. دەیان گوت:

"بگری کچم, بگری, لە جیاتی ئەوەی لە تازیەی مردوو دا بگریەی, لە خۆشحاڵیەیان بۆ زیندوو بگری... گریان چارەنووسی ژنانە... زۆریان بۆن کردوە".

باڵندە زەردەکە لە ژوور سەریان دەفڕی و لەو سەرەوە خەرمانەی زەردی زێڕینی دەکێشانەوە. سەیران هەستایە سەرپێ. چاوەکانیی بە لکی دەسماڵەکەی پاك کردنەوە:

"خواحافیز دایکینە, خوشکینە, براینە".

لە حاڵێك دا شادمان و بەختیار لەگەڵ خۆی دەدوا بەرەو دێ وەڕێ کەوت. هەتاو خەریك بوو ئاوابێ, باڵندە چووکەڵەکە جار جار دەهات و لە پێش وی لەسەر چڵە دڕکێك دەنیشت و کە لێی نیزیك دەکەوتەوە هەڵدەفڕی. هێندێ جاریش چەند دەقیقەیەك لە ژوور سەری چەرخی دەدان... و دەنگی باڵە ناسکەکانی لە گوێی سەیرانێ دا...

"باڵندەی چووکەڵە, باڵندەی چووکەڵە, سەیران بە قوربانی تۆش بێ باڵندەی چووکەڵە".

## (٩)

لەپێش دا باب و دایکی ئەو چەتەیە هاتن کە تازە سمێڵی بۆر ببوون. دایك بە دیتنی تەرمی کوڕەکەی زیراندی و چوو خۆی بەسەردا دا. باوك بێدەنگ بوو, خوێن لە دەمارەکانی دا مەیبوو, بە روخساری زەردەوە رەق رامابوو, و بە چاوێکی بێتیشکەوە تەماشای خێزانیی دەکرد. جەندرمەکان بەزەحمەت دایکیان لەسەر کوڕەکەی هەڵپچڕی. ئەوان کەمێك لەولای جەنازەی حەمەدۆك لەبن دیوار دانیشتن. دەت گوت خوێن لە رەگی دایکەکەدا بەستوویەتی. ئەویش بێدەنگ و بێقسە رامابوو.

جەندرمە باوکەکەیان لەگەڵ خۆیان بردە لای یاوەر. لە ژوورەکەی تەنیشتێ وەکیل باشی عاصم پرسیاری لێدەکردو جەندرمەیەکیش تایپی دەکرد.

ئەو لاوە کە تازە خەتی دابوو, پاڵەوان دراوسێی دیوار بە دیواری خۆیانی کوشتبوو.

پاڵەوان گاجوتەکانی خۆی لە دەغڵ و دانی وان کردبوو. پاڵەوان یەکێك لە شەرفرۆشەکانی تاوایی بوو. لە دێی دا لە هەموو کەسی دەدا, جنێوی پێدەدان و سووکایەتیی پێ دەکردن. هەموو خەڵکی دێی چاوترسێن کردبوو. تەنانەت چەند مانگ پێش کوژرانی لە نێوەڕاستی دێ و لەبەر چاوی کوڕەکە ئەوەندەی لە دایکی دا کە خوێن بە تفنکانی دا هاتە خوار. کەسیش نەیتوانی پێشی بگرێ. پاش ئەم رووداوە کوڕیژگەکە کە تازە خەتی دابوو، گۆشەنشین بوو، نەچووە نێو خەڵکی و شەرمی لە هەموو شتێك و هەموو کەس دەکردو لە خەوو خواردن کەوت. تەنانەت پاش ئەو رۆژە سەری هەڵنەبڕی تەماشای روخساری دایکیشی بکا.

لە زۆر ساڵ پێشترەوە لە ماڵێدا دەمانچەیەکیان هەبوو. کوڕیژگە دەمانچەکەی بردو لە دووری دێی تاقیی کردەوە. گوللەی دەمانچەکە نەستوور بوون، بە جۆرێك کە قەدە داریان کون

دەکرد و لێیدیوەودەر دەبوون. دەمانچەیەکی تۆپگەری گەورە بوو کە پێیان دەگوت دەمانچەی قەرەداغی. لاوەکە ئیدی تەنانەت لەحزەیەکیش دەمانچەکەی لە خۆی دوور نەخستەوە.

گاجووتەکانی پاڵەوان هەموو رۆژێ لە کەردو کێلی وان دا دەهاتن و دەچوون و لاویژگەکەش کە تازە سمێڵی بۆر ببوون گاجووتەکانی پاڵەوانی لە مەزراکەیان دەرکرد:

"ئەتۆ بە چ هەقێك گاجووتەکانم لە کێڵگە دەردەکەی، چما نازانی گاجووتی من ئازادن؟ سبەینێ ئەسپ و ئێسترەکانیش دەنێرمە کێڵگەی تۆ".

دەڵێن لاویژگە قسە بە پاڵەوان دەڵێ و پاڵەوانیش دەیگرێ، لە زەویی هەڵدەبرێو بە عەرزیدا دەداو بە پێلەقە وەردەگەڕێتە گیانی، بەڵام لاویژگە دەمانچەکەی کە لە باخەڵی دا دەبێ، هەڵناکێشێ.

رۆژی دواتریش دیسان ئەسپ و گاجووت و وەڵاغەکان لە کەردو کێڵەکەیان دەکرێن، ئەگەر هەروا چووبایە پێش, کەردوکێڵەکەیان بە جارێك لە بەین دەچووو ئەوان نەیان دەتوانی دەنکە گەنمێکیش لە مەزراکە هەڵگرن.

چوونە لای کەیخواو ریش سپییانی ئاوەدانی، بەڵام کەس نەیتوانی پێشی گاجووتەکانی پاڵەوان بگرێ. حەیوانەکان هەموو رۆژێ لە مەزراکە دەکران، لاویژگەکەش هەموو رۆژێ دەچوو دەریان کاو هەموو رۆژێ شل و کوت دارکاری دەکرا.

بەیانیی یەکێك لە رۆژەکانی جێژن بوو، هەمووان جلکی پاك و خاوێنیان لەبەر کردبوون و لە مەیدانە چووکەڵەکەی ئاوەدانی کۆببوونەوە.

لاویژگەکەش خۆی رێك و پێك کردبوو, زیاتر وەك منداڵێك دەچوو هەتا لاوێکی باڵق و پێگەیشتوو.

لاویژگە بەرامبەر بە حەشیمەتەکە راوەستاو پاش ئەوەی تەماشایەکی کردن گوتی: گوێبگرە پاڵەوانی ژن حیز، سەگی ترسەنۆك..."

لاویژگە ئەم قسانەی بە پێکەنینەوە کرد.

پاڵەوان بە رِق هەستاوی لە نێو حەشیمەتەکەرا بۆی چوو. لاویژگە لەسەرەخۆ دەمانچەکەی هەڵکێشا، لەسەرەخۆ بێئەوەی دەستی بلەرزێ سێرەی لێگرت و دەستی لێکێشا. پاڵەوان بە سەرمەقولات لە حەواو لەبەر پێیویدا لەسەر زەوی تخێڵ بوو. کورەکە دیسان بە ئارامی هەرچی گوللە لە دەمانچەکەیدا بوو هەمووی لە پاڵەوان دان. جەستەی پاڵەوان لە گەڵ هەر گوللەیەك کە لێی دەدرا بڵیند دەبوو و دەکەوتەوە.

ئەمجار منداڵەکە رووی کردە حەشیمەت و گوتی:

"لێم ببوورن کە جێژنە پیرۆزەکەتانم خوێناوی کرد. گەردنم ئازاکەن، ئەمن دەڕۆم". ئیدی لێیدا رۆیشت. نە کەس وەدوای کەوت بیگرێ و نە کەسیش قسەیەکی کرد.

پاش ئەوە خەبەر هات کە وەکێوی کەوتوەو چووەتە نێو داروودەستەی وەسمانە رەش.

باوك هەروا بە راماوی و خوێن وەستاوی وەك ئەوانەی لە خەودا دەڕۆن لە پلیکانەکانی مەخفەر هاتە خوار. جەنازەکەی لە کۆڵێ کرد و بردیە کن عارەبانەیەك کە لەبەر دەرگا راگیرابوو. پاشان گەڕایەوەو دایکەی برد لە عارەبانەکەدا لە پەنا کوڕەکەی دانا. لە جووتیارەکانی دەشتێ بوون. ئەسپەکانی وەبەر قەمچی دا. هێشتا ئەوان نەڕۆیشتبوون کە حەشیمەتێك لە جووتیاران پیاوو ژن حەوشەی جەندرمەیان پڕکرد. هاتبوون سێهەمین جەنازەی لای چەپ کە روخسارێکی تاوەسووتی هەبوو، بەرنەوە. ناوی ئەو چەتەیە ئەوکەش بوو راست سی ساڵ دەبوو لە چیاو بەندەنان بوو، لە پازدە ساڵییەوە چەتەیی دەکرد. لەو پارەیەی دەستی دەکەوت، هێندێکی دەدا بە جووتیارەکانی ناوچەی خۆی. ئەو کەسی نەکوشتبوو، بەڵام تاوانێکی وەئەستۆی خۆی گرت کە ئاغاکەی کردبووی. ئەم کەسەش کە ئەو ئاغایە کوشتبووی، بۆخۆی ئاغا بووو لەگەڵ پیاوکوژەکە وەك برا بوون. ئاغا کوژراوەکە خزم و کەس و کارێکی زۆری هەبوو. ئەگەر ئەوکەش تەنیا یەك مانگ لە بەندیخانە مابایە، گومانی تێدانەبوو کە کەس و کاری کوژراوەکە دەیان کوشتەوە، وادیاربوو هەر بە کۆمەگی ئەو ئاغایەش کە تاوانەکەی بۆ وەئەستۆی خۆی گرتبوو، توانیبووی لە بەندیخانە رابکا. لە چیای نەبا لە هیچ جێیەك نەیدەتوانی بمێنێ. دوژمنەکانی ئەوەندەیان دەست دەرۆیشت کە لەهەر کوێ دەستیان کەوتبایە دەیان توانی بیکوژن.

سی ساڵی رەبەق بە رۆیشتن لە دەستەیەکەوە بۆ دەستەیەك و هەڵاتن لە چیایەکەوە بۆ چیایەکی دیکە توانی لە دەستیان لە ئەمان دابێ. هەر کە چووە چیا ناوی خۆی گۆڕی و لەگەڵ تەقیلەی سووری لەسەر ناو ناوێکی تازەی پەیدا کرد، بوو بە پیاوێکی دیکە. بە گۆڕینی هەر دەستەیەك و بە رۆیشتن لە کێوێکەوە بۆ کێوێك ناوی خۆشی دەگۆڕی.

یەکێك لە جووتیارەکان وەسەرکەوت و بە وەکیل باشی عاصمی گوت کە دەیانەوێ ئەو جەنازەیە وەرگرنەوە.

جەندرمەکان چەکی مردووەکەیان هەڵگرت و ئەوکەشیان دایەوە بە جووتیارەکان. پاش وانیش نۆبووکێك هات. هەژدە ساڵە دیار بوو. گەردن کێل و چاوئاسك. جلی جوانی لەبەر

کردبوون، ملوانکەیەکی زێڕی لە مل دا بوو کە دەگەیشتە سەر نێوکێی، هەر هەودایەکی پێنج لیرەیی‌یەکی زێڕی پێوە هەڵواسرابوو. ژنێکی جوان بوو بە مژوڵێکی هەڵگەڕاوەوە. وەزعێکی هەبوو کە نەختێك خەفەتباری و سووکە زەردەخەنەیەکی تێکەڵ کردبوو. ژنە هات و رووبەرووی دووهەمین جەنازە لە لای چەپەوە کە لە پەنای حەمەدۆك بوو، راوەستا. تاوێك سەیری جەنازەکەی کرد کە دەت گوت چووەتە خەوێکی سەیرەوەو سەری بەسەر سنگی دا لار بووەتەوە. گۆڕانێك لە هێڵی نێوچاوانی دا دیار نەبوو. ئەگەر جەندرمەکان لەگەڵ خۆیان نەبردایە لای وەکیل باشی‌عاصم هەروا لەوێ رادەوەستاو تەماشای جەنازەکەی دەکرد.

ژنە چاو جوانەکە پاش ئەوەی لە لای فەرماندەرڕا هاتەوە دووبارە هات و بەرامبەر بە مردووەکە چەقی و بێ ئەوەی چاو بتروکێنێ تێیەوە ڕاما. ئەم چەتەیە ناوی کەریم بوو. لە خاکی پڕ پیت و بەرەکەتی ئاناوارزادا مەزرایەکی گەورەی هەبوو. کوڕی خاوەنی مەزراکەی جیرانی لە نێو بێشەیەك بە زۆر دەستی بۆ نامووسی ژنەکەی درێژ کرد. کەریمیش کابرای گرت، بردیە قەڵای ئاناوارزا دەست و لاقی بەستن و پاش سێ رۆژ جەزرەبە کوشتی.

ترۆمبێلی هەمزەدایی لە دەرێ چاوەڕێ بوو. دوو کەس هاتن، کەریمیان هەڵگرت و بردیانە نێو ترۆمبێلەکە. لەسەر کورسیی پشتەوە دایان نا. ژنە چاوجوانەکەش لە پێشەوە لە پەنای هەمزەدایی دانیشت. مردووەکە هەڵمسابوو، بۆگەنێکی قورسی لێ‌دەهات.

دوانیوەڕۆ بوو، لای ئێوارێ، شەش پیاو بە سواری هاتن. هەر شەشیان چاکەتی نوێی ڕەنگ سورمەیی‌یان لەبەردا بوو، چەکمەی رەشی چین داریان لە پێ‌دا بووو پانتۆڵی گالیفەی سواری‌یان لە قوماشی چاکەتەکە لەبەر کردبوو. هەمووشیان کڵاوی فووتێریان لەسەر بوو. سمێڵی هیچ کامێکیشیان بە موو لەگەڵ ئەوانی دیکە فەرقی نەبوو, سمێڵێکی درێژ کە بە شێوەیەکی تایبەتی بایان دابوون. هاتن و بەرامبەر بە حەمەدۆك راوەستان و یەك بە یەك داهاتنەوە, تەماشای روخساری وی‌یان کرد.

لە دەرێ لەودیو حەوشەی لە منداڵان بەولاوە کەس دیار نەبوو, منداڵەکانیش وەك باڵندە بەڕیز لەسەر دیوارەکە هەڵنیشتبوون و بە چاوێکی تامەزرۆوە تەماشای ئەو کەسانەیان دەکرد کە هاتبوون چەتەکان وەرگرنەوە.

یەکێکیان گوتی:

"لە پێش حەمەدۆك راوەستاون, ئەمانە خزمی حەمەدۆکن".

ئاشق مستەفا خێل کە لەوانی دیکە بەتەمەنتر بوو, گوتی:

"نا, حەمەدۆك کەس و کارێکی نیە. ئەو تەنیا دایکێکی هەبوو کە ئەویش عەبدیخان کوشتی".

"درۆزن".

"درۆی چی؟ ئێمە پارەکە بە هەوار چووبووینە گوندەکەی وان".

"وست, بڕوانە, ئەوان لە پێش حەمەدۆك راوەستاون. داهاتوونەوەو تەماشای دەکەن. ئەگەر حەمەدۆك کەس و کارێکی نیە, ئەدی ئەوانە چ کارەن؟".

ئاشق مستەفا وەلامی دایەوە:

"برادەرنی".

شەش پیاوە سورمەیی لەبەرەکە هەموویان پێکەوە چوونە سەرێ بۆ لای یاوەرو گوتیان:"ئێمە هاتووین جەنابی یاوەر".

"هاتوون بەخێر بێن, چتان دەوێ؟".

"هاتووین جەنازەی براکەمان بەرینەوە".

"زۆر باشە, بچن وەری بگرنەوە, پێشتر لەگەڵ وەکیل باشی عاصم قسە بکەن". رووی کردە ژوورەکەی تەنیشتی و هاواری کرد:"وەکیل باشی عاصم, خاوەنی چەتەیەکی دیکەش پەیدا بوو. خەریکە لە دەستیان رزگار دەبین".

یاوەر شەش پیاوە سورمەیی لەبەرەکەی ناردە لای وەکیل باشی عاصم.

"براکەتان کێیە".

"وەسمانە ڕەش".

"کامەیانە؟".

"ئەوەی پێشەوە, ئەوەی تەنیا ژێرکراس و تنۆکەی لەبەردان".

"ئەوانی دیکە هەموان جلیان لەبەردان. ئەوەی ئێمە بۆچی وا نیوەڕووتە؟".

"وەختێك کوشتتان ئاوا بوو؟".

"تەنانەت چەکیشی پێ نەبوو؟".

"هەر ئاوا سەرڕووت و پێخواس بوو؟".

"ئەو پیاوەی دەڵێن, ئەو پیاوە بەهەیکەلەی لە خوارێیە؟ ئەوە وەسمانەڕەش نیە".

"ئەدی کێیە؟".

"حەمەدۆك؟".

براکانی چەتە کوژراوەکە توورە بوون:

"وەسمانەڕەشی برامان چۆن بوو بە حەمەدۆك؟".

"چۆن و مۆنی ناوێ. خەڵکی پێنج دێیان دیویانەو هەمووشیان گوتوویانە حەمەدۆکە".

"بەگم، وەکیل باشی وەسمانەڕەشی برامان چۆن دەتوانێ حەمەدۆك بێ؟".

وەکیل باشی لە پشت مێزەکەی دەرپەڕی. بە چەند شەقاو خۆی گەیاندە رووبەڕووی یاوەر. خەبەردار راوەستا، نەیدەزانی مەسەلەکەی چۆن لەگەڵ باس بکا. دەنکە تارەق وەك زەنگیانە کەوتبوونە سەر نێوچاوانی.

"چیە، چ بووە، وەکیل باشی؟".

"ئەمانە حەمەدۆکیان دەوێ".

"ئەمانە چیی حەمەدۆکن؟".

"براینی".

"پەنا بەخوا، وەکیل باشی، حەمەدۆك کەس و کاری نەبوو هەتا ئەمانە برای بن".

"حەمەدۆك، حەمەدۆك نیە جەنابی یاوەر".

یاوەر دەرپەڕی:

"ئەدی کێیە؟".

وەکیل باشی عاصم بانگی براکانی ـ کە لە ژووری چاوەڕوانی دانیشتبوون ـ کرد:"وەرنە ئێرە. ـ دەنگەکەی زۆر زبر بوو ـ ئێوە جەنازەی کێتان دەوێ؟".

"جەنازەی براکەمان، وەسمانەڕەش... هۆوەتا، لەو خوارەی، بە تنۆکەوە...".

یاوەر هاواری کرد:

"مومکین نیە".

برا گەورەکە گوتی:

"مومکینە، چونکە ئەو وەسمانەڕەشی برامانە".

"ئیمکانی نیە، ئەو لە کوێ وەسمانەڕەشە، ئەو حەمەدۆکە".

"چۆن ئیمکانی نیە جەنابی یاوەر، مومکینە پیاو برای خۆی نەناسێتەوە؟ ئێمە جەنازەی حەمەدۆکمان بۆ چیە، نە دیومانەو نە دەیناسین".

یاوەر دیسان نەڕاندی:

"مەعلووم نابێ، ئێوە خەڵکی کوێن؟".

برا گەورەکە گوتی:

"خەڵکی دێیەکی زۆر دوورین، لەبن چیای دوڵدوڵ، لەکێوپارەی مریەم جیل".

"وەکیل باشی عاصم ئەم کارە فێڵێکی تێدا هەیە. دەیانەوێ بە ناوی وەسمانەڕەش حەمەدۆکی وەربگرنەوە. لەو کێوانە دەیانەوێ کەڵەکێك ساز بکەن. چما هەموو ئەوانەی لە شارو لادێ ئەویان دەناسی نەیان گوت حەمەدۆکە؟".

"بەڵێ جەنابی یاوەر، گوتیان".

"چما ژنان شیوەنیان بۆ نەکرد، ئاخ حەمەدۆك... ئۆخ حەمەدۆك...".

"بۆچی".

"فێڵ و تەڵەکەیەك لە گۆڕێ دایە".

یاوەر ئاوڕی دایەوە سەر شەش براکەو لە کاتێك دا لاقی بە زەوی دا دەدا زۆر بە تووڕەیی گوتی:

"هەمووتان بە تاوانی کەڵەکبازی و درۆ دەخەمە بەندیخانەوە".

"ئەم قسانە مەکە یاوەر، ئەتۆش خەنجەر لە برینمان مەدە، خوێ بە برینمان دا مەکە. برایەکی وەك کێوی ئوحودمان لە دەست چوو. بەڕاستی لەسەر هیچ و خۆڕاییش...".

"ئەم پیاوە ناتوانێ برای ئێوە بێ، ئەو حەمەدۆکە".

"چۆن دەگونجێ جەنابی یاوەر، ئێمە حەوت براین. هەموو تووڕووس و مەرعەش و گوێك سوون و ئاندرین ئێمە دەناسن، هەر حەوتمان وەك یەك دەچین، جوان تەماشامان کە، لە سەرانسەری تووڕووس پێمان دەڵێن حەوت براله. حەز دەکەی وەرە خوارێ لە تەنیشت جەنازەی عوسمانی ریز دەبین، بزانە هەرچەند ئەو مردوە قەڵافەتی لەگەڵ ئێمە بە مووی فەرق نیە".

"ناکرێ، بۆنیان کردوە".

"دەکرێ جەنابی یاوەر، ئەو وەسمانی برامانە، برای دایك و بابی. حەز دەکەی وەرە پێناسەکانمان ببینە، ئەمە هی منە، ئەمەش هی وەسمان. ئەمانەش هی براکانی دیکەم. بڕوانە وەسمان وێنەشی بە پێناسەکەوە هەیە، بڕۆ خوارێ وێنەکەی لەگەڵ مردووەکە بەراورد کە، بڕۆ بزانە وەسمانە یان نا. با بۆنی کردبێ. ئەو برای ئێمەیە".

یاوەر بە قینەوە چووە خوارێ، چاوێکی لە وێنەی پێناسەکە کردو چاوێکیش لە مردووەکە، چونکە وێنەکە تازە بوو، شێوەی مردووەکە لەگەڵ وێنەکە چیی وای فەرق نەکردبوو. یاوەر لە حاڵێك دا لە پلیکانەکان وەسەر دەکەوت، دووپاتی دەکردەوە: نابێ، نابێ.

"دیتت جەنابی یاوەر".

یاوەر بە تووڕەیی جوابی دایەوە:

"دیتم، ئێوە بەم فێڵە دەتانەوێ جەنازەی حەمەدۆکمان لێ وەرگرنەوە".

"ئێمە جەنازەی حەمەدۆکمان بۆ چیە؟ حەمەدۆک کەس و کاری مە نیە، خزمی مە نیە".

"ئەمن چووزانم دەتانەوێ چ بکەن، ئەمن جەنازەی حەمەدۆک بە ناوی وەسمانڕەش نادەمەوە بە ئێوە".

"جەنازەکەمان وێ دەوە، با ناوی حەمەدۆک بێ".

"دەبێ ئیسباتی بکەن کە خزمی حەمەدۆکن".

"ئێمە چۆنی ئیسبات بکەین، ئێمە خزمی حەمەدۆک نین. ئێمە تەنانەت نازانین دێیەکەشیان لەکوێیە، تەنیا ناویمان بیستوە".

"نای دەمەوە".

"ئێستا ئەم جەنازەیە لەوێیە، دەبێ هەروا لەبن دیواری جەندرمە بڕزێ. هەر لە ئێستاشەوە ماسیوە، وەك دەهۆڵی لێهاتوە، بۆنیشی کردوە... مردووتان بۆ چیە؟".

"ئەمەیان پێوەندیی بە تۆوە نیە".

"سبەینێ و دوو سبەی لەبەر بۆنێ بنیادەم لەم شارەدا بەند نابێ، تەنانەت لە ئێستاوەش..."

"ئەوە پێوەندیی بە تۆوە نیە".

"جەنابی یاوەر، ئێمە هەقی خۆمان وەردەگرین، هەر کارێك پێویست بێ بۆ جەنازەی براکەمان دەیکەم، نایەڵم بێ کفن و دفن بێ. ئێمە حەوت برا بووین، بووینە شەش. دەمرین، بەڵام جەنازەی براکەمان وەردەگرینەوە. ئەگەر ئێمە بێ وەسمان بچینەوە ماڵێ باب و دایکمان لە خەفەتان دەمرن".

یاوەر زۆریش پیاوێکی لەسەرەخۆ نەبوو، کە حەوسەلەی هەبێ گوێ بۆ قسەکانیان راگرێ. ئەو کەسانی وەك وان کەللەشەق و بێئەدەبی رادەخست و ئەوەندەی دارکاری دەکردن کە ئەو شیرەی لە مەمکی دایکیانیان خواردبوو بە کونەتفنگکانیان دا دەهاتەوە خوارو لەوە کە لەدایك بوون پەژیوان دەبوونەوە. بەڵام یەك، لە سەرو سیمایان سام گرتبووی و دووهەم، قسەکردنیان وەك دێهاتی و مێهاتیان نەدەچوو. زنجیر سەعاتی هەر کامێکیان کە لە گیرفانێکی جلیقەکەیانەوە بە گیرفانەکەی دیکە هەڵواسرابوو، لەوانەبوو پرِی هەردوو چنگی بنیادەم ببێ. دیار بوو ئەمانە لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەندن.

سێهەمیش لە دڵی یاوەر دا ئاگرێکی کزی گومان و دوودڵی هەڵبوو. ئەو جەنازەیە پیاوێکی بەخۆوە بوو وەك قەدی سنۆبەر, وەك دەشیان گوت حەمەدۆك پیاوێکی ریوەڵە بوو, شتێکی وەك رەگە گیا. بەڵام خەڵکی گەڵی شکۆفە کە ئەویان ناسیبووەوە... ئەوان دەڵێن چی, چ پێویست بوو بڵێن ئەو پیاوە حەمەدۆکەو شیوەنی بۆ بکەن؟ ئەگەر ئەم پیاوە حەمەدۆك نیە... هەموو خەڵکی تورکیە ئاگادار بوون کە حەمەدۆك مردوە, خەبەری مەرگی وی تەنانەت رۆژنامەکانیش بە درێژی و بە وێنەوە چاپیان کردوە. لە دڵی خۆی دا گوتی: نا ئەم پیاوە لە حەمەدۆك بەو لاوە ناتوانێ کەسی دیکە بێ.

بانگی وەکیل باشی عاصم و سەرجووخە عەلی کەرتیشی کردو چوونە ژوورەکەی تەنیشتێ و ماوەیەکی زۆر لەو بارەیەوە بیروڕایان گۆڕیەوە. سەرەنجام پاش ئەوەی نەیان توانی بگەنە ئاکامێکی روون لە ژوورەکە هاتنەدەر: ئەمن ناتوانم تەرمی حەمەدۆك بە ناوی وەسمانەڕەش بدەمەوە بە ئێوە, شکایەت لە کوێ دەکەن بیکەن. راوێژی یاوەر زبرو توندو بڕیاردەرانە بوو و براکان کارێکیان لە دەست نەدەهات. سەریان سوڕمابوو. لە کاتێك دا بۆ دیتنەوەی رێگاچارەیەك پێکەوە تەگبیریان دەکرد, چوونە بازار. لە دوکاندارێك ناوونیشانی عەریزەنووسیان پرسیار کرد. ئەویش بە دەست لە شوێنی بازاڕ فەخرییەشێتی نیشان دان و گوتی: خوێن لە نووکی قەڵەمەکەی دەتکێ, ئەو عەریزەیە کە ئەو دەینووسێ, لەسەر بەردو ئاسنی دانێی کونی دەکا, دە وەکیلی دادگاش کۆ بنەوە رێیان ناکەوێ ناوێی لە دەستان بکەن. پیاوێکی ئەوەندە بەشان و شکۆیە. هەر ئەم پیاوە بوو ئەوەندەی عەریزە نووسی هەتا سەری حەمەدۆکی خوارد.

فەخرییەشێت هەر کە لە دوورەوە چاوی کردن, زانی نیازی عەریزەنووسینیان هەیە, لە دوکانەکەی هاتەدەرێ و لەبەر دەرگا پێشوازیی لێکردن. لە کاتێك دا قۆڵی برا گەورەکەی گرتبوو کە لەپێش هەموویانەوە دەڕۆیشت, گوتی: فەرموون, فەرموون, فەرموونە ژوورێ ئەفەندم. وێڕای ئەوە کە کورسییەکی کۆن و شڕو شپرێوی پێ نیشان دەدا, گوتی: زاتی مەبارەکتان لەوێ دابنیشێ.

پیاوەکان ئەوەی بەسەریان هاتبوو بۆیان گێڕایەوەو داوایان لێکرد کە دوو عەریزەیان بۆ بنووسێ یەك بۆ داواکاری گشتی و ئەوی دیکە بۆ قایمەقام. نیازیان هەبوو برووسکەیەکیش بۆ والیی ئەنکەرە لێبدەن. دەقی برووسکەکەش دەبوو ئەو بینووسێ.

فەخرییەفەندی پاش ئەوەی باش گوێی بۆ قسەکانیان راداشت گوتی: جارێ ئێوە چایەك بخۆنەوە. ئێوە لێرە ناشارەزان, هیچ پێویستیی بە عەریزەو شتی وا نیە, لە رەفتاری سەنگینتان ڕا دیارە کە پیاوی جێگەورەو بەنرخن. ئەمن دەبێ کارەکەتان بەبێ عەریزە چارەسەر بکەم...

چایچی!... هەتا ئێوە چایەکەتان دەخۆنەوە ئەمن دێمەوە. ئێوە هیچ نارەحەت مەبن. ئەمن جەنازەی براکەتان لەوان وەردەگرمەوە... حەیف, حەیف, حەیف. پاشان بەغار لەوێ دوور کەوتەوە. وەختی تێپەڕین بە نێو بازاڕ دا لەبیری نەچوو کە چەند دوکاندارێك لە مەسەلەکە تێبگەیەنێ. ئەوەی نەکردبایە دڵی دەتۆقی. وەختێك گەیشتەماڵی مورتەزاغا خەڵکی بازاڕ بە مەسەلەکەیان زانیبوو, و پاش تاوێکی دیکە هەموو خەڵکی شارۆچکەی موو بە موو لە هەموو شتێك خەبەردار دەبوون.

مورتەزاغا گوتی: چ بووە دیسان, چ خەبەرە فەخرییەفەندی؟

فەخرییەفەندی لەسەر قەنەفە دانیشت. توانای قسەکردنی نەبوو. دەمی وەك جووچکە باڵندەیەك هەتا بنانگوێی داپچڕیبوو, و سنگی وەك کوورەی ئاسنگەران هەڵدەمساو دەپووکایەوە. پاش درەنگانێك بەسەر خۆی دا زاڵ بوو, خۆی خڕ کردەوەو گوتی:

"بەدبەختی ئاغا, بەدبەختییەکی گەورە, لەبەین چووین, تا ئێستا مێژوو ئابڕووچوونی وای نەدیوە".

"ئەمن دەترسێنی فەخری؟".

"بترسە ئاغا, بترسە, چەندی بترسی هەقتە, بترسە ئاغا بترسە, بەدبەختییە".

مورتەزاغا لە حاڵێك دا قوڵپی گرتبوو و رایدەتڵەکاند گوتی: زووکە بڵێ بزانم چ بووە.

"شەش برای حەمەدۆك هاتوونە دوکانەکەی من. زنجیر سەعاتی زێڕی هەر کامێکیان کە بە بەرۆکیانەوە هەڵواسراوە کیلۆیەك زیاترە".

"مورتەزاغا بە پێکەنینەوە پرسی:

"حەمەدۆك شەش برای هەبوون؟".

"ئەوەی گوتوویانە حەمەدۆکە, حەمەدۆك نەبووە".

"ئەدی کێ بووە؟".

فەخرییەشێت مەسەلەکەی وەك هەبوو بۆ مورتەزاغا گێڕایەوە.. مورتەزاغا تووشی نیگەرانییەکی گەورە بوو, نەیدەزانی چ بکا. لەنێو ساڵۆنەکەدا سەرو خواری دەکردو لەبەر خۆیەوە دەیبۆڵاند:

"رۆژڕەشی, رۆژڕەشی, رۆژڕەشییەکی گەورە. خەڵکینە, بوومە پووڵەڕەشکەیەك, ئا...خ براکەم عەلییەشەل.

ئا...خ داخوا لەمەودوا دەتوانم بێنم ئا...خ, ئا...خ, ئاخ. عەلییەشەل براڵە, کاك عەلی بم بوورە, کە قەدرو قیمەتی تۆم نەزانی. چما پیاو لەگەڵ براچووکەی خۆی, ئەم جۆرە گاڵتەیە,

ئەم جۆر گاڵتە چووکەڵانە ناکا؟ دەمەویست تاقیت بکەمەوە, چما پیاو نابێ کەسێکی بە برای خۆی دەزانێ و دەیەوێ عومرێك گیان و ماڵ و نامووسی خۆی پێ بسپێرێ, تاقی بکاتەوە؟".

گێژو وێژ و ناگالەخۆڕاو دەوری ساڵۆنەکەی دەداو وەك شێتان لەگەڵ خۆی دەیبۆڵاند. فەخرییەشێت لەنێو قسەکانی وی دا تەنیا ئەوەندە حاڵی دەبوو کە دەیگوت عەلییەشەل, براله عەلییەشەل. هەستایە سەرپێ و گوتی:

"ئاغا, دەسبەجێ دەبێ کارێك بکەین, ئەگەر ئەوانە برووسکە بۆ ئەنکەرە لێبدەن ئێمە هەمووومان, ئەمن, یاوەر هەموو شارۆچکە دەبێتە پووڵە ڕەشکەیەك".

حەسنەخان لەبەر دەرکی یەکێك لە ژوورەکان راوەستابوو و بە مەراقەوە تەماشای مورتەزاغای دەکرد. بە روخسارێکی خەفەتبارەوە چاوەڕوان بوو و نەیدەتوانی شتێك لە مێردەکەی بپرسێ. مورتەزاغا بە دیتنی وی غاری دایە لای:

"ئابروومان چوو, لەبەین چووین, رۆژڕەشی, رۆژڕەشییەکی گەورە, ئەمن ئیدی مردم, ئەی هاوار عەلییەشەل".

خێرا خێرا باسەکەی گێڕایەوە: خانم بلێ عەلییەشەل, عەلییەشەلی برام ببیننەوە, ئەمن دەچمە شارەوانی, چەند کەسێك بنێرە نێو شاری, لە عەرزو عاسمانێ بێ بۆم وەبینەو بیهێنەوە. چەند کەست وەدەست کەوتن بیان نێرە, بۆ نێو شارۆچکە, بۆ چیاکان, بۆ گوندەکان, عەلیی برام ئەگەر چووبێتە کونی مارەوەو لە ژێر باڵی باڵندەدا خۆی شاردبێتەوە دەبێ بۆم وەبینن. ئەمن دەمەویست تاقیی بکەمەوە. چما پیاو برای خۆی تاقی ناکاتەوە؟"

حەسنەخان هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا:

"ئا...خ ئاغا, ئاخ, ئاغای سەرلێشێواو, ئەم سەرلێشێوانەی تۆ...".

"ویستم تاقیی بکەمەوە, دەمەویست براکەم تاقی بکەمەوە".

"پێم وایە تازە قەت چاوت بە چاوی عەلییەشەل ناکەوێتەوە".

مورتەزاغا لە حاڵێك دا دەیگوت: دەیبینمەوە, دەیبینمەوە, چاکەتەکەی کردە بەرو بەرەو پلیکانەکان غاری دا.

"زەوییەکی دەدەمێ لە خوێنی بنیادەمێك بە قیمەت تر, زەوییی پێشکێش دەکەم, چما ئەو برای من نیە, ئەو لە من قەڵس نابێ. ئەتۆ دەسبەجێ پیاوی بە دوو دا بنێرە...".

وەختێك گەیشتنە شارەوانی, قایمەقام, داواکاری گشتی, بازپورس, قازی, سامی تورقوودی مامۆستا, مەلا دۆران ئەفەندی, یاوەر, تاشکەن خەلیل بەگ, زولفۆی دەفتەردارو بە کورتی هەموو

سەرزلەكانى بەسەريەكەوە لەوێ دى. ياوەر جەندرمەى ناردبوون هەموويانى لە شارەوانى كۆ كردبووەوە. باسى مەسەلەكەيان دەكردو بە دواى رێگاچارەيەك دا دەگەڕان تا لەو گێروگرفتە رزگاريان بێ.

جەندرمەيان ناردن شەش براكەشيان هێنان. مەلا دۆران ئەفەندى دەسبەجێ ئەوانى ناسى. بابيان دۆستى زۆر نيزيكى بوو. بە جحێڵى ماوەيەك لە خانوويەك دا كە لە دێ هەيان بوو, لەگەڵ وان ژيابوو. بنەماڵەى حەوت برالە تاقمێكى ئەسپ دز بوون. ئەوان لە زەمانى باب و باپيرانيانەوە ئەسپ دز بوون. لە سوريەو عێراق و خوارتر تەنانەت لە بيابانى يەمەنيش ئەسپيان دەدزين و ئەسپە رەسەنەكانيان بە بولغارستان و يۆنان و ئێران و رووسيا دەفرۆشت. مەلا دۆران ئەفەندى بە جحێڵى لەگەڵ ئەم تاقمەدا ئەسپى دەدزين. هيچ پێويست نەبوو وەسمانەرەش ببێ بە چەتە. ئەگەر پياويشى كوشتبايە, ئەگەر سەد كەسى ئەنجن ئەنجن كردبايە, كاپلان ئاغاى بابيان كە بەڕاستييش پياوێك بوو وەك پڵنگ (كاپلان بە ماناى پڵنگە. وەرگێڕ) كوڕەكەى نەك هەر لە دەستى دادگا, بەڵكوو لە دەستى عيسمەت پاشاش نەجات دەدا.

مەلا دۆران ئەفەندى موو بە موو تيرەو تايەفەى كاپلان ئاغاى بۆ حازران باس كرد. باپيرانى ئەو بنەماڵەيە هەموو ساڵێ ئەسپى رەسەنيان بۆ واليى حەڵەب, پادشاى ئەستەمبوڵ و شێخێ عارەبان بە ديارى دەنارد. ئەم بنەماڵەيە بنەماڵەيەك بوون دەت گوت سوڵتانى چياكانى تووروووسن.

مەسەلەكە بەم جۆرە بوو, دەركەوتبوو كە كابرا حەمەدۆك نيە. چار نەبوو دەبووايە جەنازەكە بدەنەوە بە شەش برايەكە. بەڵام گرنگترين مەسەلە ئەوەبوو جەنازەكەيان چۆن تەسليم بكەنەوە.

مەلا دۆران ئەفەندى گوتى:

"ئەم مەسەلەيە بدەنە دەست من چارەسەرى دەكەم. وەختێك دەهاتم ديتم كوڕو كاڵى شارۆچكەش مەسەلەكەيان بيستوەو بەرەو جەندرمە وەڕێ كەوتوون. بڕۆن تەماشا كەن, رووبەرووى جەندرمە بووەتە مەيدانى حەشر. جەنابان پێشنيارێكم هەيە".

قايمقام گوتى:

"فەرموو ئاغام, دۆران بەگ, دڵمان لێتە".

"ئەم گەنجانە دەبێ برايەكەيان شەوێ لاى بەيانى وەرگرنەوە, وەختێك كە ئەو دەوروبەرە كەسى لێ‌نيە... لە حەسيرێك يان جەواڵێكيەوە پێچن... ئێوەش كارتان بەسەر پاشماوەى مەسەلەكەوە نەبێ. پاشماوەكەى ئەمن جوورى دەكەم".

تاشکەن خەلیل بەگ هەستاو گوتی:

"ئێمە لە جیاتی حەمەدۆك جێژن و شادمانیمان بۆ مەرگی کەسێکی دیکە بەرپا کرد. ئەمەیان چ لـێبکەین؟ بە باوەڕی من رزگاربوون لە ژێر باری ئەم مەسەلەیە زۆر ئەستەمە".

زولفۆی دەفتەردار گوتی: ئەستەمە.

"مەترسن, ئەمن هەموو شتێك چارەسەر دەکەم... دیسانیش حەمەدۆك کوژراوە, بەلام جەنازەکەی ون بووە. ئێوە متمانەتان بە بچووکی خۆتان هەبێ".

"لەگەلّ ئەنکەرەو ئەدەنە چ بکەین؟".

"ئەویش هەر بە من بسپێرن. ئەوان پێیان نەزانیوەو پێشی نازانن کە یەکی دیکە لە جیاتی حەمەدۆك کوژراوە. ئەمەشیان لە ئەستۆی برا بچووکتان".

یاوەر بە شەرمەزارییەوە هەستایە سەرپێ و گوتی:

"برایان, لە هەمووتان سوپاس دەکەم. بەراستی هەلّەیەکی گەورە کرا. ئەگەر حەمەدۆك مابێ و ئەمن ناوم یاوەر فارووق بێ, دەبێ یان جەنازەی من لەنێو بازاڕ دا بکەوێ یان جەنازەی وی".

دۆران ئەفەندی کە لە ژوورەکە وەدەر کەوتبوو, چووە لای شەش برالە کە بە بێفیزی لە یەکێك لە ژوورەکانی شارەوانی دانیشتبوون:

"چاوودلّتان ڕوون کوڕینە, سلاوی من بە بابتان بگەیەنن, ئەمشەو وەرنە مالّی خۆمان, بۆ نانی ئێوارێ لە خزمەتتان دا دەبم, لای بەیانییش بەبێدەنگ براکەتان هەلّدەگرن و دەڕۆن".

براکان لە حالّێك دا یەك بە یەك دەستییان ماچ دەکرد گوتیان: هەر خۆش بی مامەگیان.

مەلادۆران ئەفەندی خۆی پێ رانەگیراو پرسی:

"بەراست کوڕینە, کوڕی پڵنگێکی وەك کاپلان ئاغا بۆ دەبێ چەتەیی بکاو بە گوللەی جەندرمان بکوژرێ؟".

براکان تەماشایەکی یەکتریان کردو دیسان برا گەورەکەیان وەلامی دایەوە:

"نازانم مامەگیان, هیچ کەس هۆیەکەی نازانێ. وەختێك بیستمان چەتەیی دەکا هەموو جێیەکی لـێگەراین, بەلام سۆراغمان نەکرد. تەنیا دوو رۆژ لەمەوبەر کابرایەکی خەلّکی گەلّی شکۆفە کە قەدیم پیاوی بابم بووەو وەسمانی بە دەستی خۆی گەورە کردوەو لە کوڕەکانی خۆی خۆشتری دەویست, دوو ئەسپی لە رێگادا سەکەت کردن هەتا خۆی گەیاندە ئێمەو خەبەرەکەی داینێ".

مەلادۆران ئەفەندی گەڕایەوە لای جەماعەت و مەسەلەکەی بۆ گێڕانەوە. یاوەر لەو بارەیەوە زۆر سەری سوڕمابوو. هەرچەند بیری دەکردەوە بۆی نەدەچووەوە سەر یەك کە وەسمانەڕەش چۆن ببووە حەمەدۆك. زۆر لە خەلّکی گەلّی شکۆفە قەلّس بوو. ئەوان بوون کە

ئەویان تووشی ئابڕووچوونێکی وا کرد, ئەوان بوون یاریان بە ئابڕووی وی کرد. ژنە شین گێڕەکانیش لەوێ ڕاوەستن... پاش ئەم ڕووداوە زەحمەت بوو خەڵکی گەڵی شکۆفە لە دەستی ڕزگاریان بێ. تەنیا یەك ڕێگایان لە پێش دا بوو, ئەویش ئەوە کە لە نێو جەزرەبەکان دا بۆخۆیان جۆرێکیان هەڵبژێرن.

زۆر بە پەرێشانی و خەمناکی لە شارەوانی وەدەر کەوتن. بەتایبەتی یاوەر هەر بە جارێك لەنێو چووبوو. سەری داخستبوو, نەیدەتوانی سەر هەڵبڕێ و تەماشای چاوی کەس بکا. دیارە مورتەزاغا وەزعی خەراپتر بوو. ڕەنگی وەك زەردەچێوەی لێهاتبوو, لاقەکانی هێزیان تێدا نەمابوو و دەلەرزین. بە چاوێك کە لە ترسان لە کالانەدا دەسووڕان تەماشای چەپ و ڕاستی دەکرد. باسکی بە ئەنیشتی دا بەربوونەوە. ئەگەر چاوەکانیت نەدیبان کە لە کالانەدا زیتەزیتیان دەهات, دەت گوت مورتەزاغا جەنازەیە بە ڕێدا دەڕوا. لەگەڵ جەماعەت لە حاڵێك دا بە زەحمەت لاقی لە دوو دەهاتن گەیشتنە شەقامی ڕووبەڕووی جەندرمە.

حەشیمەت لە مەیدانەکەی پێش جەندرمە لە هەموو وەختان زۆرتر بوو. هەرکەس کە بیستبووی کابرا حەمەدۆك نیەو چەتەیەکە بەناوی وەسمانەڕەش, هاتبووە بەردەرکی جەندرمە. ئەم خەبەرە لە ماوەیەکی کورت دا گەیشتە دێهاتیش. هەموو شارەکە هەژابوو.

ئەو شەوە لای بەیانی, پێش تاو کەوتن شەش براله جەنازەی براکەیانیان هاویشتە سەر پشتی ئەسپێکی خەنەیی ڕووت و جوان و بردیان. بۆخۆشیان هەریەکەی سواری ئەسپێکی خەنەیی بەشکۆ بوون.

وەسبەینێ ڕا لەبن دیواری جەندرمە جگە لە جەنازەی چەتەکەچەڵ جەنازەیەك نەمابوو. حەشیمەت لە پشت دیوارەکە ڕۆیشتبوون و تەنیا منداڵی لێمابوون, ئەوانیش بە مەراقەوە چاوەڕێ بوون بزانن کێ دێ جەنازەی چەتەکەچەڵ بەرێتەوە.

تەرمی تەنیای چەتە کەچەڵ هەروا بە خەمناکی و خەفەتباری و لارەملی و چاوەڕوانی لەبن دیواری جەندرمە مابوو. بۆنێکی سامناك وەڕێ کەوتبوو, ئەو جەندرمانەی بە پەنای دا دەڕۆیشتن لووتی خۆیان دەگرت و خێرا تێدەپەڕین. ئێشك گریش کە زۆر دوور دەهات و دەچوو لووتی خۆی گرتبوو. پاش ماوەیەك منداڵان دیتیان تەرمی چەتە کەچەڵیشیان لەبن دیوارەکە لابردوە.

## (١٠)

جموجۆڵێك كە كەوتبووە نێو شارەكە بە هیچ جۆر لەنێو نەدەچوو, لە هەموو جێیەك باس هەر باسی حەمەدۆك بوو. مەڵبەندە هەرە گرنگەكانی ئەم قسەو باسانە پێش هەمووان دوكانی ساڵەكوێر و پاشان قاوەخانەی تۆفیق و دوكانی عەریزە نووسینی فەخرییە شێت و نیوەڕۆ بازاڕ و سەرپردێ بوون. مەسەلەیەك كە لە هەمووی زیاتر باسی لێدەكرا رووداوی سەیر و ئەفسووناویی ئەو شەوە بوو كە جەنازەی حەمەدۆكیان هێنابووەوە خانووبەرەی فەرماندەرایەتیی جەندرمە. ئەو شەوە دوازدە پیاوی سەوز پۆش هاتنە نێو شار. هەر دوازدە كەس بە موو فەرقیان لەگەڵ یەكتر نەبوو... جلەكانیان، قوماشی جلەكانیان، شكل و قەڵافەتیان، چاوە گەورەكانیان، موویان، دەست و لاقیان، بەژن و باڵاو ئاكارو كرداریان هەمووی وەك یەك بوو. هەمووشیان سواری ئەسپی بۆرەی وەك یەك بوون. زین و لەغاوو ركێفی ئەسپەكانیشیان یەك جۆر بوو. ئەسپێكی بۆرەی وەك ئەسپەكانی خۆشیان لە دووی خۆیان رادەكێشا. تەنیا ئەو ئەسپەیان زین و لەغاوی پێوە نەبوون. ئەوانە دێنە نێو شارو لە پێش چاوی جەندرمەكان جەنازەی حەمەدۆك هەڵدەگرن و دەیهاوێنە سەر پشتی ئەسپە بۆرە زیادییەكە. بەڵام جەندرمەكان هیچ نابینن. ئەو دوازدە پیاوە، مردووەكە لەگەڵ خۆیان دەبەنە چیای چل كەسەو تەسلیمی چل سوارەی غەیبیی دەكەن.

" سەگبابی دە درۆزن، كەوتوونە تەنگانەو بە دنیایان گوتوە كە حەمەدۆكمان كوشتوە".

"ئاخرەكەش كێ دەرچوو؟".

"ئاخرەكەش وەسمانەرەشی كوڕی سوڵتانی ئەسپ دزان دەرچوو".

"برایەكانی هاتن، جەنازەكەییان هەڵگرت و بردیانەوە".

"دەڵێن چل سوارەی غەیبییش هاتوون..."

"چل نەمری بەرگ سەوز..."

"حەمەدۆکی دەخەنە سەر دەستانیان و هەڵدەفڕن بۆسەر چیای دوڵدوڵ..."

"ڕاست نووکی لووتکەکەی".

"حەمەدۆکیش لەوێ لە نێو چل سەوزپۆشی چاوڕەش لەنێو باخێکی تایبەتیدا چاو هەڵدێنێو دەپرسێ: ئەمن لەکوێم؟ ئەمن چم بەسەر هاتوە؟..."

"چل سوارە گوتبوویان چی، دەزانی چیان گوتبوو؟... گوتبوویان ئەتۆ مردی و زیندوو بوویەوە".

"ئەتۆ چووبوویە ئەو دنیا، ئێمە تۆمان خستە سەر باڵی خۆمان و هێنامانیەوە..."

"حەمەدۆک چیان پێدەڵێ؟"

"گوتبووی زۆر سوپاس، بژین، ئەگەر ئێوە نەبان، ئەگەر ئەو ئەسپە بۆرەیە کە منتان سوارکرد نەبووایە، ئەمن لەنێو خاکی ڕەش دا دەبوومە خۆراکی مشك و مار. گوتبووی زۆر سوپاس، هەرخۆش بن..."

"فێڵبازی دە درۆزن. ئێستا چ دەکەن؟"

"ئێستا دەیانەوێ چۆنی پێش بگرن؟"

" ئێستا ئەگەر سبەینێ حەمەدۆك لە چیایڕا هاتە خوارو دیسان بزمارێکی لە نێوەڕاستی چاوتان دا, چتان هەیە بیلێن، ها؟ دەڵێن چی؟"

"حەمەدۆك لە کۆشکی چل کەسەی هاتوەتەدەرو چووەتە سەر چیای دوڵدوڵ..."

" چتان هەیە بیلێن، ها؟..."

" هەموو ئەمانە لەبن سەری ئەو مەلا دۆران ئەفەندییەدان کە عەباکەی، چل ڕێوی خۆی لەبن دا دەشارێتەوە".

" لە ترسی حەمەدۆك خەریکە زراوی بچێ..."

" تەنیا ئاواتی ئەوەیە حەمەدۆك ڕۆژێك پێش وی بمرێ..."

" ئیدی هەرچی دەبێ... باببێ".

"هە... هە... ها..."

"زولفۆش دەترسێ".

"ئەرێ, چۆن ترسانێکیش, بەڵام دەری ناخا".

"مورتەزاغا چی؟".

"کون بە کون لە عەلیەیەشەل دەگەرێ, بەلام نای بینێتەوە".

"هێندێ بە دوادا گەراوەو هێندەش دەترسێ بە جارێك شێت بووە",

"دەلێن دەستەی ئاغاج ئۆغلی رەگەل حەمەدۆك کەوتوە".

"دەمیر نایدینیش هەروا..."

"راستە وەلی کەلەبابیش هەر رەگەل حەمەدۆك کەوتوە".

"دەلێن قەرارە ئەم رۆژانە هەموویان یەك بگرن...".

"پەلامار بێننە سەر شارۆچکە...".

"بەو حالە دەتەوێ ئەو بەدبەختە چارەرەشانە زەندەقیان نەچێ".

"ترسی گیانی, گالتە نیە".

"خۆ رووح لە بێستانی سەوز نابێ...".

"لەوانەشە شارۆچکە بەجێ بێلن و بۆی دەرچن".

"لەوانەشە هەلێن بۆ شارە گەورەکان".

"حەمەدۆك لەوێش دەیان بینێتەوە".

"لەوێش...".

سەبرییەشەلی شاگردی حەسەنەرەشی ئاشەوان سەعات بە سەعات هەموو ئەو قسەو باسانەی بۆ وەستای و بۆ عەلیەیەشەل کە لە ئاشی وەدەر نەکەوتبوو, دەگێرایەوە. هەموو خەبەرێکی تازە عەلیەیەشەلی زۆر خۆشحال دەکرد. حەسەنە رەشیش زۆر باش ئەوی نوێ کردبووەوە. کەوشی سوور, پانتۆلی رەش, چاکەتی خەت خەت و کلاو گەرگەرییەکی زۆر جوان و خەت خەت... هەربینا ئەم رۆژانە بچێتە نێو شارو قیت و قنج تێی دا بسوورێتەوە. ئێستا ئیدی بە تەواوی هاتبووەوە سەرخۆشی. جاروباریش خۆی پێ نەدەگیراو لەبارەی مورتەزاغاوە پرسیاری لە ئاشەوان دەکرد:

"وەستا, ئەو سەگبابە خوێرییە چ دەکا, پێت وانیە لە ترسان وەك بزنەکێوی وەکێوان کەوێ؟".

حەسەنەرەش پێدەکەنی و وەلامی نەدەدایەوە.

سەبریی شاگرد ئاشەوان خەبەرێکی دیکەی هێنا:

"ئەم خەبەرەم زۆر درەنگ بیست, عەلیاغا. نازانم ئەم رۆژانە گوێم کەر بوون چیە, وا درەنگ خەبەران دەبیسم!".

عەلی گوتی:

"هێندێ جار وا دەبێ, ئێستا بلێ بزانم مەسەلە چیە؟".

سەبری گوتی:

"خەبەرێکی زۆر خۆش".

"بلێ سەبری, بلێ نووری هەردوو چاوم. ئەم خەبەرەی درەنگت بیستوە چیە؟".

هەمیشە وەختێك خەبەرێکی زۆر گرنگ دەبوو, سەبری ئاوا خۆی گران دەکردو دیقی مەرگی بە عەلی دەکرد.

"ئەتۆ بلێ بزانم سەیران کێیە؟".

"ژنی حەمەدۆکە".

"ماڵی لە کوێیە؟".

"لەو خوارە, لە گوندی وایوای, دەشتی ئاناوارزا".

"ئەو هاتبوو جەنازەی حەمەدۆك ببینێ. دەڵێن زۆر جوانە".

عەلی گوتی:

"خوشکە سەیران یەکجار جوانە".

"جوانی جوانانە".

"راستە، لەم دنیایە، لە نێو ژنانی ئەم کێوپارەیەدا تاقە. زۆریش ئازایە... وەك حەمەدۆك وایە".

"ئەو هاتبووە بنکەی جەندرمە، ئارام ئارام، بە دڵەکوتە دەچێتە کن جەنازەکان. پاش ئەوەی یەك بە یەك تەماشایان دەکا...".

"پاشان...؟".

"عەرزی خزمەتی ئاغای خۆم بکەم لەوێ رادەوەستێ، دەست لە کەلەکەی دەنێ‌و دەست دەکا بە پێکەنین. لەسەر سەری مردووەکان راوەستابوو. پێکەنینێك بۆ ئێستا نەبێ بۆ کەنگێ باشە. وا پێدەکەنێ، ئەو حەشیمەتەی بۆ تەماشا هاتبوونە وێ، ئەوانیش دەست دەکەن بە پێکەنین. لە پڕ جەندرمەکان دەبینن لەوێ خەڵك هەموو پێدەکەنن، ئەوانیش دەست دەکەن بە پێکەنین. پاشان دەچێتە بازاڕ و لەوێش دەست دەکا بە پێکەنین، هەرکەس لە بازاڕ دەبێ، بێ ئەوەی بزانێ مەسەلە چیە دەست بە زگیەوە دەگرێ‌و دەست دەکا بە پێکەنین. پێکەنینەکەی دەتەنێتەوە بۆ ماڵەکانیش. خوا روحم دەکا سەیران خان لە پێکەنین ماندوو دەبێ‌و خەڵکیش لە پێکەنینی سەر جەنازە رزگار دەبن".

خەبەری چوونی سەیران بۆ سەر جەنازەی حەمەدۆك، عەلیەشەلی خستە دەریای خۆشحاڵیەوە بە سەبریی گوت:

"کوڕە سەبری, لەبەر خاتری ئەم خەبەرە... قەول دەدەم سەرتاپێت لە زێو بگرم... کەوایە لە خۆشیان پێکەنیبوو. بەڵێ؟..".

حەسەنەڕەش گوتی:

"ئەدی، لە خۆشیان...".

"هەموو خەڵکی شارۆچکەو لادێ لەگەڵی پێدەکەنین".

ئاشەوان گوتی:

"بەڵێ... ئەفەرێك هەم دەتوانێ تەواوی دنیا بکاتە شەریکی خۆشحاڵیی خۆی و بیان خاتە پێکەنین، هەم دەتوانێ بە تازیەی خۆی بیان گریەنێ. بنیادەم وایە، یانی بنیادەم بوونەوەرێکی سەیرە".

عەلی دووپاتی کردەوە:

"زۆریش سەیرە".

سەبری گوتی:

"ئەمن دەڕۆم".

عەلی گوتی:

"ئەتۆ بڕۆ، باش گوێ پێدا بگرە بزانە خەبەرێك لە حەمەدۆك هەیە یان نا...".

سەبری رۆیشت و پاش تاوێك بە هەمبانەیەك خەبەرەوە هاتەوە. ئەسپی حەمەدۆك لە مەودایەکی کەمەوە لەسەر بەردەڵان ڕا تەماشای یاوەرو جەندرمەکانی کردوە، بزانێ چ دەکەن، یاوەریش زانیویەتی ئەو ئەسپە ئەسپی حەمەدۆکە، بە چیی ڕا زانیوە، مەعلووم نیە. بڕیار دەدا ئەو ئەسپە کەوا راویان دەنێ بکوژێ، تەقەی لێدەکا. بەڵام ئەسپەکە وەك هیچ نەبووبێ لە جێی خۆی رادەوەستێ و کلك هەڵدەوەشێنێ.

"یاوەر کە حەمەدۆکی نەدیوەو نایناسێ، چۆنی زانیوە کە ئەو ئەسپە خەنەییە هی حەمەدۆکە؟".

عەیەشەل گوتی:

"ئەو ئەسپە بەناویانگە، ئەسپە جندۆکەکەی عەلیسەفابەگە. مەبەستم جادوورییە. کەس ناتوانێ بیهەنگێوێ، تەنانەت منیش، تەنانەت حەمەدۆك خۆشی".

"پاشان یاوەر لە جێی‌دا دەکەوێ...".

بەراستیش یاوەر پاش ئەو ڕۆژە لە جێی‌دا کەوتبوو. لەگەڵ وەکیل باشی عاصم نەبێ لەگەڵ کەس قسەی نەدەکرد. خەوی لـێ‌نەدەکەوت و وەك پێویست خواردنیشی نەدەخوارد. پیلی ژن و منداڵەکەی گرتبوو، چووبووە ئەنکەرە ماڵێ بابی کە سەرهەنگی سوپا بوو. ئیدی خەڵکی شارۆچکەی خۆش نەدەویست، ئەوان لە پێش چاوی خەڵکێکی زۆر نەفام، شێت و درۆزن بوون. لە یەکەم دەرفەت دا پیلی ژن و منداڵی دەگرێ‌و بە پەلە دەچێتەوە ماڵی بابی. ژنەکەی لەبەر ئەوە کە مێردەکەی خێزانی حەمەدۆکی کوشتبوو، نەی‌دەتوانی لێی‌خۆش بێ‌و لەو ڕۆژە بە دواوە هەمیشە بە چاوی سووك تەماشای دەکرد. یاوەریش ئەم مەسەلەیە تێ‌گەیشتبوو، و لە داخی حەمەدۆك کە ببووە مایەی نێوان ناخۆشیی ئەوو ژنەکەی وەك شێتانی لـێ‌هاتبوو.

" وەکیل باشی‌عاصم".

دەنگەکەی زۆر بە سپایی بوو و بە حاڵە حاڵ دەبیسرا.

"ئەمرکە جەنابی یاوەر".

"ئەو ئەسپە، ئەسپی حەمەدۆك بوو، نا؟".

"بەڵێ جەنابی یاوەر، ئەسپی تۆ چۆن دەناسم ئەو ئەسپەش وا دەناسم، هەروەك خۆم دەناسم و ژن و کچەکەم دەناسم".

"ئەمنیش باشی دەناسم، لەبیرم ناچێ".

"لە بیرچوونەوەی نیە".

"ئەدی بۆچی وا بەرەڵلایان کردوە؟ ناکا ئەوەی لە نێو لێرەوار لێمان دا حەمەدۆك بووبێ".

"ئەمنیش پێم وایە حەمەدۆك بوو".

"باشە ئەی چووە کوێ؟".

"هۆیەو هەواری عێلات لەو لایە. لەوانەشە بریندار بووبێ".

"ئەو لایە دێ‌یەك شتێکی لـێ‌نیە؟".

"بۆچی، لەو دەشتەی خوارێ دێش هەن".

"دێهاتی‌یەکان و عێلات جەنازەی حەمەدۆك کە کوشتمان حەشار نادەن؟".

"حەشاری دەدەن".

"حەمەدۆك بۆ ئەوەی ئێمە ئەزیەت بکا, بە هاندانی دێهاتی‌یەکان گاڵتەیەکی وەك بەسەرهاتەکەی باقرگدیگی وەرێ ناخا؟".

"حەمەدۆك تێكەڵی ئەو فێڵ و تەڵەكەبازیيانە نابێ".

"خەڵكی شارۆچكەش حەمەدۆكيان زۆر گەورە كردەوە. بە جۆرێك پێشوازیيان لە ئێمە كرد وەك قەڵای خەيبەرمان گرتبێ. لەبارەی كوژرانی حەمەدۆكيشەوە زۆريان برووسكە بۆ ئەنكەرە لێدا. ئێستاش دەڵێن حەمەدۆك چل سوارەی غەيبی هەڵيان گرتوەو لەگەڵ خۆيان بردوە".

"بۆخۆم بەم گوێيانەم گوێم لێبوو وايان دەگوت".

مورتەزاغا، زولفۆبەگ، مەلادۆران ئەفەندی و تاشكەن خەليل و چەند كەسی ديكە چوونە سەردانی ياوەر بۆ "بەڵادوور" پێگوتن. بەڵام ياوەر رێگای كەسی نەدا. مورتەزاغا لە رقان شێت ببوو. وەك مزی سەر مەدوونەی تواوبووەوەو لە ترسانيش وەك گونی هەڵلاج هەڵدەلەرزی. مورتەزاغا بە دەنگێك كە وەك ويشەويشی مار دەچوو، گوتی:

"كوڕە ياوەر، كوڕە ياوەر، بابمانت بە گان دا. لە بەينت بردين. كوڕە وەك قارەمانێك پێشوازيمان لێكردی. كوڕە ياوەر، تەنانەت مستەفا كەمال پاشاش پاش سەركەوتنی لە شەڕی سەربەخۆيیدا لە ئەنكەرە پێشوازيی وای لێنەكرا، نۆی ئەيلووليش وەختێك چووە ئەزمير ئەم پێشوازەی لێنەكرا. كوڕە ياوەر، وەك ناپليۆن هاتيە شارۆچكە. كوڕە، ئەتۆ درۆی وات بۆ كردو بۆچی ئێمەت لە دنياو لە ئەنكەرە كردە پووڵەڕەشكەيەك؟ كوڕە، هەموو رۆژنامەكان نووسيیان حەمەدۆك كوژرا. ئێستا چۆن لە بنی دێيەدەر؟".

تاشكەن خەليل بەگ گوتی:

"ئەوان سەرو كلكی پێك دەگرن، مەڕ پێی بەرخی خۆی ناشكێنێ".

مەلادۆران ئەفەندی گوتی:

"بۆچی، دەیشكێنێ. پێم بڵێ ئێستا ئێمە لەگەڵ بەڵای حەمەدۆك چ بكەين. ياوەر ئەگەر بش مرێ بە مەمانان چی؟ بەڵام دەبێ بزانين ئێمە چۆن دەتوانين لە شەڕی ئەم بەڵايە رزگار بين".

خەليل بەگ وەڵامی دايەوە:

"ناتوانين رزگار بين".

"جەناب ياوەری بەرێزيش خۆ لەسەر ئێمە رادەنێ... قامكە گەورەی وەبن چەنەگەی دەدا، لاقی راستی ڕەپێش دەكا، كەمێكيش خۆی كووڕ دەكاتەوە راست وەك مستەفا كەمال لە قووجاتەپە. وەی وەجاخت كوێر بێتەوە ياوەر. شارێكی گەورەی ئاگر داو وەجاخمانی كوێر كردەوە. ئێمە تازە پاش ئەو درۆ شاخدارانە دەتوانين سەر بەرز كەينەوە؟".

زولفۆ بە دڵنيايی گوتی:

"نا ناتوانین, ئەتۆش خەتات هەیە ئاغا, ئەتۆش هەژابووی".

"دیارە هەژابووم, دەکرا نەهەژێم؟ هەم هەژابووم و هەم خەریك بوو لە خۆشی‌یان شێت بم. گاڵتە نیە, بزانە چ ببوو, چ رووی دابوو, خەبەری مەرگی دوژمنێکی خەڵك, دوژمنی نیشتمان و بنەماڵەکان و دوژمنی مستەفا کەماڵ پاشاو خائینێکی تەقیلەبەسەر هاتبوو... ئەگەر تۆ بی لە خۆشی‌یان شێت نابی؟ ئەگەر خەبەری مەرگی کەسێکت بۆ بێنن کە گوللەی لە نێوی چاوی باشترین هاواڵت داوەو مێشکی بە دیوارەوە نووساندوە شێت نابی...؟".

"مورتەزاغا ئەگەر ئەمن لە جیاتی تۆ بام ئارامیی خۆم دەپاراست".

"ئەمن ناتوانم ئارام بم زولفۆ, ناتوانم. ئێستاش بزانە چ دەکا, حازر نیە چاوی بە پیاوماقوولانی شارۆچکەیەکی گەورەو گران بکەوێ. ئەمن ئەمەم پێ تەحەممول ناکرێ. چما ئەو خوێڕی‌یە کە لای ئێمە قوونی گوواوی‌یە چ کارەیە؟".

مەلادۆران ئەفەندی پشتی گرت و گوتی: بەڵێ, چ کارەیە؟".

"ئەوەندە بەفیزو دەمار بوو نەدەکرا تخوونی کەوی. ئێستاش قارەمانە نیشتمانی‌یەکەمان لە جێی دا کەوتوە".

"زولفۆ بەگ, ئەو ئەگەر پاش ئەوەی شارە جوانەکەمانی بەدناو کرد, توانی لەم شارۆچکەیە بمێنێ, با بمێنێ. ئەتۆ ناتەوێ وەزعی ئەم کابرایە عەرزی جەنابی عارف صائم بەگ ئەفەندی بکەی. ئەم خزمەتە بچووکەشت بۆ شارەکەمان لێ وەچاوە؟".

"یاوەر فارووق هەر ئەم رۆژانە مشووری حەمەدۆك دەخوا ـ راوێژی دەنگی زولفۆبەگ زۆر رق هەستاوانە بوو ـ ئەمن زۆرم متمانە بە یاوەر فارووق بەگ هەیە".

"باشە متمانەت پێی هەبێ, ئەم درۆزنە هەر مەبارەکی خۆت بێ".

"لاوێکی زۆر شەریفە, هەر بۆیەش لە جێی دا کەوتوەو ناتوانێ چاو لە چاوی کەس بکا. راوەستە با لە جێی بێتەدەر...".

"رەبی خوا خەڵکی گەڵی شکۆفە تووشی بەڵای ناگەهان کا. یاوەر فارووق ئەوەندەیان لێ‌دەدا هەموو ئەندامی لەشیان دەشکێنێ, دەیان هاڕێ. رەبی خوا خەڵکی چیاکانی تووڕووس تووشی بەڵای ناگەهان کا...".

زولفۆ بە دەنگێکی قایم گوتی: خەڵکی لادێ هەر زمانی کوتەك دەزانن.

مورتەزاغا لە حاڵێك دا بە تووڕەیی بە جێی دەهێشتن, وەڵامی دایەوە: ئەتۆ هەروا بزانە.

هەر کە گەیشتەوە ماڵێ پرسی: عەلی‌یەشەل خەبەری چیە...".

حەسنەخان وەڵامی دایەوە: هیچ خەبەری نیە.

"دەبێ وەیبینم. چارەیەکم نیە. کەس نازانێ لەمەودوا چ دەبێ. نازانن حەمەدۆك ماڵەکانیان بەسەردا دەڕووخێنێ. تەنیا مەلادۆران ئەفەندی مەسەلەکە تێدەگا. ئەویش بە دەست رێگرانەوە گرفتارە. ئاغاچلی کە پیاوەکانی کوڕی مەلادۆرانیان کوشتوە, لە شاخەکانی تووڕووس خەریکە شمشێرەکەی بۆ سەربڕینی مەلادۆران ئەفەندی تیژ دەکا. ئێستا دەردەکەوێ کە حکوومەتیش بە کەلك نایە... خانم, ئەگەر سبەینێ ئەم جەنابی یاوەرەمان کەلاکی بەرازێك بێنێ و بڵێ ئەمە حەمەدۆکە, پێم سەیر نابێ ئەگەر بیهێنێ و بڵێ ـ ئا...خ ـ تفەنگم لە حەمەدۆك دابوو, کاتێك هاویشتبوومە سەر ئەسپێکی رووت و دەم هێنایەوە, چل سوارەی غەیبی کردیانە بەراز دیسان پێم سەیر نابێ".

"فەرماندەری جەندرمەی ویلایەتەکەمان خەریکە دێتە ئێرە؟".

"سبەینێ پێش نیوەڕۆیە لێرەیە".

"قسەی لەگەڵ بکە, هەموو شتێکی پێ بڵێ".

"دیارە پێی دەڵێم. ئەو پیاوێکی قەدیمییە, گەڕاوەتەوە, بەڵکوو لە دەردمان حاڵی بێ. لە داخی ئەم زولفۆیە خەریکە شێت دەبم".

"چی کردوە دیسان؟".

"ئەو هەموو زەوییەی داوە بە عارف صائم بەگ و بەگەکانی دیکەو ئەم و ئەو, بۆخۆشی ئەو هەموو باخ و مەزرایەی وەرگرتوە چاوی پڕ نەبووە, هاتوە چەت لە کاری مەمانان دەخا".

"دەڵێ چی؟ ئەو سەگە بێقیمەتە دەڵێ چی؟ ئەو مەیموونە دەڵێ چی؟".

"دەڵێ ئەم مەسەلەیە ئەتۆ گەورەت کردوەتەوە, ئەتۆ حەمەدۆکت ئەوەندە گەورە کردوە. هەروا بزانە مەسەلەی حەمەدۆك مەسەلەیەکی چووکەڵەیە. ئا...خ عەلیەشەل ئا...خ".

"ناتوانی یەکی دیکەی وەك وی پەیدا بکەی؟".

"ناتوانم, ناتوانم, ئاخ ناتوانم. ئەگەر توانیبام پەیدای بکەم, ئەگەر توانیبام ئەوەندە لەبەر ئەو سەگبابە دەپاڕامەوە...؟ لەبەر ئەو سەگە شەلە... ئەو دوژمنی حەمەدۆکە. بۆخۆشی پیاوێکە زۆر نازاتر لە حەمەدۆك. حەمەدۆك لێی دەترسێ. ئەمن بە دەستی خۆم ماڵێ خۆم خەرا کرد. ئەمن بە دەستی خۆم پەتی سێدارەم هاویشتە ئەستۆی خۆم".

"لەوانەیە پەیدا بێتەوە".

"ئا...خ. ئەگەر جارێکی دیکە چاوم بە چاوی دەکەوتەوە... وام دەکرد لە گوناهم خۆش بێ. ئا...خ ئەگەر جارێکی دیکە, لەحزەیەك ئەوم دەدیەوە... ئەمن دەتوانم وا بکەم لە تاوانم خۆش بێ.

بەخودا خانم ئەمن دەمەویست تاقیی بکەمەوە. ئەمن چووزانم هێندە شەرم بەخۆیە ئا...خ, ئەمن چووزانم. بریا وام نەکردایە".

"دەی بینیەوە. خەریکن بۆ دیتنەوەی شارەکە ژێربەرەژوور دەکەن".

دەمەوێ دیاری‌یەك بدەم بەو کەسە کە عەلیی برام بدۆزێتەوە, پارەیەك دەورویەری هەزار لیرەم وەلا ناوە بۆ ئەو کەسەی بی‌بینێتەوە".

"پەلە مەکە ئاغا, ئەمرۆ و سبەی دەی‌بیننەوە. ئەتۆ چۆنێکی پێت سەلاحە مەسەلەکە بە فەرماندەری جەندرمەی ویلایەت بڵێ".

ئەو شەوە خەو لە چاوی مورتەزاغا نەکەوت. ئەگەر جاروباریش چەند لەحزەیەك دەنووست خەونی سەیر سەیری دەدین: ژمارەیەکیان بە دوای یەکتر دا ریز کردبوون و بە نێو چۆمێك دا وەرێیان خستبوون. لە چاوی هەموویان وەك لووساوك خوێن هەڵدەرژاو دەچووە نێو رووبارەکەو چۆمەکە سوور هەڵدەگەڕا. مورتەزاغا لە پێش هەمووانەوە دەڕۆیشت. گوللە لە نێوچاوانی درابوون و لە چەنەگەی هاتبوونەدەر.

بەیانی زوو یەکسەر چووە قایمقامیەت و چاوەڕێی سەرهەنگی فەرماندەری جەندرمەی ویلایەت و قایمقام ما. هاتنی فەرماندەر زۆری پێ نەچوو, هەرکە ترۆمبێلە سەوزەکە رووبەڕووی خانووبەرەکە راوەستا, هەردووکیان کە لە پەنجەرەی ترۆمبێلەکەوە سەیری دەرێیان دەکرد, دەسبەجێ و دەکرێ بڵێین بە غاردان لە ترۆمبێل دابەزین و هاتنە لای.

بەری دەردی دڵی مورتەزاغا دراو ئەوەندە کە توانای قسەکردنی هەبوو, یەك بە یەك ئەوەی خەڵك لە دەستی چەتەکان کێشابوویان گێڕایەوە. سەرهەنگ کە پیاوێکی تێگەیشتوو و خۆش مەشرەف بوو, زۆر چاك کەوتبووە ژێر تەئسیری قسەکانی. هێندەی نەمابوو لە بانگی گریانێ بدا.

"زۆریش پەرۆشی ئەو کوڕەمە, یاوەر زۆر پەرێشانە. لاوەکان هیچ توانای ئەم جۆرە شتانەیان نیە. هەربۆیەش نەخۆش کەوتوە. یانی چەتەکان و حەمەدۆك ئەوەندە زوڵم و زۆر دەرهەقی خەلکەکەمان دەکەن؟".

"لەوەی گوتم زیاتریش".

سەرهەنگ بە پێکەنینەوە گوتی:

"وەختێك جحێڵ بووم هەموو رۆژێ جەنازەیەکی چاکیرچالی ئەفەیان دێنایەوە فەرماندەرایەتیی جەندرمە. خەڵك فریویان دەدایەن. ئەمن ئەودەم زۆر زۆر لاو بووم. رۆژێك یاوەر قاچاخچی‌یەك دەکوژێ و بە دێهاتی‌یەکانی نیشان دەدا. ئەوان سوێندو قورئان دەخۆن کە

چاکیرچالی خۆیەتی. یاوەر دێتە ئەزمیر، وەختێك تێدەگا کابرا چاکیرچالی نیە، خۆی دەکوژێ. ئای جحێلی ئای. باشە یاوەر فاررووقمان حالّی چیە، بیستم نەخۆش بووە، وەختێك ئەو مەسەلەیەم بیست بێ ماتلّ بوون هەستام وەڕێ کەوتم".

قایمەقام گوتی:

"حازر نیە کەس ببینێ".

"ئێمە دوێنێ دەوری پازدە بیست کەس لە پیاوماقوولانی شار کۆبووینەوە بۆ ئەحوالّ پرسین چووینە لای، بەلاّم وەری نەگرتین".

سەرهەنگ لە حالێك دا دیسان پێدەکەنی، گوتی:

"ناتوانێ، ناش توانێ وەرتان گرێ. هەتا ماوەیەك ناتوانێ چاو لە چاوی کەس بکا. ئێستا با ئەمن هەستم بچمە سەردانی...".

هەستاو گوتی: دووبارە یەکتر دەبینینەوە.

"بەچاوان جەنابی سەرهەنگ".

یاوەر جلی لەبەر کردبوون، ریشی تاشیبوو، حازرو ئامادە لە مالێ چاوەڕوانی سەرهەنگ بوو. ئەو لە خوارێ لەبەر دەرگا لە حالێك دا وەك بزمار چەقیبوو پێشوازیی لە سەرهەنگ کرد. سەرهەنگ گوتی:

"بەلاّ دوورە جەنابی یاوەر، کوڕم".

سەرهەنگ لە پێشەوە، یاوەر بە دوای داو وەکیل باشی عاصم لە دوای وانەوە چوونە سەرێ. سەرهەنگ لەسەر قەنەفەیەك دانیشت. پیاوێك بوو زۆر قەلّەو. وەختێك لە پلیکانەکان وەسەر دەکەوت هەناسەبڕکەی وێکەوتبوو. رووی کردە یاوەرو وەکیل باشی عاصم کە بە پێوە راوەستابوون.

"فەرموون، دانیشن".

دانیشتن، سەرهەنگ دەستی کرد بە پێکەنین و دووبارە گوتی:

"بەلاّدوورە".

"یاوەر ئەم شتانە بەسەر هەموو جەندرمەیەك دێن".

"دێهاتییەکان فریویان دام".

"فریویان داوی یاوەر، ئەتۆ هێشتا زۆر حەمەدۆکی دیکە دەکوژی. زۆر حەمەدۆك تەسلیم دەبنەوە، ئەمە قانوونی کارەکەمانە. گرتن و کوشتنی چەتەیەك کە خەلّك خۆشیان دەوێ و لێی دەترسن کارێکی سەختە".

"دەزانم فەرماندەر".

"خەڵك هەر لە ئێستاوە كردوویانەتە نەزەرگە. چاكیرچالی محمد ئەفەش لە ئەزمیر نەزەركردەیەك بوو. هێندێك كەس هەبوون كە گلكۆكەی‌یان زیارەت دەكرد, هێندێكیان لە خاكی گلكۆكەی دەكردە نێو پیاڵەیەك ئاو هەموو نەخۆشی‌یەكانیان چاك دەبوونەوە. ئەم حەمەدۆكەشمان...".

"راستە فەرماندەر".

"ئەگەر مەسەلەی زیندووبوونەكەی راست بێ... نەزەركردە...".

"راستە فەرماندەر, ئەمن سەری ویت بۆ دێنم".

"ئیشەڵلا یاوەر. بەڵام ئەتۆ ئەگەر ئەوەندە بەو مەسەلە بچووكانەوە نارەحەت بی... یاوەر, ئێمە زۆر شتمان دیوە. گورهانێك (سریە) جەندرمەت بە سێ ئەفسەرەوە بۆ دەنێرم. دەرەجەداریش (مراتب) چەندی بتەوێ بۆت دەنێرم. ئەتۆ بەرپرسی گشتیی ئەم مەڵبەندەی, ئەو گورهانەی دەی‌نێرم لە ژێر ئەمری تۆدا دەبێ".

هەستایە سەرپێ: بەلادوورە یاوەر, نارەحەت مەبە.

"زۆر سوپاس فەرماندەر".

سەرهەنگ بەسپایی لە پلیكانەكان هاتەخوارو لە حاڵێك دا دەی‌گوت بەخوام سپاردن سواری ترۆمبێلی خۆی بوو. هەر كە ئەو رۆیشت یاوەر زیندوو بووەوە, بووژایەوە, چووە شوێنی كاری خۆی و لە پشت مێزەكەی خۆی دانیشت و بە ددان لە چیڕەوە بردنەوە گوتی:

"كارێك دەكەم خەلكی گەلی شكۆفە خوێن بڕشێنەوە".

نیوەڕۆیە وەختێك لە ماڵی قایمقام لەگەڵ سەرهەنگ خەریكی نان خواردن بوون, لە دەركەیان داو یەكێك لە پیاوەكانی موڕتەزاغا هات و ڕووبەڕوویان راوەستا. موڕتەزاغا كە هەموو شتێك تێ‌گەیشتبوو هەستاو لە حاڵێك دا لاقەكانی تێك دەئاڵقان چووە لای و پرسی:

"دیتانەوە؟".

"بەلێ, لە ئاشی حەسەنەڕەش".

"هەر ئێستا بیبەنەوە ماڵێ. هەر لەگەڵ رۆیشتنی جەنابی سەرهەنگ خۆم دەگەیەنمەوە ماڵێ. سلاوی خانم بگەیەنە, پێی بلێ هەتا بۆخۆم دێمەوە زۆری ئاگا لە عەلیی برام بێ".

وەختێك موڕتەزاغا گەڕایەوە ئەو خۆشحالی‌یە لە نەكاوە كە لە روخساری دا پەیدا ببوو, بۆ حازریان بوو بە مەراق. موڕتەزاغا وەك بلبل دەستی بە قسە كردو گوتی:

"دیمەوە، ئەوم دیتەوە، عەلی‌یەشەل، دوژمنی خوێنیی حەمەدۆك. عەلی‌یەشەلی برام بۆ جەندرمەکان دەبێتە کۆمەگێکی گەورە. گاڵتەیەکم کردبوو، رووحێکی چەند گەورەی هەیە. دەمەویست تاقیی بکەمەوە، بەڵام لە مەسەلەکە حاڵی نەبوو و دەسبەجێ لە ماڵمان رۆیشت".

ئەمجار بە شەوق و زەوقەوە بۆ سەرهەنگی باس کرد کە عەلی‌یەشەل کێیەو چ کارەیە. نان خواردنی بە جارێك لەبیر چووبوو. تەنانەت پاش ئەوەی وەبیریشی هاتەوە، دیسان پارووەکی لەوەی لە پێشی بوو هەڵنەدەگرت. یەك بە یەك هونەرەکانی عەلیی هەڵدەدان، باسی شوێن گێڕانەکەی کرد کە چۆن شوێنی مێروولە لەسەر زەوی و شوێنی هەور لەسەر ئاسمان دەدۆزێتەوەو چۆن بە تەماشای شوێنی پێی کەسێك را دەزانێ بیر لە چی دەکاتەوە، چ دەکاو چۆن بنیادەمێکە. ئەقڵ و تێگەیشتن و کەماڵاتی وی باس کردو دەست راستیی وی لە تفەنگ هاویشتن دا شی کردەوە کە چۆن دەتوانێ چاوی قورینگ لە وەختی فڕین و لاقی کەروێشك لە کاتی راکردن دا بە تفەنگ بنگێوێ.

"رەنگە بفەرموون تەواوتورە. نا تەواتور نیە. تەنیا خەڵکی ئەم شارۆچکەیە نین کە هونەرەکانی‌یان دیوە. بەڵکوو هەموو خەڵکی تووڕووس ئەمەی دەزانن".

قایمەقام پشتگیری قسەکانیی کردو گوتی: بەڵێ راستە.

سەرهەنگیش بە پێکەنین و خۆشحاڵی‌یەوە گوتی: هەیە، هەیە، بنیادەمی وا هەیە کە هەر قامکێکی دەستی هەزار هونەری لێ هەڵدەوەرێ. هاوکاریی ئەو جۆرە کەسانە زۆر بەکەڵکە.

هەستایە سەرپێ. ئەو ئەمڕۆ لە نیزیکەوە لەگەڵ مورتەزا ببووە ئاشناو زیاتر خۆشی ویستبوو. لەم بارەیەوە سوپاسی قایمەقامی کرد.

هێشتا ترۆمبێلی سەرهەنگ وەرێ نەکەوتبوو، مورتەزاغا بەرەو ماڵ بووەوە، غاری دەدا. هەناسەی سوار ببوو. خێرا لە پلیکانەکان وەسەر کەوت:

"کوا، کوا، براکەم کوا؟ زۆر داوای لێبووردن دەکەم. براله گیان ئەتۆش زۆر شەرم بەخۆو دڵناسك بووی. سەیر ئاگرە سپی‌یەك بووی و ئێمە نەمان دەزانی. یانی مەبەستم ئەوەیە وەك ئاگرێك کە رەنگی سپی بێ، یانی وەك گڕی ئاگر. ئێمە هێشتا تۆمان تاقی نەکردبووەوە..."

لەم ژوورەوە دەچووە ئەو ژوورەو لەوێوە دەچووە ژوورێکی دیکە. هاواری کرد: حەسنە، حەسنە، حەسنە ئەتۆ لە کوێی حەس...نە.

حەسنەخان و هەموو خەڵکی ماڵێ دەسبەجێ هاتبوونە سالۆنەکە. خزمەتکارەکان، مەیتەرەکان، میرزایەکان و منداڵەکانیش هاتبوون و هەموویان شەرمەزارو سەرشۆڕ بە بێدەنگی راوەستابوون.

"بۆ بێدەنگن, عەلیاغای برام کوا؟".

حەسنەخان وەڵامی دایەوە:

"نەهاتەوە, لە بەیانی‌یەوە کەس نەماوە لە دوام نەناردبێ. نایەتەوە. هەرکەسیش چووەتە لای, تەنانەت جارێکیش زاری هەڵنەپچڕیوە قسەی لەگەڵ بکا".

"لااله الا الله یانی چی. ئەمە چ بەزمێکە خوایە, ئێستا چ بکەین؟".

لەسەر قەنەفە دانیشت. سەری بەسەر سنگی دا شۆڕ کردەوەو لە فکرەوە چوو. ئەمجار سەری هەڵبڕی و رووی کردە خەڵکی ماڵێ کە بەپێوە وێستابوون, گوتی: ئێوە بڕۆن. حەسنە ئەتۆ مەڕۆ".

حەسنەخان هات و لە کنی دانیشت. چەند لەحزەیەك لە پەنای یەکتر دانیشتن. قسەیان نەدەکرد.

"ئەتۆ دەڵێی حەسنە, ئەمن لە دوای بچم, گووم کردە لاقە شەلەکەی, خەڵکی شار هەموو شتێك دەزانن, کەس نەماوە نەزانێ چۆنم رازاندەوەو دوایەش چۆنم دەرکرد. ئێستا ئەگەر هەستم لە دوای بچم هەموو خەڵکی شار پێمان پێناکەنن؟".

حەسنەخان بەدەم زەردەخەنەوە گوتی:

"با پێبکەنن, با پێبکەنن, ئەوان چ کارەن, هێندێك سەروقوون رووت, مەترسیی گیان لەگۆڕێ دایە, گاڵتە نیە, ژیانمان بە موویەکەوە بەندە, ئێمە خەتەر لە بنانگوێمانە, ئەو پێپەتی‌یانە هیچیان نەبووە, گوێت لێبوو, بیستت کە حەمەدۆك چیی بووە؟".

"وەبەر تیری قودرەتێ کەوێ یاخوا".

"دەڵێن دوازدە سەوزپۆش بە سواری دوازدە ئەسپی بۆرە دێن, جەنازەکەی لە پارچە هاوریشمێکەوە دەپێچن و سواری ئەسپێکی سەوزی دەکەن و لەگەڵ خۆیانی دەبەن, هەمووی ئەمانە لە پێش چاوی جەندرمەکان دەکرێ, تەنانەت زار هەڵناپچڕن یەك قسەش بکەن, وەك کەڕو لاڵان رادەمێنن و لە جێی خۆیان نابزوون و تەماشایان دەکەن".

"درۆیەو ئەوە مەسەلەیەکی دیکەیە".

"دەزانم درۆیە, دەزانم... دەڵێن پاشان حەمەدۆکی هەڵدەگرن و دەیبەنە چیای دوڵدوڵ بۆ لای چل سوارەی غەیبی. هەر ئەم رۆژانە لەگەڵ پیاوێکی سەوزپۆش کە شمشێری رووتی بەدەستەوەیە دەردەکەوێ... دەچێتە خوارێ بۆ چوکووراوا, چوکووراوای دەگرێ. لە دەوڵەمەندان دەستێنێ و دەیدا بە هەژاران. پاش ئەوەی ئەو دەرکەوت لە چیاکانی تووڕووس گورگ و مەڕ پێکەوە ئاو دەخۆنەوە. هەموو کار دەکەن, هەموو بەقەد یەك پەیدا دەکەن و

بەقەد یەك خەرج دەکەن و دەخۆن، کەس چاوی لە ماڵی کەس نابێ. وەختێك حەمەدۆك دەرکەوت هیچ کەس چووکترین ئازار بە کەس ناگەیەنێ و هیچ کەس بە قەد نووکی دەرزییەش دڵی کەس نایەشێنێ. وەختێك ئەو دەرکەوت، ئینسانەکان نەك هەر یەکتر، بەڵکوو تەنانەت مێروولەیەکیش ئازار نادەن. وەختێك ئەو دەرکەوت...".

"بەسە ئیدی، توخوا لێوەبڕە، لێوەبڕە حەسنەخان، درۆیە، هەمووی ئەمانە درۆیە... هەمووی ئەمانە لەبن سەری مەلادۆرانەوەن گوێمان چاوڕاو بکە، بەڵام نەك هێندە، ئەگەر ئەو لە ئێستاوە حەمەدۆکی بکاتە نەزەرکردە، حیسابی مەمانان تەواوە. چەتە بەس نەبوو، ئێستا دەبێ لەگەڵ نەزەرکردەیەك تووش بین. وەبەر تیری قودرەتێ کەوێ یاخوا. مەلادۆران ئاغا، گوێمان لێدە، ئەمان گوت لێدە بکوژە. گوێمان شتێك سازکە بیخە سەر زارو زمانی خەڵك هەتا تۆزێك وەزعمان رێك و پێك دەبێ، ئێستا وەرە تەماشای کە... ئێمە چیمان گوت و ئەو چیی کرد".

حەسنەخان گوتی:

"راستە، هەموو ئەمانەی گوتم راستن، دوازدە پیاوی سەوزپۆشی بۆرە سواری وەك یەك، هەروا بزانە لە لووتی یەکتر بەربوونەوە، هەمووشیان لە شێوەی حەمەدۆك، حەمەدۆکیش... پێت خۆشە بانگی کوڕەکان کە لێیان بپرسە، ئەوان بە چاوی خۆیان دیویانە. خۆ دەستوپێوەندەکانی خۆمان درۆ ناکەن. بەری بەیانی بووە، تاریك و روونی بەیانی، وەختێك کە تازە دنیا رووناك دەبوو، دیویانە... بە چاکی دیبوویان".

"درۆیە".

"مورتەزاغا بە قوربانت بم، ناکرێ درۆ بێ، با وەك کەو سەرمان لە بەفر رۆنەکەین".

"مەلا دۆران ئەفەندی هەتا میسرێ چووە خوێندوویەتی، ئەو گوتوویە حەمەدۆك دەردەکەوێ".

"خوایە هەزار تیری قودرەتیی وێ کەوێ... ئەتۆ ئەمەم پێ بڵێ، پێم بڵێ بزانم ئێستا مەسەلەی عەلیەشەل چ لێبکەین؟".

"یەکی دیکەی بەدوادا بنێرین، حەز دەکەی چەند کەس پیاوماقووڵ بنێرین، پێت خۆشە مەلای مزگەوتێ بنێرە".

"ئەمن دەیناسم، ئەخلاقی دەزانم نایەتەوە".

ئێستا کەوایە بۆخۆت بچوو ئاشتی بکەوە".

"چما دەکرێ, ئەمن بەم عومرەوە چۆن بچم لاقی عەلیەشەلی ماچ بکەم, گووم کردە لاقی ئەو سەگەشەلە".

ئاغا لە حالێك دا دەنگی لە ئێسکی چەنەگەی دێناو ددانی لە چیڕەوە دەبردن درێژەی دایە. ئا...خ ئاخ ئاخ. حەیفێك و هەزار مخابن کە لە عەلیەشەل بەولاوە چارەیەکی دیکەم نیە پیاو چ بکا؟

"چما ئەو برای تۆ نیە, چما براکەتت نەتۆراندوە, با گەورەتریش بی, دەبێ بچیە لای".

"لەبەرم گرانە خانم, لەبەرم گرانە. لەبەرم گرانە بچمە لای ئەو سلە گووە شەلە. بمرم باشترە".

"خوا نەکا".

"ئەوانەی دەم بینن چم پێ دەڵێن؟ دەکەومە بەر زاری خەڵك. چۆنە رابکەین و لێدەین لێرە بڕۆین؟

خۆمان لەم بەلایە دوور خەینەوە. بچین ساڵێك هەتا شەڕی حەمەدۆك لەسەر ولات لادەچێ, لە ئەدەنە وەمێنین. پێت چۆنە خانم؟".

"بۆخۆت دەزانی".

"ئەدی ئەم کاروبارە, ئەم ئەسپانە, ئەم زەوی و زارە... ئەگەر لێرە نەبم, وەختێك کە هەر کەسەی دنیایەك زەوی بۆخۆی پاوان دەکاو ئەم دەشتە بە تالان دەبا, تەگبیرم چ دەبێ؟ چارەی دیکە نیە... جگە لە هێنانەوەی عەلی هیچ چارەیەکی دیکەمان نیە... ئەو پارێزەری گیانی من بوو, چ پێویست بوو تاقیی بکەمەوە, گاڵتەی وای لەگەڵ بکەم, چما هەموو کەس گاڵتەی هەڵدەگرێ؟".

بێدەنگ بوو و سەری داخست, ماوەیەکی زۆر وا مایەوە. خانمیش لە تەنیشتی وەك خۆی بێدەنگ بوو و لە فکرەوە چووبوو. ئەو باوەڕی کردبوو کە حەمەدۆك دەردەکەوێ و رۆژێك دێ و ژنان سووك دەکا. وەختێك کچ بوو لە ماڵێ بابی زۆری لەم و لەو بیستبوو کە رۆژێك پیاوێکی سەوزپۆش دێ و پێوەندی راستی و دروستی و چاکەو بەرابەری و برایەتی لەنێو ئینسانەکان دا بەهێز دەکا, ئیدی کەس بە ناهەق هەقی کەس ناخوا, هەقی بێدەسەڵاتان لە دەسەڵاتداران دەستێنێ. لە سێبەری دا هەموو بوونەوەرەکانی دنیا بەختەوەر دەبن, روخساری خەفەتبار نامێنێ, هەموو چیاکان, دەشتەکان, دێیەکان و شارۆچکەکان و شارەکان پڕ دەبن لە گوڵ و دنیا دەبێ بە گوڵ و گوڵزارو لە جیهان دا جگە لە فکری مردن هیچ دڵەکوتەیەك نامێنێ. باشە, ئەو کەسە بۆ حەمەدۆك نەبێ؟ دیارە ئەو پرسیارەشی لە خۆی دەکرد کە داخوا

پیاوکوژێك دەتوانێ نەزەرکردەیەکی کەواسەوز بێ؟ داخوا قاتڵی عەبدی کە خۆی بە خوای پێنج ئاوایی دەزانی و زوڵمی لە خەڵکی پێنج ئاوایی دەکرد, دەتوانێ نەزەرکردە بێ؟ یان کوشتنی عەلی سەفابەگ... بەم حاڵ و وەزعەوە دەتوانێ نەزەرکردە بێ... بەڵێ دەتوانێ نەزەرکردە بێ. مورتەزاغا بە نێوچاوانێکی گرژو ئاڵۆزەوە پرسی:

"ئەوە دەڵێی چی؟".

"ئەتۆ برۆ لە دوای عەلیەشەل, ئەوەندەی بیر لێمەکەوە, هەرچۆنێك بێ دەبێ بچی لە دووی".

"راست دەکەی دەبێ بچم. (هەستایە سەرپێ) لیباس و کەوش و کڵاوشەبقە فووتێرەکەی عەلی لە کوێن؟".

"هەر کەوشەکانی لە ماڵێن. چما ئەوانی دیکە بۆخۆت نەت دان بە وەستا شەعبانی مەیتەر؟".

"ئا... ئێستا چ بکەین, کەیفمان بزووت و کاری سەیرسەیرمان کردن ها".

"گیانت سڵامەت, ئەمەش دەڕوا".

مورتەزاغا دووپاتی کردەوە:

"بەڵێ دەڕوا, ئێستا مەسەلەی جلەکان چ لێبکەین؟".

"وەستا شەعبان لەو ماڵەی خوارێ کار دەکا, ئێستا کەسێك دەنێرم جلەکانی لێ وەرگرێ و بیان هێنێ. بۆ وەستا شەعبانیش دوایە هەر لەو قوماشە دەستێکی دیکە بکڕەوەو جووتێك کەوشیشی لەسەر بێ".

مورتەزاغا بە خۆشحاڵیەوە گوتی:

"هەر ئێستا کەسێك بنێرە".

حەسنەخان یەکێك لە نۆکەرەکانی بانگ کرد. بە ئارامی موو بە موو پێی گوت کە چۆن بچێتە لای وەستا شەعبان و جلەکانی لێوەرگرێ. تاوێك دواتر جلەکان, کەوشە سوورەکان و کڵاوشەبقە فووتێرەکە لەنێو بوخچەیەکی هاوریشم دا لە پەنا مورتەزاغا دانران.

"چارەیەکی دیکەم نیە, چوون بۆ لای ئەو شەلە بێناموسە بەلای منەوە لە مردنیش خەراپترە... بەڵام لەوە زیاتر چ کارێکمان لە دەست دێ؟ ئەسپەکەم بۆ بێننە دەرێ".

"ئەسپ ئامادەیە. لەبەر دەرگا چاوەڕوانتە".

"زۆر سوپاس خانم".

"ئیشەڵلا سەرکەوتوو دەبی".

مام حەسەنەڕەش لەبەر دەرگای ئاشی بە حورمەتەوە پێشوازیی لێ‌کرد, جڵەوی ئەسپەکەی گرت و هەر کە مورتەزاغا دابەزی, ئەسپەکەی برد لەبن چناریٚ بەستیەوە:

"مورتەزاغا بەخێر بێی بۆ ئاشەکەمان, بەرەکەتت هێنا".

مورتەزاغا گوتی: زۆر سوپاس. بەڵام بە هیچ جۆر نەی‌توانی هەنگاوێك بۆ لای ئاشی هەڵێنێتەوە. ئەو ئاوەی بە شڵپ و هۆڕ لە پەڕەکانی دەداو ئەو بەردە کە دەسووڕا, هاڕەیەکی لەگوێ گرانیان هەبوو. مام حەسەن بە هیچ جۆر نەی‌دەتوانی گوێی لە قسەکانی ئاغا بێ و ئاغاش پڕ بە گەرووی هاواری دەکرد.

حەسەن خۆی پێ نەگیراو گوتی:

"راوەستە ئاغا, با بچم ئەو ئاشەی راگرم و بێمەوە".

غاری دا بۆ لای ئاشەکە. ئەو هاڕە سامناکە بە لەحزەیەك راوەستا. بێدەنگییەکی قووڵ دەوروبەری داگرت. ئەم بێدەنگییە مورتەزاغای سرك تر کرد. بە منجە منج گوتی:

"دەمەویست بڵێم کە... خەریك بووم بڵێم کە گۆیا ئەو کوڕە شێتە, عەلیی برام لێرەیە".

بە دەم قسانەوە هەوڵی دەدا پێ‌بکەنێ, بەڵام نەی‌دەتوانی.

مام حەسەنەڕەش:

"ئەو لە ژوورێیە گیانەکەم, ئەو لە ژوورێیە, زۆر باشە, ئەوەتا هاتوە بە هیچ جۆر وەدەر نەکەوتوە".

مورتەزاغا گوتی:

"بەستەزمان چۆن بێتەدەرێ, ئیمە گوویەکمان خوارد, بەڵام ئەو, گاڵتەکەمانی بەڕاست وەرگرت, دیارە گاڵتەکەی منیش کەرانە بوو... ئەرێ... کەرانە".

هەرلەوێ بە پێوە راوەستابوو. بە هیچ جۆر نەی‌دەتوانی بچێتە ژووریٚ ئاشی. حەسەنەڕەش کە تاوێك لەمەوبەر لە کاتێك دا هەموو گیانی لە ئارد دا سپی هەڵگەڕابوو, دەرگای ئاشی کردبووەوەو گوتبووی فەرموو ئاغا وەرە ژووریٚ, هەروا بە چاوەڕوانی لە شیپانەی دەرگادا راوەستابوو.

"فەرموو مورتەزاغا".

مورتەزاغا کە دەت گوت گوێی لە دەنگی نابێ, دەکریٚ بڵێین زیاتر لە نیو سەعات هەروا لەبەر دەرگا مایەوە. ویستی پێ‌بکەنێ بەڵام نەی‌توانی. ویستی قسە بکا, بەڵام نەی‌توانی.

هێندێك پرسیاری بێ سەرەو بەرەی لە حەسەنەڕەش كردو ئەویش وەڵامی دایەوە, بەڵام مورتەزاغا لەم گوێیەوەی دەهات و لە گوێیەكەی دیكەی دەچووە دەرێ. پاش ئەوەی ئەختێك دەسەڵاتی بەسەر خۆی دا پەیدا كرد, توانی زەردەخەنەیەك بكا, دیتی وەزعی باشە, دیسان چەند جاری پێكەنینەكەی تاقی كردەوە, نەیتوانی ساكارو ئاسایی پێبكەنێ, دەسبەجێ بە پێكەنینەوە چووە ژووری ئاشی و بە دەنگێكی بەرز نەڕاندی:

"كاك عەلی ئەمن هاتم, ئەگەر كێوی توورێ نەچێتە لای حەزرەتی مووسا, مووسا دەچێتە لای كێوی توور. ئێستا ئەوە هاتوومە لات. چۆنی كاك عەلییە جوانەكەم, حاڵ و وەزعت باشە؟ بزانم پیاو هیچ نەبێ بەخێراتنێكی رەق و وشكی ئاغای خۆی ناكا؟ بڕوانە كاك حەسەن, توخوا تەماشای كە, راستە, هەقی تۆیە منت نەبەخشیوە, هاتووم تكات لێبكەم لێم ببووری. برای خۆشەویست و بەڕێز. هاتووم داوای لێبووردنت لێبكەم, دەمەویست تاقیت بكەمەوە. بریا كاری وام نەكردایە. بریا زمانم لە زارم دا لاڵ بووایە. گوتم ئێستا كە قەرارە عومرێك پێكەوە برا بین با ئەو برا ئازاو بەغیرەتە تاقی بكەمەوە.

ئۆۆۆ. خۆزگە دەتۆپیم و كاری وام نەدەكرد. ئۆۆۆ, براله ئەتۆش پیاوێكی زۆر روح زل بووی, گاڵتەكەی منت بەڕاست وەرگرت؟ وەختێك جلەكانت داكەندن و فڕێت دان بۆ لای من نازانی چم بەسەر هات, نازانی حاڵم چ بوو, براله قەت چاوەڕوانی ئەوەم لە تۆ نەبوو, لەلای منداڵەكان و لەلای ژنەكانم نازانی كەوتمە چ حاڵێكەوە, بوومە بەردی سەر سەهۆڵ, خەنجەرت لێدابام خوێنم لێنەدەهات. نازانی چەند تێك چووم, نازانی... هەموو خەڵكی بازاڕو شارۆچكە خەبەردار بوون چت لەگەڵ من كرد, هەمووان زگیان پێم سووتا, گوتیان مورتەزاغا برایەكی بۆخۆی پەیدا كردبوو, بەڵام لەسەر هیچ و خۆڕایی لە كیس خۆی داو دیسان لەم جیهانەدا بەتاقی تەنیاو بێكەس و بێدەر مایەوە".

وەختێك چاوی بەو بوخچە هاوریشمە شینە كەوت كە جلەكانی تێدابوون, جلەكانی وەبیر هاتنەوەو بە توندی فەرمانی دا:

"هەستە ئەو جلانە داكەنەو ئەمانە لەبەركە بچینەوەماڵێ. ئەسپەكەت لەبەر دەرگا چاوەڕێتە".

پاشان تەماشای پشتەوەی خۆی كرد. حەسەنەڕەش لەبەر دەرگا چاوەڕوان بوو:

"ئەو جلانە ئەتۆ بۆ كاكمت كڕیون؟".

"ئەمن كڕیومن ئاغا, چ بكەین وەختێك هاتە ئاشی رووت و قووت بوو".

"کارێکی زۆر چاکت کردوه. به دڵەوه مەمنوونی ئەو میوانداریییەم که له براکەمت کردوەو ئەوپەڕی ڕێزیشم عەرزی خزمەتت دەکەم".

"زۆر سوپاس ئاغا, ئەمنیش هەزار جار ڕێزت عەرز دەکەم. دەستی مەبارەکت ماچ دەکەم".

"پارەی ئەو جلانه چەند بوو؟".

"هیچ ئاغا, شتێك نەبوو".

"چۆن هیچ؟ ئەتۆ پیاوێکی هەژاری, مانای نیه... ئەتۆ ئەو هەموو ڕێزو حورمەتەت له برای له گیان خۆشەویست ترم گرتوه ـ له حاڵێك دا پەنجا لیرەیییەکی بۆ ڕادەداشت گوتی ـ بگره بگره, ئەمەی وەرگره".

"دەغیل ئاغا, ئەمه یەکجار زۆره, یەکجار زۆره... ئەمن به ساڵێك ئەو پارەیه پەیدا ناکەم. دەستم به داوێنت ئاغا, نۆکەرتم و به قوربانت دەبم. ئەمن ئەو هەموو پارەیەم بۆ چیه؟".

"مندالّت هەن, وەریگره له گیرفانتی خه".

راوێژی دەنگی زبرو فەرماندەرانه بوو. حەسەنەڕەش نەیتوانی له فەرمانی دەرچێ. به دەستێك که دەلەرزی کیسەیەکی چووکەڵەی دەستچنی له گیرفانی دەرێنا, پەنجا لیرەییەکەی چوارقەد کردو له کیسەکەی ئاخنی.

"کاکه هەسته, هەسته ئەو جلانه داکەنەو جلەکانی خۆت لەبەر کەوه".

عەلی سەری داخستبوو, دەت گوت پەیکەری بەردە. بەرامبەر به قسەکانی مورتەزاغا چووکترین دژکردەوەی له خۆی نیشان نەدەدا.

مورتەزاغا چاوی بڕیه حەسەنەڕەش و ماوەیەکی زۆر تێیەوه ڕوانی. دەت گوت دەیەوێ داوای کۆمەگی لێبکا, بەڵام پەژیوان بووەوه.

"مام حەسەن, پیاوی پاك و چاك و دڵپاك, ئەتۆ چەند لەحزەیەك له دەرێ بە, لەبارەی تۆوه قسه لەگەڵ مەلادۆران ئەفەندی دەکەم که ئەم ساڵ ئیجارەی ئاشەکەت لێوەرنەگرێ. باشه؟".

"زۆر سوپاس ئاغا".

"ئەم ئاشه ئی مەلادۆران ئەفەندییە, وەنا؟".

"بەڵێ ئاغا".

مورتەزا بەسەر ئاماژەی کرد که دەرگا پێوەدەو بڕۆ. وەختێك ئاشەوان وەدەرکەوت مورتەزاغا گوتی:

"دوور مەکەوەوە, لە جێیەك بە ئەگەر بانگم کردی گوێت لێ بێ".

"باشە ئاغا".

"بڕوانە کاك عەلی, دەزانم, زۆرم نارەحەت کردووی و ئەو دڵە میهرەبانە لە پەلکی‌گوڵ ناسکترو جوانتر لە هاوریشم و سووکتر لە تیشکەتم شکاندوە, دەزانم دڵی بنیادەم وەك شووشە وایە, ئەگەر شکا وەك خۆی لێ‌نایەتەوە, دەزانم وەك خۆی لێ‌نایەتەوە. بەڵام دڵی وەك شووشە ناسکی برایان وا لەگەڵ یەکتر گەرمە کە لەبەر سۆزی برایەتی هەرچەندیش بشکێ و وردوخاش بێ, دیسان وەك خۆی لێ‌دێتەوە. دەتوانێ هەموو بەیانان وەك لەیلووپەڕێکی تەڕو تازە سەرلەنوێ بپشکوێتەوە. ئەدی... براله گیان...".

چوو راست رووبەڕووی عەلی راوەستا, داهاتەوەو لە خوارێ ڕا تێی هەڵڕوانی. چتە براله, بۆ وا دەکەی؟ تکا دەکەم شتێك بڵێ. هەزار جار تکا دەکەم, لەبەرت دەپاڕێمەوە. کوڕم کوشتووی و خۆم لە ماڵێ هاویشتووی. براله, عەلی. بەری پێ‌یانت ماچ دەکەم, شتێکم پێ بڵێ. ئەمن باڵندەیەکی چووکەڵەم پەنام بۆ چڵە دڕکێك بردوە. ئەو چڵە دڕکە ئەتۆی. دڵم مەشکێنەو وەرەوە سەر ماڵ و گوزەرانی خۆت... عەلی کەس لەوە زیاتر لەبەر کەس دەپاڕێتەوە؟".

چەند وشەکەی دوایەی زۆر بە قینەوە بە دەم دا هاتن, بەرە بەرەش تووڕەتر دەبوو, دەست و لاقیشی وردە وردە خەریك بوون دەلەرزین. بە دەنگێك کە دەت گوت گەرووی لەبەریەك هەڵدڕیوە نەڕاندی: قسە بکە عەلی, قسە بکە, بە نیاز نی قسە بکەی, شتێك بڵێی؟ هەتیوە لامەزەبی بێ‌دینە شەلە, خوانەناسی بێ‌ئیمان. بنیادەمی ناچار ناکەن بۆ رووحیشی ئەوەندە وەپارێ".

لەنێو ئاشەکەدا دەهات و دەچوو, لاقی بە عەرزی دا دەدان, بای دەلێوان کردبوو و سەری بەم لاو لادا دەگێڕا. دیسان پڕ بە گەرووی دەستی کرد بە دادو هاوار: سەگبابی شەلی گەوواد, بە دوو شوێن گێڕان خۆت بە گوویەك دەزانی؟ هەتیوە بەرازە, گونەبەراز. شەلی گڕوێ. هەتیوە ئەتۆش ناوی خۆت ناوە ئینسان؟

هەرچی جنێوی دەی‌زانی بە دوای یەك دا ریزی کردن, جنێوەکان تەواوبوونیان نەبوو, شەلەش هەروا وەك بەرد لە جێی خۆی رەق ببوو. تەنانەت هەناسەشی هەڵنەدەکێشاو چووکترین جووڵانی نەبوو, تەنانەت چاویشی نەدەترووکاندن.

مورتەزاغا کە تێ‌گەیشتبوو کەمێك پێی لێ هەڵێناوە, دەنگی نزم کردەوە. هێدی بووەوەو دیسان بە راوێژێکی نەرم و نیانی وەك مەخمەر دەستی بە قسە کردەوە:

"بڕوانە کاك عەلی، برای خۆت مورتەزاغا یەك دوو قسەی پێ گوتی، ئیدی مەم کوژە، ئەگەر پێت خۆش نیە بێیەوە ماڵەکەت باشە مەیەوە. ئاوا لەمن زویر مەبە، چتە ئاخر، دڵی ناسك و منداڵانەی من، دڵی برای گیانی بە گیانیی عەلیەشەل پڕ لە خوێن مەکە، یانی خەریکی وا بکەی دڵم خوێن بگریە، خەریکی هەلا بەهەلای دەکەی. عەلی قسەیەك لەگەڵ برای خۆت بکە، عەلیی، عەلیی، هیچ مەکە تەنیا یەك قسەم لەگەڵ بکە".

چووە لای، دیسان داهاتەوەو لە روخساریەوە راماو ئەمجار بە خۆشحاڵیەوە پشتی هەڵێنایەوە:

"روخسارت نەختێك نەرم بووە، ئەو روخسارە وەك گوڵ جوانەت نەرم بووە، مورتەزا بە قوربانی ئەو روخساری وەك گوڵت بێ، مورتەزا بە حەیرانت بێ. نەرم بووی، کەوایە دەتەوێ قسە بکەی، ها؟ چاوەڕێ دەبم، نەختێك سەبر بکەم... رەببی بە قوربانت بم خوایە رۆژی وا باشت هەبوون و ئەم دەزانی، کاك عەلی دەیەوێ قسە بکا، خوایە شوکور، خوایە سەد هەزار جار شوکور، شوکور بۆ تۆ عەلیت بۆ وەقسە هێنام...".

مورتەزاغا لەنێوان دەرگای ئاشی و بەردئاشەکان دا دەستی کرد بە راوێچکە: چاوەڕوانم، تەنیا یەك قسە بکە، هیچی دیکەم لێت ناوێ، هەر ئەوەندە.

چوو لەسەر بەردئاشە کۆنێك کە لە سووچێك فڕێ درابوو دانیشت. شەلاڵی ئارەق چاوی دە عەلیەوە بڕیبوون. خەریك بوو رقی هەڵدەستا. شتێکی خڕی بەقەد چنگێك دەهات بەری گەرووی دەگرت، دەیەویست خۆی بە عەلی دا بداو گەرووی رێك گوشێ، بەلام پاش کێشەکێشێکی نێو هەناوی بەسەر ئەم ویستەی دا زاڵ دەبوو.

لە کاتێك دا هەناسەی هەڵدەکێشا هەستایە سەرپێ: ناتەوێ قسەم لەگەڵ بکەی، ها؟ ئەمن ئیدی کارێکم لە دەست نایە، عەلی. چاو لە من کە... راوێژی دەنگی بە تەواوی نەرم ببوو، بۆخۆشی گوێی بۆ دەنگی خۆی راداشت. دەنگی گەرم و دڵگرو لە کانگای دڵەوە بوو، پیاو حەزی پێدەکرد: بڕوانە عەلی، کوڕم، برام، نووری هەردوو چاوم، گلێنەی چاوم، خەریکم قسەت لەگەڵ دەکەم، یازدە منداڵت هەن، تاقە ژنێکیشت هەیە، چما دەکرێ؟ ئەتۆ هێشتا جحێڵی، دەتوانی دوو ژنی دیکە بێنی، دوو ژنی وەك چەپکەگوڵ، هەر لە ئێستاوە زەوییەکی سەت هەکتاریت دەدەمێ. ئەگەر سبەینێ قەباڵەکەیم نەدایەی، خەیانەتم بە دایکی خۆم کردبێ، ئیدی سوێند لەوە گەورەتر دەبێ؟ بڕوانە عەلی، بڕوانە کوڕم، بڕوانە نێوی چاوم، ئەگەر ویستت خانوویەکیشت بۆ دەکڕم، بۆت دەکڕم چیە؟ کڕیم و تەواو بوو. خانووە دوو نهۆمییەکەی مرادی موهاجیر. گۆیا دەیەوێ بە سەدو سی لیرە بیفرۆشێ. ئەویشم بۆ کڕی، وەك

شیری دایکی خۆت حەڵاڵت بێ, سبەینێ قەباڵەی ویشت دێتە دەست. بڕوانە عەلی, کوڕم ئەگەر قەباڵەت بە دەستەوە بێ هیچ کەس ناتوانێ نە خانووت لـێ بستێنێ, نە مەزرا. بڕۆ ئەسپەکەت لەبەر دەرگا چاوەڕوانتە, لە ماڵێش فیلینتایەکی تازە کارخانە چاوەڕێتە, ڕاست وەك کچی نەسماو. باشە دەڵێی چی؟ مواجبی مانگانەت بۆ دەبڕمەوە, دەمانچە دەسك سەدەفەکەی خۆم و سەعاتە زنجیرزێڕەکەم کە عیسمەت پاشا بە دیاریی داومێ دەدەم بە تۆ"

شانیی گرت, بەسپایی ڕایتڵەکاندو لاواندیەوەو گوتی: یاڵلا برام هەستە بچینەوە ماڵێ, زۆر درەنگ بووە, هیچ دەزانی خانم چەندی خۆش دەوێی تەنانەت لە برایەکیش زیاتر, هەتا ئێستا ئەوەندە چاوەڕوانی ئێمە بووە چاوی خێل بوون, چت گوت عەلی؟ نایەوە؟

ماندوو ببوو, چوو لەسەر بەردێك کە لە قوژبنی ئاشەکە بوو دانیشت, وەك کوورەی ئاسنگەران دەهەندمی, پەڕەسلێرکە بە میچیتۆزاوی و بە داوە جاڵجاڵووکە تەنراوی ئاشەکەوە هێلانەیەکی گەورەیان دروست کردبوو, جووچکە پەڕەسلێرکە لەنێو هێلانەکەدا زاری زەردو گوشادو کەفاویی خۆیان داپچڕیبوو, هەڵلاو هەنگامەیەکیان وەڕێ خستبوو, مەپرسە.

مورتەزاغا دیسان هەستا, دەستی بۆ حەوا بڵند کردو لە حاڵێك دا بە قامك هێلانەکەی نیشان دەدا, بە پێکەنینەوە گوتی: کاك عەلی بڕوانە ئەمانە, جووجیلەکان دەمیان کردوەتەوە چاوەڕێن دایك و بابیان دانیان بۆ بێنن. ئەو یازدە جووجیلەیەی تۆش, ئەو جگەرگۆشانەت, بێ پشت و پەناو برسی و تینوو چاویان لە ڕێگایە, بۆچی ناتەوێ نەجاتیان بدەی؟ پاشان دەنگی هەڵێنا: ئێستا ئەمن, برای گیانی بە گیانیت دەستمت بۆ لا درێژ دەکەم, ئەم دەستە مەگێڕەوە. ئەو دەستەی درێژی کردبوو لە حەوا لە پەنای لووتی عەلی سەرگەردان ما. دەست چاوەڕێ ماو ئەمجار بەسپایی دەستی کرد بە لەرزین. کەوایە ئەم دەستە دەگێڕیەوە؟ باشە برام زۆر چاکە.

پاشان دووبارە دەنگی نەوی کردەوەو گەرم و دۆستانە گوتی: باشە براله, هەرچۆنێك پێت خۆشە. دەستی هێنایەوە خوارو لە ئاشی وەدەر کەوت.

عەلی زۆر ئامەزرۆ بوو, ئەم پیاوە ئەمجار هەموو بەڵێنەکانی بە جێدەگەیاند, بەڵام بە هیچ جۆر نەیتوانی جارێکی دیکە چاو لە چاوی بکات و قسەی لەگەڵ بکا, بە بیرکەوتنەوەی منداڵەکانی کە لە کێوپارەی بە پەشێوحاڵی مابوونەوە ئاگر لە دڵی بەربوو. منداڵەکانی دەیان توانی لە چوکووراوا بچنە قوتابخانە, لە وەرگێڕکەیی ماڵان و شوانی و بێگار نەجاتیان بێ...

هێندەی نەمابوو هەستێ دەست بکاتە ملی مورتەزاغاو بڵێ مورتەزاغا ئەتۆ برای هەقی منی, ئەمن دەزانم ئەتۆ دەتەویست ئاقیم بکەیەوە. هەوڵی دا, زۆری بۆخۆی هێنا, بەڵام نەیتوانی

ئەو کارە بکا, دڵی رازی نەبوو و نەیتوانی. ئێستا بە رۆیشتنی مورتەزاغا ئەو گەورەترین دەرفەتی هەموو تەمەنی خۆی لە دەست دەرچووبوو.

لە حاڵێك دا عەلی لە ژووریٚ ئاشی ئاوا لەگەڵ خۆی کەوتبووە مل ملانیٚ, مورتەزاغا کە دەستی حەسەنەرەشی گرتبوو هاتەوە ژووریٚ. دەنگێك کە دەیگرماندو خۆشحاڵانە بوو گوتی:

"حەسەنەرەش ئامۆژگاریی بکە. ئەتۆم کردە شاهیدی ئەو سوێندە کە دەمەویٚ لە حوزووری خوادا بیخۆم. هەرچی ئێستا دەیلێم دەست بە قورئان دا دەدەم و بە ناوی گەورەی خوا سوێند دەخۆم کە هەموو ئەوانەی دەیانلێم دەرهەقی عەلیەیشەلی برام بەجیٚیان بگەیەنم".

پاش ئەوەی یەك بە یەك ناوی تەواوی ئەو شتانەی برد کە دەیەویست بیان دا بە عەلی, لە حەسەنەرەشی پرسی:

"هەموو ئەوانەی ناوم بردن لەبیرت دەمێنن؟".

"بەڵیٚ ئاغا لەبیرم دەمێنن".

مورتەزاغا هاتەوە لای عەلی, دەستی لەسەر پشتێی داناو بە راوێژێکی گریاناوی گوتی:

"قسە بکە عەلی, هەستە بچینەوە ماڵیٚ".

هەژانی لەشی عەلیی لەبن دستی دا هەست پیٚدەکردو پاشان لەرزینی پشتیٚ ویشی بۆ دەرکەوت:

"یاڵلا عەلی, حەسنەخان ئەوەندەی چاو لە ریٚ کرد چاوی خێل بوون".

لەسەر قسەکانی رۆیشت, پاڕایەوە, تووڕە بوو, جنێوی دان, نەڕاندی, هاواری کرد, ناڵاندی, نەرمی و لەسەرەخۆیی نیشان دا. راوێژی دەنگی وەك ئاوی زوڵاڵی لیٚهات, بەڵام عەلی ببووە بەردو دەمی هەڵنەدەپچڕی.

مورتەزاغا بەدیتنی پەرەسلێرکەیەك کە وەك بریسکە خۆی بە ژووریٚ دا کردبوو بێدەنگ بوو. باڵندەکە هاتبوو لە دەوری هێلانەکەی دەسووڕاو جووچکە پەرەسلێرکەکان دەمیان هەتا بنانگویٚیان داپچڕیبوو و بە هات و هاوار چاوەڕێی ئەو خواردنە بوون کە دەبوو دایکیان بیان داتیٚ.

ئاغا هاتە کن عەلی, بە دەستە گەورەکانی سەریی گرت و بە زۆری بلندی کردو گوتی:

"ئەو باڵندەیەی ببینە. بیبینە... تەماشای کە... بزانە چەند بە خۆشحاڵی دانی بۆ جووچکەکانی هێناوەو دەیان داتیٚ, تەماشاکە. ئەو حەیوانێکەو ئەتۆش ئینسانێك. باش بڕوانە".

نێوچاوانی عەلی تاریك بوو, عەلی ئارەقی کردبوو و چاوەکانیشی تەڕ بوون.

"یاڵلا مام حەسەن با ئێمە بڕۆین, با ئەو تەماشا ئەو باڵندەیە بکا, شەرمی لە ئینسان بوونی خۆی بێتەوە, شەرمی بێتەوەو ئەقڵی بێتەوە جێی خۆی, ئەمن تاوێکی دیکە دێمەوە".

عەلی هەوڵی دا بە دوای دا غاردا بەڵام نەیتوانی هەستێ, ویستی قسە بکا, بەڵام زمانی نە زاری دا بەسترا, دەت گوت زمانی ئاوساوە. هەر لەوکاتەدا نەیدەتوانی چاو لەو باڵندەیە کە دەهات و دەچوو و هێندێ شتی لە زاری جووچکەکانی داویشت, وەرگێڕێ. وەختێك مورتەزاغا هاتەوە, ئەوی چۆن بەجێ هێشتبوو, هەر وای دیتەوە, دیتی کە سەری هەڵێناوەو تەماشای باڵندەکە دەکا کە خەریکە زگی جووچکەکانی تێر دەکا.

"عەلی. ناتەوێ قسە بکەی؟"

سەری عەلی دووبارە داکەوتەوە.

"باشە عەلی, ئەی شەلی شەلان ناتەوێ قسە بکەی... باشە... شەرتە بەڵایەکت بەسەر بێنم ئاسمان بۆت بگری"

فەرماندەری جەندرمەی ئەدەنە کێیە؟ دۆستی گیانی بە گیانی من دۆستی راست و ساغی من. دەبێ پەندێکت بەسەر بێنم بۆخۆت کەیفی پێ بکەی. عەلیەشەل باش باشت گوێ لەمن بێ, مەلا فەرهادو یۆیازئۆغلی تاوانبار بوون؟ ئەی بۆچی لە بەندیخانەدا کەوتوون؟ پیاوێکی خواناسی وەك مەلافەرهاد دەکرێ پیاوی کوشتبێ؟ بەستەزمانە بۆچی دەیەویست پیاوی بکوژێ؟ پیاوکوژی بۆ بکا, چ حیکمەتێکی تێدا بەستە بوو؟ بەڵام ئەوە لە ژووری بەندیخانەدا خەوتوە, لەوانەیە لە داریشی بدەن, دەزانی بۆچی تووشی ئەم رۆژەیان کرد؟ چونکە خەبەرمان زانی کە پشتیوانی لە حەمەدۆك دەکا. پاشان ئەو کابرایەکە, کەس نازانێ چ کەسەو چ کارەیە. جاسووسە؟ بۆلشەویکە؟ کەسیش نازانێ لە کوێ ڕا هاتوە. دەبێ هەتا بکرێ زووتر زاتی چەپەڵی لەنێو ببرێ. یان یۆیازئۆغلی, بۆ لە بەندیخانەدا کەوتوە؟ لەسەر گووکاریەك, بەستەزمانە لەسەر ئەسپی عەلی سەفابەگ کە حەمەدۆك سواری دەبێ لە بەندیخانەدا خەوتوە, هەربۆیەش بوو بە مایەی مەرگی عەلی سەفابەگ, مایەی مەرگی هەموومان و مایەی بەدناویی شارۆچکەکەمان لە تورکیەیەك بەو گەورەییەدا. لەسەر ئەو ئەسپەی داویە بە حەمەدۆك لە نێوەڕاستی مەیدانێ دا لەداری دەدەن. برای گیانی بە گیانیم سەرهەنگ پێشنیاری کاری پێکردووی. گۆیا دەبی بە فەرمانبەرێکی پایەبەرزی دەوڵەت و ئێمە ئاغاو بەگەکان شەبقە بە دەست بە سەلام و کەلامەوە دێینە خزمەتت. سەرهەنگ بە منی گوت: ئێستا کە براکەت عەلیەشەل ئەفەندی هونەرمەندێکی وایە, گەورەترین شوێن هەڵگری سەر ئەم جیهانەیە, شوێنی مێروولەی سەر زەوی و تەیری هەواو شوێنی جاڵجاڵۆکە لەسەر داوەکەی هەڵدەگرێ و دەیبینێتەوە, ئێمەش کاری پێ دەسپێرین و هەتا ماوە مواجبی دەدەینێ, ئەویش نەك مواجبی سەرجووخەیەکی رووت, بەڵکوو مواجبی یاوەرێکی دەدەینێ. وەختێك خۆشت مردی منداڵەکانت ئەو مواجبە وەردەگرن, بۆ ئەو

مەسەلەیەش دەست بە قورئانێ دا دەدەم و سوێندت بۆ دەخۆم. ئەتۆ بە رەسمی دەبیە شوێنگێڕی حکوومەت و مواجب وەردەگری. سەرهەنگ گوتی لە سایەی برا شوێنگێڕەکەتەوە نە چەتە لەو چیاو بەندەنانە دەمێنێ و نە دزو یاغی... شوێنی هەمووان هەڵدەگرێ و دەیان دۆزێتەوە, دەسبەجێ جێگاکەیان بە ئێمە دەڵێ و ئێمەش...".

ئەمجار هات دەستی لەسەر شانی عەلی داناو گوتی:

"هەستە, هەستە بڕۆین برا چاورەشەکەم, هەستە باب و باپیرانمان گوتوویانە هیچ بەندەیەك نیە گوناهکار نەبێ, لەسەر ئەوەی ئێمە هەڵەیەکمان کردوە ئیدی من و خۆت و منداڵەکانت لەنێو مەبە. بڕوانە, ئەو پەڕەسلێرکەیەت خۆ دی... ئەو حەیوانە چووکەڵەیە ببینن, ئەو پەڕەسلێرکەیە کە بە قەد قامکێکی تۆیە, ئەوی بکەینە سەرمەشق و شەرم لە خۆمان بکەین. بزانە پەڕەسلێرکەیەك, پەڕەسلێرکەیەك. بەو هەموو گچکەیی‌یەی خۆیەوە چۆنی ئاگا لە جووچکەکانیەتی...".

پاشان خۆشحاڵ بوو. زەردەی هاتێ:

ئەتۆ پەڕەسلێرکەکانت لە وەختی فڕین دا دی؟ چما دەکرێ نەت دیبێ, لەو ئاسمانەدا نەوی دەبن, بەرز دەبنەوە, وەك بریسکە باڵ دەگرن, وەك تیر بەرەوژوور دەچن, ئەمانە بەو ئاکارانەیان چ دەکەن؟

ئەتۆ بڵێ چ دەکەن؟ ئەتۆ لە هەموو کەس باشتر دەزانی, ئەتۆ بڵێ".

ئەمجار کەمێك کشایەوەو چاوەڕوانی وەڵامی وی مایەوە. بەو هیوایە بەڵکوو یەك قسە لە زاری ئەو پیاوە نزم و کەللەشەق و ناحاڵی‌یە دەربچێ.

"بڵێ بڵێ, بڵێ داخوا چ دەکەن؟".

وەختێك دیتی عەلی‌یەشەل بەو یاری‌یەش هەڵنەخەڵەتا, دەستی کرد بە هاوار کردن:

"دەبڵێ ئیدی, شەلی ناحاڵی, ریامە لاقە شەلەکەت, بڵێ ئەوان چ دەکەن. مێشوولە خڕ ناکەنەوە بۆ جووچکەکانیان بەرن؟ دەبڵێ گووم کردە ئەو لاقە شەلەت, مێشە شەلە... هەتیو چما ئەتۆ کێی؟ چما نافەریدەیەکی لە مێشوولە بێنرختر نی؟".

چوو بۆ لای دەرگا, دەیەویست دەرگا بکاتەوە, پەژیوان بووەوەو بەرەودوا گەڕایەوە:

گوێ بگرە, دەمەوێ ئاخر قسەم بکەم بیانووت لێ‌بڕم, چاکت گوێ لە قسەم بێ, خەتای من نیە, هەر ئەم ڕۆژانە لەبەر دەرکی ئەم ئاشە یەکێك دەکوژرێ, ئەویش لە حاڵێك دا گوللەیەك لە نێوەڕاستی چاوی دراوە, دیارە پاش ئەوەی ئەشکەنجەیان کردو پێستیان لەبەر دارنی لە جەواڵێکی داوێن و فڕێی دەدەنە پاش ئاشی.

سزای ئەو جۆرە پیاوکوشتنە ئیعدامە. پاشان پێنج کەس دێن شایەتی دەدەن کە بەم دوو چاوانەم دیومە عەلی‌یەشەل ئەو پیاوەی کوشتوە, یەکێك لەو شایەتانەش کەسێك دەبێ کە چاکەت لەگەڵ دەکاو ماوەیەکە نێرە بەخێوت دەکا, بەڵێ حسەنەرەش, ئەگەر نایەوێ شایەتی بدا, با نەیدا, خاوەنی ئەم ئاشە, دەزانی کێیە؟ مەلادۆزان ئەفەندی, ئێستا تێگەیشتی؟ ئێستا لەم دووانە یەکێکیان هەڵبژێرە, یان پەتی سێدارە یان فەرمانبەرایەتیی دەوڵەت... یان خاوەنی مەزرایەك یەکیان هەڵبژێرە..."

پاشان هەتا تین لە گەرووی دابوو نەڕاندی:

"ئەمن دەڕۆم, بۆخۆت حیسابی خۆت بکە, پێت وا نەبێ دەتوانی لە دەستم دەرچی ـ پێکەنینێکی کردو لەسەری ڕۆیشت ـ ناتوانی بچیە چیاو بەندەنان حەمەدۆك لەوێیە, لە دەشتێش ئەمن هەم... ئەمن ئێستا دەڕۆم, وادیارە ناتەوێ بێیەوە ماڵێ ها؟ ـ ددانی لە چیرەوە بردن و بە راوێژێکی وەك تف هاویشتن گوتی ـ نیشانت دەدەم".

دەرکەی ئەوەندە توند پێك دا دا کە ئاشەکە لەرزیەوە, عەلییشی لەرزاندەوە. کەمێك دواتر لە حالێك دا بەسپایی دەرگای دەکردەوە گەڕایەوە: بڕوانە عەلی, بڕوانە براله, شتێکم بیر کەوتەوە, ئێستا باشت گوێ لێبێ, لەمەودوا ئیدی بەتۆ نالێن عەلی‌یەشەل, ئەگەر پێشت بلێن زار ڕاهاتنە, بەڵێ لەمەودوا ئەتۆ ئاشەلی بەڵێ... دەڵێی چۆن؟ دەڵێم گۆیا لە بێرلین پێتەختی ئەڵمان لاقی دروست دەکەن تەواو وەك لاقی راستی لە گۆشت و ئێسقان. ئەمن یەکێك لەو لاقانەت بۆ لە برا ئەڵمانی‌یەکانمان دەکڕم, چما ئەڵمانی برای ئێمە نین؟ بۆت دەکڕم ئەگەر میلیۆنێکیشی تێبچێ, دەڵێم بۆت بێنن و بۆخۆم پێوەندی دەکەم. ئەگەر بلێن: نا, نابێ, لاقەکە دەبێ خۆمان لە ئەڵمان پێوەندی بکەین, دەچینە پێتەختی ئەڵمان و لاقە تازەکەت لەوێ پێوەند دەکەین"

مورتەزاغا زۆر لەو کەشفە تازەیەی دڵنیا بوو. ئەگەر کەسێك ئەو پێشنیارەش ڕەت بکاتەوە, ئیدی بنیادەمی لەو نزمتر پەیدا نابێ.

"بەڵێ لەمەودوا بە لاقە تازەکەت لەسەر بەردان, لەسەر شاخان, لەسەر داران و لوتکەی کێوان وەك کەو غارغارێن دەکەی, بەڵێ غارغارێن دەکەی و هەرچی شوێنە هەڵی دەگری. نا براله؟ بڕوانە پەرەسلێرکەکە دووبارە هاتەوە. بڕوانە. کاك عەلی بڕوانە. بزانە جووچکەکان چۆنیان دەم کردوەتەوە, بڕوانە سەری منیان لە دەمەوە دەچێ, ملە زەردەکەیان چۆن درێژ کردوە؟ بڕوانە بستێکیان درێژ کردوە. کەمی ماوە سەگبابانە ملیان هەڵکەندرێ..."

عەلی لەسەر قسەکەی وی سەری بۆ لای هێلانە پەرەسلێرکەکە وەرسووڕاندبوو و بە پێکەنینەوە دەی ڕوانیە ئەو جووچکانە کە هەڵلاو هەنگامەیان وەرێ خستبوو و دایکەکەیان کە لە حەوا بە دەوریان دا دەخولایەوە.

"عەلی قسە بکە".

"کوڕە دەت دەم پێستت لەبەر داڕنن ناپیاو, کوڕە دەت دەم دارت لە قوونێ بڕن. پێت وایە ناتوانم ئەمەت لەگەڵ بکەم؟ بەڵێ؟ ریامە ئەو لاقە شەلەت. کوڕە ئێمە پێمان دەڵێن پاڵەوانی سەرکەوتنی شەڕی سەربەخۆیی... بە عەلیەشەلێك ناوێرین, گووم کردە لاقە شەلەکەی؟".

ئیدی کەفی هەڵخڕاندبوو, ئاگای لە خۆی نەمابوو هەرچی بە زاری دا هاتبایە دەیگوت. لە نێو ئاشی دا ڕووبەڕووی عەلی هەڵدداو پێدای دەکردو یەك بین جنێوی دەدان, ئەو جنێودانە چەندی کێشا؟ کەس نەیزانی, نە عەلی, نە حەسەنەڕەش و نە مورتەزاغا خۆی. لەو ماوەیەدا ئەو کەسانەی دەهاتنە ئاشی کە گوێیان لە هەڵڵاو هەنگامەو قاوەقاو دەبوو, دەچوونە قوژبنێکی باغەکەی دەوروبەری ئاشی. سەرەنجام مورتەزاغا لە حالێك دا دەیگوت:

"گووم کردە دەمت شەلی گەوواد, تۆ و ئینسانەتییان نەگوتوە, ئەتۆ سزاواری زوڵم و ناهەقی و مەرگی," وەك گوللە لە دەرگای ئاشی دەرپەڕی و چوو بۆ لای ئەسپەکەی. حەسەنەڕەشی ئاشەوان دەسبەجێ غاری داو جڵەوی ئەسپەکەی گرت و رکێفی بۆ داگرت. مورتەزاغا کە خۆی هاویشتبووە سەر ئەسپەکەی, بە روخسارێکەوە کە لە رقان رەش داگیرسابوو کەمێك داهاتەوەو بەسپایی گوتی:

"پێی بڵێ... بەڕاستی لەو کەللەشەقی و گەوجییەی زۆر تووڕە ببووم, هەقمە, چما برای نیم؟ هەر دەبوو لێی تووڕە بم پێی بڵێ والی کاری دەداتێ, دەیکاتە سەردەستەی شوێنگێڕەکان و مواجبی بۆ دەبڕێتەوە, بۆخۆشم لاقێکی تازە لە لاقە شەلەکەی پێوەند دەکەم, لاقەکەی لە پێش داش چاکتر دەبێتەوە.

حەسەنەڕەش ئەگەر عەلیی برامم بۆ ئاشت کەیەوە بێنێریەوە ماڵەکەم, ئەم ئاشەت بۆ دەکڕم و دەت دەمێ. پاشان ئەتۆ پارەکەیم بە قیست وێ بدەوە. ئەمن پیاوێکم سەرم بچێ قەولم ناچێ. ئەمن ئەمشەو لە ماڵێ چاوەڕوانی دەبم".

پاشان پەرەسلێرکەکەی کە وەك گوللە لە دەرگای ئاشەکەوە چووە ژوورێ نیشانی حەسەنەڕەش داو گوتی:

"تەماشاکە, بڕوانە ئەم باڵندەیە ئەرزاق بۆ جووچکەکانی دەبا".

ئەمەی گوت و ئەسپەکەی دەنگ دا.

# (١١)

منداڵان لەسەر تەپۆلکەکەی پشت شارۆچکە لە پەنای چڵە مۆردێك لە نزیك گۆڕستانی رۆمی‌یەکان خەریکی جگێن بوون. گوڵە ئاسفۆندیلە وشکەکان هێشتا بەسەر بڕکەکانەوە مابوون. تووتڕکی کێوی و دڕك و داڵو گژوگیا لە سەرێ تا خوارێ بە نینۆکە شەیتانەی چووکەڵەی بە قەد دوگمەیەك داپۆشرابوون و سپی دەچوون. مێش و زەرگەتەی جۆراوجۆر، گەورەو چووك، بە رەنگی سووروشین و سەوز- کە هەموویان لەگەڵ خۆرهەڵات دەفڕن - بە هەڵڵاو هەنگامەو وزەوز لە فڕین دا بوون.

جاران بە جگی مەڕو بزن و گوێرەکە جگێنیان دەکرد، جۆرە یاری‌یەکی سەخت بوو. ئەم جگانە هەر لەو کاتەدا کە بە ئامرازی یاریی گەورەکان دەژمێردران بووکەشووشەی منداڵانیش بوون.

هێشتا یاری‌یەکە دەستی پێ‌نەکردبوو، ئاشق مستەفا پرسی:

"لەسەرچی یاری بکەین؟".

منداڵەکانی دیکە خۆیان بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە ئامادە نەکردبوو. زۆر وەخت لەسەر بنەسوێسنەی کێوی یاری‌یان دەکرد.

وەلی‌یە گچکە گوتی: لەسەر بنەسوێسنە. هێشتا هەشت ساڵ نەدەبوو. نەدەچووە قوتابخانە. مانی گرتبوو. بڕیاری دابوو قەت نەچێتە ئەو جێگایە کە وەك مەنگەنە وایەو پێی دەڵێن قوتابخانە. ئاشق مستەفا وەڵامی دایەوە: هێشتا بنەسوێسنەمان هەڵنەکەندوون.

"لەسەر هەنجیر".

مستەفا پرسی:

"هەنجیر لە کوێ بوو؟ بڕوانە دارەکان. قەل و داڵ هەموو هەنجیرەکانیان خواردوەو خەلاسیان کردوون".

"لەسەر زەرگەتە".

ئەو زەرگەتانەی دەزوویان لە نێو قەدێ خستبوون بە چەپ و راستیان دا باڵە فڕەیان بوو.

ئاشق مستەفا گوتی:

"ئەمن ئەگەر بدۆڕێم زەرگەتەی خۆم نادەم بە کەس. لە کاتێك دا بە دەست ئاماژەی بۆ زەرگەتەکانی دەکرد کە لە پێشیانەوە دەفڕین، لێی زیاد کرد: زەرگەتەی کەسیشم ناوێ".

هەریەکەی بەقەد قامکێك دەبوون و وەختێك لە پێش تیشکی هەتاویان رادەگرتن وەك کەلایەکی زێڕینی زەرد دەدرەوشانەوە: ئێوە قەت زەرگەتەی واتان گرتوە؟ لێرە زەرگەتەی واتان دیوە؟ ئەم زەرگەتانە نادەم بە کەس. ئەوانە بە هەر کەسەوە بدەن پێش ئەوەی بڵێ ئاخ، دەمرێ.

باس و وتوویژ درێژەی کێشا، سەرەنجام رێك کەوتن کە هەر کەس دۆڕاندی ئەوانی دیکە لە کۆڵێ کاو بچنە رەشە هەنجیرو بێنەوە. وەیسی ئەو کارەی هیچ پێ خۆش نەبوو، چونکە تا ئێستا تەنانەت تاقە جارێکیش جگێنی نەبردبووەوەو چەندین جار وەك وەڵاغ ئەو منداڵانەی لە کۆڵێ کردبوو. وەك دەڵێن وەیسیـیە چووکەڵ لە گرتنی زەرگەتەو باڵندەو مێش و مەگەزدا لینگەی نەبوو. لەم شارەدا هیچ راوچیـیەك تۆزی وی نەدەشکاند. تەنانەت جارێکیان لە کوێستان جووچکە شەهێنێکی گرت و گەورەی کرد. شەهێنەکە وای بۆ دەستەمۆ ببوو کە دەچووە هەر کوێیەك شەهێنەکەش قولانجێك لە ژوور سەریەوە دەفڕی و ئەگەر وەیسی خەریکی کارێك دەبوو، ئەویش لەسەر چڵەدارێك، لکەدارێك یان دیوارێك هەڵدەنیشت و چاوەڕێی ویی‌دەکرد. هەتا شەوێکیان شەهێنەکەی ون بوو، کەس نەیزانی چووە کوێ چیی بەسەرهات.

وەیسیـیە چووکەڵ چەند رۆژ لەسەر یەك شارۆچکەو هەموو دێیەکانی دەوروبەری ژێروژوور کرد. بەڵام باڵندەکەی نەدیەوە.

پاشان گەیشتە ئەو ئاکامە کە باڵندەکەیان دزراوە، یان بابی بە شەو بە کەسێکی فرۆشتوە. ئەو لە جێدا حەزی لە چارەی باوکی نەدەکردو لەسەر شەهێنەکەش بە توندی لەگەڵی ببووە دوژمن و چاوەڕێی گەورەبوونی خۆی بوو.

وەیسی دیسان هەروەك جاران دۆڕاندی. منداڵەکان یەك بە یەك چوونە کۆڵی هەتا ڕەشەهەنجیر چوون و هاتنەوە. هەرچەند وەیسی منداڵێکی بەهێزو ساغ بوو، بەڵام لەکۆڵ کردنی ئەو هەموو منداڵە ئەوی ماندوو دەکردو شەلاڵی ئارەقی دەکرد. وەختێك یاریـیەکە تەواوبوو، دەزووی زەرگەتەکانی خۆیان لە چڵەدرکەکان کردەوەو بە دەستیانەوە گرتن و بە دەم هەڵفڕاندنی زەرگەتەکانەوە بەرەو بناری چیا کە بە درووو تەنرابوون وەڕێکەوتن. هەریەکەی دارێکی نووك

تیژی لێڕەواریان بە دەستەوە بوو کە بە ئاسانی بنەسوێسنەیان پێهەڵدەکەندن و گیرفانە گەورەو فرەوانەکانی خۆیان لێ پڕ دەکردن.

بەدەم هەڵکەندنی بنەسوێسنەکانەوە زۆر لەو شوێنە کە زەرگەتەکانیان لێبەستبوونەوە دوور کەوتنەوە, لە رووبارێك پەڕینەوە, درۆزنەیەکی وشکیان بەجێ هێشت, جاران لووساوکەکەی کە لە داری سنۆبەر دروست کرابوو, بە لووزەو ئاوی لێهەڵدەڕژا. گەیشتنە ئالەجەجارێك, لێڕەڕا لێڕەوارێك لە داری کورتەبنەو چرویڕی ئالەج دەستی پێدەکرد. لە پاش ویش زەیتوونە خۆڕسکە کورتە باڵاکان دەستیان پێدەکرد. لە قەراخ رووبارە وشك بووەکە لەنێو دارزەیتوونەکان دا تووشی پۆلە هەنجیرێك بوون کە تا ئەو رۆژە نەیان دیبوو. هەنجیری پێوە بوون هەریەکەی بەقەد سەلکە ترخێنەیەك. منداڵەکان لە هەموو لایەکەوە پەلاماری پۆلە هەنجیریان دا.

ئاشق مستەفا گوتی: زۆران مەخۆن, ژانەزگ دەگرن. جێیەکەشی بە کەس نالێین, بۆخۆمان جاروبار دێین و دەخۆین, بڕوانن منداڵینە, تەنانەت باڵندەش بەم دارانە نازانن. ئەم هەنجیرانە دەندووکیان لێ نەدراوە. گوڵبەهار گوتی: ئەرێ, راست دەکەی. زۆریش شیرنن, دەڵێی هەنگوینن.

گوڵبەهار هەمیشە لەگەڵ کوڕان بوو, لەگەڵ کچان نەدەحاوایەوە. پاش ئەوەی تێرو پڕیان هەنجیر خواردن بەڕیز لەسەر لێوی چۆمی دانیشتن و لاقیان بەردانەوە. هەموویان پێخواس بوون, هەموویان منداڵی گەڕەکی بەرەوە بوون. هەموو خەڵکی ئەو گەڕەکە ژن و پیاو و منداڵ و کاڵ لە کێڵگەکان دا کرێکارییان دەکرد.

هەر ئەو رۆژانە هەموو خەڵکی ناوچە دەبوو بۆ لۆکە خڕکردنەوە بچنە دەشتی خوارێ. منداڵان زۆریان لۆکە چنینەوە پێ خۆش بوو, چونکە لەنێو پەمۆجاڕەکان هێندێك بڕکە شووتی و بڕکە تەماتە هەبوون. هەر چڵە شووتییەك دە دوازدە شووتیی شیرنی وەك هەنگوینی پێوە بوون و هەر بڕکە تەماتەیەکیش بە سەدان تەماتەی سوورو پڕ ئاوی گرتبوو... ئەودەم منداڵەکان وێکڕا هێرشیان دەکردو شووتی و تەماتەیان دەڕفاندن. جگە لەوە لەبن چڵە پەمۆکان دا هێلانە باڵندەش هەن و لە نێو هێلانەکان دا جاروبار جووچکەی چووکەڵە یان خڕەکە دەست دەکەون...

وەختی پەمۆ چنینەوە شەوانە کە دەست لە کار هەڵدەگیراو کرێکارەکان دەچوون بحەسێنەوە, ئاشق مستەفا سازەکەی بەدەستەوە دەگرت و گۆرانیی بۆ دەگوتن. هێندێك لە گۆرانییەکانی کۆن بوون, بەڵام, هێندێکیانی بۆخۆی دانابوون, ئەمە بەهرەیەکی خواداوە.

دیارە وەختێك پێ گەیشتبایە دەبوو بە ئاشقێکی گەلی. ڕاست وەك داداڵ ئۆغلی. هەر لە ئێستاوە چووبووە ڕیزی ئەو ئاشقانە کە ڕیشیان لەم بەزمەدا سپی کردبوو. شان بە شانی کۆنترین ئاشقەکان دەچووە پێش و بەجێ نەدەما. کە گۆرانیی دەگوت لە پێش دا دادەگیرسا, ئەمجار لەرزەیەك دایدەگرت و بە دوای ئەوەدا وشەکان وەك ئاوێکی زوڵاڵ کە لە سەرچاوەیەك هەڵدەقوڵێ و سەرڕێژ دەکا, لە لێوەکانی هەڵدەڕژان. ئەو بە توندییش ئاشقی یاغیییەکان بوو, زۆری گۆرانی بۆ وان دانابوون, چەند گۆرانیییەکیشی لەبارەی حەمەدۆکەوە هەبوون. بۆ ئەو نۆ چەتەیە کە کوژرابوون سێ سەردوولکەی دانابوون, بەڵام لەکن کەسی ئاشکرا نەدەکردن: جارێ با بمێنێ, ئەمساڵ خەڵکێکی زۆر دێنە پەمۆ خڕکردنەوە. لەو چیایانەوە خەڵکێك دێن کە زیاتر لە هەموو شتێك حەز لە گۆرانی دەکەن و ئاشق مستەفا تازیەنامەی نۆ چەتەیەکە یەکەم جار بۆ وان دەڵێ.

وەیسی گوتی:

"دوازدە پیاوی سەوزپۆشی هەموو وەك یەك لای نیوەشەوێ هاتبوون...".

گوڵبەهار گوتی: درۆیە.

مستەفا بێدەنگ بوو.

عیسمەت گوتی درۆیە.

فەوزی گوتی:

"خۆ حەمەدۆکیان نەکوشتوە... بابم گوتی, بابم ئێشك گرە, نەتان دیوە؟ دەمانچەیەکی هەیە ئا ئەوەندە گەورە, بەسەر زگیەوە هەڵاوەسراوە, بابم گوتی کە... ئەوەی کوژرا حەمەدۆك نەبوو, یەکی دیکە بوو. بابم دەیگوت حەمەدۆك گوللە کاری لێناکا, مۆری پێغەمبەری بەنێوچاوانیوەیە".

پاشان لە حاڵێك دا خۆی بە زانیارییەکانیەوە رادەنا, لەسەر قسەکانی ڕۆیشت:

"بابم سەرئێشکە... بەژنی بەقەد ئەو چنارەیە, بەقەد هۆو دارەی خوارێ".

هەموو ئەو منداڵانەی لەوێ بوون تەماشای ئاشق مستەفایان کرد کە هەروا بێدەنگ بوو.

ئاشق مستەفا بە حاڵەتێکی زۆر جیددی و بە متمانەوە هەروەك بیهەوێ گۆرانیییەك بڵێ, دەمی کردەوەو گوتی:

"ڕاست دەکا, ڕاستە ئەوەی دەڵێن کوشتوومانە حەمەدۆك نیە, یەکی دیکەیە. ئێستا دەمەوێ شتێکتان پێ بڵێم بەڵام بە کەسی نەڵێن...".

چاوی بەسەر یەك یەكی منداڵەكان دا گێڕا, ئەمجار لە حاڵێك دا دەنگی نەوی كردبووەوە گوتی:

"حەمەدۆك نەمردوە, بریندار بووە. ئەوە كە دەڵێن مۆری پێغەمبەری بە نێوچاوانێوەیە, راستە. گۆیا تەنیا ئەوێشی گوللە كاری لێ دەكا... لەوانەشە هەر ئەوێی بریندار بووبێ... ئەوە كە دەڵێن بریندار بووە راستە, وەك رۆژ روونە. دوێشەوێ یەكێك لە كۆچەرییەكانی ئایلین لە چیای ڕا هاتبووە ماڵی ئێمە, ئەم باسە نابێ كەس بیزانێ, وەختێك بەسپایی و بەدزی لەگەڵ بابم قسەی دەكرد ئەمن خۆم دەخەو كرد, هەموو قسەكانیانم گوێ لێ بوو. ئێستا هەمووتان بۆ دەگێڕمەوە. ئەگەر تاقە وشەیەكیشیتان لەلای كەسێك لە دەم دەرچێ یاوەر پێ دەزانێ. ئەودەم حەمەدۆكی بە برینداری هەر لەوێ لەداو دەخەن و دەیگرن, دەیهێننە نێو بازاڕو لە داری دەدەن. پاشانیش سەری لێدەكەنەوە دەینێرن بۆ مستەفا كەمال پاشا. ئاوا. بەڵێ, گۆیا حەمەدۆك پاش كوشتنی عەلی سەفابەگ روو دەكاتە چیاو بەندەنان. گۆیا عەلی سەفابەگ پیاوێكی زۆر زاڵم بووە, دێهاتییەكان لە دەستانی دڵ پڕخوێن بوون. حەمەدۆكیش راست لەنێوێ چاوانی دەدا. وەختێك دەچێتە چیا جەندرمەكان بۆسەی بۆ دەنێنەوە, لێی دەدەن و لە ئەسپەكەی بەردەدەنەوە. ئەسپەكەش بە ددانی هەڵی دەگرێ و بەنێو جەندرمەكان دا دەیڕفێنێ. جەندرمەكان ئەسپەكە وەبەر گوللە دەدەن بەڵام نایهەنگێون. گۆیا ئەو ئەسپە ئەسپێكی جادووییە, گوللە كاری لێناكا. ئەسپ هەڵی دەگرێ و دەیباتە ئەشكەوتێك لەسەر چیا. پاشان دەچێتە سەر دوندی چیاكە كە یەكپارچە بەردە, لەوێ دەست دەكا بە حیلاندن. ئەودەم هەژدیهایەكی باڵدار لەنێو هەورێكی سپی دەردەكەوێ و دێتەخوارێ... ئەسپەكە خۆشحاڵ دەبێ. هەژدیهایەكەی دەباتە نێو ئەشكەوتەكە. حەمەدۆك وەختێك هەژدیهایەكە دەبینێ, دەترسێ, هەژدیها بە زمانە سوورەكەی برینەكانی حەمەدۆك دەلێسێتەوە, زمانی نۆ لكی هەبوون, نۆ بڵێسە ئاگر. دەسبەجێ برینەكانی حەمەدۆك چاك دەبنەوە, ئەمە ئەو شتانە بوون كە لەو پیاوەم بیستن, دەڵێن درۆیە؟".

فەوزی گوتی:

"چما دەكرێ درۆ بێ, بابی منیش ئەمانەی بیستوە. چما دەكرێ درۆ بێ. پیرەپیاو كۆلێك ریشی سپیی هەیە... ئەوەندە".

مستەفا گوتی:

"دەڵێن كۆشێك ریشی هەیە, پیاو بەو هەموو ریشەوە چما درۆ دەكا؟".

لەوێ هەستان, چۆمەكەیان بەجێ هێشت و گەیشتنە كانگای قسڵەكە. لەوێ بێچووە كەروێشك زۆر بوون. لەوانەبوو یەكێك بگرن... مستەفا دووساڵ پێشتر بێچووە كەروێشكێكی گرتبوو. گەورەی كرد. وەختێك گەورە بوو مامی كەروێشكەكەی سەر بڕی و گۆشتەكەیان خوارد. مستەفا زۆر گریاو مامیشی وەك سەگ لە سەربڕینی كەروێشكەكە پەژیوان بوو.

ئێستا ئەگەر مستەفا بێچووە کەروێشکێکی دیکەی گرتبایە, مامی قەتی سەر نەدەبڕی.

گەیشتنە کانگا قسڵەکان. هەموو جێیەکیان هەنگاو بە هەنگاو وەك چاڵ هەڵکەندبوو. کۆمایەك بەردی سپیی نیوە سووتاویان لە چاڵەکان هاویشتبوو.

کە گەیشتنە چاڵەکان لە دوورەوە بۆنێکی توندیان بەبەر لووتی هەڵڵا هات. لە جێی خۆیان راوەستان و چاوەڕێ مان. بایەکی نەرمی دەهات کە لە دوورەوە شەپۆلی ئەو بۆنە توندەی لەگەڵ خۆی دێنا.

عاشق مستەفا گوتی: دیمانەوە.

فەوزی پرسی: چی؟

عیسمەت گوتی: دەتەوێ چ بێ, تەرمی چەتە کەچەڵ... گۆیا تەرمەکەییان لە چاڵە قسڵ هاویشتوە.

وەیسی بە نیگەرانی و شڵەژاوی گوتی:

"ئەمن دەترسم, ئەمن زۆر لە مردووی دەترسێم, وەگەڕێن, با هەڵێین".

ئاشق مستەفا بە توندی گوتی: نابێ, هەموومان پێکەوە دەچینە وێ.

فەوزی گوتی: مەترسە وەیسی, ئەتۆ خۆ دەزانی, چما بە چاوی خۆت نەت دی کە بابم دەمانچەیەکی گەورە بەسەر زگی دا هەڵواسراوە.

مستەفا گوتی: ترسی ناوێ. چما ئەتۆ پیاو نی؟

گوڵبەهار کە بەرەو چاڵە قسڵەکان وەڕێ دەکەوت گوتی: یاڵڵا با بڕۆین.

مستەفا نەڕاندی: کچێ ئەتۆ راوەستە, لە حاڵێك دا لووتی خۆیان گرتبوو هەتا نیزیك چاڵە قسڵەکان غاریان دا. لەسەر چاڵێك راوەستان و لێیان روانی. مستەفا گوتی:

"لێرەدا نیە, با بگەڕێین" لەوبەر, لە دەشتایییەکی رووتەنی پشت چاڵەکان رەوە سەگێك و پۆلە کەلاك خۆرەیەك بە چاوەڕوانییەوە رووبەڕووی یەکتر ریزیان بەستبوو. سەگەکان لە رەگەزی سەگە زەلامەکانی بەرمێگەل بوون و کەلاك خۆرەکانیش پیر بوون و کەڵەگەت. سەگەکان لە جێی خۆیان نەدەبزووتن, لەسەر پل و ئامادەی هێرش چاویان لە داڵاشەکانەوە بڕیبوو. هەر تاوە ناتاوێك چەند کەلاك خۆرە بێئەوەی باڵای بەرزی خۆیان راوەشێنن دەنیشتنەوەو بە هەڵبەز هەڵبەز تێکەڵ بە سیسارگەکەچەڵەکان دەبوون.

وەیسی هاواری کرد: لێرەیە. لەم چاڵەدایە, ئەمەیان زۆری بۆن لێ‌دێ. جەنازەکە نابینرێ, بەڵام زۆری بۆن لێ‌دێ, لێرەیە.

منداڵەکان لەسەر زاری چاڵەکە خڕ بوونەوە, بۆنێکی توند لەنێو چاڵەکە دەهات. کانگا قسڵەکە هەتا سەر زارەکەی پڕ بوو لە پەپوولەی شین.

ئاشق مستەفا گوتی: جەنازەی چەتە کەچەڵ لێرەیە.

ئەمجار لە حاڵێك دا قەڵافەتێکی زانایانەی بەخۆوە گرتبوو, لێی زیاد کرد:

"پەپوولە لەسەر دوو شت دەنیشێ, یەك لەسەر گوڵی جوان, یەکیش لەسەر جەنازەی بنیادەمی چاك".

لەو سەدان هەزار پەپوولە شینە کە لە چاڵەکە هەڵدەفڕین تیشکێك بۆ دەرێ و بۆ سەرێ دەهات و دەوروبەریانی لە ڕووناکاییەیەکی شینی وەك مژ دا نوقم دەکرد. لەحزەیەك گێژەڵووکەیەکی پەپوولە لە زارکی کانگا هەستاو دووبارە لوور بووەوە نێو چاڵەکەو دامردەوەو منداڵەکان توانیان ساتێك جەنازەکە ببینن. مردووەکە رووت و قووت بوو. لە نێوەڕاستی سەرە بێتووك و بریقەدارەکەی دا چەند دەڵەمە خوێنێك دیار بوون. لاقێکی لە لەشی جیا ببووەوەو شوێنەواری نەمابوو, گۆشتی لاقەکەی دیکەشی چووبوو و تەنیا ئێسکێکی سپی و درێژ دیار بوو. چاوێکی چەتەکەچەڵ بە کراوەیی مابوو. بە حاڵەتێکی گاڵتە پێهاتنەوە دەیڕوانیە منداڵەکان و ئەو پەپوولانە کە لەحزەیەك پێشتر هەستابوون و ئەو پۆلە دالاشە کە لە ئاسمان دا چەرخیان دەدان.

وەختێك پەپوولەکان نیشتنەوە مستەفا بە منداڵەکانی گوت: یالڵا با بڕۆین, زۆری بۆن دێ.

شەکەت و ماندوو هاتنەوە خوار بۆ ئەو شوێنە کە زەرگەتەکانیان لێ بەستبوونەوەو دەزووی زەرگەتەکانیان کردەوە. مستەفا زۆر بێواز بوو, لچ و لێوی داچۆڕابوون. دەزووی زەرگەتەکانی یەك لە دوای یەك لە چڵە دڕکەکان دەکردەوەو هەڵی دەفڕاندن, منداڵەکانی دیکەش وایان کرد. مستەفا هەتا ئەو کاتە کە زەرگەتەکان فڕین و دوور کەوتنەوە لە جێی خۆی لە بن چڵە دڕووەکە هەڵترووشکاو دانیشت. روخساری زەرد هەڵگەڕابوو و قسەی نەدەکرد. منداڵەکانی دیکەش بە روخساری زەردەوە هاتن و بەڕیز لە پەنای دانیشتن, ئەوانیش لە وەزعێك دا نەبوون کە دەم بکەنەوەو قسەیەك بکەن. ماوەیەکی زۆر وا تێپەڕی, خەریك بوو رۆژ ئاوا بێ. سەرەنجام مستەفا سەری لەسەر سنگی هەڵگرت. چاوی پڕ لە فرمێسك بوون. ئەگەر خۆی ڕانەگرتبایە لە بانگی گریانێی دابوو. بە دەنگێکی نووساوەوە گوتی:

"کەوایە ڕاستیان دەکرد کە چەتە کەچەڵ بێ کەس و کار بووە, جەندرمەکانیش هێناویانەو لەوێیان هاویشتوە".

بێدەنگ بوو. ئەگەر قسەیەکی دیکەی کردبایە فرمێسکی هەڵدەڕژان. پاش نەختێك ڕاوەستان خۆی ڕاگیر کردو پرسی: چ بکەین منداڵینە...؟ ئەمشەو سەگەل ئەم مردووەی

دەخوا, ئەو سەگانە چاوەڕوانن شەو دابێ, کە شەو داهات کەلاك خۆرەکان دەڕۆن و جەنازەکە بۆ سەگان دەمێنێتەوە.

فەوزی گوتی: هەتا بەیانی راوەستین, بابم دەمانچەیەکی دیکەی هەیە...

مستەفا وەڵامی دایەوە: ناتوانین راوەستین, دەبێ کارێك بکەین.

وەیسی وەك لەبەر خۆیەوە قسە بکا لەبن لێوانەوە گوتی: ئەمن ئیدی لە جەنازە ناترسم, ئەویش مردووی وا.

جەماڵ گوتی: ناکرێ بیدەینە دەست سەگان, ناکرێ.

بێدەنگ بوون و کەوتنە بیرکردنەوەیەکی قووڵ.

مستەفا گوتی: ئەوە شەو دادێ.

عیسمەت پرسی: چ بکەین؟

مستەفا هەستا, ئەوانی دیکەش لەگەڵی هەستانە سەرپێ.

"بە فکری ئێوە دەبێ چ بکەین؟".

مستەفا ئەم قسەیەی بە راوێژێکی ناخاترجەم بە دەم دا هات.

جەماڵ بە هەڵەداوان دووپاتی کردەوە: چ بکەین؟

"ئەو تاغەڵە مەڕەتان دیوە؟".

هەموو پێکەوە چاویان لە هۆڵە مەڕێك کرد کە لە خوارەوەی کانگا قسڵەکان بوو.

"ئەگەر بتوانین مردووەکەی لەو قوولکەیە دەربێنینەوە دەتوانین بیبەینە وێ".

هەموویان وێکڕا هاواریان کرد بڕۆ و غاریان دا بۆ ئەولا. لە پێش دا مستەفا, دوای وی وەیسی و پاش وان ئەوانی دیکە بە چاڵەکەدا چوونەخوار. لەنێو تاپۆرای پەپوولەکان دا بە زەحمەت توانیان جەنازەکە ببینن.

دەتوانین دەری بێنینەوە.

جەماڵ گوتی:

"ئەمن پەتێکم لە پشتێ بەستوە, لە موو دروست کراوە, نیزیکەی دوو باڵ دەبێ, دایکم...".

پەپوولە دەچوونە نێو زارو تفنکانی. بە دەست دەری کردن:

"دایکم بەبێ ئەو پەتە من نانێرێتە هیچ کوێیەك, ئێستا تێدەگەم بۆچی..." لە حاڵێك دا بە دەوری خۆی دا دەسوورا پەتەکەی لە پشتێندێ کردەوەو دایە دەستی مستەفا: جەنازەکەی پێوە ببەستە ئێمە دەچین لە سەرێ را هەڵیدەکێشین.

وا تووشی هەژانی دەروونی ببوون کە هەستیان بەبۆنی سامناکی جەنازەکە نەدەکرد. وەختێك مردووەکەیان بە راکێش راکێش گەیاندە هۆڵە مەڕەکە هەتاو ئاوا ببوو و خەریك بوو تاریك دابێ. دەرکی هۆڵەکەیان بە تێلێك کە لەوێ دیبوویانەوە قایم کرد. سەگە زەلامە دڕندەکان کە سیسارگەکانیان بەجێ هێشتبوو، هاتبوون لەسەر پاشووان هەڵتووتەکابوون و چاویان لە ئاغەڵەکەوە بڕیبوو. منداڵەکان گوێیان نەدانێ، هەرچەندی پێیان خۆش بوو با چاوەڕێ بن. پێش ئەوەی شەو دابێ گەیشتنەوە ماڵێ. ئەو شەوە، هیچ کامێکیان نە پارووە نانێکیان خواردو نە قومە ئاوێك لە گەروویان چووە خوار. هێشتا هەتاو نەکەوتبوو کە منداڵەکان لەبن دارەبەنێك کەلە خوار هۆڵە مەڕەکە بوو، خڕ بوونەوە. لە پێش دا وەیسی بە خۆی و دوو چارشێوی سپیی وەك بەفرەوە کە بۆنی سابوونیان لێدەهات گەیشتە وێ. دزینی چارشێوەکان لە قەدریەخانی بێوەژنی پۆستەچی کارێکی ئاسانیش نەبوو. وەیسی جێی چارشێوەکان، واتە ئەو ژوورە کە ژنەکەو زڕکچەکەی لێی دەخەوتن باش شارەزا بوو. بە ئاسانی وەك پشیلە بێدەنگ و هەرا چووە نێو ماڵەکە. بەڵام وەرە بڕوانە ئەو نەگبەتی‌یە. قەدریەخان بەنیاز نەبوو بخەوێ. وەیسی لە دەنگی هەناسەی کەسێك ڕا دەیتوانی بزانێ خەوی لێکەوتوە یان بەخەبەرە. چونکە شەوانە دزی‌یەکی چووکەڵەی دەکردو شتێکی بۆ خواردن دەدزی. بۆیە ببووە هەناسەناسێکی کارامە. وەستایەك بوو ئەگەر گوێی بۆ هەناسەدان و هەناسەهەلکێشانی کەسێك راگرتبا، دەیتوانی بزانێ کە بۆ وێنە خەون دەبینێ و تەنانەت خەون بە چییشەوە دەبینێ... قەدریەخان نیازی نووستنی نەبوو. وەیسی لە دەنگی هەناسەکێشان و هەناسەدەرکردنی دەیزانی کە تەنانەت بیر لە چییش دەکاتەوە. بەڵێ. بەڵام هیچ بە کەس ناڵێ. ئاخر ژنەتیو فکری لە شتی خەراپ خەراپ دەکردەوە، وەیسی لەبەر هەیوانی چووکی ماڵێ دا خۆی شاردبووەوەو چاوەڕوان بوو. یانی ئێستا ئەگەر ئەم ژنە ناجسنە نەخەوێ چ دەبێ؟ چەتە کەچەڵ بێ کفن دەمێنێتەوە؟ بەڕاستی ئەو کەچەڵە بەستەزمانە بەڵای زۆر بەسەر هاتوون... بەڵام ئاخرەکەی ئەو پەپوولە چووکە شینانە دایان پۆشی و کفنیان کردو نەیان هێشت جەنازەکەی سەگەل و سیسارگ و مارو مێروو بیخۆن. ئەو پەپوولە چووکە شینانە کە هەریەکەی بەقەد گوڵە مینایەك چووکەڵە بوون. بەڵام بۆچی؟ چونکە چەتە کەچەڵ... چما گوێت لێنەبوو دایکی چیی دەگوت؟ ئاشقی دادپەروەری بوو. سازی بە دەستێکەوە بوو و ماوزەر بە دەستێکەوە، بەڵام هەرگیز کەلکی لە ماوزەر وەرنەدەگرت و... هەمیشە لە چیاو بەندەنان سازی لێدەداو گۆرانیی خۆڵاتیی دەگوتن، تەنانەت مێروولەیەکیشی ئازار نەدابوو، دەنگێکی ئەوەندە خۆشی هەبوو هەر مەپرسە. وەختێك گۆرانیی دەگوت کێو و شاخ و باڵندەو پەڕۆ زمانیان دەکردەوە. کچان هەموو بێ‌ئەوەی بیر لە سەرە کەچەڵەکەی بکەنەوە ئاشق و سەوداسەری بوون. ئەگەر چەتە کەچەڵ نەزەرکردە نەبوو، ئەو هەموو پەپوولە شینە لەو قوولکەیدا چییان دەکرد؟ هەموویان بریسکەدار، هەموویان نوورانی، پەپوولەی شین و درەوشاوەو بریقەدار وەك تیشك... لەجێ‌دا لەم جیهانە پەپوولەی وا دەست دەکەوێ؟ باشە. بەو

تایبەتمەندییانەوە رەوابوو چەتە کەچەڵ بێ کفن بێنێتەوە؟ وەیسی لەو جێیەدا کە خۆی لێ شاردبووەوە دەستی پاڕانەوەی بەرەو ئاسمان راگرت و گوتی: خوایە کارێك بکە ئەو ژنەتیوە بەرەڵا جندەیە بخەوێ. سبەینێ پوورە قەدریەخان هەر کە لە دزرانی چارشێوەکانی ئاگادار بوو, دەیکاتە قیامەت, با بیکا. بەڵێ. بێ ئەملاو ئەولا دزینی چارشێوەکان بەسەر وەیسیدا دێنێ, بەڵام رەنگە بۆ یەکەم جار لە گەڕەکێ دا خەڵکی کووچەی لەسەری وەجواب بێن: بڵێن بزانین, بەڕاستی بڵێن بزانین وەیسی چارشێوی بۆ چیە؟ چما شیرنیاتە بیخوا, چما پارەیە هەڵی گرێ...

بەرەبەری بەیانی وەیسی لە دەنگی هەناسەی پوورە قەدریە ڕا زانی کە تاوێکە خەوی لێکەوتوە, لە خۆشییان باڵی گرتن, دەسبەجێ چووە سەر سندووقی جلەکان. هەر کە دەرگای سندووقی کردەوە بۆنی نەرمی سێوی کوێستان و سابوونی لە دەم و چاوان درا. لەبەر خۆیەوە گوتی: خوایە ئەگەر ئەم چەتە کەچەڵە بەندەیەکی باش و نەزەرکردەی تۆیە, یەکێك لەو چارشێوانەم بەردەست کەوێ کە گوڵی نارنجی و گوڵە وەنەوشەی شینی کاڵی لەسەر چنراون, هەر کام لەو پەپوولانە بەقەد گوڵە وەنەوشەیەك دەبوون و رەنگیشیان بنەوشی بوو. هەر کە دەستی درێژ کرد گوڵدۆزییەکی زبری هاتە بەردەست, هەر ئەو چارشێوەی دەرکێشا. بێدەنگ و بە ئاسانی وەك پشیلەیەك بە نەردیوانی دا خزی و هاتەخوار. وەك هەمیشە بە زگە خشکە بە بن چوارچێوەی دەرکی حەوشەی دا وەدەر کەوت و گەیشتە مەیدانێکی ئاوەڵا, لەوێشەوە بێئەوەی چارشێوەکە لەزەوی بدری و پیس ببێ, خوشی و خۆی گەیاندە بن دارەبەنەکە. بەدەست لێکوتان جارێکی دیکە لە گوڵدۆزیی چارشێوەکە ورد بووەوەو لە بوولێڵی بەیانی دا گوڵە وەنەوشەکانی دیتن. هەموو شتێك بەباشی چووبووە پێش, لەوێ تەنیا بوو, خەریك بوو بتۆقێ, نەیدەوێرا بە سیلەی چاویش تەماشای ئاغەڵەکە بکا. ئەگەر یەکێك لە منداڵەکان هاتبایە هەموو کارەکان جوور دەبوون. ئەگەر ببانە دوو کەس کەمتریش دەترسا, لەوانەبوو هەر نەش ترسێن. بەرە بەرە ترسەکەی زیادی کرد, بە دەنگە دەنگێك کە لە پشتیەوە هات دەسبەجێ گوێی هەڵخست, خەریك بوو رابکا کە تێگەیشت گوڵبەهارە دێ. بە پیریەوە چوو, کچۆڵەکە هەناسەبڕکەی وێ کەوتبوو. شووشەیەکی گەورەی یەك لیتریی کۆلۆنیا بەدەستەوە بوو. هاتنە بن دارەکە, خەریك بوو دنیا رووناك دەبوو, بە جۆرێك کە چاوە چووکەڵەکانیان دەیان توانی هەموو شتێك لە نیزیکەوە لێك بکەنەوە.

"ئەوە چیە پێتە گوڵبەهار؟"

"هیچ, کۆلۆنیایە"

"له کوێت دزیوه؟".

"له جیازی خوشکه نازلی, ئەو پازده دانەی دیکەی لەمانه هەیه, زۆر خەراپی بۆن کردوه, پێی دا دەکەین".

"ئەمنیش که دەهاتم له رێگادا کفنم بۆ پەیدا کرد...".

"جوانه؟".

"زۆر جوانه, گوڵدۆزی کراوه, سوپاس بۆ خوا یەکێك له رێگادا لێی کەوتبوو, لەو رێگایەدا که پێی دا دەهاتم...".

گوڵبەهار به راوێژێکی خەمناکەوه گوتی:

ئەمن له رێگادا هیچم نەدۆزیەوه, دزیم".

"قەیدی نیه, ئەمه به دزی دانانرێ, کارەکەت زۆر بەنرخه, هەموو جەنازەیەك کۆلۆنیای پێدەکەن, بۆچی جەنازەی چەتەی ئێمه دەبێ پێی دا نەکرێ".

لەو بەینەدا یەکێك که به ئاخ و داخ گوتنەوه له هەورازەکه سەر دەکەوت به دەنگێکی ترساوی‌یەوه پرسی:

"کێیه لەوێ؟".

"ئەمنم و گوڵبەهار".

"وەرنه ئێره, بۆم سەر ناکەوێ, ماندوو بووم".

وەیسی پرسی: ئەتۆی جەماڵ؟ ئەمجار رووی کرده گوڵبەهارو گوتی: ئەتۆ لێره بەو بۆخۆی چووه خوارێ. جەماڵ به دەستێك سووچی حەسیرێکی گرتبوو و بەسەر زەوی دا رای دەکێشا. پاچێکیشی به دەستەکەی دیکەوه بوو.

زۆری پێ نەچوو دەنگی فەوزییش بیسترا. وەختێك حەسیرەکەیان هێنایه بن دارەکه عیسمەت و مستەفاش هاتن. سەرو کەللەی فەوزییش دەرکەوت که پارووه سابوونێکی گەورەی بەدەستەوه بوو. عیسمەتیش پێمەڕەیەکی دەست کەوتبوو, لەگەڵ خۆی هێنابوو. مستەفاش تەورداسێك و پێمەڕەیەکی هێنابوون.

هەتا دنیا رووناك بوو منداڵەکان چوونه کانگا قسڵەکان... چاڵه قسڵەکان هەتا سەر زارکیان پڕ بوون له پەپوولەی بریقەدار که هەریەکەی بەقەد گوڵه وەنەوشەیەك دەبوون. پشتێ پەپوولەکان به شەونمی بەیانی تەڕ ببوو. لەوێ ڕا چوونه خوارێ بۆ لای ئاغەڵەکه, سیسارگ و کەلاك خۆره به باڵی داچۆڕاوەوه لەسەربانی هۆڵەکه نیشتبوون. کەلاك خۆرەکان به ریزێك و

سیسارگەکان بە ریزێکی دیکە بە چاوەڕوانیەوە ڕووبەڕووی یەکتر ریزیان بەستبوو. ئاغەڵەکە لە گەمارۆی سەگان دا بوو. ئەوان بە تەنیشت یەکەوە لەسەر پاشووان هەڵتووتەکابوون و لە دیواری هۆڵەکەوە رامابوون. مستەفا گوتی:

"بەخۆڕایی هاتینە ئێرە, دەبوو لە پێش دا قەبرەکە هەڵکەنین".

فەوزی گوتی:

"با مردووەکە بەرینە گۆڕستان, قەبرەکەی لای نیوەڕۆیە هەڵدەکەنین, لە نیزیک گۆڕستانەکە ئاویش هەیە مردووەکەی پێ بشۆین, ئەمن پارووە سابوونێکم هێناوە".

گوڵبەهار گوتی: "ئەگەر یەکێك چاوی پێ کەوتین؟...".

عیسمەت گوتی: باشە, با چاوی پێ بکەوین, چما چ دەبێ؟ گۆڕستان جێگای مردووانە ئیدی...

ماوەیەکی زۆر باسیان کرد. سەرەنجام مستەفا تەسلیمی قسەی منداڵەکان بوو. وەختێك دەرکی هۆڵەکەیان کردەوە بۆنێکی وایان بەبەر لووتی هەڵڵا هات کە دەسبەجێ هەموویان گێژ بوون. گوڵبەهار دەسبەجێ هات و نیوەی شووشە کۆلۆنیاکەی کە جیازی خوشکێی بوو, بەسەر مەیتەکەدا کرد. خێرا جەنازەکەیان هێنایە دەرێ. لە دەرێ لەبەر بای بەشێك لە بۆنی کۆلۆنیاکە لەنێو چوو. کەلاك خۆرەو سیسارگەکان هەرچەند تەرمەکەیان دی لە جێی خۆیان نەبزووتن. قسەی خۆمان بێ منداڵەکان بە دارو بەرد ئامادەی هەر جۆرە بەربەرەکانێ دانەوەیەك بوون. مردووەکەیان خستە سەر حەسیرو بە ئاسانی گەیاندیانە گۆڕستان. گوڵبەهاریش شووشە کۆلۆنیاکەی بە جەنازەکەدا کردبوو. چەتە کەچەڵیان هێناو لە قوولکەیەك دا کە لەبن چڵە درکێك بوو دایان نا. سیسارگەکان, کەلاك خۆرەکان و سەگەکانیش لەگەڵیان هاتبوون. سەگەکان هاتن و هەروەك بە دەوری ئاغەڵەکەدا کۆزیلکەیان بەستبوو, لە دەوری جەنازەکەش کۆزیان بەست و لەسەر پاشووان هەڵتووتەکان. سیسارگ و داڵاشەکان بە تەمبەڵی و بێ‌وازی هاتنە نێو گۆڕستان, کەلاك خۆرەکان لە لایەك و سیسارگەکان لە لایەکی دیکە چاوەڕوان مان. مستەفا گوتی:

"دەبێ بچین مۆرد ببڕین, کێ لەگەڵ من دێ؟ کێ لێرە دەمێنێ ئاگای لە مردووەکە بێ؟".

جگە لە گوڵبەهار هەموان دەیانەویست لەگەڵ مستەفا بچن. مستەفا فەرمانی دا: وەیسی ئەتۆ لەگەڵ گوڵبەهارێ لێرەبە. باش وریای جەنازەکە بن, مەیەڵێ سەگەکان و کەلاك خۆرەکان نیزیکی بکەونەوە.

ئەختێك لەولای کانگا قسڵەکان جارە مۆرد بوو کە هەتا چۆمی و لێرەواری سنۆبەر درێژەی هەبوو. مستەفا لەو جۆرە کارانەدا بە تەواوی وەستا بوو. لە ماوەیەکی کورت دا بەشی

قەبرێکی مۆرد بڕی. منداڵەکان لە کاتێك دا هەریەکەی باوەشێکیان مۆرد پێ بوو, هاتنەوە گۆڕستانەکە. کەلاك خۆرەکان, سیسارگەکان و سەگەکان هێشتا لە جێی خۆیان نەبزووتبوون. مۆردەکانیان لەسەریەك دانا. نێوانی قەبرەکان بە تەپۆلکەیەك مۆردی سەوزی کاڵ داپۆشرابوو. بۆنی توندی مۆرد, بۆنی جەنازەکەی وەبن خۆی دا.

لەوە کە مۆردیان هێنابوو, شانازییان بەخۆیانەوە دەکرد, لەوێ هیچ مردوویەك بەبێ مۆرد نەدەنێژرا.

فەوزی گوتی:

"کارەکەمان زۆر باش بوو, مردوویەك بە مۆردەوە نەنێژرێ بە کەلك نایە, جەنازەی چەتە کەچەڵ ئێستا بووە بە جەنازەیەکی تەواو و حیسابی. ئێستا با بیشۆین".

مستەفا بە پێداگرتنەوە گوتی:

"نابێ, مەنجەڵمان لەکوێ بوو, دەبێ ئاوێ گەرم کەین... نابێ, دەبێ لە مزگەوتێ بیشۆین".

فەوزی گوتی:

"لە گۆڕستانیش دەبێ. جەنازەی لە ماڵانیش دەشۆن".

وەزعەکە تێك چوو هەرکەسە قسەیەکی دەکرد. لەسەر ئەو مەسەلەیە کە جەنازەکەیان بشۆن یان نا, ڕێك نەدەکەوتن. سەرەنجام دیسان ئاشق مستەفا سەروکلکی مەسەلەکەی پێك گرت و بڕیەوە:

"ئەوە پێتان دەڵێم. حەز دەکەن بچن لە مەلایەکی زاناش بپرسن. شەهید شوتنی ناوێ. مەلایکەتی خوای گەورە لەشی پیرۆزی شەهید دەشۆن و پاك و خاوێنی دەکەنەوە. پێم بڵێن بزانم چما چەتە کەچەڵ شەهید نەبووە؟ ئەگەر ئەو شەهید نەبێ, ئەدی ئەو پەپوولانە کە وەك کفن لەشی وییان داپۆشیبوو چ کارەن, ئەو پەپوولە شینە چووکەڵە چووکەلانە, ئەو پەپوولە نوورانییانە...".

بە قسەکانی ئاشق مستەفا دنیا بوو بە ئاشی ئاو لێبڕاو. ئیدی کەس نەیتوانی قسەیەك لەم قسەیە بکا. فەوزی نێوچاوانی تێك ناو نەختێك ئەولاتر لە حاڵێك دا سابوونێکی گەورەی بە دەستەوە بوو, گێژو سەرسوڕماو لە جێی خۆی رەق بوو.

"زۆر باشە, چما مردوو بە بێ دوعا دەنێژرێ؟".

مستەفا, بە ئارامی و ماندوویی گوتی:

"دوعا ئەمن دەیخوێنم. کێ بەقەد من دوعا دەزانێ؟... ئەمن ئێستا دوعا دەخوێنم و خێرەکەشی بۆ روحانەتی چەتەکەچەڵ بەرێ دەکەم. یاڵڵا با جێیەك وەبینین قەبرەکەی لێ هەڵکەنین".

ئەم مەسەلەیەش باسێکی درێژی لەسەر کرا. سەرەنجام لە نێوەڕاستی گۆڕستان لەبن دارەتوویەك جێیەکیان هەڵبژارد, بەڵام خاکەکەی وشك و وەك بەرد رەق بوو, زۆر بە زەحمەت عەرزیان هەڵکەند. وەختێك کاری هەڵکەندنەکە تەواو بوو, هەموویان لە ئارەق دا شەڵاڵ ببوون, لە شەکەتییان نەیان دەتوانی ببزوون. مەیتەکەیان هێنایە بن دارەکەو لە چارشێوەکەی قەدریەخانیان وەرپێچا کە بە رەنگی نارنجی گوڵدۆزی کرابوو و گوڵی بنەوشیی پێوە بوون. گوڵە بنەوشییەکانی چارشێوەکە وەك پەپوولە دەچوون. جەنازەکەیان بە ئارامی و بە پارێزەوە لە گلکۆکە هاویشت و سەری جەنازەکەیان لەسەرەخۆ بە لکە مۆردان داپۆشی و پاشان گڵیان وەسەر کردن. لەبن دارەتووەکە تەپۆلکەیەکی درێژ لە گڵی تازە دەبینرا.

فەوزی لە حاڵێك دا غاری دەدا, گوتی: راوەستن ئێستا دێمەوە. منداڵەکان چار ناچار چاوەڕێی مان. هاتنەوەی فەوزی وەدرەنگ کەوت. منداڵەکان لەسەر بەردە قەبرەکان دانیشتن. فەوزی هاتەوە نەمامە بییەکی بە قەد باڵای خۆی بەدەستەوە بوو:

"بە رەگەوە هەڵم کەندوە, وشك نابێ, ئەگەر باشی بنێژین وشك نابێ".

منداڵەکان خۆشحاڵ بوون. قوولکەیەکی قوولیان لەلای سەرینی گۆڕەکەوە هەڵکەند. گوڵبەهار گوتی: هەتا ئەم دارە گەورە دەبێ, هەموو رۆژێ دێم و ئاوی دەدەم.

وەیسیش لێی زیاد کرد: ئەمنیش هەموو رۆژێ لەگەڵ گوڵبەهارێ دێم.

ئاشق مستەفا هاتە نێو قسەکان:

"وەختێك ئەو نەمامە گەورە بوو, پەپوولەکان دێن لە سەری دەنیشنەوە".

منداڵەکان ماوەیەك لە دەوری گلکۆکە بێدەنگ راوەستان. مستەفا لەبن لێوانەوە هێندێ شتی گوت, شتی وەك دوعا, بێدەنگیی تەواو بوو, تەنانەت دەنگی باڵی زەرگەتەیەکیش نەدەهات. هەتاوێکی تیشك دار بە زەوییەوە پان ببووەوە, لە خوارەوەی کێلە قەبری ئەوبەر پەپوولەیەکی بەقەد هەردوو لەپی دەستی منداڵێك کە رەنگی, شینێکی گەش بوو و سەر باڵەکانی زێڕکفت بوون, لەسەر لکی گوڵێك کە بە گەرما هەڵپرووکابوو هەڵنیشتبوو, لە پەستا باڵی لێك دەدان.

منداڵان لە پێش دا چاوێکیان لە گۆڕەکە کردو ئەمجار لە یەکترەوە رامان و یەك دەنگ هاواریان کرد ئێ هێ... و بە هاوارێکی خۆشحاڵانەوە بەرەو شارۆچکە غاریان دا: ئێ هێ... ئێ هێ...

سەگەکان کە دەنگی شادمانیی ئەوانیان بیستبوو رایان کردو کەڵاك خۆرەو سیسارگەکانیش باڵە گەورەو قورسەکانی خۆیان کردەوەو هەڵفڕینە حەوا.

# (١٢)

هەموو خانووەکانی چوکووراوایان لە قامیش و حەیزەران و جۆرە دڕکێك ساز دەکرد. ئەم دڕکە ناوی "جیلپێرتی"یە. ئەم خانووانە کە پێیان دەڵێن کەوێڵ شەش سووچی لاکێشی (مکعب مستطیل) بوون. ئەوپەڕی درێژایی هەرکامێکیان بیست و پێنج هەتا سی پێ بوو، دە پازدە پێش پان بوون. دیواری خانووەکان لە قامیش دروست کرابوو، قامیشەکانیان بە راستەوە لەسەر چەند تەختەدار کە لەسەر زەوی درێژ کرابوون، دادەنان و دایان دەبەستن. میچەکە لە تەژەداری باریك دروست دەکرا کە نێوانەکەیان بە چڵە دڕك دادەپۆشرا. بڵندایی دیوارەکان زیاتر لە دوو میترو نیو نەبوو. سەربانەکان پاش ئەوەی بە قامیش یان دڕك و داڵ دادەپۆشران، گڵەبان دەکران و بە گڵێکی شین یان زەردو سەوزو سوور کە لە دەوروبەری چیای حەمیدیەوە دەیان هێنا سواغیان دەکردن. میچی زۆربەی ئەم کەوێڵانەیان بە قامیش دادەپۆشی. تەنیا دیواری ئەو کەسانە لە بەرد دروست دەکرا کە زۆر پوڵدار بوون. دیارە ئەویش بە دەگمەن بوو، دیوی دەرەوەی میچی ئەم خانووانە تەنەکە یان سواڵەت بوو.

لەو دەوروبەرە تەنیا دیواری باڵەخانە دوونهۆمەکەی تالیب بەگ بەرد بوو و سەرەکەشی سواڵەت بوو. پەنجەرەکانیشی شووشەبەند بوون. ئەم باڵەخانە تازەو سپیکارە کە راست لە نێوەڕاستی دەشتیدا دروست کرابوو، ماوەیەکی زۆر کەوتە سەر زارو زمانان. میوانانی تامەزرۆ لە چیاکان و دێ دوورەکانەوە دەهاتنە تەماشای.

ئەو قامیش و جەگەنەی بۆ دروست کردنی خانووەکانی ئەو دەوروبەرە پێویست بوو، هەر لە خوارەوەی ئاناوارزاوە بگرە تا کووزان و لە خوار قەدیرلیەوە تا عوسمانیەو لەوێوە تا جەیهان، هەمووی لە ئاکچاساز دابین دەکرا. ئاکچاسازیش تالیب بەگ خانی تورکمەن دەستی بەسەردا

گرتبوو, له هەموو شوێنێکی ئاکچاساز هێندێ ئێشك گرێ چەکداری دانابوون کە قەمچیی کیرکەڵەگایان بەدەستەوە بوو... تالیب بەگ قامیش و جەگەنی ئاکچاسازی بەو دێهاتی‌یانە کە پێویستی‌یان پێی هەبوو دەفرۆشت و سندووقەکانی پڕ دەکردن لە کیسەزێڕ. بێجگە لە ئاکچاساز دەستی بەسەر بەشی زۆری دەشتی ئاناوارزاش دا گرتبوو. دەشتەکە پڕ ببوو لە رەوە ئەسپ و مێگەلە مەڕو جوانەگای یەختەکراو.

تالیب بەگ هەموو ساڵێ بەشێك لە دەشتەکەی بە عێلاتی تورکمەن دەفرۆشت و هەرچۆنێك بایە هێندێ جار پاش دوو ساڵ و هێندێ جار پاش چەند ساڵ بە زۆر زەوی‌یە فرۆشراوەکەی لێ دەستاندنەوە. تالیب بەگ بەڵایەکی بەسەر دانیشتووانی ئەو دەشتە هێنا, هەر مەپرسە. خەراپترین بەڵاشی بەسەر هۆبەی هومانلی هێنا. لەمێژ بوو ئەو هۆبەیە دەیەویست لە دەشتێ نیشتەجێ بێ. هۆبەی هومانلی هۆبەیەکی دەوڵەمەند بوو کە مەڕو بزن و گاوگۆل و ئەسپ و وشترێکی زۆری هەبوو. دەیان گوت ئەستوندەکی چادری خانی هومانلی زێڕ بووە. تەنانەت دەیان گوت ژمارەیەك لە دەشت نشینەکان بە چاوی خۆیان دیویانە.

بەڵێ, تالیب بەگ بەشێك لەو زەوی‌یانەی داگیری کردبوون, بەو عەشیرەتە فرۆشت. چۆنی فرۆشت و زولفۆی تاپۆچی چیی کرد؟ کەس نازانێ. ئەوەندە روونە کە هۆبەی هومانلی لە دادگایەك دا کە ساڵێ دواتر دەستی پێکرد, هەم زەوی‌یەکانی لەدەست چوون و هەم هەرچی‌یەك هەیبوو با بردی. دارو نەداری خۆیان ئاور داو پارەکەی‌یان دا بە تالیب بەگ. رەسەنترین ئەسپەکانیان, مێگەلەکانیان, بەرە, لبادو تەنانەت لانکە نەخشاوەکانیان کە گوڵمیخی زێرو زیویان لێدرابوو و یادگاری باپیرانیان بوون و هەرچیش لە ماڵێ دا مابوو خەرجی مەحکەمەو پارەی پارێزەریان کرد. دەستێکیان کەوتە ئەم لاو دەستێکیان کەوتە ئەولاو کاڵەم دڕاو چم پێ نەبڕا.

هۆبەکە لەبەر یەك بڵاو نەبوو, بەڵام زۆر شێوا. ئەگەر یارمەتیی هۆبەکانی دیکە نەبوایەو ئەگەر خۆڕاگریی ئەندامانی هۆبەکەو ئەو داب و شوێنانە کە هێشتا پێیانەوە پابەند بوون نەبوونایە, هۆبەی هومانلی هەر لە سەرەتاوە لەبەریەك بڵاو دەبوو, یان هەموویان لە برسان دەمردن.

لەم دەشتەدا ژمارەی ئەو جووتیارانە کە دارو گۆپاڵی پیاوەکانی تالیب بەگیان وێ نەکەوتبوو یەکجار کەم بوو, ئەوەندە کەم بوو دەبوو بە چرایە بە دوویان دا بگەڕێی. پێت دەنێو ئاکچاساز ناوە؟ زۆر باشە راکشێ بۆ قەمچی کاری. ئەویش قەمچی‌یەك کە لە کیرکەڵەگا

دروست کراوه. پێت لەسەر عەرزی تالیب بەگ داناوە؟ باشە! بڕۆ ئەو تەویلەیەی نیزیك باڵەخانەکەی تالیب بەگ هەتا بریسکەت لە چاوان بڵند دەبێ، پاش ئەوەی سێ شەوو ڕۆژان برسی بووی و لە جیاتی ئاوی خواردنەوە خوێیاوکیان دەرخوارد دای ئەقڵت دێتەوە کەللەت.

لەبارەی دارو گۆپاڵەوە تالیب بەگ داستانێکی هەیە هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی بابی فەرمانبەری جەندرمە.

ئەو ڕۆژە بەیانی کاتێك خەبەری کوژرانی تالیب بەگ گەیشتە شارۆچکە، کەس باوەڕی نەکرد. کێ غیرەتی کوشتنی تالیب بەگی هەبوو، کەسێك کە دەت گوت هەڵۆیە. سەدان پارێزەری چەکدار، نۆ کورو خزم و دۆستێکی زۆری هەبوون. ئەو دەوڵەتێك بوو لەنێو دەوڵەت دا بەدەسەلاَت تر لە دەوڵەت و حکوومەتێك بوو لەنێو حکوومەت دا بەهێزتر لە حکوومەت.

لای نیوەڕۆیە هەموو شتێك روون بووەوە، تالیب بەگ بەڕاستی کوژرابوو. لە حەمەدۆك بەولاوە کێ دەیتوانی تالیب بەگ پڵنگی دەشتی ئاناوارزا بکوژێ؟ بە کوژرانی تالیب بەگ بە دەستی حەمەدۆك شارۆچکە پشتی شکا. ئێستا کە حەمەدۆك خانێکی وەك تالیب بەگی کوشتبوو کە دەت گوت پڵنگی چنگ بە خوێنە، ئیدی کەس لە خۆیڕا نەدەدی بەرەنگاری بێتەوە، نە حکوومەت و نە هێزێکی دیکە... تەنانەت ئەگەر سوپاش هاتبایە کە ئەو دەوڵەتە مەزنانەی شکاندن، دیسان کارێکی لە دەست نەدەهات.

گۆیا دوێشەوێ پێش تاوهەلاَت حەمەدۆك لەگەڵ یازدە کەس کە سەرتاپێ سپیپۆش بوون دەچێتە دێیەکەی تالیب بەگ. ئەوان هەموویان سواری ئەسپی بۆرە بوون کە لەگەڵ ئەسپی کوێرئۆغڵی بە موو فەرقیان نەبوو، هەمووشیان فیلینتای ئەڵمانیان بەدەستەوە بوو کە وەك ئاوێنە لەبەر تیشکی مانگ دەدرەوشانەوە. خورجێنەکانیشیان پڕ بوون لە فیشەك و نارنجۆك... دوازدە پیاوی سپیپۆش هێرش دەبەنە سەر دێ، پیاوەکانی خانی چەك دەکەن، توند دەست و لاقیان دەبەستن و دەیان کەنە گلۆلەو فڕێیان دەدەنە سووچێك، ئۆرە دەگاتە باڵەخانە. دەڵێن:

"تالیب بەگ تەسلیم بە، ئەویش دەڵێ: ئەمن تەسلیم نابم. پیاوێکی ئازا بوو، لە عێل و عەشیرەتی عوسمانییەکان بوو. جوابی تەقەی وان دەداتەوە. نۆ کوڕی تالیب بەگ بە بیستنی ناوی حەمەدۆك گونیان پێ جووت دەبن و ڕووبەڕووی خانووبەرەکە دەستیان بە پشتە سەریانەوە دەگرن و تەسلیمی حەمەدۆك دەبن. جا گوێت لە حەمەدۆك بێ، دەڵێ برایان، ئەمن کارێکم بە ئێوە نیە، ئەمن کارم بەو زاڵمە خوێن خۆرەیە کە پێی دەڵێن تالیب بەگ. ئێستا دوو کەس لە ئێوە بەرەڵلاَ دەکەم. بچن

بیگرن, بیهێننه ئێره, ئەمن نامەوێ ئەو خانە رەسەنەمان, تالیب بەگ بکوژم, هەرچەند زاڵمیش بێ, هەرچەند دوژمنی ناموسیشەو لەو دەشتەدا ژنێکی جوان نەماوە بەزۆر بەردەستی نەکردبێ. ئەگەر ئەو تەسلیم نەبێ و بیهەوێ هەروا بیکاتە کەللەشەقی, ناچار دەبم بیکوژم. چونکە گوللە کاری لێناکا, لە جیاتی ئەوە دەتوانم وەك ئاوپرژێن کون کونی بکەم. ئەگەر ئێوە بچن و نەیەنەوەو فریوی قسەکانی وی بخۆن ئەمنیش بە گوللە راست لەنێوبەندێ چاوی براکانتان دەدەم کە هەموویانم بە تەناف پێچاوە, هەر ئەو کارەش لەگەڵ پیاوەکانتان و کەس و کارتان دەکەم. کوڕەکانیش دەچنە لای بابیان و قسەکانی حەمەدۆکی پێ دەڵێن.

بەڵام تالیب بەگ دیسان تەسلیم نابێ. حەمەدۆك دەنەڕێنێ: دەمەوێ نەوت بە باڵەخانەکەدا بکەم و ئاوری تێ بەردەم. تالیب بەگیش لە وەڵام دا هاوار دەکا: ئاوری تێ بەردە نەفام, ئەگەر قەرار بێ بەدەستی قووندەرێکی وەك تۆ بکوژرێم باشترە لە ماڵەکەی خۆم دا بسووتێم و بە سەربەرزی بمرم. سەگباب. حەمەدۆك. وەرە خۆت دەرخە, خۆت دەرخە, خۆت دەرخە بزانم چۆن گوللە کارت لێناکا.

حەمەدۆکیش کە سەرتاپێ سەوزپۆش بوو دێ و وەك کۆڵەکەیەکی مەرمەڕ قیت لەنێوەڕاستی حەوشەی رادەوەستێ. لەسەر هەتا پێی تیشکی دەداو دەوروبەری رووناك دەکرد: فەرموو ئاغا هاتمە خزمەتت. گوللەبارانم کە.

بە برای خۆم بلێم تالیب بەگ بەستە فیشەکێك بە حەمەدۆکەوە دەنێ و حەمەدۆکیش هاوار دەکا: تالیب بەگ گوللەکانت وەرگرەوەو ئەو پێنج گوللەیەی بۆ فڕێ دەداتەوە کە تالیب بەگ لەنێوچاوانی دابوون. تالیب بەگ چیی لەدەست دەهات؟ جگە لە سەرسوڕمان و واق وڕمان. بەوحاڵەش هەروا تەقەی لێدەکا. حەمەدۆکیش حەوسەلەی بەسەر دەچێ و هاوار دەکا: خانووەکەی ئاور تێبەردەن.

کوڕەکان بە هەر فێڵێك دەبێ, خۆ لە تالیب بەگ نیزیك دەکەنەوەو توند دەیگرن و تەسلیمی حەمەدۆکی دەکەن. ئەویش فەرمان دەدا لە نێوەڕاستی حەوشەی ئاورێك دەکەنەوە, پاشان سنگێك دەچەقێنن و سەرەکەی وەك شمشێر تیژ دەکەن و ئەمجار تالیب بەگی لەپێش چاوی ژن و منداڵی لەسەر سنگە تیژکراوەکە دادەنێن. تالیب بەگ دەست دەکا بە ناڵەو شیوەن, فرمێسکی خوێن دەڕێژێ و دەپاڕێتەوە دەڵێ بم کوژن, هەر ئێستا بم کوژن. بم کوژن و لەکن ژن و منداڵم ئەو کارەم لەگەڵ مەکەن. بەڵام نەیان کوشت, سێ شەو و رۆژان بەسەر سنگەکەوە ناڵاندی. داوای ئاوێی دەکرد خوێاوکیان دەدایەو نانی دەویست هەر خوێاوکیان دەدایە. راست لەو دەمەدا کە تالیب بەگ خەریك دەبێ گیانی دەرچێ حەمەدۆك دێ, هەڵدەکێشێتە

دەمانچەکەی و چاوەکانی تالیب بەگ پڕ دەکا لە قورقوشم و خانی گەورەی تورکمەن بەو جۆرە بە رەحمەتی خوای دەچێ.

ئەگەر ئەو خەبەرانەی دەهات بە تەواوی راست نەبوون, هەرچۆنێك بێ هەر خەبەرێك بەشێکی راستی لەگەڵە, با ئەو بەشە زۆر کەمیش بێ. ئەم خەبەرانە, ئەم جارە هەر مورتەزاغایان لە ترسان شێت نەکرد, بەڵکوو ئاغاکانی دیکە, بەگەکان و لە هەمووان زیاتر زولفۆی لەسەرەخۆی ـ کە هەموو شتێکی بە پێکەنین دەگوزەراند ـ تووشی سام و هەیبەتی مەرگ کرد. ئەگەر ئەوەی تالیب بەگی کوشتوە حەمەدۆك نەبێ, ئیدی خەراپتر. ئەو بە چاکی لە ریشەی کارەساتەکان ئاگادار بوو, دەیزانی ئەم وشترە رۆژێك لەبەر دەرکێ ویش دەخەوێ. دەبوو هەتا زوویە هێمنی و ئاسایش سەقامگیر بکرێ و رێگایەك بۆ لەنێوبردنی ئەو گوناهکارانە بدۆزرێتەوە. لەنێو شارۆچکەدا پێش هەموو کەس ئەو قۆڵی هەڵماڵی و لەگەڵ مورتەزاغا دەستی کرد بە هاوکاری. چەند برووسکەی لێدان و چەند نامەی نووسین. لەگەڵ یاوەرو قایەقام وتوویژی دەکردو تووشی هەرکەس دەبوو لێی دەپرسی چۆنی تێدەگاو رێگاچارە چیە. حەمەدۆك ئیدی شووی لێ هەڵکێشابوو, دەبوو لەنێو بچێ.

هەر ئەو رۆژە لای نیوەڕۆیە هێشتا خەبەرەکە بە تەواوی بڵاو نەبووەوە, دەستەیەکی پێنج کەسییان پێك هێنا. قەرار وابوو ئەو دەستەیە هەر ئەو رۆژە وەرێ کەون و بە شەمەننەفەر بچنە ئەنکەرە, چاویان بە وەزیری نێوخۆ بکەوێ و پێی بڵێن کە حەمەدۆك چ کوانێکی پڕ مەترسییە بە پشت ئەستۆی ئەم وڵاتەوە.

مورتەزاغا زۆری دڵ بەو کارە خۆش بوو. تووشی هەرکەس دەبوو: چی, چی؟ هەموو کەس گیانی خۆی خۆش دەوێ. گیانی زولفۆی گەوواد لە گیانی مەمانان شیرنترە؟ جاران ئەو حەمەدۆکەی گوللەی لە نێوێ چاوی ئاغایان دەداو سنگی دە پاشەوەی بەگەکان دەبری, منداڵێکی بێگوناهی لادێیی بوو. بەڵام ئێستا کە نۆرەی خۆی هاتوەو کاکە تالیبی کە هاوکاریی لەگەڵ دەکرد کوژراوە, دەسبەجێ دەچێتە ئەنکەرە, ئەویش بە سەرۆکایەتیی دەستەیەك... ئۆزۆی با بچێ بزانم چ دەکا...؟

جگە لە زولفۆ ئەندامانی دیکەی دەستەی پێنج کەسی بریتی بوون لە تاشکەن خەلیل بەگ, کووزان ئۆغڵیی پارێزەر, هەوایی بەگ قازیی خانەنشین و کاپلان ئۆغڵی خالیس بەگی خانی تورکمەن. هەمووی ئەمانەو لە سەرووی هەموانەوە, زولفۆ پیاوی بە سەروزمان و تێگەیشتوو بوون. شتێکی روون بوو کە ئەوانە بە دەستی بەتاڵ نەدەهاتنەوە. بە قشوونێك سەربازەوە دەهاتنەوە کە بە تووڕووس

وەرین. باشە، ئەو خان و ئاغایانەش کە چەتەو مەتەیان لەو چیاو بەندەنانە هەن، ئەگەر پیاوەکانی خۆیان خۆش دەوێ و پارێزگارییان لێ دەکەن با ماوەیەك لە تووڕووسەوە بیان نێرنە جێیەکی دیکەو هەر نەبێ ماوەیەك خۆیان ون کەن.

لەو ماوەیەدا موڕتەزاغا چەند جاری دیکەش چووە ئاشی. عەلیـیەشەل لەوێ نەبوو. ئاشەوان پێی نەگوتبوو بۆ کوێ چووە. موڕتەزاغا زۆر پەشێوحاڵ بوو، تەنانەت ئەگەر ئەوەی دەیان گوت نیوەشی ڕاست بێ ـ بە تایبەتی کە زولفۆش ترسی ڕێ نیشتوە ـ بەڕاستی وەزعەکە زۆر شپرزەیە. نۆرەی خۆشی هاتوە. خۆزگە توانیبای هەتا سەربازەکان دەگەنێ جێگایەك بۆ خۆشاردنەوە پەیدا بکا. ئاااخ عەلیـیەشەل، ئاااخ. ئەو شارەزای هەموو ئاکارو کرداری حەمەدۆك بوو.

جارێکیان لە بازاڕ چاوی بە مەلادۆران ئەفەندی کەوت و ئەو ناپیاوە ڕێوی سیفەتە بۆ ئەوەی موڕتەزاغا نەیبینێ خۆی شاردەوە. بەڵام چما شت لەبەر چاوی موڕتەزاغا ون دەبێ؟ دەسبەجێ ئەوی لەو دوکانە کە خۆی تێدا حەشار دابوو کێشایەدەر. مەلادۆران ئەفەندی، ئەو زانای زەمانەو دەرچووی "جامع الازهر"ە، ئەو مەردو ڕەندو زیرەك و زانایە کە ئەگەر دنیا ئاوری گرتباو سووتابایە باکی نەبوو، ڕەنگی بە ڕووانەوە نەمابوو و ئەگەر قسەی دەکرد دەنگی دەلەرزی.

بن پیلیی گرت، بازاڕیان بەجێ هێشت و بە سەرەوژێرەکەی جادەی دا ڕۆیشتن بۆ لای پردێ:

"چ بکەین؟".

"وەزع زۆر خەراپە. زۆرم پەرۆشی تالیب بەگ بوو. لە ژووری ماڵێ خۆی دا هەم داریان تێبری و هەم سێ شەوو ڕۆژان لەبەر چاوی خۆی دەستیان بۆ ناموسی خێزانی و کچە جحێڵەکانی و بووکەکانی درێژ کرد.

"تۆڵە، تۆڵە، پێیەتییەکان خەریکن تۆڵەمان لێدەکەنەوە...".

"هەقی خۆمانە، وەختێك شەو و ڕۆژ چاڵ بۆ یەکتر هەڵدەکەنین، بێگومان تۆڵە دەکەنەوە. ئەگەر ئێمە یەك نەگرین...".

"وەختێك عەلی سەفابەگ کوژرا ئەگەر ئێمەش وەك تۆ، غیرەتێکی وەك غیرەتی موڕتەزا قەرەداغلی ئۆغلێمان نواندبایە، لەوانەبوو ئەمڕۆ تالیب بەگ بەو شێوە سامناکە نەکوژرابایەو هەر لە پەنامان بووایە".

"لە نێوێ چاوانی داوە. شکی تێدا نیە ئەو کارە، کاری حەمەدۆکە".

مەلادۆران ئەفەندی وەڵامی دایەوە:

"بەڵێ. بەڵێ, دیارە..." و لە حاڵێك دا نێوچاوانی تێك دەنا لێی زیاد كرد:

"بەڵێ گوللە لەنێوێ چاوی خەڵك دان كاری ئەو كافرەیە. عەبدیخانی بەستەزمانیشی هەر بەو شێوەیە كوشت. وانەبوو؟".

"هەر وای كوشت".

هەردووكیان لە فكرەوە چوون, بیریان لە خۆیان دەكردەوەو لە بیری ئەوەدا بوون كە چۆن لەم فەرتەنەیە رزگاریان دەبێ. ئەنكەرە مەسەلەی چەتەكانی زۆر بە هێند نەدەگرت و مویالاتی پێ نەدەكرد, بۆچی بە هێندی بگرن؟ خۆ گیانی خۆیان لە مەترسی دا نەبوو...

مەلادۆران ئەفەندی سەری هەڵبڕی و تەماشای روخساری مورتەزاغای كرد, دەت گوت دەیەوێ شتێكی لێ بپرسێ, بەڵام پەژیوان بووەوە. كاتێك چەند جار ئەم كارەی دووپات كردەوە, مورتەزاغا گوتی:

"بپرسە, دەتەوێ چ بپرسی مەلادۆران ئەفەندی".

"دەمەویست بپرسم كە...".

"كەچی..."

"مەسەلەی عەلیمەشەل گەیشتە كوێ... لە دوێنێوە تا ئێستا لە بازاڕ پێش ئەوەی خەبەری تالیب بەگ بێ, هەموو هەر باسی وی دەكەن. دەڵێن ئەتۆ چووی لاقی عەلیمەشەلت ماچ كردوە, لەبەری پاڕاویەوە, بەڵێنی چەند پارچە زەویت پێداوەو بەرعۆدە بووی كە باڵەخانەی بۆ دروست بكەیەوە...".

مورتەزاغا گوتی:

"راستە مامۆستا. ئەگەر كەسێك ژیانی تۆ نەجات بدا ئەتۆ وا ناكەی؟".

ئەم جار زۆر بە داووناو باسی ئەوەی كرد كە عەلیمەشەل چۆن شوێنگێڕێكەو چۆن دوژمنی خوێنیی حەمەدۆكەو لە هەنگێوەیی دا لە حەمەدۆك كارامەترەو لەوی ئازاترو بوێرترو بەتواناترە. ئەوەندەی بوو هەزار هێندەی پێوەنا.

"ئێمە هەڵەیەكی گەورەمان كرد مامۆستا. ئەمان توانی وا بكەین بمان بەخشێ. ئەو بابایەكی زۆر بەشەرەف و تەبیعەت پیاوە. ئینسان, ئینسان... ئەگەر بتوانین, ئەگەر رۆژێك بتوانین كارێك بكەین كە ئەو برا گیانی بە گیانییە بمان بەخشێ, ئەو رۆژە خۆشی بۆخۆمان".

مورتەزاغا پاش بەسەرهاتی ئاشی, چووبایە هەر جێیەك و هەر كەسی دیبایە باسی عەلیمەشەلی بۆ دەكردو ئەوی دەگەیاندە عەرشی عەزیم, بەو هیوایە كە بەلكوو ئەو تاریفانە ببیسێتەوەو دڵی نەرم بێ.

مەلادۆران ئەفەندی گوتی:

"چۆن عەلیەیەشەل ئەفەندی ئەو پیاوەیە؟ بەڕاستی حەیف کە بە خزمەتی نەگەیشتووم...".

مورتەزاغا دووپاتی کردەوە: حەیف, حەیف.

لەو بەینەدا یەکێك بە غاردان هاتە کنیان. کابرا کوڕە جحێڵەیەك بوو زۆر سەرلێشێواوو هەژاو دیار بوو:

"جەنابی داواکاری گشتی ناردوومی. گوتی بە هەر جۆرێك بووە مورتەزاغای وەبینەو بیهێنە نێرە. گوتی بڵێ مەسەلەکە زۆر گرنگە, ئەگەر ناوی بەدەستەوە بێ نەیخواتەوە, داینێ و بێ".

"یانی وەزعەکە ئەوەندە ناسکە...".

لاوەکە گوتی: زۆر ناسکە, زۆر ناسك...

"کەوایە مەسەلەکە هێندە گرنگە... مەلادۆران ئەفەندی با پێکەوە بچین. لە ئەزموونە بەنرخەکانی جەنابت فەیزێکمان پێ ببڕێ".

هەردووکیان وەڕێ کەوتن بۆ لای داواکاری گشتی.

داواکاری گشتی پیاوێك بوو دەستەپیاو بە سمێڵێکی سپی و گۆنایەکی تێك قوپیو و موویەکی مۆنج مۆنجی سپیەوە. رەقەڵە بوو, ئێسکی قۆرتۆمەی دەرپەڕیبوو. پیاو وەختێك تەماشای دەکرد, لە پێش دا ئێسکی قۆرتۆمەی و پاشان ملی درێژو نێوچاوانی پڕ گنج و لۆنجی وی دەدی. هەمیشە تووڕەو دەستەوستان بوو, چونکە خێرا خێرا قسەی دەکرد پیاو لە نیوەی قسەکانی نەدەگەیشت و بە زەحمەتیش لە نیوەکەی دیکە حاڵی دەبوو. داواکاری گشتی دەستی بە قسان کرد:

"براینە, باش بوو هاتن...".

ئەمەی گوت و نۆ پیاوی نیشان دان کە لەسەر قەنەفەکان دانیشتبوون. ئەوان بە پێی تەمەن لەسەر قەنەفەکان ریز ببوون, هەمووان دەستیان لەسەر ئەژنۆیان دانابوو, چاویان لە وێنەی ئەتاتورکەوە کە رووبەڕوویان دانرابوو, بڕیبوو و جووڵەیان نەدەکرد. گرێی قورتۆمەی هەر نۆ کەسیان هەڵتۆقیبوو. کەم و زۆر وەك یەك دەچوون. هەموویان ئەسمەرو گوێ لوولێنە بوون.

"چاك بوو, چاك بوو زوو هاتن. وەزعەکە ناسك و شپرێوە, زۆر شپرێو. ئەم پیاوانە شکایەتێکیان هێناوە کە ئەمن نەم دەتوانی قبووڵی بکەم. لە درێژایی ماوەی خزمەتی خۆم دا

وەزعی وام بۆ پێش نەهاتوە... ئەم شارۆچکەیە جێیەکی زۆر سەیرە... گۆیا بە باوەڕی وان تالیب بەگی بابیان حەمەدۆك نەیکوشتوە, بەڵکوو کاری, کاری کەسێکی دیکەیە... ئەمنیش عەرزم کردن کە شتی وا ڕێی تێ ناچێ, بابتان تاوانبارێکی شەڕانی بەناوی حەمەدۆك کوشتوویە. بەو برایانەم گوت کە ئێمە وەك دادگا شتی وا قبووڵ ناکەین, ئەم شارۆچکەیە سەیرترین جێگایە کە لە درێژایی ماوەی خزمەتی خۆم دا دیومە. لەو برا بەڕێزانەم داواکردو عەرزم کردن کە بە پێی قانوون بێجگە لە حەمەدۆك کەس ناتوانێ بابتان بکوژێ، بەڵام نایانەوێ لە قسەکانم حاڵی بن... سەیرە، سەیرە، سەیرە..."

لە پاش ئەوە، قسەکانی هێندە توندو خێرا کردن کە هیچ کەس هیچ شتێك لە قسەکانی حاڵی نەدەبوو. داواکار کە یەك بین قسەی دەکرد، قسەکانی بەم ڕستەیە تەواوکرد: ئاغاکان، بەگەکان! حاڵ و وەزع ئەمەیە. بە چاوێکی لێڵی وەك چاوی ڕێوی، کەمێك بە گاڵتەوە نەختێك بە گاڵتەپێکردنەوەو بە شێوەیەکی بێپەروا لە هەموو دنیا تەماشایەکی موڕتەزاغای کرد, کەوا دیار بوو حەوسەلەی نەماوە. موڕتەزاغا کە لە مەبەستەکەی حاڵی ببوو گوتی:

"بۆخۆتان خۆش برایان". هەمووانیان یەك دەنگ گوتیان زۆر سوپاس، زۆر سوپاس و خۆیان کۆکردەوە. موڕتەزاغا وای خۆ خەفەتبار نیشان دا دەت گوت خەریکە بگری:

"ئاگر لە جەرگمان بەربوو. ڕەگ و ڕیشەی دڵمان بۆ تالیب بەگ پڵینگی ئاناوارزا ئاگری گرت. کەوایە ئەویشی کوشت. ئەو جانەوەرە خوێنخۆرە ڕەحمی بە پڵینگێکی وەك تالیب بەگیش نەکرد. هەی کافر، هەی: کەوایە لە نێوێ چاوی ویشیدا. هەی ناکەس بەچە هەی. خەفەت مەخۆن کوڕینە، خەفەت مەخۆن براکانم. خەفەت مەخۆن ڕۆڵە تازیەدارەکانم. دەزانن ئەمن و بەگ لە براش پتر لێك نزیك بووین، وەختێك دەهاتە شارۆچکە مومکین بوو من نەبینێ؟ بە هیچ جۆر. خەفەت مەخۆن کوڕینە لەمەودوا ئێوە کوڕی خۆمن. بە ئەسپەکەی، بەو ئەسپە بۆرە ڕەسەنەی دەهاتە نێو شارۆچکە چ شان و شکۆیەکی هەبوو، دەت گوت پڵینگێك بیابانی عەرەبستانی بە جێهێشتوەو هاتوەتە ئێرە. وەختێك دەهات، ڕاست و پتەو، دەستی بە قەمچیەوە لەسەر ڕانی ڕاست دادەنا، چاوی لە ڕووبەڕوویەوە دەبڕی و سنگی ڕەپێش دەکرد... ئێوەش لەگەڵ بابتان بە موو فەرقتان نیە. سەری خۆتان سلامەت، ئیشەڵڵا هەرکام لە ئێوە جێگای ئەو جوامێرە، جێگای ئەو نەجیب و نەجیب زادەیە پڕدەکەنەوە. دیارە پڕی دەکەنەوە. چونکە ئاوی دەریا هیچ وەخت کەم ناکا، لەبارەی حەمەدۆك قاتڵی پڵینگی ئاناوارزاشەوە..."

کوڕە گەورەکە خێرا خێرا تفی خۆی قووت دەدایەوەو دەیەویست شتێك بڵێ، بەڵام چما موڕتەزاغا نۆرەی دەدا؟

سەرەنجام کوڕی گەورە بڕیاری خۆیدا، قسەی موڕتەزاغای بڕی و گوتی:

"خۆ بابی ئێمە حەمەدۆك نەیکوشتوە..."

"چی چی؟ ئەتۆ دەڵێی چی؟"

"ئەوەی بابی مەی کوشتوە، حەمەدۆك نیە. ئێمە قاتڵی بابی خۆمان دەناسین. هەموو خەڵکی ئاناوارزاش دەیناسن".

"مومکین نیە، مومکین نیە، جگە لە حەمەدۆك ناتوانێ کەس بێ، ئەمە پێچەوانەی قانوونە. ئێمە تەنانەت لەبەر کارەساتی کوژرانی تالیب بەگ پڵنگی ئاناوارزا دەستەیەکمان پێك هێناو ناردمان بۆ سەرکوت کردنی حەمەدۆك".

"خەڵکی گوندی ئەسلاّن و کۆچەرییەکان دەستیان وەدەستی یەکتر داو بابمانیان کوشت. قاتڵەکانی قیت و قنج دەخولێنەوە. تەنانەت راش ناکەن، تەنانەت خۆش ناشارنەوە".

"دیارە راناکەن. بۆچی رابکەن؟ خۆ پڵنگی ئاناوارزا ئەوان نەیان کوشتوە... چونکە حەمەدۆکی خوێنخۆر کوشتوویەتی. هیچ کەسی دیکە نەی کوشتوە، لە جێدا پێچەوانەی قانوونە. ئەگەر پێ دابگرن کە ئیللاو بابمان, پڵنگی ئاناوارزا دێهاتییەکان کوشتوویانە پەژیوان دەبنەوە. بەخۆڕایی کارەکە لە خۆتان خەراپ مەکەن, ئەویش لە حالێك دا کە نوێنەرانمان بەرێوەن بۆ ئەنکەرە... پاش ئەوەی مەسەلەی حەمەدۆك چارەسەر کرا, ئێمە بۆخۆمان مشووری ئەو گوندنشینانەو ئەو کۆچەرییانە دەخۆین. وانیە جەنابی داواکار؟".

"دیارە ئەفەندم, عەرزی بە خزمەتی ئاغای خۆم بکەم, ئێوە ئەم شکایەتە وەرێ مەخەن, موڕتەزابەگ ئەفەندی راستی عەرز کردن... ئەو راست دەفەرموێ... ئەمن تاوێك لەمەوبەر عەرزم کردن... پێش ئەوەی ئەو پابێتەوە... ئەم رۆژانە لەم دەشتە, لەم کێوانە, یانی لە چوکووراوا هیچ کەس ناتوانێ کەس بکوژێ. بابی بەرێزیشتان هەر حەمەدۆك خۆی کوشتوویەتی. جۆری روودانی پێشهاتەکە, شێوەی رفاندنی بابی بەرێزتان, لەسەر سنگ دانانی بابتان و تفەنگ لەنێوی چاوی دانی و بە گشتی شێوەی کوشتنی بابی بەرێزو مەزنتان نیشان دەدا کە بابی بەرێزتان, پڵنگی ئاناوارزا, حەمەدۆك کوشتوویە".

"بابمان تفەنگی لەنێوێ چاوی نەدراوە...".

موڕتەزاغا لە حالێك دا دەیگوت ئیمکانی نیە هەستایە سەرپێ: ئیمکانی نیە. چونکە بە پێی راپۆرتێك کە پێمان گەیشتوە بابتان, تالیب بەگ, یانی پڵنگی ئاناوارزا بەگوللەیەك کە لە نێوێ چاوانی دراوە کوژراوە, ئەمەش تەنیا دەتوانێ کاری حەمەدۆکی تاوانبار بێ.

کوڕە گەورەکە بە نارەحەتی‌یەوە گوتی:

"نا, نا کوشتنی بابمان جۆرێکی دیکە بووە, ڕێگا بدە بۆتان باس بکەم...

چونکە ئەگەر وەزعەکە وا بڕوا, دەشێوێ. ئەمن ئەو کوڕانەو خزم و کەس و کارو خەڵکی هۆبەکەمانم بە زۆر ڕاگرتوە. ئەگەر ئەمن نەبام هەتا ئێستا خوێن دەهات و سەری دەبردن, ئێمە زۆر بەهێزین, خەڵکی گوندی ئەسلان, عێلاتی ئایدینیش زۆر ئازاو چاونەترسن".

موڕتەزاغا ئیدی بە ناچار بێدەنگ بوو و کوڕە گەورەکەش دەستی بەگێڕانەوەی بەسەرهاتەکە کرد:

"کەرەم ئایدینی, زارۆ کوردە لە گوندی ئەسلان, حاجی‌یە خڕەو کەنعانە شێت و سێ کەسی دیکە چەند ڕۆژان لە جادەدا بۆسە دەنێنەوەو لە جادەی کووزان دا لە داوی دەخەن و دەی‌بەنە چەپەك ترین قوژبنی ئاکچاساز کە پڵێنگیش پێی تێ نانێ و لەبەر دارو حەیزەران و جەگەنی زۆر ئاسمانی لێ‌دیار نیە. وا دەکەن زۆریان لەبەر وەپاڕێ. لە پێش دا گوێ‌یەکی, ئەمجار لووتی و سەرەنجام باسکانی دەبڕن... چەرمی سنگی لێ‌دەکەنەوە. بەڵام ئازارێك بە چاوو زمانی ناگەیەنن, هەتا ئەوەی بەسەری دێنن بە چاوی خۆی ببینێ و زمانیشی هەبێ بپاڕێتەوە... لە پاشان داری تێ‌دەبڕن و ئاخرەکەی بە نیوە مردوویی و رووت و قووتی بە لاقی بە قایم ترین لکی دارێکەوە هەڵی دەواسن. پاشان هەنگوینی لە سەرانسەری لەشی هەڵدەسوون هەتا زەرگەتەو مێروولە پەلاماری بدەن و پێش ئەوەی بمرێ بیخۆن".

"ئێمە چ دوژمنایەتی‌یەکمان لەگەڵ حەمەدۆك هەبووە کە بابمان بەو حاڵە بکوژێ؟".

موڕتەزاغا گوتی:

"عەلی سەفابەگ چ دوژمنایەتی‌یەکی لەگەڵی هەبوو کە لە نێوێ هەردوو چاوانی دا.

لە کاتێك دا هەناسەی هەڵدەکێشا, لەسەر قسەکانی ڕۆیشت:

"وەی تالیب بەگ, وەی. بنیادەم بووەتە جانەوەرو ئێمە نەمان دەزانی...".

"هەربۆیەش دەبێ شکایەتەکەمان بکەوێتە ڕێ. ئەگەر لەم شارۆچکەیە نەیان توانی بە مەسەلەکە ڕابگەن, هەتا ئەنکەرەو وەزارەتی عەدلیە دەڕۆین و مەسەلەکە عەرزی بەرزترین کاربەدەست دەکەین. ئەگەر وا نەبێ خوێنێکی زۆر دەڕژێ, ئەگەر حکوومەت قاتڵەکانی بابمان نەگرێ و لە داریان نەدا, لە دەشتی ئاناوارزا دەبێتە شەڕێك بڕانەوەی نەبێ...".

"قاتڵی بابتان حەمەدۆکە".

کوڕە گەورەکە بە دڵنیایی‌یەوە گوتی: نەخەیر ئەو نیە.

مورتەزاغا باش کەوتبووە تەنگانەوە. ئەو نۆ برا نەفامە هەموو ریسەکە دەکەنەوە خوری. بە چاولێکردنێکەوە کە داوای یارمەتیی دەکرد گوتی: ئەتۆش قسەیەك بکە. چاوێکی لە مەلادۆران ئەفەندی کە بێدەنگ دانیشتبوو, کردو بە دزیەوە نقورچێکی لێگرت. دۆران ئەفەندی بەسپایی گوتی:

"بەسە ئیدی مورتەزاغا, بەسە".

مورتەزاغا بە نالّەیەکەوە گوتی:

"چی بەسە کاکە. هەوەڵێ درۆیەکی وا گەورە کە حەمەدۆك گیراوە ئێستاش ئەم بەسەرهاتانە. لە ئەنکەرەدا ئابڕوومان چوو, ئێستا ئەمن چ گوویەك بخۆم؟".

مەلادۆران ئەفەندی گوتی:

"بێدەنگ بە, داواکاری گشتی بە لێزانیی خۆی هەموو کارێکی لە دەست دێ و هەموو بەڵایەك بە ئاسانی دەفع دەکا".

لەو بەینەدا قازییەکان و پاشان یاوەرو وەکیل باشی عاصمیش هاتن.

ژووری داواکاری گشتی بەرە بەرە پڕ دەبوو. بۆ ئەوانەی دوایە هاتن جێگا بۆ راوەستانیش نەما. یاوەر پاش ئەوەی سڵاوی عەسکەریی لە داواکاری گشتی کرد, گوتی:

"جەنابی داواکاری بەڕێز سەرۆکی شارەوانیمان لەوێ چاوەڕوانی جەنابتە. لە راستی دا چاوەڕێی هەموومانە. جەنابی قایمقام و کاربەدەستانی دیکەش دێن".

مورتەزاغا کە بەو قسەیە زۆر خۆشحاڵ ببوو هەستایە سەرپێ و مەلادۆران ئەفەندییشی راست کردەوە. مەلادۆران ئەفەندی دەستێکی بە ریشە تێك ئالّقاوەکەیدا هێناو لە حالێك دا لە فکرەوە چووبوو گوتی: ئێوە تەشریفتان بچێ, ئەمن دوایە دێم. پاشان سەری بردە بن گوێی مورتەزاغاو گوتی: هەر جۆرێك بێ. کارەکەتان لەوێ پێی دەچێ, ئەمن دوایە دێم. پێم وا چاکە وەختێك بێم کە کارەکان تا رادەیەك وەڕێ کەوتبن.

"زوو وەرەوە مەلادۆران ئەفەندی".

"هەتا بکرێ".

ئەوانی دیکە بە کۆمەڵ بەرەو شارەوانی رۆیشتن. سالۆنی شارەوانی گەورە بوو و جێی بە ئەندازەی پێویست بۆ دانیشتن هەبوو. قایمقام لەمێژ بوو هاتبوو و لەوێ چاوەڕوان بوو. بە دیتنی نۆ برایەکە بە تووڕەیی چاوێکی لە هەموان کردو پاش ئەوەی لە نینۆکی لاقیان هەتا تۆقی سەریان لێیان ورد بووەوە, گوتی:

"عومری درێژی بۆ خۆتان بەجێ هێشتبێ. ئەو حەمەدۆکەی بابتانی بەو شێوە سامناکە کوشتوە, دوژمنی ئێمەشە. یانی دوژمنی کۆماریشە... نارەحەت مەبن, لە دوارۆژێکی زۆر نیزیك دا تەرمی ئەو حەمەدۆك ناوە کە سەرکردەی یاغییەکانە, لەنێو شارۆچکە دەخرێتە بەرچاوی هەمووان, نۆسەد ساڵە هەرکەس لە حکوومەتی پایەبەرزمان یاغی بووبێ, سەرنەکەوتوە. عوسمانییەکان و سەلجووقییەکان لەو سەردەمەداو لەم دەورەیەش دا کۆماری رەسەنی تورك کە بە خوێن ئاو دراوە تەنیا لە ئاناتۆلی بەرهەمە درەوشاوەکانی دەبینین, بە حەمەدۆکی سەرکردەی یاغییەکان دەوێرێ و لە دوارۆژێکی زۆر نیزیك دا تۆڵەی خوێنی باوکی نەجیبتان, تالیب بەگ پڵنگی ئاناوارزاو خانی تورکمەنیش دەستێنێ..."

"بابی مە حەمەدۆك نەی کوشتوە, کەرەم ئایدینی, زارۆ کوردە, حاجییە خڕەو کەنعانە شێت و چەند کەسی دیکە بە زۆر لەگەڵ خۆیان بردو بە ئەشکەنجە کوشتیان".

"ئەدی کێ گوللەی لە نێوێ چاوانی داوە؟".

"دوکتۆرو جەنابی داواکار وەختی چاولێکردن دەبینن کە لەشی بابمان جێگای برینی یەك گوللەشی پێوە نیە. کەسێك کە تاقە گوللەیەکی لێنەدراوە چۆن گوللە لەنێوێ چاوی دەدرێ و دەمرێ؟ حەز دەکەن هەر ئێستا بچین بیبینن, لە جێی خۆی هەڵواسراوە, چاوەکانیشی زەق و زیندوون...".

باس و کێشە درێژەی کێشا, براکان پێیان چەقاندبوو کە بابیان حەمەدۆك نەیکوشتوەو قاتڵەکانی بابیان کۆچەرییەکانی ئایدین و خەڵکی ئەسڵانن و کەسانێك کە ناویان بردوون لە پێش چاوی سەدان کەس بابی وانیان رفاندوەو لەگەڵ خۆیان بردوویانەتە قامیشەڵان و بە ئەشکەنجە کوشتوویانە.

قایمقام گوتی: مومکین نیە. داواکار گوتی: مومکین نیە. قازی گوتی:

"مومکین نیە, ئەمن هەموو شتێکم بە هەموو لایەنەکانیەوە لێك داوەتەوە. حەمەدۆکی لەگەڵ کەرەم ئایدینی لێ گۆڕاوە, حەمەدۆك بۆخۆی شەیتانە, لە تایەفەی جندۆکانە... هەر دەمەی دەچێتە پێستی یەکێکەوە. چما هەر خۆمانی فریو نەدا؟".

یاوەر پشتی قسەکانی وی گرت و گوتی:

"فریوی داین, ئێمە دەستەی وەسمانەڕەشمان بۆیە تەفرو تونا کرد پێمان وابوو حەمەدۆکە".

سەرەنجام کوڕە گەورەکەی تالیب بەگ رقی هەستاو هاواری کرد:

"ئێوە پێتان وایە ئەمن شێتم؟ ئەمن سبەینێ دەچمە ئەنکەرە, جەنازەی بابم بە جووتێك چاوی ساغەوە کە زەق زەق دەڕوانن هەتا ئەمن دێمەوە هەروا لەنێو گۆلاودا بە هەڵواسراوی ماوەتەوە. دڵنیا بن لە ئێمە بەولاوە کەس ناتوانێ جێگای بابمان بدۆزێتەوە".

مورتەزاغا گوتی:

"کورم جێگاکەی لە حەمەدۆك دەپرسین و فێری دەبین". و پێ کەنی. بە دوای ئەم پێکەنینەدا ئەوانی دیکەش هەموو پێکەوە دەستیان کرد بە پێکەنین.

لەو بەینەدا بە دیتنی مەلادۆران ئەفەندی کە شەکەت و ماندوو بە روخسارێکی رەقەڵەوە هاتبووە ژووری, هەموو بێدەنگ بوون و هەمووان ئاوڕیان دایەوە سەری. مەلادۆران ئەفەندی بە راوێژێك کە هەموو پیتەکانی بە چاکی دەگەیاندە جێی خۆیان گوتی: برایان و پاشان لە حاڵێك دا دەستی بە ریشی تێك ئاڵقاوی مەبارەکی دا دێنا, گوتی:

"وا تێ دەگەم لە بارەی مەسەلەی حەمەدۆکەوە نەگەیشتوونە ئاکامی دڵخواز".

مورتەزاغا گوتی:

"کورانی بەرێزی تالیب بەگ دەڵێن بابیان حەمەدۆك نەی کوشتوەو زۆریش پێ لەسەر ئەو مەسەلەیە دەچەقێنن. لەو حاڵەدا هەموو نەخشەکانمان لێ تێك دەچێ".

ئاغا بەم قسانە نارەحەتیی خۆی دەربڕی. مەلادۆران ئەفەندی کە دەت گوت بەنیازی دەزنوێژهەڵگرتنە لە حاڵێك دا قۆڵی هەڵدەماڵی گوتی:

"نارەحەت مەبن جەنابی قایمقام, پێم وایە لەو کارەدا هەڵەیەك رووی داوە. ئەم لاوانە خەریکن بە هەڵە بچن. ئینسان تووشی خەتا دەبێ. تەنیا خوای تەعالایە کە لە هەڵەو خەتا بە دوورە".

"حەزرەتی رەسوولی ئەکرەم (ص) دەفەرموێ...".

لە گێڕانەوەی فەرمایشتی حەزرەتی رەسوولی ئەکرەم (ص) پەژیوان بووەوەو پرسی: داخوا لێرە ژوورێکی چۆڵ پەیدا دەبێ؟

بەرێوەبەری شارەوانی راست بووەوە, دەرگای هۆڵەکەی تەنیشتێی کردەوەو گوتی: فەرموون.

مەلادۆران ئەفەندی لە پێشەوەو کورەکانی تالیب بەگ بە دوای دا چوونە هۆدەکە. مەلادۆران ئەفەندی پاش ئەوەی بە جوانی دەرگای هۆدەکەی پێوەدا, گوتی: فەرموون دانیشن و ئەوانیش دەسبەجێ دانیشتن. نێوچاوانیان تێك نابوو.

مەلادۆران ئەفەندی کە بە پێش دا چەمابووەوەو ملی وەك ملە لەك لەك درێژ کردبوو و دەسحێبێکی بەدەستی راستەوە بوو دەی گێڕا, گوتی:

"کورە ئێوە شێت بوون؟ سواری گای هار بوون؟ مێشکتان لە کەللەدا نەماوە چیە؟ ئێوە دەتانەوێ بەجارێك وەجاخی تالیب بەگ پڵنگی ئاناوارزا کوێر بکەنەوە". پاش ئەوەی وەك بیهەوێ دەزنوێژ هەڵگرێ چەند جار قۆڵی هەڵماڵین گوتی:

"چەند پرسیاری چووکەڵەم لێتان هەیە, ئەگەر راستەکەی بڵێن بە قازانجتانە".

کوڕە گەورەکە گوتی: فەرموو.

"پرسیاری یەکەم, چما بابتان ماوەیەك لەمەوبەر پیاوەکانی خۆی نەنارد شەش کچیان لە گوندی ئەسلان راکێشان و پاشانیش دەستی لەگەڵ تێکەڵ کردن؟ کردی یان نەیکرد؟".

کوڕە گەورەکە گوتی: کردی.

"پاشانیش لە شەش پیاوی خۆی مارە نەکردن؟ مارەی کردن یان نا؟".

"بەڵێ مارەی کردن".

خورشید ئاغای گوندی ئەسلانیشی هەر لەسەر ئەوەی لەو مەسەلەیە نارەحەت ببوو نەبردە ئاکچاسازو پاش ئەشکەنجەو ئازار گوێ و لووت و گونی نەبڕین و نەیکوشت؟".

"با, کوشتی".

"باشە هەر ئەم داواکاری گشتییە بابتانی لەو گرفتارییە نەجات دا یان نا؟".

"نەجاتی دا".

"کەوایە ئەم جەنابی داواکاری گشتییە دۆستتانە؟".

"پارەمان زۆر لێ‌دەستێنێ, بەڵام دیسانیش دۆستمانە".

"زۆر باشە, بابتان کۆچەرییەکانی ئاوارە نەکرد؟ دەرپێیەکانیشی لێ نەستاندن؟ ئەو زەوییانەی پێی فرۆشتبوون بە فێڵ و تەڵەکە لێی نەستاندنەوە؟ لێی ئەستاندنەوە یان نا؟".

هەر نۆ کوڕەکە یەکدەنگ گوتیان: لێی ئەستاندنەوە.

مەلادۆران ئەفەندی لە حاڵێك دا چاوی دەرپەڕاندبوون و قەڵافەتێکی سامناکی بەخۆیەوە گرتبوو, دەستی راستی بە دەسحێبەکانەوە لە پشتێندێ راکێشا:

"ئێستا دێمە سەر پرسیارێکی سەرەکی".

دەستی بۆ لای کوڕی هەرە چووکە راداشت و گوتی: ئەتۆ هەستە پێ, هەستە وەرە لەپێشم راوەستە.

لاوەکە هەستاو هات قیت بەرامبەری وێستا. زۆر شەرمێون دیار بوو, سوور سوور هەڵگەڕابوو و لەسەرەخۆ دەلەرزی.

"بڵێ بزانم, وەختێك لەگەڵ کچێکی زۆر جوان و جێگەورە زەماوەندت دەکرد, بابت چەند رۆژ پێشتر ژنی هێنا؟".

کوڕێژگەکە لە حاڵێك دا چاوی لە عەرزییەوە بڕیبوون بە شەرمەوە گوتی: حەوت رۆژ.

"هەموو ئاغاو خانەکانی چوکووراوای بۆ سەر زەماوەند بانگهێشتن کرد یان نەکرد؟".
"بانگهێشتنی کردن".
"پاش چەند مانگ بابت ژنە جوانەکەتی لێ ئەستاندی یان نا؟ و ئێستا حەوتەمین ژنیەتی یان نا؟".
لاوەکە لە حالێك دا بە توندی سوور هەڵگەڕابوو و چۆڕ چۆڕ ئارەقی دەڕشت و روخساری خۆی دەشاردەوە، بەسپایی گوتی: وابوو.
"چما ئەتۆ بڕیارت نەدا لەسەر شاخی ئاناوارزاوە خۆت فڕێ دەی و راست لەو لەحزەیەدا کە دەتەویست خۆت فڕێ دەیە نێو هەڵدێرەکە ئەوە ـ قامکی بۆ لای کوڕە گەورەکە راداشت ـ قۆڵی نەگرتی؟ ئەتۆش لەسەر ئەوە تەقەت لێنەکرد؟".
بێدەنگ بوو، هەناسەی گیرا، فەرمانی بە کوڕە جحێڵەکەدا: بڕۆ لە جێی خۆت دانیشەوە.
لاوەکە لە حالێك دا لاقەکانی تێك دەئالقان چوو، وەك لەتکە بەردێك لە جێی خۆی دانیشت.
"باشە، دەربارەی ئەوەی بابتان چیی بەسەر ئێوە هێناوە چەند پرسیاری دیکەشتان لێبکەم یان نا؟ قسەی خۆمان بێ ئێوە لە من و لە یەك یەکی خەڵکی ئەو دەشتەو لەو کێوپارەیە باشتر دەزانن کە بابتان چ بەڵایەکی بەسەر هێناون. بپرسم یان نا؟".
هەمووان گوتیان: نەخەیر.
"دیتان تاوێك لەمەوبەر لە بازاڕی هاتمەوە. هیچ دەزانن خەڵکی بازاڕی لێکڕا باسی چ دەکەن؟ دەزانن؟ باسی ئێوە، باسی بابتان و باسی ئەوە کە ئاخرەکەی نەتان توانی زوڵم و زۆری بابتان تەحەمول بکەن، بردتانە قامیشەڵانی ئاکچاسازو بە چەرمەسەری کوشتتان. هەر ئێستا بیست کەس کە بە چاوی خۆیان دیویانە ئێوە تالیب بەگتان لە حالێك دا هاواری کردوەو نەڕاندوویە، لەگەڵ خۆتان بردوەتە ئاکچاساز، لەنێو بازاڕی دەگەڕێن. لەگەڵ هەر بیست کەسەکەش قسەم کرد. ئێستا پێم بڵێن بزانم قاتڵی بابتان حەمەدۆکە یان کەرەم ئایدینی؟".
کوڕانی تالیب بەگ بێدەنگ چاویان لە زەویەوە بڕیبوو.
"دە بڵێن دەی. لە دەرێ چاوەڕێی منن".
ئەوان هێشتا سەریان بەردابووەوەو بێدەنگ بوون.
"ئێستا ئەمن دەچمە دەرێ دەڵێم لەو نێوەدا هەڵەیەك رووی داوە، دەڵێم ئێوە بە چاوی خۆتان دوازدە پیاوی بەرگ سپیتان دیون کە حەمەدۆك سەرکردەیان بووە".
لە هۆدەکە چووە دەرو حازرانی لە بەسەرهاتەکە ئاگادار کرد. کوڕانی تالیب بەگیش هاتن و هەموو حازران کە لە ناخی دڵەوە خۆشحاڵ بوون پیرۆزباییان لێکردن.

دۆران ئەفەندی گوتی:

"ئەمشەو هەمووتان میوانی منن. هەزار رەحمەت لە قەبرەکەی بێ, قەبرەکەی پڕ بێ لە نوور. وەبەر شەفاعەتی پێغەمبەری (ص) کەوێ. ئەو نەزەرکردەیەك بوو بۆخۆی, لە پیاوچاکان بوو. لە ڕێی خوادا شەهید بوو. یەکێك لە کۆڵەکە سەرەکییەکانی دەوڵەتی تورکیە بوو. هەزار رەحمەت لە گۆڕەکەی. دۆستی گیانی و لە گیان خۆشەویست تری منیش بوو. بۆیە ئەمشەو میوانی دۆستی بابتانن. سبەینێش, ئێوە جەنابی داواکاری گشتی و دوکتۆر دەچنە ئاکچاسازو مەزبەتەی دەنووسن. لەوانەیە سەروەری خۆشەویستم مورتەزاغا قەرەداغلی ئۆغلییش لەگەڵتان بێ".

پاش ئەوەی کارەکەیان گەیاندە ئەو ئاکامە کە دەیانەویست, هەموویان لە شارەوانی وەدەر کەوتن و یەکسەر چوونە ڕێستوورانەکەی نەزیف ئۆغلی. هەموو حیسابی شێوەکەیان لەسەر مورتەزاغا بوو. بە هاوکاریی یەکتری لە گێژاوێکی دیکەش بەساغی دەرچووبوون. ئەو دەستەیەش کە لە بارەی حەمەدۆکەوە ناردبوویانە ئەنکەرە, وەڕێ کەوتبوو. مورتەزاغا ئەگەر مەسەلەی عەلییەشەلیشی چارەسەر کردبایە بە تەواوی بەختەوەر دەبوو. بەڵام وەختێك هەر ئەم ڕۆژانە دەستەیەك سەرباز لە ئەنکەرەوەو وەڕێ دەکەوت بۆ تووڕووس پێویستییەك بە عەلییەشەل نەبوو...

وەسبەینێ ڕا بەیانی زوو داواکاری گشتی, دوکتۆر, فەرماندەری جەندرمەو مورتەزاغا بە سواری ترۆمبێلی هەمزە دایی وەڕێ کەوتن. پێویست نەبوو فەرماندەری جەندرمە بێ, بەڵام بۆخۆی زۆری پێ خۆش بوو بچێ. پاشان دەیەویست بە چاوی خۆی تاوان و چۆنیەتیی تاوانەکانی حەمەدۆکی تاوانکار ببینێ و لە هەمووی بکۆڵێتەوە.

لەبەر ئەوەی چەند ڕۆژێك بوو باران نەباریبوو, جادە خۆڵەکەی نێوان شارۆچکەو گوندی خۆش بوو. ترۆمبێلەکەش بە پێچەوانەی هەموو جارەکانی دیکە لە نیوەی ڕێیەدا پەکی نەکەوت. زۆر زوو گەیشتنە دێ. کوڕانی تالیب بەگ کە بەیانی زوو هەستابوون, بە سواری ئەسپ بە وەخت خۆیان گەیاندبووەوە ماڵێ و لەبەر دەرگای باڵەخانە چاوەڕێیان بوون. گوتیان: بەرچاییەك بخۆین و بچینە شوێنی ڕووداوەکە.

چوونە سەرێ و دەسبەجێ بەرچایی حازر بوو خواردیان. لە خوارێ ئەسپ بۆ هەمووان ساز کرابوو. سوار بوون و چوون بۆ ئاکچاساز, لە جەرگەی گەرمای نیوەڕۆیەدا گەیشتنە ئاکچاساز. جاڵجاڵووکەی گەورە گەورە لەنێو چڵە دڕکە سوورەوە بووەکان دا داوە گەورەکانی خۆیان لە چڵێکەوە بۆ چڵێك ڕاهێشتبوو و لە سووچێکی داوەکانیان دا چاوەڕوانی نێچیرەکانیان بوون. هێلانە زەرگەتەی زەردو گەورە بە لکەکانەوە هەڵواسرابوون, ئەوەندە گەورە کە لکەکان داهاتبوونەوە. لە هەر هەنگاوێکی ڕێگادا تووشی ماری ئاماڵ سەوزو مەیلەو بنەوش و سوور دەبوون کە بەم لاو ئەولادا دەخزین. لە هەر لاوە دەنگی باڵندەو شەقەی باڵی ئەو مەلانە کە بە دیتنی وان هەڵدەفڕین, دەهاتە بەرگوێ و دنیا پڕ بوو لە ئاوازی

ئەو باڵندانە کە بە حەوادا دەفڕین. باتلاغەکە بە تەواوی داواکاری گشتیی ترساند. بەڵام بەو حاڵەش بەکەیف بوو. هەر دەیگوت: بێوێنەیە, سامناکە.

چەند لەحزەیەك چوونە نێو قامیشەڵانێکی چڕ. داواکار کە وای دەهاتە بەرچاو لەو قامیشەڵانە دەرباز نابن زۆر ترسابوو, شوکور کوڕانی تالیب بەگ باش شارەزای قامیشەڵانەکە بوون. بە ئاسانی و بە زوویی قامیشەڵانیان بەجێ هێشت و کەمێك دواتر گەیشتنە مەڵبەندێکی رووتەن. ئەم مەڵبەندە مەیدانێکی چووکەڵە بوو کە بە چیمەنێکی سەوزو ناسك و تەڕو تازە داپۆشرابوو. چیمەنەکە ئەوەندە سەوزو گەش و جوان بوو دەت گوت تاوێك لەمەوپێش سەری لە عەرز دەرهێناوە. لەنێو ئەو گۆڕاییەدا بۆیەکی قەد ئەستوور لك و پۆپەکانی بە هەموو لایەك دا بڵاو ببوونەوەو چووبوونە حەوا. بە لکی لای رۆژهەڵاتی دارەکەوە کە بڵندو ئەستوورو خوار بوو جەنازەی پیاوێکی رووت و قووت هەڵواسرابوو کە لە دوورەوە رەش دەچوو. سەری سێ بستی لەگەڵ زەوی بەین بوو. کە لە بۆیەکە نیزیك بوونەوە لەگەڵ گرمەی باڵی زەرگەتەو مێش و مەگەز بەرەورووو بوون. لەسەر تەرمەکە لە قامکی پێی هەتا تەپڵی سەری زەرگەتە دەهاتن و دەچوون. بە قەد نووکی دەرزی جێی بەتاڵ لە لەشی مردووەکەدا نەدەبینرا. تەنیا چاوە رەشەکانی تالیب بەگ یەکجار زۆر داپچڕابوون, بە سەرسوڕماوی و حەپەساوی هەروا دەیان ڕوانی. چاوەکانی نەك هەر زەرگەتە, بەڵکوو مێشوولەشیان لەسەر نەدەنیشت.

داواکاری گشتی گوتی: بابی رەحمەتیتان لەوێ بێننە خوار.

ماوەیەك هیچ کام لە کوڕەکان لە تەرمی بابیان کە لە مێش و مەگەزو زەگەتەدا ون ببوو, نیزیك نەبوونەوە. جگە لەو کۆمەڵە زەرگەتەیە کە تەرمەکەیان داپۆشیبوو کۆمەڵە زەرگەتەیەکی دیکەش لە دەوری جەنازەکە دەسووڕان, دەت گوت لە دەوری میری خۆیان دەخولێنەوە. مێشەنگوینە, ژەنگەسوورەو زەرگەتەی زەردو رەش و سوورو بۆرو زۆر جۆری دیکە کە هەتا ئێستا وێنەیان نەبینرابوو, دەوری دارەکەیان دابوو و هەریەکەی وەك پڵنگێك دەیان نەڕاندو تێکیانەوە داویشت.

کرێکارانی کێڵگە کە بۆ بردنەوەی جەنازەکە لەگەڵیان هاتبوون, تێبینیی خۆیان کردبوو. سەرکڵاوی هێڵەکیان پێ بوون, لەوانە کە وەختی مێش بڕینەوە لە سەریان دەکەن. ئەم سەرکڵاوانەیان کردە سەریان و لە دارە بۆیەکە نیزیك کەوتنەوە. چەند لەحزەیەك بە دوودڵی لەنێو زەرگەتەکان دا مانەوەو پاشان خۆیان گەیاندە جەنازەکە. مردووەکەیان لە دارێ کردەوەو هاویشتیانە سەر پشتی ئەسپێکی رووت. بەو هەموو مێش و زەرگەتەیەوە کە دەت گوت وەدوای میرەکەیان کەوتوون گەیشتنەوە کێڵگە. لەوێ ئەو دێهاتییانەی لە دێیەکانی دەوروبەرەوە هاتبوون و لە قەراخ جادە ریزیان بەستبوو چاوەڕوانیان بوون. حەشیمەتێکی بە مەراق و تامەزرۆ لە گەورەو چووك و پیرو لاو و ژن و پیاو کۆ ببوونەوە.

مەزبەتەکەیان لە باڵەخانەکەی تالیب بەگ نووسی. لە مەزبەتەدا نووسیویان کە تالیب گوللەی لە چاوان دراوەو کوژراوەو پاش مردنی لووت و گوێیان بڕیون و پاشان ئەندامیان بە هەنگوین سواخ کردوەو لە باتلاغێك بە ناوی ناکچاساز دا بە دار بۆیەکەوە هەڵیان واسیوە. دوکتۆریش زۆری زاراوەی زانستی لە مەزبەتەکەدا بەکار بردبوون. تەنانەت ئەوەشی لەبیر نەچوو کە لە راپۆرتی خۆی دا بنووسی لەو دەشتەو لە تووڕووس تەنیا چەتەیەك بە ناوی حەمەدۆك بەو جۆرە, یانی گوللە لە چاودان خەڵکی دەکوژێ.

لە باڵەخانە خواردنی وایان لە گۆشت نێچیر ساز کردبوو کە وێنەی دەست ناکەوێ. نانیان خواردو پێش خۆرئاوا چوونەوە شارۆچکە. قایمقام و سەرۆکی شارەوانی و گەورە پیاوانی دیکەی شارۆچکە دەزگای راکی خواردنەوەیان داکوتابوو, چاوەڕوانی ئەو میوانانە بوون کە دەبوو لە دێ ڕا بێنەوە. بە گەیشتنەوەی وان دەسبەجێ پەلاماری دەزگاکەیان داو بە خۆشیی تالیب بەگ دەست کرا بە خواردنەوە. یاوەر بە بەرزکردنەوەی هەر پیاڵەیەك تەنیا یەك قسەی دەکردو هیچی دیکەی بەزمان دا نەدەهات: سامناك بوو, دیمەنێکی سامناك بوو. ئەمنیش ئەو حەمەدۆکەی... راست... وەك...

موڕتەزاغا لە خۆشیان باڵی گرتبوون. ئەمڕۆ کارێکی گەورەی کردبوو. داواکارو دوکتۆرو دێهاتییەکان دیبوویان کە تالیب بەگ راست وەك عەبدیخان و عەلی سەفابەگ گوللەی لە چاوان دراوە. ئەگەر قسەکانی سەرۆکی شارەوانی کەیفی موڕتەزاغایان تێك نەدابایە, ئەو هەتا حەوتوویەکی دیکە ساغ و بەدەماغ بوو.

"جەنابی سەرۆك تکا دەکەم جارێکی دیکەش دووپاتی بفەرموو".

"کاکی بەڕێز! مەلادۆران ئەفەندی, عەلییەشەلی بانگ کردوە, پارەیەکی زۆری داوەتێ و کردوویە بە پارێزەری خۆی".

خۆشحاڵییەکەی موڕتەزاغا وەك پزدانێکی فوودراو کە دەرزییان تێ ڕۆکردبێ, پووکایەوە. دەیویست دەسبەجێ بچێتە لای مەلادۆران ئەفەندی, بەڵام نەیتوانی ئەوەش بکا. ئەو شەوە ئەوەندەی خواردەوەو ئەوەندەی باسی ریابازی و دووڕوویی خەڵك بەتایبەتی مەلادۆران کرد کە ئیدی کەس گوێی بۆ قسەکانی رانەدەگرت. ئەویش کە ئەم مەسەلەیەی بۆ دەرکەوتبوو, وەك شێتانی لێ هاتبوو. لای نیوەشەوێ موڕتەزاغا سەرخۆش و بێحاڵ لە کاتێك دا دوو کەس بن پیلیان گرتبوو و لەسەر لاقانی رایان دەکێشا, بەرەو ماڵ دەچووەوە. بەڵام مەسەلەکە چۆن بوو:

وەختێك ئەوانەی بەنیاز بوون بچنە کێڵگەی تالیب بەگ سواری ترۆمبێل دەبن, مەلادۆران ئەفەندییش دەسبەجێ دەچێتەوە ماڵێ و روو بە خزمەتکارەکانی دەنەڕێنێ:

"برۆن عەلی‌یەشەلی وەستای شوێنگێرانم بۆ وەبینن, لە هەر کوێ بێ لە ئاسمانیش بێ, دەبێ بی‌بیننەوەو بی‌هێننە ئێرە. دەڵێن لە ئاشی حەسەنەرەشە, ئەگەر لەوێ نەبوو حەسەنەرەش پێی دەزانێ. پێی بڵێن گوێی عەلی‌یەشەلی بگرێ و بی‌هێنێتە کن من. بڵێن هەر ئێستا دەم هەوێ, هەر ئێستا".

سەعاتێك پێ نەچوو حەسەنەرەش عەلی‌یەشەلی لەگەڵ خۆی هێنا:

"فەرموو ئاغای خۆم, عەلی‌یەشەلی مامۆستای شوێنگێران کە باسی دەکەن ئەمەیە".

مەلادۆران ئەفەندی کە لەسەر قەنەفەیەکی گەورە دانیشتبوو, چاوی لێك نابوون و دەسحێبی دەگێران, لەسەرەخۆ چاوی هەڵێنان:

"گوتت عەلی‌یەشەل؟".

"عەلی‌یەشەلتان ویستبوو, ئەمنیش هێنامە خزمەتت".

"زۆر باشە با بێ, بی‌بینم".

دەسحێبە نەوەدو نۆ دەنکی‌یەکەی دەستی بەرەو عەلی‌یەشەل راوەشاندو لە حاڵێك دا کورسی‌یەکی دارگوێزی پێ نیشان دەدا, گوتی:

"عەلی وەرە ئێرە دانیشە بزانم".

رووشی کردە حەسەنی ئاشەوان و گوتی:"سوپاس حەسەنەرەش, ئەتۆ برۆ." حەسەن دەسبەجێ رۆیشت و عەلییش چوو لەسەر کورسی‌یەکە دانیشت. ئەختێك ئەژنۆکانی شێلان و ئەجار بە حورمەتەوە دەستەکانیی لەسەر دانان. مەلادۆران ئەفەندی گوتی: عەلی رەحەت دانیشە.

عەلی کەمێك جوولا.

"عەلی, دەرکت بە قور نەگیرێ, تاریفی شوێنگێرانی تۆ تەواو نابێ. مورتەزاغا لەبارەی تۆوە زۆری پێوە دەنێ. سەری زمان و بنی زمانی بووەتە "عەلی‌یەشەل برای منە". ئەجار دەڵێ حەمەدۆك بە خوێنی سەری تۆ تینوویە عەلی. چۆن بوو نەت کوشت؟ گورگێکی کارکوشتەی وەك تۆ منداڵێکی وەك وی بە پاروویەك دەخوا. چما وا نیە؟".

"نەمان توانی بی‌کوژین ئاغا".

"بۆچی, لەبەرچی؟".

"ئاغا, ئەو زۆر بەغیرەتە".

"ئەی تۆ؟".

"لە کن وی ئێمە هیچ کارە نیین".

"دەڵێن گوللە کاری لێ‌ناکا, ئەتۆش باوەڕ دەکەی؟".

"باوەڕ دەکەم ئاغا, پیری خانەقای چل چاو لەشی وی کردوەتە پۆلاّ ئاغا! یەکیش بۆخۆم بەم دوو چاوانەم دیومە کە ئەو بەردە بریسکەی پێ‌یە, بەردێکە وەك ئاگر گڕی لێ‌دەبێتەوە, وەختێك تەماشای دەکەی وا لە چاو دەدا پیاو وەختە کوێر بێ".

"ئەو بەردە بە کەلکی چی دێ؟".

"هەرکەس ئەو بەردەی پێ‌بێ گوللەی وێ ناکەوێ, ئەگەر وێشی کەوێ کاری لێ‌ناکا. کەسێك ئەو بەردە, یانی بەردە بریسکەی پێ بێ, شمشێر نای‌بڕێ, ئاور نای‌سووتێنێ و ئاو نای‌با".

"دەنگۆیە, چاوڕاوە. ئەتۆ باوەڕ دەکەی؟".

"هەموو کەس باوەڕ دەکا".

"ئەگەر بڵێم ئەمن باوەڕ بەو قسە قۆڕانە ناکەم, دەڵێن چی؟".

"مەیل, مەیلی جەنابتانە, جەنابت لە زانا گەورەکانی, یادگاری ئەو گەورە گەورانەی کە نەزەر لە بەردی بکەن دەی‌کەنە ئاو".

"استغفرالله... باشە, حەمەدۆك ئەنگێوەترە یان ئەتۆ؟".

"بەخوای تاقیمان نەکردوەتەوە. ئەگەر تاقیی بکەینەوە, لەوانەیە خوا لە دوو دەستی وی بداو لەوانەشە لە دوو دەستی منی بدا".

"چۆن بوو نەی‌کوشتی. لە حاڵێك دا زۆر حەز دەکا بت کوژێ؟".

عەلی پێ‌کەنی:

"ئا ئیدی, ئەو منداڵی دوێنێ‌یە, داوی مەمانان بانادا, تەنانەت ئەگەر بریسکەشی لە گیرفان دا بێ...".

"تێ‌گەیشتم, هەر ئەم ڕۆژانە کاری وی یەکلا دەکرێ, هەرکەس بێ. بەڵام وادیارە دێهاتی‌یەکان زۆریان خۆش دەوێ. ئەویان تا ڕادەی نەزەرکردەیەکی خاوەن کەشف و کەرامەت گەورە کردوەتەوە, یانی هێندە پیاوی چاکە؟".

"ئینسانی چاکە".

"ئینسانی چاك چۆن دەیەوێ تۆ بکوژێ و یازدە منداڵت هەتیو بکا؟"

"خەتای خۆم بوو, هەقیەتی بم کوژێ...".

مەلادۆران ئەفەندی خێرا خێرا دەستی کرد بە دەسحێب گێڕان. کەمێك بە سەرسوڕمانەوە چەنەگەی ڕەپێش کردو پاش چەند جار لاحول و لا... گوتن چەند جار دەستی بە ریشی دا هێناو گوتی:

"باشە, کەوایە هەقی خۆتە. بۆچی هەقی خۆتە؟".

"هەموو ئەو بەڵایانە ئەمن بەسەرم هێناون, شوێنەکەیم دیتەوەو عەبدیخانیش گرتی".

"هە. هە. ها. مەسەلەکە روون بووەوە".

"بەڵێ, ئاوایە ئاغا".

"حەمەدۆکت زۆر خۆش دەوێ؟".

"زۆر ئاغا, لە گیانی خۆم زیاترم خۆش دەوێ".

"عەلی".

"فەرموو ئاغا".

"زۆرم خۆش ویستی".

"خۆش بی ئاغا".

"لەمەودوا ئیدی کار بۆ من دەکەی".

"باشە ئاغا کارت بۆ دەکەم".

"مورتەزاغا کارێکی زۆر ناشیرن و نائینسانانەی لەگەڵ کردی. لە پێش دا نوێ نوێی کردیەوە. پاشانیش رووتی کردیەوەو بە سەرڕووتی و پێخواسی وەدەری نای. وا نەبوو؟".

عەلیەشەل ملی بە لارەوە ناو بێدەنگ بوو.

"پاشانیش هاتە ئاشی و سێ شەوو رۆژان پاڕایەوە. بەری پێیانتی ماچ کرد. بەڵام خۆت چووك نەکردەوەو قسەت لەگەڵ نەکرد".

عەلی بە ناڕەحەتی و خەمگینی سەری هەڵبڕی و لە چاوی مەلادۆران ئەفەندیەوە کە خێرا خێرا دەسحێبی دەگێڕا راما:

"قسەم لەگەڵ نەکرد. نەم توانی قسەی لەگەڵ بکەم. زمانم نەگەڕا".

"عەلی. چەندم لێ دەستێنی کارم بۆ بکەی؟".

"لە پێش دا کڵاوشەبقەیەکی فوتێر, دەستێك چاکەت و پانتۆڵ, جووتێك قۆندەرە... پاشان ئەسپێکی بۆرەی رەسەن, ئەمجار فیلینتایەکی نوێ و دەمانچەیەکی دەسك عاجی پۆلاکوتی نوێ نوێ. پارەی جلەکانم هەر ئێستا دەوێ. مواجبەکەشم دەخەمە بەر ویژدانی

خۆت. یازده منداڵم هەن, لە کێوپارەن و ناتوانم بیان هێنمە ئێرە. چیم دەدەیەی خوا بەزیادی کا, خۆت و ویژدانت".

مەلادۆران ئەفەندی بە زەردەخەنەوە گوتی:

"ئێستا کە خۆم و ویژدانم, کارەکە ئاسانە".

دەستی بردە بەر پشتێنی, کیسەیەکی کۆنی شڕی زەلامی دەرهێناو گوتی:

"عەلی وەرە ئەم پارەیە بگرە, برۆ بازاڕی هەرچی پێت خۆش بوو بۆخۆت و ژن و منداڵت بکڕە. ئەم پارەیە لەسەر حیساب نانووسم. دوایە بەرە بەرە لە مواجبەکەت کەمی دەکەمەوە".

"هەر بژی ئاغا".

عەلی پاش وەرگرتنی پارەکە لە پێش دا چووە دوکانی کڵاوفرۆش و کڵاوشەبقەیەکی راست وەك ئەوی پێشووی کڕی. پاشان چووە لای کووتاڵفرۆش و لەوێوە رۆیشتە کن بەرگدروو, رایسپارد کە پانتۆڵەکەی بە مۆدی گالیفە بۆ بدووریٚ, راست وەك پانتۆڵی ئەفسەرانی سوارە. دوایە دوکانی وەستا جەعفەری کەوشدرووی دۆزیەوە. وەستا جەعفەر پاش ئەوەی تاوێك لەلاقیەوە راما, لەبن لێوانەوە بۆڵاندی:

"ئەمن چۆن کەوش بۆ ئەم لاقە بدوورم؟".

"کەوشکەر چۆنی دەدووریٚ, ئەتۆش وای بدروو. جووتێك چەکمەم بۆ بدروو".

"بەوی دەڵێن کەوشکەر...".

"ئەتۆ ئەرەسی درووی چاکی, لە چوکووراوا ناوبانگت کردوە. بەو هۆشە کە هەتە هیچ شتێکت لەبەر حاسیٚ نابیٚ".

وەستا جەعفەر پاش ئەوەی ماوەیەك لەسەر تا بە خواری ورد بووەوە روخساری کرایەوە, پرسی:

"ئەتۆ عەلیییەشەل, وەستای بەناوبانگی شوێنگێرانی, وەنا؟".

عەلی گوتی:

"ئەمن عەلیییەشەلم".

"ئێستا کەوایە زۆر بە داوو دڵ جووتێکت چەکمە بۆ دەدرووم. چەند کاغەزی هێنان, چەند ئەندازەی گرتن, چەند جاری حیساب کردو سەرەنجام گوتی:

"زۆر باشە, سیٚ رۆژی دیکە بۆی وەرەوە. ئاخر دەزانی, دەزانم بە پەلەی؟".

حەوتوویەك دواتر عەلی جلەکانی کردە بەری, چەکمەی لەپیٚ کردن و لە حاڵێك دا هەوڵی دەدا شەلینەکەی دیار نەبیٚ, لە نێوەڕاستی بازاڕی دا وەڕیٚ کەوت. لە بنەوە تەماشای دەوروبەری دەکرد, بزانیٚ تەماشای دەکەن یان نا".

چەند رۆژ دواتر ئەسپە بۆرەو فیلینتاش گەیشتن و مەلادۆران ئەفەندی دووربینێکی زۆر باشی ئەڵمانییشی خستبووە سەر ئەو شتانە کە عەلی داوای کردبوون, دووربینێك کە لە شەویش دا کاری دەکرد. هەموو ئەمانەی لەسەر حیسابی عەلی نووسیبوو.

مورتەزاغا بە دیتنی عەلیەشەل کە سواری ئەسپی بۆرەو دووربین لە مل دا بە فیزو دەمارەوە بە بەردەرکی ماڵەکەی دا دێت و دەچێ, لە رقان شێت بوو. هەتا ئێستا هەر جۆرێك بوو ددانی بە جەرگی خۆی دا گرتبوو, بەڵام وەختێك عەلیی بەو شێوەیە دی, ئیدی ئیمانی لەکن نەما. هەستی کرد سووکایەتییەکی گەورەی پێ کراوە. یەکسەر چووە ماڵێ مەلادۆران ئەفەندی و نەڕاندی:

"مەلا, مەلا, بابت گام, ماڵت وێران کردم و ئاوت لە جێ ماڵێ نام, ئەوەش بوو بە کار کە عەلیەشەلت لێ ئەستاندم؟".

مەلا دای نواندو بە هەزار ناری عەلی ئارامی کردەوە. هەوڵی دا تێی بگەیەنێ کە بۆخۆی زیاتر لەو پێویستیی بە عەلی هەیە.

مورتەزاغا بە رواڵەت بە قەناعەت هاتوویی ماڵێ مەلا دۆران ئەفەندیی بەجێ هێشت, بەڵام لەدڵی خۆی دا هەزار سوێندو قورئانی خوارد کە تۆڵەی ئەو کارە لە مەلادۆران ئەفەندی بکاتەوە.

# (١٣)

هێشتا خۆر دەرنەکەوتبوو کە وەزعی گوندی ئاسیاب چەشمە شێوا. خەڵك، بێدەنگ و بێهەست و خوست لەم ماڵەوە دەچوونە ئەو ماڵ... ورتە ورت و لێك روانینی بە مانا... وەختێك هەتاو لە لوتکەی چیاکانی دا ئاوەدانی کەوتە بێدەنگی‌یەکی قووڵەوەو هەموو جێ‌یەك بێدەنگ و ئارام بوو. ماوەیەك لەمەوبەریش بە بڵاوبوونەوەی خەبەری مەرگی حەمەدۆك دێ‌یەکە تووشی ئەم وەزعە هاتبوو و کاتێك خەڵك زانی‌یان ئەو رێگرەی کوژراوە حەمەدۆك نیە، تۆفانێکی خۆشی و شادمانی لە گوندەکان دا وەرێ کەوتبوو.

دەزانن ئەو وەخت کە دەنگۆی مەرگی حەمەدۆك داکەوت، دێهاتی‌یەکان چی‌یان کرد؟ لەو بارەیەوە هیچیان بە دایەحۆری نەگوت و حۆری هەرچەند ژنێکی دنیادیدە بوو و هەرچی‌یەك رووی دابایە بۆنی دەکرد، بەڵام لەو بێدەنگی‌یەی بەسەر ئاوەدانی دا زاڵ ببوو، بۆنی شتێکی ناخۆشی نەکردو لەو بابەتەوە پرسیاری لە کەسیش نەکرد. وەختێکیش بە خەبەری زیندووبوونی حەمەدۆك دێ‌یەکە بوو بە تۆفانی شادمانی، دیسان دایە حۆری جموجۆڵێکی زۆری لە خۆی نیشان نەداو بە پانەوە گوتی: دەم زانی، و پاشان تێکەڵ بە لافاوی خۆشحاڵیی خەڵکی ئاوەدانی بوو. تەنیا دەمە ساتێك خەم دای‌گرت، ئەویش لەحزەیەك بوو کە عەلی دورمووشی مێردیی وەبیر هاتەوەو لەدڵی خۆی دا گوتی ئەگەر مابایە بێ ئەوەی گوێ بداتە نەخۆشی‌یەکەی، لاقی هەڵدەکردن و بە شەوق و زەوقی تایبەتیی خۆیەوە هەڵپەڕینەکەی جارانی دووپات دەکردەوە.

ئێستاش زۆری گوێ نەدەدایە ئەو بێدەنگی‌یە کە بەسەر هەموو ئاوەدانی دا زاڵ ببوو، بەڵام لە ناخی دڵی‌دا هەستی بە جۆرە نیگەرانی‌یەکی لێڵ و تاریك دەکرد. لەبەر خۆیەوە دەی‌گوت: کوڕەکەم هیچی لێ نایە، ئەو پشت و پەناو کەس و کارو هیواو هومێدی فەقیرو هەژارانە،

دوعای زۆر کەسانی لەپشتە، ئەو خوا گەورەیە کە عەرزو عاسمانی خەڵق کردوون و نوور لە چاوە ڕەشە جوانەکانی و لە ریشە سپیەیە درێژەکەی دەبارێ، پشت و پەنایەتی... گوللە کاری لێناکا، ئاور نای‌سووتێنێ، ئاو نای‌خنکێنێ... چما خوای گەورە نازانێ کە دەبێ پشتی کێ بگرێ، کێ بپارێزێ؟ رۆژانە لەبن دیواری خانووە قوڕینەکەی دادەنیشت و خەریکی چنینی جووتە گۆرەوی‌یەکی خوری بۆ حەمەدۆك بوو. گۆرەوی‌یەکە خەریك بوو تەواو بێ. ئەگەر تەواو بوو چاوی دەوێ بێتە سەیرێ. تا ئێستا هیچ دایکێك گۆرەویی وای بۆ کوڕی خۆی کە دە ساڵە چووەتە سەربازی و بە ئەزرەتەوەیە لەحزەیەك چاوی پێی بکەوێ، نەچنیوە. تا ئێستا هیچ گەورە کچێکی دەزگیران مردووی لەخەفەتان شێت بوو گۆرەویی وای بۆ ئەو دەزگیرانەی خەونی پێوە دەبینێ نەچنیوە، هیچ نۆبووکێکی سووتاو بە ئاگری تامەزرۆیی کە زاوای لە غەریبایەتی‌یەو لێی جیا ماوەتەوە گۆرەویی وای نەچنیوە. گوڵی شینی وردو درشتی زۆر جوانی لە گۆرەوی‌یەکە هاویشتبوون. وەختێك حەمەدۆك ئەم گۆرەوی‌یانە لەپێ کاو پێیانەوە بڕوا هەرکەس بی‌بینێ پێی وا دەبێ باقە گوڵە بە ڕێگادا دەڕوا. هیچ شایەك، هیچ سوڵتانێك و تەنانەت کوێرئۆغڵیی قارەمانیش گۆرەویی وای لەپێ نەکردوەو تەنانەت نەشی دیوە.

هەتاوی پاییز دنیای گەرم دەکرد، کەمێك لەولاتر زەرگەتەیەك بە ڕەنگی سوورو شینەوە وەك هەورە تریشقە بە دەورەی گوڵێکی بنەوشیی لاسك درێژدا دەسووڕا. لەسەر گوڵەکە دەنیشتەوەو دەسبەجێ هەڵدەستایەوە.

دایەحۆری جار جار سەری لەسەر سنگی هەڵدەبڕی و لە حاڵێك دا پێڵووی چاوەکانیی دەترووکاندن تەماشای ئاوەدانیی دەکرد، تەماشایەکی دەکردو دووبارە لەنێو گوڵە شینەکانی سەر گۆرەوی‌یەکەدا نوقم دەبوو. ئەگەر حەمەدۆك ئەم گۆرەوی‌یانە لەپێ کا خوای گەورە لە جاران زیاتر لە قەزاو بەڵای ڕۆژگار دەی‌پارێزێ. بۆچی نەی‌پارێزێ. چما دایەحۆری ئازاری بە کەس گەیاندوە؟ لەم دنیایەدا هیچ گیان لەبەرێکی ئازار نەداوە. تەنانەت پەپوولەو مێروولەی خواشی ئەزیەت نەکردوەو جگە لە عەلی‌یەشەلی بێ‌دین رقیشی لە عەبدی خوای نیە، لەبارەی ئەو کافرشەوە هەقی بوو. بەڵام حەمەدۆك دڵی ئەو شەلەی دەوێ، ڕەبی خوا لاقەکەی دیکەشی شەل کا. دایە حۆری زۆر لەوە نارەحەت بوو. ئەگەر کەسێکیش ڕووی خۆشی بە عەلی‌یەشەل نیشان دابایەو قسەی لەگەڵ کردبایە، لێی خۆش نەدەبوو. بەڵام لەبارەی حەمەدۆکەوە مەسەلەکە فەرقی دەکرد. حەمەدۆك هیچ کارێکی بێ‌دەلیل نەبوو. ئەو مناڵە بستە باڵایە دڵێکی هەیە وەك شێر. ئەویش تەنانەت مێروولەیەکی خوای گەورە، ئەو خوا چاوڕەشە جەمال نوورانی‌یەی ئازار نەداوە.

دایەحۆری زۆر لەوە قەلس بوو کە دەیدی جووتیارەکان ئەوەندە بێدەنگن و خۆ دەخۆنەوە، بەلام وەڕووی هەلنەدێنان. بە دەرەك، لادێیی دەگەوجی، بێغەك... هیچ وەخت ئەو ڕۆژانەی لەبیر نەدەچوو کە دێهاتییەکان لەسەر ئەوەی حەمەدۆك نەیتوانیبوو عەبدیخانی بکوژێ پاشەملە قسەی پڕوپووچیان پێدەگوت و لە ئاوەدانی دەریان دەکرد. ئەو ڕۆژانەی وەبیر دەهاتنەوەو ڕقی هەلدەستا. ئێستا هەمزە کەچەل مالاوایی خواستوە، ئۆ...ی هەموویان ئاسوودە بوون، زەوییەکی زۆریان هەیە، کێلگەیان هەموو پڕ دەبن لە بەرهەم، مانگاکانیان، ماینەکان، بزن و مەڕەکان هەمووان دووانەیان دەبێ. بەلام ئەو گەوجانە نەیان دەزانی هەمووی ئەمانە لەسایەی سەری حەمەدۆکەوەیە، لە بەرەکەتی ئەو تەیری ئیقبالەوەیە... تەماشایان کە، توخوا تەماشایان کە، بزانە هەر بەسەر پێوە دێنە لای دایە حۆری، دایکە تاقانەکەی حەمەدۆك؟

هەتا نوێژی نیوەڕۆیە خەریکی گۆرێ چنین بوو. ئیدی هێندەی نەمابوو، ئەگەر کەمێکی هەولّ دابایە هەتا ڕۆژئاوایە تەواوی دەکرد. خەجیجی وەبیر هاتەوە. دلّی پڕ بوو. بیری کردەوە: چەند کچێکی باش بوو، ئەویش بۆ ئەوەی ئەوینی شێتانەی خۆی بە حەمەدۆك نیشان بدا ئەو جۆرە گۆرێیانەی دەچنی. ئێستا کە ئەو مردوە، حەمەدۆك دەبێ بێ گۆرەوی بێ؟ شوکور بۆ خوا کە جارێ دایەحۆریی ماوە، ئەویش ساغ و سەلیم وەك گوللە تۆپ. بە شیش گۆرەوییەکە قانگلەبەن و گۆرەوییەکەی لێك دروون و بردیەوە مالێ لەسەر چوار پێچکەی بەر ئاگردانی دانان. پشتی ڕاست کردەوە، بە جوانی قۆلنجەکانیی شکاندن و ڕۆیشتە نێو ئاوەدانی. لەنێو مالان کەس دیار نەبوو، وادیار بوو ئەوانەی دەشی بینن لەبەری هەلدێن و خۆیان دەشارنەوە. با هەلێن، هەلێن، با هیچ نەلێن و زمانیان لال بێ... چما دیسان حەمەدم بەلایەکی بەسەر هاتوە؟ ئەم دێهاتییە چەپەلانە هێشتا کوڕەکەم نەمردوە جوان و قازاخ دەقەبریان ڕاکردوە، تف، تف... زمانم لال بێ، خوا نەکا... چوو لە پەنا مالی حەسۆ ڕاوەستاو کە دیتی دەرگای مالەکەی داخراوە ڕقی هەستاو نەڕاندی: چ بووە، چ خەبەرە، خوا کوێرتان کا، چ بووە دیسان؟ دەلێی هەر مالەی یەکێکی لێ مردوە. پاشان ڕاوێژی قسەی توندتر کردو لێی زیاد کرد: گوێتان لە دەنگم نیە، سندان لەسەردراوینە، دەرکەی بکەنەوە. دەرگای مالی حەسۆ شێلم کرایەوەو حەسۆ هاتەدەر، چاوەکانی سوور هەلگەڕابوون.

دایەحۆری تێی ڕاخوڕی:

"چتە، چ بووە؟".

حەسۆ لە حالێك دا باوەشی کردبووەوە جوابی دایەوە:

"هیچ نیە, جارێ وەرە ژووری, وەرە ژووری خوشکە حۆری".

دایەحۆری لە کاتێك دا لە رقان نێوچاوانی گرژ کردبوو گوتی:

"با, شتێك هەیە".

حەسۆ شێلم دیسان لەسەرەخۆ گوتی:

"ئێستا وەرە, ئێستا وەرە ژووری..." ئەمجار بەسپایی قۆلێی گرت و رایکێشا.

دایەحۆری بە راوێژێکی توندوتیژ گوتی:

"دیسان حەمەدۆکتان کوشت؟ باشە با بمری, بیکوژن, پێت وایە ئەگەر حەمەدۆك بمری کاری ئەم دنیایە هەموویان جێبەجێ دەبن؟ دایکەکان دیسان سەد حەمەدۆکیان دەبێ, حەمەدۆك نامری, دەمری و زیندوو دەبێتەوە. ئەگەر مردبێ, خۆمان خۆش. ئەگەر مردبێ لە پێش چاوی دوژمنانی چەقەنە لێدەدەم, چەقەنە لێدەدەم و شادمانی دەکەم, لە پێش چاویان هەلپەڕین دەگرم. حالی بووی؟".

"خوشکە حۆری, جارێ وەرە ژووری".

"ئەگەر حەمەدۆکیان کوشتبێ شایی دەگرم, شایی".

ئەمجار رووی لە لای ئاوەدانی کردو هاواری کرد:

"حەمەدۆك جارێك دەمری, هەزار جار زیندوو دەبێتەوە. دایکەکان خۆش بن, دایکە...کان. گوێتان لێبێ دێهاتییە نەفامەکان, چما حەمەدۆك هی ئەم دێیە نەبوو؟ چما کوڕی برایمی هەژار نەبوو؟ چما کوڕی دوونە نەبوو؟ ژنی بەستەزمان, لە سەرت دابایە, نانت لێ رفاندبایە, دەنگی نەدەکرد. چتانە؟ بۆچی خزاونە مالەکانتان و تازیەتان داگرتوە؟".

حەسۆ دەنگی خۆی نەرمتر کرد:

"وەرە خوشکێ, تاوێك وەرە ژووری ماندووت بحەسێتەوە...".

حۆری قۆلی خۆی لە دەستی وی راپسکاوت و بە هات و هاوار چووە نێو ئاوەدانی. هات و لە مەیدانەکەدا راوەستاو دەستی کرد بە جنێودان بە هەموان. لە دێهاتییەکانەوە بگرە هەتا جەندرمەکان و یاوەرو هەموو کەس جگە لە حەمەدۆك...

ئەوەندەی دادو هاوار کرد کە جووتیارەکان لە مەراقان یەك یەك و دوو دوو لە مالەکانیان هاتنەدەرو لە مەیدانۆکەکەدا لە دەوری کۆ بوونەوە. هەتا دێهاتییەکان زۆرتر دەبوون ئەو پتری رق هەلدەستا:

"ئێوه پیاو نین؟ بنیادەم نین؟ حەمەدۆکیش دوو چاو و دوو دەست و دوو گوێی هەن و ئێوەش... حەمەدۆکیان کوشتوه؟ باشه با وابێ! کوێرئۆغڵیی جوامێر رۆیشت و نەهاتەوە، چووه کن چل سوارەی غەیبی. باشه، چ بووه؟ دنیا خەرا بووه؟ نێزه لەشی کوڕە ئاسنگەریان کون کون کرد، بەڵام هەر له جێی خۆی ما. گزیك دۆرانیان کوشت، چ قەوما؟ دنیا وەفای بۆ پادشا هەبوو؟ با حەمەدۆکی بکوژن، با حەمەدۆکی بکوژن، با بیکوژن...".

لەگەڵ گوتنی وشەی "بکوژن" دا خەفەتی له دامرکان نەهاتووی خۆشی به زمان دا دەهات و لەگەڵ هەر دووپات کردنەوەیەکی "بکوژن" دا بۆخۆشی دەمردو زیندوو دەبووەوە.

ئەمجار بێدەنگ بوو، هێزی لەبەر بڕابوو، دێهاتی‌یەکان پیرو لاو و منداڵ هەموویان له دەوری خڕ ببوونەوەو تەماشای ئەو پیرێژنەیان دەکرد که دەت گوت پەیکەری رق و خەفەته. بێدەنگی‌یەکەی حۆری درێژەی کێشا. ئەو دەستی لەبەر پشتێنێ نابوون، له دوندی عەلی‌کۆوە رامابوو و لەگژ فکران راچووبوو. به تەواوی دیار بوو که بەره بەره سست دەبێ و بەلادا دێ، ئەگەر خۆی شل کردبایه خۆی بەسەر پێوه رانەدەگرت و هەر لەوێ دەکەوته سەر زەوی. که هەستی بەو وەزعه کرد هاتەوه سەر خۆی، بەسەر خەفەت و دڵەخورپەی خۆی دا زاڵ بوو، و پشتی هەڵێنایەوە. پاش ئەوەی تاوێك تەماشای حەشیمەتەکەی کرد پرسی: حەمەدۆك چیی بەسەر هاتوه؟ ئاهەنگی دەنگی گاڵتەپێ‌کردنی پێوه دیار بوو، به تەوسەوه پێ‌کەنی: دیسان جەنابی یاوەر گوللەی له نێوێ چاوه رەشەکانی داوه؟ چ بووه؟

دیسان عەلی‌یەشەلی خائین پێوەی کردوه؟ رەبی توخم و تۆوی له سەر زەوی هەڵگیرێ، بیستوومه چووه بووەته وەرگێڕکەی ماڵی مەلادۆران... ئاخ... شوکور بۆ خوا که هەناسەی من گرتی، خوای گەورەم، ئەو خوا چاوڕەشەم خەراپتریشی بەسەر دێنێ، له وەرگێڕکەیش خەراپتر. ئەمجار دەستی بەرەو ئاسمان راگرتن و لێوەکانی بزووتن: خوایه سەد هەزار جار شوکور، ئەمجار دیسان دەستی لەبەر پشتێنی نانەوە: خەبەری مردنی حەمەدۆك به من ناڵێن؟ بەڵێ؟ دایه حۆری پیر بووه بەرگه ناگرێ، بەڵێ؟

بێدەنگ بوو و دووبارە چاوی بەسەر حەشیمەتەکەدا گێڕا. دووسێ جار دەستی راوەشاندو چەند جاریش تەکانێکی له خۆی دا وەك بیهەوێ هەڵپەڕێ. ئەمجار گوتی: تاقەت دەگرم کوڕینه، توانام هەیه، به قوربانتان بم چما بۆخۆم نازانم.

له خەفەتان دەنگی دەلەرزی: چما ئەمن بۆخۆم نازانم که یاغی سەری ساغ ناباته بن گڵ؟ دنیا وەفای بۆی نیه، چما وەفای بۆ سولەیمان هەبوو؟ سولەیمان زمانی باڵندانی دەزانی و ئەم

سەرو ئەوسەری دنیا لە ژێر فەرمانیدا بوو, وەختێك وەفای بۆ وی نەبوو, وەفای بۆ کەس نابێ.
حەمەدۆکیش ڕۆژێك وەك کوێرئۆغلی دەمرێ, ئەویش دەچێ تێکەڵ بەو پیاوچاکانە دەبێ...

دەیەویست بڵێ دەچێتە گەڵ چل سوارەی غەیبی, بەڵام گێڕایەوە. ئەو چەندی باوەڕ بە خوای گەورەی خۆی هەبوو, ئەوەندەشی باوەڕ بەوە هەبوو کە حەمەدۆك پاش مردنی دەچێتە گەڵ چل سوارەی غەیبی. ئێستا ئەگەر بتوانێ ئەم دێهاتیانە وەقسە بێنێ... بە هەر جۆر بایە ئەم کارەی دەرکرد, ئەو شارەزای هەموو خولق و خوویەکی خەڵکی لادێ بوو: تاقەت دەگرم کوڕینە, تاقەت دەگرم, دەزانم کە ڕێگری دواڕۆژی نیە, دەزانم, بەڵام دیسان دڵم ئاگری گرتوە, وەك کوورەی ئاسنگەران دەسووتێ.

دیسان دەنگی هەڵبڕیەوەو بە شێوەیەکی فەرماندەرانە گوتی: بۆ بێدەنگن, قسە بکەن, ئەمن دایە حۆریی حەمەدۆکم, ئەمن تاقەت دەگرم و...

دووبارە دەنگی نەرم کردەوە, ئاهەنگی دەنگی گەرم و پڕ لە خۆشەویستی بوو: ئەگەر ئاسن بام دەرزیم, بوومە گڵ و بەرگەم گرت, بوومە گڵ و بەرگەم گرت, بوومە گڵو...

لەنەکاو پشتی هەڵێنایەوە, دەت گوت ئەو ژنەی چەند لەحزە پێشتر کە دەنگێکی نەرم و هێدی, نەرم و نیان وەك ئاوریشمی هەبوو, هەر نیە:

"پێم بڵێن بزانم حەمەدۆك دیسان چیی بەسەر هاتوە؟".

حەشیمەت هەموو سەریان بەردابووەوەو وەك بەرد بێدەنگ بوون.

هاواری کرد: قسە ناکەن لامەزەبی دە بێدین؟ دیسان زیاتر ڕقی هەستاو هەرچی بە زاری دا هات, بە حەشیمەتەکەی گوت.

خەبەرێك هەیە ئەو لامەزەبانە قسە ناکەن. ئەم کرمی نیگەرانیە بەر ببووە گیانی جار بە جار زیاتر شێتی دەکرد. داخوا بەڕاست ئەم جارە بەڵایەك بەسەر حەمەدۆك هاتبوو؟ پێشتر گوتبووی کە بوومە گڵ و تەحەمولم کرد, بەڵێ, بەم قسەیە دڵخۆشیی خۆی دابووەوە. بەڵام ئەم جار ئیدی توانای تەحەمول کردنی نەبوو, چاردە کوڕی لە دورمووش عەلی ببوون, بەڵام هەمووی تەسلیم بە خاکی ڕەش کردبوون, ببووە گڵ و تەحەمولی کردبوو. بەڵام لەبارەی حەمەدۆکەوە؟ مەرگی وی پێ تەحەمول نەدەکرا. ئەگەر ببوایە بە بەرداشی بنەوە, یان ببا بە میچی گومبەزی ئاسمان دیسان مەرگی وی پێ تەحەمول نەدەکرا, ئەگەر لە خەفەتی مەرگی وی نەش مردایە بە زیندوویی دەرزی و لەبەر یەك بڵاو دەبوو.

بە دیتنی مەحموودە خڕە کە بە قەڵافەتێکی شەرمێونەوە ڕاست بەرامبەری وێستابوو, دەستەکانیی لەسەر زگی لەبەریەك ڕاکردبوون, تیشکێکی هیوا لە دڵی دا درەوشا. وەختێك

مەحموود تەمەنی لە سالێك پتر نەبوو, دایكی مردبوو. دایەحۆری ئەوی گەورە كردبوو و ژنی بۆ هێنابوو. ئاكارو كرداری وی باش دەناسی. فەرماندەرانە گوتی: مەحموود وەرە ئێرە. مەحموود هات و بەرامبەری راوەستا:

"بلێ بزانم حەمەدۆك چیی بەسەر هاتوە, بلێ, لێم مەشارەوە".

راوێژی دەنگی ئەوەندە فەرماندەرانەو بەبڕشت بوو, مەحموود بە جێی خۆی, هەركەسی دیكە لە جێی وی بایە نەیدەتوانی وەلاّم نەداتەوە. مەحموود گوتی: ئەسپ... و بێدەنگ بوو. حۆری نێوچاوانی تێك ناو پرسی كام ئەسپ؟

"ئەسپەكەی حەمەدۆك, ئەو ئەسپەی حەمەدۆك سواری بوو... ئەوەكەی ئەو رۆژە..."

"تێگەیشتم, ئەسپە رەشەكەی دەلێی, چیی بووە؟".

"لە هۆوێیە... هۆوێ...".

"كەسێكی سوارە؟".

"نا, رووتە".

بە بیستنی "رووتە" حۆری وەك زەعفەران زەرد هەلگەڕا. چەند لەحزەیەك تێك چوو, بەلاّم ئەو حالّەی زۆری نەخایاند, بەسەر خۆی دا زالّ بوو:

"لە كوێیە؟".

"لە هۆوێ, لەنێو شاخەكان".

حۆری وەڕێ كەوت و مەحمووده خرەش بە دوای دا, حەشیمەتە بێدەنگەكە دڕی داو رێگای بۆ كردەوە.

حۆری هەنگاوی خێراتر كردن و هەتا زیاتر دەچووە پێش خێراتر دەرۆیشت, مەحمووده خرە بە زەحمەت دەیگەیشتێ. وەختێك گەیشتنە بن شاخەكان, حۆری راوەستا. سنگی وەك كوورەی ئاسنگەران هەلّدەستاو دەپووكایەوە, ئەسپی خەنەیی راست لەسەر دوندی شاخە حەستەمەكە وێستابوو, كەلەكەی دە هەتاوێ كردبوو, سەری بەرز راگرتبوو و لەسەرەخۆ بە راست و چەپ دا كلكی رادەوەشاند, مووەكانی لەبەر ئەو رووناكایییە زۆرە كە دنیای ئاخنیبوو, دەدرەوشانەوە. حۆری خۆی هاویشتە سەر گابەردێك, بێ ئەوەی چاو لە ئەسپەكە وەرگێڕێ ماندووی حەساندەوەو هەستایە سەر پێ و گوتی:

"مەحموود گیان ئەتۆ لێرە بە ـ بە شاخەكە هەلّگەڕا ـ چەند پرسیارم لەو ئەسپە رەشە هەیە, بزانم ئەو چ دەلّێ و ئەمن چ دەبیسم".

باریکه ڕێیەکی دیتەوە کە پێی دا وەسەر کەوێ. ئەم ڕێیە بە هاتنەخواری ڕنووەبەفر دروست ببوو. بیری کردەوە: حەتمەن ئەویش بێرەدا وەسەر کەوتوە. لە حالێك دا دەچووە سەرێ چەند لەحزەیەك دەحەسایەوەو دووبارە وەڕێ دەکەوتەوەو ڕوو بە ئەسپەکە دەیگوت: خەنەیی جوانم کە ڕوخسارت وەك ڕوخساری کچانەو هەر چاوێکت بە قەد سێوێکە, ڕۆینت وەك ڕۆینی کەوەو ڕوانینت ڕوانینی ئاسکی جوانە, یالْ زێڕینی کلك ئاوریشمی, ئەتۆ وەك خەنەیی کوێرئۆغلی وای, بالْ دەگری و بە ئاسمان دا دەفڕی, حەوت شەو و ڕۆژ ڕێگا لە چاولێك نانێك دا دەبڕی, دایەحۆری بە قوربانی سوارەکەت بێ, بڵێ بزانم سوارەکەت چ لێکردوە؟ ئەتۆ چت بووە, ئەوت دایە دەستی تەیری ڕاوکەر, دەستی پڵنگی دڕندەو ئەو مارانە کە زەمانی حەوت سەریان هەیە؟ پێم بڵێ سوارەکەتت چ لێکردوە, بڵێ بە نۆکەرت دەبم, دایەحۆریت بە قوربان بێ, دایە حۆری بە قوربانی خۆت, قوربانی سمەکانت, بڵێ بزانم سوارەکەت چیی بووە, خەبەرێکی ویم بدەیە, ئەوت لە گەلێیەك فڕێ داوە, فڕێت داوەتە نێو گۆمێ, بردووتە تەسلیمی جەندرمە هارو دڕەندەکانت کردوە؟ بڵێ ئەسپی خەنەیی جوانم, ڕوخسارکچۆڵەی چاوگەورە... ئەتۆ وەك دولْدولْی حەزرەتی عەلی (ع) وای, بەبن سەدان هەزار شمشێردا تێدەپەڕی و بە ساغی دێیە دەرێ. بڵێ بزانم سوارەکەتت چ لێکردوە؟ بڵێسە ئاگر ئەویان لێئەستاندی؟ نەخۆشە, بڵێ ئاخر, بزانم چیی بەسەر هاتوە؟ ئەتۆ دەڵێی بوراقی حەزرەتی محمدی ـ بۆخۆی جوان, ناوەکەی جوان ـ هەڵدەفڕی و دەچیە ئاسمان, ئەتۆ وەك مەرکەبی حەزرەتی خدری کە بەسەر حەوت بەحران دا دەڕۆیشت. بڵێ بزانم سوارەکەتت داوەتە دەست ئەو کێوە شینە بڵندانە؟ داوتە بەو کۆچەرییانە کە چادرەکانیان ڕەشن و چاوەکانیان سەوز, بڵێ بزانم دێهاتییە دڵپاکەکان لێیان ئەستاندووی؟ بڵێ, دایە حۆریی دایکی حەمەدۆکت دەبەر مرێ. بڵێ سوارەکەتت چ لێ کردوە, بە قوربانی ئەو میوانەت بم کە لەبەر هەتاو دەبریسکێنەوە, بڵێ خەنەیی...

دایەحۆری لە حالێك دا بەم جۆرە سکالای لەگەڵ ئەسپەکە دەکرد هەتا نیزیك ئەسپی خەنەیی هەوراز چوو و چەند هەنگاو لەولای وی ڕاوەستا, ئەسپ لە جێی خۆی نەدەبزووت, هەروا ڕاوەستابوو و کلکی ڕادەوەشاند.

دایە حۆری کە لەو ڕەفتارەی ئەسپەکە غیرەتی هاتبووە بەر هەتا نیزیك حەیوانەکە ڕۆیشت. دەستی ڕاستی بڵند کردو لەسەرەخۆو کەمێك بە پارێزەوە دەستی بەسەر یالەکانی دا هێنا:

"دایەحۆری بە قوربانی یالە زێڕینەکانت بڵێ سوارەکەتت بردوەتە کوێ بڵێ بزانم ساغە, نەخۆشە, لە کن بێگانانە, بەلای بەسەر هاتوە؟".

ئەسپی خەنەیی ڕاست لەو لەحزەیەدا تەکانێکی دایە خۆی. هەستایە سەر پاشووان, لاقی پێشەوەی ڕاوەشاندن وەك ئەوەی هەوای بکوتێتەوە. حۆری دیتی کە ئەسپەکە لە نەکاو لە

شاخەکە چووە خوار. ئەگەر دایە حۆری لەحزەیەك خۆی پەنا نەدابایە, ئەسپی خەنەیی لە بەردەلانەکەی هەڵدەداشت و دەیکردە هەزار لەت:

"ئەسپە ڕەش بێچووە بەرازی شەیتان, رەبی خوا زەلیلت کا, ئەو چاوە وەك سێوانەت بتەقن, نەتۆ نە ئینسانەتی دەزانی, نە حەیوانەتی, لامەزەبی شێتی پەتیارە. منداری پیسی گلاو... حەمەدۆکیش ئەقڵی هەیە؟ ئەو ئەگەر ئەقڵی لە جێی خۆی بایە, دەیهێشت عەلیەشەلی دوژمنی خوێنخۆری, دوژمنی مارو مێروو و هەموو مەخلووقات کە ئێستا چووە بووە بە وەرگێڕکەی ماڵی مەلادۆران, زیندوو بێ؟ بڕوانە من کە پێم گوتی وەك ئەسپە بۆرەی کوێرئۆغڵی جوامێری, رەبی بە قوربانی نینۆکی ئەسپە بۆرەی کوێرئۆغڵی بی کە ناوی حەیاتی خواردوەتەوەو هەتا دنیا دنیایە, دەمێنێ. پێم گوتی وەك بوراقی محمد وای کە هەم ناوی جوانەو هەم بۆخۆی, نەتۆش پێت وابوو داخوا چیە, یاخوا بە قوربانی...".

زۆر لە ئەسپەکە تووڕە بوو و هەروا جنێوی دەدان. پاش ئەوەی رقەکەی نیشتەوە لە بەردەلانەکە هاتەخوارو لە مەحموودە خڕەی پرسی:

بۆ کوێ چوو ئەو خەنەیی پیسی بەدئەخلاق!".

مەحموود وەلامی دایەوە: چووە نێو دێ: شان بە شانی یەکتر و هێدی هێدی بەرەو دێ وەڕێ کەوتن.

دایەحۆری سەری بەردابووەوەو قسەی نەدەکرد. گەیشتنەوە ماڵێ. حۆری گوتی:

"لێرە وەمێنە, ئەمشەو دەمەوێ چێشتێکی خۆشت بۆ لێنێم. حەز دەکەی تاس کەبابی بە کەڵەشێرت بۆ لێدەنێم. بە منداڵی زۆرت پێ خۆش بوو, بە بیرت ماوە؟".

مەحموودە خڕە پێکەنی:

"دایە لەوەتی لە ماڵی ئێوە رۆیشتووم گۆشت کەڵەبابم نەخواردوە".

حۆری گوتی: زۆر باشە ئەمرۆ دەیخۆی.

لە دەری ماڵێ دانیشتن و پاڵیان وەدیواری دا. خەریك بوون دانیشن ئەسپی خەنەیی نەرم و سووك وەك با بە پێشیان دا تێپەڕی و رۆیشت. حۆری کە چاوی پێ کەوت سەری وەرگێڕاو گوتی:

"هەرچی پێی خۆشە با بیکا, تازە قسە لەگەڵ ئەم بەرازە ڕەشە ناکەم, تازە چاو لە روخساریشی ناکەم. یاخوا زەلیل بێ".

زۆری پێ نەچوو دیسان ئەسپەکە وەك با بە پێشیان دا رابوردو چوو بۆ لای بەردەلانەکە.

دایەحۆری کە بەڵێنی دابوو تازە تەماشای روخساریشی نەکا, هەتا وەختێك لە چاوان ون بوو بە ئەزرەت و تامەزرۆیی‌یەوە لە پشتەوەڕا تەماشای کرد.

بەرە بەری ئێواریٚ بوو. لە پێش دا دایەحۆری و بە دوای ویش دا مەحموودە خڕە هەستانە سەرپێ.

حۆری گوتی: مەحموود گیان... و ئەمجار کەڵەبابێکی گەورەی پەڕ سپیی مەیلەوزەردی نیشان دا کە لە پێش خۆیان بۆ دەنکە دانێك دەگەڕا. نیشانی داو گوتی: بیگرە سەری بڕە, بیگرە هەتا بۆت...

مەحموود هەر پەلاماری داو کەڵەشێری سەر بڕی. کەڵەبابی سەربڕاو لەسەر زەوی بەم لاو لادا هەڵدەبەزی.

دایەحۆری نەڕاندی: خڕە, دوات بڕیٚ خڕە, کەڵەبابی ئاوا سەر دەبڕن؟ یاڵڵا برۆ بیگرە با بەستەزمانە زۆر زەجر نەبینیٚ. بیگرە ئەو چەقۆیەی پێت سەر بڕیوە لەسەری دانیٚ. ئەودەم ئیدی نابزویٚ.

مەحموودە خڕە غاری داو کەڵەبابەکەی گرتەوە. لەسەر عەرزی رایکێشاو چەقووەکەی لەسەر داناو کەڵەباب ئیدی نەبزووت.

دایەحۆری قۆڵی هەڵکرد, هەتا رۆژئاوایە تاس کەبابێکی بۆ مەحموودە خڕە ساز کرد کە بۆنی لە سەرانسەری ئاوەدانی گەڕا. بەرامبەری یەك دانیشتن و تێرو پڕ گۆشت کەڵەبابیان خوارد. پاش ئەو خواردنە خۆشە دایەحۆری چاشی دێم کرد.

دایەحۆری کە دەنگی پێی ئەسپەکەی هاتبووە بەر گویٚ, دەرپەڕی. لە دەریٚ راوەستاو لە بولێڵی بانگی شێوان دا تەماشای ئەسپەکەی کرد کە وەك باڵندەیەکی نەرم و سووك باڵ دەڕۆیشت. چووەوە ماڵیٚ و گوتی:

"مەحموود دەزانی چیە, حەمەدۆك نەمردوە, هێشتا ماوە. بەڵام دیارە تووشی ژانەسەرێك بووە, ئەگینا ئەم ئەسپە ئاوا لەو نێوە نێوە نەدەخولایەوە. ئەگەر بریندایش بوویٚ دیسان ئاوا ئاسوورێتەوە".

"راست دەکەی دایە".

"ئەمن نازانم ئێستا ئەو لە کویٚیە, ئەم ئەسپە پەیامی بۆ هێناوین. بریا هێندەم جنێو پیٚ نەدابان و تووکم لـیٚ‌نەکردبا... حەمەدۆك داوای منی کردوە, لەگەڵم دێی؟".

"دێم دایە, بەڵیٚ دێم. ئەریٚ, لەبەر خاتری تۆ بۆ جەهەننەمیش بڵێی دێم. ئەو جیٚیەی دەبیٚ بچینیٚ بۆ لای حەمەدۆك, دوورە یان نیزیکە؟".

دایەحۆری گوتی: زۆر دوورە.

"باشە ئەو هەموو ڕێیەی چۆن دەبڕی؟".

دایەحۆری بە خۆڕانانەوە گوتی: ئەمن دەیبڕم, هەر ئەتۆ ماندوو نەبی".

"دایە, ئێمە گوێدرێژێکمان هەیە ئەویش لەگەڵ خۆمان دەبەین, کورتانی نوێمان بۆ دروست کردوە, دۆشەکەڵەیەکی داوێینە سەر, ئەگەر ماندوو بووین سواری دەبین. کەرەکەم وەك ئەسپ دەڕوا. ئەسپی حەمەدۆکیش ناتوانێ وەك وی بڕوا".

دایەحۆری بە پێکەنینەوە گوتی: ئاوا... و لێی زیاد کرد: دیارە ناتوانێ. سبەینێ شەوێ, نیوەشەوێ وەڕێ دەکەوین, نابێ کەس بزانێ دەچینە کوێ و بۆ کام لا دەڕۆین. بە ژنەکەت بڵێ دەچینە شاری, ئێ؟

مەحموودەخڕە گوتی: ئێ.

ڕاست نیوەشەوێ, مەحموودە خڕە لەبەر دەرکی ماڵی دایەحۆری بوو, دایەحۆری کە شەوێ هیچ نەنووستبوو و چاوەڕێی وی بوو, بە بوخچەیەکی گەورەو سەبەتەیەکەوە هاتە دەرێ:

"هەنجیرم بۆ حەمەدۆکی وشك کردوون, هەناری دەلیجەقۆیاخیشم بۆ هەڵگرتبوون. حەمەدۆك لە منداڵییەوە تا ئێستا هەناری دەلیجەقۆیاخی پێ خۆشن. ئەم هەنارانە ڕەنگیان پەمەیییە, بە دەم ئینسانەوە پێدەکەنن, هەریەکەی بەقەد سەری بنیادەم دەبن... ئەم بوخچەیەش دەستێك ژێرکراس, دەرپێیەك, کراسێك و چەند جووت گۆرێی لاسك درێژی تێدان, ئەمشەو دانیشتم گۆرەوییە گوڵشینەکەم تەواو کرد, ئەگەر هاتینەوە بۆ تۆش دەچنم کوڕم, وێنەی ئاسکیشت بۆ تێداوێم".

"بە قوربانت بم دایە, باشە. سوار بە".

"جارێ ڕاوەستە, ڕاوەستە مەحموود, ڕاوەستە با لە دێی وەدەر کەوین".

دایەحۆری لە پێشەوەو مەحموودە خڕە کە گوێدرێژەکەی بە دوای خۆی دا ڕادەکێشا, بە دوایەوە ئارام و بێدەنگ لە ئاوەدانی وەدەرکەوتن و روویان کردە عەلیکۆ.

مانگ لە عەلیکۆی دەدا, چیا لە مانگەشەوێکی مژاوی دا نوقم ببوو. مژێکی وەك هەوری تەنك و شین کە ئاسمانی تێڕا دیار بوو, کەوتبووە سەر خاردەشت. دەشت لە ژێر تیشکی مانگەشەودا تاوێك ون دەبوو, و پاشان لە حاڵێك دا کە بە مانگەشەو ڕەنگێکی مەیلەو بنەوشی بە خۆیەوە گرتبوو سەرلەنوێ دەردەکەوتەوە. دایەحۆری دەستی چووبوون, دەستی لەبن هەنگڵی نان و کووڕ بووەوە.

"دایە سوار بە".

"سوار دەبم. سەرمامە. دنیا ساردە. جارێ با هەتا خۆر هەڵدێ نەختێك بە پێیان بڕۆم".

ڕاست ئەو لەحزەیە کە گەیشتنە بن چیای عەلیکۆ, هەتاو ئەنگووت. دایە حۆری لەبن چیا ڕاوەستاو ماوەیەکی درێژ تێیەوە ڕاما. لە لووتکەی ڕا هەتا بنارە رووتەنەکە گوڵ پشکووتبوون, جۆرە گوڵێکی لاسك درێژی شینی پڕ ڕەنگ چیایەکەی نەخشاندبوو, چیا ڕەنگی ئاسمانی شینی گرتبوو. شاخەکانی عەلیکۆ سوورو شین لە نێو دەریایەکی ئەم ڕەنگە ئاسمانی‌یەدا نوقم دەبوون.

دایەحۆری لە ئاخری ڕێچکە بزنێك کە بەرەو چیا دەچوو, گوڵێکی گەورەی لاسك درێژی نارنجیی گەشی دی کە شاخی قەڵاشتبوو و لە نێوەڕاستی شاخی دا ڕوابوو. بە مەحموودی گوت:

"خڕە گیان, بڕوانە, بڕوانە کاری ئەم خوایە, بڕوانە ئەو گوڵە جوانە, بزانە چەند جوان دەبریقێتەوە؟ لە تیشك دا نوقم بووە...".

مەحمموودە خڕە گوتی: بەڵێ, زۆر دەبریقێتەوە.

"زۆر بە سپایی هەڵی کەنەو بیهێنە, بۆ حەمەدۆکی بەرین. هەرچەند تا دەگەینە لای سیس دەبێ, بەڵام گرنگ نیە, لەوانەیە حەمەدۆکم وەڕەزیی گوڵی عەلیکۆی کردبێ".

مەحموود بەغاردان چوو, گوڵەکەی لە قەڵشتی شاخەکە هەڵقەندو هێنای:

"بوخچەکە لە پشتی وەلاغەکە بکەوەو دەنێوی هاوێ. بۆنی هەیە؟".

مەحمموودە خڕە گوڵەکەی لە لووتی نیزیك کردەوەو ماوەیەکی زۆر بۆنی پێوە کردو گوتی:

"بۆنی زۆر خۆشە, هەر دەڵێی نێرگزی چوکووراوایە".

گوڵەکەی هێناو وەدەست دایەحۆریی دا. حۆری بێ‌ئەوەی گوڵەکە بژاکێنێ ماوەیەکی زۆر بۆنی پێوە کردو گوتی:

"بۆنی چاکی هەیە, چ بۆنێك! ئەگەر هەڵیش وەرێ, دیسان جلەکانی حەمەدم بۆنخۆش دەبن".

مەحموود بوخچەکەی لەسەر گابەردێك داناو کردیەوە.

دایەحۆری گوڵە نارنجی‌یە بۆنخۆشەکەی بەسپایی لەنێو توێی کراسێکی سووری خەت خەت کە بە دەستی خۆی لە چیتی ماراش درووبووی, هاویشت و بە پارێزەوە قەدی کرد. پاشان بوخچەکەشی وەك هەوەڵێ زۆر بە وردی گرێ دایەوەو بە کورتانی وڵاغەکەوە هەڵی واسی.

"دایە سوار بە ئیدی, هەتاویش هەڵات, کەرەکەم توندە, قبرسی‌یە".

تاریفی کەرەکەی دەکردو خەسڵەتە باشەکانی هەڵدەدان. دایە حۆریش بە فیداکاریەوە گوێی بۆ رادەگرت. لە دڵی خۆی دا دەیگوت: بەستەزمانە دارو نداری ئەم کەرەیە, با تاریفی بکا. مەحموودە خڕە تا ئەو کاتەی گەیشتنە کن بەردێکی تەختی وەك سەکۆ تاریفی کەرەکەی کرد, ئەمجار لە پەنا بەردەکە راوەستاو چاوەڕوانی حۆری بوو کە لە دوایەوە دەهات. حۆری بە بێدەنگی چووە سەر بەردەکەو لەوێ را خۆی هاویشتە سەر وڵاغەکە, لە حاڵێك دا دەیگوت: ماندوو بووم, هەوساری کەرەکەی وەرگرت: هەچە...

وڵاغەکە لەوە کە مەحموود دەیگوت باشتر بوو, وەك ئەسپ دەڕۆیشت, مەحموود بە زەحمەت لە دواوە دەیگەیشتێ.

لای نیوەڕۆیە بوو کە گەیشتنە یەکەمین دارەکانی لێڕەوار. لەو بەشەی لێڕەواردا دارەکان تەنك و کورتەبالا بوون. لەسەر کانییەك راوەستان, دایەحۆری لەسەر وڵاغەکەوە خۆی فڕێ دا. مەحموود کە شارەزای ئەخلاقی دایەحۆری بوو, نە وەختی سوار بوون و نە وەختی دابەزین لە وڵاغەکە, یارمەتیی نەدا.

کانییەك لەبن شاخێکی سپی هەڵدەقوڵی. لەبن ئەو ئاوەدا کە هەتاو لێی دەدا ماسیی وردو چووکەڵەی بریقەدار بەم لاو لادا رادەخزین. ئاوی کانییەکە لە لووساوکی بڵندی ژێر کانییەکە کە لە سنۆبەر دروست کرابوو, هەڵدەڕژاو بەنێو سنۆبەرەکان دا بەرەو گەڵییەکەی خوارێ دەڕۆیشت, بۆنی توندی پنگە بنەوشییە پڕڕەنگەکان کە لەبەر هەتاو توندترو خەست تر دەبوو, دنیای پڕ کردبوو.

دایەحۆری هەمبانەیەك کە لە پشتێی بەستبوو, کردیەوە, لەسەر کانییەکە دانیشتن. کەمبەیەکی برژیو و بلۆق کردووی لە هەمبانەکە دەرهێنا. رووی کەمبەکە کە بە پەلکە پیواز داپۆشرابوو, جێ جێ سووتابوو. مەحموود زاری پڕ بوو لە ئاو و ئاوی زاریی قووت دایەوە. پاشان پڕ بە سییەکانی بۆنی نانەکەی کە تازە سارد دەبووەوە, هەڵمژی و گوتی:

"دایە چەند شتی چاکە, کەمبەکە بۆنی چەند خۆشە!".

کوتێکی لە کەمبەکە کردەوەو قەپاڵەی لێدا, چاوی لە دایە حۆری کرد, ئەو نەیدەخوارد. مەحموود بێخەم لە هەموو دنیا بەو نانەوە کە بە دەستیەوە بوو چەسپابوو و هەتا بە چاکی تێری نەخوارد دەرفەتی ئەوەی نەبوو جارێکی دیکە تەماشای دایەحۆری بکاتەوە. ئەو هێشتا پارووییەکی نەخواردبوو. لێی پرسی:

"دایە, ئەدی بۆ ناخۆی؟".

دایەحۆری چاوەکانی پڕ لە فرمێسك بوون:

"بەرم باشترە, باشتر وایە دایەحۆریت بمرێ و بچێتە بن ئەم گڵە رەشە, چما دەکرێ نانم لە گەروو بچێتە خوار, رۆڵە گیان ئەتۆ نازانی, مەحموود گیان, کەرەکەت جوانەو بۆخۆت قارەمان,

حەمەدۆك کەمبە پیوازی بن ژیلەمۆی زۆر پێ خۆش بوو، ئەمنیش هەر بۆیە لە منداڵی‌یەوە تا ئێستا کەمبەم بۆ دروست دەکرد".

"ناڕەحەت مەبە دایە، دووبارە بۆی دروست دەکەی".

"ناڕەحەت نیم، ئەرێ، دووبارە بۆی دروست دەکەم...".

داهاتەوە سەر کانی‌یەکە، سەری بردە پێش و پاش ئەوەی بە ئیشتیاوە تێری ئاوی کانی خواردەوە، گوتی:

"هەستە با بڕۆین، بەڵکوو خوا کۆمەگی کردین و توانیمان رووی حەمەدۆك ببینینەوە".

دیسان لە حاڵێك دا مەحموود لە پێشەوە ولاغەکەی رادەکێشاو دایە حۆرییش بە دوایان دا دەهات، وەڕێ کەوتنەوە. مەحموود چاوی بە کۆلکە دارێکی ئەستوور کەوت کە لە لێوی ڕێ‌یە بوو، کەرەکەی بردە وێ و لە پەنا مووره دارەکە راوەستا. دایەحۆری چووە سەر کۆلکەکەو خۆی فڕێ دایە سەر پشتی ولاغەکە. کورتانی کەرەکە نوێ بوو. مەحموود دۆشەکەڵەیەکی نەرمی لۆکەی نوێی هاویشتبووە سەر کورتانەکە، بۆیە جێی دایەحۆری رەحەت بوو، لێکدا لێکدا ناوری دەدایەوەو بە مەحموودی دەگوت: هەر بگەینەوە ئاوەدانی جووتە گۆرێ‌یەکت بۆ دەچنم، وەك گۆرەوی‌یەکەی حەمەدۆك.

لە لێڕەواری تووشی یازدە ژنی عێلاتی بوون. هەر کام لەو یازدە ژنە منداڵێکی بە دەسرازەیەکی پان و سووری گوڵدۆزی‌کراو لە پشتی خۆی بەستبوو. حۆری گوتی:

"خانمەکان، دەقیقەیەك راوەستن".

ژنە عێلاتی‌یەکان راوەستان. فەریکە گوێزی توێکڵ سەوزیان لە کۆشێ دا بوون:

"خوا بەرەکەت بدا خانمەکان!".

"خۆش بی دایە".

"شتێکتان لێ دەپرسم، باش بیر بکەنەوە، دوایە وەڵامم بدەنەوە. ئێوەش دوێنێ یان پێرێ، حەوتوویەك پێشتر، دە رۆژ لەمەوبەر، لەم دەوروبەرانە ئەسپێکتان نەدیوە؟ ئەسپێکی خەنەیی، نە زینی پێوە، نە لەغاو، نە رکێف و نە جل، رووت و قووت...".

ژنەکان یەك قسەیان نەکردو پاش ئەوەی ماوەیەك تەماشای وی و مەحموودە خرەیان کرد، بە غاردان چوونە نێو دارستان و رۆیشتن. حۆری لە پشتەوەڕا تەماشای کردن، ئەمجار پاژنە پێی لە کەلەکەی ولاغەکە دان هەچە... دەنگی پڕ بوو لە شادمانی:

"دەبینی چ حاڵ و وەزعێکمان هەیە؟ ئەم ماستە بێ موو نیە. حەمەدۆکم ماوە... ئەگینا بۆچی هەر کە باسی ئەسپەکەم کرد بۆی دەرچوون؟".

پاش ئەو رووداوە لە لێڕەوار تووشی هەرکەس بوون, سۆراغی ئەسپەکەیان لە هەرکەس پرسی, هەروەك ئەو یازدە ژنە عێلاتییە جوولاّیەوە, لە پێش دا لە سەرتا پێیان تێیانەوە ڕادەمان و ئەمجار هەڵدەهاتن بۆ نێو لێڕەوارو لەبەر چاو ون دەبوون.

دایە حۆری ئیدی بەرە بەرە قەڵس دەبوو:

"یانی چی, یانی چی, ئەم عێلاتییانە حاڵی نابن, مێشکیان شلەقاوە؟ ئێستا چەند باش بوو کە دایە حۆری سۆراغی ئەسپەکەی لێدەپرسین, ئەگەر لە حەمەدۆکی پرسیبایە ئەوانە چییان دەکرد؟

بۆ کوێ هەڵدێن, بۆ کوێ؟ خۆ ئەمن حیسان خۆرەنیم...".

ئەگەر جاران بایەو دڵ بەخەم نەبایە, حۆری دەستی بە زگیەوە دەگرت و قاقا پێدەکەنی, ئەویش چ پێکەنینێك, پێکەنینێکی شێتانە...

شەویان لەسەر کانی لەبن دارە سیدرێکی ئەستووردا رۆژ کردەوە. نیوە شەوێ مەحموودە خڕە چووبووە نێو لێڕەوارو چەند باڵندەی گەورەو چەورروچۆڵی لەگەڵ خۆی هێنابوونەوە. لەسەر چیمەنی خوار کانییەکە ئاوریان کردەوە, باڵندەکانیان پاك کردو شوتیانەوە، خوێیان پێکردن و لەسەر پۆلان برژاندیانن. حۆری لە ژیانی دا گۆشتی وا چەورو تام و بۆنخۆشی نەخواردبوو:

"ڕەبی دوات نەبڕێ خڕە, ئەم باڵندانەت چۆن گرت؟".

"ئێمە دەیان گرین دایە".

"خڕە پێم بڵێ بزانم, ئەم جۆرە باڵندانە لە خاردەشتیش پەیدا دەبن؟".

"ئەدی دایە".

" هەر بچینەوە ماڵێ چەند دانەیەکم لەوانە لێت دەوێ, پێنج دانە".

" ئەی بابە. حەزدەکەی رۆژێ دەیانت بۆ دەگرم".

" ئەگەر حەمەدۆکیش هاتەوە ماڵێ...".

" ئەودەم داوای پەنجا دانە بکە, بەسەرچاو".

پاش ئەوەی قامکەکانیان لستنەوە پاڵیان وەدارێك داو سەرخەوێکیان شکاند. هەوساری ولاغەکەیان کەمێك ئەولاتر لە پنچکێك خستبوو, ئەویش لەنێو زەمەندێك دا دەلەوەڕا.

وەختێك دایە حۆری وەخەبەر هات هێشتا مانگ ئاوا نەببوو, بانگی کرد:

"خڕە هەستە وەڕێ کەوە, دەرمانی رێیە رۆیشتنە".

خڕە لە خەو راپەڕی و لە حاڵێك دا دووپاتی دەکردەوە دەرمانی رێیە رۆیشتنە, چوو بۆلای وڵاغەکە. هەوساری لە پنچکەکە کردەوەو گوتی سواربە دایە.

حۆری پێکەنی:

" یاڵڵا لاقم هەڵێنە سوارم. بەو نیوەشەوە مووورەدار لە کوێ بوو؟".

کە هەتاو کەوت لە لێڕەواری دەرکەوتبوون. هەتاو لە چڵە گوێنێیەکانی دەدا، پەردەیەك تیشکی سووراوی بەسەر بنارەکان هەڵکشیبوو کە شۆقی دەدایە دەوروبەر. لەسەر لێڕەواریش پەڵە مژی سەوزو زەرد هەڵدەستان.

" بڕوانە خڕە, لە پشت ئەو کێوەی رووبەڕوومان دەڵێی دووکەڵ هەڵدەستێ, ئەمن چاوم باش نابینن, تەماشاکە بزانە دووکەڵی ئاگردانە یان هەورە".

خڕە دەستی بۆ چاوی کردە سێبەرو گوتی: دووکەڵی ئاگردانە دایە, چونکە راست دەچێتە حەوا.

" زۆر باشە".

رکێفی لە وەڵاغەکەدا, بە دۆڵێکی چووکەڵەی سەوزدا چوونە خوار, باریکە ئاوێك لە حاڵێك دا تلی بە وردە بەردەکانی بنی دەدا بە نێوەڕاستی دۆڵێدا دەرۆیشت, لەبن تاقە دارێك تارمایی ژمارەیەکی زۆر ژنیان لێك کردەوە. لە دوورەوە دیار نەبوو لەسەر زەوی دانیشتوون یان هەڵترووشکاون.

با بچینە وێ...

مەحموودە خڕە لە حاڵێك دا وەپێش وەڵاغەکە کەوتبوو, دووپاتی کردەوە: با بچین.

وەختێك نیزیك کەوتنەوە ژنەکان لێکرا هەستان.

"سەلام علیکم خانمەکان!".

ژنێکی هاوتەمەنی دایە حۆری وەڵامی دایەوە:

"علیك السلام".

"ماندوو نەبن, خەریکن جلکان دەشۆن؟".

پیرێژن وەڵامی دایەوە:

"بەڵێ".

هەر لە دوورەوەش دەکرا بزانی ژنەعێلاتین.

کۆچکەیەکی زێوکاریکراویان لەسەر بوو کە عێلات پێی دەڵێن تاج. داب وایە لزگە زەنگیانە بەو کۆچکانەوە هەڵداوەسن. دەوڵەمەندەکانیش بە زێڕو مرواری دەیرازێننە.

بەرەڵبێنەکانیشیان لەگەڵ بەرەڵبێنەی ژنە دێهاتی‌یەکان فەرقی هەبوو، ڕەنگاوڕەنگ بوو و گوڵدۆزی کرابوو.

"ئێ کام هۆیەن؟".

ژنە عێلاتی‌یەکە گوتی:

"ساری کەچیلی".

"ئەمن ناوم حۆرییە، ئەمەش مەحموودە خرە. ئەمن گەورەم کردوە، بە کوڕی من دەناسرێ".

ژنەکان پێ‌کەنین.

"هەردووکمان خەڵکی گوندی ئاساب چەشمەین، لەو خوارانە. دەمەوێ شتێکتان لێ‌بپرسم، بەڵام نابێ هەڵێن. لە هەرکەس دەپرسم هەڵدێ‌و ون دەبێ...".

ژنەکان دیسان پێ‌کەنین.

پیرێژنێکی قەڵەوە کە ماوەیەك لەمەوبەر لەگەڵ حۆری سڵاویان لێك کردبوو گوتی:

"لەوانەیە ئێمەش هەڵێین، باشە، حەزدەکەی هیچ مەپرسە".

"ناکرێ نەپرسم".

"ئێستا کەوایە بپرسە خوشکێ، بەڵکوو هەڵنەهاتین".

"ئێوە دوێنێ یان ئەمڕۆ، یان لە دە ڕۆژ پێش بەم لاوە لەم دەورو بەرانە ئەسپێکی خەنمیتان نەدیوە؟ ئەسپێکی زۆر جوانە، کەمێك شێتە، هیچ کەس ناتوانێ بیگرێ، کەسیش ناتوانێ بە تفەنگ بیئەنگێوێ. جگە لە یەك کەسیش کەس ناتوانێ سواری بێ. بۆخۆی لە هێندێك جێیان دەسووڕێتەوە".

پیرێژن گوتی:

"خوشکێ ئەمن یەکە بارێ خۆم هەڵ دێم. بم بوورە. نە ئەتۆ هیچت لە ئێمە پرسیوەو نە ئێمە هیچمان پێ‌گوتووی. خواحافیز".

هەر بە ڕاستیش بۆلای دارستان وەڕێ‌کەوت و سەربەرەژێر ڕۆیشت.

حۆری لە وەڵاغەکە دابەزی و لەسەر بەردێکی بڵند دانیشت و دەستی بە قسان کرد. ژنەکان لەوێ لەسەر ئاوەکە وەك پەیکەرێکی بەردین بێدەنگ ببوون، هەتا ئەو زیاتری قسەدەکرد، گوێگرەکانی زیاتر سەریان بەردەدایەوەو بێدەنگ تر دەبوون.

حۆرییش وەك لافاوێك کە لافاوبەندی شکاندبێ، ئاوای قسە بۆ دەهاتن. سەرەنجام ماندووبوو، نەی‌توانی چیدی خۆی ڕاگرێ:

"ئۆهۆۆۆ. دایە گیان، ئێوە ئیدی کێن، ئەمن تەنیا سۆراغی ئەسپێکم لە ئێوە پرسی. حەزناکەن جواب بدەنەوە، بەدەرەك. یەك قسە بڵێن نەمان دیوە. چما چ دەبێ؟".

هەستایە پێ، بە لەخۆبایی‌بوونەوەو بە چاوێکی پڕ لە سووکایەتی تەماشای ژنەکانی کرد. مەحموود ولاغەکەی بۆ هێنابوو، بە رق هەستاوی سواربوو و گوتی:

"مەحموود ئەم ماستە بێ‌موو نیە".

"بەڵێ دایە".

بە دۆڵەکەدا سەرکەوتن. لە دووری بەردەلانێك دیاربوو دەت گوت لەبەرد ئەستێی نووك تیژو بریسکەدار دروست بووە. لەخوار بەردەلانەکە لە جێگایەك دووکەڵێکی ئەستوور بەرەو ئاسمان بڵند ببوو. وەختێك لە درووەلانێك کە چڵەکانی سەوزو زەرد بوون تێپەڕین، لە قوولکەکەی خوارێدا مێگەلە مەڕێکی چووکەڵەیان دێ. کچۆڵەیەکی کەم تەمەن مێگەلەکەی دەلەوەڕاند، تەمەنی دەدوازدە ساڵێك دەبوو.

دایە حۆری هەر کە کچۆڵەکەی دی گوتی:

"مەحموود بڕوانە هۆوێ. ئەو کچۆڵەی دەڵێم. با بچینە لای".

چوونە لای کچۆڵەکە. سەگی بەرمێگەلەکە بە قینەوە پێشوازیی لێ‌کردن. کچۆڵەکە دەسبەجێ پێشی سەگەکەی گرت. حۆری لەحاڵێك دا دەی‌گوت: کچە چووکەڵەکەی خۆم... لە ولاغەکە دابەزی:

"کیژی مووزەردی چاوشینم. بزانم ئەم کچە جوانە چل کەزی‌یەکە دەڵێی سێوەسوورەیە، ئی عێلی ساری کەچیلی‌یە، وەنا؟".

کچۆڵە شەرمێونەکە کە گۆناگوڵ هەنارەکانی سوورتر ببوون گوتی:

"ئێمە ساری کەچیلیین".

"بە قوربانی ئەو زمانە شیرنەت بم کیژم، کچە جوانکیلەکەم چەند جوان قسە دەکا. جوانکیلەی چاوبادامی ئەتۆ کچی کێی؟".

"کچی ئەسلان ئۆغلانی".

"دەی ناسم".

"ئەتۆ بابمت دیوە؟".

"دەکرێ نەم دیبێ. دێتە ماڵی خۆمان، پێم دەڵێ دایە. پیاوێکی قەڵەوەیە، چاوەکانیشی شینی پڕڕەنگن".

"پوریێ گیان, گاڵتەی دەکەی, بابم چووکەڵەیە, قەڵەو نیە. لە حاڵێك دا ئاماژەی بۆ مەحموود دەکرد, گوتی: بە قەد وییە".

حۆری دەسبەجێ سەرو کلکی پێك گرت:

"ئەدی کچم ئەدی, گاڵتەم لەگەڵ کردی".

کچەکە شەرمی دەکرد. لە ئارەق دا شەڵاڵ ببوو.

"نازانی چم بۆ کچی ئەسلاّن ئۆغلی هێناوە. ئەرێ بەراست ناوت چ بوو؟".

"فاتم".

"ئەدی هەنارم بۆ فاتمە جوانی خۆم هێناون, شیرن وەك هەنگوین... هەنجیریشم بۆ هێناون, بۆخۆم وشکم کردوون... مەحموود".

مەحموود هەنارێکی گەورەو مستێك هەنجیری لە خورجێنی وڵاغەکە دەرهێنابوون و هێنانی.

"وەرگرە کچم, وەرگرە".

کچەکە شەرمی دەکردو چۆڕچۆڕ ئارەقی دەڕشت. بەڵام لە نەکاو لە قاقای پێکەنینی داو بەدەم پێکەنینەوە گوتی:

"پووریێ ئەمنیش تۆ دەناسم".

دایە حۆری لە حاڵێك دا دەستی بە قژەکانیدا دێنا, گوتی:

"پووریێ بە قوربانی ئەو قژە زێڕینەت، بخۆ, هەنجیران بخۆ بزانم".

کچۆڵە چاوێکی لەو و چاوێکی لە مەحموود کرد, پاشان پشتی تێکردن و هەنجیرێکی لە زاری هاویشت. وەختێك ئاوڕیدایەوە چاوەکانی دەدرەوشان. کەمێك ئەولاتر چوون و لە داوێنێ دەشتێ لە پەنا یەکتر دانیشتن. کچۆڵەکە لە حاڵێك دا خێرا خێرا هەنجیری دەخواردن, بە چاوێکی پڕ لە خۆشەویستییەوە کە هەروا بریسکەیان دەهات تەماشای دایە حۆریی دەکرد. خێراو بە پەلەپەل دەیخوارد. پاش ئەوەی هەنجیرەکەی تەواوکردن گوتی:

"پووریێ دەکرێ هەنارەکەی بەرمەوە ماڵێ بیدەم بە موسلیم؟ با بیدەم بە موسلیم بیخوا, نەخۆشە".

"مەحموود هەنارێکی دیکە بێنە".

مەحموود هەنارێکی دیکەی هێناو دای بە کچەکە, کچۆڵە لە خۆشییان باڵی گرتبوون.

"دەکرێ ئەوەی لە ماڵێ لەت کەین, بیخۆین؟ باب و دایکیشم دەخۆن".

دایە حۆری لە حاڵێك دا دەستی بە قژەکانیدا دێنا, گوتی:

"باشە, باشە کچە جوانەکەم، باشە فاتم گیان".

کیژۆڵەکە بە سوپاسەوە تەماشای ویکرد, هەمبانەکەی لە پشتێ کردەوەو پاش ئەوەی بە لەباری دوو هەنارەکەی تێهاویشتن, دووبارە لە پشتێی بەستەوە.

"موسلیم نەخۆشە".

"موسلیم چیی تۆیە؟".

"ئاغامە, نەخۆشیان کرد. پووری, ئەتۆ لێرە لە چی دەگەڕێی؟".

دایە حۆری وەڵامی دایەوە:

"لە ئەسپێك دەگەڕێم, ئەسپێکی خەنەیی, ئەسپێکی ڕەش... لە ئەسپێکی جوان دەگەڕێم. ئەتۆ لەم دەوروبەرانە ئەسپێکی وات نەدیوە؟".

فاتم بە شاکەشاکەوە گوتی: دیومە, و دیسان سوور هەڵگەڕایەوە.

"دەکرێ نەم دیبێ, ئەم ئەسپە هەموو ڕۆژێ دەڕواو دێتەوەسەر دوندی هۆو تاتەبەردە لەوێ ڕادەوەستێو جووڵەی ناکا. بە...لێ. کلکی ڕادەوەشێنێ. وەختێك هەڵۆ دێن و زۆر لەسەر سەری چەرخان دەدەن ئەویش تێکەڵ بە تیشك دەبێ و دەڕوا".

لەپڕ کچەکە وەشك کەوت, چاوی لە چاوی دایە حۆرییەوە بڕی و تاوێکی چاك تەماشای کرد:

"ئەتۆ بۆچی لەو ئەسپە دەگەڕێی؟".

"ئەسپەکە ئی کوڕی منە, کوڕەکەم".

فاتم بە پێکەنینەوە پرسی:

"پووری ئەتۆ درۆ دەکەی, وەنا؟".

هێشتا چاوی لە چاوی حۆرییەوە بڕیبوو بە بەدگومانی تەماشای دەکرد:

"ئەو ئەسپە ساحەبی نیە, ئەو ئەسپە جادوویە, دەڵێن ئەسپە خەنەیی کوێرئۆغڵییە. بام دەڵێ ئەسپی کوێرئۆغڵی هەرگیز نامرێ, چونکە زۆر بە تەمەنە ڕەنگی ڕەش بووە. بام دەڵێ ئەسپی کوێر ئۆغڵی قەت قەت نامرێ, ئەمرێ... بام دەڵێ ئەو هەردەمەی دەچێتە پێستێکەوە".

دایە حۆری گوتی:

"ئەو ئەسپە یەکێك سواری دەبێ".

فاتم بە شڵەژاوی گوتی:

"نا, نا چما شتی وا دەکرێ؟ ئەو ئەسپە چەندین ساڵە دێ و لەوێ لەسەر دوندی ئەو شاخە ڕادەوەستێ. ئەو ئەسپە لە زۆر ساڵ لەمەوبەرەوە کە ئەمن لە دایك نەبووم, بابیشم لە دایك

نەببوو, خۆ باپیرم دەناسی. ریشێکی سپیی هەیە ئەوەندە ـ دەستی لێك کردنەوە ـ بڕوانە ئەوەندە. تەنانەت ئەویش نەهاتبووە سەر دنیا کە ئەو ئەسپە هاتوەتە ئێرەو هەر لەوجێیە راوەستاوە. هەلۆ دێن ئەو رادەکا. ئەرێ..."

هێشتا بە بەدگومانیەوە دەیروانیە حۆری. سەرەنجام بە پێکەنینەوە گوتی:

"درۆزن. ئەتۆ لەو ئەسپە ناگەڕێی. لە موسلیمی ئاغامیان دا. ئەویش ئێستا نەخۆشە. ئەمن لە جیاتیانی هاتوومە بەر مەڕی".

"کێ لێی داوە؟".

"کێ لێیدەدا, سەرجووخەعەلی کەرتیش... دەزانی پووری, کەرتیشێك هەیە لە خەلکی دەدا, نازانی چۆن لێیدەدا..."

"بۆ لێی داوە؟".

فاتم دەستی بە بن چەنەگەیەوە گرت, ملی بەلاوە ناو پاش ئەوەی چەند دەقیقەیەك هەروا بیری کردەوە چوو, لە حۆرییەوە راما. پاشان دووبارە سەری بەردایەوە.

"بۆچی لێیدا؟".

فاتم هەروەك گوێشی لە قسەکانی وی نەبووبێ, دیسان وەلامی نەدایەوە. لە نەکاو سەری هەلبڕی, بڕیاری خۆی دابوو. چاوەکانی لە خۆشییان دەدرەوشان. گوتی:

"پرسیبووی حەمەدۆك لە کوێیە؟ گوتبووی ئەتۆ بە جێی حەمەدۆك دەزانی؟".

حۆری گوتی هم م م م. ئەمجار دەستی بەسەریدا هێناو گوتی:

"دەلێی ناوێکی وام بیستوە".

فاتم گوتی:

"درۆدەکەی, بەلام دیسانیش پێت دەلێم".

"رەبی دایە حۆری لەبەر ئەو قژە زێڕینەت مرێ".

"ئەتۆ ناوت حۆری نیە؟".

"بۆچی, با".

فاتم دیسان دەستی وەبن چەنەگەی داو کەوتە فکرەوە.

"موسلیم گوتبووی چی؟".

موسلیمیش گوتبووی:

"حەمەدۆکم نەدیوە".

دووباره لێیدەدەن، دیسان هیچ نالێ. دیارە درۆی دەکرد. زۆری لێدەدەن، ئێسکی لەشی دەشکێنن. موسلیم دیسان هیچ نالێ. پاشان دەڵێن پێمان نەڵێی سەگەکەت دەکوژین. ئەمجار موسلیم بە درۆ جێیەکیان پێدەڵێ. موسلیم جێی حەمەدۆکیان..."

فاتم زمانی خۆی گەزت و بێدەنگ بوو.

"دوایە چی فاتم گیان؟".

"کابرایەك هەیە قەمچیی بە دەستەوەیە، ئەوەی خەجیجێ حەمەدۆکی کوشتوە... حەمەدۆك ویستوویە بی کوژێتەوە...".

"قەمچی بە دەستەوەیە؟".

"ئەرێ، موسلیم جێی حەمەدۆکیشی پێدەڵێ، کەچی دیسان سەگەکەی موسلیم دەکوژێ. موسلیم شەوو رۆژ دەگری، لەبەر برینەکانی نا، بۆ سەگەکەی دەگری. ئە...دی موسلیم هەڵیان دەخەڵەتێنێ. زۆری لێدەدەن، وەختێك جێی حەمەدۆکیان پێدەڵێ باوەڕی پێدەکەن".

ئەمجار فاتم لەنەکاو رقی هەستاو نەڕاندی:

"ئەمن هیچم ئاگا لێنیە، ئەتۆ چۆن دایە حۆریەکی؟".

دەرپەڕی، دەستی بۆ هەمبانەکەی بردو گوتی:

"ها، حەزدەکەی هەنارەکەت وێدەدەمەوە، ئەو ئەسپە شێتە... حەمەدۆك ئیدی نەماوە، چما نەت بیست لە باقرگدیگی کوشتیان؟".

دایە حۆری هەستاو گوتی:

"نا کچم، نا کچە جوانەکەم"، و دەسبەجێ سواری وڵاغەکەی بوو و دەنگی دا. کە نەختێك دوور کەوتەوە ئاوڕی دایەوەو گوتی:

"خوا حافیز کیژە گوڵ گۆناکەم"، و رکێفی لە وڵاغەکەی دا:

"نەختێك راوەستە، بزانە بۆ ئەم مزگێنیيە چەندت شت بۆ دەکڕم".

داخوا فاتم گوێی لەم رستەیەی دوایی بوو یان نا، هەرچۆنێك بێ پێیەوە دیار نەبوو. فاتم بە خۆی و بە سەگە چووکەڵەکەیەوە لە جێی خۆی راوەستابوو، تەماشای رۆیشتنی وانی دەکرد.

لای ئێوارێ گەیشتنە نیزیك بەردەڵان. کە لە تەپۆلکە چووکەڵەکەی رووبەڕوویان بایان دایەوە. چادری عێلاتییەکان دەرکەوتن. لە رێگادا هیچ قسەیەکیان پێکەوە نەکردبوو. فاتم زۆر شتی گوتبوو، بەڵام دیسانیش زۆر خەبەری لەبن زمان دا مابوون.

"خرە بڵێ بزانم دەتوانین حەمەدۆکی وەبینین؟".

مەحموود گوتی:

"بەخوا نازانم دایە، بڕوانە ئەو کچە، چەندی ئێمە راگرت. دەم زانی ئەوانە زۆر زارقایمن، بەڵام نەك بەو ئەندازەیە".

"هەرچی بێ توانیمان سۆراغێکی حەمەدۆك بکەین، ئێستا بچینە کن کێ؟ بچینە کن سەرۆکی عێلی یان یان تاولی ئەسلان ئۆغلی؟".

"باشترە بچینە لای بەتال ئاغا".

"دەڵێن زۆر پیاوی چاکە. گۆیا سەرۆکی ساری کەچیلیە. زۆر لەمێژە دەیناسم".

بە رێگادا چوونە خوارێ.

رەشماڵە مویینەکان لە هەردوو بەری ئەو چۆمە کە بە نێوەڕاستی دۆڵەکەدا دەڕۆیشت بە تەنیشت یەکەوە هەڵدرابوون.

"پێم وایە ئەمەیان تاولی سەرۆکی عێلەکە بێ. بڕوانە مەحموود پێنج چڵەی لەبەر دان. چادری دیوەخانێشی بە پەناوە هەڵدراوە، ئەو جۆرە چادرە هەر لە پەنا چادری سەرۆك عێل هەڵدەدرێ. هەموو هۆبەیەکیش لەو جۆرە چادرانەی نیە، ئێمەش دەچینە وێ".

کە گەیشتنە نیزیك چادرەکە مەحموود لە دوورەوە هاواری کرد:

"بەتال ئاغا، بەتال ئاغا، وریای سەگەکان بن، میوانتان هات...".

پیاوێکی زۆر کەڵەگەت هاتە دەرێ و بانگی کرد:

"فەرموون، فەرموون، سەگەکان بەستراونەوە".

دایەحۆری لە پەنا دەرکەی تاولی پێنج دیرەکی لە کەرەکەی دابەزی. چەند کەسی دیکە بۆ پێشوازیی میوانەکان لە چادرێ هاتنەدەر. یەکێك لە لاوەکان هەوساری ولاغەکەی وەرگرت و لە تەژەیەکی پەنا رەشماڵێی خست. مەحموود چوو بوخچەو هەمبانەو کەل و پەلەکەی دیکەی لە ولاغەکە کردەوەو لەگەڵ خۆی هێنان.

"فەرموون بۆ ژوورێ".

"ئەمن بەتالم".

حۆری گوتی: زۆر باشەو چووە ژووری چادرێ.

نێو تاولەکە زۆر رازاوە بوو. دایە حۆری لە سەیران زاری پێدابچڕابوو. بەڕەو جاجم و لبادو چڵەچادرو رایەخی وای لە هیچ کوێ نەدیبوون. تەنانەت چادری خانی خرووسلی ئۆیماخیش وا رازاوە نەبوو.

حۆری وەختێك وەخۆ هاتەوە کە بەتال ئاغا دۆشەکەڵەیەکی ئاوریشمی پێ نیشان دەدا لەسەری دانیشێ. بێ ئەوەی کەوشەکانی داکەنێ چوو چوار مێزیلکە لەسەر دۆشەکەکە دانیشت.

حۆری لە حاڵێك دا پێدەکەنی گوتی:

"ئۆژۆژۆی, کەوایە ئێستاش چادری وا ماون. بە منیان گوتبوو کە ئیدی کۆچەریەتی لەنێو چووە, هەموویان کەوتوونە هەژاری و نەدارییەوە, بەتال ئاغا, وەختێك چادرێکی وام دی خۆشحاڵ بووم".

"خۆش بی خوشکێ".

"ناوم حۆرییە, قەت ناوی منت بەر گوێ کەوتوە بەتال ئاغا؟".

پیاوەکە بە نارەحەتی و بە شەرمەوە, دەستەکانیی رێك گوشین و ریشە درێژو تەنکەکەی لەرزی, ئاخرەکەی گوتی:

"نەم بیستوە خوشکێ".

"بەمن دەڵێن دایەحۆری, خەلکی ئاسیاب چەشمەم, ئەمن دایکە حۆریی حەمەدۆکم".

وا دەهاتە بەرچاو کە بەتال ئاغا دەبێ تەمەنی زۆر بێ. زۆریش تەڕپۆش بوو. پانتۆڵێکی خوریی قاوەیی گەش, گۆرەوییەکی لاسك درێژ کە هەتا ئەژنۆی دەهاتن, کەوشێکی سوورو کراسێکی خەت خەت لە باشترین قوماشی ماراش... شاڵێکی تەرابولسیشی لە پشتێ بەستبوو. ئەنگوستیلەیەکی زێڕی نەخشێندراوی نەقیم سەوزیشی لە قامکێدا بوو...

کچێك لە کەشەفێکی زێودا قاوەیەکی هێنا کە بۆنەکەی چادری پڕ کرد. کەشەفەکەی بۆ دایەحۆری, بۆ مەحموودو بۆ بەتال ئاغا راگرت و پاشان بە ریز قاوەی دا بە هەموو ئەوانەی لە ژووری ئاوڵێ بوون.

دایەحۆری بەدەم قاوەخواردنەوە گوتی:

"بڕوانە بەتال ئاغا, ئەمن عێلی ساری کەچیلی باش دەناسم, زۆرم ناوو ناوبانگی کەچیلی بیستوە...".

بێدەنگ بوو. چاوی بە نێو چادرێ دا گێڕا, لە نێوبەندی چادرێ دا شەهێنێك لەسەر لیسی هەڵنیشتبوو کە بە چاوە تیژەکانی تەماشای دایە حۆریی دەکرد.

"وەجاخت کوێر بێتەوە باڵندە چیی لە گیانی من دەوێ, چ وردە حیسابێکی لەگەڵ من هەیە..." سەرانسەری نێو ماڵەکە بەرەی یەکجار بەقیمەتی لـێ ڕاخرابوون کە هەریەکەی بابی

ئەسپێکی عەرەبی یان وشترێکی دوو کۆپارە دەبوون. دایەحۆری تەون کەر بوو, دەیان گوت لە بەڕە دروست کردن دا کەسی ناگاتێ. نە لە نێو کوردان و نە لە کوردستان و نە لەو عەرەبستانە پان و بەرینە وەستای وەك خۆی نیە. بەلاّم تەنانەت دایە حۆرییش بە دیتنی ئەو بەڕانە زاری پێ داپچڕابوو. چاوەکانی دایەحۆری لە ئەستوندەکە نەخشاوەکانەوە دەچوونە سەر بەڕەکان, لە بەڕەکانەوە دەچوونە سەر شەهێنەکەو لەسەر شەهێنەکەوە دەگوێزرانەوە بۆ سەر بەتال ئاغاو دووبارە بەسەریان دا دەگەڕانەوە.

بەتال ئاغا تێگەیشت کە دایەحۆری بۆچی بێدەنگ بووەو تەماشای شتوومەکی نێو چادرێ دەکا. بە چاوداگرتن ئەوانەی نێو چادرێی حالّی کردن کە بچنە دەرێ چونکە ئەم ژنە مەبەستێکی نهێنی پێیە. دایەحۆرییش زمانی چاوو ئاماژەی دەزانی. لە دلّی خۆی دا گوتی ئەگەر لە دنیادا هیچ زمانێك بۆ قسەکردن نەبایە دیسان ئەم کۆچەرییانە دەیان توانی لەمە باشتر بە چاو پێکەوە بدوێن.

ئەوانەی لەنێو چادرەکە بوون هەستان, خواحافیزییان لە حۆری کردو هاتنە دەرێ. کە ئەوان لە چادرێ وەدەر کەوتن دایەحۆری رووی دەلای بەتال ئاغا کردو چەند دەقیقەیەك تێیەوە راما:

"بەتال ئاغا, ئەم چادرانە حەوت دیرەکین, دوو دیرەکەکەی دیکە چییان لێهاتوە؟". و پێکەنی. بەتال ئاغاش پێکەنی. پیاوێکی باش و بە دیمەن بوو. بە دەنگێکی گەرم لەناخی دلّەوە پێدەکەنی. چاوێکی سەوزی چیمەنیی هەبوون کە بە ئەوینداری تەماشای دنیایان دەکرد. تیشکی ئەوین و خۆشەویستی و گەرمایەك کە لە چاوەکانییەوە بلاّو دەبووەوە, دەوروبەری دادەگرت و هەرکەس چووبایە کنی لە سەرچاوەی خۆشەویستی و پاکی دا دەیشوتەوەو دلّیی لە رق و نێرەیی و بەرچاوتەنگی و زمان پیسی پاك دەکردەوە. دایەحۆری وەختێك تەماشای بەتال ئاغا, قوولاّیی سەر گۆنای, هێلّی قوولّی روخساری, تالّە درێژو سوورەکانی مووی ریشی, ئێسکی زەقی قۆرتۆمەی و روخساری راکشاوی ئەو پیاوەی دەکرد لەبەر خۆیەوە دەیگوت ئێستاش ئەو جۆرە ئینسانانە لە جیهان دا هەن؟ کەسێك روخسارێکی وای دیبایە نەیدەتوانی پیاوکوژی بکا, هیچ بوونەوەرێك ئازار بداو بەرامبەر بە ئازاری هەزاران کەمتەرخەم بێ.

"خوشکە حۆری تاقەتمان بە حەوت دیرەکی ناشکێ, چادری حەوت دیرەکی بۆ گوێزە گوێز چوار وشتری دەوێن. ئیدی نە وشترمان پێ ماوە, نە ئەسپی عەرەبی. خوشکە حۆری, چییان پێ نەهێشتین, رێی دەبازبوونیان لێگرتین. چادرەکەشمان بوو بە پێنج دیرەکی. سالّێکی دیکە دەبێتە سێ دیرەکی و سالّەکەی دواتریش دیرەکێك زیاتری نامێنێ".

خەفەت نیشتە سەر روخساری, ریشی لەرزی و چاوە شینە چیمەنی‌یەکانی لێڵ بوون و ئەمجار بێدەنگ بوو. هەتا ماوەیەك قسەی بۆ نەکرا. دڵی زۆر پرژان بوو. ئەگەر خۆی رانەگرتایە لە کن ئەو ژنە بەساڵداچووە زۆرِ زۆرِ دەگریا.

کە بەتال ئاغا بێدەنگ بوو, حۆری دەستی بە قسە کرد, زۆر بۆ بەتال ئاغا بە پەرۆش بوو. باشی دەزانی لە چوکووراوا ئەو ئاغا تازە پێداکەوتووانە چ بەڵایەکیان بەسەر ئەمانە هێناوە.

"ئەدی براڵە, ئەدی کاك بەتال, دەزانم چ بەڵایەکتان بەسەر هاتوە. جاران وەختێك کۆچەری‌یەکان لە کوێستانێ را دەهاتنەوە, لە خاردەشت هەڵیان دەدا. ئەو وەخت عەبدی‌خانی بێدین ناویشی نەبوو, سەردەمی بابی بوو, بۆخۆت دەزانی ئەو عەبدی‌خانە کافرە چۆن کیسە کیسە پارەی لە کۆچەری‌یەکان دەستاند. ئەوانیش روویان نەکردەوە خاردەشت.

ئەو رۆژگارە کاتێك کۆچەری‌یەکان لە خاردەشت هەڵیان دەدا, خاردەشت دەبوو بە سەیرانگایەك. کچە کۆچەری بە قژی ئاڵتوون بەندو جلکی ئاوریشم و پارچەی رەنگاورەنگەوە وەك پۆلەکەو لەو دەشتەدا دەگەڕان. سەدان کیژو کوڕی جحێڵ کۆ دەبوونەوەو هەڵدەپەڕین و زیاتر لە هەزار کەس ژن و پیاو رادەوەستان و تەماشایان دەکردن. لە خۆشیی خەڵك تەنانەت چیاکانیش دەکەوتنە سەما. زەماوەندی وا ساز دەکرا, وەرە سەیرێ. چەندین رۆژ شایی و هەڵپەڕین بوو, بە ئەسپی تیژرەوی وەك با دارتەقڵەیان دادەکوتا. ئەسپی وایان هەبوون لێرەوە تا عەلی‌کۆ بە پرتاو دەرۆیشتن و بە رۆژێك دەوری عەلی‌کۆیان دەداو دەهاتنەوە. هێندێکیان دەهاتنەوە چەند دانەیەکیشیان پشوویان لەبەر دەبڕاو دەتەقین. لە چیاکانی دەرسیم و ئاناتولیی نێوەڕاست, قازداغی و لە سوولی قەرەخیووکەوە, حاجی بەکتاش و سەدان دەدە بە سازی سەدەفکاری کراوەوە دەهاتن, سازیان لێدەداو داستانیان دەگێڕانەوە.

بەتال ئاغا, ئەو رۆژانەم دیوەو ئەم رۆژانەش دەبینم, چ بکەین. بەتال ئاغا, زەمانە گۆڕاوە, خەڵك رێیان لێ ون بووە ئینسانەتی‌یان لێ ون بووە. لەمەودوا چما رێی رزگار بوونمان هەیە؟ هەرکەس دزی گای خۆیەتی, جاران ئەگەر بەردێك لەنینۆکی تاقە ئینسانێك دەدرا, دەت گوت ئەو بەردە لەدڵی عەشیرەتێك دراوە, لە دڵی هەموو ئینسانەکانی ئەم جیهانە دراوە, دڵی هەمووان وەژان دەکەوت. بەڵام ئەمرۆ, ئەمرۆ هەموو بەسەر تەرمی یەکتردا باز دەدەن, باز دەدەن و تێدەپەڕن, ئەدی تێدەپەڕن".

دایە حۆری بە رقەوە قسەی دەکرد, وەك لافاو دەجۆشاو دەخرۆشا. زۆری قسە کرد, زۆری ناڵاندو زۆر تووڕە بوو و کەفی پرژاند. سەرەنجام هاتە سەر ئەسڵی مەبەست:

"کۆچەرییەکان, ئایدینییەکان, ساری کەچیلییەکان, بە قوربانتان بم. ئێوە رۆژگارێك چادری حەوت تیرەگیتان هەبوو کە نێوەکەی دەت گوت کۆشکی پادشایە, دەت گوت ژووری پادشایە, ئەسپی عەرەبیتان هەبوون لە ئاسك توندتر. هەریەکەی شەهێنێکتان بە دەستەوە بوو کە قورینگ و کەودەریی لە ئاسمان دێنایەخوار... ئەی کۆچەرییەکان, ئێوە لە کۆنەوە میوانگر بوون و بە مانگ و دوو مانگ سفرەتان کۆ نەدەکرایەوە ساری کەچیلییەکان, ئەگەر کەسێك پیاوی لەدەست کوژراباو پەنای بۆ ئێوە هێنابایە, ئەگەر پادشا بە لەشکرێکەوە هاتبا کە عەرزو عاسمانی داگرتبان و ویستبای خوێنێکتان لێ بستێنێ, هەمووتان لەجێ دەکوژران بەلام کەسێکی پەنای بۆ هێنابوون تەسلیمتان نەدەکرد, ئێوە قەوم و رەگەزێکی وا بوون. دیسانیش ئاوی دەریا قەت وشك نابێ. بەتال ئاغا, بلێ بزانم...".

بەتال ئاغا بە چاوە شینە چیمەنییەکانی کە دەبریسکانەوەو بەو ددانە سپی وەك مروارییانەی پێدەکەنی:

"وادیارە کارێکت هەیە خوشکە حۆری, بلێ بزانم چت دەوێ, مەترسە کارەکەت چیە بیلێ, بلێ و بەسەرچاو...".

دایەحۆری لە جێی خۆی تەکانێکی دا, پشتی هەلێنایەوە:

"باشت گوێ لێبێ بەتال ئاغا بەکتاش وەلی... ئەمن دایکە حۆریی حەمەدۆکم... تەماشا ئەوەی کە ـ بە دەست مەحمووده خڕەی نیشان دا کە لە گۆشەیەك کوشم هەلاتبوو ـ تەمەنی سالێك بوو کە دایکی مرد, ئەمن هێنام گەورەم کرد. دایکی حەمەدۆك نەمردبوو, بەلام ئەمن زۆرم زەحمەت پێوە کێشا. هەر بۆیە ئەمن دایکە حۆریی هەق هەقی ویم. بەتال ئاغا, بە قوربانی ئەو چاوە جوانانەو ئەو روخسارە جوانەت بم. خەبەرێکی حەمەدۆکم پێ بلێ".

"ئەمن چۆنت خەبەری وی پێ بلێم خوشکێ, ئەو یاغییەکە لە کێوو بەندەنان دەخولێتەوە".

"دەزانی چیە, فریوم مەدە بەتال ئاغا, ئەمن شوێنەکەیم هەلگرتوەو هەتا ئێرەم هێناوە. ئەلێرە لە ئەسپەکەی دابەزیوە, پێم بلێ, بەتال ئاغا, ئەمن دایکێ ویم, عەمری دایکێی نەمێنێ ئاورم لە جگەرێ بەربووە. خەبەرێکی ویم بدەیە. ئەسپەکە بە مردوویی هێنایە ئێرە یان بە زیندوویی؟".

لە نێوێ چاوی بەتال ئاغاوە راما, دلۆپی گەورە گەورەی ئارەق پەڕینە نێوچاوانی. بە دانیشتنەوە چاوەڕێ ما:

"زیندوویە یان مردوە؟".

گومان و دوودڵی سێبەری خستە سەر روخساری بەتاڵ ئاغا.

"پێم بڵێ بەتاڵ ئاغای چاوگەشم, ئەمن دایکێ ویم, زیندوویە یان مردوو؟".

بەتاڵ ئاغا بە روخسارێکی زۆر دەرفکرو بە گومانەوە گوتی:

"زیندوویە".

"بریندارە؟".

چاوە جوانەکانی بەتاڵ ئاغا خەفەتبار بوون. ئەو شادمانی‌یەی لە روخساری دا بوو, بەدەمەساتێك باری کرد:

"بریندارەو برینەکانیشی زۆر قورسن خوشکێ (ئاهەنگی دەنگی نەرم و وەك تازیەنامە خەم هێنەر بوو)".

دایەحۆری دیسان پشتی راست کردەوە:

"نارەحەت مەبە بەتالەزلە, دایکان هێشتاش حەمەدۆکیان دەبن... هیچ خۆتی بۆ نارەحەت مەکە, پێی دەڵێن حەمەدۆك, دەمرێ و زیندوو دەبێتەوە. وەك حەزرەتی عەلی وایە, وەك حەزرەتی مەهدی وایە, هیچ جەڕاحێك مەڕاحێکتان بردوەتەسەر؟".

بەتاڵ ئاغا وەڵامی دایەوە: بردوومانە.

"ئەمن دەبێ بی‌بینم, ئەو وەختێك من ببینێ, دایکەحۆری ببینێ باشتر دەبێ".

"ئەمڕۆ ناتوانی بی‌بینی, جێ‌یەکەی تەنانەت بە منیش ناڵێن, تەنیا نەفەرێك بە جێ‌یەکەی دەزانێ, ئەویش دەمیر ئاغای خۆمانە".

"دەمیری یاغی؟".

بەتاڵ ئاغا سەلماندی: دەمیری یاغی.

"بەتالەزلە. ئەو من دەناسێ. هەر ئێستا بڵێ بانگی کەن".

"لێرە نیە, دەبێ تا سبەینێ بەیانی راوەستی".

هیچ چارەی دیکە نەبوون. دایە حۆری دەبوو راوەستێ. بەتاڵ ئاغا هەستاو چووە ژوورێکی دیکە. کە ئەو چووە ژوورەکەی دیکە, کۆمەڵێك ژن و کچ و بووك و منداڵ هاتنە لای حۆری. بەخێراتنیان کردو دەستی‌یان ماچ کرد. شەوێ بەربەسێڵ, پلاو, هەنگوین و قەیماغیان خوارد.

لە ژوورەکەی ئەوسەری چادرێ جێ‌یان بۆ چاك کرد. دایەحۆری لە هەموو تەمەنی دا لەسەر جێی وا نەرم نەخەوتبوو. زۆر ماندوو بوو. هەر سەری وەسەر سەرینێ کردو خەوی لێ‌کەوت.

بەیانی بە دەنگی زەنگوڵەو هات و هاوار لە خەو هەستا. زۆر بەدەماغ بوو. خێراو چالاك خۆی توند کردەوەو چووە ژووری نێوەڕاستێ (لە چادری گەورەدا بە چیغ نێوانیان دەبڕیەوەو چادرەکەیان دەکردە چەند ژوور ـ وەرگێڕ) بەتال ئاغا چەکی لەخۆی دابوو و چاوەڕوانی بوو, بە روویەکی خۆشەوە پێشوازیی لـێکرد:

"رەحەت خەوتی خوشکە حۆری؟ جارێ وەرە بەرچایی بکە. لە شەوێ دیکەوە چاوەڕێی تۆن. کاك مەحموود ئەتۆ لێرە دەمێنیەوە".

دانیشتن. سفرەی قاوڵتی راخرابوو, قاپە شیر هەڵمی لـێ هەڵدەستا. بۆنی نانی تازەو بۆنی شیر لە چادرێ دەگەڕا. لەنێوەڕاستی سفرەکە بەرەمەشکەیەك رۆنەکەرە دانرابوو, بلۆقی دۆی لەسەر بوون. نان ساجی‌یەکە ئەوەندە گەرم بوو دەستی دەگەزی:

"جارێ با پێکەوە قاوەیەك بخۆینەوە".

بەتال ئاغا بە دەستی خۆی قاوەی دە فنجانی وی کرد. بێئەوەی قسەیەك بکەن قاوەکەیان خواردەوەو قاوڵتی‌یان خوارد.

دایەحۆری هەستاو گوتی:

"دەرمانی رێیە رۆیشتنە, وانیە بەتال ئاغا؟".

بەتال ئاغا هەر پێدەکەنی.

لە تاوڵێ وەدەر کەوتن. پیاوێکی کورتەبالاّ کە سەرتاپا چەکدار بوو و تەقیلەیەکی سووری بە گوڵینگی بنەوشی‌یەوە لەسەر نابوو, و پێش هەموو شتێك سمێڵە گەورەکانی لە چاوی بینەریان دەدا, هەوساری ئەسپێکی بە شەوکەتی بە زینی چەرکەسی‌یەوە بە دەستەوە بوو, چاوەڕوانی دایەحۆری بوو.

بەتال ئاغا لەحالێك دا هەناسەی هەڵدەکێشا گوتی:

"ئەمە دەمیرە, ئامۆزای منە, پیاوێکی ئەمینە".

دەمیر هاتە لای دایەحۆری و دەستیی ماچ کرد.

"خوا دەوامت بدا کوڕی خۆم".

بەتال ئاغا وەك داوای لـێبووردن بکا گوتی:

"دەمیر چاوانت دەبەستێ و دەت باتە ئەو جێیە کە دەبێ بچی".

چوونە پەنا سەکۆی سوار بوون. دایەحۆری بە خۆهەڵدانێك چووە سەر سەکۆیەکە. دەمیر رکێفی بۆ داگرتبوو, حۆری وەك سوارچاکێکی کارامە سواری ئەسپ بوو, ئەمجار رووی کردە

بەتال ئاغاو گوتی: خواحافیزو وەڕێ کەوتن. بەنێو رەوە وشترو مێگەلە مەڕو بزن و بەنێو سەگە قەڵەدەلەملەکان دا کە هەریەکەی بەقەد ئەسپێك دەبوون و بەنێو ئەو ژنانەدا کە بە جلکی جوان و خاوێنەوە هێندێکیان حەیوانیان دەدۆشین و هێندێکیان مەشکەیان دەژاند, تێپەڕین. لەبەردەمی هەر تاولێکیش شەهێنێك لەسەر پەلەدارێك هەڵنیشتبوو. بەنێو هات و هاوارو گریانی منداڵان و هۆهۆی شوانان دا تێپەڕین و لە هۆبەی دوور کەوتنەوە. دەمیر ئایدینی لەپێش ئەسپەکەدا وەك با دەڕۆیشت.

لە رێگادا نە هیچیان خواردو نە هیچیان خواردەوە هەتا گەیشتنە سەر ئاوێك. لەوێش پەڕینەوەو چوونە نێو لێڕەوارێك کە گەڵای دارەکانی زەرد ببوو. دەمیر نە ئاوڕی دەدایەوەو نە قسەیەکی دەکردو هەتا دەچوونە پێش ئەو توندتری دەکردو لەپێش ئەسپەکەوە دەڕۆیشت, لەدارستانی تێپەڕین. گەیشتنە مێرگ و مێرغوزارێکی هەموار کە هەتا چاو بڕی دەکرد پان ببووەوەو بێ بڕانەوە دەهاتە بەرچاو. لێرە هەموو شتێك ئەوەندە سەوزو گەش بوو کە درەوشانەوەی لەسەر ئاسمانیش رەنگی دەدایەوە. تێپەڕین لە مێرغوزارەکە زۆری کێشا.

دەمیر لە پێشەوەی ئەسپەکە بە هەناسەبڕکە دەڕۆیشت و گولێنگە تەقیلەکەی با رایدەوەشاند. گەیشتنە سەرەوژێرێکی توندو کە لەوێ تێپەڕین و گەیشتنە هەورازی تووشی چیایەکی بەرزو حەستەم بوون کە شاخەکانی هەموو بەردئەستێ بوون. لە خوار بەردەڵانەکە دارێکی ئەستوور هەبوو کە بای خەزان گەڵاکانی زەرد کردبوو. لەبن دارەکە راوەستان. دەمیر ئایدینی هاتە لای دایەحۆری بە شەرمەوەو بە داوای لێبووردنەوە گوتی:

"دایەحۆری دەبێ بیبووری. چاوەکانت دەبەستم".

ئەمجار دەستی دە گیرفانی ڕاکردو دەسرۆکەیەکی ئاوریشمی گەورەی کە گۆشەکانی بە رەنگی بنەوشی گوڵدۆزی کرابوون دەرهێناو گوتی: ها دایە, بەم دەسرۆکەیە چاوەکانت ببەستە, توندیان ببەستە کە هیچ جێیەك نەبینی. ئێمەی چەتە دابەکەمان وایە...".

دایەحۆری بە پێکەنینەوە, لە حاڵێك دا لە دڵی خۆیدا جنێوی بە هەرچی چەتەو بەتایبەتی دەمیر ئایدینی کە خۆی بە شتێك دەزانی, دەدان بە دەستی خۆی چاوی خۆی بەستن. دەمیر پاش ئەوەی جڵەوی ئەسپەکەی گرت گوتی:

"دایە, ئەتۆ جڵەوەکەی بەرەڵڵا کەو توند دەست بە قەڵپووزی زینەکە بگرە".

حۆری ئەو کارەی کردو دەمیر جڵەوی ئەسپەکەی گرت و رایکێشا. دایەحۆری لە دڵی خۆی دا دەیگوت: تەحەممول دەکەم, هەموو شتێك تەحەممول دەکەم... وەك کوێران وەدوای ئەو

دەمیرۆکەی دەکەوم, سەگ بە سمێڵە زەردەکانی هەڵمیزێ, لەبەر خاتری کوڕەکەم, لەبەر خاتری شەهێنەکەم, لەبەر خاتری گوڵی روخساری هەرچی بڵێن وا دەکەم.

"چاوی دایەحۆری دەبەستن کە هەتا ئێستا کەس نەیبەستوون؟ متمانەتان پێم نیە؟ باشە لەبیرتان نەچێ, ئەگەر ئەمن دایەحۆری بم دەزانم تۆڵەی ئەوەتان چۆن لێدەکەمەوە, دەمیر هەتیوە پیسە, ئەمن دەناسی, دەم ناسی, دەزانی ئەمن کێم, چادرنشینی چڵمن, دەمیرە دەربەدەرکراو چاوی من دەبەستی؟ راوەستە با چاوم بەو حەمەدۆکە بکەوێ, دەبێ هۆیەکەی لەو بپرسم, دەبێ ئەو قامکانەی دەزاری ڕاکەم, زاری ئەو تووتکە سەگەی لەبەریەك هەڵدڕم. ئەو بستە منداڵە کە ئێستا بووەتە حەمەدۆك, هەتیوی برایم سوالکەری متمانە بە من ناکا؟ دەستوور دەدا چاوانم ببەستن؟ هەتیوە گەوجە ئەتۆ چ کارەی, ئەتۆ چ کارەی هەتا رەفتاری وا لەگەڵ من بکەی؟ ئەو بەڵایەم بەسەر دێنی, لە دیتنی ئەو کێوانە بێبەشم دەکەی؟ وەختێك بەو چاوانە کە ئێستا وەك کوێرانم ئەتۆم دی, ئەتۆش دەستانم دەگری کە ماچیان بکەی... وا نیە؟ نابێ ئەتۆ بکەم بە قوربانی ئەو دەستە جوانانەم؟ یانی جەندرمە دەم گرن و بۆ ئەوەی بەجێی تۆ بزانن لێم دەدەن, ئەو وەخت ئەمنیش دەڵێم حەمەدۆك لە فلانە جێیە بەڵێ؟ بەڵێ بەچکە شێرەکەم؟ بەڵێ شەهێنە نازاکەم, بەڵێ سوارچاکی ئەو ئەسپە شێتە؟ پێت وایە بە کوشتنی چەقەڵێکی وەك عەبدیخان بوویە شتێك؟ پێت وایە ئێستا کە نیوەشەوێ چووی عەلی سەفای ترسەنۆکت لە نێو جێوبانی خەوێ دا کوشتوە, ئیدی بوویە کوێرئۆغلی؟ هەتیوە نەفامە, چما ئەمن ژنێ دوورمووش عەلی نیم, چما ئەمن دایەحۆریی حەوت دێیان نیم؟ هەتیوە گەوجە, چما ئەگەر جەندرمەو دوژمنانمان بە زیندوویی کەولم کەن, جێی تۆ کە هیچ, تەنانەت جێی ئەم دەمیرە سەگ دەسمێلان ڕیاوەش بەکەس دەڵێم؟ ئەگەر گۆشتی لەشمیان ریشاڵ ریشاڵ کردبایە, کەللەی سەرمیان بەسەر دارێکەوە کردباو دێ بە دێ گێڕابایان, چاوەکانمیان هەڵکۆڵیبان لەوە چاکتر بوو... هەی حەمەدۆك, لەمەودوا چۆنت لە ڕوو دێ چاوم لە چاوی کەی, ئەمن چۆن حازر بم چاو لە چاوت کەم؟ حەمەدۆك هەی بێدین, هەی کافری هەرچوار دینان, زندیق, کافر, دڵم نایە بڵێم, زمانم لاڵ بێ, ئەتۆ لە عەلییەشەلیش خەراپتری, لەو بەرازە دووڕووەش دووڕووتری".

دەیەویست لەو لەحزەیەدا دەسرۆکەکە لە چاوانی بکاتەوەو بگەڕێتەوە دێ و هەتا دەمرێ ناوی حەمەدۆك بە زمانی دا نەیە. بەڵام نەیدەتوانی. بە ڕێیەکی زۆر ناخۆش دا دەڕۆیشتن, دایەحۆری ئەمەی لەو بەردانەڕا کە خلۆر دەبوونەوەو لە سەرسم دانی خێرا خێرای ئەسپەکەڕا بۆ دەردەکەوت. توند دەستی بە قەڵپووزی زینەکە گرتبوو, و دەنگی هەناسەبڕکەی ئەسپەکەو

دەمیری ـ کە لەپێش ئەسپەکەوە دەڕۆیشت و وەك کوورەی ئاسنگەران دەهەندمی ـ گوێ لـێدەبوو و دەیگوت: سەکەت بە دەمیر ئایدینی چەپەڵ، سەکەت بە، چاوی حۆرییە دەبەستی؟

لە دڵی خۆیدا دەیگوت:

"ئێستا ئەگەر ئەو لای راستەم هەڵدێرێکی قووڵ بێ، ئەسپەکەش لاقی هەڵخلیسکێ، و حۆری بە خۆی و ئەسپەکەیەوە هەڵدێرێتە نێو گەڵێیەکەو پارچە پارچە بێ، هەی حەمەدە، ئەتۆش بێی و لەگەڵێیەکەدا جەنازە شەلاڵی خوێنەکەی من ببینی... ئەگەر نەیە نێو گەڵی و تەنانەت جەنازەکەشی هەڵنەگریەوەو سیسارگ بێن تەرمەکەی لەت و پەت بکەن، ئەودەم چ دەکەی حەمەدۆك؟ بڵێ ئیدی، دەبڵێ. تازیە دادەگری و دەگریەی؟ نا حاشا لە یەك دڵۆپە فرمێسکیش. چما وەختێك خەبەری مەرگی دوونەم پێ دای کە دایکت بوو و دەزگ و پشتانی گێڕابووی گریای".

لە هاتنەکەی زۆر پەژیوان بوو: چما پیاو لە دەستی هەتیوی برایم سوالکەری خێرێکی پێدەگا...؟ ئەوەندە تووڕە بوو ئەگەر لەبەر ئەو کۆچەرییە بێکارەیە پێی عەیب نەبایە دادەنیشت، زۆر زۆر دەگریا.

دەمیر گوێی لە بۆڵە بۆڵی پیرێژن هەبوو، جار جار ئاوڕی دەدایەوەو نێوچاوانی گرژو تووڕەی وی دەدی. بەڵام سەری لە هۆی ئەو تووڕەیی و رووگرژییە دەرنەدەکرد.

دایەحۆری ئەوەندە بە قینەوە دەستی بە قەڵپووزی زینەکەی گرتبوو کە هەموو ماسولکەکانی رێك هاتبوون. وەختێك ئەسپەکە راوەستا، حۆری کە دەت گوت لەخەو راپەڕیوە، تێك رابوو:

گەیشتینەجێ دایە، چاوەکانت بکەوە...".

حۆری لەحالێك دا دەسرۆکەکەی لە چاوان دەکردەوە هەتا تینی تێدابوو هاواری کرد:

"دەمەویست سەد ساڵی دیکەش نەگەینێ، ئێستا دەزانم چیی پێ دەکەم"

دەمیر ویستی دایبەزێنێ.

"مەیە نیزیکم، دەستم لـێمەدە، بۆخۆم دادەبەزم".

خۆی لە ئەسپەکەی فڕێ داو وەك بریسکە لە دەرگای گەورەی ئەشکەوتێك کە پیاوێکی بەخۆوەی چەکدار رووبەڕووی راوەستابوو، وەژوور کەوت. هەر وەژووری ئەشکەوتێ کەوت و لەنێوەڕاستی ئەشکەوتەکەدا رەق راما، پاشان خۆی بەسەر حەمەدی داداو باوەشی پێدا کرد:

"حەمەد, کوڕە ئازاکەم کوڕم, بەچکەشێرەکەم, چۆنی؟".

حەمەد چاوی هەڵێنان, بەخۆشحاڵی‌یەوە چاوی تێوە بڕی, زەردەخەنەیەکی هاتێ و گوتی:

"دایە سوپاس بۆ خوا کە نەمردم و تۆم دیتەوە, تازە ئەگەر بش مرم باکم نیە. ئاواتم تەنیا ئەمە بوو. لەبەر خوا دەپاڕامەوەو دەم گوت خوایە هەتا دایەحۆری‌یە نەبینم گیانم مەکێشەو خواش...".

دوو دڵۆپ فرمێسك لە چاوەکانی هەڵقوڵێن و بە گۆنای دا هاتنەخوارێ.

حۆری هاواری کرد: بێدەنگ بە تووتکەسەگ. پاشان گوتی:

"دایە بە قوربانت بێ, ئەمە چ قسەیەك بوو لە زارت هاتەدەر, وس...س ئەگەر بێدەنگ نەبی, ئەگەر وەك ژنان, وەك منداڵان بکرووزێیەوە, لێرەڕا یەکسەر دەگەڕێمەوە. بزانم, بزانم برینەکانت ببینم, بزانم چۆنن کوڕە روومەت گوڵەکەم".

حەمەد بە پێکەنینەوە برینەکانی نیشان دان. برینەکان بە چاکی بە جلەکانیەوە نووسابوون. حۆری بۆ یەکەم جار چاوی لە نوێنەکانی کرد. لەگەڵ ئەو نوێنانە کە شەوی رابردوو تێیان دا خەوتبوو, بە موو فەرقیان نەبوو.

"برینەکانت دەبرژێنەوە؟".

"کەمێك".

"کەوایە زۆر دەبرژێنەوە".

هەستایە سەرپێ, لە ئەشکەوتێ وەدەر کەوت, بەدوای دەمیر دا دەگەڕا. لەو پیاوەی لەبەر زارکی ئەشکەوتێ راوەستابوو, پرسی:

"لەکوێ‌یە, دەمیری دەڵێم, ئەوەی چاوی منی بەستبوون لە کوێ‌یە؟".

پیاوە بەخۆوەکە بە پێکەنینەوە گوتی:

"لە ژوورێ دایە".

حۆری گەڕایەوە ئەشکەوتێ. دەمیر لەسەر جێ‌یەکە راوەستابوو و لەگژ فکران راچووبوو.

"جەڕاحت هێناوەتە سەر کوڕەکەم؟".

دەمیر لە حاڵێك دا دەیگوت سێ‌دانە, لە ئەشکەوتێ وەدەر کەوت.

دایەحۆری هەموو شتێکی بۆ دەرکەوتبوو, بە دوای دا چووە دەرێ, چوون لەبن شاخێك هەڵتروشکان.

"دەمیر بڵێ بزانم کوڕەکەم وەزعی خەراپە؟".

دەمیر بە راوێژێکی خەفەتاوی گوتی:

"حاڵی شڕە دایە".

"جەڕاحەکان گوتیان چی؟".

"نەیان توانی گوللەکان دەربێنن. دوویان لە کۆچەرییەکان بوون و یەکیشیان هی ئەو دێیەی خوارێ".

"کەوایە کوڕەکەم دەمرێ؟".

"ئەمەیان خوا دەیزانێ دایە".

"کوڕەکەم نامرێ, ئەمەیان خوای گەورە دەیزانێ, بەڵێ. کوڕی حۆرییە بە برینی گوللەی دوژمن نامرێ".

"ئیشەڵڵا دایە, خوا لە زارت بڕوانێ...".

حۆری چووە ژووری ئەشکەوتێ, لە ژوور سەری حەمەدی دانیشت و دەستی بەسەر نێوچاوانیدا هێناو دەستی کرد بە ماچ کردنی. بە دەنگێکی گەرم و دڵسۆزانەو نەرم دەستی لەگەڵ کرد بە قسان. ئەگەر کەسێك لەو حاڵەدا لە ژوور سەری حەمەدی چاوی پێ بکەوتایە, باوەڕی نەدەکرد ئەو ژنە بەسۆزو میهرەبانە دایەحۆری بێ.

حەمەد تای هەبوو, بەڵام زۆر نا. چەند لەحزەیەك چاوی هەڵێنان, تەماشای حۆرییەی کردو زەردەی هاتێ:

"ئەتۆ هاتی, ئەمردم جارێکی دیکە تۆم دیتەوە, ئیدی چاك دەبمەوە".

حۆری بە دڵنیایی و تووڕەیی گوتی:

"چاك دەبیەوە, ناکرێ چاك نەبیەوە, ئێستا شۆرباوێکت بۆ لێدەنێم کە...".

هاتە دەرێ و بە دەمیری گوت:

"شتێك پەیدا دەبێ شۆرباوێکی بۆ لێنێم؟".

"هەموو شتێك هەیە دایە, چت دەوێ؟... بەڵام ئەوە چەند رۆژە دەم لە هیچ نادا..."

"ئەگەر ئەمن لێی نێم دەمی لێدەدا, ئەتۆ لێرە ئاورێك بکەوە بزانم. قابلەمەش بێنە. لەم دەوروبەرە پنگێکی زۆریش بکە".

"دایەگیان, لێرە ناکرێ ئاگر بکەینەوە".

حۆری پرسی: بۆچی نابێ؟.

"چونکە دووکەڵەکەی دەبینرێ".

"لەنێو ئەشکەوتێش نابێ. دووکەڵەکەی حاڵی کوڕەکەم تێك دەدا".

دەمیر خەریك بوو بیری لـێ‌دەکردەوە.

"زۆری بیر لـێ‌مەکەوە, جێگایەك وەبینە کە دووکەڵ نەبینرێ".

"لەم نیزیکانە ئەشکەوتێکی چووکەڵەی دیکە هەیە. لەوێ دەبێ دایە؟".

حۆری گوتی: دەبێ. خۆشحاڵ بوو, بۆ یەکەم جار نێوچاوانی کرایەوە, روخساری روون بووەوە: شۆرباوی بە پنگێ دەیهێنێتەوە سەرخۆ.

قۆڵی هەڵکردن. لە ئەشکەوتە چووکەڵەکەدا بە ئۆگری و وردەکاری‌یەکی تەواو شۆرباوێکی بە پنگێی (رەنگە هەر دۆکلیوی پنگێ بێ - وەرگێڕ) ئەوەندە خۆشی بۆ کوڕەکەی ساز کرد کە هەرکەس خواردبای دەستی خۆی پێوە دەخوارد. کەس نەی‌زانی چیی کرد کە تۆسقاڵێك دووکەڵ نەچووە دەری ئەشکەوتێ.

حەمەد کە چەند رۆژ بوو پارووە نانێکی نەچووبووە سەر زارو زمانان قاپێکی گەورەی شۆرباو خوارد.

"دایە, پێم نەگوتی, ئێستا کە ئەتۆ هاتووی باشتر دەبم؟".

"چاکتریش دەبی".

ئەو شەوە تا بەیانی حەمەد نالآندی. حۆری بەخەبەر بوو و گوێی بۆ ناڵەو هەناسەکانی رادەگرت. نەخۆشەکە یەك دوو جاریش خەوی لـێ‌کەوت, ماوەی خەوەکەشی درێژ بوو. ئەمە نیشانەی باشتر بوون بوو. بەڵێ, تاولەرزو ناڵەناڵ چاوی وی‌یان ترساندبوو. بەیانی حۆری شۆرباوێکی دیکەی لـێ‌نا. ئاش ماست بە قیمەوە. دیسان پنگێکی زۆری تێ‌کردبوو. حەمەد ئەم جاریش شۆرباوەکەی خواردو تەواوی کرد.

پاش ئەوەی حەمەد شۆرباوەکەی تەواو کرد, حۆری دەستی لەسەر نێوچاوانێی دانا. تایەکە بەری نەدابوو. ئەم تا سەگباب خێوە... جەراحێك پێویستە. جەڕاحێکی باش و لێزان...

هاتەدەرێ, لەبەر زارکی ئەشکەوتێ لەسەر بەردێك دانیشت و دەفکرەوە چوو. هەتاو تازە دەرکەوتبوو, لە بناری چیاکانی دەداو هەموو جێ‌یەکی دەدایە بەر لافاوی رووناکی. لە خوارێ, لەو لێڕەوارە کە هەتا چوکووراوا درێژەی هەبوو, لە چەند جێ دووکەڵ هەڵدەستا. بنی ئەو کانی‌یەی بە پەنا ئەشکەوتەکەدا رادەبورد گەش و روون بوو و ماسیی بریقەدارو سێبەری هەوران بەسەر وردەخیزی بنی کانی‌یەکەدا تێ‌دەپەڕین. حۆری لەحزەیەك لەوێ لەنێو ئاوەکەدا لەسەر سێبەری هەورەکان روخساری خۆی دی و لە نەکاو سەری سوڕما:

"حۆرییە قەت کەس نەماو سەیر پیر بووی".

لەوێ هەستاو لە جێیەکی دیکە دانیشت و دەسبەجێ بانگی دەمیری کرد:

"دەمیر وەرە ئێرە".

"فەرموو دایە".

"ئەم کوڕە جارێ حاڵی خەراپ نیە, جارێ تەحەممول دەکا. بەڵام ئەم وەزعە زۆر بخایەنێ, کوڕەکە دەمرێ".

"چ بکەم دایە؟".

"شتێکم بە بیردا هاتوە, خانەقای چل چاو لێرە دوورە؟".

"زۆر دوورە دایە".

"ئەتۆ هیچ ناوی خانەقای چل چاوت بیستوە؟".

"چما کەس هەیە نەیزانێ؟".

"ئێستا پیری خانەقای چل چاو ئاناجیخ سوڵتانە, وانیە؟ ئەتۆ دەزانی ئەو ئاناجیخ سوڵتانە تەنانەت کەسێك گوللەی گەرمی وەدڵیش کەوتبێ, دڵی لەت و پەتیش کردبێ, دیسان چاکی دەکاتەوە؟".

"ئەمە هەموو کەس دەیزانێ".

"تەنانەت ئەگەر گوللە کەسێکی کوشتبێش, دیسان چاکی دەکاتەوە. ئەو خانەقایە, خانەقای خوێنە, ئەوەندە بەسە لەشی یەکێك خوێنی لێبێ, زیارەتگەی چل چاو مومکین نیە چاکی نەکاتەوە. کەس نەیدیوەو نەیبیستوە وا نەبێ".

"ئێمەش فکری خانەقای چل چاومان کرد, بەتال ئاغاش هەروا... ئێمە ناتوانین حەمەدۆکی بەو حاڵەوە بەرینە وێ... ئاناجیخ سوڵتانیش نایە, دابی ئەم خانەقایە ئەوەیە پیرەکەی, ئەوێ بەجێ ناهێڵێ بچێتە جێگایەك".

"ئەمن کارێك دەکەم بەجێی بێڵێ".

"زۆر پیرە, لەوانەیە سەد ساڵ ببێ, چۆن دەتوانێ بێ؟".

"ئەتۆ حەمەدۆکی بەرە خوارێ, ئێ؟ بن ئەو کێوەی... جەندرمەکان لە فکری گیانی خۆیان دان, دەیبەیە خوارێ, بۆ هۆبەیەکی چادرنشین... ئەمن دەچمە لای ئاناجیخ سوڵتان. ئەتۆ هەر ئێستا من بەرەوە ساری کەچیلی... بەتال بە جێگای حەمەدی دەزانێ وەنا؟".

"بەڵێ پێی دەزانێ".

"ئەوی بەرە خواریّ, ئەگەر دەمریّ با لە خواریّ بمریّ. هیچ سوودی نیە لەسەر ئەم چیایە وەمیّنیّ. ئەو چیّشتەش کە بۆم لیّنا لەبیرتان نەچیّتەوە. بەیانی و نیوەڕۆو ئیّواریّ لەو شۆرباوەی بۆ لیّ‌بنیّن. ئەگەر خواردنی دیکەشی ویست بیّ‌دەنیّ".

چووە ژووری ئەشکەوتیّ, تاویّکی چاك حەمەدی لەباوەش گرت, ماچی کردو بۆنی پیّوە کرد. پاشان گوتی:

"کوڕم ئەمن دەڕۆم. دەچمە چل چاو کن ئاناجیخ سولّتان. هەتا دیّمەوە ددان بە جەرگی خۆت داگرە, تەحەممول بکە. مەمرە. وەختیّك ئاناجیخ سولّتانم هیّنا دەسبەجیّ برینەکانت چاك دەبنەوە. پاشان وا دەکەم کاریّك بکا کە ئیدی گوللەت ویّ نەکەویّ و ئەگەر ویّشت کەوت کارت لیّ‌نەکا... ددان بەجەرگی خۆت داگرە کوڕم, تەحەممول کە کوڕە بەجەرگەکەم. لەبەر خاتری دایەحۆریی بیّ‌کەس و بیّ‌دەر کە لەم دنیایەدا بیّ کەس و پشتیوانە تەحەممول بکەو مەمرە هەتا دیّمەوە".

لە زارکی ئەشکەوتەکەدا راوەستابوو, حەیران و پەریّشان لە حالّیّك دا دلّی پڕ ببوو بە عیشق و خۆشەویستی‌یەوە تەماشای دەکردو نەی‌دەتوانی هەنگاو هەلّیّنیّتەوەو لە ئەشکەوتیّ وەدەر کەویّ. سەرەنجام گوتی:

"خوایە ـ لیّوەکانی لەرزین و دەستی بەرەو ئاسمان راگرت و ماوەیەك بەو حالّەوە مایەوە ـ خوایە, ئەی خوای گەورەم, بە محمدت(ص) سویّند دەدەم کە ناوی خۆشە, بە عەلیت سویّند دەدەم کە شمشیّری دریّژە, بە پیرو پیاوچاکی خانەقای چل چاوت سویّند دەدەم کوڕەکەم بدەوە بە من, بیدەوە بە فەقیرو هەژاران...".

کە لە ئەشکەوتیّ وەدەر کەوت ئاوڕی دایەوەو وەك ئەوەی بلّیّی قەت چاوی بە حەمەد ناکەویّتەوە تەماشای کرد, دەت گوت دەیەویّ روخسارە جوانەکەی, روخسارە دلّگرو میهرەبانەکەی کە تایبەتی ئەزەرکردەکان بوو, لەنیّویّ چاوی و لە قوولاّیی دلّی دا بە جۆریّك بکیّشیّتەوە کە هەرگیز نەسڕیّتەوە.

دەمیر ئەسپەکەی هیّنابوو, لەبەر زارکی ئەشکەوتیّ چاوەڕیّی بوو.

حۆری بە پاڕانەوەوە گوتی:

"کوڕم ئەگەر دەکریّ چاوەکانم مەبەستە. ئەمن دایکی حەمەدۆکم. ئەگەر کەولّیشم کەن...".

دەمیر گوتی: باشە دایە, و میّزی لیّ‌دا هاویشتیە سەر ئەسپەکە.

دایەحۆری لەسەر ئەسپەکەوە داهاتەوە, تەماشای وی کردو گوتی:

"دایه بە قوربانت بێ, بە قوربانی ئەم سمێڵە زەردە بریقەدارە جوانەت بێ. کاری چاکت کرد کە چاوت نەبەستم. ئەو رەفیقەی تۆ, حەمەدۆك نامرێ...".

"کورِم ئەوتان چۆن بێرەدا بردە سەرێ؟".

دەمیر هەناسەیەکی هەڵکێشا:

"هەر مەپرسە دایە"

خۆشحاڵ و بەدەماغ ئەسپەکەی بەنێو بەردەلاّن دا لێخورِی. تەماشای لای چەپی خۆی کرد, ئۆزۆی, هەڵدێرێکی دی ئەوسەری دیار نەبوو...

شۆرِ ببوونەوە, خەریك بوو ئەسپەکە سەرەنگرێ بێ و حۆرییش فرِێ درێتە بنی هەڵدێرەکە.

"بریا دیسان چاوت بەستبام"

هەردووکیان پێکەنین.

## (١٤)

خانەقای چل چاو لەنێو بەردەلانێکی بەردئەستێ داو لە پەنا کۆمەڵە دارێکی ئەستوور کە دیار نیە تەمەنیان چەندە، دروست کراوە. کۆنیەکەی دەگەرێتەوە بۆ ئەو سالانە کە تورکمەنەکان لە خوراسانەوە هاتنە ئەم دەوروبەرانە. خانەقا لە بەردئەستێ دروست کراوەو لە سێ دەروازەوە کە سەردەرانەکەیان بە تاق هاتوونەوە، دەکرێ بچیە ژوورێ. دەرگاکانی لەدارێکی سەخت و ساغی لێرەوار دروست کراون کە نەخشی زۆر جۆرە کەڵەکێوی، باڵندەو جانەوەرو ئایەتی قورئانیان لێ‌هەڵکەندراوەو لەنێو نەخش و نیگاری هەر دەرگایەك دا نهێنییەك شارراوەتەوە. ئەم خانەقایە دەرمانی هەموو دەردێك و شیفای هەموو نەخۆشییەکە. هەژاران، دڵداران و ئەوانەی تووشی بەلاو موسیبەت دەبن، بۆ چاری دەردی خۆیان دێنە ئەم خانەقایە. لەبن ئەو دارە ئەستوورانە ئاوێکی روون و زوڵاڵ هەڵدەقوڵێ و پاش ئەوەی بە هارە هارو کەف پرژاندن دەوری شاخەکان دەداتەوە، بە خێراییەکی باوەڕ پێنەکراو لە بناری را دەچێتە خوارو بەردان هەڵدەکەنێ و لەگەڵ خۆیان دەبا. هێندێك کەس دەڵێن ئەو ئاوە لەگەڵ ئەو هەموو خورێنییەی لە نەکاو رادەوەستێ و پاش راوەستانەکەش هەر بەو خورێنییە دەگەرێتەوە سەرچاوەکەی. گۆیا چەند کەسێکیش ئەمەیان بە چاوی خۆیان دیوە. لە سەرانسەری تووروس دا هیچ کەس گومانی لەم مەسەلەیەدا نیە، تا ئێستا تەنانەت بە بیری کەسیش دا نەهاتوە کە گومانی لەو بارەیەوە هەبێ و بە گومان و باس کردن لەو بارەیەوە خۆی تووشی لەدین وەرگەران و بێ‌ئیمانی بکا. وەختێك بەهار دادێ، لە کێوەکانی چل چاو بە شاخە سپی و نووك تیژەکانیەوە کە هەموویان بەردئەستێن شەوێك هەتا بەیانی دەنگی قرچە قرچ دێ. ئەو شەوە هەموو باڵندەکان، جانەوەرەکان، گورگ و پڵنگ و بە گشتی هەموو ئافەریدەکان بەخەبەرن و کە بەیان دەنگوێ تەنانەت تۆسقاڵێکیش هەور بە ئاسمانەوە نابینرێ، رووناکییەکی سەرسوڕهێنەر هەموو جێیەك دەگرێتەوەو لەو

ڕووناكایی‌یەدا ئینسان تێدەگا كە شەوێ گوڵەزەردە شاخەكانیان قەڵاشتوەو سەریان وەدەرناوەو قرچەقرچەكەی دوێشەوێ دەنگی ئەو شاخانە بووە كە بە ڕووان و سەروەدەرنانی گوڵەكان قەڵشتیان بردوە. ئەودەم هەموو جێیەك, زەوی و ئاسمان و تەنانەت ئەو ئاوە كە بە هاڕەهاڕ دێتەخوار ڕەنگیان زەرد هەڵدەگەڕێ و بەدوای ئەوەدا دنیا وەك شووشەیەكی زەردی پڕشنگدار تیشك داوێژێ. وەختێك پاییزیش داهات بەیانی كە لە خەو هەڵدەستی دەبینی كە هەموو ئەو گوڵە زەردانە بەیەك شەو ون بوون و هەموو جێیەك سپی هەڵگەڕاوە. ڕۆژو شەوەكانی هەوەڵی پاییزێ بە شێوەیەكی باوەڕ پێنەكراو دەكەونە نێو سپیایی‌یەكی یەك ڕەنگەوە, ئاسمان, زەوی, دار, گیاو هەموو گوڵەكان سپین. تەنانەت باڵندەی ئاسمانیش ڕەنگیان سپی دەبێ و شەوێكیان دنیا دیسان دەست دەكا بە قرچەقرچ. چیاكان دەكەونە لەرزین و وەختێك بەیان دەنگوێ و هەتاو هەڵدێ ئینسان بە سەرسوڕمانەوە دەبینێ كە ئەمجار گوڵی شینی ئاسمانی شاخە سپی‌یەكانیان قەڵاشتوەو هەموو شتێك ڕەنگێكی شینی نەرم و ناسكی بە خۆیەوە گرتوە, ئەوەندە ناسك كە ئەگەر دەستی لێدەی كاڵ دەبێتەوەو ون دەبێ. هەركەس جارێك پێ بنێتە نێو ئەو ڕەنگە شینەوە دڵی لە هەموو دەردو ناڕەحەتی و تاریكایی‌یەك پاك دەبێتەوەو دەڵێی تازە لەدایكی خۆی بووە. هەتا دەش مرێ دڵی پاك و ڕووناكەو تووشی هەر بەڵایەكیش بێ, دیسان تا دەمرێ دەستی دەگاتە شادمانی‌یەكی منداڵانەو بەختەوەرانە كە هیچ ئینسانێك ناتوانێ بیگاتێ. هەتا ماویشە هەر لەحزەیەكی تەمەنی بە كەیف و شادی و دڵڕووناكی‌یەكی بەهەشتی‌یانە دەباتەسەر. بەڵام دەست وێڕاگەیشتن و چوونە خوار بەو ڕەنگە شینەداو ژیان لەگەڵ ئەم پاكی و پیرۆزی‌یە, هێندەش ئاسان نیە. زۆرداران, ئەوانەی ئینسانەكان بە كەم دەزانن, كەسانێك كە دەستیان بە خوێنی خەڵك سوورە, ئەوانە كە هەق دەخەنە ژێرپێ و خوێنی خەڵك دەمژن, بێكارەو مفتەخۆرەكان ناتوانن بچنە وێ. ئەگەر چووشن ڕێیان ناكەوێتە نێو ئەو ڕەنگە شینەو ئەگەر ڕێگاشیان بكەوێتە نێوی ئەو شادمانی‌یەیان پێناگاو دڵیان لەگەرمی و سەرخۆشی و مەستیی ئەو شادمانی‌یەدا باڵ ناگرێ.

دایەحۆری ڕۆژو نیوێكان بەرێوە بوو. ئەو ئەسپەی سواری بوو و ئەو لاوانەی لەگەڵی بوون هەموویان چوست و چالاك بوون. یەكێك لە لاوەكان لەلای ڕاستی و یەكێكیان لەلای چەپی بێئەوەی هەست بە ماندوویی بكەن پێ بە پێی ئەسپەكە دەڕۆیشتن. حۆری تووشی هەژان و دڵەخورپە ببوو. دەچووە زیارەتی خانەقای چل چاو, دڵەخورپەی بوو, ئەگەر پیری خانەقا نەی‌ویستایە حەمەدۆكی چاك بكاتەوە... ئەودەم حۆری چاری چ بوو, تاق و تەنیاو بێكەس و كار دەمایەوەو كوڕەكەی, ئەو بێچووە پڵنگە لە پێش چاوانی سیس هەڵدەگەڕاو دەمرد. ئەوكاتە حۆرییش خانەقای چل چاوی خوایە تۆیە... زمانت لاڵ بێ حۆری, ئەتۆ چۆن فكری وا

دەکەیەوە, خوا ئاگادارە, خوا بۆخۆی دەزانێ کە خانەقای چل چاو زیارەتگەی خوێنە, کەسێك گوللەی وێ کەوێ ئەگەر بش مرێ بگاتە ئێرە زیندوو دەبێتەوە, جا چ جای ئەوەی بریندار بێ. تا ئێستا کەس نەیدیوەو نەیبیستوە برینداریك لەم دەرگایە بە مردوویی یان بە ئیفلیجی چووبێتەدەر. دایەحۆری ئەم رەنگە شینە دەبینێ, دەچێتە نێوی و ئاناجیخ سولتانیش ئەگەر هەزار سالیشی تەمەن بێ, قانیع دەکاو دەیباتە ژوور سەری حەمەدۆك. بەسالداچووش بێ گرنگ نیە, پیرانی تەریقەت لەگەڵ چل سوارەی غەیبی تێکەڵن, مەحالە پیرو گردەنشین بن. ئاناجیخ سولتان ئێستا وەك کچێکی هەژدە ساڵە وایە. وەك نەمامی تازە پشکووتوو دەچێ, ئەو دارێکی هەمیشە بەهارە کە هەموو بەیانیەیەك گوڵ دەکاو هەموو بەیانیەیەك دەپشکوێ. هەموو رۆژێ شوورە مێیەکان دێنە لای, رووناکایی بەرەبەیان لەسەر شاخیان و درەوشانەوەی هەتاوی بەیانی لەسەر مووەکانیان... خوشکانی دانیشتووی خانەقایە دەیان دۆشن. هەموو مانگێکیش کەڵەکێوییەك دێت و لەبەردەرکی خانەقایە دەکەوێ, سێ رۆژان مل کەچ دەکاو لە دەرگای خانەقاوە رادەمێنێ و چاوەروان دەبێ. رۆژی سێهەم سەری دەبڕن و کەوڵەکەی وشك دەکەن و دەیبەنە لای ئاناجیخ سولتان و ئەویش کەوڵەکە دەنێرێ بۆ کەسێك لە گۆشەیەکی جیهان کە لە هەموو ناپاکی و دزێوی و زۆرداریەیەك پاك بووبێتەوە, ئەو کەسە دەکرێ ژن یان پیاوێکی لە دنیا بێمنەت بێ.

لەوێ, هەورێکی ئاوساو و پڕ لە رووناکی سێبەری لەسەر خانەقای چل چاو کردوە, کە لەوێ بەولاوە ناچێتە هیچ کوێیەك. بەبن ئەو هەورەدا کۆتری سپی هەڵدەفڕن. لەنێو ئافەریدەکانی خوادا بەختەوەرترین باڵندە ئەم کۆترە سپیانەن.

دەست راگەیشتن بە خانەقای چل چاو و ماچ کردنی شیپانەکەی و بە خزمەت پیرگەیشتن کارێکی هێندە ئاسان نیە. لەمەوبەر لە خانەقای چل چاو چل مەنجەڵ دەکوڵی. ئەو نەخۆش و دەردەدارو بریندارانە کە دەچوونە وێ, تێروپڕیان دەخواردو شیری شووریان دەخواردەوە. شمشێری خانەکانی هەوشار, کورد, تورکمەن, پادشاکانی ئێران و سولتانەکانی عوسمانی, یان خونکار دەدە لە قوونیە, پیری خانەقای چل چاو لە پشتێیان دەبەستن بۆ ئەوەی دوژمن زەفەریان پێ نەبا. زۆر جار خان و پادشاو سولتانەکان کە بۆ شمشێر بەستن دەهاتنە دەرکی ئەم خانەقایە چەند مانگ و چەند ساڵ چاوەڕێ دەمان و سەرەنجامیش بێئەوەی زیارەتی پیریان بۆ بکرێ, دەچوونەوە.

ئەو دەرگایە کە هەمیشە بۆ فەقیرو هەژاران لەسەر پشت بوو, لە خان و پادشاکان داخرابوو.

پیرانی چل چاو، چل چاوی غەیبییان هەبوو. بە یەکێك رۆژئاوایان دەدی و بە یەکێك رۆژهەڵات، بە یەکێك بەهەشتیان دەدی و بەوی دیکە جەهەننەم، یەکێك دەیڕوانیە ئینسانە باشەکان و ئەوی دیکە تەماشای ستەمکارانی دەکرد. یەکێك دەیڕوانیە رابردوو، و یەکی دیکە چاوی لە داهاتوو دەکرد، چاوێك ئاگای لە مێروولەکان دەبوو، چاوێکیش وریای باڵندەکان، چەند چاوێك دەیان روانیە باران، هەور، ئاو، ئاگرو ئەستێرەکان. . .و چاوێکیش تەماشای دڵی ئینسانەکانی دەکرد. لەوەتا ئەو دەرگایە دروست کراوە هەتا ئەمڕۆ دزێوی و حەرام و زوڵم و زۆری پێدا نەچووەتەژوور. ئێستاش کە ئینسانەکان ڕێگایان ون کردوەو دنیا تووشی کاری ناشیرین بووە چوونە ژوور لەو دەرگایە دژوارتر بووەو هێندە ئاسان نیە. ئاناجیخ سوڵتان تەنیا جارێك ئەویش ئەو وەخت کە زۆر جحێڵ بوو، نەیتوانی پێشی خانێکی لاوی جوان چاك بەڵام زۆردار بگرێ و ڕێگای دا بچێتە ژووری خانەقایە، شوورەکان حەوت ساڵان نەهاتنەلای، هەورەکە لە جێی جارانی بزووت و ڕۆیشت. کۆترەکان بەوێ دا نەفڕین و ئاوەکە سەربەرەژوور نەڕۆیشت و گوڵە زەردو شینەکان نەیان توانی شاخە سەخت و ڕەقەکان بشکێنن و بپشکوون.

دایەحۆری دڵەخورپەی بوو. دەترسا ئاناجیخ سوڵتان کە بە چل چاوەکەی خۆی نهێنیی دڵی ئینسانەکانی دەخوێندەوە، نێو دڵی وانی دەدی و دەیزانی کێ چاکەو کێ خەراپ، ڕێگای نەدا بچێتە ژوور. بۆ ئەوەی بزانێ چ گوناهێکی کردوەو چ خەراپەیەك لەوەوە رووی داوە، سەرانسەری ژیانی خۆی هێنایەوە پێش چاو. هێندێك جار هیوادارو خۆشحاڵ دەبوو، هێندێ جاریش ترسی ڕێ دەنیشت. داخوا کردەوە گوناهاوییەکانی پترن یان کردارە باشەکانی؟ هەتا پتری بیر دەکردەوە تای تەرازووی کارە چاکەکانی قورس تر دەبوو. بە جحێڵی وەختێك تازە مێردی بە دورمووش عەلی کردبوو، کاتێك ئەو چووە سەربازی لە ئاشی لەگەڵ یەکێك. . . داخوا ئاناجیخ سوڵتان ئەو ڕووداوە زۆر کۆنەی وەبیر دێتەوەو ڕێگای نادا بچێتە ژووری خانەقایە؟ بیری کردەوە: زۆر لەمەوبەر بوو، زۆر لەمەوبەر، ئاناجیخ سوڵتانیش زۆر پیرە.

رووی کردە ئەو لاوە کە لەلای راستیەوە دەڕۆیشت و لێی پرسی:

"کوڕم ئەتۆ ئاناجیخ سوڵتانت دیوە؟".

لاوەکە وەڵامی دایەوە: بەڵێ دیومە.

"زۆر پیرە؟".

لاوەکە پاش ئەوەی لە سەرتاپای فکری، وەڵامی دایەوە، ئەو زۆر لەتۆ جحێڵترە.

حۆری بەم وەڵامە زۆر تێك چوو. لە حاڵێك دا لێوی خۆی دەگەزی و راوێژی ئەختێك گاڵتەپێکردنی تێدا بوو، گوتی:

"چۆن دەکرێ کوڕم, چۆن دەکرێ؟ مومکین نیە رۆڵەگیان, وەختێك ئەو شمشێری لە پشتی مستەفا کەمالی دەبەست... ئەودەم هێشتا مەسەلەی یۆنان و مۆنانیش رووی نەدابوو, ئەمن کچێکی منداڵ بووم و ئەو ژنێکی وەنێوکەوتوو".

"دایە, ئەو لەتۆ جحێڵتره, گۆیا پیرانی تەریقەت پیر نابن".

"پیر نابن کوڕم, ئا...خ ئەوان پیر نابن".

ئێستا: وەختێك گەیشتنە وێ و بەردەکان قەڵشین و گوڵەشینەکان سەریان وەدەرنا, هەموو شتێك روون دەبێتەوە. نـ...ا, ئەگەر شاخەکان بە جلکی سپیەوە پێشوازیی لـێبکەن و هیچ روونەدا, ئەودەم ئیدی حۆریی چارەڕەش بە تەواوی دۆڕاندوویەو حەمەدۆکی بەدبەختیش...

"کوڕم وەختێك ئەتۆ چووبوویە وێ, ئەو گوڵە شینانەت دین کە شرینگ و هۆڕ شاخەکانیان دەتەقاند؟".

"تەقینی شاخەکانم نەدی, بەڵام گوڵەشینەکانم دیتن. لە قەڵشتی شاخەکان هاتبوونەدەرێ, وەك بەرەیەك بەسەر شاخ و بەردەکان دا پان ببوونەوە".

"ئەمنیش دەتوانم بیان بینم؟".

"بۆچی ناتوانی دایە؟".

"کوڕم ئەتۆ تا ئێستا "زنای محصنە"ت کردوە؟".

لاوەکە بە شێوەیەکی سەیر تەماشای کردو گوتی:

"ئەمن تا ئێستا "زنا"م نەکردوە, هەتا "محصنە"کەیم کردبێ".

"تا ئێستا پیاوت کوشتوە؟".

"نەم کوشتوە".

"لە کەست داوە؟".

لاوەکە بێدەنگ بوو و جوابی نەدایەوە.

دایەحۆری پیلەی پێگرت: لەگەڵ تۆمە, لە هیچ کەست داوە؟

"لێم داوە".

"لە سەگانت داوە؟".

"لێم داون".

"حەیوانێکت کوشتوە؟".

"کوشتوومە".

"ئەی باڵندە؟".

"ئەویشم کوشتوە".

"باشە ئەی چۆن توانیت ئاناجیخ سوڵتانی چل چاو ببینی؟".

"مانای ئەوەیە گوناهکار نەبووم دایەحۆری".

"هـ...م"

دایەحۆری خۆشحاڵ بوو. ئێستا مەسەلەی ئاشەکەی بۆخۆشی باش لەبیر نەمابوو. ئەوان سێ شەو و رۆژان لەو ئاشە چۆڵەدا مابوونەوە, لە ژووری را دەرکەیان لەسەر خۆ داخست و بێ ئەوەی بخەون و بحەسێنەوە خەریکی ئاشقێنی بوون. بەڵام ئەمە کۆن ببوو. دەیەویست ئەو رۆژانەی بێتەوە بیرو یادەکەی زیندوو بکاتەوەو تامەکەی بچێژێتەوە, بەڵام بە هیچ جۆر ئەو خۆشییە لە دەست چووەی لە خۆی دا نەدەدیتەوە. ئەما...ن ئەگەر ئاناجیخ سوڵتان لە جیاتی چل چاو هەزار چاویشی هەبێ, چۆن دەتوانێ ئەو رۆژە دووردوورانە ببینێ؟ ئەو ئاشەش لە بەین چووەو جێیەکەی وەك لەپی دەست تەخت بووە...

بەڵام دایە حۆری هێندێ گوناهی دیکەشی هەبوون... زۆر باشە, داخوا ئاناجیخ سوڵتان بۆ خۆی قەت گوناهی نەکردوە؟ دەکرێ بنیادەم بی, ژن بی و گوناهت نەکردبێ؟ یانی ئەویان بە ئاگر شوتوە, کێ دەزانێ کێ چۆنە, سەرەدەری لـێناکرێ.

ئێستا خەریك بوو بچێتە وێ, لەوانەیە بتوانێ گوڵەشینەکان ببینێ, لەوانەشە پێش ئەوەی بگاتە دەرکی خانەقایە ئاناجیخ سوڵتان دەری کا. ئێستا بزانم چۆن دەبێ. دەبێ نەختێك سەبرکەم, کەمێك ددان بە جەرگی خۆم دا بگرم. قوونێ رەش و سپی لە بوارێ دەردەکەوێ.

سوڵتان مرادیش پادشایەکی ئازاو نەترس بوو. بڕیار دەدا هێرش بکاتە بەغدایە. ئەو لەسەر بڕیاری خۆی بوو کە رۆژێك دایکی مرادی کوڕەکەی خۆی کە پادشا بوو بانگ کردە کن خۆی و پێی گوت: کوڕم مراد, خەریکی دەچیە شەڕێ, دەچیە بەغدا, ئیشەڵڵا سەفەرت بەبەرەکەت و ئاخر خێر دەبێ. دەوڵەتی عوسمانی دەوڵەتێکی گەورەیەو ئەتۆش لەشکرچییەکی زۆرت هەیە. بەڵام بەغداش پاروویەکی هێندە سووك و ئاسان نیە کە بەرەحەتی لە گەرووت بچێتە خوار, ئەوانیش بەهێز و بە توانان. کەوایە لە پێش دا لەسەر رێیەت بچووە چل چاو, دەستووریان لـێوەرگرە و ئەم جار بڕۆ بۆ شەڕ. خانەقای چل چاو ودمی دابێ بە هەر کەس شمشێری تیژبووەو بەختی بەکار. ئامۆژگارییەکەمت لەبیرنەچێ. ئەم راسپاردەیەشت لە بیربێ. ئەتۆ سوڵتانێکی گەورەی, ئەچی لە خۆیابی بی, ئەگەر گەیشتیە بەردەرکی خانەقایە, وەختی نوێژێ چۆن لە

حوزوور خوای خۆت دا رادەوەستی, لەوێش وابکە, وەختێك چوویە ژووری خانەقایە حەوت جار عەرزێ ماچ کە. خانەقا سێ‌دەرگای هەن لە هەرسێکیان دا دوعا بکە... بێینە سەر باسی سولتان مراد, پاش ئەوەی دوعای خێری دایکی وەردەگرێ, دەستی وی ماچ دەکاو دەکەوێتە سەربازکۆکردنەوەو چەند مانگ دواتر دەچێ بۆ شەڕ. بەلام لەبەر پەلەپەل و شاکە شاك هەموو شتێکی لەبیر دەچێتەوە, لەشکر ساز دەکاو هەتـ...ا دیاربەکر دەچێ. ماوەیەکی زۆر لە دیاربەکر دەمێنێتەوەو دەڕوا. لە نێو لەشکرچییەکانیدا بۆلە دەست پێ‌دەکا: ئێمە هاتووینە شەڕی بەغدا یان هاتووین لە دیاربەکر وەمێنین؟ هەموو ئەو مقۆمقۆیانە بە گوێی سولتان دەگەنەوە, بەلام ناتوانێ لە دیاربەکر وەدەرکەوێ. هەروەك شتێکی لەبیرچووبێ. هەمیشە فکر دەکاتەوە, لەگەلێ کەس قسە ناکاو نابێتە هاودەم. هەتا رۆژێکیان لە نەکاو هاوار دەکا:

"خوایە هەزار جار شوکر, وەبیرم هاتەوە" دەسبەجێ فەرماندەری سوپاو وەزیرو وەکیلان بانگ دەکاو دەلێ: بەهەرجۆر بووە پیری خانەقای چل چاو بێننە ئێرە. وەزیرو وەکیلەکان و فەرماندەری سوپا هەموویان دەلێن: مومکین نیە, پیری خانەقای چل چاو لە خانەقای خۆی نایەتەدەرو ناچێتە هیچ کوێ و ناچێتە حوزووری هیچ کەس. سولتانی بابت, باپیرانت, هەموویان دەچوونە لای‌و شمشێریان پێ‌دەبەست. مەلاخونکار لە قوونیە چ شان و شکۆیەکی هەیە, پیری خانەقای چل چاویش هەر ئەو شان و شکۆیەی هەیە. تەنانەت پلەی ئەم هەزار جار لەو بەرزتریشە. بەلام سولتان مراد دەلێ چی؟ فەرمان دەدا: بڕۆن بی‌هێنن, ئەمن چل چاوو هەزار چاوی ناناسم. وەزیرو وەکیلەکان دەکەونە راوو تەگبیر. چەند جاریش دەچنە کن سولتان و لەبەری دەپارێنەوە بەلام سوودی نابێ. بەناچار هەلدەستن و دەچنە خانەقای چل چاو. دەچنە حوزووری پیر, پیر دەلێ: دەزانم بۆچی هاتوون, بە سولتان مراد بلێن ئەو کێیە کە روو لە خانەقایەك وەردەگێڕێ کە باب و باپیرانی سەریان خستوەتە سەر شیپانەکەی؟ وەزیرەکان لەم قسانەو لەو کەرامەتە سەریان سوڕ دەمێنێ‌و دەچنەوە لای سولتان و دەلێن حال و مەسەلە ئاوا بوو. سولتان مراد تووشی تۆفانی رق و تووڕەیی دەبێ‌و دەلێ: بچن پیرە, میرە چیە پێی بلێن ئەمنیش لەشکری دێنمە سەر.

وەختێك وەزیرەکان بە حورمەتەوە لە شیپانەی ئاخرین دەرگادا رادەوەستن, پیر پێ‌دەکەنێـ پیاوێکی زۆر گەنج بووـ و دەلێ:

"بە سولتان مراد بلێن هەرچی لەشکری هەیەتی بی هێنێتە سەرخانەقا, زۆر کەس خۆیان تاقی کردوەتەوە, بەلام هیچ کامیان بە ئاکام نەگەیشتوون".

پادشا رقی هەڵدەستێ و دنیایە وەسەر خۆی دەگێڕێ. سەری لەشکری بەغدایە بۆلای خانەقا وەردەسووڕێنێ. ئەو ڕۆژە تۆفانێك هەڵدەستێ کە تۆفانی نووح لە چاوی وەك بارانەی هاوینێ دەبێ.

دەغیل سولتان... دەستمان بە داوێنت سولتان... لە سولتانی دەپرسی؟ سات بە سات زیاتر تووڕە دەبێ، کە بارانەکە هەر دەبارێ و لێی ناکاتەوە، لە رقان هارتر دەبێ. سەرەنجام ڕۆژێکیان بەیانی باران لێی دەکاتەوە. هۆردووش بۆ لای پیری چل چاو وەڕێ دەکەوێ. کە لە دەشتێکی پان و بەرین تێدەپەڕن چیایەکی مەزن ڕووبەڕووی خۆیان دەبینن بە لووتکەیەکی بڵندو نووك تیژو بە بەفرەوە، کێوێك بە جوانی ئاسکە سرکەکان.

وەزیرەکان خەریك دەبن بڵێن: ئەگەر لەو کێوە تێپەڕین خانەقای چل چاو لەو دیویەوەیە... کە لە نەکاو کێوەکە دەست دەکا بە گرم و هۆڕو لە حاڵێك دا لە زارکی خۆیەوە دەشتەکە ئاورباران دەکا وە جموجۆڵ دەکەوێ. پادشا بە دیتنی ئەم دیمەنە دەکەوێتە سەر خاك و دەڵێ: ئەی پیری چل چاو، ئەمن کردم ئەتۆ نەیکەی. ڕاست لەو وەختەدا کۆترێکی سپیی لەکن دەنیشێ و کاتێك کێوەکە ئارام دەگرێ، کۆترەکەش دەفڕێ و دەڕوا.

پادشا دەڵێ: با لەشکر بگەڕێتەوە دیاربەکر، ئەمن بە تەنیا دەچمە خانەقای چل چاو. خۆی دەگۆڕێ و لەگەڵ فەرماندەری سوپاو چەند وەزیری خۆشەویستی خۆی دەچن بەرەو چل چاو.

وەختێك دەگەنە بن خانەقایە دەنگی قرچە قرچێك وڵاتی دادەگرێ. لە نەکاو چاو هەڵدێنن دەبینن عەرزو عاسمان و دارو بەرد پڕ بووە لە گوڵی شین. پادشا لە ئەسپەکەی دادەبەزێ و لەو ئاوە کە سەربەرەژوور دەڕۆیشت دەزنوێژێ هەڵدەگرێ و دوایە دەکەوێتە خاکوپاو سێ جار زەوی ماچ دەکا. هەتا دەگەنە دەرگای دەرەوەی خانەقایە حەوت جار وا دەکا. کە دەگەنە ئەو دەرگایە، لەخۆوە دەرگا دەکرێتەوەو مراد دەسبەجێ بۆ ڕازو نیاز ڕادەوەستێ، لە شیپانەی دووهەمین و سێهەمین دەرگاش دا ئەو کارە دەکا. لەو کاتەدا پیری خانەقای چل چاو دەڵێ:

"باشە... سولتان مراد هەستە وەرە لەلام دانیشە. با وەزیرەکانت لە دەرێ هەر لەوێ ڕاوەستن".

بەڵێ سولتان مراد نەیتوانی بڵێ: لەگەڵ ئەوەی خۆم گۆڕیوە چۆنت ناسیم و نەشی توانی بڵێ یا شێخ چەند گەنجی، تازە خەتی سمێڵت داوە.

"سولتان مراد فەتحی بەغدات بە نسیب دەبێ، پیرۆزت بێ".

سولتان مراد سوپاسی کردو جارێکی دیکەش عەرزی ماچ کرد.

"تەنیا یەك شتت پێ دەڵێم كە نابێ لێی لا بدەی, ئەمشەو لێرە دەمێنیەوەو سبەینێ زوو وەڕێ دەكەوی. لەو خوارە لە چوكووراوا لە گوندی قەرەبورجلی كوڕە بێوەژنێك هەیە بە ناوی عوسمان, هێشتا سمێڵی بۆر نەبوون. عوسمانی دێنیە نێو لەشكری خۆت.

عوسمان لە تۆ یاغی بووە, لەو چیایانە دەخولێتەوە, لە دەوڵەمەندان دەستێنێ و دەیدا بە هەژاران, دەرمانی دەردی هەژاران و چاری بێچارانە. بەغدا بەدەست زوڵمەوە گرفتارە, فەقیرو هەژار خوێن دەگریەن, ئەگەر عوسمانی نەهێنیە نێو هۆردووی خۆت ناتوانی بەغدایە لە دەست زوڵم و زۆر نەجات بدەی".

پادشا بە تكاو رجاوە دەڵێ:

"ئەمن عوسمانێكی یاغی كە لە چیاو بەندەنان دەخولێتەوە چۆن وەبینم؟ ناكرێ ئەمن نەچم بۆ دیتنەوەی؟".

پیریش دەڵێ:

"ئەتۆ مەچوو, ئەمن دەی‌نێرمە لات"

ئەمجار رادەوەستێ, چاو لە چاوی پادشاوە دەبڕێ. چاوی ئەوەندە بە حوكم بوون كە ئەگەر پادشا چاوی لە چاوی وەرنەگێڕابا, بە تیشكی روانینی پیر چاوەكانی دەسووتان و كوێر دەبوون.

وەزیرەكانیش هاتبوونە حوزووری پیر, لەو بەینەدا شوورێكی شاخ خواری سوور لە چیای ڕا دێتە خوار. پیری چل چاو دەفەرموێ:

"بەشی شێوی ئەمشەوتان هات. بۆ ساغی و سڵامەتیتان لە سەفەری بەغدادا قوربانی‌یەكی باشە, بە لاقی خۆی هاتوە, بۆخۆی داوخوازە. مراد بە دەستی خۆی دەبێ سەری بڕێ".

شوورەكە بۆخۆی لەسەر عەرز رادەكشێ و مراد چەقۆی لەمل دەنێ و سەری لە لەشی جیا دەكاتەوە. تنۆكێك خوێن لە ملی شوورەكە نارژێتە سەر زەوی. شوورەكەی لەسەر ئەو ناورە كە لە نێوەڕاستی حەوشەی دا دایسا دەبرژێنن و دەی‌خۆن. پادشا لەوەتا ببووە سوڵتان لە عومری خۆی دا گۆشتی وا بەتامی كە بۆنی گوڵەكانی كوێستانی لێ‌دەهات, نەخواردبوو.

ئەو شەوە لەوێ لە دەوری ناورەكە لەسەر عەرزی رەق خەوتن. دەت گوت لەسەر دۆشەكی تووكی قوو نووستوون, هەتا ئەو شەوە, قەت خەوی وا خۆشیان لێ نەكەوتبوو.

بەیانی زوو لەگەڵ تاوهەڵات, وەك هەموو رۆژێك شوورەكان هاتن, خوشكانی خانەقا دۆشیانن و لە شیرە گەرمەكەیان دەرخواردی پادشایان دا, هیچ كەسیان خواردنەوەی وایان نەخواردبووەوە كە بەو جۆرە ئینسانی سەرمەست بكاو لە خۆشحاڵی‌یان باڵی پێ بگرێ.

پادشا گوتبووی: ئەی خوای گەورە لە جیاتی ئەوەی سوڵتانی ئەو وڵاتە پان و بەرینە بم، باشتر نیە خزمەتی ئەم خانەقایە بکەم؟ لە حاڵێك دا خوێن دەگریاو دەیگوت قیسمەت و نسیب و چارەنووس ئەمە بوو، وەڕێ کەوت.

دەچنە دیاربەکر، سێ ڕۆژ پێش ئەوەی ئەوان بگەنە دیاربەکر، عوسمان خۆی دەگەیەنێتە دیاربەکر.

وەزیرەکان بە دیتنی عوسمان نێوچاوان تێك دەنێن کە: خاوەن شکۆ، ئەوە منداڵێکە، زۆر گەنجە، ئێمە چۆن دەتوانین کەسێك بێنینە نێو سوپاو لەگەڵ خۆمانی بەرینە بەغدا کە هێشتا شانەی بە سمێڵانەوە بەند نابێ؟

عوسمانیش دەڵێ: شانەیەکم وێ دەن. ئەودەم شانەکە دە گۆشتی لێوی سەرەوەی ڕۆ دەکاو بە پێکەنینەوە دەڵێ:

"دیتان شانەم بە سمێڵانەوە بەند دەبێ". پادشا هەردوو چاوانی ماچ دەکا.

دەگەنە بەغدا. لە نیزیك دەروازەی بەغدا شەڕ دەست پێدەکا. عوسمان لە سوپادا بە گەنج عوسمان (عوسمانی لاو) ناوبانگ پەیدا دەکا.

لە پێش پێشەوەی لەشکر وەك تیری سارده کەوان شەڕی دەکرد. ئەو یەکەم کەس بوو کە لە خەندەکی دەوری شار پەڕیەوەو یەکەم کەس بوو کە دەرگای قەڵاتی بەغدای کردەوە. بە سواری ئەسپی ماندوویی نەناسی خەنەیی، شمشێری دەوەشاند. ڕۆژێکیان لای نیوەڕۆیە ئەو کاتە کە بازاڕی بەغدا لە گڕی هەتاودا نوقم دەبێ و خوێن لە مەیدانی شەڕدا جۆگەلە دەبەستێ، شمشێرێك دێ و سەری گەنج عوسمان دەپەڕێنێ. گەنج عوسمان چ بکا؟ دادێتەوە، سەرەکەی هەڵدەگرێتەوە، بەدەستیەوە دەگرێ و سێ شەوو ڕۆژان بەو حاڵە شەڕ دەکا. دۆست و دوژمن کە ئەویان بەو وەزعەوە دەدی لە ترسان هەڵدەهاتن. سەرەنجام بەغدا دەگیرێ. پادشا سێ ڕۆژان لە بورجی قەڵاتی بەغداوە چاو لە گەنج عوسمان دەکا کە سەری خۆی بەدەستەوەیەو شەڕ دەکا. کە شەڕ تەواو دەبێ. دەڵێ: گەنج عوسمانم بۆ وەبینن و بۆم بێنن، بەڵام نە گەنج عوسمانی دەبیننەوەو نە ئەسپەکەی.

ڕاست لەو جێگایە کە سەری گەنج عوسمانی لێ‌کەوتبوو، گوڵێك ڕوابوو کە هەر ڕۆژەی بە جۆرێك دەپشکووت و بۆنەکەی هەموو جێیەکی دادەگرت. ئەو گوڵە ئێستاش لە نێوەڕاستی بەغدایە هەموو ڕۆژێ لەگەڵ تاوهەڵات دەپشکوێ و هەتا قیامەتێش دەپشکوێ.

کە بەغدا دەگیرێ، گەنج عوسمان سەرە بڕاوەکەی بەدەستەوە دەگرێ و وەڕێ دەکەوێ یەکسەر بۆ خانەقای چل چاو. لەبەر دەرکی خانەقایە لە حاڵێك دا قیت بەسەر ئەسپەکەوە

دادەنیشێ، چاوەڕێ دەبێ... ئاخر خۆ سەری پێوە نابێ تا ئیکلام بکێشێ، لە ناکام دا هەر لەوێ قیت دەمێنێتەوە... لەو بەینەدا پیر لە بەسەرهاتەکە ئاگادار دەبێ، دێتە دەرێ و دەڵێ:

"غەزاکەت پیرۆز بێ گەنج عوسمان، بڕۆ لە ڕێی خۆت، لەمەودوا لەبەر خاتری حورمەت و ئابڕووی تۆ ئەم خانەقایە دەبێتە خانەقای خوێن، برینداری نیوەگیان و تەنانەت برینداری وا کە گیانیشیان دەرچووبێ هەر بگەنە ئێرە، بە ساغی دەڕۆنەوە".

گەنج عوسمان پاش بیستنی ئەم قسانە ڕکێف لە ئەسپی توند دەکاو لە خانەقای چل چاو دەردەپەڕێ، تێکەڵ بە مژی شینی ئەم کێوانە دەبێ و دەڕوا. لەو ڕۆژەوە تا ئێستا ئەسپی خەنەیی گەنج عوسمان لەم چیایانەدا سەرگەردانە.

دایەحۆری لە کوڕە جحێڵەکەی هاوڕێی پرسی:

"ئێرەیە؟ گەیشتینە خانەقای چل چاو؟".

لاوەکە گوتی:

"خەریکین دەگەینێ، ئەو خانووەیە کە سەرەکەی دەبریسکێتەوە".

بەنێو بەردئەستێ سپی و تیژەکانی بەردەڵان دا دەچوونە سەرێ. هەورازێکی کووڕ بوو. ئەسپەکە بەو هەموو تاقەتەی خۆی بەزەحمەت وەسەر دەکەوت. چاوەکانی دایەحۆری وەك چاوی تەیری ڕاوکەر دەورووبەریان دەپشکنی و لەو گوڵە شینە پاییزییانە دەگەڕان کە شاخەکان دەقەڵێشن و سەر وەدەر دەنێن. لێرە ئەو گوڵە شینانە کە بە قرچەقرچ شاخەکان دەقەڵێشن و سەر وەدەر دەنێن، ئەوەندە زۆر بوون کە بەردو دار دەکەوتە بن تەبارەیەك گوڵ.

دایەحۆری بە دەنگێکی خەواڵووەوە لەو لاوە کە لە تەنیشتیەوە دەڕۆیشت پرسیاری کرد:

"ئەو گوڵانە کە بەردەکان دەقەڵێشن و دێنە دەرێ، لە کوێن؟".

"دایە ئەمن گوڵ و موڵی وام نەدیوە".

"چەند ساڵە هاتوچۆی ئێرە دەکەی؟".

"لەوەتا بەبیرم دێ".

"ئەتۆ لەو ماوەیەدا تاقە گوڵێکی شینیشت نەدیوە کە ئەو بەردانە بقەڵێشێ و بێتەدەرێ؟".

لاوەکە ملی بەلاوە نا: نا، نەم دیوە.

دایەحۆری سەرێکی ڕاوەشاندو گوتی:

"پەنا بەخوا، کەوایە قەدیمییەکان درۆیان لەگەڵ کردووین".

لاوەکە بە شلەژاوییەوە گوتی:

"نا دایە، نـ...ا قەدیمییەکان درۆیان نەکردوە. ئەو گوڵانە کە باست کردن تەنیا بنیادەمە باشەکان دەیان بینن. هەر ئێستا ئەم بەردئەستێیانە پڕن لە گوڵی شین، بەڵام ئێمە نایان بینین".

"هم...".

ئاو بە کەف پڕژاندن لە تەنیشت وانەوە بەسەر شاخە نووك تیژەکان دا تێدەپەڕی. ئاو لە حاڵێك دا کەفی بەم لاو لادا دەپڕژاند بە سەرەوژێرەکەدا دەچووە خوار. حۆری خۆشحاڵ بوو، گوتی:

"قسەی تۆیە، راست دەکەی".

روانیە ژوور خانووەکە کە لەو سەرە بوو. چما هەمیشە پەڵە هەورێك لەسەر خانووەکە رانەوەستاوە؟ لەسەر خانووەکە هەورێکی وا دیار نەبوو، بەڵام لەلای چەپی لووتکەی تیژی کێوێك کە کەوتبووە پشتی خانووەکە پەڵە هەورێکی چووکەڵەی سپی دیار بوو کە دەت گوت بە ئاسمانی شینی ساوو بریقەدارەوە نووساوە. دایەحۆری بە دیتنی ویش خۆشحاڵ بوو. لەدڵی خۆی دا گوتی: بەستەزمانە هەوری چووکەڵە هێندە لێرە وێستاوە ماندوو بووە، چووەتە وێ نەختێك بحەسێتەوە.

دایەحۆری روو بەو لاوە کە بە هەناسەبرکە لە تەنیشتیەوە هەورازی دەبڕی، گوتی: ئەو هەورە... بە قامك ئەو هەورە چووکەڵەی نیشان دا کە لەسەر دوندی کێوەکە بوو، ئەمجار لەسەری رۆیشت: هەوری خانەقای چل چاو نیە، بۆچی سەری خۆی هەڵگرتوە چووەتە سەر ئەو کێوە، ماندوویە، زویر بووە؟

لاوەکە بە هانکەهانك لەهەورازی وەسەر دەکەوت، پێکەنی:

"چما هەوریش دەتوانێ زویر بێ دایە؟ هەور لە کێ زویر دەبێ؟".

دایەحۆری بە تووڕەیی گوتی:

"دیارە دەتوانێ زویر بێ، وەختێك دەتوانێ بفڕێ، دەتوانێ رەق لەوێ راوەستێ و نەبزوێ بۆچی ناتوانێ زویر بێ؟".

لاوەکە کە پێکەنیبوو و پێی وانەبوو دایەحۆری ئەوەندە بە پێکەنینەکەی قەڵس دەبێ، بە پەژیوانی لە پێکەنینەکەی گوتی:

"ئەمن چووزانم دایەحۆری، لەوانەشە زویر بووبێ".

حۆری کورت و کرمانجی گوتی: زوێر بووە. جەزبەی ئەم خانەقای چل چاوەش نەیتوانیوە باشی بگرێ. بە قینەوە دەیگوت: خانەقای چل چاویش وا دەبێ؟ ئەمە زوێر بووە چووە لەسەر ئەو لووتکە چیایە ڕاوەستاوە. نە گوڵی زەرد دیارەو نە گوڵی شین کە بەردان دەقەڵێشێ و دێتە دەرێ... ئەدی گومبەزەکە، گومبەزەکە کوا؟ بڕوانە سەربانەکەی، سەربانی ماڵێ عەلیەیە کەچەڵی سوالکەر لەو باشترە...

هەر کە نەختێکی دیکە هەوراز چوون دایەحۆری بە دیتنی سوێسنە شینە پاییزییەکان کە لەنێو کەلێنە شاخ و بەردەکان دا رووابوون و خۆیان پان راکردبوو، خەریك بوو لە خۆشییان باڵ بگرێ و بفڕێ. هاواری کرد:

"دیتمن، کوڕینە دیتمن، بڕواننە ئەو سوێسنە شینانە وەك چیمەن لەسەر زەوی پان بوونەوەو خەوتوون".

ئەو لاوەی چەند لەحزە پێشتر قسەی لەگەڵ حۆری دەکرد، گوتی: دیتمن. لاوەکە ئیدی هیچ قسەی نەدەکرد. سەری بەردابووەوەو بیری دەکردەوە.

"کەوایە لەنێو شاخەکانیش رووان؟".

لاوەکە بە باوەڕێکی تەواوەوە گوتی:

"چما دەکرێ نەڕووابن؟".

لە سەرەوە کاتێك حۆری لەنێو دارە ئەستووری بڵندەکان دا گومبەزەکەی دی زیاتریش خۆشحاڵ بوو و لەسەر ئەو بێباوەڕی و بێئیمانییەی چەند لەحزە لەوەپێشی، لە خۆشی تووڕە بوو:

"ئەم گومبەزە هەموو شەوێ لەگەڵ هەزاران ئەستێرە کە شەوانە لە ئاسمانەوە دەهاتنەخوارو دەورەیان دەگرت، هەتا بەیانی هەڵدەسووڕان و هەڵدەسووڕان، وەنا؟".

لاوەکە بە ترسەوەو بە شێوەیەکی سەیر تەماشای دایەحۆریی کرد:

"بەڵێ هەموو شەوێ لەگەڵ هەزاران ئەستێرە... کە لە ئاسمانەوە دەهاتنەخوار... هەر لەوێ...".

حۆری لە حاڵێك دا ئاماژەی بۆ دەوروبەری گومبەزەکە دەکرد، گوتی:

"ئەستێرەکان تا بەیانی هەڵدەسووڕان و هەڵدەسووڕان. کە رۆژ دەبووەوە دەچوونە نێو ئەم ئاوە، ئاوو ئاسمان و هەموو جێیەکیان رووناك دەکردەوە ت...ا چوکووراوا... لێڕەوارەکان، چیاکان، هەر جێیەك ئاوەکە پێی دا رۆیشتبا، رووناکی دەکردەوەو دەڕۆیشت".

دایەحۆری دیسان رقی هەستابوو, و تووشی گومان ببوو:

"ئەتۆ ئەمانەت نەبیستوە؟".

لاوەکە بە پەلەپەل گوتی: با, با, بیستوومن, بیستوومن".

"دەرۆیشتن و هەموو جێیەکیان, لێرەواریان لەرووناکی دا نوقم دەکرد".

هەتا نیزیك دەرگای خانەقایە وەزعەکە جێی رەزامەندی بوو. هەرچەندی گومبەزەکە, دارەکان, ئەو هەورە کە زوێر ببوو, گوڵەکان و زۆر شت وەك بە فکری دا هاتبوو بەشکۆ نەبوون, بەڵام دیسانیش هەموو شتێك وەك بیری لێ‌کردبووەوە لە جێی خۆی بوو. کەچی هەر کە هاتن و بەرامبەر بە خانووە قورینەکە راوەستان تەواوی ئەو خۆشحاڵی‌یانە لە گەرووی‌دا گیریان کردو هەموو گەش بینی‌یەکانی بوونە رەش بینی. سەگێکی گەڕ لەبەر دەرگای کەوێڵە قورینەکە کەوتبوو, لە حەوشی ماڵێش دا کە وەك حەوشی ماڵە دێهاتی‌یەکان دەچوو, چەند مریشك عەرزیان هەڵدەکۆڵی بۆ ئەوەی دەنکە دانێك بدۆزنەوە. سێ دەروازەکەش ئاسەواریان نەبوو, تەنانەت یەك دەرگاش هەر نەبوو, تاقە گەورەکەی سەردەرانە نیوەی رووخابوو. حۆری لە دڵی خۆی دا گوتی: هەرچۆنێك بێ, دەبێ ئەمە یەکێك لە دەروازەکان بێ. لەنێو وێرانە گەورەکەی لای چەپی ماڵەکە تەپۆلکە پەین و خۆڵ و لەتکە خشت دەهاتنە بەرچاو. پەپولەیەکی شینی گەورەی هێندی باڵندەیەك بە دەوری گوڵێکی شینی لاسك درێژدا کە لەنێو تەپۆلکە خۆڵەکەدا رووابوو, دەخولایەوە. دایەحۆری ئەوەندە پەرت و پەرێشان بوو کە هەستی بە هەڵفڕینی پەپولەکەش نەکرد. لە هەمووی زیاتر ئەو سەگە گڕوی‌یەی بەردەرکی ئەو ماڵە پیرۆزەو مریشکەکانی نێو حەوشەی فکری وی‌یان پەرت کردبوو. چەند لەحزەیەك بە دوودڵی بەسەر ئەسپەکەوە مایەوە: بچمە ژووری؟ بگەڕێمەوە؟ بەسەر ئەسپەکەوە رەق رامابوو. دەرگای خانەقاو تەنیا پەنجەرەیەك کە بە زەحمەت منداڵێکی تێوە دەچوو, داخرابوون. لەو دەوروبەرەش کەس دیار نەبوو.

دایەحۆری بە دەنگێکی کزو بێ‌گیانەوە پرسی: ئێرەیە خانەقای چل چاو؟

"بەڵێ, ئێرەیە...".

دایەحۆری شەکەت و ماندوو, داهاتبووەوە سەر ملی ئەسپەکە هەروەك دڵۆپێك خوێن لە دەمارەکانی‌دا نەبێ هەوساری ئەسپەکەی لەدەست بەر ببوو و هەر لەوێ بەرامبەر بە تاقە تێك رووخاوەکە رەق رامابوو. ئەو دوو لاوەی لەگەڵیشی بوون لە خوارتر لە پەنای بەردی گەورەی تاقی سەردەرانەکە راوەستابوون و سەریان داخستبوو. نە حۆری قسەی

دەکردو نە ئەو دووانە زمانیان دەگەڕا. بێدەنگی‌یەکەیان درێژەی کێشا, هەتا کاتێك دوو لاوەکە بە دەنگی حۆری تێك ڕابوون:

"خەریکە دێ, ئەو هەورە چووکەڵەی لەسەر چیاکە بوو خەریکە دێ".

سەریان هەڵبڕی و دیتیان هەورە چووکەڵەکەی کێوی بەرەولایان دێ.

دایەحۆری دەسبەجێ لە ئەسپەکەی دابەزی. نێوەڕاستی تاقە تێك رووخاوەکەی بەو نیازە کە یەکەمین دەرگای چوونەژوورە, دەست لێداو داهاتەوەو ماچی کرد. دوو لاوەکەش پاش ئەوەی ئەسپەکەیان لە دارێك خست چاویان لەو کرد. دایەحۆری بە سەنگینی و هێمنی دەڕۆیشت. کە گەیشتە نێوەڕاستی حەوشەی لەوێش داهاتەوەو بەردێکی سپیی ماچ کرد. لە دەرگاکەوە کە لێکرابووەوە, تەماشای ژوورێی کرد, تاریك بوو, لاوەکان لەبەر دەرگا راوەستابوون. حۆری بە شەقاوێك لە شیپانە بەردینەکە تێپەڕی. پیاوێکی جحێڵی زۆر کەڵەگەتی موو خورمایی سمێڵشۆڕ کە پانتۆڵێکی قاوەیی رەنگی خوریی دەستچن و گۆرەوی‌یەکی لاسك درێژی لەپێدا بوون, هاتە پێش و گوتی: فەرموو خاتوون, و زۆر بە ئەدەب و حورمەتەوە وەپێشی کەوت. چوونە ژووری هۆدەیەکی گەورە. ئێرە رووناکتر بوو. لە ژووری تەختەبەندی هۆدەکەدا لبادی پڕ نەخش و نیگار راخرابوون. چوونە هۆدەیەکی دیکە, دایەحۆری چاوی بە کوورەخانەیەکی گەورە کەوت کە دەورەکەی بە داری نەخشێندراو رازابووەوە. لەنێو کوورەخانەکەدا چەند کۆلکەداری گەورە گەورەی نیوەسووتاو دەبینران. سێهەمین هۆدە لە دووەکانی دیکە رووناکتر بوو. هەرچوار لای هۆدەکە نیوتەختی لێدانرابوون کە رووپۆشی سپیی بە رەنگی نارنجی گوڵدۆزی‌کراویان بەسەردا درابوو.

لە سووچێکی ئەم هۆدەیەش کوورەخانەیەك هەبوو کە دەوروبەرەکەی بە دارگوێزی نەخشێندراو رازابووەوە. دۆشەکێك لەلای راستی ئەم کوورەخانەیە راخرابوو, لەسەر کەوڵە مەڕێك کە لەسەر ئەو دۆشەکە راخرابوو, ژنێك چوار مەشقی دانیشتبوو کە ئینسان بە یەکەم لێڕوانین دەیزانی دەبێ ئاناجیخ سوڵتان بێ.

دایەحۆری هات و بەرامبەری راوەستا. پاشانیش بێ راوەستان ئەژنۆی راستی داداو ئیکلامی کێشا, دەستی ئاناجیخ سوڵتانێی گرت و ماچی کرد. ئاناجیخ سوڵتان دەستی وی گرت, هەڵی ئەستاندەوەو لەلای راستی خۆی دایئنا. ئەمجار چاوە گەورەو جوان و چیمەنی‌یەکانی ـ کە بڵێسەیەکی ئینیان تێدا دەدرەوشایەوە ـ بۆ لای دایەحۆری وەرگێڕاو بە دەنگێکی پڕ لاواندنەوەو گەرم و خۆمانە گوتی: حۆری خاتوون بەخێر بێی بۆ خانەقای پیرۆزی

چل چاو. بەرەکەتت هێنا. هیچ خەفەت مەخۆ, حەمەدۆکی کورت بەو برینانە نامرێ, چاك دەبێتەوە.

چاوەکانی دایەحۆری درەوشانەوە, رەنگی گۆڕا, نەیزانی دەبێ چ بکا, ویستی قسە بکا نەیتوانی, لەو کاتەدا تەنیا شتی بە دڵی دا هات ئەوەبوو کە دەستی بگرێ. یەك بەیەك دەستەکانی ئاناجیخ سوڵتانێی ماچ کرد.

سەرەنجام توانی پچڕ پچڕ بڵێ:

"ئۆ رەبی حۆری بە قوربانی ئەو کەشف و کەرامەتەت بێ. خوایە حۆری بە قوربانی خاکی بەر پێت بێ".

"سبەینێ بەیانی زوو لەگەڵ تۆ وەرێ دەکەوین. ئەمن هەر ئێستا وەڵام دەنێرم بۆ هۆیەی ساری کەچیلی, وەڵام دەدەمە بەتاڵ ئاغا کە حەمەدۆکی بێننە قزل کارتاللی ئەمنیش برینەکانی دەبینم".

"حۆری بەری پێیانت ماچ دەکا".

ئاناجیخ سوڵتان بێفیز دیار بوو, بە دەستی راستی خۆی بەسپایی دەستی لە شانانی دەدا. دایەحۆری ئیدی بێدەنگ بوو, قسەی نەدەکرد. بە سەرسوڕماوی و بە چاوی فرمێسکاوی دەیڕوانیە پرچی سپی, چەنەگەی ناسك, جووتە چاوێکی کە بڵێسەی خۆشەویستی‌یان تێدا دەدرەوشا, گەردنی وەك ملی قوو, گرێی دەرپەڕیوی قۆرتۆمەو دەم و چاوی نوورانی و خڕی ئاناجیخ سوڵتان.

ئەگەر ئەو لاوەی ماوەیەك لەمەوبەر رێی پێ نیشان دابوو بەکەشەفێکی زێوو قاوەکەیەوە کە هەڵمی لێ‌هەڵدەستاو هۆدەکەی پڕ کردبوو لە بۆن, وەژوور نەکەوتایە, دایەحۆری هەروا وەك کەڕو لاڵان تێیەوە رادەما.

دایەحۆری کە فنجانی قاوەی بەدەستەوە بوو, لە حاڵێك دا دەلەرزی فنجانەکەی لە لێوی نیزیك کردەوەو هەر لەو کاتەش دا چاوی بە ژوورەکەدا گێڕا. لەسەر دیواری بەرامبەر ئاڵایەکی ئاوریشمی سپی و درێژ کە رەنگە سێ باڵ دەبوو, هەڵواسرابوو, لە سەرەوەی ئاڵایەکە لە سووچی لای راست تاجێك بە ئەندازەی دوو لەپە دەست گوڵدۆزی کرابوو, هێندێ نووسراوی درشتی سەوز لە ژێر تاجەکەوە هەتا سووچەکەی دیکەی ئەو ئاڵایە درێژەیان هەبوو, نووسراوەکە بە خەتی عەرەبی بوو. لەلای راستی ئاڵایەکە قورئانێك دەهاتە بەرچاو کە وەك ئاڵتوون دەدرەوشایەوە. بە دیوارەکانی هۆدەکەوە خەتی زێرکفت کراوی زۆر درێژ لە قاپی رەش

دا, ریزه سازێکی سەدەفکاریکراو, دەفەو کەشکۆڵی عاج کاری و زیوکاری و زێڕکاری کراوو تەومرزینی بە ئاڵتوون رووکێش کراو هەڵاوەسرابوون. لە نێوەڕاستی یەکێك لە دیوارەکان دا تەنیا شمشێرێکی جەواهێرنیشان قایم کرابوو. ئەو بەڕانەی تێی دا راخرابوون زۆر لەمێژینە بوون و رەنگەکانیان بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر جوان بوون.

"حۆری خاتوون, حەمەدۆکت دی؟".

"دیتم ئاناجیخ سوڵتان, وەك تەندوور داییسا. هۆشی نەبوو. ئاناجیخ سوڵتان, یاخوا چاوەکانم کوێر بن, ئاناجیخ سوڵتان, سێ جووت گۆرەویم بۆ چنیبوون ئەم توانی بیدەمێ, هەنجیرم بۆ وشك کردبوون, هەناری دەلیجەقۆیاخم بۆ هێنابوون, نەکرا بیدەمێ بیان خوا".

"بەم زووانە دەیدەیەی و دەیان خوا".

دایەحۆری ورده ورده بەسەر خۆی دا زاڵ دەبووەوە, روخساری دەکرایەوەو لەرزینی دەستەکانی ئارام دەبوو. تەنانەت دەیتوانی فکریش بکاتەوە... ئاناجیخ سوڵتان تا ئێستا نە دیبوومی و نە ناومی بیستبوو, چۆنی ناسیم. ناکرێ لە جێیەکی بیستبێ کە ئەمن لەبەر حەمەدۆکی هاتووم, کەس ئاگای لەو مەسەلەیە نەبوو... ئەدی وەختێك ئەمن گەیشتمە بەر دەرگا, چۆن ئەو دەرگایە لەخۆوە کرایەوە؟

ئاناجیخ سوڵتان هەروا زەردەخەنەیەکی ناسك و دڵگری لەسەر لێوان بوو, دەسحێبە نەوەدو نۆ دەنکیـیە رەشەکەی ـ کە دانکەکانیان درێژووکە بوون و بزماری زیڕیان لێدرابوون ـ خڕ کردەوەو لە پەنا خۆی دانان. هەستایە سەرپێ. بە دانیشتنەوە سام و هەیبەتێکی تایبەتیی هەبوو, لە کاتێك دا ژنێکی باریك و ریوەڵە بوو. دایەحۆری لەم دوو حاڵەتیـیە زۆری سەر سوڕمابوو. ئەو لە پێشەوەو دایەحۆری بەدوای دا هاتنە دەرێ, لە دەرێ لەنێو پانتایی گەورەی باغەکەدا هێندێ گلکۆ دەبینران. بەردە قەبرەکان بەردێکی زۆر سەخت و شین بوون. بەردەکان لووس و رێك بوون... بەڵام ئەو بەردە قەبرانە نە نووسراوێکیان لەسەر بوو نە نیشانەیەك. لە قولینچکی رۆژئاوای باغەکە خانوویەکی گەورەی دیکە دیار بوو. لە تەنیشت خانووەکە چەند دارگوێزێك چووبوونە ئاسمان کە لك و پۆپیان خانووەکەی داپۆشیبوو. لە دارە گوێزەکان نیزیك بوونەوە. هێشتا ئەوان نەگەیشتبوونە خانووەکە کە کۆمەڵێك ژن و پیاو لە خانووەکە هاتنەدەرو بەخێراتنی دایەحۆرییان کرد. ئەوان منداڵانی بابە مولایم دەرکەوانی خانەقا بوون. بابە مولایم لە وەختێك دا تەمەنی راست هەشتاونۆساڵ دەبێ, دێتە لای ئاناجیخ سوڵتان و دەڵێ ئەی دایکی چل چاو, ئیزن دەخوازم, ئەمن وەختی رۆیشتنم هاتوە. ئەویش دوعای خێری بۆ دەکاو دەڵێ برۆ بابە مولایم.

بابە مولایم لە کاتێك دا خۆی داوێتە سەر وەکازەکەی روو دەکاتە لووتکەی چیایەکی بەرز. پارەکە لەسەر دوندی چیایەك دیبوویان لە حاڵێك دا ریشە سپی‌یەکەی دەگەیشتە سەر ئەژنۆیان مێگەلە شوورێکی دەلەوەڕاند. ئەو پیاوەی حەفتاوپێنج ساڵی رێك خزمەتی ئەو خانەقایەی کرد. لە جێ دا هەر دەبوو واش بێ. ئەویش وەك یونس پیاوێك بوو کە هیچ خواری و ناراستی‌یەك, تەنانەت داری خواریشی نەبردە ئەو خانەقایە. وەختێك لێیان دەپرسی بۆچی هەموو ئەو دارانەی دەیان بەیە خانەقایە وەك خەدەنگ لووس و راستن؟ بە پێکەنینەوە جوابی دەدایەوە کە دەرکی ئەم خانەقایە داری خواریشی پێدا ناچێتە ژوور.

لە بابە مولایم شەش منداڵ و نەوەیەکی بێ‌ئەندازو ئەم دارگوێزانە کە بە دەستی خۆی ناشتبوونی, بە یادگار بەجێ مابوون. هاتنە بناری کێوی و لەسەر تاتەبەردێکی گەورە راوەستان. خوارەوەی ئەو بەردە هەڵدێرێکی بێ‌ئەندازو سەرسوڕهێنەرو لێڕەوارێك بوو وەك چاڵێکی گەورە. ئەم لێڕەوارە هەتا دەشتەکانی زۆر بەرەخوار بەنێو چیاکانیش دا درێژەی هەبوو. لە بناری و لە دەشتێ وا دەهاتە بەرچاو کە گێژەڵووکەیەك لە تۆزی ئاڵتوون لەسەر ئەو دارە زەردو سوورو شینانە کە رادەژێن هەڵی کردوە, تۆزی زەردو سووری ئاڵتوون بەسەر لێڕەوار وەردەکرێ و بە شکڵی کۆڵەکەی گێژەڵووکە هەتا چیاکانی رووبەڕوو دەڕوا. لێڕەواری پاییز لە حاڵێك دا زۆر بە ئارامی چیاکانی دەبزواند لە ناخەوە دەی‌گرماند.

لەسەر بەردە سپی‌یەکە بەرامبەر یەکتر دانیشتن. ئاناجیخ سوڵتان لە نەکاو لە دایەحۆریی پرسی:

"ئەمڕۆ ئێوارێ چاوەڕوانی شوورەکانی, بەڵێ؟".

دایەحۆری بێ هیچ سەرسوڕمانێك وەڵامی دایەوە: بەڵێ چاوەڕوانم.

"کەوایە شوورەکان دێن, لەبەر دەرگا رادەوەستن, ئێمەش دەچین شیرەکەیان...

بەیانییش کە هەتاو ئەنگووت شوورەکان دەچنەوە سەر چیاکانیان, لەنێو وان دا شوورێکیش لەبەر دەرگا دەمێنێتەوە هەتا بی‌گرین و سەری ببڕین و بی‌خۆین. بەڵێ؟".

دایەحۆری گوتی: بەڵێ دەمێنێتەوەو لە دڵی خۆی دا گوتی: ئاناجیخ سوڵتان ئەم قسانە بۆ دەکا, ئاخر چ شتێکی نائاسایی هەیە کە...

"سەد ساڵ دەبێ شوورەکان نایەنە ئێرە".

دایەحۆری بە قینەوە گوتی:

"نایەن با نەیەن, با هەر نەیەن. یاخوا حۆری بە قوربانی سەگی خانەقاکەشت بێ".

"هەموو ساڵێ لە رۆژێکی بەهاری دا ئەسپی خەنەیی و نەمری کوێرئۆغڵی کە لەگەڵ چل سوارەی غەیبی کەوتوە, لە حاڵێك دا مووەکانی دەبریقانەوەو دەدرەوشانەوە دەهات و لەبەر دەرکی ئەم

خانەقایە رادەوەستا. لەو وەختەوە کە شوورەکان نەهاتن ئەسپەکەش نەهاتەوە. دەڵێن ئەسپی خەنەیی ئێستا لە سووچێکی دنیادا بۆ چاکەو برایەتی و یەکسانی و ئازادی لە شەڕ دایە. دوڵدوڵی حەزرەتی عەلییش لە جێیەك لە پشت کێوی قاف لە شەڕدا بەشدارە. ئەو ئەسپەش سەد ساڵە نایەتە ئەم دەرگایە. گۆیا تەنیا ئەسپی عەرەبیی گەنج عوسمان بە سوارەکەیەوە کە سەری خۆی بە دەستەوەیە لەو لێرەوارەی خوارێ کێو بە کێو دەگەڕێ. ساڵی رابردوو شوانێك ئەسپەکەی لەبەر زارکی ئەشکەوتێك دیبوو. کوڕە جحێڵە سەر بڕاوەکە هێشتا شمشێرەکەی بەدەستەوە ببوو. ئەویش ماوەیەکی زۆرە سەری خانەقایەی نەداوە".

"دایەحۆری بە قوربانی ئەو کەرامەتەت، حەیرانی ئەو زمانە شیرنەت، با نەیەن، رۆژێك ماندوو دەبن و دێنەوە خانەقای خۆیان".

هەتاو ئاوا بوو تاریکایی وەك بەردێکی رەش کەوتە سەر بناری چیاکان. ئەو تۆزە زێڕینە کە دەپرژایە سەر لێرەوار ون بوو. تەنیا لووتکەی کێوەکەی بەرامبەر کە دەت گوت رایەخی زێڕی لێ ڕاخراوە لەنێو ئەو تاریکایییە زاڵەدا دەبریسکایەوەو درەوشانەوەی سەرسوڕهێنەری خۆی پاراستبوو. ئاناجیخ سوڵتان هەر کە هەستا دوندی نووك تیژی نوقمی رووناکایی نیشان داو بە راوێژێکی تێکەڵ بە سکاڵاوە گوتی:

"لەوەی جاران هەبوو، تەنیا ئەمە ماوە. هەموو شتێك تەواو بووە تەنیا لووتکەی ئەم کێوە لەگەڵ ئەوەی دنیا تاریك دادێ تا ماوەیەك هەروا تیشك دەداتەوە. ئیدی دەنگی تەقینی شاخەکان نایە، گوڵەشینەکان سەر وەدەر نانێن و ئاوەکە سەربەرەژوور ناڕوا. ناتوانم بە کەس بسەلمێنم کە کەرامەتی ئەم خانەقایە لەنێو چووە...".

بەرە بەرە دایەحۆری لە دەستی جارز دەبوو. بە تووڕەیی دەستی بۆ لای لووتکەی چیاکە ـ کە وەك کۆیەك ئاگر گڕی لێ هەڵدەستا ـ راداشت:

"ئەدی ئەوە چیە ئاناجیخ سوڵتان؟ حۆری بە قوربانی ئەو چاوە جوانانەت بێ".

"حۆری خانم، تەنیا ئەوەمان بەدەستەوە ماوە. لەم خانەقایە تەنیا ئەوەندە ماوە. داخوا خانەقای چل چاوی بەستەزمان تاقەتی بەم دنیایە دەشکێ کە پڕە لە فیتنەو خەراپە؟".

دایەحۆری بە هەموو ئیمان و باوەڕەوە گوتی: رۆژێك دادێ تاقەتی پێی دەشکێ.

چوونە ژووری خانەقایە. ئاناجیخ سوڵتان ئەوی بردە هۆدەیەکی گەورە. چرا ئەوتییەکی شین لەو چرا قەدیمییانە کە عەمبارەکەیان خڕە، هۆدەکەی رووناك دەکرد. لەو هۆدەیەدا کووپەو تونگەو شووشەی عەنتیکەو رەنگاوڕەنگ بە تەنیشت یەکەوە لەسەر رەفتەکان دانرابوون. ئەو

دەرمانانە کە سبەینێ حەمەدۆکیان نەجات دەدا لەنێو ئەم دەفرانەدا بوون. هەزار ساڵی ڕێك دەبوو کە لەم خانەقایەدا ئەو جۆرە دەرمانانە ساز دەکران. هەزار ساڵە کە گوڵ و گیای دەرمانی بووغالار, ئالاداغ, دولدوڵ داغی, ئەرەسیەش, چوکووراواو بیابانەکان دێننە ئەم خانەقایەو هەزار ساڵە کە لە خانەقادا شیلەی ئەم گوڵ و گیایانە دەگرن.

"ڕەبی حۆری بە قوربانی کەرامەتەکانت بێ".

ئاناجیخ سولتان دەستی خستە سەر شانی و گوتی:

"حۆری خاتوون, حۆری خاتوون. نە ئەمن و نە ئەم خانەقایە هیچمان خاوەن کەرامەت نیین. کەرامەت لە خاك و دارو ئاو و ئینسان و جانەوەرو باڵندەکان دایە... باش تەماشای ئەوانە کە...

شووشەیەکی سووری تاریکی لەسەر ڕەفتەکەی رووبەڕووی هەڵگرت, سەرەکەی هەڵپچڕی و بۆنی پێوە کرد. بۆنێکی خۆش دەژوورەکە گەڕا کە تا ئەودەم هەرگیز بەبەر لووتی دایەحۆری هەڵلا نەهاتبوو, بۆنێك بوو کە کاری دەکردە سەر ناخی هەناوی بنیادەم.

هەموو کەرامەتەکان هی ئەمەن. چل ساڵە ئەمن تێگەیشتووم کە کەرامەت لەخاك و ئینسانەتی دایە".

شووشەکەی لە جێی خۆی دانایەوەو لە هۆدەکە چوونە دەرێ. چوونە سەر ئاوێکی زۆر کە بەوێ دا دەڕۆیشت, دەزنوێژیان هەڵگرت. ئاوەکە کەفاوی بوو و ڕووناکایی شاخە سپیەکان لەسەر ئاو و لەسەر شەو... بۆنێکی خۆشی بە هەوادا بلاو دەکردەوە کە بنیادەمی مەست دەکرد. لە ژووورە گەورەکەی ئاناجیخ سولتان, لەسەر بەرماڵی کەوڵەشوور نوێژی خۆیان کرد.

مدبەقێکی گەورە بوو بە ریزە ئاورگێکی زۆر دووکەلاوییەوە. مەنجەڵی گەورە گەورە لەسەر ئاورگەکان بوون, هەمووان سەریان لەسەر دانرابوو. یەکێك لە ئاگردانەکان داییسا. ئاناجیخ سولتان گوتی:

"حۆری خانم شیربرنجت بۆ لێنێم؟".

دایەحۆری لەسەر سەکۆیەك دانیشت و چاوی لە شیربرنج لێنانی ئاناجیخ سولتان کرد. دەستەکانی چەند کارامە بوون, داخوا ئاناجیخ سولتان مێردی کردبوو؟ کێ دەزانێ بە جحێڵی چەند ژنێکی جوان بووە. تەنانەت ئێستاش لە روخساری ناسك و جوانی دا, دڵی بنیادەم بە پێکەنینە شیرنەکانی خەنی دەبێ. لەمێژ ساڵ بوو, لەو کاتەوە کە پیرانی خانەقای چل چاو چوونە شەڕو نەهاتنەوە ئاناجیخ سولتان لەم مدبەقەدا گوڵە کێوییەکانی دەکوڵاندو

شیلەکەیانی دەگرت, ئەویش بە دەستی خۆی, تەنیا هاوکاری و یاریدەی تاقە کەسێکی قبووڵ بوو, ئەویش بابە مولایم بوو... بەڵام تەنانەت منداڵ و نەوەو ژن و بووکەکانی ویش تا ئێستا رەنگی ئەم مدبەقەیان نەدیوە. بابە مولایمیش چوو, بوو بە شوانی شوورەکان...

ئاناجیخ سوڵتان تا ئەمڕۆ بۆ خزمەتەکانی, بۆ وەستایی‌یەکەی لە بەکارهێنانی ئامرازی تیژی نەشتەرگەری‌دا کە لە کۆنەوە هەروا بریقەدارو خاوێن مابوونەوەو بۆ هەوڵ و تەقەللاکەی لە پێناوی نەجاتی گیانی ئینسانەکان دا هەقدەستی لە هیچ کەس وەرنەگرتبوو. تەنانەت ئەگەر مردووشی زیندوو کردبایەوە, دیسان بە دابی خانەقا هیچی لە بەرامبەر دا وەرنەدەگرت. ئاناجیخ سوڵتان کە لە سەرانسەری تەمەنی دا لە برنج بەشیر بەولاوە هیچی نەخواردوە, لەمێژ ساڵە دراوێکی لەکەس وەرنەگرتوە. ئەو کەسانەی ئەمەیان دەزانی بە دزیەوە دە قرۆشیان داویشتە نێو کلۆرایی قەدی دارە گوێزێك کە لەو خوارە بوو, بۆ ئەوەی ئاناجیخ سوڵتان کەمێك برنج بەشیر بۆخۆی پەیدا بکاو بنەماڵەی بابە مولایم لەسەر ئەو چیایە برسی نەبن. ئەو پارەیە ژیانی وانی دابین دەکردو تەنانەت لێشیان زیاد بوو. لە سەد ساڵ لەمەوبەرەوە کە شوورەکان نەدەهاتنە خانەقا, ئەوان بۆ پیاڵە برنج بە شیرێکیش تووشی دەست تەنگی هاتبوون.

ئاناجیخ سوڵتان, جوانی جوانان بێ‌ئەوەی دەستی پیاوی وێ کەوتبێ بۆ درێژەدان بە ژیانی ئەم خانەقایە ئەم سەرچیایەی کردە جێ و مەکانی خۆی. شوورەکان نەچوونە لای, ئەسپی خەنەیی کوێرئۆغلی, دولدولی حەزرەتی عەلی و ئەسپی عەرەبیی گەنج عوسمان سەریان لێ‌نەدا, شاخەکان نەقەڵشین و گوڵە شینەکان نەپشکوتن, بەڵام ئەو مەردانە راوەستاو خانەقای بەجێ نەهێشت.

چێشتەکەیان لە دەوریی مس کردو چوونە هۆدە گەورەکە. سفرەیەکی جاجم لە نێوەڕاستی ژوورەکەدا هەروا راخرابوو, لەنێوەڕاستی سفرەکەدا کەمێك نانی تەندووریێ لوول درابوو. بێ‌ئەوەی قسە بکەن چێشتەکەیان خواردو دیسان بێ‌قسەکردن هەتا نوێژی خەوتنان لە پەنای یەکتر دانیشتن.

لە چەندین ساڵ لەمەوبەرەوە هەموو رۆژێ ئێواران وەختی خۆرئاوابوون هەر کەدوندی چیایەکەی رووبەڕوو لە رووناکی دا نوقم دەبوو باڵندەیەکی بەقەد هەڵۆ بە پەڕی سەوزو دەندووکی قولاپیی وەك دەندووکی شەهێنەوە, بە چاوێکی وەك بلووری سوورەوە دەهات و لەسەر لووتکی شاخە سپی‌یەکەی رووبەڕووی دەرگا هەڵدەنیشت و لەگەڵ کازیوەی بەیانی هەڵدەفڕی و بە باڵە درێژەکانیەوە سێ جار بە دەوری بانی خانەقایەدا دەسووڕاو پاشان بەرەو لووتکەی چیا شینەکەی ئەوبەر بڵند دەبوو.

نوێژیان کرد. لە ژوورەکەی دیکە جێ راخرابوو. ئاناجیخ سولّتان هەتا ژوورەکە لەگەڵ دایەحۆری چوو و پاش ئەوەی شەوێکی خۆشی بۆ بە ئاوات خواست بەجێی هێشت.

بەیانی کە وەخەبەر هات هەستی دەکرد وەك پووشکە کایەك قالب سووك بووە, بە جۆرێك هەستی بە ساغی و بەدەماغی دەکرد, دەت گوت تازە لەدایك بووە. دەسبەجێ لە جێی هاتەدەرو خۆی پۆشتە کردەوە. پشتێنی بەست و یەکسەر چووە ژووری ئاناجیخ سولّتان, لەوێ کچۆڵەیەك بەمەسینەو خاولی و لەگەن و سابوونەوە چاوەڕێی بوو. کچەکە ئاوی لە دەستی کردو دایەحۆری دەست و چاوی شوتن. ئاناجیخ سولّتان لەسەر کەوڵەکەی پەنا کوورەخانەکە دانیشتبوو, چاوی لەسەریەك دانابوون, لەسەرەخۆ دەسحێبی دەگێڕان و لەبن لێوانەوە دوعای دەخوێندن.

هەر کە دایەحۆری دەست و چاوی شوتن, ئاناجیخ سولّتان چاوی هەڵێنان, دەسحێبەکانی لە پەنا خۆی دانان و گوتی:

"ئەم بەیانییە بڕوێش بەشیرم بۆ لـێ‌ناوی".

لەسەر سفرەیەك کە لەنێوەڕاستی ژوورەکە راخرابوو, شۆرباو لەنێو دەورییە مسەکان دا هەڵمی لـێ‌هەڵدەستا. دەسبەجێ دانیشتن. وەختێك قاوڵتی تەواو بوو ئاناجیخ سولّتان هەستایە سەر پێ و گوتی:

"دەرمانی ڕێیە رۆیشتنە".

چووە ئەو ژوورە کە دوێ شەوێ دایەحۆری دیتبووی و پڕ بوو لە شووشەی جۆراوجۆر. دایەحۆرییش بە دوای دا چوو. ئاناجیخ سولّتان چوو دەرگای سندووقێکی دارگوێزی کردەوە کە گوڵی زەقی لەسەر هەڵکەندرابوون. لاولاوەی دەرگای سندووقەکە لە وەختی کردنەوەدا جیڕەی هات. ئاناجیخ سولّتان کیسەیەکی مەخمەری سەوزی لەنێو سندووقەکە دەرهێنا. هێندێك جێی کیسەکە رزیبوون و تووکەکەیان وەریبوو. زارکی کیسە بە پزووەکەی کردەوەو پاش ئەوەی چەند مەقەست و چەقووی ئاسك و بریقەدار, ریزە ئامرازێکی ئاسك و تیژ کە هێندەی کاریان پێ بکرێ سوابوون و بریسکەیان دەداو زەڕەبینێکی گەورە کە لە کیسەکەی دەرهێنابوون, هەموویانی بەسەر کردنەوە, سەرلەنوێ لە توورەکەکەی هاویشتنەوەو بەن پزووەکەی توند کێشاو بەستی. پاشانیش سندووقەڵەیەکی لەسەر تاقەیەك هەڵگرت. سندووقەڵەکە کۆمەڵێك شووشەی گەورەو چووك بە رەنگی جۆراوجۆر, قوتووە بۆیاخ و تونگەی چووکەڵەی تێدا بوون.

ئەم ژوورە ئەوەندەی بۆنی هەزارو یەك گوڵی کوێستان لـێ‌دەهات کە حۆری لەگەڵ وەژوورکەوتن تووشی جۆرە بە بۆن کەوتنێك هات.

ئاناجیخ سولّتان دەچوو بۆ چاك کردنەوەی حەمەدۆك, گومانی تێدا نەبوو کە چاکی دەکردەوە.

دایەحۆری داخوازێکی دیکەشی لێی هەبوو, بەڵام لە رووی نەدەهات. بۆنی دەرمانەکانی ئەو ژووره غیرەتی وەبەر نا. بە دەنگێکی لەرزۆك و روخسارێکی مەیلەو زەردەوە گوتی: تکایەکی دیکەشم لێت هەیە, درێخیم لێ مەکە. رەبی خوا باڵایەت بدا... لەم ژووره پیرۆزەدا نیازی خۆمت لێداوا دەکەم...

"فەرموو خانم".

"تەلەسمێك بدە بە حەمەدۆك کە گوللە کاری لێنەکا, ئەم حاجەتەم بەجێ بگەیەنە".

ئاناجیخ سوڵتان جوابی ئەم داخوازەی نەدایەوەو گوتی:

"یاڵڵا با برۆین".

بۆخۆی لە پێشەوە وەرێ کەوت و چووە حەوشەی. دایەحۆریش بەخەمباری وەدوای کەوت. کاری سەراوێی هەبوو, لە دوێنێ شەوێوە تا ئێستا کاری سەراوێی هەبوو, خەریك بوو بتەقێ, بەڵام بەو هەموو نارەحەتیـیە توندەوە بیری دەکردەوە دەست بە ئاو گەیاندن لەم شوێنە پیرۆزە بێحورمەتیـیەکی گەورە دەبێ. لە دەرێ ئەو دوو لاوەی لەگەڵی بوون و هەروەها ئەو پیاوە کەڵەگەتەی پێشوازیی لێکردبوو, هەوساری ئەسپەکانیان بە دەستەوە بوو و چاوەڕوان بوون.

لەبەر دەرگا لاوەکان کە چاویان بەوان کەوت بە حورمەتەوە خۆیان رێك و پێك کردو بەغار چوونە پێش و بەرامبەر بە ئاناجیخ سوڵتان ئەژنۆی راستیان لە عەرزی داو ئیکلامیان کێشا, ئاناجیخ سوڵتان دەستی گرتن و راستی کردنەوە. پیاوە کەڵەگەتەکە خورجێنێکی مافوورەی بەدەستەوە بوو. لەبەر دەرگا ئەو کەڵوپەلانەی بە دەست ئاناجیخ سوڵتانەوە بوون لێی وەرگرتن و لە خورجێنەکەی هاویشتن.

بە سواری ئەسپ لە سەرەوژێری چوونەخوار. ئاسۆ رووناك ببوو کە گەیشتنە چوارڕێیانێك. جاران ئەم شەقامە ڕێیانە کاروانیان پێدا دەهات. رێگایەك لە جنووبەوە دەچوو بۆ شیمال و یەکیش لە رۆژهەڵاتەوە بەرەو رۆژئاوا دەڕۆیشت, ئەم دوو شەقامە لەم نوختەیەدا یەکتریان لەت دەکرد. هیچ وەخت هیچ سەرقافڵەیەك پێش ئەوەی بچێتە خانەقاو سەر وە شیپانەکەی بکا لەم چوارڕێیانە تێنەدەپەڕی. ئەگەر کەسێك بێئەوەی بچێتە خانەقا سەفەری خۆی درێژە پێدابایە, بەڵای وای بەسەر دەهاتن مەپرسە...

دایەحۆری هاواری کرد: راوەستن. هەر کە ئەو دوو لاوەی لەگەڵ ئەسپەکەی وی دەڕۆیشتن, راوەستان دایەحۆری خۆی فڕێ دایە خوارو غاری دایە نێو لێڕەوار, دارێکی کردە لەمپەرو دەسبەجێ دەرپێیەکەی داکێشاو هەر لەوێ لەسەر گیاشینکەی هەڵنیشت.

ئاناجیخ سولتان لەنێوەڕاستی ڕێگادا چاوەڕێی بوو. پاش ماوەیەك دایەحۆری لە حاڵێك دا سەری بەردابووەوەو دۆخینەکەی توند دەکردەوە لە دارستان هاتەدەر. ئاناجیخ سولتان هەموو شتێك حاڵی ببوو. دەیزانی کە زۆر کەس ناتوانن لە خانەقای چل چاو خۆیان سووك کەن... بە زەردەخەنەیەکی شیرن و گاڵتەکردنەوە بەدەم دایەحۆرییەوە پێدەکەنی. پێکەنینی ئاناجیخ سولتان لەو کاتەدا کە دایەحۆری خەریك بوو سوار بێتەوە, غیرەتی وەبەر نا. رقی هەستابوو, بە راوێژێکی توندەوە گوتی:

ئاناجیخ سولتان ئەمەت لەمن وەچاو نەبێ, جادوویەك بکە کە گوللە کار لە حەمەدۆکی کوڕم نەکا. بەردە بریسکەش کاری نەکرد, کوڕەکەم خەریك بوو بمرێ".

ئاناجیخ سولتان گوتی:

"ئەمن جادوو نازانم, بریا زانیبام".

"چۆن دەکرێ نەزانی ئاناجیخ سولتان؟ فریوم دەدەی؟ ئەتۆ پیری خانەقای چل چاو بی... وەختێك گەیشتینە جێگاش کوڕەکەم نەجات بدەی, چۆن...".

لە کاتێك دا دەستی بۆ خورجێنەکە رادەداشت گوتی: ئەدی ئەوانە چین؟

ئاناجیخ سولتان بە سەنگینی و دڵنیایییەوە گوتی:

"هەزاران ساڵە لەو چیایانە ئەوانە خڕ دەکەنەوە. ئەمن چەندین ساڵە دەیان کوڵێنم و شیلەکەیان دەگرم, لە چەندین ساڵ لەمەوبەرەوە تا ئێستا لەنێو خەڵکی دا دەیان بەشمەوە, بڕوانە هۆوێ ـ لە کاتێك دا قامکی بۆ لای چیا رادەداشت ـ هەموو شتێك لەوێیە, هەموو شتێك لە گوڵ و گیادایە. تەلەسم و جادوو لەنێو ئەو نووره دایە کە چۆر چۆر هەڵدەڕژێ, لێم ببووره خوشکێ ئەو جۆرە کەرامەتانە لە دەست من نایەن. خاوەن کەرامەت ئەم خاکمیە کە هەمیشە بەرهەم دێنێ.

## (١٥)

تاژی تەحسین بە دزی و بە پاراستنی ئەوپەڕی نهێنیکاری کێو و لێڕەوارەکانی بڕین و خۆی گەیاندەوە گوندی گەڵی شکۆفەو لەبەر زارکی ئەشکەوتێك کە لە پشت ئاوەدانی بوو دانیشت. هەموو گیانی ترس بوو. موڕتەزاغا کە لە خۆشییان ئەو هەموو دراوەی دابوو بەو کە ئێستا لەگیرفانیدا بوو، بێگومان دوایە پەژیوان بووەتەوەو ماوەیەکە ژمارەیەك سواری وەدوا خستوون. چاك بوو بە شەقامەڕێیەدا نەهات. ئەگەر بە شەقامەڕێیەدا هاتبایە، هەرچەندیش توندو خێرا غاری دابایە سوارەکان هەر دەیان گرتەوەو پارەکەیان لێدەستاندەوە، ڕێی تێنەدەچوو کەسێك بۆ هێنانی خەبەری کوژرانی حەمەدۆك ئەو هەموو پوولە بدا بە یەکێك...

تاژی تەحسین لەبەر زارکی ئەشکەوتێ دانیشتبوو، نەیدەوێرا بچێتەوە نێو ئاوەدانی. لە برسان خەریك بوو بمرێ. ڕیخۆڵە گەورەی ڕیخۆڵەی چووکەی دەخوارد. چما دەیوێرا بچێتەوە نێو دێ؟ ئێستا تاوێکە پیاوەکانی موڕتەزاغا گەیشتوونە ئاوایی. هەر ئێستا بە پازدە جەندرمەوە چوونە ماڵێ موختاری بێدین و خوێنخۆرو لەوێ دانیشتوون و چاوەڕوانی وین. ئاخر کێ بۆ مزگێنییەك پارەی کڕینی کێڵگەیەك دەدا بە کەسێك؟ جەندرمەکان بە تاوانی ئەوە کە پووڵی موڕتەزاغای هەڵگرتوەو رای کردوە لەبن دارو کوتەك دا رایدەخەن و لەماڵێ موڕتەزاغا ئەوەندەی لێدەدەن خوێن بمیزێ. خوا هیچ گیان لەبەرێك نەخاتە بەردەستی عەلی کەرتیش پاشا. سەرجووخە عەلی کەرتیش وەختێك دێهاتییەکانی لە جێیەکی چۆڵ بۆ هەڵدەکەون بەلایەکیان بەسەر دێنێ کە هاوار دەکەن: ئەمان ژەنراڵ سەرجووخە عەلی، ژەنراڵ سەرجووخە عەلی. تاژی تەحسین ئەگەر لە برسان بمرێ، لەبەر زارکی ئەم ئەشکەوتە بنێژرێ و ئێسکە سپییەکانی لێرە بدۆزنەوە، دیسان پێ لەنێو ئاوایی نانێ... ئا...خ دایکیشی هەرگیز لە

ماڵێ ناچێتەدەر... بریا رێی لـێ ون بایەو بەم دەوروبەرەدا رابردبا, ئەودەم چ نان ساجێیەکی گەرمی بۆ دێنا... کەسیش نەیدەدی و نەیدەزانی. ئێستا نێو دێ شێواوە. هەموو کەس و پێش هەمووان موختار دەڵێن تاژی ئەو هەموو پووڵەی هەیە؟ و بە چوار چاوان چاوەرێن پێ لە نێو دێی نێ. تەنانەت خەبەریان بە مەحموودئاغاش داوە.

ئەو شەوە لە ئەشکەوتێ دا نووست, دیارە بە ترس و لەرزەوە. ئەشکەوت پڕ بوو لە شەمشەمەکوێرە, ئەویش ئەو شەمشەمەکوێرانە کە هەم گەورە بوون هەم خوێنخۆر. گۆیا ئەو شەمشەمەکوێرانە دەنووک لە رەگی بنیادەم رۆدەکەن و هەتا هەموو خوێنی دەمارەکانی نەمژن بەرەڵلای ناکەن.

وەختی نووستنێ لەسەر پارەکەی دەخەوت. با شەمشەمەکوێرەکانیش خوێنی بمژن, بەڵام دەست لە پووڵەکەی نەدەن. بەم دراوە چەند شت دەکڕێ. دوو جووت گای سووری شاخ کەوانی, نێرو ئامووریێك, چوار مانگای دۆی, مەڕ. بزن و ئەسپێکی رەش کوێت. ئەو ئەسپی رەش کوێتی پێ جوان بوو. ئەسپە کوێتەکەش دەبوو کوێتێکی نێوچاوان قەشان بێ. کڵاو گەڕگەڕییەکیش راست وەك کڵاوی عەلییەشەل, پاشانیش چاکەت و پانتۆڵێك لە چاکەت و پانتۆڵەکەی عەلییەشەل, ئەمجار جووتێك قۆندەرەی سووری وەك پۆلـێ سوور. قەراخی کەوشەکەش دەبێ خەتێکی زەردی پێدا هاتبێ...

جا لێی سواری ئەسپ دەبێ و لە بەیانییەوە تا ئێوارێ بە نێو دێی دا دێت و دەچێ. کڵاو گەڕگەڕییەکەشی بە لایەکی سەریەوە دەنێ... ئا...خ خەریك بوو لەبیری بچێتەوە, دیارە ئەمەش لە ترسان بوو. ئاخر تاژی تەحسین لە تفەنگ و دەمانچە, تەنانەت خەنجەرو هەرچی خوێنی پێ برژێ زراوی چووبوو. فیلینتایەکی ئەڵمانییش دەشانی دەکا, دیارە تفەنگێکی بەتاڵ. چما شێت بووە فیشەك بخاتە عەمباری فیلینتایەکەیەوە؟ ئەو تەنانەت لە تفەنگی بەتاڵیش دەترسا, بەڵام زۆر زۆر نا.

بەرە بەری بەیانی کەمێك نووست, وەختێك وەخەبەر هات, دیتی غوولێك لە ژوور سەری راوەستاوە, بە نارەتەکێشان لە ئەشکەوتێ دەرپەڕی و لووت و بزووت لەگەڵ وەلییەشوان تێك هەڵئەنگووت. ئەوی نەناسی و دووبارە گەڕایەوە نێو ئەشکەوتێ. غوولەکە هێشتا لەنێو ئەشکەوتێ بوو. ماوەیەك هەروا لە ئەشکەوتێ بۆ دەرێ و لە دەرێ بۆ ئەشکەوتێ لە هاتوچۆدا بوو. سەرەنجام وەختێك باش سەرنجی وەلیی دا بە سەربەرگی شوانییەکەی را ناسیەوە: وەلی...

وەلی گوتی: چیە, چت لـێهاتوە؟

"لەو ژوورە...".

"سەگەکەی من لەو ژوورەیە، ئەتۆی ناسی بۆیە نەوەڕی، ئەمنیش تاوێك پێش ئێستا بێرەدا تێدەپەڕیم، لەنێو ئەشکەوتێ گوێم لە دەنگی ناڵەناڵ بوو، ترسام و نەچوومە ژوورێ، سەگەکەم نارد".

تاژی تەحسین ئەژنۆی شل بوون و لەسەر زەوی دانیشت. ماوەیەك لە حاڵێك دا قەوەزەی سنگی هەڵدەستاو دەپووکایەوە، هەروا رەق راما.

"چ بووە تەحسین، چیە، بڵێ بزانم چ بووە؟".

تەحسین لە کاتێك دا لە برسان خەریك بوو گیانی دەرچێ گوتی:

"جەندرمەکان... پیاوەکانی مورتەزاغا... خەبەریان بە مەحموودئاغاش داوە. وەختێك منی دەست کەوێ هەموو ئێسکی لەشم دەشکێنێ".

ئەم جار لە سیرێ هەتا پیوازێ هەموو مەسەلەکەی بۆ وەلی گێڕایەوەو لە ئاخری دا گوتی:

"باش بزانە ئەگەر ئەوەی پێم گوتی بە کەس، تەنانەت بە یەك کەس، تەنانەت بەدایك و بابیشتی بڵێی دەت خنکێنم و دەت کوژم".

وەلی شازدە ساڵ دەبوو، بگرە کەمتریش، دەم و چاوی خڕو گۆشتنی بە بیستنی ئەم بەسەرهاتە وەك چەوەندەری کوڵیو سوور هەڵگەڕابوون.

"کاك تەحسین، ئەمن ئەمانە بە کەس ناڵێم، چما ئەمن مەحموود ئاغای ناناسم؟ پارە بە دەستی هەرکەسەوە ببینێ لێی دەستێنێ، خۆزگە لە کۆڵیشی بایەوە، پاشانیش هەموو ئێسکی بنیادەم تێك دەشکێنێ. مەحموود ئاغا بەرەو ئاوایی دەهات، کەوایە بۆ ئەمە بووە".

"سوێند دەخۆی بە کەس نەڵێی؟".

"سوێند بە چی بخۆم؟".

"بە سەری دایکت".

"ئەمن هەرگیز سوێند بە سەری دایکم ناخۆم، سوێند بخۆم و دوایەش دایکم بمرێ...".

"کەوایە دەچی بە خەلکی دەڵێی".

"ناتوانم سوێند بە سەری دایکم بخۆم".

"دەبێ بخۆی، سوێندێ نەخۆی ئەلێرەت دەکوژم، دەت کوژم و لێدەدەم دەڕۆم... کێ دەزانێ...".

"بم کوژە بەڵام ناچارم مەکە سوێند بەسەری دایکم بخۆم، بەستەزمانە دەمرێ. بە هەرچی دیکە بڵێی سوێندت بۆ دەخۆم".

تاڙی تەحسین پێی داگرت, ئەویش دەیگوت بشم کوڕی سوێند بە گیانی دایکم ناخۆم. ئەوەندەیان کێشە کرد هەردووکیان ماندوو بوون و دەنگیان گیرا, هەر یەکەی کەوتنە لایەك. دەنگیان ئیدی وەك لیکاو شل بوو.

تاڙی تەحسین بە دەنگێك کە بە حاڵ و باڵ دەبیسترا گوتی:

"مەڕۆ نانم بدەیە, نەختێکیش شیر بدۆشە".

وەلی نانی دایە, هەر نانەکەی دایەو چووە نێو بزنەگەل و سەرەوژێر تێی تەقاند بۆ نێو ئاوەدانی.

تاڙی تەحسین ئەوەندەی برسی بوو هەر بە فکریشیدا نەهات وەدوای کەوێ و بیگرێ. دەیزانی وەلی چ هەنگامەیەك لەنێو دێ دا وەڕێ دەخا. هەوڵی دەدا چەندی بکرێ زووتر نانەکەی بخواو لێبێتەوە. سەرەنجام خۆی پێ ڕانەگیرا. دەسرۆکە نانەکەی هەڵگرت و چووە نێو لێڕەوار بۆ سەر کانی. تینووی بوو. لێوی بە بەردی سپیی کانییەکەوە ـ کە هێندە سوابوو, وەك کەللا لووس و ڕێك ببوو ـ ناو بە ئیشتیاوە لەو کانییە کە بۆنی پنگی گرتبوو ئاوی خواردەوە.

پاروویەکی لە نانی وەلی دەخواردو دادەهاتەوە سەر کانییەکەو قومێك ئاوی دەخواردەوە. پاش ئەوەی ورتکەنانی نێو دەسرۆکەکەشی خوارد هەستایە سەرپێ. لە سەرەوە جێگای قایتری لێ بوون. لەنێو چیمەنێکی چووکەڵەدا تاتەبەردێکی لووس و درێژ هەبوو. دەبوو بچێتە وێ. کە هەستا سەری سووڕاو چاوی دەرەشەوە هاتن,, خەریك بوو بکەوێ دەستی دە لکەدارێك گرت, لکەکە ڕاینەگرت و کەوت. هەر کەوتە عەرزی و خەوی لێکەوت, خەوێکی قورسی لێکەوت.

هەموو خەڵکی گوندی گەڵی شکۆفە لە دەوڵەمەند بوونی تاڙی تەحسین کە خەبەری مەرگی حەمەدۆکی بردبووە شارۆچکەو مژدانەی لە خان و ئاغاکان وەرگرتبوو ئاگادار بوون و هەروەها خەبەریان زانی کە مەحموود ئاغا بە خۆی و پازدە سوارەوە وەدوای کەوتوە کە پارەکەی لێ بستێنێ. دێ بە تەواوی شڵەژابوو:

"مەحموودئاغا پارەکەی لێدەستێنێ".

"بەو پووڵەی داویانەتێ دەتوانێ پازدە گاجووت, نۆ ئەسپ, سەد بزن و سی و پێنج مەڕ بکڕێ...".

"بوو بە خاوەن پارەو ڕۆیشت".

"بۆچی نەترسێ, ئەگەر چەتەکان پێ بزانن کە ئەو هەموو پووڵەی هەیە...".

"ئەگەر ژەنراڵ سەرجووخە کەرتیش پێ بزانێ".
"تاژی تەحسینی بەستەزمان, چما دێڵن ئەو پووڵەی پێ بمێنێ".
"تاژی تەحسینی بەستەزمان, پارەی وەرنەگرت, بەڵای وەرگرت".
"مەحموودئاغای چاوھەڵۆش دەبێتە بەڵا بۆ گیانی".
"یان ئەم موختارەی خۆمان؟ چما دێڵێ ئەو پووڵەی پێ بمێنێ".
"لەگەڵ سەرجووخە عەلی کەرتیش رێك کەوتوە...".
"مەحموودئاغا نایەڵێ قرۆشێك لەم دراوە کەس لەسەر چاوی خۆی دانێ...".
"تاژی تەحسین ئەگەر ئازایە با پووڵەکەیان نەداتێ...".
"موختارو سەرجووخە کەرتیش حەمەدۆکیان کوشت... پووڵەکە...".
"پووڵەکەی تاژی تەحسینی چڵمن وەری گرتوە...".
"چما ئەو هەموو پارەیە هەر بۆ ئەوەی چەند شەقاو غاری داوە دەدەن بە هیچ کەس؟".
"مەحموود ئاغا کەولی لەبەر دادەرنێ".
"ژەنرال سەرجووخە عەلی کەرتیش چاوانی هەڵدەقەنێ".
"ئەگەر ئازایە دێتەوە نێو دێ...".
"دەڵێن مەحموود ئاغا سواری ئەسپی بۆرە بووە, فیلینتای لە شان کردوەو وەك باڵدار بەرەو ئێرە دێ".

تاژی تەحسینیش لەنێو لێڕەوار خەوی لێ‌کەوتبوو و خەونی سەیرو سەمەرەی دەدیت. وەختێك هەتاو لێی دا, وەخەبەر هات. لە زۆر دوور گورگێك دەیلووراند, تاژی تەحسین مووی لەشی راست بوونەوە: لوورەی گورگ فەری باش نیە. دەستی لەبن هەنگڵی دا لەسەر پووڵەکەی بوو. زراوی چوو. ئێستا وەلی چووەو هەموو شتێکی بۆ دێهاتییەکان باس کردوە. دێهاتییەکانیش... کێ چووزانێ... کچانیش بە چ شێوەیەك تەماشای دەکەن؟ بەو چاوە کە تەماشای پیاوی پووڵدار دەکەن. لەنێو دێی دا راست وەك سەرجووخە عەلی کەرتیش دێت و دەچێ: سنگ تێ‌قوپیو, قوون دەرپەڕیو. راست وەك بەران. هەموو کەس تەماشای دەکا.

"تاژی تەحسین دەوڵەمەندێکی زلە".

ترسی گورگ و لەزەتی تامی شیرنی دەوڵەمەندبوون ئەویان هەتا سەر شاخەکەی پشتی ئاوەدانی برد. هەتا دنیا تاریك دادێ لێرە خۆی دەشارێتەوەو کە تاریك داهات وەك رێوی خۆ بەنێو ماڵان دا دەکا, پاشانیش دایکی لە سیرێ تا پیوازێ هەرچی لە ئاوایی دا رووی داوە هەمووی بۆ دەگێڕێتەوە. ئەویش... پارەکەی لەنێو ئاوەدانی لە جێیەك دەشارێتەوە کە هەزار

ساڵیشی بۆ بگەڕێن کەس نەیبینێتەوە. دەیەویست هەرچی زووە بچێتەوە نێو دێ، لەوێ لە پەلەپەلان خەریك بوو دڵی بتۆقێ. خەڵکی دێکەشیان با ئێستا بێن بیبینن نەك ئەودەم کە هێندەی شۆرباو خواردبوو هەڵامسابوو، ئێستا با بێن بیبینن.

ئیدی خۆی پێ راگیر نەکرا، لەو کونەی خۆی تێدا حەشار دابوو هاتەدەر. لەسەر ئەو شاخە کە خۆی لەبن دا شاردبووەوە دەستی کرد بە راوێچکان. ئێستا دەبوو یەکێك لە خەڵکی ئاوایی بیبینێ کە چۆن سنگی ڕەپێش کردبوو پیاسەی دەکرد. هەموو دەوڵەمەندەکان ئاوا سنگیان ڕەپێش دەکەن. ئەگەر مەحموودئاغاو پیاوەکانی هاتبنە ئاوەدانی، یان مورتەزاغا... ئەودەم تاژی تەحسینیش: چیا بگرەو هاتم. ئەودەم ئەگەر توانیان بیگرن، با بیگرن. وەختێك ئەو بەنێو ئەو بەردەڵانەدا رابکا، ئەگەر گوللەشی لەدوا باوێن تۆزی ناشکێنێ. بڕیاری دابوو بچێتە نێو دێ. ئەگەر کەسێك بیهەوێ پوولەکەی لێبستێنێ، بەندەن بگرەو هاتم. توێشوویەکی زۆریش لەگەڵ خۆی دەبا... خوێش هەرواو چەقۆیەکی تیژیش. ئەگەر برسی بوو گیسکێك لە مێگەلی شوان... ئەودەم لەسەر کانییەك لەنێو پنگەڵان گۆشت گیسك لەسەر ئاگری پۆلان دەبرژێنێ و لە کاتێك دا ڕۆن بە دم و لەوسی دا دێتەخوار گۆشتی برژیو هەڵدەلرفێنێ. ئەو وەڵییە سەگبابە... پێش هەمووان تەواوی بزنەکانی وی یەك بە یەك دەخوا. ئەوان هێشتا تاژی تەحسینیان نەناسیوە. ئەو دزێکی ئەوەندە کارامەیە رۆڵەی لەبەر دایکێ هەڵدەگرێ، نایەڵێ پێ بزانێ. بۆچی لە هەموو گەڵی شکۆفە کەڵەبابێك پەیدا نابێ؟ چونکە هەموو کەڵەشێرەکانی ئەم دێیە تاژی تەحسین دزیونی و بردوونی خواردوونی. ئەویش لەسەر ئەو کانییە کە ئاوەکەی بۆڕنگی لێدێ. کێ سەری ئەو کەڵەشێرانەی لەدێی دزیون بردوون لە ئەشکەوتی قەڵای ئاڵخ دا شاردوونیەوە؟ دیارە تاژی تەحسین. زۆر باشە، لەماوەی ئەم دە ساڵەدا لەم دێیە هیچ کەس تێگەیشت ئەو هەموو کەڵەشێرە کێ بردنی و کێ تۆوی کەڵەبابی لەم دێیەدا بڕیەوە؟ لەنێو دێ دا شکیان بۆ هەموو منداڵانی ئاوەدانی چوو، بەڵام عەبدی خوای راست بووەوە بڵێ: خەڵکینە ئەوەی تۆوی کەڵەشێری لەم دێیەدا بڕیەوە تاژی تەحسینە. داخوا یەك کەس، تەنانەت یەك کەس بەفکری دا هات؟ ئەگەر پێویست بایە تاژی تەحسین ـ شانازیی بە ناسناوی تاژییەوە دەکرد ـ دە ساڵانیش لە چیا دەمایەوە هەموو کاوڕو گیسکی دێهاتی دەوروبەری دەخواردو خەلاسی دەکردن، بەڵام ئەو پوولەی بە ئارەقی نێوچاوانی پەیدای کردبوو، نەدەدا.

بەرە بەرە دنیا تاریك دەبوو، تاژی تەحسین لەسەر شاخەکە وەك شێتان ئەم سەرو ئەوسەری دەکرد. کە هەتاو ئاوا بوو ئەوەندە خۆشحاڵ بوو کە بە دەست خۆی نەبوو هاواری کردو خۆی هەڵاویشت. بەدوای ئەوەدا ترسار چوو لەبن شاخەکە لە کونێك دا خۆی شاردەوە. چەند لەحزەیەك گوێی بەم لاو

لادا گرت, چووکترین دەنگ و هەرا نەدەهات. بە سەنگینی و ئارامی لە شاخی هاتەخوارو وەك ڕێوی بێدەنگ و هەرا خۆی بەنێو دێ دا کردو کاتێك گەیشتەوە ماڵێ دڵی تەپەتەپ لێی دەدا:

"دایە, دایە, دەرکەم لێ‌وەکە".

دایکی دەرگای لێ‌کردەوە. لە ماڵێ ئاگر داییسا وەختێك دایکی لەبەر شۆقی ئاگر چاوی بە روخساری کەوت بە سەرسوڕمانەوە هاواری کرد:

"ئەیەرۆۆۆ کوڕم, چت بەسەر هاتوە؟".

تاژی تەحسین کە خێرا چووبووە ژووری و دەرگای پێوە دابوو گوتی:

"هیچ نەبووە دایە, هیچ نەبووە... دەقیقەیەك گوێم بۆ راگرە... گوێت لە قسەکانم بێ, ئەم رۆژانە دەستەیەك لە خەڵکی شارۆچکەی نەهاتوونە ئێرە لەمن بپرسن؟ لەنێو ئاوایی کابرایەکی شەلت دیوە ناوی عەلی‌یەشەل بێ؟ مەحموودئاغا لەکوێیە؟".

"هەیهووو, کوڕم کەس نەهاتوە, نە شەل, نە کوێر, نە ساغ. مەحموودئاغاش هێشتا نەهاتوە, گۆیا قەرار بووە بێ".

"هیچ کەس, هیچ کەس نەهاتوە نا؟".

"هیچ کەس کوڕم, بۆخۆت دەزانی لەنێو دێی مێشوولە باڵ لێك دا ئەمن دەزانم".

"دایە, دەوڵەمەند بووم".

دایکی لە حاڵێك دا بەحەبەساوی تەماشای دەکرد گوتی:

"بیستم کوڕم, بیستم. وەلی‌یەشوان دێیەکەی ژێروژوور کرد. لەنێو دێی باس هەر باسی تۆیە".

"دەوڵەمەند بووم دایە, دەوڵەمەند. وەرە ئێرە".

قۆڵی دایکیی گرت و بردیە نیزیك ئاگردان. دەستی لە باغەڵێی راکردو دەسرۆکەیەك کە پووڵەکەی تێوە پێچابوو, دەری هێناو گوتی:

"بڕوانە دایە. ئەمە یەك, بەم یەکە دەتوانی دوو جووت گا بکڕی, گوتت کەسی غەریبە نەهاتوەتە ئاوایی؟".

"هیچ, هیچ".

"ئەمە دوو, بەمەشیان دەتوانی ئەسپێك و ماوزەرێك و ئیروئامورێك بکڕی. ئێستا بەم یەکەیان... دوو مانگای دۆت بۆ دەکڕم. بەم یەکەش فرۆیەکی زۆر, ماست, رۆنەکەرەو قەیماغ دەخۆین... یازدە گیسکیش دەکڕین... ئەتۆش پەنیری دروست دەکەی. دایە هیچ کەس لەگەڵ کابرایەکی شەل نەهاتوەتە ئاوایی, هیچ, هیچ؟ مەحموودئاغا نەهاتوە؟".

"نەهاتوە هیچ, هیچ, هیچ".
"دەوڵەمەند بووم دایە".
دایە لە سەیران چاوی پیّدەرپەڕیبوون و تەماشای ئەو دراوەی دەکرد کە تەحسین لەسەر عەرزی لە پەنای یەك دایـنابوو, ئەوەی دەیدی باوەڕی نەدەکرد.
تاژی تەحسین یەك بین بەسەرهاتەکەی دەگێڕایەوەو باسی مورتەزاغاو عەلیـیەشەلی دەکرد.
"ئەو پیاوە لەو پارەیە کە لە مزگێنیی مەرگی حەمەدۆك دا داویە بەمن پەژیوان نابێتەوە؟".
لە نەکاو دایە ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا: ئەمن نازانم کوڕی خۆم.
تاژی تەحسین بە پێکەنینەوە گوتی: پەژیوان نابێتەوە, نا.
ئەم پێکەنینە لە رووی ترسەوە بوو.
"ئەمن خەبەری مەرگی پیاوی وەك حەمەدۆکم داوەتێ. بۆ مزگێنیـیەکی وا ئەم پارەیە کەمیشە".
"ئەدی کوڕم, کەمیشە...".
هەستایە سەرپێ: ئەتۆ لە برسان مردی کوڕم...
تاژی تەحسین گوتی:
"ئەی دایە مردم لە برسان, سێ شەوو ڕۆژە پاروەنانێکم لە گەروو نەچووەتەخوار... ئەم پووڵە کەمیشە, وەنا دایە؟".
"ئەدی کەمیشە...".
"ئەم پارەیە لە کوێ دانێین کە کەس...".
"ئەتۆ دراوەکەی وەمن دە, ئەمن دەزانم لەکوێی دانێم, ئەگەر مستەفا کەمال پاشاش بێ ناتوانێ وەیبینێ".
"وێت نادەم دایە, بۆخۆم دەیشارمەوە".
"باشە, چما پووڵی خۆت نیە؟ بۆخۆت بیشارەوە, بەڵام ئەگەر ژەنراڵ سەرجووخە عەلی کەرتیش و موختار کەوڵیان کردی, خۆ جێیەکەیان پێ نالێی؟".
"دەیلێم...".
"باشە, ئیدی بۆخۆت دەزانی کوڕم".
تاژی تەحسین بە هەژاوی و نیگەرانیـیەوە گوتی:

"ئەتۆ وەیشێرە دایە, ئەگەر ئەمن لەبن داران دا بکوژن, دیسان جێیەکەی بەوان مەڵێ. ئەگەر ئەنجن ئەنجنم کەن... گوێی خۆت باخنە, چاوانت بقوچێنەو جێیەکەیان پێ مەڵێ, تەنانەت ئەگەر مەحموودئاغا لەبن پێی ئەسپەکەیدا تۆ بپلیشێنێتەوە..."

"جێیەکەی ناڵێم".

"سوێند بخۆ".

"بەچی؟".

"بە گیانی من".

"سوێندم خواردو تەواو بوو".

"ئەگەر دایە نەتوانێ هاوارو ناڵەی تاژی تەحسین تەحەمول بکاو جێی پوولەکەیان پێ بڵێ, تاژی تەحسین لە جێ گیانی دەردەچێ. باشە دایکی هەرگیز رازی نابێ ئەو بمرێ. ئێستا ئەگەر عەلی کەرتیش لەبن داران دا بیکوژێ, ئەوە شتێکی دیکەیە".

تاژی تەحسین پاش ئەوەی هەموو پارەکەی وەدایکی دا, گوتی:

"دایە شۆرباوێکم بدەیە, خەریکم دەمرم".

دایك, چێشتەکەی بەمەنجەڵەوە لەنێویەندی سفرەکە دانا. تەحسین بە کەچکێکی گەورەی دار دەستی بە چێشت خواردن کرد, چەند دەقیقە دواتر شەلاڵی ئارەق بوو.

"کوڕم, ئەمن دەڕۆم".

"بڕۆ دایە بڕۆ... وریا بە پوولەکە مشك نەیخوا".

دایك لێی دا رۆیشت. وەختێك هاتەوە دیتی تاژی تەحسین لەبەر ئاوری درێژ بووەو خەوی لێکەوتوە.

بەیانی دایك و کوڕ بە خۆشحاڵی لە خەو هەستان و هەتا نیوەڕۆیە بە ئیشتیاوە باسی کڕینی گاجووت, ئەسپی رەسەن, بزن و مەڕ, ئیرونامووررو کێلگەیەکیان کرد کە هەرچی لێی بچێندرێ هێند بە قەوەت دەبێ پڵنگی تێ ناچێ. هەتا پتریان قسە دەکرد چەنەگەیان باشتر گەرم دەبوو. ئەگەر تاژی تەحسین بۆ خۆدەرخستن لەنێو ئاوەدانی بە پەلە نەبایە دایك و کوڕ سێ شەو و رۆژان لەو بارەیەوە قسەیان دەکرد. تاژی تەحسین لەلایەك تامەزرۆ بوو لەگەڵ دایکی باسی بەختیاری و دوارۆژی پڕ لە دارایی خۆیان بکاو لەزەتی لێببینێ, لەلایەکی دیکەش دەیەویست خۆی بە خەڵکی ئاوەدانی نیشان بدا. پارەکەی لە رێی حەڵاڵەوە پەیدا کردبوو, و ئەگەر دنیاش خەرابایە هیچ هێزێك نەیدەتوانی لێی بستێنێ.

سەرەنجام خۆی پێ رانەگیرا, لەماڵێ هاتەدەرو چووە بن چنارێ. چنارەکە کانییەکی لەبن هەڵدەقوڵی, هێندی بڵێی یەك و دوو بن چنار پڕ بوو لە ژن و پیاو و منداڵ. هەرکەس

دەیگەیشتێ لێی دەپرسی کە چۆن دەوڵەمەند بووە. ئەویش بێئەوەی هەست بە وەڕەزی و ماندوویی بکا, باسی دەکرد کە چۆن یەك تەکان لێرەوە تا شارۆچکە غاری دا, چۆن بە دەهۆڵ و زوڕناوە لە شارۆچکە پێشوازیی لێکرا, چۆن هەتا بەردەرکی ژووری قایمەقام ڕۆیشت و لەوێ بێهۆش کەوت و وەختێك وەهۆش هاتەوە دوکتۆرو پیاوماقووڵانی شارۆچکەی لە ژوور سەری خۆی دی, هەروەها چۆن پیاوێکی کەڵەگەت و کابرایەکی شەلی کڵاوشەبقە لەسەر لێکدا لێکدا پارەیان دەدایەو چۆن ئەگەر پووڵەکەی وەرنەدەگرت لێی تووڕە دەبوون. هەمووی موو بە موو گێڕایەوەو لێی زیاد کرد کە پاشان ئەو پیاوەی پارەکەی دابوویە, بردیەوە ماڵێ خۆی و بەرخی بۆ سەر بڕی و شانە شانە هەنگوینی تازەی بڕیەوەو شەربەتێکی دایە کە بۆنی گوڵی سووری لێدەهات و لە جێوبانێك دا نواندی کە بۆنی گوڵی سووری لێدەهات:

"پاشانیش ئەو پیاوە کەڵەگەتە گوتی... حەمەدۆك ویستوویەتی بیکوژێ, وەختێك عەلی کەرتیش حەمەدۆکی کوشت ئەمنیش مزگێنیەکەم بۆ ئەو پیاوە برد, بە منی گوت... هەرچی دەتەوێ داوام لێبکە, بەسەرچاوم, هەرچی دەتەوێ داوا بکە, ئەگەر حەز دەکەی لەو کچە جوانانەی شارۆچکە ژنێکت بۆ دێنم. ئەمنیش گوتم: نا, نامەوێ, وەختێك بەڕێی دەکردم گوتی ئەحسین ئێرە وەك ماڵی خۆتە, هەروەخت دەست و دڵت تەنگ بوون وەرە, هەرچی ویستت, ئەسپت ویست ئەسپ, چەکت ویست چەك, پارەت ویست پارە, زەویت ویست زەوی, کچت ویست کچ, هەر ئەوەندە دڵت بیگرێ و داوا بکە... هەرچی بتەوێ بەسەرچاوم, زۆرم خۆش ویستی, وەك ئەولادی خۆمی... ئێستا کە ئەتۆ مردی و زیندوو بوویەوە, بەڵام مزگێنیی مەرگی دوژمنت بۆ هێنام, ئەمنیش تۆ... ئەمنیش پێم گوت خۆش بی ئاغا..."

حەشیمەت بەرە بەرە زۆرتر دەبوو, کە لە نەکاو موختار بە سواری ئەسپی بۆرە لە جادەی خوارێ وەدەر کەوت. چاوەکانی تاژی ئەحسین وەك کەللاشووشە لە کالانەدا بزەبزیان دەهات, دەیەویست پێش ئەوەی موختار بگاتێ ئەو بەنێو حەشیمەتەکەدا خۆی دەرباز بکاو بەرەو چیا تێی تەقێنێ. بەڵام نەیدەتوانی. بە دیتنی موختار تەواوی لەشی کەوتە لەرزین و هەر لەوێ ئەژنۆی دووڵا هاتنەوە. لەسەر بەردی کانێیەکە دانیشت. چەند جار هەوڵی دا هەستێ بەڵام بە هیچ جۆر نەیدەتوانی هەستێ.

موختار هات, دڕی بە حەشیمەت دا, ئەویش هات و لەسەر کانێیەکە دابەزی. هەوساری ئەسپەکەی دایە دەستی کوڕە جحێڵەیەك و گوتی: ئەمەی بەرەوە ماڵێ.

"چیە, چ باسە لێرە کۆ بوونەوە؟".

گوتیان: دەتەویست چ بێ, تاژییەکەمان...

"دەوڵەمەند بووە".

"حەمەدۆك دەوڵەمەندی كردوە".

هەموویان لە سیر هەتا پیواز بۆ باس كرد. موختار پیٚكەنی. پاشانیش گوتی: وەزع خراپە, یاوەر زۆر لە دێیەكەمان تووڕەیە. گوتوویەتی دەیەوێ ئێرە لەگەڵ عەرزی تەخت بكا. تووشی ژانەسەر بووین. ئەم ژنانە بەدبەختیان كردین. ئەگەر مەحموودئاغا پیٚبزانێ... ئیشەڵلا پیٚنازانێ. ئیشەڵلا نایەتە ئاوەدانی.

"چ بووە, دێیەكەمان چ بەڵایەكی بەسەر هاتوە؟".

"ئەوەی كوژراوە حەمەدۆك نەبووە".

"ئەدی كێ بووە؟".

"گۆیا وەسمانەڕەش بووە ـ هەناسەیەكی قووڵی هەڵكێشاـ وەختێك ژنانی ئاوەدانییش گوتیان ئەمە حەمەدۆكە كوژراوەو شیوەنیان بۆ كرد, جەندرمەكانیش گوتیان ئەمە حەمەدۆكەو بڕووسكەیان بۆ ئەنكەرە لێدا كە حەمەدۆكمان كوشتوە. پاشانیش وەختێك مەسەلەكە روون دەبێتەوە هەموویان دەبنە پووڵەسووركەیەك. یاوەر هەر دەڵێ سنگ لە ...ی ژنانی ئاوەدانی دەبڕم. ئیشەڵلا, ئیشەڵلا مەحموودئاغا تووڕە نابێ".

"با سنگ لە ...ی ژنەكەی خۆی ببڕێ".

"یاوەر هەر دەڵێ دێیەكەی دەكەمە خۆڵەمێش و هەرزنی لێدەچێنم. ئیشەڵلا مەحموودئاغا نایەتە ئاوایی".

"با بیكاتە خۆڵەمێش بزانین".

"ئەمن بە هەزار زەحمەت گیانی خۆمم نەجات دا. ئەویش لەبەر خاتری حەمەدۆك. پێم گوتن رەحم پێ بكەن, لێم مەدەن, مەم نێرنە بەندیخانە, ئەمن حەمەدۆكتان بۆ دێنم. جێیەكەی دەبینمەوەو خەبەرتان دەدەمێ. ئەمانەم گوت و بە هەزار زەحمەت گیانی خۆم لە دەستیان رزگار كرد. یاوەر لە هیچ تووڕە نیە لە گریان و شیوەنی ژنان نەبێ, خەریكە شێت دەبێ, بە هیچ كەس دانامەزرێ".

دەڵێ: باشە, با ژنانی گەڵی شكۆفە وا بكەن, قەرز بێ لەسەرم. خوا بكا مەحموودئاغا..."

پاشان ئاوڕی دایەوە لای ژنەكان:

"یانی چی, چ پێویست بوو لەسەر تەرمی چەتەیەكی بێگانە شیوەن بكەن كە بەڵێ حەمەدۆكە؟ ناوی دێیەكی بەو باشییەتان لە شارۆچكەیەكی وا گەورەدا لە گوو وەردا. ئێستا

ئەمن چ بکەم... ئا...خ لە دەست ئەم ژنانە, ئا...خ, چەتەیەکی بێگانە بە ئێوە چی, بۆچی شیوەنی بۆ دەکەن جندەینە, بۆچی دێیەکە ئاور تێبەردەدەن...".

"چما ئەو بەندەی خوا نەبوو؟".

"خۆ نابێ مردوو وەك سەگ لە قوولکەیەك هاوێژرێ".

"بەتایبەتی کە مەیتی حەمەدۆکیش بێ...".

موختار پڕ بە گەرووی نەڕاندی:

"تەرمی حەمەدۆك نەبوو".

"با تەرمی حەمەدۆکیش نەبێ, خۆ تەرمی بنیادەمە".

"ئاوا شیوەن دەکەن؟".

"ئێمە لە باب و باپیرانی خۆمان دیوە ئاوا شیوەن دەکەن".

"لەسەر تەرمی هەرکەس کە هاتە بەردەستتان؟".

"لەسەر تەرمی هەر ئادەمیزادێك...".

"موختار! ئێستا کە وای لێهاتوە...".

"وەختێك ئەتۆ مردی لەسەر تەرمەکەت شین ناگێڕین".

"تەرمی تۆ وەك کەلاکە سەگ داوێینە نێو قوولکەیەك".

"پێت خۆشە؟".

موختار توورە بوو, نەڕاندی, جنێوی دان, شێت بوو. کە ئەو جنێوی دەدان, ژنەکانیش جنێویان پێدەدانەوە. سەرەنجام موختار بانگی مێردەکانیانی کرد. ئەوان ژنەکانیان ئارام کردنەوە. موختار بە ناچار هەڵاتەوە ماڵێ. ژنەکان لەبن چنارێ کۆ ببوونەوەو هەرچی جنێوی دەیان زانی حەوالەی موختار, یاوەرو ئەنکەرەیان دەکردو گۆرانیی گشتیان دەگوتن و بە حەمەدۆکیان هەڵدەگوت. بەخەبەری ئەکوژرانی حەمەدۆکی ئەوەندە خۆشحاڵ بوون نەك هەر یاوەر, تەنانەت مەحموودئاغاشیان بە هیچ نەدەزانی. ئاوایی پڕ ببوو لە شادمانی. موختارو چەند پیرو پاتاڵ خەریك بوون یەخەی خۆیان دابدڕن. پێکەنینی خۆشحاڵی و گۆرانی گوتن هەتا نیوەشەوێ درێژەی هەبوو.

تاژی تەحسینیش خۆی ڕەگەڵ شەپۆلی ئەم خۆشحاڵییە خستبوو, ئەو لەبەر شتێکی دیکە لە هەمووان زیاتر بە مانی حەمەدۆك خۆشحاڵ بوو, و لە خۆشییان لە پەستا هاواری دەکرد. وەختێك هاتنەوە ماڵێ گوتی: دایە, و باوەشی بە دایکیدا کرد:

"دایە ئێستا ئیدی بە تەواوی بووینە پووڵدار, بزانە دەمەوێ چ بکەم لە جیاتی موختار بۆخۆم وەدوای حەمەدۆك دەکەوم, شوێنەکەی هەڵدەگرم و دەیبینمەوە, پاشانیش خەبەر بەو ئاغایە دەدەم, ئەویش ئەویش ئەمجار زۆر, زۆر, زۆر زیاتر لە جاری پێشوو پارەم دەداتێ. ئەم ماڵە پڕ دەبێ لە پووڵ, ئا... ئەوەندە".

"بێدەنگ بە سندان لەسەری‌ەراو, ئەمن پارەم ناوێ... پاشانیش ئەوان حەمەدۆکی بکوژن, بەڵێ؟".

تاڕی تەحسین لێوی هەڵچنین و گوتی:

"با بیکوژن, چما حەمەدۆك برای منە؟ سبەینێ توێشووم زۆر بۆ سازکە. دەمەوێ بڕۆم".

## (١٦)

ناوی هەموو کوێخاکان لە گیرفانی مورتەزاغادا بوو. ئەو شەوێکیان سواری ئەسپ بوو و بەرەو ئەدەنە وەڕێ کەوت, کە گەیشتە ماڵی رەمەزانی خان, زۆر لەنیوەشەوێ لای‌دابوو. خان پیاوێکی بەساڵداچوو بوو, لەمێژ بوو خەوی لێ‌کەوتبوو. هەر کە لە دەرگای دا وەرگێڕکەیەك دەرگای کردەوە. خان کە دەسبەجێ وەخەبەر هاتبوو, بە خەواڵوویی, بە ئارەقچن و رۆبەوە هاتەدەرێ.

کوڕە خزمەتکارەکە لە سووچێك راوەستابوو, بە چاوێکی پڕ لە سەرسوڕمانەوە تەماشای ئەو ئاغا کەڵەگەتە کڵاوشەبقە لەسەرەی دەکرد کە دوو دەمانچەی لەبەر پشتێنێ راکردبوون. قەت نەی‌دیبوو. مورتەزاغا گوتی:

"خان, ئەمن مورتەزای نۆکەرتم, دەبێ ببووری کە بەم نیوەشەوە ئەزیەتم دای...".

"جارێ وەرە سەرێ گیانە, وەرە سەرێ دوایە قسان دەکەین".

لە نهۆمی سەرێ هاتوچۆ بوو, هێشتا خان لە پلیکانەکان نەهاتبووە خوارێ چرایەکان هەڵکرابوون.

لە تەنیشت یەکتر لەسەر قەنەفە دانیشتن. هەر دانیشتن و قاوەیان هێنا.

"خێرە مورتەزاغا...".

مورتەزاغا هەموو بەسەرهاتەکەی, مەسەلەی حەمەدۆك, کوژرانی عەلی‌سەفابەگ, درۆیەکانی یاوەر فاررووق بەگ و ئەوە کە چۆن لە شارۆچکە وەك خانێکی رەمەزانی پێشوازیی لێ‌کراو چۆن تالیب بەگ بە شێوەیەکی سامناك بە دەستی حەمەدۆك کوژرا, بە کورتی هەموو شتێکی لە سیر هەتا پیواز گێڕایەوەو سەرەنجام گوتی:

"خان, مەسەلەکە بەم جۆرەیە... بەڵام عارف صائم بەگ, ئەو ناپیاوەش لە ترسی قوونێی وا بە ئەنکەرە نیشان دەدا کە هیچ کام لەمانە روویان نەداوە. ئەگەر ئەنکەرە لە هەمووی ئەم رووداوانە ئاگادار بێ, ئیدی ئەوی ناکەنە وەکیلی ئێرە. هەربۆیەش چیاو بەندەن پڕ بوون لە چەتە. ئەم حەمەدۆکە, ئەم دوژمنی ماڵ و نامووسەش بە جارێك خۆی کردوەتە حوکمداری چیاکانی تووڕووس. ئیدی لەمەدوا نە دەستەیەك و نە فەوجێك و نە لەشکرێك, هیچ شتێك ناتوانێ پێشی حەمەدۆك بگرێ, هەموو خەڵك بەتایبەتی چینی قوون رووتان و تایفەی پێخواسان لە ژێر فەرمانی دان. ئەو نیشتمانەی ئێمە لە دەستی دوژمنمان نەجات دا ئەوان وێرانیان کرد. وەك بیستوومە ئەم رۆژانە بەنیازن ئەدەنەش بگرن. بەردی لەسەر بەردی ناهێڵن و سەری کەس بە لەشیەوە ناهێڵن...".

رەمەزانی خان دوژمنی خوێنیی عارف صائم بەگ بوو. لە جیاتی ئەو ببێتە وەکیل, ئەنکەرە ئەو جەندرمە هەرچی و پەرچییەی کردە وەکیل. لە کاتێك دا لە حەوسەد ساڵ لەمەوبەرەوە هەتا ئێستا کاروباری ئەدەنە بەدەست ئەمیرانی رەمەزانیەوە بوو. رەمەزانییەکان کە حەوسەد ساڵ فەرمانڕەواییان بەسەر ئەو مەڵبەندەوە کردبوو, لە دەورەی کۆماردا ناچار بوون سووچێکی ئەم کڵاوە بدەنە دەست خەڵکی دیکەو ئەمەشیان هەروا لەسەر دڵ مابوو. ئەمەش داخێکی گەورە بوو. لە هیچ دەورو زەمانێك دا لە سەردەمی سەلجووقییەکانیش دا بەڵای وا بەسەر خانەکانی رەمەزانی نەهاتبوو... تاقە یەك نوێنەری مەجلیسیان هەبوو کە ئەویش رەمەزانییەکی لە سەداسەد خالیس نەبوو, کابرایەکی هەمیشە مەست بوو.

خانی رەمەزانی گوتی:

"هەقتە مورتەزاغا, ئێمە دەبێ جێگایەك بدۆزینەوە کە مەسەلەی ئەم راپەڕینە بە ئاگاداریی ئەنکەرە بگەیەنین. بەڵام داخوا چۆن ئەو کارە بکەین. ناکرێ بچینە لای وەکیلی کاروباری نێوخۆ. پێی وایە سەرۆك وەزیرانە. چاوپێکەوتنی پاشاش لە تەخت کردنی چیاکانی تووڕووس دژوارترە".

هەتا بەیانی قسەیان کردن. سەرەنجامیش بڕیاریان دا رێگایەك کە بە فکری مورتەزاغا گەیشتبوو, هەڵبژێرن.

"خان, ئەم عارف صائم بەگە هێندێ بەرنامەی دیکەشی هەن..."

"بەرنامە وەك چی؟".

مورتەزاغا پێکەنی:

"بەرە بەرە خەریکم سەر لە کارەکانی دەردەکەم. هێشتا بە تەواوی بۆم ساغ نەبووەتەوە, ئەگەر سابیتی بکەم, عارف صائم بەگ دەبێتە تۆزو دەچێتە حەوا".

- خان بە شاکەشاك و بە چاوێکی پڕ لە مەراقەوە پرسی:

"بلێ بزانم مەسەلە چیە؟".

"پێم وایە عارف صائم بەگ کەسێك نیە بە نوێنەرایەتیی مەجلیس و سەرۆك وەزیری رازی بێ. ئەو چاوی لە هەورازترە... لەگەڵ هەموو قسەیەکی دەڵێ پاشا ئەمن هەڵی دەسووڕێنم".

"ئەمەی دەزانم".

"ئەو تەون و بەستی نهێنیشی هەیە".

"لەگەڵ کێ؟".

"لەگەڵ چەرکەسەکانی ئەو چیایانەی سەرێ رێك کەوتوە... وەك بیستوومە ئەگەر لەسەر ئەو, چیانشینەکان, هەموو چیانشینەکان راپەڕن... بەڕواڵەت ئەو خۆی تێکەڵ ناکا...".

"بلێ بزانم چت بیستوە؟".

"چەرکەسەکان لەنێوان ئەو و فەرانسەیی‌یەکان لە سووریەو ئینگلیزی‌یەکان لە عیراق بوونە واسیتە. پەیام دەبەن و دێننەوە, لەوە زیاتر سەری لێ دەرناکەم".

مورتەزاغا هەستایە سەرپێ و دەستەکانیی راوەشاندن. ماوەیەك هەروا بە پێوە بیری کردەوەو ئەمجار گوتی:

"خان. ناوێرم بێڵێم. تەنانەت ناتوانم ئەو قسەیەم بە زمانیش دا بێ"

خانی رەمەزانی هاواری کرد: بلێ بزانم مەسەلە چیە؟

"خان, شتێکت لێ‌دەپرسم".

"بلێ".

"داخوا بە درێژایی مێژوو, ئەم ناوو خاکە, ئەم سەرزەمینە مەزنەی عوسمانی‌یەکان توانیویەتی پیاوی وەك مستەفا کەمال پاشا پێ‌بگەیەنێ؟"

خان نێوچاوانی تێك ناو گوتی:

"ئەمەیان ئیدی نازانم, ئەتۆ پێم بلێ بزانم چت بەسەر هاتوە؟".

مورتەزاغا لە روو چوو, چەند جار تفی قووت دایەوە. یەکەم جار بوو لە ژیانی دا لەبارەی مستەفا کەمال پاشاوە لەگەڵ دژکردەوەیەکی وا سارد بەرەوڕوو دەبوو. سەری سوڕمابوو. زۆری پێ چوو هەتا هاتەوە سەرخۆ.

"دەنگۆیەك لەنێو خەڵك دا داکەوتوە کە عارف صائم بەگ پیلانێکی لەنێوبردنی بۆ مستەفا کەمال پاشا رێك خستوە. تەنانەت بۆ ئەو مەبەستە دەیەوێ حەمەدۆك و چەتەکانی تووڕووسیش بەهێز بکا".

خانی رەمەزانی قاقایەکی درێژی کێشا:

"مورتەزاغا, ئەمە دەنگۆیە, درۆیە, درۆ. عارف صائم بەگ ناوێرێ کاری وا بکا".

"دەیکاو چاکیشی دەکا. ئەو سەرۆکی دەستەیەك چەتەی بێبەزەییە".

"ناوێرێ".

"هەموو هەر باسی ئەم مەسەلەیە دەکەن".

"قسەی خۆڕایی دەکەن".

"هەر ئەم رۆژانە دەبینین".

"خۆزگە".

"ئەم وشەیەی لە زاری دەرچووبوو.

مورتەزاغا لە حاڵێك دا هەڵدەستایە سەر پێ گوتی: خوا نەکا, لە ترسان هەموو مووی لەشی راست ببوونەوە, دەت گوت لە ترسان لە کونێك دەگەڕێ خۆی تێدا بشارێتەوە. لە چاولێك نانێك دا گیانی ڕەسەر ئارەق کەوت: خوا نەکا.

خان هەستایە سەرپێ, مورتەزاغای زەندەق چووی هێدی کردەوە. ئیدی نە ئەم و نە ئەوی دیکە باسی ئەو مەسەلەیەیان نەکردەوە.

هێشتا هەتاو نەکەوتبوو کە پارێزەر سابیت خانی خەمیرچی هاتە ماڵێ رەمەزانی. پیاوێکی گەنج بوو. چاوە زیتەکانی لە کالانەدا دەهاتن و دەچوون. مورتەزاغا بە دیتنی, مووی لەشی بوونە نەشتەر. قەڵافەتێکی سەیری هەبوو. پیاوێك بوو کورتەباڵا, چاوبادامی و قۆرتۆمە دەرپەڕیو. چاوەکانی راست لە بنی لووتی دا پێکەوە نووسابوون. حاڵەتێکی بێئارامی هەبوو, خێرا خێرا قسەی دەکرد.

خان گوتی:

"نووکی قەڵەمی سابیت بەگ تك تك خوێنی لێدەچۆڕێ. نەك هەر لە ئەدەنە, بەڵکوو لە سەرانسەری تورکیەدا قازیی وەك خۆی کارزان دەست ناکەوێ. هەر ئەمڕۆ دەستی ویت وەدەست دەدەم".

مورتەزاغا چار ناچار دەبوو لەگەڵ سابیت بەگ هاوکاری بکا. چونکە ئەگەر وا نەبایە بێحورمەتی بە خان دەبوو. پاش دیتنی قازی وەك سەگ لە هاتنەکەی پەژیوان بوو. دانیشتن و

هەتا لای نیوەڕۆیە خەریکی بەرنامەدارشتن بوون. بڕیار درا شازدە موختار شازدە نامەو ٣٠ موختاریش ٣٠ برووسکە بۆ وەزیری نێوخۆ بەرێ بکەن. دایان نا سابیت بەگ تەواوی شەوێ خەریك بێ و هەتا سبەینێ نیوەڕۆیە هەموو نامەو برووسکەکان ئامادە بکا. پاشان هەمووان بۆ مورتەزاغا بخوێنێتەوەو ئەویش پەسندیان بکا.

نیوڕۆژێکی خۆشیان خوارد. کە لە نان خواردن بوونەوە سابیت بەگ دەسبەجێ جانتاکەی هەڵگرت و ڕۆیشت و پاش ڕۆیشتنی وی خان گوتی:

"دەڵێی ئاورە, بەخوا سابیت بەگی کوڕمان وەك ئاور وایە. ئاگرێك لە ئەنکەرە بەردەدا نە وەزیری نێوخۆ بمێنێ, نە سەرۆك وەزیرو لەوانەیە عیسمەت پاشا لەشکرێك بنێرێتە ئێرە".

پاش نیوەڕۆیە مورتەزاغا چووە نێو شاری و بە پیاسەکردن هەتا سەر چۆمی سەیهان چوو. مندالآن قامیشی شەکریان دەمژی, قامیشێکی درێژی کڕی, چووە پشت چەرخ و فەلەکەکان و بە دزییەوە دەستی بە قامیش مژین کرد. بەنیاز بوو بچێتە جندەخانە. هەتا "داشچیکان قاپووسی" چوو. چەند دەقیقەیەك ڕاوەستاو پاشان پەژیوان بووەوە. بە جحێڵی هەتا هاتبایە ئەدەنە سەرێکی جندەخانەشی دەدا. بەڵام ئێستا لەبەر بەسەرهاتەکانی مالێ ڕەمەزانی, یان لەبەر هەرچی بوو نەیتوانی بچێ... لە هەناوی دا ترس و خەفەتێکی سەیر هێلانەی کردبوو. خەمیرچیی هیچ وەبەر دڵ نەکەوتبوو. ڕەفتاری ئەختێك وەك سامی تورقوودی مامۆستا دەچوو: پاشان ئەو کابرایە ئەوەندەم دەڕووتێنێتەوە, وەك سلقی رووتم لێ‌دێ. لە جێ دا نەدەبوو هێندە کۆڵ بە حەمەدۆکەوە هەڵگرێ: چما ئەمن چ حیسابێکم لەگەڵ حەمەدۆك بووە؟ خۆ ئەمن خەراپەیەکم بۆی نەبووە هەتا بیهەوێ بم کوژێ. داخوا باشتر نەبوو دەستی لە هەموو ئەم بەرنامانە هەڵگرتباو حەمەدۆکی بەگژ مەلادۆران ئەفەندی دا کردبایە؟ دەبوو ڕێگایەك بدۆزێتەوە کە مەلادۆران ئەفەندی بەدەستی حەمەدۆك بکوژرێ.

عەلیەشەل دوژمنی خوێنیی حەمەدۆکیش چووە لە مالێ مەلادۆران ئەفەندی بووەتە وەرگێڕکە. بە تیرێك دوو نیشانەی دەشکاندن... بەڵام داخوا بەڕاست ئەو شەلە دوژمنی حەمەدۆك بوو؟ بەرواڵەت وا دیار نەبوو, داخوا ڕێی تێ‌نەدەچوو ئەو یەکێك لە هاودەستانی حەمەدۆك لەنێو شاردا بێ؟ مورتەزاغا لە حاڵێك دا لە ئەژنۆی خۆی دەدا گوتی: ئەگەر وابێ هەڵەیەکی گەورەم کردوە.

مورتەزاغا ئێوارەی ئەو ڕۆژە کاتێك دەگەڕایەوە مالێ ڕەمەزانی, زۆر پەرت و پەرێشان بوو. خان بە ڕوویەکی خۆشەوە هەتا سەر پلیکانان بەپیریەوە چوو, دەستی گرت و لەسەر

قەنەفە دایئنیشاند. تەنانەت خێزانی خانیش هات بەخێراتنی کرد. ماڵی خان خانوویەکی داری دوو نهۆمی گەورە بوو لەسەر لێوی سەیهان کە هەر نهۆمەی دە ژووری هەبوون. خانوویەکی رازاوە بوو. پێشتر باوکی خان لەم خانووەدا دەژیا. خانووەکە بەدەستی وەستاکارانی ئەرمەنی دروست کرابوو. بۆ کاروباری دارتاشییش وەستا رەزایان لەکێوپارەوە هێنابوو کە لەدار بنیادەمی دەتاشی و گیانی وەبەر دەنا.

خان بە پەرۆشەوە گوتی:

"ئاغای گەورەی تورکمەن, مورتەزاغا, هیچ دیوتە چۆن خەریکن چوکووراوای وەك گۆشتی قوربانی لەنێو خۆیان دا داروبەش دەکەن؟ ژمارەیەك لە "ئالازیك" دەستەیەك لە "مانیە", هێندێك لە "ئەفیوون"و بەشێك لە "ماراش"و "ئۆرفە"وە هاتوون و خاکی باب و باپیرانمان و هاوینەهەوارەکانمان لەنێو خۆیان دا بەش دەکەن. ئەمانە خەریکن چوکووراوا بەش دەکەن, تالانی دەکەن. ئێمە تالانی وامان نە لە سەردەمی سەلجووقییەکان دا دیوە, نە لە دەورەی عوسمانی و نە لە زەمانی برایم پاشا کوڕی محمد علی پاشا والیی میسردا. دێ بە دێ و دەشت بە دەشت خەریکن چوکووراوا لەنێو خۆیان دا بەش دەکەن. ئێمەش دەست و پێمان بەستراون و تەنیا تەماشای ئەوانە دەکەین کە بوونە مارو زەوییەکانمان لە خۆیان بەش دەکەن. ئەتۆ دەڵێی چی مورتەزاغا فاتیحەمان خوێندراوەو براوەتەوە".

خانی رەمەزانی زۆری دڵ پڕ بوو و زۆریش تووڕە بوو. لەم شارەدا مزگەوتی سووورو ئەو پردە گەورە بەردینەو کاروانسەراو حەمامەکان هەموویان بنەماڵەی وی دروستیان کردبوون. ئەدەنە ئەوان دروستیان کرد. نیزیکەی هەشت سەد ساڵ چوکووراوا لەژێر دەسەڵاتی وان دا بوو... ئێستا ئەم پیاوە, ئەم خانە هەقی نەبوو لە داخان شێت بێ؟ رەمەزانییەکی وا گەورە وەك بەردی بن گۆمێ لە گۆشەیەك کەوتبوو. مورتەزاغا لەو بارەیەوە زۆر بەداخ بوو, کەمی مابوو دەست کا بە گریان. بەڵام لەنەکاو هاتەوە هۆش خۆی. زانیاری و ئاگادارییەکانی خۆی هەڵسەنگاند. چەندین ساڵ لەمەوبەر هاورێیەکی زۆر نیزیکی لە بنەماڵەی رەمەزانییەکان هەبوو. ئەو هەر باسی رەمەزانییەکانی دەکردو مێژووی پرشنگداری رەمەزانییەکانی بۆ مورتەزاغا دەگێڕایەوە کە لەو کاتەوە بەشێك لە خانەکانی یوورەگیر بوون و هاتوونە چوکووراوا چییان کردوە.

رەمەزانییەکان بە درێژایی مێژوو لە بەرێوەبردنی کاروباری وڵات دوور نەبوون. ئێستاش دڵیان هەر لەگەڵ دەوڵەت بوو و رێزو حورمەتێکیان هەبوو. دیسانیش هەر خاوەن حورمەت و قەدر دەبن.

ئاوی دەریا هەرگیز وشك نابێ, لە دوارۆژێکی نیزیکیش دا تایفەی رەمەزانی ئەنکەرەی دادەگرێ. خان نەیدەتوانی بوونی عارف صائم بەگ و تازە بەسەرداکەوتووەکانی دیکە تەحەممول بکا. باشە هەقیشی بوو. راستی دەکرد. بەڵام نەدەبوو نەختێك راوەستێ؟ لە راستییش دا ئێستا تاقمێك هەرچی و پەرچی کە کەس نازانێ لە کوێوە هاتوون و تەنانەت ئەسڵ و نەسەبیشیان روون نیە بوونە وەکیلی مەجلیس و لە چوکووراوا هەڵبەز دابەزیانەو خانێکی بەو گەورەیی‌یەش گۆشەنشین بووەو بووەتە بەردی بن گۆمێ. ئەو هەقی بوو ئاوا تووڕە بێ.

وەسبەینێ ڕا راست وەختی نیوەڕۆیە سابیت بەگی پارێزەر هاتە ماڵێ رەمەزانی. جانتاکەی پڕاوپڕ بوو لە کاغەز. نامەو بروسکەکانی یەك بە یەك بۆ مورتەزاغا خوێندنەوە. ئاغا تا ئێستا وشەو رستەی وا کاریگەری نەبیستبوون. ئاشقی پارێزەر بوو.

پاش ئەوەی خوێندنەوەی نووسراوەکان تەواو بوو, خان گوتی:

"مورتەزاغا قەرەداغلی ئۆغلی, دڵنیابە, سابیت بەگ کوڕی هەق و هەقانیەتی خۆمانە, ئەو نهێنی‌یە کە بەومان گوتوە لە هیچ کوێ دەر ناکەوێ. لەو بارەیەوە خەیاڵتان رەحەت بێ".

سابیت بەگ لە کاتێك دا چاوە بادامی‌یەکانی لە روخساری مورتەزاغاوە بڕیبوون, بەدڵنیایی‌یەوە گوتی:

"دەبێ ئەوەی بزانن کە سەرمان دەچێ, بەڵام نهێنی‌یەك بە ئێمە گوترابێ لای کەس نایدرکێنین".

مورتەزاغا بە بیستنی ئەم قسانە لە خۆشی‌یان خەریك بوو باڵ بگرێ.

"بروسکەکان ئەمڕۆ دوانیوەڕۆیە بۆ ئەنکەرە بەڕێ دەکرێن, نامەکانیش دەدرێن بە پۆستەخانە".

نۆرەی دانی هەقدەست هات. لە سابیت بەگی خەمیرچی کە دەیگوت بۆ کارێکی وا کەم بایەخ هەقدەستێك وەرناگرێ, سوێندو لەمورتەزاغا کە ئیللاو بیللا دەبێ وەرگرێ سوێند. سەرەنجام سابیت بەگ نەیتوانی بەرامبەر بەو هەموو تکاو پاڕانەوەیەی مورتەزاغا خۆی رابگرێ و ئەو هەقدەستە "کەم و بێبایەخ"ەی بەدەم دا هات.

مورتەزاغا بە بیستنی رادەی هەقدەستەکە تێمیسکەی دەرکردن. ئەو هەقدەستە کەمە بۆخۆی سامانێك بوو و مورتەزاغاش لەو کاتەدا پارەیەکی وا ئەستووری پێنەبوو. لە حاڵێك دا بە شێوەیەکی نابەدڵ پێدەکەنی و کەمێکیش ناڕەحەت و شەرمەزار بوو گوتی:

"لەماڵێ ڕا بۆت دەنێرم".

سابیت بەگ گوتی: تکا دەکەم، و بە پەلە کاغەزەکانی خڕ کردەوە، هەردوو پلیکانی کردنە یەك و لە ماڵێ وەدەر کەوت. لەگەڵ هەمووی ئەمانەش دا مورتەزاغا بە خۆشحاڵییەوە لە شارۆچکە گەڕایەوە. لەم سەری بازاڕەوە تا ئەوسەر بەفیزو دەماری فەرماندەرێکی سەرکەوتووەوە دەهات و دەچوو و ملی قیت رادەگرت و سنگی ڕەپێش دەکرد. دەگەیشتە هەر کەس چاك و خۆشیی لەگەڵ دەکرد، قسەی دەکردو گاڵتەی دەکرد. بەڵام هەر کە چاوی بە عەلییەشەل دەکەوت جنۆکە دەستیان لێدەوەشاندو زمانی دەبەسترا. پێی خۆش بوو زەوی بقەڵشێ و قووتی دا. پاڕانەوەکەی ئاشی حەسەنەرەشی لەبیر نەدەچووەوە، سوێند لەسەر سوێند دەیخوارد کە نەیەڵێ شەلە زیندوو بمێنێ: لە پێش دا لاقە شەلەکەی لە پێش چاوی بە چەپەجاخی قەسابان دەبڕێ، پاشان وردە وردە کەولّی دەکاو ئەجار چاوانی دەردێنێ و ئاخرەکەی دەیکوژێ. جارێ راوەستە بەلای حەمەدۆکیان لەکۆڵ وەبێ جا دوایە. توخوا تەماشای ئەو لاقە شەلەی و ئەو چەکمە بریقەدارانەی کەن، بڕواننە دەمانچەی دەسك عاج و ئەسپی عەرەبیی بن پێی و کلاوشەبقەی سەری. وەرگێڕکەی کوڕی وەرگێڕکە. ئەو مەلادۆران ئەفەندییە، دووڕووی درۆزنە، ئەو بێقیمەتەش سزای خۆی دەبینێ. ئەو عارف صائم بەگە، ئەو جەنابی یاوەرەش سزاکەی دەبینن. کابرای پارێزەری زۆر بەردڵ کەوتبوو. ئەو هەقدەستە کەمۆکەی داواشی کردبوو کە گەڕایەوە شارۆچکە بە براکەی دا بۆی دەنارد. چونکە لە دوارۆژدا زۆری کار بەو پارێزەرە هەبوو. لە دوارۆژێکی نیزیك دا ئەو دەبوو بە وەکیل و پلەو پایەی گەورەی وەردەگرت و بۆیە زۆر بە کەلکی مورتەزاغا دەهات. مورتەزاغاش هەرچی لە دەستی هاتبایە دەرهەقی وی تەنەخیی نەدەکرد.

بەڵێ ئەم عارف صائم خانە نیازی هەیە مستەفا کەمال پاشا بکوژێ. باشە، با کەس باوەڕ نەکا. ئەگەر سابیت بەگی خەمیرچی کەیفی لێبێ کارێك دەکا هەموو دنیا باوەڕ بکا. مستەفا کەمال پاشاش دەستوور دەدا عارف صائم بەگی لەپێش چاوی خۆی لەدار بدەن.

ئیدی شەوانە خەوی ئاسوودەی نەبوو، حەمەدۆکیش لە چیاکان هیچ دەنگ و باسی نەبوو. لەوانەش بوو کوژرابێ. لەوانەش بوو ئەو چەتەیە کە تەرمەکەییان لە کانە قسڵەکان هاویشت حەمەدۆك بووبێ و لە ترسان کەس خۆی لە تەرمەکەی نەکردبێتە ساحێب. بەڵام حەمەدۆك ئەخلاقی تایبەتیی خۆی هەیە. لە جێیەك خۆی حەشار دەدا، رادەوەستێ، رادەوەستێ هەتا لەنەکاو لە جێیەك کە کەس فکری ناکا وەك ئەجەل دادەبارێتە سەر دوژمن. چما عەلی سەفابەگی بەم شێوەیە نەکوشت؟

چەتە بایرام ئۆغلی برادەری بوو. پاش ئەوەی وەبەر لێبووردن کەوت، هاتە دەشتێ و هەرگیز تاقە جارێکیش نە هاتە شارۆچکەو نە پێی وە ئەدەنە کەوت. هەرچەند وەکیلان و

نوێنەرانی مەجلیس و پاشاکان زۆر تامەزرۆی دیتنی بوون بەڵام ئەو هەرگیز لاقی لە دێیەکەی خۆیان نەبردەدەر.

لە سەردەمی عوسمانی‌یەکان دا چاردە ساڵی رەبەق لە چیاو بەندەنان سووڕایەوە، ماراش و ئەدەنەو عەنتەبی خستە لەرزین.. وەختێك کە زۆر گەنج بوو، شازدە ساڵ زیاتر نەبوو یاغی بوو و چووە کێوان، لەگەڵ ئەو هەموو لێبووردنە یەك لە دوای یەکانە کە حکوومەت بۆی دەرکردن، هەرگیز چیای بەجێ نەهێشت و خۆی تەسلیم نەکرد.

کە شەڕی سەربەخۆیی دەستی پێ‌کرد، پیاوەکانی خۆی خڕ کردنەوەو لە بەشێکی چیاکانی تووڕووس دا لەگەڵ دوژمن کەوتە شەڕ. بەم جۆرە ناوی کەوتە سەر زارو زمانان و بوو بە داستان. کە شەڕ تەواو بوو چووەوە دێیەکەی خۆیان، تفەنگ، فیشەك، خەنجەری دەسك ئاڵتوون، دووربین و دەمانچە بەقیمەتەکەی فرۆشتن، خانوویەکی ساز کردو ژنی هێنا. جووتە گایەکیشی کڕی و لە زەوی‌یەکی چەند هەکتاری دا کە لە بابی بۆی بەمیرات بەجێ مابوو، دەستی کرد بە جووت‌وگا. لەوە بەدوا ناوی ئەو قارەمانە ئازایە، پیاوی دلێری نێو گۆرانی‌یە خۆولاتی‌یەکان لەبیر چووەوەو ناوونیشانی ون بوو. چاوی زەمانە چەتەیەکی وەك ئەو زیرەك و وشیاری نەدیبوو. چاردە ساڵی تەواو لە بەرامبەر دەوڵەتی گەورەو گرانی عوسمانی دا، لە بەرامبەر ئەو فەوج و لەشکرانەدا کە بۆی دەچوون راوەستا، نە برینی گوللەی کەوتە لەش و نە خوێنی لە لووتی هات. دەڵێن یاغی ناتوانێ ببێتە حوکمداری دنیا، بەڵام بایرام ئۆغلی کە چاردە ساڵی تەمەنی لە چیاو بەندەنان بەسەر برد، بوو بە حوکمداری دنیا. ئەگەر کەسێك هەبێ دەرەقەتی حەمەدۆك بێ، هەر ئەو گورگە پیرەیەو کەسی دیکە.

مورتەزاغا جارێ لەبارەی ئەو گورگە پیرەوە نە لەگەڵ یاوەرو عارف صائم بەگ و نە لەگەڵ هیچ کەس قسە ناکا. جارێ با ئەو هەر لەوێ بێ. نیازی بوو هەر ئەم رۆژانە بچێتە سەردانی و حاڵ و هەواڵی بپرسێ و هێندێك دیارییشی بۆ بەرێ. ئەگەر حەمەدۆك دیسان هاتەوە مەیدان ئەودەم بە بایرام ئۆغلی دەڵێ: فەرموو ئەوە گۆو ئەوە مەیدان، هەرچیشت دەوێ داوا بکە...

وەسبەینێ بەیانی‌را چووە بازارو بەنیازی کڕینی هێندێ شت بۆ بایرام ئۆغلی سەری دوکانەکانی دا. دەبوو باڵتۆیەکی بارانی، دەستێك جل و بەرگ، پشتێنێکی کاری حەڵەب، سوخمەیەکی چل دوگمەی دەست درووی حەڵەب، کڵاوشەبقەیەکی فووتێرو کراسێك بکڕێ. بەڵام خۆ ئەندازەکانی وی نەدەزانی... لەنەکاو رۆستەمە کوردەی وەبیر هاتەوە. رۆستەمە کوردە هەمیشە تا زستان سارد دەبوو کووپە بریقەدارەکەی لەکۆڵ دەنا، بەنێو بازاڕی دا دەگەڕا، زەنگوڵەکەی لێ‌دەداو شەربەتی شیرین بەیانی دەفرۆشت.

دەیان گوت لە شەڕی سەربەخۆیی دا لەگەڵ دەستەی بایرام ئۆغلی چووەتە شەڕ. رۆستەمە کوردە لە جێژنی سەرساڵی کۆماردا جل و بەرگە خۆڵەمێشی‌یە پڕ گنج‌ولۆچەکەی دەستەی خۆیانی دەکردە

بەر, چەکمەکانی خۆی ـ کە بەرەکەیان دڕابوو و پڕ بوون لە کەلێن و کەلەبەرـ لەپێ دەکرد, کڵاوە کەوڵە بەرخە رەشە بەشکۆیەکەی لەسەر دەناو تفەنگەکەی ـ کە قۆنداغەکەی تەلیش تەلیش ببوو و لە جیاتی قایش هەودا بەنێکی قایمی تێخستبوو, لە شانی دەکردو ئەو سکە مسە کۆنانەی کە وەك میداڵ دەچن بە زنجیرێك وەبەرۆکی دەخستن و ئەمجار بارگینێك کە دراوسێیەکەی ئاوی پێ دەفرۆشت, پشتی بریندار بوو, لەبەر لاوازی کەلەکەی تێك قوپیبوون و پەراسووی بەدەرەوە بوون, وەری دەگرت, لێی سوار دەبوو, قەمچییە جوانەکەی خۆی بەدەستەوە دەگرت و لە رێوشوێنی جێژن دا بەشدار دەبوو. هەموو ساڵێش لە رێورەسمی جێژن دا گاڵتەو گەپی خەلکی پێ قبووڵ نەدەکرا کارەساتێکی دەخولقاندو بە هاوار کردن و جنێودان دەگەڕایەوە ماڵێ و حەوتوویەك لە ماڵێ وەدەر نەدەکەوت. لەبەر خۆیەوە قسەی دەکردن, ئاوێنەیەکی چووکەڵەی بەدەستەوە دەگرت, جێبرینەکانی زەمانی شەڕی یەك بە یەك بەخۆی نیشان دەدان و دەیگوت: بڕوانە, بڕوانە رۆستەمە کوردە باش بڕوانە, ئەم برینانە کەلکی هیچیان نەبوو, بەڵام ئەوانەی بە بیستنی دەنگی تەقە کونەمشکیان لێ دەبوو بە قەیسەری, بوونە قارەمان, دەوڵەمەند بوون و کێلگەکانیان داگیر کردن. بڕوانە, بڕوانە, باش بڕوانە رۆستەمە کوردە ئەتۆش نەبوویە هیچ گوویەك.

"ئۆۆۆ سلاو کاك رۆستەمە کوردە".

رۆستەم لە دەری شاری لەولای گۆڕستان بە دەستی خۆی بە تەنەکە بەتاڵ و داری بێکەلك و دڕكوداڵ خانووی دروست کردبوو و لەگەڵ شەش منداڵی سەروپێچکەو ژنە جحێڵەکەی تێی دا دەژیان.

رۆستەم غاری دایە دەرێ و لە حەوشی ماڵەکەی پێشوازیی لە مورتەزاغا کرد:

"فەرموو خان. فەرموو ئاغا. فەرموو ئاغا فەرموو, ئەی بابە ئاغایەکی گەورەی وەك جەنابیشت دێتە ماڵی رۆستەمە کوردە؟".

مورتەزاغا نەچووە ژوورێ, لەپەنا ماڵێ لەسەر بەردە قەبرێك دانیشتن, رۆستەم لەوە کە ئەوی وەچنگ کەوتبوو هەستی بە بەختیاری دەکرد. پێی گوت: بڕوانە ئاغا...

مورتەزاغا دەیزانی چیی بەسەر دێ, بەڵام چار نەبوو دەبوو تەحەمولی هەبێ.

"فەرموو رۆستەم...".

"بەدمەزەب, ئەتۆ کەنگێ چوویە چیا, کەنگێ تاقە گوللەیەکت بە دوژمنەوە نا کە میداڵیان دایەی؟ بلێ بزانم, یاڵلا بلێ...".

"ئێ... ئێمەش هەر ئەوەندەمان لەدەست دەهات...".

"وەختێك دوژمن هاتە شارەکەتان و ئێمەش هاتین شارمان لە دەست دوژمن دەرهێنایەوە، ئەمن تۆم لە کادێنێ دا نەدیتەوە کە خۆت لە کایە خزاندبوو و سەدوپەنجا جووجیلەو رەوەیەك مریشکە بەکورك لەسەر سەرت غارغارێنیان دەکرد؟ ئەمن دەستم نەگرتی و نەم هێنایەدەر؟"

"با وابوو، باشە چیم کردبا، گیانی بنیادەم خۆشەویستە..."

"هەهەها. گیانی بنیادەم خۆشەویستە بەڵێ؟ ئەدی ئەو میداڵە کێ پێی دای؟ کێ دایەی؟ ئەو جووجیلانە کە لەسەر سەرت دەهاتن و دەچوون؟".

"باشە، چما چ بووە ئەمن میداڵێکم وەرگرتوە؟".

"باشە، ئەی بۆ نەیان دا بەمن؟"

"ئەتۆ غەدرت لـێکراوە"

"زۆر باشە، با لەتۆ بگەرێین، ئەو تاشکەن بەگە چی؟... لەماوەی شەڕدا تاقە جارێکیش لەماڵێ هاتەدەر؟ تۆ ویژدانت راست برۆ..."

"نا، نەهاتەدەر".

"بڵێ بزانم ئەدی ئەو هەموو زەوی و زارەیان بۆ داوەتێ؟ یان ئەو زولفۆ تووتکەسەگە. چما ئەو جاسووسی فەرانسەیی‌یەکان، سەگی فەرانسەیی‌یەکان نەبوو؟".

"با، سەگیان بوو".

"یان ئەو عارف صائمە؟ رۆژێکیان خۆم گۆرِی و لە چیای هاتمەخوار..."

"هاتیەخوار..."

"هەر هاتمەخوارو جەندرمە گرتیانم و بردیانمە لای عارف صائم. ئەویش گوتی ئەمە لە پیاوەکانی مستەفا کەمال پاشایەو لەبن داران دا رایان خستم... سێ شەوو رۆژان لێیان دام. ئەمنیش وام نیشان دا کە لاڵم و لە هیچ حاڵێ نیم. ئاخرەکەی گیانی شیرنم لە دەستیان نەجات دا: ئێستا ئەو...".

ئەمجار رۆستەمە کوردە یەك بە یەك ئەوانەی لە شەرِی سەربەخۆیی‌دا بەشدار ببوون و ئەو کەسانەی رایان کردبوو، هەمووی ژماردن و ناوی بردن. رەگی ملی وەك کلکەتەشی هەستابوون و هەموو ملی ببووە دڵۆپە ئارەق.

"ئێستا ئەوانەی خۆیان داویشتە سەر لاقانم و لەسەر رێگام رادەوەستان هەتا بیان بینم و جوابی سڵاویان بدەمەوە، گاڵتەم پێدەکەن، تەنانەت پیاڵەیەك شەربەتی شیرن بەیانم ناخۆنەوە، بەخۆرایش دەیان دەمێ نایخۆنەوە".

"بنیادەم شیری خاوی خواردوە".

رۆستەم لەمێژ ساڵ بوو لە هەر جێیەك یەكێك لە ئاغاكانی گیر كەوتبایە، ترسەنۆكی و هەزار روویی‌یەكەیانی بەچاودا دەدانەوە، بەڵام بەو حاڵەش قەت كاریان بە كاری نەبوو، پارێزیان لـێ‌دەكردو هەرچی گوتبای قووتیان دەداو دەنگیان دەر نەدەهات.

"فەرموو ئاغا، بم بوورە پاش چەند قەرن هاتوویە ماڵەكەم، بەخێربێی بەرەكەتت هێنا. خوا كوێرم كا، خەریكم قسەی كاڵت پێ دەڵێم. فەرموو مورتەزاغای گەورە، هەر فەرمانێكت هەبێ بەسەرچاو".

مورتەزاغا لە دڵی خۆی دا گوتی: لە ئاخی دڵەوە چەندم ئەو كوردەیە خۆش دەوێ".

"رۆستەم، ئەتۆ بایرام ئۆغڵیی دەناسی، وەنا؟".

لە حاڵێك دا هەڵدەستایە سەر پێ بە شانازی و خۆڕانانەوە گوتی:

"دەكرێ نەی‌ناسم؟".

دووبارە لە جێی خۆی دانیشتەوەو گوتی:

"لەم چیایانە، لە چوكووراوا تاقە یەك پیاوی ئازا، ساف و پاك وەك منداڵێك و تاقە یەك پیاوی پیاو هەیە، ئەویش بایرام ئۆغڵی‌یە. ئەو هەرگیز درۆ ناكا، لەگەڵ منداڵان وەك منداڵ وایەو لەگەڵ پیاوی گەورە وەك پیاوی گەورەیە. ئەمن پێنج ساڵ لەگەڵ وی لە چیاو بەندەنان گەڕاوم. دوو ساڵیش لەگەڵی شەڕی دوژمنم كردوە. لەو كاتەوە هاتوومە سەر دنیا زۆر كەسم دیوە، زۆر كەسم ناسیوە، بەڵام كەسی وام نەدیوە. ئێستا ئەتۆ بڵێ ئەمن بۆچی لە چیای هاتمە خوارێ، لەبەر خاتری كێ چیاو بەندەنم بەجێ هێشتن و كووپە شەربەتم بە كۆڵێ‌دا دا؟ دەبڵێ..."

"لەبەر خاتری كێ؟".

"پێت وایە لەبەر خاتری كێ؟ لەبەر خاتری بایرام ئۆغڵی... وەختێك شەڕ تەواو بوو، ئێمەی لە دەوری خۆی كۆ كردەوە. گوتی: حكوومەت لە ئێوە بووردوە، ئێستا بچنە دەشتێ هەركامەی كارێك بۆخۆتان پەیدا كەن، تخوونی حەرامی مەكەون. كەسیش ئەزیەت و ئازار مەدەن. گوتی: چونكە هەرچۆن بێ ئێوە بوونە بەشێك لە مێژوو، بوونە نووری چاوی میللەت. بایرام ئۆغڵی تەنیا ئەم درۆیەی كرد... نە ئێمەو نە ئەو هیچ كامان نەبووینە نووری چاوی میللەت.

"وەك بیستوومە لە باری ماڵی‌یەوە وەزعی زۆر خەراپە".

رۆستەمە کوردە گوتی:

"زۆر خەراپە. ئەویش چۆن... هەموو ساڵێ بۆخۆی، منداڵەکانی و خێزانی بۆ پەمۆ چنینەوەو دروێنەو کێشەو گێرە دێنە چوکووراوا، ئەگینا دەبێ برسی بن. ئەمن جێژنی هەموو ساڵێك... ـ دەستی بە زگیەوە گرت و قاقا دەستی کرد بە پێکەنین ـ هەموو ساڵێ پاش جێژنی کۆمار دەچمە لای. کە دەچمە لای ئەویش زۆر خۆشحاڵ دەبێ. دیاریی بۆ دەبەم قەند، چا... ئەو زۆری چا پێخۆشە. تەنانەت ئەودەم کە لە چیاو بەندەنان بووین، کەتریی چای پێ بوو. ئەگەر قەندیشی نەبایە گرنگ نەبوو. ئەگەر چاشمان نەبایە گیای کێویی دێم دەکردو دەیخواردەوە. ئەو گیاکانی دەناسی"

"ئەو بەژن و باڵای چۆنە؟".

رۆستەمە کوردە کە بۆنی شتێکی کردبوو، خۆشحاڵ بوو:

"بەژن و باڵای ویت بۆ چیە ئاغا؟ تێگەیشتم..."

پاشان جۆرێك پێکەنی کە ددانە سپیەکانی کە دەت گوت مروارین دەرکەوتن:

"دەتەوێ دیاریی بۆ بەری ـ هەستایە سەر پێ ـ بڕوانە بەژنی ئاها... ئەمەندەیە، لە شەڕو دەعواکان دا هێندێ جار پێڵاوی یەکتریمان لەپێ دەکرد. ئەمن کوردم و ئەو تورکمەن، بەڵام خوا تەختەتاش نیە، تەختە رێکخەرە"

"ئێستا کەوایە هەستە بچینە لای خەیات ئەندازە بگرە، بچینە لای کەوش فرۆشیش... حەز لە چەکمە دەکا؟"

"بەڵێ ئەودەم حەزی لێدەکرد، ئێستا دێهاتیەکی هەژارە. ئەگەر جووتێك قۆندەرەی سووری بۆ بکڕی خۆشحاڵتر دەبێ، ئەو پانتۆڵی سوارییە لەپێ ناکا، پانتۆڵی وەك ئەوەی عەلیەشەل لەپێ ناکا، کڵاوشەبقەش لەسەر نانێ".

"تێگەیشتم".

"ئەی خوا بت پارێزێ ئاغا... ئەمن دەزانم لە چوکووراوا ئاغای وەك تۆ پەیدا نابێ. ئەو دەمانچەو چەك و ئەسپیشی ناوێن..."

مورتەزاغا لە پێشەوەو رۆستەمە کوردە لە حاڵێك دا لە خۆشیان لاقی تێك بادەدران بە دوای دا بەرەو بازاڕ وەڕێ کەوتن.

"ئەتۆ شێر دەرچووی کوڕی قەرەداغلی، هیچ کەس، تەنانەت مستەفا کەمال پاشاش نەیتوانی ئەم کارە بکا. چما دەکرێ مستەفا کەمال پاشا ناوی ئەو سەربازە ئازاو بەغیرەتەی

نەبیستبێ. چما لەم جیهانەدا کەس هەیە ناوی بایرام ئۆغلیی بەرگوێ نەکەوتبێ. ئەی یاخوا بژی. بە کێ دەڵێن ئینسان؟ کەسێك ئینسانەتیی هەبێ و قەدرو قیمەتی خەڵك بزانێ"

ڕۆستەمە کوردە لە حاڵێك دا وەك منداڵێك خۆشحاڵ بوو, هەتا گەیشتە بازاڕ بە سەرسوڕمانەوە باسی ئەمەگناسیی مورتەزاغای کردو لە کاتێك دا پڕ بەدڵ خۆشی دەویست و باوەڕی پێی هەبوو, تاریفی کردو گەیاندیە ئاسمان. ئەمجار لە سەری بازاڕی ڕاوەستا, چاوەکانی پڕ لە فرمێسك بوون. گوتی:

"ڕاوەستە ئاغا, ڕاوەستە گوێت لەمن بێ, ئێستا کە ئەو ئینسانەتی‌یەت دەرهەقی بایرام ئۆغلی کردوە لەمەودوا, تا ئەم گیانە قوربانی تۆیە, لە ڕێی تۆدا بەخت دەکرێ. لەمەودوا هەرچی ویستت لەمن داوا بکە".

چەند ڕۆژ دواتر مورتەزاغا پاکەتە چایەك و نیو هۆقە شەکری کە ڕۆستەمە کوردە بۆ بایرام ئۆغلیی ناردبوون, لە خورجینێك کە دیاری‌یەکانی خۆشی تێدا بوون, هاویشتن و وەڕێ کەوت. نوقمی خۆشحاڵی بوو. بە ڕاگرتنی دڵی بایرام ئۆغلی و ڕۆستەمە کوردە دەی‌توانی بە مەیلی خۆی لەو دوو پیاوە کە لەبیر چووبوونەوە کەلك وەرگرێ.

گوندی بایرام ئۆغلی و ئەوانەی زۆر لەوەپێش ئەوکات کە منداڵ بوو, دیتبوو, ڕێگاکەشی باش شارەزا نەبوو, جڵەوی ئەسپەکەی بەردابووەوەو بۆخۆی لەگژ فکرێکی قووڵڕا چووبوو: بایرام ئۆغلی: پیاوێك کە وەختی خۆی ئەگەر ناوی دەهات خەڵك بۆ ڕێز لێ‌گرتنی سەریان دادەنواند بۆچی وای کرد؟ و بۆچی هەر کە شەڕی سەربەخۆیی تەواو بوو, ئیدی دەرنەکەوت و لە دێ‌یەکی چەپەك دا ملی لە جووت و گا ناو تووشی هەژاری و نەداری بوو؟ لەکاتێك دا ئەگەر ویستبای باشترین کێڵگەکانی چوکووراوا دەبوونە هی ئەو, سواری ئەسپی عەرەبی دەبوو و منداڵەکانیشی بۆ خوێندن دەچوونە ئورووپا چیی بۆ پێش هات کە ئاوا دەستی لە دنیا بەرداو لە هەموو شتێك و لە هەموو کەس کشایەوە؟ مورتەزاغا زۆر تامەزرۆ بوو هۆیەکەی بزانێ. داخوا ئەو چۆن پیاوێك بوو؟ لەبارەی حەمەدۆکەوە چۆنی بیر دەکردەوە؟

ئەو شەوە بوو بە میوانی چادری کۆچەری‌یەك, هەرچەند عێلات ئەو ژیانی پڕ شکۆو ئێرەیی بزوێنی جارانیان نەمابوو, بەڵام دیسانیش میوانداری‌یەکی باشیان لێ‌کرد. سێ دۆشەکیان بۆ ڕاخستن و ڕووپۆشی ئەتڵەسیان بۆ پێدا دا. جێ‌یەکەی بۆنی خۆشی پەریوەشانی لێ‌دەهات. سەرینەکەی لە تووکی قوو بوو. ئەوەندە نەرم بوو هەر سەری وێ کرد خەوی لێ‌کەوت. بۆ سبەینێ ڕا بەیانیی زوو بە دەنگی حەپەی سەگەل و دەنگی زەنگوڵەو قاڕوهۆڕی مەڕو ماڵات وەخەبەر هات.

هەر کە چاوی هەڵێنا کچێکی جحێڵی لەژوور سەری خۆی دی. شیرقاوەیەك کە لەسەر سینی‌یەکی زێو بە دەستی کچەکەوە بوو، هەڵمی لێ‌هەڵدەستا. بنە فنجانەکە زێڕ بوو. بێ ئەوەی لە جێ‌یەکەی بێتە دەرێ قاوەکەی وەرگرت و هەڵی قووڕاند، پاشان خۆی پۆشتە کردەوەو لە چادرێ وەدەر کەوت.

لە دەری تاوڵێ هەر ئەو کچە جحێڵەی چەند لەحزە پێشتر ئافتاوەیەك بەدەستەوەو خاولی‌یەکی وەك بەفر سپی بەسەر شانەوە بە لەگەنێکەوە چاوەڕێی بوو. بەدۆڵەکەدا چووە خوار، چووە پشت بەردێك و لە خوارەوەی کانی‌یەك کە لە پێش بەردەکە دەهاتەدەر دەستی بەئاو گەیاند. وەختێك هاتەوە کچەکە هەر لەوێ چاوەڕوانی بوو. دەم و چاوی بە سابوون شوتن. کیژەکە بە ئارامی و بە ئەندازە ئاوی بە دەستان دا دەکرد.

لەگەڵ سەرهۆبەکە لەسەر سفرەی قاوڵتی دانیشتن. سفرەکە هەنگوینێکی زۆر سپیی لەسەر بوو. هەنگوینەکە بۆنی خۆشی جۆرە گوڵێکی لێ‌دەهات کە نەی‌دەزانی چیە.

سەرهۆبەکە کە بابی وی باش دەناسی، باسی زەمانی قەدیم، سەردەمی پێش نیشتەجێ‌کردنیان کرد.

پاش قاوڵتی سەرهۆبەکە شەهێنێك و کەوڵە ئاسکێك و خورجێنێکی مافوورەیی بەدیاری دایە. لە پێش هەر چادرێك دارێك چەقیبوو و لەسەر هەر دارێکیش شەهێنێك هەڵنیشتبوو کە بە چاوێکەوە کە وەك بریسکە دەدرەوشا تەماشای ئاسۆی رووناکی دەکرد.

سواری ئەسپەکە بوو و بەنێو مێگەلە مەڕو وشترو ئەو ژنانەدا کە لیباسی رەنگاوڕەنگی زۆر جوانیان لەبەردا بوو تێ‌پەڕی. سەگانی سەر مێگەلی هۆبەکە هەریەکەی بەقەد ئەسپێك دەبوون، هیچ سەگێکی پێ نەوەڕی. لە دڵی خۆی دا گوتی: سەگی عێلات لەخەڵکی چوکووراوا بەئەدەب ترن.

چیای دوڵدوڵ لەوبەرەوە بەدوندی باریکیەوە هێدی هێدی لەبن تەم و مژ دەهاتەدەر، مژێکی قورس لەرەنگی مس لە پشت کێوەکان و لە ژوور کێوەکانەوە کە دەت گوت سەرزەمینێکی ئەفسووناوی لە دنیایەکی دیکەن، بەئارامی بەرز دەبوو. هەر لەو لەحزەیەدا هەتاو لە دوندی دوڵدوڵی دا، لووتکەی چیایەکە لە رووناکی دا نوقم بوو، و وەك ئەستێرەیەك دەستی کرد بە درەوشانەوە. ئەو شەهێنەی بەدەستیەوە بوو، باڵە پانەکانی لێك دەکردنەوەو ئەندامی لەشی لەبەر یەك دەکێشانەوە. بە چاوەکانی کە دەت گوت بریسکەن دەی‌ڕوانیە دەوروبەر. لەوە کە ئەو شەهێنەی هەبوو، زۆری بە خۆی دەنازی. عێلات شەهێنی خۆیان تەنیا بۆ میوانی زۆر بەنرخ و بەرێز دەکردە دیاری.

مورتەزاغا کەیفی ساز بوو، فکری لەوە دەکردەوە ئەگەر ئەمساڵ زستانێ کۆچەری‌یەکان هاتنە دەوروبەری ئاناوارزا بێ ئەوەی قرۆشێکیان لێ وەرگرێ خۆیان و مەڕو ماڵاتیان لە

گیاجاڕە بێ سەروبنەکانی خۆی دا بخاوێنێتەوە. نەیتوانیبوو ئەم نیازەی بە سەرهۆیە بڵێ. چونکە پێشنیارێکی وا پاش وەرگرتنی شەهێنەکە بە جۆرە بێحورمەتی‌یەك دەژمێردرا. بەڵێ. ئەو مورتەزاغا بوو, رۆڵەی وەچەیەك لە رەگەزێکی دنیادیتووی ساردوگەرمی رۆژگارچێشتوو. هەرچۆنێك بایە رێگایەکی دەدۆزیەوەو بە وردبینی‌یەکی شیاوەوە هۆبەو هەوارەکەی دێنایە کێلگەی خۆی.

لە بەرامبەری‌یەوە چیای دوڵدوڵ بەرەو بەرزایی سەر دەکەوت, ئەو ئەسپەی لەبنی‌دا بوو ئەسپێکی بەتاقەت بوو کە لەو هەموو هەورازە سەرکەوت و نەی‌گوت ئاخ.

لە رێگادا چەند کەسێکی دیتن کە تەوربەدەست لەنێو لێڕەوارە چڕەکە دەهاتنەدەر. سۆراغی گوندی بایرام ئۆغڵیی لەچەند کەس پرسی. نە کەس بایرام ئۆغڵیی ناسی نە کەس بە گوندەکەی زانی. لەسەر رێگا لە دەشتێکی پان و بەرین و سەرسەوز کە چەند سەرچاوەی لێ‌هەڵدەقوڵین, تووشی هۆبەیەکی دیکە بوو. ئەوان بایرام ئۆغڵی‌یان دەناسی و شوێنی دێیەکەشی‌یان پێ‌دەزانی. رێگایان پێ نیشان دا.

دوانیوەڕۆ بوو کە گەیشتە ئاوەدانی. دێیەکی چەند ماڵی بوو کە خانووەکانی بە قوڕو بەرد دروست کرابوون, لە پێش هەر ماڵێك چنارێکی ئەستوور هەبوو کە لك و پۆپەکانی گەیشتبوونەوە سەر خانووەکان و لەبن هەر چنارێکیش کانی‌یەکی پڕ ئاو هەڵدەقوڵی.

پرسیاری ماڵی بایرام ئۆغڵیی لە ژنێکی بەساڵداچوو کرد کە رووبەڕووی دەهات. ژنەکە جڵەوی ئەسپەکەی گرت و هەتا بەردەرکی ماڵێ بایرام ئۆغڵی رای‌کێشاو بە مزگێنی پێدانەوە بانگی کرد:

"هۆ...ی بایرام ئۆغڵی, میوانێکی غەریبەی شەهێن بەدەستت بۆ هاتوە".

بایرام ئۆغڵی بە بیستنی دەنگی ژنەکە هاتەدەرێ, جڵەوی ئەسپەکەی گرت و گوتی:

"فەرموو ئاغا, بەخێر بێی بەرەکەتت هێنا".

مورتەزاغا خورجێنێك کە لە پاشکۆی ئەسپەکەی قایم کرابوو, لێی کردەوەو لە عەرزی دانا. بایرام ئۆغڵییش ئەسپەکەی بردو لە قیسپە پەرژینێکی نیزیك ماڵێی خست و پاشان بە چوستی و چالاکیی کوڕە جحێڵەیەك غاری دایەوە لای مورتەزاغا. شەهێنەکەی لێ وەرگرت و لەولاتر لەسەر لکەدارێکی داناو بەستیەوە.

"بەخێر هاتی, بەرەکەتت هێنا".

چەند ژن لە ژووری ڕا دۆشەکیان هێناو لەسەر نیوتەختە دارەکەی بن چناری ڕایان خست.

"فەرموو, ئێستا فەرموو, قاوەی چۆنت پێ خۆشە؟".
"کەم شەکر".
بایرام ئۆغلی رووی دە مالێ کردو گوتی:
"دوو قاوەی کەم شەکر".
لە حالێك دا بۆخۆی هەمیشە قاوەی تالی دەخواردەوە, بۆ ئەوەی نەبێتە بێحورمەتی بە میوانەکە بۆخۆشی قاوەی کەم شەکری داوا کرد.
مورتەزاغا لەسەر نیوتەختەکە دانیشتبوو بە سیلەی چاو لە بەری پێ را تا تۆقی سەری لە بایرام ئۆغلی ورد دەبووەوە, ئەمجار تەماشای چیای دولدولی دەکرد. ئەو پیاوەی رۆژگارێك ئەم چیایانەو ئەم دەشتانەی هێنابووە لەرزین داخوا راست ئەو پیاوەیە کە لەبەر کزی و لاوازی ئێسکی دەرپەریون و فووی لێکەی با دەیبا؟ بایرام ئۆغلی برۆیەکی ئەستوورو پری هەبوون. چاوە شینە پر بلێسە دەقوولی کەوتووەکانی لەبن ئەو برۆ پرانەوە, راست وەك چاوی ئەو شەهێنە دەچوون کە لەسەر لکە دارەکە هەلنیشتبوو. دەستی ئەو پیاوە باریك و ریش تەنك و سپییە ئەوەندە گەورەو بەهێز بوون کە بنیادەم لێیان دەترسا. دەلینگ و زارەگیرفانەکانی پانتۆلە کال بووەوەو رزیوەکەی ریشال ریشال ببوون. دیار بوو کالە چەرمە خاوەکەی بۆخۆی هەلبەستوە. کراسە خەت خەتەکەی پاك و خاوێن بوو و بۆنی سابوونی لێدەهات.
مورتەزاغا بە خۆیەکەم گرتنەوەو بە حالەتێك کە دەت گوت پێی شەرمە ناوی خۆی بلێ, گوتی:
"بایرام ئۆغلی, ئەمن مورتەزاغا قەرەداغلی ئۆغلیم. چەند رۆژ لەمەوبەر لەگەل رۆستەمە کوردەی خۆمان باسی تۆمان دەکرد. لەپر بە دلم دا هات و بە رۆستەمم گوت: کورە دەلێی چاومان کوێر بووەو دنیایە نابینین. گوتم هەر کە شەر تەواو بوو ئێمە ئەو پیاوە جوامێرەمان لێ بوو بە بەردی بن گۆمێ و لەبیرمان چوو. گوتم ئاخر رەوایە, ئاخر بەمە دەلێن ئینسانەتی؟ ئەمن گوتم دەمەوێ بچمە سەردانی ئەو پیاوە ئازاو مەزنە کە لەبیر خۆمان بردوەتەوە. گوتم دەمەوێ بچمە سەردانی بایرام ئۆغلی".
"خۆش بی ئاغا".
بایرام ئۆغلی بە شێوەیەکی سەیرو بە چاوێکی پر پرسیارەوە لە چاوی مورتەزاغاوە رامابوو, مورتەزاغاش ناچار دەبوو چاوی لێ وەرگێرێ, ئەویش چاوی لە دووی چاوی مورتەزاغا دەگێراو بۆ هەر لایەك وەرسوورابایە دەیقۆزتەوە. بایرام ئۆغلی دەیزانی ئەم

ئاغایانە هەتا قازانجێکی تێدا نەبینن و دوعاو پاڕانەوەیەکیان نەبێ, نایەنە لای. مورتەزاغاش دەیزانی ئەو ئەم هەستەی تێدایەو زۆر بەنیاز نەبوو ئەم جارە باسی حەمەدۆکی لەگەڵ بکا. تەنانەت ئەگەر بۆخۆشی باسی کردبایە, دیسان مورتەزاغا نیازی وابوو خۆی بەرامبەر بە مەسەلەی حەمەدۆك بێمەیل نیشان بدا.

قاوەکەیان هێنا, هەڵمی لێ هەڵدەستاو بۆنی خۆشی خۆی لەو هەوا پاکەدا بڵاو دەکردەوە. باسی رابردووی دووریان کرد, باسی شەڕی سەربەخۆیی, ئەو ساڵە رەشانەو ئەو یاغییانە کە لەم شەڕەدا بەشدار بوون. باسی سولەیمانە کوردەو گزیك دۆرانیان کرد.

بایرام ئۆغلی بە سەنگینی و بێفیزی گوتی:

"ئەمن, ئەمن هەم سولەیمانە کوردەو هەم قەرە ئیلان و هەم گزیك دۆرانم دەناسی. قەرە ئیلان پیاوێکی جوامێرو ئازاو بەغیرەت بوو, کەس وەك خۆی زیرەك نەبوو. هانیەی خوشکی, خێزانی سولەیمانە کوردە بوو.

سولەیمانە کوردە یاغییەکی بەڕاستی و بەمێشك بوو. هەر ئەویش بووە هۆی ئەوە کە قەرە ئیلان لەگەڵ فەرانسەییەکان شەڕ بکا. ئەویش لەشکری گەورەی فەرانسەییەکانی لێك بڵاو کرد. گزیك پیاوێکی ئاقڵ بوو, بەڵام بوو بە قوربانی پیاوەتیی خۆی, ئەگەر مابایە سەرانسەری چوکووراوای دەگرت و دەیکردە کێڵگەی خۆی. ئەودەم دەهات و لەسەر مەزرایەکی وا پان و بەرین ئۆتۆنۆمیی رادەگەیاندو حکومەتی دەکرد. عارف صائم لە چاو وی بووکەشووشەی منداڵان بوو. عارف صائمیش باش دەناسم. بەڵایەکی بەسەر هێنام هەر مەپرسە. دەیگوت ئیللاو بیللا دەمەوێ بچمە لای فەرانسەییەکان".

مورتەزاغا پرسی: بایرام ئۆغلی, ئەتۆ بۆچی لەم کێوپارەیە گیرساویەوە؟".

بایرام ئۆغلی بەسپایی پێکەنی:

"کابرای یاغی یان تا ماوە یاغی دەبێ, یان وەك من دەمرێ. کە شەڕ تەواو بوو ئەمن بەخۆمم گوت... ناتوانم لە کەسانێك یاغی بم کە لە یەك ریز دا لەگەڵ یەکتر شەڕی دوژمنمان کردوە. ئەمن لە ژێر فەرمانی مستەفا کەمال پاشادا دژی دوژمن شەڕم کردوە. وەختێك ئەو دەسەڵاتی بە دەستەوە گرت ئەم دەتوانی دژی وی شەڕ بکەم. چوومە کن دۆغان بەگ گوتم: دەمەوێ بچمەوە دێیەکەی خۆمان, ئەویش گوتی کاری چاك دەکەی. ئەو لە من و لە قسەکانم حاڵی بوو. بەڵام ئەو عارف صائمەو قلیچ عەلی لە کۆڵم نەبوونەوە: زەویت دەدەینێ, ماڵ و ملکت دەدەینێ. فلانت دەدەینێ و فیسارت دەدەینێ..."

"بۆچی قبوولْت نەکرد؟".

"باشە, ئەودەم ئەمەش دەبوو بە جۆرە چەتەیی‌یەك... ئەوان بۆچی دەیانەویست ماڵ و مڵك بدەن بە من, چما ئەمن چیم کردبوو. چەند گوللەم بە فەڕانسەیی‌یەکانەوە نابوون. ئەو چەند گوللەیە کە دەمەویست بە جەندرمەکانی خۆمانیانەوە بنێم, بە دوژمنانمەوە نان, کاری من یاغی‌یەتی بوو. ئێستا گوللەم لەجیاتی ئەم بەر بەو بەرەوە نا...".

"نا بایرام ئۆغڵی یەکجار واش نیە".

"بایرام ئۆغڵی دووپاتی کردەوە:

"بۆچی وانیە, راست وایە. ئەوان دەیانەویست ماڵ و مڵك و مەزراو پووڵ بدەن بە بایرام ئۆغڵیی ڕێگر. بڕوانە مورتەزاغا, باشت گوێ لەمن بێ, ئەتۆش ئەمڕۆ لەبەر چاوی کاڵی من نەهاتوویە لام. هاتوویە لای بایرام ئۆغڵیی چەتە, بژی, خۆش بی, میوانمی. بەخێر بێی سەر تەپڵی سەرم. لەو وەختەوە چەتەییم وەلا ناوەو تفەنگم فڕێ داوە هەتا ئێستا لە ڕۆستەمە کوردەو هاوالآنی دەستەکەم بەولاوە کەس لێی نەپرسیوم... ئەتۆ یەکەم کەسی, پێم بڵێ چت لەمن دەوێ؟".

مورتەزاغا لە قوژبنێك کوشم هەلآتبوو, ئەگەر ئەوەی لە دڵیدا بوو پێی دەگوت هەموو نەخشەکانی تێك دەچوونەوەو بایرام ئۆغڵییش تازە هەرگیز چاوی لە چاویی نەدەکردەوە.

مورتەزاغا بێ ئەم لاو ئەولا گوتی:

"ئەمن هیچم ناوێ. تەنیاو تەنیا بۆ سەردان هاتووم, داخوا پیاوێکی وەك من ئارەزوو ناکا پیاوێکی وەك تۆ ببینێ؟ ئەوانەی تاقە گوللەیەکیشیان بەدوژمنەوە نەنابوو, و کاتێکیش دوژمن هات, لەبن داوێنی ژنەکانیان دا خۆیان شاردەوە ئێستا بوونە قارەمان و دوژمن شکێن. دنیایەك ماڵ و ملکیان وەرگرتوە. پیاوێکی وەك تۆش بێ ئەوەی ناچار کرابێ, هاتوە لێرە فەعلەیی دەکا. ئەودەم کە ئەتۆ چیاو بەندەنت بەجێ هێشتن و هاتیەوەو ئەو پێشنیارەت قبووڵ نەکرد چی‌یان بۆ هەڵنەبەستی. هیچ زانیوتە دەڵێن لە چیای دولدوڵ خەزنەیەکی هەیە بەقەد خەزنەی پادشایەك؟".

"زانیومە".

"دەزانی کە دەڵێن ئەتۆ هەر بۆیە بۆ عەمەلەیی دەچیە چوکووراواو خۆت رووت و برسی نیشان دەدەی هەتا مەسەلەی خەزنەکە داپۆشی؟".

"دەزانم".

بایرام ئۆغڵی بە شێوەیەکی ناسك و منداڵانە پێدەکەنی.
مورتەزاغا گوتی:
"لەبارەی رۆستەمە کوردەشەوە پازدە ساڵ باوەڕیان نەکرد کە پارەی نیە. لەبارەی ویشەوە گوتیان بۆ شوێنەونکە کووپە شەربەتی بە کۆڵێدا داوە. خەڵك بەردەوام دەیان گوت: ئاها... کوردە ئەمساڵ خەزنەکەی ئاشکرا دەکا, ئاها... ساڵێکی دیکە ئاشکرای دەکاو چەندین خانوو و حەمام و کێلگە دەکڕێ. کەچی چەندین ساڵ تێپەڕین و کووپەی شەربەتی شیرین بەیان لە پشتی رۆستەمە کوردە نەهاتە خوار. وەختێك رۆستەمە کوردە ئەوانی لە بارەی خەزنەکەوە ناهومێد کردو خەڵك لێیتەمابڕاو بوون, لەگەڵ ئەو بەستەزمانە بوونە دوژمن. چووە هەرجێیەك, هەر کارێکی کرد, دەستیان کرد بە تەوس و توانج تێگرتنی, ئەویش چاری نەبوو, تێکەڵ بە گاڵتەو گەپی ئەوان بووو بۆ خۆی سەری هاویشتە سەرخۆی".
"دەزانم ئاغا, پیاوێکی جوامێرو ساغ و بە تاقەتە, ئەمن چەندین ساڵ لەگەڵی لە چیاو بەندەنان بووم و دیومە کە لە بن هیچ گیروگرفتێك دا نەچەماوەتەوە. گەیشتوومە ئەم تەمەنە, تا ئێستا پیاوی وا پاك, خۆش ئەخلاق, چاك و ئازاو ئاقڵم نەدیوە. ئەگەر ئەو بێهەوێ بە شەوێك نیوەی حەشیمەتی دێ ئەنجن ئەنجن دەکا. پیاوی وەك خۆی چوست و چالاکم نەدیوە. ئاغا پێم بڵێ بزانم چت دەوێ".
دووبارە چاوی لە نێوێ چاوی مورتەزاغاوە بڕی. ئەو چاوی خۆی لە چاوی بایرام ئۆغڵی دەشاردەوە بەڵام سوودی نەبوو. چاوە پۆڵایینەکانی بایرام ئۆغڵی دەهاتن و لە چاوەکانی دەچەقین. بایرام ئۆغڵی ئارام و زیرەکانەو بە گوزەشتەوە پرسی:
مورتەزاغا لەبارەی حەمەدۆکەوە دەتەویست پرسیارم لێبکەی؟".
مورتەزاغا بە رەنگ و روویەکی زەردەوە جوابی دایەوە:
"نا".
چۆنی غافڵگیر کرد, نامەردبابە, دڵی پیاوی دەخوێنێتەوە... لە نەکاو هاتەوە سەر خۆی و لێی پرسی:
ناوی عەلییەشەلت بیستوە؟"
بەڵام ئەم قسە گۆڕینەش کەلکی نەبوو, بایرام ئۆغڵی گوتی:
"دەیناسم. ئەو وەختی چەتەییم دەکرد, ئەگەر پیاوێکی وام هەبایە, نەك هەر دەبوومە یەکە رێگری دنیا, بەڵکوو دەبوومە پادشای جیهان".

مورتەزاغا نالآندی: ئەریّ وەڵلا.

ئەم جار یەك تەکان بەسەرهاتی خۆی و عەلیەشەلی بەو جۆرە کە ببوو بیّ کەم و زیاد گێڕایەوە:

بایرام ئۆغلی بە گوتنی رستەی "باشت رەفتار لەگەڵ نەکردوە" دڵ پەرۆشیی خۆی نیشان داو گوتی:

"پیاوی وەك وی تاك و تەرا دێنە سەر دنیا. ئاخر دەکریّ پیاو لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانە وا رەفتار بکا؟"

مورتەزاغا نالآندی: وا هات ئیدی...

"بڕوانە مورتەزا، ئێستا کە زەحمەتت کێشاوەو لەم کێوە هاتوویە ماڵەکەم، ئەمنیش ئامۆژگاریەکت دەکەم. باش گویّ لە قسەکانم راگرە، ئەتۆ لە حەمەدۆکی مەترسە، ئەگەر گیانی مەبارەکتت خۆش دەویّ لەمەولا لە عەلیەشەل وریا بە، مەلادۆران ئەفەندییش دەبیّ ئاگای لە گیانی خۆی بیّ. بەڵام لەبارەی حەمەدۆك..."

مورتەزاغا گوێی هەڵخست و چاوەڕیّ ما. بۆ بیستنی بیروڕای بایرام ئۆغلی دەربارەی حەمەدۆك وەخت بوو گیانی دەرچیّ. دەرفەتێکی بۆ هەڵکەوتبوو کە هەرگیز چاوەڕوانی نەدەکرد.

"هەتا ئێستا حەمەدۆکم نەدیوە، تەنیا ناویم بیستوە، سەرم لێی سوڕماوە، مورتەزاغا. وەك دەڵێن منداڵێکی ریوەڵەیە. ئەمن لەوەتا فامم کردوەتەوە کەسم نەدیوە خەڵك ئەوەندەیان خۆش بویّ. ئەم میللەتە نە کوێر ئۆغلی، نە چاکیر چالی ئەفە، نە گزیك دۆران، نە پیرانی شەهیدی چل چاو و نە هیچ کەسی ئەوەندە خۆش نەویستوەو نەی گەیاندوەتە پلەو پایەی نەزەرکردەو پیاوچاکان. پێم سەیرە ئەو منداڵە چیی هەیەو چیی کردوە کە میللەت ئەوەندەی خۆش دەویّ. ئەمن تیّناگەم. عەبدیخانی پیری کوشت کە لاقی لەسەر لێویّ قەبری بوو. ئەمەش بوو بە کار؟

ئێمە.

دەیەویست بڵیّ ئێمەش چەند کەسمان لەوانە... پاشان پەژیوان بووەوە.

بیستم کە چەند ساڵ لە کونێك دا خۆی حەشار داوە، خۆی حەشار داوەو پاشان لەسەر رێگای خۆی عەلی سەفابەگی کوشتوەو دیسان شرت و گوم بووە. تیّناگەم چ وەزع و حاڵێکە. ئەوەندەی ئەمن بزانم چەتە وەختێك چەکی دانا، دەیکوژن، زۆر ناژی مەگەر وەك من و

رۆستەمە کوردە بچێ لەبەر دەستی عێلات ببێتە مێوورۆن، فەعلەییش بکا ناهێڵن ئاسوودە بێ، گاڵتەی پێ دەکەن. ئاخرەکەی ئەمن تێنەگەیشتم ئەو کوڕە چ حیکمەتێك لە کاری دایە".

بایرام ئۆغڵی زۆر تامەزرۆی حەمەدۆك ببوو. لەبارەی هەموو وردەکارییەکانی ژیانی و داستانی یاغیگەرییەکەی زانیاریی بەدەست هێنابوو. بەڵام بە هیچ جۆر سەری لە کاری ئەو کوڕە دەرنەدەچوو.

"چاکیر چالیی دەناسی؟".

"هێندێ شتم لەبارەی دا بیستوە".

"چاردە ساڵی رەبەق لە چیاو بەندەنان دا دژی دەوڵەتی عوسمانی شەڕی کرد. چەند لەشکری شکاندن. پادشا چوار جاری عەفوو کرد. چوار جار هاتەوە دەشتێ، بەڵام چاکیر چالی ئەفە هەر جارێك دەهاتەوە دەشتێ دوو ساڵ زیاتری خۆ ڕانەدەگرت و سەرلەنوێ رووی لە چیا کردەوە. ئەو نەیدەویست یاغیگەری بکا. باش دەیزانی کابرای یاغی رۆژێك بە گوللەیەك سارد دەبێتەوە. هەربۆیەش لە چووکترین دەرفەت دا کێوی بەجێ دەهێشت. بەڵام خەڵك لێی نەدەگەڕان و دیسان ناچار دەبوو بچێتەوە شاخ و بەندەنان. ئەوە کە دەڵێن یاغی ناتوانێ پادشایەتی بکا قسەی وییە. لەوانەشە مەسەلێکی کۆن بێ، هەرچی بێ راستە. لە شاخی هەموو کاتێك چاوەڕوانی لەبن هەر چڵە درکێك بکەویە داوی جەندرمە، یان بە گوللەی هاورێیەکت بکوژرێی. وەختێك بنیادەم دەچێتە چیا هەموو کاتێك سەری لەبن هەنگڵی دایە. ئەگەر ئەو وەختەی چەکم دانا هاتبامە چوکووراوا، دەبوومە خاوەن مەزراو ملك و ماڵ و تێکەڵی خەڵك دەبووم، پاش چەند ساڵ ناچار دەبووم بچمەوە چیا. هەتا ئێستا چەتەیەکت نەدیوە لە دەشتێ وەمێنێ و بە مردنی خوای لەسەر جێی بمرێ. ئەگەر ئەمن هاتبامە دەشتێ و تێکەڵی خەڵك بام کەس زوڵمی لەکەس نەدەکرد؟ دەیکرد. ئەودەم خەڵك چاویان دەمنەوە دەبڕی. ئەگەر جەندرمەیەك لە دێهاتێیەکی دابایە دیسان خەڵك چاویان دەمنەوە دەبڕی، ئەودەم وەرە ئەو کەرەی لەو قوڕەی وەپەڕێنە. تا کاتێك لەم جیهانەدا زوڵم هەیەو دنیا بەم جۆرەیە هەمیشە خەڵك چاویان لە یاغییانە، لەو کەسانەیە کە باوەڕیان پێیان هەیەو دەزانن کە ناهەقی و زوڵم قبووڵ ناکەن. هەر لەم دێ پێنج ماڵییەدا ژنێك کە مێردەکەی لێی داوە، منداڵێك کە چاوی لە دایکی ترساوە، لاوێك کە لە جەندرمە تۆقیوە، هەموویان دێن و بێ ئەوەی قسەیەك بکەن چاو لە چاوی منەوە دەبڕن. ئەمن لێرەش ئەم توانی تەحەممول بکەم. رەنگە زیاتر لە دە جار ویستبێتم تاو دەمە تفەنگ و بچمەوە چیا. چەند رۆژان مل بە ملەم لەگەڵ خۆم کردوەو پاشان شەیتانم بە نەحلەت کردوەو لە جێی خۆم دانیشتووم. ئێستا ئیدی ئاسوودەم. ئێستا ئیدی پیر بووم، ئێستا ئیدی کەس نایە مات و خەمگین چاو لە چاومەوە ببڕێ. لەمن ناهومێد بوون. لە رۆستەمە کوردەی

بپرسە پێت دەڵێ بۆخۆی چەند جار ویستوویەتی تفەنگەکەی هەڵگرێ و وەکێوان کەوێ. جارێکیش هاتە کن من، بڕیاری یەکجاریی دابوو. سێ شەووڕۆژان قسەم لەگەڵ کرد هەتا توانیم پەژیوانی بکەمەوە. لە کاتێك دا ئەو شەربەت فرۆشێکەو کەس نازانێ کێ بووەو چ کارە بووەو کەسیش چاوەڕوانیی‌یەکی لێی نەبووە. جگە لەوە، پیاوێکی زۆر بە حەوسەلەشە، بەڵام... دیسانیش ئەو..."

مورتەزاغا لە کاتێك دا نەی‌دەویست نیازی خۆی بدرکێنێ، پرسی:

"ئەدی حەمەدۆك؟".

"کاری وی سەیرە، لەبارەی ئەم منداڵەوە ئەقڵم بڕ ناکا. دەڕوا، ون دەبێ، ون دەبێ لەپڕ دێتەوە مەیدان. ئەوەندەی ئەمن بزانم چەتە هیچ کاتێك ناتوانێ لە جێیەك بشاردرێتەوە. ئەم کوڕە لە کوێ خۆی حەشار دەدا؟ کێ پەنای دەداو دەی‌شارێتەوە؟ هیچ کەس بە خۆڕایی چەتەیەك لەکن خۆی ناشارێتەوە. بڵێم چووەتە لای یەکێك بووە بە شوان؟ کەسێك فێری یاغیگەری بووبێ، ئەویش بابایەکی وەك حەمەدۆك کە گەیاندوویانەتە پلەو پایەی پیاوچاکان ناچێ لە گۆشەیەك وەمێنێ و بە دەستی خۆی خۆی بە کوشت نادا. یان بە چووکترین شت وەك ئەوە کە فلانەکەس گوتوویە پشتی چاوت برۆیە تاو دەداتە تفەنگێ و یەك تەکان دەچێتەوە چیا. خەڵك نایەڵن یاغی لە دەشتێ ئاسوودە بێ. شتێکت پێ بڵێم، ئەم حەمەدۆکە هەر کەس بێ ئاخر و ئاقیبەتی نیە. یاغی هەرچەندیش ئازاو بە جەرگ بێ دەزانێ کە دواڕۆژی نیە. ئێستاش عەلی سەفابەگی کوشتوەو چووەتە چیاو بێ‌سەروشوێن بووە".

"دەڵێن تازە دەر ناکەوێتەوە".

"هەموو کارێك دەکا بۆ ئەوەی دەرنەکەوێتەوە".

"یانی ئەتۆ دەڵێی لێی ناگەڕێن؟".

"ئەمن پێم وایە حەمەدۆك کابرایەکە بۆخۆی لەکۆڵ خۆی نابێتەوە"

"یانی چۆن دەبێ؟"

"داخوا ئەو عەلی سەفابەگی دەناسی؟"

"پێم وانیە".

"دەلیلێکی هەبوو بۆ ئەوەی بی‌کوژێ؟"

"نازانم. ئەوەندەی ئەمن بزانم نا، دەلیلێکی نەبوو. لەوانەیە تا ئەو کاتەی کوشتوویە قەتیش نەی‌دیبێ".

"ئەم جۆرە ئینسانانە پەیدا دەبن. ئەوان ناچارن".

"ئەدی ئەتۆ؟"

"ئەمن لەوان نەبووم".

"لە کامانە...".

"ئەوان ئاگرێکی دیکەیان لە دڵ دا دایسێ, ئاگری ناچاری. حەمەدۆك بۆ ئەوەی روو بکاتە چیاو بەندەنان ناچار بوو عەبدیخان و عەلی سەفای بکوژێ, هەتا ئاخریش دەڕوا. بەڵام ئەگەر پەلە نەکا..."

"پەلە لە چی نەکا؟"

"لە چوونە چیا... لە چیا, بابایەکی یاغی ئەگەر داروودەستەیەك بۆخۆی دروست نەکا, ناتوانێ بژی".

"خەڵك دەیپەرستێ".

"با بیپەرستێ... هەزار کەسیان دەیپەرستێ, بەڵام دوژمنێکیشیان لەنێو دا پەیدا دەبێ, ئەودەم کاری تەواوە. هەموو گیاو گوڵ و باڵندەکان و هەر چڵێك و هەر گەڵایەك دەبێ چاوو گوێی یاغی و رێگران بن. ئەگەر چل قۆناخ ئەولاتر ببزوێ ئەو دەبێ لێرە ئاگادار بێ و رێگاچارەی بۆ وەبینێ. کوێرئۆغڵی وا بوو, بۆیە توانی بمێنێ".

مورتەزاغا بۆ ئەوەی هەوای زاری بایرام ئۆغڵیی بزانێ گوتی: باشە, ئەویش عەلیەشەلی هەیە. ئەمجار بە تەواوی لێی ورد بووەوەو چووکترین دژکردەوەیەکیی خستە ژێر زەڕەبین.

بایرام ئۆغڵی بێباك بوو. پاش کەمێك بیر کردنەوە گوتی:

"ئەگەر هەر ئەو عەلیەشەلەی هەبێ, ئەگەر پیاوێکی وەك عەلیەشەل ئاگای لێی بێ, هیچ کەس بە حەمەدۆك ناوێرێ".

ئەو شەوە تا بەیانی بێ ئەوەی بخەون قسەیان کرد. کە رۆژ بووەوەو هەتاو کەوت مورتەزاغا دیارییەکانی لە خورجێن دەرهێنا: ئەمانە دیاریی رۆستەمە کوردەن.

بایرام ئۆغڵی پێکەنی و لە حاڵێك دا فرمێسك لە چاوانی دا قەتیس مابوو, دیارییەکانی رۆستەمی وەرگرت.

"ئەمانەش بۆخۆم هێناومن".

بایرام ئۆغڵی ئەو لیباسە جوانەو ئەو قۆندەرە سوورانەی زۆر بە کەیفێ بوون, زۆریش بەخۆدا شکایەوە. پەیتا پەیتا دووپاتی دەکردەوە: چەندتان زەحمەت کێشاوە, و قسەیەکی دیکەی بۆ نەدەهات.

مورتەزاغا گەڕایەوە شارۆچکە. دڵەخورپەیەکی سەیری گرتبوو. لە بەینی خاترجەمی و ترسی مردن دا هاتوچۆی دەکرد. یەك شت باش حاڵی ببوو, ئەویش ئەوە کە بایرام ئۆغڵی بەو ئاسانییە وەدوای حەمەدۆك ناکەوێ. ئەو تەنیا یەك ئارەزووی هەبوو. ئەویش ئەوە کە لە گوندەکەی دا بە ئارامی بمرێ. بەڵام دیسانیش لەبارەی ئەو جۆرە کەسانەوە ناکرێ داوەری بکەی. هەربینا تفەنگەکەی تاو دایەو رووی کردەوە چیا.

ئەو دەیزانی وەختێك کرمی شتێك کەوتە مێشکی بنیادەم بەو ئاسانییە نامرێ. دەخەوێ, دەخەوێ و لە نەکاو وەخەبەر دێتەوە. مورتەزاغا دەیدی کە هێشتا کرمی مێشکی بایرام ئۆغڵی نەمردوە.

چاو ئاوێنەی دڵی بنیادەمە. لە ناخی دڵی وی دا ئاوات و ئارەزووی شتێك, شتێکی وەك بەهەشتی ون کردووی بەدی دەکرد. لەوانەش بوو بە هەڵە چووبێ بەڵام وا دەهاتە بەرچاو کە چاوەکانی بایرام ئۆغڵی زۆریشیان ئەو تووشی هەڵە نەکردوە. ئینسانێك چۆن دەیتوانی پێش مردن ئاوا هەموو شتێکی خۆی لەگەڵ خۆی دا تەسلیمی مەرگ بکا. مورتەزاغا هەرگیز سەر لە شتی وا دەرناکا.

سەری داخستبوو. بێ ئەوەی تەماشای دەوروبەری بکا, هەروەك کەس لە دەوروبەری نەبێ لەم سەری بازاڕەوە هەتا ئەوسەر لە هاتوچۆدا بوو. بە بیستنی دەنگێکی ئاشنا تێك ڕابوو و هاتەوە سەرخۆ:

"چیە مورتەزاغا؟ چت بەسەر هاتوە؟ سێ جار بە پێشت دا تێپەڕیم, نەت دیتم, دەڵێی لەسەر ئەم دنیایە نیی".

پیاوێکی قەمچی بەدەست کە رووبەڕووی راوەستابوو مەحموودئاغا, ئاغای گوندی گەڵی شکۆفە بوو.

"ئای مەحموودئاغا ئەتۆی؟ چەند رۆژە بیر لەوە دەکەمەوە کە برامان مەحموودئاغا لە کوێیە. لە ماڵی خەلیل خان چاوم پێت کەوت و پاشان لەو قەرەباڵغییەدا لێم ون بووی. ئەم چەند رۆژە لەکوێ بووی؟"

دەستی دە بن قۆڵی ڕاکردو شۆڕ بوونەوە بۆ لای پردێ.

"بیستت, دیتت چ رووی دا, چ دەبێ, چ روو دەدا؟ ئەم کابرایە, ئەم بێچووە دێهاتییە کاڵەلەپێیە باڵی گرتوە, دەگرێ, دەکوژێ, دەسووتێنێ, خەڵکی دەکوژێ و دەڕوا. بەو جۆرە کە ئەو دەستی پێ کردوە, کەسی زیندوو لەم شارەدا ناهێڵێ. لە پێش دا عەبدیخان, دوایەش عەلی

سەفای بستەزمان, بە دوای ویش دا تالیب بەگی پڵنگی ئاناوارزا... چۆن دەکرێ پڵنگێکی وەك تالیب بەگ بکوژێ, ئەو هەموو عێل و عەشیرەتەی بە پشتەوە بوو, هەموویان شەرکەرو ئازا وەك پڵنگ, لەشکرێکی لەگەڵ بوو".

"دیارە دەکوژرێ. بنیادەمی هێندە زاڵم, دوژمنی ناموس؟ وەختێك کابرا تەماع لە بووکێ خۆشی بکا, دیارە دەکوژرێ. ئەگەر سزایەکی لە مەرگ خەراپتر بووبێ و لەگەڵیان نەکردبێ, بە هەڵە چوون. خۆی نەك هەر بە پڵنگی ئاناوارزا, بەڵکوو بە خوای ئاناوارزا دەزانی. دیارە دەکوژرێ".

"کاری ئەم حەمەدۆکە, ئەم بەڵای ناگەهانە بە کوێ دەگا, لە چیای بێتە خوارو هەموومان یەك بە یەك بکوژێ؟ دەبێ وەك قۆچی قوربانی چاوەڕوان بین".

"کێ, باسی کێ دەکەی؟"

"حەمەدۆك".

"حە...مەدۆك, دەیجا چی؟".

"حەمەدۆك ئیدی... شەرتی کردوە هەموومان بکوژێ. تەنانەت دەیەوێ تۆش بکوژێ".

"ئەمن؟ چۆن؟".

"زۆر ئاسان, وەك عەبدیخان, عەلیسەفابەگ, تالیب بەگ. گوللەت لە چاوان دەدا. ئەویش راست لە نێوێ چاوانت... ئەمن تەرمی تالیب بەگ, تەرمی پڵنگی ئاناوارزام دی. هەردوو چاوی لەبەریەك هەڵتەکابوون. هەر چاوەی گوللەیەکی لێ درابوو, لە پشت ملی هاتبووە دەر. ئەمان خوایە... خوا مردنی وا بە نسیب کەس نەکا, بەڵای وا بەسەر دوژمنیشت نەیە. عەلی سەفابەگیش مێشکی بە دیوارەوە نووسابوو".

مەحموودئاغا قسەکەی پێ بڕی: راوەستە مورتەزا.

رووبەڕووی یەکتر راوەستان.

"ئەمەی بزانە کە تالیب بەگ حەمەدۆك نەیکوشت".

"ئەی کێ کوشتی؟"

"کوڕەکانی خۆی و کەرەم... لەگەڵ دێهاتییەکان دەستیان وەدەستی یەك داو بابیانیان کوشت. هەموو کەس ئەمەی دەزانێ. هەموو دێهاتییەکانی ئاناوارزا بە شانازییەوە دەڵێن پڵنگی ئاناوارزامان کوشت. ئێوەش لە ترسان قازانجتان لەوەدایە کە بەسەر حەمەدۆکیدا بێنن. چما حەمەدۆك چ کارەیە کە هەرچی بوو, دەیدەنە پاڵ وی؟ هەموو شتێك گەورە دەکەنەوە. تەنانەت عەلی سەفا خانیش حەمەدۆك نەیکوشتوە".

مورتەزاغا کەمێك پانتۆڵەکەی هەڵکێشاو لە حاڵێك دا خۆی بە سمێڵەکانیەوە دەخافڵاند گوتی:

"ئەتۆ, ئەتۆ, ئەتۆ دەڵێی چی مەحموودئاغا؟ ئەو حەمەدۆکە... ئەمن تەرمی تالیب بەگم دی, گولله لەنێوێ چاوانی درابوو... تەنیا حەمەدۆك کاری وا دەکا, پیشەی خۆیەتی, ئەمەش درۆیە؟".

مەحموودئاغا بێ ئەوەی خۆی شلوێ بکا گوتی:

"ئەمەش درۆیە. ئەو حەمەدۆکەی باسی دەکەن منداڵێکە, ئەو چی و چەتەیی چی؟ ئەو ئاوارەیەکە".

مورتەزاغا خەریك بوو توورە بێ. بۆ ئەوەی رقەکەی ئاشکرا نەبێ پەنای بۆ هەموو فێڵێك دەبرد:

"ماشەڵڵا مەحموودئاغا, ماشەڵڵا قسەی سەیر دەکەی؟ بۆخۆت گوێت لەو قسانەی خۆت هەیە؟ هەموو خەڵکی شارۆچکە, خەڵکی ئەدەنە, چیاکان و هەوارەکان لە ترسانی خەوو ئارامیان نیە. هەموویان لە حەوت ساڵەوە تا حەفتا ساڵە لە فکری گیانیان دان. ئەتۆ دەڵێی چی...؟"

"ئێوە تووشی نەخۆشیی ترس بوون".

مورتەزاغا ئیدی قەڵس ببوو. هەرچی لە دڵیدا بوو پێی گوت. مەحموودئاغاش بە توورەیی‌یەکی زیاترەوە وەڵامی دایەوە. لە کاتێك دا جنێوی پیس پیسیان بە یەکتر دەدان هەتا سەر پردێ چوون. کە گەیشتنە سەر پردێ بێدەنگ بوون. خۆیان بەسەر میلەکانی پردێ دا هێناو تەماشای ئاوێ چۆمی‌یان کرد. مورتەزاغا بەرە بەرە ئارام دەبووەوەو رقەکەی دەنیشتەوە. مەحموودئاغاش بەزەیی بەو پیاوەدا دەهات کە ترسی مەرگی رێ نیشتبوو.

"بەراست ئەتۆ هێندە لەو کابرایە دەترسێی؟".

"گیانە شیرنەکەم, هەموو کەس دەبێ لێی بترسێ. مار هەتا چووکەڵەیە دەبێ سەری پان بکەیەوە, ئەگینا کارێکت بەسەر دێنێ. ئەم کابرایە سبەو دووی ژمارەیەك لەوانەی لە پەتی سێدارە رزگار بوون و لەبەر سنگ تێبرین هەڵاتوون لە دەوری خۆی کۆ دەکاتەوە... هەموو خەڵکی هۆبەو هەوارەکان و کێوپارە لەبەر نەداری خەریکە لەنێو دەچن. چما نازانی زگی برسی لە خوای ناترسی".

"دەزانم".

"دەردی من ئەمەیە, ترسی منیش لەمەیە. ئەمن هەمیشە گوتوومە مار هەتا چووکەڵەیە دەبێ سەری پان بکەیەوە"

"ئەو مارە حەمەدۆك نیە, حەمەدۆك هیچ نیە, کابرایەکی بەستەزمانە تووشی ژانەسەرو کوێرەوەری بووە".

"ئەگەر ئەم قسەیە وایە, ئەدی کێ بە شەو چوو بەندیخانەی کووزانی کردەوەو بەندیـیەکانی دەر کردە دەرێ, کێ بەندیـیەکانی ئازاد کردو دوایەش بەندیخانەی سووتاند؟"

"ئاکرێ حەمەدۆك بووبێ".

"ئەدی کێ بوو؟".

"ئەمەیان ئیدی کاری تۆ نیە, ئەتۆ ناتوانی بیزانی".

"ئاخر کێ بوو؟".

"هەر ئەم رۆژانە بنج و بناوانەکەیت بۆ دەردێنم".

کەوایە ئەتۆ حەمەدۆکی بە پیاو نازانی؟".

مەحموودئاغا دەستی دە قۆڵی راکردو بە دەنگێکی ماندوو گوتی:

"وەڵڵا مورتەزاغا ئێوە لە ترسان ئەقڵتان لەلا نەماوە, ئەو کێوانە پڕ لە چەتەو یاغین, هەر کامێکیشیان پڵنگێکە بۆخۆی, هەر کامێکیان هەزار حەمەدۆکە. ئێوە سەرتاسەر پیلەتان بە حەمەدۆك گرتوە... وەڵڵا لە هەڵەدان, مومکین نیە, شتی وا مومکین نیە".

گەڕانەوە بۆ نێو شارۆچکە, لە سەرەخۆ, لە سەرەوژێری پردە بەردینەکە هاتنەخوارێ. مەحموودئاغا هەمیشە رووگرژ بوو. دەم و چاوێکی درێژووکەی هەبوون کە زوو گنج و لۆنجیان تێ کەوتبوو. کەم دوێ و کەم قسە بوو. کەسێك یەکەم جار دەیدی, تووشی هەستێکی ناخۆش دەبوو.

"گوێت لێ بێ مورتەزاغا, دەمەوێ شتێکت پێ بڵێم, ئەو حەمەدۆکەی باسی دەکەن ها... کە سواری ئەسپ دەبێ و بە تەنیا دەچێتە چیاو بەندەنان... ئەمن سبەینێ گوێی دەگرم و دەیدەمە دەستت".

"چی؟ بەڕاستتە؟"

"بۆچی؟ هێندەت پێ سەیر بوو؟"

"پێم سەیر بوو, زۆریشم پێ سەیر بوو"

"لەبەر چی؟"

"عەرزو عاسمان لێك درا, ئەنکەرە شێوا, ئەدەنە راپەڕی. یاوەر نەخۆش کەوت, تەنانەت عارف صائم بەگ بۆ ئەو مەبەستە هاتە شارۆچکە. فەرماندەری لەشکریش هات... زۆر لەمێژە لە تورکیە باس هەر باسی حەمەدۆکە, هەر ئەم رۆژانە لەشکر دەچێتە چیاکانی توورڕووس, کەچی ئەتۆ دەڵێی سبەینێ گوێی حەمەدۆك دەگرم و دەیهێنمە ئێرە".

"دەیهێنم و هەر سبەینێش".

"ئەگەر وایە, بۆ هەتا ئێستا نەت گرتوە بیهێنی؟"
مەحموودئاغا گوتی:
"قسەی وا مەکە مورتەزا, قسەی وا مەکە برالە قسەی وا مەکە. رۆژێك دەبێ منت وەبیر بێتەوە. هەتا ئێستا لەم شارۆچکەیە عەبدی خوای لە منی پرسیوە مەسەلەی حەمەدۆك بە کوێ دەگا. ناکا پێیان وا بووبێ ئەمن دەبێ لەبەریان وەپارێم کە رێگا بدەن گوێی حەمەدۆکی بگرم و تەحویلیان بدەم. حەوتوویەکە لەم شارۆچکەیە دەسوورێمەوە. هەتا ئێستا کەس هاتوە لەبارەی حەمەدۆکەوە قسەیەك لەمن بپرسێ؟ دەبلێ دەی؟".
"هەقتە. کەوایە مەسەلەی حەمەدۆك وا ئاسانە؟".
مەحموودئاغا لە حالێك دا قۆڵی مورتەزاغای دەگرت, گوتی:
"بڕوانە مورتەزا, ئەتۆ لەمێژە من دەناسی, لە منداڵییەوە... لەو وەختەوە کە بابم دەهاتە ماڵی ئێوە. بلێ بزانم هەتا ئێستا چاوڕاوت لەمن دیوە؟".
مورتەزاغا نەختێك بیری کردەوە:"ئەتۆ... نەخەیر, دوور لە تۆ..."
هاتنە نێو شاری. لە سەری بازاڕی راوەستان.
"ئەتۆ ئەمشەو لەلای ئێمە دەبی. حەسنەخان بۆ ئێوارێ چاوەڕێتە, ئەسپەکەت لەکوێ بەستراوەتەوە؟ ئەسپەکەشت بێنە. هەم قسان دەکەین هەم دەردی دڵ. ئەتۆ هەقتە. لەجێدا تۆمان هەر لەبیر نەبوو. ئێمە نابینە بنیادەم. هەموومان لەترسان شێت بووین. ئەتۆ قەت ناوی عارف صائم بەگت بیستوە؟"
"عارف صائم بەگ چیی بووە؟".
"ئەو دەیەوێ پاشای بکوژێ, ئەم کارەی لە دەستیش دێ, لەگەڵ چەرکەسەکانی کێوپارەی بووەتە هاودەست و لەگەڵ فەڕانسەیی و ئینگلیزییەکان رێك کەوتوە. ئەم کارە دەکرێ؟ ئەتۆ هەر ئەم رۆژانە عارف صائم بەگی دەناسی, دەکرێ کاری وا بکرێ؟"
ئەو پیاوە کە پێنەدەکەنی و تەنانەت جارێکیش مانای پێکەنینی نەزانیبوو, سێبەری زەردەخەنەیەك بەسەر روخساری دا تێپەڕی و گوتی:
"با لەوە گەڕێین, کێ زانیویە, کام دوژمنی عارف صائم بەگ ئەم درۆیەی هەڵبەستوە... شەوێ قسەی لێدەکەین".
دەستی بۆ لای مورتەزاغا درێژ کرد, پاشان پشتی تێ کردو چووە دوکانی زین فرۆش کە نەختێك لەولاتر بوو.

مورتەزاغا لەوە خۆشحاڵ بوو کە لە چاوپێکەوتنی ئاغای گوندی گەڵی شکۆفە ئاکامی باشی وەرگرتوە: باش بوو کاتێك گوتی سبەینێ گوێی حەمەدۆکی دەگرم و بۆت دێنم، دەر هەڵ نەبووم و هێرشم نەکردە سەر. هەروا ئارام بووم. هەقیەتی. لەم شارۆچکەیەدا تەنیا کەس کە دەتوانێ مەسەلەی حەمەدۆکی ببڕێتەوە ئەم مەحموود ئاغایەیە. چۆن بوو تا ئێستا هیچ کەس تەنانەت ئەو زولفۆیە کە شەیتانی دەرس دادەدا فکری ئەوەی نەکردبوو؟ لە کاتێك دا پیاوێکی ئازاو نەترسی وەك مەحموودئاغایان هەبوو کە وەك تای تەورداس ئامادەی کوشتنی حەمەدۆك بوو. چونکە دەیەویست شانازیەیەکی دیکە بخاتە سەر شانازیەکانی خۆی. کە گەیشتەوە ماڵێ حەسنەخان لەسەر پلیکانان پێشوازیی لێکرد:

"بەخێراتیەوە ئاغا... خەبەری خۆشت پێێ؟".

مورتەزاغا ئارام بوو. حەسنەخان ئەم رۆژانە ئەوی وا بە ماندوویی نەدیبوو. چووە ژوورەکەی خۆی و لەسەر قەنەفە پان بووەوە:

"خانم خەبەری خۆشم پێێ".

هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، لەبەر ماندوویی خەریك بوو خەوی لێبکەوێ.

"خانم ئێمە زۆر کەرین، شت لەبن لووتی خۆمانە کەچی لەوسەری دنیایە بۆی دەگەڕێین".

"چما چ بووە ئاغا؟".

"ئاوێك لەمەوبەر لەگەڵ مەحموودی گەڵی شکۆفە قسەم دەکرد، حەمەدۆکی بە پووشکەیەکیش نازانێ. گاڵتەمان پێ دەکا کە هێندە دەترسێین. دەیگوت: سبەینێ دەچمە چیای، گوێی حەمەدۆکی دەگرم و دەیهێنمە ئێرە".

"دەیگرێ دەیهێنێ".

"دڵی لە ئێمە ئێشاوە".

"هەقیەتی دڵی بێشێ".

"ئەمن لێی وەولا کەوتم، هەر باسیشم لەگەڵ نەکرد، تێگەیشتم کە مردووی ئەوەیە حەمەدۆکی بکوژێ و شانازیەیەك بۆخۆی پەیدا بکا. ئێمەش نەمانەوێ دیسان دەچێ حەمەدۆکی دەگرێ، وەك ئەمن حاڵی بووم رێگاشی بۆ کارەکەی خۆش کردوە، بۆخۆی یەك دوو دەستە چەتەی لە کێوی هەن. بلێ بمرن دەمرن، بلێ بژین دەژین. خانم سەرم لێی دەرناچێ، ئەمانە چۆنیان ئەو کارە پێ دەکرێ، لە کاتێك دا مەحموودئاغا هەم لە من و هەم لە هەموو خەلکی شارۆچکەی خوێندەوارترە".

"ئەوان سەر لەو کاتەوە کە لە دایك دەبن دەبێ بۆخۆیان لە فکری گیانیان دا بن. پیاوکوژی بکەن, خەڵکی بترسێنن, هەربۆیە برشتیان هەیە. هیچ دەزانی ئەو زەوی و زارەی ئێستای چۆن ئەستاند؟ لەم دەشتەدا کێ دەیتوانی کاری وا بکا".

"ئێستا کەوایە بۆ شەوێ زۆر باش خۆت ساز کە, دەمەوێ میوانداری‌یەکی لێ‌بکەم سەری سوڕ بمێنێ".

"لەبارەی حەمەدۆکیشەوە هیچ قسەی لەگەڵ ناکەین, باشە؟ ئەگەر بۆخۆشی قسەکەی هەڵگیرساند, ئەو چاکتر. باشە؟".

"ئەو دڵی تاقەت ناگرێ, بۆخۆی هەڵی دەگیرسێنێ. بۆ کوشتنی حەمەدۆك ئەوە گیانی دەردەچێ".

مەحموودئاغا لە رەسەنترین بنەماڵەکانی توورڕووس بوو. بابی بۆئەوەی ئەو بخوێنێ و ببێتە بنیادەم, ئەوی ناردە ئەدەنەو ئەستەمبووڵ. ئەویش پیاو هەق بڵێ باشی خوێند. لە شارۆچکە بە فکری کەس دا نەدەهات کە ئەو پاش ئەو هەمووە خوێندنەو ژیان لە شارە گەورەکان دا بێتەوە لە توورڕووس بژی, بەو هەل و مەرجە دژوارەوە کە توورڕووس هەیبوو. گۆیا کە بابی دەمرێ, دەسبەجێ دێتەوە گوندەکەیان و پاشان بە پازدە سوارەوە کە هەموویان پڕچەك بوون دێتە چوکووراوا. هەر ئەو رۆژە کابرایەك کە دەیان گوت جنێوی بە گۆڕی بابی داوە, لەبن چنگە ئەسپان دا دەپلیشێنێتەوەو دەیکوژێ. ئەم پێشهاتە قەت لەبیر شارۆچکە نەچووەوەو لەوەدواش ناوبانگی بوو بە "مەحموودئاغایەك کە بە چنگە ئەسپان پیاوان دەکوژێ".

مەحموودئاغای گەڵی شکۆفە, ئەو ئاغایە کە بە چنگە ئەسپان پیاوی دەکوشتن, پووڵ و پارەو مڵك و ماڵێکی زۆری لە بابی بۆ بەجێ ما. ئەویش زۆر زیاتر لەوەی لە باب و باپیرانی بۆی بەجێ مابوو, سامانی کۆکردەوەو وەسەر یەکی نا.

سامانی وی بەرهەمی نیزامە ئابووری‌یەکی تایبەتی بوو کە لە باب و باپیرانی بۆی بەجێ مابوو و بۆخۆشی لەسەری رۆیشت. بۆ وێنە ماینێکی دەدا بە لاوێکی دێهاتی کە هەموو جارێ شەش جوانووی بە زگێك دەبوون, پاشان قەول و قەراری لەگەڵ دادەنا کە ماینەکە بەرێتەوە ماڵێ و بەخێوی بکا, تفاقی بداتێ و شاڵ و رنەکی بکا. هەرکات ماینەکە زا, ئەگەر لەسەر زەوی نەچوو, ئەوە سێ جوانوو بۆ دێهاتی‌یەکەو سێ جوانووش بۆ ئاغای بن. ماینەکەش هەمیشە هەر هی ئاغا بوو. بەڵام ئەگەر هات و ماینەکە مرد, لاوە دێهاتی‌یەکە دەبوو بۆی ببژێرێ. ئاغا بەو مەرجانە لە چەندین دێ هەزاران ماین و مانگاو مەڕو بزنی بەسەر دێهاتی‌یەکان دا دابەش دەکرد. بەم جۆرە پاش دە پازدە ساڵان ئاغا

دەبوو بە خاوەنی رەوە ئەسپ و مێگەلە مەرو رەشەولاغ و کوورو جوانەگایەکی خەساوی زۆر. ئەمجار هیچ دێهاتی‌یەك هەقی نەبوو بەشەکەی خۆی لە ئاغا بەولاوە بە کەس بفرۆشێ و ناچار بوو بەو نرخە کە ئاغا دەیەویست پێی بفرۆشێ.

مەحموود ئاغا کە پیاوێکی خوێندەوار بوو ئەم شێوە کارەی دەسکاری کردو پێشی خست. لە وەزعی دێهاتی‌یەکانی دەکۆڵیەوە. ئەو دێیانەی باشترین و جوانترین ئەسپیان پەروەردە دەکردن، ماینی دەدانێ و لە هەر جێیەك بزن و مەرو ڕەشەولاغ باشتر بەخێو دەکران بزن و مەرو مانگاکانی دەنارده وێ. پێش وی لە زەمانی باب و باپیرانی دا کارەکە جۆرێکی دیکە بوو. دابەشینی ماین و مانگاو مەرو بزن بەبێ لێکدانەوە بوو. بەم شێوە کارە مەحموود ئاغا ئەسپ و مانگاو مەرو بزنێکی رەسەنی پێ‌دەگەیاندن. لە چیاکان، لە چوکووراوا ڕەوە ڕەوە ئەسپ و مێگەل مێگەل مەرو بزن و ڕەشەولاغی هەبوون. هەموو ساڵێ ئەم رەوە مێگەلانە بۆ فرۆشتن دەچوونە حەڵەب و ئەدەنەو ئەستەمبووڵ، دەبوونە زێرو دەهاتنەوە نێو سندووقی مەحموود ئاغا.

ئەو سوارچاکی ڕەسەنترین ئەسپان بوو. ئەمجار بە بێ‌لایەن ترین و بە دەست ودڵ ترین و جوامێرترین پیاوی ئەو دەشتەش دەژمێردرا. جوابی کەسیشی نەدەدایەوە. پلیشاندنەوەی خەڵك لەبن چنگە ئەسپانیش دا پیشەی تایبەتیی خۆی بوو، و لەو بارەیەشەوە کەس لێی نەدەپرسیەوە. ئەگەر بۆخۆی پێی خۆش با، خوێنی کوژراوەکەی دەدا بە ژن و منداڵ و کەس و کارەکەی، دەنا هیچ.

یەکێك لە قایمقامەکانی ئەم دواییانەی ئەدەنە کە ناوبانگی وی بیستبوو، بۆ ئەوەی بزانێ چۆن پیاوێکە، داوای دەکا، بەڵام ئەو ناچێ. قایمقام چەند جار داواکەی دووپات دەکاتەوە، بەڵام مەحموودئاغا گوێی ناداتێ. قایمقام کە بەو کارە زۆر توورە دەبێ، یاوەرێك بە فەرماندەرایەتیی هەموو جەندرمەکانی دەنێرێتە گەڵی شکۆفە. بەڵام یاوەر کە دەچی مەحموودئاغا لەماڵێ نابێ. وەختێك یاوەر لە چیا ڕا دەگەڕێتەوە ئەدەنە مەحموودئاغا لە باڵەخانەیەك دا گەمارۆی دەداو دەیگرێ و پێی دەڵێ: چ ئەمرێکت هەیە یاوەر، ئەمن مەحموودئاغام. پاشان چەند ڕۆژان لەلای خۆی رای دەگرێ، میوانداری‌یەکی بێ‌وێنەی لێ‌دەکاو پاش ئەوەی پوولێکیشی وەك خەرجی ڕێگا لە گیرفان دەخا، پێی دەڵێ: سلاوم بە جەنابی قایمقام بگەیەنەو عەرزی بکە ئەمن لە دەوڵەت یاغی نیم، ئەگەر پێی خۆش بوو بۆخۆی بێ و چەند ڕۆژێك لەو کێوپارەیە کە دەڵێی بەهەشتە میوانمان بێ، جێی لەبان سەرمانە. ئەمجار یاوەری بەرێ دەکاتەوە.

پاش ئەم رووداوە قایمەقام لە ئەدەنە دەرواو مەسەلەکە لێرەدا تەواو دەبێ. بەڵام مەحموودئاغا لە خۆی وەشك دەکەوێ و لە پاش ئەوە، رێگا نادا نە ئەفسەرێك، نە باجگرێك و نە هیچ فەرمانبەرێکی دەوڵەت بێتە کێوپارە. هەتا دەست پێکردنی شەڕی یەکەمی جیهانی لەو چیایانە چۆنی بۆخۆی حەزی لێبوو، بێ لەخۆبایی‌بوون درێژەی بە ژیانی خۆی دا. مەحموودئاغا لە یەکەم شەڕی جیهانی دا زۆری نارەحەتی تووش بوو. لە ماوەیەکی کەم دا چیاو بەندەن پڕ بوون لە سەربازی راکردوو و چەتەو رێگر. ئەوان هێرشیان دەکردە سەر گوندەکان، تالانیان دەکردن و هەرکەس لە پێشیان راوەستابایە دەیان کوشت. بۆیە مەحموودئاغا ناچار بوو پیاوەکانی خۆی زۆرتر بکا. ئەم کارەشی پێویستیی بە پارەی زۆر هەبوو. لەبەر ئەوە ژمارەیەك لە پیاوەکانی خۆی دەست بژێر کردو بەداخەوە بە پێچەوانەی ویستی خۆی چەتەیی پێ کردن. زۆر بەم کارە نارەحەت بوو، بەڵام چارەی نەبوو... پیاوەکانی هەتا دەوروبەری ماراش و قەیسەریەو چوکووراوا دەچوون و تالانێکی زۆریان بۆ دێنایەوە. لەگەڵ دێهاتی‌یەکانیش تووشی کێشە بوو. لە هێندێك دێیان خەڵك بزن و مەڕو گاوگۆلەکەی ئەویان سەر بڕین و خواردیانن و خەلاسیان کردنو بەسەر سەربازە راکردووەکانیان دا هێنا. مەحموودئاغا فەرمانی دا بەوردی و بەربڵاوی لەو مەسەلەیە بکۆڵنەوە. ئاکامی لێکۆڵینەوە ئەوەبوو کە هەرچەند چەتەکان و سەربازە راکردووەکان چەند سەرێکیان مەڕو بزن و رەشەوڵاغ لە دێهاتی‌یەکان ئەستاندبوون، بەڵام مێگەلەکانی، رەعیەتە برسی‌یەکانی خۆی خواردبوویان. ئەم رووداوانە بە مانای هەڵوەشانی ئەو نیزامە ئابووری‌یە بوون کە باسمان کردو ئەم مەسەلەیەش ئەوی شێت کردبوو. پێویست بوو ئەم گیروگرفتە لە دێهات دا خاشەبڕ بکا...

رۆژێکیان سواری ئەسپەکەی بوو، لەگەڵ چەکدارەکانی چوونە گوندی سایزلی کە لە بناری چیاکان بوو. گەیشتە نێو دێ. دێ دەت گوت چۆڵگەیە، نە کەسی بەپیرەوە هات و نە کەسیش دیار بوو. دەت گوت چەند ساڵە چۆڵ بووە. گوندی سایزلی گوندێك بوو کە بزنی رەسەنی بەخێو دەکردن. مەحموودئاغا بزنە تۆوەکانی ئەم گوندەی ـ کە رەنگیان سوورو موویان درێژ بوو ـ لە شوێنێکی زۆر دوورەوە هێنابوون و بە کۆڵان پارەی پێ دابوون. ئەم بزنانە هەموویان گەورەو بەشیر بوون و جووتیارەکان هەموو ئەو بزنانەیان سەر بڕی و خواردیانن و تۆوی ئەو بزنە ڕەنگ ئاڵتوونی‌یانەیان لەنێو برد، مەحموودئاغا لەبن سنۆبەرە ئەستوورەکەی نێوەڕاستی ئاوەدانی دابەزی، لەسەر بەردێك لە پەنا مەنجەڵێك کە لەبن دارەکە دەکوڵی دانیشت و فیلینتایەکەی لەسەر کۆشی دانا. نێوچاوانی وەك جەهەننەم سوور ببووەوە.

"کوێخا مووسام بۆ بێنن".

کوێخا مووسا لەنێو دوو پیاوی چەکداردا سەرشۆڕو شەرمەزار لە کاتێك دا هەردوو دەستی بە سنگیەوە گرتبوون و کەمێك کۆم ببووەوە، هاتە پێش. تەماشای ئاغاو کەسی دیکەی نەدەکرد. پانتۆڵە دەستچنەکەی پینە کرابوو. مووی لەشی لە کەلێنی کراسە شڕەکەیەوە دەرکەوتبوون. کاڵەکەی پێی نوێ نوێ و لە پێستی بزنی سوور بوو.

"لە هەموو ئەم دێیەدا بزن ماوە، تەنانەت یەك دانەش؟".

مووسا بێ ئەوەی سەر هەڵبڕێ، بە دەنگێکی بێتین کە بە زەحمەت دەبیسترا گوتی نەماوە.

"تەنانەت یەك دانەش؟".

"نەماوە".

"هەموو بزنەکانم ئێوە خواردتانن؟"

"ئێمە خواردمانن".

"ئەدی چەتەو راکردووەکان؟"

"لە سایەی سەری جەنابتەوە کەس نەهاتە ئەم دێیە".

"بۆچی خواردتانن؟"

"زۆرمان هەوڵ دا نەیان خۆین. برسی بووین. مانگێك، دوو مانگ، سێ مانگ خۆمان راگرت، پاشان یەکێکمان سەر بڕی".

"دوایە؟"

"یەکی دیکەمان سەر بڕی".

"دوایە؟"

"هەموو بزنەکان تەواو بوون. دوا بزنمان سێ رۆژ لەمەوبەر سەر بڕی".

"ئێستا چی؟"

"برسیمانە"

مەحموود ئاغا هەستا. دێهاتیەکان لە دڵی خۆیان دا گوتیان: ئێستا سوار دەبێ و کوێخا مووسای لەبن چنگە ئەسپان دا دەپلیشێنێتەوەو دەیکوژێ. بەڵام هەرگیز وا نەبوو، نێوچاوانی مەحموودئاغا ئارام بوو، و ئەوەندەی دەگونجا نەرم بوو. بەسپایی لە جێی خۆی هەستا، چووە لای مووساو بە راوێژێکی ساردەوە فەرمانی دا:

"سەرت هەڵبڕە"

مووسا بە ترسەوە سەری هەڵێنا.

"ئاغا بەزەییت پێمان دا بێ، لەسەر ماڵ و حاڵی خۆمان دەرمان مەکە. ئێمە بووین ئەو بزنانەمان بەخێو دەکرد، دووبارەش بەخێو دەکەین. لەجیاتی هەر بزنێك سێ بزنت وێ دەدەینەوە. لێمان ببوورە".

"سبەینێ کەس لەم دێیەدا نابینم"

مەحموود ئاغا پاش سێ رۆژان هاتەوە دێی، ئاوەدانی چۆڵ ببوو. دەستووری دا پیاوەکانی ماڵەکان گەڕان. لە دەری ئاوایی لە ئاغەڵە بزنەکان دا سێ سەگی پیرو ژن و مێردێکی پیریان دینەوە کە لەوێ دا خۆیان شاردبووەوە. ژن و مێردەکە لەبەر پیریی‌یان نەیان دەتوانی هەستنە سەرپێ. ئەوانیان هێنایە لای ئاغا.

"ئێوە بۆچی نەرۆیشتوون؟"

ژن و مێردەکە کە لیباسێکی کۆن بەڵام زۆر پاك و خاوێنیان لەبەردا بوو، وەڵامێکیان نەدایەوە.

مەحموودئاغا ئیدی پرسیارەکەی دووپات نەکردەوە، بەزەیی بەو ژن و مێردە پیرەدا دەهات و چاوی پڕ ببوون لە فرمێسك.

"ئەمانە سوار کەن با بڕۆینەوە، لە ڕێیە نارەحەتیان مەکەن، باشیان پێ رابگەن، ئەم سەگانەش بەرن، بەزەییم بە سەگەکانیش دا دێتەوە، بەستەزمانانە لێرە لەبرسان دەمرن".

میهرەبانی و دڵنەرمیی مەحموودئاغا دەرهەقی ئەو ژن و مێردە پیرەو ئەو سێ سەگە بە چەند رۆژ لەنێو هەموو دێهاتی‌یەکانی کێوپارەدا دەنگی دایەوە. تەنانەت خەڵکی شارۆچکەش لێی ئاگادار بوون، هەمووان بە چاکە باسیان دەکرد.

پاش دەرکردنی خەڵکی سایزلی لە هیچ دێیەك کەس ئەگەر لە برسانیش مردبایە، جوانەگایەك، بزنێك و تەنانەت مریشکێکیشی سەر نەدەبڕی بیخوا.

کوێخا مووسا وەپێش دێهاتی‌یەکان کەوت و بردنی بۆ چوکووراوا. زۆریان بۆ دژوار بوو لە گوندەکەیان، جێیەك کە باب و باپیرانیانی لێ‌نێژرابوون بڕۆن. بەڵام چارە نەبوو، دەبوو بڕۆن چەند کەسێکیش نیازی کەللەشەقی‌یان هەبوو کە ئاوماڵەکان بە تێکڕا پەژیوانیان کردنەوە. بە گریان و شیوەن وەڕێ کەوتن. شیوەنەکەیان لە چیاکان دەنگی دەدایەوە. هیلاك و ماندوو گەیشتنە شارۆچکە. لەبن پردێ مانەوە. پیاوە گەنجەکانیان هەموو چووبوونە بەرەی شەڕ. پیرەپیاوانی هاوتەمەنی کوێخا مووسا هەرچەندی زیاتر بیریان کردەوە ڕێگایەك بۆ رزگاری لەم بەڵایە بدۆزنەوە کەمتر بە ئاکام گەیشتن.

تەنیا دە رۆژان توانیان لەنێو ئەو ئالەتە کێوی‌یانەدا کە لەبن پردێ روابوون, خۆ رابگرن. لە شارۆچکە کار نەبوو, چەندین ساڵ لەوەپێش کوێخا مووسا بۆ رەنجبەری چووبووە چوکووراوا. دێیەکی لە دەشتی ئاناوارزا وەبیر هاتەوە کە کاری لێ‌کردبوو. کۆچ و کۆچباری دەنگ دا. دێیەکەیان دیتەوە. دێهاتی‌یەکان کادێنی خۆیان وێ دان. ئەو ساڵە باران زۆر باری. زۆریان کوێرەوەری دیتن. وەزعی دەشتێش باش نەبوو. زۆر لە منداڵەکانیان مردن.

لەنیزیك دێی هەتا چۆمی سەیهان پارچە زەوی‌یەك بوو هەمووی درووەڵان و قامیشەڵان و تووترك. لەنێو ئەو پارچە زەوی‌یەدا بەتاڵای‌یەکیان دیتەوە. بە قامیش و دارو پەردوویەك کە تالیب بەگ پێی دان و بۆ ئەوە هیچیشی لێ‌نەستاندن هەریەکەی کەوێلێکی کاتی‌یان بۆخۆیان ساز کرد. دارو نەداری خۆشیان فرۆشت و دایان بە پاچ و پێمەرەو داس و بیورو تەورداس و دەستیان کرد بە بوورە دەرهێنان. لە منداڵی حەوت ساڵەوە هەتا پیری حەفتا ساڵە کاری دەکرد. بە تێکۆشانێکی زۆر لەو درووەڵانە بەشی تۆوی ئەو ساڵەیان زەوی ساغ کردەوە. بە هاوکاریی دێهاتی‌یەکانی دیکەش دایان چاندو رەنێویان هێنا. ئەوان تێکرا تووشی لەرزوتا بوون. خەڵکی کێوپارەی وەك دانیشتووانی چوکووراوا بەرگەی گەرمای چوکووراوایان نەدەگرت. بەشی زۆری پیرەکان بە لەرزوتا مردن. چار نەبوو دەبوو تەحەممول بکەن. هەموو ساڵێ لە زی‌یەلێن و قامیشەڵان و درِدووکاوی هێندێك زەویی دیکەیان ساغ کردوەو ئەم کارەیان درێژە پێ دا. دانیشتووانی چوکووراوا لەوەتا وەبیریان دەهات, خەڵکی وا بەکارو بەکێشیان نەدیبوو. سەریان لێ‌یان سورِمابوو. دێی خۆیان ناو نا یالیزیۆرد. جووتیارانی یالیزیۆرد بەو دەستانەیان کە لەبەر کاری زۆر لە رادەی ئاسایی گەورەتر و شەقار شەقار ببوون و بە روخساری لەبەر هەتاو سووتاویان و بە رِوومەتی تێك قووپیویان بە یەکەم چاو لێ‌کردن لە جووتیارەکانی دیکە جیا دەکرانەوە. ئەو خاکە رەشەی لە چنگی زی‌یەگەرمێنی رزگار کرابوو, یەك بەسی و یەك بە چلی دەبری. گەنم و جۆو پیوازو سەوزی‌یان چاند. هەر جووتیارێك لەسەر ئەو خاکە ئازادکراوە وەك قارەمانێکی سەرکەوتوو هەنگاوی هەڵدێنایەوە. ئەسپ و ماین و گاوگۆل و مەرِو بزنیان کرین. لە بەخێوکردنی ئەسپ دا کەس نەیان دەگەیشتێ. لەو ماینە تۆوانە کە لە ئۆرفە هێنایانن رەسەن ترین ئەسپیان پێ گەیاندن و لەو دەشتەدا یەکەم کەسانێك بوون کە خانووی دێهاتی‌یەکانیان بە قورِو بەرد ساز کرد.

دێهاتی ئەو دەوروبەرە کۆڵان و مەیدانیان نەبوو. ئەوان لە دێی خۆیان دا کووچەو کۆڵانیان بە شێوەیەکی دروست لێ‌داو تەنانەت مەیدانێکیشیان لەنێوەرِاستی دێ دا هێشتەوە. هیچ کام

لە خانووەکانی ئەو دەشتە پەنجەرەی شووشەبەندیان نەبوو. خەڵکی یالیزیۆرد زۆر زوو لە نێوەڕاستی ئاوەدانی مزگەوتێکیان بە خشتی سوور دروست کرد. کە هاوین داهات چوونە کوێستان. لە چوکووراوا دروێنە زوو پێدەگەیشتن. خەڵکی یالیزیۆرد بە هەرەوەز بەرهەمەکەیان خێرا کۆ کردەوە. دێیان چۆڵ کردو بە هەوار چوونە گەلّی مەریەم چیل. لە ترسی مەحموودئاغا نەچوونە دەوروبەری کۆنە دێیەکەی خۆیان. دەترسان بەڵایەکیان بەسەر بێنێ.

زۆر لە لاوەکانیان لەشەڕ نەهاتنەوە. ئەوانەی هاتیشنەوە هەموویان پیاوی ئیفلیج, نەخۆش و نیوەپیاو بوون. زۆر بۆ ئەوانە کە نەهاتبوونەوە گریان. ژنانی یالیزیۆرد خۆڕاگرییەکی گەورەیان نواند. ژنەکان جوان بوون. هێندێکیان مێردیان بە سەربازە راکردووەکان و لاوانی گوندەکانی نیزیك کرد. لەماوەیەکی کەم دا وەك خەڵکی دەشتێ بوونە دەشت نشین و وەك خەڵکی چوکووراوا بە ئاوو هەوای دەشتێ ڕاهاتن.

لەو سەردەمەدا مەحموودئاغا لە کێوپارە وەك گێژەڵووکە دەیلەرفاندو لەگەڵ فەڕانسەیی‌یەکان کە هەتا چوکووراوا هاتبوون و لەگەڵ ئەرمەنی‌یەکان کە هاوکارییان لەگەڵ دەکردن, شەڕی دەکرد. چەتەو ڕێگرێکی زۆری لە دەوری کۆ ببوونەوە. لە چیای ڕا دەهاتە خوار بۆ دەشتێ و لە مەرجێن و خوارەوەی دەشتەکانی عوسمانیە هێزەکانی دوژمنی تێك دەشکاند. رۆژ بە رۆژ ناوبانگی پتر دەڕۆیشت. رۆژێکیان لە شەڕێك کە دوژمنی تێدا شکاندبوو دەگەڕایەوە کە ڕێی کەوتە یالیزیۆرد. کوێخا مووسا لەگەڵ هەموو خەڵکی ئاوەدانی, منداڵ و پیرو لاو لە دەری ئاوەدانی پێشوازییان لێکرد. داخوا ئەم پیاوە قارەمانە کۆنە ئاغاکەی خۆیان نەبوو؟ چما هەر ئەو نەبوو کە لە قاربوغازی چل و یەك فەوجی فەڕانسەی بەدیل گرت, بەجۆرێك کە خەبەرەکەی گەیشتە دێیەکەی وانیش و ناوبانگی پێ دەرکرد؟

مەحموودئاغا لەوە کە گوندێکی چوکووراوا بەم جۆرە, بە پێشوازی نەناسیاوێکی وەك خۆیەوە هاتوون, خۆشحاڵ بوو. خەریك بوو بڕیار بدا چەند رۆژێك لەم دێیەدا کە مزگەوتێکی جوانیشی لە نێوەڕاستێ دا هەبوو, بحەسێتەوە. لەنێو پیاوەکانی دا چەند بریندارێکیش هەبوون.

ئەو جڵەوی ئەسپەکەی توند کردبوو بە میهرەبانی‌یەوە تەماشای تاپۆرای ئەو خەڵکەی دەکرد کە ژمارەی ژنەکانیشیان زۆر بوو و بە پێشوازیەوە هاتبوونە دەری ئاوەدانی. لەو کاتەدا کوێخا مووسا بەرامبەری قوت بووەوەو گوتی:

"ئاغا بەخێراتی بۆ دێیەکەمان".

مەحموودئاغا دەسبەجێ کوێخا مووسای ناسیەوە:

"ئاغا ئەم دێیە هی ئێمەیە بەخێراتی, فەرموو".

مەحموودئاغا قسەی نەکرد, سەری داخست, ڕکێفی لە ئەسپەکەی داو بێ ئەوەی بچێتە نێو دێ بە تەنیشتی دا تێپەڕی و ڕۆیشت.

چووە شارۆچکە پرسیاری کرد, زانی کە ئەوانەی بزنەکانی وییان خواردبوو, لەو خاکە پڕ پیتەدا دێیەکیان ساز کردوەو بەکارترین خەلکی ئەو دەشتەن.

فەرانسەیی و ئەرمەنییەکان لە دەشتێ پاشەکشەیان کردو ڕۆیشتن. شەڕی سەربەخۆیی تەواو بوو. ئەو پیاوە ئازایانەی شەڕی دوژمنیان کردبوو بەچەکەوە چوونەوە شارۆچکە. ئێستا ئیدی دەوڵەتێکی تازە دادەمەزرا کە ئەوان دەبوونە بەردی بناغەی. دەستیان کرد بە داروبەش کردنی دەشتێ. کاری ئەو بەش وەرگرتنە لە هێندێ ناوچە ئاسان و لەهێندێ ناوچە دژوار بوو. ماوەیەکی زۆر مەحموودئاغا خۆی تووشی ئەو کارانە نەکردو هەروا سەیری کرد. ئەو زێدەخواز نەبوو. هەموو شتێکی هەبوو. ئەو شێوە کارەی لە چیا لە سەردەمی باب و باپیرانی دا باو بوو, بە چەشنێکی باشترو پێشکەوتووتر درێژەی هەبوو. بەڵام ئەم وەزعە هەتا سەر نەدەما. دەبوو بێتەخوار بۆ دەشتێ. دەیتوانی لەهەر جێیەك پێی خۆش بێ و هەرچەندی بیهەوێ کێلگە بۆخۆی پەیدا بکا. خەریك بوو دنیایەکی تازە دەست پێ بکاو مەحموودئاغا ئەوەندە خوێندەوارو دنیادیدە بوو کە ئەم مەسەیلە باش تێ بگا. ڕۆژێکیان بەیانی پیاوەکانیی بانگ کردو گوتی:

"سوار بن".

پیاوەکانی سوار بوون, چوونە دەشتی ئاناوارزا بۆ گوندی یالیزیۆرد. خەلکی دێ هەر کە خەبەریان زانی ئەو هاتوەتە دێیەکەیان, لە مەیدانی ئاوەدانی لە پێش مزگەوتێ خڕ بوونەوە. دەت گوت لەبیریان چووەتەوە کە مەحموودئاغا ئەوانی لە دێیەکەیان دەرکردوە.

کوێخا مووسا بە ڕووخۆشی پێشوازیی لێکردو بەمیهرەبانییەوە گوتی:

"فەرموو ئاغا, بەخێراتی بۆ دێیەکەمان".

کابرا نێوچاوانی تێك نا. وەك پەیکەری رق و تووڕەیی بەسەر ئەسپەکەیەوە ما.

"ئاغا فەرموو دابەزە, بەخێر بێی, خۆشحاڵت کردین کە هاتوویە گوندەکەمان, وا دەزانین دنیات داوینێ".

مەحموودئاغا کەمێك لەسەر ئەسپەکەی داهاتەوە, بە توندی و فەرماندەرانە گوتی:

"مووسا, سبەینێ ئەم دێیە چۆڵ دەکەن" و ئەسپی دەنگ داو لەوێ دوور کەوتەوە.

"ئاغا, ئاغا, مەحموودئاغا..."

سێهەمین رۆژ پیاوەکانیی ناردەوە ئاوایی. دێهاتی‌یەکان لە جێی خۆیان نەبزووتبوون. رۆژی چوارەم و پێنجەمیش هەروا... مەحموودئاغا دە رۆژان سەبری گرت: وادیار بوو ئەو دێهاتی‌یە خوێڕی و نەفامانە, ئەو دوورخراوانە جوابەجەنگی‌یان لەگەڵ وی, لەگەڵ قارەمانی شەڕی نیشتمانی دەکرد. سوار بوو و هاتە یالیزیۆرد. لە ئاوایی دا کەس دیار نەبوو هەموویان لە ماڵەکانیان دا خۆیان پەنا دابوو و چاوەڕوانی ئەو شتە بوون کە رووی دەدا.

"مووسا, بۆچی لە دێیەکەم وەدەر نەکەوتوون؟ ئەمن لە جیاتی ئەو بزنانەی خواردووتانن ئەم دێیەتان لێ‌دەستێنم. سەرپێچی مەکەن. باش دەزانن چتان بەسەر دێ".

"بچینە کوێ ئاغا؟ ئێمە ئەم گوندەمان بە چنگ و نینۆك ساز کردوە... بڕوانە دەستەکانمان, ئەم دەستانە وەك دەست دەچن؟ بڕوانە دەم و چاومان. تەماشامان کە, بزانە لە دەم وچاومان دا, لە لەشمان دا جێیەك ماوە وەك ئادەمیزاد بچێ؟ بڕوانە دێهاتی‌یەکان, چاو لە ژن و پیاوەکان بکە داخوا لە بنیادەم دەچن؟ ئاغا, ئەتۆ پێت وایە زیێەڵێن دەرهێنان و کردنی بە زەوی زۆر ئاسانە؟"

مەحموودئاغا کە وەك پەیکەرێك لە تووڕەیی و خۆبەزل زانین بەسەر ئەسپەکەوە دانیشتبوو, فەرمانی بە پیاوەکانی دا:

"ئاور لە دێیەکە بەردەن".

مەحموودئاغا ئەو چەند رۆژە چاوەڕوانی رۆژێك بوو کە بای شەماڵی بێ, لە نەکاو لە هەر سووچێکی ئاوایی گڕو بڵێسەی ئاگر چووە ئاسمان. دێهاتی‌یەکان بە گریان و بەخۆدادان لە مەیدانی ئاوەدانی‌دا کۆ بوونەوە, تەنانەت لە فکری بردنەدەری کەل و پەلەکانیشیان دا نەبوون.

"سبەینێ لێرە, لەم دێیە گیان لەبەر نابینم"

مەحموودئاغا هەروا بە سواری ئەسپ لەگەڵ ژمارەیەك لە پیاوەکانی کە لەگەڵی بوون دڕی بە حەشیمەتەکە داو لەدێ وەدەر کەوت.

پاش رۆیشتنی وی لەنێو دێهاتی‌یەکان و پیاوەکانی دا بوو بە شەڕ. زۆر لە دێهاتی‌یەکان بریندار بوون و لەبن پێی ئەسپان دا پان بوونەوە. لەو نێوەدا لاوێك بە ناوی قاسم کە تازە لە شەڕی یۆنان هاتبووەوە چەکی پێ بوو, بە گوللەیەك ساڵح برا چووکەڵەی مەحموودئاغای بە بێ‌گیانی لە ئەسپ بەردایەوە, ئەگەر لێی گەڕابان لەو خەندەکەوە کە سەنگەری لێ‌گرتبوو, هەموو پیاوەکانی مەحموودئاغای دەکوشت.

دووهەمین رۆژ کە مەحموودئاغا هاتەوە گوندی, نە گیان لەبەرێك لەدێ‌دا مابوو, نە خانوویەك کە داری بەسەر بەردیەوە مابێ. چەند خانوو هێشتا دووکەڵیان لێ‌هەڵدەستا. تەنیا

مزگەوت بە منارە دارینەکەیەوە لە نێوەڕاستی مەیدانەکەو لەنێو دووکەڵ دا قیت بە پێوە مابوو.

مەحموودئاغا بۆ گرتن و کوشتنی قاسم هەموو ڕێگاکانی کێوپارەی داخست, وەڵامی بۆ هەموو ئاشناکانی لە کێوپارەو بۆ چەتەکانیش نارد کە قاسمی بەزیندوویی یان بە مردوویی بدۆزنەوەو بۆی بنێرن. چەند مانگ تێپەڕین, هیچ کەس لە هیچ کوێ چووکترین شوێنەواری قاسمی نەدی. خەلکی یالیزیۆردیش ناوونیشانیان ون ببوو. لەو ڕۆژە بەدواوە گەڕان و لێکۆڵینەوەیان کردو خەبەرێکیان لەوان نەزانی.

✧ ✧ ✧

مەحموود ئاغا نەختێك درەنگتر, واتە پاش خۆرئاوا هاتە ماڵی موڕتەزائاغا. خزمەتکارەکان لەبەر دەرگای حەوشەی چاوەڕوانی بوون. بەسواری ئەسپ هاتە ژووری حەوشەی. موڕتەزائاغا کە لەبەرهەیوانێ ڕا چاوی لێ ببوو هاتوە, چووە خوارێ و جڵەوی ئەسپەکەی وەرگرت. مەحموودئاغا کە خێرا لە ئەسپەکەی دابەزیبوو, رووی کردە موڕتەزائاغاو گوتی:

"استغفرالله, جا ئەمە کارە؟" جڵەوی ئەسپەکەی لێ وەرگرت و دایە دەستی خزمەتکارێك کە لە پەنایان بوو. خزمەتکار ئەسپەکەی بردە سەر ئاخورێکی درێژ کە لە بەردی سەخت دروست کرابوو. ئەو دووانەش قۆڵیان کردە قۆڵی یەکترو لە پلیکانەکان وەسەر کەوتن. حەسنەخان لەپێش مێزێکی رازاوە پێشوازیی لێکردن و بە دەمی بە پێکەنینەوە گوتی:

"مەحموود ئاغا, براڵە بەخێر بێی, گەورەت کردین".

موڕتەزائاغا قۆڵی مەحموودئاغای گرت و لەسەر مێزەکە دایەنیشاند. لەسەر مێزەکە مەزەی جۆراوجۆر, سەهۆڵ و جامێکی گەورەی شووشەی پڕ لە بەفر چاوەڕوانیان بوو.

"باش بوو, ماوەیەکە لێوم لە مەشرووب نەداوە".

موڕتەزائاغا پێکەکەی بۆ پڕ کرد: نەختێك بەفر, ئاو؟

مەحموود گوتی: بەڵێ...

بەدەم خواردنەوەوە باسی ڕۆژگاری کۆنیان کرد, بەڵام نە ئەوو نە کەسی دیکە بە هیچ جۆر مەسەلەی حەمەدۆکی نەدێنایە گۆڕێ. ئەم وەزعە هەتا نیوەشەوێ درێژەی کێشا. حەسنەخان هێند بە پەلە بوو, وەخت بوو بتەقێ, لێکدا لێکدا هاتوچۆی ژوورەکەی دەکرد, مەزەی دێنا, خواردنی دەبرد, بەڵام نە مەحموودئاغاو نە موڕتەزائاغا باسی حەمەدۆکیان نەدەکرد. سەرەنجام تاقەتی بەسەر چوو و تەقیەوە:

"ئەم حەمەدۆکەش بۆ ئێمە, بۆ ئەم میللەتە بووەتە بەڵایەك".

مورتەزاغا بە رقەوە چاوێکی لێ‌کرد کە بە زمانی بێ زمانی دەی‌گوت ریسەکەت کردەوە بە خوری.

"هەم ئەتۆ, هەم مەحموودئاغاو هەموو پیاوماقوولانی شارۆچکە مەسەلەی حەمەدۆکتان بەکەم گرتوە. مەسەلەش هیچ چووکەڵە نیە. لە ولاّتی ئێمە, ولاّتی باب و باپیرانم ئەگەر حەمەدۆکێك پەیدا بێ و بچێ نەك عەلی سەفابەگ, بەڵکوو مێشوولەی ماڵی پیاوێکی وەك عەلی سەفابەگ بکوژێ, خەڵکی دەشتی ئاموخ راست دەبنەوە, کابرای دەگرن و سەری دەبڕن".

سەیر داگیرسابوو, دەستەکانی دەلەرزین و روخساری وەك چەوەندەری کوڵیو سوور هەڵگەڕابوو.

"ئەم مەسەلەیە شتێکی چووکەڵە نیە. حەمەدۆك رۆژێك هەڵدەستێ, خەڵکی گوندی یالیزیۆردیش لە دەوری خۆی کۆ دەکاتەوە..."

مورتەزاغا مۆڕەیەکی وای لێ‌کرد کە حەسنەخان ناچار بوو قسەکەی ببڕێ.

ئەگەر مەحموودئاغا دیسان هەر دەنگی نەکردبا, جوان نەدەبوو. بۆیە گوتی:

"خانم, ئەو حەمەدۆکە هیچ نیە"و بێدەنگ بوو.

حەسنەخان ویستی بڵێ: ئەدی ئەو کارانەی دەیان کا چین, ئەوانیش هیچ نین؟ بەلاّم کە چاوی بە چاوی مورتەزاغا کەوت, دەنگی نەکرد.

روخساری تووڕەی مەحموودئاغا کە پێکێکی دیکەی هەڵدابوو, کرایەوە:

"حەسنەخان, ئەو هیچ قیمەتی نیە, سبەینێ دووسبەی سوار دەبم دەچمە چیا, گوێی دەگرم, ئەویش بە تایبەتی لەبەر خاتری جەنابت گوێی دەگرم, دەی‌هێنمە ئەم ماڵەو ئەم ژوورە بۆ لای تۆ نـ...ا, ئەگەر بە زیندوویشت نەویست سەری بڕاوی بە گوێچکەی هەڵ دەگرم و دەی‌هێنم لە پێشت دادەنێم. ئەمن هەتا ئەمڕۆ کە لە بازاڕی لەگەڵ مورتەزاغا قسەمان دەکرد, مەسەلەی حەمەدۆکم لە کەس نەبیستبوو. کەسیش بە منی نەگوت بەلاّیەکی وامان بەسەر هاتوەو نەی‌پرسی کە چۆن دەتوانین لە شەڕی رزگار بین. کەس کارێکی لەمن نەویست. ئیدی کەس مەمانان بە پیاو دانانێ. پاش مەسەلەکەی یالیزیۆرد قینیان لەمن داگرتوە. نازانم چی‌یان لە گیانی من دەوێ. هەموو بزنەکانی منیان خوارد, براکەم و پیاوەکانمیان کوشت, لەسەر زێڕو مەزراکانم دانیشتن, مەزرایەك کە بە کۆڵ پارەم لێ خەرج کردوە هەتا لێڕەوارەکەم دەرهێناوەو کردوومە بە کێڵگە... وەختێکیش چووم ملکی خۆم وەرگرتەوە هەموو دنیا, تەنانەت ئەنکەرە, تەنانەت ئەو هاوڕێ‌یانەش کە چۆکمان وەچۆکی یەکتر داو شان بە شانی یەکتر دوژمنمان دایە بەر ئاگرو پێکەوە لەنێو ئاگردا بووین, لەمن

بوونە دوژمن. باوەڕ فەرموو ئەگەر تەنانەت تاقە یەکێك لە جووتیارەکانی یالیزیۆردیان دیتبایەوە، دێیەکەیان لێ‌دەستاندم و دەیان دایەوە بەو دێهاتی‌یە. ئێمە بەخۆڕایی لەسەر نیشتمان خوێنی سووری خۆمان ڕشتە سەر ئەو چیاو بەندەنانە. ئەوانەی وەك کەروێشك لەبن پنچکان دا خۆیان شاردبووەوەو لە ترسان سەریان نەدێنایەدەر، کەسانی وەك زولفۆو عارف صائم و تاشکەن خەلیل بۆمان بوونە قارەمان. بۆمان... شوکور بۆخوا کە خەلکی یالیزیۆرد کە زەوی‌یەکانی منیان زەوت کردبوو هەلاتن و لە شەرمان ئیدی دەرنەکەوتنەوە، لە ولات چوونەدەرو مەزراکەمان لە دەستی خۆمان دا مایەوە".

حەسنەخان هەناسەیەکی هەلکێشاو بە ڕاوێژێکی خەماوی‌یەوە گوتی: ئەو بەرچاوتەنگانە لەگەل جەنابتان دوژمنن.

"ئەو بەرچاوتەنگانە دوژمنی جەنابتن. ئێمە جەنابتان باش دەناسین ئاغا، چما پیاوی وەك تۆ پەیدا دەبێ؟ هەمووی ئەمانە لەگەل تۆو مورتەزاغا دوژمنن. چاوی دیتنی ئەم دووانەتانیان نیە. چونکە ئێوە هەردووکتان، هەم ئێوە هەم مورتەزاغا، هەرچی پەرچی نین، ئەسل و نەسەبتان هەیە. ئێمە لە ڕەگەزێکین کە ژن و ژن خوازیمان لەگەل عوسمانی‌یەکان هەبوو. چما ئەم وەحشیانە دەتوانن چاویان بە مەمانان هەلبێ؟ ئەوانە ئەگەر لە دەستیان بێ هەم تۆو هەم مورتەزای بە دەستی حەمەدۆکی بە کوشت دەدەن. لەوانەشە هەر وابکەن".

مەحموودئاغا بێ شلوێ بوون گوتی: بەو ئاسانی‌یەش نیە.

ماوەیەك ڕاوەستا، ئەمجار بە دوای یەك دا چەند پێکی هەلدان.

مورتەزاغا کەشەفی مەزەکەی بۆ ڕاگرت. ئەویش بە چاوداگرتنێك سوپاسی کرد. تەماشای چەپ و ڕاست و دارو دیوارو قەنەفەکانی کرد:

"بەو ئاسانی‌یەش نیە. چەند ڕۆژی دیکە تەنیا لەبەر خاتری گولی ڕوخسارت سەری براوی حەمەدۆك دەکەوێتە بەر ئەو لاقە جوانانەت".

حەسنەخان گوتی:

"جا دوژمنان وەختێك دیتیان سەری حەمەدۆك کە ئەوەندەی لێ‌دەترسان لەبەر پێی من دا کەوتوە، لە بەخیلی‌یان شەق دەبەن، ئەو یاوەرە بێ زیپك و زاکوونەش دووبارە لە جێی دا دەکەوێ، لەوانەشە لە خەفەتان بمرێ. وەك بیستوومە ژنەکەی نەی‌توانیوە لەگەلی بسازێ، مندالەکانیشی هەلگرتوون و چووەتەوە لای باوکی کە سەرهەنگە".

مورتەزاغا گوتی:

"دیاره دەچێتەوە, ژنی بەستەزمان چۆن لەگەڵ بنیادەمێکی ترسەنۆك بسازێ. . . "

پاش ئەوە مەحموود ئاغا جاروبار چەند قسەیەکی بە زمان دا هاتن و هەتا خۆرهەڵات مەشرووبی خواردەوە. وادیار بوو زۆری قسە کردبوو, وادیارە کەسانی بە شەخسییەت و جێداری وەك وی بە کەسری شانی خۆیانی دەزانن زۆر باسی غەریبەیەکی وەك حەمەدۆك بکەن. مەحموودئاغا فکری دەکردەوە: عەیبی نیە, ئەمانە بێگانە نین, ئەمانەش وەك ئەهلی ماڵی خۆمن. باوەڕ ناکەن, باوەڕ ناکەن کە ئەمن هەر سبەینێ دووسبەی سەری حەمەدۆکی دێنم و دەیخەمە ژێر پێیان. بەم فکرانە دڵخۆشیی خۆی دەدایەوە. بەڕاستی مەسەلەی هەوڵدان بۆ کوشتنی پاشا لە کوێوە هاتوە, داخوا وەزعەکە خەریکە تێك بچێ؟ چەند باش بوو کە دووبارە قسەیان نەکرد. خۆشحاڵ بوو لەوەی ئەم باسەی نەهێناوەتە گۆڕێ.

## (١٧)

مورتەزاغا لە گوێیان پێ‌دەکەنی, لەم سەری بازاڕەوە دەچووە ئەوسەرو دەهاتەوە, تووشی هەرکەس بایە چ دێهاتی و چ خەڵکی شارۆچکە, قسەی لەگەڵ دەکرد. لەگەڵ ئەوانەی لە چاخانەکەی تۆفیق لە دەوری کۆ ببوونەوە, باس و گاڵتەی دەکردو رووداوەکانی سەردەمی شەڕی سەربەخۆیی بۆ دەگێڕانەوە. باسی ئەو ئەفسەرە لاوانە کە مستەفا کەمال پاشا ناردبوونی بۆ توورووس و باسی تۆغان بەگ و تۆفان بەگی دەکردو چووبایە هەر جێیەك شنەبای شادی و خۆشحاڵیی لەگەڵ خۆی دەبرد...

خەڵکی شارۆچکە کە دوێنێ ئەویان جۆرێك بە لارەملی و رووگرژی دیبوو دەت گوت لەگیانەڵلا دایە, لەوە کە دەیان دی بووەتە تۆفانێك لە شادمانی, سەریان سووڕ مابوو و نەیان دەزانی چ باسە. خۆشحاڵی‌یەکەی ـ هەرچەند جێی سەرسوڕمانیش بوو ـ کاری کردە سەر خەڵکی شارۆچکەش.

خەڵکی شارۆچکە لێکرا بوونە گۆرانی‌بێژو دمبەگ ژەن, هەموویان چەتە کوژراوەکان و عەلی سەفابەگ و بەڵای حەمەدۆکیان لەبیر چووەوە.

ئەبداڵ جومەك بێ پرس و ڕا لە کاتێك دا دەهۆڵێکی پێ بوو, هات و دەستی کرد بە لێدان و لاوەکانیش دەستیان کرد بە هەڵپەڕین. دەستەیەك تەناف باز کە روون نەبوو لە کوێ هەڵقوڵین هاتن و لە خوار پردێ لەنێو ئەو پنگەڵەدا کەگوڵە شینەکانی پشکووتبوون و بۆنێکی خۆشیان لێ هەڵدەستا, تەنافەکانیان زۆر بەرز راهێشت و لە بەیانی‌یەوە تا ئێواری سێ ژن و پیاوێك لەسەر تەناف سەمای کەمەریان کردو پارەیان لەو خەڵکە وەرگرت کە لە دەوریان کۆ ببوونەوە. تەنانەت مورتەزاغاو ناودارەکانی شارۆچکەش تێکەڵی ئەمانە ببوون. کورسی و نیوتەختیان هێنان. لەسەر ئەو تەنافە بەرزانە

به سامای کەمەر هەنگامەیەك بەرپا کرابوو. کاردروستایی بۆ زۆرانبازی و گرەوە ئەسپیش کرا. بە کورتی تەواوی دانیشتووانی شار لەمندالّی حەوت سالّەوە تا پیری حەفتا سالّە لە شادمانیی مورتەزاغادا بەشدار بوون, بیّ ئەوەی لەهۆیەکەی ئاگادار بن.

سالّە کویّری سەرتاش پیاویّك بوو شەیتان و نیگاشیرن, لە هەزار ئاوی دابوو قوونی تەڕ نەببوو, سیّ‌ونۆ چاوی لە پشتە سەرێی هەبوون بۆ ئەوەی لە هەرچی لە نێو شارۆچکەدا روو دەدا ئاگادار بێ. وەختێك تووشی دەبووی دەی‌گوت:

"نیە, لینگەی نیە. پیاوی وەك مورتەزاغا نەهاتوەتە سەر دنیا, وەختێك پیّ‌دەکەنیّ هەموو خەلکی شارۆچکە لەگەلّی پیّ‌دەکەنن و کاتێك دەگری شارۆچکەش لەگەلّی دەگری و ئەودەم کە دەش ترسیّ خەلکی شارۆچکەش لەگەلّی کونەمشکیان لیّ‌دەبیّ بە قەیسەری. نیە, لینگەی نیە... تازە پیاوی وەك وی نایەتە سەر دنیا..."

سالّە کویّر کەلە هەزار ئاوی دابوو قوونی تەڕ نەببوو, ئەم جارەیان بە دوای هۆی رەفتاری ئێستای ئەم پیاوە چەنەبازەدا دەگەڕاو نەی‌دەدیەوە. لەبارەی ئەو پیاوەوە نەدەکرا بلّیّی زرینگ نیە. هەرچەند وەك مندالّیّك دلّپاك بوو, بەلاّم نەدەکرا پیّی بلّیّی زرینگ نیە. بلّیّی دەرو ژووری یەکن, یەك نین, پەنا بەخوا لەوانەیە کلاّو لە سەری شەیتانی بنێ. وەختێك خۆشحالّ دەبیّ لە کانگای دلّەوە خۆشحالّە, کاتێکیش ترسی ڕیّ دەنیشیّ دەست و لاقی رەق دەبن. دەبێتە جەنازەیەك و هەموو ناچارن لە شادمانی و ترس دا لەگەلّی شەریك بن.

سالّە کویّر دەی‌گوت:

"دەترسم وەختێك ئەم گەووادە بمریّ ئێمەش هەموو لەگەلّی بمرین. زۆر سەیرە لەگەلّ خیّزانم کە چل سالّی رەبەق شەڕە دەندووکەمان بووە ئێستا حەوتوویەکە نە شەڕە دەندووکەمان هەیە نە کێشەو هەراو نە دلّ عاجزی و نە تەنانەت قسەی لە گولّ کالّترمان بە یەکتر گوتوە... خوا بکا ئەم گەووادە هەمیشە وەك ئێستا خۆشحالّ بیّ..." لەم شارۆچکەیەدا تەنیا یەك کەس سەری لە کاری وی دەردەکرد, ئەویش رۆستەمە کوردە بوو. دەگەیشتە هەرکەس دەی‌گوت:

"دەزانی مورتەزاغا چیەتی؟"

"نا, چ بووە رۆستەم؟"

"چونکە چووەتە مەکە".

"سەیرە رۆستەم, کەنگیّ چووە مەکەو کەنگیّ هاتەوە؟"

"ئەمن دەزانم کەنگیّ چوو, و کەنگیّ هاتەوە".

بەڵێ رۆستەم قسەیەکی لەبن زمانی دا هەبوو, بەڵام نەیدەدرکاند. گورگی کەللەشەق بیشی کوژی هیچ ناڵێ. جگە لەوەش ئەو پێوەندییە نیزیکە کە ئەم دواییانە لەنێوان مورتەزاغاو رۆستەمە کوردەدا دامەزرابوو لەبەرچاوی خەڵك ون نەبوو, بەڵام مەسەلە چ بوو, ئەمەیان نەدەزانی. دڵخۆشیی هاوبەشی مورتەزاغاو خەڵکی شارۆچکە هەتا وەختێك عارف صائم بەگ و پارێزگار هاتنە شارۆچکە, درێژەی هەبوو.

رۆژێکیان بەیانی فۆردە نوێیەکەی عارف صائم بەگ کە نوقمی تۆزوخۆڵ بوو لە پێشەوەو ترۆمبێلە رەش و درێژەکەی پارێزگار کە ئاڵای بە سەرەوە بوو بە دوای دا, بە نێو بازاڕدا تێپەڕین و راستەڕێ چوونە خانووبەرەی قایمەقامیەت. وەختێك ترۆمبێلەکان بە بازاڕدا تێدەپەڕین, ئەو کەسانەی روخساری عارف صائم بەگیان لەنێو ترۆمبێلەکەدا دیبوو, خەریك بوو لە ترسان زراویان بچێ. ئەو بە روویەکی گرژەوە لەسەر کورسیی پاشەوەی ترۆمبێلە تۆزاوییەکە دانیشتبوو, ملی قیت راگرتبوو و چاوی لەسەریەك دانابوون. نە تەماشای لای چەپی خۆی دەکردو نە تەماشای لای راستی. پارێزگارو سەرهەنگ فەرماندەری قسەخۆشی جەندرمەش تەڵافەتیان وەك عارف صائم بەگ بوو. قایمەقام لە کۆڵانەکەی رووبەڕووی قایمەقامیەت لەو پیاوە سەرتاپێ تۆزاوییانە کە تەنیا چاوو ددانیان دیار بوون پێشوازیی کرد. دەست و لاقی دەلەرزین و نەیدەزانی دەبێ چ بکا.

"قایمەقام".

"بەڵێ خان"

"هەر ئێستا دەبێ تاشکەن خەلیل بەگ و ئاغاو خانەکانی دیکەو زولفۆبەگ و حاکمی شەرع و داواکاری گشتی بانگ بکەنە ئێرە..."

"بەسەرچاو"

بەڵام پێویست نەبوو قایمەقام پیاوماقووڵانی شار بانگ بکا. چونکە بەشێك لەوان هەر کە خەبەری هاتنی ئەو جەنابانەیان بیستبوو, لە حەوشەی قایمەقامیەت دا خڕ ببوونەوەو ئەوانی دیکەش کە خەبەریان زانیبوو بە پەلە بەرەو قایمەقامیەت دەهاتن.

تاشکەن خەلیل بەگ لە پێش دا دەستی عارف صائم بەگ و پاشان بە نۆرە دەستی پارێزگارو فەرماندەری جەندرمەی گوشی و گوتی:

"بەخێراتن جەنابان, فەرمرموون بۆ ماڵی ئێمە, لە ماڵی خۆمان باشتر ئیسراحەت دەکەن. تکا دەکەم جەنابان".

عارف صائم بەگ بێئەوەی تەماشا روخساری وی بکا تێی ڕاخوڕی:

"باشە, یاوەر لە کوێیە؟"

بە چاوی پڕ لە قینەوە تەماشای چوار دەوری خۆی کردو لەسەری رۆیشت:

"دەسبەجێ بیهێنن بۆ ماڵی خەلیل".

دووبارە سواری ترۆمبێلەکانی خۆیان بوونەوەو بەرەو ماڵی تاشکەن خەلیل وەڕێ کەوتن. کە لە پلیکانی ماڵێ وەسەر کەوتن دیتیان چوار پێنج پیاوی فلچە بەدەست چاوەڕوانن. تاشکەن خەلیل بەگ بەداوای لێخۆشبوونەوە گوتی:

"ڕێیەکان زۆر پڕ تۆزوخۆڵن, کۆمارەکەمان هێشتا ساوایە, جادەکان پڕ لە تۆزوخۆڵن. دەم زانی سەروچاوتان پڕ دەبێ لە تۆزوخۆڵ... لەبەر ئەو زەحمەتانە کە ئێوە لە پێناوی نیشتمان دا کێشاوتانە, دڵی بنیادەم بەردیش بێ دەبێ بە ئاو, تەحەممول ناکا. زۆر ناڕەحەتم کە سەروچاوتان وا دەبینم... دەکرێ چاکەتەکانتان مەرحەمەت کەن تا ئەو تۆزوخۆڵەی لێ بتەکێنم؟"

عارف صائم بەگ لە حاڵێك دا چاکەتەکەی دادەکەند گوتی:

"دەبێ بڵێی تۆزوخۆڵە پیرۆزەکەی ـ پێکەنی ـ تۆزوخۆڵە پیرۆزەکەی..."

"تۆزوخۆڵە پیرۆزەکەی لێبتەکێنم ئەفەندم..."

عارف صائم بەگ چاکەتی خۆی دایە دەست یەکەمین پیاوی فلچە بەدەست کە لە پەنای راوەستابوو. تاشکەن خەلیل بەگ لە ترسی گیانی دەستی بۆ لای ئەو چاکەتە کە تۆزوخۆڵی پیرۆزی لەسەر نیشتبوو درێژ کرد, عارف صائم بەگ لە حاڵێك دا چاوی لێ مۆڕ دەکردەوە دەستی وی گرت و گوتی:

"خەلیل وا مەکە. خەلیل ئێمە پێکەوە هاوڕێی مەیدانی شەڕ بووین. کاری وا مەکە".

تاشکەن خەلیل بەگ شڵەژا.

پارێزگار کە بەدوای وی دا هاتبوو, چاکەتەکەی دایە فلچە بەدەستێك. سەرهەنگ فلچەکەی لە یەکێك لە فلچە بەدەستەکان وەرگرت و لەسەر پلیکانەکان دەستی کرد بە خاوێن کردنەوەی چاکەت و پانتۆڵەکەی.

عارف صائم بەگ کە چووبووە ژوورێ و خۆی هاویشتبووە نێو قەنەفەکە, هاواری کرد:

"سەرهەنگ, بێزەحمەت چاکەتەکەت بدە بەوانەو وەرە".

"بەچاوان ئاغا" سەرهەنگ لە حاڵێك دا خێرا چاکەتەکەی داکەندبوو هاتە ژوورێ: بەڵێ ئاغا.

"تکا دەکەم بەرامبەرم دانیشە, لەوێ, لەتەنیشت پارێزگار".

دەسبەجێ شەربەتی فێنکیان هێنا. لەو بەینەش دا پیاوە ناسراوەکانی شارۆچکە هاتن و ژوورەکەیان پڕ کرد. هەرکەس دەهات لە حاڵێك دا پاڵی بەوانی دیکەوە دەنا دادەهاتەوە,

دەستی چەپی بە سنگیەوە دەگرت و دەیگوت: بەخێراتن. لە پێش دا دەستی عارف صائم بەگ, دوایە دەستی پارێزگارو ئەمجار دەستی سەرهەنگی دەگوشی و هەروا بە داهاتنەوەو بێ‌ئەوەی پشت راست کاتەوە دەستی چەپ لەسەر دوگمەی چاکەتەکەی دەچوو لە سووچێك کوشم هەڵدەهات. هەمووشیان شەلالی ئارەق بوون. کەسیش نەیدەوێرا ئەو دڵۆپە ئارەقە درشتانە کە لەنێوچاوانی نیشتبوون بسرێتەوە.

ئەم دیمەنەش لەبەرچاوی عارف صائم بەگ ون نەبوو. خۆ عارف صائم بەگ نەیدەتوانی بەو جانەوەرانە, بەو پیاوە زرت و زەلامانە کە لەوێ بە سەرشۆڕی و شەرمەزاری بەرامبەری راوەستابوون دەستوور بدا کە: دەسەسرەکانتان دەربێنن و ئارەقی نێوچاوانتان بسرنەوە.

ئەوانیش هەموو چاویان بڕیبووە عارف صائم بەگ و نیشانەیان لەو وشە پیرۆزە گرتبوو کە دەبوو لە دەمی بێتەدەرو هەر بەو جۆرە چاوەڕوان بوون.

بێدەنگی درێژەی کێشا. نە پارێزگارو نە سەرهەنگی جەندرمەو نە عارف صائم بەگ قسەیەکیان نەدەکرد. عارف صائم بەگ بە نێوچاوانێکەوە کە سات بە سات گرژتر دەبوو, تەماشا رووبەڕووی خۆی دەکرد. لە حالێك دا دیار بوو بەرە بەرە تووڕەتر دەبێ, لەسەرەخۆ یاریی بە داردەستەکەی دەکرد. یاوەر هاتبوو بەرامبەری خەبەردار راوەستابوو. عارف صائم بەگ لەو کاتەوە کە یاوەر هات, تەنانەت ئەو وەختە کە شەربەتە فێنکەکەشی هەڵگرت سەری هەڵنەبڕی کە تەماشای روخساری وی بکا. شەربەتی هەنگوین, شەربەتی سێوەترشەو هەنار لەکەشەفی زێودا دەهات و دەگەڕا. میوانەکان تەنانەت پاش ئەوەی تۆزوخۆڵی پیرۆزی چاکەتەکانیشیان خاوێن کرایەوەو لەبەریان کردنەوە, نەیان توانی تامەزرۆیی‌یەك بۆ دیتنی قەڵافەتی یاوەر لەخۆیان نیشان بدەن.

پاش ئەوەی بێدەنگی‌یەکە گەیشتە ئەوپەڕی عارف صائم بەگ چاوی بەسەر یەك یەکی حازران دا گێڕاو ئەمجار دارحەیزەرانەکەی توند لە عەرزی راکێشا بە جۆرێك کە شووشە پەنجەرەکان لەرزینەوەو حازرانی نێو ژوورەکەش تێك ڕابوون.

"ئێرە بۆگەنی لێ دێ".

سێبەری زەردەخەنەیەك بەسەر روخساری دا تێپەڕی کە پیاو نەیدەزانی بە تووڕەیی بوو یان بە گاڵتە پێکردن یان لە رووی خەفەتەوە. نەختێك دەنگی هەڵبڕی وگوتی:

"پێتان دەڵێم, ئەم شارۆچکەیە بۆگەنی لێ‌دێ".

زولفۆی تاپۆچی بە زەردەخەنەیەکی زۆرەملێ‌یەوە گوتی:

"ئەوە جاری پێشوو بوو جەنازەکە بۆنی کردبوو. جەنابت..."

"بۆنی کردوە زولفۆ, ئەتۆ لێرەی و ئاگا ناکەی. ئێستاش هەر بۆنی لێ‌دێ. زولفۆ, وام دێتە بەرچاو کە ئەم شارۆچکانە ڕزیون و هەتا ڕۆژی قیامەتیش هەروا دەبن".

زولفۆ بە دڵشکاوییەوە گوتی:

"جەنابت هەقتە ئاغا, چ بکەین ئێمە خۆمان بۆنمان کردوە".

"بەڵێ بۆنتان کردوە".

سات بە ساتیش زیاتر تووڕە دەبوو:

"جانتاکەم لەنێو ترۆمبێلەکە دایە, بۆم بێنن".

تاوێك دواتر جانتاکەیان هێنا.

جەنابی قایمقام ئەمانە وەخوێنە".

قایمقام دەستی کرد بە خوێندنەوەی جانتایەك نامەو برووسکە. لە پێش دا کەوتە پەتەپەت, بەڵام دوایە بە لەباری دەستی بە خوێندنەوە کرد. کە ئەو دەی‌خوێندنەوە یاوەر بەسەر پێوە زەرد هەڵگەڕابوو, وەك پەلکە گەڵا دەلەرزی. خەریك بوو بکەوێ.

"برۆ یاوەر برۆ هۆوێ, ئائەوێ, برۆ دانیشەو لەوێش مەبزوو. قایمقام ئەتۆش بەردەوام بە".

پاش ئەوەی خوێندنەوەی نامەو برووسکەکان تەواو بوو, بە ڕاوێژێکی داخاوی‌و ترسێنەرەوە گوتی:

"ئاوا, هاوڕێیان, بۆگەنی لێ‌دێ".

ئەوانەی لە ژوورەکە بوون متەقیان نەدەکرد. قامکیشیان نەدەبزاوتن و چاویان نەدەترووکاندن, لەوانەبوو نەتوانن هەناسەش هەڵبکێشن.

عارف صائم بەگ بە دەنگێکی ماندوو, بێ تووڕەیی و بێ دڵئێشی لەسەر قسەکانی خۆی ڕۆیشت:

"ئەمن ئێرە, ناوچەی نوێنەرایەتیی خۆم باش شارەزام. ئەمن وەختێك گەنج بووم, زۆر لەم لاوە گەنج تر, لێرە فەرماندەری جەندرمە بووم. ئەو وەختیش ئێرە ئاغای وەك ئێوەی هەبوون. ئەمن لەو لاوە ـ ئاماژەی بۆ یاوەر کرد ـ گەنج تر بووم. بۆ ڕاونانی چەتەکان بەرد نەما پێی لێ نەنێم و کون نەما سەری پێدا نەکەم. ئەمن کاتێك لەم لاوەش گەنج تر بووم, نەك لەگەڵ حەمەدۆك و ئەم جۆرە بێ ڕەگ و ریشانە, بەڵکوو لەگەڵ کەسانی وەك بایرام ئۆغلی, گزیك دۆران, دیرگن عەلی و ڕەشیدە کوردە کە هەریەکەی پادشایەکی ئەو چیایانە بوون بەشەڕ هاتووم. ناتوانم بڵێم هەموویانم بەچۆك دا هێنا, بەڵام بەچۆکیش دا نەهاتم. ئەو وەختیش ئاغای وەك ئێوە چەتەیان بە چیاو بەندەنانەوە هەبوون. بەڵام هیچ کەس ئاوا, ئەم جۆرە برووسکە

خوێڕیانەیەی لە دژی من بەڕێ نەکرد. ئەمن هەمووی دەزانم و هەموو جێیەکی ئەم شارۆچکەیەو توورووسەکان شارەزام و ماڵ بە ماڵ و نەفەر بە نەفەر دەیان ناسم. کاکینە, ئاغاکان و خانەکان, ئەمن تەنانەت دەزانم ئێوە چەند ڕەگتان لە جەرگی دا هەیە, تەنانەت دەزانم لە چیاکان تاقمە چەتەی واتان هەیە کە هەرچی پێتان خۆش بوو دەیکەن. بۆگەنی دێ".

بێدەنگ بوو, دەت گوت چاوەڕێی وەڵامی پرسیارێکە. چاوی بەسەر یەك یەکی حەشیمەتەکەدا گێڕا. هەمووان سەریان داخستبوو.

زولفۆ دیسان کەوتە مەرایی کردن, سەری هەڵبڕی و گوتی:

"ئەمن نیمە, ئەمن تاقمە چەتەم نیە".

عارف صائم بەگ گوتی:

"ئەمن دەزانم ئەتۆ چەتەت نین زولفۆ. ئەتۆ پێویستیت بە چەتە نیە".

زولفۆ قسەکەی وی لە هەوا قۆزتەوە:

"پێویستییشم پێ نابێ...".

عارف صائم بەگ بە پێکەنینەوە گوتی:

"بۆچی, دەبێ هەت بێ زولفۆ؟ ئەمنت لە پشتم. ئێمە هەین. بەس نیە؟".

زولفۆ سەری بەردایەوە.

عارف صائم بەگ لەسەر قسەکانی ڕۆیشت:

"مەسەلەی چەتە مەسەلەیەکی ساکار نیە, پێوەندیی بە ئاسایشی گشتییەوە هەیە. مەسەلەیەکی دەوڵەتییە... پاش ئاناتۆلیی ڕۆژهەڵات تەنیا لە ناوچەی نوێنەرایەتیی من دا چەتە هەیە... ئەگەر مستەفا کەمال پاشا بەم مەسەلەیە بزانێ هیچ جوان نابێ. بۆ چەتەیەکی چووکەڵەی بێقیمەت, بەڵێ چووکەڵە, پووشکەیەکتان کردوەتە دنیایەك و کێچێکتان کردوە بە گایەك و نامە لەسەر نامەو برووسکە لە دوای برووسکە دەنێرنە ئەنکەرە, باشە سوودی چیە؟ بڵێن بزانم کێ ئەوەی کردوە؟"

چاوی لە چاوی زولفۆوە بڕی, تەماشای کرد. چاوەڕوان بوو زولفۆ وەڵامی بداتەوە. زولفۆ جینگڵێکی داو خەریك بوو شتێك بڵێ بەڵام نەیتوانی.

"ئەمن هیچم لێ نایە زولفۆ, ئەگەر هەموو خەڵکی چوکووراواو توورووسەکان لە حەوت ساڵەوە تا حەفتا ساڵە ببنە چەتە بۆخۆت باش دەزانی کار لە من ناکاو ناکا. پاشا بۆ ئەو وردە مەسەلانە ئەمن بانگ ناکاو لێم ناپرسێ چ بووە. ئەتۆ بۆخۆت لە هەموو کەس باشتر دەزانی

کە زیانەکەی بۆ چوکوورراوا خۆیەتی, چوکووراوایەك کە دەڵێی چەپکە گوڵە. زیانەکەی بۆ جەنابی پارێزگار, بۆ ئەم سەرهەنگە بەڕێزەی جەندرمەو بۆ ئەو یاوەرە لاوەی ڕۆڵەی کۆمارەکەمانە".

"دەزانم سەروەری بەڕێز".

"گوێت لێ بێ زولفۆ, لەم شارۆچکەیە کە ئەتۆی لێی, ئەتۆیەك کە چاوو گوێ و دەست و لاقی منی چاوەڕوانی ئەم شتانە نەبووم. تەماشاکە زولفۆ. هەتا وەختێك ئەمن لە ئەنکەرەم موویەك لە سەری ئەم جەنابانە کەم نابێتەوە, ئەتۆ بۆخۆت دەزانی کە ئەمن لە ئەنکەرە توانای ئەوەم هەیە داکۆکی لە پارێزگارو سەرهەنگ و یاوەر بکەم".

"دەزانم قوربان".

"تەنانەت دەتوانم وریای حەمەدۆکیش بم. پێتان خۆشە لێبووردنێکی تایبەتیی بۆ وەردەگرم. ئەمن دەتوانم پێنج هێندە, دە هێندەی زەوییەکانی ئێوەی زەوی بۆ دابڕم. ئەودەم ئەویش دەبێتە بەڵایەك و دەکەوێتە گیانتان. لەم مەلادۆرانەش خەراپتر".

بە وەکازەکەی ئاماژەی بۆ مەلادۆران کرد: هەستە وەرە ئێرە.

مەلادۆران بە پەلە دەسحێبە نەوەدونۆ دەنکییەکەی لە گیرفانی هاویشتەوەو هات بە شلو ولی لە بەرامبەر عارف صائم بەگ دا ڕاوەستا.

"بلێ بزانم دۆران, ئەتۆ کەنگێ چوویە "جامع الازهر"و زانستە ئایینییەکانت خوێند؟ بلێ بزانم"

"دەست و لاقت ماچ دەکەم خان...".

"بلێ بزانم ئەتۆ کەنگێت خوێندو کەنگێ خوێندەوار بووی؟ بلێ ئیدی. ئەتۆ ئەگەر ئەلف ببینی پێت وا دەبێ دارخانوویە".

"خان, خان.."

ملی بەلاوە نابوو و بە حاڵەتی پاڕانەوە تەماشای دەکرد.

عارف صائم بەگ پێکەنینێکی تاڵی کردو گوتی:

"ئەمن ئیدی لەوە زیاتر مەجەلّی مەلادۆران ئەفەندی تێك وەرنادەم. چونکە ئەگەر زۆری لەسەر بڕۆم وەزعێك دێتە پێش کە هەمووتان قامکی خۆتان دەگەزن".

"وەرە پێشێ, وەرە پێشێ, وەرە نیزیکم دۆران".

مەلادۆران لە حاڵێك دا لاقەکانی تێك با هەڵدەدران لێی نیزیك کەوتەوە.

"داوەرەوە".

مەلادۆران دەستی بە سنگیەو گرتن و بەرامبەری داهاتەوە. عارف صائم سەری بەگوێی مەلادۆرانەوە ناو بە چپە گوتی:

"دۆران. سەگباب, رەنگە ئەم کارانە لەبن سەری تۆدا بن. بە ملی شکاوت, بلێ بزانم ئەتۆ ئەم برووسکانەت لێداوە؟ ئەتۆ گوتووتە ئەم نامانە بنووسن؟"

"نەوەڵڵا بەگ, نە بیللا بەگ, لەبەر بەری پێیانت مرم, بەزەییت پێم دا بێ".

"زۆر باشە, بلێ بزانم چ کەسێك یان چ کەسانێك ئەوانەیان نووسیوە؟"

"وەڵڵا نازانم خان, بیللا نازانم".

عارف صائم چاوێکی خێرای لە مورتەزاغا کردو کابرا وەختێك تیری نیگای وی لێدرا هەموو ئەندامی لەشی لەرزین.

"حەز دەکەی لەو بارەیەوە لێی بکۆڵمەوە".

"لێی بکۆڵەوەو کابرای وەبینە. ئەگەر نەیبینیەوە, بۆخۆت دەزانی چ دەبێ. ئێستا بڕۆ لە جێی خۆت دانیشەوە. یاوەر!"

"فەرموو بەگ"

"رۆژنامەنووسێك لەم شارۆچکەیە هەبوو, ناوی چ بوو؟ زەکی بەگ بوو؟"

"بەلێ ئاغا..."

"بانگی کە بۆ ئێرە".

"بەسەرچاو ئاغا"

لەبەر هەرچییەك بوو عارف صائم بەگ پاش قسەکردن لەگەڵ مەلادۆران ئەفەندی هاتبووەوە سەرەخۆ.

"چاوی زەمانە پیاوێکی دەغەڵ یانی پیاوێکی نزمی وەك مەلادۆرانی ئێمەی ـ لە حالێك دا زگی هەڵدەبەزیەوە, قاقا پێ‌کەنی ـ مەترسە مەلادۆران, راستیت لێنالێم, وەك مەلادۆرانی نەدیوە. چونکە ئەمن حەز لە ئینسانی هەلکەوتوو دەکەم, بۆیە ئاشقی مەلادۆرانم. تەماشای کەن بەو ریشەو بەو عەبایەوە هەر مێزەرێکی سەوزی کەمە, بەو قاپقاپانەیەوە هەروەك مامۆستاکانی "جامع الازهر" دەچێ, دۆرانی خۆمان, ئەم دۆرانە. پیاوێکی هەزار روو, دوو هەزار روو و سێ هەزار روو نیە, دە هەزار رووی هەیە. ئێستا کە ئێوە هێندە لەو حەمەدۆکە منداڵۆچکەیە دەترسێن, لە جیاتی هێزی جەندرمە مەلادۆرانی بنێرن. وەك مووی لە ماستی راکێشێ, گوێی دەگرێ و دەیهێنێ دەیداتە دەستتان. باوەڕ کەن درۆ ناکەم..."

"حاشا ئاغای خۆم, حاشا لە رووتان..."

"بڕوانە دۆران, وشەی حاشا فێر بووە. کوڕە دۆران..."

تەماشای کردو چاوەڕێ ما. روخساری شاد بوو و پێدەکەنی.

"لە سێبەری جەنابت دا, لە سایە سەری جەنابتەوە فێر بووین".

"لینگەی ئەم قورئان خوێنە خوانەناسە تەنیا یەکێکە, لە ئەنکەرە. ئەویش ئاغای بەڕێوەبەری گشتییە. جا چ بەڕێوەبەرێکی گشتی. دەسەڵاتی سەرۆك وەزیری هەیە, هەمەکارەی ئەنکەرەیە, نیوەشەوێکیان دیتم لە دەرگا دەدەن. دەرگام کردەوە دیتم بەڕێوەبەری گشتیی خۆمانە, لەبەر دەرگا جانتا بەبن هەنگڵەوە وەك پشیلەی زیانەخرۆ شەرمێون و شەرمەزار راوەستاوە..."

عارف صائم بەگ لەگەڵ گێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتە لە پەستا پێدەکەنی و کەیفی دەکرد:

"لەپێش دا نەم ناسی. قەڵافەتی جۆرێك بوو دەت گوت خەبەری مەرگی هێناوە. ئەوەندە پەرێشان بوو دەت گوت غازی پاشا (لەقەبێکی ئەتاتورکە ـ وەرگێڕ) بەڵایەکی بەسەر هاتوە: گوتم وەرە ژووری وەرە. بە ترس و لەرزەوە هاتە ژووری. دام نیشاند. گوتم فەرموو برای بەڕێز. با ئەوەش بڵێم ئەگەر ئەو کەیفی لێبێ من و عیسمەت پاشای (سەرۆك وەزیری ئەوکاتی تورکیە ـ وەرگێڕ) دەکاتە دووکەڵ و دەمان نێرێتە هەوا. باشتان گوێ لێبێ, ئەو بنیادەمێکی وایە..."

لە کاتێك دا بە وەکازەکەی ئاماژەی دەکرد گوتی:

"ئەو ئەگەر حەز کا ئەم شارۆچکەیە, ئەو چیای تووڕووسەو چوکووراوا دەکاتە دووکەڵ و دەیان نێرێتە هەوا. راستییەکەی ئەمنیش ترسام, زۆری خۆ پێشان نادەم, چونکە ئەگەر کەیفی لێبێ ئەمنیش دەکاتە دووکەڵ و دەم نێرێتە هەوا. ها. ها. ها. ها. ها... بەڵام ئەمن هاوڕێیەکی زۆر, زۆر... کۆنی ویم. رازی نابێ رەفتاری وام لەگەڵ بکا... بەڵێ. بەڕێوەبەری گشتیمان دەرگای جانتاکەی کردەوە, ئەم نامانەی هێناومن و بۆتانم خوێندەوە دانی بە من و گوتی: ئەمانەم لەبەر خاتری تۆ راگرتوەو ئێستاش دەیان دەم بە خۆت. لەمن بەولاوە کەس نەیدیون. بەڵێ, کاری دنیا ئاوایە".

لەو بەینەدا زەکی بەگی مامۆستا هات.

"وەرە بزانم کاکی رۆژنامەنووس. ناوت چ بوو؟"

"رۆژنامەنووس زەکی".

"ئەتۆ مامۆستاشی, نا؟"

"مامۆستام".

"دانیشە بزانم".

زەکی بەگ بە ئەدەب دەستی لەسەر ئەژنۆیانی داناو دانیشت و بە بێدەنگی ملی بەلارەوە گرت.

"دەڵێن ئەتۆ لێرەوە خەبەر بۆ رۆژنامەکانی ئەستەمبووڵ دەنێری, پەیامنێری".

"بەڵێ ئاغا".

"زۆر با...شە. هەتا ئێستا چ دەنگوباسێکت ناردوە؟"

"چەند رۆژ لەمەوبەر ئاغا خەبەری کوژرانی نۆ چەتەم نارد, زۆر باشیشم نووسیبوو کە چۆنمان پێشوازی لە یاوەر کردو حەمەدۆك چۆن بنیادەمێکە. هەمووی ئەمانەم, زۆر جوان کێشابووەوە".

"چی دیکە؟"

"لەبارەی هێرشی چەتەکان بۆ ئەو دێیە کە چۆن دەستدرێژی‌یان کردە سەر نامووسی شەش کچ و ئەوانیان لەگەڵ خۆیان بردە چیاو دوایەش دێیەکەیان سووتاندو..."

"شتی وا رووی داوە؟".

یاوەر گوتی:

"ئێمە نەمان زانیوە".

"زۆر باشە. چی دیکە...؟"

زەکی بەگی مامۆستا. بە ئیشتیاوە باسی هەموو ئەو خەبەرانەی کرد کە لە یەك ساڵی رابردوودا ناردبوونی. لە ئاخری دا گوتی:

"جەنابی مورتەزاغا پیاوێکی زۆر نیشتمانپەروەرە. ئەوەندە بەرێزو گەورەیە کە من لە هەموو پێشهاتەکان ئاگادار دەکا".

"باشە دوایە, دوایە, دوایە چی؟"

زەکی بەگ لە حاڵێك دا ئیکلامی دەکێشا گوتی:

"جەنابی ئاغا..."

پاشان نارەحەت بوو. وەك منداڵێك کە بووکەشووشەکەیان لێ ئەستاندبێ, کۆڵەگرووی لە ئەوکێ ماو گوتی:

"ئەمن شکایەتم هەیە, لە خزمەت جەنابت شکایەت دەکەم ئاغا".

"لەکێ؟"

"بەگشتی شکایەتم لە هەموو رۆژنامەکانی ئەستەمبووڵ هەیە. هیچ کام لەو خەبەرە دڵتەزێنانەیان کە بە وردی و بە سەرنجێکی تەواوەوە نووسیبوومن و رێك وپێکم کردبوون, بڵاو

نەکردەوە. ئەگەر ئاناتۆلی لەنێو بچێ, لە ریشەوە بسووتێ, هەموو لەنێو بچن, دوژمن بێ و ئێرە داگیر بکا, دیسان هیچ نانووسن. ئاغا بەقەد مێشوولەیەك بایەخ بۆ مەمانان دانانێن. حەمەدۆك, مەسەلەی حەمەدۆکیان هەر بڵاو نەکردەوە, جەنابی ئاغا, تەنانەت خەبەری مردنەکەشی... ئەمن شکایەتم هەیە. چەند باش بوو کە بانگتان کردم و ئەمنیش توانیم ئەمانە عەرزی خزمەتتان بکەم".

"رۆژنامەکانمان تا ئێستا هیچ کام لە خەبەرەکانی تۆیان بڵاو نەکردوەتەوە؟"

زەکی بەگ بە خۆشحاڵی‌یەکی منداڵانەوە گوتی:

"بۆچی, ئەگەر چاپیان نەدەکرد پێم نیشان دەدان چی‌یان پێ دەکەم"

"کام خەبەر بوو؟"

"تەشریف هێنانی زاتی مەبارەکتانم ناردبوو. لە لاپەڕەی یەکەمیش دا چاپیان کردو وێنەی جەنابتانیشیان لەگەڵ چاپ کردبوو".

"لەو بارەیەوە کرێیەك شتێك..."

"چیتان فەرموو؟"

"بۆ ئەو خەبەرە هیچیان نەدایەی؟"

"نا, نەم توانی وەری بگرم, ناشم هەوێ... ناوی شارەکەمان بکەوێتە رۆژنامەکەوە بەسە. ئەمن هیچی دیکەم ناوێ".

"زەکی بەگ!"

"فەرموو قوربان".

"ئەتۆ مامۆستای, نا؟"

"لە سایەی سەری جەنابتانەوە".

"ئێستا پێشنیارێکم بۆت هەیە".

"بەسەر سەر قوربان".

"دەست لە مامۆستایەتی هەڵگرە".

"ناتوانم قوربان, ژن و منداڵم و باب و دایکە پیرەکەم لەبرسان دەمرن".

"کاکی رۆژنامەنووس, ئێستا کەوایە لە ئێستاوە دەست لە ناردنی خەبەر بۆ رۆژنامەکان هەڵدەگری و ئیدی تاقە دێڕێك بۆ هیچ جێیەك نانووسی. ئەگەر بزانم... ئێستا دەتوانی بڕۆی. ئەگەر جارێکی دیکە بزانمەوە..."

زەکی هەستا, دەستەکانی وەکیلی میللەتی گرتن, ئەو دەستی کێشایەوە دوایە, بەڵام دیسانیش بەزۆر ماچی کردن و بە لاتسیاو لاتسیاو لە پلیکانەکان چووەخوار. بەدەم ڕۆیشتنەوە پەیتا پەیتا لەبەر خۆیەوە دەیگوت: ئیدی ناکەم قوربان, هەرگیز ناکەم, ناکەم, نا... نا... ئیدی ناکەم.

بە هەموو درێژایی بازاڕدا کە دەڕۆیشت هەر دەیگوت ئیدی ناکەم. دەوروبەری خۆی نەدەدی, بێئەوەی ئاگای لە خۆی بێ هەتا سەر پردێ ڕۆیشت.

پاش ڕۆیشتنی وی عارف صائم بەگ بە ناڕەحەتییەوە گوتی: بەستەزمان لە دڵەوە بەپەرۆش بوو, هەر خەبەرێك کە دەینێرێ چاپی ناکەن دیسانیش هەر سوورە لەسەر ئەوەی بنێرێ. دیارە بەستەزمانە کوڕێکی خەیاڵ پەرستە.

چاوی بۆ تاشکەن خەلیل گێڕا:

"خەلیل بەگ لە کوێیە؟"

"ئێستا دێ قوربان".

"یاوەر, وەرە ئێرە".

یاوەر خەبەردار راوەستا.

"هیچ خەبەرێك نابێ لێرە بچێتەدەر"

"پۆستەخانە لەژێر چاوەدێری دایە, ماوەیەکە بێ ئاگاداریی ئێمە هیچ خەبەرێك لەم شارۆچکەیەوە بەرێ ناکرێ. نە نامەو نە برووسکە"

پارێزگار بە ئاسانی و بڕوا بەخۆبوونەوە گوتی:

"بە پێی فەرمانی عارف صائم بەگ رەفتار دەکرێ".

"جەنابی یاوەر, دیارە بۆخۆشت دەزانی دەبێ چۆن رەفتار بکەن... ناڕەحەت مەبە. مەسەلەی حەمەدۆك ناڕەحەتت نەکا. ئەمن بایرام ئۆغلێم نۆ جار کوشت. هەر نۆ جاریش دێهاتییەکان دەیان گوت ئەمە بایرام ئۆغلێیە. باوەڕ کەن بۆ فریودانی منیش وایان نەدەگوت, درۆشیان نەدەکرد. پێیان وابوو هەموو پیاوێکی بەخۆوەی سمێڵ گەورە بایرام ئۆغلێیە, چونکە پاش مردن قەڵافەتی بنیادەم دەگۆڕێ. دێهاتییەکانیش هەموو جارێ ئەگەر کەسێکمان دەکوشت پێیان وا بوو بایرام ئۆغلێیە. دەزانم ئەم رۆژانە خەو لە چاوت نەکەوتوە, لە خەوو خۆراك کەوتووی. ئەمنیش کاتێك یەکەمین بایرام ئۆغلێم کوشت وا بووم. بەڵام کە سێهەمین بایرام ئۆغلێم کوشت ئیدی راهاتبووم و بە هیوا بووم جاری چوارەم بەڕاستی بیکوژم. تەنانەت

نۆهەمین جاریش ئەم توانی بیکوژم, نۆهەمین کوژراومان بەداخەوە ئەسپ دزێك دەرچوو. منداڵێك بوو هێشتا سمێڵی بۆر نەببوون و ئەو کەسەی ئێستا لەگەڵی لە مەجلیس دام... باشە لێی گەڕێن".

عارف صائم بەگ نەیویست لەسەر قسەکانی بڕوا. هەموو ئەو کەسانەی لەوێ بوون دەیان زانی ئەو وەکیلەی باسی دەکا کێیەو مەسەلە چییە.

عارف صائم بەگ خۆی پێ نەگیراو لەسەری ڕۆیشت:

"ئەو پیاوەی ئێستا لە مەجلیس دا پێکەوەین ڕۆژگارێك بەنیاز بوو ڕەسەنی هەموو ئەسپ و ماینی دنیا چاك بکا. هەربۆیە فەرمانی بە پیاوەکانی دەدا کە بە شەو ئەسپ و ماینی خەڵك لە تەویلەکان بدزن و... دوا بایرام ئۆغڵی کە کوشتمان قوربانیی دەستی وی بوو, یەکێك بوو لە پیاوەکانی"

تاشکەن خەلیل بەگ بە قۆڵ هەڵماڵاوی وەژوور کەوت و گوتی: چەتەکەباب حازرە. (بەرخێك کە بە ساغی بە شیشەوە دەکرێ و لەسەر ئاگر دەبرژێ ـ وەرگێڕ).

"ڕاکیی خالیسیشتان هەیە؟"

"ئەویش حازرە".

چوار مێزیان هێنان و لە نێوەڕاستی ژوورەکەدا پێکیانەوە نان و سفرەیەکیان لەسەر ڕاخستن. مورتەزاغا حەزی نەدەکرد لەسەر مێزی نان خواردن ئامادە بێ, زۆر نارەحەت بوو. لەوێ کەس نەبوو نەزانێ ئەم گۆنگەڵە هەمووی لەبن سەری وی دایە. مەلادۆران ئەفەندییش جۆرێکی چاو تێوە بڕیبوو هەر مەپرسە... مورتەزاغا بەدوای تاشکەن خەلیل دا چووە دەرەوەی سالۆن و ون بوو... وەختێك خەریك بوو لە پلیکانەکان بچێتە خوارێ خەلیل بەگ قۆڵیی گرت و بەدەنگێکی وەك وشەوشی ماری کولەوەیباب بە گوێی دا چپاند:

"ناپیاوی نەفام, ناپیاوی نەفام. ناپیاوی نەفام خەریکی خۆت ون دەکەی؟ نازانی وەختێك ڕۆیشتی پاشملەی تۆ چ بە عارف صائم بەگ دەڵێن... هەموو خەتاکان دە ملی تۆ دەپەستێون. وەگەڕێ".

مورتەزاغا بێ هەست و خوست گەڕایەوەو لە جێی خۆی دانیشت.

خواردنەوەی ڕاکیی خالیس و خواردنی چەتەکەباب و جموجۆڵی ماڵەکە تا بەیانی درێژەی کێشا. ئەو شەوە میوانەکان بێئەوەی بخەون ڕۆژیان کردەوەو لەگەڵ تاوهەڵات وەڕێ کەوتن.

زولفۆ پاش ئەوەی ئەوانی بەڕێ کرد, خۆی گەیاندەوە مورتەزاغا کە بە پەلە بەرەو ماڵ دەچووەوە:

"ناپیاوی خوێڕی, سەگی ترسەنۆك, ئەتۆ ئەم بەلاّیانەت بەسەر هێناین و هەمووشی لە ترسان. منت فەوتاند. وەجاخت کوێر کردمەوە. دیتت کە ئەو عارف صائم بەگەی بۆخۆم کردوومەتە بنیادەم و ناردوومەتە مەجلیس وەختی ڕۆیشتنی نەك هەر دەستی دەنێو دەستی نەنام, بەلکوو چاویشی لێ نەکردم. موڕتەزا ئەتۆ بابی منت بەگان دا, ئەمنیش بابی تۆ بەگان دەدەم و تۆزی بە بادا دەکەم. تێگەیشتی؟ پاشەڕۆژی منت کردە هیچ, هیچ, هیچ. چاوەڕێ بە. ئەمنیش دوارۆژی تۆ دەکەمە هیچ. ئەتۆش بچۆ دوارۆژی خۆت لەگەل یاوەر فارووق و پارێزگارو عارف صائم بەگ بەش بکە".

قۆلّی وی بەرداو گەڕایەوەو ڕۆیشت. موڕتەزاغا کە ماوەیەك لەجێی خۆی ڕەق ببوو بە دوای دا غاری داو بانگی کردو گوتی:

"زولفۆ سەر ماوێ سەر من, ئەتۆ من باش دەناسی. لە دۆستانی باوەڕپێکراوی خۆت بپرسە, لە مەلادۆرانی فێلّباز پرسیار بکە, ئەوان پێت دەلێن ئەمن چۆن پیاوێکم. ئەمن کەسێکم قسەی خۆم لە پێشەوە دەکەم. ئەگەر لەسەر ئەم نامەو برووسکانە بەلاّیەکم بەسەر بێ زۆر باش بزانە بێ ئەم لاو ئەولا دەت کوژم".

زولفۆ دەستی کرد بە پێکەنین و پاشان دووبارە قۆلّی وی گرتەوەو گوتی:

"گوێت لێبێ کابرا, چما ئەمن نازانم ئەتۆ چوویە کن خانی ڕەمەزانی و ئەم نامەو برووسکانەت بە وەکیلەکەی وی نووسیوە؟"

موڕتەزاغا هاواری کرد:

"چی؟ ئەتۆ ئەمانەت لە کوێ زانیوە؟"

"ئەمن هەمووی ئەمانە دەزانم. بەلاّم بە کەس, تەنانەت بە عارف صائم بەگی براشمیان نالێم. جا ئەتۆش لەمەودوا بێ ڕاوتەگبیری من هیچ مەکە".

"بەلێن دەدەم".

قۆلّیان لە قۆلّی یەکتر ڕاکردو بە قسەکردن هەتا سەر پردێ ڕۆیشتن.

بەلاّم یاوەر بە زەحمەت خۆی گەیاندە ژووری کاری خۆی لە مەخفەری جەندرمە. ئەو نامەو برووسکانەی عارف صائم بەگ لەگەل خۆی هێنابوون هەمووی لەسەر مێزەکە بلاّو کردنەوەو یەك بە یەك دەستی کرد بە خوێندنەوەیان. بە خوێندنەوەیان تووشی وەزعێکی سەیر هات و لە هۆش خۆی چوو. هەتا ئێوارێ هەر نامەو برووسکەیەکی چەند جار خوێندەوەو پاشان هەتا تین لە گەرووی دابوو هاواری کرد. وەکیل باشی عاصم و سەرجووخە عەلی کەرتیش غاریان داو لە ژوورەکەی دا ڕاوەستان:

"ئەمرکە جەنابی یاوەر".

یاوەر بە وەزعێکی ناناسایی لە حاڵێك دا لە رقان چاوی هیچ جێیەکیان نەدەدی هاواری کرد:

"ئێستا، ئێستا، ئیدی لەمەودوا لەو نینۆکەشەیتانانە دەگەیەنم ئەمن کێم. ئەوان یاری بە دوارۆژی من دەکەن و دەم خەنە ئەم وەزع و حاڵەوە؟ لەنێوم دەبەن؟ ئەمن لەمەدوا چۆن دەتوانم لەکن خەڵکی سەر هەڵێنم و تەماشای چاوی فەرماندەرەکەم و ئەوانی لەخۆم باڵاتر بکەم؟"

بە دیتنی بەردەستەکانی کە لەبەر دەرگا خەبەردار وێستابوون، نەختێك هاتەوە سەرەخۆو گوتی:

"ئەمن خەریکم دەمرم، ئەمانە وەخوێنن".

لە کاتێك دا وەك سەرخۆشان بەلادا دەهات لە ژوورەکەی خۆی هاتەدەرو چووەوە ماڵەکەی. هەموو لەشی کوترابوو، دەت گوت لە ناونگ دا کوتاویانە. بێئەوەی جلەکانی داکەنێ چووە نێو جێی راکشاو تاوێك دواتریش خەوی لێکەوت.

وەسبەینێ ڕا بەیانیی زوو کاتێك یاوەر چووە مەرکەز دیتی وەکیل باشی عاصم و سەرجووخە عەلی کەرتیش و هەموو وەکیل و سەرجووخەو نووسەرەکان لە دەوری ئەو مێزە کە نامەو برووسکەکانی لەسەر بڵاو کرابوونەوە خڕ بوونەوەو خەریکی قسەو باسن. بێئەوەی چاویش لەچاویان بکا بەنێوچاوانێکی زۆر گرژەوە چوو لە پشت مێزەکەی دانیشت. ئەو رۆژە بەیانی ریشی نەتاشیبوو، و بە سەرو پۆتەڵاکێکی نارێك و کەوشی تۆزاوییەوە هاتە دایرە. چاوی دەقووڵ کەوتبوون. پاش ئەوەی ماوەیەك خۆی بەخوێندنەوەی نامەکانی سەر مێزەکەوە خافلاندو چەند شتێکی نووسین و خەتی بەسەردا هێنان و نامەکانی سەروبن کردن، بانگی وەکیل باشی عاصمی کردو پرسی:

"ئەم کەنعانە کوێخای گوندی چانقازوخ کێیە؟ ئەمن دەیناسم؟"

"بەڵێ فەرماندەر، دەیناسی".

"چۆن پیاوێکە؟"

خەبەرهێنی تایبەتیی خۆمانە. شوێنی هەموو ئەسپ دزەکان هەڵدەگرێ و جێیەکەیان دەبینێتەوەو خەبەرمان پێ دەدا. پیاوێکی کزەڵەی کورتەباڵای بەهۆشە".

یاوەر گوتی:

"ئاها، ناسیمەوە، پیاوێکی باش دیار بوو، نازانم چۆنە نامەی وای دژی من نووسیوەو ناردوویەتە ئەنکەرە، ئەتۆ چۆنی تێدەگەی وەکیل باشی؟"

"ئەویش بنیادەمە، کاری بنیادەم کەس تێی ناگا. دارێك نۆسەدو نەوەدونۆ گەڵای هەیەو ریشەی لەبن زەوی دایەو رەگەیەکیشی لەسەر زەوییە، بنیادەمیش هەر وایە. ئەمن پێم وایە ئەو بۆخۆی ئەو نامەیەی نەنووسیوە، پێیان نووسیوە".

"ئەمنیش هەر وای بۆ دەچم، پێمان دەڵێ کێ پێی نووسیوە، وەنا؟".

"پێمان دەڵێ جەنابی یاوەر، ئەو خەبەرهێنی تایبەتیی خۆمانە. جەنابیشتی بەقەد رووحی خۆی خۆش دەوێ".

"ئەمنیش هەر پێم وابوو، پێم سەیرە کەنعان چۆن توانیویە کاری وا دەرهەقی من بکا. وەختێك نامەکانم خوێندەوە بۆخۆشم شەرمم لە خۆم کردو توامەوە. ئەگەر یەکێك لەو نامانە ـ کە ئەمن بە خوێندنەوەیان خۆم لەبیر چووەوەو گوتم ئەم یاوەرە دەبێ ئیعدام بکرێ ـ کەوتبایە دەستی فەرماندەرایەتی، یان وەزیری نێوخۆ حەتمەن فەرمانی کوشتنم دەردەچوو. نامەکان ئەوەندە کاریگەر بوون کە ئەمن تا ماوەیەك لەبیرم چووەوە کە لەگەڵ خۆمیانەو لەدڵی خۆم دا گوتم دەبێ ئەو یاوەرەی بگرم و ئیعدامی بکەم. لەبارەی پیاوێکی وەك منەوە ئەمانەیان بۆچی نووسیوە، ئەویش هەمووی درۆو دەلەسە. چۆن دڵیان رازی بوو، بنیادەم زۆر زاڵمە. وەکیل باشی بنیادەم، مرۆڤ یەکجار زۆردارە... نووسیویانە کە ئەمن بۆ ئەوەی پێشوازیم لێبکرێ و میداڵ وەربگرم وەسمانەرەشم کوشتوەو دوایەش کردوومەتە حەمەدۆك... ئەو نۆ کەسەش کە ئێمە کوشتوومانن هیچ تاوانێکیان نەبووە. وەختێك لە باقر گلیگی ئەوانمان گرتوە، خەریکی ئەسپ لەوەڕاندن بوون، لاوەکانی ئاوایی بوون. شتی وا ئیمکانی نیە".

وەکیل باشی عارصم گوتی:

"ئیمکانی نیە، بەڵام ئەوە دەبینی ئیمکانی بووە. راوەستین بزانین ئەم قەرەچی بازاڕە چ بەڵایەکی دیکەمان بەسەر دێنێ".

یاوەر گوتی:

"قسەی تۆیە، رادەوەستین و هەر لەو کاتەش دا دەبێ وشیار بین... ـ پێکەنینێکی تاڵی هاتێ ـ سەرجووخە عەلیی بانگ کە".

سەرجووخە عەلی کە لە پاش دەرگا چاوەڕوان بوو بە چاوی تەڕەوە هاتە ژوورێ و بە راوێژێکی بێوازو ماندووەوە گوتی: ئەمرکە جەنابی یاوەر.

"هەر ئەمڕۆ دەسبەجێ کەنعانم بۆ بێنە ئێرە".

سەرجووخە عەلی بە شانازییەوە گوتی:

"لێرەیە، ئەمن دوێنێ شەوێ دەسبەجێ هێنامە ئێرە، لەخوارێ چاوەڕوانە".

"ناڕەحەت مەبە سەرجووخە".

"ئەمن ناڕەحەت نەبم، ئەدی کێ ناڕەحەت بێ... دەبچۆ گیانی خۆت هەڕاج کە... ئەو هەموو لامە لامەیە لەبەر خەڵکی دێهات بکە... بڕوانە جەنابی یاوەر ـ دەستەکانیی لێك

کردنەوە ـ جەنابی یاوەر تەماشای دەستانم کە, ئەوەندەم زللە لەو دێهاتی‌یانە داوە ئاوایان لـێ هاتوە. ئینسافە؟ دەستم لە لاقم ئەستوورترن ئاخر دەستی بنیادەم وایە؟ بریا هەر لە دێ‌یەکەی خۆمان مابامەوەو کرێکاریم کردبا. پاش ئەم رووداوە ئەمن ئیدی ناتوانم بژیم, یان لە کار دەکشێمەوە یان ئەوەندە بەسەری خۆم دا دەدەم هەتا دەمرم. ئێمە لەو نامەیەدا بووینە جەللادێکی تەواو. ئێمە جەللادین جەنابی یاوەر؟ ئێمە ئەرکی خۆمان بەجێ دەگەیەنین و رۆڵەی نیشتمانپەروەری ئەم کۆمارەین. ئەگەر ئەرکی نیشتمانی نەبێ بە مریشکی کەس نالێم کشە. پاش ئەم رووداوە مردن بۆ من نەبێ, بۆ کێ باشە؟"

دەستت لە سەرجووخە عەلی دابا فرمێسکی دەهاتەخوارو یاوەری دڵپاکیش نەی‌دەزانی چۆنی دڵخۆشی بداتەوە:

"کەنعانی بێنە ئێرە".

"هەموو ئێسکی لەشی دەشکێنم...".

سەرجووخە غاری دایە خوارێو بە ددان لەچیڕەوە بردن کەنعانی لەگەڵ خۆی هێنا. کەنعان نەی‌دەزانی مەسەلە چیە, زۆر دەترسا. بە چاوی پڕ لە پاڕانەوەی سەگێك تەماشای چاوەکانی یاوەری دەکرد:

"لەوێ راوەستە".

"وەکیل باشی عاصم ئەم نامەیەی بۆ وەخوێنە".

وەکیل باشی عاصم نامەکانی یەك بە یەك خوێندەوەو لـێ‌یان بووەوە.

"وەرە ئێرە".

کەنعان بە چاوی حەبەساوی چووە کن مێزەکەی یاوەر.

"ئەو نامەیە ئەتۆ گوتووتە بۆت بنووسن؟"

"رووحم خەبەردار نیە".

"بڕوانە, ئەم ئیمزایە هی تۆ نیە؟"

کەنعان دەست بە سینە داهاتەوەو تەماشای نامەکەی کرد:

"نەخەیر ئاغا".

"باشە, ئەدی ئەم مۆرە؟ بۆ ئەوەی باش دیار نەبێ مۆرەکەت لەسەر نامەکە سووڕاندوە".

"ئی من نیە جەنابی یاوەر, چما ڕێی تێ دەچێ ئەمن بێ‌ئەدەبیی وا لەخزمەت جەنابت دا بکەم؟".

یاوەر وەك بریسکە لە جێی خۆی راپەڕی و بە هەموو قەوەتی خۆی زللەیەکی لە لاچاوی کەنعان راکێشا. کەنعان لاترێکی برد, بەڵام نەکەوت. یاوەر بەوە زیاتریشی رق هەستا.

زللەیەکی دیکە, یەکی دیکەو کوێخا بەسەر تەپڵی سەری دا کەوت. سەرجووخە عەلی کەرتیش لە جێی خۆی راستی کردەوە. کەنعان خوێنی بە زارو تفنکان دا دەهاتەخوار. یاوەر وەختێك لە جێی خۆی دانیشتەوە, هەناسەبڕکەی وێ کەتبوو.

"بڵێ کێ هانی دای ئەم نامانە بنووسی؟"

"ئەمن نامەی وام نەنووسیوە...".

"دەبێ بڵێی کێ هانی داوی...".

"ئەمن...".

"سەرجووخە عەلی, ئەو سەگبابەی بەرە ئیقراری پێ بکە... هەتا قسە نەکا لە کۆڵی مەبەوە... حەز دەکەی بیبە سەر چۆمی".

کەنعان پاڕایەوەو گوتی:

"جەنابی یاوەر, وەدەست ویم مەدە. ئەگەر دەڵێی ناوی ئەو کابرایە دەنووسم و ئیمزای دەکەم".

"ئەمن راستی‌یەکەم دەوێ".

سەرجووخە کەرتیش بە راکێش راکێش بردیە دەرێ. یاوەر کە ئارام ببووەوە, بە پێکەنینەوە لە پشتەوەڕا تەماشای دەکردن. دڵنیا بوو زۆری پێ ناچێ کە راستی‌یەکەی دەڵێ. زۆری پێ‌چوو. سەرجووخە عەلی سەروسۆراغی نەبوو. یاوەر حەوسەڵەی بەسەر دەچوو.

"وەکیل باشی عاصم, وادیارە خۆ ڕادەگرێ. کەسێك ئەوەندە بەدەست سەرجووخە کەرتیشەوە خۆ ڕاگرێ دەبێ وەك پۆڵا قایم بێ. وانیە وەکیل باشی؟".

"راستە جەنابی یاوەر. ئەم ئاغایانە کە دوژمنی مەملەکەت و دوژمنی ئێمەن دەزانن ئەو کارە خەتەرناکانە بە کێ بکەن. کاری وا بە پیاوە بە ئەزموونەکانیان دەسپێرن".

"ئا...خ بم توانیبا ئەم کوێخایە وەزمان بێنم... زۆر باشە, یانی لەو بیست و سێ کوێخایە یەکێکیان ئیقرار ناکا؟"

"زۆریان ئیقرار دەکەن جەنابی یاوەر. کەمی وایان تێدایە بتوانێ لەبەر دەستی سەرجووخە عەلی دا خۆی راگرێ".

یاوەر هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو گوتی: بەڵێ زۆر کەمە بەڵام... بانگی کە بزانین مەسەلە چیە.

تاوێك دواتر سەرجووخە عەلی کەرتیش بەدەستی خوێناوی و پشتی لە ئارەق دا شەڵاڵ و دەم و چاوی رەش داگیرساوەوە هات: قسە ناکا جەنابی یاوەر!

"دەڵێ چی؟".

"هەرچی ئاغای لەم شارۆچکەیەدا هەیە ناوی بردوە, لە سەرووی هەمووشیانەوە مورتەزاغا قەرەداغلی ئۆغلی".

یاوەر هەر تاوە نا تاوێك سەرجووخە عەلی کەرتیشی لەخوارێ ڕا بانگ دەکردە سەرێ و راپۆرتی لـێ وەردەگرت. هەتا نیوەشەوێ چاوەڕوانی ئاکامی کارەکەی بوو.

"قسە ناکا جەنابی یاوەر, ئەمجار هەرچی ئاغای دەیناسێ ناوی دێنێ. ناوی خێزانی عارف صائم بەگیشی بردوە. دەڵێ هەموو نامەکان ئەو لەسەر داوای زولفۆ نووسیونی".

یاوەر گوتی:"بیبە سەرچۆمی" و بۆخۆشی چوو بخەوێ:

"ئەگەر ئیقراری کرد هەڵم ئەستێنە. چاوەڕوانم".

کوێخا کەنعان هەر کە دیتی چاویان بەستن زانی مەسەلە چیە. کەوتە سەر پێی سەرجووخە عەلی کەرتیش:

"ژەنراڵ سەرجووخە عەلی کەرتیش, ناوی هەر کەست دەوێ دەیڵێم. لەسەر هیچ وخۆڕایی وا مەکە. ژن و منداڵم هەیە. منداڵم وردن... باب و دایکیشم زۆر پیرن".

سەعاتێك دواتر کوێخا کەنعان لە حاڵێك دا دوو جەندرمە چووبوونە بن پیلی بەسەر خرەبەردەکانی لێواری چۆمی دا راکێشرایە خوارێ.

سبەینێ بەیانی یاوەر هاتە دایرە. شەوێ هیچ نەخەوتبوو. ویژدانی زۆر لە ئازاردا بوو. ئیمزای بن نامەکانی بە زەڕەبینێکی گەورە کە لە دەرمانخانەی وەرگرتبوو, تەماشا کرد. هیچ کام لە مۆرەکان نەدەخوێندرانەوە. هەموویان ساختە بوون. ئەدی ئیمزاکان؟ لەبارەی ئیمزاکانەوە مەسەلەکە ئاڵۆز بوو. ئەگەر ئیمزاکان ساختە بایەن دەبوو هەموویان دووسێ کەس ئیمزایان کردبان, لەکاتێك دا ئیمزای هەر نامەیەك لەگەڵ نامەیەکی دیکە فەرقی هەبوو, دیار بوو هەر نامەیە کەسێك ئیمزای کردوە. خەتەکان هەموو خەتی لادێ بوون. ئیمزای کوێخاکانی هەبوو, لەگەڵ ئیمزای نامەکان لەبەر یەکی راگرتن, زۆر وەك یەك دەچوون. ئەگەر ئەو ئیمزای کردوە بۆچی بە قیمەتی گیانی خۆشی ئیقرار ناکا. هێشتا ناهومێد نەببوو.

هەتا ئێستا کەس نەبوو سەرجووخە عەلی کەرتیش بێباتە چۆمی پرسیاری لـێبکا, بەڵام ئیقرار نەکا. ئەمجار بەزەیی بە سەرجووخە عەلییش دا دەهات. بەستەزمانە لە منداڵییەوە تا ئێستا رۆژی خۆشی نەدیوە. دایك و باب و خوشك و براکانی هەموو لەبرسان و بە مالاریا مردن. ئەو کە بەحەوت ساڵی هەتیو ببوو لەدەرکی خەڵکی بێبەزەیی هەتا سنووری گیان کێشان کاری کرد بۆ ئەوەی ژیانی خۆی دابین بکا.

سەربازی فریای کەوت. ئەویش بەتێکۆشان و جێبەجێ کردنی وردی ئەرکەکانی گەیشتبووە ئەم پلەیەو بە قەرارو مەدار کرابوو بە سەرجووخە. بەڵام وەرە بزانە کابرای ئەرک ناس چۆن ناچار بووە وەك حەیوان لەگیانی خەڵك بەر بێ و شەووڕۆژ بێ ڕاوەستان هەتا سنووری مردن دارکارییان بکا. ئێستا چەند دەقیقەی دیکە شەکەت و ماندوو و نیوەگیان لەچۆمی ڕا دێتەوەو پەشێوحاڵ و پەرێشان لەبەر کوورەخانەی گەرم خۆ درێژ دەکاو هەتا چەند ڕۆژانیش نایەتەوە سەرخۆ. چەنەلێدان لەگەڵ خەڵك بە هیچ جۆر کارێکی ئاسان نیە. ئەودەم ئەو پیاوە فیداکارو بەرێزە کە سەری لە پێناو بەجێهێنانی ئەرکی خۆی دا بەخت دەکا, ناویان ناوە جەللاد. دەبوو سەرجووخە عەلی لە کاتی شەڕ لەگەڵ ڕێگران دا ببینن... ئەو سەربازێکە بەقەد لەشکرێك... یاوەر چەند دەقیقە بیری لە مانای وشەی کەرتیش کردەوە, وەختێك لە ماناکەی پرسیبوو, گوتبوویان کەرتیش بە مارمێلکەی گەورە, یان بزن مژە دەڵێن. سەرجووخە عەلی کوێی وەك بزن مژە دەچێ؟ ئەمجار هەموو شتێك تەنانەت خەفەتەکانی خۆشی لەبیر چوونەوەو پێکەنی. وەختێك سەرجووخە عەلی سەری خۆی بەو لووتە زەلام و ناحەزەوە کە دەماری شینی تێدان, هەڵدەتەکێنێ وەك بزن مژە ناچێ؟

"وەکیل باشی عاصم, خەبەری سەرجووخە عەلی چیە؟"

"هێشتا خەبەری نیە. ئێستا دێتەوە. نایەڵێ کارەکەی بگاتە خۆرهەڵات".

"پێت وایە ئیقراری لێ وەرگرتوە؟"

"حەتمەن ئیقراری پێ کردوە".

"پێت وایە کێ هانی داوە ئەو نامانە بنووسێ؟"

"یەکی وا کە هەر فکرمان بۆی ناچێ".

"وەك؟".

"وەك مەلادۆران ئەفەندی".

"ئەتۆ شکت لەوە؟".

"نەخەیر".

"شکت لە کێیە؟".

"بە فکری من لەم شارۆچکەیە دوو کەس وێ دەچێ ئەم کارەیان کردبێ, یەکیان زولفۆ, یەکیشیان مورتەزاغا".

"چۆن شتی وا دەبێ؟ یەکیان دۆستی نیزیکی عارف صائم بەگ و یەکیشیان دۆستی خۆمە... ئیمکانی نیە".

"لەم دووانە بەولاوە فكرم بۆ كەس ناچێ".

"بۆچی ئەوان دەبێ ئەو كارە بكەن؟".

"ئەمەیان ئیدی نازانم. دەبێ هۆیەكەی بدۆزینەوە".

یاوەر باسەكەی گۆڕی:

"دەزانی بە سەرجووخە عەلیی خۆمان دەڵێن بزن مژە...؟".

نە زولفۆو نە مورتەزاغا, كاری هیچ لایەكیان نەبوو بۆچی؟ بۆیە ئیدی...

یاوەر بێئەوەی خۆی پێ ڕابگیرێ, قاقا پێدەكەنی. پاش پێكەنینێكی زۆر گوتی:

"كەرتیش یانی مارمێلكەی گەورەی بزن مژ, بزانە وەختێك سەرجووخەی خۆمان بەو لووتە زەلامەیەوە سەری هەڵدێنێ و نەویی دەكاتەوە, وەك بزن مژە ناچێ؟".

وەكیل باشی عاصم بە پێكەنین قسەكەی وی سەلماندو گوتی:

"بەڵێ وێ دەچێ و زۆریش وێ دەچێ. هەر دەڵێی بزن مژەیە, زۆریش تووڕەو تۆسنە..."

یاوەر گوتی: حەیف بۆ ئەو پیاوە. زۆرم زگ پێ دەسووتێ. ناوێكیشی جەللادە..."

"ئەدی جەللاد. بەستەزمانە..."

"لەكوێ بووە؟".

یاوەر رستەكەی تەواو نەكردبوو كە عەلی كەرتیش هاتە ژوورێ و خەبەردار راوەستا. خەریك بوو بەلادا بێ, دڵۆپە نارەقی زلە زلە نیشتبوونە سەر نێوچاوانی... بن هەنگڵ و بەرزگیشی تەڕ بوون. هەتا نێوقەدێش قوڕاوی ببوو. جلەكانی هەموو گنج و لۆنج بوون.

هەر كە چاویان پێ كەوت لە پێش دا یاوەرو دوایە وەكیل باشی عاصم دەستیان بەبەر زگیانەوە گرت و لە قاقای پێكەنینیان دا. تەماشایەكی عەلییان دەكرد ـ كە سەری هەڵدەبڕی و دایدەنواندەوە ـ و دووبارە لە فیشقەی پێكەنینیان دەدایەوە... هەتا ئەوان پێدەكەنین عەلی زیاتر خەبەردار رادەوەستا. پەیتا پەیتا بە نیشانەی خەبەردار سەری بڵند دەكردو نەویی دەكردەوە.

سەرەنجام یاوەر كە بە زۆر پێكەنینەكەی راگرتبوو, پرسی: قسەی كرد؟

"بەڵێ فەرماندەر".

"پێت وایە راستی گوتوە؟".

"پێم وایە راستی گوتوە".

"كێ بوون؟"

"زولفۆو مورتەزاغا".

"ئەوە دەڵێی چی؟".

عەلی کەرتیش منجە منجێکی کرد, ویستی شتێك بڵێ, بەڵام نەیتوانی.

"زۆری خۆ ڕاگرت, ئەمنیش هەروا... وەختی گیان دەرچوون ئەم دوو ناوەم لە زاری دەرکێشا. دەسبەجێ دامە دەستی جەندرمەکان و غارم دا بۆ ئێرە".

"کەوایە مرد؟"

"بەڵێ نەختێك".

"دانیشە چایەك بخۆوە..."

سەربازێك کە لەبەر دەرگا بوو, غاری دا چایەکی گەرمی بۆ سەرجووخە عەلی کەرتیش هێنا. سەرجووخە عەلی تەنانەت وەختی چا خواردنەوەش هەر نیوە خەبەردار ڕاوەستابوو. ئارامیی ئینسانە بەختەوەرەکان و ماندوویی کەسێك کە کارێکی باشی ئەنجام دابێ, لەسەر روخساری بەدی دەکرا.

"باشە سەرجووخە, کوێخا کەنعان مرد؟".

"بەڵێ کەمێك".

"دانیشە سەرجووخە عەلی".

"بەچاوان جەنابی یاوەر, مردبوو جەنابی یاوەر. بەڵام زۆرم زگ بە کەنعانی سووتا... مردوە... مردوە... جەنابی یاوەر"

تاوێك دواتر جەندرمەکان خەبەری مەرگی کوێخا کەنعانیان هێنا.

"بچنە ژوور سەری مردووەکەو شایەت نامەیەك بنووسن. دەتوانن داواکاری گشتی و دوکتۆریش بەرن.

وەکیل باشی عاصم ئەتۆ بۆخۆت تایپی بکە, نووسەر (کاتب)م ناوێ. ئەوەی پێت دەڵێم وشە بە وشە دەینووسی. ناوو نیشانەی کەنعانم بۆ بێنن".

ناوو نیشانەی کوێخای گوندی چانقازوخیان لە دوێنێ شەوێ وە لەسەر مێزی جەنابی یاوەر دانابوو. سەرجووخە عەلی لەسەر مێزەکە تێی ڕۆ هات و دایە دەستی یاوەر:

"فەرموو جەنابی یاوەر".

"سوپاست دەکەم, هەتا وەکیل باشی عاصم شایەت نامەکە تەواو دەکا, بۆخۆت بچۆ ئیسراحەت بکە".

تەقەو ڕەقەی تایپ وەڕێ کەوت. تایپێك بوو زۆر کۆن و گەورەو ناقۆڵا کە بەشێك لە پیتەکانی لەکار کەوتبوون, بەڵام بەدەست وەکیل باشی عاصمەوە وەك فرفرە کاری دەکرد.

"بەڵێ... دوێشەوێ حەمەدۆك ناو سەردەستەی چەتەكان هاتوەتە لێواری چۆمی نیزیك شارۆچكە, كەنعان كوێخای گوندی چانقازوخی بە لێدان كوشتوە. كوێخا كەنعان خزمەتی زۆر بەنرخی بە حكوومەت دەكردو بە دۆزینەوەی شوێنی هەموو ئەسپ دزەكان دەرەتانی گرتنیانی پێك دێناو چەندین ساڵ لە چیاكان دا بە راونانی چەتەكان شوێنی خۆحەشاردانی ئەوانی بە ئێمە نیشان دەدا. باسی ئەو كارەساتە دڵتەزێنە حەیدەر كوڕی سولەیمان خەڵكی گوندی چانقازوخ كە لەگەڵ كوێخا بووەو ئەو كارەساتە جەرگبڕەی بەچاوی خۆی دیوە, بۆ ئێمەی گێڕاوەتەوە..."

لەپڕ وەكیل باشی عاصم دەستی لە تایپ كردن هەڵگرت و گوتی:

"جەنابی یاوەر, بە باوەڕی تۆ ئەم شتە ناتەبایی لەگەڵ قسەكانی دیكەدا نیە؟".

"مەبەستت چیە؟"

"ئاخر جارێك رادەگەیەنین كە حەمەدۆك شرت و گوم بووەو لەهیچ كوێ دیار نیە, جارێكیش دەڵێین هەتا پەنا شارۆچكەی هاتوە".

یاوەر فارووق پێكەنی و گوتی:

"وەكیل باشی عاصم ئەو شایەت نامەیە لەلای خۆمان دەبێ, كاتێك حەمەدۆك لەنێو چوو, ئەودەم كردەوەكانی لەقاو دەدەین, تێگەیشتی؟"

"تێگەیشتم جەنابی یاوەر".

"هەموو ئەم راپۆرتانە دوایە دەچنە سەر دۆسیەكە. كاری خۆت بكە".

"پێشهاتەكە بەو جۆرە بووە كە لەگەڵ پیاوەكانی, كوێخای لە ماڵەكەی دێننەدەرو دەیبەنە بەستێنی پەنا شارۆچكەو ماڵی مورتەزاغا قەرەداغلی ئۆغلیی ـ كە یەكێكە لە پیاوماقووڵانی شارۆچكە ـ لێدەپرسن. سەردەستەی چەتەكان حەمەدۆك دەیەویست مورتەزاغاش لەگەڵ عەلی سەفابەگ بكوژێ, بەڵام ئەو وەخت مورتەزاغا لە ماڵێ نابێ و گیانی لەو مەترسیە رزگار دەبێ. سەردەستەی چەتەكان كە دەیەوێ ئەویش بكوژێ, غیرەت وەبەر خۆی دەنێ و هەتا نیزیك شارۆچكە دێ. شەوێ كەنعانی كوژراو كوێخای گوندی چانقازوخ لە جێی دەردەكێشێ و دەیباتە قەراخ چۆمی. شوێنی مورتەزاغای لە كوێخا دەپرسێ و كوێخاش هەرچەند بە جێیەكەی دەزانێ بە مردنی خۆی رازی دەبێ و جێیەكەی پێ ناڵێ, سەرەنجام حەمەدۆك ناو سەردەستەی رێگران و پیاوەكانی دەست دەكەن بە لێدانی و پاش ئەوەی تا بەیانی ئەشكەنجەی دەكەن, دەیكوژن.

ئەم شایەت نامەیە لە شوێنی روودانی تاوانەكەو بە ئاگاداریی شایەتەكان رێك و پێك..."

"باشە؟".

"زۆر باشە جەنابی یاوەر".

"جەنازەکە دەسبەجێ بدەنەوە بە بنەماڵەکەی ـ جەنازەکە بەنێو شارۆچکەدا مەبەنەوە. ئەتۆش سەرجووخە کەرتیش و جەندرمەکان و شایەتەکان... شایەتەکان حازرن؟".

"زۆر لەمێژە سەرجووخە عەلی شایەتەکانی ئامادە کردوە. لەم جۆرە وەختانەدا ئەو هەنگاوێکیش بەبێ شایەت هەڵناهێنێتەوە".

"دوکتۆرو داواکاری گشتی..."

"لە ماوەی پێنج دەقیقەدا هەموو شتێك حازرە".

پاش نیوەڕۆیە جەنازەکە درایەوە بە بنەماڵەی کەنعان و ئەو دێهاتیانە کە لە گوندی چانقازوخەوە هاتبوون. دێهاتییەکان بێئەوەی بگرین و هەڵلاو هەنگامەیەك ساز کەن جەنازەکەیان هەڵگرت و بە پشت شارۆچکەدا وەڕێ کەوتن.

مورتەزاغا کە خەبەرەکەی بیستبوو بە دەست و لاق لەرزین و هەناسەبڕکەوە چووە بارەگای فەرماندەرایەتیی جەندرمەو هەردوو پلیکانی کردنە یەك و خۆی گەیاندە ژوورەکەی یاوەر:

"خەبەرێکم بیستوە, راستە جەنابی یاوەر؟ دەڵێن حەمەدۆك سەرکردەی چەتەکان هەتا چۆمی هاتوەتە خوار, دەڵێن ناوونیشانی ماڵێ منی لە کەنعانی بەستەزمان پرسیوەو ئەویش دەستی لە گیانی شیرنی هەڵگرتوە چونکە جێی منی... ئاخر ئەمن خۆ هەمیشە لەماڵێ خۆم نیم. پاش ئەوەی سەرکردەی چەتەکان عەلی سەفای برامی کوشت ئەمن هەموو رۆژێ, هەموو رۆژێش نەبێ هەرچەند رۆژ جارێك لە ماڵێکی دیکە دەمێنمەوە, یان دەچمە دێیەك جێیەك... دەڵێن کەنعان جێی منی بەکەس نەگوتوە. گیانی خۆشەویستی دەداو ژیانی من دەکڕێتەوە؟ ئەمن ناهێڵم منداڵەکانی وی دەردی هەتیوی بچێژن, نایەڵم دایك و بابی چاولەدەستی کەس بن. کەوایە ئەو پێشهاتە راستە؟"

"بەداخەوە بەڵێ".

"وەك دەڵێن هەتا شارۆچکەی هاتوە راستە؟"

"بەڵێ".

"وەك دەڵێن تا ئێستا ئەمن دەبوو مردبام؟"

"بەداخەوە..."

"کەوایە..."

"بەداخەوە..."

"ئێستا ئەمن چ بکەم؟"

"ئەتۆ هیچ مەترسە. ئەمن فکری هەموو شتێکم کردوە. پیاوەکانی منت دیتن... کەنعان خەبەرهێنی تایبەتیی ئێمە بوو, ئەو گیانی خۆی لەسەر تۆ دانا".

"خۆش بی یاخوا, رۆڵەکانی نیشتمان خۆش بن. ئەم نیشتمانە لەسەر شانی لاوازی وان, لەسەر شانی جەنابت و لەسەر شانی لاوانی ئازای وەك وی بەرز دەبێتەوەو دەگاتە عەرشی عەزیم ـ هەستایە سەرپێ ـ ئیزن دەدەی لە خزمەت مەرەخەس بم؟"

مورتەزاغا خۆی گەیاندە بازارو تووشی هەرکەس بوو بە جەرگی سووتاوو راوێژێکی پڕ لە ستایش داستانەکەی گێڕایەوە کە چۆن حەمەدۆك سەرکردەی چەتەکان هەتا چۆمە وشکەکەی نیزیك شارۆچکە دێ. جێگای وی لە کەنعانی کوژراوی خوالێخۆشبوو دەپرسێ. کەنعانیش بە قیمەتی گیانی خۆی جێگای ئاغای خۆی کە لە بابیشی بە گەورەتر دەزانێ ئاشکرا ناکاو کائیبەك کەئاوی لێ خواردوەتەوە بەردی تێناوێ.

حەمەدۆك ناوی کافر, کەنعانی خۆمان دەگرێ و دەڵێ: جێگای مورتەزاغام پێ بڵێ. ئەویش دەڵێ نازانم. ئەوانیش لەبن داروکوتەك دا ڕای دەخەن و گونانی با دەدەن, کەنعانی خۆشمان دەڵێ بم کوژن, دەمرم بەڵام جێگای مورتەزاغا بەکەس ناڵێم. دەڵێ هەموو دنیا, دۆست و دوژمن دەزانن کە ئەمن نان و نمەکی ویم خواردوە. ئافەریم, ئافەریم بۆ تۆ بەچکەشێر, ئافەریم بۆ کوڕی شەهیدم کەنعان..."

خەڵکی شارۆچکە زۆر پێش ئەوەی ئەو بچێتە لای یاوەر لە رووداوەکە ئاگادار ببوون. سەرتاشخانەکەی ساڵەکوێر بەناوی نازك لار وەك پووره هەنگ ئاڵۆز ببوو.

تەنیا مورتەزاغا بوو کە بە ترس و لەرزەوە لە شارۆچکەدا دەگەڕا. پێش ئەوەی بچێتە ئەدەنە نامەیەکی بە کوێخا کەنعان نووسی و ناردی بۆ ئەنکەرەو ئەدەنە. داخوا ئەو نامەیەش لەگەڵ ئەو نامانە کە عارف صائم بەگ لەگەڵ خۆی هێنابوون هەبوو؟ بەو پێیە لەنێو نامەکان دا دەبێ دوو نامەی کوێخا کەنعان هەبن. یەکێك ئەو نامەیە کە چڵك نووسەکەی پارێزەری گۆرین لە ئەدەنە نووسیبووی و ئەوی دیکەش ئەو نامەیە کە داواکاری گشتی بە دەستی خۆی بە تایپەکەی خۆی نووسیبووی. کوڕە ئەو داواکاری گشتی بەگەش نامەی سەیرسەیر دەنووسێ... کوڕم ئەتۆ عەللامەی دنیای چیی؟ هەر دێڕێکی سەگ بێخوا پێی هار دەبێ, وەی وەی. باشە. ئەگەر وابێ کوێخا کەنعانی خۆشەویست و قارەمان لەبن دارو گۆپاڵی

حەمەدۆك دا نا, بەڵكوو لەبن داری سەرجووخە عەلی کەرتیش دا گیانی دەرچووە. لەبەر خۆیەوە گوتی: ئەمەی لە زمانی یاوەر دەردەکێشم, ئەویش هەر ئەمشەو, سەر لەو مەسەلەیە دەر نەکەم دیق دەکەم.

نیوەشەوێ لە هەیبەتان خەریك بوو بخنکێ, لەوانەشە حەمەدۆك بێ... ئەی ئەو سوێندی خواردوە ئاغای زیندوو لە شارۆچکەدا نەهێڵێ و بۆچی یەکەم کەس کە دەیەوێ بیکوژێ مورتەزاغا نیە؟ لەم شارۆچکەیەدا کێ هەیە لەو بەرچاوتر, ئازاترو دەوڵەمەندتر؟ چما خوالێخۆشبووی بابی, قەبرەکەی پڕ بێ لە نوور قەباڵەی بۆ هەموو خاکی ئەدەنە هەتا ئەم شارۆچکەیە ساز نەکرد؟ چما بابی مورتەزاغا کە ئێستا لە گلکۆی پیرۆزی دا حەساوەتەوە, یەکەم کەس نەبوو کە لەگەڵ ماراشیەیەکان لەم شارۆچکەیە چەڵتووکی چاندو لۆکەی ڕەنێو هێنا؟ چما باوکی رەگەز تورکمەنی مورتەزاغا دەشتەکانی ئەم شارۆچکەیەی پڕ نەکرد لە مێگەلە مەڕو بزن و گاوگۆل و ڕەوە ئەسپ؟ چما بابە گەورە ڕەسەنەکەی وی کە وەك هەور دەیگرماند, نەبوو کە...

وەختێك مورتەزاغا هاتە شارۆچکە خۆی لە باسی کارەکانی باپیری دەپاراست و تەنانەت لە مێشکی خۆشی دا پێیان دا نەدەچووەوە. بەڵام ئەو خەتای چ بوو؟ هەرچی لە دەستی هات کردی, کەچی دیسانیش هەموو خەڵکی شارۆچکە دەزانن کە بابە گەورەی کێ بووەو چیی کردوە. باشە با هەموو خەڵکی شارۆچکەی بزانن, با پیاوەکانی دەوڵەتیش بزانن. باشە چما چ بووە؟ بابە گەورەی وی لەگەڵ کووزان ئۆغلی لە لکی سومباسی فیرقەی ئیسلاحیەدا تێدەکۆشا, کووزان ئۆغلییەك بەو گەورەیی خۆی پشتی کردە عوسمانیەکان و ڕەگەڵ کۆمارخوازان کەوت. بەڵام بابە گەورەی وی تەنانەت هەنگاوێکیش لە لەشکری عوسمانی نەکشایەوەو سەرەنجام فیرقەی ئیسلاحیەو هێزەکانی لەبەریەك هەڵوەشان.

باپیری کارێکی دیکەشی کردبوو کە زۆر جێگای سەرکۆنەی تورکمەنەکان و مایەی رەزامەندیی عوسمانیەکان بوو. کووزان ئۆغلی پاش ئەو شکانەی هەڵات بۆ تووڕووس, ئاشق داداڵ ئۆغلییشی لەگەڵ بوو. ماوەیەك لە چیاکانی تووڕووس دا دێ بە دێ و ئەشکەوت بە ئەشکەوت خۆی شاردەوە, بەڵام نەیتوانی لە چیای وەمێنێ. سەرەنجام ئەحمەد پاشا کووزان ئۆغلی پەنای بۆ چادرە حەوت ژووریەکەی قەرەداغلی ئۆغلی برد... ئەو شەوە داداڵ ئۆغلی سازەکەی خۆی بەدەستەوە گرت و هەتا بەیانی گۆرانیی ئازادیی گوت و عێلی تورکمەنیش لەگەڵی گریان. کە رۆژ بووەوە بابە گەورە ڕەسەنەکەی, قەرەداغلی ئۆغلی, دەست و لاقی

ئەحمەد پاشا کووزان ئۆغلێی بەستن و بردی بۆ دەروێش پاشا فەرماندەری سوپای عوسمانی. بۆی بردو گوتی: ها بگرە پاشا, کووزان ئۆغلێم بۆ هێناوی, هێناومە بەلام نابێ بیکوژی, ئەگینا دنیا ژێرو ژوور دەبێ. بەلام دڵی نەهات داداڵ ئۆغلی تەسلیمی عوسمانییەکان بکا. بەو حاڵەش تورکمەنەکان لەسەر تەسلیم کردنی کووزان ئۆغلی بە عوسمانییەکان لە بابە گەورە رەسەنەکەی خۆش نەبوون و کارەکەی وییان بە پێچەوانەی ئەخلاق و ئینسانەتی دانا. باپیری رۆژێکیان بەیانی کە لە خەو هەستا دیتی تاقە کەسێکیش لە هۆبەو عەشیرەتەکەی نەماوەو هەمووان بەجێیان هێشتوە, لەپاش ئەوە, لە ئەندامانی عەشیرەتی بابە رەسەنەکەی تەنانەت تاقە کەسێکیش, حاشا لە براو خزم و کەس و کار نەچوونە لای. ئێستاش ئەگەر یەکێك لەو تورکمەنانە کە ماون ناوی بابە گەورەی وی دەبیسێ, شەیتانی بە نەحلەت دەکا.

مەعلووم نەبوو بۆچی تا نیوەشەوێ بیری لە بابی و بابەگەورەی کردەوە, ئەو شەوە هەرچی کردی نەیتوانی باب و باپیرانی لەبیر خۆی بەرێتەوە. راستە باپیری ئەحمەدپاشا کووزان ئۆغلێی تەسلیمی حکوومەت کردبوو, بەلام خۆ ئاشق داداڵ ئۆغلێی تەسلیم نەکردو پاراستی. تەنانەت ئەو داداڵ ئۆغلییەش کە باپیری پارێزگاریی لێکردو گیانی نەجات دا, لەو رۆژە بەدواوە پشتی تێکرد. نە پێی دە ماڵێ ناو نە چاوی لە چاوی کرد.

رووی کردە خێزانی کە لەمێژ بوو چاوی دەچاویەوە بڕیبوو و دەیەویست لە روخساری دا فکرەکانی وەخوێنێ, پێی گوت:

"حەسنەخان, بیر لە بابە گەورەم دەکەمەوە, چەند باش بوو کە وەك خانێکی تورکمەن نەمایەوە, ئەگینا ئێمەش وەك منداڵە قوون رووتەکانی ئەو خانە تورکمەنانەمان لێدەهات کە لە برسان بۆگەنی هەناسەیان سەد فرسەق دەڕوا, ئێمەش وەك منداڵانی هەموو خانەکانی دیکەی تورکمەنمان بەسەر دەهات. نیوەکۆچەری و نیوەبرسی... باش بوو کە, باش بوو کە..."

ژنەکەی وەڵامی نەدایەوەو بە شێوەیەکی سەیر تەماشای کرد. چونکە ژنەکەی لە رەگەزی ئەو خانە تورکمەنە نیوەکۆچەری و نیوەبرسییانە بوو.

بەلام بێینە سەر باسی دەروێش پاشا. پیاوێکی ئازاو جوامێر بوو, هەرچی بێ عوسمانییەك بوو. لەبەر خاتری خۆشەویستیی بابە گەورەی دەرهەقی عوسمانییەکان پێی گوتبوو: هەرچی دەتەوێ لەمنی بخوازە, هەتا ئەسپت بڕ دەکا, زەوی بۆخۆت هەڵگرە. بابە گەورەشی لە حوزوور دەروێش پاشا رادەوەستێ و لەجیاتی فرمێسك خوێن بە چاوانی دا دێتەخوارێ: ئەمن ماڵ و ملکی چ لێبکەم. ئێستا کە عێل و عەشیرەتەکەم وەك گولێك منیان بە تەنێ بەجێ هێشتوە,

ماڵی دنیایه چ لـێبکەم. دەروێش پاشا چ دەکا؟ دڵخۆشیی دەداتەوەو فەرمانێك دەنووسێ و دەیداتێ کە ئەم بەری چۆمی بۆتۆ. هەموو ئەو مێگەل و ئەسپ و وشترو چادرو نێوماڵ و زێڕە کە تورکمەنەکان پاش شکان بەجێیان هێشتبوو, بوون بە ئی باپیری. خوا هەقە باپیریشی ئەو ماڵەی بەباشی راگرت و ساڵ بە ساڵ لێی زیاد کرد. دنیا گۆڕاو رۆژگار سووڕا, ئەو عێل و عەشیرەتە کە بنەماڵەی مورتەزاغایان بەتەنیا بەجێ هێشتبوو بۆ بستە زەوییەك و کەمێك لەوەڕگە خۆیان لەبەر پێی وان هاویشت. بەڵام بابی رەسەنی پیاو بوو و قسەی پیاوانیش یەکە. لەو عەشیرەتە کە بەتەنیا بەجێیان هێشتبوو خۆش نەبوو و تەنانەت چاویشی لەچاوی یەکێکیان نەکرد. کەچی مورتەزاغا وانیە, مورتەزاغا خوێن گەرمەو ناشقی عێل و عەشیرەتی خۆی. دەزانێ بەبێ عێل و عەشیرەت هیچ کارێك ناچێتە پێش. دەزانێ داری ئەستوور بە لك و پۆپەکانیەوە زیاد دەکا.

"خانم باپیرم لەهەڵە دا بوو, وانیە؟"

حەسنەخان گوتی: با, لە هەڵە دا بوو.

"وەختێك عێل و عەشیرەت نەبێ سامان قرۆشێك نایەنێ".

خانم بە خۆشحاڵییەوە گوتی: بەڕاستی نایەنێ.

"ئێستا ئەگەر ئەمڕۆ عێل و عەشیرەتی خۆمان لەکن بایە, ئێمەش وەك خەڵکی دیکە... بڕوانە "بوزدووغانی"یەکان, کەس دەتوانێ پێیان بڵێ پشتی چاوتان بڕۆیە, خۆ ئەوان فەقیرن, یەکێکیان هەزاریەکی منی نیە, کەچی دنیا لێیان دەترسێ".

"هەمیشەش لێیان دەترسێ".

"ئەوان هیچیان نیە بەڵام عەشیرەتیان هەیە. ئەگەر خان هاوارێك بکا سەدان و هەزاران کەس گیانیان لە پێناوی خانی بوزدووغان دا بەخت دەکەن".

خانم گوتی: بەڵێ بەخت دەکەن.

"وەختێکیش یەکی وەك حەمەدۆك پەیدا دەبێ و سەر چیاو بەندەنان دەگرێ وەك من ترسیان ڕێ نانیشێ و کونەمشکیان لـێ نابێ بە قەیسەری".

"بەڵێ لێیان نابێ".

"ئەمن بچم سەرێکی یاوەری بدەم و بزانم دنیا چ باسە... ئەمن پێم وایە کوێخا کەنعان سەرجووخە عەلی کوشتوویە".

"لەوانەشە حەمەدۆك کوشتبیەتی, هیچ مەعلووم نیە".

"هیچ مەعلووم..."

مورتەزاغا چاوێکی لە سەعاتەکەی کردو لە پلیکانەکان چووە خوار. لە دوورەوە کە چاوی بە چرا نەوتی‌یەکەی ژووری یاوەر کەوت خۆشحاڵ بوو. روحمی بۆی بزووت: کوڕێکی باشە, پیاوێکی ئازایە. نموونەی ئەفسەرێکی باشە, پیاوێکی ئازایە. نموونەی ئەفسەرێکی کۆمارە. فرت و فێڵ و کەڵەك لە کاری دا نیە. پیاوێکی قسەلەڕوویە. بەڵام حەیف دۆستی زولفۆیەو زولفۆش خەریکە چاڵی بۆ هەڵدەکەنێ. لەو ساتەدا لەو نامانە کە دژی یاوەری نووسیبوون پەژیوان بووەوە. بیری کردەوە: حەیف نەبوو, دەرهەقی لاوێك کە ئاوا, شەوو رۆژی بۆ نیە, ساڵ دوازدە مانگ بەدوای رێگرانەوەو لەبن بارانەی گوللە دایە... ئەگەر ئەو دێهاتی‌یە بێ‌قیمەتانە ئەویان فریو داو ژنان رێ‌یان پێ گۆڕی و لە جیاتی حەمەدۆك خستیانە داوی وەسمانەڕەش و لەسەر تەرمی وەسمانەڕەش کە پێیان دەگوت حەمەدۆك شین و شەپۆریان وەڕێ خست, ئەو خەتای چ بوو...

لە دەرکەی دا, سەربازێك پرسی: کێ‌یە؟

"کوڕم ئەمنم مورتەزاغا, یاوەری ئاگادار کە".

دەرگاکە کرایەوە, سەربازەکە گوتی: یاوەر لە سەرێ چاوەڕێتە.

یاوەر لە سەرێ ڕا بە راوێژێکی شادو بە پێکەنینەوە گوتی:

"چاوەڕێت بووم ئاغا, گوتم چاش حازر کەن. درەنگ هاتی. چاوەڕوانت بووم".

"درەنگ نەهاتم, راست نیوەشەوە, گوتم با خەڵك بچنەوەماڵێ و وڵات چۆل بێ جا بێم".

"بەخێر بێی, چاکت کرد هاتی. زولفۆیەگیش لێرەیە".

مورتەزاغا باوەشی بە زولفۆدا کرد.

چا, ساز بوو.

زولفۆ دەسبەجێ مەسەلەکەی هەڵایساند:

"ئەم نامەو برووسکانە... عارف صائم بەگیان شێت کردوە. ئەتۆ دیتت چاویشی لەچاوم نەکرد. نووسەری نامەکانی دەوێ. دوێنێش هێندێ قسەی لابەڵام بیست, تف, تف... دوور لە گیانی هەمووان, دەڵێن عارف صائم بەگ بە هاوکاریی چەرکەسەکان دەیەوێ مستەفا کەمال پاشای بکوژێ تا بۆخۆی لە جێگای دانیشێ, پێوەندیی بە دەوڵەتە مەزنەکانەوە هەیە, توخوا شتی وا ڕێی تێ دەچێ؟"

مورتەزاغا هاواری کرد:

"حاشا, مومکین نیە. دەغیلە, ئەمە بە عارف صائم بەگ نەگاتەوە. شارۆچکەکەمان ژێروژوور دەکا, ئاوری دەداو دەی‌سووتێنێ".

زولفۆ بەو حاڵەتی پوختەیی و سەنگینی و دنیادیتوویی خۆی گوتی:

"هەڵمەچوو ئاغا, سەرچاوەی ئەم قسە قۆڕانە ئێرە نیە, ئەم قسەو باسانە لە ئەدەنە بڵاو بوونەوە, هەربۆیەش بۆ ئێمە زۆر گرنگ نین. بەڵام دەنگۆیەکی سەیر خەتەرناکە, عارف صائم بەگ مستەفا کەمال پاشای پێ لە خوا گەورەترە, ئەمن دەزانم, ئەو مستەفا کەمال پاشای دەپەرستێ, خوا نەکا ئێستا بمرێ, عارف صائم بەگ هەر خەبەری مەرگی ببیسێ هەڵدەکێشێتە دەمانچەکەی و لە زاری خۆی دەدا. دەترسم, مورتەزاغا زۆر دەترسم. دەترسم ئەو دەنگۆیە پیلانێکی لەبن دا بێ".

مورتەزاغا بە پێکەنینەوە گوتی:

"مەترسە, لەمێژە گوتوویانە جێیەك ئاوری لێ نەبێ دووکەڵی لێ هەڵناستێ. بەڵام ئێمە لەوانەین کە دووکەڵ لە ئاویش پەیدا دەکەین. پاشای قارەمانی مووزەردی خۆمان ئەمەی باش دەزانێ, چما نازانێ؟"

چاوی لە چاوی زولفۆوە برین و بەو چاوە تیژەی خۆیەوە تەماشای کرد. ئەو بێدەنگ بوو.

مورتەزاغا هاواری کرد: دەزانێ.

یاوەر لە سووچێکی مێزەکە دانیشتبوو. بەدەم چا تێکردنەوە بە نارەحەتی و بەدگومانی جارێك چاوی لەمیان دەکردو جارێك لەویان و بە نێوچاوانێکی پڕ فکرەوە گوێی لە قسەکانیان رادەگرت. مورتەزاغاش هەوڵی دەدا باسەکە بگۆڕێ و یاوەریش ئەمەی بۆ دەرکەوت. تاوێکی چاك بێدەنگ بوون. کەس نەیتوانی ئەم بێدەنگییە بشکێنێ و کەسیش نەیەویست بێتە سەر مەبەستە ئەسڵییەکە. سەرەنجام یاوەر باسەکەی کردەوە.

"هەرسێکمان باش دەزانین ئەمشەو بۆچی لێرە کۆ بووینەوە. ئەو خەبەرە نهێنییانەی وەدەستمان کەوتوون نیشان دەدەن کە ئەو نامانە دوور لە رووتان, ئەم دووانەتان نووسیوتانن. ئەمن بۆئەوەی دڵی جەنابتان نارەحەت نەکەم بە پێویستم نەزانی شتێکیشتان لێ بپرسم. ئێوە بۆخۆتان کە مەسەلەکەتان زانی زەحمەتتان کێشاو هاتن".

زولفۆ بە زەردەخەنەوە گوتی: بەڵێ هەر کە بیستم هاتم.

مورتەزاغا زۆر تێك چوو و گوتی: بەڵێ بیستم و هاتم.

"دیسان ئەمن رێم ناکەوێ لەو بارەیەوە پرسیارێکتان لێبکەم. ئەتۆ زولفۆ هاوسەنگەرێکی عارف صائم بەگ بووی, پێویست ناکا کاری وا بکەی. ئەتۆ مورتەزاغا نیزیکترین دۆستی خۆمی. برا گەورەمی. ئەتۆش خەیانەت بە من...!"

"حاشا, حاشا هەزار جار حاشا... ئەتۆ خۆشەویست ترین کەسی منی. مستەفا کەمال پاشا بۆ عارف صائم بەگ چۆنە, ئەتۆش بۆ من وای"

"تکای من لە ئێوە ئەوەیە کە هەرسێکمان پێکەوە نووسەری ئەم نامانە وەبینین. ئەمنیش پاش ئەوەی لەقەدەر خۆم هەقی خۆیانم لە مستیان نا, مەسەلەکە دەگەیەنمە عارف صائم بەگ, ئەودەم ئەو بۆخۆی دەزانێ چ دەکا. تەنیا دەبێ بەڵگەی پێویستم بەدەستەوە بێ. ئەمن لە سبەینێ ڕا لە کوێخاکانی بیست و سێ دێوە دەست پێ دەکەم. بەڵکوو ئەوان پێی لـێ بنێن. فەخرییەشێتی عەریزەنووسیش لەژێر چاوەدێری دایە. دەڵێ مورتەزاغا پێی گوتووم ئەو برووسکانە بنووسم. سیاسەتباز لەبەر دەستی سەرجووخە عەلی دایە, بەڵام پێ لە هیچ نانێ".

"یاوەر واز لەوانە بێنە, ئەوە پێوەندیی بە برووسکەکانی پێشووەوە هەیە, ئەو برووسکانە کە کاتی کوژرانی عەلی سەفابەگ لێمان دان... ئەمن لەبەر خاتری جەنابت گوتم بیان نووسین بۆئەوەی هێزتان بۆ بنێرن. بۆخۆشت ئاگات لـێ بوو. ئێستا سیاسەتبازی بەستەزمان پێی لـێنانێ. جەنابی یاوەر تکا دەکەم ئەوی لەبەر دەستی عەلی کەرتیش دەربێنن. دەیکوژێ. ئەو بەستەزمانە هەژارەی دەکوژێ".

"نا نایکوژێ".

مورتەزاغا بە ناڕەحەتییەوە ملی بەلاوە نا: ئەگەر ئەمن عەلی کەرتیش بناسم تا ئێستا کوشتوویە.

"قەولی بەمن داوە نەیکوژێ"

"ئەتۆ ئەگەر تا نیو سەعاتی دیکە فریای نەکەوی, سبەینێ تەشریفت دێ بۆ نوێژی مردوو. جەنابی یاوەر تکا دەکەم, ئەو منداڵی زۆرن. ئەتۆ ئەوی بەرەڵلا کە, ئەمنیش بەڵێن دەدەم نووسەری نامەکان ببینمەوە".

یاوەر بە پێکەنینەوە دەسبەجێ هەستا, شتێکی بەو جەندرمانە گوت کە لەخوارێ بوون و لەبەر دەرگای جەندرمە دەنگی تەقەی تفەنگێك هات.

"زۆر باشە, ئێستا بەرەڵلای دەکەن".

لەسەر کورسییەکەی خۆی دانیشتەوە. پاش ئەوەی چایەکەی تازە کردەوە گوتی:

"سبەینێ روون کردنەوەکانی بیست و سێ کوێخایان ڕێك و پێك دەکەم, حەیف کە یەکێك لەو کوێخایانە حەمەدۆك لەبن داران دا کوشتی..."

زولفۆ پێکەنینێکی بە مانای کرد:

"وەك دەڵێن هەتا شارۆچکەی هاتوە. ئەم حەمەدۆکە دەبێ پیاوێکی ئازا بێ".
یاوەر گوتی: زۆر ئازایە, وەك شێتان ئازایە".
"دەڵێن جێگای منی پرسیوە".
"بەڵێ".
"کەنعانی کوڕیشم پێی نەگوتوە".
"گیانی خۆی لە ڕێی تۆدا بەخشی. لە کاتێك دا دەیزانی کە ئەتۆ هەر شەوەی لە جێیەك دەخەوی. ئەو کابرایە چیی لە گیانی تۆ دەوێ؟"
"زۆر شت... ئەو دەزانێ ئەمن دەتوانم چ بەلایەکی بەسەر بێنم. ئەو دەزانێ ئەمن... جەنابی یاوەر دەبێ بزانی کە ئەم ڕێگرانە لە هەموو جێیەك جاسووسیان هەیە. ئەوان... هەر ئەبێ حەمەدۆك وەك بایرام ئۆغڵی دەجوولێتەوە..."
"موڕتەزاغا خان هێندەی گەورە مەکەوە".
موڕتەزاغا ملی بەلاوە ناو نێوچاوانی تێك نا:
"ئەمن پێم وابوو کەنعان سەرجووخە عەلی کەرتیشی خۆمان کوشتوویە. ئەگەر حەمەدۆك کوشتبیەتی, ئەمن حیسابم ڕۆیشتوە, گەردنم ئازا کەن".
"واش نیە موڕتەزاغا".
"ئەگەر پێی خۆش بێ دەتوانێ هەر ئێستا بێ و لێرە بم کوژێ"
"تکات لێدەکەم موڕتەزاغا".
موڕتەزاغا کرووزایەوە: دەم کوژێ.
زولفۆ بە جۆرێك توانی لەبن مێزەکەوە لاقێکی لە لاقی سرەوێنێ. موڕتەزاغاش باسەکەی گۆڕی.
"دەزانی ئەمن شکم لەکێیە, ڕێگام بدەن زۆر بە ڕاشکاوی بیلێم"
"فەرموو زولفۆبەگ..."
"ئەمن شکم لەو مەلا ساختەچیە, لەو کونەدرۆیە, لەو مەلادۆران ئەفەندییەیە".
موڕتەزاغا دەرپەڕی و گوتی:
"دەم خۆش, زۆر ڕاستە, ئەو ئاوری بن کایەیە".
"جەناب یاوەری بەڕێز, لەم شارۆچکەیەدا تاقە یەك کەس هەیە کە ئەو نامانەی لە دژی جەنابت نووسیبێ, ئەویش..."
"مەلادۆران لەوانەیە کە شەیتانی ناڵ دەکەن, نایەڵن پێ بزانێ".

"راسته..."

"هاورێیان دەبێ بەڵگەمان هەبێ"

زولفۆ گوتی: پەیدای دەکەم.

مورتەزاغا گوتی: پەیدای دەکەین.

"بەڵام گرتن و دادگایی کردنی وی، ئەویش لەم رۆژە پڕ مەترسی‌یانەدا سوودی چیە؟"

یاوەر تێیەوە راخوڕی: ئەمن لەکەس ناترسم. سبەینێ تەحقیقاتی لێ‌دەکەم.

هەستا، پشتی وەژان کەوتبوو. خۆی خاوکێش کردو پرسی: ئەدی تاشکەن خەلیل بەگ؟

زولفۆ گوتی: ئەو زۆر بنیادەمێکی خەتەرناکە جەنابی یاوەر. پیاوی چاك بە تەحقیقاتی لێ مەکە.

"بۆچی؟"

"ناکرێ جەنابی یاوەر، ژانەسەر بۆخۆت دروست دەکەی".

"ئەمن لە فەرماندەی خۆم نەبێ لەکەس ناترسم".

"نۆرەی ویش دێ".

"جەنابی یاوەر، قسەی زولفۆیەگ لەگوێ بگرە. کاری هەڵە نابێ بکەین، حەمەدۆك..."

"ئەتۆ هیچ لەوی مەترسە مورتەزاغا، ئەو ئیدی تاقە جارێکیش ناتوانێ بێتە نیزیك شارۆچکە، نەك هەر شارۆچکە، ناتوانێ لە تووڕووسیش نیزیك بێتەوە، ئەو هەر ئەم رۆژانە..."

یاوەر ئەوەندە بەدڵنیایی و بڕوابەخۆبوونەوە قسەی دەکرد کە مورتەزاغا بە گاڵتە پێی گوت: ئای مەحموودئاغای گەڵی شکۆفە...

پاش ئەوە ناوی هەموو ناودارانی شارۆچکەیان هێناو ئەمجار لەبارەی ئەوەدا کە کامیان وێ دەچێ ئەو نامانەی نووسیبێ بیروڕایان گۆڕیەوە. لای بەیانی بێ‌ئەوەی بە ئاکامی پێویست گەیشتبن لێك جیا بوونەوە. هەرکە چوونە دەرێ، زولفۆ بە راوێژێك کە وەك وشەوشی مار دەچوو لەبەر خۆیەوە گوتی:

"گەوجە، ناپیاوی نەفام نەت زانیوە سەرجووخە عەلی کەرتیش بە ئەمری یاوەر کەنعانی کوشتوە، حاڵی نەبووی؟ ئەویش ناوی ئێمەی لە دەمی کەنعان دەرکێشاوە. تێ‌نەگەیشتی؟ عەلی کەرتیش هەر ئەو رۆژە غاری دایە کن من و هەموو شتێکی پێ گوتم، بۆت دەرنەکەوت؟ حەمەدۆك لەکوێ بوو، چەتە لەکوێ بوون، ناپیاوی نەفام، ئەتۆ تا ئێستا دیوتە یان بیستووتە چەتەیەك پیاوێکی لەبن مست و پێلەقەدا کوشتبێ، تێگەیشتنی مەسەلەیەکی بەو ساکاری‌یە کارێکی گرانە؟"

مورتەزاغا بە نارەحەتی‌یەوە گوتی:

"زانیبووم, بۆچی زانیبووم, بەڵام گوتم با دیسانیش گوێ پێ دابگرم..."

"یاڵلا بچینەوە ماڵی ئێوە, حەسنەخانی هەستێنە"

"هەستاوە, ئێستا چاوەڕێمانە"

"قاوڵتی‌یەکی چەورو چۆڵ دروست دەکا. ڕۆنەکەرەی تازەم دەوێ, ئەویش هەر هی ئەمڕۆ کە بڵقە دۆی لەسەر بن, هێندەش بیر لە حەمەدۆك مەکەوە. سەروبەرەکەی تەماشاکە, بەستەزمانە دێهاتی‌یەکە, هەر ئەم یاوەرە ئاگرخۆرە مشووری دەخوا"

"وا مەڵێ زولفۆ, قسەی وا مەکە. ئەو, عەلی سەفابەگی خوارد کە وەك کێوی ئوحود بوو, منیش دەخوا, تۆش... ئەو بە خوێنی سەرمان تینوویە. هەر ئەم ڕۆژانە دەبینی چ دەکا, ئەو یاوەرەش هیچ..."

"هەر ئەم ڕۆژانە دەبینی چ دەکا, لەوانەیە تا ئێستاش گوتبیەتی بیکوژن. لەوانەشە لەنێو ئەو نۆ چەتەیەدا بێ کە کوژرابوون. بە پێی خەبەرێك کە لە چیاوە بۆ من هاتوە, ئێستا چەتەیەکی وا لە چیاکان نیە, حەمەدۆکێك لەگۆڕێ دا نیە. ئەم خەبەرە باوەڕ پێ‌کراوە. خەبەرێکی جێی متمانەیە".

"ئەگەر وایە, ئەدی ئەو شەیتانە ئێستا لەکوێ‌یە؟"

"هەر ئەم ڕۆژانە دەزانین".

"کەنگێ, ئاخر کەنگێ؟ دەستم دامێنت زولفۆ زووکە. ئەمن ئیدی خەوو ئارامم نیە. هەر ئێستا چاوەڕوانم گوللەیەك لە جێ‌یەکەوە بێ و حیسابم یەك لا بکا. ڕاستە دەزانم حەمەدۆك هەر ئەم ڕۆژانە دەکوژرێ, بەڵام دیسانیش دەترسم"

"مەترسە"

قۆڵیان دەقۆڵی یەکتر ڕاکردو بەرەو ماڵی مورتەزاغا وەڕێ کەوتن. خەریك بوو هەتاو بکەوێ. حەسنەخان لەبەر دەرگای ماڵێ پێشوازیی لێ‌کردن.

"کاك زولفۆ بەخێر بێی, ئەگەر ئەتۆش نەبی... لەم شارۆچکەیەدا مورتەزاغا تاقە دۆستێکی هەیە ئەویش ئەتۆی. ڕۆژ نیە ئاغا ناوە جوانەکەی تۆی بەدەم دا نەیە, کاکە زولفۆم ئەمەی گوت, کاکە زولفۆم ئەوەی گوت..."

یاوەریش هەر کە ئەوان ڕۆیشتن دەسبەجێ و بەپەلە چووە دایرەی جەندرمە, دەرفکرو تووڕە بوو, مەسەلەی چەتەکان ئاسان بوو, بەڵام چۆن بەو دوابڕاوانە وێرابا. خەبەریان لە هەموو

شتێك هەبوو. کاتێك باسی حەمەدۆك هات زولفۆ چەند بە سووکایەتییەوە تەماشای کردبوو. ویستبووی بەزمانی بێزمانی تێی بگەیەنێ کە جەنابی فەرماندەر، ئەمن ئەو قسە بێتامانەم بە گوێدا ناچێ. ناوی ئێمەت لە زمانی کەنعان ـ کە فەرمانت دا بیکوژن ـ دەرکێشاوە؟ مەبارەکت بێ. چ تەماشایەك و چ پێکەنینێکی کوشندە بوو.

سەرجووخە عەلی کەرتیش لەنیزیك بەردەنووسە لەمێزینەکە پێشوازیی لێ‌کرد.

"وەرە عەلی، کارەکە پیس بوو. هیچی دەگەڵ ناکرێ. وەرە ژوورەکەی من قسان بکەین".

لە ژووریٚ سەماوەرێك کە لەسەر مێزەکە زلق زلق دەکوڵی چاوەڕێی بوو. یاوەر بە خۆشحاڵی گوتی:

"ئەی بژی سەرجووخە، چاشت دێم کردوە، چۆنت دەزانی دێم؟"

"دەکرێ نەزانم جەنابی یاوەر؟"

یاوەر چایەکەی ـ کە وەك خوێنی کەروێشك سوور بوو ـ لە ئیستیکانی نێوقەدباریك کردو پاڵی وە قەنەفەکەدا.

"جەنابی یاوەر، ئیقرارم لە نۆزدە کەسیان وەرگرتوە".

یاوەر لە سەرتاپایەوە ڕاما، چاوی هەڵمسابوون، ببوون بە دوو گۆمی خوێن. پانتۆڵەکەی لەبەرزگی کەوتبوو، نێوچاوانی تێك نابوو، کراسەکەی دڕاوو دەستەکانی شەلاڵی خوێن بوون. یاوەر زگی پێی سووتا. بەهەر هۆیەك بوو ئەم پیاوە زۆری ڕەنج دەکێشا. ئەمجار سەریشی لەتاقەت و توانای وی سوڕمابوو.

"خۆ کەس نەمرد؟"

"نا، ئەمانە ساغ دەرچوون".

"بریا کەنعانیش نەمردبایە..."

"نەدەمرد جەنابی یاوەر، بەڵام کەنعان زۆر لاواز بوو، هەم لاواز بوو هەم کەللەشەق. مرد ئیدی".

"بریا نەمردبایە. هەموو خەڵکی شارۆچکە فکریان بۆ ئەوە چووە کە ئێمە کوشتوومانە، زولفۆو موڕتەزاغاش هەروا. ئەوانەی ئیقراریان کردوە دەڵێن چی؟"

"لەپێش دا پێی لێ نانێن، پاشانیش وەك بلبل دەخوێنن. پێت وایە ئەگەر کەنعان وا لاواز نەبایەو نەمردبا، ئەمانە بە دوو کوتەك ئیقراریان دەکرد؟ ئەمشەو هەر نەبێ پێنج جەنازەمان دەبوون. پێت وایە چ دەڵێن جەنابی یاوەر. دەڵێن: زولفۆبەگ و موڕتەزاغاو هیچی دیکە. یەکێکیشان ناوی تاشکەن خەلیل بەگی بردو یەکیشیان ناوی مەلادۆران ئەفەندی، ئەوانی دیکە زولفۆ، موڕتەزاغا... موڕتەزاغا، زولفۆ..."

یاوەر گوتی:

"دەزانم، دەزانم. بەڵام خۆ کارێکمان لەدەست نایە، دەتوانین چییان لەگەڵ بکەین؟"

بەنیشانەی داماوی و بێدەسەڵاتی هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا. لە حاڵێک دا بە ناهومێدی دەستی لێك دەکردنەوە گوتی: خۆزگە کەنعانت نەدەکوشت.

"جەنابی یاوەر بێدارو بار بوو. دەزانی خۆ ئەمن نیازێکی تایبەتیم لەکوشتنی دا نەبوو، بۆخۆی مرد".

"دەزانم سەرجووخە، بەڵام دیسانیش... ئیدی لەمەودوا..."

یاوەر سەری داخست، ئیستیکانی پڕ لە چا کە لەسەر مێزەکە بوو، هەڵمی لێ هەڵدەستا. کەوتە فکری دوورو درێژەوە. وەختێك سەری هەڵبڕی چاوەکانی سوور بوون و نێوچاوانی گرژ. گوتی:

"زۆر تەنیاین، سەرجووخە، زۆر. لە چوار لاوە گەمارۆیان داوین. ئەوان هەمەکارەن ئێمەش... کوێخاکان بەرەڵڵا کە هەموویان بچنەوە... بە درۆو دەلەسە دیوارێکی ئاسنینیان بە دەورەدا کێشاوین. ئەمانە هیچیان لەگەڵ ناکرێ. ئەوان بەرەڵڵا کە با برۆن... سەرجووخە عەلی نارەحەتم، پەرێشانم، هیچ دەزانی خەریکن سەودامان پێدەکەن، ئەو فەقیرانە بەرەڵڵا کە با برۆن..."

"بەچاوان جەنابی یاوەر".

سەرجووخە عەلی کەرتیش هەموو شتێك تێگەیشتبوو. لە رقان شێت بوو، زگی بە فەرماندەرەکەی سووتا. بە چاوێکی پڕ لە خۆشەویستیەوە تەماشای سەرتاپای کردو دڵی دایەوە. ئەگەر تاوێکی دیکە راوەستابا، وەك منداڵان زۆر زۆر دەگریا. خۆی لە ژوورەکە فڕێ دایە دەرێ: کوڕە حەمەدۆك. ئەتۆ هەقتە کوڕم، یەك دنیا هەقتە، خۆزگە ئەمنیش لەگەڵ تۆ دەبووم و گیانی ئەو ئاغایانەم دەستاند. رۆژێ مشووری دەپازدەیەکیانم دەخوارد... دەنگی ددان لە چیڕەوە بردنەکەی دەبیسترا...

## (١٨)

حەمەدۆك لە چەند حەوتوو لەمەوبەرەوە بەرەو باش بوون چوو. لە ئەشكەوتێ ڕا چووە لێرەوارو لە چۆڵترین سووچی دارستان لە چادرێكی چووكەڵەدا جێگیر بوو. قاسم و دەمیر لە هۆبەكەی خۆیان ڕا شیری تازەیان بۆ دێناو دەیخواردەوە. ڕۆنەكەرەو هەنگوین و گۆشت نێچیری سوورەوەكراوی دەخوارد. هۆبەكان دەت گوت پێشبڕكەیان داناوە. ژنان و كچانی جحێڵ چێشتیان بۆ لـێ‌دەناو بەهەر جۆرێك بایە بە گەرمی بۆیان دێنا. چادرە چووكەڵەكەی حەمەدۆك وەك خانوویەك بەرەو لبادی لـێ ڕاخرابوون و بە جەواڵ و خورجێنی گوڵدارو لێفەی ئەتڵەس و سەرینی تووكی قوو و دۆشەكی خوری ڕازابووەوە.

چاك بوونەوەی حەمەدۆك خۆشحاڵییەكی بێ‌بڕانەوەی خستە نێو هۆبەكان. هەركسە كاروباری خۆی بەجێ دەهێشت و تێكەڵ بەو لافاوە مەزنەی خۆشحاڵی دەبوو. سەری زمان و بنی زمانیان حەمەدۆك بوو... ئەو مەڵحەمانە كە ئاناجیخ سولتان دابوونیەو ئەو دەرمانانە كە دەرخواردی دابوون, هەر یەكەم ڕۆژ كاری خۆیان كردو لە یەكەم حەوتوودا تایەكەی هێنایەخوارو برینەكانی بەرەو چاك بوونەوە چوون.

دایەحۆری وەك باڵندە بە دەوری دا دەسووڕاو بێ‌ئەوەی لەحزەیەك چاو لێك نێ شەوانە لەسەری بەخەبەر بوو. برینەكانی بۆ دەرمان دەكردو تەنانەت نیوەشەوێ وەخەبەری دێنا بۆ ئەوەی دەرمانەكانی بخوا. سەرەنجام وەختێك حەمەدۆك چاوی هەڵێنان و بزەی هاتێ, دەستی بە مووەكانی داهێناو گوتی:

"دایە حۆری بە قوربانی ئەو چاوە ڕەشانەت بێ".

وەختێكیش حەمەدۆك لە جێی هاتەدەرو هەستایەوە دایە حۆری گوتی: كورم حەمەدۆك ئێستا ئیدی ئیزن دەخوازم. ئەمەی گوت و سواری وڵاغەكەی بووو لەگەڵ مەحموودە خڕە بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە بەرەو

ئاوایی کەوتەرێ. بەڵام بەهیچ جۆرێك لە بیری نەدەچوو کە بۆ ئەوەی بچێتە لای حەمەدۆك چاویان بەستبوون. . . جارێ با چاك وەبێ، بکەوێتەوە کار، ئەودەم دایە حۆری مشووری دەخوا.

وەختێك حەمەدۆك چاك بووەوەو دایە حۆری رۆیشتەوە، یەکەم جار کەس نەی‌ناسیەوە. چونکە لەوانەبوو بیست ساڵ گەنج بووبێتەوە. گنج و لۆچی دەم و چاوی پاك ببوونەوەو چاوەکانی وەك چاوی گەورەکچان دەدرەوشانەوە. پێکەنینی بەختیاری نیشتبووە سەر روخساری و دایە حۆری بەو ددانە سپی‌یانە وەك گوڵی خۆشحاڵی پشکوتبوو.

"بەجێم نەدەهێشتی حەمەدۆك، بەڵام لە نێو دێی زۆرم کار هەیە".

رۆژێکیان ئێوارە بوو کە گەیشتەوە ئاوەدانی، هیچ ماندوو نەبوو. وەك سوارچاکێکی لاوو کارامە هێشتا ولاغەکە رانەوەستابوو، خۆی فڕێ دایە خوار. کە گەیشتەوە ماڵێ دیتی ئەسپە خەنەیی‌یەکەی حەمەدۆك لەبەر دەرگا راوەستاوە. ئەسپەکە وەك سەری وەدەرگاکە کردبێ بێدەنگ و خەفەتبار راوەستابوو. دێهاتی‌یەکان کە دایە حۆری‌یان بە خۆشحاڵی دی ماڵ بە ماڵ گەڕان و خەبەرەکەیان بە هەمووان دا. هێشتا نەگەیشتبووە بەردەرکی ماڵێ کە ماڵەکەی بوو بە مەیدانی مەحشەر.

"بەخێربێیەوە دایە حۆری، دایە حۆری بەخێربێیەوە".

غەڵبەغەڵبی خەڵك دێ‌یەکەی پڕدەکرد و ئەسپی خەنەیی لەو هەموو خەڵکە نەدەسڵەمیەوە. ئەسپ بێ‌جووڵە لە جێی خۆی راوەستابوو.

حەسۆ گوتی:

"دایە حۆری، ئەم ئەسپە سێ رۆژە لێرەیە. سێ شەوو رۆژە ئەم ئەسپە نە هیچ دەخوا، نە هیچ دەخواتەوەو لێرە چاوەڕێ‌یە".

دایە حۆری دڕی بە حەشیمەتەکەدا، لە حاڵێك دا بۆلای ئەسپەکە دەچوو، دەی‌گوت: رێگام کەن، هێندێ قسەم هەن دەبێ پێی‌بڵێم، ئەمن دەزانم بۆچی سێ رۆژە لەوێ نەبزووتوەو چاوەڕوانی منە.

ئاپۆرای حەشیمەتی دێهاتی‌یەکان بێدەنگ بوو. دایە حۆری وردە وردە لە ئەسپەکە نیزیك بووەوە، دەستی هەڵێناو بە ترسەوە لەسەرەخۆ دەستی بە یاڵەکانی‌دا هێنا. سەری بردە بن گوێی‌و گوتی: ئەسپی جوان، ئەسپی خەنەیی ئەتۆ لە رەسەنی دوڵدوڵی حەزرەتی عەلیی، لە رەسەنی ئەسپە بۆرەی کوێرئۆغڵیی‌و لە رەسەنی ئەسپە عەرەبی‌یەکەی گەنج عوسمان و بوڕاقی

پێغەمبەری, ئەگینا سێ شەوو سێ رۆژان برسی و تینوو چاوەڕوانی من نەدەبووی... راوەستە ئێستا...".

ئەسپ دەستی کرد بە بەدفەڕی و خێراخێرا کلکی بەراست و چەپ دا ڕادەوەشاند. گوێی دەچەرمەوە بردن و سەری هەڵێنا. ئێستا دایە حۆری بە حاڵەحاڵ دەگەیشتە سنگی ئەسپەکە. دایەحۆری کەوتبووە هەژان و بە دەستە لەرزۆکەکانی بەرسنگی دەخوراند. حەشیمەتەکەش راوەستابوون بە چاوی ئەفسوون لێکراوەوە تەماشایان دەکردن.

دایە حۆری بە دەنگێك کە بەزەحمەت دەبیسترا, گوتی: ئێستا باشت گوێ لە من بێ, سەرت نەختێك نەوی کە کوێراییت دایە... بزانە چەند قسەی خۆشت پێدەڵێم, گوێت لێبێ.

دەستی کێشایەوەدوایەو ویستی تەماشا چاوانی کا, بەڵام نەیتوانی چاو لە چاویەوە بڕێ: زۆر باشە, گوێمەگرە, گوێ لەقسەم مەگرە, زۆر باشە, ئەمنیش ئەگەر کەیفم لێبێ پێت ناڵێم.

نەیدەتوانی ئەوەی دەبوو بە ئەسپەکەی بڵێ, بەسەر زمانیدا بێنێ, چوونکە لەوانەبوو ئەم حەشیمەتە بێ تامە گوێیان لێبێ. ئەسپەکە خەریك بوو هێدی دەبووەوە. پێش ئەوەی ئەسپەکە سەرهەڵگرێ و بە پڕتاو بڕوا, دەبوو ئەو خەبەرە خۆشەی پێبڵێ, ئەم بەستەزمانەش سێ شەوورۆژە برسی و تینوو چاوەڕێی بووە, دەبێ خەبەرەکە ببیسێو دڵی خۆش بێ.

ئەسپەکەی بەرەڵڵاکردو هاتەوە لای حەشیمەتەکە:

"ئێوە جارێ نەختێك دوور کەونەوە بزانم. ئەمن دەمەوێ شتێکی نهێنی بەم ئەسپە بەدفەڕو شێتوشوورە بڵێم. یاڵڵا بە قوربانتان بم, یاڵڵا ئاوماڵە جوانکیلەکانم. لێم ببوورن, دڵتان نەیەشێ. پاش ئەوەی ئەم ئەسپەم دەرکرد, دێمە ماڵی یەك بە یەکتان.

حەشیمەت بێدەنگ و دڵشکاو کشانەوە دواوەو دوور کەوتنەوە. دایە حۆری دوای ئەوەی راوەستا هەتا حەشیمەت لەوێ دوور کەوتنەوە, چووە کن ئەسپەکە: لەسەر ئەو بەدفەڕی و شێت و شووریەت ئەم دەویست ئەم خەبەرە خۆشەت بدەمێ, بەڵام چ بکەم ئەتۆ جنۆکەیو ئەسپێکی ئەفسووناویی. پاشانیش سێ ڕۆژە چاوەڕێم بووی.

بەرۆیشتنی حەشیمەت ئەسپەکە نەختێك ئارام ببووەوە کەمێك سەری نەوی کردبوو:

"باشت گوێ لێبێ, حەمەدۆك چاك بووەوە, چاك بووەوە. کەمێك کشایەوەو تەماشای چاوی ئەسپەکەی کرد. پێیوابوو ئێستا پێ بە عەرزی دادەداو لە خۆشییان جۆرێك دەحیلێنێ دنیا دەنگ بداتەوە... وەختێك دیتی ئەسپەکە هیچ نەگۆڕا رقی هەستاو بێ ئەوەی بچێتە لای لە دوورەوە هاواری کرد: چاك بووەوە, گوێت لێنەبوو چیم گوت, بەڵای ئاسمانی,

کوێرایی‌داهاتوو؟ ڕەبی زەلیل بی. چاك بووەوە، چاك بووەوە... ئەسپەکە دیسان دژکردەوەیەکی لەخۆی نیشان نەدا.

"خوا بت کا بە قوربانی ئەسپەبۆرەی کوێرئۆغلیێ, دولدولی حەزرەتی عەلی و بوڕاقی حەزرەتی پێغەمبەر, بە قوربانی نینۆکێکی من و حەمەدۆك بێ...".

رقی هەستا, ئاگای لە خۆی نەماو هاواری کرد: حەمەدۆك چاك بووەوە نەجاتی بوو, چاك بووەوەو نەجاتی بوو, ئاناجیخ سولتان چاکی کردەوە, گوێت لێبوو؟

دێهاتی‌یەکان کە پێیان وابوو دایە حۆری لەگەڵ وانیەتی کە دەڵێ حەمەدۆك چاك بووەوە, بەغاردان هاتنەوە لای ماڵی دایە حۆری.

دایە حۆری پێلەقەیەکی بە پێشووی ئەسپەکەدا دا, ئەسپەکەش دەسبەجێ هەستایە سەر پاشووان و پاش حیلەیەکی درێژ گەڕایەوەو بەرەو عەلیکۆ دەخۆی نووساو وەك پەڵە هەورێك بە فڕین بە نێو دێدا تێ‌پەڕی.

پرسیان:

"حەمەدۆك چیی ببوو, دایە چیی بەسەر هاتبوو؟".

"بریندار بوو؟".

"نەخۆش بوو؟".

لەسەر ئەو ئەسپە کوێرایی داهاتوە قسەکە لە زاری ترازابووو ئەوەی نەدەبوو ببێ, ببوو.

دایە حۆری گوتی: حەمەدۆك بریندار ببوو, ئێستا وەزعی باش بووە.

پاش ئەوەی بە وردی لە هەموو دەوروبەری خۆی ڕوانی, گوتی:

"خوایە هەزاربار شوکور کە حەمەدۆك چاك بووەتەوە. زۆر خەراپ بریندار ببوو, بەڵام ئێستا چاك بووەتەوە. دیارە چاك چاك نەبووەتەوە, بەڵام چاك دەبێتەوە, بەو هەنجیرانەوە کە بۆم وشك کردبوون و بە هەناری دەلیجە قۆیاخەوە چووم بۆلای, ئەو گۆرەوی‌یانەی بە دەستی خۆم بۆم چنیبوون دەلاقیم کردن. چۆن چاك نەدەبووەوە؟ بەوی دەڵێن حەمەدۆك. ئاناجیخ سولتانی خانقای چل چاوم لە خانەقایەڕا هەڵگرت, سواری ئەسپم کرد, ئەو ژنە مەبارەکە هەزار ساڵەیەم بردەسەر. هەرکەس لە جێی وی بێ چاك دەبێتەوە. خانەقای چل چاو خانەقایەکە کە بنیادەمی دوولەت کراوی پێکەوە نووساندوەتەوەو زیندووی کردوەتەوە. ئەو, خانەقایە کە مۆجیزەی‌کردو گەنج عوسمان سێ شەووڕۆژان لە بەغدایە سەری لەبن هەنگڵی گرت و شەڕی کرد. ئەو, خانەقایە کە بەو چاوانەم دیتم ژوالفقاری عەلی بە دیوارەکەیەوە هەڵواسراوە, ئەو شمشێرە کە

ئەگەر حەوت هەزارو حەوسەدو حەفتاو حەوت پیاو بێن ناتوانن لە دیواری بکەنەوە, ئەمن دیتم, ئەو شمشێرە, کە ئەگەر بکەوێتە سەر عەرز نۆ هەزارو نۆسەدو نەوەدونۆ کەسیش بێن ناتوانن لە عەرزی راستی کەنەوە, بەڵام ئاناجیخ سوڵتان دێ بەتاقیتەنێ وەك پەڕە مریشکێك لە عەرزی هەڵیدەگرێتەوەو بە دیواریدا دەکا... حەمەدۆکیش دەبێ چاك بێتەوە.

دایە حۆری لە کاتێك دا ئەسپەکەی و رقەکەی و خۆشی لەبیرچووبوونەوە لەسەر بەردێك کە بەرامبەر بە ماڵەکەی بوو, بە هەڵچوون و هەژانەوە ئەوەی بەسەر حەمەدۆك هاتبوو, وەك ئەفسانەیەکی کۆن دەیگێڕایەوەو خەڵکەکەش لە جێی خۆیان دانیشتبوون و گوێیان راگرتبوو.

دایە حۆری گێڕانەوەی داستانەکەی لە کوژرانی عەلیسەفابەگەوە دەست پێکردو گوتی کە چۆن وەختێك حەمەدۆك لە شارۆچکەی وەدەرکەوت, جەندرمەکان گوللەبارانیان کرد. ئەمجار گوتی: باسی ئاساب چەشمەتان بۆ ناکەم چونکە خۆتان لە من باشتری دەزانن, ئێسکەکانی کەلاکی هەمزە کەچەڵ کە سەگ خواردوویەو بووەتە خۆراکی قەل و داڵ هێشتا لەو خوارە کەوتوون, حەمەدۆك ئەوێی بە جێ هێشت. ئەمجار باسی لێڕەواری گێڕایەوە, کە چۆن وەختێك حەمەدۆك دەیەویست بچێتە نێو لێڕەوار ئەسپەکە سڵەمیەوەو نەیدەویست بچێتە نێو لێڕەوار، بەڵام حەمەدۆك ئەو ئەسپە مەبارەکە جادوویی‌یەی ناچار کرد بچێتە نێو دارستان. جەندرمەکان لە نێو لێڕەوار بۆسەیان دانابوو, دیسان ئەسپەکە گوێ لەچەرمەوە دەباو لە جێی خۆی دەچەقێ, بەڵام حەمەدۆك ئاگای لە رەفتاری نائاسایی ئەسپەکە نابێ. دیسان ئەسپەکەی بەرەوپێش لێدەخوڕێ‌و لووس و باریك دەکەوێتە نێوەڕاستی جەندرمەکان. کەچی ئەسپەکە لەو نیوەشەوەدا لەسەر زگ رادەکشێ و بە زگەخشکە لە ئەڵقەی گەمارۆی جەندرمەکانی ئەجات دەدا. بەو حاڵەش ئەو حەمەدۆکە بێئەقڵە کە بە قسەی ئەسپەکەی نەکردبوو حەوت گوللەی لێدەدرێن. دایە حۆری پاشان باسی ئەوەی کرد کە چۆن چەتەکان هاتوون و ئەجاتیان داوە: چەتەکان هاتن ئەویان هەڵگرت و بردیانە ئەشکەوتێك لەسەر چیایەکی بەرز. جەڕاحیان هێنان, جەڕاحەکان خوێنەکەیان راگرت و برینەکانیان بۆ بەست. حەمەدۆکیش... ئاخر گاڵتە نیە, حەوت گوللەی لێدرابوون... نۆبەتێی دێتێ و وەك تەندوور دادەگیرسێ. دایە حۆری هەڵدەستێ وەدوای دەکەوێ, ئێستا ئەگەڕێ کەنگێ بگەڕێ, بەڵام کەس جێ‌و ڕێیەکەی پێنالێ. دایە حۆری هەموو بەسەرهاتەکەی بە وردی دەگێڕایەوە, نە ناوی جێگاکانی بە زمان دا دەهات و نە باسی کۆچەری‌یەکانی دەکرد.

دایە حۆری پاشان روونی کردەوە کە چۆن خێرخوایەك شوێنی حەمەدۆك لە چەتەیەك فێردەبێ‌و چەتەکانیش چاوانی دەبەستن و دەیبەنە لای حەمەدۆك. دیارە ئەوان دایە حۆرییان

نەناسیبوو کە وێرابوویان بۆ ئەدەبیی وابکەن . دایەحۆری بەو کارە وا قەڵس دەبێ کە بڕیار دەدا هەر لەوێ مشووری حەمەدۆکە چڵمنی بخوا, ئەگەرچی نەخۆشیش بوو, بەڵام دوایە دێتە سەر ئەو بڕیارە کە هەتا چاك نەبێتەوە ئەو پێشهاتەی بەسەر چاودا نەداتەوە, بەڵێ, خوا بەخشندەیە. با جارێکی دیکە دەستی حۆرییە بگاتە یەخەی ئەو هەتیوە چڵمنە, ئەم جار مشووری دەخوا.

خۆر شۆڕ بووەوە, شەو داهات, بوو بە نوێژی خەوتنان و هێشتا دایەحۆری هەر خەریکی گێڕانەوەی داستانەکە بوو, تازە گەیشتبووە ئەو جێیە کە وەڕێ کەوتبوو بۆ خانەقایە. گوتی: ئیدی ماندوو بووم. بەسەرهاتی خانەقایە سبەینێ و دووسبەی دەگێڕمەوە, بەسەرهاتی خانەقایە چل شەوو رۆژیش بگێڕمەوە دیسان تەواو نابێ... بەڵام پێش وی دەبێ شتێکتان پێ بڵێم. ڕووبەڕووی خانەقایە کێوێك هەیە لە بەردئەستێی زۆر بەرزو نووك تیژ, لووتکەی ئەو چیایە شەوو رۆژ, تەنانەت رۆژانی هەورو بەفرو بارانیش هەتاوە, تەنانەت لە تاریکاییش دا ئەو کاتە کە چاو چاوی نابینێ, دیسان دوندی ئەو چیایە پڕ نوورە, بەڵێ, وایە.

ئەو شەوە دراوسێیەکان حۆرییان بۆ نان خواردن بردەوە لای خۆیان. دایەحۆری قەت پێی خۆش نەبوو لە ماڵێ هیچ کەس نانی بخوا, بەڵام ئەو شەوە چارەی نەبوو, زۆر درەنگ ببوو بە پێچەوانەی ویستی خۆی بۆ تاقەجارێکیش بووبێ قبووڵی کرد نانی لە ماڵێکی دیکە بخوا.

بەیانی کە لەخەو هەستا خۆشحاڵتر بوو, دەسبەجێ مەنجەڵە ئاوێکی وەسەرنا, کە ئاوەکە گەرم بوو حەمامی کرد, بە پارووە سابوونێکی بۆن خۆش پاك پاك خۆی شوت, بانگی کچە دراوسێیەکەی کردو گوتی کەزیەکانی بۆ بهۆنێتەوەو چەند زەنگیانەی شینیشیان تێبخا. لەبەرخۆیەوە پێکەنی: دایەحۆریی حەمەدۆك بە چاوەوە نەبێ. دامێنێك کە قوماشەکەی تێکەڵاوێك لە ئاوریشم و لۆکە بوو و لە جحێڵییەوە تا ئێستا لەبەری نەکردبوو, هەڵی گرت, قۆندەرە بریقەدارەکانی لەگەڵ جووتە گۆرێیەکی تەنك کە تایبەتی ژنە شارستانییان بوون لە سندووقێ دەرهێنان. دەسماڵێکی ئاوریشمی پوولەکەداری سەوزی بەخۆیدا دا, خەزێمێك کە عەلی دورمووش کاتی گەڕانەوەی لە سەربازی لە عەرەبستانی سەعوودی بۆی هێنابوو, لە لووتی کرد, خڕخاڵەکانی کردە پێی, شاڵە تەرابلووسییەکەی کە گوڵینگەکانی دەگەیشتنە سەر ئەژنۆی, لە پشتێ بەست و خۆی بە جوانی رازاندەوە, ئەمجار ماوەیەکی چاك تەماشای ئاوێنەی کرد. لە کاتێك دا ئاوێنەکەی دادەنایەوە, لەبەرخۆیەوە گوتی: ئەی بنیادەم, ئەتۆ چ بوونەوەرێکی؟ بە شەوێك هەزار ساڵ پیر دەبی و بە رۆژێك هەزار ساڵ جوان دەبیەوە.

به لەنجەولار چووە نێو ئاوەدانی. سەری لە هەموو ماڵێك دەدا, هەمووی خۆش دەویستن و دەیلاواندنەوە.

لە ماڵێ هاتبووە دەرو لێوبەزەردەخەنە دەچووە نێو دێ کە تووشی سوارێك بوو. ئەسپی سوارەکە وەك ئەسپە خەنەیی حەمەدۆك ئەسپێکی بۆرەی رەسەن بوو. سوارەکە چەکمەی لەپێدا بوو, کلاوشەبقەی لەسەر بوو, خەتی پانتۆڵە تازە ئوتوو کراوەکەی کەڵەبابت پێ سەر بڕیباو چاکەتێکی تازەی لەبەردا بوو دەت گوت هەر ئێستا لە بەرگدرووی وەرگرتوەتەوە. سوارەکە فیلینتایەکی ئەڵمانیی نوێ و بریقەدارو مۆنج مۆنجی لە شان دا بوو. سوارەکە لە تەنیشت دایەحۆری لەغاوی ئەسپەکەی توند کردو گوتی: دایەحۆری.

دایەحۆری بە خۆشحاڵییەوە گوتی:

"دایەحۆریت بەقوربان بێ رۆڵە چ دەفەرمووی, ئەتۆ کێی کە دەسبەجێ منت ناسی و بانگت کردم دایەحۆری؟"

سوارەکە گوتی:

"دایە, ئەمن عەلیەشەلم".

"چـ...ی, ئەتۆ عەلیەشەلی؟ گاڵتەم پێ مەکە رۆڵە. رەبی عەلیەشەل بە قوربانی موویەکی سەرت بێ رۆڵە. بەچکەشێرەکەم. چما ئەو بەمن دەڵێ دایەحۆری؟ ئەمنی دەست کەوێ تێکگوشێ بە خوێنم ساز دەکا".

"وەڵڵا, بیللا ئەمن عەلیەشەلم".

دایەحۆری بە زەردەخەنەیەکی شەیتانانەوە تەماشای کرد, وەك ئەوەی بڵێ: گاڵتەم لەگەڵ دەکەی؟.

"دایە ئەتۆ ئەمڕۆ چاکت خۆرازاندوەتەوە دەڵێی بووکی دوێنێو پێرێی. چ باسە, خەبەر مەبەرێك هەیە؟".

دایە حۆری وەڵامی ئەم پرسیارەی نەدایەوە, گوتی:

"دایە حۆریت بە قوربان بێ ئاخر ئەتۆ کوێت وەك عەلیەشەل دەچێ؟".

"دایە, ئەگەر پێت خۆشە وەرە ئەم بەر لاقە شەلەکەم ببینە".

دایە حۆری وەشك کەوتبوو, چووە لای دیکەی سوارەکە لاقە شەلەکەی عەلیی کە وەك تۆپێك لە ئاوزەنگیی ڕۆکردبوو, چاو پێکەوت هەر کە لاقەکەی دی پەلاماری زەوییداو تاوی دایە بەردێك:

"ئەوە ئەتۆی سەشەلە, هەی گووم کردە ئەو لاقە شەلەت..."

بەردەکەی پێدا دا, بەڵام وەعەلیەشەل نەکەوت. دایە حۆری کە دیتی بەردەکەی لێنەدرا شێت بوو, هەرچی بەردی لە دەوروبەری کەوتبوون هەڵیدەگرتنەوەو بە عەلیەشەلیدا دەدان. لەسەر زەوی هەڵدەسووڕاو جنێوی بە عەلیەشەل دەدان کە بەسەر ئەسپەکەوە حەبەسابوو.

"ئەی تاژیی چوکووراوا, کڵاوشەبقەشی لەسەرناوە, بووەتە پیاو... سەگی بەرەڵڵا, گووەجەندرمە! لە کڵاوشەبقەکەت دەڕیم, پڕیدەکەم، ئەتۆش لەسەرتی کە, پێت وایە حەمەدۆك مردوە هاتوویە ئەم دێیە, بەڵێ؟ حەمەدۆك نەمردوە, نەمردوە. هەتا حەمەدۆك تۆ نەکوژێ ئەمن لەم دنیایە نارۆم".

"دایە, دایە؟ حەمەدۆك ماوە؟ خوایە شوکور دایە... مزگێنیت لە سەر چاوانم!... ئەو بێمزەڕەت بێ..."

ئیدی زۆری قسە بۆ نەکرا, لەگەڵ بەردێك کە لە چەنەگەیدرا, بەلادا هات, بەڵام بەرنەبووەوە.

"گووی هەموو سەگی دنیات بە زاری, میزی هەموو کەری دنیات بە کونەتفنکان, تاژیی چوکووراوا... بەڵێ حەمەدۆك نامرێ, چما دەمرێ... چما هەتا هەزار مشك کەروێشکی وەك تۆ نەکوژێ, دەمرێ؟".

عەلیەشەل بە پاڕانەوە گوتی:

"راوەستە دایە قسەم پێتە".

هەولێشی دەدا خۆی لەو بەردانە کە پێیدا دەدران بپارێزێ.

"خەڵکینە! بڕواننە کابرای, ماوزەری لە شانی کردوە, بڕوانە ئەمەی, میزو گووی دنیا بەڕیش و سمێڵانی. تەماشای کەن, هەر کە پێی وابوو حەمەدۆك مردوە تفەنگی دە شانی کردو سواری ئەسپی عەرەبی بووو هاتەوە ئاوایی. بە قوربانتان بم, بە قەرەواشتان بم وریای بن. پێی وایە حەمەدۆك مردوە, کەیفی سازە. حەمەدۆك نەمردوە, نەمردوە..." دێهاتیەکان کە گوێیان لە هات و هاواری دایە حۆری ببوو هاتنە دەرێو بە ناڕەحەتیەوە چاویان بە ڕەفتاری دایە حۆری لەگەڵ سوارچاکە تەرپۆشەکە کەوت.

سەرەنجام دایە حۆری گۆپاڵێکی گەورەی دەست کەوت و لە پشتێ عەلیی ـ کە پشتی دەلای ویبوو ـ ڕاکێشا. عەلیەشەل تەکانێکی دا, ئەگەر ئەسپەکەی دەنگ نەداباو دووهەمین گۆپاڵی لێدرابایە لە ئەسپەکەی بەردەبووەوە.

دایە حۆری لە دواوە تێیڕاخوڕی:

"هەڵێ، هەڵێ گووم کردە ئەو لاقە شەلەت. ئەگەر حەمەدۆك ئەمجاریش نەتکوژێ، شیری ئەم مەمکانەی لێ حەرام دەکەم".

هێشتا رقەکەی نەنیشتبووەوە، لە کاتێك دا هێندێك بەردی بەدەستەوە بوون ماوەیەك بەدوای دا غاری دا، بەڵام نەیگەیشتێ. ڕۆیشتەوە ماڵێ و چووە سەربانی، ڕووی کردە عەلیکۆو بانگی ئەسپی خەنەیی کرد:

"وەرە وەرە وەرە، ئەسپە خەنەیی‌یەکەم، وەرە، گوێ مەقەستی، نێوقەد باریکی، چاوڕەشم وەرە، وەرە ئەم شەلە لە بن پێت دا پان کەوە. پێی وایە حەمەدۆك مردوە هاتوەتە ئاوایی. وەرە ئەسپە بۆرەی کوڕی ئۆغلی، بوراقی حەزرەتی پێغەمبەر، وەرە ئەتۆ لە ڕەسەنی دولدولی حەزرەتی عەلیی وەرە. یاڵڵا وەرە. دایەحۆری بانگت دەکا. ئەگەر تۆسقاڵێك ڕەسەنایەتی، دڵۆپێك ئینسانەتی و پیاوەتی و جوامێری لە زاتت دا هەیە وەرە. وەرەو ئەم شەلە گڕوێ خانینە لەبن پێت دا بپلیشێنەوە، وردوخاشی کە".

دەستی بەرەو ئاسمان ڕاگرتن و دەستی کرد بە تووك کردن. تووکی دەکردن و بانگی ئەسپی خەنەیی دەکرد.

کەمێك دواتر ئەسپی خەنەیی کە لە دەشتایی دڕووەڵانەکەی بەرامبەر بە عەلیکۆ لینگی دابوو، هات و بەپێش ماڵی دایەحۆری دا تێپەڕی بە جۆرێك کە دەت گوت چەند لەحزەیەك لەوێ ڕاوەستاوە. ئەمجار بە چوار نالی لە حالێك دا یاڵ و کلکی لە هەوادا باڵیان گرتبوو بەرەو بەردەڵانەکانی ڕۆژهەڵات دەخۆی نووساو دوور کەوتەوە.

دایەحۆری بە دیتنی ئەسپەکە نوتقی بەسترا. لەسەربانی ئەژنۆی سست بوون و دانیشت، دڵی لەبەر سام و سەرسوڕمان خێرا خێرا لێی دەدا. بە دەنگێکی نووساوو پڕ لە سام گرتوویی ڕوو بە خوارەوە هاواری کرد: دراوسێینە وەرن بم بەنەوە خوارێ. ئەم ئەسپە لە کۆڵم نابێتەوە.

دوو کوڕە جحێڵە بە غاردان، هەردوو پلیکانیان کردنە یەك و چوونە سەربان و ئەویان هێنایە خوار.

"فریام کەون دراوسێکان، فریام کەون ئاوماڵەکان، فریام کەون خوشکینە، براینە، فریام کەون، سەرم لە کاری ئەم ئەسپە دەرناچێ، ئێوە لە دنیادا شتی واتان دیوە، لە جێدا شتی وا ڕێی تێدەچێ؟".

شەکەت و ماندوو، ماسوولکەکانی ڕوخساری ڕێك هاتوو، لێو وەك گێچی سپی و شەلاڵی ئارەق لە جێی خۆی ڕەق ڕامابوو.

"دایە کەمێك بحەسێوە".

بردیانەوە ماڵێ، دۆشەکیان بۆ ڕاخست، لەسەر دۆشەکەکە دایان ناو چەند سەرین و باڵنجیان لەبەر پشتێ دانان. دایە حۆری چاوی لێك نان و ماوەیەك هەروا مایەوە. کاتێك هاتەوە سەرخۆی چاوی هەڵێنان و گوتی:

"تەماشای دەرێ‌کەن داخوا ئەو ئەسپە لەبەر دەرکەیە؟"
تەماشای بەردەرگایان کردو هاتنەوە گوتیان: ئەسپەکە دیار نیە".
"ئەو بەرازە, ئەو کافرە بۆ کوێ چوو؟".
گوتیان چوو بۆلای ماڵی عەبدی‌خان".

دایە حۆری بە زەردەخەنەوە گوتی: بابچێ بزانم چ دەبێ, و بە دوای ئەم قسەیەدا دیسان شادمانی‌یەکەی پێشووی وەدەست هێنایەوەو لەگەڵ دەوروبەرەکەی دەستی کرد بە گاڵتەو گەپ. وەختێك ئەوان بڵاوەیان کردو بەرەو ماڵبوونەوە لە پشتەوەڕا هاواری کرد.
"ئەمان خەڵکینە ئەمن لە ئەسپی حەمەدۆکی دەترسم".

عەلی‌یەشەلی بە تەواوی لەبیرچووبووەوە, فکری بە ئەسپی حەمەدۆکەوە خەریك بوو. ئەم ئەسپە جندۆکە بوو, پەری بوو؟ هەتا ئەم تەمەنە هەرگیز شتی وای نەدیبوو, لەوانەش بوو هەر ئەسپە نەمرەکەی کوێرئۆغلی بووبێ‌و چووبێتە کەوڵێکی دیکەوە بۆ ئەوەی تا قیامەت کەسانی وەك کوێرئۆغلی و حەمەدۆك بە کۆڵێ خۆی‌دا دا...

دایە حۆری لە حاڵێك دا ددانی لە چیڕەوە دەبردن, بە رقەوە گوتی: ئەو عەلی‌یە شەلەی بکوژە.

هەتا نیوە شەوێ لە پەستا دەهاتە دەرو چاوەڕێی ئەسپەکەی دەکرد. بەڵام ئەسپ ئیدی دەرنەکەوتەوە. دایە حۆری لە دڵی خۆی‌دا گوتی: ئەسپەکە چووەتە لای حەمەدۆك. جا حەمەدۆك سواری دەبێ‌و پێش ئەوەی عەلی‌یەشەل لە دێی دەرکەوێ‌و ملی خۆی‌بشکێنێ, دەی‌گاتێ‌و ئەو شەلە خائینەی دەکوژێ. ئەگەر ئەمجاریش عەلی‌یە شەلی نەکوژێ, ئەو دەم دایە حۆری دەزانێ چ بەڵایەك بەسەر ئەو هەتیوە چڵمنە دێنێ, کە دەستووری دابوو چاوانی ببەستن و بەو کێوانەدا ببەنە سەرێ‌و بی هێننەوە خوارێ.

✧ ✧ ✧

حەمەدۆك بەیانی زوو هەستا, پانتۆڵ و کراسە خوێناوی‌یەکەی لەبەرکردن, ئەو گۆرێ‌یانەی کردە پێی کە دایە حۆری بە دەستی خۆی بۆی چنیبوون, بەن کاڵەکەی قایم کرد, فیشەکدانی لە خۆی‌دان, دووربینەکەی بە ملی خۆیەوە هەڵواسی, تەقیلەو کەل و پەلەکەی دیکەی لە خورجین هاویشت و تفەنگی لە شانی کردو گوتی:

"یاڵلا هاوڕێ‌یان, هەتا هۆبە وەڕێ‌نەکەوتوە بچێتە چوکووراوا: دەبێ بچین گەردن ئازایی‌یان لێ‌بخوازین".

حەمەد لە پێشەوەو قاسم و دەمیر بە دوایدا ملی باریکەڕێی نێو لێڕەواریان گرت. کاتێك لە لێڕەواری دەرچوون نیوەڕۆ بوو. شوێنەواری تەم و مژ لەسەر لێڕەوارەکە نەمابوو. پاش ئەوەی ماوەیەك ڕۆیشتن گەیشتنە دۆڵی قزڵ کارتال. بەتال ئاغا هەتا دووری چادرەکان بە پێشوازیانەوە هات. دەم و چاوی حەمەد پڕفکرو نێوچاوانی پڕ چرچ و لۆچ بوو. ئەو بریسکە پۆڵای گۆرین هاتبووەوە نێو گلێنەی چاوەکانی. بەتال ئاغا لە حالێك دا لە پێشەوەی یاغییەکانەوە بەرەوچادری دیوەخانێ دەچوو، لەبن لێوانەوە گوتی: ئەو بریسکەیەی باسیان دەکرد، دەبێ ئەمە بێ.

نان و خوان لەمێژ بوو لە چادرێدا ئامادە بوو، سفرەیەکی ئاوەڵا چاوەڕێیان بوو. ئەو باڵندە راوکەرانە کە لەبەر دەرکی چادرەکان لەسەر پەلە دارەکان هەڵنیشتبوون ئەمڕۆ زۆر ئاڵۆز دیاربوون. باڵیان لێك دەکردنەوەو وێکیان دەنانەوەو هەوڵیان دەدا هەڵفڕن و بۆ رزگاری لەو جێگایە کە پێیەوە بەسترابوونەوە دەندووکیان بە پەتەکەدا دەدا. حەمەد بە باشی لە هۆی ئاڵۆزیی باڵندەکان ئاگادار بوو. هەمیشە کاتێك کۆچ ئامادەی وەرێکەوتن بوو، ئەوان ئاوا دەکەوتنە پەلەپەل. حەیوانات هەستێکی زۆر بەهێزی پێش بینییان هەیە کە بنیادەم نیەتی. بێ ئەوەی قسەیەك بکەن نانەکەیان خواردو لێبوونەوە. سفرەکەیان کۆ کردەوەو قاوەیان هێنا، وەختێك قاوە هات، حەمەد زۆر خۆشحاڵ بوو. بەڵێ، ئەو لە ژیانیدا کەمی قاوە خواردبووەوە، ئاشقی قاوەی کۆچەرییەکان بوو. هەتا ماوەیەك تام و بۆنی قاوەی کۆچەرییەکانی لەبەر زارو لووتان دەماو چووبایە هەرجێیەك ئەو تام و بۆنەی لەگەڵ بوو.

بەتال ئاغا گوتی:

"کوڕینە، ئەگەر سبەینێ نەکرێ، دووسبەی دەڕۆین. لە مەودوا ئیدی کاری ئێمە دژوارە. دەبێ دنیایەك پووڵ بدەین بۆ ئەوەی لە ئارانی باب و باپیرانمان دا رامان بگرن. ئیدی هیچمان نەما. ئەم مەلادۆران ئەفەندییە بێ قیمەتە جگە لەوەی ئارانی باب و باپیرانمانی هەڵگرت و کردی بە کێڵگە، هەموو سالێش بۆ ئیجارەکەی زێڕی لێدەوێ، پارەی کاغەزیش وەرناگرێ، ئێستا کە چووینە خوارێ دەبێ بچینە ئەدەنە بۆ پارەی زێڕ. دارونەدارمان لەدەست چوو. فیرعەونێکی خۆبەزل زانی وەك ئەم مەلادۆرانە لە چوکووراوادا پەیدا نابێ، ئەگەر هەر ئەم ڕۆژانە دەست بەسەر زۆزانەکەشمان دا بگرێ پێم سەیر نابێ. ئێستا عەلییەشەلی کردوەتە گزیری خۆی، دەڵێن. . .".

چاوی لە چاوی حەمەدەوە بڕی وەك ئەوەی چاوەڕوانی شتێك بێ.

"دەڵێن ئەو عەلییەشەلەش هەزار جار لە خۆی خەراپترە، لەویش بێ ئینساف ترە. دەبێ لەدەستی ویش بچێژین. مەلادۆران ئەفەندی ئەسپێکی داوەتێ سواری بێ و ماوزەرێکیشی داوەتێ لە شانی کا".

حەمەد بەخۆی نەبوو پێ‌کەنی. ئەم پێکەنینە لەپێش چاوی بەتال ئاغا ون نەبوو.
"پێم وایە ئەم عەلیەیەشەلە هەر ئەو عەلیەیەشەلی شوێن گێڕی، نۆکەری عەبدی‌خانە".
حەمەد بە خۆشحالی و بە پێکەنینەوە گوتی: رەنگە.
بەتال ئاغا بێ‌ئەوەی رووبکاتە کەسێکی دیاریکراو، گوتی: پیاوی چاکە؟
حەمەد گوتی: زۆر پیاوی چاکە، دایکی رۆژگار پیاوی وا ئازاو جوامێرو ئاقڵی لێ‌نەبووە.
بەتال ئاغا گوتی: وادەڵێن. بەهەرحاڵ ئێمە کارمان کراوە، خەڵکی چوکووراوا رووتیان کردین و دارونەداریان بردین. کەریم ئۆغڵییش پێوەبوو.
حەمەد پرسی:
"ئەو بۆچی؟ لە مێژ ساڵە ئەم دیوە. خۆزگە جارێکی دیکە بەم چاوانە دەم دیو دەستیم ماچ دەکرد. لەخوام داوایە پێش مردن ئەو رۆژەم بە نسیب بکا.
وەختێك حەمەد باسی کەریم ئۆغڵیی‌کرد، وەك منداڵێکی شەرمێون دەچوو کە خەتایەکی کردبێ. بەتال ئاغا هەستی کردبوو حەمەد چیی لە دڵدایە:
"ئەویش تۆی وەك کوڕەکانی، وەك گیانی خۆش دەوێ".
حەمەد زیاتر کەوتە عەزابەوەو چاوی بەردانەوە، هیچ پێی‌خۆش نەبوو ئەو رۆژانەی وەبیربێنەوە کە تووشی کەریم ئۆغڵی ببوو.
"هۆبەکەی ویش لێیان تێك چوو، ئارانەکانی وانیش ئاغایەکی تازە بەسەرداکەوتوو داگیری کردوون و ئەو ئاغایە ناهێڵێ تەنانەت بە پەنای ئارانی خۆشیان دا برۆن... راوەستە بزانم ناوی چ بوو؟".
لەفکرەوەچوو، چرچی کەوتنە نێوچاوانی‌و سمێڵەکانی بزووتن:
"گۆیا ئەویش یەکێك لە قارەمانانی شەڕی سەربەخۆیییە. ئارانی کەریم ئۆغڵی‌یان لە جیاتی هەقی شمشێر داوەتێ، ئەویش رێگا نادا ئەوان لە ئارانەکەیان نزیك کەونەوە، دیسان خوا ماڵێ مەلادۆرانی ئاوەدان کا. چا نیە ئەو هەر زێڕمان لێ‌وەردەگرێ، لە ئارانەکەی خۆمان دەرمان ناکا".
بێدەنگ بوو، هێندێك دەستی دە سمێڵەکانی وەرداو ئەمجار گوتی:
"ئاها، ناوی سابیت بەگە، هیچ ناوبانگیت بیستوە؟".
حەمەد سەری لەقاند و گوتی: ناویم بیستوە.
"دەساڵی پێ‌ناچێ هەموومان لەنێو دەچین، هۆبەی ئێمە لە ئێستاوە خەریکە لێك بڵاو دەبێ - چاوی پڕبوون لە فرمێسك - ئەگەر ئەمن بمرم... بە زمان گیرانەوە لەسەری رۆیشت -

هۆبەکەمان تەنانەت گۆرستانێکیشی نابێ مردووەکانی تێدابنێژرێ.ـ پێکەنینێکی تاڵی کرد ـ ئەگەر ئەمن مردم بم هێنن لە خوار ئەم کانی‌یە لەبن ئەم چنارە بە خاکم بسپێرن".

حەمەد لە حاڵێك دا چاوی پڕبوون لە فرمێسك گوتی: خوا بەو رۆژە نەکا.

لەو بەینەدا گەورە کچان و نۆبووکان و ژنانی بەساڵداچوو چەند بوخچەیەکی چووکەڵەی گوڵدۆزی‌کراویان هێنان و لەبن چیغیان دانان. هەر کامەشیان چاوێکی لە حەمەد دەکرد جا دەڕۆیشت.

کوڕە جحێڵەیەکیش بە چەند فیشەکدانی گوڵدۆزی‌کراوو فیلینتایەکی ئەڵمانی‌یەوە هات و ئەوانەی لە پەنای جەواڵە نەخشینەکان داناو ئەمجار دەست لەسەر سنگ چاوەڕێ‌ما. بە دوای ئەوەدا دووربینێك، دوو خەنجەری چەرکەسی‌و دەمانچەیەکی دەسك عاجی ناگانیان هێنا... حەمەد کە نەی‌دەزانی ئەم تێکەوەهاویشتنە بۆ چیە، بەسەرسوڕمانەوە تەماشای فیلینتایەکەو بوخچەکانی دەکرد.

بەتال ئاغا بە بەژنی باریك و کەڵەگەتیەوە هەستایە سەرپێ. بەو چاوە شینە جوان و پیاوانەیەوە کە بووی، یەکەم بوخچەی هەڵگرت و بێ ئەوەی بی‌کاتەوە لە پێش حەمەدی داناو ئەودەم یەك بەیەك هەموو بوخچەکانی لە بەردەمی وی ڕیزکردن:

"حەمەدۆك، ئەمانە هی تۆن. دەبێ ببووری. دیاریی شوانی ئاڵەکۆکە. لێمان ببوورە ئەگەر دەرهەقی تۆ تەنەخی‌یەکمان کردبێ".

حەمەد هاتەوە سەرخۆی‌و گوتی: تەنەخی لە ئێمەوە بوو. ئەو هەموو زەحمەتەتان بۆچی کێشاوە؟... بە حەبەساوی‌و بێ ئەوەی بزانێ دەبێ چ بکا تەماشای ئەو بوخچانەی دەکرد کە لە پێشی دانرابوون.

بەتال ئاغا گوتی: ئەوانە بکەوە، دیاریی کچانی هۆبەکەمانن بۆتۆ، و ئەوانەش ـ لە حاڵێك دا فیلینتاو فیشەکدانەکان و دەمانچەکەی نیشان دەدا ـ ئەوانەش دیاریی هۆبەکەمانن.

حەمەد کە وەك چەوەندەری کوڵیو سوورهەڵگەڕابوو، تەنیا ئەوەندەی توانی بڵێ: هەر خۆش بن. شتێکی وەك گلۆڵە بەقەدەر مستەکۆڵەیەك بەری ئەوکیی گرتبوو. ئەگەر خۆی ڕانەگرتایە زۆر زۆر دەگریا. بە هیچ جۆر نەی‌دەتوانی دەست لە بوخچەکان بدا.

سەرەنجام بەتال ئاغا خۆی پێ‌ڕانەگیراو گەورەترین بوخچەی کردەوە. پانتۆڵێکی خوریی دەستچنی ڕەنگ قاوەیی بوو، زار گیرفانەکان و جێ‌درووومانەکان و دەلینگەکانی گوڵدۆزی کرابوون. گوڵینگەی دۆخینەکەی گوڵەباڵتوون بوون. هەر لەو بوخچەیە سەربەرگێکی نوێ و بە گوڵە باڵتوون چنراوی دەرهێناو پاشان کراسێکی هەریر کە یەخەکەی زۆر جوان بە ئاوریشم نەخشابوو، سێ جووت گۆرێیی قولاپەی، سێ دەسەسرەی ئاوریشم کە هەر چوار قولینچکیان گوڵی بنەوشی شینیان لێ‌دوورابوو سەرەنجام دەرپێ‌یەکی درێژی پاتیست و جووتێك قۆندەرەی سووری کاری ماراش دەرکەوتن.

وەزعی حەمەد لەسەر سورمان تێپەڕیبوو. بە چاوێکی جادوولێکراو حەیران و سەرلێشێواو تەماشای ئەو دیارییانەی دەکرد کە بۆیان هێنابوون. دیسان ئەو بریسکە درەوشاوەی بە ئەندازەی نووکە دەرزی هاتبووە بنی چاوانییەوە. بێدەنگ بوو, بەتال ئاغاو قاسم و دەمیر لە خۆشییان خەریك بوو باڵبگرن و پێدەکەنین.

"ئەم بوخچەیە هەڵگرەو بچووە ئەو بەشەی چادر جلەکانت بگۆڕە... مەترسە پڕیەبەرتن. هۆیەکەمان هەموویان تۆ دەناسن".

ئەم پێشنیارە فریای حەمەدی کەوت. پڕیدایە بوخچەکەو چووە دیویلکەکە, کە گەیشتە وێ دەسەڵاتی بەسەر خۆی دانەما. لە حاڵێك دا هۆن هۆن دەگریا جلەکانی داکەند و جلە کۆن و خوێناوییەکانی کە بە گوللەی جەندرمەکان کون کون ببوون فڕێ دایە لایەك, خێرا جلە نوێیەکانی کردە بەری. جووتێك لە گۆرەوییەکانی بە دەستەوە گرت, زۆر جوان بوون, بەڵام ئەم گۆرییانەی دایە حۆری بۆی چنیبوون, جوانتربوون. ئەو بوخچەیەی بەدەستیەوە بوو, لەولای داناو گۆرێیەکانی پێشووی دەپێکردەوە. کەوشەکان پڕ بە پێی بوون. قەیتانی کەوشەکانی بە وردی داخست. دەیەویست بچێتەوە دیوەخان, بەڵام گریانەکەی رانەدەوەستا... یەکێك لە دەسرۆکە ئاوریشمەکانی بەدەستەوە گرت, چەند لەحزەیەك چاوەکانیی پاك کردنەوەو لە دیویلکەکە هاتە دەرێو چووەوە دیوەخان.

بەتال ئاغا بە پێکەنین و خۆشحاڵییەوە گوتی:

"پێم نەگوتی, نەم گوت, دیتت چۆن هەموو شتێك بە ئەندازەی لەشت بوو؟... ئەدی برازا... لەسەردەمی کوێرئۆغڵییەوە دەوارنشینەکانمان ئەم کارانە باش دەزانن".

بە بیستنی ناوی کوێرئۆغڵی حەمەد ئاگری لە دڵ بەربوو.

"پێش ئەوەی کوێرئۆغڵیی ئازاو نەترس بچێتە شەڕێ, ژنانی تورکمەن ئاوا نوێیان دەکردەوە. ئەمە دابی باب و باپیرانمانە. ریش سپییەکانمان وا دەڵێن... ئاشق یەشیل وەختێك باسی کوێرئۆغلیی دەکرد شەوو رۆژێك بە جل و بەرگەکەی هەڵدەگوت, بەڵام هێشتا لێنەدەبووەوە".

سەرەنجام حەمەد زمانی کرایەوە, بۆ ئەوەی چاوە فرمێسکاوییەکانی نەبینن, راست تەماشای بەردەمی خۆی دەکرد, نەیدەویست چاو لە چاوی کەس بکا. حەمەد بە دەنگێك کە بە حاڵو بال دەبیسترا گوتی:

"چاك بوو, چاك بوو ئاغا, ئەمن ئیدی واز لە چیاو بەندەنان دێنم, سەری خۆم هەڵدەگرم و دەچمە جێیەك کە ناویشی نازانم و لەوێ خۆم ون دەکەم. ئەم کارەی من ئاقیبەتێکی نیە, ئەم کارە پوولێك ناهێنێ, ئاخرو ئاقیبەتەکەی گوللەیەکی گەرمە".

تەماشای روخساری حازرانی کرد, هیچ نیشانەیەکی سەرسوڕمان لە روخساریان دا دیار نەبوو. حەمەد لە حالێك دا نەیدەتوانی سەرسوڕمانی خۆی بشارێتەوە گوتی:

"ئێوە دەتان زانی ئەمن دەمەوێ وا بکەم؟".

بەتال ئاغای دنیا دیتووی ساردوگەرم چێشتوو گوتی:

"ئەوەندەی ئەمن بزانم, ئەوەندەی ئەمن بزانم هیچ یاغی و چەتەیەك نایەوێ هەتا قیامەت لە چیا بمێنێتەوە, هیچ رێگرێك نەدیتراوە لە کێوان پیر بێ. ئەگەر چەتە بە گوللەیەك کاری نەکراو لە کێوان پیربوو, لە تاقەت دەکەوێ و ئیدی چەتەیی پێناکرێ, هەر بۆیەش کاری چاك دەکەی کوڕم حەمەد. ئەتۆ کارێکی چاك دەکەی, بەلام تا ئێستا هەڵنەکەوتوە چەتەیەکی وەك تۆ بتوانێ خۆی ون کاو لە دەشتێ بژی, یان بە بیانوویەك کوژراوە, یان بە دیتنی ناهەقییەکی چووکەڵە دووبارە وەکێوان کەوتووەتەوە. خەراپ حالی نەبی, پێت نالێم لە چیای وەمێنە, ئەمن ئەو شتانەم باس کرد کە لە باب و باپیرانم بیستوون, یان بۆخۆم دیتوومن. چەتەیەك بێهەوێ خۆی ون کاو لە دەشتێ وەمێنێ کارەکەی زۆر لەوە گرانترە کە بی هەوێ لە چیاکان دەوام بکا. ئەمن لە ژیانم دا هێشتا چەتەیەکم نەدیوە لە دەشتێ وەمێنێ و بە مردنی خۆی بمرێ, یان دووبارە وەکێوان نەکەوێتەوە. مەبەستم کەسانی بێناوونیشان و وردەوپردە نیە. مەبەستم کەسانی خاوەن ناوی وەك تۆن. ئەمن باسی کەسانی وەك کوێرئۆغلی و حەمەدۆك دەکەم".

"باشە بایرام ئۆغلی, بایرام ئۆغلی چووە لە دێیدانیشتوەو وەك گولێش بۆ خۆی دەژی..."

بەتال ئاغا گوتی:

"بایرام ئۆغلی مرد. ئەو خۆی کوشت. رۆستەمە کوردەش کە کووپە شەربەتی بە پشتێدا داوەو بووەتە گالتەجاری ئەم و ئەو هەموو رۆژێ جارێك دەمرێ. هەر ئەو رۆستەمە کوردەیە کە تەنانەت بایرام ئۆغلییش لە پیاوەتی و ئازایەتیدا نەدەگەیشتە قولاپەی و رێینەدەکەوت ئاوێشی لە دەستان بکا".

حەمەد گوتی: ئەمنیش دەمرم.

بەتال ئاغا گوتی:

"ئەمن باوەڕ ناکەم. خوابکا لە دەستت بێ. ئەمن کەمێك تۆ دەناسم. هەتا کاتێك ئەو کرمەی بەربووەتە گیانت دەجوولێ ئەتۆ ناچاری. کوێر ئۆغلییش ناچار بوو".

"دەزانم کە ناچارم, هەمیشە ناچارم. دەزانم وەختێك حەمەدۆك بێ سەرو شوێن چێ, ناتوانم تەحەممول بکەم. ئەمن خۆم دەناسم. دەزانم بابی چەندم... دەزانم, دەزانم, دەزانم".

بەتال ئاغا چاوە شینە چیمەنییەکانی خۆی لە چاوی حەمەدەوە بریبوون و حەمەدیش بێ ئەوەی چاوی لێوەرگێڕێ بەو چاوانەی کە بریسکەی پۆلایان تێخزیبوو تەماشای دەکردەوە. بەتال ئاغا لە دڵی خۆیدا

دەیگوت: ئای... بنیادەم, ئای... ئەو پیاوەی تاوێك پێش ئێستا ئارام و هێدی دانیشتبوو بە دیتنی جلەکانی وەك منداڵێك خۆشحاڵ ببوو شەرمی دەکردو لەبەر ئەو میهرەبانی‌یەی لەگەڵی کرابوو, وەك منداڵان دەگریا, ئێستا بووەتە پڵنگێك, بووەتە دێوێك کە مووی لەشی راست بوونەوە.

"دەزانم خان... باشت گوێ لە من بێ, دەمەوێ شتێکت پێ‌بڵێم کە خەریکە ئاگر لە هەناوم بەردەدا. ئەمن لە مردن ناترسم. مردن, ئەگەر ئەمڕۆش مردن میوانمان نەبێ, رۆژێکە کە ئاخرەکەی درەنگ یان زوو, سبەینێ یان دووسبەی دەبێ پێیدا بڕۆین, ئەو کەسەی لە مردن دەترسێ ئینسان نیە. ئەمن لەوە ناترسێم کە بە گوللەیەك بکوژرێم, دەردی من شتێکی دیکەیە...".

بەتال ئاغا بەدەم فکرانەوە لە حاڵێك دا قامکە درێژەکانی بەسەر چەنەگەی‌دا دێنان بە دڵەوە گوێی بۆ قسەکانی راگرتبوو, هەر وشەیەك لە قسەکانی بۆ وی بایەخێکی لە رادەبەدەری هەبوو.

"دەردی من دەردێکی سەختە, خوا دەردی وا تووشی گیانی کەس نەکا, تووشی گیانی دوژمنیشتی نەکا... ئەمن عەبدی‌خانم کوشت, هەمزە کەچەڵی هاتەجێ, ئەویشم کوشت بزانم ئێستا کێی دێتە جێگا... عەلی سەفابەگم کوشت, هەتا ئێستا کەس جێی وی نەگرتوەتەوە. دام نا ئەویشم کوشت, سابیت بەگ هاتوە سواری سەری کەریم تۆغلی بووە, ئەویش راست لە ئاسمانەوە هاتوە سواری سەری بووە. مەلادۆران ئەفەندییش بەڵای گیانی تۆیە... ئەم کوشت و کوشتارەی من سوودی چیە؟ هەزاریان لی‌بکوژین دووهەزار کەس جێیان دەگرنەوە..."

وەختێك بەتال ئاغا قاقاپێ‌کەنی, حەمەد پێی‌سەیر بوو. بەتال ئاغا گوتی: ئێستا تێ‌گەیشتم دەردت چیە. باشیش تێ‌گەیشتم - قسەی دەکرد و پێ‌دەکەنی - ئەتۆش باش گوێ‌بگرە حەمەدۆك... چوار مێزیلکە دانیشت و دەنگی خۆی رەوانتر کرد.

"حەمەدۆك دەکوژرێ, عەلی یۆك دێتە جێگای, ئەویش بکوژرێ حەسەنۆك جێی دەگرێتەوە... ئەویش بکوژرێ وەلی‌یۆك دێ... ئەویش بکوژرێ... ئەویش بکوژرێ... ئەویش بکوژرێ... کورم ئەتۆ فکرت لە کوێ‌یە؟ گیانی هەر ئینسانێك کرمێکی ناچاری, کرمێکی بوون بە حەمەدۆکی تێدایە. کوێرئۆغلی رۆیشت, حەمەدۆك هات. هەتا وەختێك ئەم کرمە لە گیانی مرۆڤ دا هەیە, هەرچی‌یەك رووبدا تێك ناشکێ. ئەتۆ ئەو کرمەی کە لە گیانی مرۆڤ دایە. هەرچیت بەسەر دێ, بابێ, هەرکوێت پێ‌خۆشە بچۆ. بەڵام وەختێك ئەم کرمە لە گیانی بنیادەم دا بێدەنگ بوو, ئەو وەخت ئینسانەتیی خۆی لە دەست دەدا. ئینسان نابێ رێگا بدا ئەم کرمە لە دەست بچێ, دەبێ هەتا قیامەت وەك چاوی خۆی بی‌پارێزێ. ئەم کرمە شادەماری ئینسانە. دڵی پڕلەلێدانیەتی. ئەو کرمەی کەوتوەتە گیانی تۆ کرمی ئینسانەتی‌یە".

ئەو ڕۆژە حەمەدۆك بە هیچ جۆر نەیتوانی گەردن ئازایی‌یان لێ‌بخوازێ و لەوێ بڕوا. هەتا بەیانی قسەیان کردن. بەتال ئاغا زۆر شتی لەبارەی جیهان و لە بارەی ئینسانەتی‌یەوە دەزانی:

"حەمەدۆکێك بمرێ, هەزار, دەهەزار, سەد هەزار حەمەدۆك جێی‌دەگرنەوە. ئاغاکان دەبڕێنەوە, بەڵام حەمەدۆکەکان بڕانەوەیان نیە".

قسەکانی بەتال ئاغا کاریان لە دڵی کردبوو هەموو گیانی وی‌یان هێنابووە لەرزین. بە هیچ جۆر نەی‌دەتوانی لەژێر تەئسیری ئەم قسانە ڕزگاربێ.

ڕۆژ بووەوە. هەتاو کەوت. حەمەدۆك لە بڕیاری خۆی پەژیوان نەبووەوە, جگەلەوەش, هێشتا برینەکانی بە تەواوی سارێژ نەبوونەوە. دواقسەی لەگەڵ بەتال ئاغا ئەوە بوو کە هەر لەسەر بڕیاری پێشوویەتی.

بەتالیش هێندێ شتی گوت, بەڵام سەرەنجام هەقی لەدوا دا. ئەویش ئینسان بوو ئەویش دەبوو ژن و منداڵی هەبێ و بگاتە ژیانێکی ئارام. بەڵام ئاگای لەو کرمەش هەبوو کە لە لەشی بنیادەم دا هەبوو. باش دەی‌زانی ئەو کرمە لە کۆڵی نابێتەوە.

بەیانی بە خۆشحاڵی و پێکەنینەوە بەرچایی‌یان خوارد. هەتاو تەواوێك هەڵکشیبوو کە حەمەدۆك هەستایە سەرپێ‌و گوتی:

"ئەمن دەبێ بڕۆم. گەردنم ئازاکەن. لەوانەشە هەتا قیامەت یەکتر نەبینینەوە".

خەنجەرو دووربین و فیشەکدانەکانی هەڵگرتن و لە پێش بەتال ئاغای دانان:

"ئەمانە با لەنێو هۆبەدا بمێنن, بەڵکوو ڕۆژێك لە ڕۆژان حەمەدۆکێك ڕێی دەم هۆبەیە کەوت. ئەودەم ئەمانەی بدەیەو پێی بڵێ ئەمانە هی ئەو حەمەدۆکەن کە ڕۆیشت و بێ‌خەبەر چووو ناوو ناوبانگی ون بوو".

چاوی بەو فیلینتایە کەوت کە ڕۆژی پێشتر خەڵکی هۆبەکە بەدیاری دابوویانێ و هەروا لە عەرزی کەوتبوو, چوو ئەویشی لەگەڵ فیشەکدان و دەمانچەو خەنجەرەکان هەڵگرت و هێنانی لەبەردەمی بەتال ئاغای دانان و بە پێکەنینەوە گوتی: ئەمانەش هەر بۆ ئەو حەمەدۆکە کە دوای ئەم حەمەدۆکە دێ.

کەل و پەل و دیاری‌یەکانی دیکەی لە خورجێنەکە هاویشت و خورجێنی بەشانی‌دا داو لە تاوڵێ وەدەر کەوت. لە دەرێ هەموو دانیشتووانی هۆبەکە لەپێش چادرێ کۆ ببوونەوەو چاوەڕێ‌یان دەکرد.

حەمەدۆك گوتی: گەردنم ئازا کەن.

زۆر بە سوپاس و میهرەبانی‌یەوە چاوێکی لێ‌کردن و وەڕێ کەوت. هەموو دانیشتووانی هۆبەکەو لە سەرووی هەموانەوە بەتال ئاغا, قاسم و دەمیرو ناودارانی دیکەی هۆبەو ژنان و

منداڵان و بەساڵداچووان هەتا جارە خەڵەنگێك كە بە گڵۆوكە سوورەكانیەوە شەپۆلی دەدان و یەكەم جار حەمەدۆكیان لەبن گوێنییەكانی وێ دیتبووەوە, لەگەڵی چوون.

حەمەدۆك بێئەوەی ئاوڕ بداتەوە هەتا لێرەواری هات. لەو بەردەلآنە كە لێی بریندار ببوو بایدایەوەو لە لێواری چۆمی لەسەر بەردێك دانیشت و لەو هەنارانە كە دایەحۆری لە دەڵیجەقۆیاخەوە بۆی هێنابوون یەكێكی لە خورجێنەكە دەرهێنا. دەستی بە هەنارەكەدا هێناو بۆنی پێوە كرد. توێكڵەكەی پچڕی و تفی كردەوە. لەسەرەخۆ توێكڵەكەی لاداو بێئەوەی بهێڵێ یەكێك لەو دەنكە لووس و درشت و بریقەدارانەی بكەوێتە سەر زەوی هەنارەكەی خوارد. پاش ئەوەی دەستی لە ئاوی چۆمەكەدا شوتنەوە هاتەوەو دووبارە لە جێی خۆی دانیشتەوەو لەگۆ فكران ڕاچوو. نەیدەزانی دەبێ بچێتە كوێ و چ بكا. داخوا چوویایە هەركوێیەك مستەفا كەمال پاشا نەیدەدیتەوەو لەداری نەدەدا؟ لەولاشەوە قسەكانی بەتال ئاغای لەبیر نەدەچوون. ئەو قسانە بەجۆرێك كاریان تێكردبوو كە خەریك بوو بگەڕێتەوەو نیوەشەوێ بەتال ئاغا لەخەو هەستێنێ و پێی بڵێ: حەمەدۆكێك بڕوا هەزاری دێتە جێ, و ئەمجار تاو داتە تفەنگەكەی و بڕوا. ئەم قسەیە گیانێكی دیكەی بەبەردا كردبوو و ئەوی كردبوو بە ئینسانێكی دیكە. لەدڵی خۆی دا گوتی: داخوا مەلافەرهاد لەو بارەیەو بیروڕای چیە؟ داخوا مەلافەرهادیش وەك بەتال ئاغا بیر دەكاتەوە. دەبێ بچێتە لای دایەحۆری و گەردنی خۆی پێ ئازا بكا. داخوا دژكردەوەی وی لەبارەی ئەوە كە دەیەوێ یاغییەتی وەلا بنێ, چ دەبێ؟ هەنارێكی دیكەی لە خورجێنەكە دەرهێناو بەدەم بیركردنەوەوە خواردی. دوای ویش هەنارێكی دیكەی دەرهێنا. سێ هەناری تێدا مابوون. نیازی وابوو نەیان خواو بۆ دایەحۆرییان بەرێ.

دەوارنشینەكان خورجێنەكەیان پڕ كردبوو لە توێشووی ڕێگا. بەشی سێ ڕۆژی دەبوو. لەنەكاو یەقێكی هاتەوەبەرو ئارەقێكی ساردی دەركرد. ڕوانیە دەوروبەری خۆی. خۆی لە بۆشاییەیەكی باوەڕپێنەكراودا بەدی كرد. نەبوونی شتێكی لەتەنیشت خۆی هەست پێكرد. لەنەكاو تێگەیشت كە تفەنگی پێنیە. ترسا. ئێستا ئەگەر تووشی چەتەیەك یان جەندرمەیەك بووایە چیی پێ دەكرا؟ بەتایبەتی كە لە شوێنێكی بەرئاوەڵاو بێدیفاع دانیشتبوو, وەك گەوج و نەفامان خەریكی هەنارخواردن بوو. هەر هەستاو خۆی بەنێو لێرەواری دا كرد. فكری وابوو لە جێیەكی چەپەك دانیشێ و شەوێ وەرێ بكەوێ و نیوەشەوێ لە دەركەی ماڵێ دایەحۆری بدا. مەڵێ دایەحۆری, بڵێ باقەگوڵ. دایەحۆریی باش دەناسی و دەیزانی كە وەختێك لە بڕیاری حەمەدۆك ئاگادار بێ, بەچاولێمۆڕكردنەوە بۆلای دێ و هاوار دەكا: حەمەدۆكە ژنانیلە! ئەو فەقیرو هەژارە, سەیران, وەسمانەزلەو ئەو خەڵكە چارەڕەشەت بەجێ هێشتوە, دەچیە كوێ؟ پاشانیش وەك شێر دەنەڕێنێ و دەڵێ: ئەو كارەی كردووتە هەتاسەر لەسەری بڕۆ.

## (١٩)

وەختی بانگی خەوتنان بوو کە حەمەدۆك گەیشتە بەردەلانەکەی ئەولای ئاوەدانی. بایەکی ساردی دەهات، کەمێکی سەرما بوو. لەپڕ لەلای ئاوەدانی ڕا بۆنێکی ئاشنای بەر لووتی کەوت. لەمێژ بوو بۆنی دێی لەبیر چووبووەوەو تا ئێستا لە هیچ کوێیەك بۆنی وا ئارام بەخشی بەبەر لووتی هەڵلا نەهاتبوو. بەم بۆنە دایکی، خەجیج و سەیرانی وەبیر هاتنەوە. منداڵەکەی ئێستا لەکوێیە؟ پوورە ئیراز بردوویەتە کوێ؟ لەو ڕۆژەوە تا ئێستا هەرچەندی هەوڵی داوە نەیتوانیوە سۆراغیان بکا. لە ئاوایییەوە جاروبارو دەنگی سەگوەڕ دەهات. خۆی دایە پەنای گابەردێك، بەم جۆرە هەم بایەکەی وێ نەدەکەوت و هەم خەڵکیش نەیان دەدی. ئاخر ئەم دێیە جەندرمەو شۆفاری زۆر بوون. ئاسمان یەك بەر ئەستێرەی لێ ڕاخرابوون. چەند لەحزەیەك لە ئەستێرانەوە ڕاما. ئاسمان وەك دەسرۆکەیەك دەچوو کە گوڵدۆزی کرابێ. بە منداڵی لەم بەردەلانە تەڵەی دادەناو لە شەوە بەفرەکان دا هەتا بەیانی خۆی مات دەداو لەسەرمان هەڵدەلەرزی. یەکەمین دەڵەك کە گرتی عەبدیخان لێی ئەستاند. ئەو، دەڵەکە گەورەکەی بەو چاوە درشتانەیەوە هەر بە تەڵەکەوە بردبووە نێو دێ. هەموو خەڵکی دێ لە دەوری دەڵەکەکە کۆ ببوونەوە. دەڵەکەکە زۆر ترسابوو، بە تەڵەکەوە دەلەرزی. ئەودەم عەبدیخان دەڵەکەکەی بە تەڵەوە لێئەستاندو کەوڵەکەی دا بۆی لە یەخەی باڵتاوەکەی بدروون. لەگەڵ ئەوەی زۆری هەوڵ دا نەیتوانی تەڵەکەش وەربگرێتەوە. کە بیری لە عەبدیخان کردەوە لە هەناوی خۆی دا هەستی بە بۆشایییەك کرد. خەجیج و منداڵیی خۆی و دایکیی وەبیر هاتنەوە. بۆشایی هەناوی هەر دەهات و بەبڵاوتر دەبوو. سەیران هات باریك وەك توولەنەمام، بەچاوە ڕەشە گەورەکانیەوە، بە قووڵکەی سەر گۆناکانیەوە، جانانەو جوان بەرامبەری ڕاوەستا.

تامەزرۆیی‌یەکی شێتانە کەوتە هەناوی حەمەدەوە. لەو ساتەدا, لەو جێگایە, لەبن ئەو ئەستێرانەدا دەبوو سەیرانی لەکن بایە. داخوا سەیرانیش ئاوا تامەزرۆی وی بوو؟ کێ دەزانێ؟ لەوانەشە پێی وابێ حەمەد مردوە. بەخۆشحالی بیری کردەوە. حەتمەن تا ئێستا دایەحۆری خەبەری پێداوە. پێش ئەوەی بچێتە ئەو شوێنە کە دەیەوێ لێی بژی, سەیرانێش هەڵدەگرێ و لەگەڵ خۆی دەباتە وێندەرێ. بەڵام چۆنی دەتوانی بچێتە لای سەیران. جەندرمەکان هەرگیز چاو لە دێیەکە بەتایبەتی لەماڵێ‌وان وەرناگێرن.

یەکێك لە سەرەتایی‌ترین شێوەکانی کاری جەندرمە بۆ راوی چەتەکان لەژێر چاوەدێری خستنی ماڵی دڵدارەکانیانە. بابایەکی چەتە هەرچەندیش پڕ هێز بێ دیسان ئینسانەو لەگەڵ ئەوەی دەزانێ چ چارەنووسێك چاوەڕێ‌یەتی, خۆی پێ ڕاناگیرێ و سەرەنجام شەوێك خۆ بە ماڵی خۆشەویستەکەی دا دەکا, بەڵام پێش ئەوەی دڵدارەکەی ببینێ, لەپێش چاوی وی لەخوێنی خۆی‌دا دەتلێتەوە. حەمەد بۆڵاندی: رێگایەك بۆ دیتنی سەیرانێ دەدۆزمەوە. هەرچەندی زیاتر بیری لێ‌دەکردەوە زیاتر تاسەی سەیرانێی دەکرد. دەیەویست بێ ماتڵ بوون هەموو ئاکامەکانی ئەو کارە لەخۆی بگرێ و بکەوێتە رێگاو بچێتە گوندی وایوای. جەندرمەکان ئەم رۆژانە چاوەڕوانی ئەوە نین ئەویان لە وایوای بەرچاو بکەوێ و ماڵێ سەیرانێ ناخەنە ژێر چاوەدێری. وەبیری هاتەوە کە چەکی پێ نیە... ئەگەر چەکی پێ بایە باشترین وەخت بوو بۆ ئەوەی بچێتە لای سەیران. لەوانەیە دیسانیش بتوانێ بە خۆگۆڕین بچێتە وێ, هەروەك ئەوەی لە چوکووراوا کردی. ئەگەر پانتۆڵێکی رەش لەبەر بکاو جووتە یەمەنی‌یەکی پاژنەنووستوو بەسەر پێوە بکاو کڵاوگەڕگەڕی‌یەك لەسەر نێ و لێوارەکانی هەتا سەر چاوانی بێنێتەخوار کێ دەتوانێ فکری بۆ ئەوە بچێ کە لەوانەیە حەمەدۆك بێ... خۆ لە نێوچاوانێی نەنووسراوە حەمەدۆك. سمێڵەکانیشی دەتاشێ. لەجێ‌دا تا ئێستا کەس چەتەی بێ‌سمێڵی دیوە؟ سەیران بە دیتنی لەپێش دا دەسڵەمێتەوەو ئەمجار لە خۆشی‌یان شێت دەبێ و بەجۆرێك لە باوەشی خۆی دا دەی‌گوشێ کە قرچەقرچی لە ئێسکان دێنێ. پاشانیش دەچنە گوندەکەی وان کە هەمووی شاخ و داخە, منداڵێکی زۆریان دەبێ. بۆچی سەیران تا ئێستا منداڵی نەبووە. ئاکا نەزۆك بێ؟ تۆ بڵێی وابێ؟ باشە, با وابێ. بەپێکەنینەوە بیری کردەوە: سەیرانیش نەزۆك بێ حەمەد بۆخۆی منداڵێکی هەیە... بەهەرحاڵ رۆژێك لە رۆژان لەهەر کوێ‌یەك بێ کوڕەکەی دەبینێتەوە. ئەگەر ئەویش نەی‌توانی وەی‌بینێ, کوڕەکەی رۆژێك بابی خۆی دەبینێتەوە. ئیراز وەك چاوی خۆی ئاگاداری دەبێ. لەو بارەیەوە هیچ گومانی نەبوو. پاش ئەوەی کەڵەبابی نیوەشەوێ خوێندیان و بێدەنگ بوون لەپاش بەردەکە هاتەدەرێ. دنیا هێشتا سارد بوو. بەو رێگا چۆڵانەدا کە بۆخۆی شارەزا بوو چووە نێو دێ و وەك

پشیلەیەك بێهەست و خوست گەیشتە بەردەرکی ماڵێ دایەحۆری. لە دەلاقەیەکی چووکەڵەوە تەماشای کرد. دایەحۆری هێشتا چرای دایسا. دایەحۆری مەقەڵێیەکی دەنێو لاقانی گرتبوو, سەری بسەر سنگیدا بەردابووەوەو لەفکرەوە چووبوو, لەوانەشە لەوکاتەدا خەوی لێ‌کەوتبێ.

بەسپایی لە دەرکەی دا. دایەحۆری بە بیستنی تەقەی دەرگا هەستایە سەرپێ. بەگێژی و سەرسوڕماوی تەماشای چەپ و راستی خۆی کرد. جاری دواتر کە حەمەد لە دەرگای دا, دایەحۆی بەرەو دەرگا غاری دا. کە چاوی بە حەمەد کەوت گوتی:

"دەم زانی ئەمڕۆ دێی, چاوەڕوانی هاتنت بووم, بۆیە هەر دانیشتبووم".

یەکتریان لەئامێز گرت.

"وەرە ژووری".

"بەچی ڕا دەت زانی؟"

"دەکرێ نەزانم؟ ئەسپێکی شێتت هەیە ها؟ ئەمن چووزانم, هەموو کەس دەڵێ ئەسپی تۆیە. خەنەیی‌یەکی زۆر جوانە"

"ئەوە ئەسپی منە"

"ئەو ئەسپە سەگباب خێوە سێ رۆژە بەیانی و ئێوارێ دێتە دەرکی ماڵێ. مل بەلاوە دەنێ و هەرلەوێ ڕادەوەستێ, کە ئەمنیش دەمەوێ ئاوو جۆی بۆ بەرم رادەپەڕێ, کلکی هەڵدەگرێ, دەفڕێ و دەڕوا. لەوەڕا زانیم ئەتۆ دێی"

"ئەسپەکە پێی گوتی؟"

دایەحۆری لە حالێك دا مستێکی لە پشتێ دەدا بە خۆشحاڵی‌یەوە گوتی:

"سەگباب, مەیکە گاڵتەبازاڕی"

"ئەسپەکەم چیی بەسەر هاتوە؟"

"تۆ ڕەبی ئەسپەکەت زەلیل بێ... ئەوەندەی لەبەری پاڕامەوە کە..."

"چیت لێ داوا کرد, بەقسەی نەکردی؟"

"چم لەو بەرازە ڕەشە دەویست؟ عەلی‌یەشەل لێرە بوو, بە ئەسپەکەم گوت ئەم کابرایە دوژمنی خوێنیی حەمەدۆکی خاوەنتە, لەبن پێت دا بێپلێشێنەوە, وردوخاشی کە, بەڵام ئەو بەرازە ڕەشە چاویشی لێ‌نەکردم, پاشانیش پەژیوان بووەوەو لەبەر دەرکی ماڵەکەم کەوتە پاڕانەوە. ئەمنیش لەبەر خاتری تۆ ئاوو جۆم بۆ لە دەرو دراوسێیان وەرگرت و بۆم برد بەڵام نە ئاوی خواردەوەو نە دەمی لە جۆیەکە دا".

حەمەد لە حالێك دا دەستی لەشانی وی دەدا گوتی:

"ئەتۆش حەوسەلەت هەیە دایە, خۆ ئەسپ لە زمانی ئێمە حالّی نابێ".

دایەحۆری لە حالێك دا دەیگوت: بەلاّم ئەو حالّی دەبێ, سەری بردە بن گوێی حەمەدو چەند شتێکی بە گوێ دا چپاند:

"ئەو لە هەموو شتێك حالّی دەبێ, تێگەیشتی؟"

حەمەد گوتی:

"تێگەیشتم".

بە ماندوویی و شەکەتی لەسەر دۆشەکێك کە دایەحۆری لە پێشی ژوورەکە رایخستبوو, دانیشت:

"عەلیەشەل لێرەیە؟"

دایەحۆری لەکاتێك دا چاوەکانی بریسکەیان دەدا پرسی:

"دەتەوێ بیکوژی؟ دەتەوێ بیکوژی, وەنا؟"

"دایەحۆری ئەمن تازە وازم لە یاغیگەری هێناوە. عەلیەشەل لێرەیە؟"

"هەتا دوێنێ لێرە بوو. بیستوتە کۆلێکی پارە بە خانووەکەی عەبدیخان داوەو کڕیویەتی؟ ئەو لە شارۆچکەی بووە بە گزیری کابرایەك. چەکمە لەپێ, شەبقە لەسەر, ماوزەرێکی وەك ناوێنە بەشانەوەو ئەسپێکی عەرەبی لەبن پێدا... پێنج رۆژی تەواو بە کوێرایە چاوی من قیت و قنج لەنێو دێ دا سووڕایەوە, وەك ئەوەی بڵێ: کێوە چووکەکان ئەمن دروستم کردوون و گەورەکانیش بابم. منەتی بەکەس نەبوو"

"مندالّەکانی عەبدیخان چیان بەسەر هات؟"

"لەدێی باریان کرد, دارونەداریان بەجێ هێشت و چوونە شارۆچکە. مندالّی ئەو عەبدیخانە کە رۆژێك وەك کێو دەینەڕاند ئێستا چوون بەستەزمانە لەوێ دوکانیان داناوە. زگم پێیان سووتا, ئەتۆ نەخۆش بووی لەبیرم چوو بڵێم, وەختێك لەئاوایی دەڕۆیشتن بەستەزمانانە چاویان ببوو بە گۆمی خوێن, دەگریان. هەموو خەلکی دێش بۆیان گریان. وەختێك عەلیەشەل خانووەکەیانی کڕی, دەت گوت خەنجەری لە دلّی خەلکی ئاوەدانی داوە. خانووی عەبدیخان, خانێکی وا گەورەو گران بوو بە هی عەلیەشەل, بوو بە هی عەلیەشەل, گوێت لێبوو حەمەد, گوێت لێبوو؟

حەمەد گوتی: گوێم لێبوو دایە, چاکم گوێ لێبوو.

"ئەو ژنە بێکارەیەی عەلی‌یەشەل بەخۆیو یازدە منداڵی لیکنەوە چوون لە خانووی ئاغازێڕەی خۆمان دا دانیشتن. ئەمەشت بیستوە؟"

"زۆر چاکم بیستوە دایە".

"لە دێی دا دوکانێك کراوەتەوە, خاوەنەکەی خەڵکی دارندمیە, زۆریش پیاوی چاکە, ناوی مەولوودە گۆدمیە, مەولوودئاغا زگێکی هەیە ئا...ئەوەندە. ئەدی زۆر پیاوی چاکە, دوکانەکەشی پڕپڕ لە شتومەکە. قوماشی گوڵباسمەیی و ئاوریشمی, زەنگیانە, ئاونەباتی رەنگاورەنگ, کەوش, خوێ, ئاڵەت, قەند... هەرچی بتەوێ. ئەوەی لە دوکانی مەلوودەفەندی هەیە لە شارۆچکەش دەست ناکەوێ. زۆریش پیاوی چاکە هەرکە لە دوورەوە چاوی بەمن دەکەوێ دێتە پێشەوەو دەڵێ: فەرموو دایە. بانگم دەکاتە دوکانەکەی, بەدەستی خۆی قاوەم بۆ دروست دەکا. لەکەسیش داوای پارە ناکا. ئەوانەی پووڵیان هەیە دەیدەنێ و ئەوانەی نیانە لەدەفتەردا دەی‌نووسێ. دوکانەکەی وەك خەڵێفەمێش پاك و خاوێنە. تەنانەت خەڵکی دێیەکانی دیکەو دەوارنشینەکانیش لە کوێستانێ ڕا دێن شتی لێ‌دەکڕن".

پاشان داهاتەوە بن گوێی حەمەدو بەسپایی پێی گوت:

"کەس لێت نەزانێ, هەربۆخۆت بزانە, دەڵێن حکوومەت ئەوی لەبەر تۆ ناردوەتە ئێرە. ئەمنیش لێی بەشکم. چاوەکانی خائین دیارن! ئەمن لەو جۆرە بنیادەمانە کە زۆر پێ‌دەکەنن و لەگەڵ هەموو کەس خۆ رێك دەخەن, دەترسم. لەوەتا عەلی‌یەشەلیش هاتوە شەوو رۆژ پێکەوە سرت و خورتیانە. لەپاش ئەو وەختە ئیدی قینم لێی دەبێتەوە. جارێکیشیان لە کاتێك دا لامەلامەی لەبەر من دەکرد بەزۆڵەتی لەتۆی پرسی. ئەمنیش گوتم: ئا حەمەدۆکی دەڵێی؟ ئەو لەو دەورویەرانە نیە. گوتم دەڵێن چووەتە حەڵەب. وەختێك ئەمەی بیست لەفکرەوە چوو, وا لەگژ فکران ڕاچوو, هەر مەپرسە. لەوەڕا زانیم پیاوی دەوڵەتە, بەتایبەتی کە هەمیشە لەگەڵ عەلی‌یەشەل سرتەو خەلوەیەتی".

"عەلی‌یەشەل دیسان قەرارە بێتەوە؟"

"ئەمن دەمەوێ سەد ساڵی رەبەق رووی تێ‌نەکاتەوە, رەبی ژێروژوور بێ! ئەگەر بێتەوە دەی‌کوژی, وەنا؟"

"دایە, پێم گوتی ئەمن ئیدی وازم لە یاغیگەری هێناوە... بڕوانە نە تفەنگم پێ‌یەو نە چەك".

دایەحۆری بێدەنگ بوو و ماوەیەکی زۆر تێیەوە ڕاماو پاشان گوتی:

"کەوایە ئەتۆ بێ چەك و تفەنگ هاتوویە نێو دێ. کوڕە دەت کوژن. لەخوا ناترسی, شەرم لە پێغەمبەر ناکەی کە ئاوا دەگەڕێی؟ کوڕە ئەتۆ کەوا بە ڕووت و قووتی دەگەڕێی منداڵێکی دوو ساڵەش دەتوانێ بت کوژێ".

دایەحۆری سەری لێشێوابوو، نەیدەزانی چ بکا. لە ژوورەکەدا هەڵدەسووڕاو هەرچی وەبەر دەستی دەهات لە مووڕەدارو لێفەو دۆشەکەوە بگرە هەتا دەفرو ئامان و سینی و کەشەف هەمووی لەپاش دەرگای ژوورەکە لەسەر یەك دانان.

"ئەوە چ دەکەی؟"

"گەوجی نەفام نابینی چ دەکەم؟ دەرگا قایم دەکەم".

پاشان باڵنجێکی هەڵگرت و بە پەنجەرە چووکەڵەکەیەوە نا:

"با ڕووناکایی نەچێتەدەر".

"دایە جارێ وەرە نەختێك لەلام دانیشە، وەرە دایکە جوانەکەم"

دایەحۆری بە ڕاوێژێکی تێکەڵ بە گاڵتەپێکردنەوە گوتی:

"ئەوە هاتم دانیشتم حەمەدئاغا، هاتم لەکنت دانیشتم حەمەدئاغا، ئەتۆ بەخوێنی سەری خۆت تینووی. وەختێك دەهاتیە ئێرە کەس نەیدیتی؟"

حەمەد گوتی: کەس نەیدیتم.

"خوایە چ بکەم چارم چیە لەدەست ئەم هەتیوەی برایم سوالکەر... ئەمانە ئەوەندە ئەقڵیان نیە کە نابێ بەبێ چەك هەستن بێنە نێو ئاوەدانی... ئێستا ماوزەرێك و توورەکە فیشەکێك لە کوێ پەیدا بکەم بۆی بێنم... خوای گەورە ئەتۆ کە هەموو شتێکت داوە بەم حەمەدە هەتیوە، ئەی خوا چاوگەشە جوانەکەم بۆچی بەقەد دەنکەجۆیەك ئەقڵت نەداوەتێ؟ هاتوەتە نێو دێ کە وەك مەڕ سەری ببڕن..."

دەهات لە تەنیشت حەمەدی دادەنیشت، دەیبۆڵاندو هەڵدەستا لە نێو ماڵەکەدا دەخولایەوەو هەرچی وەبەر دەستی دەهات بەپاش دەرگاکەیەوە دەناو دووبارە دەهاتەوە ماوەیەکی درێژ تەماشای ڕوخساری حەمەدی دەکرد، کە دەت گوت تازەی ناسیوە. دووبارە هەڵدەستایەوەو لەنێو ماڵەکەدا دەسووڕایەوە، لەجێی خۆی بەند نەدەبوو.

"ڕاوەستە دایە، بەخوا هیچ نابێ. کەس نازانێ هاتووم"

دایەحۆری بە دەنگێك کە وەك وشەوشی ماری ڕەش دەچوو، دەیگوت:

"گەوجی نەفام، گەوجی نەفام، چما ئەتۆ نەبووی کە گوتت چاوی من ببەستێ و وەك کوێران بە کێوان دا بم گێڕن؟ هەتیو پێت وابوو ئەمن، پێت وابوو دایەحۆری جێی تۆ بە جەندرمەکان دەڵێ؟ هەتیوە چڵمنە، پێت وایە لەبیرم چووە چ بەڵایەکت بەسەر هێنام؟ ڕەبی خوا زەلیلت کا! حەتمەن گوتووتە کە جەندرمەکان ئەمن دەگرن و کەوڵم دەکەن، پێت وابوو دایەحۆرییش خۆی

پێ ڕاناگیرێ و جێگاکەتیان پێ دەڵێ، بەڵێ؟ هەتیوە ڕیخنە ـ لە حاڵێك دا بە مست لە سنگی خۆی ڕادەکێشاـ بەمن دەڵێن دایەحۆری، تێگەیشتی؟ دایەحۆری... بەمن دەڵێن دایەحۆری. ئەگەر گۆشتی لەشمیان ئەنجن ئەنجن کردبایە، ئەگەر چاوەکانمیان هەڵکۆڵیبان ئەمن... ئەمن چما دەکرا ئەمن جێگای تۆ، جێگای کوڕەکەم، نووری چاوەکەم بەوان بڵێم؟"

"دایە ئەمن نەم گوتبوو چاوانت ببەستن، ئەمن کاری وام نەکردوە"

"چما ئەوان ڕەفیقی تۆ نین؟"

"نا دایە، کێ گوتوویە ڕەفیقی منن. وەختێك بریندار بووم و لەهۆش خۆم چووم، ئەوان لەوێ دیتیانمەوە. چاوبەستن داب و شوێنی کۆچەرییانە".

"هەی گووم کردە داب و شوێنەکەیان"

"گووی تێکە دایە، باشە گووی تێکە"

"ئێستا، ئێستا، ئێستا چ بکەین؟ ئێستا ئەگەر جەندرمە ماڵەکەیان گەمارۆدا چی؟"

حەمەد کەوتە فکرەوە، چۆن توانیبای دایەحۆرییە قانیع بکا کە ئەمشەو گیروگرفتێکی تووش نابێ؟ سەرەنجام گوتی: جەندرمە سۆراغیان لە هیچ کوێ دیار نیە. کەس ئاگای لێنەبوو کە هاتمە ئێرە. جەندرمە لە فکری گیانی خۆیان دان. باسی مارو مێرووو ئاسمان و ڕێسمانی کرد، بەڵام بێسوود بوو، هەتا زیاتری قسە دەکرد ترس و نیگەرانیی دایەحۆری زیادی دەکرد، نەك کەم. حەمەد گێژ ببوو، نەیدەزانی بڵێ چی و چ بکا. لە نەکاو فکرێکی بەدڵ دا هات و سێبەری زەردەخەنەیەك بەسەر ڕوخساری دا تێپەڕی و گوتی:

"دایە".

"بڵێ بزانم ناپیاوی نەفام".

"دایە، دایکە جوانەکەم، ئاخر ڕێی تێدەچێ ئەمن بەدەستی خۆم، خۆم لە ئاگر باوێم؟"

"باشە، دەتەوێ چ گوویەك بخۆی؟"

"بڕۆ دەرێ تەماشاکە، ئەسپەکەم لەدەرێیە، لە پشت ماڵێ چاوەڕێیە. برادەرەکانیشم لەو پشتە لەنێو شاخەکانن... ئەگەر شتێك ڕوویدا... خۆ داوێمە سەر ئەسپەکەم، تفەنگیش لە تەنیشت زینەکە لەبەر دەستم دایە".

لەنەکاو ڕوخساری دایەحۆری کرایەوە، ئارام بوو، دەت گوت هەر ئەو دایەحۆرییی تاوێك لەمەوبەریش نیە کە سەری لێشێوابووو دنیای وەسەر خۆی گێڕابوو.

"دەبڵێ کوڕم، کوڕە ئازاکەم، حەمەدی خۆم بڵێ بە دایکی خۆت بڵێ ئیدی یادگاری دوونەی جوان".

"ئەگەر وانەبایە, ئەمن هەروا بەدەست بەتاڵی دەهاتمە نێودێ؟"
دایەحۆری ماوەیەك هەروا بەسەر پێوە راوەستاو ئەمجار گوتی:
"ئۆ رەبی کوێر بم و دەستەکانم شکێن, خۆ ئەتۆ لەبرسان مردی"
حەمەد بەخۆشحاڵییەوە گوتی: برسیمە دایە.
"وەرە یارمەتیم بدە ئەو شتانەی بەپاش دەرگامەوە ناون لەجێی خۆیان دانێمەوە".
دایەحۆری ئەوەندەی شڕو شالآت بەپاش دەرگاوە نابوو کە هەتا لای بردن و لەجێی خۆی دانانەوە زۆری خایاند. دایەحۆری کە چێشتی وەسەر دەنا, بەداوای لێبووردنەوە گوتی:
"دەمەوێ رۆنی بچۆقێنم. بەو نیوەشەوە بۆنی رۆنی لە دێی دەگەڕێ و ئاومالّەکان تێدەگەن کە حەتمەن یەکێك هاتوەتە ماڵێ دایەحۆری".
"نان و پەنیرت هەیە؟"
دایەحۆری گوتی: هەنگوینیشم هەیە.
"ئێستا کەوایە سبەینێ چێشتێ لێنێ. ئیشتیام لە دۆینەی دەستی تۆیە".
دایەحۆری مەنجەڵەکەی لەسەر ئاگر لابرد, سفرەی هێنا, لەپێش حەمەدی راخست و گوتی:
"سەرشیرمان هەیە, ئەمرۆ بەیانی دروستم کردوە"
"خۆش بی دایە".
هەتا حەمەد نانەکەی خواردو لێبووەوە قسەیەکیان نەکرد.
"دایە ئەمن لەمەولا ئیدی واز لە یاغیگەری دێنم".
حەمەد دوای ئەم قسەیە چاوەڕوان بوو دایەحۆری یەخەی بگرێ و بلێ: بۆکوێ, بۆکوێ دەچی؟ کوێ؟ حەمەدۆکی ترسەنۆك بۆ کوێ. لەو حاڵەدا داخوا ئەو سووکایەتییەی پێ قبووڵ دەکرا؟ چما پێش کوشتنی عەبدیخان داستانێکی لەو بابەتەی بەسەر نەهات؟
"دایە, دەمەوێ سەری خۆم هەڵگرم و لێرە برۆم, بچمە جێگایەك کەس ناوونیشانیشی نەزانێ. تێکەڵی ژن و منداڵ دەبم. حەمەدۆك دەمرێ. دەمەوێ ناوی خۆم بگۆڕم".
حۆری ئارام و بێدەنگ بێئەوەی دژکردەوەیەك لەخۆی نیشان بدا, رووبەڕووی حەمەدۆك دانیشتبوو و گوێی بۆ راگرتبوو.
"دایە! عەبدیخان مرد هەمزەکەچەڵ هاتە جێگای, هەمزە مرد جێگاکەی... عەلیسەفابەگ مرد... دایە! ئەم دنیایە ئاغای زۆر تێدان, زۆرن دایە..."
حۆری بێدەنگ و بێئەوەی قسەیەك بکا گوێی دەدایە قسەکانی.

"حەمەدۆکیش ئەگەر بمرێ، زۆر حەمەدۆکی دیکە دێن. ئاغاکان لە حەمەدۆکەکان کەمترن. حەمەدۆکێك بمرێ، هەزار دەهەزار سەدهەزار حەمەدۆك جێگای دەگرێتەوە، ئەمنیش نەبم هیچ گرنگ نیە..."

حەمەد لەبنەوە تەماشای وی دەکردو دەیەویست دژکردەوەی وی هەڵسەنگێنێ. حۆری وەك بەرد بێدەنگ بوو، بێ‌ئەوەی گۆڕانێك بەسەر هێڵەکانی دەم و چاوی دا بێ گوێی دەدایە قسەکانی.

"بچیە سەرێ و بێیە خوارێ ئاخرو ئاقیبەتی کاری چەتەیی گوللەیەکە، وانیە دایە؟"

چاوەڕوانی قسەیەکی وی بوو، بەڵام دایەحۆری بێدەنگ بوو. نە قسەیەکی بەدەم دا دەهات و نە چووکترین دژکردەوەی لەخۆی نیشان دەدا.

"دەچمە دێیەکی چەپەك، زەوییەکی لێ‌دەکڕم. نەختێك پارەم هەیە، خانوویەك دروست دەکەم. ناوی خۆشم دەنێم برایمەڕەش یان برایم سوالکەر، باشە؟ منداڵم دەبن. تێگەیشتووم چەتەیی کاری من نیە. ئەمنیش وەك بابم وام. لەسەرم دە، نانم لەدەست بڕفێنە، بنیادەمێکی دڵنەرمم. پیاوکوشتن کاری من نیە. زۆرم بیر لێ‌کردوەتەوە، ماڵێك کە خوا دروستی کردوە هەر بۆخۆی دەتوانێ وێرانی بکا".

حۆری کە سەری داخستبوو پرسی: ئاوت دەوێ؟

"زۆر سوپاس دایە. هەروەك ئەتۆ زگت بە عەبدیخان دەسووتێ... ـ تەماشایەکی روخساری دایەحۆریی کرد ـ ئەمنیش زگم بە عەبدیخان و عەلیسەفابەگ دەسووتێ".

دایەحۆری چاوی لێ‌مۆڕ کردەوەو گوتی:

"وست بە سەگباب! ئەمن نەم گوت زگم بە عەبدیخان دەسووتێ، زگم نە بە عەبدیخان دەسووتێ و نە بە عەلی سەفابەگ، ئەوان ئەو ماڵە نین کە خوا دروستی کردوە، ئەوان ماڵێکن کە شەیتان دروستی کردوە. ماڵێك شەیتان دروستی کردبێ، بنیادەم دەبێ وێرانی بکا، بنیادەم بۆخۆی..."

"ئەمن دەمەوێ لێرە بڕۆم بچمە ئەو خوارە بۆ چوکووراوا، سەیرانێ هەڵگرم و بچمە جێگایەك کە کەس ناووناوبانگی نەبیستبێ. دەمەوێ ببمە برایم سوالکەر".

"کوڕی خۆم دنیا پڕ لە برایم سوالکەرە، لەوە ئاسانتر، لەو دنیایەدا لەوە ئاسانتر نیە کە پیاو ببێتە برایم سوالکەر".

قسەکانی دایەحۆری کاریان لەناخی دڵی کردو ئەویان گۆڕی. بە راستییش دنیا پڕ بوو لە کەسانی وەك بابی کە کاریان بە کاری هیچ شتێك و هیچ کەس نەبوو.

"کوڕم حەمەد! شتێکت پێ بڵێم, شتێکت پێ دەڵێم بەڵام لێم عاجز مەبە, باش؟ راستە ئەتۆ لەمن نەبووی, بەڵام لە دایکت و برایم سوالکەری بابت زیاترم زەحمەت پێوە کێشاوی. هەر لەبەر ئەوەش لە قسەکەم دڵگران مەبە. ئەمن تاقە نینۆکێکی حەمەدۆکی مردوو بە سەد هەزارو سەدهەزار برایم سوالکەر ناگۆڕمەوە".

"کەوایە ئەتۆ دەڵێی ئەمن نابێ واز لە چەتەیی بێنم؟"

دایەحۆری رقی هەستاو گوتی:

"ئەمن قسەی وام نەکردوە, گیان, گیانی خۆتە کوڕم - دەستەکانی دەلەرزین و ماسولکەکانی دەم چاوی دەبزووتن - لێدە بڕۆ, ئەمە عەرزو ئەوە گەز".

"لە چوکووراوا..."

"تێگەیشتم, ئەتۆ لەگەڵ کچێك زەماوەندت کردوە, چما وانیە؟ عەلیەشەل بە دراوسێکانی گوتبوو. کچەکە زۆر جوانە. باب و براکانیشی وەك پڵنگ وان".

"بەڵێ دایە, زەماوەندم کردوە"

"خوا پێوقەدەمی مەبارەك کا. گوتت کەنگێ, کەنگێ دەتەوێ بچیە چوکووراوا؟"

"سبەو دووسبەی".

حۆری بێدەنگ بوو. مووی لەشی راست بوونەوەو راوێژی قسەکردنی توند بوو:

"کەنگێ؟ گوتت کەنگێ؟"

لێوەکانی گرژ بوون و لەرزین. حەمەد شارەزای ئەم حاڵەتە بوو. دایەحۆری وەختێك لێوی دەلەرزین دەبوو بە پڵنگێك. هەربینا تەقیەوە بەڵام مەعلووم نەبوو بۆچی هێشتا بێدەنگ بوو. حەمەد چاوەڕوانی تەقینەوەی رقی دایەحۆری بوو. دایەحۆری وردە وردە ئارام دەبووەوە.

"کوڕم, دوژمن لە پشت ماڵی سەیرانی چاوەڕوانتە. دوور لە چاوی خەڵك و لە تاریکەشەوێکی بارانی دا کە چاو چاوی نابینێ, چۆن دەڵێی کەس ئاگای لە هاتنت نەبووە لەبەر بارانێك کە جێی وشکی لە لەشت دا نەهێشتوە بێ هیچ ترس و خۆفێك دەچیە نێو کەمین. دەوری ماڵی سەیرانێیان گرتوەو هەزاران چاو چاوەڕوانتە, بێدەنگ و بێ هیچ هەست و خوستێك. شەڵاڵی بارانی شەوێ دێی, دیواری ماڵەکانی چوکووراوا قامیشەو سەربانەکانی چرپ و چاڵ.

بارانی گوللە دەبارێ و هێشتا ناوی سەیرانێت نەهێناوە, گیانت دەردەچێ. کچی خەڵکی بۆت دەگری, بەڵام ئەوە دایکە کە دەسووتێ و دایکە کە بەکوڵ دەگری, ئەتۆ دەتەوێ ئەمنی پیرو بێحاڵ ئەو

ڕۆژانە ببینم... لێدە بڕۆ, هەرکوێت پێخۆشە بچۆ. پێت خۆشە برایم سوالکەر بەو حەز دەکەی "وەلی لایەجی", کێت پێخۆشە ئەو بە, بەڵام مەمرە. کوڕم مەیەڵە بۆت بگریم. لەدایك و بابت زیاترم هەق بەسەرتەوە هەیە... ئەتۆش ئینسانی چاکی. دەزانم دڵت نایە مێروولەیەکیش ئازار بدەی, ئەگەر ئەمن نەت ناسم کێ دەت ناسێ گوڵەکەم؟ کوشتنی عەبدیخان و عەلی سەفایان لەنێوچاوانێ تۆ نووسیوە. ئەتۆ ناتوانی لەبەر چارەنووس رابکەی, لێدە بڕۆ, ئۆغرت خێر بێ, ڕێگات بێخەتەر بێ. بڕۆ لەپێش چاوان ون بە, بەڵام خۆت مەخە کەمینی دوژمنەوە.

"دایە, قسە ناکەی, لەبەر خۆتەوە دەڵێی چی؟"

دایەحۆری ڕەنگی ڕەش داگیرساو ڕاست بووەوە:

"بێمێشك. خوایەگیان ئاخرو ئاقیبەتی چ دەبێ؟ ئەم کوڕە نابێتە بنیادەم... کوڕی خەلکی ئەگەر بەساڵدا دەچێ ئاقڵتر دەبێ. هی مەمانان ئاوا دەردەچێ, گێژو شێت, نازانێ قسەش بکا".

" چ بووە دایە؟"

"گۆڕی بابت بووە. تووتکەسەگ دەیەوێ ببێتە برایم سوالکەر. برایم سوالکەر هەر نەبێ بنیادەم بوو, وەك تۆ بێمێشك نەبوو. خوا بت کا بە قوربانی ئەو ناوە جوانەی برایم سوالکەر".

"لەسەرەخۆ دایە, لەسەرەخۆ, نازانم بۆچی تووڕە بووی, دەست و لاقت ماچ دەکەم ئەتۆ چیتە دایە؟ وەرە ئێرە دانیشە بزانم"

"حەمەدە لەخۆڕیوی قوون نەشۆر دەیەویست ببێتە چەتە. جارێ دەرپێیەکەت هەڵکێشەوە, دوایە بچوو چەتەیی بکە. زۆر چاك دەکەی کە دەتەوێ بڕۆی".

"دایە دەبەرت مرم ئەتۆ چتە؟"

"دایەحۆری لاسای کردەوە:

"دایە چتە, ئەتۆ چتە".

بە پێکەنینەوە لەسەری ڕۆیشت:

"دایە چتە؟ کوڕە بەچکەشێرەکەم ماشەڵڵا هەزار ماشەڵڵا باش فێر بووە بڵێ چتە".

"دایە چتە؟"

دایەحۆری دەنگی هەڵبڕی و دەستی کرد بە هات و هاوار.

"دایە بێدەنگ بە, دایە لە دەرێ گوێیان لە دەنگت دەبێ, دەڵێن بەم نیوەشەوە..."

حۆری دەستی دە کەلەکەی نان:

"با گوێیان لـێبێ، با جەندرمە گوێیان لـێبێ و بت کوژن و ئەمن نەجاتم بێ لەدەست تۆ، ئەتۆ دەتەوێ لەبەر خاتری ئەو سەیرانە جـ... بچیە چوکووراوا نا؟ پێت وایە جەندرمە هەروا سەربەخۆ بەرەڵڵایان کردوە؟ کە چوویە وێ جەندرمەکان لە کەمین دێنەدەرو هێشتا سەیرانت نەدیوە مشوورت دەخۆن. گۆیا تەلیسم و برووسکەت پێن، بەردە برووسکەکەشتمان دی: ئەگەر ناناجیخ سوڵتانی چل چاو فریات نەکەوتبوو بە ساغ و سڵامەتی دەچوویە لای عەبدیخان... ئەمنیش لە پەنا قەبری عەبدیخان قەبرێکی جوانم بۆ هەڵدەکەندی و دوایە دەهاتم بە قەبرەکەشتم هەڵدەمیزت. کوڕە دەت کوژن، وەك بێژینگ کون کونت دەکەن. پێت وایە ماڵی سەیرانێ لەژێر چاوەدێری دا نیە؟"

"تێگەیشتم دایە، دەستت ماچ دەکەم، لـێوەبڕە"

دایەحۆری نەڕاندی: لـێنابڕمەوە.

"دایە پەژیوان بوومەوە، بەخوای دایە ناچمە چوکووراوا، بەخوا تێگەیشتم دەڵێی چی..."

حۆری هات، چۆکی بەچۆکیەوە داو دەستی بەسەر سەریدا هێنا:

"کوڕە ئاقڵ و نازاکەم، کوڕە جوانە رێگرەکەم حاڵی بووە، حەمەدۆکم حاڵی بووە..."

"دایە بەخوا تێگەیشتم، ناچمە چوکووراوا. بێدەنگ بە. وەدوا سەیرانێ ناکەوم. رێگایەك بۆ دیتنی دەدۆزمەوە".

دایەحۆری گوتی:

"ئەسپە شێتەکەت کە لەپشت ماڵێیە دەینێرمە وێ. ئەگەر پێت خۆشە دەتوانین عەلیەشەلی گووسەگی هەزار ڕوو بنێرین. پاشانیش کە ئەتۆو سەیران رۆیشتن دێ شوێنتان هەڵدەگرێ و دەتان بینێتەوە. ئەتۆش راست وەك عەبدیخان دەیکوژی و دوایە ملی کێوان دەگری..."

دایەحۆری بەرەبەرە هاتەوە سەرەخۆ. باشە هەقی بوو. بیری کردەوە کە بۆچی ئەوەندە تووڕە بووە. بۆچی؟ چونکە هێشتا خەفەتی چاوبەستنەکەی لەسەر دڵ مابوو. زەردەیەکی هاتێ. حەمەد سەری بەلاوە نا:

"دایە سەرم مەخەرە سەر توخوا، هاتەلات کە..."

وەختێك حەمەد وەك منداڵی هەتیو ملی بەلاوە نا، دایەحۆری ئاگری لەدڵ بەربوو.

"ئەمن سەیرانێت وەدەست دەدەم، ئەتۆ ئەو کارەی بەمن بسپێرە. ئێستا کە ئەتۆ ناتەوێ بچی..."

"دەمەوێ هەتا زووە بڕۆم دایە".

"کوڕم ئەمن چۆن بەو دەم و دەستە سەیرانێت بۆ بێنمە ئێرە".

"هەر جۆرێك توانیت بیهێنە".

"ڕاوەستە با ڕۆژ وەبێ. مەحموودەخڕەی دەبینمەوە، ئەویش سەیرانێ دەبینێتەوە. پاشان ئەتۆ لە جێیەك چاوەڕوان دەبی".

"ئەمن تا ئەودەم لەکوێ بێنمەوە. ئێستا ئیدی ئەمن یاغی نیم"

"ئەتۆ بچووە بنی جەهەننەمێ، باشە؟"

"باشە، دایە!"

"ئەمن سبەینێ مەحموودەخڕەی دەبینمەوە... ئەتۆش... ئەتۆش..."

دایەحۆری بیری دەکردەوە، دەستێکی لە شانی حەمەدی داو گوتی:

"خوا کوێرت نەکا حەمەد، ئەتۆش بچوو، لای ئاناجیخ سولتانی چل چاو ـ چاوەکانی بریسکەیان داـ بچوو، هەم لەبەر ئەوەی چاکی کردوویەوە دەستی ماچ کەو هەم دوعایەکی لێوەرگرە کە ئیدی گوللەت وێ نەکەوێ. دەچیە وێ، دەستی ماچ دەکەی، دوعایەکت دەداتێ، لەوانەشە دوعات بەسەردا بخوێنێ... ئەودەم ئەتۆش وەك گەنج عوسمان ئەگەر سەرت بکەوێتە بن هەنگلیشت، دیسان نامری"

"لەمەودوا ئەمن دوعام بۆچیە دایە؟"

"هەموو کەس هەمیشە دوعای خانەقای چل چاوی پێویستە، هەم لەم دنیایەو هەم لەو دنیا..."

"باشە دایە، سبەینێ پێش تاوهەلاتێ وەڕێ دەکەوم".

"نا سبەی شەوێ دەڕۆی، سەر لە ئێوارێ، هەر کە تاریك داهات..."

هەتا بەیانی باسی زۆر شتیان کردو قسەیان لە زۆر خەونی شیرن کرد. وەختێك حەمەد ناوی خۆی گۆڕی و بوو بە برایم سوالکەر چ دەکا! کە منداڵیان بوون دایەحۆری هەتا دەمرێ داژداریان دەکاو پێیان دەگەیەنێ. چ دەمێنێ بیکەن؟..."

دایەحۆری گوتی:

"زۆر خۆشحاڵم حەمەد. وەختێك مردم ئەتۆو سەیران جەنازەکەم هەڵدەگرن. ئەگەر لە ماڵی ئێوە مردم، ماڵتان لەهەر کوێ بێ جەنازەکەم بێننەوە ئێرەو لەپەنا قەبری مام دورمووش عەلی بەخاکم بسپێرن، باشە؟"

"باشە دایە".

دایەحۆری وەك گەورە کچێك ڕاست بووەوەو گوتی:

"راوەستە کلاوێکی جوانم بۆ چنیوی. مەرەزە, زۆر نەرمە, گوڵیشم تێهاویشتوون. ساڵێك سۆمایی چاوم لەسەر داناوە. ئەگەر هاتبوومە لات لەبیرم چووبوو لەگەڵ خۆمی بێنم وەرە لە سەرتی نێ, بزانم".

دەرگای سندووقە سەوزەکەی کردەوەو لەنێو بوخچە چل کوتەکە کلاوەکەی دەرهێناو لەسەری حەمەدی ناو گوتی:

"لێت دەکاڵێتەوە. ئەم کلاوە لەسەر نێی کەس نات ناسێتەوە. هێندەی نەماوە رۆژ بێتەوە, با بچم دۆینەکە وەسەر نێم".

دۆینەکەی وەسەر ناو چوو دووبارە سندووقەکەی کردەوە. لەکن حەمەدی جلەکانی داکەندن و ئەو جلانەی کردە بەری کە وەختێك لەلای چادرنشینەکان هاتەوە لەبەری کردن.

"پاش ئەوەی لەکن تۆرِا هاتمەوە ئەم جلانەم لەبەر کردن. ئێستاش ئەمانە دەکەمە بەرم".

حەمەدۆك گوتی:

"خۆش بی دایە, ئەمن ناتوانم چاکەی ئەو هەموو میهرەبانیی‌یەی تۆ بدەمەوە..."

"هەستە برۆ رووحی خۆت نەجات دە, ببە خاوەن ماڵ و منداڵ"

هاتەدەرێ, چووە پشت ماڵێ و وەختێك لە دوور لەسەر لووتکە شاخێکی چووکەڵە تارمایی ئەسپەکەی دی بە خۆشحاڵی غاری دایەوە ماڵێ و گوتی:

"ئەسپەکەت لەوێ وێستاوە".

## (٢٠)

حەمەدۆك و تاژی تەحسین لە "کۆمەکلیك نیبلی" تووشی یەکتربوون، بارانێکی وەك لافاو دەباری. دلۆپە بارانەی درشتە درشتە بە تەپە تەپ دەکەوتنە سەرزەوی. لە چیاو دۆڵەکانەوە لافاوێکی زەردی کەفاوی بە هارەهارێ بەردو مووروە داری لەگەڵ خۆی دێنان و لە بەرزاییەیەوە دەیهێنانە خوار. لێکدالێکدا هەورە تریشقە دەدرەوشانەوەو بریسکە لەو دارەبەرزە جەنگەڵیانەی دەدا کە لەو دەوروبەرە هەبوون.

تاژی تەحسین بە دیتنی حەمەدۆك لە ترسان نەیدەزانی چ بکا. وەك گوناهکارێك کە لە کاتی تاوانەکەیدا دەگیر کەوتبێ سەری لێشێوابوو، نەیدەزانی بۆ کوێ هەڵێ، بە رەنگێکی زەردی وەك زەردەچێوەو بە دەست و لاقێکەوە کە ماسوولکەکانیان رەق ببوون لەوێ لە نێوەڕاستی رێگادا راوەستابوو. باران وەك لوولەمەسینە لە ئەندامی هەڵدەچۆڕاو چاوی لە چاوی حەمەدەوە بڕیبوو. حەمەدۆکیش راوەستابوو تەماشای وی دەکرد: ئەم پیاوە بۆچی هەر کە منی دی ئاوا ترسی ڕێنیشت؟ پاش ماوەیەك تاژی تەحسین هاتەوە سەرخۆی، بە دەم حەمەدۆکەوە پێکەنی و بە راوێژێکی وەك داوای لێبووردنەوە گوتی:

"ئۆغر بێ حەمەدۆك ئاغا".

"کێ، کێ، گوتت کێ؟".

"گوتم حەمەدۆك ئاغام".

"لەگەڵ منت بوو؟"

"ئەی دەتەوێ لەگەڵ کێم بێ، لەگەڵ تۆم بوو ئاغام. لەم دنیایەدا چما جگەلە تۆ حەمەدۆکێکی دیکەش هەیە؟"

حەمەدۆك غافڵگیر كرابوو. هەرچەندی هەوڵی دا خۆی ناشارەزا بكا, نەكرا. ئەم پیاوە ئەوی ناسیبوو. تەنانەت وا دیاربوو باشیشی دەناسێ. لێی پرسی:

"ببوورە, ناوت چیە؟"

"بەمن دەڵێن تەحسین ڕێوی".

"خەڵكی كام دێی؟"

" گەڵی شكۆفە "

"لەو دێیە تاژی تەحسینێكیش هەیە, دەی‌ناسی؟"

"دەی‌ناسم ئەو تاژی تەحسینە خۆمم, ئەمن ڕێوی‌یەكم بۆ خۆم"

حەمەدۆك پێ‌كەنی... چوونە بەر نوای گابەردێك كە لە تەنیشتیان بوو. ئەوێ باران نەی‌دەگرتەوە.

"لە كوێڕا هاتووی, بۆ كوێ دەچی؟"

"لە خوای شاراوە نیە, چ لە تۆ وەشێرم ئاغام, خەریكی قاچاخچیەتیی جگەرەم".

كیسەیەكی ئەستووری مشەممای لە گیرفانی دەرێنا, دەستەكانیی بە گڵ وشك كردنەوە, كاغەز سیگاری لە توورەكەكە دەركێشا, سیگارێكی پێچایەوەو بۆ حەمەدی راداشت. حەمەد ئەو ئەستێ‌و پووشووەشی كە تەحسین بۆی راداشتبوون وەرگرت. پووشووەكە یەكەوجار گرتی. پووشووەكە كە لە هەوای كوێستان دا ئاگری گرتبوو بۆنێكی خۆشی لێ‌هەستا.

"كاك تەحسین, زۆر لەمێژ بوو جگەرەم نەدەكێشا. چەتەیی ئەمەیە ئیدی. ڕۆژێك جگەرەت دەست دەكەوێ پێنجان دەستت ناكەوێ. جگەلەوەش ئەم ژەهرەمارە زۆری زیان هەیە".

تاژی تەحسین گوتی: ئەمنیش جاروبار دەكێشم.

تەحسین لەسەر ئەو بەردە كە لێی دانیشتبوو ئارام و ئۆقرەی لێ‌هەڵگیرابوو, لە جێی‌خۆی بەند نەدەبوو. تاوێك دەترساو تێك دەچوو, دوایە دووبارە خۆشحاڵ دەبوو. پاشان چاوی لە چاوی حەمەدەوە دەبڕی‌و كاتێك حەمەد تەماشای دەكرد چاوی لێ‌وەردەگێڕا. ئەم وەزعە لەبەر چاوی حەمەدۆك ون نەبوو: ئەم هەتیوە كەڵەكێكی لەبن سەردا هەیە, دەبێ بزانم چیە.

"وەختێك ئەمن بریندار بووم, ئەتۆ لە باقرگدیگی بووی؟"

"بەڵێ لەوێ بووم حەمەدۆك ئاغام. ئەسپێك هەیە ئا... ئەویش لەوێ بوو, ئەسپی خەنەیی دەڵێم لەسەر دوندی شاخەكە راوەستابوو, لە جێی خۆی نەدەبزووت, هەر لەوێ وێستابوو"

"بیستم وەختێك بریندار بووم ژنان شیوەنیان بۆ کردم".
"ئەریٚ, وەختێك یاوەر فەرمانی بە جەندرمەکان داو جەنازەی تۆی لیٚوەرگرتنەوە, ئەوانیش جلەکانی تۆیان لەبەرت دارنیٚو لەگەڵ خۆیان بردنە دەشتیٚو سیٚ شەوو رۆژان بەسەریان دا گریان".
"ئەو حەمەدۆکە هیچ وەك من دەچوو؟".
"وەك ئێستای تۆ؟ بە هیچ جۆر وەك ئێستای تۆ نەدەچوو. ئەو بەژنی دوو میتر دەبوو, چاو گەورەو برۆ پڕپشت بوو, روخساری تاوەسووت بوو, پیاوێکی زل و ناقۆڵابوو".
"خەڵکی گەڵی شکۆفە لە منداڵی حەوتساڵەوە تا پیری حەفتا ساڵە هەموویان من دەناسن. چۆن بوو بە هەڵەچوون؟"
"کەس بە هەڵە نەچوو حەمەد ئاغام. تەنانەت ئەمنیش پێم وابوو ئەو کابرایە حەمەدۆکەو برایەوە".
حەمەد پیٚکەنی: زۆر شتێکی سەیرە.
تاژی تەحسین بۆی سەلماند:
"بەڵیٚ زۆر سەیرە, ئەو پیاوە لە تۆ زیاتر وەك حەمەدۆك دەچوو, تیٚگەیشتی؟"
"تیٚگەیشتم".
"هەورە تریشقەیەك لێیدا, ئاسمانی لەم سەرەوە تا ئەو سەر شەق کردو گرمەکەی لە چیا دەنگیدایەوەو دەنگەکەی لە دەوروبەر گەڕا.
حەمەدۆك پاش ئەوەی باش لە تەحسین ورد بووەوەو بە زیرەکی هەڵیسەنگاند, گوتی:
"بڕوانە کاك تەحسین, باشت گویٚ لێم بیٚ, ئەگەر جەندرمەکانت دیتن و سۆراغی منیان لیٚویستی پێیان بڵیٚ: ئەو رۆیشت, تازە وازی لە چەتەییش هێناوە, دیتم سەری خۆی هەڵگرتبوو دەرۆیشت. بڵیٚ وا دیار بوو بۆ ئەوەی خوا لە گوناهانی خۆش بیٚ دەیەویٚ بچێتە کابەی پیرۆز, باشە؟ بڕوانە چەکیشم پیٚنیە"
تاژی تەحسین دەسبەجیٚ لە پەنای شاخەکە هاتەدەریٚو لە کاتێك دا بە بەر بارانیٚدا غاریدەدا گوتی:
"باشە".
حەمەد چەند لەحزەیەك لە پشتەوەڕا تەماشای کرد. لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەو کابرایە شتێکی لەبن سەردا هەبوو. بەڵام گرنگ نیە. دەبیٚ رێگاکەم بگۆرم. روانینەکەی ناخۆش و پڕ ترس بوو. پیاو

دەبێ لەو جۆرە کەسانە کە لە هەموو شتێك تەنانەت لە سێبەرو دەنگی گەڵادارێکیش دەسڵەمنەوە, بترسێ. هەر کارێکی خەراپ کە فکری لێبکەیەوە, لە دەستیان دێ.

تاژی تەحسین هەر کە لە پەنا بەردەکە دەرپەڕی لەبەر چاو ون بوو, حەمەدیش لەو قوولکەیەی لەبن گابەردەکە هەبوو هاتەدەرێو ڕێگای خۆی بەرەو بناری لێژو پڕ بەردەڵانی چیا خوارکردەوە. دەیزانی خەبەرهێنێکی وەك تاژی تەحسین بە یەکەم کەس کە بی گاتێو بە یەکەم جەندرمە کە تووشی بێ دەڵێ حەمەدی دیتوە. لەوانەشە هەر ئێستا ئەو ڕێوی, چەقەڵ یان هەر ژەهرەمارێك هەیە بەو پەڕی هێزو توانایەوە بەرەو شارۆچکە دەخۆیئووسا بێ هەتا خۆیگەیەنێتە یاوەر. بۆیە پێویست بوو بە پەلە لەم ناوچەیە دوور کەوێتەوە.

تەحسین ئەو ترس و هەژانەی تووشی ببوو, لەخۆی دوور خستەوەو لە جیاتیان خۆشحاڵی ڕووی تێدەکرد. زۆر ڕۆژان بە دوای حەمەددا چیاو بەندەنی پشکنین و سەرەنجام لە منداڵەشوانێکی بیست کە حەمەدۆکی لەم دەوروبەرانە دیوە. چەندین ڕۆژ لەسەریەك ئەم مەڵبەندەی بەجێ نەهێشت و لە کوێرەڕێیەکان و شەقامەڕێیەکانی کوێستان دا رایبوارد. ئەو دەیزانی دێهاتیەکان بە تایبەتی دەوارنشینەکان چەند زارقایمن. دیارە دەشیزانی چۆن قسە لە زاری دێهاتیەکان دەرکێشێ. ئەو دەیزانی کە لەم دەوروبەرانە زۆر ئاسان تووشی حەمەدۆك دەبێ. داخوا ئێستا حەمەدۆك بە بێ چەك بۆ کوێ دەچوو؟ دەبوو بە تەواوی جێگاو مەکانەکەی بدۆزێتەوەو وردیش لەبیری بمێنێ.

تەحسین بەرێی خۆیدا گەڕایەوە, حەمەدی لەبن ئەو شاخە کە پێکەوە لەبنی دانیشتبوون نەدیتەوە. تەماشای شوێنەکەی کرد چووبووە سەر چیاکە. هەموو شتێك حاڵی بوو. کەمی مابوو لە خۆشیان دڵی ڕاوەستێ. حەمەدۆك چووبووە خانەقای چل چاو. چونکە چەتەیەك ئەگەر چەتەیی وەلاش نابێ دیسان هێندە گەوج نیە لەو چیایانە بە بێ چەك بگەڕێ. تەنیا ئەو کەسەی دەچێتە خانەقای چل چاو هەقی نیە هیچ چەکێك لەگەڵ خۆی بەرێ, تەنانەت چەقۆیەکیش. کەسێك کە تەنانەت بە چەقۆیەکیشەوە لە خانەقا نیزیك بێتەوە ڕۆژی خۆشی نایەتە ڕێو سزای کاری خۆی وەردەگرێ. هیچ کەسیش ناتوانێ چەتەیەك یان مەحکومێك هەر کەس بێ وەختێك پەنای بۆ بن میچی ئەو خانەقایە بردوە, لەوێ دەربکێشێ. ئەو پادشاو خانانەش کە بەنیازن بچنە وێ, ڕۆژەڕێیەکیان بۆ وێدەمێنێ کە هەموو چەکێك لە خۆیان دەکەنەوەو ئەجار سەر دەخەنە سەر شیپانەکەی.

حەمەدۆکیش ڕۆژەڕێیەکی مابوو بۆ خانەقا چەکی لە خۆیکردبووەوەو وەك دەروێشان بە پێیان و خورجێن بە شان وەرێکەوتبوو. دەبوو زوو بگاتە لای ئەو پیاوەو خەبەرەکەی پێ بڵێ. ئەویش

پارەیەکی زۆری دەداتێ. پاشانیش دەبێ بچێتە لای یاوەر. یاوەرو جەندرمەکان بە چەکەوە ناچنە خانەقای چل چاو. دەکرێ لە ڕێگای چل چاو بۆسەی بۆ دانێن و بێخەنە کەمینەوە, یان دەبێ زۆر خێراو زوو هێشتا حەمەدۆك نەگەیێتە خانەقای چل چاو, جەندرمەکان هەموو ڕێگاکانی چل چاو ببەستن, یان وەختی گەڕانەوە لە خانەقایە لە داوی بخەن...

تاژی تەحسین گەڕایەوەو هەتا تینی تێدابوو دەستی کرد بە غاردان. دەبوو هەر ئەمشەو یان بەیانی خۆی بگەیەنێتە شارۆچکەو جەندرمەکان بەرێبکا. بەڵام کابرای گۆرین چۆن وەبینێ؟ ئەگەر ئەو پیاوە باڵابەرزە وەبینێ زوو دەیناسێتەوە. ئەگەر ناوونیشانەکانیشی بلێ خەڵك دەیناسن. ئاغایەکی گەورەیە. عەلییە شەلێکیش هەیە, مامۆستای شوێن هەڵگران. ئەگەر کەسیشیانی دەست نەکەوت دەپرسێو لەهەر کوێ بێ دەیبینێتەوە.

لەبەر بارانێ نەدەکرا چاو هەڵێنێ. پێڵاوەکانی پڕ ببوون لە ئاو. کاڵە نەبایە هەر کەوشێکی دیکەبایە, لەو کەوشانە کە پێیان دەڵێن قۆندەرەی سووری جووت باقیە, مومکین نەبوو بەرگەی ئەم بارانە بگرێ.

حەمەدۆکیش لەو کەوشانەی لەپێدا بوو. باشتر. ئەو قۆندەرە سوورانە بەرگەی ئەم بارانە ناگرن, هەتا خانەقایە دوو ڕۆژەرێ بوو. ئەو قۆندەرە سوورانە زۆر زوو ئاوێ هەڵدەمژن و هەڵدەمسێن. لەوانەشە حەمەدۆك کاڵەی لە نێو خورجێنەکەیدا هەبن. مەسەلێکی مەنشوور بوو دەیان گوت: چەتە دەبێ لاقی چوست و چالاك بن. وەك با بە ڕێگا سەرەوژێرەکەدا دەڕۆیشت. هەتا بنی ددانی لە ئاودا خووسابوو. ئەگەر وا خێرا غاری نەدابایە هەتا ئێستا لە سەرمان مردبوو. وردە وردەش ڕۆیشتنەکەی توندتر دەکرد. هەر بەو خێراییە گەیشتە دەشتێ. مێرگ و مێرغوزارێکی تەخت بوو. لە نێوەڕاستی ئەو مێرغوزارەدا کانییەك هەڵدەقوڵی کە خڕکە بەردەکانی بنی دیاربوون. ئاوی کانییەکە لەگەڵ لافاو تێکەڵ ببوو, هەستابووو دەوروبەری داگرتبوو. کەمێك ئەولاتر لێڕەوارێکی پان و بەرین بوو کە تاریك و ڕەش هەتا چوکووراوا درێژەی هەبوو. لەسەر لێڕەوارەکە چەند پەڵەهەوری سپی کە نەختێك مژاوی بوون, لەژێر ئەو بارانە توندەدا بەرەو ئاسمان هەڵدەکشان. لە لایەکی بەردەڵانەکەش پیرەدارێکی"سیدر" دەبینرا کە لكوپۆپەکانی, دەورو بەریان داگرتبوو. بەردەڵان چووبووە نێو هەورێکی سپییەوە. تاژی تەحسین لە جێی خۆی ڕاوەستابوو, وەختێك بە نێو لێرەواریدا وەرێدەکەوت وای هاتە بەرچاو کە لەسەر لووتکەی شاخی لە نێو هەوران دا سەرە ئەسپێك دەبینێ. سەری ئەسپەکە وون دەبووو دووبارە دەردەکەوتەوە. لەو فکرەدا کە داخوا بەخەبەرە

یان خەوی لێ کەوتوە هەتا نیزیك دارە سیدرەکە چوو. ئەو هەورە گەورەیە خێرا لە لووتکە شاخەکە دەهاڵاو لێك بڵاودەبوو. لە ژێر دارەکە چاوەڕێ ما. باران بەرەبەرە توندی دەکرد. گرمەی هەورە تریشقەکان لە چیاکان دەنگی دەدایەوەو دەی‌هێنانە لەرزین. بریسکەیەکی درێژ لێی‌دا کە دنیای لە رووناکی‌دا نوقم کردو ئەو ئەسپەی لە نێو هەورەکان دا بوو لەحزەیەك دەرکەوت و دوایە ون بووەوە. خۆشحاڵیی تاژی تەحسین لە دیتنی ئەسپەکە لە شادمانیی دیتنی حەمەدۆکیش پتر بوو. دەسبەجێ بە بەردەڵانەکەدا پێ هەڵگەڕا. بەم جۆرە هەم خەبەری دیتنی حەمەدۆکی زووتر دەبردە شارۆچکەو دەی‌گەیاندە ئەو پیاوە بەخشندەو پووڵدارەو هەم دەی‌توانی ئەسپەکەش ببینێ. ئەو پیاوە بە دڵ و دەروون و پارەدارە ئەوی لە زێڕو ئاڵتوون دا نوقم دەکرد. لە نەکاو ناوی پیاوەکەی وەبیرهاتەوە. ناوی مورتەزاغا بوو...

وەسەرکەوتن لەو شاخە کە وەك دیوار لووس بوو, کارێکی زۆر ئەستەم بوو. وەسەرکەوتن لەو شاخە لە ژێر ئەو بارانە توندەدا کە دەباری‌و لێی‌نەدەکردەوە, وەك ئەوە دەچوو بە دارتێلێکی لووس هەڵگەڕێی کە ڕۆنی تێ هەڵسوابێ. بەراست ئەو ئەسپە چۆن وەسەر ئەو شاخە کەوتبوو؟ لەوانەشە ئەو ئەسپە حەیوان نەبێ, جندو پەری بێ. یان شەیتان بێ. ترسا, بەڵام نەی‌توانی نەچێ بۆ لای ئەسپەکە. تەماع بەری چاوانی گرتبوو. باران وەك کلکە ئەسپێك دەچوو کە لە بەرزاییی هەڵواسرابێ‌و سەری هەر تاڵە موویەکی گوانێك بێ کە دۆشیبێتیان.

تاژی تەحسین وەختێك گەیشتە دوندی شاخەکە دەستەکانی شەڵاڵی خوێن بوون, لە هەورە تریشقەی‌دا, هەور گرماندی, بریسکەیەك بە نەڕو هۆڕ لە شوێنێکی زۆر نیزیکی وی کەوت و ئەو شاخەی لەسەری راوەستابوو, وەك لانکە راژا. ئەسپەکە بە بریقەیەکی رەشەوە درەوشایەوەو بەرەو لای وی کەوتە لینگدان. لەو کاتەدا تاژی تەحسین لەبەر زگی ئەسپەکەدا بوو, لە ترسی رووحی خۆی هەرچۆنێك بوو خۆی هاویشتە قەڵشتە شاخێکەوە. ئەسپەکەش هات و بە لینگدان بە ژوورسەری‌دا تێ پەڕی‌و ڕۆیشت لە خوارەوە لەبن دارێك رەق راوەستا. تاژی تەحسین بۆڵاندی: دەی گرم. دەی‌گرم و دەی دەم بە پارچە زەوی‌یەك. کێ دەتوانێ لێم وەستێنێ؟

تاژی تەحسین خێرا لە بەردەڵانەکە هاتە خوارێ, لەبن دەوەنێك دەسکە گیایەکی شینی هەڵکەندو بە دەستیەوە گرت و لە حاڵێك دا بانگی ئەسپەکەی دەکرد بۆ لای چوو. وردەوردە گەیشتە نیزیك ئەسپەکە. هەتا لە ئەسپەکە نیزیك دەکەوتەوە دڵی وەك بیەوێ لە قەوەزەی سنگی بچێتەدەر تەپ تەپ لێی‌دەدا.

تەحسین نیزیك کەوتەوە, نیزیکتر, دەستی درێژ کردو راست لەو دەمەدا کە دەیەویست یاڵی بگرێ, نەی‌زانی چ رووی‌دا, تەنیا یەك لەحزە دیتی ئەسپی رق هەستاو بە چاوی دەرپەڕیوەوە لە

حالێك دا ددانە سپییەکانی وەك شمشێر دەدرەوشانەوە, پەلاماری ویداو پاش لەحزەیەکی دیکەش دیتی ئەسپەکە وەك تۆپێك فڕێی دەداتە ئەم لاو ئەولا. سەرەنجام لەسەر زەوی پان ڕابوو.

ئەسپەکە پاش ئەوەی ئەوی لەسەر زەوی تخێل کرد, بە غاردان بێ ئەوەی خۆی پێ ڕاگیر کرێ هەتا دوور هەتا خوار کانییەکە لینگیداو لەوێ وەستا. ئەودەم چەند جارێك بە دەوری خۆیدا سوڕاو پاشان بە ماسوولکەیەکی شلەوە بە فیشقاندن و کەف پڕژاندن و ددان گرکردنەوەو بە ملی ڕاکێشراوو چاوی سوورهەلگەڕاوەوە هێرشی کردەوە سەرێ.

تاژی تەحسین ئەگەر نەختێك درەنگتر لە جێی خۆی هەستابایە, بە ددانی ئەسپەکە لەت و کوت دەکراو لەبن پێیانیدا گیانی دەردەچوو. وەختێك ئەسپەکە گەیشتە مەودای سەدمیتریی وی, تاژی تەحسین بە زەحمەت توانی خۆی باوێتە پاش قەدی دارەکەو گیانی خۆی نەجات بدا. ئەم جارەیان ئەسپەکە لە جیاتی ئەوەی غارداو لەوێ دوور کەوێتەوە, دەسبەجێ بە فیشقە فیشق لە کاتێك دا بلێسە ئاگر لە چاوانی هەلدەڕژان گەڕایەوە سەر تاژی تەحسین, ملی درێژ کردو باسکی تەحسینی کە خۆی دەپشت دارەکە گرتبوو, بە ددانی گرت و قۆلەکەی لێکردەوە. جێی شوکرانە بوو کە کاتێك ئەسپەکە سەری بردە پێش تەحسین باسکی خۆی کێشایە دواوەو تەنیا قۆلی چاکەتەکەی بەر ددانی ئەسپەکە کەوت.

ئێستا لە نێوان ئەسپەکەو تاژی تەحسین دا بەربەرەکانییەك لەسەر مردن و ژیان دەستی پێکردبوو. ئەسپ بە ددان, بە جووتەو بە هەموو لەشی خۆی پەلاماری تەحسینی دەدا, ئەویش لە پەستا بە دەوری دارەکەدا دەسووڕاو گیانی بێهێزو نیوە مردووی خۆی نەجات دەدا. سەرەنجام تەحسین لە هێرشی پەیتا پەیتای ئەسپەکە ماندوو بوو. چاوی دەڕەشەوە دەهاتن و سەری دەسووڕا. هێندەی نەمابوو بکەوێتە سەر زەوی, هومێدێك بە ڕزگاربوونی نەمابوو. ئەسپەکەش جار بە جار ڕق ئەستوورتر دەبووو زیاتر هێرشی دێنا. وەختێك تاژی تەحسینی بۆ نەدەگیرا, لە ڕقان قەپی بە قەدی دارەکەدا دەکرد. تەحسین تەنیا یەك ڕێگای نەجات بوونی بۆ مابوو, ئەویش ئەوە کە بچێتە سەردارەکە... هەرکە ئەسپەکە نەختێك دوور کەوتەوە دەسبەجێو بەپەلە بە دارەکە هەلگەڕاو هەتا یەکەمین لکی دارەکە کە ڕێکی زەوی بوو, وەسەرکەوت. ئەسپەکە وەختێك ئەوی لەسەر لکەدارەکە دی لە ڕقان شێت بوو, غاریدایە سەری, ئەگەر تەحسین لەگەل غاردانی ئەسپەکە خۆی نەکێشابایە لای ئەولا کەوتبووە بەرددانی ئەو حەیوانە شێتە. تەحسین هەورازترو هەورازتر هەتا تلۆفکی دارەکە چوو.هەموو ئەندامی لەشی وەك بەر کارەبا کەوتبێ دەلەرزین. باران وەك لافاو لە گەلاو لك و قەدی دارەکە دەچۆڕا.

وەختێك ئەو چووە تلۆفکی دارێ, ئەسپەکە دەستی لێ‌هەڵنەگرت. وەك لە جێ‌یەك داوای یارمەتی بکا بە شێوەیەکی توندو پچرپچر دەی‌حیلاندو دەکەوتە غاردان. ئەسپەکە سەری خۆی گەیاندە یەکەمین لکی دارەکەو پاشان بە پشت دا کەوت, پاش ئەوەی چەند جار ئەو تەقەلایەی دووپات کردەوە راوەستا. ماوەیەکیش لەبن دارەکەوە لە کاتێك دا لە ڕقان خوێن بەری چاوی گرتبوو, تەماشای تەحسینی کرد. پاشان پاڵی وەقەدی دارەکەداو کلك و گوێی بەردانەوەو دەستی راستی بە بەر زگیەوە گرت و هەر لەوێ راوەستا.

تاژی تەحسین لە دڵی خۆی‌دا گوتی: هەڵەیەکی گەورەم کرد. ئیدی کارم کراوە... ئەگەر ئەم ئەسپە حەوتوویەك لێرە راوەستێ‌و ئێرە بەجێ‌نەهێڵێ, ئەمن بەسەر ئەم دارەوە دەمێنمەوەو لە برسان و بێ‌خەوی‌یان دەمرم, ئەگەر نەش مرم لە سێ‌ڕۆژان زیاتر بەو سەرەوە خۆم راناگرم و لەوێ‌را راست بەردەبمەوە نێو زاری ئەم ئەسپە. ئەم ئەسپە هەتا قیامەت لێرە رادەوەستێ‌و چاوەڕوانی من دەبێ. بۆچی ئەم بەڵایەم بەسەر خۆم هێنا؟ بۆچی‌و لەبەرچی ویستبووی ئەم ئەسپە شێتە جادوویی‌یە بگرێ‌و گیانی خۆی لەسەر ئەو کارە دابنێ؟ ئەو هیچ هیوایەکی نەجات بوونی نەبووو حەیوانەکەش بە دەمی ئاوەڵاوە چاوەڕوانی بوو. بەڵکوو چەتەیەك, شوانێك, یان دێهاتی‌یەکان بێن و نەجاتی بدەن. هەتا لای نیوەشەوێ لە گژ ئەم فکرانە راچوو, هەموو ئەندامی لەشی دەلەرزین. ئەگەر ئەمشەو لێرە مابایەوە پێویست نەبوو ئەسپەکە بە ددانی خۆی لەت و کوتی کا, چونکە لەسەرمان دەمرد. بەسەر ئەم دارەوە دەی‌بەست و دەمردو سبەینێ بەیانییش سیسارگ کەلەشەکەیان لەت و پەت دەکرد.

بە بێ شك ئەسپەکە دەی‌زانی کە ئەو نیازی پێوەکردنی حەمەدۆکی هەیەو هەر بۆیەش دەیەویست بی‌کوژێ. ئەگینا ئەم ئەسپە بە دیتنی ئادەمیزادو لەگەڵکوو یەکێك لێی‌نیزیك دەکەوتەوە رای‌دەکردو لە پێش چاو ون دەبوو. ئەم پەلامارانە کە بە قەستی کوشتن بۆ سەر وی دێنان بە خۆرایی نەبوون, مسۆگەر شتێکیان تێدا بەستەبوو. کەوایە ئەم ئەسپە وەك نەزەرکردە هەموو شتێك دەزانێ‌و تێ‌دەگا: ئەگەر لەبەری وەپاڕێم و قەولی پێ‌بدەم کە جێی حەمەدۆکی بە کەس ناڵێم لە کۆڵم دەبێتەوە؟ نا ئەم بەرازە رەشە وازم لێ‌نایەنێ. ئەو ئەسپە کارێك دەکا هەر لێرە, لەسەر ئەم دارە لە سەرمان رەق بمەوەو بمرم.

بە ترس و لەرزەوە لە گلۆفکی دارەکەوە هاتە خوارێ بۆ لکەکانی بەرەوەتر, وا دەلەرزی دەت گوت لە حەوادا باڵی‌گرتوون و دەفڕێ. لێرە زۆری خۆ ڕانەدەگرت و بە زوویی وەك هەرمێ‌یەکی گەییو تلپ بەردەبووەوە نێو زاری ئەو ئەسپە. لە نێو لکەکانی خوارێ‌دا پاڵی بە

قەدی ئەستووری دارەکەوەدا. ئێرە کەمتری باران وێدەکەوت. ئەگەر بارانەکە لێیبکاتەوە کارەکەی خەراپتر دەبێ. دەیکاتە کزەباو کزەباش زوو بەسەر ئەم دارەوە رەقی دەکاتەوە.

دەستەکانیی کە دەت گوت لەبەر لەرزینی توند دەفرِن, بەرەو ئاسمان راگرت: خوایە... بەلاّم چەند لەحزەیەك زیاتر نەیتوانی رایان گرێ: خوای گەورە ئەم ئەسپەی لێرە هەڵگرەو بیبە جێیەکی دیکە, تا ئەمن بتوانم لێرە بچمەخوار. ئاخر چ دەبێ خوایە... وەڵلاّ بیللا ئەمشەو لێرە بمێنمەوە حەتمی دەمرم. خوای گەورە ئەگەر ئەو ئەسپەم لە کۆڵکەیەوە کەڵەبابێکی گەورەی سەربەکلاّوت بۆ لە خۆ دەگرم. ئەگەر ئەو ئەسپە لێرە لابەی و بیبەیە جێیەکی دوور, بەرخێك دەدزم و بۆت دەکەمە قوربانی. پاشان تێگەیشت کە ماڵی دزیەتی بە قوربانی ناشێ گوتی: خوایە دەیکرِم و بۆت دەکەمە قوربانی, تەماشای خوارێی کرد. ئەسپەکە هەر لە جێی خۆشی نەدەبزووت. دەستی چەپی بە بەر زگیەوە نابوو هەر لەوێ راوەستابوو.

تاژی تەحسین پارِایەوە: مانگێك رۆژوو دەگرم, سێ مانگیش نوێژان دەکەم, قبوولێیەکی بە گۆشتی بۆ مامانی دێیەکەمان لێدەنێم, ئەویش بە گۆشتی سێرو. ئەو مامانە نا... بۆ قبوولێیەکی بە گۆشتی ئەوە دڵی دەتۆقێ. حەزدەکەی قبوولێیەکە بە گۆشت کەو دروست دەکەم, پیوازو رِۆن و ئالەت و زەردەچێوەشی لێدەدەم.

زاری خۆشی رەناو کەوتبوو. زۆری برسی بوو. بەرەبەرە سەرما کاری خۆی دەکرد, خوێنی لە گەرِان دەکەوت. تەنانەت نەش دەلەرزی: ئەو مامانە نا... ژنی وا چاك لەم دنیایەدا نیە. نەزەر کردەیە. لەم دنیایەدا ژن نەبووە بتوانێ وەك وی دوعایان بخوێنێ. دەڵێی گۆرانی دەڵێ. وەختێك ئەمن قبوولێی بە گۆشت کەوم لێناو دامێ خواردی ئەویش شەوو رۆژێك, حەزی خۆتە سێ شەوو رۆژ دوعات بۆ دەخوێنێ, لە دەستی ئەم ئەسپەم نەجات بدە. سەری وەرسووراندو تەماشای خوارێی کرد, ئەسپ لە جێی خۆی راوەستابووو مووەکانی راست ببوونەوە. ئەویش سەرمای ببوو.

بۆ ئەوەی ئاکامی دوعاکانی ببینێ, تاوێك لەو سەرەوە تەماشای خوارێی کردو چاوەروان بوو. ئەسپەکە مێشێکیشی لێمیوان نەبوو. کەم کەم بارانەکەش هێدی تر دەبوو. تاژی تەحسین دیتی لە لایەن خواوە جێگای هومێدێکی نیە, ئەم جار لەبەر ئەسپەکە پارایەوە:

"ئەسپەکە، ئەسپی جوان, ئەتۆ خاوەنێکت هەیە نا, ناوی حەمەدۆکە, ئەمن قسەم لەگەڵ کرد, دەزانی. ئەو حەمەدۆکە کە رۆژگارێك چەتە بووو ساتێك چەکی لە خۆی نەدەکردەوە, دیتم چەکی پێنەبوو. دەت گوت دەچێتە خانەقای چل چاو. کەس ناتوانێ بە چەکەوە لە خانەقای چل

چاو وەڕوور کەوێ. ئەمە دابێکە لە قەدیمییەکانەوە ماوەتەوە. ڕۆژەڕێیەکی دەما بۆ خانەقای چل چاو پاشاکان، خانەکان، سەرۆك وەزیرەکان و تەنانەت پادشاکان چەکەکانیان وەلادەنا، شمشێرو خەنجەرەکانیان لە خۆ دەکردنەوەو دەچوون لە دەری خانەقایە عەرزیان ماچ دەکرد، هەژدیهاو مارەکان ددانی خۆیان دەکێشاو دووپشك و زەرگەتەکان چزووی خۆیانیان هەڵدەکێشاو دەچوونە وێ. سوارە مەزنەکەی تۆ، حەمەدۆکیش بە بێ چەك دەچووە وێ، ئاوا ڕووت و قووت دەچووە کوێ؟ هەر دەچووە خانەقای چل چاو. ئەمن جەماڵی ویم دیت کە وەك حەزرەتی عەلی ئازا بوو، گوڵی ڕوخساریم دیت. لێم گەڕێ بابڕۆم. وەڵڵا بیللا بەسەر ئەم دارەوە ڕەق دەبمەوەو دەمرم و خوێنم دەکەوێتە ئەستۆی تۆ. هیچ باش نیە ئەسپێك دەستی بە خوێن سوور بێ. ئەتۆ قەت ئەسپی پیاوکوژت دیوە یان بیستوە؟ ئەسپێك خوێنێ بکا هەتا ڕۆژی قیامەت خۆشی لەخۆی نابینێ. تەنانەت ئەگەر نەزەرکردەش بێو بگاتە پلەی پیاو چاکانیش. ئەگەر ئەتۆ تا بەیانی لەوێ بی ئەمنیش لە سەرمان ڕەق دەبمەوەو دەمرم. ئاخر چ دەبێ، دەبڕۆ ئیدی. بڕوانە! ئەگەر نەڕۆی خوێنی منت دەکەوێتە ئەستۆ، تو گیانی ئەو حەمەدۆکە دەست بەردارم بە مەیەڵە لێرە بمرم. جێی حەمەدۆکیش نە بە ئاغایەکەو نە بە جەندرمەکان نالێم. دەتەوێ بە ناوی جوانی حەزرەتی محمدو بە خوای گەورەش سوێندت بۆ بخۆم. لەوێ لاچوو با بێمە خوارو ڕووحی خۆم نەجات بدەم".

باران هەروا دەبارێو توندتریشی کردبوو. دەنگی لافاوو سووڕانی ئەو بەردە گەورانە کە دەهاتنە خوار بەرگوێ دەکەوت. هەورەتریشقە تا ماوەیەکی زۆر دەوروبەریان ڕووناك دەکردەوە. ئەسپەکە لەبن داری گوێی بەردابوونەوەو بە یاڵی داچۆڕاوەوە ملی بۆ لای عەرزی درێژ کردبووو بێ جووڵە خەوی لـێکەوتبوو.

"بڕوانە ئەسپی ڕەسەن و جوان، ئەتۆ جوانی جوانانی، ئەگەر لێرە ئازادم بکەی ئەمنیش جێگای حەمەدۆك..." دەستی کرد بە هاوار هاوار، لە سەرمان باشی دەنگ دەرنەدەهات. بە هیچ کەس، بە هیچ کەس نالێم. نالێم بە هەرچی دەڵێی سوێندت بۆ بخۆم. لەوێ لاچۆ".

هەستی کرد دەست و لاقی سڕبوون، خەریك بوو ڕەق بێتەوە. دەستی کرد بە هەوراز چوون، بە لکەدارەکان دا دەچووە سەرێو دەهاتەوە خوار. تاوێك دواتر گەرمی هاتەوە. لێوە لەرزەکەی کەمتر بوو. هاواری کرد: سەگباب ناڕۆی؟ مەڕۆ، ئەتۆ ئەسپ نی، سەگێکی هاری. سەگ... لێکدالێکداش هەتا تلۆفکی دارەکە پێ هەڵلادەچووو دەهاتەوە جێی خۆی.

وەختێك دنیا کەمێك ڕووناك بوو، تاقەتی لەبەر بڕابوو و نەیدەتوانی ببزوێ. دەست و لاقی واسڕ ببوون دەت گوت لە لەشی جیابوونەوە. بە نارەحەتییەوە تەماشای بنەوەی کرد. چەند

دەقیقەی دیکە هێزی لەبەر دەبڕاو هەر لەوێوە دەکەوتە خوار بۆ بەر پێی ئەسپەکەو ئەویش بە سم و ددان لەت و کوتی دەکرد. هەتا تینی لەبەردا بوو هاواری کرد:

"فریام کەون, فریام کەون, کەس نیە نەجاتم بدا؟".

ئەمجار گوێی هەڵخست جگە لە دەنگی لافاوو ئەو بەردانە کە لافاو دەیهێنان دەنگێکی دیکە نەدەهات. جارجاریش بریسکەکە لە چیادوورەکانی دەدا, ئاسمانی وەگرمە دەخست و عەرزی وەك لانکە ڕادەژاند. هیچ گیانلەبەرێك دیار نەبوو, نە باڵندەیەك, نە جانەوەرێك, نە بەرازێك, نە چەقەڵێك و نە مانگ... ئەو ئێستا لەگەڵ ئەو ئەسپە کە لە رقان شێت ببوو لەبن دارەکە چاوەڕێی بوو, لەم جیهانەدا بە تاقی تەنیا مابووەوە.

دیسان دەستی کرد بە پاڕانەوە: بڕوانە ئەسپە جوانەکە. لێم گەڕێ, لێم ببوورە با بڕۆم, ئاخر چ دەبێ؟ دەزانم, ئەمن ئینسانێکی خراپم, دەچووم خەبەری حەمەدۆکی بدەم بە یاوەر. ئەگەر ئەتۆ پێشت پێنەگرتبام... خوای گەورە تۆی بۆ ناردم و نەیهێشت ئەو کارە خراپە بکەم... ئەمنیش وازم لێهێنا. وازم لێدێنی, نا؟

"وازم لێنایەنی؟"

"بۆچی وازم لێناهێنی, چونکە چووم خەبەرم لە حەمەدۆك دا؟"

............

"دەزانی هێشتا خەبەرم لێنەداوە. ئەتۆ لە پێشم پەیدا بووی. دەمەویست خەبەری لێبدەم, چما دەمەویست چیی لە جیاتان وەربگرم؟"

............

خەبەری مردنەکەیم دا... لە دڵی خۆم دا گوتم کەسێك مردووەکەی هێندە بێنێ, داخوا زیندووەکەی قیمەتی چەند بێ؟ وەڕێ کەوتم, چەند ڕۆژە؟ چەند ڕۆژ, زۆر ڕۆژان بە دوایدا گەڕام. کەس جێی وی بەمن نەدەگوت. نە ئادەمیزاد, نە باڵندەو پێڕۆ, نەڕێولاڕێ, نە ورچ و چەقەڵ هەموو دنیا لاڵ ببوون و جێگای وییان نەدەدرکاند. پاشان خوای گەورە لە ڕێگای خانەقای چل چاو ئەوی هێنایە سەر ڕێگای من".

............

"نا نا, نا... خوا ئەوی بە من نیشان نەدا. لەم جادەیەدا چەندین ڕۆژ چاوەڕێی بووم. ئاخر خانەقای چل چاو هیچ ڕێگای دیکەی بۆ ناچن... هەرچۆنێك با, بەوێدا دەهات".

............

"ئەمن زۆر زرینگم, بەڵێ... بەڵام ئەتۆ بە گیرت هێنام. ئەتۆ لە من زرینگ تری".

............

"زۆر ئاقڵی, زۆر زرینگی... بڕوانە, لەم داری دنیایەدا دایکێکی بێوەژنم هەیە, لەمن بەولاوە کەسی نیە. دارونەداری ئەمنم. ئەگەر من بکوژی, هەر ئێستا ئەوە دەمرم, دایکم لە خەفەتان و لە برسان دەمرێ. زگت پێم ناسووتێ؟"

............

"دەزانم ئەسپێکی بێ ویژدانی... بەڵام ڕەسەنی, ئەسپە ڕەسەنەکانیش مردنیان بۆ نیە, ئەگەر قیامەتیش هات دەچنە بەهەشتێ. لەوێ پێغەمبەرو مەلایکەو حۆرییەکان سواریان دەبن. بەڵام ئەگەر ئەمڕۆ لێرە قەتڵێك بکەی, ئەو خانووە جوانە کە خوا دروستی کردوە خەراپ دەکەی. چما ئەو دەم خوا تۆ, پیاوکوژێك دەباتە بەهەشت؟ ئەتۆ بۆ کوشتنی من بەهەشتی خۆت مەکە بە جەهەننەم. جەهەننەم لە جێدا ئاوری لێنیە, هەر کەس ئاوری خۆی لێرەڕا دەبا. ئەتۆ ئاوری خۆت لێرەڕا مەبە".

............

"نا... هەموو ئەسپەکان دەچنە جەهەننەم بە تایبەتی ئەسپە خەنەییەکان؟ کێ ئەم قسەیەی پێگوتووی, حەمەدۆك؟"

............

"ئاناجیخ سوڵتانی چل چاو گوتوویە؟ چما ئەو قسەی وا دەکا؟ ئەمن بۆ خۆم لێم بیست کە گوتی هەموو ئەسپە ڕەسەنەکان دەچنە بەهەشت".

بەرەبەرە ئاسۆ روون دەبوو, مژێکی سپی هێدی لەسەر لێڕەوارەکەی خوارێ هەڵدەستا. جارجار بارانەکە نەختێك لێیدەکردەوەو ئەمجار ئاسمان دەیگرماندو لە هەموولا دەنگی دەدایەوەو پاشان هەورەتریشقە پەیتاپەیتا دەدرەوشانەوەو بریسکە لەم لاو لەولای دەداو سەرەنجام لە ئاسمانەوە رووبار بەرەو زەوی وەڕێدەکەوت.

"بڕوانە, کارێك مەکە لە جیاتی بەهەشتێ بچیە جەهەننەم".

............

"بڕوانە, ئەمن ئەگەر لێرە نەجاتم بێ, سوێندەکە بە سەری تۆ دەچم دنیایەك جۆ لە خەرمانێ دەدزم و ئەشکەوتێ پردەکەم لە جۆ بۆ ئەوەی زستانێ برسیت نەبێ".

............

"جێگای حەمەدۆکیش بە..."

............

"نا, نا لە هەردوو چاوان کوێرم... بە کەسی نالێم. دەست بە قورئانیدا دەدەم کە..."
بایەکی توندی هات, لکە دارەکان پێك دا دران, کۆمەڵێك گەڵا کە با لێیکردبوونەوە چوونە حەواو بەرەو لێڕەوار ڕۆیشتن. دەت گوت پۆلێك باڵندە لەسەر دارەکە هەڵفڕیون. باران وەك گۆپاڵ چەپ و راستی دەکوتاو ئەسپەکە لەوێ بێ ئەوەی گوێبداتە ئەوەی روویدەدا راوەستابووو سەری کە بۆ لای زەوی درێژ کردبوو, تاقەجارێکیش هەڵی نەبڕیو بۆ تاکە ساتێکیش تەماشای دەوروبەری نەدەکرد.
"ئای کە کەللەشەقی".

ئیدی دەنگی دەرنەدەهات, هەر ئەوەندەی پیدەکرا زاری بکاتەوەو وێکی بنێتەوە, ئەویش بە هەزار زەحمەت. ئەو باو بارانەی لە کێوپارەوە دەهات ئەوەندە توندبوو کە تەحسین بە زەحمەت خۆی بە دارەکەوە راگرتبوو.

بریسکەیەك لە نیزیك وی کەوت. رووناکی‌یەکەی ئەوەندە توندو وەك گوێزان ئەوەندە تیژ بوو کە ئەگەر چاوی لێك نەنابایەن کوێر دەبوو. بریسکەیەکی توندتر لەوەی پێشێ کەوت. سێهەمین بریسکە لەسەر دوندی ئەو شاخە کە ئەسپەکەی لەسەر رادەوەستا تەقیەوە. ئێستا لێکدالێکدا هەورەتریشقە دەدرەوشانەوەو لەو دەوروبەرە لە راست و چەپ بریسکە دەکەوتن. هەورەتریشقەکان وەك تۆرێك تێکەوە تەنرابوون و لەگەڵ ئەو لافاوانە کە لە چیاکان را دەهاتنە خوار وەرێکەوتبوون و دەهاتنە پێش و بەرەو لێڕەوار دەڕۆیشتن. دوا بریسکە کە لە چیارا هاتبووە خوارو هەموو جێیەکی لەرزاندبووەوە, هات و چوار جار بە دەوری دارەکەدا سووڕاو چەند خەرمانەی نووری کێشانەوە. ئەسپەکە لە جێی خۆی راپەڕیو ویستی لەو خەرمانەیە وەدەرکەوێ, بەڵام نەیتوانی. بریسکە دارەکەی بەجێهێشت و لە دەوری ئەسپەکە دەستی کرد بە سووڕان. ئەسپ لە نێو ئەڵقەی بریسکەکەدا مابووەوەو هەڵدەسووڕاو ئەڵقەکەش بە توندی بە دەوری ویدا دەسووڕا. ئەسپ و بریسکە لە کاتێك دا هەروا دەبزووتن و بە دەوری یەکتردا دەسووڕان بەرەو هەورازی قزڵ کارتال وەرێ کەوتن. ئەم سەما دەگمەن و سەرسوڕهێنەرەی تیشك و ئەسپەکە تا ئەو کاتەی نەدیو بوون هەروا درێژەی هەبوو. لەو نێوەدا تەحسینیش لەو سەرەوە لەگەڵ ئەو ناوە کە بە قەدی دارەکەدا دەهاتە خوار ڕژایە سەر زەوی. چەند لەحزەیەك نەیتوانی لەبن قەدی دارەکە هەستێ, چاوەکانی بە ترسەوە بە دوای ئەسپەکەدا دەگەڕان, کە لەگەڵ بریسکە ببووە یەك و ڕۆیشتبوو.

ئەگەر ئەسپەکە جارێکی دیکە گەڕابایەوە ئیدی رزگاربوون ئیمکانی نەبوو. نە هێزی ئەوەی لەبەردا بوو جارێکی دیکە بچێتە سەر دارەکەو نە توانای راکردنی هەبوو... بەزگەخشکە لە سەرەوژێرەکە دەهاتە خوارو بەرەبەرەش لەشی گەرم دادەهات. لە هێندێ شوێن لەسەر لێرەوارەکە هەورە تریشقە لێیدەداو تۆپەڵە نوورێکی گەورە چیاکانی رووناك دەکردەوە. تاژی تەحسین لەو رووناکاییەدا هەموو شتێکی بە وردی دەدی. تەنانەت چووکترین رووناکی کە بەقەدەر نووکە دەرزییەك لە بەردەڵانەکە دەدرەوشایەوە, داوی جاڵجاڵۆکە کە لەسەر دەوەنەکان تەنرابوون و باران دەیدڕیو ئەو هەودایانە کە بە هۆی دڵۆپە بارانەی چووکەڵەوە دەکەوتنە لەرزین هەموویان و تەنانەت رەگەرەگەی چووکترین گەڵاکانیشی دەدی.

وەختێك سەری هەڵبڕی ئەو دەوارانەی دی کە لە پێشەوەی لێرەوارەکە هەڵدرابوون. دەسبەجێ تێگەیشت کە ئەو رەشماڵانە ئیکۆچەرییەکان نین, لە دەری چادرەکان جگە لە تەیرە راوییەکان کە لە پەنای هەر تاولێك لەسەر لیسی کوشم هەڵاتبوون زیندەوەر دیارنەبوو, نە وەڵاغێك نە ئینسانێك. ویستی هاوار بکا. دەنگی دەرنەهات. بە ترسەوە تەماشای دەوروبەری خۆی کردو چاوی بۆ ئەسپەکە گێڕا کە هەردەم لەوانەبوو بگاتە سەری. چادرەکانی لێنیزیك بوون بەڵام زمانی گیرابوو. چووکترین ئەندامی لەشی دەلەرزی, دەت گوت هەموو ماسولکەکانی لەشی دەستیان کردوە بە پەڕین. بە گاگۆلکە خۆی بەسەر قوڕیدا بەکێش دەکرد, دەقوڕ رۆدەچوو, تاوێك دواتر ببوو بە بوونەوەرێکی قوڕین. باران بەرەبەرە توندتری دەکرد, کچێك لە تاولێك کە تەیرێکی راوێی لەبەر دەرگابوو, هاتەدەرو بێ ئەوەی لە دەرێ راوەستێ چووەوە ژوورێ. لە خۆشیی دیتنی کچەکە رووحی هاتەوەبەر. راست لە پەنای باڵندەکە چاوی دەرەشەوە هاتن. ئاخر شت کە دیتی چاوی وەك بریسکەی شەهێنەکە, زمانی سووری لەنێو زاری بە باوێشك داپچڕاوداو دەندووکی تیژو بە قولاپی تەیرەکە بوون. ئیدی بێهۆش بوو.

ئەو کچەی چەند دەقیقە پێشتر هاتبووە دەرێ, لەبەر بارانێك کە وەك گۆپاڵ دەهاتەخوار لە تاولێ وەدەر کەوت. شەهێنەکە کە ئەوی دیتبوو باڵی لێك کردنەوەو خۆی راوەشاندو دڵۆپە ئاوی درشتی بە دەوروبەریدا بڵاو کردنەوەو کچەکەش دیسان خێرا گەڕایەوە نێو چادرێ و گوتی:

"بابەگەورە, جەنازەیەك لەبەر دەرکی تاولێ کەوتوە, درێژ کەوتوەتە سەر عەرزی".

بابەگەورە کەپەنکەکەی بەسەر شانیدا دا. پیاوێك بوو زۆر کەڵەگەت بە ریشێکی سپیی زۆر درێژو قامکە دەستی درێژو راکشاوەوە. هەرکە گەیشتە لای تاژی تەحسین دەستی راستی لەسەر سنگی وی داناو بە زەردەخەنەوە گوتی:

"خۆ ئەمە تاژی تەحسینی خۆمانە. نەمردوە, هیچی نیە, نەختێك سەرمای بووەو زۆریش ترساوە".

"لەچی ترساوە باپیرە؟"

"نازانم, زۆر ترساوە".

باپیرو نەوە تاژی تەحسینیان بردە ژووری چادرێ.

"کراس و دەرپێ و گۆرەوی و جلەکانی بابت بێنەو خاولیەیەکیش بێنە, ئاورەکەش خۆش کە. ددانی پێك دا نووساون. تاژی تەحسین نەمردوە, بەڵام حاڵیشی زۆر باش نیە, چایەك دەم بکە".

تاژی تەحسینی بردە دیوێکی چۆڵی چادرەکە, لەو نێوەدا تاژی تەحسین جارێکی چاو هەڵێنان و دووبارە لەسەر یەکی دانانەوەو بە نێو کەلێنی ددانەکانی دا دەنگێك کە بە زەحمەت دەبیسترا گوتی:

"فریام کەون, خەریکە دێ, خەریکە دێ, خەریکە دێ, خەریکە دێ".

پیرەپیاو سەری لە قسەکانی دەرنەکرد.

کچەکە ئەو شتانەی کە بابەگەورەی داوای کردبوون, هێنان و لەپەنای دانان. تەحسین لەسەر لبادێك بەدرێژەوە راکشابوو, ئەو ئاوەی لە سەرولەشی دەچۆڕا لبادەکەی کردبووە قولەتێن. پیاوە بەساڵداچووەکە بەدەستە کارامەکانی خێرا تەحسینی رووت کردەوە, لەسەرەخۆ بە خاولی دەستی کرد بە وشك کردنەوەی. جلی وشکی لەبەر کردن, ئەوی لە بەڕەیەکەوە پێچاو بردیە بەر ئاگر. لەو بەینەدا تەحسین دوو جاری چاو هەڵێنان و لەسەریەکی دانانەوە.

"هەموو شتێك ئاسانە, تەنیا کردنەوەی ددانەکانی کە پێك دا نووساون بە زەحمەتە. کردنەوەی ددانی قفڵ بووی کەسانێك کە ئاوا سەرمابردوو بوون کارێکی ئاسان نیە".

کچەکە ئاورەکەی خۆشتر دەکرد, ژووری تاوڵەکە جاربەجار گەرمتر دەبوو, دەبوو بە کوورەیەك. ئەگەر کیژۆڵەکە لە پەستا هاتوچۆی دەرێی نەکردایە چادرەکە لەوەش گەرمتر دەبوو.

"بابەگەورە, شەهێنەکەش لە دەرێ وەك تاژی تەحسین رەق دەبێتەوە. تووکەکانی راست بوونەوە. بیهێنینە ژوورێ؟"

باپیرە توندو قایم گوتی: باڵندە هیچی لێ نایە.

"بەڵام باپیرە..."

بابەگەورە لە حاڵێك دا برۆ سپی و پان و بەپشتەکانیی وێك دێنان گوتی:

"هیچی نابێ, باڵندە ئاو تەڕی ناکا, باڵندە سەرمای نابێ"

"ئەگەر باڵندە سەرمای نابێ, ئەی بۆچی شەهێنەکە لە دەرێ تووکی گرژ کردوەو سەرمایەتی؟"

"ئەمە پیشەی خۆیانە. عادەتەن باڵندە لە سەرماو بەفرو باران دا تووکەکەیان گرژ دەکەن".

"بەڵام بابەگەورە..."

بابەگەورە رقی هەستاو گوتی: ئا... ئەگەر حەز دەکەی هەڵیگرەو بیهێنە ژووریٰ.

کچۆڵەکە چووە دەرێ و باڵندەکەی بەو دارەوە کە لەسەری هەڵنیشتبوو هێنایە ژووری چادرێ. دارەکەی لە نیزیك سۆبە هەڵاوەسی و باڵندەکەی لەسەر داناو گوتی:

"ئێستا تۆزێکی دیکە گەرمی دێتەوەو چاوەکانی وەك چاوی جندۆکە دەکەونە بریسکە بریسك".

چاوی باڵندەکە پەردەیەکیان بەسەر هەڵکشابوو, پەڕەکانی پێکەوە نووسابوون و لاقی راستی بە بەرزگیەوە نابوو, جاروباریش لە خەوێ دا پەڕەکانی راست دەبوونەوە. پاش ئەوەی گەرمیان هاتەوە, لەپێش دا باڵندەکەو دوایە تاژی تەحسین چاویان هەڵێنان. تەحسین لە حالێك دا هەولی دەدا ئەو پێشهاتە سەیرانەی وەبیر بێنەوە, لە پێش دا تەماشای کچەکەو دوایە تەماشای بابەگەورەی کرد, ویستی قسەیەك بکا بەڵام چەنەگەی هەڵنەپچڕا.

چایەکە لەسەر ئاگرەکە زلق زلق دەکوڵی.

"ئەگەر بتوانی دەمت بکەیەوەو چایەك بخۆیەوە... ئەگەر شتێکی گەرم بچێتە نێو گەدەت بە تەواوی چاك دەبی".

بابەگەورە دەنگی خۆی رەوانتر کردو سەری بردە بن گوێی, وەك لەگەڵ کەڕێك قسە بکا نەڕاندی:

"ئەتۆ زۆر ترساوی, ئەتۆ زۆر ترساوی. ئەتۆ زۆر..."

کابرا چاوی هەڵێنان و بە چاوێکی راماوەوە چەند لەحزەیەك تەماشای کردو دووبارە چاوی پێکەوە نانەوە.

"تاژی, کوڕم کێ وەدوات کەوت و ترساندتی؟"

تاژی تەحسین جارێکی دیکە چاوەکانی هەڵێنان. ئەم جارە بریسکەی وەهۆش هاتنەوە لە چاوانی دا درەوشایەوە. باڵندەکەش کە گەرمی هاتبووەوە باڵەکانی لێك دەکردنەوەو خۆی خاوکێش دەکردو پاشان خێراو توند خۆی رادەوەشاندو چاوە تیژبینەکانی لە کالانەدا دەسووڕان.

چایەکی وەك خوێنی کەروێشکێی لە قۆرییەکە کردە ئیستیکانێکی نێوقەدباریکەوە. چایەکە هەڵمی لێ هەڵدەستا. تەحسین چاوی بڕیبووە ئیستیکانە چایەکە ـ کە هەڵمی لێ‌هەڵدەستاو ـ چاوی لێ وەرنەدەگێڕا. بابەگەورە سەری تەحسینی لەسەر چۆکی خۆی دانا, بەو کەچکە کە

چایەکەی پێ تێك وەردەدا کەمێکی چا هەڵگرت و ویستی دەزاری تاژی تەحسینی بکا, بەڵام چایەکە بە لالغاوەی تاژیدا ـ کە دەمی نەدەکرایەوەـ هەڵەڕژایە سەر ملی. پیاوە بەساڵداچووەکە چەند جار ئەم کارەی دووپات کردەوە. سەرەنجام زاری تاژی تەحسین کەمێك کرایەوەو ئەویش بە زمان لێوە نەخۆشەکانی خۆی لستنەوە. بابەگەورە ئیستیکانەکەی پڕ کردەوە لە چاو بەدەمیەوە کرد, تەحسین بەزەحمەت چایەکەی قووت دەداو هەتا زیاتری دەخواردەوە, پتر دەهاتەوە هۆش خۆی. بەم جۆرە تاژی تەحسین لەماوەیەکی کەم دا یازدە ئیستیکانی چا خواردنەوە. وەختێك وەهۆش خۆی هاتەوە تێك ڕابوو و بەناڵینەوە گوتی:

"خەریکە دێ, فریام کەون خەریکە دێ, فریام کەون ئۆمەتی محمد..."

"کێ خەریکە دێ تەحسین؟"

تەحسین هەستایە سەرپێ, بەلادا هات و دانیشتەوە:

"ئەو خەریکە دێ, ئەو ئەسپە..."

ماسوولکەی دەم و چاوی ڕێك هاتبوون و هەڵیان داویشت, چاوە داپچڕاوەکانی لە ترسان ڕاست وەك چاوی بەگومانی ئەو باڵندەیە کە لە پەنای بوو, تەماشای دەورووبەریان دەکرد.

"خاڵەوەهاب ئەتۆی؟"

"ئەمنم تەحسین"

"دەتوانم ڕزگار بم خاڵە وەهاب؟ ئەو منی کوشت"

"کێ؟"

"ئەسپی خەنەیی"

"کام ئەسپی خەنەیی تەحسین؟ ئەتۆ جارێ قسان مەکە, ئێستا هەنگوین و ڕۆنەکەرەت بۆ دێنم"

بابەگەورە هەستا, لە کووپەیەك هەنگوینی کردە تاوەیەکی دەسك دارەوەو لە کووپەیەکی دیکە ڕۆنەکەرە, تاوەکە لەسەر ئاور وەکوڵ هات و هەنگوین و ڕۆنەکەرەکە پێکەوە قاڵ بوون. بۆنێکی توندی خۆش دەوەڵاتی گەڕا, دەت گوت عەتری هەموو گوڵەکانت دە ئاوری کردوە.

خاڵەوەهاب کەچکە دارینەکەی بەپڕی بە زاری تەحسینەوە نا:

"دەمت بکەوە بخۆ"

تەحسین دەمی بەقەد دەمی بۆقێك کردەوە.

"ئێستا ئەمەی بخۆی دێیەوە سەرەخۆ"

تاژی تەحسین هەموو هەنگوین و ڕۆنەکەرە لێك دراوە قاڵکراوەکەی نێو تاوەی خواردو خەلاسی کرد. خوێن لە دەم و چاوی گەڕاو سەرگۆناکانی سوور هەڵگەڕان و گوتی:

"دیتم حەمەدۆکم دی، دەڕۆیشت، نە چەکی پێ بوو نە هیچ. بنیادەمێکی بێچەك و دەست بەتاڵ بۆ کوێ دەچێ؟ دەچێتە خانەقای چل چاو ئەمن دیتم، رام دەکرد خەبەرەکەی بدەم بە شارۆچکە کە..."

ئەمجار وەك حیکایەت خوانێکی کۆنەکار کە تازە لە نەخۆشی هەستابێتەوەو تامەزرۆی حیکایەت کردن بێ، بە ئیشتیاو دووروودرێژی و بێئەوەی ماندوو بێ یان حەوسەلەی بەسەر بچێ، داستانی حەمەدۆك و ئەسپەکەی گێڕایەوە.

"گوتت چۆن بوو؟ گوتت حەمەدۆك چۆن بوو؟ چۆن قەلافەتێکی هەبوو؟"

"پێت وایە چۆن بوو، بالای بەقەد بالای من بوو، ڕوومەتی تێك قوپیبوون، ملی وەك قونچکە هەرمێ بوو، چاوەکانی دەقووڵ کەوتبوون، دەستەکانیشی گەورە بوون، دووهێندەی دەستی من، سمێڵەکانیشی داچۆڕابوون... بەڵێ، ئاوا. حەمەدۆك بەقەد منداڵێکە".

کچەکەو بابەگەورە وەختێك گوێیان لە قسەکانی تەحسین بوو، لەپێش دا کچەکەو بەدوای وی دا وەهاب لە قاقای پێکەنینیان دا. پێکەنینێك بۆ ئێستا نەبێ بۆ کەنگێ باشە. تاژی تەحسین وەك گێژو حۆلان بە حەبەساوی تەماشای دەکردن. خاڵەوەهاب لەگەڵ پێکەنینەکەی لە پەستا لە ئەژنۆی خۆی دەدا: ئەی بڵێم خوا چت لـێبکا تەحسین وەی وەی وەی. باشە حەمەدۆك بستە منداڵێکە، ئەسپەکەشی لەگەڵ بریسکە تێکەڵ بوو سەری خۆی هەڵگرت و ڕۆیشت؟ وەی کوڕم تەحسین. وەی کوڕم تەحسین، وەی کوڕم چیت بەسەر هاتوە؟

"چیم بەسەر هاتوە خاڵە وەهاب؟"

"دەتەویست چیت بەسەر بێ تەحسین، حەمەدۆکی وا هەر لە دنیادا هەیە؟ دەستم بەداوێنت قسەی وا لەکن کەس مەکە ها! گاڵتەت پێدەکەن، پاشانیش دەکەویە بەر زاری خەڵك. داستانی ئەسپەکەشت لێرە گوت لە جێیەکی دیکە دووپاتی مەکەوە... نەچی قسەی وا بکەی ها... حەمەدۆکی وا کە تۆ دەڵێی هەر لە دنیادا نیە"

"هەیە خاڵەوەهاب. ئەمن دوێنێ بە چاوی خۆم دیتم"

"تەحسین، ڕۆڵە، ئەو کەسەی ئەتۆ دیوتە حەمەدۆك نەبووە. حەمەدۆك بە یازدە ساڵی ئەو بەژن و بالایەی هەبوو، ئەمن ماوەیەك لەمەوبەر لە ئاسیاب چەشمە دیتم. جوان چاك و بەدیمەن، قیت و قۆز وەك داری سەوڵ لەسەر پشتی ئەسپەکە چەقیبوو. ئەوەندە بەخۆوە بوو کە ئەسپەکەی هەر ئەو ئەسپە کە خەریك بوو تۆ بخوا پشتی لەبنی دا چەمابوو، دوولا هاتبووەوە،

کوڕم تەحسین نەچی بەکەس بڵێی کە ئەسپەکە خەریك بوو بت خواو ئیدی کەس ئەو قسە پڕ چاووڕاوەت نەبیسێ کە ئەسپەکە نەی‌هێشت سێ شەووڕۆژان لەسەر دارەکە بێیە خوارێ, باشە؟ بۆتۆ هیچ باش نابێ. ئەتۆ حەمەدۆکی بەقەد لادەرگایەکت کردە بستە منداڵێك, کوڕم تەحسین ئەمانە بۆ کەس مەگێڕەوە ئەگینا خۆت دەکەیە گەپجاڕی عالەم".

"بەڵام خاڵەوەهاب وەڵڵا بیللا..."

کچەکە هێشتا پێدەکەنی, هەرچەندی تاژی تەحسین پتر پێی لەسەر راستی و دروستیی قسەکانی خۆی دادەگرت, ئەو زیاتر پێدەکەنی. سەرەنجام تەحسین کە دامابوو, بە تووڕەیی گوتی:

"ئێوە باوەڕ مەکەن. ئیدی ئەمن چیم لەدەست دێ؟"

خاڵەوەهاب گوتی:

"هیچت لەدەست نایە. ئێستا باشت گوێ لەمن بێ کوڕم تاژی تەحسین. ئەتۆ پیاوێکی باشی, کوڕێکی میهرەبانی, بابیشت وەك خۆت بوو. ئەویش زۆر ترسەنۆك بوو. ئەتۆش زۆر ترسابووی".

"زۆر ترسام. ئەم ئەسپە خەریك بوو بم خوا. دەمی بۆ خواردنی من داپچڕیبوو و دەیەویست لە دارەکە وەسەر کەوێ. ئەگەر لە دارەکە بەربامەوە, کوتی گەورەم شلکەی گوێم دەبوو. لە ماڵێ دا چەکت هەیە؟"

"ئەدی, بۆچیتە؟"

"ئەو ئێستا دێ, ئەو... دێ و هەرسێکانمان دەخوا, هەرسێکمان لەت و کوت دەکا... بچمە هەر کوێ بۆنم دەکا. ئەگەر چوومە شارۆچکە دەمانچەیەك دەکڕم. وەختێك بۆنی کردو منی دۆزیەوە بە دەمانچە لێی دەدەم..."

خاڵەوەهاب بە پێکەنینەوە گوتی:

"ئەو ئەسپە گوللە کاری لێناکا, وەختێکیش ئەت هەنگاوت هاوار بە حاڵت کە چت بەسەر دێنێ... ئەو وەختەیە کە ئەسپی خەنەیی لەت و کوتت دەکا..."

تاژی تەحسین ملی بەلاوە ناو گوتی:

"راستە کە گوللە کاری لێناکا, باشە ئەی ئەمن چ بکەم لەدەست ئەو ئەسپە, روو لەکوێ کەم بۆ ئەوەی گیانی خۆم نەجات بدەم؟ خاڵەوەهاب ڕێیەکم بۆ دانێ".

"بڕوانە تەحسین, لەمەولا ئەتۆ قەت مەچۆرە جێیەك کە داری نەبێ. چارەی دیکەت نیە".

تاژی تەحسین گوتی:

"نا, پیاو نابێ دار لە هێلانەی ژەنگەسوورەی تووڕە وەربدا. وەختێك كاری وای كرد ئاوای لـێ‌دێ ئیدی. لە دەستیان رزگار نابێ".

خاڵەوەهاب لە كاتێك دا لە ناخی دڵەوە پێ‌دەكەنی گوتی:

"هیچ ڕێگایەكی رزگاربوونت نیە..."

"ئەگەر ئێستا بێ, ئەمن ڕاكەم بچمە نێو لێڕەوار؟"

خاڵەوەهاب گوتی: نایە.

"ئەگەر هات؟"

"ئەگەر هات, ئەتۆ پێت وایە ئەمن ئەم باڵندەیەم هەر بۆ راوێ راگرتوە؟ ئەم شەهێنە دەنێرمە سەر ئەسپەكەو ئیدی تەواو"

كچۆڵەكە بەدزیەوە پێ‌دەكەنی.

"شەهێنەكە دەچێ و لەسەر سەری لەنێوان هەردوو گوێی هەڵدەنیشێ, بە دەندووكێك چاوێكی هەڵدەكۆڵێ و دەری دێنێ و بە دەندووكێكی دیكە چاوەكەی دیكەی دەردێنێ و لەو گۆڕەی دادەنێ. پاشانیش ئەسپ كە لە هەردوو چاوان زەلیل بوو با هەر بەدوات دا بگەڕێ و بت بینێتەوە".

تاژی تەحسین زەردەی هاتێ, ئارام بووەوە, پاڵی وە باڵنجەكە داو چاوی لەسەریەك دانان. تاوێك دواتریش هەر لەوێ خەوی لـێ‌كەوت. وەك منداڵان لەسەرەخۆو بەلێوخڕكردنەوەوە هەناسەی دەهات.

چاك بوو نووست, چونكە تاوێك دواتر ئەو قاچاخچی‌یانە كە سێ ڕۆژ بوو خاڵەوەهاب چاوەڕێ‌یان بوو هاتنە چادرێ. خورجێنەكانیان پڕ بوون لە قوماشی ئاوریشم, سەعات و ئاڵتوون. ماڵەكەیان لە سووریە كڕیبوو و نیازیان بوو بیبەنە مەلاتیە. ئەسپی قاچاخچی‌یەكان ڕەش كوێت بوون. زین و ڕەختیشیان یەكجار جوان بوون. خورجێنەكانیان خوری بوون و فیلینتای ئەڵمانی‌یان پێ بوو. چاكەتی سورمەیی و پانتۆڵی گالیفەیان لەبەردا بوون و چەكمەی بریقەداریان لەپێ‌دا بوون. كراسەكانیان ئاوریشم بوون و كڵاوگەڕگەڕی‌یەكانیان لە قوماشی نایابی ئینگلیزی دروست كرابوون. لەبن چاكەتەكانیان چەپ و راست دوو قەد فیشەكدانیان لە خۆیان دابوون.

خاڵەوەهاب بە خۆشحاڵی پێشوازیی لە قاچاخچی‌یەكان كرد.

"سێ شەوو ڕۆژە چاوم لە جادەوە بڕیوەو چاوەڕێتانم. پێم وابوو بەڵایەكتان بەسەر هاتوە".

قاچاخچی‌یەکان هیچ تەڕ نەببوون. ئەو سەربەرگە فرەوان و جوانە لبادینە کە ئاوی دانەدەداو دەگەیشتە سەر ئەژنۆی خۆیان و کەفەڵی ئەسپەکانیان، لە باران پاراستبوونی. خورجێن و شتوومەکەکانی دیکەیان چوست و چالاك بردە ژووری تاوڵێ و گوتیان:

"خاڵەوەهاب نیگەران مەبە، کوڕەکەت لە حەڵەب مایەوە، ساغ و سلاٚمەتە".

خاڵەوەهاب دەیەویست هەواڵی کوڕەکەی بپرسێ، بەلاٚم لە ترسی ئەوەی نەوەکا بەلاٚیەکی بەسەر هاتبێ نەیدەوێرا پرسیار بکا.

"لە حەڵەب چ کارێکی هەبوو؟"

"لەوێ ماوەتەوە چاوەڕێی ئێمەیە. ئەم جار کە چووینەوە لەگەڵمان دێتەوە. بیستمان حەمەدۆك دووبارە وەکێوان کەوتوەو ئاوری کردوەتەوە"

"جارێ دانیشن... نەختێك گەرم ببنەوە، چایەك بخۆنەوە..."

"دەستەو تاقمەکانی دیکە لەکوێن؟"

"جارێ دانیشن"

خاڵەوەهاب سەربەرگە لبادینە گوڵدۆزیکراوەکانیانی، کە ئەگەر بارانە لێی دەدان ڕەقتر دەبوون، لەگەڵ کلاٚوە خوری‌یەکانیان بردە ژوورێکی دیکە. هاتەوەو لەهەر چوارلا دۆشەکی ڕاخستن و گوتی:

"فەرموون دانیشن"

کچۆڵەکە خەریك بوو چای دە ئیستیکانە نێوقەد باریکەکان دەکرد. هەرسێ قاچاخچی‌یەکە سمێڵی ئەستووریان هەبوون. یەکێکیان کە لەوانی دیکە کەڵەگەت تر بوو، "وان یکاد"یەکی چووکەڵەی زێڕی لە گیرفانی دەرێناو بۆ کچۆڵەکەی ڕاداشت و گوتی: ها ئەمە دیاریی تۆیە.

چاوەکانی خاڵەوەهاب بریسکەیان دا، قاچاخچی‌یەکان لەسەرەخۆو بە ئارامی چای گەرمیان دەخواردەوە. کیژەکە ئیستیکانەکانی پڕ دەکردەوەو ئەوانیش کلۆ قەندێکیان بە ددانان دەپچڕی و چایەکەیان بە دیشلەمە دەخواردەوە.

"دەزانن ئەو کوڕە ئازایەی خەوتوە، کێیە؟ پێی دەڵێن تاژی تەحسین، تاژی تەحسین. ئەم تاژی تەحسینە بەوە بەناوبانگە کە سێ ڕۆژەڕێ بە ڕۆژێك دەبڕێ و سێ کێوی گەورە بە دوو ڕۆژان بەجێ دێڵێ، تەنانەت ئەسپە عەرەبی‌یە ڕەسەنەکانیش ناتوانن پێشبڕکەی لەگەڵ بکەن. بەلاٚم ئەم تاژی تەحسینە بەلاٚیەکی بەسەر هاتوە خوا بەسەر دوژمنیشی نەهێنێ"

ئەمجار دەستی کرد بە گێڕانەوەی ئەو کارەساتانەی بەسەری هاتبوون. چۆن حەمەدۆك لە باقرگدیگی بریندار بوو، چۆن ژنەکانی ئاوایی شیوەنیان لەسەر کردو چۆن تاژی تەحسین بە

شەوورۆژێك خەبەری ئەنگێورانی حەمەدۆکی گەیاندە شارۆچکە. خەلکی شارۆچکە چۆن شادمان بوون و چۆنیان تاژی ئەحسین لە پوولێ دا نوقم کردو پاشان چۆن دەرکەوت کە ئەو کوژراوە حەمەدۆك نیەو کەسێکی دیکەیەو تاژی ئەحسین چۆن وەدوای حەمەدۆك کەوت, چۆنی چاو پێکەوت و چۆن دوای دیتنی وی دەگیر ئەسپی خەنەیی حەمەدۆك کەوت و ئەسپ چ بەلایەکی بەسەر هێنا, هەمووی موویەموو گێڕایەوە.

سەردەستەی قاچاخچییەکان پرسی: داستانی ئەو ئەسپە راستە؟

"بۆچی راست نیە؟ بەڕاستی ئەو ئەسپێکی وایە, لە حەمەدۆك بەولاوە کەس ناتوانێ بیگرێتەوەو کەس ناتوانێ لێی نیزیك بێتەوە. زۆر کەس تاقییان کردوەتەوە. گوللەش کاری لێناکا".

"باشە, مەسەلەی ئەو بریسکەیە کە ئەسپەکە لەنێو ئەلقەیەك بریسکەدا غاردەدا, لەگەل تیشکی بریسکە دەبێتە یەك و دەڕوا, ئەمەش وایە, ئەمەش ڕاستە؟"

خالۆوەهاب گوتی:

"بۆچی راست نیە, چما دولدولی حەزرەتی عەلی و بۆرەی کوێرئۆغلی وا نەبوون؟"

"بە هیچ جۆر ناکرێ ئەو ئەسپەی بگریەوە؟"

خالۆوەهاب گوتی:

"نا, چما گوێت لێنەبوو گوتم ئەو ئینسان فرۆشەی لەسەر دارێ ڕاگرتبوو خەریك بوو بیکوژێ؟ با بچێ دوعا بۆ گیانی بریسکە بکا.

"دەستەی دورسوونەزلە لەم دەوروبەرانەیە؟"

"رۆژی رابردوو لە ئاکجاداغ بووە".

"ئەگەر وابێ, هەتا حەوتوویەکی دیکە لەم دەوروبەرانە پەیدا نابن. ئێمە بەگیر نەهێنێ؟"

"ئەی جەندرمەکان؟"

"ئەوان لە حەمەدۆك بەولاوە چاویان هیچ نابینێ. ئەو کێوانە پڕن لە چەتە, بەلام سەری زەمان و بنی زەمانیان حەمەدۆکە. ئەویش خۆ دیار نیە, لەبن شاخێك جێیەك خۆی شاردوەتەوە".

"چەتەیەکی سەیرە".

"ئەویش چ سەیرێك. ئەمن تا ئێستا چەتەی وام نەدیوەو نەبیستوە. ماوەیەك دەرناکەوێ, ون دەبێ, ناوونیشانی کوێر دەبێتەوە. لەپڕ رۆژێك دەبینی سەروسەکوتی دەردەکەوێ و دنیایە

دەشێوێنێ. هەر ئەم رۆژانە هێزێکی گەورەی عەسکەری دەنێرنە چیاکان. ئەودەم دەبێ ئێوە تا ماوەیەك لەم دەوروبەرە دەرنەکەون. دوێنێ چیچەکلی ئۆغلی بە هەموو داروودەستەکەیەوە لێرە بوو. پێم گوت کە زۆر زوو ملی رێی خۆی بگرێ و لەم چیایانە برواو بچێتە جێیەکی دیکە".

"مەسەلەی ئەسپەکە ناتوانم باوەڕ بکەم".

"یاوەر داوای لە دێهاتی‌یەکان کردبوو کە ئەسپەکەی بۆ بگرن... دێهاتی‌یەکان لە چیاو دەشتان کەوتنە دوای، بەلاّم نەیان توانی بی‌گرنەوە"

"ئێستا رێگاکان ئاوەلاّن؟"

"ئاوەلاّن، دەستەی کەرەمە کوردە هەر کە دەگەیە چوارڕێیانی چل چاو چاوەڕێتانە. هەتا لەم چیایانە تێدەپەڕن لەگەلّتان دێ".

"یاللاّ با شتێك بخۆین".

جێی تاژی ئەحسینیان ئەولاتر لەپەنا لاپانکی چادرێ راخستبوو، هێشتا هەر خەوتبوو. ئەیرە راوی‌یەکەش لەسەر لیسی خۆی هەلّنیشتبوو و پەردەی بەسەر چاوانی هەلّکێشابوو. باللّەکانی هەتا نیزیك لاقی لێك کردبوونەوەو جارجاریش چاوەکانی لەپشت پەردەکەوە دەسووڕان.

نانەکەیان خوارد. دەرمانی ڕێیە رۆیشتنە، سواری ئەسپەکانیان بوون و وەڕێکەوتن. سەربەرگە لبادینەکانیان دەخۆیانەوە پێچاو لەبەر ئەو بارانە بە غوڕەمە وەڕێ کەوتن.

کە ئەوان رۆیشتن هەتا نوێژی خەوتنان خالّەوەهاب دایرەی لێ‌داو کچەکە گوێی بۆ راگرت. پاش نوێژی خەوتنان ماست و دۆشاویان خواردو خەوتن.

وەختێك تاژی ئەحسین وەخەبەر هات هێشتا رۆژ نەببووەوە. بە باشی ئیسراحەتی کردبوو، ماندووی حەسابووەوە. مووردەدارەکان لەنێو ئاگردانەکەدا دامردبوون و بە زوویی دەبوونە خۆلّەمێش. چادرەکە لە موو دروست کرابوو، گەرم بوو. کچ و بابەگەورە خەوێکی خۆشیان لێ‌کەوتبوو. تاژی ئەحسین پاش ئەوەی جوان چاوەکانی هەلّگلۆفین، جلەکانیی کە لە ئێوارێوە لەسەر خڕەبەردەکانی بەرئاگردان وشك ببوونەوە، کردەوە بەری. کالّەکانیی لەپێ کردنەوە. دەبوو برواو خۆی بگەیەنێتە شارۆچکەو ئەم خەبەرە خۆشە بدا بەو پیاوە کەلّەگەتەو دیسان دنیایەك پوولّ وەرگرێ. زۆر وەدرەنگ کەوتبوو. حەمەدۆك تا ئێستا لە خانەقای چل چاو هاتوەتەوەو کێ دەزانێ بۆ کوێ چووە... لە دەری چادرێ هێشتا وەك گۆزەی سەرەوژێر باران دەباری. تاژی ئەحسین لە دلّی خۆی‌دا گوتی، با بباری، دەبێ بڕۆم بۆ شارو خەبەر بەو ئاغا بالاّبەرزە بدەم و مزگێنی وەرگرم. لە تاولّێ هاتەدەر، بەلاّم دەسبەجێ گەڕایەوە. لە ئاسۆ شتێك وەك سپیایی بەیانی

شەپۆلی دەداو تارمایی ئەسپەکەش وەك هەورێکی گەورە بەسەر لێڕەوارەکە هەڵکشیبوو. تارمایی ئەسپەکە لەگەڵ تاریکایی شەو تێکەڵ ببوو و سات بە سات هەڵدەدمساو بای دەکرد. هەرچی دەبێ بلا ببێ. تەنانەت ئەگەر بەدەستی ئەسپەکەش کوژرابایە هەر دەبوو بڕوا. لە نیزیك ئاگردان چاوی بە شەهێنەکە کەوت کە لەسەر لیسی هەڵنیشتوەو بە چاوێك کە رووناکایی پۆلووی ئاگرەکە لێی داون, تەماشای دەکا: ئاها... و شەپۆلی شادمانی لەدلّی دا هەستا: ئاها ئێستا باڵندەکە لەگەڵ خۆی دەباو ئەگەر ئەسپەکە پەلاماری دا ئەوی بەردەداتە سەرو باڵندەکەش چاوەکانی دەردێنێ. بەلام ناکرێ پیاو شەهێنی خاڵەوەهاب بدزێ... لەم چیاو بەندەنانە خاڵەوەهاب لە حەمەدۆك و ئەسپەکەش بێبەزەیی‌تر بوو. خەبەری هەموو رێگرو قاچاخچی‌یەکانی کێوپارەی هەبوو. لەم کێوانە چەتەیەك نەبوو نەی‌ناسێ و ناوی نەزانێ و بۆخۆی وەرێی نەخستبێ. کێی پێ خۆش با دەی‌کوشت و کێی ویستبایە دووری دەخستەوە. چما کەس دەوێرێ بازی پیاوی وا بدزێ؟... ئەو کەسێك بوو کە بێ‌ئەوەی تەنانەت چەقوولەیەکیشی پێ بێ, بێ ترس و خۆف لەو چیاو بەندەنانە دەنووست. رێگرەکان پاش خوا ئەویان دەپەرست. تاژی تەحسین وەختێك ئەوی دی ئەگەر ددانەکانی پێك دا نەنووسابان دیسان زمانی دەگیرا. دیارە پیاوێکی زۆر باشیش بوو. گیانی وی نەجات دابوو. داخوا باڵندەکەی بەوادەی رۆژێك بە ئەمانەت وێ دەدا؟ داهاتەوە کە خەبەری بکاتەوە, بەلام پاشان بە فکری ئەوە کە لەوانەیە باڵندەکەی وێ نەدا, پەژیوان بووەوە. هاتەدەرێ. خەریك بوو دنیا رووناك بێ. باران هەروا گاڵەی دەکرد. لافاو وەرێ کەوتبوو و لە شیوو دۆڵەکانەوە دەنگی هارەهاری ئاوێ دەهاتە بەرگوێ. بەیانی وەختێك خاڵەوەهاب لەخەو هەڵدەستێ تەماشا دەکا دەبینێ شەهێنەکەی نەماوە ـ هەموو کەس دەزانێ کە ئەو شەهێنەکانی لەگیانی خۆی خۆشتر دەوێن ـ تێ‌دەگا تاژی تەحسین تەیرەکەی بردوە. هیچ توورە نابێ. یەکێك لە کورەکانی یان یەکێك لە چەتەکان بانگ دەکاو دەڵێ: بچن ئەو تاژی تەحسینە خائین و نمەك بەحەرامە کە نانی خواردوەو ناندێنی دڕاندوە بگرن, سەری ببڕن و بۆم بێنن, هیچی دیکەم ناوێ. تاژی تەحسین وەختێك بیری لەم باسە دەکردەوە دەست و لاقی رەق دەبوون. بەلام بەبێ باڵندەکەش نەی‌دەتوانی بچێتە هیچ کوێ. ئێستا ئەسپەکە لە قەراخ لێڕەواری راوەستاوەو سێبەری خۆی وەك کێوێك خستوەتە سەر لێڕەوارو سەر تاریکایی شەوو چاوەڕوانیەتی.

خاڵە لە تەنیشتی راستەوە کەوتە سەر کەلەکەی چەپی و لەخەودا راواندی. گوێ‌یەکانی گەورە بوون. تاژی تەحسین تا ئێستا لە ژیانی دا گوێی وای نەدیبوون. پێکەنینی هات و دەسبەجێش سەری باڵندەکەی گرت, لەسەر لیسەکەی ڕفاندو دەرپەڕیە دەرێ. سەری باڵندەکەی ـ کە بێ‌پسانەوە پەلەقاژەی دەکرد ـ لەبن هەنگڵی‌دا دەگوشی و ئەو لافاوەی دەبڕی کە

دەگەیشتە نێوکی, بە سەرەوژێردا غاری دەداو بەسەر بەردەکان و کۆمەڵە دڕکەکان دا بازی دەدا. کە گەیشتە لێرەوار, لەبن دارە سیدرێکی گەورە راوەستا, بن دارەکە هێندەی باران وێ نەدەکەوت. تەنانەت لەبن لکی دارەکەدا کە گەڵاکانی پان بوون و هێندێك شوێنی زەوی تەڕیش نەببوون. لەسەر جێگایەکی وەك سەکۆ دانیشت. باڵندەکە زۆری پەلەقاژە دەکردو ئارامی نەدەگرت. فکری کردەوە: کاتییە. هەستایە سەرپێ, چەند لەحزەیەك دواتر باڵندەکە هاتەوە سەرەخۆ, دەستی کرد بە جموجۆڵ, دەستی وی بەدەندووك دەگرت.

پاش کەمێك حەسانەوە رێگای چوکووراوای دیتەوە. ئیدی هێزی لەبەردا نەمابوو. باڵندەکە تا رادەیەك خووی پێوە گرتبوو و هێندە نەدەبزووت. دەندووکی بەدەستیەدا نەدەداو ئارام ببوو. کە گەیشتە "کانی پوویزار" بارانەکە لێی کردەوە. روونی کردو هەتاو دەرکەوت و شاخە تەڕەکان بریقانەوە. چاوی تاژی تەحسین و باڵندەکە بە تاو کەوتن. باڵندەکە دیسان دەستی کردەوە بە پەلەقاژە, بەڵام بەدفەڕیی نەکرد. تاوێك دواتریش ئارام بوو.

تاژی تەحسین بەیانیی رۆژی دواتر گەیشتە شارۆچکە. هەموو لەشی قوڕاوی بوو. باڵندەکەش لە قوڕدا نوقم ببوو و لەسەر باسکی تاژی تەحسین خەوی لێ‌کەوتبوو, بێ‌واز بوو, نە هەڵدەبزووقاو نە جووڵەی دەکرد. کاتێك تەحسین گەیشتە یەکەم ماڵەکانی شارۆچکە چاوێکی لە باڵندەکە کرد. ئەو تەیرە گیانی وی لە دەستی ئەسپەکە رزگار کردبوو, بەغیرەتی وییەوە بوو کە توانی بێ‌ترس و دڵەخورپە خۆی بگەیەنێتە ئێرە. ئیشەڵڵا باڵندەکە هیچی لێ‌نایەو ئەویش لە یەکەم دەرفەت دا هەڵیدەگرێ و دەیباتەوە بۆ خاڵەوەهاب.

لە شوێنی نیوەڕۆ بازاڕ دەپازدە دوکان ئەولاتر بۆنی کەباب و ترشی سماقی هاتە بەرلووتی. خەریك بوو لەبرسان دەمرد. باڵندەکە لەویش برسی‌تر بوو. بەغاردان چووە کەبابخانەکە:

"دوو شیش کەباب بە سماقێکی زۆرەوە, تەماتەش دانێ... کوتەگۆشتێکی کاڵیش بۆ ئەمە بێنە".

کەبابچی بە شاگردەکەی گوت دووشیش کەباب حازرکاو چوو مستێکی قیمەی کاڵ هێنا. هێشتا تەحسین دەستی بۆ لای پیاوەکە درێژ نەکردبوو و قیمەکەی لێ‌وەرنەگرتبوو کە باڵندەکە پەلاماری ئەو گۆشتەی دا کە بەدەست کەبابچییەکەوە بوو. بێ‌ئەوەی دەندووك لەبەری دەستی وەگوێزێ بە چاوێکی گیان وەبەرهاتووەوە کە لەگۆشتەکە بەولاوە هیچی نەدەدی, قیمەکەی قووت دا. باڵندەکە پاش ئەوەی قیمەکەی هەڵلرفاند وەك سەگێکی برسی لە چاوانیەوە ڕاما.

"هێندەی دیکەشی بۆ بێنە".

"ئەم تەیرە لەبەر قاتی ماوەتەوە".

کەبابچی دوو هێندەی قیمەکەی جاری پێشووی وەك تۆپەگۆشتێك هێناو دایە دەست تەحسین, ئەویش دووبارە گۆشتەکەی دەرخواردی تەیرەکە دا. باڵندەکە ئەم جارەیان وەك جاری پێشوو لە کاتی خواردن دا سەری بەرنەدەدایەوە. دەندووکی لێدەداو پاشان تاوێك تەماشای دەوروبەری دەکردو گۆشتەکەی قووت دەدا, دەندووکی بە پەڕەکانی پاك دەکردەوەو پاشان دووبارە بەئەداوە دەستی دەکردەوە بەخواردن.

کەباب هات. تەیرەکە خواردنی خۆی تەواو کردبوو, باڵی لێك کردبوونەوەو خۆی خاوکێش دەکرد: کەبابچی بەساڵداچوو هات و بەرامبەر بە تەحسین کە خەریکی نان خواردن بوو دانیشت. دوکانەکە مشتەریی دیکەی لێ نەبوون. لە تاژی تەحسینی پرسی:

"چ بووە براله, وەك ئەوە دەچێ شتێکت لێ قەومابێ. بڕوانە دەڵێی لە قوڕاوێیان هەڵکێشاوی".

"باران زۆر باریبوو".

"دیسانیش سەرتاپات قوڕاوی بووە"

"سەرانسەری شەوێ غارم داوە, بەڕێوە بووم".

"چ گرفتارییەکت هەبوو برام؟"

تاژی تەحسین هەم خۆش خۆشە نانەکەی دەخواردو هەم وەڵامی پرسیارەکانی وی دەدایەوە.

کوتێکی کەباب بۆ تەیرەکە هاویشت. باڵندەکە باڵی لێك کردنەوەو غاری دایە سەر مێزەکە, ئەو کوتە کەبابەی لەسەر مووشەممایەکە بوو رفاندی و قووتی دا. تەحسین ئەمجار پاروەوە کەبابێکی بۆخۆی دەخواردو پارویێکیشی بۆ تەیرەکە فڕێ دەدا... باڵندەکە لە حاڵێك دا سەرباڵەکانی دەلەرزین ئەو کەبابەی تەحسین بۆی داویشت, خێرا قووتی دەدا.

"حەمەدۆکم دی کاکە. زۆری بەدوادا گەڕام هەتا دیمەوە. قسەم لەگەڵ دا کرد. هاتوومە ئێرە خەبەرەکەی بەو پیاوە کەڵەگەتە بدەم. ئەو پیاوە باڵابەرزە گوتبووی کە... ناوەکەیم لەبیر چووەتەوە".

"ئەم شارۆچکەیە زۆری پیاوی کەڵەگەت لێهەن"

"ئەوەی ئەمن دەڵێم ئاغایەکی زۆر پووڵدارە. وەختێك خەبەری مردنی حەمەدۆکم دایە, زۆری پارە دامێ, ئەمن بوومە پووڵدار. ئاها وەبیرم هاتەوە, ناوی موڕتەزاغا بوو, وەنا؟"

"ئێستا خەبەری زیندووبوونەکەی پێدەدەی؟"

"ئەو ئاغایە بەمنی گوت ئەگەر حەمەدۆکی بدۆزیەوەو خەبەرم پێ بدەی بە پارەو ئاڵتوون خەنیت دەکەم. ئەمنیش هەموو چیاکانم سەرەوبن کردن هەتا جێیەکەیم دیتەوە".

"ئێستاش هاتووی خەبەری پێ بدەی, نا؟"

"ئەرێ".

"حەمەدۆك چۆن بنیادەمێك بوو؟"

"باریك و درێژ وەك تورلەنەمام... ئا... دووهێندەی من, شەرمێون, ئاقڵ, ئازا. چاوەکانی ڕەش و زەلام بوون. برۆشی هەر ڕەش بوون, سمێڵەکانیشی درێژ بوون. عەبایەکی گوڵدۆزیکراوی بەخۆیدا دابوو, لاوێکی بەتاقەت. ئەوەندە بەدیمەن و جوانە ناتوانی چاوی لێکەی. کەسێك بیبینێ تازە ناتوانێ لێی جیا بێتەوە, چاو لە دیتنی تێر نابێ".

"ئەتۆش هاتووی جێوڕێیەکەی بەو ئاغایە بڵێی, ئەو ئاغایەش پارەت دەداتێ, جەندرمەکانیش دەچن حەمەدۆکی دەکوژن, وەنا؟" ڕاوێژی کەبابچی لەنەکاو توند بوو, و لە حاڵێك دا ددانی لە چیڕەوە دەبردن گوتی:

"سەگبابی جاسووس, هەستە لەوێ, هەستە لەو جێیەی لێی کەوتووی, هەستە, هەستە لاچۆ لە پێش چاوم. بڕۆ بۆ جەهەننەم, سەی کوڕی سەی, جاسووسی کوڕی جاسووس. هەستە لەوێ..."

تاژی تەحسین بەسەرسوڕماوی لەجێی خۆی مابووەوە, نێوچاوانی تێك نابوو و پاروو لەزاردا, ڕەق ڕامابوو. نە دەیتوانی ئەو پارووەی لە زاری دایە بیجوێ و نە توانای ئەوەی هەبوو تفی کاتەوە.

"ڕاست بەوە, هەستە, دایك و خوشکت... قەلافەتت قرۆشێك نایەنێ هەستە هەتیوە قـ... بۆ پازدە بیست قرۆش دەتەوێ حەمەدۆکی بەکوشت بدەی, نا؟ هەستە ئەو تەیرەت هەڵگرەو بڕۆ".

پەتی باڵندەکەی لە کورسییەکە کردەوەو بەسەر تەحسینیدا دا. تاژی تەحسین پاش ئەوەی تاوێك هەوڵی لەگەڵ باڵندەکە دا چوو گرتیەوە.

"هەستە ون بە لەپێش چاوم, بڕۆ لێرە, پارەی ناپیاوێکی چەپەڵی وەك تۆشم ناوێ, یاڵڵا هەستە, بە ژەهرەمارت بێ..."

تاژی تەحسین هۆی ئەو بەلایەی نەدەزانی کە بەسەری هاتبوو. گێژوکاس تەماشای دەوروبەری خۆی دەکرد, دەت گوت هیوای بە کۆمەگی کەسێك و جێیەك هەیە, کەبابچییە قەڵەوەکە لە کاتێك دا قۆڵی تەحسینی دەگرت گوتی:

"هەتیوە پێم گوتی هەستە, دەیاڵلا دەی".

بە ڕاکێش ڕاکێش بردیە دەرێ. تاژی تەحسین لە حاڵێك دا تەیرەکە لەسەر شانی نیشتبوو, پاڵی بەدیواری بەرامبەر دوکانەکەوە دا. نەیدەزانی چ رووی داوە. کەبابچی کە لە رقان شێت ببوو, کاتێك دیتی ئەو هێشتا پاڵی وەدیوار داوەو چاوەڕێیە, پەلاماری دا. تاژی تەحسین لەنەکاو دیتی ئەو پیاوە لەندەهۆرە وەك شێتان پەلاماری داوە. لەبن قۆڵی ئەستوورو هەڵکراوی کەبابچی کە دەستی درێژ کردبوو پشت ملی بگرێ, دەرپەڕی و دوور کەوتەوەو بەنێو بازاڕدا بە سەرلێشواوی بەرەو ژوور هەڵات. کە گەیشتە دەرگای مزگەوت راوەستا خۆی بە مزگەوتێ دا کرد. چەند کەسێك لە حەوزخانەی مزگەوتێ خەریك بوون دەزنوێژیان هەڵدەگرت. خۆی گەیاندە بەلووعە ئاوێك, دەمی پێوەناو بە ئیشتیاوە ئاوی خواردەوە. ئەو کابرایە بۆچی بەوجۆرە رەفتاری لەگەڵدا کردبوو؟ تاژی تەحسین هیچ سەری لێ دەرنەدەکرد. لەلایەکیشەوە خۆشحاڵ بوو. کابرای نەفام, نازانم بۆچی هێندە تووڕە بوو کە لەبیری چوو پارەی کەبابەکەش وەرگرێ. بیری کردەوە: ئەو شارەی ئێمە بنیادەمی سەیرو سەمەرەی لێپەیدا دەبن ها... لەوانەیە شکڵ و شێوەی حەمەدۆکم پێچەوانە باس کردبێ, بۆیە قەڵس بوو. بێم راست و رەوان بۆیان باس بکەم و پێم پێبکەنن؟ پێم پێبکەنن و گاڵتەم پێ بکەن, بەڵێ؟ ها... ئێمە. خەراپ حاڵی بوون. ئەگینا هیچ مانای نەبوو کابرا لەسەر هیچ و خۆڕایی دەت گوت باڕووتیان دەقوونێ کردوە, ئاوا هار بوو. لەسەر سەکۆی حەوزخانەی مزگەوتێ دانیشتبوو. لەحاڵێك دا فکری لەو پیاوە کەڵەگەتە دەوڵەمەندە دەکردەوە, چاوی بە پیاوێکی بەساڵداچوو کەوت کە ریشێکی ئاڵۆزو روخسارێکی هێدی و هێمنی هەبوو. بەدڵی دا هات کە دەتوانێ سۆراغی ئەو پووڵدارە کەڵەگەتە لەو بپرسێ, بە دوودڵیەوە لێی نیزیك بووەوە:

"دەمەویست لەبارەی یەکێکەوە پرسیارت لێبکەم".

کابرا کە ڕیش و سمێڵێکی تێك ئاڵقاوی هەبوون, دەسحێب بەدەست و ئارام بەزەردەخەنەوە گوتی:

"بپرسە بزانم".

"پیاوێك هەیە ئا, زۆر باڵابەرزە, چەکمان دەپێ دەکا, زۆریش پووڵدارە, وەختێك ئەمن خەبەری مردنی حەمەدۆکم دایە, زۆری پووڵ دامێ".

"ئەو پیاوە ناوی نیە؟"

"نازانم, دەبێ ناوی مورتەزاغا بێ. پیاوێکی پووڵدارە, چەکمەی بریقەداری لەپێدان".

"کارت بەو پیاوە چیە؟"

"تاژی تەحسین تاوێك بیری کردەوە. ئیدی بڕیاری دابوو هەرگیز لەلای هیچ کەس باسی حەمەدۆك نەکا. بەدرۆ گوتی:

"قەرار وایە لە مەزراکەی دا کارم بداتێ..."

پیاوەکە ماوەیەك لەبەرخۆیەوە ناوی چەند کەسی بردو گوتی:

"نازانم, کەسی وام پێ شك نایە, مورتەزاغای ناناسم".

پاشان بە شێوەیەکی سەیر تەماشای روخساری وی کرد. لەم کورە لاوە وەشك کەوتبوو, لێی پرسی:

"ئەتۆ بۆ وات لێ هاتوە کورم؟ یەك تەختە بوویە قوڕ. ئەم باڵندەیە وەمن دە بچۆ حەوزخانە خۆت خاوێن بکەوە".

تاژی تەحسین چوو بۆ لای حەوزخانەکە بەڵام متمانەی پێ نەکرد باڵندەکەی بداتە دەست. پاش ئەوەی پەڕو سەرو دەندووکی باڵندەکەی جوان خاوێن کردنەوە, ئەوی لەسەر شانی خۆی داناو دەستی کرد بە خاوێن کردنەوەی خۆی و لاق و سنگ و سەروسەکوتی خۆی هەموو لە قوڕوقاڵ خاوێن کردنەوە. ئەو پیاوەی ریشە ئاڵۆزەکەی هەبوو, پێی گوت:

"ئەتۆ بەم سەروگوێلاکەتەوە سەرمات دەبێ, ستڵو جەم دەگری و دەمری. ناورێك شتێك پەیدا کە خۆت وشك وەکە".

تاژی تەحسین گوتی:

"باشە خاڵە. پیاوێکی شەل هەیە. وەستای شوێن گێرانە... کڵاوشەبقەی لەسەرە, پەتێکیشی بەملیەوە بەستوە, پەتەکەی سوور سوورە وەك ئاگر. ئەتۆ ئەویش ناناسی؟ وابزانم ناوی عەلیەشەلە".

پیاوە بەساڵداچووەکە بەپێکەنینەوە گوتی:

"ئەوی دەناسم. لە عەلیەشەلی شوێن هەڵگر دەگەرێی, وەنا؟"

"ئەرێ لەو دەگەرێم".

پیاوە بەساڵداچووەکە پاش ئەوەی بەوردی ناونیشانی مەلادۆران ئەفەندیی دایە, گوتی:

"کاك عەلیەشەل لەوێیە, برۆ وەیبینە, ئەویش ئاگرێك شتێکت بۆ پەیدا دەکا کە وشك بیەوە".

پێش ئەوەی تاژی تەحسین مزگەوتێ بەجێ بهێڵێ باران دایدایەو بەرێژنە دەستی کرد بە بارین. کەس لە کۆڵانەکان دیار نەبوو. بێئەوەی گوێ بداتە بارانە, باڵندە لەسەرشان بەو هیوایە کە

عەلی‌یەشەلی ببینێ, ئەم سەرو ئەوسەری شەقامەکەی دەپێواو دەهات و دەچوو. باران بەرەبەرە توندتری دەکرد. بایەکی تووڕەو تۆسن کە لەباشووورەوە دەهات پەڕی باڵندەکەی سەرشانی وی دەشێواندن.

مراد کۆچەر, تەنیا خۆڵ ماڵی شارۆچکە زگی بەو منداڵە باڵندە لەسەرشانە سووتا, کە وادیاربوو بۆ گەیشتن بە جێگایەك لەبەر ئەو بارانە خێراخێرا ئەم سەرو ئەوسەری شەقامەکە دێت و دەچێ. بیری کردەوە: داخوا ئەم بەستەزمانە گرفتاری‌یەکی تووش بووە؟"

"وشت. کاکە لەکەنگێوە دەبینم ئەتۆ هەروا یەك تەکان دێی و دەچی. گیروگرفتێکت هەیە؟"

تاژی تەحسین گوێی لە قسەکانی نەبوو و هەروا بە ڕێی خۆی دا دەڕۆیشت.

"وشت... وش...ت, کوڕم, وشت".

قۆڵی تەحسینی گرت و ڕای گرت. چاویان لە چاوی یەکترەوە بڕی. مراد پرسیارەکەی خۆی دووپات کردەوە, ئەویش جوابی دایەوە کە لە عەلی‌یەشەلی شەبقە بەسەری مامۆستای شوێنگێڕان دەگەڕێ.

مراد کۆچەر دەستی دەقۆڵی ڕاکردو گوتی:

"یاڵڵا وەرە بت بەمە لای وی. کوڕم تەیرەکەشت زۆر جوانە ها... هەردووکتان تەڕ بوون, هێزتان لەبەر بڕاوە. هەردووکتان نەخۆش دەکەون".

"مەلادۆران ئەفەندی, ه...ۆی مەلادۆران ئەفەندی, میوانت هاتوە".

بەخێرایی بەرەو ماڵی مەلادۆران ئەفەندی وەڕێ کەوتن.

عەلی‌یەشەل بە دەنگی مراد کۆچەر هاتە بەرهەیوانێ.

"ئا...ی مام عەلی ئەم کوڕە لەتۆ دەگەڕێ. لە بەیانی‌یەوە تا ئێستا هەروا لە بازاڕی‌دا دەخولێتەوەو دەڵێ کارم بە عەلی‌یەشەل, وەستای شوێنگێڕانە".

عەلی‌یەشەل دەسبەجێ تاژی تەحسینی ناسیەوەو گوتی:

"ئەوە دێم, زۆر سوپاس کاك مراد".

عەلی کە هاتە خوارێ گوتی: چ بووە تەحسین, بەم حاڵەوە لە کوێ ڕا دێی؟"

دەم و چاوی تاژی تەحسین کە دەت گوت دڵۆپێك خوێن لە لەشی‌دا نەماوە, وەك کاغەز سپی ببوو.

"جارێ وەرە سەرێ".

بردیە سەرێ, دەستێکی جل بۆ هێنان و لەپێشی دانان:

"هەر لەم ژوورە خۆت رووت کەوە, ئەو باڵندەیە لەوێ دانێ ئیدی"

ژنەکان و منداڵ و خزمەتکارەکانی مەلادۆران ئەفەندی دەهاتن و دەچوون و لەبارەی ئەو کورپژگە باڵندە بەشانەوە پرسیاریان لە عەلیەشەل دەکرد. سەرەنجام مەلادۆران ئەفەندییش هات. ئەویش لە بازاڕی بیستبووی کورپژگەیەك کە باڵندەیەکی لەسەر شان بووە چووەتە ماڵەکەی.

"عەلی ئەوە کێیە؟"

"ئەو کوڕەیە کە خەبەری مەرگی حەمەدۆکی بۆ هێنابووین".

"ئەو کوڕە کە هێندەی غار دابوو بێهۆش ببوو؟"

عەلیەشەل گوتی:

"راست خۆیەتی. پێم وایە ئەمجاریش خەبەرمەبەرێکی پێیە. دیسان بەغاردان هاتوە, ئەویش بەم بارانە. ئێستا لەو ژوورە خەریکە جلەکانی دەگۆڕێ".

چووە مدبەق و پانتۆڵێکی هێناو دای بە تاژی تەحسین:

"ئەمەش بکە بەرت".

تەحسین پانتۆڵەکەشی لەبەر کردو پێکەوە لە ژوورەکە هاتنەدەرێ.

"ئەم کوڕەی دەڵێم دۆران ئەفەندی".

مەلادۆران ئەفەندی گوتی: ناسیمەوە. وەرە ئێرە بزانم.

عەلی لەپێشەوەو تاژی تەحسین باڵندە لەسەرشان بەدوایدا لەو دەرگایە کە مەلادۆران ئەفەندی کردبوویەوە چوونە ژوورێکی گەورە. قەنەفەکان بە قوماشێکی سپی گوڵدۆزیکراو کە بۆنی خۆشی سابوونی لێدەهات داپۆشرابوون. مەلادۆران ئەفەندی گوتی:

"عەلی چایەکی... لەوانەیە برسیشی بێ... لەوانەیە لە رێیەکی دووریشەوە هاتبێ".

تاژی تەحسین بە خۆشحاڵییەوە گوتی: خەبەرم بۆ هێناون.

تاژی تەحسین داستانی کەباب خواردن و کەبابچییەکەی وەبیر هاتەوە. رەنگی روخساری گۆڕاو گوتی:

"کە گەیشتمە شارۆچکە کەبابم خوارد. ئەگەر چایەك هەبێ گەرمم دێتەوە".

عەلی هەستا چووە مدبەق و سێ پەرداخی گەورەی پڕ کردن لە چاو لەسەر کەشەفێکی زێو هێنانی. تاژی تەحسین هەتا چایەکەی تەواو نەکرد قسەی بۆ نەکرا. پاش خواردنەوەی چایەکە دەنگی کرایەوە. ئەودەم بەسەرهاتەکەی لە ئەوەڵ هەتا ئاخر چۆن بوو هەمووی بە وردی گێڕایەوەو لێی بووەوە. پاشان وێڕای ئاماژە بۆ ئەو تەیرە کە لەو سووچە بە دەزوویەك لە کورسییەکە خرابوو, گوتی:

"ئەم تەیرە منی لەدەستی ئەو ئەسپە نەجات دا. ئەگەر ئەم تەیرەم لە خاڵەوەهاب نەدزیبایە, ئێستا لێرە نەبووم, ئەسپەکە لەت و کوتی کردبووم".

"ئەتۆ راست بە چاوی خۆت حەمەدۆکت دی؟"

"راست بەم دوو چاوانەم حەمەدۆکم دی. یاخوا ئەگەر درۆ بکەم ئەم دوو چاوەم بتەقن و بەربنەوە سەر بەری دەستم... حەمەدۆکم دی... حەمەدۆکم دی... وەختێك دیتم نەیەویست ئەمن بزانم حەمەدۆکە".

"ئەتۆ پێشتر ئەوت لەکوێ دەناسی؟".

"بڕوانە خاڵم. ئەمن هەر لەو وەختەوە کە لە دێیەکەی خۆیان بوو دەم ناسی. ئەگەر بوو بە چەتەش هات لە دێیەکەی ئێمە مایەوە. هەموو رۆژێ چاوم پێی دەکەوت".

"زۆر باشە, حەمەدۆك چۆنە؟".

تاژی تەحسین چاوی لە عەلیەشەل کرد. ئەو سەری بەردابووەوەو قسەیەکی نەدەکرد. داخوا قسە بکان یان نا؟ هەمیشە وەختێك باسی قەڵافەتی حەمەدۆکی دەکرد, گیروگرفتێك دەهاتەپێش...

"کوڕم, حەمەدۆك چۆن شکڵ و قەڵافەتێکی هەیە, بۆم باس بکە".

"ئەتۆ ئەوت دیوە دۆران ئاغا؟".

دۆران ئەفەندی پێکەنی و گوتی:

"دەکرێ ئەم دیبێ؟"

"دەی باشە ئەتۆ چۆنت دیوە, هەروا بوو ئیدی".

"ئاخر چۆنە؟"

تاژی تەحسین خەراپ پێوە ببوو. دەیدی کە ناچارە هێندێ شت بڵێ.

"جووتە سمێڵێکی گەورەی هەیە بە قەد شاخی گا, ئەگەر دوو کەس چوارمێزیلکە لەسەر شانی دانیشن جێیان دەبێتەوە. چاوەکانیشی بەقەد چاوی ئەسپ گەورە بوون. باسکی وەك قەدەدار وان".

مەلادۆران ئەفەندی دەستی کرد بە پێکەنین و گوتی:

"ماڵت خەرا نەبێ تەحسین, ئەوەی ئەتۆ دەڵێی حەمەدۆك نیە, ئەوە تاریفێکە کە ئاشقە کوێرە لە کوێرئۆغلیی دەکرد".

"ئاها, حەمەدۆك راست وەك کوێر ئۆغلی دەچوو".

عەلی‌یەشەلیش پێ‌کەنی.
مەلادۆران ئەفەندی رووی کردە عەلی و گوتی:
"عەلی گیان, راوەستە جلەکانی ئەم کوڕە وشك وەبن, دوایە هەتا ماڵێ موڕتەزاغای لەگەڵ بچۆو بیدە دەستی, بەڵکوو قرۆشێکی بداتێ. بڕوانە بەستەزمانە چەندی زەحمەت کێشاوە. ئەو ئەسپە شێتە خەریك بوو بەستەزمانەی بکوژێ, خوا رەحمی کرد ئەو باڵندەیە"
تەحسین لە کاتێك دا هەناسەیەکی قووڵی هەڵدەکێشا گوتی:
"ئەدی, خەریك بوو بم کوژێ. ئەگەر ئەم تەیرە نەبا, چما دەم توانی لە چادرێ وەدەر کەوم و بێمە نێرە"
عەلی‌یەشەل لە کاتێك دا دەستی لە شانی وی دەدا, گوتی:
"کاکە تەحسین خوا تۆی لە دەستی ئەسپی حەمەدۆك نەجات دا"
"خوا نەجاتی دام"
مەلادۆران ئەفەندی کارێکی لە دادگا هەبوو, خواحافیزیی لەوان کردو پاش ئەوەی باڵتۆی لەبەر کردو چەترەکەی بەدەستەوە گرت لە ماڵێ وەدەرکەوت و بەبەر باران و لەنگێزەدا وەڕێ کەوت. ئەوان هەتا بارانەکە کزی کردەوەو جلەکانی تاژی تەحسین وشك بوونەوە ـ کە هەتا ئێوارێ گرت لە ژوورێ دانیشتن و قسەیان کرد. ئەمجار عەلی ئەوی هەتا بەردەرکی ماڵی موڕتەزاغا لەگەڵ خۆی بردو بۆخۆی گەڕایەوە. تاژی تەحسین کە گەیشتە دەرگای ماڵی موڕتەزاغا لەپشت دەرکی حەوشەکەوە هاواری کرد:
"موڕتەزاغا, موڕتەزاغا ئەمن هاتم, ئەمن هاتم"
موڕتەزاغا کە هاتبووە بەرهەیوانێ, بە پێکەنینەوە رووی کردە خوارێ و هاواری کرد:
"ئەتۆ بەخێر بێی, بەرەکەتت هێنا, منداڵینە دەرکەی لێ‌وەکەن بزانن و بزانین بەم بارانە کێ‌یە هاتوە"
وەرگێڕکەکان پاش ئەوەی تاژی تەحسینیان زۆر باش پرسیارکوت کرد, رێنوێنی‌یان کرد بچێتە سەرێ. ئاغا کە باڵندەکەی لەسەرشانی وی دیبوو, بەمەراقەوە پرسی:
"ئەتۆ راوکەری؟ ئەی نێچیرت کوا؟"
"ئەمن راوکەر نیم, تاژی تەحسینم, ئەوەم کە مزگێنیی مردنی حەمەدۆکم بۆ هێنای, ئەتۆش پارەت دامێ... ئێستا خەبەرم بۆ هێناوی کە... حەمەدۆکم دیت و جێ‌وڕێ‌یەکەشی پێ‌دەزانم"
چاوەکانی موڕتەزاغا بریسکەیان داو گوتی:

"لە کوێیە؟ وەی مورتەزاغا بە قوربانی ئەو زمانەت بێ. ئەمنیش ئەگەر لە پارەو زێڕو زەوی دا نوقمم نەکردی... ئەمنیش ئەگەر چوار ژنم بۆ نەهێنای... ئەمن ئەگەر تۆم... وەرە وەرە, وەرە بۆم بگێڕەوە... هەمووم بۆ باس بکە".

چوونە ژووری. تاژی تەحسین دەیزانی ئەگەر ئەوی بەگیر بێنێ نانی دەرژنی کەوتوە. لەخۆشی‌یان خەریك بوو باڵ بگرێ. هەستێکی متمانەو بروابەخۆبوونی تێدا پەیدا بوو. تەحسین پاش ئەوەی پەتی لاقی باڵندەکەی دە کورسی‌یەك خست کە لە سووچێك دانرابوو, هات و رووبەڕووی مورتەزاغا دانیشت و بە میهرەبانی‌یەوە لە چاوەکانیەوە ڕاما:

"کە پووڵەکەم لە تۆ وەرگرت هەڵاتم, بەڵام هەرچەند حەمەدۆك نەمردبوو ئەتۆ کەست وەدوا نەخستم پارەکەم لێ وەستێنێ... ئەمنیش لە دڵی خۆم دا گوتم ناتوانم هەروا قەرزداری چاکەی ئاغایەکی وا باش بم. گوتم ئەمجار حەمەدۆکی دەبینمەوەو خەبەری زیندوومانەکەی بۆ دەبەم. گوتم خەبەری بۆ دەبەم با جەنابی یاوەرو ژەنراڵ سەرجووخە عەلی کەرتیش بێن بیگرن و لەداری دەن...".

ئەمجار تاژی هەموو داستانەکەی ئارام و بەتام و خوێ و بە هەموو وردەکاری‌یەکەوە لە سیرێ هەتا پیوازێ گێڕایەوەو لە کۆتایی دا گوتی:

"ئەگەر ئەوەم پێ نەبایە, ئێستا لێرە نەبووم. ئەو تەیرە منی نەجات دا. بەڵام ئەگەر خاڵە وەهاب لەسەر تەیرەکەی ئەستۆم هەڵنەبڕێ..."

مورتەزاغا قسەکەی پێ بری:

"هەڵی نابڕێ, هەر سبەینێ سوارێك دەنێرم بۆ لای خاڵە وەهاب و شەهێنەکەت بۆ لێ‌دەکڕم. وەهاب, ئەو وەهابی دەڵێم ها. قسە لە قسەی من ناکا".

تاژی تەحسین ملی بەلاوە ناو گوتی: ئیشەڵڵا.

مورتەزاغا بە پێکەنینەوە لە حاڵێك دا ددانە زێڕەکانی سەرەوەی دەبریقانەوە دەستی لە شانی وی دا:

"کاك تەحسین, کاك تەحسین... کاك تەحسین ئەتۆ هەموو شتێکت گوت و لێ‌بوویەوەو زۆر جوانیشت تەواو کرد. بەڵام نەت گوت حەمەدۆك چ شکڵ و قەڵافەتێکی هەبوو, سەرو سیمای چۆن بوو, مووی سەری, لووتی... هیچت باس نەکرد".

تاژی تەحسین پێی وابوو ئەم بەڵایەی لەکۆڵ خۆی کردوەتەوە. بەڵام بەڵا گەیشتبووە جێ. پاش ئەوەی تاوێکی چاك فکری کردەوە کە چیی پێ بڵێ و چۆنی پێ بڵێ, بە خۆشحاڵی‌یەوە گوتی:

"ئەو وەك تۆ دەچوو, ئەویش وەك تۆ ددانی زێڕی لەزاریدا بوون كە دەبریقانەوە, ئەویش وەك تۆ پیاو بوو. ئەویش وەك تۆ زێڕی دا بەمن. زانیم ئی چەتەگەرییەیە وەرم نەگرت. چاكم كرد وەرم نەگرت, پارەی چەتەگەرییە حەرامە وەنا؟".

مورتەزاغا لە حالێك دا دەستی لە شانی وی دەدا گوتی: بریا وەرت گرتبا. موویەك لە بەرازی وەبێ تراشە.

تاژی تەحسین لە كاتێك دا دەستی وی گرتبوو گوتی:

"پێویست نیە. ئەمن دراوی رێگرانم ناوێ. ئاغایەكم هەیە وەك گوڵ, پشتم بە قەڵاتێ‌وەیە. ئەگەر ئەمن ببمە هۆی ئەوە كە حەمەدۆكی بگرن, ئەمن دەكاتە قاڕوون".

مورتەزاغا كە شووتیی وەبن هەنگڵ درابوو, گوتی:

"دیارە دەت كەمە قاڕوون. جارێ هەستە دەسبەجێ بچینە لای جەنابی یاوەر. ئەویش خێرا سەربازەكانی بنێرێتە خانەقای چل چاوو حەمەدۆكی لەنێو بەرن".

سەربەرگە لبادەكەی مورتەزاغایان هێنا, سەربەرگێكیشان وە تاژی تەحسین دا. لە دەرێ بارانەیەك دەباری دەت گوت ئاسمان كون بووە.

"باران لێی ناكاتەوە, چیاو لێڕەوار هەموو بوونە دەریا, چاك بوو لەم بارانەدا توانیم خۆم بگەیەنمە تۆ".

یاوەر بیستبووی كە تاژی تەحسین هاتوەو خەبەرێكی حەمەدۆكی پێیە. ماوەیەك بوو لەگەڵ وەكیل باشی عاصم و سەرجووخە عەلی كەرتیش چاوەڕێی بوون. لەبەر دەرگا بەسەر پێوە پێشوازیی لە مورتەزاغاو تەحسین كرد. دەستووری دا چایان بۆ تاژی تەحسین هێنا.

یاوەر بە دەنگێكی میهرەبانانە گوتی:

"باشە, بۆمان بگێڕەوە بزانم لاوە!"

تاژی تەحسین لەوە كە یاوەر راستەوخۆ قسەی لەگەڵ دەكرد لە قوولایی دلێدا هەستی بە لەخۆباییبوونێك دەكرد. ئەم جار, گێڕانەوەی بەسەرهاتەكەی لەسەرەتاوە دەست پێ‌كرد, ئەوە كە چۆن حەمەدۆك بریندار بوو, و لە ئەسپەكەی كەوتەخوار, كۆچەرییەكان بردیان لە چیای شاردیانەوە, و ئەوە كە چۆن راست لە وەختێك دا خەریك بوو بمرێ دایەحۆری بە هەناری دەلیجەقۆیاخەوە گەیشتەجێ‌و لەوێوە چووە خانەقای چل چاو بۆ لای ئاناجیخ سولتان و ئەوی هێنایە ژوور سەری حەمەدۆك و ئەویش بە مەڵحەم و دەرمانەكانی حەمەدۆكی چاك كردەوەو سەرەنجامیش گوتی هەموو ئەم زانیارییانەی وەختێك بەدوای حەمەدۆك دا گەڕاوە لەم و لەوو

بەتایبەتی منداڵان بەدەست هێناوە. پاشان باسی هێنایە سەر ئەسپەکە, پاش ئەسپەکە مەسەلەی خاڵەوەهاب و دوای خاڵەوەهاب داستانی شەهێنە راوکەرەکەی گێڕایەوەو لەکۆتاییدا لێی زیاد کرد:

"ئەم تەیرە گیانی منی نەجات دا. ئەگینا ئەسپی حەمەدۆك منی دەخوارد. ئاغاش ئەم تەیرەی بۆ لە خاڵەوەهاب کڕیوم".

"ئەتۆ چاك دەزانی کە حەمەدۆك هەر ئێستا لە خانەقای چل چاوە؟"

تەحسین گوتی:

"بەڵێ لەوێیە, بەم بارانە بۆ کوێ دەچێ, وەختێك ئەمن دەهاتم لە کوێستانێ بارانێك دەباری کە هەموو دارو گابەردەکانی لەبن ڕا هەڵدەکەندو دەیبردن. ئەو ناچێتە هیچ کوێ, هەر لەوێ گیری کردوەو ماوەتەوە".

"گوتت چەکیشی پێ نەبوو. ئەتۆ ئەوت دی, قسەشت لەگەڵ کرد, نا؟".

"بەڵێ دیم و قسەشم لەگەڵ کرد".

"گوتت بۆچی چەکی پێ نەبوو؟"

"چونکە هیچ کەس تەنانەت مستەفا کەمال پاشاش بە چەکەوە ناچێتەوێ".

"ئەگەر بچێ چ دەبێ؟"

"ناچێ".

مورتەزاغا نۆرەقسەی وەرگرت و داستانێکی لە خانەقای چل چاوو لە کەشف و کەرامەتەکەی باس کرد. هەم یاوەرو هەم وەکیل باشی عاصم هەموو ئەم قسانەیان دەزانی. مورتەزاغا قسەکانی بەم جۆرە تەواو کرد:

"ئەم خەڵکە نەزانە ئەوان دەپەرستن, ئەم کۆنەپەرستییەو ئەم قسە پڕوپووچانە چوونە مێشکی ئەو خەڵکەوە کە دەڵێی مەڕی خوان. هەزار ساڵی دەوێ بۆ ئەوەی ئەو قسە قۆڕانە لە مێشکی خەڵك بێننەدەر. ئەوانیش خەڵکی دەچەوسێننەوە, رووتیان دەکەن و خوێنیان دەمژن. ئی وا هەیە تەنیا کەڵەبابێك, یان بزنێکی هەیە, کەچی هەڵی دەگرێ و بە مەیل و ئارەزووی خۆی دەیبا بۆ خانەقای چل چاو".

وەکیل باشی عاصم گوتی:

"خانەقا پیاوی لێنین. ژنێك پیر(شێخ)ی ئەو خانەقایەیە. هەموو خەڵکی تووڕووس, ماراش, قەیسەریەو عەنتەپ مریدی وین".

"هەتا شەڕی سەربەخۆیی خانەقا پیاوی زۆر لـێبوون"
یاوەر پرسی:
"چیـیان لـێهات؟ دیارە شتێکم ئاگا لـێیە, بەڵام زیاترم بۆ روون بکەنەوە"
مورتەزاغا کەوتە هەڵپەهەڵپ و گوتی:
"بە دڵخواز رۆیشتن, وەختێك شەڕی سەربەخۆیی دەستی پێکرد هەر شازدە پیاوی خانەقا بە دڵخوازی خۆیان چوونە بەرەی شەڕ, هەمووشیان لە یەك رۆژدا لە تەنیشت یەکتر لە "دوملی نەپار" شەهید بوون. سوپای یۆنان دەیگوت: ئێمە سوپای تورك نەیشکاندین, بەڵکوو چەند پیاوی شمشێربەدەستی سپیپۆش, مێزەرسەوزی باڵابەرز کە لە پێشەوەی سوپا بوون شکاندیانین. ئەوان ئەمانیان نەداین. هەمووی قسەی پڕوپووچە. خەڵك بەمانە باوەڕ دەکەن"
یاوەر پرسی:
"راستە هەر شازدە پیرەکە بە دڵخوازی خۆیان چوونە بەرە؟"
"راستە, ئەوکاتە هەموو خەڵکی شارۆچکە چووبوونە چیا, هەموومان سەربازی راکردوو بووین. ئەمن دواتر رەگەڵ هێزی نیشتمانی کەوتم. بۆخۆم هەر شازدەیانم دین کە توورەکەیان بەسەر شانیدا دابوو, دەچوونە سەربازی. وەختێك ئەوان بەرێدا دەڕۆیشتن, خەڵکە ئەزانەکەش ئەو جێیەیان ماچ دەکرد کە ئەوان پێیان لـێدەنا".
"یانی هیچیان لەشەڕ نەهاتنەوە؟"
مورتەزاغا گوتی: نا هیچیان نەهاتنەوە.
"کەواتە ئێستا ئەو ژنە جێنشینیانە؟"وەکیل باشی عاصم گوتی: بەڵێ, ژنێکی پیرە. زۆریش تووڕەو تۆسنە, قسە لەگەڵ کەس ناکا"
یاوەر لە حاڵێك دا هەناسەی هەڵدەکێشا گوتی:
"کەوایە تا ماوەیەکی زۆر ئەم خەڵکە لەدەست ئەم کۆنەپەرستی و درۆو دەلەسەو چەوسانەوەیە نەجاتیان نابێ. بچینە هەر جێیەك ئەمانە لە پێشمان قوت دەبنەوە. کەوایە ئەمانە لە شەڕی سەربەخۆییدا لەپێش پێشەوەی سوپای تورك دا شەڕیان دەکرد"
تاژی تەحسین بە ئیشتیاو بە گەرمەوە گوتی:
"بەڵێ, ئەوان بوون, ئەوان هەموو کەس دەزانێ کە ئەوان لە پێش پێشەوەی سوپای تورك دا شەڕیان دەکرد. ئەوان چل کەس بوون. دەڵێن هەموو سەربازەکان ئەوانیان دیوە. لە گوندی خۆمان قیزعەلیـیەك هەیە... ئەویش ئەوانی لەپێش سەنگەرەکەیان دیبوو. دوژمن وەك باران گوللەی

دەباراند, بەڵام ئەوان بێباکانە دەچوونەپێش دوژمن, دوژمنیش دەیگوت مێژەرسەوزەکان هاتن و ڕای دەکرد.

"کەوایە ئێستا حەمەدۆك لە خانەقای چل چاوە, وەنا؟"

"بەڵێ لەوێیە"

"ئەگەر ئێستا بچین وەك بەدەستی خۆمان لەوێمان دانابێ, دەیبینینەوە, وەنا؟"

"بەڵێ, دەیبینینەوە"

"ئەدی ئەسپەکە, ئەتۆ دەڵێی ئەسپی خەنەیی حەمەدۆك سەرڕێمان پێ دەگرێ؟ ئەگەر ڕێمان پێ بگرێ و بیەوێ هەمووانمان بخوا تەگبیر چیە؟"

تاژی تەحسین گوتی: ئەمن شەهێنەکەتان وێ دەدەم.

یاوەرو ئاغا قاقا پێکەنین و تاژی تەحسین نەیزانی ئەوان بۆچی وا بەدڵ پێدەکەنن. وەختێك پێکەنینەکەیان درێژەی کێشا ئەویش دەستی کرد بە پێکەنین.

"زۆر باشە, ئەتۆ حەمەدۆکت دیوەو قسەشت لەگەڵ کردوە, وەنا؟"

"بەڵێ قسەم لەگەڵ کرد"

لەو وەختەوە کە تەحسین و مورتەزاغا هاتبوون, سەرجووخە عەلی دەیەویست شتێك بڵێ, بەڵام نۆرەی نەدەهات. ئەم کوڕیژگەیەی هیچ بە دڵەوە نەنووسابوو. عەلی کەرتیش لادێیی بوو, و دەیزانی خەڵکی لادێ چەند ڕوون, هەزار ڕێوی لە مێشکیان دا دەجووڵێ. ئەوان ساف و ساویلکە دیارن. کەسانی وەك مورتەزاغاو یاوەریش هەروا باوەڕیان پێدەکەن.

"سەرجووخە عەلی دەتەوێ شتێك بڵێی؟"

"بەڵێ جەنابی یاوەر"

"باشە بڵێ"

"ئەمن پێم وایە حەمەدۆك خۆی بۆ کارێکی گەورە ساز دەکا"

"مەبەستت چیە؟"

وەکیل باشی عاصم نۆرە قسەی وەرگرت:

"سەرجووخە عەلی دەیەوێ بڵێ تەواوی قسەکانی کاك تاژی تەحسین چاوڕاون".

تاژی تەحسین لەحاڵێك دا ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو, گوتی:

"نەوەڵڵا, نەبیللا, ئاخر بۆچی دەبێ چاوڕاو بکەم. تەماشا لاقانم کەن. ئەمن لەبەر خاتری ئاغای خۆم بەم لاقانەم کێوو بەندەنم بۆ دیتنەوەی حەمەدۆك پشکنین. پێنج جاران خەریك بووە بمرم خوا نەجاتی

داوم, ئاخر بۆ درۆ دەکەم؟ ئاغا زۆری پووڵ دا بەمن. لەدڵی خۆم دا گوتم دەبێ چاکەیەکی لەگەڵ بکەم و حەمەدۆك نەتوانێ ئاغاکەم بکوژێ. ئەگەر ئاغام بمێنێ دراوێکی زۆرم دەداتێ, زەوی‌یەکی باشم دەداتێ. ئەمنیش... ئەمنیش ژنێ دێنم و دەبمە خاوەن ژن و ماڵ, خەریکە وەنێو دەکەوم. دایکم پێم دەڵێ کە درەنگە, چما ناتەوێ ژن بێنێ؟... پاشانیش خوا ئەم ئاغا جوان و جوان چاکەی بۆ گەیاندم. وەختێك خەبەری مەرگی حەمەدۆکم پێدا پارەیەکی زۆری دامێ و وەختێك دەرکەوت کە خەبەری مەرگی حەمەدۆك درۆیە, حەمەدۆك دەیەوێ هەموو ئاغاکان بکوژێ لە دڵی خۆم دا گوتم هەتا حەمەدۆك ئەو ئاغا دڵپاکەی نەکوشتوە ئەمن دەبێ وەیبینم, هەتا بیگرن و ئاغام نەجاتی ببێ"

مورتەزاغا بە خۆشحاڵی لە کاتێك دا بنی چاوانی پێدەکەنی بە خۆشەویستی‌یەوە تەماشای تاژی تەحسینی دەکرد.

یاوەر پرسی: گوتت حەمەدۆکت دیوە, نا؟

"بەڵێ دیتم"

"بڵێ بزانم قەڵافەتی چۆن بوو؟ کە دەڵێن حەمەدۆك؟ چ شکڵ و قەڵافەتێکی هەیە؟ بڵێ با ئێمەش بزانین"

تاژی تەحسین تووشی دوودڵی بوو, دیسان ترساو لەگەڵ خۆی کەوتە کێشە, تەماشای چاوی مورتەزاغای کرد وەك ئەوە چاوەڕوانی کۆمەگی لێی هەبێ. مورتەزاغا بەکەیف بوو, و پێدەکەنی. هەتا ئێستا قەڵافەتی حەمەدۆکی بەهەر جۆرێك باس کردبوو کارەکەی پیس ببوو. خەڵك یان باوەڕیان نەدەکرد یان گاڵتەیان پێدەکرد. هەموو ڕووداوەکانی رێك و پێك کردبوون, تەنیا لەباسی شکڵ و قەڵافەتی حەمەدۆك دا کارەکە خەراپ دەبوو. ئەو عەلی‌یەشەلە پیاوێکی زۆر باش, زۆر ئاقڵ و زۆر تێگەیشتوو بوو, بریا لەوی پرسیبایە کە قەڵافەتی حەمەدۆك چۆن بۆ ئەم خەڵکە باس بکا. ئەودەم ئەویش پێی دەگوت کە چ جۆرە حەمەدۆکێکیان بەدڵە.

"حەمەدۆك, ئەو حەمەدۆکە راست... راست... وەك"

بێدەنگ بوو. لە دڵی خۆی دا گوتی: بڵێم وەك مورتەزاغای دەچوو؟ چاوی بە چاوی مورتەزاغا کەوت, وەك ئەوە دەچوو بەچاو پێی بڵێ وا بڵێ.

"راست وەك ئەم مورتەزاغایە دەچوو, قامکی وەك قامکی وی, چاوی وەك چاوی وی, بەڵام گوێی نەختێك گەورە بوون. گوێ‌یەکانی, ئەستۆی, شان و ملی راست وەك ئاغای من مورتەزاغا بوون. وەختێك دەمی لێك دەکردەوە, سێ ددانی وەك ددانەکانی ئاغام دەبریسکانەوە. لووتیشی وەك لووتی ئاغام, وەك دەندووکی شەهێن, بەقولاپ بوو. ئەویش وەك ئاغام جوان بوو, زۆریش جوان پێدەکەنی. تەمەنی... وەختێك گەیشتە ئێرە نەختێك بیری کردەوە:

تەمەنی... کەمێك جحێڵتر بوو. زۆریش چوست و چالاك بوو, دەت گوت تاژییە, ماندووبوونی نەدەزانی. جووتێك قۆندەرەی سووری لەپێدا بوون, عەبایەکی ماراشی بەشانیدا دابوو کە گوڵدۆزی کرابوو. یەخە کراسەکەشی وەك سفرەو دەسرۆکەی ئاوریشم وابوو. ئەنگوستیلەیەکی زێڕی نقێم سووری لەدەستیدا بوو. ئەنگوستیلەکەیان لە خانەقای چل چاو دابوویە"

سەرجووخە عەلی قەڵس بوو و گوتی:

"لێوەبڕە, حەمەدۆك کەنگێ وا بووە؟"

تاژی تەحسین ملی بەلاوە ناو پرسی:

"ئەدی چۆنە؟"

سەرجووخە عەلی گوتی:

"جەنابی یاوەر, ئێستا دەرکەوت کە ئەم کابرایە کێیەو چ کارەیە؟"

یاوەر بێدەنگ بوو. بیری دەکردەوە.

وەکیل باشی عاصم زۆر بە داووناو دەستی بە قسان کرد:

"حەمەدۆك خەریکە کەڵەکێك ساز دەکا. جەنابی یاوەر دەبێ زۆر ورد بین. ئەوە کە خانەقای چل چاویشی هێناوەتە نێو ئەو داستانە, مەسەلەیەکە دەبێ زۆری لێ ورد بینەوە. ئەو خەریکە خۆی بۆ عەمەلیاتێکی گەورە ئامادە دەکاو دەیەوێ بەهۆی پیاوەکانیەوە فکری ئێمە بۆ جێیەکی دیکە لاڕێ بکا ـ رووی کردە موڕتەزاغا ـ ئەتۆ بفەرموو موڕتەزاغا. ئەتۆ پیاوێکی دنیادیدەو بەئەزموونی, دنیات قوونەکەو کردوە. ئیمکانی هەیە هیچ دێهاتییەك وەك ئەم کوڕە بێ و بیەوێ جێگای حەمەدۆکی ئاشکرا بکا؟"

"نا, نا بەڵام ئەمە..."

"هەرکەس بێ, موڕتەزاغا..."

"ئەتۆ پێم بڵێ سەرجووخە عەلی, لەو چیاو بەندەنانە ئەتۆ چەند کەست دارکاری کردوە, کەوڵت کردوون, نینۆکت دەرهێناون, کوشتووتن, نقوستانت کردوون. توانیت لەبارەی حەمەدۆکەوە قسەیەکیان لەزاری دەرکێشی؟"

سەرجووخە عەلی کەرتیش سەری هەڵێناو دایەنەواندەوەو گوتی:

"نۆ...ی سەدان کەس, هەزاران کەس, نەك هەر راستییەکەیان نەگوت, بەلکوو لەوکاتەدا کە دوا هەناسەیان دەداو لەسەرە مەرگ دا بوون, بۆئەوەی سەرمان لێبشێوێنن وەك ئەم لاوە درۆو دەلەسەیان تێك دەکردنەوە"

رووی کردە یاوەرو گوتی: بیبەم؟

"ببووره مورتەزاغا, دەبێ هێندێ قسەی لەبن زمانی دەرکێشین"

"بەڵام جەنابی یاوەر ئەمە منداڵێکی سادەو ساویلکەیە, ئەمن پێم وایە..."

پاشان ترسا: ئەم دێهاتیی‌یانە کە وا سادەو ساویلکەن پیاو سەر لە کاریان دەرناکا, زگی هەرکامێکیان سەد رێویی تێدا دەجوولێ.

یاوەر بە توندی گوتی: ئێمە رێگاکەی دەزانین.

"رەنگە هەقی ئێوە بێ, ئێوە هەقتان بێ, بەڵام مەخابن بەستەزمانە کورێکی دڵساف بوو. قەڵافەتی وەك جاسووسان ناچێ, مەعلووم نیە, پیاو سەری لە کاری ئەم دێهاتیی‌یانە دەرناچێ. ئەمانە لە کوتەك..."

تاژی تەحسین بە چاوێکی پڕ لە پاڕانەوە وەك مەڕێك کە بیکەنە قوربانی چاوی لە چاوی وی دەکرد.

"لەسەر ئیزنی ئێوە, ئێستا دەزانین کێیەو چ کارەیە. سەرجووخە هەڵیگرە بیبە"

تاژی تەحسین پاڕایەوە:

"مەم کوژن. ئەمن تاقانەی دایکی خۆمم. بۆخاتری خوا مەم کوژن. ئەم باڵندەیە کە چاوی ئەسپی حەمەدۆك دەردێنێ دەدەم بە ئێوە"

سەرجووخە عەلی ئەوی لەگەڵ خۆی بەکێش دەکردو ئەویش لینگی دەچەقاندن و بەدەم پاڕانەوەوە هاواری دەکرد:

"ئاغا, ئاغا, هەموو ئەم بەڵایانەم لەسەر ئەو چاکەیە بەسەر هاتن کە لەگەڵت کردم. بریا نەهاتبامە ئەم شارۆچکەیە, بریا تۆم نەدیبایە, بریا ئەو حەمەدۆکە تەقیبایەو مردبایە. پووڵ و پارەی تۆم ناوێ ئاغا مەیەڵە بم کوژن. هەموو شتێك دەڵێم تەنیا مەیەڵە بم کوژن. ئەمن لەدەست ئەم عەلی کەرتیشە بستێنەوە"

"بڕوانە مورتەزاغا هەر لە ئێستاوە دەستی کردوە بە ڕاستیگوتن"

مورتەزاغا لە حاڵێك دا ددانە زێڕەکانی دەبریسکانەو پێدەکەنی. لەبەر دەرگا لەحزەیەك تاژی تەحسین لەدەستی عەلی کەرتیش بەرەڵڵا بووو غاری دا دەستی مورتەزاغای گرت:

"ئەمن مەدە دەستی وی, کەوڵم دەکا. ئەو دەم کوژێ. هەرچی بتانەوێ دەیڵێم. حەمەدۆك مرد, مرد, جەنازەکەیم بەم دوو چاوانەم دی"

"سەرجووخە هات و بەدەستە بەتاقەتەکانی گرتی و بێ‌ئەوەی گوێ بداتە پاڕانەوەو لالانەوەکەی, لەگەڵ خۆی برد. مورتەزاغا لەدوای وانەوە بە نارەحەتی هاواری کرد:

"سەرجووخە عەلی. نابێ بیکوژی"

دوای ڕۆیشتنی سەرجووخە عەلی یاوەرو مورتەزاغا لەبارەی سەردەمی شەڕی سەربەخۆییەوە دەستیان کرد بە قسان. وەکیل باشی عاصمیش بە وردی گوێی بۆ قسەکانیان راگرتبوو. بە باوەڕی مورتەزاغا هەموو ئەوانەی نیشانی زێڕیان وەرگرتبوو سەربازی راکردوو بوون و لەو ڕۆژە ڕەش و تاریکانەدا قامکی هیچ کامێکیان وەپەلەپیتکەی تفەنگ نەکەوتبوو. زۆر کەسیان هەر نەیان دەزانی تفەنگیش باوێن. لەماوەی شەڕدا هەرکامیان لە کێوپارەی لە قوژبنێك خزین و کاتێك شەڕ تەواو بوو بەناوی قارەمانی شەڕ سەروسەکوتیان دەرکەوتەوە. نازایەتیی راستەقینە یاغی و چەتەی وەك گزیك دۆران, بایرام ئۆغلی و ڕۆستەمە کوردەی شەربەت فرۆش و دێهاتییە بێبەشەکانی دیکە نیشانیان دابوو. ئەوانیش ئێستا هیچ کارە نین. خەڵکی دیکە لە دەرفەت کەلکیان وەرگرت و کێڵگەی ئەرمەنییەکان و زۆزانی کۆچەرییەکان و زەوییە دەوڵەتییەکانیان لەنێو خۆیان دا دابەش کردن و ئێستاش چاویان لە عەرزخواردن پڕ نەبووە. تاشکەن خەلیل, زولفۆ, هودایی قازیی خانەنشین کراوو مستەفا روشدیبەگ هەموویان لات و لووت بوون. هەموو ئەوانە, چامورر ئۆغلییەکان, بنەماڵەی یەگیت ئۆغلی هەموویان دابەستەی چوار پێنج ساڵەی کۆمار بوون. لەم چوکووراوایە دوو رەگەزی رەسەن و خاوەن ئەسڵ و نەسەب هەبوون. یەکیان رەمەزانییەکان و ئەوی دیکە قەرەداغلییەکان. قەرەداغلییەکان لە رەمەزانییەکانیش جێگەورەتر بوون. چونکە ئەسڵ و نەسەبیان دەچووەوە سەر تایفەی زولقەدر. لەگەڵ عوسمانییەکان ژن و ژن خوازییان لەنێودا بوو. سەردەمێك مەڵبەندی ژێر دەسەڵاتی تایفەی زولقەدر لە ماراشەوە تا مەلاتیەو خارپووت و لەوێوە هەتا سێواس دەڕۆیشت, دەوڵەتی عوسمانی هێشتا لە سووگووت گاگۆلکەی دەکردن. بەڵێ! مورتەزاغای بێفیزو خۆیەکەم گریش نە ئەو مەسەلەیە لای کەس باس دەکاو نە شەجەرەی بنەماڵەکەی کە بە ئاوی زێڕ نووسراوە, بەکەس نیشان دەدا.

سەرجووخە عەلی لە حاڵێك دا بەخۆشحاڵیو رەزامەندییەوە هاتبووە ژووری گوتی: راستیی گوت. شەلاڵی ئارەق بوو. ئارەقی دەنێو شانان پەڕیبوو.

"بەڵێ, ئەمن هەقم بوو. ئەو حەمەدۆك ناردوویە. حەمەدۆك لە کێوپارە خەریکە خۆی بۆ پێك هێنانی دەستە یاغییەکی گەورە ئامادە دەکاو لەدوارۆژێکی نیزیك دا دەیەوێ هێرش بکاتە سەر شارۆچکە. بۆچی دەیەوێ هێرش بکا؟ هۆیەکەی تێنەگەیشتم, ئاژی تەحسین نایڵێ, لەوانەیە ئەویش نەزانێ, تەنیا توانیم ئەمانەی لەبن زمانی دەرکێشم"

مورتەزاغا لە حالێك دا دەستەكانیی هەڵێنابوون گوتی:

"پیاو سەری لـێدەرناكا, پیاو ناتوانێ سەر لە كاری ئەم دێهاتیـیانە دەربكا. ئەگەر ئێوە نەبووایەن ئەو كورە بەتەواوی منی فریو دابوو. وەزعی چۆنە, حاڵ و هەواڵی چیە؟"

سەرجووخە عەلی گوتی:

"زۆر باشە. تەنانەت بەرەڵلای كەم بۆخۆی دەڕوا, هەر لە ئێستاوەو چاوی هەڵێناون"

یاوەر گوتی: باشە.

سەرجووخە عەلی گوتی:

"ئەم یەكە بێگیان نەبوو, بەساغی دەرچوو. دەبێ پیاو ئەو جۆرە ئینسانە ساغانەی دەست كەون, چل شەوو رۆژ داركاریی بكە ناڵێ وەی. ئەو حەمەدۆكەش پیاوی زۆر بژاردە هەڵدەبژێرێ ها... مەڕوانە ئەوەی فەقیرۆكە دیارە. پتەوو بەخۆوەیە. جەنابی یاوەر چیی لـێبكەین؟"

مورتەزاغا بە تكاو رەجاوە گوتی:

"بەمنی ببەخشن, ئەمن هێنامە ئێرە, بیدەنەوە دەست خۆم. لەجیاتی ئەوەی دێهاتیـیەكی وا زیرەك بەدیاری بۆ حەمەدۆك بنێرین, ئەمن دەیبەمەوە ماڵێ, برینەكانی بۆ دەرمان دەكەم و دڵخۆشیی دەدەمەوە"

"بەڵام ئەو خائینێكە"

"تكا دەكەم ئەو خائینەی بدەن بەمن"

یاوەر فەرمانی دا: بیهێنن.

تاوێك دواتر دوو جەندرمە لە كاتێك دا بن پیلی تاژی تەحسینیان گرتبوو لەگەڵ خۆیان هێنا. تاژی تەحسین لاقی تێك دەئاڵقان. چاوی لەسەریەك دانابوون. لە مل و روومەت و نێوچاوانی خوێن دەچۆڕا, لێوەكانی قەڵشیبوون و هەموو جلەكانی ونجڕ ونجڕ ببوون.

"بەرەڵلای كەن پاڵی پێ وەدیوار دەن"

پاڵیان پێ بەدیوارەوە دا. تاژی تەحسین چەند لەحزەیەك هەروا پاڵی بەدیوارەوە دابوو و رێك هاتبوو. ئەمجار وەك مردووان كەوتە سەر زەوی.

یاوەر گوتی:

"تاوێكی دیكە وەهۆش خۆی دێتەوە... ئەمنیش وام دەو مندالەڕا نەدەدی. بەرامبەر بە حەمەدۆك چۆن پارێزگاری لە شارۆچكە بكەین؟ ئەفرادمان زۆر كەمە, هێندێكیشیان تازەكارن. مورتەزاغا ئەتۆ فكرت بۆ كوێ دەچێ؟"

"جەنابی یاوەر, هەر سبەینێ دەبێ هەموو پیاوماقوولآنی شارۆچکە لەجێیەك کۆبکەینەوەو دانیشتنێکی راوتەگبیر پێك بێنین و رێگاچارەیەك بدۆزینەوە. ناکرێ مەسەلەکە هەروا لـێگەرێین"

"ئاغا, هێشتا پازدە بیست رۆژمان وەخت هەیە... ئەو بەم زووانە ناتوانێ دەستەکەی پێك بێنێ. لەوانەشە مانگێك.. لەو مانگەش دا ئێمە..."

لەو بەینەدا تاژی تەحسین دیسان چاوی هەڵێنان و لەسەریەکی دانانەوە.

"تاژی تەحسین کورم, چاوت هەڵێنان, حاڵی بووی؟"

تاژی تەحسین دووبارە چاوی هەڵێنانەوە. بەلێوێکی قەڵشیوەوە ویستی پێبکەنێ.

"چۆنی, چاکی؟"

تاژی تەحسین لە حاڵێك دا دووبارە هەوڵی دەدا پێبکەنێ, گوتی:

"وەزعم باشە, ماڵی ئاوەدان بێ سەرجووخە عەلی کەرتیش, منی نەکوشت. ئەتۆش خۆش بی ئاغا. بەڵام بریا ئەو چاکەیەت لەگەڵ نەکردبام.

## (٢١)

حەمەدۆك هەر كە لە لێرەواری هاتەدەر لەنێو گابەردەكان راوەستا. لەبن شاخەكەی رووبەرووی كانێیەك دەهاتەدەرو گۆمیلكەیەكی دروست كردبوو كە وردە خیزەكەی بنی تێدا دیار بوو. سوورەماسی لە نێو گۆمیلكەكەدا بە پۆل دەهاتن و دەچوون و لە بەردێكەوە بازیان دەدایە سەر بەردێكی دیكە. لە نێو بەردەكان دا لە هەموو جێیەك پنگ بەو گلۆوكە شینانەیەوە روابوو. بارانێكی توند رووبەری ئاوەكەی دابووە بەر زەبری خۆی. رووبەری گۆمیلكەكە وەك روخسارێكی خروێلكاوی دەچوو. ئەو لافاوانەی بە گوڕ لەسەردا دەهاتنە خوار لەحزەیەك ئاوی گۆمیلكەكەیان لێڵ دەكردو ماسیەكان ون دەبوون و پاشان تێدەپەڕین. بۆنێكی خۆش لە فەزای بەردەلانەكەو پۆلە جاترە تەڕبووەكان و ئاوو گڵی كوێستان هەڵدەستا.

حەمەد ماندوو بوو, ماوەیەك لەبەر باران لەسەر بەردێك دانیشت و پشتی بە بەردێكی دیكەوەدا. عەبا گوڵدۆزیكراوەكەی سەرشانی كە تێكەڵێك بوو لە خورییە مەڕو خوریی ئەنكەرە بەو بارانەی وێی كەوتبوو هەودای رایەڵ و پۆیەكەی ئەوەندە پاڵیان وێك دابوو كە ئاوی دانەدەدا. لە سەرانسەری درێژایی رێگادا فكری لە دایەحۆری دەكردەوەو خۆشحاڵ بوو. سۆزو خۆشەویستیی دایەحۆری بێبڕانەوە بوو, راست وەك ئاوی ئەم كانێیە كە پاك و بێخەوش هەڵدەقوڵی و هەرچی هاتبایە سەری: بنیادەم, باڵندە, پێڕۆ, دۆست و دوژمن پاكی و رووناكایی دەدا بە هەمووان. كەسێك روخساری دایە حۆریی دیبایەو خۆشەویستیی گەرمی وی چێشتبایە, دەبوو بە ئینسانێكی بەختەوەر كە نەیدەتوانی ئینسان بكوژێو كاری خەراپ بكا. دایە حۆری بۆ حەمەد هەر لە سەردەمی منداڵییەوە تا ئێستاو لە تاریكترین رۆژانی ژیان دا بوو بە هێزو توانا. بوو بە سەرچاوەی خۆشەویستی. تەنانەت پاش مردنی خەجیجێش ئەوین و خۆشەویستیی وی هیوا بە ژیانی لە

حەمەددا دروست کردەوە, لە کاتێك دا دەستی لە ئومێد بەردابوو. گەرمی و رووناکی و پاکیی خۆشەویستی‌یەکەی هەناوی حەمەدی رووناك کردەوەو ئەوی ژیاندەوە. یەکیش ئەو بەتال ئاغایە... ئەم پیاوە قسەی تێدا نەبوو... حەمەد تەنانەت ئەگەر بش مردایە خەفەتێکی لە دنیادا نەبوو. ئەگەر ئاغایەك ڕۆیشت و دە ئاغای هاتنەوە جێ, حەمەدۆکێك بمرێ, دە هەزار, سەد هەزار, سەد سەد هەزار حەمەدۆکی دێتەجێ. ئاغاکان کەمن بەڵام فەقیرو هەژار زۆر... لەو ڕۆژەوە تا ئێستا ئەم ڕستەیە ببووە بنێشتە خۆشەی سەرزاری حەمەدۆك. هەموو جارێ دووپاتی دەکردەوەو بە دووپات کردنەوەی, هەناوی رووناکتر دەبووو پڕی دەکرد لە ئەوین و خۆشەویستی‌و ئەودەم چیاکان, هەورەکان, ئەو لافاوانەی دێن و ئەو هەورەتریشقە بە گرموهۆڕانەو بریسکەکانی بە چاولێ‌کردن دەلاواندەوە. تەنانەت ئەو ناپیاوە ریوەڵەیەش کە بۆ ئینسان فرۆشتن بەرەو شارۆچکە غاری دەدا, ئەویشی خۆش دەویست... کێ دەزانێ وەختێك ئەوی بۆ دەداو بخرێ چەندە پووڵو پارە وەردەگرێ. چاوی ئەو کابرا ریوەڵەیە وەك لەشی نەخۆشێکی نۆبەتی‌دار داگیرسابوون. هەر کە چاوی بە حەمەد کەوت ئەوەندە ترسا کە دەست و لاقی رەق بوون. پاشانیش لە خۆشی‌یان بە ئاسمانان دا دەفڕی, غاردانێك بۆ ئێستا نەبێ بۆ کەنگێ باشە. ئێستا مسۆگەر گەیشتۆتە شارۆچکەو مژدانەی خۆی لە ئاغاکانی شارۆچکەو یاوەرەکانی جەندرمە وەرگرتوە. حەمەد پاش تاقیکردنەوەیەکی دوورودرێژ بۆی‌دەرکەوتبوو کە جەندرمە لە هەوایەکی ئاوا تەڕوتووشی‌دا سەری لووتیشیان لە شاری وەدەرنانێن و لەو بارەیەوە فکری ئاسوودە بوو. دەبوو ئەشکەوتێك, بەرنوایەك, شتێك لەم دەوروبەرە بدۆزێتەوە. برسیی ببوو. بریاری دابوو پاش تێرخواردن بگرەو هاتم... بگرەو هاتم! بەڵام کوێ؟ بۆ وی هەموو دنیا تەڵەبوو. لەبن هەر بەردێك, لەهەر قوژبنێك و لەبن هەر پنچکێك بەدبەختی‌یەك بۆی لە کەمین دا بوو. چۆن دەتوانێ سەیرانێ لە ئاوەدانی وەدەرخاو پێکەوە ئەو چیایانە ببڕن؟ پەنا بۆ کوێ دەبەن؟

خووی بە چەتەیی‌یەوە گرتبوو, لەمەولا چ کارێکی دیکەی لە دەست دەهات؟ پاشان دەی‌توانی خۆی بە چ کارێکەوە خەریك بکا؟ زەردەیەکی هاتێ‌و لەبەرخۆیەوە گوتی: بچمە لای ئاغایەك ببمە وەرگێڕکە, جووتی بۆ بکەم. لەوانەش بوو بچێتە چوکووراوا یان ئەدەنە, وێش دەچوو بچێتە دێیەکەی دورسوون کەناری دەریا بوو: بەراست دێیەکەی دورسوون و وان ناوی چ بوو؟ دەچووە وێ‌و دەبووە باغەوانی باغە پرتەقاڵێك: لە نێو باغە پرتەقاڵەکەدا خانوویەکی چووکەڵە بۆ خۆم و سەیرانێ دروست دەکەم, چەند ساڵ دواتریش دایە حۆری دێ, ئاگای لە منداڵەکان دەبێ. کە بەهار داهات هەوا خۆش دەبێ, لەگەڵ هەتاوی بەخشندە خونچەی تازەپشکووتوو, وەك هەورێکی سپی بەسەر باغە پرتەقاڵەکەدا دەکشێن. ئەمجار بۆنی خۆشی

خونچەلیمۆو پرتەقاڵ و نارنج ئینسانەکان، مێشەنگوینەکان، باڵندەکان، پەپوولەکان، شەهێنەکان و بۆقەکان سەرمەست دەکاو هەموو بوونەوەرەکان بە بۆنی گوڵەنارنج مەست دەبن. ئاگایان لە خۆیان دەبڕێو بێدەست کردنەوە خۆیان تەسلیمی سروشت دەکەن. حەمەدۆك جارێکیان لە وەرزی بەهاردا کە باغە پرتەقاڵەکان وەك هەورێکی سپی شەپۆلیان دەداو دنیاو بەردو گڵو هەموو شتێکیان بە بۆنی خۆش سەرمەست کردبوو، ناچار بوو شەوێکی مانگەشەو لە نێو باغە پرتەقاڵێك دا رۆژ بکاتەوە. ئاگای لە خۆی براو سێ شەووڕۆژان نەیتوانی بە جێیبێڵێ، لەبن دارێکەوە بۆ بن دارێکی دیکە لە هاتوچۆدا بوو...

سەیران بۆنی گوڵەنارنج دەگرێ، مندالەکانیان، ئەو بارانەی دەبارێ، ئەو بایە کە هەڵیدەکا، ئەو تۆزوخۆڵە کە هەڵدەستێ هەموویان بۆنی گوڵەنارنج دەگرن. مێدیترانەی مەزن و پڕ شەپۆلیش بۆنی خۆشی گوڵەنارنجی لێدێ. جووتێك کۆتری سپی دەکڕێ، لەوانە کە لە هەوا هەژدەجار سەرمەقولات لێدەدەن... لەگەڵ شەهێنێکی چووکەڵەی کەم تەمەن. ئەودەم لەبەر دەرکی ماڵە سپی کارەکەی لەسەر لیسێکی سپیی دادەنێ. لێوارەکانی دەریای چوکووراوا پڕن لە هەوێردەو حەمەد هەموو رۆژێ شەهێنەکەی دەباتە راووشکارو بەرێدەداتە سەر ئەو هەوێردانە کە لەنێو پنچکەدڕووەکان هەڵدەفڕن. دایەحۆری بە پووکە بێددانەکانیەوە لە حاڵێك دا رۆنی بە دم و لەوسان دێتەخوار گۆشت هەوێردە دەخوا. دایەحۆری کە لە ژیانیدا رۆژی خۆشی نەدیوە لە ماڵێ وی تامی بەختیاری دەچێژێ. سەیرانیش پێدەکەنێ. وەختێك ئەو پێدەکەنێ دنیا جوانتر دەبێ. چەند لەحزەیەك لەو جێیی لێیدانیشتبوو تەماشای ئاوی روون و زوڵاڵی کردو بیری لە سەیرانێ کردەوە، روخساری ویی هێنایەوە بەرچاوی خۆی، چاڵی گۆناکانی بە سووکە ئاوردانەوەیەك دەقووڵ دەکەوت و دڵی بنیادەمی پڕ دەکرد لە گەرمی و ئەوین. روخساری گەنم رەنگی دلگری شنەبایەکی مەیلەو گەرمی تێکەڵ بە بۆنێکی خۆش و نەرمی لێهەڵدەستا کە بنیادەمی لە تاوان شێت دەکرد. زۆری بۆ بەتاسە بوو. دەبوو زوو بچێتە خانەقای چل چاوو بێتەوەو سەیرانێ لەوێ هەڵگرێو پاشانیش بچێتە جێگایەك کە کەس ناوونیشانی نەزانێ... حەمەد زۆری زاراوەی "کەس ناوونیشانی نازانێ" پێخۆش بوو. قەرەچەتۆغڵانیش دەیگوت: هەتا نەچیە وڵاتێك کە کەس ناوونیشانی نازانێ، ناتوانی یارت لەبیر بچێتەوە. پاش ئەوەی چوونە وێ، چوونە ئەو ماڵە کە بۆنی سەرخۆشکەری گوڵەنارنجی لێدێ، هەم سەیران و هەم مندالەکان کاردەکەن، تەنیا دایەحۆری نابێ کار بکا. پاشانیش راستەرێ دەچێتە ئاناوارزاو گلکۆی نایب رەجەب دەبینێتەوەو شتێکی وەك گومبەزی بۆ ساز دەکا. هەرچەند هەموو کەس دەزانێ ئەو چەتە بووە، بەڵام دیسانیش دێهاتیو کۆچەرییەکان دێن و لەسەر گلکۆکەی قوربانی دەکەن و نیازی دڵیان لە داری خوار گلکۆکەی داوا دەکەن.

دەنگی تل دانی ئەو بەردانە دەهاتە بەرگوێ کە باران لە جێی خۆیانی هەڵکەندبوون و لە چیاکان ڕا هێنابوونیە خوارو هەورەتریشقە دەیان گرماند. بە وەبیرهاتنەوەی سەیران لە تامەزرۆییەکی شێتانەدا تەزووی پێدا دەهاتن و تەواوی ئەندامی لەشی سستییەکی قووڵ دایدەگرت.

هەستایە سەرپێ، بۆنی گوڵەنارنج لەبەرلووتی، هەورێك پەپوولەی سەرمەست لە دەوری سەریو کۆمەڵێك باڵندەی سەرخۆش لە دەوروبەرو لە ژوور سەری. دووسێ هەنگاوی بەرەو گۆمیلکەکە هەڵێنانەوە. لەگەڵ درەوشانەوەی بریسکە، ماسییەکی سووری ترووسکەدار راپەڕیو لە کاتێك دا رووناکاییەیە سوورەکەی لە ئاودا رەنگی دەدایەوە، چووە قووڵایی گۆمیلکەکە. حەمەدۆك زەردەخەنەیەکی بەختیارانەی هاتە سەر لێوان. چاك بوو کە چەتەیی - ئاخرەکەی هەرچی بایە - وەلانابوو. لە گابەردێکی خڕکە وەرسووڕایەوە، دوورتر ئەشکەوتێکی دی کە زارك و دەوروبەرەکەی لە دووکەڵدا رەش ببوو. هەنگاوی توندتر کردن و گەیشتەوێ. نێو ئەشکەوتەکە پڕ لە خیزو وردەبەرد بوو. دیاربوو کە لە رۆژگاری کۆن دا کانییەك لە نێو ئەو ئەشکەوتە هەڵقوڵیوەو ئەم وردەبەردانە لەو کانییە بە یادگار ماونەوە. داخوا ئەم کانییە چیی بەسەر هاتبوو؟

توێشووەکەی دەرهێنا. خورجێنەکە ئاوی دانەدابوو. دەسکری کۆچەرییەکان بە دەگمەن ئاوێ دادەدا. ئەوان لەو هونەرەدا مامۆستا بوون. نانی سێڵێو پەنیری دەرێنا، مستێکی لە سەلکە پیوازێك دا لەتی کردو دەستی کرد بە نان خواردن. وەختێك تێری خوارد هاتەوە سەرخۆی، لە دڵی خۆیدا گوتی: نابێ راوەستێ. باشترە هەتا زوویە خۆی لە دەست ئەم چیایانە رزگار بکا. دەبوو راستە رێ بچێتە باغە پرتەقاڵەکان. دەم بە پێکەنین لە خۆی پرسی: بەراست سەیران ناوی چیە؟ چ ناوێکی لێدەوەشێتەوە؟ دایکی خۆی ناوی دوونە بوو، دایکی ئەگەر کچی هەبایە ناوی دەنا چی؟ خەزاڵ. چەند ناوێکی جوانە... پاش عەبدی خان ماوەیەك چووبووە چیاو چووبووە کن کوردەکان. لەوێ کچێکی جوانی دیبوو، وەك قەرقاوڵ جوان و شۆخوشەنگ، ناوی خەزاڵ بوو. سەیران دەبوو ناوی خەزاڵ بووایە. ئەگەر کچیان بوو ناوی دەنێن خەزاڵ، هەم بۆ خۆی خەزاڵ و هەم دایکی خەزاڵ... کوردە کۆچەرییەکان گۆرانییەکی خۆشیان بۆ خەزاڵ دانابوو (رەنگە مەبەست گۆرانیی "یارخەزاڵ" بێ - وەرگێڕ -) خەزاڵ جارێك بەو چاوە ڕەشانەی ئاورێکی خۆشی وەسەر دابووو بە جارێك تەواوی ئەندامی لەشیی هێنابووە لەرزین. زۆر وەك سەیرانێ دەچوو، هەردەت گوت خۆیەتی... باغە پرتەقاڵەکان، بۆنی گوڵەنارنج، خەزاڵ و سەیران لە مێشکیدا تێکەڵ بوون. شەوێکیان تا بەیانی لەگەڵ سەیرانێ لە

قەراخ ئاکچاساز لەنێو ئەو هەمموو نێرگزە زەردەدا کە هەتا ئەژنۆیان دەهاتن، گەڕان. بایەکی نەرم هەتا بەیانی بۆنی نێرگزی هێنا. سەیران لەنێو ئەو نێرگزانەدا کە بە بۆنی خۆشیان سەرمەست ببوو، وەك ئاسك دەسلەمیەوە. لە گۆلاوەکە لێکدالێکدا دەنگی خۆشی باڵندەیەك دەهاتە بەر گوێ... سەیران سەری وەسەر ڕانی وی کردبوو خەوی لێکەوتبوو. حەمەد گوێی بۆ دەنگی باڵندەکان هەڵدەخست. زۆر ماندوو بوو، لە زۆر بەلایان نەجاتی ببوو و زۆر برینی پێوە بوون... وەختێك جەندرمەی دەدیتن، تووشی حاڵەتێکی سەیر دەبوو، نێوچاوانی گرژ دەبووو چاوی بە مۆلەق دەوەستان. رقێکی سامناکی بەرامبەر بە جەندرمەکان لە دڵی خۆیدا هەست پێکرد. ئەوان خەجیجیان کوشتبوو، برینێکی واشیان لە دڵی سەیرانێ کردبوو کە هەتا مردن چاك بوونەوەی نەبوو. حەمەد خەوی لێکەوت.

کە وەخەبەر هات باران و لافاوەکان ئارامتر بوون. لە دووری هەورە تریشقە لێیدەداو بریسکە دەکەوتنە سەر چیاکانی دوور. لە ئەشکەوتێ هاتەدەر. کەوشەکەی لاقیی گرتبوو، قەیتانەکانی شل کردنەوە.

خەریك بوو هەتاو بکەوێ کە گەیشتە خانەقای چل چاو. سێبەرەکان درێژ بوون. شۆق دانەوەی هەتاو لەسەر بەردە تەڕەکان تلۆفکی دارەکان لێڕەواری تاریکی رووناك دەکرد. لەنێو شاخەکان داو لەبن دارو دەوەنەکان گوڵە جووتێرەی سیس و ژاکاو شین دەچوون. لە گۆڕاییەیەك دا پۆلە گولالەیەکی زۆر سووری جوانی دی کە بە مل کەچی تێك چرژابوون. ئاوێکی کەف پڕژێن بە توندی بە نێو شاخە بەردئەستێیەکان دا تێدەپەڕی. دوندی چیاکەی رووبەڕووی هێندە روون بوو دەت گوت دەبریسکێتەوە. حەمەد بەرامبەر بە چیاکە راوەستا. لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەو کێوەی دەڵێن سەرتاسەری سالێ شەووڕۆژ لووتکەکەی رووناکە، دەبێ ئەم کێوە بێ.

بە دەرگایەکی تێك رووخاودا چووە ژوورێ حەوشەی. بەردە سپییەکانی نێو حەوشەی ئەم شوێنە پیرۆزە دەت گوت شۆراون، هەموو جێیەك رووناك و درەوشاوە بوو. داهاتەوەو عەرزی ماچ کرد، کە گەیشتە نێوبەندی حەوشەی جارێکی دیکە داهاتەوە. هەستێکی نامۆ، تێکەلاوێك لە ترس و ئەوین نیشتە هەناوی. هەتا شیپانەی هات، لەوێ چۆکی دادا، داهاتەوەو سێجار شیپانەی ماچ کرد. بە کرانەوەی لە نەکاوی دەرگاکە تێك ڕابوو. ئەو پیاوە کەلەگەتە کە دەستی بەتای دەرگاکەوە بوو، چاوەڕوانی بوو.

هەستا، بەدەمیەوە پێکەنی. پیاوەکە وەپێشی کەوت. بە جێیەکی تاریك دا ڕۆیشتن و گەیشتنە شوێنێکی تاریکی دیکە پاشان گەیشتنە سالۆنێکی گەورەی رووناك. ئاناجیخ سولتان بە جلی

سپی‌یەوە لەسەر لبادێك دانیشتبوو، دەسحێبی نەوەدونۆ دەنکیی بەدەستەوە چاوەڕوانی وی بوو. حەمەد چوو لە بەرامبەری‌دا دەست لەسەر سنگ راوەستا. دەستی ئاناجیخ سوڵتانی گرت، سێ جاری ماچ کردو لەسەر سەری خۆی دانا. ئاناجیخ سوڵتان دەستی گرت و لە پەنا خۆی دانا. تاوێك پێ‌چوو قاوەیەکی بۆنخۆشیان هێنا. حەمەد دەستی دەلەرزی‌و دەسکە فنجانەکەی بۆ نەدەگیرا. ئەمە لەبەرچاوی ئاناجیخ سوڵتان ون نەبوو. فنجانەکەی لەسەر کەشەفەکە هەڵگرت و بۆی ڕاداشت. ئەم کارە ئەوی زیاتر پەشۆکاند.

"چاوەڕێت بووم حەمەدۆك، بەخێراتی کوڕم، وەزعت باشە؟"

حەمەد بە شەرمێکی منداڵانەوە لە حاڵێك دا خوێن لە دەم و چاوی چڕژابووو رەنگی تێك چووبوو گوتی:

"باشم دایە."

لە ژوورەکەدا لە شمشێری گۆڕین بەولاوە شتێك بەرچاو نەدەکەوت، هەر لە منداڵی‌یەوە تا ئێستا زۆر شتی لەبارەی ئەم شمشێرەوە بیستبوو، لەمێژ ساڵبوو لەم چیایانە گۆرانی‌بێژو ئاشق و بەیت بێژەکان داستانی ئەم شمشێرە بەدیوارهەڵواسراوەیان دەگێڕایەوە، لە هەردوولای ئەم شمشێرە نۆسەدو نەوەدونۆ ئایەت و حەدیس نووسرابوونەوە. شمشێرێك بوو ئەفسووناوی. ئەو شازدە پیاوەی لەم خانەقایەوە چوونە شەڕی سەربەخۆیی‌و هیچیان نەگەڕانەوە هیچ کامیان ئەم شمشێرەیان لەخۆیان نەبەست و نەیان برد. بۆچی ئەم شمشێرە ئەفسووناوی‌یەیان لەگەڵ خۆ نەبرد؟ لەوانەبوو ئەگەر لەگەڵ خۆیان بردبایە، یەکێکیشیان لووتی دەخوێن نەهاتایەو هەموویان بە ساغی گەڕابانەوە خانەقای خۆیان. ئیدی پیاوێك لە خانەقایەدا نەمابوو کە شمشێری حەسەن بەگی لە قەدی خۆی بەستی‌و شمشێرەکە بە غەمناکی بە دیوارەوە هەڵاوەسرابوو. حەمەدۆك هەرچەندیش پیاوێکی باش بێ دیسان ناتوانێ ئەم شمشێرەی پێ بێ، تەنانەت ئەو کەسانە کە لە تۆرەمەی حەسەن بەگیش بوون و دەیان توانی ببنە خاوەنیشی، نەیان وێرابوو شمشێرەکە لە دیواری بکەنەوەو لە قەدی خۆی بەستن و بچنە شەڕ. تەنانەت یەکێکیشیان لە شەڕی سەربەخۆیی نەهاتەوە.

"حەمەدۆك کوڕم، بیر لە چ دەکەیەوە؟ چاوت پڕیوەتە شمشێرەکە"

"دەڵێم بۆچی پیرەکانمان وەختێك دەچوونە شەڕێ شمشێرەکەیان لەگەڵ خۆیان نەبردوە؟"

"تاقەتیان پێ‌نەشکا شمشێری حەسەن بەگی هەڵگرن. بابم، براکانم، مامەکانم هەموویان لەبارەی ئەم شمشێرەوە... شمشێری حەسەن بەگ... دەیان گوت هەموو کەس تاقەتی پێ‌ناشکێ هەڵی‌گرێ. ئەوان لەو شمشێرە دەترسان.

سوڵتان سەلاحەددینی ئەییووبی شمشێرە پیرۆزەکەی خۆی بە دیاری دا بە حەسەن بەگ. هەر ئەم شمشێرە لە دەستی وی‌دا توانی قودس و شامی شەریف لە بەرامبەر زرێ‌پۆشانی خاچ لە مل دا بپارێزێ. ئاخرەکەش سەلاحەددین لەسەر ئەو خاکە پیرۆزانە شەهید بوو. ڕۆژێکیان بەیانی کە سوڵتان سەلاحەددینی ئەییووبی بە شەکەتی لە خەو هەڵدەستێ, حەسەن بەگی بانگ دەکاتە کن خۆی‌و دەڵێ: ئەتۆ بەو هەتاوە کە خەریکە سەر دەردێنێ, بەو نوورە کە دنیایە ڕووناك دەکاتەوە, بە گەڕانی ڕۆژگارو بە دەشت و قودسی پیرۆز, بە خاکی پڕپیت و چیمەنی سەرسەوز سوێند دەدەم کە لەمەودوا بەم شمشێرە لە دژی زرێ‌پۆشانی خاچ لە مل شەڕ بکەو شمشێرەکەش مەدە بە کەس. ها, بگرە شمشێرەکەو سەربازەکانت هەڵگرەو بڕۆ ئەو جێیە کە هەتاوی لێ ئاوا دەبێ.

حەسەن بەگیش شمشێری پیرۆزی دەست دابوویەو بە ڕەفیقەکانیی گوتبوو: یاڵلا بڕۆین بۆ غەزا, دەبێ بچینە خاکی ئاناتۆلی و ڕۆم.

لە دۆڵی قوونیە لەگەڵ زرێ‌پۆشانی خاچ لەمل کە شمشێری درێژدرێژیان پێ‌بوون بەرەڕوو بوون. ژمارەیان زۆر بوو. دەریایەك لەشکر. بەرگی ئاسنیان کردبووە بەرو جلەکانیان جرینگەجرینگی لێ‌دەهات. ژمارەی لەشکریانی حەسەن بەگ کەم بوو. ژمارەی نەفەراتی لەشکری دوژمن ٣٠ هێندەی نەفەراتی حەسەن بەگ بوو. لە دەشتی قوونیە شەڕێکی بێ بەزەیی‌یانە دەست پێ‌کرا. ئەو ڕۆژە لە پازدە هەزار کەس شەڕکەری حەسەن بەگ دە هەزاریان کوژران. سیسارگ و قالاوی دەشتی قوونیە لە گۆشتی بنیادەم تێربوون. وەسبەینێ‌ڕا پاشماوەی لەشکریانی حەسەن بەگیش کوژران. حەسەن بەگ بە خۆی و چل کەس لە نەفەراتی خۆیەوە پەنایان بۆ کێوێکی جوان و بەشکۆ برد کە لەو نیزیکانە بوو. دوژمن بە نەفەراتی خۆیەوە کە یەکجار زۆریش بوون دەوراندەوری کێوە بەرزو بەشکۆیەکەی گەمارۆدا. حەسەن بەگ تا ڕۆژئاوا لەگەڵ زرێ‌پۆشەکان کە وەك شارە مێروولە کێوەکەیان داگرتبوو شەڕی کرد. بەرەبەری ئێوارێ تەنیا سێ کەس لەسەر لووتکەی کێوەکە مابوون. ئاورێکی خۆشیان کردەوەو ئیسراحەتیان کرد. ئەو ئاورەی کردبوویانەوە, هەموو دەشتەکەی وەك ڕۆژ ڕووناك کردبوو. بەیانی حەسەن بەگ وەك گورگ لە مەڕی بدا خۆی بە نێو لەشکری دوژمن دا کرد. حەسەن بەگ و سێ ڕەفیقەکەی جەنگەی نوێژی نیوەڕۆیە شەهید بوون. دوژمن زۆر خۆشحاڵ دەبێ. فەرماندەری سوپای دوژمن دەستوور دەدا دەڵێ شمشێرەکەی وەبینن و بۆم بێنن. ئەو شمشێرە ریشەی دەرهێناین و وەجاخی کوێر کردینەوە. هەرچەندی لە شمشێرەکە دەگەڕێن نای‌بیننەوە. دێنەوەو داستانەکە بۆ

فەرماندەری قشوون دەگێڕنەوە. فەرماندەر دەڵێ: ئەم کارە نهێنی‌یەکی تێدایە. ئێستا کە شمشێرەکەتان نەدیوەتەوە, جەنازەی حەسەن بەگ وەبینن و سەرەکەیم بۆ بێنن. بەرگ ئاسنینەکان دێنەوە تەماشادەکەن جەنازەکەش دیار نیە.

وەسبەینیڕا دێهاتی‌یەکان دێن دەبینن چل جەنازە بە تەنیشت یەکەوە درێژبوون. هەر چل کەسیان زەردەیان لەسەر لێو بوو, حاشا لە دڵۆپە خوێنێکیش کە بە لەشیانەوەبێ, دەت گوت خەوێکی خۆشیان لێکەوتوە. دەیان شۆن, کفنیان دەکەن و بە خاکیان دەسپێرن. لەپڕ دەبینن... چ ببینن باشە؟ دەبینن شمشێری حەسەن بەگ هاتوەو راست لەسەر گلکۆی حەسەن بەگ چەقیوە. دەیانەوێ شمشێرەکە بگرن, هەرکە دەستی بۆ درێژ دەکەن شمشێرەکە بە عەرزیدا دەچێتە خوارو کە ئەوان دەکشێنەوەو وردەوردە لە عەرزی دێتەوە دەرو رادەوەستێ. ئەوان هەرچەندی هەوڵ دەدەن, شمشێرەکە بگرن, شمشێرەکە خۆیان بە دەستەوە نادا. لەو بەینەدا پیرێکی پیاوچاك دێ هاوار دەکا: دەستوورە, ئۆمەتی محمد دەستوورە کە ئەم شمشێرە هەتا نەزەرکردەیەك لە تۆرەمەی حەسەن بەگ پەیدا نەبێ و نەیەتە سەری هیچ کەس ناتوانێ دەریبێنێتەوەو هەڵی‌گرێ. وەختێك ئەو هات, دەچێتە سەر ئەم چیایە, ناویشی حەسەنە. ئەم شمشێرە پیرۆزە تەنیا ئەو دەتوانێ بەرزی کاتەوە... لە ئێستاش ڕا هیچ پاڵەوانێك ناتوانێ ئەو شمشێرە لە جێی خۆی دەربێنێ...

چەند ساڵ و چەند ساڵ تێ‌پەڕین. هەتا وەختێك پیرێك بە ناوی حەسەن هاتە خانەقای چل چاو, ئەو شمشێرە لەسەر گلکۆی حەسەن بەگ و ڕەفیقەکانی پاسەوان بوو. ڕۆژێك لە ڕۆژان لاوێکی حەڤدە ساڵە دێو دەچێتە سەر چیا ژوورسەری بابەگەورەی خۆی, حەسەن بەگ و شمشێرەکە دەبینێ. لە ترسان لێی نیزیك نابێتەوە. شمشێرەکە وەڕێدەکەوێ دێتە لای نۆجوانەکەو دەسکی خۆی وەدەست دەدا. ئەویش شمشێرەکە هەڵدەگرێ و دەچێتە خانەقا.

لەو ڕۆژەوە ناوی ئەو چیایە دەبێتە حەسەن کۆو لەو ڕۆژەش بە دواوە هەتاو کە هەڵدێ لە پێش دا دەچێتە سەر لووتکەی حەسەن کۆ, نەختێك لەوێدا دەنیشێو پاشان تێ‌هەڵدەبێو دەچێتە ئاسمان"

ڕۆژ ئاوابوو, ئاناجیخ سوڵتان نوێژەکەی کردو چووە ئاشپەزخانەو چێشتێکی بۆغۆشی بۆ حەمەد لێنا. پاش نان خواردن تا لای نیوەشەوێ بێدەنگ لە پەنای یەك دانیشتن. سەرەنجام ئاناجیخ سوڵتان بێدەنگیی شکاندو پرسی:

"بێدەنگی حەمەدۆك, کوڕم گیرو گرفتێکت هەیە؟"

حەمەدۆك گوتی:

"ئاناجیخ سولتان, دەمەوێ واز لە کێوپارە بێنم, چەتەیی بۆ من نابێ, تا ئێستا بە کاری هیچ نەهاتووم. دەمەوێ حەمەدۆکی بکوژم. هاتووم تەگبیروڕا لەگەڵ تۆ بکەم"

"چۆنت پێخۆشە وابکە"

"ناتوانم, بچمە کوێ, چ بکەم؟ سەرێك خێزانم هەیە, ژنێکم هەیە. لەو خوارە لە گوندی وایوای چاوەرێمە"

"جێیەکت نیە رووی تێکەی؟"

"نا ئاناجیخ سولتان, ئەگەر حەمەدۆك بمرێ, زۆر حەمەدۆك جێگای دەگرنەوە, فەقیرو هەژار زۆرن ئەوانی دیکە کەم... ئەمن بچمە کوێ؟"

بێدەنگ بوون و دەفکرەوە چوون. حەمەدۆك چاوی بڕیبووە شمشێری پیرۆزو چاوی لێوەرنەدەگێڕا. ئەو شمشێرە بێ ساحێب مابوو. داخوا لەمەودوا پیاوێك پەیدا دەبێ کە هەڵیگرێ:

"ئاناجیخ سولتان, ئەگەر نەرۆم و لەم کێوانە بمێنمەوە, نابێ. دەبێ هەموو تەمەنم لێرە بەرمەسەرو ئاخرەکەشی بە گوللەیەك..."

کورت و کرمانجی حەمەدۆك دەیەویست دەستووری پێبدا. چاوەڕوان بوو بڵێ مەڕۆ حەمەدۆك, وەمێنەو درێژە بە یاغیگەری و چەتەیی بدە, چارەنووسی تۆ ئەمە بووە, ناتوانی چارەنووسی خۆت بگۆڕی. ئەگەر ئەو وایپێگوتبا کار تەواو بوو.

"دڵت چۆنی پێخۆشە وا بکە"

"باشە ئاناجیخ سولتان"

ئاناجیخ سولتان هەستایە سەرپێ. دەستە کلیلەیەکی لە گیرفانی دەرهێنا. لەبن سندووقێك دانیشت و کردیەوە. ئەنگوستیلەیەك کە لە مەخمەرێکەوە پێچرابوو, هێنایو گوتی:

"ئەمە مۆری خانەقایە. پاش من ئەم وەجاخە کوێر نابێتەوە. با لەکن تۆ بێ. ئەگەر چوویە مەلاتیە بچۆ خانەقای"ئاگوایجین" ئەنگوستیلەکە دەرمەهێنە, بە کەلکت دێ. وەختێك ئەم وەجاخە کوێربووەوە هەر نەبێ با ئەم ئەنگوستیلەیە لە دەستی پیاوێکی باش دا بێ"

دەستی راستی ویی گرت و بەسپایی و لەسەرەخۆ ئەنگوستیلەکەی لە قامکی نێوەڕاستیی کرد. دەت گوت ئەنگوستیلەکە بۆ دەستی وی دروست کراوە, پڕ بە قامکی بوو.

"بە باوەڕی من ئەم شمشێرە هەقی تۆیە, بەڵام ئەم شمشێرە نادەم بەکەس, ئەگەر مردم شمشێرەکە بۆ خۆی چارەی کاری خۆی دەکا"

حەمەدۆك دەستەو نەزەری راوەستا. سێ جاری دەست ماچ کردو لەسەر سەری دانا. ئەوجار بە خۆشحاڵی‌و نوقمی رووناکی و بە هیوایەکەوە کە لە دڵی‌دا پەیدا ببوو بەحاڵەتێکەوە کە دەت گوت تازە لە دایکی خۆی بووە, گوتی:

"ئەمن چاوەڕێی فەرمانم"

هەناوی پاك و بێ خەوش بوو.

"باچێشتێکت بۆ لێ‌نێم. پاشان بەو خۆرەتاوەت دەسپێرم کە هەڵدێ"

کەمێکی مابوو هەتاو بکەوێ کە پێکەوە چێشتەکەیان خوارد.

نوورێك لە دڵی‌دا دەدرەوشایەوە, نوورێك کە وەك تۆفان دەی‌گوڕاند و دەی‌گرماند. وا بە سەرەو ژێری‌دا دەڕۆیشت کە دەت گوت هەموو ئەندامی لەشی باڵیان گرتوە, لەلای راست لە نێو دارستانی دەنگی شیوەن و گریان دەهات.

کە گەیشتە چوار ڕێیانەکە راوەستا. گوێی بۆ دەنگی شیوەنەکە هەڵخست. لێی‌ببوو بە مەراق. لەسەر بەردێك دانیشت و چاوەڕێ‌ما. دەنگی تازیەباری‌یەکە بەرەبەرە نیزیکتر دەبوو. لە پێش دا تابووتەکەی دی. لەسەر تابووتەکە کوڕە جحێڵەیەك دیاربوو کە تازە خەتی سمێڵی دابوو. رەنگی مردوەکە زەرد بوو. دەستەکانی لەسەر تابووتەکەوە بەم لاولادا بەرببوونەوەو رادەژان. ئەوانەی تابووتەکەشیان هەڵگرتبوو جحێڵ بوون. دەم و چاوی هەر شەش کەسیان دەت گوت سەهۆڵ بەستوویە. هاتن و رووبەڕووی حەمەدۆك راوەستان, ئەویان نەدەدی. بە چاوێکی سرکەوە تەماشای چەپ و راستی خۆیان دەکرد. ئەو تابووتەی لەسەر شانیان بوو, لەسەر گابەردێکیان دانا, دەستەکانی مردووەکەیان هاویشتەوە سەرسنگی. تاوێك دواتر ژنانی شێن گێڕو حەشیمەتی جووتیارەکان دەرکەوتن. هاتن و لە دەوری جەنازەکە کۆڕیان بەست.

حەمەد هەستایە سەرپێ, لەپێش پیاوێکی ریش سپی کە لە پەنای بوو, راوەستاو بەسپایی پرسی:

"بۆخۆتان خۆش بن, ئەم لاوە چیی بەسەر هاتوە؟"

پیرە پیاو گوتی:

"یاخوا حەمەدۆك وەجاخی کوێربێتەوە, دوێ شەوێ هێرشی کردە سەر دێیەکەمان, ئێمەیان رووت کرد, دەستیان بۆ نامووسی کچەکانمان درێژ کردو ماڵ وێرانیان کردین"

لەو بەینەدا حەشیمەتەکە کە ئەوانیان پێکەوە دیبوو, یەك یەك هاتنە لای وان و کۆبوونەوە.

پیرەپیاو کە ریشە سپی‌یەکەی بە فرمێسکان تەڕببوو, گوتی:

"ئەمە کوڕی هەرە چووکم بوو. لەسەر هیچ و خۆڕایی وەبەر تفەنگانیان دا"

یەکێك لە حەشیمەتەکە گوتی:

"یاخوا حەمەدۆك لە هەردووچاوان زەلیل بێ, یاخوا کوێربێ..."

ژنێك کە لە ژوور سەری تابووتەکە دانیشتبوو لە حالێك دا خۆی رادەژاند ئارام ئارام بە مردووەکەی هەڵدەگوت, حەمەدۆکی لە گۆڕ ڕادەکردو دەیهێنایەوەدەر.

حەمەد ناڕەحەت بوو, دەت گوت دنیای بەسەردا رووخاوە. چاوی دەڕەشەوە هاتن. خۆی بەسەر پێوە ڕانەگرت و بە زەحمەت توانی خۆ بگەیەنێتە ئەو بەردە کە لەپێش دا لەسەری دانیشتبوو, خۆی بەسەر بەردەکەدا دا, سەری دەنێو دەستانی گرت و گرمووڵە بوو.

ئەوانەی لەوێ بوون هەمووان ئەم وەزعەیان دی. ئەوانەی لە دەوری جەنازەکە بوون بەجێیان هێشت و هاتنە کن وی.

پیرە پیاوەکە پرسی:

"رێبوار, ئەتۆ کوڕەکەمت دەناسی؟ بەچکەشێرەکەم برادەرت بوو؟ ئەو دۆستی زۆر بوون"

"دنیا بۆی بە پەرۆشە"

"وەجاخی حەمەدۆکی کوێربێتەوە!"

"وەبەر گوللەی گەرم کەوێ"

"رەبی کەلاکی بکەوێتە بەر سەگان و لەت و پەتی کەن"

"یاخوا ببێتە خۆراکی قەل و داڵ"

هەرکەسە شتێکی دەگوت, بەڵام حەمەد وەخۆ نەدەهاتەوە. ناڵەو تووك و دوعای ئەو حەشیمەتە کە لە دەوری حەمەدۆك کۆببوونەوە درێژەی کێشا. سەرەنجام پیاوێکی کەڵەگەت کە لەچاو ئەوانی دیکە جل و بەرگێکی باشتری لەبەردا بوو, زنجیر سەعاتێکی بەخۆیەوە هەڵواسیبوو دەمانچەیەکی بەقەدیەوە بوو, لە نێو حەشیمەتەکەرا هات قۆڵی حەمەدۆکی گرت و گوتی:

"حەمەدۆك بە جێی خۆی, ئەگەر جندو پەرییش بێ نایەڵم خوێنی براکەمان, حەسەن بە فیڕۆ بچێ. شەش براین, تۆڵەی خۆمان دەستێنینەوە. ئەتۆ حەسەنت لە کوێ دەناسی؟"

حەمەد سەری هەڵبڕی, بریسکە پۆڵایینەکەی گۆرین هاتبووە نێوێ چاوانیەوە, بەڵام هێشتا مات و پەرێشان بوو. لەسەرەخۆ پرسی:

"ئەو حەمەدۆکە کە باسی دەکەن, ئەوە کە حەسەنی کوشت, شکڵو قەلافەتی چۆن بوو؟"

پیاوە ریش دارەکە گوتی: وەك جانەوەرێکی زەرد دەچوو.

"خۆ حەمەدۆك وەك زەردەمار ناچێ"

"ئەی وەك چ دەچێ؟"

"یەكێكە وەك من و تۆ"

"چاوێكی قووڵی هەبوون, سارد وەك سەهۆڵ"

"وەك ئیزرائیل دەچوون"

"حەتمەن بە هەڵە چوون"

"ناكوڕم نا رێبوار, كەس بە هەڵەنەچووە, ئەمن حەمەدۆكی دەناسم"

"ئەتۆ تائێستا حەمەدۆكت دیوە؟"

"ئەمن چاكی دەناسم"

"ئەمنیش دەیناسم, حەمەدۆك هیچ كاتێك بێ رەحمیی وا دەرهەقی لاوێكی بە دیمەنی وەك حەسەن ناكا"

"هەموومان دەیناسین"

"كێ هەیە حەمەدۆكی نەناسێ؟"

"رێبوار, چما دەكرێ لە حەمەدۆك بەولاوە كەسێكی دیكە ئەم كوڕەی كوشتبێ"

"حەمەدۆك حەسەنی ناكوژێ"

حەشیمەت بەرەبەرە تووڕە دەبوون, حەمەد دیتی هیچ چارەی نیە. هەستا, سەری بەردایەوەو بە نێو حەشیمەتە بێدەنگەكەدا تێپەڕیو لە تەپۆڵكەكە چووەخوارو ڕۆیشت. بە دوای ویدا دووبارە شیوەن دەستی پێكردەوە. نە دەیتوانی بیر لە هیچ بكاتەوەو نە تەنانەت دەیتوانی تووڕەو ناڕەحەت بێ. تەنانەت ئێشی ئەو برینەشی هەست پێنەدەكرد كە لە خوار شانی راستی هەبوو. دەت گوت تەواوی لەشی بووە بە سەهۆڵ. هەتا نیزیك كانیەك كە لە پێشی دارستانەكە بوو, ڕۆیشت. بە دیتنی كانیەكە تینووی بوو. وەبیریهاتەوە كە برسیەتی. دمی بە كانیەكەوە ناو لەو ئاوە فێنكە خواردیەوە. پاڵی وەدارە سیدرە ئەستوورەكەی پەنا كانیەوە داو لە فكرەوە چوو. روخساری لاوە كوژراوەكە زۆری كار تێكردبوو. وایدەهاتە بەرچاو كە دەیناسێ, بەڵام هەرچی كردی نەیتوانی وەبیر خۆی بێنێتەوە كە لە كوێی دیوە.

ئەو تێشووە كە دایەحۆری بۆی دەخورجێنەكە نابوو, دەریهێناو بێمەیل و ئیشتیا دەستی بە خواردن كرد. راست لەو لەحزەیەدا بوو كە لە پشتەوەی قیامەتێك هەستا... سەری وەرسووڕاندو تەماشای ئەولای كرد. لە بەرزاییەكی كەم دا پۆلە باڵندەیەك وەك هەورێكی رەش شەپۆلیان دەدا.

وەك تیر لوور دەبوونەوە زەوی و پێش ئەوەی بگەنە سەر زەوی هەروا بە توندی تێهەڵدەبوونەوە. کەمێك دەڕۆیشتن و دووبارە دەگەڕانەوە, پاشان بە غار دەچوونە سەر لێرەوارو دیسان هەر بەو خێرایییە لەوێوە بەرەو دوا دەگەڕانەوە. حەمەد وەختێك دیتی بازێكی راوی وەك تیر خۆیەنێو باڵندەكان دا دەكاو دێتەوە دەرێ, زانی مەسەلە چییە.

بازەکە زۆر گەورە نەبوو, تەنیا سەری باڵەکانی وەك خەنجەر تیژ بوو. بازی راوکەر زۆر بە چالاکی دەچووە نێو پۆلە باڵندەکەو چەند دەقیقەیەك لەنێو هەورێکی باڵندەدا ون دەبوو. وەختێك باڵندەکان لوور دەبوونە سەرزەوی, ئەویش لە گەڵیان دەهاتە خوارێو لە حاڵێك دا شتێکی وای نەدەما لە زەوی بدرێ, بستێکی دەما بگاتە عەرزی خۆی دەگرتەوەو هەر بەو چالاکییە هێرشی دەکرد. حەمەد هەستابووە سەر پێو چووکترین جموجۆڵی باڵندەکانی لەبەرچاو ون نەدەبوو.

شەڕوکێشەی بازەکەو باڵندەکان زۆری نەخایاند. ئاخر جار کاتێك پۆلە باڵندەکە بە هەراو هەنگامەیەکی زۆرەوە لوور بوونەوە سەر زەوی و هەستانەوەو بڵاو بوونەوە, حەمەد بازەکەی دی کە لەسەر عەرزی کەوتوەتە پەلەقاژە, وا دیاربوو باڵێکی تەیرەکە لە پنچکە دڕوویەك یان لکەدارێك شتێك دراوە. لەسەر عەرزی کەوتبوو خۆی بەکێش دەکرد. لە بازەکە نیزیك بووەوە, تەیرەکە بەدیتنی وی باڵی لێك کردنەوەو هەوڵی دا هەڵفڕێ, کەمێك حەوا کەوت, بەڵام دیسان کەوتەوە سەر زەوی. هەتا حەمەد زیاتری لێ نیزیك دەکەوتەوە, بازەکە پتر هەوڵی دەدا بفڕێ. کەمێك دەفڕی و دەکەوتەوە سەر زەوی. حەمەد دەستی بردە پێش بیگرێ. باڵندەکە کە لەفڕین ناهومێد ببوو, پەلاماری دەستی ویداو بە دەندووکە تیژەکەی قامکی شادەی بریندار کرد. حەمەد بە پێکەنینەوە گوتی:

"دەت گرم, ئەتۆ باڵندەیەکی زۆر چەپلەکی. ئەگەر وەستا بای نە باڵت دەشکاو نە هیچت لێدەهات... هەر ئێستاش نێچیرێکت گرتبوو و لەو سەرانە لەسەر لکەدارێك خەریکی خواردنی بووی".

حەمەد هەرچەند دەستەکانی بریندارو کۆڵەوار ببوون پاش شەڕو کێشەیەکی دوورودرێژ گرتی, تەیرەکە زۆر ماندوو ببوو, بەڵام چاوەکانی کە هەروا گیاندارو زیندوو بوون, بەقینەوە لەکالانەدا دەسووڕان و بیریان لە تەسلیم بوون نەدەکردەوە. حەمەد لە دڵی خۆیدا گوتی:

"ئێستا پێویست بوو مەڵحەمەکانی ئاناجیخ سوڵتانم پێ بێ هەتا لە باڵم هەڵسووبای... وەختێك لە باڵتم هەڵسووبایە, باڵە جوانەکەت دەسبەجێ چاك دەبووەوە"

باڵندەکەی لەبن هەنگڵێ گرت:

"چەپلەکە جوانەکەم, دنیا ئاوایە. پیاو نابێ کاری ناشێیانە بکاو ناشبێ وەك تۆ تووڕەو تۆسن بێ..."

وەختێك خەریك بوو دەیلاواندەوە, تەیرەکە دەندووکێکی توندی لەدەستی دا کە وەك چەقۆ پێستی دەستی قاش کرد. حەمەد خوێنەکەی لستەوەو دەستی لە ئاوەکەدا شوتەوە:

"ئەگەر دۆست و دوژمنی خۆت ناسیبایە ئەم بەڵایەت بەسەر نەدەهات..."

بەسەرهاتی باڵندەکە ئەوی باش هێنابووەوە سەرخۆ. بە بەنێك کە لە خورجێنەکەی راکێشابوو لاقی بەستن, لەپەنا چڵەگوێنێیەکی داناو دەستی کرد بە خواردنی نانەکەی کە بەنیوەچڵی بەجێی هێشتبوو, چووە سەرکانی, دەمی بە پلووسکی کانێیەکەوە ناو ئاوی خواردەوە. پاشان تەیرەکەی لەپەنا گوێنێیەکە هەڵگرت و وەڕێ کەوت. لەبەرخۆیەوە گوتی:

"دەیبەم بۆ سەیرانێ. سەیران لێی وریا دەبێ, باڵی چاك دەکاتەوەو پاشانیش ئەم چەپلەکە بەرەڵای شاخەکانی ئاناوارزا دەکا, راست بۆسەر گلکۆی نایب رەجەب, ئیدی دەست لەو چەپلەك بازارێیە هەڵدەگرێو دێتەوە. لەوانەشە لەسەر دارەکەی سەر گلکۆی نایب ڕەجەب بنیشێ. ئەو بەنەی دەلاقی باڵندەکەی خستبوو لێی کردەوە. بە هیچ جۆر نەیدەویست بیر لە حەسەن بکاتەوە کە حەمەدۆك کوشتبووی. هەتا ئەو کوڕە لاوەو ژنە شێن گێڕەکانی وەبیر دەهاتنەوە, دەسبەجێ هەوڵی دەدا بیر لە دایەحۆری و مەلافەرهادو سەیرانێ بکاتەوە.

بەرەو دەشتێك شۆڕ بووەوە. لەم دەشتەدا هێندێ شتی وەبیر دەهاتنەوەو نەیدەتوانی لەبیر خۆیان بەرێتەوە. لەم دەشتەدا چڵەگوێنێیەکان, دەستەدەستە, بەرەنگی زەردو سووراویی پڕڕەنگ و سووری زۆر سوور ڕوابوون. تەنانەت چەقڵی گوێنێیە سوورەکانیش سوور بوون. دەت گوت لەبناری دەشتێ ئاورێك داییسێ کە بڵێسەی سووری لێ هەڵدەستێ. لەپشت سەری خۆیەوە گوێی لە هەناسەی ئەسپێك بوو, وەك بگرمێنێ. رەق لەجێی خۆی راوەستا. ئەسپی خەنەیی بیست بیست و پێنج هەنگاوی لێ دوور بوو. راوەستابوو و بەشێوەیەکی سەیر تەماشای وی دەکرد. باڵندەکەی بەدەستیەوە بوو, دایناپە سەر زەوی و بۆلای ئەسپەکە چوو. لە ئەسپەکە نیزیك کەوتەوە, راست لەو دەمەدا کە دەستی بۆلای وی درێژ کردبوو, ئەسپ خۆی شل کردو بەسەر سەری ویدا بازی داو رۆیشت. نەختێك کز ببوو. ئەسپ چوو لەسەر شاخێکی نووك تیژ راوەستاو پاش ئەوەی سێ جار لەسەریەك حیلاندی بەرەو هەتاو وەرسووڕاو گوێی لە چەرمەوە بردن. حەمەد باڵندەکەی لەسەر زەوی هەڵگرتەوەو بە ئەزرەتەوە تەماشای ئەسپەکەی کردو لەبەرخۆیەوە گوتی:

"پەند وەربگرە، ئەگەر کەمێك پیاوەتیت تێدا ماوە، لەم ئەسپەو لەم باڵندەیە پەند وەربگرە".

ئەمجار دەستی بەسەری باڵندەکەی بن هەنگڵیدا هێناو گوتی:

"ئەتۆش پەند وەربگرە تەیری راوکەر، لەم ئەسپە پەند وەربگرە، هەرچەند بێسەروزمانە بەڵام تەسلیمی کەس نەبووەو تەسلیمیش نابێ... هەرچەند حەیوانێکە، سەروزمانیشی نیە، لەم چیایانە دەمرێ، ئێسکەکانی دەبن بەگڵ، بەڵام ئەویش وەك ئەسپی کوێرئۆغلی تەسلیم نابێ. ئەی دڵی غافڵ، ئەتۆش لەم تەیرەو لەم ئەسپە پەند وەرگرە"

وەرێ کەوت بۆلای دەشتی قزڵ کارتاللی. خوا بکا عێلی ساری کەچیلی هێشتا باریان نەکردبێ. باڵندە بریندارەکە لەبن هەنگڵ دا، دەکرێ بڵێین بەغاردان دەڕۆیشت. تەیرە راوییەکە ئیدی راهاتبوو، لە ئامێزی حەمەددا ئۆقرەی گرتبوو و بە چاوێکی پڕ لە متمانەوە تەماشای دەکرد.

لەبەرخۆیەوە گوتی: ئەگەر لە تەپۆلکەکەی ئەوبەر چووەخوارێ هۆبەکەی لێ دەردەکەوێ. بەتال ئاغای دنیادیدە هەر کە چاوی پێیکەوت هەموو شتێکی بۆ باس دەکاو زەردەخەنەیەك دەکەوێتە سەر لێوانی. نەیدەزانی چیی پێ بڵێ و چۆنی رەفتار لەگەڵ بکا. کە لە تەپۆلکەکە وەسەر کەوت، بەسەر هەواری خاڵیدا کەوت. هۆبەکە باری کردبوو. دووسێ ئاورگ هێشتا کەمێك دووکەڵیان لێهەڵدەستاو بەرەو دارستان تێهەڵدەبوو. ماوەیەك لە جێی خۆی راوەستاو تەماشای وێی کرد. بێئەوەی بەدەست خۆی بێ لاقەکانی بردیانە جێهەوارەکە. لە جێتاوڵی بەتال ئاغا شوێنی جەواڵە موویینەکان و بەرەکان بەجوانی لەسەر زەوی دیار بوو. جووتە کاڵەکۆنێکی منداڵانە، لینگە گۆرێیەکی میرزایی کۆن، پیکەزوڕنایەك و دارحەیزەرانێکی شکاو بەجێ مابوون. پیکەکەی هەڵگرتەوەو دەستی کرد بە لێدان. وەختێك منداڵ بوو پیکی باش دروست دەکردو جوانیشی لێدەدا. لەسەر بەردێك دانیشت و دەستی بە لێدان کرد، ئەو هەوایانەی لێدان کە بەمنداڵی لێیدابوون. ئەو وەخت زۆری هەوڵ دا خەجیجێ فێری پیك لێدان بکا، بەڵام نەیتوانی، کچان توانای پیك لێدانیان کەمە. ئەو لیسانە کە تەیرە راوکەرەکانیان لەسەر هەڵدەنیشتن هەروا لەجێی خۆیان بوون. کەمێك ئەولاتر لە جێچادرێك گۆزەیەك لەسەر تەنیشتێ کەوتبوو. کۆمەڵێك مێشەنگوین لەدەوری گۆزەکە دەخولانەوە. لەجێیەکی دیکە چلەگوێنێیەکی سووری تەڕو تازە دەدرەوشایەوە... چەقوولەیەکی دەسك شکاو لە قوولکەی جێدیرەکێك دا کەوتبوو. لەنێوەڕاستی جێهەوارەکە شارەمێروولەی دان بەدەم لە باریکەڕێیەکانیان وەرێ کەوتبوون و هەڵداوپێدایان دەکرد.

باڵندەیەکی چووکەڵە هات و لەسەر لیسێك کە ڕووبەڕووی حەمەد بوو هەڵنیشت. بیری کردەوە کە بەردێك بە باڵندەکەدا بداو گۆشتەکەی بدا بەو بازە کە بەدەستیەوە بوو. باڵندەکە چووکەڵەو ڕەنگاوڕەنگ و جوان بوو، دڵی نەهات بەردی پێدا بدا. لەسەرەخۆ بەردەکەی دانایەوە. غەمێك دایگرت. چاوی ئەو باڵندەیەی بەدەستیشیەوە بوو غەمگین بوون. تەیرەکەی بەرەڵڵای جێهەوارەکە کردو بازەکە بە تەکانێك خۆی گەیاندە ئەو باڵندە چووکەڵەیە کە لەسەر لیسەکە هەڵنیشتبوو. باڵندە چووکەڵەکە هەڵفڕی، پاش ئەوەی چەند جار بەدەوری تەیرە ڕاوییەکەدا سووڕا، لە کاتێك دا بەفڕینی خۆی خوارمێچمیەکی لەهەوادا دەکێشایەوە، فڕی بۆسەر لێڕەوار. حەمەدیش بەدوایدا چووە نێو دارستان و گەیشتە ئەو بەردەڵانە کە یەکەم جار تووشی جەندرمەکان هاتبوو و بریندار ببوو. کە لە بەردەڵانەکە سووڕایەوە تووشی قۆڵێك جەندرمە بوو. پاش تاوێك دوودڵی لایدا بۆ قەراخ ڕێگاکە چاوەڕوانی تێپەڕبوونی جەندرمەکان بوو. یاوەرێك کە سواری ئەسپ بوو، کاتێك گەیشتە پەنای جڵەوی ئەسپەکەی توند کردو بەدوای ویش دا ئەو دەستەیەی بەدوایدا دەهاتن ڕاوەستان.

یاوەر گوتی:

"دێهاتی! وەرە ئێرە بزانم".

نایب عەریفەکان، عەریفەکان و سەرجووخەکانی دەستە جەندرمەکەش خێراو بەغاردان هاتنەلای وان. حەمەد لەحزەیەك ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاو ئەمجار هاتەوە سەر حاڵی ئاسایی خۆی.

"ئەوەی بەدەستتەوەیە چ جۆرە تەیرێکە؟"

حەمەد گوتی:

"بریندارە، نازانم چ باڵندەیەکە"

ئەمەی گوت و داستانی چەپلەك بازاڕیی باڵندەکەی گێڕایەوە.

"کەوایە، نەیتوانی لەنێو ئەو هەموو باڵندەیەدا یەکێکیان بکوژێ؟"

"نا، نەیتوانی".

"ئێستا ئەتۆ دەتەوێ چیی لێبکەی؟"

"دەیبەمەوە ماڵێ، بەخێوی دەکەم و کاتێك برینەکانی چاك بوونەوە بەرەڵڵای دارستانی دەکەم".

"زۆر باشە، ناوت چیە؟"

"حەمەدۆك"

"چەتەیەك هەیە بەناوی حەمەدۆك، ئەتۆ ناویت بیستوە؟"

"کێ ناوی نەبیستوە؟"

"ئێستا لەکوێیە, دەزانی؟"

حەمەد لەحاڵێك دا ملی بەلاوە دەنا بەبێفیزی گوتی:

"دەزانم, ئەو ئێستا لە ئاکچاداغە"

"........."

"دەستەی دروست کردوە..."

"........."

"دەستەیەکی ١٦ کەسی".

"........."

"هەموو دێهاتییەکان دەزانن"

"جێیەکەیم پێدەڵێن, نا؟"

"پێت دەڵێن"

"ئەودەم ئەمنیش دەیگرم"

"بەڵێ جەنابی یاوەر فاڕووق, ئەتۆ دەیگری"

"ئەمن یاوەر فاڕووق نیم, ئەمن سەر بە فەرماندەرایەتیی جەندرمەی ماراشم. پێش یاوەر فاڕووق بۆخۆم حەمەدۆکی دەگرم"

"جەنابی یاوەر! کاتێك پیاو ئامانجێکی هەبێ, هیچی لەبەردەست دەرناچێ"

"ئەتۆ حەمەدۆکت دیوە؟"

"دیومە جەنابی یاوەر"

"شکڵ و شێوەی چۆنە؟"

حەمەد سەری داخست. تاوێك فکری کردەوە, چاوی لە چاویەوە بڕی و گوتی:

"پیاوێکی بەخۆوەیە وەك تۆ, چاوی گەورە, سەوزەو ڕەش ئەسمەرە, قامکی درێژن... ئەگەر بیبینی خۆشت دەوێ"

روخساری یاوەر نەختێك ئارامتر بوو.

"ئەتۆ ئێستا بۆکوێ دەچی؟"

"دەچمە شارۆچکە"

"دەتوانی جێیەکەی بەمن نیشان بدەی؟"

"ئەمن خەڵکی ئەم دەوروبەرەم جەنابی یاوەر, نازانم ئاکچاداغ لە کام لایە"

یاوەر ئەسپەکەی دەنگ دا:

"خواحافیز حەمەدۆك"

"بەخێرچی جەنابی یاوەر"

حەمەد کشایەوە لێوی جادەو هەتا جەندرمەکان تێپەڕین راوەستا. پاش رۆیشتنی دەستەکە بەبێوازی لەسەر مووڕەدارێك کە لەوێ بوو دانیشت. دڵی تەپەتەپ لێی دەدا. لەبەر خۆیەوە گوتی: زۆر ترسام و پاشان بەگاڵتەوە گوتی: کەوایە حەمەدۆکیش دەترسێ. لەراستییش دا زۆر تێك چووبوو. بە لاتسیاو لاتسیاو هەستایە سەرپێ, دووسێ هەنگاوێك رۆیشت, لاقی تێك باهەڵدەدران. گەڕایەوەو لەسەر کۆلکەدارەکە دانیشتەوە. ئەو باڵندەیەی لەبن هەنگڵی‌دا بوو, چاوی هەڵێنابوون و بە حەبەساوی‌یەوە تەماشای دەکرد. سەری باڵندەکەی لەنێو دەستانی گرت و بە پەلەقاژەی تەیرەکە بەرەڵای کردەوەو لەسەر زەوی دای‌نا. باڵی داچۆڕابوون و رەعەرزی دەخشان. باڵندەکە دووسێ هەڵبەزەی کرد, دەیەویست هەڵفڕێ. هەوڵی‌دا, بەڵام بە باڵێك نەی‌توانی هەڵفڕێ و بەلایەك دا کەوت. بەتاقی تەنیا لەسەر زەوی کەوتبوو. حەمەد چوو لە باوەشی کرد. بەڵام بوونی باڵندەکەش نەی‌توانی بۆشایی هەناوی پڕ بکاتەوەو ئەو ترسە لەنێو بەرێ کە نیشتبووە دڵیەوە. هەستی دەکرد شتێکی کەمە. دەت گوت دەست و لاق و سەری نین. لەپشتەوەڕا تەماشای جەندرمەکانی کردو کاتێك دوا جەندرمە لە تارمایی دەوەنەکان دا ون بوو, هەستاو دەستی کرد بە غاردان, وای دەهاتەبەرچاو کە یاوەر گەڕاوەتەوەو بە سواری ئەسپەکەی کە هەروا دەفیشقێنێ وەدوای وی کەوتوە, هەستی دەکرد هەناسەی ئەسپەکە لەپشت ملی دەدرێ. لە بەردەڵانە شین و بڵندەکەی سلێمانلی هاتەخوار. لە ئاخری سەرەوژێرەکە تووشی چۆمێکی چووکەڵە بوو. بەسەر بەردەبازەکان دا پەڕیەوە بەری ئەوبەری چۆمەکەو چووە نێو دارچنارەکان. دارەکان هێشتا گەڵاسوورەکانی خۆیان نەوەراندبوو. لەنێو پنچکەکان دا ڕێوی‌یەکی دی کە بەترسەوە تەماشای دەکا. ڕێوی بە دیتنی وی لە حاڵێك دا کلکە درێژەکەی ـ کە دەت گوت مەشخەڵە ئاگرەـ رادەوەشاند, لە بنارەکە رای‌کردو لەنێو گوڵە کێوی‌یەکان دا ون بوو.

بۆشایی‌یەك کە لەهەناوی‌دا بوو پەرەی دەگرت و ترسێکی باوەڕپێنەکراو کەم کەم هەموو لەشیی گەمارۆ دەدا. عێلاتی ساری کەچیلی دەبوو لەو دەوروبەرانە بن. چونکە هێشتا ئاگردانی جێهەوارەکان دووکەڵی لێ‌هەڵدەستا, کەوایە هۆبەکە لەگەڵ کازوکووزی بەیانی وەرێ کەوتوە, لە حاڵێك دا کە دەست و دەم و چاوی منداڵە خەواڵووەکان سارد بووە. بە منداڵی ئەوانیش وەختی کۆچ و کۆچبار هێشتا کازیوە

نەنگوتبوو, بەرێز دەبوون و وەرێ دەکەوتن. حەمەدیش دەست و دەم و چاوی سڕ دەبوون و دایەحۆری دەستی وی لەنێو دەستەکانی خۆی دەگرتن.

لەنێوەڕاستی دارستانی شوێنێکی راوندو سەرسەوز هەبوو. کۆچ و کۆچبار هەمیشە دێن چەند رۆژێك لەسەر ئەو کانییە کە بە وردکە بەردی سپییەوە لەو مەیلەو دەشتاییە سەرسەوزە هەڵدەقوڵێ, دەمێننەوە. لای نیوەڕۆیە بەنیزیك بوونەوە لەو شوێنە راوندە خۆی وەك پەڕەمریشکێك لەنێو بۆشاییدا هاتەبەرچاو. ئەگەر ئەو تەیرە نەبایە کە بە باوەشیەوە بوو, تەنانەت لە بوونی خۆشی دەکەوتە گومان. شتێکی لێ ون ببوو کە زۆری خوو پێوە گرتبوو. ئەو شتە چ بوو؟ هیچ نەیدەزانی ئەو شتەی لێی ون بووە چییە.

لە دوورەوە دەنگی غەڵبەغەڵبی کۆچ و کۆچبارێکی بەرگوێ کەوت. هەروەك پێش بینیی کردبوو هۆبەکە لەو شوێنە راوندە خستبووی. چەند رۆژێك لەوێ دەمانەوە. کە لە بەردەڵانەکەی بەرامبەری بایدایەوەو گەیشتە نیزیك دارە سیدرەکە کلاوەی رەشماڵەکانی هۆبەی لێ وەدەر کەوت. ئێستا چۆن چووبایە نێو هۆبەو چیی بە بەتال ئاغا گوتبایە؟ بای دایەوە لای راست. گیاکرمە دەگەیشتە ئەژنۆی, بۆنی شیلەی تەڕی دارەکانی لێرەوار, بۆنی گڵ و بۆنی پنگەڵ و بۆنی توندو تاڵی گولۆوکە پاییزەی تازەپشکووتوو, ولاتیان پڕ دەکرد. بۆنی دارستان کەمێك هێنایەوە سەرهۆش, تەماشای باڵندەکەی کرد, پەردەیەك بەسەر چاوانیدا کشابوو, خەوی لێکەوتبوو و لەشی گەرم بوو.

بۆئەوەی بچێتە نێو کۆچ و کۆچبارەکە چاوەڕوان بوو شەو دابێ. لە سەگەکانی سەرمێگەل دەترسا. هەرسەگەی بەقەد ئەسپێك دەبوو. کەسێکیان بەشەو لەگەڵ کۆچەکە نەدیبێ, لەت و کوتی دەکەن.

بۆ چوارەمین جار دەوری گۆڕاییەیە سەرسەوزەکەی دەدا, کە چاوی بەشوانێك کەوت, سەگێکی قەڵەدەلەملی سووری خاڵداری لەپەنا بوو. شوان قۆڵی هەڵماڵیبوون, دەستی دەنێو گۆمیلکەکەی پەنا کانی رادەکردو بە کارامەیی سوورە ماسییەکانی دەگرت و فڕێی دەدانە سەر چیمەنەکە.

"هۆی شوان".

شوانەکە ئەوی ناسی:

"فەرموو کاحەمەد".

دەسبەجێ بە خۆی و سەگەکەیەوە هاتەلای.

"بەتال ئاغا لێرەیە؟ قاسم و دەمیرت دیون؟"
"لەنێو هۆبەن"
"یاڵڵا برۆ نێو هۆبەی بانگی قاسم و دەمیر کە. ناوی من مەبە. بڵێ دۆستێکتان هاتوە ئێوەی دەوێ. لەگەڵ خۆت بیان هێنە ئێرە"
شوان رۆیشت, تاوێك دواتر قاسم و دەمیر تفەنگ بەشان, فیشەکدانی ڕاست و چەپ لەخۆداوو حازرو ئامادە لەوسەری شوێنە راوندەکە وەدەرکەوتن. بەدیتنی حەمەد هیچ سەریان سووڕ نەماو بە پێکەنینەوە غاریان دایەلای و باوەشیان پێداکرد.
دەمیر گوتی:
"بەتال ئاغا چاوەڕێتە, دەیگوت زۆری پێناچێ دێتەوە. قاوەکەت لەسەر ئاگردان حازرە"
"بەچی ڕا دەیزانی؟"
"ئەو زۆر شت دەزانێ. ئەسڵ و نەسەبی هەیە. ئێمە عێلاتین, رۆژێك هەموو ئەو چیایانە, ئەو خوارە هەموو جێیەکی چوکووراوا هی ئێمە بوو. بەڵام ئێستا عێلات نیین. بووینە تاقمێك دێهاتیی بێچارەی موحتاجی نانی شەو"
دەردەدڵی ئەم دەمیرە کەم دوێیە کاری کردە ناخی دڵی حەمەد.
قاسم گوتی:
"یاڵڵا با برۆین. بەتال ئاغا چاوەڕێتە. بت بینێ زۆر خۆشحاڵ دەبێ. وەختێك رۆیشتی هەر باسی دەکردی. قسەی دیکەی بەدەم دا نەدەهات. باسی هەرچی کردبایە, ئاخرەکەی دەیهێنایەوە سەر تۆ. هەموو رۆژێش لە بەیانیەوە تا ئێوارێ دەچووە سەر تەپۆلکەکەو چاوی لەڕێی تۆ بوو. دەیگوت: ئەمن لە هەموو شتێك دا بەهەڵە دەچم, بەڵام لە ناسینی پیاوان دا بەهەڵە ناچم. بەهەڵەش نەچووبوو. یاڵڵا با برۆین"
قاسم لەپێشەوەو حەمەد بەدوایداو دەمیریش لە دوای وانەوە کەوتنەڕێ. بەتال ئاغا چاوەڕوانیان بوو. حەمەدی لەئامێز گرت و گوتی:
"بەخێراتی حەمەدۆك"
خۆشەویستیەك لە دەست و چاوو هەموو گیانی بەتال ئاغا هەڵدەقوڵی کە حەمەد پێی سەیر بوو. تەنیا دایەحۆری بەوجۆرەی پێشوازی لەو دەکرد.
"لەو رۆژەوە کە رۆیشتووی چاوەڕێت بووم"
"بۆچی؟"
"چونکە ئەو کرمەم دەناسی کە لە وجوودی تۆدا هەیە"

"ئەو چۆن کرمێکە؟"

"ئێستا ئیدی بۆخۆت لەمن باشتر ئەو کرمەت دیوەو ناسیوەو لە منی دەپرسی؟"

چوونە ژووری تاولێ.

"ئێمە هیچ کاتێك لێرە نەدەماینەوە. ئەمن لە قزل کارتاللی چاوەڕێت بووم. زۆرت چاوەڕێ بووم, دەم زانی دێیەوە, بەڵام ئیدی بەرەبەرە تەمابڕاو دەبووم. گوتم با لێرە وەمێنین. هەتا زستانێ, هەتا دەهاتی لێرە چاوەڕوانت دەبووم".

"خەریك بوو بێمە چوکووراوا لەوێ بت بینم"

"قەت کاری وا مەکە. چوکووراوا تەڵەی یاغییانە. وەك مەرگی وان وایە. لەڕێیە تووشی یاوەری بووی؟"

"ئەدی, پرسی ناوت چیە, ئەمنیش گوتم حەمەدۆك. ئەم تەیرە نەجاتی دام. ئاخر چما چەتەش باڵندەی بەبن هەنگڵەوە دەبێ؟"

بەتال ئاغا گوتی: نا, نابێ.

لەژووری تاولێ دۆشەکۆڵەو سفرە راخرابوون و چاوەڕوانی میوان بوون. لەپێش دا شۆرباوێکیان هێنا کە هەڵمی لێ‌هەڵدەستا. بەتال ئاغا گوتی:

"لە چێشتەکانی ئاناجیخ سوڵتانە. لەو چێشتە کە خواردت"

"بەچی ڕا زانیت؟"

"ئەو ئەنگوستیلەیەی دەستت, ئەنگوستیلەی خانەقایە. جگە لە خەڵکی خانەقایە کەس لەدەستی ناکا, چۆن بوو دای بەتۆ؟ ئەتۆی بە شێخ داناوە. ئەمەت لەبیر نەچێ, هەتا کاتێك ئەم ئەنگوستیلەیەت لەدەست دایە لەقەزاو بەڵا دەت پارێزێ"

دانیشتن و دەستیان کرد بە خواردنی شۆرباوەکە, کە لە قاپێکی گەورەدا بوو.

لەو بەینەدا هەر ئەو کچەجوانەی جاری پێشوو هات تفەنگ و فیشەکەکانی حەمەد, ئەو تفەنگ و فیشەکانە کە دیاریی هۆبەکە بوون هێنانی و لەپەنا حەمەدی دانان. حەمەد گوتی:

"وەختێك ئەو کرمە کەوتە مێشکی کەسێك هەتا سەرەمەرگ..."

بەتال ئاغا گوتی:

"ئەدی, هەتا سەرەمەرگ. پیاو لەدەست هەموو شتێك رزگاری دەبێ, لەدەست ئەو کرمە نەبێ کە لەمێشکیدا هەیە. هەتا لە نان خواردن بوونەوە ئیدی قسەیان نەکرد. پاش نان خواردن حەمەد باسی دایەحۆریو ئاناجیخ سوڵتانیی کردو زۆری تاریف کردن. بەتال ئاغا گوتی:

"حۆری یەکێك لەو کرمانەیە کە لەگیانی تۆدا هەن"

حەمەد گوتی:

"ئاناجیخ سولتانیش یەکێکی دیکەیانە"

پاشان داستانی ئەسپ و شەهێنەکەشی گێڕایەوە.

"ئەو ئەسپەش یەکێك لە کرمەکانی مێشکی تۆیە"

حەمەد گوتی:

"ئەو تەیرەش هەروا"

بەتال ئاغا دەستی لە پشتێ داو بە چاوێکی پڕ لە خۆشەویستی‌یەوە گوتی:

"حەمەد کوڕم, کوڕە دلێرەکەم, گەورەترین کرمی مێشکی تۆ خۆتی"

حەمەد گوتی: ئەسپەکەش, و پێ‌کەنی.

هێشتا نوێژی خەوتنان نەببوو, حەمەد گوتی:

"بەتال ئاغا, ئەمن دەمەوێ بنووم, ئەمانەتت ئەم باڵدارە بێ, چاوێك لە باڵی بکە بزانە چاك دەبێتەوە, نابێتەوە؟ هەتا پێش چوون بۆ چوکووراوا ئەگەر چاك بووەوە بەرەڵلای دەکەم. بەستەزمانە زۆر دەست و پێ سپیلکەیە"

بەتال ئاغا گوتی: کرمتە.

حەمەد گوتی: کرمە.

کچەکە هات: جێی کاحەمەدم راخستوە.

حەمەد گوتی: سوپاس خوشکێ.

پاشان ئاوڕی دایەوە سەر قاسم:

"قاسم هەتا نیوەشەوێ ئەمشەو ئەتۆ ئێشك بەو دوایەش دەمیر بەخەبەر بێ. لەمن ببوورن ئەمشەو زۆر ماندووم"

هەستاو چووە سەر جێی. بێ‌ئەوەی جلەکانی دانێ لێفەی بەسەر خۆی هەڵکێشا, تفەنگ و فیشەکەکانی لەپەنا خۆی دانان و هێشتا سەری نەگەیشتبووە سەر سەرینەکە خەوی لێ‌کەوت.

کازیوە نەنگوتبوو کە دەمیر بانگی کرد, حەمەد لەمێژ بوو بەخەبەر بوو و چاوەڕوانی دەمیری دەکرد. لەجێی هاتەدەر, ئافتاوەیەك لەبەردەرکی تاولێ بوو هەڵی‌گرت و بەدۆڵی‌دا چووەخوارو خۆی سووك کرد. وەختێك هاتەوە سفرە ڕاخرابوو. شۆرباو, رۆنەکەرەو هەنگوین و نان ساجیی گەرم و تازە.

ئەمرۆ بەیانی نێوچاوانی بەتال ئاغا نوقمی نوور بوو و زۆر خۆشحاڵ دەهاتە بەرچاو. خێرا ناشتایان کردو گەردن ئازایی‌یان لە یەکتر خواست. بەتال ئاغا سێ جاری لەئامێز گرت و نێوچاوانی ماچ کرد. هێشتا هۆیەکە وەخەبەر نەهاتبوو, دارستان هەڵمی لێ‌هەڵدەستا. هەتا تاوهەڵاتێ بەنێو لێرەواری‌دا رۆیشتن. کە گەیشتنە بەردەلانێک حەمەد راوەستا:

"دەبێ سەردەستەیەک هەڵبژێرین".

قاسم گوتی: سەردەستە ئەتۆی.

دەمیر گوتی: ئەتۆی.

تفەنگی حەمەدیان لەسەر بەردێک داناو دەستیان خستەسەرو سوێندیان بە قورئانی پیرۆز, بە محمد کە هەم ناوو هەم روخساری جوانە, بە حەزرەتی عەلی, بە خانەقای چل چاوو بە شمێشێری حەسەن بەگ و بە چل سوارەی غەیبی و بە کوێرئۆغڵی خوارد کە فەرمانی وی بەرێوە بەرن.

حەمەدۆک مەسەلەی حەسەنی ـ کە بەدەستی چەتەکان کوژرابوو ـ گێڕایەوەو گوتی:

"ئێمە دەبێ ئەو حەمەدۆکەی وەبینین, ئەگینا ژیان لەو چیایانەمان لێ تاڵ دەبێ"

ئەنجار پرسی: ئەو رێگرە کە دێهاتی‌یەکان دەیان گوت وەک زەردەمار دەچێ, دەبێ کێ بێ؟

قاسم گوتی:

"ئێمە دەی‌ناسین. هەم دەمیرو هەم ئەمن باشی دەناسین. ئەویش ئێمە دەناسێ"

دەمیر گوتی:

"ئەمن بە جێ‌یەکەی دەزانم, هەروا بزانە بۆخۆم بەم دەستانەم لەوێم داناوە, ئێمە هەموو ئەو جێ‌یانە کە ئەو خۆیان تێدا حەشار دەدا, شارەزاین, پێی دەڵێن عەبدیک ساری چیان. ئەگەر گرتم بی‌کوژم؟"

"بەزیندوویی دەی‌گرین"

دوو رۆژو دوو شەو بەرەو چیاکان رۆیشتن. گەیشتنە جێگایەک هەمووی شاخ و داخ.

حەمەد گوتی:

"ببوورن, ئەمن هێشتا خاوم. لەماندوویی‌یان مردم, ئیشتیای خواردنێشم نیە"

پاشان داوای لێ‌بووردنی لەوان کردو خۆی بە عەرزی‌دا دا. قاسم لە حاڵێک دا هەوڵی دەدا بەسەر پێوەی راگرێ گوتی:

"ئەختێک راوەستە, ئێستا پووش و پەڵاشت بۆ لەسەر زەوی رادەخەم..."

دەسبەجێ لەگەڵ دەمیر پووشی وشکیان خڕ کردەوەو لە قوولکەیەک دا ڕایان خست. حەمەد خۆی هاویشتە وێ.

"دەمیر ئاگای لەتۆ دەبێ, ئەمنیش ساری چیانی دەبینمەوە: لەم دەورویەرانە چەند کەسێکمان هەن, ئەوان دەیدۆزنەوە"

قاسم پێش تاوهەڵاتێ هاتەوە. حەمەد لەخەو هەستابوو, پەنیری دە نان ساجی هەڵدەسوی و دەیخواردو دەمیریش بەحەبەساوی تەماشای دەکرد.

"دیتەوە؟"

"ئەدی, نەختێك لەپێشمانەوەیە, شەش کچیشیان لەگەڵن, لەگەڵیان رادەبوێرن".

حەمەد گوتی:

"زۆر باشە, ئەوان شەوی رابردوو نەخەوتوون, گێژوویێژن, گەمارۆیان دەدەین, ساری چیانی نابێ بکوژین, ئەوانی دیکە. خوا چیی بە نسیب کرد..."

"ئەگەر ساری چیان تەسلیم نەبوو چی؟"

"تەسلیم دەبێ"

بێهەست وەك پشیلە بە بنارەکەدا چوونەخوار. دەستەی ساری چیان. وەك هێلکە لە مەیدانێکی بەرتاوەلادا داکرابوون.

حەمەد گوتی:

"بێقیمەتی دە بێرەگ, ئەمانە چەتە نین, کەسێك ناوی خۆی نابێ چەتە شەوێ لە جێی وا دەمێنێتەوە؟".

"چەتەو یاغی ئاوا دەست بۆ ناموسی هیچ کەس درێژ ناکەن"

"ئەمانە بەدەستی خۆیان حوکمی مەرگی خۆیانیان ئیمزا کردوە".

"دەمیر ئەتۆ بەم بەردا برۆ, قاسم بەپشت ئەو شاخەدا برۆ. ئەمنیش دەچمە پاش ئەو بەردە. لەپێش دا تەقە لەو کابرایە دەکەم کە لەو نێوەڕاستە دەگەرێ, دیارە بەنیازی کوشتن نا, با بزانین دوایە قیسمەت و نسیبی چ دەبێ..."

لەگەڵ یەکەمین تەقە چەتەیەکی کزەڵە کە لەو نێوەڕاستەدا دەگەڕا هاوارێکی کردو کەوتە عەرزی. پاشان هەستایەوەو بە تفەنگەکەی دەستیەوە بە دەوری خۆیدا سووڕا. تاوێك دواتریش تفەنگەکەی بە سووڕدان لەدەستی بەربووەوە. حەمەدۆك و قاسم و دەمیر بێدەنگ و بێئەوەی قسەیەك بکەن لێکدا لێکدا تەقەیان دەکرد. پاش درەنگانێك وەڵامی تەقەکەیان دانەوە. لای ئەولاش دەستی کردبوو بەتەقە. کچەکان بەم لاولادا رایان دەکردو لەم بەردەوە خۆیان دەگەیاندە ئەو بەرد. ئەو یاغی‌یەی بە یەکەم گوللە برینداربوو لەسەر عەرزی پەلەقاژەی دەکرد.

حەمەد تفەنگی لە چەتەیەکی دیکەش دا کە شانی بە دەرەوە بوو. کابرای بریندار هەستایە سەرپێ و بە سەرەوژێری‌دا رای کرد. دەمیر تفەنگی لە هەردوو لاقان دا. پیاوێکی دیکە تفەنگەکەی فڕێ داو هەڵات. دەمیر ئەویشی خستە عەرزی و پاشان جنێوی پێدا:

"ئەو دین و مەزهەبەت... کە نیتە".

حەمەد بە دەنگێکی رەوان و کاریگەر کە ماوەیەك لە شاخەکان دا دەنگی دایەوە گوتی:

"تەسلیم بە ساری چیان، تەسلیم بە عەبدیك. ئێوە گەمارۆ دراون، یان تەسلیم بن یان هەمووانتان دەکوژین".

عەبدیك پرسی: ئەتۆ کێی؟

حەمەد گوتی: ئەمن حەمەدۆکم.

"ئەگەر بەڕاستی ئەتۆ، ئەتۆ حەمەدۆك بی، تەسلیم دەبم".

"بەچیڕا دەزانی کە ئەمن حەمەدۆکم؟"

یەکێك لە هاوڕێیەکانم حەمەدۆکی دەناسێ"

"ئێستا کەوایە بینێرە با بێ"

پیاوێکی چووکەڵە لەبن بەردەکان هاتەدەر، سەرتاپای فیشەکدان بوو. نیزیك کەوتەوە:

"تفەنگەکەت دانێ عەرزی، هەروا دەمانچەکانیشت"

کابرا دەسبەجێ تفەنگ و دەمانچەکانی دانانە زەوی و فیشەکدانەکانیشی لەخۆی کردنەوەو دەستی هەڵێنان. وەزعێکی جێی پێکەنینی پەیدا کردبوو. لە دوورەوە دیار بوو کە دەلەرزێ.

"وەرە ئێرە بزانم"

کابرا ملی درێژ کرد. حەمەدۆکی دی، لەحزەیەك لە جێی خۆی ڕاما. پاشان وەك شێتان روو بەخوارەوە هاواری کرد:

"ئەو حەمەدۆکە، حەمەدۆکە"

غاری داو خۆی گەیاند ساری چیان:

"حەمەدۆکە، حەمەدۆکە، حەمەدۆکم دی"

ساری چیان هاتەدەرێ:

"تەسلیم دەبم. قەولم پێ بدە کە نام کوژی".

"قەول دەدەم کە نەت کوژم"

عەبدیك ساری چیان تفەنگەکەی فڕێ دابوو، بۆ لایان دەهات.

"دەمیر وەرە دەرێ".

دەمیر لە پەناگە هاتەدەرێ, ساری چیانی گرت و دەمانچەکانی وەرگرت و بە ئاسانی چەکی کرد.

"ئێوەش وەرنەدەرێ"

لەوسەری بەردەڵانەکە سێ پیاوی دیکە دەرکەوتن. دەمیر هەموویانی چەك کرد. قاسم و حەمەدیش لە جێیەکانیان هاتنەدەر. روخساری قەڵس و قۆڵی حەمەد شەلاڵی ئارەق بوو. بێئەوەی قسەیەك بکا بە سووکایەتی پێکردنەوە چاوێکی لە ساری چیان کرد. کچەکانیش لە جێیەك خڕ ببوونەوەو وەك مەڕ سەریان دەبەریەك نابوو.

قاسم گوتی: کچینە بچن برینی بریندارەکان ببەستن.

کچەکان رایان کرد, داوێنە کراسەکانیان دڕی و برینی بریندارەکانیان پێچا.

حەمەد بەسرتە بە قاسمی گوت: هەمووی ئەمانە رووت و قووت بکەوە.

قاسم تەماشای کچەکانی کرد.

حەمەد گوتی: چارە نیە. پەتێکی درێژ پەیدا کەن بۆم بێنن.

قاسم گوتی: کچینە تەنافێکتان پێیە ئەمانەی پێ وەبەستین؟

کچەکان پشتێنەکانیان کردەوەو تێکیان گرێدان.

قاسم و دەمیر چەتەکانیان رووت و قووت کردەوەو بە پشتێنەکان تێکیان خستن.

"ئێوە خەڵکی گوندی حەسەنن؟".

"بەڵێ"

"وەپێشمان کەون".

ئاوەدانی زۆر دوور نەبوو. لای ئێوارێ گەیشتنە دێی. دێهاتییەکان, منداڵ و پیرو لاو لە بەسەرهاتەکە ئاگادار ببوون و بێدەنگ لە مەیدانەکەی نێو ئاوەدانی خڕ ببوونەوە. پیرەپیاوێك کە لە رێگادا قسەی لەگەڵ حەمەدۆك کردبوو لەنێو حەشیمەتەکە هاتەدەرێ, هات رووبەڕووی حەمەد وێستاو گوتی:

"ئەمن تۆم ناسیەوە, ئەتۆ برادەرەکەی حەسەن نی؟"

"با, خۆمم".

"ئەتۆ ئەمانەت گرتوە؟"

"ئێمە گرتوومانن"

پیرەپیاو خۆی بەسەر لاقانیدا داو گوتی:

"ئەمن دەبەر تۆ مرم. ئێستا دەتەوێ چ لەو حەمەدۆکە بکەی؟"

حەمەد گوتی:

"ئەو حەمەدۆك نیە, پێی دەڵێن عەبدیك ساری چیان"

پاشان رووی كردە ساری چیان:

"ساری چیان پێیان بڵێ حەمەدۆك كێیە"

ئەو جوابی نەدەدایەوە.

"كێیە؟"

قاسم بە زەبرێكی توندی قۆنداخە تفەنگ لە عەرزێی دا.

"بڵێ حەمەدۆك كێیە؟"

ساری چیان چاوی دەترووكاندن, لە ترسان زمانی شكابوو. بەشان ئاماژەی بۆ حەمەدۆك كرد.

"لێم ببوورن حەمەدۆك منم"

حەشیمەت شەپۆلی داو هەنگامەیەك ساز بوو.

پیرەپیاو دەستی دەستۆی كردو گوتی:

"حەمەدۆك ئەتۆی؟ تۆڵەی كوڕەكەمت كردەوە"

ژنێك هات و دەستی دەستۆی حەمەدۆك كردو دەستی ماچ كرد. پاش ئەو هەنگامەیە حەشیمەتەكە ورتەی لێبڕا.

حەمەد گوتی:

"لێم عاجز مەبن كە ئەمانەم ئاوا بە رووت و قووتی هێناوەتە ئێرە. سزای من بۆ ئەمانە ئەمە بوو. ئێستا ئەمن ئەوان تەسلیمی ئێوە دەكەم. تفەنگ و فیشەك و جل و بەرگ و خرت و پرتیان لەو خوارەیە, ئەوانیش هەڵگرن. پاشانیش هەر سزایەكتان بۆ دانان كەیفی خۆتانە. یاڵڵا, خواحافیز"

دێهاتیەكان پێشیان پێگرتن:

"هەتا نانمان نەخۆن, ئیستیكانە چایەكمان لەكن نەخۆنەوە نایەڵێن حەمەدۆك بچێتە هیچ كوێ"

حەمەدۆك گوتی: دڵم لێتان ئێشاوە.

بابی حەسەن گوتی: بڵێ گوناهمان چیە؟

"ئێوە تووكتان لەمن كرد"

پیرەپیاوەكە گوتی: خەفەتی كوڕی...

پیرەژنێك گوتی: شەڕەف و ناموسمان پێشێل كرا...

حەمەد دەنگی هەڵێنا, دیار بوو زۆر تووڕەیە:
"ئێوە دڵی منتان بریندار کرد".
"چما ئێمە چیمان لێکردووی حەمەدۆک؟"
"چما دەکرێ حەمەدۆک کوڕەلاوێکی تازەپێگەیشتوو بکوژێ؟ ژنیشی نەهێنابوو, نا؟".
"نا ژنی نەهێنابوو"
"حەمەدۆک بێڕەحمیی وا دەکا؟"
حەشیمەت وەڵامی نەدایەوە.
"حەمەدۆک دەست بۆ ناموسی کەس درێژ ناکا. بۆچی فکری ئەمەتان نەکرد؟ بڕوانە حەمەدۆک تەنانەت ئەو دوژمنانەی شەڕەف و ناموسیش, کەسانێک کە ئەویان بەدناو کردوە تەسلیمی ئێوە دەکا. تۆڵەی منیش ئێوە بێئەستێننەوە".
حەشیمەت رەق رامابوو, کەس قسەیەکی بۆ نەدەهات. نەیان دەتوانی سەر هەڵبڕن و حەمەدی ببینن. وەختێک حەمەدو هاوڕێیەکانی وەڕێ کەوتن, حەشیمەت لەنێوێ ڕا لەت بوو, بووە دوویەش. حەمەدۆک لەپێشەوەو قاسم و دەمیر بەدوایدا وردە وردە لەدێی وەدەرکەوتن و ڕۆیشتن.
"ئەم دێیە ناوی چیە؟"
"پێی دەڵێن چاملی یۆڵ".

# (٢٢)

سفرەی ئومەت هەموو کاتێك بۆ هەموو کەس ڕاخرابوو. لەسەر ئەو کێوەو هەروەها لەو دەوروبەرە لە ماڵێ وی بەولاوە ماڵێکی دیکە نەبوو. بۆیە هەمیشە ئەو ڕێبوارانەی ڕێیان لێ‌ون دەبوو ئەوانەی لە زستانێ‌دا تووشی کرێوەو باکوت دەهاتن پەنایان بۆ ماڵێ وی دەبرد. ئومەت لە پێش دا نیمچە گوزەرانێکی هەبوو. ئێستا لە جێی ئەو خانووە قوڕو بەردە خانوویەکی دوو نهۆمی بیست و سێ ژووریی لێ‌ڕاکێشابوو کە بانەکەی سواڵەتی سوور بووو دەرگاو پەنجەرەکانی بەتاق هاتبوونەوە. چوار دەوری خانووبەرەکە بە شوورەیەکی بەرزی میلەدار دەورە درابوو. خانووبەرەکە بە بناری دارستان و بەردەڵانی چیاکەوە نووسابووو لە دوورەوەش بە ڕەنگی سپی‌یەوە دەدرەوشایەوە. دەیان گوت ئومەت لە سایە سەری کەکلیك ئۆغڵیی یاغی‌یەوە دەوڵەمەند بووە.

کەکلیك ئۆغڵی سی‌و حەوت ساڵی ڕەبەقی لەگەڵ سێ ڕەفیقی خۆی لەم چیایانەدا بەسەربرد, هێرشی کردە سەر ماڵان, سەربەندەنی گرتن و زۆر وەجاخی کوێرکردنەوە. ئومەت لە منداڵی‌یەوە ئەوی دەناسی‌و لەگەڵی هاودەست بوو. پەیامی بۆ دەگەیاندن و جوابەکەیانی بۆ دێنانەوە. خەڵك دەیان گوت کەکلیك ئۆغڵی لەو سی‌وحەوت ساڵەدا چەند سندووق ئاڵتوونی وەسەریەك ناوەو ئەم زێڕانەی بە ئەمانەت لە لای ئومەت داناوە کە زۆری خۆش دەویست و متمانەی پێ‌دەکرد. پاشانیش لە نەکاو ون بوو.

هەمووان دەیان زانی کە ئومەت ئەوی کوشتوەو چۆنی کوشتوە. ڕووداوەکەیان بە جۆرێك دەگێڕایەوە هەر دەت گوت بۆ خۆیان بە چاوی خۆیان دیویانە:

"شەوێکیان کەکلیك ئۆغڵی شەکەت و ماندوو بە توورەکەیەك ئاڵتوونەوە دێتە ماڵی ئومەت. ئەو دوو یاغی‌یەی لەگەڵیشی بوون هێندە ماندوو بوون خۆیان بەسەر پێوە ڕانەدەگرت.

ئومەت کە ئەوان وا دەبینێ زۆر خۆشحاڵ دەبێ. لە پێش دا نانێکیان دەداتێ کە دەرمانی بێهۆشی‌یەی دە هەویرەکەی کردبوو. سێ‌چەتەی پیر هەر لەوێ بێهۆش دەبن. ئومەت هەرسێکیان داوێتە سەر ئێسترو دەیان باتە سەر لوتکەی چیا. هەرسێکیان لە پەنای یەك ریز دەکاو دەیان داتە بەر دەسرێژ. چەتە بێهۆشەکان تەنانەت پەلەقاژەشیان نەکردبوو".

هێندێکیان باوەڕیان بەم دەنگۆیە دەکردو هێندێکیشیان نا. هەرکەس ئومەتی دەدی و دەی‌ناسی لە دڵی خۆی‌دا بەرامبەر بەو هەستی بە باوەرو متمانە دەکرد. لەگەڵ ئەو دەنگۆیەش کە لە بارەی کەکلیك ئۆغلی‌یەوە بلاو ببووەوە دیسان خەڵك لە جاران زیاتریان متمانە پێی‌هەبوو. ئەم دەنگۆیانەش بە هیچ جۆر کاریان لەو نەدەکرد. لەسەر ئەو کێوەو ئەم چوارڕێیانە هەم جەندرمە حەوجێیان پێی هەبوو هەم یاغی‌یەکان. ئەویش یارمەتیی هەموو کەسێکی دەدا کە لە تەنگانە کەوتبێ. یارمەتیی بەو جەندرمانە دەکرد کە بە دوای چەتەکان دا دەگەڕان و هەر ئەو خۆشەویستی و یارمەتی‌یەی بەزیادەوەش و بە دڵ و گیان بەرامبەر بەو یاغی‌یانە بەکاردێنا کە جەندرمەکان بە دوایانەوە بوون. گێرانی چەتەیەك چەندی ئەو خۆشحاڵ دەکرد ئەوەندەش خەمناکی دەکرد. ئومەت بابایەکی ئاوا سەیروسەمەرە بوو.

ئەم رۆژانە ئەسپی رەسەنی بەخێوەدەکردن. لە ئۆرفەو ئەسکەندەروون و حەڵەبەوە ئەسپی دێنان بۆ فەحل و تۆولێ‌گرتنەوە. لەو دەشتەی خوارێ‌دا مێگەل مێگەل بزن و گاوگۆلی ئومەت دەلەوەڕان. لەم دەوروبەرە هەرچی زەویی هەموارو راوند هەبوو, ئەگەر بستێکیش بایە, ئومەت بە ناوی خۆیەوە قەباڵەی بۆ دەرهێنابوو. هەمیشە پێ‌دەکەنی و هەمیشە خۆشحاڵ بوو. رۆژێك کە کاری دروست کردنی خانووبەرەکەی تەواو بوو, سێ کچی یەك لە یەکێ جوانتری دابەزاندن و زەماوەندێکی ساز کرد کە راست حەوت شەوو حەوت رۆژی خایاند. لە ماراش و ئاندرین و ئەدەنەو عەنتەپەوە خەڵکی بۆ سەر زەماوەند بانگهێشتن کردبوو. هەموو یاغی‌یەکانی ئەو چیایانەو هەموو مل ئەستوورەکان هاتبوونە سەر زەماوەندەکەی. ئومەتە زەرد نۆرەی بۆ بووکەکان داناو هەر شەوە چووە پاڵ یەکێکیان و بە سێ شەوان کارەکەی تەواو کرد.

ئومەتە زەرد هەروەها دارگوێزی کوێستانەکانی دەکڕی, بۆ هەر دارێك خاوەنێکی دەتاشی و لێی دەکڕی و دەستووری دەدا دارەکەیان دەبڕی. قوولکەیەك لەپاش ماڵەکەی بوو. ئەم قوولکەیە هەتا سەر لێوان پڕ بوو لە مووروە گوێز. ئومەت بەنیاز بوو بە زوویی سەری ئەو مووروەدارانە بە تەنەکە داپۆشێ و قەرار بوو دارەکان هەروا لەوێ وەمێنن. لەم دارانە کووپە کووپە زێڕی دەست دەکەوت. هەرچەندی زیاتریان لێ راوەستابا بە قازانجی بوو. قیمەتی دارگوێزەکان رۆژبەرۆژ دەچووە سەرێ.

حەمەدۆك و ڕەفیقەكانی نیوەشەوێ هاتنە ماڵی ئوممەتە زەرد. حەمەد بە دیتنی خانووبەرەكە سەری سوڕماو گوتی:

"هاوڕێیان وادیارە ڕێمان لێگۆڕاوە. پار ماڵی ئوممەتە زەرد لێرە بوو, ئەم خانووبەرە گەورەیەی لێنەبوو".

قاسم گوتی:

"ئەم خانووبەرە گەورە دوونهۆمە هی ئوممەتە زەردئاغایە, ڕاست لەجێی ئەو خانووەش دروست كراوە كە ئەتۆ دیبووت"

حەمەد سەری سوڕما.

"هەی ناكەس, ئەو هەموو دراوەی لەكوێ بووە؟ بە ساڵێك ئەم خانووبەرە گەورەیەی چۆن دروست كردوە؟"

"زۆر وەستاكاری لە سێواس و قەیسەریەو "گوێك سوو" ڕا هێنان, وەستاكاری بەناوبانگ و كارامە... لێرەش چ زۆرە؟ داروبەرد"

"هەموو زێڕەكەی كەكلیك ئۆغڵی لەلای وی بووە, وەك دەڵێن كەكلیك ئۆغڵیی كوشتوەو زێڕەكەش بۆخۆی بەجێ ماوە"

"ئوممەت كەس ناكوژێ, خەیانەت ناكا, حەتمەن وەختێك ئوممەت وەنێو كەوتوە كەكلیك ئۆغڵی بۆخۆی زێڕەكەی داوەتێ و پاشانیش سەری خۆی هەڵگرتوەو ڕۆیشتوە. باشە دەتەویست ئوممەت چ بكا؟ قۆڵی لێ هەڵماڵیوەو بسم الله"

قاسم گوتی: خوا بكا وابێ.

دەمیر گوتی: ئیشەڵلا وایە.

حەمەد بەدڵنیاییەوە گوتی: هەروایە.

بەردێكی هەڵگرتەوەو لە دەرگا گەورە سەربەتاقەكەی دا: ئوممەت! ئوممەت! هۆی ئوممەتە زەرد!

دوو پیاوی چەكدار دەرگایان كردەوە. ئەو پیاوە چەكدارەی لە پێشەوە بوو, بە دەنگێكی زۆر زبر گوتی:

"مام ئوممەت لە ماڵێیە, پێی بڵێم كێ هاتوە؟"

"بڵێ حەمەدۆكە"

لەحزەیەكی كورت هەموو بێدەنگ بوون, پیاوە دەنگ زبرەكە بە ڕاوێژێكی گەرمەوە پرسی:

"ئەتۆ حەمەدۆكی؟"

"ئەدی ئەمن حەمەدۆکم"

کابرا داهاتەوە بۆلای حەمەدۆك و تەماشای روخساریی کرد, لەبەر شۆقی ئەستێران نەیتوانی وەك پێویستە روخساری ببینێ. گوتی:

"ببوورە حەمەدۆك, با خەبەر بە ئاغا بدەم"

حەمەدۆك دەستووری پێدا: خەبەری پێ بدە.

تاوێك دواتر دەنگی پێکەنینی ئوممەت لە سەرێ دەنگی دایەوە:

"حەمەد, حەمەدم, براکەم حەمەد, بەخێر بێی. ئەم بێئەقلانە تۆیان لەبەردەرکێ راگرتووە؟"

دوو هاوڕێی لەمێژینە یەکتریان لەئامێز گرت.

ئوممەت لەپێشەوەو حەمەد بەدوایدا, چوونە سەرێ. ماڵەکە کەوش کەنێکی گەورەی بوو هێندەی مەیدانە ئەسپێك. ژوورەکان بە تەنیشت یەکترەوە ریز ببوون. ئوممەت دەرگای ژووری ئاخری کردەوە, لە کوورەخانەیەکی گەورەدا کە لەنێوەراستی ژوورەکەدا بوو و چواردەوری بە داری نەخشێندراو رازابووەوە مووروەداری گەورە گەورە بلێسەیان لێ هەڵدەستا, چرا نەوتییەکی گەورە بە کووپەیەکی شینەوە کە بە گوڵی پەمەیی نەخشابوو, راست لەسەر نێوچاوانی ئاورگەکە هەڵواسرابوو, ژوورەکەی رووناك دەکردەوە. لە دەوری ژوورەکە قەنەفە دانرابوون کە قالیچەی رەنگاوڕەنگ و نەرمیان لەسەر راخرابوو. قەنەفەکان پاڵەپشتی قالیچەی نەرمیان لەسەر دانرابوو.

"برسیتانە؟"

"وەختێك هاتووینە ماڵی ئاغامان, دیارە کە تێر نین. ئەمن بەم نیوەشەوە... بەڵێ, نیوەشەوێش بەرخی برژیو لە خاوەنی ئەم جۆرە خانووە داوا دەکەم"

"ئەمنیش هەر ئێستا دەڵێم بەرخ بۆ حەمەدۆکی خۆم سەر ببڕن. هەر ئەوەندە بەسە کە نەختێك راوەستی"

حەمەدۆك گوتی:

"رادەوەستم, ئەتۆ مشووری نان و پەنیرێك بخۆ. چایەکیش لەسەر ئەم ئاگردانە وەسەرنێ"

ئوممەتە زەرد بەگاڵتەوە گوتی:

"چی دیکە, چیدیکە, چ فەرمایشتێکی دیکەت هەیە؟ کوڕە وێچووەکەم, حەمەدۆك".

هاواری کرد: کچینە, کوڕینە...

سێ کەس, دوو کچ و کوڕە جحێڵەیەك هاتنەژووریێ.

"کوڕم هەر ئێستا بەرخێك سەر بڕن و بیبرژێنن. زووکەن. کچینە ئێوەش رۆنەکەرە, هەنگوین, پەنیرو هەرچی لەو جۆرە شتانە لە ماڵێدا هەیە زوو بێنن. چاش لێنێن, باش دێم بکێشێ. برای خۆشەویستم هاتوە, چما دەتوانم لە خۆشییان شێت نەبم"

بەڕاستییش ئومەتە زەرد لە خۆشییان لەجێی خۆی بەند نەدەبوو. دەچوو, دەهاتەوە, ئەوی لەباوەش دەگرت, ماچی دەکردو قسەی لەگەڵ دەکرد.

"تەنانەت خەبەری مەرگیشتم بیست"

"هێندەی نەمابوو بمرم"

"ئەگەر ئاناجیخ سولتان نەدەبوو..."

"ئێستاش یەکێك لە گوللەکان لەبن شانی ڕاستم دا ماوە"

ئەمجار داستانی دایەحۆری و ئاناجیخ سولتانیی گێڕایەوەو ئەوەی بەسەری هاتبوو لە سیرێ هەتا پیوازێ هەمووی بۆ ئومەتە زەرد باس کرد.

ئومەتە زەرد لەخۆشییان لەگوێیان پێدەکەنی.

"یاوەرێك هەیە ها؟ ئەوەی لە چیا تووشی ببووی, پێی دەڵێن یاوەر شەوکەت. دوژمنی خوێنیی یاوەر فارووقە. چاویان نیە یەکتری پێببینن. یاوەر شەوکەت هەرچەند سەر بە فەرماندەرایەتیی جەندرمەی ویلایەتی ماراشە, بەڵام دیسانیش لەدوای حەمەدۆك دەگەڕێ, هەر ئەوەندەی دەگوت: حەمەدۆك ئەمن دەیگرم, یاوەر فارووقیش بەری دەستی دەلێسێتەوەو لەلای خەڵکی زەلیل و ریسوا دەبێ. وەك دەڵێن ئەم دوو یاوەرە وا بەگژ یەکتردا چووبوون خەریك بوو خوێن بڕژێ"

"ئەتۆ جارێ باسی ئەم خانووبەرەیەم بۆ بکە, ئەمن سەرم لەم کارە دەرناچێ. ناکا پەرییان شەوێك لەشەوان هێنابێتیان و لێرەیان دانابێ"

"ئەگەر بڵێی پەرییان هێناویانە لێرەیان داناوە زۆرت زیاد نەگوتوە. ئەم خانووە بەڕاستی هەروا بە چاوتروکانێك دروست بوو. کەکلیك ئۆغلیی چەتە هەیە ها؟"

بێدەنگ بوو, ئەمجار چاوی بڕیە قاسم و دەمیر.

حەمەد لە مەبەستەکەی حاڵی بوو, گوتی:

"قسەکەت بکە, ئەمە قاسم و ئەمەش دەمیرە. هەموو قسەیەك لەلای ئەمانە دەتوانی بکەی, ئەم هاوڕێیانە لەوانە نین کە ئەتۆ بیریان لێدەکەیەوە, تێگەیشتی؟ ئەمن بەتەواوی

متمانەم پێیان هەیە. ئەگەر ئەمانە نەبان، ئەمن لەمێژ بوو لەبن گڵی ڕەش دا خەوتبووم، ئەودەم ئەم خانووبەرە جوانەی تۆشم نەدەدی"

ئوممەتە زەرد بە پێکەنینەوە گوتی:

"تێگەیشتم، ئێستا کەوایە باشم گوێ بۆ بگرە. ئەمن کەکلیك ئۆغڵیم زۆر لەمەوبەر، لە منداڵییەوە ئەووەخت کە بابم مابوو، دەناسی. پاش مردنی بابم کەکلیك ئۆغڵی هەر کارێکی هەبایە، تەنانەت کاری زێڕیشی هەبایە، وەلای دەناو ساڵێ چەند جار دەهات سەری دەدام و یەك دوو حەوتوو لەکن من دەمایەوەو دەحەسایەوە. پاش مردنی بابم ئەمن و ئەو وەك باب و کوڕ پێکەوە یەکدڵ و یەك گیان بووین. دوو برادەری هەبوون، هەرسێکیان بەڕۆژێك دەستیان بە چەتەیی کردبوو. ڕۆژێکیان لەپشت ئەو بەردە دەنگی فیتوویەك هات. دەسبەجێ زانیم کەکلیك ئۆغڵی هاتوە، ئەمنیش بە فیتوو جوابم دایەوە. ئێ کەس پێکەوە لە حەوشەی وەژوور کەوتن. کەکلیك ئۆغڵی لە حاڵێك دا منی لە ئامێز دەگرت گوتی: برازای خۆم، لەم دنیایەدا لەتۆ بەولاوە کەسم نیە. هەرچی بێ و نەبێ، دیسان کەس و کارم هەر ئەتۆی... جارێ بچۆ بەرانێکمان بۆ سەر بڕە، پاشان پێکەوە قسان دەکەین. ئەمن گوتم: کەکلیك ئۆغڵی بەچاوان، هەر ئێستا، لەوبارەیەوە خەیاڵت تەخت بێ. ئێمە دەزانین چۆن ڕێز لە برادەری بابمان بگرین.

کەکلیك ئۆغڵی بە هاوڕێیەکانی گوت: ئێوە بچنە ماڵی ئوممەتە زەردو ئیسراحەت بکەن، زۆر ماندوون، بۆخۆشی لەگەڵ دوو برادەرەکەی هاتن و لەسەر کانییەك کە لەبن هۆو چنارە هەڵدەقوڵێ دانیشتن. کەکلیك ئۆغڵی گوتی: برازا باشت گوێ لێبێ. ڕوخساری مات و گرژ بوو. ئوممەتە زەرد تازە دەیزانی کە کەکلیك ئۆغڵی ڕیشی هێشتوەتەوە. ڕیشێکی درێژی هەبوو، وەك چۆڕی شیری. کوڕم، زەردە، پیر بووم ئیدی، ڕۆژێکی پێ دەچێ تا لەم کێوەڕا خۆم دەگەیەنمە ئەو کێوە. چەتەیی بۆمن وەختی بەسەر چووە، ئێستا ناوو ناوبانگەکەمە کار دەکا. ئەم ناوبانگە یەك دوو ڕۆژ زیاتر بڕ ناکا. ڕۆژی سێهەم فاتیحەم خوێندراوە. ئەمن ئیدی دەست لە چەتەیی هەڵدەگرم. ئەمن زێڕێکی زۆرم هەیە، ئەوەندەم پووڵ هەیە کە تا ئاخری عومرم بە ڕەحەتی پێی بژیم، بلێ بزانم لە کوێ دەتوانم کونجێك بگرم و دانیشم؟

ئەو ڕۆژە تا ئێوارێ ڕاو تەگبیریان کردو لەفکری دیتنەوەی جێیەك دا بوون کە کەکلیك ئۆغڵی بتوانێ بەئاسوودەیی لێی بژی. دووهەمین ڕۆژیشیان بەباس و ڕاو تەگبیرو بیرکردنەوە لەو بارەیەوە بردە سەرێ. ڕۆژی سێهەم چوون و جێیەکیان دیتەوە کە دەبوو کەکلیك ئۆغڵی لەوێدا خۆی حەشار بدا. کەکلیك ئۆغڵی خۆشحاڵ بوو.

ڕۆژگارێك ڕەسووە کوردە پاشایان دوور خستەوە بۆ شارۆچکەیەکی چوکووراوا. ڕەسووەکوردە کە هاتە شوێنی دوورخرانەوەکەی، نۆ ژن، نیزیکەی هەزار سوار، منداڵەکانی و بەشێك لە عێل و عەشیرەتەکەی خۆشی لەگەڵ خۆی هێنا. وەختێك هاوین داهات کوردەکان کە فێری گەرمای بەسام و تەپۆو مێشولەی چوکووراوا نەبوون، نەخۆشی‌یان دەنێو کەوت و زۆریان لێ‌مردن. پاشانیش ئیزنیان لە حکوومەت وەرگرت کە بە سەدان ڕەشماڵەوە بچنە کوێستان. کەکلیك ئۆغلی کە ئەودەم لاو بوو هاتە خزمەت ڕەسووەکوردەو لە کوردەکان کە بە گوللە دەرزی‌یان هەڵدەگرت، فێری تفەنگ هاویشتن بوو، بەجۆرێك کە ڕەسووەکوردە پاشا لەدەست ڕاستی و ئەنگێوەیی ئەو سەری سوڕما. ڕۆژگار هات و چوو، و پاشا گەڕایەوە ئۆرفە. سەرانسەری دەشتی "جەرشان"، لە "هەیلان پیناری"یەوە هەتا چیاکانی "عبدالعقیم" بەشێك لە خاك و ملکی وی بوو. کەکلیك ئۆغلییش لەگەڵ ڕەسوو پاشا چوو بۆ ئۆرفە. پاشا ئەوی لەهەموو پیاوەکانی خۆشتر دەویست و لەخۆی دوور نەدەخستەوە. کەکلیك ئۆغلی لە ماوەیەکی کەم دا زمانی کوردییش فێر بوو.

پاشا دیسان لە ئۆرفە ئارامی نەگرت. لە ڕاستی‌دا ئەو دەی‌توانی لەسەر ئەو خاکە پان و بەرین و بەپیت و بەرەکەتە دەوڵەتێك دامەزرێنێ. پاشا ڕاپەڕی. لە شەڕو پێك هەڵپڕژانێك دا شکاو بە تەنگاوی پەنای بردە بەر حەڵەب. خانەکان و پاشاکان و والیی حەڵەب کەوتنە نێوبژی و پادشا ڕەسووپاشای بەخشی. ئەویش ڕازی بوو کە لە حەڵەب وەمێنێ و بە بەروبووی ملکەکانی گوزەرانی خۆی بەڕێوە بەرێ. ئەو دیسانیش دەچووە هەر جێیەك پارێزەری گیانی خۆی، واتە کەکلیك ئاغای لەگەڵ بوو. پاشا پیاوێك بوو بە چاوێکی بادامی کە وەك ئاسك دەیان ڕوانی، نێوچاوانێکی درێژو دەم و چاوێکی درێژو باریك و بەژنێکی وەك تووڵەنەمامەوە. ئەو لە عەرەبستان سواری جوانترین و ڕەسەنترین ئەسپەکان دەبوو. کەکلیك ئۆغلی و ئەو هاوتەمەن بوون و وەك دوو براش لەیەك دەچوون. تەنانەت جارێکیان والیی حەڵەب لەجیاتی ڕەسووپاشا کەکلیك ئۆغلیی لەباوەش گرت و ماچی کرد.

کەکلیك ئۆغلی کەسێك نەبوو تا ئاخری عومری پارێزگاری لەگیانی یەکێك بکاو کاری هەر ئەوە بێ. ئەو دەیەویست تفەنگی دەستی بە دڵخوازی خۆی وەکار بخا. بۆیە ڕۆژێکیان هاتە لای ڕەسووپاشاو گوتی:

"پاشا، ئەمن دوعاخوازیت لێ‌دەکەم، دەڕۆم"

"ئەوەم لەگەڵ مەکە، ئەتۆ لەم وڵاتی غەریبایەتی‌یە وەك برامی. لە براش لەمن نیزیکتری... ئەتۆ بۆمن وەك ئەو تیشکە هەتاوەی کە لە دوندی چیاکانی تووڕووس دەدا. هەق نیە بەجێم بێڵی و بڕۆی"

ڕەسوو پاشا هەرچیی گوت و هەرچیی کرد بێسوود بوو, کەکلیك ئۆغلی گوێی نەدایەو ڕۆیشت. ڕۆیشت و چەندین ساڵ لەگەڵ سێ برادەری خۆی لە عەنتەپ و ئۆرفەو حەڵەب خەریکی چەتەیی بوو. پیاوێك بوو نەترس و زبرو زرینگ و ئازا. لە سەرانسەری ڕۆژهەلاّت دا لە ئۆرفەو ئەدەنەوە بگرە هەتا حەڵەب و مووسڵ ناوبانگی دەرکردبوو و چەندین ساڵ لەم ڕێیانەدا زێڕو ئەڵماس و مرواری و یاقووت و زمرووتی خڕ کردەوە. ماڵی خانەکانی عەرەب و کورد و تورکی تالاّن کرد. وەختێك کەسێك ناوی وی دەبیست دەسبەجێ هەرچی داوای کردبا, دەیدایە. ئەوەندە بریندار ببوو جێی ساغی لەلەشیدا نەمابوو. وەك پشیلە حەوت گیانی هەبوون و بە مفتێ گیانی خۆی تەسلیمی ئیزرائیل نەدەکرد.

پاش ئەوەی باری خۆی تێك نا هاتەوە تووڕووس کە بۆ وی جێگایەکی بێخەتەر بوو. چیاکان گەورەترین پەناگەی یاغییان بوون. لێرەش بێکار دانەنیشت, چەتەیی کرد, زۆر ماڵی تالاّن کردن, زێڕی وەسەریەك نا بەلاّم تاقە جارێکیش شتێکی لە هەژارێك نەستاند, حاشا لە دەرزییەکیش, قەتیش کەسانێکی ئەزیەت نەدا کە سامانێکی زۆریان نەبوو. لەم دەشتەو لەم کێوە خانێك و ئاغایەك نەما کە رووتی نەکردبێ. دەت گوت مەختەی لەسەر هەموو ئاغاو خانەکان داناوە, کاتێك وەختی دەهات خان و ئاغاکان مەختەی خۆیان تەسلیمی ئەو پیاوانە دەکرد کە کەکلیك ئاغا دەیناردن. ئەو کەسانەش کە مەختەی دیاریکراویان نەدابایە, تەنانەت ئەگەر چووبانە کونی مارەوە, یان لەژێر باڵی پەلەوەردا خۆیان شاردبایەوە, ڕەوانەی دنیای دیکە دەکران. لەو کاتەوە کە چیاکانی تووڕووس دروست ببوون, چەتەی وا ئاقڵ و زرنگ و بەهۆش و چالاکیان بەخۆوە نەدیبوو. چەندین ساڵ لەم کێوانەدا زۆر دەستەو فەوجی جەندرمەی وەدوای خۆی خستن و هەڵی خەڵەتاندن. هەموویان لەدەستی جاڕز ببوون. گەورەترین سروشتی تایبەتیی ئەوەبوو کە ئەگەر ئەمشەو لێرە بوو سبەینێ ئێوارێ سەروسەکوتی لە چوکووراوا دەردەکەوت. ئەم هەموو خێرا بزووتنەوەیە بەفکری کەس دا نەدەهات.

ڕۆژێك خەبەرت دەزانی کە لە ئالاّداغییە, دوو ڕۆژ دواتر دەت دی سەری لە چیای دوڵدوڵ وەدەرناوە... تەنانەت باڵندەش ئەو مەودا دوورەی لەماوەیەکی وا کەم دا نەدەبڕی.

لە تووڕووس و چوکووراوا هەمووان هەر باسی ئەو زێڕو ماڵەیان دەکرد کە ئەو وەسەریەکی نابوو.

پاشا مابوو و لە حەڵەب دەژیا. ئەو پەناگەیە کە کەکلیك ئۆغلی و ئومەتە زەرد پاش سێ شەوو ڕۆژ لێکدانەوە دیبوویانەوە, ماڵی پاشا, لە حەڵەب بوو. ئەگەر پاشا ئەوی دیبایە زۆر خۆشحاڵ دەبوو. وەزع و حاڵی پاشا وەك جاران نەمابوو و گوزەرانێکی باشی نەبوو. کەوایە چوونی وی کۆمەگێکیش بە حاڵ و گوزەرانی پاشا بوو.

"مەسەلە تەواوە, دەچمە لای پاشا. تکایەکی دیکەشم لێت هەیە ئومەتە زەرد, ئەگەر ئەویشم بۆ جێبەجێ بکەی بە ئاسوودەیی سەر دەنێمەوە"

"فەرموو مامەگیان, هەرچی دەفەرمووی بەسەر سەر"

"دەبێ ئەم خانووە بەمن بفرۆشی, وەستاکارم هێناون, ئەوان دەزانن لە جێیەکەی چ خانوویەك دروست دەکەن ئەو خانووەی رەسوو پاشا لە دەشتێ هەیبوو پێم نیشان داون. خانوێکی وەك وی لێرە ساز دەکەن. خانووەکە بەساڵێك تەواو دەبێ و پاشانیش دێم دەیبینم. گلکۆی من لەنێو ئەو بەردەڵانە لەبن ئەو چنارە دروست بکە. لەهەرکوێ مردم تابووتەکەم بێنەوە ئێرە بم نێژە. لەبارەی پووڵیشەوە دوایە دەزانی کە زێڕو ماڵی من بەقەد خەزنەی سوڵتان سولەیمانی قانوونیە. هەمووی دەدەم بەتۆ. بۆخۆشم ئەوەندە زێڕ لەگەڵ خۆم دەبەم کە هەتا ئاخری عومرم پێی بژیم, دنیایە, ئەگەر لێشم بڕا ئەتۆ بۆم بێنە"

نیوەشەوێك سێ ئێستریان بردن و چوونە شوێنێکی حەستەم کە زێڕەکەی کەکلیك ئۆغلیی لێ شاررابووەوە. بەڕاستی جێیەك بوو شەیتان فکری نەدەکرد. زێڕەکە لە چەند سندووقی پۆڵادا بوو.

"وەختێك خانووەکە تەواو بوو کەکلیك ئۆغلی هات بیبینێ؟"

"نا نەهات"

"بیستی کە تەواو بووە؟"

"ئەرێ بیستی"

"دێتە ئێرە؟"

"قەرار وایە"

حەمەد بە هەژانەوە گوتی:

"کەنگێ دێ؟ ئەگەر هات خەبەر بەمنیش دەدەی؟"

"ئەرێ, خەبەرت پێدەدەم"

"لەگەڵ پاشا نێوانیان چۆنە؟"

"پاشا زۆر دەست کورت ببوو. کاتێك کەکلیك ئۆغلی دەبینێ زۆر خۆشحاڵ دەبێ. کەکلیك ئۆغلییش زێڕەکەی داوێتە بەرپێیانی"

"ئەتۆ ئیدی پووڵداری"

"ئەدی پووڵدارم"

"ئەم خانووە ئی تۆیە"

"ئی منە, بەڵام نازانی چەند حەز دەکەم بێت و ئەو خانووەی بۆی دروست کراوە بەچاوی خۆی ببینێ..."

"بۆچی هەر ئەودەم کە خانووبەرەکە تەواو بوو نەهات؟"

ئومەتە زەرد گوتی:

"زۆر دەترسێ"

"کەکلیك ئۆغڵی؟"

"بەڵێ"

"سەیرە"

"پیاو کە پیر بوو تەنانەت ئەگەر هەژدیهاش بێ, ترسەنۆك دەبێ"

"ئەمەم دەزانی, بەڵام چما پیرێك چەندی عومر ماوە کە..."

"تاقە رۆژێکیش مابێ, هەروا بزانە هەزار ساڵە, بە هەردوو دەستان پێیەوە دەچەسپێ... هەربۆیە لەم جیهانەدا هیچ بوونەوەرێك لە بنیادەمی پیر ترسەنۆکتر نیە. وەختێك کوێرئۆغڵیی ئازا تفەنگی دی, بە ئەقڵیشیدا نەهات کە بۆخۆشی یەکێك لەوان بکڕێ, لە کێویارە ڕای کرد. دەزانی بۆ؟ ئەگەر پیر نەبایە رای دەکرد؟"

"نا, رای نەدەکرد"

"لەبەر ئەوەیە کە کەکلیك ئۆغڵی ئیدی ناتوانێ بێتە ئەم دەوروبەرە, ئەو دڵنیایە کە ئەگەر مرد جەنازەکەی دێنمەوە ئێرە"

"نازانم هۆی چیە. هەموو کەس متمانەت پێدەکا. هەرچەند دەڵێن ئەتۆ کەکلیك ئۆغڵیت کوشتوە, دیسان ناتوانن متمانەت پێ نەکەن"

"ئەوان دەزانن کەکلیك ئۆغڵی نەمردوە..."

"ئەگەر نیگارکێشێکت پەیدا کردبا..."

"مەبەستت ئەوەیە بڵێم وێنەیەکی خانووبەرەکەم بۆ بکێشنەوەو بۆینێرم بۆ کەکلیك ئۆغڵی. فکری چاکە. پیاو بەخۆڕایی نابێتە حەمەدۆك"

"چما ئەمن چیم کردوە کە بوومە حەمەدۆك؟ ئەقڵم نایبڕێ. کوێرئۆغڵییش وەك من بوو؟"

"راست وەك تۆ"

"فایدەی چی؟... بەخۆڕاییییە..."

نومەت گوتی:

"بڕوانە دەمەوێ شتێکت پێ بڵێم، باش گوێ ڕاگرە... وەختێك خەڵك بەتۆ دەڵێن حەمەدۆك حەتمەن حیکمەتێکی تێدا هەیە. دیارە شتێکیان لەتۆدا بەدی کردوە. خەڵك پیاوان باشتر لە هەموو شتێك دەناسن. ئەوەتا دنیا دنیایە ئادەمیزاد بیر لە ئادەمیزاد دەکاتەوە... بنیادەم هیچ شتێك لە هاوجنسی خۆی باشتر ناناسێ"

"ئەمن بە ئەقڵم دا ناچێ"

"دەبێ پێیدا بچێ".

"ئەو بنیادەمە کە ئەتۆ دەڵێی ها؟ زۆر جار لە ناسینی ئادەمیزاددا زۆر بەهەڵە دەچێ"

"زۆر باشیشیان دەناسێ. کەکلیك ئۆغلی چۆن لەنێو ئەو هەموو بنیادەمەدا منی دۆزیەوە، دەیزانی ئەگەر دنیاش خەرابێ، دیسان ئەمن ئەم خانووبەرەیە دروست دەکەم و جەنازەکەی دێنمەوە ئێرە. دەینێژم و لەسەر گڵکۆکەشی گوڵی کێوی دەنێژم. هەم نێرگزی چاوڕەش دەچەقێنم و هەم سونبولی کاکۆڵ بنەوش"

گۆشت بەرخی برژیو لای بەیانی پێگەیشت. بێئەوەی قسەیەك بکەن زگی خۆیان تێر کرد. قاسم و دەمیر تەماشای چاوەکانی حەمەدیان کرد. لەبەر بێخەوی لە سەرەمەرگ دا بوون.

"ئێوە بچن بنوون. ئەمن لەگەڵ کاك ئومەت ئێشك دەگرم"

ئەوان هەستان. ئومەتە زەرد چوو ئەوانی خەواندو هاتەوە:

"باشە، بڵێ بزانم ئێستا چەند یاغیی جێی باوەڕو جوامێرو ئازاو بەئەزموونت لەبەردەست دا هەن؟"

"هەمن"

"کێ؟"

"دەستەی سینەم ئۆغلی"

حەمەد پێکەنی.

"بۆچی پێدەکەنی؟"

"سینەم ئۆغلی هێشتا منداڵە"

"گەنج عوسمانیش منداڵ بوو. ئەتۆش منداڵی"

حەمەد گوتی: تێگەیشتم، تێگەیشتم، تێگەیشتم.

"بۆخۆشی, یەکەم خواو دووهەم تۆ دەپەرستێ. زۆرم قسە لەگەڵ کردوە. بلێ بزانم چ کارێکت پێی هەیە؟"

"دەمەوێ هێرش بکاتە سەر شارۆچکە"

"چۆن؟"

"هیچ, هیچ, دێتە سەر تەپۆلکەکەی رووبەڕووی شارۆچکە لە نێو دارەکان لە پشت شێست تیر دادەنێشێ. پاش ئەوەی شارۆچکەی وەبەر دەسڕێژ دا لای بەیانی پاشەکشە دەکا بۆ چیا"

"باشە پێم بلێ بزانم چ فکرێکت لەسەردایە؟"

حەمەد لەبارەی ئەوە کە مەبەستی چیەو چ بەرنامەیەکی هەیەو چ دەکا, موویەموو هەموو شتێکی بۆ ئومەت شی کردەوە.

ئومەت لەبەری پاڕایەوە:

"مەچۆوە چوکووراوا. ئەم جارە لە چوکووراوا بە ساغی دەرناچی. بووەتە چل هەزار چاوی خائین کە هەمووی چاوەڕێی تۆیە"

باسێکی درێژیان کرد, ئومەتە زەرد نەیتوانی حەمەدی پەژیوان بکاتەوە. قسەی پیاوان یەك بوو.

"زۆرم پەرۆشی حەمەد, حەیفە. هەتا کاتێك ئەتۆ هەناسەت لەبەردایە, فەقیرو هەژار چاوی هیوایان تێوە بڕیوی. تەنانەت ئەگەر هیچیش نەکەی. ئەتۆ کەسێك نی بتوانی واز لە یاغیگەری بێنی, هیوایەکت بەم کارەت نەبێ. ئەتۆ لەگەڵ ئەو کرمە کە لەمێشکت دا دەجووڵێ لەدایك بووی. ناتوانی جۆرێکی دیکە بی"

حەمەد گوتی:

"نامەوێ بمرم, نامەوێ بە گوللەیەك بمرم"

"بەگوللەمردن لەچارەت نووسراوە. هیچ دەزانی ئاناجیخ سوڵتان ئەو ئەنگوستیلەیەی بۆچی داوە بەتۆ کە لەدەستی کەی؟"

وەختێك تاو هەڵات لە خانوویەرەکە وەدەر کەوتن و هاتن لەسەر تاتەبەردێك کە لەبن دارچنارەکەی خۆشەویستی کەکلیك ئۆغلی بوو دانیشتن. لەگەڵ بەری بەیانی دنیا ئەوەندە رووناك بوو کە دەنك دەنکی وردە بەردەکانی بن ئاوی کانیەکە دەبینران.

"ئەنگوستیلەکەی بۆیە دا بەتۆ چونکە دەیزانی ئەتۆ بەخۆت ناوێری"

وادیار بوو کە حەمەد بە قسەکانی ئومەت هەم تووڕە بووەو هەم بێئەوەی بەخۆی بزانێ لەناخی دڵیەوە خۆشحاڵە.

"دەڵێن عەلیەیەشەل چووەتە بن باڵی دۆران ئەفەندی"

"وەرە بڕوانە عەلیەیەشەل, کڵاوشەبقەیەکی لەسەر ناوە وەك والیی ئەدەنە, پەڕەهەڵۆیەکی سووریشی لەکڵاوەکەی داوە. چەکمەی دە لاقەشەلەکەی کردوە... ماوەیەك لەمەوبەر سواری ئەسپێکی عەرەبی بوو. فیلینتایەکی لەشان دا بوو... ئەویش لەسەری داوە"

"چۆن چۆنی لەسەری داوە؟"

"هەمیشە دەڵێ مورتەزاغای دەکوژم"

"ئەوەی بەڕاستی کرمی لەمێشك دایە عەلیەیەشەلە. ئەو کرمەی لەمێشکی وی دایە بەقەد پڵنگێکی دڕندەیە. پێم سەیرە ئەم پیاوە ئەو هەموو ساڵە چۆن توانیویە ئەم نیزامە, ئەم رەوشتە, ئەم هەموو دزێوی و زوڵم و زۆرە تەحەممول بکا. دڵی چل شێری لەسنگ دایە. عەلیبیشت دەوێ؟"

"ئەگەر ئەو خۆی شێت کا, ئیدی ناتوانم لە چوکووراوا بێمەدەرێ"

"کەسی دیکەت پێویستە؟"

"خۆش بی کاك ئوممەت. ئەو سێ کەسەمان بەسین"

پیاوەکانی ئوممەت بە دوو رۆژان سینەم ئۆغلیان دیتەوەو هێنایان, شەش کەس بوون. هەموویان هاوتەمەن و لاو بوون. سینەم ئۆغلی هەر کە چاوی بە حەمەد کەوت, بەرامبەری دەستەونەزەر وێستا, دەستی وی گرت و پاش ئەوەی سێ جاری ماچ کرد لەسەر نێوچاوانێی دانا. ئەوانی دیکەش هەر وایان کرد. چوون بەرامبەری لەسەر چۆك دانیشتن و دەستیان لەبن هەنگڵیان نا. بە سەرسوڕماوی و حەبەساوی تەماشایان دەکرد, دەت گوت دەڕواننە چیایەکی بەشکۆ کە هەتاو لە لووتکەکەی دابێ.

ئوممەتە زەرد پێشتر لەبارەی دەستەی سینەم ئۆغلیەوە قسەی لەگەڵ حەمەد کردبوو و یەك بەیەك باسی ئەو یاغیانەی بۆ کردبوو کە لەو دەستەیەدا بوون. سەیر ئەوەبوو بەسەرهاتی هەموویان وەك یەك بوو. داستانی ژیانی هەموو ئینسانەکانی ئەم کێوانەو ئەم دەشتە وەك یەك بوو. ئەگەر وایە بۆچی ئەم تاقە سوارە وەکێوان کەوتبوو. داخوا کرمی مێشکی وان کرمێکی دیکە بوو؟

بابەگەورەی سینەم ئۆغلی چووە شەڕو ئیدی نەهاتەوە. وەك دەیان گوت باپیری و هەروەها بابی باپیری و بابی باپیرەگەورەی هەموویان چووبوونە شەڕو نەگەڕابوونەوە, باپیری, بابی, سێ مامی و حەوت خاڵیشی لە شەڕی بیابانی عەرەبستان و شەڕی یۆنان دا بەشدار ببوون. باب و

باپیری لاوەکانی دیکەی ئەم دەستەیەش هەر چووبوونە شەڕو نەگەڕابوونەوە. هەرشەش لاوەکە کاتێك وەختی سەربازی‌یان هات, ئەقڵی خۆیان خستە سەریەك, فکریان کردەوە, لێکیان دایەوەو روویان کردە چیا.

"ئەگەر عافواتێك دەرچێ واز لە چیا دێنن؟"

"وازی لـێ‌نایەنین"

"ئێوە دەتانەوێ تا مردن لەشەڕدا بن, کەچی لەترسی شەڕ نەچوونە سەربازی..."

"چەتەیی لەشەڕ چاکترە"

حەمەد گوتی: بەچی ڕا دەزانن؟

دیسان بریسکە پۆڵای گۆڕین هات و لەبنی چاوانی‌دا جێگیر بوو. هەتاوی زەرد زەرد بە دەوری سەری‌دا دەستیان کرد بە سووڕان, یەکیان گرت و بوونە خەرمانێکی خۆرەتاو.

"ئەگەر جێ‌یەك بۆ خۆمان پەیدا کەین, باقە پرتەقالێك لە لێواری دەریا... ئێوە قەت باغەپرتەقاڵتان دیوە؟"

سینەم ئۆغلی دەستەکانی خۆی نیشان دان. پڕ بوو لە قەڵشت و برینی سارێژ بووەوە.

"بڕوانە دەستانم, ئەوانەی لە باغە پرتەقاڵەکان دا کرێکاری دەکەن, دەستیان ئاوای بەسەردێ. ئەمن لە حەوت ساڵی‌یەوە لەدۆرت یۆڵ لە باغە پرتەقالان دا پرتەقاڵم لـێ‌کردوونەوە"

"ئێستا ئەگەر ببینە خاوەن باغەپرتەقالێکی گەورە کە خونچە دەربکاو بۆنی خۆشی لـێ‌بێ, دیسان ئێوە واز لە چیا ناهێنن؟"

"نا, وازی لـێ ناهێنین"

ڕۆژئاوایە عەلی‌یەشەل بە سواری ئەسپە بۆرەکەی گەیشتەجێ. حەمەد هەرکە چاوی پێ‌کەوت دەستی کرد بە پێکەنین. شەلە لە ئەسپەکەی هاتەخوارێ و چوو باوەشی بەحەمەدو ئومەت دا کرد. حەمەد هێشتا لەبەر پێکەنین دوولا هاتبووەوەو تەماشای عەلیی دەکردو پێ‌دەکەنی.

عەلی‌یەشەل وای نیشان دەدا کە قەڵس بووە, نێوچاوانی تێك نا:

"چیە؟ بۆچی پێ‌دەکەنی کوڕم, جێ‌یەکم بەدەرەوەیە حەمەدە لیکێ"

"نانا... بڕوانە ئەو کڵاوشەبقە گەڕگەڕی‌یە... گەڕگەڕی..."

حەمەد لەبەر پێکەنین هەناسەی ڕاوەستابوو. سینەم ئۆغلی, قاسم, دەمیرو ئومەت و یاغی‌یەکانی دیکەش ڕەگەڵ حەمەدی کەوتبوون و پێ‌دەکەنین.

"کورم ئاخر کلاوگەرگەری کوێی بۆ پێکەنین دەبێ؟"
"لایبە لەسەر سەرت عەلی"
"لاینابەم کورم, هەتیوە چەتەیەکی نەدی بدیی وەك تۆ چ لە کلاوشەبقەیەك کە ئاغاو خان و پاشا لەسەری دەنێن حالی دەبێ. ئەتۆ دەزانی ئەم کلاوشەبقە مەخمەرییە خوێنی سێ بەچکە دێهاتیی وەك تۆیە؟"
عەلیەشەل گەرگەرییەکەی لەسەر سەری هەڵگرت, دەستی بە پەرەسوورەکەیدا هێنا, بەچەند پتە تۆزوخۆڵەکەی لێتەکاندو بەهێواشی لەسەری نایەوە.
"حەمەد! ئێستا تێگەیشتی کورم ئەم کلاوگەرگەرییە چۆن دەکەنە سەریان؟"
حەمەد گوتی: ئەرێ, تێگەیشتم.
سێ کۆنە هاورێ لەپەنای یەکتر دانیشتن و دەستیان کرد بە دەردیدڵ. شەلە تا تولعی بەیانی باسی شارۆچکەو ترسی خەڵکی شارۆچکەو داستانی خۆی و مورتەزاغای بۆ کردن. وەختێك ئەو دەیگێرایەوە حەمەد پێدەکەنی و لەبەر پێکەنین کەفەزگ دەبوو.
"کاك عەلی ئەتۆ خەریکی بە پێکەنین دەم کوژی"
"سبەینێ کە تووشی یاوەر فارووق بووی پێکەنینت لەبیر دەچێتەوە"
"نا, لەبیرم ناچێتەوە"
"وەختێك ئەمن مورتەزاغام کوشت و وەکێوان کەوتم, ئەو وەخت بە باشی پێکەنینت لەبیر دەچێتەوە"
"ئەتۆ ناتوانی کاری وا دەرهەقی من بکەی, ئەگەر ئەتۆ لە چوکووراوا نەبی, ئەمن چم پێدەکرێ؟".
"ئەتۆ چت پێخۆشە وا بکە. ئەمن بەدەستی خۆم دەیکوژم"
"چۆنە لەجیاتی ئەوەی ئەوی بکوژی, من بکوژی؟"
عەلیەشەل چاوی پێ دەرپەڕین, لێوەکانی کەوتنە لەرزین, مستی خڕ کردەوەو گوتی:
"تەواوی ئەو سووکایەتییەم لەبەر خاتری تۆ قبووڵ کردوە. ئەگەر ئەتۆ پێش من مورتەزای بکوژی, بە قورئان و بەناوی خوا ئەمنیش تۆ دەکوژم..."
حەمەد گوتی:
"ئۆۆۆ. مام عەلی بۆ هێندە تووڕە بووە؟"
حەمەد هیچ کاتێك عەلیەشەلی وا نەدیبوو.

عەلی‌یەشەل کە تێگەیشت حەمەدی نارەحەت کردوە، گوتی:

"لێم ببوورە حەمەد، دەزانم کە هەرچی ئەتۆ بڵێی هەر ئەوە، بەخوا گوناهە بنیادەمێکی نزمی وەك وی لەم دنیایەدا چۆرەئاوێك بخواتەوەو پاروەنانێك بخوا. دنیاکەمان هەرچەندیش خراپ بێ دیسان بنیادەمی وا رێی ناکەوێ تێیدا بژی"

حەمەد لەحاڵێك دا ملی بەلاوە دەنا گوتی:

"مام عەلیی خۆم، کێ دەزانێ تا ئێستا چەند ئینسانی خەراپ و نزم و هەتا حەزکەی بێشەرم هاتوونە سەر ئەم دنیایەو تێیدا ژیاون، کێ دەزانێ؟"

عەلی‌یەشەل زۆر بەتوندی گوتی:

"لینگەی وی نەهاتوەتە سەر دنیا، ئەمن بەدەستی خۆم دەیکوژم"

حەمەد بەپێکەنینەوە گوتی:

"باشە بیکوژە.

بەیانی زوو عەلی‌یەشەل لەحاڵێك دا خۆی هاویشتبووە سەر زینی‌و بە پتە تۆزوخۆڵی لە کڵاوگەڕگەری‌یەکەی دەتەکاند وەرێ کەوت. هەتا ئەدیو بوو حەمەدۆك دەستی بە بەرزگیەوە گرت و لەدوایەوە پێکەنی.

"ئومەت، ئێمە پێویستیمان بە سێ ئەسپ هەیە"

"ئۆ... لێرە چ زۆرە ئەسپ..."

"ئەو هەموو ئەسپەت بۆ هەیە؟"

"رەشیدە کوردە هەیە..."

"ئەرێ..."

"پێم گوتی خەڵکی ئۆرفە بوو..."

"ئەرێ، گوتت"

"ئەسپە رەسەنە عەرەبی‌یەکانی ئۆرفە جوانترین ئەسپی دنیان"

"ئەوە هەموو کەس دەیزانێ"

"ئەو پاشا کوردە لە ئۆرفە پڕی چەندین تەویلەی ئەسپی عەرەبی هەبوون".

"ئەتۆ ئەم ئەسپانەت لەئۆرفەوە هێناوە؟"

"حەوتوویەك، مانگێك نەبوو کە کەکلیك ئۆغڵی بەقاچاخچی‌یەك دا بە چەتەیەکی کورددا یان بە تەتەرێك دا ئەسپێك نەنێرێ..."

"زۆرت ئەسپ لەسەر ئاخورِ هەن؟"

"هەتا بەیانی بیان ژمێرە, هەمووشیان بەزین و لەغاوەوە. هەر زین و لەغاوێك لەوانەیە بایی سەد سکەی زێرِ بێ"

"ئیشەڵلآ کەکلیك ئۆغلی ترسەکەی وەلا دەنێ و دێ هەموو ئەمانە دەبینێ..."

ئومەتە زەرد گوتی: ئیشەڵلآ.

لەگەڵ تاوهەڵاتێ ئەسپەکانیان دەرکێشانە دەرێ و سوار بوون. ئومەتە زەرد هەریەکەی سەربەرگێکی لبادی دەسکری قابارتای چەرکەسییشی دانێ بۆ ئەوەی چەکەکانیان دیار نەبن.

"ئێوە برِۆن, ئەمنیش دوای ئێوە دێم. ئەمنیش بەچەکەوە دێمە شارۆچکە"

ئەو شەوە تا بەیانی ئەسپیان لینگ دان, بەڵام هێشتا نەیان توانیبوو بگەنە گوندی وایوای. لای بەیانی گەیشتنە قامیشەڵانی نیزیك "عەزەبلی" ئەسپەکانیان بردە نێو قامیش و حەیزەرانەکان و لەوێ چاوەروان بوون شەو دابێ. حەمەد کەم سیکەدانە بوو. دەیەویست دەسبەجێ بێتەدەرێ و بچێتە گوندی وایوای. لە جادەیەکی دوورەوە دەنگی رۆیشتنی داشقەکان دەهات, لەلای باکوورەوە بایەکی ساردی دەهات و قامیش و حەیزەرانەکانی بەلای باشووردا لار دەکردەوە. دەشتەکە لە خشەخشێکی سەیردا نوقم ببوو. ئەو باڵندانەی لەپێش باکەوە دەرِۆیشتن بە توندی بەرەو دەریای مێدیترانە دەفرِین و پەرِەکانیان لەبەر با پەرِش و بلاو دەبوون. بۆنی گیا, بۆنی رەگەو بۆنی گەڵارِزیو دنیای پرِ دەکرد. لە ئاسمان هەورێك لەسەر ئاناوارزا راوەستابوو لەجێی خۆی نەدەجوولا. حەمەد چاوی لەسەریەك دانان و دنیای دەوروبەری لەبیر خۆی بردەوە. گوڵەکانی دەلیجەقۆیاخ پشکووتبوون. دارهەنارەکان وەك هەورێکی سوور بەرەو دوندی چیا تێهەڵچووبوون.

جادەیەکی سوور لەکێوییەوە هەتا نیزیك قامیشەڵان راکشابوو و دەشتەکەی لەنێو خۆی دەگرت. باڵندەیەکی سوور بەچاوێکی وەك پۆلووی سوورەوە بەو باڵانەیەوە کە وەك مەشخەڵ سوور دەچوون بەسەر قامیشەڵانەکەدا دەفرِی.

گوڵەگەنە زەردو پێگەیشتووەکان بەدەم بای دەمەو ئێوارەوە لە حالێك دا لاسکەکانیان دەبریقانەوە بە درەوشانەوەیەکی زێرِینەوە بەلای رۆژهەڵات دا دەچەمانەوە. روخساری تاوەسووتی سەیران و بسکەکانی کە گەنم رەنگ بوون بۆنی توندی گوڵ و بۆنی هەتاویان لێدەهات... خاکی گەرم بۆنێکی لێدەهات کە ئەوی شێت دەکرد.

لەشی سەیرانێ بۆنی گەڵای زەردی پاییزو بۆنی خاکی باران لێدراوی لێدەهات. تەرِو گەرم... حەمەد پەیتا پەیتا لە باتلاغەکە دەهاتەدەرو دەیرِوانیە لای گوندی وایوای و بە

کونەلووتی فشەوە بۆنی بەهەواوە دەکرد. هەموو جێیەك بۆنی لەشی سەیرانێی لێدەهات. بۆنی سەیرانێ کەوتبووە سەر بەردەکان, سەر بازە بریندارەکە, سەر بنەوشەی بن درووەکان و سەر کانێیەك کە پنگی لەدەوروبەر ڕوابوو. قاسم و دەمیریش بۆنی سەیرانێیان لێدەهات.

سەرەنجام حەمەد چی دیکەی خۆ پێ ڕانەگیراو گوتی:

"ئەسپەکانتان بکەنەوە هاوڕێیان, دەڕۆین"

قاسم کە پیاوێکی زۆر بەئەزموون بوو و باش لە وەزعی حەمەد حالّی دەبوو, هەستاو گوتی: با بڕۆین.

هەتا ئەوان جوولاّن حەمەد بەسواری ئەسپ لە قامیشەلاّن دەرکەوتبوو.

بەغاردان گەیشتنە نێودێ.

وەسمانەزلە باوەڕی بەوە نەدەکرد کە دەیدی. لە دەرکی مالّەکەی راوەستابوو و تەماشای ئەو سێ سوارەی دەکرد کە سات بەسات نیزیکتر دەبوونەوە. بەلاّم نەیدەناسین. ئەوەندە هەبوو ئەسپەکان و سوارەکانیان شتێکیان دێنایەوەبیر. دەڕۆیشت, دەهاتەوە, دەیڕوانی بەلاّم هیچ سەری لێ دەرنەدەکرد.

"مام وەسمان, مام وەسمان, ئەمنم, حەمەد"

وەسمانەزلە لەحالّێك دا دەیگوت: حەمەدۆك, شەهێنەکەم! غاری دایە کنی. چوو هەوساری ئەسپەکەی وی گرت. وا هەژابوو ئەگەر خۆی بە ئەسپەکەوە نەگرتبایەوە دەکەوتە سەر عەرزی. حەمەد لە ئەسپەکەی دابەزی, ئەوی لەباوەش گرت و بردیەوە ژوورێ. دایەقەمەر کە لەبەر دەرگا راوەستابوو چاوەڕوانی دەکردن, بە قاسم و دەمیری گوت:

"ئێوەش دابەزن کوڕینە"

بەلەحزەیەك حەوشی مالّەکە پڕ بوو لەحەشیمەت. ئەسپەکانیان بردە تەویلە. سەیران کە دیبووی حەمەد دێتە نێو ئاوایی و ئەویش بەغاردان, بەرەو مالّی وەسمانەزلە غاری دەدا. زۆری رق هەستابوو. لەترسان جەرگی جەرگیی دەخوارد: ئەم نەفامە ئەجەل هەلّی گرتوە؟ بەڕۆژی ڕووناك و ئەویش بەسواری ئەسپ هاتوە..."

ئەم دێیە پڕ لە شۆفارە. ئای حەمەدی بێئەقلّ, ئای کە جارێکم دەست کەوتی و دوایەش لێم ون بووی..."

هەتا سەیران گەیشتێ حەوشە گەورەکەی مالّی وەسمانەزلە پڕ بوو لە حەشیمەت, هێشتاش هەرکەس خەبەری دەزانی غاری دەدا بۆ مالّی وەسمانەزلە. سەیران هات, دڕی بە حەشیمەت داو لەبەر دەرگا راوەستا. ڕەنگی وەك زەعفەران زەرد ببوو. هەموو ئەندامی لەشی دەلەرزین.

حەمەد بە دیتنی وی تێك چوو، نەیتوانی ببزوێ. بۆنێکی خۆشی سەرگێژکەر لەسەیرانێ هەڵدەستاو هەموو جێیەکی دادەگرت. حەمەد چاوی دەڕەشەوە چوون، بە لاتسیاو لاتسیاو بۆلای سەیرانێ چوو.

"حەمەد هاتووی خۆت بەکوشت بدەی؟"

راوێژی دەنگی زبرو سارد بوو.

حەمەد هاتەوە سەرخۆی، لێی نیزیك کەوتەوە، ویستی لەباوەشی بگرێ، سەیران دەستی گرت و رای وەشاندو بەریدایەوە.

"جەندرمە لێرە دەخولێنەوە، چوکووراوا هەتا ئەستۆی پڕ لە سەربازە. هەر پنچکێك، هەر جرۆجانەوەرێك، هەر دارێك، هەر باڵندەیەك هەمووی خەبەر بۆ وان کۆ دەکاتەوە. ئەتۆ هاتووی خۆت بەکوشتن بدەی؟"

حەمەد بێدەنگ بوو.

"هەر ئێستا سواری ئەسپەکەت بەو بڕۆوە چیا!"

سەیران ببووە لەتکەشاخێك و چاوەکانی گریان لێ دەباری...

"ئەمن هاتووم هەر ئەمڕۆ زەماوەندت لەگەڵ بکەم"

"ئەمن لەگەڵ کەسانی وەك تۆ کە بەخوێنی خۆیان تینوون، زەماوەند ناکەم. سواری ئەسپەکەت بەو دەسبەجێ لێدە بڕۆ"

"سەیران!"

"قسەم لەگەڵ مەکە. ئەمن لەگەڵ شێتی وەك تۆ قسان ناکەم. بڕواننە حەمەدۆکی میللەت! ئێوە پێم بڵێن کەسێکی ناوی خۆی نابێ حەمەدۆك کاری وا دەکا؟"

وەرسووڕا، دڕی بە حەشیمەت داو چووەوە ماڵێ. ئەوەندە بە توندی و رق هەستاوی و بێئاگایی و بە بۆڵەبۆڵ دەڕۆیشت کە بابی و براکانی نەیان دەتوانی خۆی پێ بگەیەننەوە.

لە حەوشەی ماڵەکەی خۆیان دا بوو کە بابی قۆڵیی گرت و براکانیشی گەیشتنەجێ.

"چ قەوماوە، چ بووە کچم، سەیران؟"

"بابە دەیکوژن"

"کێ دەیکوژێ کچم"

"یاوەر، جەندرمەکان... ئەوان سێ کەسن، جەندرمەکان هەزار کەسن. فەزلی فەلەك سز ئەوی دی. ئێستا حەتمەن چووە بۆ شارۆچکە. بڕۆ لەوێ نەجاتی بدە، لەم دەشتەدا

باڵنده ناتوانێ له دهست جهندرمهکان دهرچێ, ههتا دهگا به حهمهدۆك. دێهاتیهکانیش لهگهڵ جهندرمهکان رێك دهکهون و ئهودهم حهمهدۆك به تهنیاو بێ پشت و پشتیوان دهمێنێتهوه"

"فهزلی فهلهك سزی وهبینن"

براکانی سهیران بهلهحزهیهك خۆیان گهیانده نێو دێ.

"فهزلی فهلهك سز..."

"فهزلی فهلهك سز..."

"ئێستا دیتم, تاوێك لهمهوبهر لهپشت ئهو ماڵه بوو.

بهحهبهساوی تهماشای حهمهدۆکی دهکرد.

"تێیهوه ڕامابوو"

"فهزلی فهلهك سز, فهزلی فهلهك سز, فهزلی..."

دێهاتیهکان بڵاوهیان کرد, ههموویان له فهزلی فهلهك سز دهگهڕان. چهند دهقیقه دواتر خهبهریان هێنا که فهزلیان به سواری ئهسپ له ڕێی شارۆچکهدا دیوه.

وهسمانهزله گوتی:

"بڕۆن بیگهنێ بیگرن, ئهسپهکهی لهبن دا بکوژن, نهکرا, خۆشی بکوژن. ئهگهر ئهو بگاته شارۆچکه ئێمه حهمهدمان پێ نهجات نادرێ"

کوێخا سهیفهلیه مل درێژ گوتی:

"مووسڵی ئهتۆ غاردهی. سواری ئهسپێك بهو بڕۆ, فهزلی فهلهك سز بهقسهی تۆ دهکا, چهند کهسیشت ویستن لهگهڵ خۆت بهره! ئهو نابێ بگاته شارۆچکه"

براکانی سهیرانێش وهڕێ کهوتن.

"ئهوان فهزلی دهگرن"

زهسمانهزله بهپێکهنینهوه گوتی:

"بیکوژن, بیکوژن و کهلاکهکهی له ئاکچاساز بشارنهوه"

حهمهد به نیگهرانیهوه پرسی:

"ئهم فهزلیه کێیه؟ بۆچی وا سهرتان لێ شێواوه؟"

کهس وهڵامی وی نهدهدایهوه, ههموویان به کاری فهزلی فهلهك سزهوه خهریك بوون.

سهرهنجام کوێخا سهیفهلیه مل درێژ گوتی:

"حەمەد گیان، ئەوە فەزلی فەلەك سزی هەتیو، لە پیاوەکانی یاوەرە. لەوەتا ئەتۆ ڕۆیشتووی شەووڕۆژ سەیرانی خستوەتە ژێر چاوەدێری. هەر کارێك بکا، بۆ هەرکوێیەك بچێ وەك سێبەر بەدوایەوەیە. ئێستاش کە چاوی بەتۆ کەوت سواری ئەو ئەسپە بوو کە یاوەر داویەتێ و بە لینگدان ڕۆیشت، لەبەر ئەمەیە کە شڵەژاوین"

"سەیران هەربۆیە تووڕە ببوو؟"

"بۆچی تووڕە نەبێ؟ وەختێك خەبەری مەرگی تۆ هات هێندەی نەمابوو خۆی بکوژێ، هەتا بەیانی لە ماڵێکی بەو گەورەیی‌یەدا شیوەنی کرد. پاشان وەختێك دەرکەوت کوژراوەکە ئەتۆ نی لەخۆشی‌یان باڵی گرت. ئەودەم هەموو تەیری ئاسمان، ماسیی دەریا، مێرووڵەی سەر زەوی، ئاسکی دەشتێ و گورگ و هەڵۆی کێوان هەموویان لە خۆشی‌یان وەجۆش هاتن. وەختێك دەرکەوت ئەتۆ نەکوژراوی، هەموو خەڵکی دەشتێ خۆشحاڵ بوون، تەنانەت منداڵی قۆنداغەش دەستیان لەگریان هەڵگرت و شادمانی‌یان کرد..."

"سەیران دەترسێ..."

"بڕوانە! ئەمن هیچم لێ‌نایە"

ئەمەی گوت و ئەنگوستیلەکەی دەستیی نیشان دا.

"ئەو چیە؟"

"مۆری خانەقای چل چاوە، تەلیسمە، تێ‌گەیشتی؟"

"سەیران ئەمە نازانێ"

"ئاناجیخ سوڵتان دایمێ. لەمەودوا..."

دایەقەمەر بەخۆشحاڵی گوتی:

"تێ‌گەیشتم، گوللە کارت لێ‌ناکا"

لەو بەینەدا بابی سەیرانێ هات. پیاوێك بوو چوارشانە، دەموچاوێکی ڕەقەڵەو ریشێکی سپیی هەبوو بە ڕوانینێکی توندو جێ‌برینێك بەسەر گۆنایەوە. پیاوێکی تەڕپۆش بوو.

"پێش ئەوەی بگاتە شارۆچکە کوڕەکان دەی‌گرن"

حەمەد خۆشحاڵ بوو. ئەم پیاوە بەهەیکەلە باوەڕبەخۆو لێو بەپێکەنینەی زۆر خۆش ویست. بە قاسم و دەمیری گوت:

"ئێوە لە دەرێ ئێشك بگرن، بە حەشیمەتەکەش بڵێن بڵاوەی بکەن. ئەمن کارێکم بەو بەڕێزانە هەیە، بڵێ تەشریفیان بچێتە ژوورێ"

بابی سەیرانێ لەپێشەوەو سەیفەلی و حسام و هاورێکانی دیکە بەدوایدا چوونە ژووری هۆدەیەك.

حەمەد بە وەسمانەزلەی گوت: مامە ئەتۆ لێرە بە.

وەسمانەزلە نەچووەژوور.

"وەختێك چوومە ژوورێ، ئەتۆ بە ئەمری خواو فەرمایشتی حەزرەتی پێغەمبەر سەیرانێم بۆ لەبابی بخوازە. لە ئاواییدا مەلامان هەیە؟"

"ئەرێ"

"پاشان دەچینە لای سەیرانێ، لەوێش مارەی دەکەین"

وەسمانەزلە لە حالێك دا لە خۆشییان قاقای لێدەدا گوتی:

"ئەمە شتی چاکە!"

دەسبەجێ چووە ژوورێ و خوازبێنیی کچەکەی کرد.

بابی سەیرانێ گوتی:

"ئەوە دامێ و تەواو بوو. خوا ئەوانی بۆ یەکتر داناوە، ئەمن هیچ کارە نیم..."

حسام غاری دا مەلای هێنا، سەیفەلی و وەسمانەزلە بوونە شاهید. سەیران کاتێك مەلا لەپێشەوەو سەیفەلی و وەسمانەزلەی لەدوایەوە دیتن هەموو شتێك حالی بوو، بەلام دیسانیش رقەکەی نەنیشتەوە، هەتا پتر توورە دەبوو زیاتر دەترساو بە زیادترسانەکەشی رقەکەی زیادی دەکرد.

لە ماوەیەکی کەم دا مارەیان لێك برا. حەمەدو سەیرانیان لە ژوورێ بەجێ هێشت و بۆخۆیان هاتنەدەر.

زۆری پێنەچوو لە حەوشەی وەسمانەزلەدا دەنگی دەهۆلان بەرز بووەوە. زورناکان دەستیان کرد بە لێدان و سەمای هالای دەستی پێکرد.

حەمەد بە پارێزەوە ورەد وردە لە سەیرانێ کە لە نێوەراستی ژوورەکەدا وەك پەیکەرێکی بەردین راوەستابوو، نیزیك بووەوەو زەردەخەنەیەکی هاتێ. بەلام سەیران وەك پارچە سەهۆلێك لەجێی خۆی رەق راما. حەمەد گوتی:

"سەیران!"

سەیران وەك بەرد وابوو، تەنانەت پێلووی چاوەکانیشی نەجوولا. حەمەد ئامێزی لێداو ماچی کرد.

سەیران وەك قەدەدارێکی بێ‌گیان بوو. دەت گوت خوێن لە لەشیدا نەماوەو بەپێوە مردوە.

"چ بووە سەیران؟"

سەیران نە جووڵەی هاتێ و نە قسەیەکی کرد.

"سەیران ئاوام رەفتار لەگەڵ مەکە..."

لە دوور دەنگی دەهۆڵ دەهات, دەنگە دەنگێك کە لە ئاکچاساز هەڵدەستا, لەگەڵ دەنگی دەهۆڵەکە تێکەڵ دەبوو.

"چما ئەتۆ جەنازەی سەیران!"

حەمەد هەوڵی زیاتری دا. لەبەری پاڕایەوە, بەڵام بەکەللەشەقیی سەیرانێ نەوێرا.

"منت کوشت سەیران, قسە بکە, شتێکم پێ بڵێ"

سەیران چاوە گەورەو دڵشکاوەکانی خۆی بەحەبەساوی و بە دەریایەك ئەوینەوە لە روخساری حەمەدەوە بڕی, چەند لەحزەیەك چاوی لە قووڵایی چاوەکانی کردو ئەمجار گوتی:

"سواری ئەسپەکەت بەو بڕۆ. حەمەد ئەگەر ئەتۆ بکوژرێی ئەمن ناتوانم بژیم. ئەتۆ بڕۆ, لە هەرکوێ بێ زوو دەت بینمەوە. سوار بەو بڕۆ"

دەنگی ئەوەندە خەفەتاوی بوو کە وەك برینی خەنجەر کاری لەدڵی حەمەد دەکرد.

"هەر ئێستا دەڕۆم سەیران, هەر ئێستا"

یەکتریان لەئامێز گرت. سەیران بەسپایی, وەك ئەوەی بترسێ ئازاری بگا سەرگۆنای ماچ کرد. حەمەد بەغاردان دوو پلیکانی کردنە یەك و هاتەخوار. سەیرانیش لەدواوە تەماشای کرد.

وەسمانەزلە گرتی و بە دەنگێکی بڕیاردەرانە گوتی:

"نابێ, هەتا نانی زەماوەندێ نەخۆی نایەڵم بچیە هیچ کوێ. فەری باش نیە..."

حەمەد بەپێکەنینەوە ئاماژەی بۆ سەیرانێ کرد.

وەسمانەزلە بە نەرمی گوتی:

"چت لەگیانی شەهێنەکەم دەوێ؟ حەمەد شەهێنی منە. هەمووان پێیان وابوو ئەتۆ مردووی..."

ئەمجار لەحالێك دا دەستی لەسەرشانی حەمەد دادەنا گوتی:

"بەڵام ئەمن گوتم شەهێنەکەم نەمردوە. وانەبوو سەیران, درۆ دەکەم؟"

پاشان چوو مێزی لەسەیرانێ داو گوتی:

"ناوت سەیرانیش بێ, دیسان لەتیرەی ژنانی. بڕوانە سەیران, کچێ خۆم. ئەگەر فەزلی فەلەك سز خۆشی گەیاندبێتە شارۆچکە... باوا دانێین گەیشتوەتێ, دەبێ جەندرمان کۆ کەنەوەو بیان نێرنە ئێرە. هەتا دەگەنە ئێرە... چما ئەتۆ شێتی کچەکەم. لێی گەڕێ شەهێنەکەم بەئاسوودەیی نانەکەی بخوا, ئەویش نانی زەماوەند. دایەقەمەر گۆشتاوی زەماوەندێی بۆ لێناوە ـ سەیرانی لەلای ڕاستی گرت و حەمەد لەلای چەپ و وەڕێ کەوتن. دەت گوت ریشە سپییەکەی لەخۆشییان پێدەکەنێ ـ ئەم زەماوەندە سێ شەوو رۆژ دەخایەنێ, ئەگەر ئەتۆ هەر ئێستا لێدەی بڕۆی... ئەتۆ ئیدی منداڵێکی هەتیوو بێکەس نی. ماڵ و گوزەرانت هەیە, بابێکی وەك وەسمانەزلەت هەیە. هەر ئێستا لە هەموو خەڵکی ئەم دەشتە دەگێڕمەوە... لە پاڵەوانەکان و هالایچییەکان..."

"هەر بژی مامە..."

چوونەوە ژووری. سەیران لەبەر دەرگا مایەوە. پاش ئەوەی تاوێك ئاشقانە تەماشای حەمەدو لێوەشاوەیی ویی کرد لەوێ لاچوو و لەو بوولێڵی ئێوارەیەدا لە دەوری ئاوەدانی دەستی کرد بە گەڕان. گوێی وا لەسەر هەست بوون کە چووکترین دەنگ و کەمترین خشەخشیان دەبیست. هێشتا خەبەرێك لەو کەسانە کە بۆ دۆزینەوەی فەزلی فەلەك سز چووبوون, نەبوو. لەلایەك لە مێردکردنەکەی و لەوە کە حەمەد لەگەڵ ئەو هەموو مەترسییە کە هەڕەشەی لەگیانی دەکرد, هاتبووە لای, خۆشحاڵ بوو و ئەوین وەك ئاوێکی شیلەوگەرم و زوڵاڵ لە دڵی دا هەڵدەقوڵی, لەلایەکیش ترسێکی لەتوانابەدەر دڵیی ئاخنیبوو... ئەگەر توانیبای, حەمەدی دەکردە باڵندەیەك و هەڵی دەفڕاندە ئاسمان. لەحاڵێك دا دەستی بەرەو ئاسمان ڕاگرتبوون گوتی: خوایەگیان... ئاسمان پڕ بووە لە ئەستێرەو ئەستێرەکان هەموو خۆشحاڵ, ئەوان بەو ڕووناکییە کە لەهەتاویان وەدەگرت وەك کێڵگەیەکی زەرد کەوتبوونە شەپۆل دان. خوایەگیان بۆخۆت حەمەدی بپارێزە.

بەرەو لای شارۆچکە دەڕۆیشت, کە دەگەیشتە چۆمی دەگەڕایەوە, گوێی بەعەرزییەوە دەناو گوێی بۆ دەنگە دوورەکان هەڵدەخست. چونکە زەوی جگە لە دەنگی گرمەو هاڕەی باتلاغەکە دەنگێکی دیکەی لێنەدەهات دڵی ئارام دەبوو. بیری دەکردەوە کە لەمەودوا سەرانسەری ژیانی ئاوا ڕادەبرێ. عومرێك... یان هەتا ئەوکاتەی حەمەدۆك دەکوژرێ.

هەمیشە دڵی پڕ لە ترس دەبێ. ئەنگوستیلەیەکی لەدەستی حەمەد دا دیبوو. نقێمەکەی نووسراوێکی لەسەر هەڵکەندرابوو, وەك ئەنگوستیلە قەدیمییەکان, ئەو

ئەنگوستیلانە کە تایبەتی چاوەزارن... لێی بوو بە مەراق, بەڵام چۆن دەیتوانی بچێ لەکن ئەو هەموو خەڵکە لەبارەی ئەو ئەنگوستیلەیەوە کە لەدەستی حەمەددا بوو, پرسیاری لێبکا.

بەرەو ئاوەدانی دەخۆی نووسا. چووە حەوشەی ماڵی وەسمانەزلە, قاسمی دیتەوە, بە پیاوێکی سەرنج راکێشی هاتە بەرچاو. رووی تێکردو پێی گوت:

"ئەمن سەیرانم"

"دەزانم خوشکێ"

"بچۆ ژووری, بەسرتە پێی بڵێ ئەمن لێرە چاوەڕێی دەکەم, بەڵام کەس گوێی لێنەبێ"

قاسم, چوونەژوورو هاتنەدەری لەگەڵ حەمەد یەکێك بوو.

"سەیران..."

"هێشتا کەس دیار نیە, ئەمن وریای جادەکانم, قاسم و دەمیریش کە لێرەن وەك برای خۆم وان, دەمەویست شتێکت لێ بپرسم. بۆ ئەو..."

راوێژی دەنگی شەرمێونانە بوو.

"بپرسە سەیران..."

"دەمەویست بڵێم کە..."

کەوتە پەتەپەت.

حەمەد پێکەنی:

"شەرم لەمن دەکەی؟"

"دەمەویست بڵێم کە..."

حەمەد لەحاڵێك دا دەیگوت: دەتەویست بڵێی چی سەیران, سەیران, سەیران, لە باوەشێی گرت و ئەو بۆنەخۆشەی رووناکی و کێڵگەو گیاو ئینسانی هەتا قوولایی وجوودی هەڵمژی, سەری لەگێژەوە چوو و شادی هەناوی پڕ کردو لەسەریەوە رژا.

"مەبەستم ئەوەیەکە... ئەوەی لەدەستت دایە..."

"ئەنگوستیلەکەی دەڵێی؟ ئەوە ئاناجیخ سوڵتان پیری خانەقای چل چاو کە برینەکانی چاك کردنەوە, دایمێ... وەك دەڵێن ئەم ئەنگوستیلەیە تەنیا گەورەکانی ئەو خانەقایە توانیویانە لەدەستی کەن. یەکەم جارە کە کەسێکی دیکە لەقامکی دەکا, ئەویش ئەمنم... لەمردن, گوللە, نەخۆشی, بریسکە..."

"دەزانم حەمەد, ئەتۆ لەرێی خۆت بڕۆ ئۆغرت خێر بێ... خوا هەمیشە بەختەوەرت بکا, ئەمن زۆر زوو دەت بینمەوە, ئیدی ئێستا کە ئەم ئەنگوستیلەیەت لەدەست دایە, ناترسم"

حەمەد گوتی:

"مەترسە. شتێکت پێبڵێم؟ عەبدییەك بمرێ هەمزەکەچەڵ دێتە جێگای, ئەو بڕوا دە هەمزە کەچەڵ دێنە جێگای... عەلی سەفا بڕوا سەد عەلی سەفا جێی دەگرنەوە... ئێستا کەوایە دەزانی تەقەلای من بۆ چیە؟"

سەیران تا ئێستا نەیدیبوو حەمەد ئەوەندە قسە بکا, بەڵام هەرچۆنێك بێ, مسۆگەر نیازی بوو مەبەستێکی گرنگی پێ بڵێ, ئەگینا چ پێویست بوو لەو وەختەی شەودا ئەو جۆرە پرسیارانە بێنێتەگۆڕێ.

لە نێوەڕاستی حەوشەی ئاورێکی خۆش داییساو لاوەکان لە دەوری ئاگر "هالای"ـەکی قەدیمی و قورس هەڵدەپەڕین, وەك ئاوێکی داوەستاو قورس و ماندوو.

"بەڵام ئەگەر حەمەدۆك بمرێ..."

دەنگی, رەنگدانەوەیەکی وەك نووری هەبوو.

"خوا بەو رۆژە نەکا"

"ئەگەر حەمەدۆك بمرێ دەهەزار, سەد هەزار, سەد سەد هەزار, هەزار هەزار, چەند میلیۆن حەمەدۆکی دێنە جێگا, دەڵێی بۆچی؟ چونکە فەقیرو هەژار زۆرن و دەوڵەمەندەکان کەم... ئاخرەکەی خەلاس دەبن"

سەیران لەحاڵێك دا ئەوی لەباوەش دەگرت گوتی:

"تێگەیشتم, چاکیش تێگەیشتم. ئەوەندەیان لێدەکوژرێ کە تۆویان ببڕێتەوە. ئەتۆ ئێستا بڕۆ نانەکەت بخۆ... خوا دەزانێ چەند رۆژە برسیتە"

حەمەد چووە ژوورێ, سەیرانیش بەرەو تەپۆلکەکەی دەری ئاوەدانی رۆیشت. تەپۆلکەکە هێندە بڵیند نەبوو, بەڵام دیسان تەپۆلکە بوو. لەنەکاو وەبیری هاتەوە کە ئەو دەهۆڵانەی لێدەدرێن و ئەو جێژنەی بەرپا کراوە هەمووی لەبەرخاتری ئەوو حەمەدە...

لە تەپۆلکەکە وەسەر دەکەوت و دەهاتەوە خوارو گوێی بۆ ئاهەنگی هەڵپەڕینەکە هەڵدەخست کە لەگەڵ دەنگی دەهۆڵەکە دەگۆڕا. لە دوورەوە چاوی لەگڕی ئاگرەکە دەکردو بیری لە رێورەسمی جێژنی زەماوەندەکە دەکردەوە. ئەنگوستیلەی ئاناجیخ سوڵتانیی وەبیر دەهاتەوە, بەڵام دیسانیش ترس بەری نەدەدا

لەخوا دەپاڕایەوە کە حەمەد بێئەوەی بەڵایەکی بەسەر بێ لێرە ڕزگاری بێ و بڕوا.

بەڵام ئاخر سەرانسەری ژیانی حەمەدۆك ئاوا، بە وەزعێکی وەك وەزعی ئێستاوە تێناپەڕێ؟ داخوا ئینسان وەزعێکی ئاوای پێ تەحەممووڵ دەکرێ؟ ئەمجار دەچووە نێو قووڵایی تاریکایی‌یەکی بەتاڵ لە هیواو هومێدەوە، توانای لێ‌دەبڕاو لەسەر خاکی شەدار دادەنیشت و سەری دەنێو دەستانی دەگرت.

لەنەکاو هاتەوە سەرخۆی و بە پێکەنینەوە بەخۆی گوت: بڕوانە ئەم جـ...ەیە. ئەم جـ...ە نەفام و ترسەنۆکەی ببینە، هەر دەبێ بترسێ، هەی سەیرانی بێ‌مێشك، بێ‌غیرەت حاڵی نەبووی کوڕەکە چیی گوت، ئاغاکان کەمن و هەژارەکان زۆر... دەکوژرێن و ریشەیان وشك دەبێ. ئەوەتا دنیا دنیایە ئەمانە کوژراون و کوژراون، بەڵام خەلاس نەبوون. ئەمجار نۆرەی ئەوانی دیکەیە...

وەختێك گەیشتەوە ماڵی وەسمانەزلە، جحێڵەکان هالایەکی تازەیان گرتبوو. کچان و نۆبووکان و ژنانی دێش جوانترین جل و بەرگی جێژن و زەماوەندیان لەبەر کردبوو، خۆیان ڕازاندبووەوەو وەك خونچەی بەهاری پشکووتبوون، سەیرانیان لەنێو خۆیان گرت و لەگەڵ خۆیان بردیانە ماڵێك کە هۆڵێکی گەورەی هەبوو. لەوێ دەستیان کرد بە گوتنی چەند گۆرانی‌یەکی جوانی قەدیمی. تازە تێ‌گەیشتبوون کە ئەو ڕێ‌وڕەسمە هەر بۆ گاڵتەو خۆشی نیە، بەڵکوو هەر بەڕاستی جێژنی زەماوەندە. لە کورت ترین ماوەدا سەیرانیان بەجوانترین شێوە ڕازاندەوەو کردیانە بووك.

لای نیوەشەوێ بوو، سوارێك کە بەپڕتاو دەهات لە حەوشەی ماڵی وەسمانەزلە لەپەنا ئاورەکە ڕاوەستاو دابەزی و بەغار چووە ژوورێ و دەهۆڵکوتەکان کە ئەویان وا بەشڵەژاوی دی دەستیان لە لێدان هەڵگرت و چاوەڕوان مان.

"لەخوار شارۆچکە، ڕێی جگەرەکێشێکی مابوو بۆ شارۆچکە کە گەیشتمە فەزلی فەلەك سز، ئەسپەکەی چوارناڵ لێ‌دەخوڕی. بە گوللەیەك ئەسپەکەم لەبن دا کوشت، ئەسپ سەرەنگرێ بوو. وەختێك ئەسپەکە کەوت هاتمە خوارێ، لەپڕ دیتم فەزلی دیار نیە، لەو دەوروبەرە بۆی گەڕام، لەنێو پنچکە دڕووەکان، نێو قامیشەکان، سەر دارەکان، هەموو جێ‌یەکم پشکنی. لەنەکاو دیتم جەندرمەکان یاوەر فارووق لەپێشەوە، مولازیم حەبیب لە تەنیشتی، عەلی کەرتیش و فەلەك سز... ئەمنیش ئەسپم تاو داو خۆم گەیاندەوە ئێرە"

حەمەد بێئەوەی بجەجڵێ هەروا بزانە هیچ نەقەوماوە هەستایە سەرپێ، لە حاڵێك دا زەردەخەنەی لەسەر لێوان بوو گوتی: ئەمە باش بوو. پاشان یەك بەیەك حازرانی لەباوەش گرت و وەدەرکەوت و هاتە لای ئەوانە کە سەمای هالای‌یان گرتبوو.

"خۆش بن کوڕینە, چەند جوان هەڵدەپەڕین, ئەی بۆچی راوەستاون؟"

دەهۆڵەکان دەسبەجێ دەنگیان لـێ هەستایەوە.

لە سەیرانێی پرسی, نیشانیان دا. وەختێك سەیرانی بە جلی بووکێنیەیەوە دی فرمێسك لەچاوانیدا قەتیس ماو گوتی:

"خواحافیز سەیران"

"خوات لەگەڵ"

لە جادەی خوارەوە, لە عەنبەر ئەرزەوە بەرەو شارۆچکە وەڕێ کەوتن. عەلیەشەل لەبن دارە قەدئەستوورەکە لە حاڵێك دا سیگاری بە سیگارێ دادەگیرساند بە خۆی و ئەسپەکەیەوە راوەستابوو.

حەمەد گوتی:

"بڕوانە قاسم, لەهۆوێ لەبن ئەو دارە, ئاوری ئەو جگەرەیە دەبینی؟ ئەوە عەلیەشەلە"

"چۆنی دەزانی بێرەدا دێن؟"

"بزانێ دێم یان نەزانێ, هەر چاوەڕێم دەبێ"

تاوێك دواتر گەیشتنە نیزیك دارەکەو جڵەوی ئەسپەکانیان توند کرد.

"سلام علیکم ئاغا شەلە"

تارمایی عەلیەشەل چەند هەنگاوێکی بەرەولای وان هەڵێنایەوە.

قاسم گوتی: دەستی خاوەن سیگار ماچ دەکەین.

دەمیر گوتی: دەستی خاوەن سیگار ماچ دەکەین.

حەمەد بەپێکەنینەوە گوتی:

"جگەرەیەکی قەڵەوم بۆ وەپێچە, دەزانی ئاغاشەلە ئەمن زەماوەندم کردوە"

"دەزانم, پێکەوە پیر بن"

"لە وایوای زەماوەندە"

"دەزانم"

"ئاغاشەلە, شتێك نیە ئەتۆ نەیزانی, سینەم ئۆغڵی لەچ دایە؟"

"دوژمن لەماڵێت نائومێد بێ, بەڵایەکە بۆخۆی... دوێ شەوێ لەنیوەشەوێ ڕا شێست تیری لەسەر تەپۆلکە دابەست و دەستی کرد بە ئاگرباران. لەنێو شارۆچکە هیچ کەس نە جەندرمەکان, نە وەکیل باشی عاصم, کەس نەیوێرا سەری لووتی لەمەرکەزی جەندرمە بێنێتەدەرێ. تاوێکی دیکە دەست پێدەکاتەوە"

"ئەگەر وایە, ئەی بۆچی یاوەر فارووق وازی لەو هێناوە, ملی ڕێگای گرتوە چووەتە وایوای"

"بۆ ئەوەی تۆ بگرێ. فەزلی فەلەك سز پیاویەتی. گەورەترین شۆفاری یاوەرە. ئەو خەبەرەکە بۆ یاوەر دەبا, یاوەریش پێی وایە ئیدی کار تەواوە"

"مەلات دی؟"

"دیتم زۆر خۆشحاڵ بوو, لە دوورەوە چاوەکانت ماچ دەکا. یۆبازئۆغلییش دەڵێ ئیلان و بیلان لێرە نایەمەدەر"

"با وا بلێ وەختێك لوولەی تفەنگی دی... ئێستا پێکەوە دەچینە ماڵی مەلادۆران ئەفەندی, پاشانیش دەچین مەلافەرهادی لەگەڵ خۆمان هەڵدەگرین. ئوممەتە زەرد لەکوێیە؟"

"لە بازاڕییە... هەر خۆشە بێبینی. ئێستا ئیدی وەختێك ئەو بەبازاڕدا تێدەپەڕێ, هەموو بازاڕییەکان لەبەری هەڵدەستن و سلاوی لێدەکەن. تەنانەت ئاغاو خانەکانیش ئاواتیانە کاتێك ئوممەت بەوێدا رادەبرێ, چاك و خۆشییەکی لەگەڵ بکەن"

"کەوایە کارەکان باش دەچنەپێش"

"ئەدی. باشە ئەتۆ چ کارێکت بە مەلادۆرانی ئاغام هەیە؟"

"ئەدی ئەتۆ چ کارت بە مورتەزاغای ئاغام هەیە؟"

"ئەوەم لەگەڵ مەکە حەمەد. ئاغایەکی باش و ئینسانم بۆخۆم پەیدا کردوە, ئەویش ئەتۆ دەتەوێ لێم بستێنی"

"ئەتۆ بمبە لای وی, بەلام پێش ئەوەی بچین دەبێ دەستانت ببەستم"

عەلیپەشەل گوتی:

"پێویست ناکا دەستانم ببەستی, ئەو زۆر زرینگ و پیتۆڵە, ئاگای لە هەموو شتێك هەیە, دەزانێ ئەمن و تۆ پێکەوە دۆست و برادەرین. ئەویش لەخۆمانە... زۆر لە ئاغاو خانەکان تووڕەیە"

"ئەو باشتر, ئێستا کەوایە یاڵلا وەڕێ کەوە با بڕۆین"

"وەزەندییەك بەو..."

"یاڵلا بابڕۆین عەلی..."

"هێند قەڵەوت پێچاوەتەوە, تەواوبوونی نیە"

حەمەد بۆ ئەوەی جگەرەکەی تەواو بکا چەند مژی لەسەریەك لێدان و فڕێی دایە دووری: یاڵلا راست وەبە.

"راوەستە کوڕە, سیگارەکەت بکێشە, تەواوی کە"
عەلی وەختێك هەستا بەو تاریکەشەوەش تۆز تەکاندنی کڵاوەکەی لەبیر نەچوو.

✧ ✧ ✧

عەلیەشەل چونکە خێراو ئەویش بە شەلەشەل لە پلیکانەکان وەسەرکەوتبوو, هەناسەی سوار ببوو.

"چ بووە عەلی, چ خەبەرە؟"

"شتێك نیە, هیچی خەراپ رووی نەداوە, حەمەدۆکم هێناوە"

"چ...ی؟"

"حەمەدۆکم هێناوە"

دۆران ئەفەندی بۆ پێشوازی لەحەمەد هەستایە سەرپێ.

"فەرموون, فەرموون, ئەمنیش زۆرم پێ خۆش بوو تۆ ببینم. کوڕم ئەتۆ سیفەتی رەسوولی ئەکرەمت تێدان. ئەتۆ شمشێری مەولامان عەلیو شمشێری کوێرئۆغلیی باپیرمانی.

حەمەدۆك ئەتۆ هەقی هەتیوان دەستێنیەوە... خوای تەعالا بۆخۆی شمشێری تۆی ئاو داوەتەوە, حەزرەتی خدر دەستی بەپشتێ تۆدا هێناوە, شمشێرەکەت لەهەرچی دەی, دەیبڕێ, لەنێوەڕاستی مەیدانی شەڕیش دا وەمێنی دیسان گوللە کارت لـێناکا. فەرموو, فەرموو, فنجانێك قاوە مەیل بفەرموو"

ئەو پیاوە بەساڵداچووە لەخۆشیان ببووە هونەرمەندێکی گورج و گۆڵ. نەیدەزانی چ بڵێ و چ بکا, هەر بەدەوری حەمەدۆك دا هەڵدەخولا

"ئەو بێدینەت کوشت, عەلیی دەڵێم. ئیشەڵڵا پاشماوەکەشیان دەکوژی. خوای تەعالا لە عومری من هەڵگرێ و بیخاتە سەر عومری تۆ. دانیشە کوڕم ئیسراحەت بکە. برسیتە, تینووتە, ئێرە بە ماڵی خۆت دانێ, وەك ماڵی بابت, ماڵی برات..."

رەگی ملی هەستابوون و خوێن دە ڕەگە باریکەکانی دەم و چاوی گەڕابوو. روخساری سوورو داگیرساو بوو: هەتا قاوەکان دێنن سیگارێکی بۆنخۆش بۆ جەنابتان داگیرسێنم تووتنەکەی دەڵێی کارەبایە"

لە کاتێك دا سیگارێکی دەپێچایەوە دەستی کرد بە پێکەنین.

"ئەم شەلەی دەڵێم ها, خوا بەنسیب دوژمنی بنیادەمیشی نەکا. پێم گوت, یانی لەوکاتەوە شەرمەحوزووریی لەمن نەماوە, زۆر جارم پێ گوتوە کورِە, حەمەدۆك چەتەیەك و یاغییەکە, لەو چیاو بەندەنانە بۆخۆی هومێدێکە. دەبێ یەکی وەك من بیپارێزی. برِۆ پرسیاری لێبکە, داخوا پێویستیی بە پووڵ و ماڵ, چەك و چۆڵ و نوێن و بان, کۆمەگ و یاریدەدەر هەیە یان نا, ئەم شەیتانە شەلە مەلعوونە هەمیشە دەڵێ بە جێورِێیەکەی نازانم و هیچی دیکە... بەهیچ کەس, بە چاوی خۆشی باوەرِ ناکا"

"زۆری متمانە بەجەنابت هەیە ئەفەندم"

"ئێستا تێگەیشتم کە ئەمن جێگای متمانەم"

"مەسەلەی مەلافەرهادیشی پێ گوتووی؟"

"پێی گوتووم"

"ئەدی دەتەوێ متمانەی خۆی بە چ شێوەیەك بەئێوە نیشان بدا"

"متمانەی هەیە"

حەمەد سەری بەردایەوە. چەند لەحزەیەك رِاما. جارجار سەری هەڵدەبرِی و هێندێ جاریش تەماشای قاسم و دەمیری دەکرد. پاشان دووبارە سەری دادەخست و لەگژ فکرەکانی رِادەچوو.

"حەمەد کورِم, بلێ بزانم گیروگرفتێکت هەیە, کارێکت بەمن هەیە؟"

حەمەد سەری هەڵدەبرِی, تەماشایەکی ئەو و قاسم و دەمیری دەکردو دووبارە سەری دادەخستەوە.

"بلێ هاورێ, قسەی دڵت بکە, شەرمەحوزووری لەمن مەکە, ئەمن وەك باب و براگەورەی خۆت دانێ. هەرچیت دەوێ راست و رەوان و بێپەردە پێم بلێ. لەم دنیایەدا لە سامان وەسەریەك نان بەولاوە بە کەلکی هیچی دیکە نەهاتم. هەموو شتێك تەنانەت رق و قینیش لەدلّم دا نێژراوە. هەرکاتێك تەماشای ئەو جانەوەرە بێبەزەیی و ترسەنۆك و درۆزنانە دەکەم وەختە برِشێمەوە... بەرەبەرە ئەمنیش وەك وانم لێدێ, وەك وان فێڵبازو بگرە هەزار جار درۆزن ترو دوورِووتر لەوان, تەنانەت ئیدی لەگەڵ خۆم, لەگەڵ بنەماڵەکەم, منداڵەکانم, لەگەڵ تۆو لەگەڵ عەلییش دوورِووم. بە رِاشکاوی لەگەڵ مـن بدوێ"

حەمەدۆك بە راوێژێکی زبرو توند کە وەك شمشێر دەیبرِی گوتی:

"تارانی ئەو کۆچەرییانە بدەوە بەخۆیان"

لەوە کە راوێژی قسەکانی ئاوا بڵندو توندو فەرماندەرانە بوو, بۆخۆشی بەخۆدا شکایەوەو سەری بەردایەوە.

"نایدەمەوە"

حەمەد توورە بوو گوتی:

"دەبێ بیان دەیەوە"

وەڵامی توندی "نایدەمەوە"ی مەلادۆران ئەفەندی کاری وی ئاسانتر کردبوو. دەیتوانی توندتر بجووڵێتەوە.

"تەنانەت ئەگەر گیانیشم لێ بستێنی و تالانیشم بکەی, یەك بست لەو خاکە کە قەباڵەکەیم هەیە نادەم بەکەس, تەنانەت بە نووری چاوەکانم کە حەمەدۆکە. ئەتۆ دەزانی ئەمن چۆنم ئەوانە وەدەست هێناوە؟ ئەتۆ پێت وایە لەترسی گیانی خۆم زەوییەکانم دەدەم بەکەس؟"

عەلییە شەل هاتە نێو قسەکانیانەوە:

"راوەستن, وا دیارە لێك حاڵی نەبوون. حەمەدۆك قەباڵەی زەوییەکانی تۆی ناوێ. مەبەستی ئەوەیە کە کۆچەرییەکان وەك جاران بێن چادر هەڵدەن و پارە نەدەن. ئەوان زۆر فەقیر بوون. ئەو زەوییانە بۆ وان..."

مەلادۆران ئەفەندی پێکەنی:

"خوایەگیان! ئەمنیش کیسە کیسە زێرم لێوەرگرتوون. بە کۆچەرییەکان بڵێن بێن و لێیهەڵدەن. هەتا کاتێك ئەتۆ زیندووی, چ لە چیا بیو چ لە دەشت, ساغ بی یان نەخۆش نە پووڵی لەوەرگەیان لێوەردەگرم و نە هەقی تاوڵ هەڵدان..."

"خۆش بی مەلادۆران ئەفەندی"

"ئەتۆش بژی حەمەدۆك، کورە ئازایەکەم, خوا سێبەری تۆ لەسەر چیاکانمان لانەبا. هەرچی عومرم هەیە خوا هەڵی گرێو لەسەر تەمەنی تۆی دابنێ"

لە پێش دا عەلییەشەل و دوایە چەتەکان هەستانە سەرپێ. مەلادۆران ئەفەندی هەتا بەردەرکێ لە گەڵیان چوو، و تۆغربەخێری پێگوتن:

"گوێ بگرە حەمەدۆك, لەم دەشتە هەر کارێکت هەبێ پێمان جێبەجێ دەکرێو مەلادۆران ئەفەندییش هەرگیز هیچت لێ داوا ناکا. کەوایە تا کاتێك ئەمن ماوم نابێ هیچ کەس دەست بۆ زەوییەکانی من درێژ بکا. ئەم زەوییانە کە بە قیمەتی گیانم وەدەستم هێناون, شەرەفیمنن, هەروەك

حەمەدۆك بوون شەرەفی تۆیە... خوا پشت و پەناتان بێو شمشێرتان تیژتربکا... سڵاوی مەلا فەرهاد بگەیەنە"

لەو بەینەدا کە ئەوان لەگەڵ مەلادۆزان ئەفەندی قسەیان دەکرد عەلییش جلەکانی گۆڕین و وەك جاران خۆیکردەوە دێهاتی.

کاتێك ئەوان لە ماڵێڕا بەرەو بەندیخانە رۆیشتن، سینەم ئۆغڵییش لەسەر تەپۆڵکەوە دەستی کرد بە تەقە. هەر بە ئاگربارانی شێست تیر رازی نەبوو، پێنج ماوزەریش لە پێنج شوێنەوە شاریان داگرتبوو. دەنگی ئێشك گری سەر دیوارو دەنگی هاوکارەکەی کە لە خوارێبوو هاتە بەرگوێ کە دەیان گوت: ناوی شەو، مەیە پێشەوە... عەلی وەك پشیلە وەسەر دیواری کەوت و ئێشك گرەکەی سەر دیواری خستە نێو مەنگەنەی باسکی خۆیو گوتی:

"هەتیوە سێواسی دەنگت لەبەر نەیەتەدەر، بە من دەڵێن سینەم ئۆغڵی، خوێنت دەخۆمەوە"

"رەحم پێبکە سینەم ئۆغڵی!"

عەلیەیەشەل چەخماخی تفەنگی جەندرمەکەی دەرهێناو گوتی:

"ئەگەر رۆیشتین لەبەر دەرگای بەندیخانەی دادەنێم. ئێمە نیازی کارێکی خەراپمان نیە، هاتووین پیاوی خوا، مەلا فەرهادی ئازاد بکەین کە بوختانیان بۆ هەڵبەستوە. خۆ ئەمە زیانێکی بۆ تۆ نیە"

ئەمجار لەسەر دیوارەکەوە خزییە خوارێ.

"ئێشك گر، دەرگاکە بکەوە"

ئێشك گر دەرکەی کردەوە.

ئەمجار لەسەرێڕا، لە شوێنی فەرماندەرایەتیی جەندرمە تەقەیەکی کاریگەرو بەرچاو دەست پێکرا.

ئەوانەی تەقەیان دەکرد شەش حەوت کەس بوون.

حەمەد هاواری کرد:

"وەکیل باشی عاصم، شارۆچکەم بە چل کەسەوە گەمارۆ داوە. یاوەر فاروقیشم کێشاوەتە وایوای. نیازێکی خەراپم نیە، ئەتۆ بۆ خۆت دەزانی کە مەلافەرهاد کەسی نەکوشتوە، ئەو تەنانەت رازی نیە مێروولەیەکیش ئازار بدرێ. ئەوی هەڵدەگرم و لەگەڵ خۆمی دەبەم، ئەمە خۆ مەسەلەیەك نیە... ئەگەر تەقەکە رانەگری، ئەتۆش دەگرم و لەگەڵ خۆمت دەبەم بۆ چیا.

بە گیانی دایکم و خەجیجێو بە خانەقای چل چاو سوێند دەخۆم کە وادەکەم. ئەتۆ بۆ خۆت من دەناسی. ئەتۆش لەگەڵ خۆم دەبەم. ئەتۆش وەك وەکیل باشییەکی لە مێژینە لە کن دۆست و دوژمن بێ قەدر دەبی"

وەکیل باشی عاصم تەقەی راگرت.

ئێشك گر مەلافەرهادو یۆباز ئۆغلیی لە بەندیخانە هێنانەدەرو تەسلیمی حەمەدۆکی کردن.

"جەنابی حەمەدۆك, لە دیتنی تۆ خۆشحالم. بە زیارەتت دنیایەك بەختەوەرم. پێم وایە دەرهەقی مەلافەرهاد لە رێزو حورمەت کۆتاییمان نەکردوە. ئەمن پێم وایە بۆ خۆشی لێمان رازییە... داهاتەوەو دەستی مەلافەرهادی ماچ کرد: بە خوام سپاردی مامۆستا, کەفارەتی گوناهانت بێ. بڕوانە جەنابی حەمەدۆك چەند بەوەخت و بە باشی ئێوەی ئازاد کرد. لەو وەختەوە کە هاتوویە بەندیخانە هەر پێم نەدەگوتی کە ئێوە هیچ گوناهتان نیەو بە زوویی ئازاد دەبن؟ ئێستاش ئەوە نەجاتتان بوو و چاوتان روون. ئێمەش لە سایەی سەری ئێوەوە حەمەدۆکمان دیت و ناسیمان. بە خوام سپاردی ئاغا. ئەگەر گوناهێك و قوسوورێك لە ئێمەوە رووی‌داوە لێمان ببوورە جەناب..."

## (٢٣)

فەزلی فەلەك سز خەریك بوو لە لای یاوەر دەردی دڵی هەڵدەڕشت:

"ئەمن ناتوانم لەو دێیە بمێنمەوە جەنابی یاوەر, منیان کوشت, دارێکیشیان لێنەداوم, بەڵام کارێکیان پێکردووم لە کوشتن خەراپتر. لەو دێیەدا هیچ کەس قسەم لەگەڵ ناکا. کەس لەو دێیەدا نەماوە کە سەرجووخە عەلی کەرتیشی خۆمان دارکاریی نەکردبێ, تەنانەت پەراسووی دایکێشمی شکاندن. خەڵکی دێی لە لێدان و زوڵم و سووکایەتیەکە قەڵس نین, لەوە تووڕەن کە زەماوەندەکەیان لێتێك چووە. ئەمن چووزانم ئەو زەماوەندە بۆ کێیە. هەتا ئەمن لە نێو ئاوایی بووم زەماوەند مەماوەندێك لە گۆڕێدا نەبوو. ئەم زانی دوایە ئەو جێژن و زەماوەندە لە کوێڕا پەیدابوو. لە کێ بپرسم بزانم مەسەلە چیە؟ خۆ کەس ئام دوێنێ. چما ئەمن حەمەدۆك ناناسم؟ ئەمن ئەوی لە تۆ, لە برای خۆم چاکتر دەناسم. ئەمن بۆ خۆم بەم دوو چاوانەم ئەوم لەوێ دی. ئەگەر خەڵکەکە شرت و گومیان کردوە, تاوانی من چیە جەنابی یاوەر؟"

یاوەر تێیڕاخوڕی:

"ئەتۆ خەتاباری, نەدەبوو بێڵی خەڵکی ئاوایی بت ناسن, بەڵام تۆیان ناسی و هەربۆیەش لە گەڵکوو ئەتۆ ون بووی حەمەدۆکیان بەرێکرد. ئەتۆ دەبوو کەسێکی دیکە بنێریە لای من"

"جەنابی یاوەر! کەس وەگیرناکەوێ. هەموویان, هەموو ئەو خەڵکە تازە بەسەرداکەوتوە, خەڵکی دێهاتی چوکووراواو چیانشینەکان ئەویان هێندی نەزەرکردەیەك گەورە کردوەتەوەو خاکی بەرپێی ماچ دەکەن.

تەنانەت دایکیشم لەسەر ئەوەی خەبەری هاتنی ویم بۆ تۆ هێناوە, ئام دوێنێ. جەنابی یاوەر, کارێکم بۆ بکە, ئەمن ئیدی ناتوانم لەو دێیە بژیم"

"زۆر باشە, کەسێکت پەیدا کردوە لەجێی تۆ کار بکا؟"

"ئەم توانیوە پەیدا بکەم"

"کەوایە دەبێ بچیەوە دێ"

"ناتوانم بچمەوە"

"ئەمن ئەمرت پێدەکەم"

"ناتوانم بچمەوە جەنابی یاوەر. ئەگەر جارێکی دیکە حەمەدۆك بێتەوە ئاوایی, یەکەم کەس کە دەیکوژێ ئەمنم"

"تازە ئەو ناتوانێ بێتەوە ئاوەدانی"

"دێ جەنابی یاوەر, ئەو لە هیچ ناترسێ. دێ و منیش دەکوژێ"

"ئەتۆ دەبێ بچیەوە دێ و تەواو. ئێستا برۆ ئەمن کارم هەیە, بچووە لای مورتەزاغا پارەت دەداتێ. ئەتۆش هەر ئەمڕۆ بڕۆوە دێ و چاوەڕوانی دەستووری من بە. دەقیقەیەکیش لەسەیرانێ غافڵ مەبە"

فەزلی فەلەك سز قبوولّی کردو هێدی هێدی لە ژوورەکەی یاوەر وەدەرکەوت.

یاوەر لە حالێك دا دەستی دەبەر قایش پشتێنە عەسکەرییەکەی ڕاکردبوو, لەپشت مێزەکەوە گوتی:

"وەکیل باشی عاصم بڵێ بزانم ئەمشەویش ئەو چەتە شێست تیر بەدەستە دێتەوەو شارۆچکە گوللەباران دەکا؟"

"بەڵێ دێ, جەنابی یاوەر"

"حەمەدۆك خۆیەتی؟"

"ناکرێ حەمەدۆك بێ, ئەو یاغییەکی بەڕاستییە"

"ئەتۆ حەمەدۆکت خۆش دەوێ, نا؟"

بەڵێ جەنابی یاوەر, ئەویش نۆگری من بووە"

"ئەو کابرایە دەبێ کێ بێ؟"

"لەوانی خوارێیە, یەکێك لەوانەیە کە دەیانەوێ ناوبانگ پەیدا بکەن. حەتمەن حەمەدۆك داوایلێکردوە کە شەوێك شارۆچکە وەبەر دەسرێژ بدا..."

"ئەویش مەیدانی بە چۆلی دیوەو... با ئەمشەو بە داویەوە بکەین و ئەم کارە ببڕێتەوە. ئەگەر خەبەری گوللەبارانی دێیەکەمان بگاتە ئەنکەرە... کە دوایەش حەمەدۆك هاتوە,

پەلاماری بەندیخانەی داوەو مەلافەرهادو یۆباز ئۆغلیی ئازاد کردوون, ئەودەم بۆ من و تۆ تەنیا یەك ڕێگا دەمێنێتەوە, ئەویش ئەوە کە بچینە شارەوانی و لە جێگای مرادی موهاجیر ببینە خۆلّ مالّ"

"ڕاستە جەنابی یاوەر, ئەمن لە ڕووم نایە بچمە بازارِ بۆنێو خەلّك. وام دێتە بەرچاو کە هەموویان گالّتەمان پێدەکەن"

"دیارە گالّتەمان پێدەکەن. چما نەت دی لە گوندی وایوای هەموویان گالّتەیان پێدەکردین؟ ئەم دێهاتییانە ئەوەندی دوژمنمانن, ئەوەندەشمان لێدەترسێن... تەنیا لێمان دەترسێن. ئێمەیان هیچ خۆش ناوێ. لە چەتەش دەترسن, بەلاّم ئێمەیان خۆش ناوێ. ئێستا چ بکەین؟"

"ڕاکردنی مەلافەرهاد چ لێبکەین؟"

خەلّکی شارۆچکە لەبارەی ڕووداوەکانی ئەم دواییەوە هیچیان نەدەگوت. دەت گوت هەر هیچ ڕووینەداوە. سێ شەو بوو چەتەکان دەهاتن, شاریان گوللەباران دەکردو لایبەیانی دەڕۆیشتن. تەنانەت مورتەزاغاش ئیدی نیگەران نەبوو. دوو ڕۆژ بوو دیار نەبوو. یاوەر لێیدەگەڕا, چەند کەسی نارد بیبیننەوە, بەلاّم کەس نەیدیتەوە.

قایمقام و سەرۆکی شارەوانییش بێدەنگ بوون, زولفۆ لە بنانگوێیان پێدەکەنی. هودایی قازیی خانەنشین قسەیەکی لەبن زمانیدا هەبوو کە نەیدەدرکاند. حەمەدۆك هێرش دەکاتە سەر مالّی مەلادۆران ئەفەندیو عەلیەیە شەل کە یەکێکە لە پیاوەکانی دەگرێو دەست و لاقانی دەبەستێو ڕاست لەو دەمەدا کە دەیەوێ بیکوژێ, لە ئاکامی تکاو پاڕانەوەی مەلادۆران ئەفەندیدا واز لە کوشتنەکەی دێنێ. عەلیەیە شەلیش پاش ئەو کارەساتە پڕ شوورەییە لە مالّێ وەدەر ناکەوێ. بۆ کەسێکی وەك وی, ئەم ڕووداوە ئەو جۆرە سووکایەتییە لە ڕاستیدا وەك مردن وایە. چونکە لەمەودوا مەلادۆران ئەفەندی ئیدی کارێکی ڕێناسپێرێ.

"عەلیەیەشەل لە مەودوا دەتوانێ یارمەتیمان بدا. ئێمە دەتوانین بۆ شوێن هەلّگرتن کەلکی لێوەرگرین, وانیە وەکیل باشی عاصم"

"جەنابی یاوەر ئەم کابرایەم هیچ بەردلّ ناکەوێ. هەمیشە پێم وایە لە بنەوە هێندێ شت دەکا. بنیادەمێکی دووڕوویە... لەوانەشە لە حەمەدۆك بترسێ"

"هەموو کەس زۆری لێدەترسێ, ئەمن بە دەستی خۆم دەیکوژم"

"دەلّێن یاوەر شەوکەتیش لە دوویەتی"

یاوەر پێکەنیو گوتی:

"ئەرێ, ئەو هیچ کاتێك چاوی بە من هەڵنەهاتوە. ئەم جارەش حەمەدۆکم لێدەستێنێ. ئێمە پێکەوە هاوپۆل بووین. ئەو هەموو چەتەی سەرکوت کردوەو گرتوە, دیسان چاوی تێر نابێ"

وەکیل باشی عاصم گوتی:

" هێندێ کەس چاویان تێر نابێ"

"دەبێ چاوت بە سەرۆکی دادگای جینایی بکەوێ"

"پیاوێکی وشکە جەنابی یاوەر..."

"دەزانی کە مەلا فەرهاد هیچ گوناهێکی نەبوو. ئادەم ون بوو و نەهاتەوە. ئێمە نازانین کێ ئادەمی کوشتوە, لەوانەشە نەمردبێ. ئێمە تەنیا لەبەر عەلیسەفابەگ فەرمانی گرتنی ویمان دا. دادگایەکی دادپەروەر دەبێ بە بێگوناهی بناسێ. ئەو کابرا ترسەنۆکە زراوتۆقیوەکە ناوی چ بوو؟"

"یۆباز ئۆغلی"

ها, ئەو دەتوانێ پیاوی بکوژێ؟"

"ناتوانێ جەنابی یاوەر"

"کەوایە دەبێ بە بێگوناح بناسرێن"

"دادگایەکی دادپەروەر دەبوو زۆر لەمەوبەر بە بێگوناهیان بناسێ, چونکە هیچ بەڵگەیەکیان لەسەر نەبوو"

"تاشکەن خەلیل بەگ."

"ئێوە خۆتان بچنە لای سەرۆکی دادگای جینایی و هەموو شتێکی بۆ روون بکەنەوە. لەو حاڵەدا ئەوان لە راستیدا هەڵنەهاتوون, بەڵکوو بە بێگوناح ناسراون و ئازادمان کردوون"

"باشترین رێگا هەر ئەمەیە... یان رابگەیەنین کە مەلافەرهادیش بووەتە چەتە"

"دوایە فکری لێدەکەینەوە"

"پاشانیش مەلایەکمان لەسەر دەستان دەمێنێتەوە. ئەویش مەلایەکی یاغی. داستانێکی سەیرو سەمەرەیە"

لای ئێوارێ هەموو جەندرمەکان کەوتنە ئامادەیی تەواوەوە. بڕیار درا لە دڕووەلانی"دوومووز تەپەسی" بۆسە دابنێن و ئەو چەتانە کە ئەمشەو دێن شارەکە وەبەر گوللە بدەن, لەداو بخەن.

"عەلیبە شەلیش لەگەڵ خۆمان دەبەین"

"دەیبەین جەنابی یاوەر. ئاوا دەتوانین تاقیی بکەینەوە. لەوانەشە بەکەڵکمان بێ."

جەندرمەیەك چوو عەلیەیە شەلی لە ماڵێ مەلادۆران ئەفەندیڕا هێنا.

عەلیەیە شەل کە وەڤووریێ کەوت کڵاوگەڕگەڕی بە دەستەوەو چەکمە لەپێداو پانتۆڵی گالیفەی سواری لەبەردا خەبەردار راوەستا.

یاوەر بێ ئەوەی پێی بڵێ دانیشە, یەکسەر چووە سەر باسەکە:

"هەر ئەمشەو لەگەڵ وەکیل باشی عاصم دەبێ بچنە کەمێن و ئەو یاغیەیانە کە شارۆچکەکەمان وەبەرتفەنگان دەدەن, بەدیل بگرن. دانیشە"

عەلیەیەشەل بە سرکی و بە ترسەوە تەماشای چەپ و راستی کردو لەسەر کورسیەیەك کە لە پەنای بوو, دانیشت. کڵاوەکەی بەسەر ئەژنۆی ڕۆکرد. بەڵام لەبەر ئەوەی دەستیشی لەسەر ڕانی دادەنا کڵاوەکە بەند نەدەبووو دەکەوتە سەر زەوی. سەرەنجام وەکیل باشی عاصم کڵاوەکەی هەڵگرتەوەو بە بزمارێکی داکرد کە لە دیواری درابوو.

"خۆش بی وەکیل باشی"

عەلی, جێبرینەکەی سەر دەستی وەکیل باشیی بەدی کرد. وا دیاربوو کاتی خۆی حەمەدۆك تفەنگی لەو دەستەی دابوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: پیاوی وەك ئەم وەکیل باشی عاصمە ئازاو ئاقڵم نەدیوە. ئەگەر وەکیل باشی عاصم لە جیاتی ئەوەی ببێ بە جەندرمەو بەو ژیانە نەمر نەژیەیە رازی بێ, وەکێوان کەوتبایەو یاغی بووایە لە حەمەدۆکیش بە ناوبانگتر دەبوو, و ناوی دەکەوتە سەر زارو زمانان. ئەگەر هەموو جەندرمەکانی کۆماری تورکیەش خڕ بانەوە, دیسان نەیان دەتوانی بیگرن بان بیکوژن.

"حەمەدۆك خەراپەیەکی دەرهەقی تۆ کردوە؟"

"نا, هیچی لەگەڵ نەکردووم, بەڵام دەم کوژێ. ئەو خەراپە لەگەڵ من ناکا. لەبەر ئەوەی مەلادۆران ئەفەندی پیاوێکی ئاییینیەیە حورمەتی گرت و منی نەکوشت"

"ئەوانەی شارۆچکە گوللەباران دەکەن کێن, بیروڕای تۆ لەو بارەیەوە چیە؟"

"پێم وایە ئەوانە منداڵی کەم تەمەنن. پیاوی ئاقڵ کاری وا ناکا"

"حەمەدۆك دەستی لەم کارەدا هەیە؟"

"ئەرێ. ئەو بۆ نەجات دانی مەلافەرهاد ویستی جەندرمەکان بکێشێتە دەری شارۆچکە..."

"ئەمانەش گوللەبارانی شارۆچکەیان پێ خۆش بوو. هەموو شەوێ لەپەستا گوللە دەتەقێنن. گوتم منداڵ و پاڵن... بۆ ناوو ناوبانگ وادەکەن. هەر ئەم رۆژانەش بۆخۆیان بەدنیا دەڵێن کە کێ بوون"

"ئەگەر ئەمشەو ئێمە ئەوانە بگرین... ئەمشەویش دێنەوە؟"
"ئەگەر دەستەکانی دیکە لـێیان گەڕێن..."
"ئەم بەسەرهاتە بۆ شارۆچکەکەمان مایەی سەرشۆڕییە"
"قسەی تۆیە جەنابی یاوەر"
"ئەتۆ چۆنی تێدەگەی, ئەگەر بێنەوە دەتوانین بیان گرین؟"
"وەکیل باشی عاصمیش دێ؟"
"ئەویش دێ"
عەلی زەردەی هاتێ: کەوایە دەیان گرین. ئەمنیش دەتوانم چەکێك هەڵگرم؟"
"دەتوانی, چەکی خۆشت دەتوانی بێنی..."
"بەچاوان جەنابی یاوەر"
"ئەمن ئەمشەو لەنێو شاری دەمێنمەوە. ئێوە چەندتان پێخۆشە جەندرمە لەگەڵ خۆتان بەرن"
عەلیخۆشحاڵ بوو.
ئەو شەوە بەدزیەوە چوونە دوومەزتەپەسی و لەنێو پنچکە دڕکەکان دا دامەزران و هەتا بەیانی چاوەڕێ مان, بەڵام کەس نەهات.
کە هەتاو کەوت عەلی چەند لەحزەیەك لە شوێنی چەتەکان ورد بووەوەو گوتی:
"ئەمانە شەش کەس بوون, هەمووشیان تازەکارو دەست و پێ سپی. ئەمڕۆش دەبوو بێن, ئەدی بۆ نەهاتن؟ چەتەکانی دیکە, یان کوشتوویانن یان تەمبێیان کردوون"
وەکیل باشی عاصم گوتی:
"بریا گرتبامانن, بۆ هەردووکمان باش دەبوو"
عەلی گوتی: بەڵێ, باش دەبوو.
"حەمەدۆکی چ لـێبکەین؟"
"گرتنی زۆر دژوارە"
"دژوارە, بەڵام دەبێ بیگرین. یاوەر لە خەفەتان دیق دەکا. سەری زمان و بنی زمانی حەمەدۆکە".
"ئێستا ئیدی هەرکەسە بووەتە حەمەدۆکێك"
"خەڵك تەنانەت ئەسپەکەشی بە نەزەرکردە دەزانن"
عەلییەشەل گوتی:
"ئەمن ئەو ئەسپە دەناسم. ئەسپە رەسەنەکەی عەلی سەفایە. خۆ ئی حەمەدۆك نیە..."

"دەستوورمان بە هەموو کوێستانەکان داوە کە ئەو ئەسپەی بگرنەوەو بۆمان بێنن, نازانم بۆچی کەس ناتوانێ نیزیکی کەوێتەوە. تەنانەت ناتوانن بەتفەنگیش لێیدەن..."

"لەو ئەسپەی دەترسن. دێهاتییەکانی لای ئێمە لەو جۆرە ئەسپانە دەترسێن, دەترسن ئەگەر بیگرنەوە بەڵایەکیان بەسەر بێ"

"ئەتۆش دەترسی؟"

"دەترسم, حەمەدۆکی حازرم بکوژم, بەڵام ئەو ئەسپەی, نا"

ئەو ڕۆژە وەکیل باشی عاصم و عەلییەشەل تا دێیەکانی نیزیك چوون و هاتنەوە. لەو دێیە هەموو کەس دەیزانی چ کەسانێك شارۆچکەیان ئاورباران کردوە. کاتێك گەڕانەوە شارۆچکە دیتیان هەموو خەڵکی شاریش ئاگادار بوون. بەڵام لەبارەی حەمەدۆك و هێرشی بۆسەر شارۆچکەو نەجات دانی مەلافەرهادەوە کەس هیچی نەدەگوت.

باس هەر باسی سینەم ئۆغلیی ڕێگر بوو.

وەکیل باشی عاصم و عەلییەشەل حەوتوویەکی دیکە لە دەورووبەری شارۆچکە بۆسەیان نایەوە, تەنانەت نەیان هێشت باڵدار بەو دەورووبەرەدا بفڕێ. بەڵام نە کەس هات و نە کەس چوو.

یاوەر بە وەکیل باشی عاصمی گوت:

"کارەکان تێکەڵ پێکەڵ بوون وەکیل باشی عاصم. زۆرم هەوڵ لەگەڵ سەرۆکی دادگای جینایی دا بەڵام سەرنەکەوتم. کەسیش باسی مەسەلەی راکردنی مەلافەرهاد ناکا.

ئێستا مورتەزاغا خەریکی ئەم کارانەیە... لەمەودوا ئەمن و تۆ دەبێ ئەم مەسەلەیە چارەسەر بکەین. کارەکانیش زۆر تێکەڵ پێکەڵ بوون. شوێنگێڕێکی دیکەمان پەیدا کرد.

زولفۆ بەگیش قەول وایە یەکێك لە کۆنەبرادەرەکانی حەمەدۆك بێنێتە لای من. دەیەوێ ئێمە بینێرینە لای حەمەدۆك و پاشانیش بە نامەردی حەمەدۆکی بکوژێ.

دەزانی وەکیل باشی, ئەمن ناتوانم ئەم کارە بکەم. ئەم کارەم هیچ پێ خۆش نیە. چەندین ساڵە ئەمن رووبەڕوو بەگژ حەمەدۆك دا چووم. ئەمن دەمەوێ بیگرم یان بیکوژم. حەمەدۆك چاوەڕوانی ئەم کارەی لەمن نیە"

"ئەم حەمەدۆکەش کابرایەکی سەیرە"

"ئی ئەم دەورو زەمانەیە نیە"

"زۆریش گەنجە. لەئەندازەبەدەر, ڕەنگە ئازایەتی و پاکی و جوامێرییەکەشی هەر لەبەر ئەوە بێ. ئەو کۆنە یاغییە کە لە کێڵگەکەی زولفۆدا کار دەکا ناوی جەبارە. وەبیرت دێتەوە؟"

"چۆن وەبیرم نایەتەوە؟"

"وەختێك فەرمانی لـێبووردن دەرچوو یەکێك لەوانەبوو کە زووتر تەسلیم بوونەوە. ئەوەیە کە هەر باسی حەمەدۆکی کردو هیچی لەبارەی خۆیەوە نەگوت. لەبارەی "دۆردووە شێت"یشەوە هێندێ شتی گوتبوو, تەنانەت دەربارەی ئەوەش کە بۆچی حەمەدۆکی خۆش دەوێ. ئێمە ئەودەم پێمان وابوو ژمارەی پیاوەکانی دەستەی حەمەدۆك زۆرە. لەرێگای وی‌یەوە تێگەیشتین کە دوو کەس زیاتر نین. کورێکی باشە, پاکی و خووورەوشتی منداڵانی هەیە. ئێستا لەکێڵگەی زولفۆبەگ دا کار دەکا. ئەمرۆش قەول وایە تاشکەن بەگ بچێتەلای سەرۆك و رووی لـێبنێتەوە. بزانین چۆن دەبێ. زگم بە مەلافەرهادی بێتاوان دەسووتێ. ئەویش پیاوێکی چاکە. مورتەزاش کابرایەکی سەیرە, چۆنی پێی خۆش بێ ئەم شارۆچکەیە وا هەڵدەپەرێنێ. خەڵکی شارۆچکە چۆنی ئەو پێی خۆش بێ وا قسە دەکەن و وا بیر دەکەنەوەو باوەڕ دەکەن. قایمەقام کابرایەکی بێکیفایەتەو داواکاری گشتییش دەڵێی ئاگرە. ئەمن چۆن دەتوانم قبووڵ بکەم کە جەبار بچێ بە نامەردی حەمەدۆکی بکوژێ؟ دەزانی ئەمەش بۆمان بووەتە ژانەسەرێك"

ئەو شەوە تاشکەن خەلیل چووە ماڵێ سەرۆکی دادگای جینایی. بۆخۆشی حوقوق زانێکی کۆنەکار بوو. بەجحێڵی لە دادگاکان دا خزمەتی دەکردو پاشان ماوەیەکی زۆر لە شارۆچکە بوو بە پارێزەر. لەمێژ بوو لەگەڵ سەرۆکی دادگای جینایی دۆستایەتیی هەبوو.

"فەرموو خەلیل بەگ, بەخێربێی"

سەرۆك پیاوێکی زۆر نەجیب و بەحورمەت بوو. سەر بێتووك و بەهۆش بوو. چاوێکی پڕنووری هەبوون و ئاکارو کرداری نیشانی دەدا کە پیاوێکی بەئەزموونە. لووتی قەپۆزبەرانی و چەنەگەی پان و بەقەوەتی سام و هەیبەتی پیاوێکی توندوتیژیان پێبەخشیبوو. باب و باپیریشی قازی ببوون. لەوە کە بۆخۆی قازی‌یەو لە بنەماڵەی قازی‌یانیش دا پێگەیشتوە, شانازیی بەخۆیەوە دەکرد. وێنەیەکی قەڵەم کێشی بابی بەجبەی قازی‌یانەوە تەنیا وێنە بوو کە بەدیواری ماڵەکەیەوە هەڵاوەسرابوو.

خەلیل بەگ پاش ئەوەی تەختە کۆن و رزیوەکانی تەختی ژوورەکەی خستە شەقەو تەقەوە, چوو لەسەر قەنەفەیەکی زۆر کۆن کە قازی نیشانی دابوو و رووپۆشێکی کاڵ بووەوەو پواوی بەسەردا درابوو, دانیشت. دیاربوو ئەم تەنیا قەنەفەیەی ئەو ماڵە چەندین ساڵ بە شارو شارۆچکەکان دا گەڕاوە. زۆر جێگای داری قەنەفەکەش مۆریانە کون کونی کردبوون.

"خەبەرو باس چیە خەلیل بەگ, زۆر لەمێژە نەمان توانیوە یەکتر ببینین"

خەلیل بەگ وەڵامی دایەوە:

"پڕکاری. مەملەکەت تازە خەریکە سەروسامان پەیدا دەکا. کارەکانمان لەسەر کەڵەکە بوون. هەم کاروباری دەوڵەتی و هەم کاروباری خۆم, دەستێك بەسەر ئەو کێڵگەیەدا بێنین, ئەو زەوییانە کە لەمێژ ساڵە بەیار ماونەوە داچێنین, تەراکتۆرێك و چەند مەکینەی دیکەی کشتوکاڵ بکڕین و ئەو جۆرە شتانە. بەرهەمیش نافرۆشرێ. لۆکە لە عەمبارەکان دا ماوەتەوە کەس نایکڕێ. سندووقی بانکی کشتوکاڵ بە تەواوی بەتاڵە, قرۆشێك بەقەرز نادا. کاتێك ئەو زەوییە بەیارانە دەبینم ئاورم لە جەرگی بەردەبێ. لەشکرێك نەخۆش, دەردەدارو بێکارو برسی و تینوو لەم دەشتەدا بەکوێرەوەری دەژین. لەسەرانسەری ئەم دەشتەدا یەکێك نابینی مالاریای نەبێ. چەندین ساڵە خەڵك لەبرسان گیاوگژ دەخۆن. ئەگەر گیاوگژەکە نەبایە ئیدی کارەسات رووی دەدا. خەڵك وردە وردە لەبەین دەچن. کارەکان بێسەرەوبەرەو تێکەڵ پێکەڵ بوون, نازانین چ بکەین. ئەو یاغییانەش لێمان بوونە بەلا... تەنانەت بۆ کەیفەو ئیشتیاش هێرش دەکەنە سەر شارۆچکەو گوللەبارانی دەکەن. مورتەزاغا هەقی بوو ئەوەندە بترسێ. دوێنێ حەمەدۆك هاتوەتە ماڵی مەلادۆران ئەفەندی, ئەو, لەم دواییانەدا پیاوێکی راگرتوە بەناوی عەلییەشەل, ویستوویەتی بیکوژێ. مەلادۆران ئەفەندی لەبەری دەپاڕێتەوەو گیانی عەلی نەجات دەدا. پاشانیش حەمەدۆك دەچێتە بەندیخانەو کابرایەك بەناوی مەلافەرهاد ئازاد دەکاو دەیبا. یاوەر فارووق داوای لەمن..."

قازی تووڕە بوو:

"کاری وا ناکەم خەلیل بەگ! هەرگیز کاری وا ناکەم..."

"بەلام وەك دەڵێن مەلافەرهاد هیچ گوناهی نەبووە"

"ئەگەر گوناهێکی نەبووە, باشە بۆچی دۆسیەیەکیان بەداوای ئیعدامەوە ناردوەتە لای من. یەقین بزانە کە ناتوانم کاری وا بکەم. ئەمن ناتوانم دادپەروەری بکەمە گەمەی منداڵان. بۆخۆم دەزانم کە تاقیکردنەوەم لەم کارەدا زۆرە, ئەمەش دەزانم کە لەمەولا خەڵکی شارۆچکە نایەڵن ئاسوودە بژیم. ئەمن لە بنەماڵەیەکم کە باب و باپیری قازی بوون. دادپەروەری لەلای من پیرۆزە, بەهیچ جۆر ئالوودەی ناکەم. مەلافەرهاد تاوانبار بوو, بەلام هەر کە ڕای کرد بێگوناح دەرچوو؟ واز لەم قسانە بێنە خەلیل بەگ. ئەتۆ پیاوێکی بە بەخت کردنی خوێنی خۆت لە نەجات دانی ئەم نیشتمانەدا بەشدار بووی. نەدەبوو کاری وا لەمن داوا بکەی. ئەگەر

دادپەروەری عەیب دار بێ زۆر زەحمەتە بتوانین ئەم مەملەکەتە بەسەر پێوە رابگرین. ئەم جەنابی داواکاری گشتییەش هیچ بەردڵی من نەکەوت. چۆن, چۆن, بە بەڵگەداتاشین دۆسیەی پیاوێکی بێگوناح بۆمن دەنێرن, شاهیدان دێنن... خەلیل بەگ زۆریان لێ تووڕەم... ئەمن دەزانم مەملەکەت تازە خەریکە سەروسامان پەیدا دەکا, زۆر کاری نارەواش دەکرێن, بەڵام دادپەروەری شتێکی تازە نیە, بیری دادخوازی و ویژدانی مرۆڤ شتێکی یەکجار لەمێژینەیە. بەداخەوە ئەمن ناتوانم داخوازەکەیان جێبەجێ بکەم. بەو بەڵگەو سەنەدانە کە نیشانی منیان داوە ئەگەر مەلافەرهاد بۆ مەحکووم بوون ببێ مەحکووم دەبێ, ئەگەر بێتاوانیش بێ بە بێتاوان دەناسرێ"

قازی ئەوەندە زیرو توندو بەمتمانەوە قسەی دەکرد کە شەلاڵی ئارەق ببوو. لێکدا لێکداش بە دەسرۆکەکەی نێوچاوانی خۆی دەسڕیەوە.

قازی ژن گوتی: ئەوەندە تووڕە مەبە ئاغا, خۆت دەکوژی.

ئەمەی گوت و پەرداخێکی ئاو هێناو بە میهرەبانی و دڵدانەوەوە دەستێکی لەپشتێ دا.

"دیارە تووڕە دەبم خانم. خەفەت بۆ ئەم مەملەکەتە دەخۆم. دیارە ئەم رۆژانەش تێپەڕ دەکەم... زۆر حەستەم دەبێ. ئەگەر ئەو دێهاتییانە دەبینی کە تاوانێك دەکەن و دەیان هێننە لای من... لە خۆم و لە ئینسان بوونی خۆم شەرم دەکەم"

خەلیل بەگ گوتی: کارێکی زۆر دژوارتان هەیە, زۆر دژوار, خوا کۆمەگتان بکا.

قازی لەحاڵێك دا دەم و چاوی داگیرسابوون گوتی:

"زۆر دژوار, ئێستا ئەگەر ئەمن بەپێی ئەو بەڵگەو شاهیدانە کە نیشانم درابوون مەلافەرهادم مەحکووم کردبایە تەگبیر چ بوو؟ ئێستاش هەرخۆیان هاتوونە لای من و دەڵێن ئەو بێگوناهە. ئەمن تەگبیرم چیە؟ ئەمن پیاوی قانوونم, باب و باپیرم قازی بوون. ئاشکرایە کە نارەحەت دەبم. خەلیل بەگ... وەزعی من تێدەگەی؟ ئەگەر هەستی دەروونیی ئینسانەکان بێدەنگ بکەین, رێزو حورمەت لەنێو ئینسانەکان دا لەبەین دەچێ. وەختێکیش لەنێو خەڵك دا رێزو متمانە لەنێو چوو, ئینسانەتی و زۆر شت لەدەست دەچن, ژیان بێتام دەبێ"

قازی دەرهەڵ ببوو و یەك تەکان قسەی دەکرد.

"وەختێك ئێمە خەریکین نیزامێکی تازە دادەمەزرێنین, دەبێ زۆر دادپەروەر بین"

ئەمجار سەری هەڵبڕی و بەشێوەیەکی سەیر تەماشای تاشکەن خەلیلی کرد:

"باشە ئێستا مەلافەرهاد دەیەوێ یاغی بێ؟"

خەلیل بەگ گوتی: ڕەنگە.

زۆر بەخۆدا شکابووەوە, نەیدەزانی چ لەدەستەکانی بکاو لە کوێیان دانێ. ماوەیەك دەستی دە کەلەکەی نان, تاوێك لەبن باخەڵی گرتن و تاوێکی دیکە دەنێو ڕانی خۆی نان.

"ئێستا ئەگەر ئەو پیاوە یاغی بێ و بیهەوێ ئەو دادپەروەرییەی لە ئێمەی نەدی بۆخۆی جێبەجێی بکاو دێهاتییەکانیش وەك حەمەدۆك بیگەیەننە پلەو پایەی پیاوچاکان ئێمە تەگبیرمان چیە؟ دەڵێن ئەو پیاوە ناهەقیەتی؟"

"ئەم پیاوە دەبێتە چەتەو بۆخۆشی لە خوێنخۆرەکانە"

"ئەگەر ئێمە رابگەیەنین بێگوناهە... دیارە بەوحاڵە وا دێتە بەرچاو کە بێگوناهیشە, دیسان هەر درێژە بە یاغیگەری دەدا؟"

"کەس نازانێ, بنیادەمە, لەوانەشە لەهیچ حاڵەتێك دا چەتەیی نەکا"

قازی تاوێکی دیکەی خواردەوەو لەگژ فکران ڕاچوو. پاشان پێکەنی:

"پیاو سەر لەکاری بنیادەم دەرناکا. ئەوی راست بێ بەزەییم بەو یاوەرەدا دێ. لێرە لەنێو ئەو هەموو چەتەو سەربازە راکردووە خۆرایییان کردو, حەیواناتی ئەم شارۆچکەیەش سەربار... خەلیل بەگ ئەمانە بۆ چووکترین قازانجی خۆیان هەموو کارێك دەکەن. ئەویش هەتا تووڕە دەبێ و دەکەوێتە تەنگانەوە, رقی خۆی بە دێهاتییەکان دەڕێژێ, وەختێك دێهاتییەکان دێننە لای من و چاوم پێیان دەکەوێ, لەداخان وەختە بتەقم"

تاشکەن خەلیل هەستایە سەرپێ, ئەویش ئارەقی کردبوو:

"تەنانەت هێرشیان کردە سەر شارۆچکەش, سێ شەوان دایانە بەر دەسڕێژ, وەزعمان زۆر خەراپە"

قازی گوتی: زۆر خەراپە, خوا کۆمەگتان بکا.

لە شارەوانی, پیاوماقووڵانی شارۆچکەو قایمقام و سەرۆکی شارەوانی چاوەڕوانی تاشکەن خەلیل بوون.

سەرۆکی شارەوانی کە کەوش درووییەکی کۆنەکارو لەمێژینە بوو و ددانی زێڕی لەدەم دا بوون, بە دوای تاشکەن خەلیل دا دەهات کە لە رێگادا تووشی بوو:

"چ بوو؟"

"دەتەوێ چ بێ؟ سەرۆك دەستی کرد بە بۆڵەو پرتەو هەرچی بەدەمی دا هات گوتی. بەڵام مەلافەرهادی بە بێگوناح دەناسێ"

مورتەزاغا گوتی:

"زۆریش پێویست نیە, مەلافەرهادێك لەگۆڕێ دا نەبووە. نە کەوتوەتە بەندیخانەو نە لە بەندیخانە هاتوەتەدەر. کەس ئاگای لەم مەسەلەیە نیە. ئەم مەسەلەیە تەنیا... کەسیش هێرشی نەکردوەتە سەر شارۆچکە. ئەو تەقەیەش تەقەی ئەو جەندرمانە بووە کە لەگەڵ چەتەکان تێك هەڵچووبوون. ئەم مەسەلەیەمان ئەمڕۆ بۆ دەرکەوت و بڕایەوە"

ئەمجار ئاوڕی دایەوە سەر مەلادۆران و دەستی لەسەر شانی دانا.

"ئەو کەسەی هاتبووە ماڵێ تۆش حەمەدۆك نەبوو. وانیە؟"

"حەمەدۆك نەبوو"

"حەمەدۆکیش هەر ئەم ڕۆژانە دەگیرێ و لەم بگرەو بەردەیەدا لەگەڵ مەلافەرهاد لەدار دەدرێ. ئێستا بزانین کاکە زولفۆمان دەڵێ چی"

"ئەمن یەکێکم دیوەتەوە کە هاوڕێی سەردەمی چەتەگەریی حەمەدۆك بووە, ناوی جەبارە. بە جەبارەدرێژ بەناوبانگە. لەگەڵ حەمەدۆك لەکێوان بوو کە فەرمانی لێبووردن دەرچوو, ئەویش هاتەوە دەشتێ. هەر بەڕێکەوت بەم مەسەلەیەم زانی. لە کێڵگەکان دا کار دەکا پیاوێکی کەم دوێیە, کاری بەکاری کەس نیە. دێهاتیەکان دەڵێن پیاوێکی ئازاو بەشەرەفە, ئەو حەمەدۆکی کردوەتە حەمەدۆك. ئەمن بیرم کردەوە ئەوی بنێرینە لای حەمەدۆك کە بڵێ دیسان دەیەوێ یاغی بێتەوە. ئەویش فریو دەخواو پاشانیش شەوێك لێی دا بیکوژێ. بە یاوەرم گوت قبووڵی نەکرد. دەڵێ ئیللان و بیللان حەمەدۆکی هەر بۆخۆم دەگرم و هەر بۆخۆم دەیکوژم..."

مورتەزاغا گوتی:

"باشە, ئەگەر هات و پێش ئەوەی یاوەر بیکوژێ ئەو حەمەدۆکەی هێرشی کردوەتە سەر شارۆچکە, گرتووی لە بەندیخانە رفاندوەو زەماوەندی لەگوندی وایوای وەرێ خستوە, هات یەك بەیەك لە ئێمەی داو هەموومانی کوشت, تەگبیر چیە؟ با بەکۆمەڵ بچینەوە لای یاوەرو قانیعی بکەین"

"ئەمن زۆرم تکا لێکرد"

سەرۆکی شارەوانی گوتی:

"ئەو منی خۆش دەوێ, لە قسەی من دەرناچێ"

قایمەقام گوتی:

"گەلاڵەی جەباری لە هەمووان ئاسانترە. یاوەر دەبێ ئەو نەخشەیە قبووڵ بکا. باشە ئێوە لە جەبارتان پرسیوە, رازیە؟ وەك دەڵێن زۆر پیاوە, کەسێکی وا رەفیقی خۆی دەکوژێ؟"

زولفۆیەگ قاقا پێکەنی:

"لێم نەپرسیوە, بەڵام قبوولی دەکا. ئەمن وادەکەم قبوولی بکا. سێ منداڵی سەروپێچکەی هەن"

مورتەزاغا بەدڵنیاییەوە گوتی:

"ئەوەندە بەسە ئێوە یاوەری رازی بکەن, ئەمن جەباری قانیع دەکەم. ئەمنیش هێندێ شتم لەبارەی جەبارەوە بیستبوو"

بڕیاریان دا سبەینێ بەیانی قسە لەگەڵ یاوەر بکەن.

وەسبەینێ ڕا بەیانی زوو قایمقام, سەرۆکی شارەوانی و تاشکەن خەلیل لە شارەوانی خڕ بوونەوەو چوونە لای یاوەر. یاوەریش دوای هێندێك خۆگران کردن سەرەنجام رازی بوو. تاشکەن خەلیل ئەو کومیتەچییە کۆنەکارە گوتی:

"جەنابی یاوەر, ئێمەش ئەو چاکەیەی جەنابتانمان لەبیر دەمێنێ و بۆت قەرەبوو دەکەینەوە"

"باشە چۆن؟"

"ئەگەر جەبار بیکوژێ, ئێمەش بە ئەنکەرەو ئەدەنەو هەموو دنیا رادەگەیەنین کە ئەتۆ حەمەدۆکت کوشتوە"

قایمقام گوتی: فکرێکی یەکجار باشە.

سەرۆکی شارەوانی کە پیاوێکی بەرپەڕ بوو هەستایە سەرپێ. دەستی یاوەری گرت و باوەشی پێدا کرد:

"جەنابی یاوەر, لە ئێستاوە پیرۆزباییت لێدەکەم. ئەتۆ چ بۆخۆت حەمەدۆکی بکوژی و چ بەم نەخشەیە ببیە هۆی کوژرانی, لە هەردوو حاڵەتەکەدا شانازییەکە بۆخۆتە"

"ئەمن ناتوانم ئەم پێشنیارە قبووڵ بکەم. ئەمە کەڵەکبازییە... ئەم پیاوە دەبێ لەنێو بچێ, جا هەرکەس دەیکوژێ, با بیکوژێ. بەڵام زۆرم حەز دەکرد بۆخۆم بم کوشتایە. ئەو زۆری گاڵتە بە غیرەت و ئابڕووی من کرد. پێم خۆش بوو گرتبام, قسەم لەگەڵ کردباو دوایە کوشتبام. تەمەنی لاویم لەسەر وی دانا. چ بکەین ئێستا دەبێ بە نەخشەو ناپیاوی بیکوژین. چارەیەکمان نیە... ئەمن هەرگیز نەم دەویست ناپیاوی لەگەڵ دوژمن بکەم. تەنانەت لەگەڵ دوژمنی بێئەمانی گیانیشم"

"جەنابی یاوەر زۆرت سوپاس دەکەین"

"پیاوێکی جێگای ڕێزو حورمەتی"

"مورتەزاغا قسە لەگەڵ جەبار دەکاو قانیعی دەکا"

یاوەر هەناسەیەکی هەڵکێشاو بە روخسارێکی خەفەتاوییەوە گوتی:

"ئیشەڵڵا قبوولّی ناکا. ئەمن رازی نیم رەفتاری وا لەگەڵ گەورەترین دوژمنیشم بکەم کە بەدەستی نیزیکترین دۆستی خۆی بیکوژم. چ بکەم چارەیەکم نیە. زستان خەریکە دادێ. دەرەتانی عەمەلیات نیە, هەموو کەسیش چاوەڕوانە کە ئەمن زۆر زوو لەنێوی بەرم. ئەمن نازانم بۆچی هێندەی لـێ دەترسن"

تاشکەن خەلیل بەگ قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

"دەترسێین جەنابی یاوەر, ئەمنیش بەرە بەرە خەریکە لێی بترسم"

"ئەتۆش؟"

"بەڵێ ئەمنیش جەنابی یاوەر!"

"ئیشەڵڵا جەبار قبوولّی ناکا. ئەمن ئەو دێهاتیيانە لەنیزیکەوە دەناسم. جەبار بەناچاری قبوولّی دەکا, لەترسان, سێ منداڵیشی هەن"

"جەنابی یاوەر دڵ لەدڵ مەدە, ناکامی کارەکە خۆشحاڵت دەکا"

یاوەر هەتا پلیکانەکان لەگەڵیان چوو.

"گوێت لـێبوو وەکیل باشی عاصم؟"

"بەڵێ, جەبار قبوولّی دەکا؟"

"ناچاری دەکەم"

"جەبار سەر دەکەوێ؟"

"زۆر باشی دەناسم. لەقەدەر خۆی پیاوێکی زۆر باشە, پیاوێکی پیاوە. وەختێك خۆی تەسلیم کردەوە هەمیشە ناڕەحەت بوو, دەیگوت: حەمەدۆکم لەو چیایانە بەجێ هێشتوەو هاتوومەوە. نەیدەتوانی تەحەممول بکا, زۆر لەوە ناڕەحەت بوو کە هاوڕێیەکەی لەچیا بەجێ هێشتوەو هاتوەتەوە. ئەمن زۆرم هەوڵ دا دڵخۆشیی بدەمەوە. وەك دەڵێن لەلای زولفۆ کرێکاری دەکا ها؟ لەوانەشە بتوانێ حەمەدۆکی بکوژێ"

"یانی نیزیکترین هاوڕێی خۆی... ئەی کە ئەم دێهاتیيانەی ئێمە..."

"بەشی زۆری ئەم جۆرە یاغیيانە بەدەستی هاوڕێکانی خۆیان..."

"هاوڕێیەتی... چما هاوڕێیەتی لەگیانی بنیادەمیش بەنرختر نیە؟ لەوانەشە جەبار بچێ و پاش ئەوەی هەمور شتێکی بەحەمەدۆك گوت ڕەگەڵ دەستەکەیان بکەوێ"

"ڕێی تێدەچێ..."

"ئەگەر وای لـێبێ زۆر خۆشحاڵ دەبم"

وەکیل باشی عاصم گوتی: ئەمنیش هەروا.

"چۆنە پێش ئەوەی جەبار پچێتە لای و حەمەدۆکیش خۆی ئامادە بکا دەست بە عەمەلیات بکەین..."

"زستان لەڕێ دایە, لە تووڕووسیش بارین دەستی پێکردوە"

"گوتت چەند کەسی لەگەڵن؟".

"وەك فەزلی دەڵێ سێ کەس بوون"

"هەتا بەهارێ دەستەکەی تەواو دەکا"

"هەتا ئەوان خۆیان ڕێك و پێك دەکەن, ئێمەش خۆمان ساز دەکەین"

"ئەدی جەبار؟"

وەکیل باشی عاصم گوتی:

"مەعلووم نابێ, ئەگەر سەر نەکەوت جەنازەکەی دێتەوە"

"بەفکری تۆ حەمەدۆك نیزیکترین هاوڕێی خۆی دەکوژێ؟"

وەکیل باشی عاصم گوتی: بەڵێ دەیکوژێ.

زولفۆ هەر ئەو ڕۆژە یەکێکی نارده کێڵگە بۆئەوەی جەباری لەگەڵ خۆی بێنێ. قەرار وابوو مورتەزاغا قسە لەگەڵ جەبار بکا.

مورتەزاغا لەحاڵێك دا بەخۆشحاڵیەوە دەستی ڕێك دەخشاندن دەیگوت:

"ئەگەر, ئەگەر جەبار لەژێر ئەم کارە بچێتە دەرێ, ڕێگایەکی کاریگەری دیکەم هەیە, ئەویش چۆن ڕێگایەك, کوژرانی حەمەدۆك بە جێی خۆی, ڕیسی هەمور یاغیيەکانی ئەم چیایانە دەکەمەوە خوری.

بەڵام ئەوی ڕاست بێ, زۆرم متمانە بە جەبار نیە. کوڕە ئەم زولفۆیەی دەڵێم, ئەم زولفۆیە. ئەگەر لەم چوکووراوایە کەسێك هەبوو داوی بادا, ئەمن ڕیش و سمێڵی خۆم لەبن ڕا دەتاشم"

بەبێسەبری چاوەڕوانی جەبار بوو, زۆری مەراق بوو بزانێ ئەو چۆن پیاوێکە. وەختێك خۆی تەسلیم کردەوە ئەوی لە مەقەری جەندرمە لەنێو یاغیيەکانی دیکە دیبوو. چون دەیان گوت

ڕەفیقی حەمەدۆکە, نەختێك زیاتر لە قەڵافەتی ورد ببووەوە. ئەمە ڕووداوی زۆر لەوەپێش بوو لێڵ و تاریك پیاوێکی وەبیر دەهاتەوە زۆر کەڵەگەت کە دوولا هاتبووەوەو گرموولە ببوو و لە قوژبنێك هەڵکوشمابوو.

"یاوەر زۆر ناڕەحەت دەبێ"

مورتەزاغا بەپێکەنینەوە گوتی:

"با ناڕەحەت بێ. لەجێدا کارەکە پێوەندیی بەوەوە نیە, ئێمە جەباری دەنێرین. تەنانەت پێویست نیە هیچیشی پێ بڵێین. یاوەر با بچێ کاری خۆی بکا, نەیەڵێ حەمەدۆك هێرش بکاتە سەر شارۆچکە, چما حەمەدۆك بەهەر جۆرێك بکوژرێ ئەو بەرپرسە؟ ئەو یاوەرە دەست و پێ سپی‌یە دیسان دەبێ شوکرانە بەنێوچاوانی ئێمە ببژێرێ. دەبینی جەبار یان کەسێکی دیکە حەمەدۆکی دەکوژێ و شیرنی‌یەکەش ئەو وەری دەگرێ. ئەگەر جەباریش ئەم کارەی لەدەست نیە, ئەمن یەکێکم هەیە, یەکێك هەیە حەمەدۆکی وەك ئاوێ دەخواتەوە, بەڵام جارێ لەبەر نەخشەیەکی زۆر وردو هەڵسەنگێندراو ناوەکەی بەکەس ناڵێم. وەختێکیش ویستم ئەو کەسە بنێرم حەمەدۆکی بکوژێ, نە بەکەس دەڵێم و نە هیچ شتێك لە کەس دەپرسم و نە ئیزن لە یاوەر فارووقی بەرێز وەردەگرم. ئێستا با جەباری تاقی بکەینەوە. هەتا مەقاش هەبێ پۆلووی بەدەستی هەڵناگرم. ئەمن جارێ ئەو زاتەی تووشی ئەزیەت ناکەم. چونکە ئەو پیاوێکی ئازاو نەترسە کە شارۆچکە هەمیشە پێویستیی پێی هەیە. لەهەر چەرخێك دا تەنیا یەك پیاوی وا لە چوکووراوا, لە هەموو توورووس و چیاکانی "هەزارەگا" پەیدا دەبێ. ئەمن لەمانە دوو کەسم هەن. دوو بازی ڕاوکەر..."

تاشکەن خەلیل بەپێکەنینەوە گوتی:

"ئێستا دەزانم ئەتۆ بۆ گۆڕاوی و بۆچی لەبنانگوێیان پێدەکەنی. هیچ لە حەمەدۆکیش ناترسی. حەمەدۆك وەك مێشوولە لەنێو دەستمان دایە"

مورتەزاغا تێی ڕاخوری:

"کوڕم زولفۆ فکرت لەکوێیە؟ گومانی تێدا نیە کە حەمەدۆك وەك مێشوولە لەدەستی خۆمان دایە. پێت وایە ئەمنیش عەلی سەفابەگم. حەمەدۆك بۆمن لەخواردنەوەی قومە ئاوێکیش ئاسانترە... ئەو لەلای من هێندی مێروولەیەکیش قیمەتی نیە. چما ئەو کێیە؟ دێهاتی‌یەکی پێخواس و قوون ڕووت, منداڵێکی هەتیو... هەزار چەتەی وا لەلای ئێمە قیمەتی پووشکە کایەکیان نیە. کۆماری بەرێزی تورکیەش دوو قسەی حیسابی لەگەڵ ئەو دێهاتی‌یانە دەکا کە پشتیوانی حەمەدۆکن, هەروەها لەگەڵ جەنابی یاوەریش..."

دەیەویست بڵێ لەگەڵ عارف صائم بەگیش, بەڵام بێدەنگ بوو.

بەپێی خەبەرێك کە بەرگوێی مورتەزاغا کەوت, ئەو دەنگۆیە کە عارف صائم بەگ دەیەوێ مستەفا کەمال پاشای بکوژێ وەك تۆپ لە هەموو وڵات تەقیبووەوە. ئەو قسەیە کە ئەو, بێ لێکدانەوە بەسەر زمانیدا هات هەنگامەی لەنێو خەڵك دا وەرێ خست. تەنانەت ئەدەنەو ئەنکەرەو ئەستەمبوولیشی شلەقاندبوو. گەورەپیاوانی ئەنکەرە لە مەجلیس, لە بەزمی ئارەق خواردنەوەو لە مەکتەبی رۆژنامەکان دا هەر باسی ئەو قسەیەیان دەکرد. لە شارۆچکەش خەڵك بە مەسەلەی پیلانی کوشتنەکەیان زانیبوو. بەڵام کەس راست و رەوان باسەکەی بەدەم دا نەدەهات, لەوانەشە راست بێ, هیچ شتێك لەخۆوە ناگوترێ. خۆ مورتەزاغا نەیدەتوانی مەسەلەیەکی وا گرنگ لە ورگی خۆی دەربێنێو... بێ و نەبێ ئەم خەبەرە بە گوێی مستەفا کەمال پاشاش دەگاتەوە. جا ئەودەم وەرەو سەیری حاڵو باڵی زولفۆی بکەو وەرە بروانە قەڵافەتی عارف صائم بەگ قارەمانی نیشتمانی! پەت لەمل داو تابلۆ بەسنگی دوو هاورێی لەمێژینەی پاشاوە, عارف صائم بەگ و زولفۆ...

زولفۆ چەند جار ویستی قسەیەك لەزمانی مورتەزاغا دەرکێشێ, بەڵام ئەو هەروا بزانە هیچی نەبیستوە, قسەکەی دەبردەوە لایەکی دیکە. ئەو دەیزانی رۆژێك لە رۆژان زولفۆ راست و رەوان ئەم باسەی لەگەڵ دەکاتەوەو هەر لەئێستاوە لەوە دەترسا.

مورتەزاغا هەر کە چاوی بەجەبار کەوت, دڵی ئاوی لێنەخواردەوە. پۆتینێکی پێستەبزن لەپێدا, پانتۆڵێکی رەشی کاڵ بووەوە لەبەرداو کڵاوگەرگەرییەکی لێوشکاو بەسەرەوە, بە روخسارێکی سیس و شەرماوییەوە, بەچەشنێك کە لەشەرمان چاوی لەچاوی کەس نەدەکرد.

بەیانی زۆر زوو بوو کە جەبار چووە باڵەخانەکەی مورتەزاغا. لەدڵی خۆیدا گوتی ناکرێ لەسەر رواڵەتی هیچ کەس داوەری بکەین, کاڵەك بەرەنگی نیە, هەر کراسە مەردی خۆی تێدایە. بە رووخۆشییەوە وەری گرت و فەرمانی دا بەرچایی بۆ بێنن. جەبار لەسەر قاوڵتی گێژو سەرسوڕماو بوو.

لەکاتی چاخواردنەوەو لە وەختی هەڵگرتنی پەنیرو زەیتوون دا جارێکیش سەری هەڵنەبڕی تەماشای بکا. دەستی دەلەرزین. هەر دەستیشی لە رۆنەکەرەو هەنگوینی سەر سفرەی قاوڵتی نەدا.

"بەڵێ جەبارەفەندی, وادیارە ئەتۆ رەفیقی حەمەدۆکی؟"

جەبار نارەحەت بوو, بەخۆدا شکایەوە, ویستی قسەیەك بکا بەڵام بێدەنگ بوو.

"وەك دەڵێن ئەتۆ لەچیا لەگەڵ حەمەدۆك بووی, پێکەوە دەستتان بەچەتەیی کردوە"

"پێشتر ئەمن لەگەڵ دەستەی دۆردووە شێت بووم. وەختێك دۆردووە شێت کەریم ئۆغڵیی دارکاری کرد... کەلوپەلی نێو ماڵەکەی برد, ئەمن و نایب رەجەب لێی جیا بووینەوەو رۆیشتین و رەگەڵ حەمەدۆك کەوتین. هەتا کاتێك کە نایب رەجەب لە ئاکچاساز مرد, لەگەڵ حەمەدۆك بووین"

"هەر دوو کەس بوون؟"

"دوو کەس..."

"ئەتۆ بۆچی ببوویە چەتە؟"

"ئەو کابرایە زۆری لەدایکم دا... کە دایکم مرد... هەر بۆیە..."

"ئەی پاشان؟"

"پاشان کە لێ‌بووردن دەرچوو, وازم هێناو هاتمەوە. حەمەدۆك لەچیا مایەوە, لەوێ مایەوەو دوایە عەبدی‌خانی کوشت, پاشانیش ون بوو و ناوی لە کوولەکەی تەڕیش دا نەما. لەنەکاو گوتیان عەلی سەفای کوشتوە. پاش ئەوەی لێی جیا بوومەوە نەم دیوەتەوە"

"ئێستا حەمەدۆك لە چیایە, دوێنێش هێرشی کردوەتە سەر شارۆچکە. دەیەویست عەلی‌یەشەلی بکوژێ, مەلادۆران ئەفەندی بە تکاو پاڕانەوە لێی ئەستاندوەتەوە. ئەتۆ هیچ دەزانی حەمەدۆك چ دوژمنایەتی‌یەکی لەگەڵ عەلی‌یەشەل هەیە؟"

"دەزانم, حەمەدۆك بۆخۆی پێمی گوت"

"مەسەلە چ بوو؟"

"وەختێك حەمەدۆك خەجیجی هەڵگرتوە, عەلی‌یەشەل دوای شوێنەکەی کەوتوەو دەگیری خستوە, حەمەدۆکیش لەسەر ئەوە چووەو یاغی بووە. دایەحۆری‌یەك هەیە ها... بە حەمەدۆك دەڵێ: ئیللان و بیللان دەبێ عەلی‌یەشەلی بکوژی. ئەویش قەت ناتوانێ دڵی دایەحۆری بشکێنێ..."

"حەمەدۆك چۆن پیاوێکە, زۆر ئازاو بەغیرەتە؟"

"ئازاو بەغیرەتیش بوو بەقسە, ئەو بکەوێتە نێو ئاگر خۆی دەردێنێتەوە, هەر ئەوەندە بەسە ئەو نوورەی لە چاوەکانی دایە جارێك ببریسکێتەوە"

"چ بریسکانەوەیەك؟"

"ئەمەیان ئیدی نازانم. وەختێك رقی هەستێ و بیەوێ کارێك بکا, لە چاوەکانی‌دا نوورێك بە ئەندازەی نووکە دەرزی‌یەك دەبریسکێتەوە. وەختێك ئەو نوورە دەدرەوشێتەوە ئیدی کەس ناتوانێ پێشی بگرێ"

"زۆر زرینگ و ئاقڵە؟"

"زۆر ئاقڵە, بەڵام وەك منداڵێکیش باش و میهرەبانە. نەختێکیش زرینگە, ئەو تەنانەت مێروولەیەکیش ئازار نادا, متمانەش بە هەموو کەس دەکا, گوتم وەك منداڵێك وایە"

"ئەتۆ زۆرت خۆش دەوێ؟"

"پیاو رەفیقی خۆی خۆش ناوێ؟"

مورتەزاغا چاوی بڕیە چاوی جەبار. جەبار چاوی لێ وەرنەگێڕا. چەند لەحزەیەك ئاوا لە چاوی یەکترەوە ڕامان.

"ئەتۆم بۆیە بانگ کردوەتە ئێرە کە ئەتۆ... ئەتۆ... ـ جەباری هەڵدەسەنگاند ـ ئەتۆ دەبێ حەمەدۆکی بکوژی"

جەبار وەك چاوەڕوانی ئەم پێشنیارە بێ, ڕەنگی تێك نەچوو, قسەیەکیشی نەکرد.

"حکوومەت زۆر بە حەمەدۆك قەڵسە, عیسمەت پاشا لە ئەنکەرەو گەورە گەورەکانی دیکە زیکرو فکریان ئەوەیە کە حەمەدۆك لەبەین بچێ. ئێمەیان لێرە زۆر خستوەتە تەنگانەوە, وەختێك ئێمەش لە پیاوێکی ئازاو نەترس دەگەڕاین کە حەمەدۆکی بکوژێ, زولفۆیەگ تۆی نیشان دا. ئەمنیش گوتم: باشە, با شانازیی کوشتنی حەمەدۆك بەنسیب باشترین دۆستی خۆی بێ. گوتم رەوای هەق نیە پیاوێکی ئازاو جوامێرو باش و رەفیق دۆستی وەك حەمەدۆك کە دڵێکی وەك دڵی حەزرەتی عەلیی هەیە, بەدەستی پیاوێکی بێناوونیشان بکوژرێ.

پیاو دڵی بەوە ڕازی نابێ پیاوێکی خراپ کەسێکی وەك حەمەدۆکی بکوژێ. حەمەدۆك درەنگ یان زوو هەر جۆرێك بێ دەکوژرێ. ئەتۆ تا ئێستا دیوتە یاغیەیەك, یاغیەیەکی وەك حەمەدۆك بە گوللە نەکوژرێ؟"

جەبار گوتی:

"سەرم لێ دەرناچێ, ئەو, قەرار بوو پاش کوشتنی عەبدیخان ئیدی چەتەیی نەکا. وەختێك بیستم عەلی سەفای کوشتوە باوەڕم نەکرد"

"هەموو کەس دەزانێ ئەو عەلی سەفای کوشتوە"

"باوەڕم نەکرد, ئەو بە عەبدیخانەوە ماندوو بوو, قەرار وابوو پاش کوشتنی وی ڕابکاو بڕوا. ئەمن پێم وابوو کەسێکی دیکە, یەکێك کە دوژمنایەتیی لەگەڵ عەلی سەفا هەبووە, کابرایەکی دێهاتی ئەوی کوشتوەو بەسەر حەمەدۆکیان دا هێناوە. ئەمن وای بۆ دەچووم"

"عەلیەشەلێك هەیە ها, ئێستا لەلای مەلادۆران ئەفەندیەو پێشتریش لەلای من بوو..."

"بیستوومه"

"ئەتۆ ئەویش دەناسی؟"

"دەیناسم"

"ئەو عەلی‌یەشەلە وەختێك حەمەدۆك عەلی سەفای كوشتبوو, بەچاوی خۆی چاوی لێبووبوو"

بۆ یەكەم جار لە روخساری جەباردا گۆڕانێك بەدی هات, سەرسوڕمانێكی ئاشكراو جۆرێك كە پیاو تێی بگا.

ئەم حاڵەتە لەبەرچاوی مورتەزاغا ون نەبوو.

"ئێستا حەمەدۆك لەكێوپارەیە. گومان لەوەدا نیەو خەریكی چەتەییشە. پیاوان دەكوژێ و خەڵكی رووت دەكا"

جەبار بە باوەڕێكی پتەوەوە گوتی:

"ئەو هەرگیز سەربەندەنان ناگرێ و خەڵكی رووت ناكا"

"لەپێش دا باسی ئەوە دەكرا كە عەلی‌یەشەل یان رۆستەمە كوردە یان یەكی دیكە بنێرین حەمەدۆكی بكوژێ, زولفۆیەگ ناوی تۆی برد. ئەمنیش گوتم لێوەشاوەترین پیاو بۆ كوشتنی حەمەدۆك خۆیەتی. بڕوانە, ئەمن پیاوێكی شەڕكەرم. راستەوڕاست, قسە دەكەم, ئاشكراو پاك كردە. باش گوێت بكەوەو گوێ لە قسەكانم بگرە. لەگەڵ زولفۆو ئاغاكانی دیكە قەرارو مەدارم داناوە, هەر كە حەمەدۆكت كوشت كێڵگەیەكی سێسەد هێكتاریت لە هەركوێ پێت باش بێ دەدەینێ. خانوویەكیشت بۆ دروست دەكەین. لەنێو خۆمان دا دراوێك كۆ دەكەینەوەو دەت دەینێ. پارەكەت لەلای مەلادۆران ئەفەندی دادەنێین. كە حەمەدۆكت كوشت دێیەوەو دەچی پووڵەكەت وەردەگری. دنیایە, ئەوە خوایە ئەگەر ئەتۆ نەت توانی حەمەدۆكی بكوژی و ئەو تۆی كوشت, هەموو پارەو كێڵگەو مێڵگەكەو هەموو ئەو شتانەی بەڵێنم داوە بە ژن و منداڵەكەت دەگەن. ئەگەر ئەتۆ داواكەمان قبووڵ نەكەی لەسەر ئەو خەراپەیە كە دەرهەقی ئێمەو حەمەدۆكی دەكەی نایەڵێن لە چوكووراوا دانیشی. لە پێش دا زولفۆ لە كێڵگەكەیت دەردەكا, پاشانیش لەم دنیایەدا لە هیچ كوێ جێت نابێتەوە. چونكە دەستی ئێمەو دەستی حكوومەت هێند درێژە دەگاتە عەرش. بچیە هەر كوێیەك دەت بینینەوە. رەنگە بڵێی ناتوانن هیچم لێبكەن... دەبێ بڵێم كە دەتوانین, كوشتنی كابرایەك بەسەر تۆدا دێنین. یان ئەوەتا دەچیە كێوان و رەگەڵ حەمەدۆك دەكەوی, كە ئەودەمیش یان بە گوللەیەك دوایێت دێ یان

دەکەویە بەندیخانەو دیدار ناخرەتی منداڵەکانت دەبی و دەمری. لەوانەشە لە مەیدانی شارۆچکە لەدارت دەن"

وەختێك مورتەزاغا لەقسەکەی بووەوە جەبار وەك مردووان رەنگی زەرد هەڵگەڕاو کەوتە بەر دەست و پێیانی:

"ئەمەم لەگەڵ مەکە ئاغا, ئەو کارەی مەکە, رەحم پێ بکە, بە حەمەدۆکیم بەکوشت مەدە"

"ئەو بەچی ڕا دەزانێ کە ئەتۆ بۆچی چوویە لای. بلێ وەختێك بیستم ئەتۆ چوویەوە چیا ئەمنیش یاغی بوومەوە. ئەویش باوەڕ دەکا"

"ئەو من دەناسێ, ئەو باوەڕ ناکا. ئەو دەزانێ کە ئەمن ئیدی هەرگیز چەتەیی ناکەم. ئەویش دەزانێ کە بۆ کوشتنی چووم. ئەمەم لەگەڵ مەکە, منداڵم وردن, بەزەییت پێم دا بێ"

"تەواوە! قسەیەکی دیکەم نیە. حەمەدۆکم لەتۆ دەوێ. هەم خەڵکی شارۆچکەو هەم حکومەت ئەم شانازییەیان بە شیاوی تۆ زانی... بێدەنگ بە. تفەنگی خۆت هەڵگرەو روو لە چیا بکە... هیچ کەس نابێ بزانێ کە ئەتۆ هاتوویە ئێرەو پێکەوە قسەمان کردوە, ئۆغرت خێرو غەزات پیرۆز"

هەرچی جەبار هاواری کرد, هەرچەندی پاڕایەوەو لالایەوەو تکاو ڕەجای کرد, مورتەزاغا نە کەم نە زۆر قسەی نەکرد. ببوو بە پەیکەرێکی بەردین.

سەرەنجام جەبار گوتی:

"دە رۆژم لێ راوەستن, فکری لێ دەکەمەوەو چارەیەك دەدۆزمەوە"

"هەوڵ مەدە دووبارە بچیەوە چیاو یاغی بی. خوا دەزانێ لەبەین دەچی"

جەبار بەناڕەحەتییەوە پێکەنی و گوتی:

"ئێمە چی و چەتەیی چی"

بەو بەژنە زۆر کەڵەگەتەیەوە هەستایە سەرپێ. هەروا لاتری دەبردن.

"پازدە رۆژت مۆڵەتە بیر بکەوەو رێگاچارەیەك بدۆزەوە"

## (٢٤)

گوندی مەلادۆران لەپشتی ئەو چیا دوورە سەرسەوزانە، لە بەلاوەترین قوژبنی دۆڵێکی تەنگ و قووڵ و پڕ بەردەڵان و لێڕەوار هەڵکەوتبوو. نێوانی ئەو گوندە لەگەڵ نیزیکترین ئاوەدانی ڕۆژەڕێیەك و لەگەڵ نیزیکترین شارۆچکە سێ ڕۆژەڕێ بوو. چۆمێکی باریك کە لەچیا حەستەمەکانەوە دەهاتەخوار ئەو دێیەی لەگەڵ دنیا گرێ دەدا. حەوت مانگی ساڵ پێوەندیی ئەو گوندە لەگەڵ دنیای دەرەوە بەتەواوی دەپچڕا! خەڵکی ئەو دێیە کێڵگەیان نەبوو، لەنێوان شاخ و بەردەکان دا پارچە زەوییەکی چووکیان دەدیتەوەو، بە پاچ دەیان کێڵاو دایان دەچاند. بزنێکی زۆرو کەمێك مەڕیشیان هەبوو. گاوگۆلیان هەر نەبوو. لەو ڕێوبانە سەختەدا لە ئێستر بەولاوە هیچ بارەبەرێك بەکار نەدەهات. وەختێك دۆران لەدایك بوو تەعامی سەر سفرەیان کوولەکەی زۆرو نانی کەم بوو. دۆی ترش و تۆراغی سەگباب خێو لەو خواردەمەنییانە بوون کە ئاواتی بوو بیان بینێ. هەتا تەمەنی دوازدە ساڵی لەڕو لاوازو مردەلۆخە بوو. جووتێك چاوی هەڵمساوو دەم و چاوێکی کزو تاوەسووتی هەبوون. لەبەر لاوازی لاقەکانی تێك دەئالقان.

لە یەکەم شەڕی جیهانیدا دێیەکەیان ڕوخساری خەڵکی غەریبەی دی. بەشێك لەو خەڵکە نۆجوان بوون و تازە خەتی سمێڵیان دابوو، هێندێکیشیان پیاوی وەنێوکەوتوو بوون. ژمارەیەکیان چەکیان پێ بوو، بەشێکیشیان بێچەك بوون. دەستەیەك لەوان ڕووت و ڕەجاڵ بوون و دەستەیەکیش گیرفانیان پڕ لە سکەی زێڕ بوو، جلکی جوانیان لەبەردا بوو، چەکمەی ترووسکەداریان هەبوون و زنجیر سەعاتی زێڕیان وەبەرۆکیان هەڵواسیبوو. بە چەند ساڵێك ژمارەی خەڵکی دێ بوو بەسێ چەندانەو لە شەڕی سەربەخۆییدا بوو بە پێنج تا حەوت هێندە. بەشی زیاتری ئەوانەی پەنایان بۆ دێ هێنابوو کەسانی خوێندەوارو دەرس خوێندوو بوون. دیارە

چەتەو یاغی و قاچاخچییشیان لە نێودا پەیدا دەبوون. رووکاری گوندی "ساری ئاسما" کە خەڵکەکەی هەمیشە تەنیاو دوورەپەرێز لەو دوورە دەژیان, بە هاتنی ئەو سەربازە راکردووانەو یاخی‌یەکان گۆڕا. لە ماوەی چەند مانگێك دا گۆڕانێکی بەرچاو لە وەزعی دێهاتی‌یەکان دا پەیدا بوو. بەشێك لە راکردووەکان تەنانەت لەو گوندە چەپەك و بێدەنگەش دا خانوویان ساز کردو ژنەکانیشیان هێنایە وێو لەوێندەرێ بە دوور لە چاوو پەلاماری دوژمن بە خاترجەمی گوزەرانیان کرد. بابی دۆرانی چووە شەڕو لە ساری قامیش مرد. هێشتا مەرگنامە رەسمی‌یەکەیان نەناردبووەوە کە یەکێك لە دۆستانی کە پێکەوە خزمەتیان دەکرد, هاتە ئاوەدانی‌و خەبەری هێنا کە بابی دۆران لە جەبهە لەبەر چاوی وی گیانی دەرچووە. ئەو سەربازە بۆ خۆشی ئیدی نەگەڕایەوە شوێنی خزمەتی خۆی. دایکی دۆران ژنێکی جوان و بە تواناو دڵگربوو. تەنانەت لە تازیەی مێردەکەشی‌دا نەگریا, ئەو لەمێژ بوو سەربازێکی راکردووی بە ناوی حوسێن کە ببووە پێش نوێژی گوندەکەیان, هێنابووە سەرماڵێ. مەلا حوسێن پیاوێك بوو سوورکارە, چوارشانە بە ریشێکی رەش و تێك ئاڵقاو, جووتە لێوێکی ئەستوورو جووتە چاوێکی گەورەوە. پێش نوێژی‌کەرێك بوو کە پانتۆڵی گالیفەی شینی دەبەر دەکردو چەکمەی چین داری لەپێ‌دا بوون. کیسەباخەڵێکی زێوکاری‌کراوی هەبوو پڕبوو لە سکەی ئاڵتوون. سەعات و زنجیرسەعاتی زێڕی وەخۆی دەخستن. هەمیشەش لەبن لێوانەوە دوعای دەخوێندن. هیچ وەختیش ئەو فیلینتا ئەڵمانی‌یەی لەبن جبەکەی‌دا هەڵی‌دەگرت, لە خۆی دوور نەدەخستەوە. فیشەکدانەکانی کە راست و چەپ لەخۆی دەدان, گوڵدۆزی کرابوون. هەر گوڵێکی سەرفیشەکدانەکانیشی نیشانەو نموونەی تەلیسمێك بوو.

مەلاحوسێن لە ئاوایی‌دا نە لەگەڵ راکردووەکان دەبووە هاودەم و نە لەگەڵ خەڵکی ناوچەکەدا دەدوا. هەمیشە لە ماڵێ بوو. ئەویش ماڵی دایکی مەلادۆران. هەموو شەوێش بێ ئەوەی بخەوێ هەتا بەیانی لە گەڵی رادەبوارد. لەسەرەتادا تەنانەت چاوەڕوانی خەوتنی دۆرانیش نەدەبوون, دۆرانیش جگە لەوە کە هەموو شەوێ گوێی لە سرتەو خەڵوەی ئەو دووانە بێ چارەیەکی نەبوو. زۆریشی پێ‌خۆش بوو, بەڵام نەی‌دەتوانی زۆر خۆی بۆ بێخەوی رابگرێ.

لە سایە سەری مەلاوە دۆران بوو بە برای سێ خوشکان. لەو نێوەدا دۆرانیش هەڵی‌داو خەپەتۆڵە بوو. مەلا ئەوی خۆش دەویست. بریسکەیەکی تەماعکارانە لە چاوە رەش و قووڵەکانی دۆران دا دەدرەوشایەوە, کە مەلاحوسێن بە ئاشکرا هەستی پێ‌دەکرد. لە ماوەیەکی کەم دا دوعاو خوێندنەوەو نووسینی فێر کرد. پێکەوە نوێژیان دەکردو قورئانیان لەبەر دەکرد.

مەلاحوسێن لە زیرەکی و بە توانایی قوتابی‌یەکەی خۆشحاڵ بووو لەو بارەیەوە هەستی بە لەخۆبایی‌بوونێك دەکرد.

ڕۆژێکیان دۆران هەستی کرد مەلاحوسێن خۆی سازدەکا بۆ ئەوەی دایکی و منداڵەکان بەجێ‌بهێڵێ‌و لە ئاوەدانی رابکا. ئاکارو کرداری ویی خستە ژێر چاوەدێری، شەوێکیان کە دایکی خەوێکی شیرنی لێ‌کەوتبوو، مەلاحوسێن لەجێی هاتەدەر، خۆی پۆشتە کردەوە، فیلینتایەکەی هەڵگرت و کیسەیەکی لەسەر سەرینەکەی خۆی داناو لە ماڵێ وەدەرکەوت. دۆران کە لەمێژ بوو چاوەڕوانی ئەم لەحزەیە بوو، خۆی پۆشتە کردەوەو ئەویش بە دوایدا دەرپەڕیە دەرێ‌و دووربەدوور وەدوای کەوت. بەهاربوو، شنەبایەکی خۆشی دەهات. رووبارێکی مانگەشەو بەسەر ئەو لێرەوارەدا کە هەڵڵاو هەنگامەی لێ‌هەڵدەستا، هەڵدەڕژایە خوار. لە ئاوەدانی وەدەرکەوتن، چەند سەگ بە دیتنی مەلا دەستیان کرد بە وەڕین. ئەو گوێی نەدانێ. لە هەورازە سەخت و بەردەڵانەکەی تەنیشت هەڵدێرەکە وەسەرکەوتن و بەودیودا شۆڕبوونەوە. لای تاوهەڵاتێ گەیشتنە بنی هەڵدێرێك کە چەند کیلۆمیتر قووڵ بوو و دەت گوت چاڵە. لە رێگادا مەلا چەند جارێك وەشك کەوت و هەستی کرد یەکێك بە دوایدا دێ، راوەستاو تەماشای دەوروبەری کردو حەسایەوەو چونکە کەسی چاو پێ‌نەکەوت وەڕێ‌کەوتەوە. وەختێك بە دۆڵێکی قووڵدا وەسەر دەکەوتن نوێژی نیوەڕۆ بوو. مەلا دەزنوێژی هەڵگرت و نوێژی‌کردو ئەمجار دانیشت نانی خوارد. دۆران خەریك بوو لەبرسان بمرێ، هەروا قوورەی زگی بوو. وەختێك مەلا نانی دەخوارد ئەو لیکاوی بە دەم و لێوان دا دەهاتە خوار.

مەلا کە پاش نان خواردن سووکە ئیسراحەتێکی کردبوو، بە گومانەوە روانیە چەپ و راستی خۆی، وەك ئەوە دەچوو چاوەکانی بۆ کەسێك بگەرێن، بێ‌گومان بۆنی هێندێ شتی کردبوو. دۆران ئەوەندە بە پارێزو بەدزی بە دوایدا دەڕۆیشت کە کابرا سەرباری ئەو هەموو بەدگومانی‌یەش کە بۆی پەیدا ببوو، بە هیچ جۆر نەی‌دەتوانی بی‌بینێ.

هەتا ئەو کاتە کە مەلا بۆ شێوخواردن راوەستا وەزعی دۆران زۆر نەگۆڕابوو، تەنیا لاقی شل ببوون و سەری دەگێژەوە دەچوو. بەڵام دیسانیش دەی‌توانی بەدوای مەلایدا بڕوا.

مەلا لە گۆڕایی هاوینەهەوارێك دا لەسەر کانی‌یەك کە لەبن تاقەدارێك هەڵدەقوڵی راوەستا، توێشەبەرەکەی نەختێك ئەم دیوئەودیو کرد، ئەمجار پاش ئەوەی بەچاوە شەهێنی‌یەکانی تەماشای دەوروبەری خۆی کرد نوێژی دابەست. دۆران ئیدی خۆی پێ‌ڕانەگیرا.

وەك پشیلە بە خشكە خشك, ئارام و بێدەنگ هاتە بن دارەکەو دەستی بۆ هەمبانەی توێشووەکە برد. راست لەو دەمەدا پەنجەی زبری مەلاحوسێن لە جومگەی دەستی گیر بوو.

"هەی سەگە بەرەڵلا دەم زانی, دەم زانی ئەتۆ وەدوام کەوتووی"

پاشان لە کاتێك دا زەردەی دەهاتێ لەسەر قسەکەی رۆیشت:

"برسیتە, بەرەڵلای بێعار؟ راوەستە لە نوێژەکەم ببمەوە پاشان قسەت لەگەڵ دەکەم راوەستە" دووبارە نوێژی دابەستەوە. پاش تەواوبوونی نوێژەکەی دەستی کرد بە دوعا خوێندن:

"وەرە ئێرە بزانم مەلادۆران ئاغا, وەرە با زگمان تێرکەین دوایە..."

هەمبانە پڕبوو لە پەنیر, پیواز, هێلکەکوڵیو, پەتاتەو نان. مەعلووم نەبوو مەلاحوسێن ئەو هەموو ئازووخەو توێشووەی کەنگێ‌و چۆن سازکردوە بێ ئەوەی کەس پێ‌بزانێ, لە کوێی ئامادە کردبوو؟ دۆران بە راستی سەری سوڕمابوو.

"کوڕم دۆران, ئیدی لەوە زیاتر ئەمن نەم دەتوانی لەم دێیە بێنمەوە. دایکیشت ژنێکی جوان و جوورە, زۆریش جوانە. ئەمنیش زێڕم بۆ بەجێ هێشتوە, حەوتوویەك نابا لەگەڵ لاوێکی بە دڵی خۆی زەماوەند دەکا. لە مێژبوو منی لەبیر چووبووەوە. بەڵام ئێستا وا بیر دەکاتەوە کە ئەمن تۆم رفاندوەو لەگەڵم دەبێتە دوژمن. ئەو بەبێ تۆ ناتوانێ بێنێ. ئەو کچانەی لە منی بوون بە منداڵی خۆیان نازانێ. ئەتۆ دەبێ بگەڕێیەوە بۆ ماڵێ"

دۆران زۆر بە ماندوویی و شەکەتی, بەڵام بە توندی گوتی:

"ناگەڕێمەوە"

"زۆر باشە, دەتەوێ بچیە کوێ؟"

"ئەتۆ بچیە هەر کوێیەك دێمە وێ"

تەردەست خواردنەکەیان تەواو کرد. مەلاحوسێن دەستی لە کانێیەکە شوتنەوەو هاتەوە. دۆران خەریك بوو هەمبانە توێشووەکەی هەڵدەگرتەوە.

"ئەتۆ نابێ لەگەڵ من بێی"

"دێم"

"بۆم دەبی بە ژانەسەر"

"بۆچی دەبمە ژانەسەر؟..."

"بڕوانە دۆران, بۆ خۆشت دەزانی زۆرم خۆش دەوێی, ئەتۆم لە کچەکانم و لە دایکیشت زیاتر خۆش دەوێ, بەڵام هەر ئێستا نەگەڕێیەوە دەت کوژم"

چەخماخی فیلینتایەکەی راکێشاو فیشەکی وەبەردا. قۆنداغی لە شانی قایم کردو سێرەی لە دۆران گرت:

"ئەگەر ئێستا نەگەڕێیەوە پێتەوە دەنێم"

"ناگەڕێمەوە"

"ئەتۆش دەڕۆی و منیش دەڕۆم. کێ ئاگای لەو سێ کچۆڵەیە دەبێ؟"

"ئەوان بۆ خۆیان ئاگایان لە خۆیان دەبێ. سێ رۆژی پێ ناچێ دایکم مێردی دەکاتەوە"

"هەتیوە بێکارەیە دەڵێم وەگەڕێ, ئەگینا هەر ئێستا دەستی لێدەکێشم"

دۆران لەسەرەخۆ گوتی:

"دەستی لێبکێشە"

مەلاحوسێن لە کاتێك دا ددانی لە چیڕەوە دەبردن گوتی:

"دەت کوژم"

"بم کوژە"

"کەوایە بگرە لە دەستم"

گوللەیەکی لەبن لاقی دۆران لە عەرزیدا. منداڵەکە نەختێك رەنگی بزڕکا بەڵام لە جێی خۆی نەبزووت. مەلاحوسێن گوللەیەکی دیکەو بە دوای ویش دا گوللەیەکی دیکەی تەقاند, کەچی کوڕە مێشێکیشی میوان نەبوو, تەنانەت چاویشی نەدەترووکاند. مەلا دەیزانی ئەو منداڵە لەوەش نەترسترەو هەر لە فکری ئەوەدا بوو کە رێگایەك بۆ گەڕانەوەی بدۆزێتەوە. وەختێك دیتی تفەنگ پێوەنان سوودی نیە, کەوتە فکری فریودانی, لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەو کەسەی مردن بە هیچ بزانێ بە چەند قسەی خۆش هەڵدەفریوێ. دەستی کرد بە پاڕانەوەو زۆری بەبەر هەڵخوێند, کوڕیژگە باکیشی نەبوو. وەك داری وشکەڵ لە جێی خۆی چەقیبوو. قەولی پارەی پێدا, دیسان سوودی نەبوو.

"ئەمن لە تۆ کەللەشەق ترم. دڵم نەهات بت کوژم بەڵام زۆریش دڵنیا مەبە, باش چاوو گوێت بکەوە. ئەتۆ ناتوانی زۆر لەگەڵ من بی. ئەمەی باش بزانەو بۆخۆت لە فکری چارەسەردا بە"

مەلاحوسێن لە پێشەوەو دۆران بە دوایدا وەڕێ کەوتن. هەتا چوکووراوا تەنیا وەختی نان خواردن لە کن یەکتر دانیشتن, بەڵام یەك قسەیان لەگەڵ یەکتر نەکرد. مەلاحوسێنی بە خۆوەو بە تاقەت لە پێشەوەو دۆرانێکی شەکەت و ماندوو کە سەری خۆی نەدەتوانی و لاقەکانی

بلۆقیان کردبوون و بە زۆر خۆی بە دوادا بە کێش دەکرد بە دوایدا لە کەناری مێدیترانە گەیشتنە دێیەك کە خانووەکانی سپیکار بوون و پڕ لەدارە پرتەقاڵ بوو. لێرە هەمووان مەلایان دەناسی. ژنەکەی و منداڵەکانی لە کاتێك دا لە خۆشییان وەك شێتانیان لێهاتبوو، بە گریانەوە پێشوازییان لێکرد. لە نێو ئاوایی هیچ کەس باوەڕی بەوە کە بە چاو دەیدی، نەدەکرد. سێ ساڵ لەمەوبەر لە ساری قامیشەوە مەرگنامەی مەلایان ناردبووەوە. مەلا وەك هەر هیچ رووی نەدابێ چووەوە ماڵەکەی و تێکەڵ بە ژن و منداڵەکەی بوو. جێوبانێکیشیان دا بە دۆران و کەسیش لێی نەپرسی کێیە، لە کوێ ڕا هاتوەو دەیەوێ بچێتە کوێ؟

حەوتوویەك دوای گەیشتنەوەیان بوو کە مەلاحوسێن دەرگای دوکانێکی کردەوە. شتومەکی دوکانەکە بریتی بوو لە کڵاوگەرگەڕیی تۆز لەسەر نیشتوو، کارتۆنە بەتاڵ، هێندێك تەلیس کە هەمووان بۆسابوونیان لێدەهات چەند سندووقی گەورە گەورە... قۆڵیان لێهەڵماڵیو بەیانییەك تا ئێوارێ دوکانەکەیان شوت و گەسکیان لێداو سڕیانەوەو سڕیانەوە. دوکان وەك ئاوێنە دەبریسکایەوە. بەڵام دیسانیش یەك قسەیان پێکەوە نەکرد. نەك هەر قسەکردن، مەلاحوسێن تەنانەت جارێکیش سەری هەڵنەبڕی و تەماشای روخساری دۆرانی نەکرد.

رۆژی دووهەم بەسواری عارەبانەیەك کە دوو ئەسپی رەش کوێت رایان دەکێشا چوونە شارۆچکە. ئەسپەکان دەت گوت دووانەن، بەموو فەرقیان نەبوو، هەر کامێکیشیان چەند زەنگوڵەی چووکەڵەی بە زەنگیانەی شینەوە دەمل کرابوون، زین و تەنگەو هەوساریان بریسکەی دەدا، عارەبانەکەش نوێ نوێو سەوز بوو. نەخش و نیگاری پێوە بوو و هێشتا بۆنی رەنگەکەی لێدەهات. زۆریان شتوومەك کڕی. وەختێك دوکانیان کردەوە دێهاتییەکان شاڵاویان بۆ هێنا. چەند جاری دیکەش چوونەوە شارۆچکە.

دێهاتییەکان لە شت کڕین تێر نەدەبوون. لەماوەی شەڕدا گوندەکانی دیکە چەند هەژار ببوون ئەم دێیە ئەوەندە دەوڵەمەند ببوو. خەڵکی ئاوایی لەلایەك بە قاچاخی، مەڕو گاوگۆلیان دەبردە سووریەو لەلای دیکەش ئەو بەلەمانەیان کە لە ئەسکەندەروونەوە دەهاتن، پڕ دەکرد لە پرتەقاڵ و لۆکە ـ هەرچی چاندبوویان هەڵیان گرتبوو ـ و بەو بازرگانانەیان دەفرۆشت کە بەو بەلەمانە هاتبوون. زۆربەی دێهاتییەکان لە کۆچەرییەکانی گرید بوون.

مەلادۆران راست سێ ساڵان لەلای مەلاحوسێن مایەوە. لەماوەی ئەو سێ ساڵەدا یەك قسەشیان پێکەوە نەکرد. لەو سێ ساڵەدا تاقە جارێکیش چاویان لەچاوی یەکتر نەکرد. هەردووکیان بەڵای رۆژگار بوون. هەدووکیان بەدفەڕو ناجسن بوون...

دانیشتبوون و کەبابیان بە سماقەوە دەخوارد, مەلادۆران بەشێوەیەکی دۆستانە چاوی لەمەلاحوسێن کردو بۆ یەکەم جار پاش سێ ساڵ گوتی:

"مامۆستا دەمەوێ بڕۆم. ئەوەی دەرهەقی منت کرد لە سەریشم زیاد بوو, هەر خۆش بی. هەتا دەمرم چاکەی تۆم لەبیر ناچێتەوە. گەردنم ئازا کە"

"گەردنت خۆش و ئازا بێ دۆران. ئەمن کارێکم نەکردوە, ئەتۆش هەربژی و خۆش بی... دەم زانی نیازی رۆیشتنت هەیە"

دەستی دەگیرفانی ڕاکردو لەحالێك دا کیسەباخەڵێکی گەورەی دەردێنا گوتی: تەنانەت ئەو پارەیەش کە لەو سێ ساڵەدا لە دوکانێ پەیدات کردوە بۆم حازر کردووی. پارەی خۆت هەڵگرە. بەستە ئەسکیناسێکی گەورەی لە کیسەکە دەرهێناو لە حالێك دا بە خۆشحالیەوە پێدەکەنی بۆ دۆرانی ڕاداشت: بگرە.

دۆران پوولەکەی وەرگرت. زارکی ئەو توورەکەیەی کە دەستۆی خۆی کردبوو, کردەوەو ئەسکیناسەکەی بەجوانی تێدا تاقەت کردو پاشان هەستایە سەرپێ و گوتی:

"خواحافیز مامۆستا حوسێن" و رۆیشت.

مەلا بەمیهرەبانی‌یەوە لە پشتەوەڕا تەماشای کرد. لەدڵی خۆی‌دا گوتی: ئەم کوڕە زۆر بەزیپکە. دەبێتە پیاوێك لەو چوکووراوایەدا هەموو خەڵك بەسەرسوڕمانەوە تەماشای بکەن.

مەلادۆران بێ‌ئەوەی کات بەفیڕۆ بداو دەرفەت لەکیس خۆی بدا, دەسبەجێ چووە بازاڕو گوێدرێژێکی قبرسیی زۆر چاکی کڕی کە دەت گوت ئەسپە. دەزگایەکی شووشەبەندی وردەواڵە فرۆشانیشی کڕی و پڕی کرد لە زەنگیانەو خرت و پرتی ژنانەو هەر ئەو رۆژە وەڕێ کەوت بۆ دێهات.

چووبایە هەر دێ‌یەك وێڕای فرۆشتنی مت‌وموورروو ئەگەر بۆی هەڵکەوتایە پێش نوێژییشی دەکردو نوێژی بۆ خەڵك دەکرد. چووبایە هەر جێ‌یەك تەنانەت لەسەر چیاش سەری چووبا نوێژی نەدەچوو.

شەش مانگ دواتر گوێدرێژەکەی فرۆشت و لەجیاتیان ئەسپێکی کڕی و دەستی کرد بە فرۆشتنی شتومەکی قاچاخ, بەوەش رازی نەبوو چوار پێنج کەسی لەدەوری خۆی هالاندن و لە حەڵەبەوە ماڵی قاچاخی هێنا. بەم ماڵە قاچاخە لە "ئەنتەپ" و "کلین" دوکانی داناو بەوەندەشەوە نەیستاو بوو بە سەرۆکی رایەڵکەیەکی گەورەی قاچاخچی‌یان.

بەو توانایە کە هەیبوو هەموو کاروبارێکی بەباشی ڕاپەڕاندو سامانێکی زۆری وەسەریەك نا. بەڵام ئەو دەیزانی قاچاخچیەتی سەرەنجامێکی باشی نیە, ڕایەڵکەکە, دوکانەکان و هەموو شتێکی بە ناتەواوی بەجی هێشت و بەچەند سندووق ئاڵتوونەوە هاتە شارۆچکە. هەر لە منداڵییەوە زۆری حەز لە زەوییەکانی پشتەوەی شارۆچکە بوو. هەر لەوێ باغێکی "٣٠ دۆنمی"ی بە سێ لیرەی زێڕ کڕی. لەماوەی ساڵێك دا زۆر سەیر لەنێو شارۆچکەدا ناوبانگی دەرکرد: بەحەوت ساڵی هەموو قورئانی لەبەر کردوە, والیی ئەدەنە بەو باسەی زانیوەتەوەو بۆ خوێندن ناردوویەتە "جامع الازهر"ی میسر. ئەو لە میسرێ دەبێ بە زانایەك کە زانا ئایینییەکان ڕێیان ناکەوێ ئاوێشی لە دەزنوێژێ بکەن.

لە ئەنکەرە پێشنیاری پێدەکەن ببێتە وەزیرو بەرپرسایەتیی وەزارەتی کاروباری ئایینی وەئەستۆ بگرێ. بەڵام ئەو جۆرە پێشنیارانە ڕەت دەکاتەوەو هیچ پلەو پایەیەك وەرناگرێ...

لەو ڕۆژە بەدواوە کێڵگە بوو بە گەورەترین ئەوینی. لەگەڵ زولفۆ کەوتە تەون و بەست و بە چەند لیرەیەکی زێڕ دەستی کرد بە کڕینی ئەو زەوییانە کە خەزێنەی دەوڵەت خستبوونیە لەسەر زیادکردن "مزایدە"وە. لەماوەی چەند ساڵێك دا ئەوەندەی زەوی لە خەزێنەو لە دێهاتییەکان کڕی کە بۆخۆشی ژمارەی دروستی قەباڵەکانی نەدەزانی. یەکەمین ژنی, کچە ئاغایەك بوو کە بابی مردبوو, ئەویش قەباڵەی هەزاران دۆنم زەویی لەگەڵ خۆی هێنا. باشترین قەباڵەی ملکدارییەکەی قەباڵەی زەوییەکی حەڤدە هەزار میتری بوو کە بە دوو لیرەو نیو لەدەستی دێهاتییەکی دەرهێنابوو. ئەم زەوییە ڕاست لەبناری لێڕەواری توورووس واتە لەو شوێنە کە دەشت دەست پێدەکا هەڵکەوتبوو. داری هێند ئەستووری تێدا بوون کە ئەگەردوو کەسیش دەستیان تێك گرتبایە, دەستیان لەقەدیان نەدەگەیشتەوە. شێوەی سنوور دیاریکردن لەو قەباڵەیەدا سست و ناڕوون بوو و دەکرا هەزار جۆر فێڵ و تەڵەکەی تێدا بکرێ. سنوورێکی ئەم زەوییە لەدەشتێ ڕا دەستی پێدەکردو دەگەیشتە یەکەمین تەپۆلکەکانی چیا. لە ڕۆژئاواوە بۆ ڕۆژهەڵاتیش چەند کیلۆمیتر درێژایی هەبوو. مەلادۆران هەر کە ئەم قەباڵەیەی کڕی, وای کرد دادگا بانگی بکا. دادگاکەی چەندین ساڵی کێشا, بەڵام سەرەنجام بردیەوە. ئەمجار کارێکی کرد کە دۆسیەکەیان ناردە دادگای بەرزی تەمیز, بەوێش ڕازی نەبوو هەتا ئەنجومەنی بەرزی داوەری, سنووری قەباڵەکەی بۆ مۆر کرد. بەم جۆرە مەلادۆران بوو بە خاوەنی لێڕەوارێك. لێڕەوارەکەش هەمووی داری سیدر بوو. سیدریش دارێکی بەقیمەتە. ئەو گەمییانەی نیشانەی وڵاتانی دەرەوەیان پێوە بوو, لە بەندەری مێرسین چاوەڕوانی ئەو دارە بەقیمەتە بوون.

مەلادۆران ئەفەندی بەخۆی و هەزار تەور بەدەستەوە چووە نێو ئەو لێڕەوارە گەورەو جوانە. زۆر بەپەلە بوو, چونکە ئەگەر دەوڵەت نەختێك هۆشی هاتبایەوە بەر خۆی, نەیدەهێشت ئەو دارانە لەگەرووی مەلادۆران بچنە خوار. لەماوەی چەند ساڵ دا لەدەوروبەری زەوییەکەی وی تاقە نەمامێك چیە بەپێوە نەما. پێش ئەوەش وا دەوڵەمەند ببوو کە جێی نەبوو پووڵ و پارەکەی تێدا هەڵبگرێ. دەرهێنانی ریشەی لێڕەوارەکە زۆر دژوار بوو. بەڵام سوپاس بۆخوا هەموو دانیشتووانی دەشت و کێوپارە بێکار بوون. خەلکەکە رۆژی بە دە قرۆش هەر بۆ ئەوە کە زگی خۆیانی پێ تێر بکەن کاریان دەکرد. جێی لێڕەوارەکە بووە کێڵگەیەك کەبەشێوەیەکی باوەڕپێنەکراو بەرێژەو بوو, بەجۆرێك کە لە قەراخەکانی مێدیترانە لەدەشتی یوورەگیریش خاکی وا پەیدا نەدەبوو. مەلادۆران ئەفەندی ئاشق و سەوداسەری ئەم خاکە بوو. لەو ماوەیەدا ژمارەی ژنەکانی گەیاندە سێ, بەڵام زۆری روو نەدەدانێ. ئەو جێ لێڕەوارە هەموو عەشق و ئەوینی وی بوو... لە چەند تەراکتۆر کە لە شارۆچکەدا هەبوون سێیان هی خۆی بوون. هێندێك مەکینەی دروێنەو خەرمان کوتیشی کڕیبوون. زۆری حەز لەو جۆرە مەکینانە دەکرد.

ئەو زەوییانە کە کڕیبوونی ئارانی چوار هۆبەی چادرنشینیشیان تێدابوو, یەکەمین دەستەی چادرنشینەکان لەگەڵی بەکێشە هاتن. نەیان دەویست بۆ زەویی باب و باپیرانیان پوولێك بدەن بەکەس. ئەوان خەلکێکی بە زیپك و زاکوون و نەترس بوون.

بەڵام ئەوان هەرکەس بوون, گرنگ نەبوو, چونکە لەماوەیەکی کەم دا بەرامبەر بە مەلادۆران ناچار بە پاشەکشە بوون و وەك بەرخۆڵە ڕام بوون. هەموو کەس دەرەقەتی مەلادۆران نەدەهات. مەلادۆران ئەفەندی پووشانەی لە چادرنشینەکان دەستاند ئەویش تەنیا زێڕ, هیچ پارەیەکی دیکەی نەدەویست. کۆچەرییەکان هەموو ساڵێ کە لە کوێستانێ دەهاتنەوە زۆر بەرێزەوە کیسە مەخمەری پڕ لە زێڕیان دەبردنە خزمەت مەلادۆران.

عەلییەشەل گوتی:

"مەلائەفەندی بەتال ئاغا هاتوە"

"ئەسپەکەیتان بردوەتە تەویلە؟"

"بەڵێ بردوومانە"

"با بفەرمووێ"

مەلائەفەندی هەستاو پێشوازیی لە بەتال ئاغا کرد. مەلا ئەوی خۆش دەویست. ئەو هەمیشە ئاشقی پیاوی خۆڕاگر بوو, بەتایبەتی ئەو پیاوە خۆڕاگرانە کە خۆیان کزو بێدەسەلات

ناکەن. کۆچەریـیەکان نابووت ببوون, لەبرسان زگیان بە مووروەگەی پشتیانەوە نووسابوو. هۆیەکانیش رۆژبەرۆژ لەنێو دەچوون. هەر رۆژەی دەستەیەك لە هۆیەی جیا دەبوونەوەو دەچوون جێیەکیان دەدۆزیەوەو چادریان لـێهەڵدەدا. بەڵام بەتال ئاغا هەروا داموودەزگای جارانی راگرتبوو. چادرەکانی جاران هەروەك پێشوو بەشکۆوە هەڵدرابوون و بەتال ئاغاش شەهێن بەدەست دەگەڕا. تەنانەت بۆ ماڵێ ویش بەشەهێنەوە چووبوو.

بەتال ئاغا بەسمێڵی بادراو, کڵاوگەرگەڕیی لێو پانی حەلەب, پانتۆڵی فاسوونیای سەرگێرفان گوڵدۆزیکراوو کراسی ئاوریشمیـیەوە پیاوێکی رێك و پێك بوو.

قاوەیان هێنا, بەتال ئاغا هەر کە یەکەم قومی لە قاوەکەی خواردەوە کیسە مەخمەرێکی سووری لەگیرفانی دەرێناو بەسپایی لەسەر نیوتەختەکەی نێوان خۆی و مەلادۆرانی داناو گوتی:

"ئەمساڵ هەر ئەوەندەمان لەدەست هات"

مەلادۆران ئەفەندی بە پێکەنینەوە گوتی:

"هەڵیگرەوەو لەجێی خۆی هاوێوە"

"بەڵام... چۆن دەکرێ... ئەمە کرێی زۆزانەکە..."

"هەڵیگرەوەو لە گیرفانتی خەوە"

"هەتا هۆیەکەیم پێ نەڵێی... ئاکا دڵت لێمان ئێشابێ. بنیادەم لەوانەیە خەتا بکا, لێمان ببوورە. ئاخر چ بووە, بەنۆکەرت بم, پێم بڵێ چ بووە؟"

"حەمەدۆك هاتبوو..."

رەنگی بەتال ئاغا وەك زەعفەران زەرد هەڵگەڕا:

"ئاغای خۆم, بەخوا ئێمە ئەومان نەناردوەتە لای تۆ"

"دەزانم ئێوە ئاگاتان لـێ نیە. داخوا چاکەیەك, شتێکتان لەگەڵ کردوە؟"

"بریندار ببوو, لەنیزیك هۆیەکەمان لە ئەسپەکەی کەوتبووە خوار... برینەکانی زۆر قورس بوون. کوڕەکانی ئێمە هێنایانەوەو چاکیان کردەوە"

مەلادۆران لەحاڵێك دا بە میهرەبانیـیەوە دەستی لەسەر شانی وی دادەنا گوتی:

"کاری چاکتان کرد. زۆر کاری چاکتان کرد, ئەمن بەقەدەر عەرزو عاسمان لەئێوە رازیم, دنیاکەمان پێویستیی بەو جۆرە پیاوانە هەیە, لەم دەورو زەمانەیەدا کە دنیا پڕە لە خەراپەو چەپەڵی و دووڕوویی و زوڵموزۆر, ئەو جۆرە پیاوانە کە وەك ئاوی کانی پاکن, پێویستن بۆئەوەی بتوانین هەناسەیەکی رەحەت هەڵکێشین, زۆر کاری چاکتان کرد کە ئەوتان چاك کردەوە. دیارە

ئەویش منی زۆر تووڕە کرد, هاتبووە لام دەیگوت: دەبێ قشلاغەکانی ئەو کۆچەرییانە بدەیەوە بەخۆیان.

مەلادۆران بێئەوەی ئاگای لەخۆی بێ ئەو قسانەی دوایەی بەدەم دا هاتن. ئەمە لەراستیدا دژکردەوەیەکی لەخۆوە بەرامبەر بە قسەکانی حەمەدۆك بوو.

مەلادۆران ئەفەندی هەرگیز شلوێ نەدەبوو, کاتێك تووڕەش دەبوو, بۆنی خۆشی گوڵە نارنجی بەبەر لووتی هەڵلا دەهات و ئارامی دەکردەوە.

"پێم گوت کورە حەمەدۆك, جارێکی دیکەش قسەکەت دووپات بکەوە بزانم, ئەوەچیە بوویە چەتە دەتەوێ ماڵێ کێ بدەی بەکێ؟ وەختێك ئەمن تووڕە بووم ئەویش دایئەنواند, وا دابنێین زەوییەکانی من پێشتر قشلاغی باب و باپیری ئەم کۆچەرییانە بوون, قشلاغی هەزار ساڵەیان بوون, باشە بەمن چی؟ ئەمن جرینگ جرینگ زێرم لەسەر ژماردوون و کڕیومن. چما کۆچەرییەکان ئەقڵیان لەسەریدا نەبوو, بۆچی ئەودەم ئەو فکرانەیان نەکردو نەهاتن قەباڵەی قشلاغەکانی خۆیانم لێبستێننەوە؟ هەتا ئەمن تووڕە دەبووم ئەو دایدەنواند, ئەو دایدەنواندو ئەمن تووڕەتر دەبووم... سەرەنجام رێك کەوتین. قەرارەکەمان وا دانا کە ئەو کاری بەقەباڵەکانی من نەبێ و ئەمنیش هەتا ماوم پووشانە لەئێوە نەستێنم"

"وەڵلا بیللا دەستت بۆ بە قورئانێ دا دەدەم ئێمە خەبەرمان نەبووە کە حەمەدۆك هاتوەتە لای جەنابت, ئەگینا نەمان دەهێشت بێ"

"ئەو کیسەیەی لەگیرفانت هاوێژەوە"

بەتال ئاغا لەحاڵێك دا بە گومانەوە چاوی لەچاوی وی دەکرد کە نەوەك ئەم ماستە بێموو نەبێ, کیسەکەی لەگیرفانی ڕاکردەوە.

"ئەوانەی ئێمە دەناسن دەزانن کە ئێمە بەچنگ و ددان لەگەڵ هەڵۆی ئاسمان و پڵنگی دارستان بەشەڕ هاتووین هەتا بەم جێگایە گەیشتووین. لەخوا بەولاوە کەس ناتوانێ ئێمە لە ڕێی خۆمان لابدا. منداڵی وەك حەمەدۆك بەشی پارووەیەکی مەمانانیش ناکا. پاروو بەجێی خۆی, بەشی ئەوە نابێ بیخەینە کەلێنی ددانیشمانەوە. بەڵام ئێستا بۆچی دەمەوێ لەمەودوا هەتا دەمرم پووشانە لە ئێوە نەستێنم, بڵێ بۆچی؟"

"خوا بکا باوەڕ بکەی کە ئێمە ئەومان نەناردوەتە ئێرە, لە ئێمە عاجز مەبەو خەتامان مەگرە"

"ئێستا پێت دەڵێم بۆچی, چونکە پیاوێکی پیاوی وەك حەمەدۆکتان نەجات داوە, نەجاتتان داوەو گێڕاوتانەتەوە باوەشی ئەم نیشتمانە پیرۆزە. ئەمنیش بۆئەوەی نیشانتان بدەم لەو

بارەیەوە سوپاستان دەکەم... لەمەودوا ئێوەش وەك حەمەدۆك بۆمن نەزەرکردەیەکن, چونکە ئەو قارەمانەتان نەجات داوە هەمیشە جێتان لەسەر تەپڵی سەری منە"

بەتال ئاغا کەوتبووە دەریای دوودڵییەوە. لەدڵی خۆیدا گوتی:

"هەر بەڕاست ئەم پیاوە حەمەدۆکی خۆش دەوێ؟ ئەمجار لەبەر خۆیەوە گوتی: ئەم جۆرە کەسانە لەدنیادا لەخۆیان بەولاوە هیچ کەسیان خۆش ناوێ. ئەم جۆرە جانەوەرانە بەو ئاسانییەش ناترسن"

مەلادۆران ئەفەندی هەروەك ئاگای لە دڵی وی بێ, زەردەخەنەیەکی تاڵ و هەر لەوکاتەدا بە تانووتەوەی هاتێ:

"پیاو هەرچەندی ئازاو بەغیرەتیش بێ هەر دەبێ لەحەمەدۆك بترسێ, چونکە ئەو لەولای مردنەوە دەژی, دەزانی مانای چیە؟"

"بەڵێ دەزانم, بەڵام حەمەدۆك وەك ئەتۆ دەڵێی وانیە"

"راستە هەمیشە وانیە. زۆربەی وەختان بنیادەمێکە وەك هەموو خەڵك هێدی, خۆش ئەخلاق و لەبەردڵان وەك منداڵێکی چووکەڵە... هێندێ وەختانیش..."

بەتال ئاغا گوتی:

"پیاو سامێی لێ دەکا"

مەلادۆران بانگی عەلییەشەلی کرد:

"عەلی وەرە جارێ لێرە دانیشە, باسی حەمەدۆکی دەکەین"

"گوێم لێبوو ئەفەندی, قسەی هەردووکتان راست بوو. ئەمن چاکی دەناسم, لەمنداڵییەوە دەیناسم. وەختێك بڕیار بدا کارێك بکا لەپێش دا بریسکەیەکی پۆڵا دێ و دەخزێتە بنی چاوانی. ئەو وەختەیە کە لەمردن ئەولا دەکەوێ, ئەو کاتەیە کە بنیادەم لێی دەترسێ"

مەلادۆارن ئەفەندی گوتی:

"لەمنیش دەبێ بترسن, ئەمن و ئەو لە ئاسنێك دروست بووین"

عەلی گوتی:

"تێگەیشتم. وەختێك هەردووکتانم پێکەوە دیتن ئەمەم بۆ دەرکەوت. ئەو بریسکەیە لە یەك کات دا هات و چووە نێو چاوی هەردووکتان"

"وەختێك پێم گوت: بستێك لە قشلاغەکەم نادەم بەکەس, ئەگەر پیاوێکی ئازاو بەغیرەت هەیە با بێ و لێم بستێنێ, ئەو تێگەیشت کە کاری کردن نیە. ئەمنیش پووشانەکەم پێ بەخشی. لەلایەك لەبەر

ئەوەی ئێوە نەجاتتان داوە... لەلایەکیش چونکە عەلیی بەمن بەخشی. لەوانەشە عەلی پیاوی خۆی بێ ئەمە مەسەلەیەکی دیکەیە. ئەگەر وەك دەڵێ عەلی دوژمنی بێ, عەلیی کردە خاتری من"

عەلی بەخۆشحاڵی‌یەوە گوتی:

"بەخشیمی"

"نهێنی‌یەکم لەدڵ دایە دەمەوێ بیدرکێنم بەڵام متمانە بەعەلی ناکەم. ئەگەر بزانم ئەو پیاوە پیاوی حەمەدۆکە ئاسوودە دەبم"

"ئەتۆ دەبێ متمانەت پێم هەبێ. حەمەدۆکیش هەروا. ئەمجار دەبێ لێشم بترسن"

"ئەوەی دەزانم, ئەتۆ لە هەمووان بەڵاتری"

"ئەتۆ مانگێ, ساڵێ جارێك ئەولای سنووری مردن دەکەوی, بەڵام ئەمن هەموو رۆژێ لەودیو سنووری مەرگم. ئەمن تەنانەت لەخۆشم دەترسم. بەڵام ئەتۆو حەمەدۆك ناچارن متمانەم پێبکەن"

"ئێستا کەوایە گوێتان لێبێ, چەند رۆژ لەمەوبەر وەلی کوزگوونی رێگر وەڵامی دابوومێ ئەگەر ئەمن حەمەدۆکی بکوژم ئەتۆ عافواتم بۆ وەردەگری کە لەچیای بێمەخوار؟ ئەم بڕیارەی داوەو دەیەوێ ئەو کارە بکا. ئەگەر ئەمن دەست پێش نەخەم پەنا بۆ تاشکەن خەلیل بەگ, زولفۆو موڕتەزاغا دەبا. ئەوانیش ئەوەندە لە حەمەدۆك دەترسن کە هەر پێشنیارێك بکا قبووڵی دەکەن. ئەوە پێتان دەڵێم وەلی کوزگوون بابایەکی کارکوشتەیە, سی, سی‌وپێنج ساڵە چەتەیی دەکا.

هەشت کەسیشی لەگەڵن کە هەموویان دنیادیدەن و چاوی قورینگی هەوا بەتیر دەنگێون. لەوانەشە بچن حەمەدۆکی غافڵگیر بکەن و بیکوژن. لەو حاڵەدا هەم ئەمن تێشکاوم و لەدەست چووم هەم عەلی‌یەشەل. ئەمن مەرگی ویم پێ تەحەممول ناکرێ. گاڵتە ناکەم. ئەم قسەیە لەنێوێ دڵمەوە دێ. دەبێ لەفکری چارەیەك..."

بێدەنگ بوو. گنجی کەوتبوونە نێوچاوانێ. سەری بەردایەوە, تاوێك بیری کردەوە: تەنیا چارە ئەوەیە کە ئەم خەبەرە بگەیەنینە حەمەدۆك و پێی بڵێین وریای خۆت بە, وەلی کوزگوون بەنیازە بت کوژێ, پیاوێکی خەراپە, پەنجا کەسی زیاتر بەدەستی خۆی کوشتوە. ئێستا کێ ئەم خەبەرەی پێ بگەیەنێ. ئەتۆ بەتال ئاغا؟ یان ئەتۆ عەلی شوێن گێرِ؟"

عەلی و بەتال چاویان لێکتر کرد. بەتال ئاغا بەشاکەشاکەوە گوتی:

"ئەمن. ئەمن ئەو خەبەرەی پێدەگەیەنم. خۆش بی مەلادۆران ئەفەندی. ئەتۆش ئەگەر فەرمایشتێکت پێمان هەبوو..."

"استغفرالله..."

بەتال ئاغا هەستا تەماشای دەوروبەری خۆی کرد:

"کاك، عەلی خورجێنەکەم کوا؟"

"لەپشت دەرکەیە, بیهێنم؟"

"ئەگەر زەحمەت نەبێ"

عەلی لەپشت دەرگا خورجێنێکی مافوورەی هەڵگرت و هێنای لە پێشی دانا... بەتال ئاغا کلیلەیەکی لەگیرفانی دەرهێناو قفلی خورجێنەکەی کردەوە... قفلەکە سێجار زەنگی لێدا. دوو دەفری گەورەی دەرهێنان و گوتی:

"ئەمەیان هەنگوینی تێدایە. ئەمەش رۆنەکەرەیە. هەم ئەتۆ, هەم ئەتۆ دەزانن چ رۆنەکەرەیەکە" دەفری سێهەم گەورەتر بوو:

"ئەمەش پەنیری سەوزە, لەگەڵ سەوزی رەنێویان هێناوە. تەنیا عێلاتی ئێمە دەزانن دروستی کەن. ئەگەر دەیخۆی هەتا دە رۆژان بۆنەکەی لەزاری بنیادەم دا دەمێنێ. بنیادەم بۆنێکی خۆشی لێدێ کە پیاوی شێت و سەرمەست دەکا. جگە لەوە بۆ هەموو دەردێکیش دەرمانە. ئەمن ئیزن دەخوازم"

مەلادۆران ئەفەندی هەتا دەرکی دەرێی لەگەڵ چوو. یەکتریان لەئامێز گرت:

"لەبیرت نەچێ خەبەر بە حەمەدۆك بدەی"

"هەر ئەمشەو"

عەلی هەتا دەرەوەی باغی بەرێی کرد.

بەتال ئاغا لەسەر ئەسپەکەوە داهاتەوە سەری و بەسپایی گوتی:

"موسلیمەرەشی دەنێرمە ئێرە بۆلای تۆ. حەمەدۆك لە هەرکوێ بێ دەیبینێتەوە".

مەلادۆران نوێژی خەوتنانی کردبوو, خەریکی دوعاخوێندن بوو کە عەلی کەمێك بەشێواوی لە خوارێ را بانگی کرد:

"هاتن"

"بیان هێنە ئێرە"

سێ شوانی سەریەرگ لەبەر هاتنە ژوورێ. مەلادۆران بەپێوە بوو. وەلی کوزگوون و ئەو یەکتریان لەئامێز گرت:

"مەلادۆران لەم جیهانەدا متمانەم تەنیا بەتۆ هەیە. متمانەی ماڵ و ملك و نامووس و تەنانەت گیانیشمت پێدەکەم... هەرچەند ئەتۆش بنیادەمی و شیری خاوت خواردوە بەڵام لەنێو ئادەمیزاددا تەنیا ئەتۆی کە متمانەم پێت هەیە"

"جارێ دانیشە, ئەم کەپەنکە دانێ... شوانیت پتر لـێدەوەشێتەوە هەتا چەتەیی." پاشان ئاوڕی دایەوە سەر چەتەکانی دیکە:

"ئێوەش کەپەنکەکانتان دانێن"

وەلی کوزگوون و هاوڕێیەکانی هەر کە فەرەنجیەکانیان داکەند چەکە بریسکەدارەکانیان وەدەر کەوتن. سنگیان لەبن فیشەکدانی راست و چەپ دا ون ببوو. بە دووربین و دەمانچەو خەنجەرەکانیانەوە بەتەواوی پڕچەك بوون. وەلی کوزگوون زۆر داڵەگۆشت بوو و رەنگی وەك رەنگی رەش پێستان تاوەسووت و تاریك بوو. لەوەتا مەلادۆران دەیناسی هەر کاتێك لێیان پرسیبا تەمەنت چەندە, دەیگوت سی ساڵ!

ساڵی ١٩١٠ کە فەرمانی لێخۆشبوون دەرچوو, ئەو یەکێك لەو چەتانە بوو کە وەك حەمەدۆك عافواتیان قبووڵ نەکردو دەستیان لە چیاکان بەرنەدا. وەختێك دۆستانی لێیان دەپرسی بۆچی ناتەوێ بێیەوە دەشتێ, پێی دەگوتن: هێشتا کۆڵم تەواو نەبووە, بەچەند قرۆشەوە بێمەوە دەشتێ هەتا لە چوکووراوا ببمە گەپجارێ ئەم و ئەو؟ لەپاش ئەم وەختەش خەڵکی رووت کرد, پیاوی کوشتن و ماڵی تاڵان کردن.

چوار ژنی هێنان و دێیەکی کڕی. دێیەکەی پڕ بوو لە ئەسپ و گاو مانگای رەسەن و مێگەلە مەڕ. زۆر لەدەوڵەمەندانی هەتا ئۆرفە, ماراش, حەڵەب, مەلاتیەو قەیسەریە رووتاندەوە.

"ئیدی پیری هاتوەو بەردەرکی پێگرتووم. ئێستا ئیدی نۆرەی حەسانەوەیە. چما چەند ساڵی دیکە دەژیم دۆران ئەفەندی...؟ کاك دۆران زۆر کەسمان کوشتوە, زۆر وەجاخمان کوێر کردوونەوە. سوپاس بۆخوا زەوی و دێ و هەموو شتێکمان هەیە. ئەتۆ بۆخۆت لەمن باشتر دەزانی کە ئەگەر بمەوێ ئەو سکە زێڕانەی لە سندووقانم دان بژمێرم, شەووڕۆژێکی پێدەچێ, ئاخرو ئاقیبەتی بابایەکی چەتە گوللەیەکی وێڵە. هەتا ئێستا کەس تخوونمان نەدەکەوت, بەڵام ئێستا تێگەیشتوون پیر بووین. کەم کەم سەرمان دەخەنەسەر. سێوپێنج ساڵە سەردەستەم. هەتا مردن نەیەنیە بەرچاوی خۆت ناتوانی کەسێکی دیکە بەدوای مردن دا بنێری, کوشتنیش هەروایە... ئیدی خەریکە پیر دەبم, کە پیریش بووی گیانت لەلا خۆشەویست دەبێ. پیاو کە پیر بوو ئیدی مردن بەلایەوە بێبایەخ نیە. لەبارەی کوشتنیشەوە, ئیدی دڵم نەرم بووە, بەو ئاسانییە خەڵکم پێناکوژرێ. قەسابێك چۆن کەلاکە مەڕ لەتوپەت دەکا, ئەمنیش جاران لە چاولێك نانێك دا ئاوام بنیادەم لەتوپەت دەکرد, بەڵای وام بەسەر زۆر کەس هێناوە. کەسێك لەمردن بترسێ ناهێڵن لەکێوپارەی بژی. ئەگەر ئەمن هەتا زووە نەیەمەوە دەشتێ زۆر ناژیم,

دەم کوژن. بڕوانە ئەم دووانە, ئاوا سەریان بەرداوەتەوەو ڕاوەستاون, ئەگەر ئەوانە پێبزانن دڵۆپێك ترس ڕژاوەتە نێو دڵم هەر ئەوان دەم کوژن"

پیاوەکانی وەلی کوزگوون جووڵەیان لێبڕابوو, توند دەستیان بە تفەنگەکانیان گرتبوو کە لەسەر کۆشی خۆیان دانابوون, چونکە وەلی کوزگوون وای کردبوو.

"ئەمن خۆم باش دەناسم. ترس دایگرتووم. وەختێك یەکێك تفەنگێك داوێ دەستەکانم دەلەرزن. لە چیا تەمام بەژیان نیە, دەبێ بێمە خوارێ و بچمە سەر کێڵگە. بچمە لای ژن و منداڵەکەم. ئیدی ناتوانم لەسەر عەرزی ڕووت بخەوم. پشتم دێتە ژان. کێڵگەکەم وەك قەڵا دروست کردوە, وەختێك هاتمەوە ئەگەر خۆم تێکەڵی کەس نەکەم کەس کاری پێم نابێ. چەندین ساڵ هەرچی کردوومە بۆ ئەوەم کردوە کە ڕۆژێك بێمەوە دەشتێ و پێش ئەوەی بمرم هەر نەبێ چەند ساڵێك بەئاسوودەیی بژیم. حەز دەکەم سواری ئەسپێکی عەرەبی بم و بەبێ دڵەخورپە تەنانەت شەوانەش بۆخۆم بگەڕێم. وەختێك بەدڵم دا بێ کە ئەو ڕۆژە نابینم ترس دام دەگرێ. ڕاستە زۆرم زوڵم کردوە, بەڵام چما هەقم نیە چەند ساڵێك بحەسێمەوە؟"

چاوە دەقووڵ کەوتوەکانی کەدەت گوت چاڵاوێکی تاریکن و وێنەی ئاسمانیان تێکەوتوە, بڕینە چاوی مەلادۆران ئەفەندی, وادیار بوو هیوایەکی پێی هەیە:

"چاری دەردی من تەنیا بەتۆ دەکرێ مەلادۆران ئەفەندی. لەنێو خەڵکی ئەم شارۆچکەیەدا هەر ئەتۆ باری ژیانی من دەزانی, ئەو ڕۆژانە کە لەبەر زەردەگەرمای چوکووراوا لەگەڵ دایکم گوڵەگەنم و گوڵەجۆمان هەڵدەگرتنەوە, لەتینوان دەبرژاین و دڵۆپە ئاوێکمان دەست نەدەکەوت, ئاوی گەرم و پڕ مێشوولە مالاریای مەرەزەجارمان دەخواردەوەو ئەو ڕۆژانە کە ئەمن و دایکم بەدەم نۆبەتێوە هەڵدەلەرزین و دێهاتییەکان لەم مەزراوە دەریان دەکردین بۆ ئەو مەزرا... لەبیرم نەچوونەوە..."

دوو کۆنەبرادەر کە چەندین ساڵ لە حەوتوودا یەك دووجار, یان لە کێوپارە یان لە شارۆچکە چاویان بەیەکتر دەکەوت, پێکەوە دەردی دڵیان کردو لەبارەی ژن ومنداڵیانەوە دوان. وەلی کوزگوون بە وەبیرهێنانەوەی ژیانی تاڵی دەورانی ڕابردوو گریاو دۆرانیش بە وەبیر هاتنەوەی کوێرەوەرییەکانی وی گریانی هات.

"بەڵێ هەر ئەتۆ دەزانی. دەمەوێ ڕۆژێك بەبێ ترسی مردن بژیم, حەز دەکەم شەوێك, تەنیا شەوێك لە جێوباونێکی ڕەحەت دا بەئاسوودەیی بنووم. لەوە زیاتر هیچم لەخوا ناوێ. ئەگەر درۆ بکەم خوا بم گرێ"

پاشان پێ‌کەنی:

"بۆچی، شتێکی دیکەشم دەوێ... دەمەوێ بچمە حەج و لەخوای گەورە داوای لێ‌خۆشبوونی گوناهەکانم بکەم"

"پێکەوە دەچینە حەج. چما قەول‌وقەرارمان وانەبوو؟"

"با، لەبیرمە. ئەو جارەی پێکەوە دەچووینە هۆوێ، قەراخ دەریای مێدیترانە بەڵێنمان دا پێکەوە بچینە حەجی پیرۆز. ئەتۆ زۆر لەو کابرایە دەترسای، مەبەستم مەلاحوسێنە"

"راستە، زۆری لێ‌دەترسام"

پاش تێپەڕینی چەند ساڵ مەلادۆران بەئاسانی ماڵی مەلاحوسێنی کە لەنێو باغە پرتەقاڵێك دا بوو، دۆزیبووەوە، دەت گوت بەدەستی خۆی لەوێی داناوە. مەلاحوسێن کاتێك چاوی پێی کەوت لەپێش دا لەخۆشی‌یان وەخت بوو شێت بێ، پاشانیش ڕەنگی وەك زەعفەران زەرد هەڵگەڕاو دەستی کرد بە لەرزین. ـ دیارە هەر ئەو چەند لەحزەیەی پێش دا ـ پاشان پرسی: خۆ نام کوژی، ها؟

مەلاحوسێن زۆر دەولەمەند بوو، سنووری باغە پرتەقاڵەکەی دەگەیشتە لێواری دەریای مێدیترانە. چەند گەمی‌یەکیشی کڕیبوون و هاویشتبوونیە دەریای مێدیترانەوە. دارە پرتەقاڵەکان گوڵیان کردبوو و بۆنی گوڵەکانیان هەموو کەسی سەرخۆش دەکرد. ئەوو مەلای دۆستی‌یان لەگەڵ خۆیان بردە لێواری دەریایەکی گەورە کە شەپۆلەکانی بەرزو ئاوەکەی سپی و کەفاوی بوو.

"مامۆستا قسەی ئاخرت بکە"

مەلاحوسێن هەستی بە لەرزینی دەنگی مەلادۆران ئەفەندی کردبوو.

"ئەتۆ دەتەوێ راست لەگەڵ خۆرهەڵات بە گوللە لێم دەی و بم کوژی. دەم زانی ئەتۆ رۆژێك لەرۆژان دێی و ئەو کارەساتە روودەدا. ئاگات لەدایکت و مندالەکانم هەیە؟"

مەلادۆران وەڵامێکی نەدایەوە. شەکەت و ماندوو هەتا بەیانی گوێ‌یان بۆ دەنگی دەریا راگرت و چاوەڕێ مان. کە کازیوە ئەنگووت مەلادۆران ئەفەندی دەمانچە دەسك عاجەکەی هەڵکێشاو هاتە رووبەڕووی مەلاحوسێن. مەلاحوسێن گوتی:

"دەمەوێ دوعا بخوێنم. زۆر پەلە مەکە گیانەکەم، تاوێکی دیکە دنیا رووناك دەبێ"

مەلادۆران ئەفەندی دەمانچە بەدەست چەند لەحزەیەك بەرامبەری راوەستا.

"تەواوە، بڕوانە دنیا رووناك بوو"

مەلاحوسێن گوتی: تەواوە.

روخساری رەنگی خۆڵەمێشی گرتبوو.

ئەو سێ گوللەیە کە لە لوولەی دەمانچەی مەلادۆران دەرچوون, راست لەسەر دڵی مەلاحوسێن دران. مەلا زۆری خوێن لەبەر رۆیشت. ئەوەندە لەژوور سەری راوەستا هەتا دواهەناسەی هەڵکێشا.

"بەڕاست چەندیش پشووت لەسەرخۆ بوو, دەت گوت هیچ رووی نەداوە, راست لەگەڵ خۆرهەڵات کوشتت... پاشانیش لکە پرتەقاڵێکت لێکردەوەو تێروپڕ بۆنت پێوەکرد. پێکەوە دەچینە حەج و تۆبە دەکەین"

مەلادۆران ئەفەندی گوتی:

"لەگوناهان پاك دەبینەوە, وەك ئەو رۆژەی لەدایکی خۆمان بووین"

"بەڵام داخوازەکەم لەتۆ... ئەمن دەمەوێ بچم حەمەدۆکی یان بگرم یان بکوژم." لەنێو قسەکانیدا چاوی بە عەلیەشەل کەوت.

مەلادۆران گوتی:

"مەبەستت ئەوەیە؟ ئەوە عەلیەشەلی شوێنگێڕە. حەمەدۆك بەخوێنی سەری تینوویە. چەند رۆژ لەمەوبەر خەریك بوو عەلیی بکوژێ. بەزۆر لەدەستیم ئەستاندەوە, چەندت متمانە بەمن هەیە ئەوەندەشت بەو هەبێ"

وەلی کوزگوون پێکەنینێکی هاتێ و گوتی:

"ئەمن عەلیەشەلی باش دەناسم, ئەویش من باش دەناسێ"

عەلیەشەل نەختێك لێی نیزیك کەوتەوە, دەستی بۆلای درێژ کردو گوتی:

"بەخێربێی"

"خۆش بی کاك عەلی, مەترسە حەمەدۆکی دەکوژم, ئەو بستەمنداڵێکە"

"ئیشەڵلا"

"لەبەرامبەر کوشتنی حەمەدۆك دا تەنیا یەك شتم دەوێ, لێبووردن. تێگەیشتی مەلادۆران ئەفەندی؟"

"تێگەیشتم"

"پاش گرتن یان کوشتنی حەمەدۆك دەمەوێ ئەمان نامەیەکی بەرزترین کاربەدەستم بەدەستەوە بێ کە کاریان بەکاری من نەبێ. ئەگەر ئەم کارەت لەدەست بێ ئەمن بەتۆ..."

"جارێ با بنووین هەتا لەسەر خێران ڕۆژ دەبێتەوە..."

بەیانی وەختێك مەلادۆران ئەفەندی دەچووە لای تاشکەن خەلیل, موسلیم شوان کە عەلی‌یەشەل هەموو شتێکی تێ‌گەیاندبوو, بەرەو کێوپارە دەڕۆیشت کە حەمەدۆکی بدۆزێتەوە.

پیاوماقوولانی شارۆچکە شەوێ لەماڵی مەلادۆران ئەفەندی کۆ بوونەوە. وەلی کوزگوون بۆ گرتن یان کوشتنی حەمەدۆك ئەمان نامەیەك و فەرمانی لێ‌خۆشبوونی بەنووسراو دەویست کە پاش ئەوەی کارەکەی تەواو کرد بۆی‌دربێتی. ئەویش بەهۆی عارف صائم بەگەوە. زولفۆ گوتی:

"ئەمن بە دوو ڕۆژان ئەو نامەیە وەردەگرم و بۆتی دێنم. ئێستا عارف صائم بەگ لەئەدەنەیە, بەدوای منیشی دا ناردوە"

مورتەزاغا گوتی:

"ئەمنیش نامەیەکی وات بۆ لە والی وەردەگرم. ئەمن تۆ باش دەناسم. ئەگەر کەسێك هەبێ ئەو کارەی پێ بکرێ, ئەتۆی"

تاشکەن خەلیل بەگ گوتی:

"ئەمنیش نامەیەك لە فەرماندەری جەندرمە وەردەگرم. سەربازان ناپیاو نین, لەسەر قسەی خۆیان رادەوەستن..."

حەوتوویەك دواتر وەلی کوزگوون و دەستەکەی لەحاڵێك دا نامەکانی لەگیرفان دا بوو, لەباغی مەلادۆران ئەفەندی وەدەرکەوتن و بەنێو ئەو گەزیچارانەدا کە لەنیزیك ئاوێ ڕوابوون بەدوای حەمەدۆك دا ملی کێوپارەیان گرت. نە یاوەرو نە قایمەقام و نە پیاوە گەورەکانی دیکەی وڵات لەو بەسەرهاتە ئاگادار نەبوون.

وەلی کوزگوون بۆئەوەی بتوانێ کارەکەی بێ‌ژانەسەر جێ‌بەجێ بکا بەتوندی داوای لە ئاغاو خانەکان کردبوو مەسەلەکە بەنهێنی بگرن.

مەلادۆران ئەفەندی پێی گوتبوو حەمەدۆك خەتەرناکەو پێویستە بەپارێزەوە ڕەفتار بکا. وەلی کوزگوون زۆر لەفکردا بوو داخوا مەلادۆران ئەفەندی مەبەستی لەم قسەیە چ بوو؟ چما حەمەدۆك لە بنیادەمێکی ڕیوەڵە بەولاوە کە بۆنی شیری خاوی لەزاری دەهات و بەزۆری پاڵیان پێوە نابوو چەتەیی بکاو تەنیاو بێکەس لەچیاو بەندەنان دەسووڕایەوەو بۆخۆشی نەی‌دەزانی چ بکا, چ کارە بوو. ماڵی ئاوەدان بێ. ئەگەر حەمەدۆك بەو ئەندازەیە خەڵکی شارۆچکەی نەترساندبا, وەلی کوزگوون نەی‌دەتوانی خەونیش بەژیانی دەشتەوە ببینێ, ژیانێك کە چەند ساڵ بوو چاوەڕوانی دەکرد. حەمەدۆك تەیرێکی زێڕینی ئیقباڵ بوو کە لەسەر سەری نیشتبوو,

بەپێچەوانەی ویستی خۆی دەبوو بیکوژێ, هیچ حەزی نەدەکرد بیکوژێ بەڵام چاری نەبوو. پشکی مردن بەناوی حەمەدۆك دەرچووبوو, بۆ ئەمیش تەیری ئیقباڵ بوو.

جاروبار لەناخی دڵەوە خۆشحاڵ دەبوو, لەخۆشی‌یان باڵی دەگرت و گۆرانیی دەگوت و هەڵدەپەڕی... بەگەنجییش کاتێك چەتەیی دەکردو پیاوی دەکوشتن و کیسە زێڕەکانی لەباخەڵی ڕادەکرد, یان ماڵێکی تاڵان دەکرد, ئاوا وەکەیف دەهات و ئەوەندە خۆشحاڵ دەبوو هەر مەپرسە. دەبوو زۆر زوو حەمەدۆکی بکوژێ و بچێتە سەر کێڵگەکەی.

ئەوەندە توند دەڕۆیشت کە ئەو ڕێگرانەی لەگەڵی بوون, تەنانەت ئەوی هەرە لاویشیان نەیدەگەیشتێ. پاش ئەوەی بەم جۆرە لە بەندەنی قەڵایە ئاوا بوو وەلی کوزگوون ئاوڕی دایەوەو گوتی:

"کوڕینە ئاوا سوودی نیە, بەپێیان نایگەینێ, دەبێ ئەسپ پەیدا بکەین. دەبێ لەو سەرە سەرو ئەسپ لە چەرکەسەکان وەرگرین"

لای نیوەڕۆیە ئەسپەکانیان حازر بوون و لەسەر کانی چاوەڕوانیان دەکردن. ئەگەر ڕوو لەچیا بکەن, ئەوی دیکەی ئاسانەو حەمەدۆك لەبەر دەستیان دەبێ.

## (٢٥)

مەلافەرهاد گوتی: دەزانی حەمەدۆك خەریك بوو لە دارمان دەن؟ چاك بوو هاتی و نەجاتت داین.

ڕاست دە ڕۆژ بوو لەم دێ سەخت و چڕو دووركەوتووە دەژیان. تەنیا لەیەك ڕێگاوە دەكرا بچیە ئەو دێیە. ئەویش شوێنێكی رووتەن بوو كە لەبەرچاوی خۆیان بوو. مێروولە بەو ڕێگایەدا ڕۆیشتبا لەنێو ئاواییەوە دیار بوو. پاشماوەی قەلایەكی لەمێژینە لەو گوندە هەبوو كە نەخشی چەند شێرێكی پێوە دیار بوو. هەموو دانیشتووانی ئەم گوندە مەلافەرهادیان دەناسی و خۆشیان دەویست. كەس ناڕازی نەبوو. دیاریش نەبوو بۆچی وایە, بەلام دیار بوو كە مەلافەرهاد نیازی هەیە چەند سالێك لەوێ بێ. حەمەدۆكیش چونكە مەلای باش دەناسی تەنانەت مەراقی نەبوو هۆیەكەشی بزانێ.

یۆبازئۆغلی لەڕێگادا بێئەوەی بلێ دەیەوێ بچێتە كوێ و چ بكا, لەوان جیا ببووەوە.

"بنیادەم هێندەش ترسەنۆك دەبێ..."

مەلافەرهاد لە هەموو شتێك زیاتر سەری لەكاری یۆبازئۆغلی سوڕمابوو. ببووە بنێشتەخۆشەی سەر زاری و لەپەستا دووپاتی دەكردەوە: پیاو هێندەش ترسەنۆك دەبێ...

حەمەد لەوە كە لەگەڵ مەلایە هەم خۆشحاڵ بوو, هەم هەستی بە دڵنیایی دەكرد. لەو ڕۆژەشەوە باس لەنێوان حەمەدو مەلادا دەستی پێكردبوو و هەروا درێژەی هەبوو:

"ڕێگای مرۆڤ خوا دیاریی دەكا. خوا زۆر لەمەوبەر ڕێگای منی دیاری كردبوو, بۆخۆم نەم دەزانی. ئەگەر ئەتۆش دەست لە چەتەیی هەڵگری و بڕۆی ئەمن لەو چیایانە دەمێنمەوە.

بۆم دەركەوتوە لەمە بەولاوە ڕێگایەكم نیە. چارەنووسی من بە گوللەیەك تەواو دەبێ. خەونم دی, دووبارە خەونم دی كە لەبەندیخانە ئازاد دەبم و دێمە چیا. ڕێگای بنیادەم هەم خۆی دیاریی دەكاو هەم

خوا. ئەمن زۆرم هەوڵ دا لەکێوان نەمێنمەوە, بەڵام دیت لەنێوچاوانێم نووسراوە. نامەوێ لەبەر قەزاو قەدەر رابکەم. تەنانەت ئەگەر تاقە چەتەیەکیش لە چیاو بەندەنان نەمێنێ ئەمن دەمێنمەوە. ئەمە بۆمن باشترە. لەو دێیە کە گۆشەنشین ببووم خوا بەخۆڕایی تووشی تۆی نەکردم"

مەلا قسەکانیی بە راوێژێکی زۆر بڕیاردەرانە تەواو کرد. بەڵام حەمەد لە سەلماندنی قسەکانی وێدا هیچی نەگوت. لەمێژ بوو مەلا فێری تفەنگ هاویشتن دەبوو. هەموو رۆژێ بەیانیی زوو لەخەو هەڵدەستاو پاش ئەوەی نوێژی دەکرد دەیگوت:

"یاڵڵا کوڕینە کێ لەگەڵم دێ؟"

هەرکەسی لەگەڵ هاتبایە دەچووە پارچە زەوییەکی راوند کە لەپشت ئاوەدانی بوو, لەوێ دەستی دەکرد بە تفەنگ هاویشتن. وێڕای ئەوەش هەمیشە مەشقی شاخەوانیی دەکرد, بەڕێدا دەڕۆیشت و قسەی دەکرد.

حەمەد سەری لەکارەکانی سوڕمابوو, ئاشقی سوارچاکییەکەی ببوو. ئەو هەرچییەکی توانیبا ببینێ, ئەگەر سێرەی لێ گرتبایە دەینەنگاوت. حەمەد لەژیانیدا تفەنگچیی وای نە دیبوو, نە بیستبوو.

مانگێك لەدێ مانەوە. حەمەد تێگەیشت کە خەڵکی ئەم دێیەو گوندەکانی دەورووبەر بەچاوی نەزەرکردەیەك دەڕواننە مەلاو بەپیرۆزی دەزانن. هۆیەکەشی دۆزیەوە:

ساڵێك کە قاتی ببوو مەلا لەگەڵ سێ برادەری خۆی پەنا بۆ ئەم دێیە دەبەن و دەست دەکەن بە رێگری. ماڵی دەوڵەمەندانی قەیسەریە, دووملی و سێواسیان تاڵان دەکردو دەرخواردی خەڵکی برسیی ئەم دێیەیان دەدا. ئەوەندەی دەشیان توانی پێشی هێرشی سەربازانی راکردوو لەشەرِ بۆ ئەم گوندەیان دەگرت.

هەربۆیە وەختێك دووبارە سەروکەللەی مەلافەرهاد لەم دێیەدا دەرکەوت شەپۆلی شادمانی گوندەکەی داگرت.

حەمەد لەحاڵێك دا تفەنگەکەی بۆلای مەلافەرهاد رادەداشت گوتی:

"مەلای خۆم, ئەمن لەژێر فەرمانی تۆ دام, سەردەستە ئەتۆی, هەروەك پێشتریش لێرە سەردەستە بووی. ئەمنیش یەکێك لەپیاوەکانی تۆم"

"دێهاتییەکان ئەمەیان پێ‌گوتی؟"

"ئەوان پێیان نەگوتم, بۆخۆم تێگەیشتم"

مەلافەرهاد دەیزانی ئەوەی حەمەد بۆی دەرکەوتوە, خەڵکی ئەو دێیە هەرگیز لەلای کەس باسی ناکەن و دەیزانی حەمەدی زیرەك پاش هاتن بۆ ئەم دێیە, بەسەرهاتی ویی لە غەوارەیەك یان لە شوانێکی ساویلکە بیستوە.

"رۆژێك هەموو بەسەرهاتی خۆمت مووبەموو بۆ دەگێڕمەوە. تفەنگەکەت هەڵگرەوە، سەرۆکی دەستە ئەتۆی"

"لایبە لەپێشم. ئەمن دەزانم کێ دەبێ ببێتە سەرۆکی دەستە"

"ئەمنیش دەزانم مەلای خۆم"

مەلا رقی هەستا:

"هەڵیگرەوە یاڵڵا، دابی نوێ مەیەنە گوندی کۆن"

"دەیهێنم مەلا"

"بوویە بەڵای گیانی من؟"

"ئەدی مەلای خۆم"

"کەوایە برادەران بانگ دەکەین، هەر ئێستا، ئەوان سەردەستە هەڵبژێرن"

"ئەتۆ دانیشە لەجێی خۆت. کوڕینە وەرنە ئێرە..."

قاسم و دەمیر کە نەختێك دوورتر راوەستابوون و تەماشای وانیان دەکرد چوونە پێشەوە.

"دەمانەوێ سەرۆکی دەستە هەڵبژێرین، کێ حەمەدی پێباشە؟"

هەرسێکیان حەمەدیان هەڵبژارد.

حەمەد لەحاڵێك دا دەت گوت لەنێوان خەوو بێداری دایە هەموو ئەو بەسەرهاتەی سەیر دەکردو قسەیەکی بۆ نەدەکرا. هەرسێکیشیان چەکەکانی خۆیان هێناو هاویشتیاننە بەرپێی حەمەد. حەمەد لەنەکاو کوڵی هەستاو فرمێسك لەچاوانی گەڕا، دەسبەجێ هەستاو دەستی مەلای گرت و لەسەر سەری خۆی دانا.

دێهاتیەکان کە ئەو بەسەرهاتەیان دیتبوو، یان بیستبوو، ئەو شەوە بەخۆشیی حەمەد بانگهێشتنێکی گەورەیان ساز کرد، دەهۆڵکوت و گۆرانیبێژو دایەرەژەن لە گوندەکانی دەوروبەر ڕا هاتن. لەمەیدانی نێوەڕاستی ئاوەدانی ئاورێکی گەورەیان کردەوە. لێرەوارو بناری بەردەڵان هەتا لای بەیانی رووناك بوو.

حەوتوویەك دواتر حەمەد گوتی:

"لێرە ئیدی خەریکە دەڕزین"

هەموو زەین و هۆشی لە لای سەیران بوو. رۆژی پێشتر بڕیاری دابوو بچێ سەیرانی هەڵگرێو بێباتە جێیەکی بێناوونیشان، بە تایبەتی جێگایەك لە لێواری دەریا کە پڕ لە داری پرتەقاڵە. داخوا بۆ ئەم کارە پێویستیی بە پارە هەرچەندیش کەم بێ، نەبوو؟

"با لێرە بڕۆین, بەڵام ئێرەمان لەبیرنەچێ. تەنانەت لە خەراپترین ڕۆژەکانیشمان دا... ئەگەر هەموو خەڵکی ئێرە لەت و کوت بکەن کەس بە گرتمان نادا"

"ئەمەی دەزانم مامۆستا"

"ئێرە قەڵامانە..."

دێهاتی‌یەکان بە ژن و پیاوو منداڵەوە ئەوانیان تا بەندەنەکەی خواریێ بەرێ کرد.

وەختێك لە دێهاتی‌یەکان جیابوونەوەو بە تەپۆڵکەکە هەڵگەڕان, مەلافەرهاد هەڵۆیەکی لە حەوا نیشان داو گوتی:

"حەمەد باشی تەماشا کە. ئەوە یەکەمین نێچیری منە" تفەنگەکەی بەرز کردەوە, سێرەی لـێ‌گرت, دەنگی گوللە لە شاخەکان گەڕاو دەنگی دایەوە. هەڵۆی چارەڕەش بە سەرمەقولات لە حەوارا هاتەخوار.

"بەخت لەگەڵم تەبایە"

مەلا دێهاتی ئەو دەوروبەرەو ڕێگاکانی وەك بەری دەستی خۆی شارەزابوو. لای خۆرئاوا گەیشتنە دێ‌یەك. ئەم گوندە لە قەراخ گۆلاوێکی چووك کە شاخێکی سووری وەك دورگەیەك لە نێودا دەبینرا, دروست کرابوو. خەڵکی دێ بە خۆشحاڵی و جۆش‌وخرۆشێکی زیاتر لە گوندەکەی پێشوو پێشوازی‌یان لە مەلافەرهاد کرد: مامۆستا, پێمان وابوو کوژراوی, خەبەر هات کە جەندرمە کوشتوویانی, سوپاس بۆ خوا مامۆستا. گاوگەردوونیان بۆ مەلا کردو حەوتوویەکی تەواو بەرێزو شکۆوە میوانداری‌یان لـێ‌کردن. گۆلاوەکە زۆری سوورەماسی تێدابوون. مەلافەرهاد دەلینگی پانتۆڵەکەی هەڵکردن و چووە نێو گۆلاوەکەو وەك جاران لە کەلێن و کونی گۆلاوەکەدا سوورە ماسی‌یەکی زۆری گرت.

زۆر لە کۆنەوە لەم دێ‌یەدا ئەسپی ڕەسەنیان بەخێودەکردن. ئەسپی ئەو دێ‌یە لە ئەسپی ئۆرفەو عەرەبستانیش بە ناوبانگ تر بوون. ناوبانگی ئەسپی عەلی سەفابەگ کە حەمەدۆك سواری دەبوو, گەیشتبووە ئێرە.

"هێندێك ئەسپ وان. وەختێك لە ڕەوە جیابوونەوەو بە تەنیا مانەوە, یان ڕووداوێکی خەراپیان بۆ پێش هات بە کەس ناگیرێنەوە, لەگەڵ بنیادەم دەبنە دوژمن. سووتمان ئەوی زۆر ترساندوە, هەتا دەش مرێ نایەتەوە سەردۆخی ئاسایی"

مەلا فەرهاد و حەمەدیان لە خانوویەکی جوانی دوو نهۆم دانابوون. خانووەکە لەسەر دوندێك بوو کە بەسەر گۆلاوەکەی‌دا دەڕوانی. ڕەنگی گۆلاوەکەی خوارەوە شینێکی توند بوو. ئەو کاتە کە یەکەم ڕووناکایی بەربەیان دەردەکەوت و هەتاو لە گابەردە سوورەکەی نێو

گۆلاوەکەی دەدا, گۆلاوو دارەکانی دەوروبەری, زەویو گژوگیا رەنگیان سوور هەڵدەگەڕا. کە هەتاو بەرز دەبوو گابەردەکە لە رووناکایی‌دا نوقم دەبووو گۆلاوەکە رەنگی شین دادەگیرسا.

مەلاو حەمەد لەسەر جێیەکەی خۆیان کە بە تەنیشت یەکەوە راخرابوون هەتا بەیانی قسەیان کرد. مەلا لەبارەی جیهان و مرۆڤەوە زۆری دەزانی. وەختێك تەماشای چاوی کەسێکی دەکرد ئەوەی لە ناخی دڵی‌دا بوو دەیخوێندەوە.

"ئەتۆ بڕیاری خۆت داوە حەمەد, قسەو ئامۆژگاری سوودی نیە. سەیرانێ هەڵگرەو بڕۆ بۆ قەراخ ئەو دەریایە نێو خونچەی گوڵەنارنجەکان... بەڵام بزانە کە ئەتۆ دیسان ناتوانی زۆر لەوێ بەند بی. دێیەوە چیا. چیا لە هەوێنی رووحی تۆدایە. ئیشەڵڵا لە نێو باغە پڕتەقاڵەکان دا ژانە سەرت بۆ دروست نابێو زوو لەوێ رزگارت دەبێ... وەختێك پیاو دەبێ بە حەمەدۆك ئەو حەمەدۆك بوونە وەك بارێك قورسایی دەخاتە سەرشانی بنیادەم. لەنێو باغە پڕتەقاڵەکان دا رۆژێك, دوو رۆژ ئەو پەرەکەی ساڵێك تاقەت دەگری, ئەو پەڕەکەی ساڵێك, ئەویش زیاتری لە باوەشی ژنەکەت دا دەتوانی بێنیەوە. پاشان ئەگەر زنجیریشت بکەن ناتوانی لە جێیەك بەند بی"

"ئەدی بایرام ئۆغڵی چۆن سی ساڵ ماوەتەوە؟"

مەلا فەرهاد پێکەنی و گوتی:

"ئەمن لەگەڵ دەستەکەی وی بووم. ماوەیەکی زۆریشە هەمیشە خەبەرم لێی هەیە. هەموو رۆژێ بەیانی چەك لە خۆی شەتەك دەدا, هەتا چیایەکەی رووبەڕووی دەچێو دەگەڕێتەوە. ئەگەر رۆژێك چەکەکەی لـێبستێنن, ئەگەر بەیانی یەك چەك لە خۆی نەبەستێ, دەبینی چ روو دەدا. بایرام ئۆغڵی رۆژێك دەچێتەوە چیا. لەوانەشە ئەو کاتە بێ کە لەسەرەمەرگ دایە, بەڵام ئاخرەکەی هەر دەچێ. ئەو کەسێك نیە لە جێو بانی نەخۆشی‌دا بکەوێتە ناڵەناڵ و بمرێ. ئەتۆ کاتێك عەبدی‌خانت کوشت رۆیشتیو ون بووی. ئەدی بۆ هاتیەوە, کێ ناچاری کردی. کێ تۆی دەناسی؟"

حەمەد گوتی:

"باشە ئەوە گەڕامەوە..."

"دووبارە دەگەڕێیەوە. هەوێنی رووحی تۆ شتێکی لە هەوێنی رووحی کوێر ئۆغڵی, پیر سوڵتانی ئەودال و شێخی سەقاریە تێدایە...

یەکێك لەوان هەم ئاشق بوو, هەم شێعری دادەنان. شیعەو قزڵباش و یاغی بوو, لە پیاوەکانی شا بوو, شا عەلی, ئەو شاسواری دوڵدوڵ سوار, ئەو حەزرەتی عەلی‌یە. یەکێك بوو لە پەیڕەوانی حەزرەتی عەلی. هەر بۆیەش دوژمنی سوڵتان بووو لە دژی وی یاغی بوو.

ڕۆژێکیان بەیانی پیرسولتان بانگی خدری دەکا کە لە لای وی کاری دەکرد, پێی دەلێ خدر, دوێ شەوێ خەونێکم دیوە. لە خەوێم دا دەچوومە ئەستەمبوولێ. ئەتۆ دەکەنە حاکمی سێواس و پاشان فەرمان دەدەی ئەمن لێرە لە بازاڕی سێواس لە دار بدەن. یاللا, خواحافیز, لەگەل چارەنووس شەڕ ناکرێ. خدر بەسەر دەست و لاقی پیردا دەکەوێ: ئەی ئەمان پیر! ئەمن چۆن دەتوانم ئەتۆ لەدار بدەم با بش بمە حاکم... پیر سولتان پێی دەلێ: بڕۆ وەڕێکەوە خدر.

بەڕێی دەکا. خدر دەڕوا. چەند سال رادەبرن, حاکمێك دێتە سێواس بە ناوی خدر. رۆژێکیان حاکم وەبیری دێتەوە کە ئەو پیرەی خەونی دیو هیمەتی کرد و ئەوی ناردە ئەستەمبوولێ لە گوندی "بناز" لە دەوروبەری "یۆلدوزئیلی"یە. لە دلی خۆیدا دەلێ: ئەی چۆن بوو, ئەو گوتبووی ئەتۆ دەبی بە حاکم و من لەدار دەدەی. دەبێ میوانداریەکی لێبکەم بۆ خۆی کەیفی پێبکا. لە سێواسەوە بۆ بناز سێ رۆژەڕێ بوو. رۆژی میوانداریەکە دیاری دەکا هەموو پیاوماقوولێو ئاغاو خانەکانی سێواسیش بانگهێشتن دەکا هەتا ببینن کە حاکم لەگەل ئەو پلەو پایەیەش کە هەیەتی چۆن رێزی پیری خۆی دەگرێ. لە سێواسەوە تا بناز سێ رۆژەڕێ بوو. حاکم پیاوەکانی دەنێرێو پیرسولتانی ئەودال دێنێتە کۆشکی خۆی. وەختێك پیر دەگاتە مەجلیسی میوانداریەکە حاکم دەستەونەزەر لە پێشی رادەوەستێ. پیر لەو بارەیەوە زۆر خۆشحال دەبێ. بەلام لە دلی خۆیدا هەست بە بەدگومانی دەکا. چونکە خدر ببوو بە"خچر"و عوسمانی. عوسمانییەکانیش جێی باوەڕ نەبوون. ئەمجار خەونیشی دیبوو. بە فەرمانی وی میوانداریەکە دەست پێدەکا, هەموو جۆرە خواردنێکیان لەسەر سفرە دانابوو. هەمووان دەستیان کرد بە خواردن. بەلام پیرسولتان وەك دەست و لاقیان بەستبێ لە جێی خۆی رەق ببوو. خچر پاشا کە چاوی لەم وەزعە دەبێ, دەلێ: پیر, فەرموو نانی بخۆ. پیر وەلام ناداتەوە. لە حالێك دا هەموو بە ئیشتیاوە خەریکی نان خواردن دەبن, ئەو تاقە پاروویەکیش ناخوا... ئەی ئەمان پیر... پیرسولتان سەر هەلدەبرێو چاو بەسەر یەك یەکی خان و ئاغاو پیاوەکانی دەولەت دا دەگێڕێو دەلێ: ئەمن لەم نانە ناخۆم. چونکە ئەم نانە هەقی هەتیوو سەغیرانەو بەخوێنی ئەو کەسانە شێلراوە کە نوقمی خوێن و نارەق رەنج دەدەن. ئەم خواردنە نانی زولمە. ئەمن ناتوانم ئەم نانە بخۆم, حەرامە... ئەمن هیچ, تەنانەت سەگەکانی منیش ئەم نانە ناخۆن.

خچر پاشا زۆر تووڕە دەبێ, مووی سەری خۆی دەڕنێتەوەو لە رقان شێت دەبێو بۆ ئەوەی لەبەرچاوی خان و ئاغاکان خۆی نەشکێنێو لەوە زیاتری سووکایەتی پێ نەکرێ, دەلێ: پیر, سەگەکانت بانگ کە بزانم دەخۆن یان نا... پیر دەسبەجێ دەست بۆ لای بناز رادەدێرێ, سەگەکان وەڕێدەکەون و دوای تاوێك دەگەنە وێ: فەرموو پاشا ئەمەش سەگەکان. خواردنەکە

بۆ سەگەکان دادەنێن. سەگەکان لە دوورەوە بە سەری لمبۆزیان بۆن بە خواردنەکەوە دەکەن. پیاوەکانی پاشا لەبەریان دا شل و کول دەبن, بەلاّم سەگەکان دم لە خواردنەکە نادەن.

پاشا بەرامبەر بەم وەزعە زۆر بەخۆدا دەشکێتەوە. نەدەکرا ئەو هەموو سووکایەتی‌یە قبووڵ بکاو دەبوو بە جۆرێك خۆی لەو تەنگانەیە دەرباز بکا.

خچر پاشا دەڵێ: پیر خەونەکەت خەریکە وەدی بێو بەلاّم لەبەر خاتری ئەوەی پیری منی, دەرگایەکی نەجات بوونت بۆ دێڵمەوە, ئەگینا لەسەر ئەم ڕەفتارە دەبوو لە دارت بدەم.

دەبێ سێ بەیاتی دابنێی کە هیچیان ناوی شایان(مەبەست حەزرەتی عەلی‌یە ـ م) تێدا نەبێ. ئەگەر وابکەی دەت بەخشم. ئەگینا فەرمان دەدەم بەیانی لە مەیدانی شاردا بە بەرزترین دارەوە هەڵت واسن.

پیرسوڵتان سازەکەی بەدەستەوە دەگرێو یەکەمین بەیاتی دەخوێنێتەوە. هەموو حازران و یەك لەوان پاشا ڕەق رادەمێنن. پیر سوڵتان لە هەر لەتە شیعرێکیدا جارێك ناوی شای هێنابوو. میوانان چاوەڕوانی دووهەمین بەیاتی دەبن. ئەویش سەرانسەر پڕ لە ناوی شا بوو. سێهەمین بەیاتییش هەروا بوو.

خچر پاشا دەڵێ: پیرم, خەونەکەت وەدی‌هات. دارۆغەکان پیری دەگرن و لە مەیدانی سێواس دا لە داری دەدەن. لەو رۆژە بەدواوە سێواس بوو بە "قانلی سێواس", (سێواسی خوێناوی ـ م) هەتا دنیا دنیایە ئەم شێعرانە لەبیر ناچنەوە.

ئەو بەیانی‌یە لەگەڵ تاوهەلاّت خەلکی سێواسیش باسی بەسەرهاتی پیرسوڵتان و چۆنیەتیی لەداردرانەکەییان دەکرد. یەکێك دەی‌گوت: ئەمن لەگەڵ شەبەقی بەیانی دیتم کە پیرسوڵتان بە بەرگی سپی‌یەوە لە دەروازەی قەیسەریە چووەدەرێو ڕۆیشت. یەکی دیکە دەی‌گوت: ئەمن دیتم کە بە دەروازەی تووقات دا وەدەرکەوت. ژمارەیەك دیتبوویان کە لە دەروازەی ڕۆژهەلاّتەوە دەرچووەو هێندێکیش چاویان لـێ‌ببوو کە بە دەروازەی ڕۆژئاوادا چووەتەدەر. کەس نەی‌دەتوانی باوەڕبکا کە پیر لەدار دراوە. هێندێك کەس کە لەو مەسەلەیە بە گومان بوون گوتیان:

یاڵلاّ بابچینە مەیدانی شارو بزانین, ئەگەر پیرسوڵتانیان لە دار دابێ لەوێ دەی‌بینین. هاتنە مەیدانی شار دیتیان دۆڵ پڕە لە جاو. تەنیا بە لکە دارێکەوە تەنافێك هەڵواسراوەو رادەژێ.

مەلا فەرهاد بە دەنگە خۆشەکەی ئەو سێ بەیاتی‌یەی گوتن کە ناوی حەزرەتی عەلی لە شیعرەکانیان دا هاتبوو.

حەمەد گوتی: قەراجە ئۆغلاّنیش وەك دادال ئۆغلی ئاشقێك بوو, ئاشقی هەق...

مەلا گوتی: بەڵێ, وەك دادال ئۆغلی.

"پیر سوڵتان ئەسپی نەبوو, وەنا؟"

مەلا فەرهاد گوتی: نا، نەیبوو.

ئەگەر لە شێخی سەقاریە دەپرسی دەبێ بڵێم کە "محمد مهدی"ی سەردەمی سوڵتان مرادی چوارەم بوو، کە لە چیاکانی سەقاریە پەیدا بوو، هەر لەوێش غەیب بوو. شا سێ جار لەشکرێکی زۆری نارده سەر. ئەو هەموو جارێ بە هەزار کەس لە مریدەکانی سوپای عوسمانیی تێك شکاند.

وەختی لەشکرکێشانی سوڵتان مراد بۆ سەر بەغدا، سوپای عوسمانی شەوێك لە قوونیە دەمێنێتەوە کە لەنەکاو فەرماندەری سوپا، سەرۆك وەزیرو وەزیرەکان هۆشیان دێتەوەبەر کە: ئەی هاوار، ئێمە خەریکی چیین؟ دەچنە لای پادشاو دەڵێن: پادشا، بۆچی وامان کردوە، بۆچی سوپای خۆمان دەبەینە بەغدا، لە کاتێك دا شێخی سەقاریەی مەلعوون گەیوەتە دەروازەی ئەستەمبوڵ؟ ئەو کەسەی سوپای شەست هەزار کەسیی ئێمەی تێك شکاند ئێستا بە پێنج هەزار سوارەوە لەبەر دەروازەی ئەستەمبوڵە. ئەگەر ئەستەمبوڵ داگیر بکەن، ئێمە دەتوانین چ بکەین؟ بەڵام بێمە سەرباسی سوڵتان مراد. فکری کردەوەو گوتی: بچن لەزمان منەوە سڵاو لە شێخی بکەن و پێی بڵێن بەنیازم ئەسپێکی رەسەن، باڵتۆیەکی چەرم و تووغێکی وەزارەتی بۆ بنێرم. (تووغ تاجێك بوو لە تووکی باڵندە یان داموسك دروست دەکراو پادشا وەك خەڵات دەیدا بە فەرماندەرانی سوپاو وەزیران ـ م). ئەمن بەنیازی گرتنی بەغداو شەڕی قزڵباشم. با لەشکرەکەی لەگەڵ خۆی بێنێ و لەگرتنی بەغدادا بەشدار بێ، چونکە خێرە. فەرماندەری سوپا، سەرۆك وەزیرو وەزیرەکان دیارییەکان هەڵدەگرن و دەچنە چیاکانی سەقاریەو چاویان بە شێخ دەکەوێ:

"پادشای تۆی کردوەتە وەزیر، وەزیری سێ تووغ (هەتا تووغی زیاتریان دابایە بەکەسێك نیشانەی ئەوەبوو کە رێزی زیاتریان بۆ داناوە ـ م). ئەم ئەسپ و خەڵاتەشی بۆ ناردووەو فەرموویەتی کە ئەمن دەچمە شەڕی قزڵباشەکان، با ئەویش لەگەڵ لەشکرەکەی بێ، بچین بەغدا بگرین".

"ناتوانم قبووڵی بکەم"

"چی چی؟ ئەتۆ ناتوانی وەزارەت قبووڵ بکەی؟"

"ناتوانم"

"چۆن ناتوانی؟"

فەرماندەری سوپاو سەرۆك وەزیر سەریان سووڕمابوو.

بەرامبەریان پیاوێکی لاو وەك چیای سەرکەش راوەستابوو، باڵابەرز، بە روخسارێکی منداڵانەو ریشێکی عەبەنووسی و تێك ئاڵقاو، بە جەستەیەکی تاوەسووت و رەنگێکی پەڕیوو بە جووتە چاوێکی تیژی رەشەوە کە وەك بڵێسە دەدرەوشانەوە.

"ناتوانم قبووڵی بکەم"

"ئەگەر ئەتۆ قبوولّی نەکەی ئێمەش ناتوانین هەروا لێرە لەدەروازەی ئەستەمبوولّ بەجێت بهێڵین"
"دەزانم"
"ئەتۆ پێنج هەزار کەست هەیە, ئەو سوپایەی بۆ بەغدا دەچێ سێسەد هەزار کەسە..."
"دەزانم"
"ئێمە وەختێك دەتوانین بچینە شەڕی بەغدا کە بگەڕێینەوەو لەپێش دا کاری تۆ یەك لا بکەین"
"دەزانم"
"ئەم سوپایە تۆ دەشکێنێ. پاش ئەوەی گرتیانی بە رووت و قووتی سواری ولاغت دەکەن و بەبازاڕی قوونیەدا دەت گێڕن"
"دەزانم"
"جەللادێك دەست و لاقت دەشکێنێ و هەڵیان دەکەنێ و لە لەشتیان جیا دەکاتەوە, بەزیندوویی کەولّت دەکەن, بە چەند رۆژان لەت و کوتت دەکەن و بە جەزرەبە دەت کوژن"
"ئەوەش دەزانم"
"ئەی کەوایە چ بەلاّیەکتە"
"ئەمن ناچارم لێتان یاغی بم"
شێخی سەقاریە, ئەو پیاوە کە ناچار بوو یاغی بێ, سواری ئەسپێکی بۆرە بوو کە لەبەردەرگا راگیرابوو, بەرەو چیاکان باڵی گرت و رۆیشت.
سولّتان مرادیش سوپای بەغدایەی بۆسەر وی دەنگ دا. لە چیاکانی سەقاریە شەڕێکی سەخت هەڵگیرسا. هەتا ئێوارەی ئەو رۆژە سوپای شێخ کەسیان بە زیندوویی دەرنەچوو. لای ئێوارێ شێخیان بەدیل گرت. لە چاوە ڕەشە پڕ بلّێسەکانیدا ترسێك نەدەبینراو لەروخساری جوان و رێك و پێکیدا خەفەتێك نەبوو.
لەشاری قوونیە سواری ولاّغێکیان کردو دایانە دەست جەللاد.
جەللاد هێدی هێدی ئەوی کەولّ کرد, جومگەکانی لەشیی شکاندن و لێی کردنەوە, بەلاّم لە روخساری ویدا چووکترین نیشانەی ئێش و ئازار بەدی نەکرا.
پێش ئەوەی جەللاد سەری لە لەشی جیا بکاتەوە گوتبووی:
"یا دەدەسولّتان (ناوی شێخانی مەولەویەیە ـ م) وەرم گرە."
لای بەیانی نەختێك خەوتن. حەمەد هیچ حەزی نەدەکرد بخەوێ. پێی خۆش بوو شەوو رۆژ گوێ بۆ قسەکانی مەلا رابگرێ: ئەم مەلافەرهادەش چەندە شت دەزانێ. ئەو دەبوو هەموو شتێك لە مەلافەرهاد

بپرسیّ, لەبارەی هەموو شتێکەوە پرسیاری لیّبکا, مرۆڤ, دار, گیا, گوڵو ئەستێرەو هەرچی لەم جیهانەدا هەبوو و نەبوو, لەبارەی هەموو نهێنی‌یەکانەوە دەبوو پرسیاری لیّبکا. ئەو بۆچی ئەوەندە لەچیاو بەندەنان گەڕابوو؟ وەك هیچ کەس نەدەچوو, نە چەتە, نە پێش نوێژ, نە قاچاخچی, نە سەربازی ڕاکردوو, نە شارستانی و نە لادێیی. حەمەد نوقمی سەرسوڕمان بوو. هەتا ئەم تەمەنە بنیادەمی وای نەدیبوو.

لەگەڵ تولعی بەیانی, وەك سەرانسەری شەویّ خەوتبن, بەکەیف و دەماغ هەستان. خۆیان پۆشتە کردەوەو هاتنە لێواری گۆلاوەکە. ماسیی سووری خاڵدار لەنێو مژی بەیانی لە قووڵایی ئاوی ڕوونی گۆلاودا وەك بریسکە دەهاتن و دەچوون. تاوێك لە قوژنێنێك خڕ دەبوونەوەو هێندی چاوترووکانێك وەك پریشك بڵاو دەبوونەوەو لەبەرچاو ون دەبوون. لەنێو ئاوەکەدا سەمای ماسی‌یەکان و تیشکی هەتاو تێکەڵ بەیەك ببوون.

"یا دەدەسوڵتان وەرم گرە..." ئەمەندەی گوتبوو و بەس, هیچی دیکەی نەگوتبوو, ئەویش لەو لەحزەیەدا کە جەللاد ساتۆرەکەی لەملی دابوو. ئەم ڕستەیەو دیمەنی خلۆربوونەوەی سەر لەسەر زەوی لەحاڵێك دا خوێن فیچقەی لیّدەکرد, هەموویم لەپێش چاوە. ئەمشەو پیرسوڵتانم لەخەو هات. لەسەر بەردێکی سپی دانیشتبوو شێعری دەخوێندەوەو پەیتا پەیتاش دەیگوت دەدەسوڵتان پێم گەیشتی؟ زەردەخەنەیەکی لەسەر لێوان بوو, پێکەنینێك وەك تیشك پاك و وەك ئاو ڕووناك.

"لەبەرەکەتی وانە کە ئەم جیهانە هێشتا لەجێی خۆیەتی. ئەگەر ئەوان نەبوونایە لەمێژ بوو زوڵم و خەراپەو کاری دزێوو ناشیرن دنیایان دادەگرت"

حەمەد قسەکانی بۆ سەلماند:

"بەڵیّ زوڵم دنیای دادەگرت"

حەمەد چاوی لەئاوەکەوە بڕیبوون و بەگۆشت و پێست و ئێسکەوە لە تەپڵی سەریەوە هەتا سەری نینۆکانی لەبیرێکی قووڵ دا نوقم ببوو. تیشکی هەتاو لەسەر وردەخیزەکانی بن ئاوەکە هەر دەهات و گەورەتر دەبوو. بڵاو دەبووەوەو لە قەراخەکان دەکووژایەوە.

"کەوایە, ئەو وەختەی سەری لەلەشی جیا دەبووەوە گوتی: یا دەدەسوڵتان وەرم گرەو هیچی دیکەشی نەگوت. نە پاڕانەوەیەك, نە تکایەك, هیچ قسەیەکی دیکەی نەکردبوو".

مەلافەرهاد بەزەردەخەنەوە گوتبووی:

"ئەدی هەر ئەوەندەی گوتبوو"

وەختێك گەیشتنەوە ئەو ماڵە کە لێی دەژیان, دیتیان موسلیم شوان لەبەر دەرگا دانیشتوەو چاوەڕێیانە.

کەچاوی بەوان کەوت هەستاو گوتی:

"ئەمن دەناسیەوە حەمەدۆك؟"

"دەت ناسمەوە, ئەتۆ ئەو شوانە نی کە یاوەر سەگەکەتی کوشت, ئەوەندەیان لـێدابووی خوێنت دەمیزت؟"
موسلیم گوتی:
"بەڵێ هەوم, وەختێکیش عەلی کەرتیش و یاوەری دەکوژم"
مەلافەرهاد بەزەردەخەنەوە گوتی:
"جارێ راوەستە. جارێ راوەستە دوایە بیان کوژە, ئێستا بڵێ بزانم بۆچی هاتوویە ئێرە؟"
موسلیم بەناڕەحەتی‌یەوە گوتی:
"بەڵام چاك غەیب بوون ها , ئەوەندەتان بەدوادا گەڕام ئاوێ لاقانم چوو, بنی پێڵاوەکەم کون بوو"
ئەمەی گوت و بەری کەوشەکانی نیشان دان. بەری پێڵاوەکەی بەجارێك سوابوو و ڕۆیشتبوو.
"پێڵاوێکی نوێت بۆ دەکڕم, ئێستا بڵێ بزانم بۆ هاتووی؟"
"مام عەلی‌یەشەل منی ناردوە بتان بینمەوە"
ئەمجار چاوی لە مەلافەرهاد داگرت دابێتەوە سەری. مەلافەرهادی لەحەمەدۆك زیاتر بەردڵ کەوتبوو.
مەلافەرهاد داهاتەوەو گوێی هێنایە بەردەمی.
"دەزانی, لەخۆت بەولاوە نابێ کەس بزانێ کە عەلی‌یەشەل منی ناردوەتە ئێرە. ئەگەر کەس بزانێ هەموو کارەکان تێك دەچنەوە. دنیا پڕە لە بنیادەمی زاربەهاوار. ئێ؟"
مەلافەرهاد لەحاڵێك دا پشتی راست دەکردەوە گوتی:
"ئێ, ئەتۆ ئەو خەبەرەمان پێ بڵێ کە بۆت هێناوین"
موسلیم شوان بەگومانەوە تەماشای دەوروبەری خۆی کردو کە زانی کەسی لـێنیە بەدەنگێکی سەیر گوتی:
"دەستەی وەلی کوزگوون دێن بتان کوژن"
دەنگی ئارامتر کردەوە:
"مام عەلی‌یەشەل گوتی ئاغاکانی شارۆچکە پوولێکی زۆریان داوەتێ کە ئێوە بکوژێ. قەرارە حکوومەتیش لێی خۆش بی. ئەویش قەرارە بچێتە کێلگەکەی و هەتا دەمرێ لەوێ پاڵی لـێبداتەوە. عەلی‌یەشەل ئەمانەی پێ‌گوتم"
مەلافەرهاد باوەشی پێدا کردو گوتی:
"هەر بژی موسلیم"
بەدوای ئەوەدا دوعایەکی بەسەردا خوێندو فووی لـێکرد.
موسلیم پێ‌کەنی و گوتی:

"زانیم ئەتۆ مەلافەرهادی... ها... ئەتۆ چەند پیاوێکی گەورەی..."

موسلیم لەوە کە ئەوی دیوە زۆر خۆشحاڵ بوو.

"ئەتۆ من لەکوێ دەناسی؟"

"ئەمن تۆ دەناسم, زۆر باشیشت دەناسم"

حەمەد بەمەراقەوە پرسی:

"ئێمەت چۆن دۆزیەوە؟"

موسلیم گوتی:

"ئەمن دەبینمەوە. باشترە باسی ئەوەی نەکەین, ئەتۆ کاڵەك خۆری یان بێستان ڕن؟ ئێستا ئەمن دەچم وەلی کوزگوون دەبینمەوە"

دەنگی نەوی کردو پاش ئەوەی لە چەپ و ڕاستی خۆی ڕوانی گوتی:

"مامەشەلە گوتی لەپێش دا خەبەر بەوان بدە پاشانیش وەلی کوزگوون وەبینەو جێیەکەی بەوان بڵێ. ئەمن دەڕۆم, کارێکت نیە؟ ئێوە لەهەر کوێ بن ئەمن دەتان بینمەوە..."

"موسلیم شتێك بخۆ جا بڕۆ"

"توێشووم پێیە, لەپشتێم بەستوە. پارەشم لەگیرفان دایە"

لەکاتێك دا لاسای عەلیەشەلی دەکردەوە, یەك دوو هەنگاو بە شەلەشەل ڕۆیشت وگوتی:

"ئەو پێی گوتم دەرفەت لەدەست نەدەم و بەخۆڕایی وەخت بەفیڕۆ نەدەم. خواحافیز"

وەڕێ کەوت, پەنجا شێست هەنگاو دوور کەوتەوەو گەڕایەوە.

"کاك حەمەد ئەسپێکت هەیە ها, ئەسپی تۆیە؟ شێت بووە. بووەتە بەڵایەك بۆخۆی. دوێنێ لەدەشتی "قەرە ساقروون" دیتم, لەدڵی خۆم دا گوتم ئەم ئەسپە هی حەمەدۆکە. با بچم دەستی بەیاڵان دا بێنم و ملی بخورێنم. بریا هەر نەچووبام. هێندەی نەمابوو بم کوژێ.

یاوەر فەرمانی داوە هەروەخت, لەهەر جێیەك ئەو ئەسپەتان دی پێش حەمەدۆك تفەنگ بەوەوە بنێن. بەڵێ, حەمەدۆك ئەویش حوکم دراوە. ئەو یاوەرە سەگەکەی منیشی کوشت. ئەمنیش ئەوی دەکوژم. ئەگەر ئەسپی تۆ بکوژێ...

دەڵێن دێهاتیەکانیش ناتوانن تخوونی ئەسپی تۆ بکەون. دێهاتیەکان دەڵێن وەختێك لێی نیزیك دەبنەوە ئەسپەکە غەیب دەبێ. بەجارێك لەپێش چاو ون دەبێ, ئەو ئەسپە وایە, هیچ ئەخلاقێکی باشی نیە, ئەگەر بیکوژن هیچ پەرۆشم نابێ. ئا...خ, سەگەکەی منیش وابوو"

ئەمەی گوت و هەناسەیەکی هەڵکێشا.

## (٢٦)

ئەسپی خەنەیی باڵی گرت و هات لەنێو مێرگ و مێرغوزارێکی سەرسەوزو پان و بەرین دا ڕاوەستا. سەری هەڵبڕی, گوێی لەچەرمەوە بردن. لێرەوارەکە دەوران دەوری دەشتەکەی داگرتبوو, هەڵڵاو هەنگامەیەکی لێ‌هەڵدەستا. گەڵا زەردەکان زەویی سەرسەوزیان دادەپۆشی. سێبەری بەیانی کەوتبوونە سەر دۆڵو دەرەی کێوە مژاوی‌یە دوورەکان. ئەسپ کە بێ‌جووڵە لەجێی خۆی چەقیبوو, تەکانێکی دایەخۆی, ماسوولکەکانی شل کردن و پێستی کەفەڵی وردەگنجێکی تێ‌کەوت. ئەندامی ڕێك هات. ماسوولکەکانی بەرزگیی وا شل کردن کە زگی گەیشتە سەر زەوی. چەند لەحزەیەك وا مایەوە. سەری ڕاست کردەوەو بەگومانەوە لە چەپ و ڕاستی خۆی ڕوانی. لەزۆر دووری جاروبار بەردەڵانێك وەك ئاوێنە دەبریقایەوە. کە تیشکەکەی لەچاوی ئەسپەکەی دەدا, ئەسپەکە دەسڵەمیەوەو گوێی لەچەرمەوە دەبردن و تەماشای ئەم لاو ئەولای دەکرد. لەنێو مێرغوزارەکەدا سێ کانی هەڵدەقوڵێن کە بنەکەیان وردەبەردێکی وەك کەڵلا بوو و لە قەراخەکانیشیان پنگێکی گڵووك وەنەوشی ڕوابوو. لەسەر ڕووی ئاوی کانی‌یەکان ئاوڕوون کەرەوەی چووکەڵە چووکەڵە بەخێرایی ئەم سەرو ئەوسەریان دەکردو لە هاتوچۆدا بوون.

ئەسپی خەنەیی بە ئارامی‌و زۆر بەسپایی هەروەك بەرێگادا نەڕوا چووە سەر نیزیکترین کانی. سەری نەوی کردو لەحاڵێك دا هێدی هێدی کلکی ڕادەوەشاند دەستی کرد بە ئاوخواردنەوە. بەهیچ جۆر دمی لەئاوەکە نەدەکردەوە. لەو سەرە, لە عەوێقی ئاسمان هەڵۆکان سنگیان دابووە بەر باو بەئارامی دەفڕین. سێ سێروو هاتن, لەسەر کانی‌یەکە نیشتن. ئەسپەکە ئەختێك سڵەمیەوە. سەری هەڵبڕی و دیسان دەمی پێوە نایەوە. چەند لەحزە دواتر پۆلە پەپوولەیەکی سپی وەك هەورێکی سپی

هاتن لەسەر گوڵە بنەوشی‌یەکانی پنگی دەوروبەری کانی‌یەکە هەڵنیشتن. بۆ دەمەساتێك ئەسپ و مێرغوزار لەنێو هەوری سپیی پەپوولەدا ون بوون.

ئەسپەکە سڵەمیەوە, سەری بۆ سەروخوارو کلکی بەخێرایی بۆ چەپ و ڕاست راوەشاند. پەپوولەکان هەڵدەفڕین و دووبارە دەهاتنەوە لەسەر پنگەڵەکە دەنیشتنەوە. چەند لەحزەیەك ئەسپ لەنێو پەپوولەدا ون بوو. ئەسپ کە لێکدا لێکدا سەری هەڵدەتەکاندو بەتوندی کلکی رادەوەشاند دەستی کرد بەغاردان. پەپوولە لەکۆڵی نەدەبوونەوە. دەورەیان دابوو, لەگەڵی دەفڕین و دەڕۆیشتن. پەپوولەکان لەبەر تیشکی هەتاو وەك پووڵەکەیەکی درەوشاوەو بریقەدار دەچوون.

ئەسپەکە لەگەڵ پەپوولەکان لەسەرێکی مێرغوزارەکەوە دەچووە ئەوسەرو دەگەڕایەوە. ئەمجار رادەوەستا. بەلاقی پێشەوەی سمکۆڵی لە زەوی دەکرد, جیفڕکی هەڵداویشت و دەستی دەکردەوە بەغاردان. دەکەوتە چوارناڵی, بەڵام بەهیچ جۆر نەیدەتوانی خۆی لەدەست پەپوولەکان رزگار بکا. سەرەنجام شەکەت و ماندوو لەنێو مێرگەکە راوەستا. پەپوولەی سپی لەسەر سەری تێکیانەوە داویشت و ئەویش بەکەللەشەقی لەجێی خۆی چەقیبوو و نەدەبزووت. ئاوی هەرسێ کانی‌یەکە سەرڕێژی کرد, هەڵچوو, بە کەفی سپی‌یەوە هەڵقوڵی و بەسەر چیمەنە سەوزەکەدا رۆیشتەخوار. ئاو گەیشتە ئەژنۆی ئەسپەکە. پەپوولەی سپی سەر ئەسپەکەیان داپۆشیبوو. ئاو بەرەو لێرەوار شۆڕ بووەوەو رۆیشت. هەتاو لەخوار کانی‌یەکانی دا. لەو سەرە, لەئاسمان شەهێنەکان دەت گوت بەبەری ئاسمانەوە نووساون و گیریان کردوە.

لەنێو لێرەوارەکەی خوارێ بلێسەیەك لێی داو کووژایەوە. ئەسپەکە بەدیتنی گڕی ئاگر لەجێی خۆی مات بوو, بەجۆرێك کە خەریك بوو بەرزگی لەزەوی بدرێ. گوێی‌یەکانی مات کردن, یاڵەکانی لە چڵە دڕووە زەردکەیەك دران. بەرەبەرە ژمارەی ئەو پەپوولانەی لەسەر ئەسپەکە نیشتبوون و کەس نەی‌دەزانی لەکوێ ڕا دێن, زیاد دەبوو. ئەسپ لەنێو پەپوولەکان دا ون ببوو. هەتاو وڵاتی دەبرژاند. زەردەگەرمایەکی تۆزاویی خنکێنەر هەموو جێ‌یەکی داگرت. گیا, کانی‌یەکان و بڕکە پنگە گوڵ بنەوشی‌یەکان وشك بوون. تورێژێك لە تەپ و تۆز لێرەوارو گیاو گوڵ و ئاوی داگرت. هەموو جێ‌یەك لەبن تۆزدا ون بوو دەت گوت بەفر باریوە. ئەسپی خەنەیی خۆی راوەشاند. تۆزوخۆڵ و پەپوولەکان کەوتنە سەر زەوی. چەند لەحزە دواتر دایەحۆری بەدەستێکیەوە تەناف و بە دەستی دیکەیەوە باقە گیایەك لەئەسپەکە نیزیك بووەوە. لەنێوان دایەحۆری و ئەسپەکەدا بلێسەیەك هەستا. ئەسپ کەوتە غاردان و بەرەوپێش بازی دا

وێڕای ئەو ئاگرە کە گەمارۆی دابوو، دەستی کرد بە سووڕان. دایەحۆری لەم بەری ئاورەکە ڕاوەستابوو و تەماشای ئەسپەکەی دەکرد کە لەگەڵ گڕی ئاگرەکە بەدەوری خۆیدا دەسووڕا. ژمارەیەك دێهاتی بەدەستێکیانەوە تەناف و لەدەستی دیکەیان دا گیا لە لێڕەوار هاتنەدەرو بۆلای ئەسپەکە چوون کە هەروا لەگەڵ گڕی ئاگرەکە بەدەوری خۆیدا دەسووڕا. ئەوانیش لەپشت دایەحۆرییەوە ڕاوەستان. دەستە دەستە دێهاتی لەدارستان دەهاتنەدەرێ و لە پاش دایەحۆری خڕ دەبوونەوە. ئەمجار لەدەورویەری ئەسپەکە کە لەگەڵ گڕی ئاگرەکە دەسووڕا کۆزیلکەیان بەست. ژمارەی ئەوانەی لە دەوری ئەسپەکە کۆ ببوونەوە هەر دەهات و زیاد دەبوو. بڵێسە ئاگرەکان بەرەو کووژانەوە چوون و ئەسپەکە دیسان کەوتەوە نێو هەورێکی سپیی پەپوولە. بەهەڵسووڕانی ئەسپەکە پەپوولەکان بڵاو دەبوون، بەڵام وازیان لێ نەهێنا. لەهەموو لاوە تەناف هاوێژرانە ئەسپەکە. لەگەڵ هەر سووڕانێکیدا لەگەڵ تەنافەکان تێك دەئاڵقا.

لەنەکاو لەحزەیەك لەسەر زەوی چۆکی داداو هێندی چاو لەسەر چاو دانێی ڕۆیشت و لەبەرچاو ون بوو. دێهاتییەکان بە سەرسوڕماوی هاتنە ئەو جێیە کە ئەسپەکە تێیدا هەڵدەسووڕا. بەئەندازەی جێخەرمانێك گیاکانی پێخوست ببوون. سمی ئەسپەکە زەوییەکەی قوولکە قوولکە کردبوو.

بایەکی توندی هات و گەڵا زەردەکانی بڵاو کردنەوە. دێهاتییەکان وەبن گەڵاکان کەوتن. دایەحۆری لەحاڵێك دا پێدەکەنیو جنێوی بە ئەسپەکە دەدان، تەناف بەدەست لەبن گەڵاکان هاتەدەر. دێهاتییەکانیش گەڵاکانیان لەسەر خۆیان وەلاداو تێیەوە ڕامان. دایەحۆری هەرکە چاوی بەئەسپەکە کەوت لەسەر شاخێك وێستاوە، غاری دایە لای. دێهاتییەکانیش بەدوایدا... دەوری شاخەکەیان دا. ئەسپەکە گوێی نەدانێ. لەسەر دوندی شاخەکە بێجووڵە ڕاوەستابوو، کەلەکەی دابووە بەر هەتاوو سێبەرە درێژەکەی لەگەڵ سێبەری شاخەکە کەوتبووە سەر زەوی.

دێهاتییەکان بە بەردەڵان هەڵگەڕان، هەتا نیوەی شاخەکە چوون، بەڵام ئیدی نەیان توانی بستێك هەورازتر بچن، شاخەکە ڕاژاو هەموو دێهاتییەکان کەوتنەخوار. لەو بەینەدا پیاوێکی ڕەشتاڵەی ماوزەر بەدەست پەیدا بوو، گوتی: ڕاوەستن. چۆکی لەعەرزی داکوتا، سێرەی لە ئەسپەکە گرت و پێنج جاری دەست پێدا هێنا. ئەسپ هەر لەجێی خۆشی نەبزووت و بەدوای ئەوەش دا یاوەر فاڕووق هاتە بن شاخەکە. دێهاتییەکان سەریان بەردابووەوەو بێدەنگ دەستیان بەسنگیانەوە گرتبوو. کشانەوە. یاوەر فاڕووق بەنێوچاوانێکی گرژەوە تەماشای ئەسپەکەی

کردو زەردەخەنەیەکی تاڵ گنجی دەم و چاویی کردەوە. چۆکی دادایەوە. سێرەی لە ئەسپەکە گرت و پێنج فیشەکی لەسەریەك پێوەنان. ئەسپەکە گوێی نەدایە. یاوەر فارووق خێرا فیشەکی خستنەوە ماوزەرەکەی و دیسان پێنج جار لەسەریەك دەستی لێ‌کێشا. ئەسپ هەروەك گوێشی لێ‌نەبێ وا بوو. یاوەر تفەنگەکەی پڕ دەکردەوە لە فیشەك و پێیەوە دەنان و لەم کارەش ماندوو نەدەبوو. هەورێکی پەپوولە هاتن و دەوری ئەسپەکەیان دا. ئەسپ سووڕا, پەپوولەکانی بڵاو کردو پاشان لەگەڵ پەپوولەکان لە لووتکی شاخەکەوە بازی داو وەك باڵندەیەك بەسەر سەری یاوەردا تێ‌پەڕی و چووە مێرگێکی دوور لەوێ. سەیران یاڵی وی گرتبوو و دەی‌برد. یاوەر رووی کردە دێهاتی‌یەکان و گوتی گیانی حەمەدۆك بەم ئەسپەوە بەندە, بەزیندوویی یان بەمردوویی لەئێوەم دەوێ, ئەگەر تا چەند رۆژی دیکە بەزیندوویی یان بەمردوویی بۆم نەهێنن هۆیاڵی خۆتان بەستۆی خۆتان. دێهاتی‌یەکان گوتیان: بەسەرچاو جەنابی یاوەر.

وەکیل باشی عاصم لەبن شاخەکە خزیبوو, تفەنگەکەی لەباوەشی گرتبوو و یەك لەدوای یەك جگەرەی دەکێشاو لەگژ فکرێکی قووڵ ڕاچووبوو.

ئەسپەکە لەنێو مێرگێکی سەرسەوزدا راوەستابوو. یاڵی شۆڕ کردبوونەوەو کلکی رادەوەشاند. لە پان بوونەوەی سمەکانی ڕا دیار بوو کە هەرچوار پەلی پێخواس بوون. نەختێك کز ببوو, مووەکانی گرژ ببوون و نووکی سەری مووی لەشی لەبەر هەتاو کاڵ ببووەوە. هەڵۆ لە پەرپەرۆچکەی ئاسمان, هەروەك بەمیچی ئاسمانەوە نووسابن, دەفڕین.

ژمارەیەك باڵندە, هەموویان سپی, دەستە دەستە لەدارستان هاتنە دەرێ و لەمێرگەکە نیشتنەوەو ئەسپی خەنەیی لەنێو تەختی سپیی مێرگەکەدا وەك پەڵەیەکی ڕەش دیار بوو. هەورێکی سپی لەکێوێکی دوور جیا بووەوەو هات راست لەسەر سەری ئەسپەکە راوەستا. سێبەری هەورەکە کەوتە سەر باڵندە سپی‌یەکان و ئەسپی خەنەیی. وێنەی ئەسپەکە لەگەڵ تیشکی هەتاو لە قوولکە ئاوێکی چووکەڵەدا ڕادەژا. وێنەی ئەسپی خەنەیی لە رووناکایی ئاوەکەدا دەشکایەوە, هەتا دوندی شاخەکە پێ هەڵدەگەڕاو پاشان دەگەڕایەوە. چەند ماسی کە وەك ئاڵتوون دەدرەوشانەوە لەنێو وێنەی ئەسپەکەدا مەلەیان دەکرد.

ئاسمان, مێرگ, پنگە شینەکان و لێرەوار کە گەڵا زەردەکانی با دەی‌بردن, ئەسپ و هەموو شتێك لەنەکاو پاك بوونەوەو ون بوون. هەموو شتێك کەوتە نێو درەوشانەوەیەکی بریقەداری سپی‌یەوە. ئەو نوورەی لەسەر لێرەوارەکە بوو رۆیشتەخوارو تاریکترین کەلێن و قوژبنەکانی رووناك کردنەوە.

داره پرتەقاڵەکان خونچەیان دەرکردبوو و بۆنی گوڵەنارنج شەپۆل شەپۆل لەلێوارەکانی مێدیتێرانەوە هەتا دوندی چیاکان پێ هەڵدەگەڕا.

لەداوێنی چیایەکی دوور گوڵە گوێنێیە سوورو سووراوی و سپی و زەردەکان وەك تۆپەڵە ئاور دەدرەوشانەوەو لەبەر تیشکی هەتاو بلێسەیان دەدا. ئاسۆی هەوراوی رووناك بوو. ئەسپ لاقی راکێشابوون و وای خۆ شل کردبوو بەرزگی لەزەوی دەدرا. چاوی لەکالانە دەرپەڕیبوون، لەنێو سپیێنەی چاوانیدا ڕەگە ڕەگەی خوێن دەبینران. ملی وەك ملی قوو درێژو جوان بوو. لەسەر کێوەکەوە ماینێکی بۆرەی جوان و راکشاوو گەردن کێل کە بەگوڵە گوێنێیە پڕنوورەکان وەدەماغ هاتبوو، لەحالێك دا خڕە بەردەکانی لەبن لاقیدا خلۆر دەکردنەوە، هات و نەختێك لەولای ئەسپی خەنەیی هەروەك ئەوی نەدیبێ راوەستاو دەستی کرد بە لەوەڕان. خەنەیی سەری هەڵبڕیو تەماشای ئەو میوانە تازەهاتووەی کرد. ئەویش ئاوڕی دایەوە بەڵام هەروەك نەیدیبێ، دیسان دەستی کردەوە بە لەوەڕ. مێشێکی سەوزی بەقەد سەرە قامکێك بە وزەوز لەمەودای نێوان هەردووکیان دا یەك تەکان هاتوچۆی دەکرد. کە بەبەر تیشکی هەتاودا دەرۆیشت دەدرەوشایەوەو دوایە دەکووژایەوە.

ئەسپی خەنەیی بەئارامی لەماینەکە نیزیك بووەوە، ماینەکە گوێی پێنەداو بەدەم لەوەڕەوە لە دۆڵەکەی ئەوبەر نیزیك کەوتەوە. لەوێ گوڵە مەخمەریی سوور کە هەریەکەی بەقەدەر لەپەدەستێك دەبوون، بالاپیاوێك هەستابوون و هەتا دەگەیشتنە لێڕەوار هەمووی وابوو. ماینەکە چووە نێو گوڵەکان و بۆ یەکەم جار چاوی لە ئەسپی خەنەیی کرد. خەنەیی غاری دایە پەنای و ویستی بۆنی پێوە بکا. ماینەکە لەنەکاو ویستی ددان لە یاڵ و بژی گیر بکا، خەنەیی بەرەودوا کشایەوە، ماینەکە نەختێك بەرەژێرتر چووە قووڵایی دۆڵەکەوە. خەنەیی دەستی لێ هەڵنەگرت و لووتی بردە بن کلکی. ماین بە جووتەیەکی توند ئەوی لەجێی خۆی راگرت. خەنەیی رقی هەستا، بە چەپ و ڕاستی خۆیدا دەسووڕاو بۆنی دەکرد، ماینەکە گازی لێدەگرت بەڵام خەنەیی گوێی نەدەدایە. ماینەکە جارجار خۆی شل دەکرد، لاقی لێك بڵاو دەکردن و میزی دەکرد.

خەنەیی بۆنی بە میزەکەوە دەکردو لووتی دەئاسمان دەکرد. کونەلووتەکانیی ئەوەندەی بەبەریانەوە هەبوو فش دەکردەوەو بۆنی بە هەواوە دەکرد. ماینەکە رادەوەستا، میزی دەکردو ئەویش لەدەوری هەڵدەسووڕاو بۆنی پێوە دەکرد.

ماینەکە ڕاوەستا، سەری بۆلای خەنەیی وەرگێڕا کە پەڕەکانی لووتی دەلەرزین و بێڕاوەستان فش دەبوون و وێك دەهاتنەوە. ئەندامی بەرزگی رادەژا. ماینەکە خۆی لێك

کێشایەوە, لاقی لێك بڵاو کردن, کەفەڵی کە لەسەرەخۆ گنج دەبوو لێك دەکشایەوە. خەنەیی لاقی پێشەوەی هەڵێنان و هاویشتنیە سەر ماینەکە. ویستی گاز لەملی بگرێ کەچی نەیتوانی, لاقی هێنانەوە خوارێ. دووهەمین هەوڵیشی سەرنەکەوت. سێهەمین جار ئیدی یالی ماینەکەی بەرنەداو توانی سواری بێ. لەو حاڵەدا کەفەڵی بەتوندی دەبزووت, دەهات و دەچوو, لەپێش دا زۆر بەتوندی پاشان بەهێمنی. لاقی پێشەوەی خەنەیی کە هاویشتبوونیە سەر ماینەکە, پشتی و کەفەڵی هەموو دەلەرزین.

لەو بەینەدا هەورێك لە پەپوولەی سپی لەحاڵێك دا دەوروبەری خۆیان لە رووناکیدا نوقم کردبوو, هاتن و ئەم دوانەیان وەبن خۆ دا. پاش ئەوەی لاقی خەنەیی لەسەر ماینەکە هاتنەخوار پەپوولەکان بەدەم درەوشانەوەوە دەستە دەستە بڵاو بوون و لەحاڵێك دا چەند هێڵی شکاویان لەئاسمان دا دەکێشایەوە, رۆیشتن.

خەنەیی و ماینەبۆرە لەجێی خۆیان گوێیان بەردابوونەوەو سەریان بەرەو زەوی نەوی کردبوو.

لەلای رۆژهەڵاتەوە تۆپەڵە ئاورێك هات, بەنێو گوڵەکان دا تێپەڕی و بەدەوری ئەسپ و ماینەکەدا خەرمانەی کێشا. خەنەیی بە قەڵەمبازێك بەسەر گڕی ئاورەکەدا خۆی فڕێ داو بەرەو چیا دەخۆی نووساو بە تاوێکیش لەپشت مژی زەردو سوورو سووراویی گوێنییەکانەوە ون بوو و رۆیشت. خەنەیی و ماینەکە لەنێو گیایەکی تەڕو تازەدا بوون کە دەگەیشتە ئەژنۆیان. دەت گوت لەقاتی بەربوون. دەلەوەڕان و سەریان لەسەر زەوی هەڵنەدەپچڕی. لە دوور لەخوار دارستانەوە لە شوێنێك دووکەڵێکی خەست هەڵدەستاو بەرەو بنار دەخزی و بڵاو دەبوو. هەڵۆکان سنگیان دابووە بەر بایەکی سارد کە لە بەرزایی دەهات و باڵەکانی خۆیان ئەوەندەی دەکرا لێك کردبوونەوەو لە ئاسمانی ساف و بەتاڵ دا دەگەڕان.

لەپشت چڵە دڕکەکانەوە کچێك وەدەر کەوت کە باسکە درێژو تاوەسووتەکانی دەگەیشتنە سەر ڕانی و کراسێکی ڕەنگ نارنجیی لەبەردا بوو. بۆلای ئەو ولاغانە کە شل ببوون و داهێزابوون رۆیشت و هاتە کن ماینەبۆرە. ماینەکە کاتێك چاوی بەو کچە کەوت سەری هەڵنەبری, تەماشای کردو چاوەڕێی ما. کچەکە یالیی گرت, سواری بوو و تێی تەقاند. خەنەیی لەحاڵێك دا بۆنی بەبن کلکی ماینەکەوە دەکرد نەختێك وەدوایان کەوت. وەختێك کچەکە ماینەکەی لینگ دا خەنەیی لەجێی خۆی راوەستا. ئەوان دوور کەوتنەوە, خەنەیی چەند جار لەسەر یەك حیلەیەکی درێژی کرد. لەسەر پێشووانی راوەستاو هەتا لەبەرچاوی ون بوون لەپشتەوەڕا سەیری کردن. بە خەمناکی گەڕایەوەو دیسان دەستی بە لەوەڕ کردەوە.

ئەسپی خەنەیی هەتا کازیوەی بەیانی لە قەراخ ئەو گۆلاوە شینە راوەستا. رووبەری ئاوەکە هەڵماوی بوو, هەور لەسەر گەڵای زەردی لێرەوار هەڵدەستان. ماینەبۆرە وەڵامی حیلەی ئەسپەکەی بە حیلە دەدایەوەو زەویی هەڵدەکەندو لاقی شل دەکردن و میزی دەکرد. خەنەییش لەحالێك دا کونەلووتی فش کردبوون پڕ بە قووڵایی هەناوی هەوای هەڵدەمژی.

خەنەیی خۆی پێ ڕانەگیرا, خۆی بە ئاوە شینەکەدا داو لەحاڵێك دا ئاوەکەی کەفاوی دەکرد, بەرەو ئەوبەری گۆلاوەکە کەوتە مەلە. ماینەبۆرەش خۆی دەئاوێ هاویشت. لەنێوەڕاستی گۆلاوەکە گەیشتنە یەکتر. خەنەیی بە ددانەکانی گازێکی لەملی گرت. ماینەکە هەوڵی دا خۆی رزگار بکا, سەرەنجام خۆی بەرەڵلا کرد. پێکەوە هاتنە قەراخی گۆلاوەکە. ماین لەحاڵێك دا ئاوی لێدەچۆڕا, ئەوەندەی دەیتوانی لاقی لێك کردنەوەو میزی کرد. خەنەیی هاتە پەنای و ویستی خۆی باوێتەسەر, کە لەنەکاو دێهاتیەیە تەناف بەدەست و چەکدارەکان دەورەیان دان. ماینەکە ئالۆزا, حیلاندی و لەحاڵی ئاسایی دەرچوو. بەرەبەرە حەشیمەتی تەناف بەدەستی دێهاتی زیاتر دەبوون و بۆلایان دەهاتن.

تۆپەڵە ئاورێك کە دیار نەبوو لەکوێ ڕا هاویژراوە, هات و لەنێو هەردووکیان دا کەوت. درەوشایەوەو کووژایەوە. هەورێکی سپیی پەپوولان لەسەریان نیشتن و خەنەیی بەسەر حەشیمەتەکەدا تێپەڕی, بەرەو گۆلاوەکە چوو و بەمەلە پەڕیەوە ئەوبەری ئاوەکە. ماینەبۆرەش بە دوایدا هات. هەردووکیان لەئاوەکە هاتنەدەر, خۆیان راوەشاندو ئاوەکەیان چۆڕاندەوەو چوونەوە نێو لێرەوار.

لە هەوای خۆش و نە ساردو نە گەرمی بەهاریدا, لەحاڵێك دا سمیان بەئەسپایی لە زەوی ڕۆدەچوو, چوونە نێو باغە پرتەقاڵێك کە خونچەی دەرکردبوو. ئەو بایەی دەهات, شەپۆلی بۆنێکی خۆشی نەناسراوی دەهێنایە بەر لووتیان, لە باغە پرتەقاڵەکە تێپەڕین. کرێکارەکان دوولا هاتبوونەوەو لەکێڵگەکەدا کاریان دەکرد, بەنێویان دا رۆیشتن. کرێکارەکان وا سەرگەرمی کاری خۆیان بوون کە ئەو ئەسپ و ماینەیان نەدی کە بەبەر دەمیان دا تێپەڕین... گەیشتنە لێواری دەریایەك کە شەپۆلەکانی هێندی منارەیەك بەرز بوون, کەفاوی و بێئەندازە پان و بەرین بوو. لەحاڵێك دا کەلەکەیان ڕەکەلەکەی یەکتر دەخشاند لەقەراخ دەریاکە مانەوە. سێبەری هەردووکیان کەوتبووە سەر خیزەکە. شنەبایەك هەڵیکردو بێهەست بوو. جارجار, لەحزەیەکی کورت سروەبایەکی دەهات و بێدەنگ دەبوو. هەوا زۆر گەرم بوو. بەدوای ئەم گەرمایەدا دەریا روون بوو, رووبەرەکەی ساف و رێك و لووس بوو. هەروا کەمێك گنج و لۆچی تێدا بوو. لەنێو دەریاکەدا سەری ئەسپێك دەرکەوت کە بەرەو ئەوان مەلەی دەکرد.

ماینەبۆرە ئارامی لێ هەڵگیراو ویستی رابکا. بۆنی گوڵەنارنج بەرەو دەریا رۆیشت و پەرەی لووتی ماینەبۆرە لەرزین. سەری ئەسپەکە لەنێو دەریاوە دەهاتەپێش و نیزیکتر دەکەوتەوە. هات و راست رووبەرووی وان لە دەریا هاتەدەر. ئەسپێك بوو یەکدەست و رەش و بەخۆوە کە چاوگەورەو گوێ مەقەست بوو. یاڵەکانی بەزەنگیانە نەخشابوون. پاش ئەوەی ئاوی لەشی چۆڕاندەوە لە ماینەبۆرە نیزیك بووەوە. بۆنی پێوەکرد. ماینەکە نەیتوانی هیچ دژکردەوەیەك لەخۆی نیشان بداو بەهیچ جۆر نەبزووت.

خەنەیی بەسەرسوڕمانەوە چاوەڕوانی دژکردەوەی ماینەکە بوو. ئەسپەکە بۆنی بەهەموو لەشی ماینەکەوە دەکرد. تۆپەڵە ئاورێکی سوور لە دەریا هەڵستاو کەوتە قەراخی دەریا. خەنەیی کەوتە غاردان و پەلاماری ئەسپەکەی دا. ماینەبۆرە کشابووەوەو تەماشای دوو ئەسپی رق هەستاوی دەکرد کە تێك ئاڵقابوون.

مل بەملە درێژەی کێشا. مووی کلك و یاڵیان لەهەوادا باڵی گرتبوو و لەشیان بە ددانی تیژ بریندار ببوو، خوێنی لێدەچۆڕا. ئەسپەکان رەنگیان سوور هەڵگەڕابوو، وای لێهات هیچیان توانای تەکانیان نەما. خەنەیی بەکێش تر بوو. ئەسپەکەی وەپێش خۆی داو بەنێو کێڵگەو دارە پرتەقاڵەکان دا هەتا کێوەکان ڕەپێی ناو هەتا لەدارستان نەدیو بوو، وەدوای کەوت، ئەمجار گەڕایەوەو هاتە قەراخ دەریا. ماینەبۆرە، لەحاڵێك دا لاقی لێك کردبوونەوە، هەرلەوێ چاوەڕوانی بوو. خەنەیی سەرباری ئەو ماندوێتییەیەش لاقی پێشەوەی هەڵێنان و راست لەو بەینەش دا هەورێکی سپی پەپوولە هاتن و بە باڵەفڕە ئەوانیان داپۆشی.

وەختێك هەورەکە بڵاو بوو، ئاپۆرای دێهاتییە تەناف بەدەستەکانیان رووبەڕووی خۆیان دی. ئەم جار ژمارەیان زیاتر بوو. هەموویان پێکەوە بۆ گرتنی وان تەنافیان هاویشت. بڵێسەیەك تەقیەوە. خەنەیی پاش ئەوەی سێ جار بەدەوری خۆیدا سووڕا، بازی دایە نێو دەریاو ماینەبۆرەش بەدوایدا...

چەند لەحزە دواتر دەنگی سەرسوڕمانی حەشیمەت لەدوورەوە دەهاتە بەرگوێ. ئەسپ و ماین بەپاڵ یەکەوە لەدەریای بێبڕانەوەدا بەرەو بێکۆتایی مەلەیان دەکرد.

## (٢٧)

کاتێك لەبەندەنێ ئاوا بوون گوندی "سەقزلی"یان لەبەردەمی خۆیان دا دی. ئاوەدانی لەگۆڕاییی لێواری گەڵێیەك پاڵی بەچیای شینی "کەکیکلی"یەوە دابوو. زۆر لەخانووەکان نیوەڕووخاو بوون. لە قەڵشتە دیواری ماڵەکان گیاو هەنجیری خۆڕسك و گوڵی کێوی سەریان دەرهێنابوو. هەموو کێلە قەبرەکانی گۆڕستانە چووکەکەی دەرەوەی گوندیش رووخابوون.

قاسم وەختێك گەیشتە پشت دێ و لەسەر بەردێك دانیشت, لەحاڵێك دا نێوچاوانی تێك دەنا گوتی:

"ئەمە ماڵی ئێمەیە"

بەدەست خانوویەکی دوونهۆمی نیشان دان کە حەوشەیەکی گەورەی هەبوو و بە بەردی نەتاشراو دروست کرابوو. سواغی دیوارەکانی لێبببووەوەو چینە بەردەکان دەرکەوتبوون.

"وەختێك خەڵکی دێکەمانیان دەرکرد, تەنیا ئەمن بووم کە دووبارە هاتمەوە ئێرە. بە هەمووانمان لەبەر ناچاری هەموو بزنەکانی مەحموودئاغای گەڵی شکۆفە, ئاغای ئاوەدانیمان خواردبوو. برسیەتی وایە ئیدی. زگی برسی لەخوای ناترسی..."

قاسم پیاوێکی کەم دوێ بوو, بەڵام ئێستا زمانی کرابووەوە.

"دەزانی لەچی قەڵسم؟ ئێمەی لەم دێیە دوور خستەوە باشە, دەڵێم چونکە بزنەکانیمان خواردبوو, بەڵام ئەدی ئەو دێیەی چوکووراوامانی بۆ لێئەستاندین؟ ئێمە گیانمان دەرهات هەتا ئەو زەوییانەمان بۆ کشتوکاڵ ئامادە کرد"

ئەمجار دەستەکانی خۆی نیشان دان. جێی ساغی لەدەستان دا نەبوو. جێی نەبوو دڕوو هەڵیان نەدڕیبێ و داس و تەورداس و تەور نەیان بڕیبێ. دەستی وەك دەستی جانەوەرێکی سەیر دەچوون.

مەلافەرهاد کە لەپەنای وی هەڵترووشکابوو گوتی:

"ئەوەی ئەتۆ کوشتت برا چووکەی مەحموودئاغا بوو, نا؟"

"ئەرێ, بە گوللەیەك مێشکی هەڵتەکا, دەت گوت شووتی‌یە بە عەرزیت دا داوە"

"جگە لەتۆ خەڵکەکەی دیکەش بەرهەڵستی‌یان کرد؟"

"نا, ئەگەر کردباشیان هیچیان لەدەست نەدەهات. مەحموودئاغا چەکداری زۆر لەدەورە بوون, حکوومەتیشی لەپشت بوو. پاشان ئێمەی باش چاوترسێن کردبوو. ئەوانەی وا دەترسێن هیچیان لەدەست نایە"

"ئەدی ئەتۆ چۆنت ئەو کارە کرد؟"

"چونکە ئەمن سەد هێندە, هەزار هێندەی وان دەترسام. بۆخۆشم نەم زانی چۆنم ئەو کارە کرد. قامکم لە پەلەپیتکەکە درابوو"

"ئەدی ئێستا قاسم؟"

"ئێستا ئەوەندە مردووم و زیندوو بوومەوە کە لەگەڵ ترس ڕاهاتووم"

"وەك بیستوومە خەڵکی دێیەکەتان, خەڵکی سەقزلی هەموو سەری خۆیان هەڵگرتوەو چوونە جێیەکی دوور کە کەس ناوونیشانی نەبیستوەو ئێستا بێ‌سەروشوێنن"

چوونە هۆبەی وامیق ئەنتاکیەو لەوێ خۆیان شاردوەتەوە. ئەوەندەیان چاو لە مەحموودئاغا ترساوە کە کون بە کون خۆ دەشارنەوە نەوەکا مەحموودئاغا بێ لەوێش بیان بینێتەوە. ترسی وا تا ئێستا کەس نەی‌دیوە. ئەو جۆرە ترسە لەمردنیش خراپترە..."

مەلافەرهاد قسەکەی وی دووپات کردەوە:

"ئەدی لەمردنیش خراپترە. ئەگەر بتوانن لەو کێوە ترسەی لەگیانیان دایە بێنەخوار, ئەگەر بتوانن ئەو زنجیرانە بپچڕن, ئیدی کەس پێیان ناوێرێ, هەرچەندیش بەهێزو بەدەسەڵات بێ, مەحموودئاغای هەر دەهارن. بەڵام وەرە بڕوانە چۆن"

حەمەدۆکیش لەپەنای مەلافەرهاد وەك وی هەڵترووشکابوو. بێ‌هەست و خوست بەدارەکەی دەستی خۆڵی تێك وەردەدا. تەنیا گوێی دەگرت. دەمیر لە خوارەوەترەوە لەبن دارەبەنێك دانیشتبوو, پاڵی بە قەدی دارەکەوە دابوو. ملی درێژ کردبوو, دەی‌ڕوانیە ئەو دۆڵە بێدەنگە. قاسم هەناسەیەکی هەڵکێشا:

"خەڵکەکە ئیدی هەرگیز نایەنەوە ئێرە, نایەنەوە چوکووراواش... لەبیابانی عەرەبستان دا شرت و گوم دەبن"

هەستاو چووە خوارێ بۆ نێودێ. ئەوانی دیکەش وەدوای کەوتن. قاسم چوو بەرامبەر بە حەوشی ماڵەکەی خۆیان راوەستاو ماوەیەك ڕاما.

"چیە قاسم، ناوێری بچیەژوور؟"

"ئەمن لەم ماڵەدا لەدایك بووم و پێگەیشتووم..."

ئەمجار سەری هەڵبڕی و چاوی لە مەلافەرهادو حەمەدو دەمیر کردو پاشان لەخانووەکە ورد بووەوەو گوتی:

"ناتوانم بچمە ژوور"

گەڕایەوە دواوەو بەلێواری رووبارێدا سەربەرەژێر چووەخوار. ئەوانی دیکە بەزەحمەت دەیگەیشتنێ. هەتا کاتێك دێ چۆل کراوەکە بە سپیدارە رووتەکەیەوە لەبەرچاو ون بوو هەروا رۆیشتن. ئەگەر حەمەد نەچووبا قۆڵی نەگرتبایەو رایئەگرتبا، ئەو هەروا سەری خۆی هەڵگرتبوو و دەڕۆیشت. پشوویان سوار ببوو.

مەلافەرهاد کە چووبوو لەسەر بەردێك دانیشتبوو، قوتووە جگەرەکەی لەگیرفانی دەرهێناو سیغارێکی ئەستووری پێچایەوە. ئەستێوبەردی لـێدان و بۆنی خۆشی پووشوو دەوڵاتی گەڕا.

"ئەودەم کە ڕات کردبوو، لەکوێی ناوەدانیێدا خۆت حەشار دا. لە ماڵەکەی خۆتان؟ ئەوکات کە مەحموودئاغا کون بەکون بەدوات دا دەگەڕا نەترسای لەم گوندە چۆڵە بێنیەوە؟"

قاسم گوتی:

"بۆچی، دەش ترسام بەڵام ئیدی لەم دێیە کەس منی بەگرت نەدەدا. ئەمجار بەئەقڵی مەحموودئاغاش دا نەدەهات کە بێم لەم گوندە چۆڵەدا خۆم بشارمەوە"

"لەکۆنەوە خەڵك لەدێهاتی چۆڵ و شوێنی تەریك ترساون. هەر تاوێك پێش ئێستا قاسم لە ماڵەکەی خۆیان ترساو هەڵات"

قاسم قسەی مەلافەرهادی دووپات کردەوەو گوتی:

"ئەدی، سام گرتبوومی، ترسام، زۆر لەمردووان دەترسم"

"وەختێك لەنێو دێدا خۆت شاردبووەوە، بۆ نان و پێخۆر چیت دەکرد؟"

"لە پێش دا دەچوومە گەڵی شکۆفە لەوێ نانم دەخوارد. سفرەی خەڵك راخرابوو. زۆری پێنەچوو هەموو دێهاتیەکان زانییان ئەمن لەو چۆڵەدێیە دەژیم. ئەم مەسەلەیە هیچ نیگەرانی نەکردم. رۆژێکیان لە گەڵی شکۆفە تووشی مەحموودئاغا بووم. ئەو منی نەدەناسی، بەڵام هەموو پیاوەکانی منیان دیبوو و دەیان ناسیم. لە ترسان ئەژنۆم شل بوون. نەم توانی یەك

هەنگاو برۆم. گێژ ببووم و وەك گەڵای زەرد لە پێشیان راوەستابووم و دەلەرزیم, ئەئەوان تێپەڕین و ڕۆیشتن, ئە ئەمنیش لە جێی خۆم بزووتم. سەرەنجام مەحموودئاغا کە وەشك کەوتبوو, بانگی کردم. لە منی پرسی ئەتۆ کێی, لە کوێڕا دێی, دەتەوێ بچیە کوێ, چت بەسەر هاتوە. بۆچی وەك مێژووکە دەلەرزی. منیش گوتم کە چاوم بە ئاغا, بە مەحموودئاغا کەوت ئاوام بەسەرهات. ئەمەی پێخۆش بوو, دەستی کرد بە پێکەنین و پاشان ئەسپەکەی لێخۆڕیو بێ ئەوەی شتێکی دیکەم لێ بپرسێ, لێیدا رۆیشت. پیاوەکانی مەحموودئاغا وەختێك دەڕۆیشتن ئاوڕیان دەدایەوەو خێرا خێرا تەماشای منیان دەکرد. وەخت بوو زراوم بچێ. گوتم ئاکا مەحوودئاغا لە تەماشاکردنی ئەوانە بکەوێتە گومان و بگەڕێتەوە. بەزەحمەت خۆم دە ماڵێك هاویشت کە ئەختێك لە جادە دوور بوو. بە باوەری تۆ زۆر سەیر نیە کە هیچ کام لە پیاوەکانی مەحموودئاغا راستییان لە من نەگوت؟ لە کاتێك دا چەند مانگ بوو لە چیاو بەندەنان بەدوام دا دەگەڕان"

"مەلافەرهاد ئەتۆ لەم بارەیەوە دەڵێی چی؟"

"بنیادەم لە خۆیدا بوونەوەرێکی جوامێرە. بنیادەم بە پیاوەتی و بە شەرەفەوە دروست کراوە, وەختێك دیویانە قاسم وا ترساوە ئەویان بە گرت نەداوە, بە گرت دانی ئەویان بە نزمیو ناپیاوی زانیوە. هەمور کەس بارە باش و خەراپەکانی ئینسانەکان دەبینێ, بەڵام سەرنج نادەنە تایبەتمەندییە باشەکان"

ئەمجار دەستی خستە سەر شانی قاسم و گوتی:

"قسە بکە کوڕم, باسی ئەوەت دەکرد کە وەختێك لە نێو دێ بووی هەموو خەڵکی دێهاتی دەوروبەرو یەك لەوان گەڵی شکۆفە وردو درشت دەیان زانی, نا؟"

"دەیان زانی, دەیان زانی. نان و پێخۆریان دێناو بە پەلی هۆو دارەیان دا دەکرد کە لەسەر ئەو تەپۆلکەیەیە, پاش ئەوەی بۆخچە خواردەمەنییەکەیان بە دارەکەوە هەڵدەواسی فیتوویان لێدەدا.

کە گوێم لە فیتووەکە دەبوو لە جێیەکەم دەهاتمەدەر. ئاومالێکیش جارێکیان دەستەنوێنێکی هێناو لەبن دارەکەی دانا. دەچووم بوخچەی خواردنە گەرمەکەم لە دارێ دەکردەوە. هێندێ شەوی واش هەبوو سێ جار دەنگی فیتوو دەهات, ئەوەندەیان خواردەمەنی بۆ هێنام کە ئیدی لە دێی وەدەر نەدەکەوتم. پاشان دەمیریش هاتە گوندی"

دەمیر هاتە نێو قسەکانەوەو گوتی:

"به هۆویدا, بەو ریگایەی ئەو بەردا دەچوومە زۆزان, گویم لە فیتوویەك بوو. پاشان دیتم یەكیك بوخچەنانیك لە دارەكە دەبەستێ. دەم زانی دێ چۆلە, چونكە ئاگام لە هەموو ئەو بەلایانە هەبوو كە بەسەری هاتبوون. لە نیو درك و دالدا خۆم شاردەوەو چاوەرێمام. دیتم قاسم لە دێی هاتەدەرو بوخچەنانەكەی لەپەلە دارەكە كردەوە. هەر لەوێ لەبن دارەكە دانیشت, بوخچەكەی كردەوەو بە پەلەپەل دەستی كرد بە خواردن. پاشان خۆم پێ نیشان داو هاتمەلای قاسم گوتم: نۆشی گیانت بێ دەستەبرا. سەری هەلبڕیو گوتی: خۆش بی, فەرموو... ئەمنیش چووم لە كنی دانیشتم و پیكەوە نانمان خوارد"

"ئەگەر مەحموودئاغا ئەمانەی زانیبایە خەلكی گەلی شكۆفەو پاشانیش خەلكی تەواوی ئەم كێوپارەیەی وەك خەلكی سەقزلی دەربەدەر دەكرد. وەنا؟"

"ئەدی"

هەور لووتكەی چیاكانی دەوروبەری گرتبوو. لە رۆژئاوا, لەسەر ئالاداغەوە پەلەهەوریكی رەش دەهات و هەروا زیادی دەكرد. دنیا بەرەبەرە تاریك دەبوو. تەنیا رووناكایی‌یەكی بریقەدار بە ئەندازەی جیخەرمانیك لە نیو دێی سەقزلی كەوتبووە سەرسپیدارە بلیندو بێ گەلایەكە.

"خەریكە باران دەبارێ"

حەمەد گوتی:

"باببارێ. ئیمەش پەنا بۆ سەقزلی دەبەین. مالەكەی قاسم ساغ و سەلیمە"

قاسم گوتی:

"ئەمن ناچم, تەنانەت ئەگەر لەبەر بارانیش بمرم. ئەگەر لافاو هەلم گرێو ببا, هیشتا جاریكی دیكە ناچمەوە نیو ئەو دێیە. ئەگەر دیسان لە دەستی مەحموودئاغا رابكەم و دووبارە فەرمانی گوللەبارانم بۆ دەرچێ و بزانم ئەگەر بچمە نیو ئەو دێیە لە سەداسەد نەجاتم دەبێ, دیسان ناچم. ئەگەر باران باری ئیوە بچنە نیو دێ, ئەمن لیرە دادەنیشم"

مەلافەرهاد گوتی:

"یاللا با هەستین. ناتوانین لەوە زیاتر لیرە بەند بین, لیرە جەندرمە وەك خیزوخۆل وایە, با بەخۆڕایی تووشی شەڕ نەبین"

بەرەو هەورازی بنارەكە وەڕێكەوتن. بای ساردی پیش باران هەلی كرد. هیندیك جار بایەكە زۆر بە توندی لە چەپ و راست و سەرو خوارەوە دەهات و درك و دال و قانگەلاشكی هەلدەكەندن و لە هەوادا بلاوی دەكردنەوە, جاروباریش كزی دەكرد. كە لە بنارەكە

وەسەرکەوتن دڵۆپە بارانەی درشت و قورس تەپ تەپ دەستیان بە بارین کرد. لە جادەکەی خوارێ سوارێك ئەسپەکەی بەم لاولادا تاو دەداو پاشان رادەوەستا لە دەوروبەر ورد دەبووەوە.

قاسم لە حاڵێك دا جادەکەی نیشان دەدا گوتی:

"سوارەکەم ناسی. کوڕە شوانەکەیە, چەند جوانیش ئەسپ لێدەخوڕێ! دەڵێی بەسەر ئەسپەکەوە سەما دەکا"

حەمەد گوتی:

"ئەو شەیتانە لە ئێمە دەگەڕێ"

دەمیر لە حاڵێك دا بەسەرەوژێرەکەدا غاری دەداو هاواری دەکرد ڕۆیشت. سوار جڵەوی ئەسپەکەی توند کردو چاوەڕوانی دەمیر مایەوە.

"ماندوو نەبی موسلیم, دەنگ و باس چیە؟"

"خەبەری خۆشم پێن"

"راوەستە با ئەوانی دیکەش بێن"

موسلیم دابەزی, ئەسپەکەی بردو هەوسارەکەی لە دارێکی قەراخ رێگا خست.

"جێ برینەکانم ئێستاش دەبرژێنەوە. عەلی کەرتیش لێیدابووم... برینەکانم ئەگەر بارانەیان وێدەکەوێ, دەبرژێنەوە"

"بارانەکەی زۆر توندە"

موسلیم لە وەڵام دا گوتی:

"ئێوە ئاخر چ جۆرە یاغیەکن. یاغی دەبێ لەو کەپەنکە چەرکەسیەیانەی هەبێ کە گوللە تۆپ کاریان لێناکا, هەتا دەگا بە باران"

"ئێمە نیمانە, ئێمە یاغیەکی هەژارین"

"باشە دەوڵەمەند بن, کێوپارە پڕە لە خەڵکی پووڵدار, راوەستن با ئەمن بچمە چیا ئەودەم بزانن هەموو چیاو دەشت و پووڵدارەکان رووت دەکەم یان نا".

"ئەوانیش تۆ دەکوژن"

"باشە با بم کوژن. مردن هەقە, لە مردن مەترسەو گۆشەگیر مەبە. چارەنووسی پیاوی هەرچی هەبێ هەروا دەبێ"

باران وەك گۆپاڵ باران دەهاتە خوار. هەم یاغیەکان و هەم موسلیم تلیسابوونەوە. دنیاش بەرەبەرە تاریکتر دەبوو. تەنیا لەوبەریان سەرشاخەکە وەك پووڵەکە دەدرەوشایەوە.

"بەخێربێی موسلیم"
"خۆش بی‌حەمەدۆك"
"وادیارە خەبەری خۆشت بۆ هێناوین"
موسلیم گوتی: ئەرێ، خەبەری خۆشم پێن، خدر ناردوومی.
"خدر کێیە؟"
"ئەتۆ نای‌ناسی. ئەتۆ برادەرێکت هەبوو ها... ناوی حەسەن بوو. ساری چیان کوشتبووی‌و گوتبووی ناوم حەمەدۆکە. خدر بابی ئەو حەسەنەیە. تێ‌گەیشتی؟"
حەمەد گوتی: باشە، تێ‌گەیشتم.
"خدر پێی گوتم زوو حەمەدۆکی وەبینە... ئەوان دەزانن ئەمن لەگەڵ تۆم، ئێستا نازانم چۆنیان زانیوە... تەنیا یەك کەس ئەو مەسەلەیە دەزانێ"
موسلیم شوان لە حالێك دا شانازیی بە خۆیەوە دەکرد لەسەر قسەکانی ڕۆیشت:
"پاشانیش هەموو خەلکی کێوپارە دەزانن"
"ئەگەر جەندرمەکانیش بزاننەوە ئێسکی ساغت لە لەشی‌دا ناهێلن..."
"ناتوانن بزانن، ئەگەریش بزانن ناتوانن بەگیرم بێنن، ئەگەر بشم دۆزنەوە، ناتوانن بم گرن، خۆیان لە دەست دەرباز دەکەم. ناتوانن حەپسم بکەن و لە دارم بدەن. ئەمن زۆر زرینگم، زۆریش ئاقلم"
"زۆر باشە، حالی بووم. ئێستا بلێ بزانم مام خدر چیی گوت، ئەوەمان پێ بلێ"
"مام خدر گوتی، بابی ئەو حەسەنە کە کوژرا ها... ئەو گوتی وەلی کوزگوون هاتوەتە گوندەکەیان. وەلی کوزگوون قەولی بە حکوومەت داوە تۆ بکوژێ. حکوومەتیش حوکمی لێ‌خۆشبوونی ویی دەرکردوە. مام خدر گوتی ئەو بە خوێنی سەری تۆ تینوویە. مام خدر گوتی بە حەمەدۆك بلێ حەتمەن ئەمشەو بچێتە گوندی چاملی یۆڵ. ئەمشەو دەرمانی بێهۆشی دەدەین بە وەلی کوزگوون، دوو شەوو ڕۆژان بێهۆش دەبێ. با بێ سەری ببڕێ‌و بیبا"
"ئێمە چۆن دەتوانین ئەمشەو بگەینە چاملی یۆڵ، بە سوارییش بچین دیسان نای‌گەینێ..."
"مام خدریش گوتی وریای خۆیان بن، مەحموودئاغای گەلی شکۆفەش بە سێ سوارەوە بە دوویانەوەیە"
مەلافەرهاد پێ‌کەنی و گوتی:

"ئاهاااا دنیا وەدوامان کەوتوە. ئەگەر پەلاماری بەندیخانەمان نەدابایەو نەمان گوتبا شارۆچکە وەبەر دەسرێژ بدەن خەڵکێکی زیاتریشیان وەدوا دەخستین. باشە ئەوان بە جێی خۆی، مەحموودئاغا بۆ چی. سەر لە کاری وی دەرناکەم"

حەمەد گوتی:

"ئەمن چاکی دەناسم. لەم چیایانە، لەم دەوروبەرانە کەس نابینی بەقەد وی ئاشقی ناوو ناوبانگ بێ"

"چونکە حەمەدۆك وا وەقیمەت کەوتوە ئەو قورمساخەش دەیەوێ بەشێکی پێ‌ببڕێ. ئیشەڵڵا ئەو دەکەوێتە بەر گوللەی خۆم..."

قاسم بەم قسانە رق و قینی خۆی نیشان داو دەستی بەرەو ئاسمان بەرزکردەوەو دووبارە گوتی: ئیشەڵڵاو دەستی هێنانەوە خوار.

"لە پێش دا دەبێ مشووری وەلی کوزگوون بخۆین"

"کاری وی زۆر ئاسانە، چونکە ئەو ئێمە وەك مێروولەیەکیش تەماشا ناکا. هەر بۆیەش کاری وی ئاسانە. زۆر بە ئاسانی راوی دەکەین. ئەمن لە مەحموودئاغای دەترسم یەك لەبەر ئەوەی پیاوێکی زۆری هەن، دوو چونکە لەم کێوانەدا دەتوانێ چەند دەستە چەتەش رەگەڵ خۆی بخا، سێ لەبەرئەوەی جەندرمەکانیش لەگەڵ خۆی دێنێ‌و چوارەمیش چونکە هەموو دێهاتی‌یەکان نۆکەرو خزمەتکارنی. مەسەلەی قاسم و دەمیر شتێکی دیکەیە. ئەمە جارێك هەڵدەکەوێ. ئەگینا دێهاتی‌یەکان بۆ ئەوەی خۆیان لەبەرچاوی وی شیرن بکەن، هەمووی ئێمە، تەنانەت ئەگەر باب و دایك و منداڵیشیان بین، کەوڵدەکەن. ئێستا بڵێن بزانم چ بکەین"

"دەچینە چاملی یۆڵ. هیچ کارێکمان نیە جگە لەوە هەر جۆرێك بووە ئەمشەو ئەگەر بەری بەیانییش بووە خۆمان بگەیەنینە وێ. یاڵڵا موسلیم ئەتۆ وەپێش کەوە"

"حەمەد، چۆن بگەینە وێ؟"

"دەگەینێ مامۆستا. ئەمن رێگای سەربڕ شارەزام. هەر کە لەم کێوە رەت بووین دەگەینە پشتی چاملی یۆڵ. رێگاکەمان زۆر سەختە، بەڵام چار نیە"

موسلیم جڵەوی ئەسپەکەی وەرسوڕاندو لەبەر ئەو بارانە کە وەك گۆپاڵ دەهاتە خوار خێرا لەبەر چاو ون بوو. ئەوانیش ملی چیایەکیان گرت کە لە کەلێنە شاخەکانیدا داری سنۆبەرو دڕكوداڵ روابوون. دڕووەکان وەك دریشە زبرو تیژ بوون و لە پێڵاوەکانیان دەهاڵان. بارانەکە بە ئارامی بەڵام بێ‌پسانەوە دەباری. یاغی‌یەکان لە حالێك دا لوولە تفەنگەکانیان سەربەرەژێر

راگرتبوو بە بنارەکەدا کە هەورازێکی زۆر کوورِ بوو پێهەڵگەڕان. حەمەد لە پێشیانەوە دەڕۆیشت و وەك کەڵەکێوی وەسەر دەکەوت. ئەوانی دیکە بە دوایدا بەزەحمەت خۆیان بە کێش دەکرد. شەوەکە ئەوەندە تاریك بوو چاو چاوی نەدەدی. هیچیان نەیان دەزانی پێ لە کوێ دەنێن و چ دەکەن و بۆ کام لا دەچن. هەتا تاو هەڵات مەلا فەرهاد دوو جار لە ئاوی خڕێ کەوت. جاری پێشێ بەزەحمەت بۆیان نەجات درا.

جاری دوایەش مەلا خۆی بە لکە دارێکەوە گیرساندەوە, هەتا تینی لەبەردا بوو هاواری کرد. بە ئاسانی دیتیانەوە. قاسمیش لە کەندەلانێك کەوت کە بەقەد چالاوێك قووڵ بوو. لێی تەمابراو بوون. نیو سەعاتێك دواتر توانی لەو جێیە کە تێی کەوتبوو بێتەدەر. ئەو جێی تێی کەوتبوو, بەستێنێکی نەرم و خیزەلان بوو, هەر نەختێك لاقی چەپی ئازار درابوو.

حەمەد بێ ئەوەی گوێ بداتە شاخ و دڕك و لێڕەوارو کێوو ئاو, وەپێشیان کەوتبوو و بێ ترس لە تاریکیبەرەو پێش دەچوو. کە گەیشتنە سەربەندەنێ دنیا کەمێك رووناك ببوو, کولاوکەی چەند ماڵێکی ئەو دێیە کە لە خواری هەبوو, دووکەڵی لێهەڵدەستا.

حەمەد گوتی: گەیشتینێ.

مەلا فەرهاد وەڵامیدایەوە, گەیشتینێ, بەڵام مردین.

حەمەد گوتی:

"دەمیر دەخۆت رادەبینی خۆت بگەیەنیە یەکەم ماڵی ئاوەدانی؟"

دەمیر گوتی:

"ئەرێ, حەزدەکەی ئەوەندەی هاتووین ئەوەندەی دیکەش برۆم"

"ئێستا کەوایە بچووە ئەو ماڵە, هەر کەس لە ماڵێ بوو ژن, پیاو, منداڵ بێنێرە ماڵی مام خدر و مام خدری لەگەڵ خۆت بێنە ئێرە"

دەمیر بە غاردان رۆیشت, دەت گوت ئەو هەموو رێیە لەگەڵیش نەبووە, دەت گوت ئەو نەبووە کە ئەو هەموو رێیەی بە شەوی تاریك و لەبەر بارانێو بەنێو دڕووەلان دا بڕیوەو لە تاریکیدا چەند جار خۆی لە قەدەدارەکان کوتاوە. لە سەرەو ژێرەکە چووە خوارێ. ئەوانی دیکە لەبن دارە سیدرێك دانیشتن. ئەوێ بارانی لێنەدرابوو, بارانەکە بەسەر گەڵا پڕو تێك چڕاوەکان دلەخزیبوو و لەولاتر هەڵەڕژابووە سەر زەوی.

قاسم پرسی:

"ئاگرێك بکەینەوە؟ رەق هەڵاتم, ئەمن ئەوە هەڵدەلەرزم"

مەلا فەرهاد گوتی:

"هەموومان هەڵدەلەرزین"

حەمەد گوتی:

"ئەوە فکرتان لە کوێیە؟ لە هەر چوار لاوە گەمارۆ دراوین. چۆن ئاگر هەڵدەکەین؟"

قاسم لەسەری نەڕۆیشت.

ئیدی هیچیان قسەیان نەکرد. سەریان داخست و لە کڵ فکران ڕاچوون و هەتا وەختێك لە خوارەوەڕا دەنگێکیان بەرگوێ کەوت هەروا مانەوە.

دەمیر گوتی:

"هاتینەوە"

بەغاردان وەسەر دەکەوت و بەدوای ویش دا مام خدر کە زۆری لێ بەجێ مابوو، لە ژێڵاَ دەهات. گەیشتە بن دارەکە. هێشتا نەحەسابووەوە بە راوێژێکی پرسکالاَوە گوتی:

"قسە ناکا، نازانم ئەم پیاوە مام خدرە یان نا. دەم هەڵناپچڕێ. دەڵێی لەم دێیە وەزع گۆڕاوە. ئەمن سەری خۆمی لێ دەرناکەم. ئێستا با بێ بزانم"

چوو پاڵی بەقەدی دارێکەوە دا.

حەمەد بەپێشوازی بابی حەسەنەوە چوو و گوتی:

"فەرموو مام خدر"

قۆڵیی گرت و هێنایە بن دارەکە. مەلافەرهادو قاسمیش نەختێك بەرەژێر چوون و پێشوازییان لێکرد.

"بەخێر بێن براینە، ئەمە مەلافەرهادە؟"

حەمەد گوتی: بەڵێ خۆیەتی.

"ئێمە لەم چیایە مەلای خۆمانمان زۆر خۆش دەوێ. ئەو لە بەندە نەزەرکردەکانی خوایە. چەندین ساڵ ئێمە پێمان وابوو ئەو حەزرەتی خدرە دوایە زانیمان کە مەلافەرهادە"

حەمەد گوتی:

"حەزرەتی خدر خۆیەتی، لەشکڵی مەلافەرهاددایەو بەفریومان دەبا"

مەلافەرهاد پێکەنی: فریوتان نادەم.

"با بچینە ماڵێ. لەماڵێ شێوی گەرم چاوەڕێتانە هەروا هەڵمی لێ هەڵدەستێ"

"وەلی کوزگوون لەکوێیە؟"

"واز لە وەلی کوزگوون بێنن، وەرن بچینەوە ماڵێ"
"ئاخر گوتبووت ئەمشەو..."
"ئێوە درەنگ هاتن لەدەستمان دەرچوون، خەم مەخۆن دووبارە دێنەوە"
وەرسووڕاو وەڕێ کەوت. ئەوانیش بەدوایدا.

کە گەیشتنە ئاوەدانی، دیتیان هەموو خەڵکی دێ وەدەرکەوتوون و چاوەڕوانیانن. بەنێو حەشیمەتەکەدا تێپەڕین و راستەڕێ چوونە دیوەخانی مام خدر. دیوەخانی مام خدر ژوورێکی بەرین بوو بەچەند پەنجەرەی زۆر گەورەوە کە بەڕووی هەڵدێرێکی زۆر قووڵدا دەکرانەوە، کە وەختێك ئینسان تەماشای دەکرد چاوی دەرەشەوە دەهاتن. سەربانی خانووەکەی بە سواڵەتی سوور داپۆشرابوو. دیوارەکان داری نەخشێندراو بوون و ژوورەکە بە بەرەی قیمەتی و بژاردە پڕ کرابووەوە. دوو ڕیز قەنەفە ڕووبەڕووی یەکتر دانرابوون.

"زۆر تەڕ بوون، حەز دەکەن جلەکانتان داکەنن؟"

حەمەد لەمێژ بوو هەستی کردبوو ئەو ماستە بێموو نیە، ئەگینا چ پێویست بوو بەو گۆپاڵبارانە هەموو خەڵکی دێ لە ماڵەکانیان وەدەر کەون و چاوەڕوانی وان بن. لەم گوندەدا شتێك رووی دابوو، بەڵام چ رووداوێك؟ کاتێك چاوی بەچاوی مەلافەرهاد دەکەوت بەچاوان یەکتریان حاڵی دەکرد کە دەبێ لەم دێیەدا پێشهاتێك قەومابێ، بەڵام چ پێشهاتێك؟ بۆیان ساغ نەدەبووەوە.

حەمەد گوتی: ئێستا جلەکانمان دادەکەنین.

چەند لەحزە دواتر مام خدر چوار دەست جلکی لەگەڵ خۆی هێنان:

"ئەمانە بکەنە بەرتان. هەتا چێشتەکەتان دەخۆن منداڵەکان جلەکانتان بەئاگر بۆ وشك دەکەنەوە"

یەك یەك چوونە ژوورەکەی تەنیشتێ و خۆیان رووت کردەوەو جلی وشکیان لەبەر کردن و هاتنەدەر. لەو ماوەیەدا کە ئەوان خۆیان دەگۆڕی سینیێەکی گەورەیان هێناو لەنێوەڕاستی ژوورەکەیان دانا. لەنێو سینیێەکە دۆینەیەك بە رۆنێکی زۆرو بیباری سوورو تیژەوە هەڵمی لێهەڵدەستا. مام خدر بەکەوچك لەدەفرێکی گەورە کە لەنێوەڕاستی سینیێەکە بوو، دۆینەکەی لەچەند قاپی پەل دەکردو پڕی دەکردن.

"ئێستا فەرموون..."

ئاگر لە ئاورگەکەدا بڵێسەی لێ هەڵدەستا. چوار کەچکی برسی لەچوار لاوە هێرشیان کردە سەر قاپە دۆینەکان. بەدوای ویش دا رۆنەکەرەو هەنگوینی سپییان هێنا کە بۆنی خۆشی

گوڵەگوێنیی لێ هەڵدەستا. باش باش ورگیان لەسەر دانا. کچێکی جحێڵ و کوڕە جحێڵەیەك هاتن و سینی و قاپەکانیان هەڵگرتەوەو بردیانن.

حەمەد خۆی بۆ گەرمای ئاگرەکە شل کردبوو, خۆی دابووە بەر گەرما. مەلافەرهاد دەستی لەسەر پەلاپیتکە بوو, تەنانەت وەختی نان خواردنیش تفەنگەکەی لەسەر کۆشی لانەبرد.

کە سفرەکەیان هەڵگرتەوە دێهاتییەکان هاتن. لەپێش دا ریش سپییەکان و دوایە لاوان یەك بەیەك هاتنە ژوورێ. هەرکەس دەهات پاش سڵاو بەخێراتنی میوانەکانی دەکردو دەچوو لەجێیەك دادەنیشت. کاتێك دیوەخان پڕ بوو و ئیدی جێی کەس نەما, مام خدر جلکی یاغییەکانی ـ کە وشك ببوونەوە ـ هێنایەوە. دووبارە بەنۆرە چوونە ژوورەکەی تەنیشتێ, خۆیان گۆڕی و هاتنەوە.

لەجۆرە فنجانێکی بێدەسك دا کە خەت خەتی سووریان تێدا بوو و زارەکەیان فرەوان بوو, قاوەیان هێنا. بۆنی قورس و خۆشی قاوە لە فەزای گەرمی ژوورەکە گەڕا. وەختێك قاوەکەیان خواردەوە مام خدر گوتی:

"بیهێنن"

دوو لاو پیاوێکی رووت و قووت و کزیان هێنایە ژوورێ کە لەبەر لاوازییان ئێسکی جێی شەرمی بەدەرەوە بوو, لەشی تاوەسووت بوو و چاوەکانی لێڵ بوون. دەستییان لەپشتەوە بەستبوون. کابرا بەچاوێکی پڕ لە سامەوە تەماشای دەوروبەری دەکردو هەوڵی دەدا گەڵۆ گونی لەنێو ڕانی خۆی دا بشارێتەوە.

"وەلی کوزگوون ئەمەیە. سەردەستەیە. بۆکوشتنی حەمەدۆك هەتا ئێرە, هەتا گوندەکەمان هاتبوو. فەرموون, ئێمە لەلایەن خەڵکی چاملی یۆڵەوە دەیدەینە دەست ئێوە"

حەمەدۆك گوتی: خۆش بن.

"ئەوانی دیکەش بێنن"

دوو لاو, چەتەکانی دیکەشیان هێنا کە هەموویان رووت و قووت بوون. هەمووان قۆڵیان لەپشتەوە بەسترابوو, هەمووشیان بەپێش دا چەمابوونەوە.

"وەلی کوزگوون بۆچی دەتەوێ من بکوژی؟"

"حەمەدۆك, چونکە ئەگەر تۆ بکوژم عەفووم دەکەن. ئەمن ئیدی لەم چیاو بەندەنانە بێزار بووم. لەو خوارە لەدەشتێ هەموو شتێکم هەیە, مەزرا, دارایی, ژن و منداڵ. نازانم چۆن توانیومە چل ساڵی ڕەبەق لەم کێوو بەندەنانە تاقەت بگرم. چل ساڵی تەواو هەموو رۆژێکی خوا مردووم و زیندوو بوومەوە. گوتم

لەجیاتی ئەوەی هەموو رۆژێ بمرم, با ئەگەر تاقە سالێکیش بووە بەئاسوودەیی بژیم. بەڵام قیسمەت نەبوو. ئەم لادێییە نزم و ئاژەڵانە بەفێڵ گرتیانم. ئەگەر رزگاریم بێ ـ کە هیچ هومێدیشم نیە ـ دەزانم چ رەفتارێك لەگەڵ ئەمانە دەکەم. حەمەدۆك, ئەتۆش نە هیچ نارەحەت بەو نە خۆشحاڵ, ئاخرو ئاقیبەتی تۆش وەك ئاخرو ئاقیبەتی من دەبێ. ئەتۆ کوڕێکی پاکی. ئەم دێهاتییانە تۆش وەك من دەگرن. بەتایبەتی تەحویلی حەمەدۆکیشت نادەن, راست و راست دەت دەنە دەستی جەندرمە. ئێستا ئەمن هومێدێکم هەیە, هەرچەند کەمیش بێ. ئەتۆ ئەوەندە هومێدەشت نیە"

"ئەو هومێدە کەمەی تۆ چیە؟"

"ئەتۆی. ئەتۆ یاغیەکی کەمێك جوامێری. بەرەڵام دەکەی. چونکە هیچ یاغییەك ئەوەندە خۆی چووك ناکاتەوە دوژمنی دەست و لاق بەستراوی خۆی بکوژێ"

"ئەتۆ دوژمنی من نی"

"ئەمن هەرکەس بم, دەهاتم تۆ بکوژم. هەربۆیەش ئێستا کەوتوومە بەر چنگی تۆ. دەم کوژی؟ ئەتۆ ناتوانی دوژمنێکی رووت و بێچەك کە ئەم دێهاتییە نزمانە گرتوویانە, بکوژی. ئەم کارە لەپیاوان ناوەشێتەوە. ئەگەر من بکوژی, ئەگەر تۆسقاڵێك پیاوەتیت تێدا مابێ هەتا ماوی ناتوانی لەخۆت خۆش بی. ئەمن بەمردنی خۆم ئینسانەتی, پیاوەتی, جوامێری و هەموو شتێکی باش کە لەتۆدا مابێ لەگەڵ خۆم دەبەم, ئەتۆ ناچاری من بەرەڵا بکەی. بەرەڵام بکە, چەکەکەم وێ دەوە با یەك بەیەك و رووبەڕوو بەشەڕ بێین"

حەمەدۆك گوتی ئەتۆ هەقتە, راوەستە لە مەلاش بپرسم.

مەلافەرهاد گوتی: وەلی کوزگوون هەقیەتی, ئەو دوژمنی ئێمەیە.

حەمەد نەڕاندی:

"مامۆستا ئەتۆ لە هەڵەدای. ئەمن بۆیە نایکوژم کە دوژمنی منەو هاتوە بم کوژێ. ئێستا ئەگەر پێکەوە بکەوینە شەڕو ئەو من بکوژێ ئەم دێهاتییانە تەگبیریان چیە؟ ئەم جانەوەرە هەموو ئەم دێیانە ئاگر نادا؟ بەردی لەسەر بەردی دێڵێ‌و کەس دەمێنێ لەسەری نەدا؟ دەردی من ئەمەیە. ئەگینا ئەمن نەدەهاتم لەگەڵ کابرایەکی وا زاڵم و خوێنخۆر, چەتەیەك کە فەقیرو هەژاران رووت دەکا, دانیشم و قسەی لەگەڵ بکەم و ببمە هاودەمی.

"ئەمن هیچ کاتێك فەقیرو هەژارم رووت نەکردوون. ئەگەر ئەتۆ بەرەڵڵام بکەی لەوانەیە هەرگیز نەمەوێ لەگەڵت بەرەورِوو ببمەوە, بەڵام لەگەڵ ئەم دێهاتییانە خەراپتر لەوەش کە ئەتۆ گوتت رەفتار دەکەم"

"فەرموو مامۆستا, ئەمەی چ لـێ دەکەی؟"

"حەمەد, ئەمن قسەی خۆمم کرد"

جووتیارەکان بێدەنگ بوون و سەیری ئەوەیان دەکرد کە خەریك بوو روو بداو لەفکردا بوون.

مام خدر لەجێی خۆی هەستاو گوتی:

"حەمەدۆك, وەلی کوزگوونی بەرەڵلا بکە با بڕوا. لەبەر ئێمە خۆت مەخە تەنگانەوە. ئێمە لەوانە نیین کە ئەتۆ بیر دەکەیەوە. ساری چیانی چەتە لەنەکاو بەسەریدا دابووین. ئەودەم دێیەکەمان سێچوار تفەنگ زیاتری لـێ نەبوون. ئێستا دێ بووەتە جبەخانەیەك, چاوو گوێمان کراونەوە, ئەگەر حەز دەکەی وەلی کوزگوونی بەرەڵلا بکە. خەمی ئێمەت نەبێ, ئەگەر جارێکی دیکە روو لەم دێیە بکاتەوە, تامەکەی دەچێژێ"

ئەمجار رووی کردە دێهاتیەکان و گوتی:

"حەمەدۆك وەلی کوزگوونی بەرەڵلا بکا یان نا؟"

هەمووان گوتیان: بەرەڵلای بکا.

"جل و بەرگی ئەمانە بێنن, چەکەکانیشیان..."

دوو کوڕە جحێڵە چەك و جل و بەرگی چەتەکانیان هێناو لەپەنایان دانان. مام خدر قۆڵی وەلی کوزگوونی گرت و بردیە ژوورەکەی دیکە. چەتەکانی دیکەشی بردە وێ.

مەلافەرهاد بە نێوچاوانێکی گرژو ناڕەحەتەوە هەستاو چووە دەرێ. حەمەدیش وەدوای کەوت.

کە هاتنە دەرێ مەلا ون بوو. حەمەد چاوی بۆ گێڕا. بارانەکە لێی کردبووەوە. پاڵی وە دارگوێزێکی قەدئەستووری نێو حەوشەکەدا کە ئەگەر دوو کەس دەستیان تێك گرتبایە دەستیان لەقەدی نەدەگەیشتەوە. نیگەران بوو, مەلا چیی بەسەر هاتبوو, بەو نێوچاوانە گرژەوە بۆکوێ چووبوو؟

ماوەیەکی زۆر لەبن دارەکە چاوەڕێی بوو. مەلا سەرو سۆراغی نەبوو. وەلی کوزگوون بە حەوت کەس لە پیاوەکانیەوە هات و بەپەنایدا تێپەڕی:

"خواحافیز حەمەدۆك, ئیشەڵلا جارێکی دیکەش خوا من و تۆ بەرەوڕوو دەکا..."

ئەو خەڵکەی لەدیوەخان بوون و هەروەها قاسم و دەمیر هاتبوونە دەرێ و چاویان لە رۆیشتنی وەلی کوزگوون دەکرد.

وەلی کوزگوون بەدیواری حەوشەیدا کە لە بەردی نەتاشراو دروست کرابوو, وەسەر کەوت و لەو دیوەوە هاتەخوارو هەر لەو حاڵەدا تفەنگەکەی تەقاند.

گولله سەربەرگە لبادەکەی حەمەدی کون کرد, چەرمی سەرشانیی داغ کردو رۆیشت.
لەدوای ئەوە وەلی کوزگوون فەرمانی بە پیاوەکانی دا: هەمووتان تەقە لە حەمەدۆك بکەن!
پیاوەکانی وەلی کوزگوون لەشوێنێکی بەرناوەڵا راوەستابوون و بێئەوەی خۆیان لە مەسەلەکە هەڵقوتێنن, تەماشای رووداوەکانیان دەکرد. وەلی کوزگوون لەپشت کەڵەکە بەردێکەوە وەك شێتان ئاوری بەسەر حەمەددا ـ کە خۆی دابووە پەنای دارەکە ـ دەباراند. ئەو تفەنگچی‌یەکی زۆر کارامە بوو. زۆری پێ سەیر بوو کە یەکەو تفەنگ حەمەدۆکی نەنگاوتوە. ئەمە شتێك بوو کە لەماوەی چل ساڵ دا نەیدیبوو.
لەوەختێك دا وەلی کوزگوون چووکترین نوختەی ئەندامی لەشی حەمەدی ئەگەر لەپشت دارەکەوە دەرکەوتبایە, دەدایە بەر دەسرێژ, مەلا فەرهاد دۆخین بەدەست لەنێو دەراڵە شاخەکانەوە وەدەر کەوت. پشتی وەلی کوزگوون کە وەك شێتان تەقەی لە حەمەدۆك دەکرد, وەك سفرە لەبەردەمی راخرابوو.
"وەلی کوزگوون!"
وەلی کوزگوون گوێی لەدەنگی مەلا بوو, هەر ئاورِی دایەوەو گوللەیەکی لەنێوەراستی نێوچاوانێ درا. بەرەوپشت کەوتە سەر کەڵەکەکە.
راست لەو لەحزەیەدا شوانێك کە لەئارەق دا شەڵاڵ بوو و رەگی ملی هەستابوون لە خوارێ را هات و لەحاڵێك دا وەك کوورەی ئاسنگەران دەهەندمی گوتی:
"دێیەکە گەمارۆ درا"
مەلافەرهاد نیزیك کەوتەوەو رووبەرووی پیاوەکانی وەلی کوزگوون راوەستا:
"گوێتان لێبوو ئەم برایەمان چیی گوت. دێیەکەیان ئابلووقە داوە. ئێوە لەگەڵ ئێمە دەکەون یان دەرۆن؟"
پیاوێکی کورتەباڵا کە لەپێشەوە راوەستابوو گوتی:
"ناتوانین بچینە هیچ کوێیەك, دێیەکەیان گەمارۆ داوە"
"حەمەد!..."
حەمەد کە رەنگی وەك بەهێ زەرد ببوو گوتی:
"ناپیاوە خەریك بوو بمان کوژێ, ئەتۆ ئەمەت دەزانی بۆیە چووبوویە دەرێ؟"
"ئەمن وەلی کوزگوونم باش دەناسی"
لەبنارەکەی رووبەروویان راست لەسەر دێیەکەوە ئۆغلەمەیەك کراو بێدەنگ بوو.

"تەسلیم بە حەمەدۆك!"

"قاسم ئەتۆ دوو کەسان لەگەڵ خۆت بەرەو بچووە بن ئەو بەردە ئەوێ بپارێزە. دەمیر ئەتۆش دوو کەسان بەرەو ئەو خوارەی بگرە... مامۆستا ئەتۆش ئەوبەر..."

پیاوە کورتەباڵایەکە هێشتا لەجێی خۆی نەبزووتبوو.

"ئەتۆش وەرە کن من"

دووبارە ئۆغڵەمەیەك کرا.

"لەسەر عەرزی درێژ بن. خەڵکەکەش بچێتەوە ژووران..."

ئۆغڵەمەکە درێژەی هەبوو.

"تەسلیم بە حەمەدۆك, رێی دەربازبوونت نیە, لەهەموو لاوە گەمارۆ دراوی"

تەقەکە لەهەر چوار لای ئاوەدانیی‌یەوە دەست پێ‌کرابوو, ئەمە نیشانی دەدا کە ژمارەیەکی زۆر گەمارۆیان داون. بێ ئەم لاو ئەولا دەربازبوونیان رێی تێ‌نەدەچوو...

"مامۆستا بڵێ بزانم چ بکەین؟"

"شەڕ دەکەین"

"بەم وەزعەوە چەند رۆژ دەتوانین خۆ ڕاگرین؟"

"لەنێو دێی تەقەمەنی زۆرە. لەوانەیە بۆ سێ‌چوار ڕۆژ, بگرە پێنج رۆژیش بەس بێ, زۆر باش نازانم"

"لەماوەی سێ ڕۆژان دا سەدان و هەزاران سەرباز دەورەمان دەگرن, مامۆستا. ئەگەر ئێمە نەتوانین ئەمشەوو ئەوپەڕەکەی تا نیوەشەوێ لێرە وەدەر کەوین, فاتیحەمان بۆ خوێندراوە"

"نەخشەت چیە؟"

حەمەد دەستی مەلای گرت و هێنایە سەر لێوی هەڵدێرەکە. گوللە بەسەریان دا دەباری. لەپشت کەڵەکە بەردان راوەستان. چەتە کورتەباڵاکەشیان لەگەڵ بوو. تاوێك دواتر موسلیم شوانیش کە کەس نەی‌دەزانی لەکوێ ڕا گەیوەتە وێ, هاتە لایان.

"ئەگەر ئەمن بتوانم لەم هەڵدێرە بچمە خوارو خۆیان بگەیەنمێ لەپشتەوەڕا گەمارۆیان بدەم, ئەوان..."

مەلافەرهاد هاتە سەر لێوی هەڵدێرەکەو تەماشای خوارەوەی کردو گوتی:

"ئۆووی, ماڵ ئاوەدان حەمەد! ئەم وێرا تەماشاشی بکەم, تەنانەت ئەم توانی بنی هەڵدێرەکەش ببینم! ئەتۆ چۆن دەتەوێ بێرەدا بچیەخوار؟ ئەگەر بکەوی دەبیە هەزار لەت"

"قەدیم وەختی راوەشوور لە زۆر هەڵدێری وا چوومەخوار"

"بەمەیان دا ناتوانی بچیەخوار, باڵندە بە باڵەکانی و مار بەنێوقەدی بەتاقەتی ناتوانن بێرەدا بچنەخوار"

"یان دەچینەخوار, یان لێرە دەمێنینەوەو دەبینە خۆراکی جەندرمەکان. پێت وایە ئەگەر جەندرمەکان بمان گرن, دێڵن زیندوو بین؟"

کێشەی نێوان حەمەدو مەلافەرهاد درێژەی کێشا, ئاوری بەکۆمەڵی جەندرمەکانیش وردە وردە زیاتر دەبوو. قاسم و دەمیر و پیاوەکانی وەلی کوزگوون کە لەگەڵیان بوون هەر بەو توندوتیژییە تەقەیان لە جەندرمەکان دەکردەوە.

"قاسم, ئەتۆ شەڕی چاك دەکەی..."

"هەتا نیوەشەوێ لەپشتەوەڕا..."

"ناتوانی بەم هەڵدێرەدا بچیەخوار. بڕوانە, بنەکەی دیار نیە, وەك دیوار رێك و لووسە"

لەو بەینەدا موسلیم شوان کە چاوەڕوان وێستابوو و دەت گوت لەسەر ئاوو ئاورانە, گوتی:

"ئەمن کاك حەمەدم بێرەدا دەبەمەخوار"

"چۆنی دەبەیەخوار؟"

"ئەمن رێگاکەی شارەزام. لەپێش دا ئەمن لەپێشیانەوە دەچمە خوار, پاشان ئەوانیش بەدوام دا دێن, ئەگەر تفەنگێکم وێ دەن..."

"تفەنگت بۆچیە؟"

"ئەمنیش شەڕیان لەگەڵ..."

لەحاڵێك دا بەدەست ئەو کەسانەی نیشان دەدا کە لە دەری ئاوەدانی ڕا تەقەیان دەکرد, گوتی:

"ئەمنیش... ئەگەر تفەنگم نەدەنێ ئەمنیش هەر لێرە دەمێنمەوە, ئەمن بێچووە شوانێکم, کەس کاری بەکاری من نیە"

مەلافەرهاد لەحاڵێك دا بەبن دیواردا دەڕۆیشت خۆی گەیاندە سەر جەندەکی وەلی کوزگوون. هەستی کردبوو موسلیم چاوی بڕیوەتە تفەنگی وەلی کوزگوون. هەموو چەك و فیشەکی چەتەکەی لەگەڵ کیسە زێڕەکانی هێناو هاتەوەو گوتی: بگرەو دانیە دەستی موسلیم. موسلیم لەکاتێك دا دەست و لاقی تێك دەئاڵقان, چەکەکانی لەخۆی دان.

"حەمەد, ئەتۆش ئەم کیسەیە بگرە, پڕپڕە لەزێڕ... ڕۆژێك پارەت پێویست دەبێ"

حەمەد قسەیەکی بۆ نەکرا. کیسەکەی ـ کە لەچەرمێکی زۆر بەقیمەت ساز کرابوو و بەزیوکاری نەخشی زەقی گوڵ و ئاسك و سەرە ئەسپی لێ‌کێشرابوونەوە ـ وەپشتێندێ خست. کیسەکە زۆر قورس بوو. تەنیا زێڕ دەی‌توانی ئەوەندە قورس بێ. مەلافەرهاد گوتی:

"ئەمن دەڕۆم, ئەوانە کوڕەکانیان زۆر خستوەتە تەنگانەوە. ئەگەر وا بڕوا هەتا ئێوارێ خۆمان پێ ڕاناگیرێ"

ئەمجار لەگەڵ دوو کەسەکەی لەگەڵی بوون بەرەو لای چەپی ئاوایی بۆلای بەردەلانێك کە کەوتبووە سەر لێواری هەڵدێرگەکە, دەستی بە زگەخشکە کرد.

"ئەگەر مەلا خۆ بگەیەنێتە وێ, دەتوانێ یەك دوو ڕۆژان شەڕ بکا... تەنانەت ئەگەر لەشکرێکیشی لەپێش بێ"

پیاوە کورتەبالآکە کە لەدەستەی وەلی کوزگوون بوو, نەختێك دوورتر ڕاوەستابوو یەك قسەی نەدەکرد.

حەمەد کە دیتی ئەو لەوێیە پرسی:

"ئەتۆ ناوت چیە؟"

"شاهان"

"ئەتۆ پێت وایە دەتوانین بێرەدا بچینەخوارو هەپروون بەهەپروون نەبین؟"

"دەتوانین"

"ئێستا کەوایە... موسلیم وەپێش کەوە"

موسلیم وەك چەوەندەر سوور هەڵگەڕابوو, وا دیاربوو بیر لەشتێك دەکاتەوە. حاڵەتی ئەو کەسانەی هەبوو کە کارێکی زۆر گرنگیان بەدەستەوەیە. بەرەو ڕۆژهەلآت وەرسووڕاو بە قوولکەیەکی زۆر قووڵی وەك خەندەك دا کە لەسەر لێوی هەڵدێرەکە بوو, چووەخوار. چڵەگوێنیو قانگەلاشك قوولکەکەیان هەتا سەر لێوان پڕ کردبووەوە. حەمەدو شاهانیش بەدوایدا ڕۆیشتن. موسلیم جاری وابوو هەتا پشتێندێ بەئاوێدا دەچووەخوار, بەلآم ئەگەرچی لە مەودای تفەنگی دوژمن دەرچووبوون, لەبەر هەرچیەك بوو نەی‌دەویست لەخەندەکەکە بێتەدەرو بەسەر لێوی قوولکەکەدا بڕوا. حەمەدو شاهانیش بێ‌ئەوەی قسەیەك بکەن وەدوای کەوتبوون و دەڕۆیشتن.

چوونە نێو دارستانێکی زۆر چڕ کە داری ئەوەندە ئەستووری تێدا بوون دوو کەس دەستیان تێك گرتایە دەستیان لەقەدیان نەدەگەیشتەوە. خڕێکی زۆر قووڵ لێڕەوارەکەی دەکردە دووبەش.

"ئەگەر بمانەوێ بچینەخوار بەم خڕەدا بڕۆینەخوار باشە, لەکۆنەوە ئەمن هەر بە خڕۆکان دا لەهەڵدێران چوومەخوار. بزنیش ئەگەر ناچار بێ, هەر بە خڕان دا دەڕواتەخوار. ئەمن لەبزنان فێر بووم بەخڕو دۆڵان دا لەهەڵدێران بچمەخوار"

شاهان ڕووی کردە حەمەدو گوتی:

"چۆنە بەنێو لێڕەواریدا بڕۆین و لەپشتەوەیان سەر وەدەرنێین؟"

حەمەد وەڵامی دایەوە:

"گەمارۆیان داوە, ئێرە بەبێ دیفاع بەرەڵلا ناکەن. چارەمان نیە دەبێ ڕێنوێنیەکەی موسلیم قبووڵ بکەین. بڕۆ خوارێ موسلیم"

موسلیم گوتی: یاالله, یا فتاح, بسم الله... و بەهەڵدێرەکەدا داگەڕا, بەئاسانی بەنێو ئەو شاخانەدا کە وەك خەنجەر تیژ بوون و بە زەندۆڵێك دا کە ئاو دایدڕیبوو, دەچوونەخوار. دیارە ڕێگایەکی یەکجار ناخۆش بوو. ئەو شاخ و پنچك و ڕەگەدارو درووانە کە بۆ چوونەخوار دەستیان تێدەگرتن, وەك خەنجەر دەستیانی هەڵدەدڕی و جلەکانیانی ونجڕونجڕ دەکرد. بەماوەیەکی کەم دەستی هەرسێکیان شەلاڵی خوێن بوو.

موسلیم جاروبار رادەوەستاو چاوەڕێ دەما تا هاوڕێیەکانی پێی بگەنەوە. ئامۆژگاری و دروشمەکانی خۆشی لەبیر نەدەچوون: تەماشای خوارەوە مەکەن, ئەگینا سەرتان دەگێژەوە دێ و هەڵدەدێرێن. پێ لەسەر خاك و بەردی چووکەڵە دامەنێن, پێ لەسەر تاتەبەردی گەورە دابنێن. دەست بە بەردان مەگرن, دەست بە ڕەگەداری قایم بگرن. هەرکام لەم ئامۆژگارییانە بۆخۆی فەرمانێك بوو.

بەهەر گیان کێشانێك بوو لە هەڵدێرەکە هاتنەخوار, بەڵام ئیدی هێزیان لەبەردا نەمابوو, لاق و ئەژنۆیان هەڵدڕ هەڵدڕ ببوون.

موسلیم گوتی:

"ئێستا لەم بەستێنە بچینەخوار دەگەینە بەستێنێکی دیکە کە سەرەوژوورە. ئەگەر لەوێ وەسەر کەوین, ڕاست لەپشت وانەوە سەر دەردێنین, جا ئەودەم یاڵلا... خوا یان بە ئێمەی دەدا یان بەوان..."

پاشان بەخۆشحاڵییەوە لەسەری ڕۆیشت:

"ئەودەم کاك حەمەد دەبینی کە ئەمن چۆن تفەنگچییەکم. حەیف ئەو کوزگوونە بێکارەیە فیشەکی کەم پێبوون"

"ئەوە دەڵێی چی موسلیم؟ ئەوەندە فیشەکەی بەتۆیە پێشی لەشکرێکی پێدەگیرێ"

موسلیم گوتی:

"کەمن کەم, یاڵڵا با برۆین, هێشتا زۆرمان ماوە"

"موسلیم ئەتۆ ئێرە باش شارەزای. پێشتر هاتوویە ئەم گوندە؟"

"قەت نەهاتوومە ئێرە"

"ئەگەر وایە, بەچی ڕا دەزانی کەمێکی دیکە برۆین دەگەینە بەستێنێك؟"

موسلیم پێکەنی و بە خۆهەڵکێشانەوە گوتی:

"دەزانم, ئاشکرایە, بەو لافاوگەیەڕا کە پێیدا هاتووین دەزانم. هەمیشە هەر لافاوگەیەك چەند وردەچۆمی لەتەنیشت هەن. ئەتۆ ئەمەت نەدەزانی؟"

ئەو ڕێگایە کە موسلیم دەیگوت بەستێنی چۆمێك بوو کە وشکی کردبوو. ئاوی خڕەکە زۆر کەم ببوو, زۆریش سەرەوژێر نەبوو. بەنێو ئاوەکەدا ڕۆیشتن. بێپسانەوە دەنگی تەقە دەهات. وەختێك لە بەستێنەکە وەسەر کەوتن و گەیشتنە لێڕەوار دنیا تاریك ببوو. ماوەیەك لەنێو لێڕەوار مانەوەو پشوویان دا.

شاهان گوتی: ئەمن ئەو سەرانە باش شارەزام. با بەو دۆڵەدا سەرکەوین.

لکەداری تەڕ لە دەم و چاویان دەدران و دەیان ئێشاندن. بەدۆڵەکەدا سەردەکەوتن کە حەمەد گوتی:

"ڕاوەستن, یەکێك لەوبەرمانەوەیە"

ڕاوەستان و گوێیان بۆ دەورروبەر هەڵخست.

"نەبزووی! کێی؟"

دەنگێك وەڵامی دایەوە: ئەمنم حەمەدۆك.

"ئەتۆ کێی؟"

"ئەمن عەلی بێچارەم, بێچارە... دەم ناسی؟"

"وەرە عەلی, ئێمە لێرەین, چاوەڕێی تۆین"

عەلی لەکاتێك دا پنچکەکانی لادەداو هەراو هۆریای وەڕێ دەخست هات و سەرەنجام ئەوانی دۆزیەوە. حەمەدو ئەو یەکتریان لەئامێز گرت.

"لەئێوە دەگەڕام. بیستم هاتوونە ئێرە, سوار بووم و وەڕێ کەوتم. کاتێکیش گەیشتمە ئێرە تێگەیشتم کە گەمارۆ دراون. ئەمنیش لەپشتەوە تەقەم لەجەندرمەکان کرد. گێژ ببوون. ئێستا

نازانم بۆچی تاوێکه تەقه لەلای ئاوەدانی ناکەن. وەرن بچینه بن ئەو بەردەی رووبەڕوومان. ئەسپەکەم لەوێیه. ئێستا چوار کەسین ئەگەر لەوێ سەنگەر بگرین و تەقه بکەین وا دەزانن گەمارۆ دراون, بەتایبەتی ئەگەر یەك دوانێکیشیان لێ بهەنگێوین..."

حەمەد گوتی:

"لێیان دەپێکین. ئەمه ئاسانه. تەقه لە گڕی تفەنگەکانیان دەکەین و تەواو. چەندمان بوێ..."

شاهان گوتی: وەك گوێرەکه هۆڕەیان لێ بەرز دەکەینەوە.

"ئەم برایه کێیه؟"

حەمەد گوتی: شاهانه. ئەمەش موسلیم شوانه.

"ئەو شاهانەی لەگەڵ دەستەی وەلی کوزگوون بوو ئەمەیه؟ ئۆژۆی حەمەد, ئەتۆش هەڵبژاردەکان دەبینیەوە ها! کوزگوون هیچ کاره نیه, دەڵێن ئەوکەسەی وەلی کوزگوونی کردوەته کوزگوون ئەم شاهانەیه. چۆنه کوزگوون ڕەگەڵ ئێوه کەوتوه؟"

حەمەد هەموو بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە.

عەلی بێچاره گوتی:

"باش بوو. ئێستا با بچینه بن ئەو شاخه. پشتی شاخەکه جۆرێکه هەڵۆش ناتوانێ پێیدا بفڕێ"

که گەیشتنه شاخەکه, ئەسپی عەلی بێچاره بەحیلاندن پێشوازیی لێکردن. لەو سەره هەورەکان بەخێرایی بەسەر مانگی شازدەشەودا تێدەپەڕین. حەمەد که تارمایی سازێکی بەسەر ئەسپەکەوه بەدی کردبوو, گوتی:

"عەلی وادیاره ئەتۆ هێشتا وازت لە دەنگبێژی نەهێناوه"

"ئەمن دەستم لەچەتەیی هەڵگرتوه, دوێنێ هاتوومەوه ئاوەدانی. وەختێك بیستم ئەتۆ دیسان چوویەوه چیا تفەنگەکەمم تاودایەو وەڕێ کەوتم..."

هێشتا عەلی قسەکەی تەواو نەکردبوو که لەرووبەڕوویان هاوارێکی دڵتەزێن بەرز بووەوە.

موسلیم شوان گوتی: زۆر لە جەندرمەکان دەکوژم.

حەمەد به سەرکۆنەوه گوتی: یاغی جەندرمان ناکوژن.

"ئەوان یاغییەکان دەکوژن"

"ئەوان دەکوژن"

"یاغی جەندرمان ناکوژن, ئەدی چ دەکەن؟"

"ئەگەر هەر ناچار بوون بریندایان دەکەن"

"ئەی ئەگەر ناچار نەبوون؟"
"ڕادەکەن"
"ئەگەر ئەمن عەلی کەرتیشم بەرچاو بکەوێ؟"
حەمەد لەحالێك دا رقی خۆی ئاشکرا دەکرد گوتی:
"لێیدە، بێکوژە. ئەو زالمە، ئەو ئەشکەنجەچییە..."
یەکەم تەقە موسلیم لەجەندرمەکانی کرد. بە سێیەمین گوللە لەخوارێ هاوارێك هەستا.
موسلیم گوتی:
"دیتان، سێرەم لەگڕی تفەنگەکەی گرت. ئەم کوشت، گوللە شانیی سمی و دەرچوو"
حەمەد گوتی وست قسە مەکە.

بلاو بوونەوەو لای خوارەوەیان دایە بەر ئاگر. دەت گوت چل کەس تەقە دەکەن. غاریان دەدا، بازیان دەدایە چەپ و ڕاست و دەستیان وەك مەکینە لەسەر پەلەپیتکە کاری دەکرد. بەم جۆرە ژمارەی خۆیان زۆرتر نیشان دەدا. جەندرمەکان لەمێژ بوو تێگەیشتبوون کە لەنێو دوو ئاگردا گیریان کردوە. لەبەر سەرلێشێوانی زۆر تەقەیان کەمتر کردبوو، بەدوای ڕێگایەك دا دەگەڕان کە پێش هەتاو کەوتن خۆیان لەئاڵقەی ئاگر رزگار بکەن. ئەو هەموو یاغییە لەگەڵ تاوکەوتن ئەوانیان وەك کەوبارە بەدەستان دەگرت.

مەحموودئاغا کە بێئەوەی کەس ئاگادار بکا بەخۆی و پیاوەکانیەوە بەدوای حەمەدۆك دا دەگەڕا، لە قزل کارتالی تووشی یاوەر شەوکەت بوو. وەختێك بیستی کە وەلی کوزگوون لەگوندی چاملی یۆڵ حەمەدۆکی گرتوە، ڕەگەڵ یاوەر کەوت و بەپەلە بەرەو چاملی یۆڵ وەڕێ کەوت. گوندی چاملی یۆڵیان گەمارۆ دا. مەحموودئاغاو پیاوەکانی ئەم گوندەو دەوروبەرەکەی پنچك بە پنچك و بەرد بەبەرد شارەزا بوون.

"جەنابی یاوەر، ئێمەیان خستە تەنگانەوە. هەروەك بیرمان لێدەکردەوە، ئەمانە چەند دەستەیان بوونە یەك. گەمارۆ دراوین. گەمارۆ دراوین و زۆر باشیش شەڕ دەکەن، زۆریان خۆ ڕاگرت، ئێمە تەنیا توانیومانە یەکێك لەوان بریندار بکەین، ئەوان نیزیك بەنیوەی پیاوەکانی ئێمەیان بریندار کردوە. ئەگەر حەزیان لێبایە هەموومانیان دەپێکا. ئەگەر رۆژ بێتەوەو ئەوان ناچار بن تەنانەت یەکی ساغیشمان لێ ناهێڵن. ئەوان پێیان وایە هەموو پیاوەکان جەندرمەن بۆیە بەنیازی کوشتن لێمان نادەن. وەختێك رۆژ بێتەوەو پیاوەکانی من ببینن... ئەمن دەکشێمەوە خوارێ"

یاوەر شەوکەت زۆری ڕق هەستابوو.

"دیسان حەمەدۆکمان لەدەست دەرچوو؟"

"لەوانەیە نەیتوانیبێ ڕابکا, لەوانەیە وەلی کوزگوون کوشتبێتی"

"کەوایە, ئەمن هیچ وەخت ناتوانم حەمەدۆکی بکوژم. نا؟"

"پیاو چووزانێ, لەوانەیە..."

"ئەگەر یاوەر فارووق وەزع و حاڵی من ببیسێ زۆری پێ خۆش دەبێ. با پاشەکشە نەکەین مەحموودئاغا"

چەند لەحزە دواتر حەمەد بۆی دەرکەوت کە ئەوان پاشەکشەیان کردوە.

"موسلیم ئەوان بۆ کام لا دەچن؟"

"هەر ئێستا دەزانم"

موسلیم لەحاڵێك دا دەستی بەشاخەکەوە دەگرت چووەخوار. بەنێو دارەکان و کەلێنی پنچکەکان دا بێهەست و خوست دەچووەپێش. وەختێك گەڕایەوە مانگ ئاوا ببوو"

"بەرەو ئەولایە پاشەکشە دەکەن کە ئێمە پێیدا هاتین, لەوێشەوە شۆڕ دەبنەوە بۆ جادەی سەرەکی. چەکداری خۆولاتییان زۆر لەگەڵە. یەکێکیان ڕاست بەپێش من دا تێپەڕی. ئەگەر حەزم کردبایە, دەم توانی بیکوژم"

"گوتت چەکداری خۆولاتی؟"

عەلی بێچارە گوتی:

"مەحموودئاغایە, ئاغای گوندەکەمان تەمای سەری تۆی کردوە"

"باشە مەحموودئاغا چ قەرزێکی بەسەر منەوە هەیە؟"

"گرتنی تۆ, یان کوشتنت بۆ هەموو کەس شانازییەکە... ئێستا ئیدی ئاغاکانیش لێت بوونە دوژمن. ئەو خۆولاتییانە دەبێ پیاوی مەحموودئاغا بن"

"ئێستا کەوایە, بابچین ڕێیان لێبگرین"

بەو دۆڵەدا کە لێیەوە هاتبوون چوونەخوارو هەتا تینیان تێدابوو هەنگاویان توند کردن. هەورەکان بەری مانگیان بەردابوو, مانگ بەتاقی تەنیاو بەدرەوشانەوە لەئاسمان دا مەلەی دەکرد. دوورتر, لەداوێنی ئاسۆ چەند ئەستێرەیەك دەدرەوشانەوە. ئەو دڵۆپە ئاونگانە کە لەسەر گەڵاکان نیشتبوون لەبەر تیشك دا وەك ئەستێرە زریوەیان دەهات.

وەختێك لەپێچی گەڵییەکە بایان دایەوە حەمەد گوتی:

"هەستی لاقان دێ. ئێوە بەو بنارە بەردەلآنەی رووبەڕوویان دا سەر کەون و ئەمن و موسلیمیش بەم بنارە هەڵدەگەڕێین و لەدوو لاوە ئاگربارانیان دەکەین, بەقەد نووکەدەرزی‌یەك لەلەشی چەکدارە خۆولآتی‌یەکان ببینین لێیان دەدەین. هەموومان بەقەستی کوشتن تەقە دەکەین"

کەمێك دواتر تارمایی یەکەم جەندرمە لە گەڵی‌یەکەوە بینرا. عەلی بێچارە بەستەیەك فیشەکی لەبن لاقی وی دا. جەندرمەکە نەڕاندی و پاشەوپاش کشایەوەو هەلآت. ئەمجار لەنێو لێرەوارەوە بارانی گوللە بەسەر بەردەلآن دا باری. هەتا خۆرهەلآت تەقە لەدوو لاوە درێژەی هەبوو. حەمەدۆك چاوی بۆ مەحموودئاغا دەگێڕا. پێی وابوو کوشتنی ئەو کابرایە خێرەو ئەگەر بمرێ هەموو دانیشتووانی ئەم کێوپارەیەو خەلکی چوکووراوا دەی‌کەنە جێژن.

"ئەتۆ مەحموودئاغای دەناسی؟"

"چۆن دەکرێ نەی‌ناسم؟ ئاغای دێی خۆمانە..."

شاهان گوتی:

"ئەمنیش باشی دەناسم. ئەمنیش وردە حیسابێکم لەگەڵی هەیە"

"یالڵا, ئێستا کەوایە وەرە با کاری ئەو کابرایە تەواو بکەین"

ئەو جێ‌یەی لێی دامەزرابوون لای خوارەوەی وەك بەری دەست لێوە دیار بوو. ئەو جەندرمانە کە خۆیان لەپاش دارو گابەردەکان گرتبوو لەشوێنێکی بەرئاوەلآو بێ‌دیفاعی ئەو نێوەڕاستە لەبەر لوولەی تفەنگی وان دا بوون. سەیر ئەوەبوو تەنانەت یەك چەکداری خۆولآتییشیان لەنێودا نەبوو. یاوەر لەکاتێك دا دارحەیزەرانی بەدەستێکەوە بوو و دەمانچە بەدەستەکەی دیکەوە, لەو مەیدانە تخێڵ ببوو.

هەتا دەوروبەری نیوەڕۆیە هەم جەندرمەکان و هەم حەمەدۆك و هاوڕێ‌یەکانی بێ‌هەست و خوست چاوەڕێ مان. سەرەنجام یاوەر فەرمانی دا هەستن و جەندرمەکان یەك یەك لەبن دارەکان و گابەردەکان هاتنەدەرو بەرێچکە لەسەرەوژێرەکە چوونەخوارو دوور کەوتنەوە. وەختێك ئەوان رۆیشتن حەمەد گوتی:

"با بچینە ئاوەدانی بەلکوو خەبەرێکی مەحموودئاغامان چنگ کەوێ"

لای ئێوارێ بوو کە گەیشتنە دێ, برسی‌یان بوو. هێند شەکەت بوون توانای جوولەیان نەبوو. کە گەیشتنە دێ مام خدر بەپیریانەوە چوو و خەبەری پێ‌دان:

"مەلافەرهاد بریندار بووە, وەزعیشی هیچ باش نیە. دووسێ دەستە جەندرمەش لەخوارەوەڕا دێن بۆ ئاوەدانی"

حەمەد دەسبەجێ غاری دایە لای مەلافەرهاد. مەلا لەنێو نوێنێکی خاوێن دا کە مەلافەیەکی سپیی پێدا درابوو بۆنی خۆشی سابوونی لـێدەهات ئاسوودە لێی خەوتبوو. جارجاریش لەبەر ئێشی زۆر نێوچاوانی تێك دەنا.

"بەڵادوور بێ مامۆستا"

"خۆش بی حەمەد. دەبێ هەر ئێستا هەستین و لەم گوندە دوور کەوینەوە, ئەگەر جارێکی دیکە لێرە بەگیرمان بێنن ئیدی دەربازبوونمان نیە. هەتا ئێستا لانیکەم یازدە کەس هاتوون خەبەریان داومێ کە جەندرمەکان لەو خوارەوە بەرەو ئێرە دێن"

"برینەکەت چۆنە؟"

"گوللە لەباسکم دراوە. زۆر گرنگ نیە. ئەگەر ناچار بم دەتوانم چەکیش بەدەستەوە بگرم, هەر ئێستا دەبێ بڕۆین. ئەسپێکم بۆ پەیدا بکەن"

"عەلی بێچارە ئەسپی پێیە"

"عەلی بێچارە کێیە؟"

"برادەرێکی کۆنە. ماوەیەك پێکەوە بووین. کوڕێکی پیاوە. هەر کە بیستی ئێمەیان گەمارۆ داوە..."

حەمەد جلەکانی کردەوە بەر مەلافەرهاد. ئەسپی عەلی بێچارە لەبەر دەرگا چاوەڕێ بوو.

مەلا کە توانیبووی بچێتە سەر سەکۆیەك, بەئاسانی سواری ئەسپەکە بوو. خەڵکی دێ هەتا دەری ئاوەدانی بەڕێیان کردن. ئەوان لە تفەنگچییەتی و ئازایەتیو زیرەکیی مەلافەرهاد سەریان سوڕمابوو. ئیدی تەنانەت ناوی حەمەدۆکیشیان نەدەبرد. لەئاوەدانی دوور کەوتنەوە. قەڵنەکێشێك بوو وەڕێ کەوتبوون کە ڕاوەستان.

"بۆکوێ دەچین؟"

"بچینە کوێ مامۆستا؟"

هەرکەس دێیەك و جێیەکی بۆ خۆشاردنەوە ناو دەبرد. برینی مەلافەرهاد هەرچەند بۆخۆی بەشتێکی گرنگی نەدەزانی, بەڵام بەتەواوی ئەستوور ببوو. ژانەکەشی زۆرتر ببوو.

"ئەگەر دێیەکی نیزیکتر بێ باشترە. پێویستم بە جەڕاحێك هەیە, کەمێك ئەستوور بووە"

مەلافەرهاد پێکەنینێکی تاڵی هاتێ و گوتی:

"ئاغای دێیەکەشتان بەخوێنی سەرمان تینوویە. ئەگەر بچینە وێ ڕاست دەکەوینە باوەشی مەحموودئاغا"

"دەیجا باشتر, ئەگەر ئەو بەدوای ئێمەوە بێ, بەئەقڵیدا ناچێ ئێمە بچین لەدێیەکەی خۆیدا خۆ بشارینەوە"

"کەس خەبەری پێنادا کە لەوێین؟"

عەلی بێچارە گوتی:

"دێی ئێمە ئەو جۆرە کەسانەی لێنین. پاشان جەراحیش حازرو ئامادەیە"

ماوەیەکی زۆر پێکەوە باس و وتووێژیان کرد, دنیا تاریک ببوو و بایەکی ساردی دەهات, ئەوەندە سارد پیاو رەق دەبووەوە.

"ئێمە لەگەڵ حەمەد ئەوەندە لەدێی ئێمەدا ماوینەوە... حەمەد بۆ خۆت بڵێ کەس خەبەری لێدابین و خەیانەتی پێکردین؟"

"نا"

"تەنانەت تاقە کەسێکی واش نیە کە بچێ خەبەر بە مەحموودئاغا بدا؟"

"نا, تەنانەت یەك کەسیش"

حەمەد گوتی:

"دەبینە دوو دەستە. ئەمن و مامۆستاو عەلی و قاسم و موسلیمە یاغی دەچینە گەڵی شکۆفە. دەمیرو شاهان و ئەوانی دیکەش دەچنە سەقزلی. هەرکامێکمان تووشی ژانەسەر بووین, ئەوانی دیکە فریای دەکەون. خواردنمان پێیە؟"

دەمیر گوتی:

"پێمانە. مام خدر ئەوەندەی توێشوو بۆ تێناوین بەشی حەوتوویەکمان دەکا".

لە دووڕێیانێك کە بەدەشتاییدا دەڕۆیشت لێك جیا بوونەوە. حەمەدۆك, مەلافەرهاد, قاسم, موسلیم و عەلی بەڕێی گەڵی شکۆفەدا رۆیشتن و ئەوانی دیکەش چوونە گوندە چۆڵەکەی سەقزلی.

کەگەیشتنە گەڵی شکۆفە خەریك بوو دنیا رووناك دەبوو. هێشتا کەڵەباب نەیان خوێندبوو. عەلی بێچارە داوای لە هاوڕێیان کرد چەند لەحزەیەك لەدەری ئاوەدانی چاوەڕوان بن. ئەمجار بۆخۆی چووە نێو دێ. چاوەشە زەرد خاڵی بوو. چووە ماڵی ئەوو مەسەلەکەی بۆ باس کرد. چاوەشە زەرد گوتی: با بێن, لەسەر سەرمیان دادەنێم. لەم دێیەدا ئیدی کەس ناتوانێ بیان بینێتەوە. تەنانەت بەفکری کەسیش دا نایە کە ماڵی ئێمە بگەڕێ. عەلی بێچارە هاتەوە هاوڕێکانیی لەگەڵ خۆی بردە ماڵی چاوەشە زەرد.

ماڵی چاوەش خانوویەکی گەورەی شەش هۆدەیی بوو.. ژوورەکان بەتەنیشت یەکترەوە بوون و لەهەر ژوورێکەوە ڕێگا بۆ ژوورەکەی دیکە هەبوو.

چاوەشە زەرد گوتی:

"ژوورەکەی ئەوسەر ئی تۆیە. وەختێك دوژمنان بەدەرکەیدا هاتنەژوور, هەتا ئەوان لەپێنج دەرگا تێدەپەڕن و دەگەنە ژوورەکەی تۆ, ئەتۆ لەم دەرگایەوە رادەکەی و روو دەکەیە ئەو بەردەڵانەی پشتەوەو دەڕۆی. کاتێك گەیشتیە وێش ئیدی کەس ناتوانێ بت گرێ"

ژوورەکە بەرەو لبادی تێدا راخرابوون و لەسەر وانیشەوە دۆشەکی ئەستوور راخرابوون. لەسەر ئاگردانێك کە خۆش خۆش دایسا کترییە ئاوێك دەکوڵی.

"ئێوە دانیشن هەر ئێستا بەرچایی ساز دەبێ. ئێستا کوێرئۆغڵیی خۆمان دێتە لاتان, ئەمن دەچم لەدوای جەراح, خوا بکا لەماڵێ بێ"

لای نیوەڕۆیە چاوەشە زەرد بە وڵاغێکی رەشەوە کە جەراحەپیرەی سوار ببوو گەیشتەوە ئێودێ. خەڵکی ئاوایی کە جەراحەکەیان لەگەڵ چاوەشە زەرد دیبوو, زانیبوویان شتێك قەوماوەو بریندارەکانی دەستەی حەمەدۆك کە لە چاملی بێڵ گەمارۆ درابوون, لەم دێیەن و بەجارێك قڕوقەپیان کرد. تاژی تەحسینیش بەمەسەلەکەی زانی. خۆی لە بەردەڵانی پشت ماڵی چاوەشە زەرد حەشار داو ماڵەکەی خستە ژێر چاوەدێری. چونکە ماڵەکانی ئاوەدانی ئاودەستیان نەبوو و هەموو کەس لەنێو بەردەڵانەکە دەستی بەئاو دەگەیاند, ئەگەر یەکێك لە چەتەکان هاتبایەدەرێ ـ ناچاریش بوون بۆ دەست بەئاوگەیاندن بێنەدەرێ ـ تاژی تەحسین دەیدیت و دەیناسی. لەپێش دا قاسم هاتە بەردەڵانەکەو پاش ئەوەی لەبەر شۆقی مانگەشەو ماوەیەکی زۆر تەماشای چەپ و راستی خۆی کرد, دۆخینەکەی کردەوەو لەپشت بەردەڵانەکەوە کەمێك لەولای تەحسین هەڵترووشکاو خۆی خاڵی کرد. بۆنێکی ناخۆش لەهەوادا بڵاو بووەوە. قاسم تەنانەت وەختی دەست بەئاوگەیاندنیش دەستی لەسەر پەلاپیتکەی تفەنگەکەی بوو. تاژی تەحسین ئارامی نەبوو, ئەگەر کۆکەیەکی کردبایەو چووکترین دەنگی لێوە هاتبایە حیسابی رۆیشتبوو. ئەو پیاوە بەسامە لەبەرچاوی وردە وردە ئەستوور دەبوو, درێژ دەبووەوەو دەبوو بە غولێك.

پاش وی عەلی بێچارەو بەدوای ویش دا موسلیم هات. موسلیم دەستی لەسەر پەلەپیتکە بوو, هێندەی نەمابوو چاوی بەتاژی تەحسین بکەوێ. هاتە پەنای بەردێکی درێژ کە هەر هەنگاوێك لە تاژی تەحسین دوور بوو, دۆخینی کردەوەو هەڵی میست. پڕیشکی میزەکەی,

سەروچاوی تاژی تەحسینیان تەڕ کرد. حەمەدۆك لەکاتێك دا بن پیلی مەلافەرهادی گرتبوو هاتەدەر, پێکەوە سرتەیان دەکرد, پاشان لەپەنای یەك هەڵترووشکان, لەو حاڵەش دا لێیان نەبڕیەوە. تاژی تەحسین بەدیتنی وان هۆشی بەسەر خۆیەوە نەما, دڵی خێرا خێرا کەوتە لێدان و تەپەتەپ. خۆی لەجێی خۆی رانەدەگرت, حەمەدو مەلافەرهاد هەڵترووشکابوون, لاقیان لێك بڵاو کردبوون و بەدەم خۆسووك کردنەوە قسەیان دەکردن, ئەوەندە بەسپایی قسەیان دەکرد کە تاژی تەحسین تەنانەت گوێی لە یەك وشەی قسەکانیشیان نەبوو. شەلاڵی ئارەق بوو, هەڵدەلەرزی. لەحزەیەك بەفکریدا هات کە شەپلە لێی داوە. نەیدەتوانی دەست و لاق و تەنانەت سەریشی ببزێوێ. ئەو ماوەیە کە ئەوان لەوێ هەڵترووشکابوون و قسەیان دەکردن لەپێش چاوی تەحسین بەساڵێك گوزەرا. پاش ئەوەی ئەوان هەستان و رۆیشتن و تەنانەت چوونەوە ژوورێش, دیسان تاژی تەحسین تا ماوەیەك نەهاتەوە سەرخۆی. دەیەوست هەستێ, وەڕێ کەوێ و هەڵێ, بەڵام ئەندامەکانی لەشی بەهیچ جۆر لەژێر فەرمانیدا نەبوون.

هەر کە یەکەم کەڵەبابی بەیانی خوێندی تەحسین توانی هەڵستێ. لەکاتێك دا لاقی بەدووی خۆیدا رادەکێشان, چووە ماڵی کوێخا. کوێخا لەحەوشەی خەریك بوو دەزنوێژی هەڵدەگرت.

کەچاوی بەو کەوت دەزنوێژەکەی بەنیوەچڵی بەجێ هێشت, هەستایە سەرپێ و پرسی:

"چتە, چ بووە تەحسین؟"

تەحسین روونی کردەوە کە بۆچی بەو بەیانییە زووە هاتوەتە ماڵێ وی. چوونە ژوورێ, تەحسین گوتی:

"لێرەن, بەم چاوانەم حەمەدۆك و ئەو کابرا بریندارەم دیتن. عەلی بێچارەی خۆشمانیان لەگەڵ بوو, پیاوێکی دیکەشیان لەگەڵ بوو, هەموویان لە ماڵی چاوەشە زەردن. زوو دەبێ بچم خەبەر بە مەحموودئاغا بدەم, ئەویش پووڵێکی زۆرم دەداتێ, تەنانەت لە مورتەزاغاشم زیاتر دەداتێ. مەحموودئاغای خۆمان لەهەمووان پووڵدارترە, وەنا؟"

"ئەرێ, پووڵدارە"

"ئەوە دەڕۆم"

"ئەگەر حەمەدۆك رابکا, دەزانی دوایە چیت بەسەر دێ؟"

"ئەمنیش هەڵدێم"

"هەموو کەس دەزانێ کە ئەتۆ خەبەری حەمەدۆکت بەهەمووان گوتوە"

"با بزانن, ئەمن هەڵدێم"

"باشە, ئەودەم ئەمن تەگبیرم چ دەبێ؟"

"مەحموودئاغا نایەڵێ حەمەدۆك دەربچێ"

دەمەتەقەی تاژی تەحسین و کوێخا ماوەیەکی زۆری کێشا. کوێخا بەهیچ جۆر نەیتوانی بیروڕای تاژی تەحسین بگۆڕێ. لەدڵی خۆیدا گوتی: ئەم هەتیوە ریوەڵەیە بۆخۆشی نازانێ چ دەکا. زۆری بەڵا بەسەر دێن.

کوێخا لەنەکاو بەخۆی زانی کە لەماڵێ وەدەر کەوتوە. داخۆ بچێ بەچاوەشە زەرد بڵێ کە تاژی تەحسین نیازی هەیە میوانەکانی بەمەحموودئاغا بەگرت بدا؟ هەتا دەرکی ماڵی چاوەشە زەرد چوو, پاش ئەوەی تاوێك لەوێ راوەستا گەڕایەوە خۆی پێ رانەدەگیرا, خێرا خێرا دەچووە کن ماڵی چاوەشە زەرد, تاوێك لەوێ رادەوەستاو دووبارە دەهاتەوە ماڵی خۆیان. ئەم هاتوچۆیە پەیتا پەیتایەی نێوان ئەو دوو ماڵە تا نیوەرۆیە درێژەی کێشا. کەمێك لەنیوەڕۆ لای دابوو کە لەبن دارێ لەگەڵ چاوەشە زەرد تووشی یەك بوون.

چاوەشە زەرد تێی ڕاخوڕی:

"راوەستە. خۆ ئەتۆ من دەناسی. پیاوێکم لەتەنیشت مستەفا کەمال پاشا شەڕم کردوە. لە جەناق قەڵا لەپەنای بووم, دەریای جەناق قەڵا ئێمە ژێرو ژوورمان کرد ئەتۆ چت لێقەوماوە؟ لەپێش خۆرهەڵاتەوە وەك سەگی بەرەڵڵا لەبەر دەرکێ من دەسووڕێیەوە. باشت گوێ لەمن بێ"

چاوە شینە چیمەنێیەکانی لێ دەرپەڕاندن و لەسەری رۆیشت:

"حەمەدۆك لەم ماڵەیە. ئەگەر قوونەبانت هەیە بچۆ بەو ئاغا زاڵمە خوێڕیە خوێنخۆرەت بڵێ حەمەدۆکی لەماڵێ من دا بکوژێ. ئەودەم ئەمنیش... ئەتۆ بۆخۆت. ئەتۆ بۆخۆت چاوەشە زەردی باش دەناسی. ئەودەم ئەمنیش ریشەی تۆو ئەو تووتکەسەگە کە ئاغای تۆیە, وشك دەکەم. کوێخا ئەمەت لەبیر نەچێ. لە جەناق قەڵا لەگەڵ مستەفا کەمال پاشا پلێتەی دینامیتەکە خۆم ئاگرم داو ئاوی دەریام گەیاندە ئاسمان, یاڵڵا برۆ, بەڵام بیر لەئاخری کارەکە بکەوە"

کوێخا وەك زمانی بەسترابێ, هەرچی کردی و کراندی نەیتوانی بەچاوەشە زەرد بڵێ کە تاژی تەحسین چووەتە لای مەحموودئاغا.

کوێخا لەحالێك دا وشەکان لەدەمی هەڵدەڕژان گوتی:

"چاوەش روحم پێبکە, ئەمن خەراپەیەکم لەگەڵ تۆ نەکردوە"

چاوەش پشتی تێکردو گوتی:

"هەرچۆنێك بێ, بیر لەئاخرەکەی بکەوە"

چووەوە ماڵێ, زۆر لە کوێخا قەڵس بوو. لەحاڵێك دا ریشە تەنکەکەی لە رقان دەلەرزی, جنێوی پێدەدان.

کوێخا چەند جاری دیکەش هەتا دەرکی ماڵی چاوەشە زەرد چوو, دەیەویست مەسەلەی تاژی تەحسینی پێ بڵێ. بەڵام کە دەگەیشتە بەر دەرکی ماڵێ پەژیوان دەبووەوە. کە خۆر ئاوا بوو کوێخا چووە ژووری میوانان, کلیلەکانی دایە دەستی خێزانی و گوتی:

"دەرکەم لەسەر داخەو هەتا بەیانی ئەگەر هات و هاواریش بکەم, ماڵەکەش ئاوری تێبەربێ, تەنانەت مەحموودئاغاش بێ, دەرگام لێ مەکەوە. بڵێ بە حەزرەتی محمد, بڵێ بەخانەقای چل چاو کە هەوری لەسەر راوەستاوە..."

ژنەکە سوێندی بۆ خواردو دەرگای لەسەر داخست.

# (٢٨)

بایەك كە لەبەردەلآنەوە دەهات بۆنی جاترەی لەگەڵ خۆی دێنا. لەبەر مانگەشەوی پاك شاخەكان وەك بلوور دەدرەوشانەوەو دەشت كە هەر چواردەوری بەكێوو بەندەن گیرابوو, وەك گۆلاوێكی سپی شەپۆلی دەدان, سێبەری سپیدارە بڵێندەكان كەوتبووە سەر بانی خانووە قوڕەكان. مەحموودئاغا لەپێشەوەو پیاوەكانی بەدوایدا وەك پشیلە بەنەرمی و بێدەنگی, بێئەوەی قسەیەك بكەن و بێئەوەی تەنانەت جگەرەیەك داگیرسێنن لە باریكەڕێی كێوپارەوە دەچوونە خوارێ بۆ ئاوەدانی. لە دووری, جاروبار كوندێك دەیخوێندو جاروباریش دەنگی قەڵشینی شاخەكان دەهاتە بەرگوێ.

مەحموودئاغا بەسرتەیەك كە بەزەحمەت دەبیسترا گوتی:

"تەحسین وەرە ئێرە بزانم"

تاژی تەحسین كە لەپشتیەوە دەڕۆیشت لێی نیزیك كەوتەوە.

"لەبەر دەرگا كەس ئێشكی دەكێشا؟"

"دوێنێ شەوێ كەسی لێنەبوو, لەوانەشە ئەمشەو دایان نابێ"

رۆیشتن, گەیشتنە سەرەوەی ئاوەدانی پشت ماڵی چاوەشە زەرد, ئەوەندە ئارام و بێدەنگ رۆیشتبوون كە تەنانەت لە بەردەلآنیش خڕكە بەردێك لەبن پێیان نەخزی و دەنگێك هەڵنەستا.

"بڕۆ بروانە بزانە لەبەر دەرگا ئێشك گر هەیە یان نا"

تاژی تەحسین بەبنارەكەدا خوشی و هاتەخوار. چوونەخوارو هاتنەوەی یەك بوو.

"ئێشك گریان هەیە, راست لەبەر دەرگا. پێم وایە ئێشك گرەكەش عەلی بێچارەیە"

"عەلی بێچارە؟ چەتەیەك هەبوو سازی لێدەدا. خەڵكی گوندی خۆمان بوو, ئەوی دەڵێی؟"

تاژی تەحسین گوتی: ئەگەر بەهەڵە نەچووبم خۆیەتی.

ئاغا فەرمانی بەپیاوێکی بەخۆوە کە لەپەنای بوو, دا:

"ئەتۆ وەستای ئەم کارەی. عەلی بێچارەی هەڵگرەو لەگەڵ خۆتی بێنە ئێرە. ئەگەر لەدەستت دەرچێ یان متەقی لەبەر بێتەدەر بزانە فاتیحەی هەمووانمان خوێندراوە. ئەگەر پێت خۆشە تاژییش لەگەڵ خۆت بەرە"

کابرای چوارشانە کەوشەکانی داکەندن, لەوێ لەسەر بەردێکی دانان و گوتی:

"یاڵڵا تەحسین وەپێش کەوە"

وەك پەپوولەیەك ئارام و بێهەست بەرەوپێش چوون. دەنگی ئەو ئاوەی بەنێو دێدا دەڕۆیشت, دەهاتە بەرگوێیان. جگە لەدەنگی قەڵشینی شاخەکان دەنگێکی دیکە نەدەهات. کە گەیشتنە بەردەرکی ماڵی چاوەشە زەرد, دیتیان عەلی بێچارە پشتی بەسیلەی دیوارەکەوە داوەو سەری بەسەر سنگیدا شۆڕ کردوەتەوە. لێی نیزیك بوونەوە. پێنج شەقاو, سێ شەقاو, دوو شەقاو, عەلی بێچارە هەروا مابووەوە. لەپێش دا کابرا قەڵەوەکە خۆی بەعەلیدا داو بەدەستەکانی وەك مەنگەنە زاریی بەست. هەر کە عەلی خۆی راپسکاوت تەحسینیش خۆی پێدا داو توند توند گرتیان و بردیانە سەرەوە بۆ لای مەحموودئاغا.

"دەست و لاقانی ببەستن با لێرە بێ, یەکیشتان لەسەر سەری راوەستن"

هاتنەخوارێ و چوونە پشت ماڵێ. بەدوای یەکتردا لەپەنا دیواری بەڕیز بوون. لەو بەینەدا ئەو کوندە کە لەدوور دەیخوێند دووبارە دەنگی لێهەستا, ئەسپی عەلی بێچارە حیلاندی. سەگێکی سپیی سەر مێگەل لەحاڵێك دا توند کلکی دەگەڵۆزی گرتبوو, هات بەپەنایان دا تێپەڕی و چوو لەبن دارەکەو لەتەنیشت سەگەکانی چاوەشە زەرد کە خەویان لێکەوتبوو, راوەستا. لەخوارەوەی ئاوەدانی دەنگی وەڕینی کورتی چەند سەگێك هەستا ئەویش بێدەنگ بوو. مەحموودئاغا قۆڵی پیاوە قەڵەوەکەی ـ کە تاوێك پێشتر عەلی بێچارەی گرتبوو ـ گرت و کێشایە لای خۆی:

"ئەگەر دەرگاکە داخرابێ سێبەسێ خۆی پێدا دەن, خوابکا دەرگا ئاوەڵا بێ. ماوزەر لەگەڵ خۆتان بەرن دەستیان کردەوە, دەبێ لەخەنجەر کەلك وەرگرن. تەحسین ئەتۆش وریای سەگەکان بە, مەهێڵە هیچ سەگێك بێتەدەرێ"

ئەمجار سێ کەسی دیکەی هەڵبژاردن:

"ئێوەش هەر کە دەرگا کرایەوە بەدوای وان دا هێرش بەرن..."

دەرگا ئاوەڵا بوو, ئەو سێ کەسەی لەپێشەوە بوون, لەحاڵێك دا چراگازێکیان هەڵکردبوو, خۆیان دەژووری ڕاکرد. هەموو خەوتبوون. کەس نەی‌توانی ببزوێ. مەحموودئاغا لەحاڵێك دا شاگەشکە ببوو, بەدەنگێکی لەرزۆکەوە پرسی:

"تەواو بوو؟"

کابرای قەڵەوە گوتی: تەواوە.

"دەست و لاقیان ببەستن"

لەماوەیەکی کورت دا دەستی هەر چوار کەسەکەیان لەپشتەوە بەست"

"بانگی کوێخا کەن"

چاوەشە زەرد کە لەکارەساتەکە ئاگادار ببوو, بەتوێی کراس و دەرپێ‌یان هاتبووە دەرو وەك گێژو حۆلان بێدەنگ بەدەوری مەحموودئاغادا هەڵدەسووڕا.

"بڕۆن چاوەشە زەردیش بێنن"

گوتیان: لێرەیە.

"هەی پیرەسەگ, چۆن ئەتۆ لەدێی من دا, لەماڵێ من دا دوژمنانی من, ئەوانە کە تەماعیان لەگیانی ئەم میللەتە کردوە, پەنا 'دەدەی ها؟ پیرەسەگی گرِوێ بەو مێشکە بەتاڵەتەوە بیرت کردوەتەوە چیت بەسەر دێ؟"

"ئاگات لەزاری خۆت بێ مەحموود, ئەمن پیرەسەگ نیم, ئەتۆ پیرەسەگی"

"ئەم دەویتەی وەقسە بێنن, دەستانی ببەستن, کەوڵت دەکەم پیرەچەقەڵ"

"چەقەڵ بابتە, خۆتی, عێل و عەشیرەتتە"

"ئەو بێدینەی بێننە لای من"

قەمچیی مەحموودئاغا کە لە کێرکەڵەگا دروست کرابوو, چەند جار لەسەر یەك وەك مار وشاندی.

"کوێخا ناتوانێ بێ"

"بۆچی؟"

"ژنەکەی دەرکەی لەسەر داخستوە"

"بڕۆن دەرگاکە بشکێنن"

لەماڵێك کە دوو ماڵ ئەولاتر بوو چەند لەحزەیەك دەنگی تەقەتەق و شەقەشەقی دەرگا هات و تاوێك دواتر بێ‌هەست بوو.

"ئۆۆۆ کوێخا... دۆستی بابم, پیاو ئاغای خۆی ئاوا لەپشت دەرگای داخراوەوە بەجێ دێڵێ؟"

"لێم ببوورە ئاغا, بۆخۆم بەخێزانم گوتبوو دەرگاکە داخا"

"بۆچی؟"

"چونکە ئەمن تاژی تەحسینم لەدوای تۆ نارد. دەترسام پەژیوان ببمەوەو بەوان بڵێم کە تەحسین هاتوەتە لای تۆ"

"کاری چاکت کرد"

"فەرموون بۆ ماڵێ"

"دێمە ماڵی ئێوە, بەڵام ئەم رێگرانە چ لێبکەین؟"

"ئێوە فەرموون بۆ ماڵێ... فکرێك بۆ وانیش دەکەین..."

"قسەی تۆیە..."

ئەو دێیە تەنیا دوو خانووی دوو نهۆمی لێ بوون, یەکیان باڵەخانەکەی مەحموودئاغاو ئەوی دیکە ماڵی کوێخا. چەتەکان لەپێشەوەو مەحموودئاغاو پیاوەکانی بەدوایان دا لەحاڵێك دا دریان بەو حەشیمەتە دەدا کە ئاگاداری مەسەلەکە ببوون و کۆڵانەکانیان پڕ کردبوو, گەیشتنە ماڵی کوێخا. حەشیمەت متەقی لێنەدەهات. دەت گوت خوێن لەدەمارەکانیان دا مەییوە. وشك و بێگیان وەك دارێك بەپێوە وەستابوون.

دەرگای ژووری میوانداریی ماڵی کوێخا ئاوەڵا بوو و ژنەکەی بە دەستە کلیلەوە لەبەر دەرگای شکاوی ژوورەکە راوەستابوو. ژنە سێ مووڕەداری هاویشتبوونە سەر ئاگر. مووڕەدارەکان داگیرسابوون و بەگڕێکی زۆرەوە داییسان. ژوورەکە رووناك بوو.

ئاغا چوو لەسەرەوەی دیوەخان دانیشت و پێنج کەس لەپیاوەکانیشی چوون لەخوارترەوە بەڕیز لەسەر نیوتەختەکان دانیشتن. پیاوەکانی دیکە هێندێکیان لەدەرێ و هێندێك لەژووری دەست لەسەر پەلەپیتکە راوەستان.

"ئەو چەتانە لەسەر ئەو نیوتەختە بێننەخوار, ئەمانە چ سەگێکن! رێگری چەتەی خوێڕی... بیان هێننەخوارو لەبن پێی منیان دانیشێنن. کوێخاشمان لەگەڵ ئەو کفن دزانە وەك پاشایان رەفتار دەکا"

پیاوەکانی مەحموودئاغا یاغییەکانیان ـ کە لەسەر نیوتەخت دایان نیشاندبوون ـ هەستاندن و لەبن لاقی مەحموودئاغا بەڕیز دایان نیشاندن.

مەحموودئاغا پاش ئەوەی ماوەیەك لێیان ورد بووەوە, لەوی پێشەوەیانی پرسی:

"ها بریندار, بڵێ بزانم ئەتۆ کێی؟ پیاوێکی زۆر شەرمێون دیاری"

مەلافەرهاد سەری هەڵبڕی, زەردەیەکی ئارام و تێکەڵ بە گاڵتەپێکردنی هاتە سەرلێوان و گوتی:

"ئەمن مەلافەرهادم"

"ئاااا, ئەتۆی؟ بیستت کە پاش ئەوەی بەندیخانەت شکاندو رات کرد بە بێگوناح ناسراوی؟ پێت وابوو رزگارت بووە, بەڵام ئێستا لەسەر ئەوەی بوویە هاودەستی حەمەدۆك و لەگەڵ دەستەکەی وی کەوتووی, لەدارت دەدەن. هیچ دەزانی بۆچی دەسبەجێ ناتان کوژم؟ چونکە ئێوە رێتان ناکەوێ بەدەستی من بکوژرێن. ئێوەی جانەوەر شیاوی پەتی سێدارەن. ئەگەر زانیبام تۆزقاڵێك پیاوەتی لەئێوەدا هەیە ئەم دەناردنە سەر سێدارە, هەر لێرە بۆخۆم دەم کوشتن. ئەتۆ سەگی گروێ دەبوو پێش نوێژی بکەی. وەك دەڵێن مەلایەکی زاناو خوێندەواریشی. وەختێك هەڵاتی هیچ تاوانێکیشت نەبوو, بەڵام ئێستا ئێعدام دەکرێی, ئاوا"

دوو قامکی دەستی راستی لێك کردنەوەو سەروبن رای وەشاندن.

"ئەتۆ کێی؟"

"ئەمن حەمەدۆکم"

"ئەی دادو بێداد. هەتیو ئەتۆ دەڵێی پشیلەی کێتەڵە شیرت وەرگێڕاوە. هیچ وەك حەمەدۆك ناچی"

پاشان رووی کردە کوێخا:

"تەماشا! بڕوانە ئەم فسۆس پاڵەوانە, تەماشا قارەمانی چیاکانی توورووس! دەڵێی مشکی برسییە. بەڕاست ئەم کابرایە حەمەدۆکە, ئەتۆ پێشتر دیوتە؟"

"لەم دێیەدا کەس نیە نەیناسێ... حەمەدۆکە"

"الله, الله, الله! خۆزگە ئەو کەسەی گرتوومەو ئەوەندە بەدوایدا عەوداڵ بووم لانیکەم وەك بنیادەمان دەچوو. ئەگەر ئەمەی بەرمە شارۆچکەو بڵێم حەمەدۆکە, هەموو کەس پێم پێدەکەنێ, دەبمە گەپجاڕی چاك و خراپ. ئێستا ئەمن دەبێ ئەم چڵمنە, ئەم کرمە پیسەیە بەرمە شارۆچکە؟ بەرەڵڵای دەکەم با بڕواو تووشی شەرمەزاری نەبم. بەئاغاو خانەکانی شارۆچکەم گوت سبەینێ دەچم گوێی دەگرم و بۆتان دێنم, باش بڕوانن ئەمن شانازی بە کێوە دەکەم. باشی تەماشا کەن, ئەمن ئەمەم بەنۆکەرو

وەرگێڕکەی ماڵێ خۆشم قبووڵ نیە! جوان تەماشا روخساری ئەم چەپەڵە بکەن, بڕواننە سیمای ئەم گونە کەڵەبابە رزیوە! عەبدیخان و عەلیسەفابەگ ئەمە کوشتوونی. تفوو لەو تەرح و دیدارەت... بڕواننە من دانیشتووم باسی چ دەکەم, باسی ئەم کەلاکە کەمتیارە مندارە دەکەم. ئەگەر ئەمن لەجێگای دەوڵەت بام بێقیمەتێکی وام لەداریش نەدەدا, لەچاڵی ئاودەستێم داویشت, چاڵی ئاودەستێ..."

مەحموودئاغا جاروبار تووڕە دەبوو, هەڵدەستا دەچوو تفی دەسەروچاوی حەمەد دەکوتاو دەیدایە بەر پێلەقە. جاروباریش دادەنیشت و لاقی دەخستە سەر لاقی و گاڵتەی پێدەکردو پاشان وەك خیزوخۆڵ جنێوی دەدان. سەرەنجام ماندوو بوو. تەنانەت دەنگیشی نووسابوو. بەڵام هێشتا نەیتوانیبوو داخی دڵی خۆی پێ برێژێ.

لەقاسمی پرسی:

"ئەتۆ کێی؟"

"ئەمن حاجی دەمیرم, لەدێهاتی ئاناوارزاوە هاتووم. لەدەستەی وەلی کوزگوونم کە وەلی کوزگوون کوژرا ڕەگەڵ ئەمانە کەوتم, قیسمەت و نسیب..."

مەحموودئاغا سەری نەخستە سەر.

"کوڕە ئەتۆ کێی؟"

"ئەمن لەتایەفەی ساری کەچیلیم, پێم دەڵێن موسلیمە یاغی"

"ئێ... ئەتۆ یاغیی؟"

"ئەدی, یاغیم"

"لەکەنگێوە؟"

"لەدوو رۆژ لەمەوبەرەوە..."

موسلیم لەدەمی دەرچوو, وادیار بوو دەیەویست بڵێ دوو ساڵ, گوتی دوو رۆژ. مەحموودئاغا فەرمانی دا:

"دەستانی بکەنەوە"

پیاوەکانی دەستی موسلیمیان کردنەوە.

"ئاغا ئەمن چ چاکەیەکم لەگەڵ کردووی کە ئازادم دەکەی, چما ئەمن یاغی نیم؟"

"فرێی دەنە دەرێ"

موسلیمیان لەحاڵێك دا بۆڵەبۆڵی دەکرد, دەرکردە دەرێ.

"ئەتۆ دەناسم, ئەتۆ عەلی بێچارە دەنگبێژی خۆمانی, ناتوانم هیچت لێبکەم, بابت لەپیاوانی نیزیکی من بوو. بەرەحمەت بێ. چووە شەڕی بالکان, زۆرم هەوڵ دا نەهێڵم. گوتم مەچووە سەربازی, بەقسەی نەکردم. چوو و ئیدی نەهاتەوە. بیستم وازت لەچەتەیی هێناوە"

"وازم هێنابوو, دوو ڕۆژ لەمەوبەر هەر کە بیستم حەمەدۆك دووبارە چووەتەوە چیا, چووم دۆزیمەوە"

"چاك بوو دۆزیتەوە. ئەگەر ئەتۆ نەبووایەی ئەو نەدەهاتە ئەم دێیەو ئەمنیش نەم دەتوانی وەك هەرمێی گەییو لەدارێی بکەمەوە. دەستانی بکەنەوە"

دەستی عەلی بێچارەیان کردنەوە.

"تاودە سازەکەت, یەك دوو پەلکەمان بۆ لێدە"

عەلی بێچارە وەڵامێکی نەدایەوەو لەجێی خۆشی نەبزووت.

مەحموودئاغا بەراوێژێکی توندەوە فەرمانی دا:

"تاودە سازەکەت"

عەلی بێچارە دیسان گوێی نەدایە.

"ساز بۆمن لێنادەی؟"

چاوەشە زەرد سەری هەڵبڕی:

"مەحموود, خوارزای ئازاو بەجەرگی من بەجێی خۆی, سەگی منیش ساز بۆتۆ لێنادا"

مەحموودئاغا بەگاڵتەوە پێکەنی و گوتی:

"ئاوا, ئاوا هاوڕێی نیزیکی مستەفا کەمال پاشا, ئاوا خەباتگێڕی جەناق قەڵا کە بەگوللەیەك دەریات بردە حەواو دنیات بێدەریا هێشتەوە؟"

"سەگی وەك تۆ, خوێنخۆری وەك تۆ, کەسێك کە خەلکی لەبن چنگە ئەسپان دا دەپلیشێنێتەوەو دەیان کوژێ بۆی نیە ناوی مستەفا کەمال پاشا بێنێ"

مەحموودئاغا لەسەرەخۆ هەستایە سەرپێ. هەتا بنی چاوانیشی زەرد ببوو, هاتەلای چاوەشە زەرد. پێلەقەیەکی بەکەلەکەی ئەو پیرەپیاوەدا دا, پاشان پێلەقەیەکی دیکەو یەکی دیکە. ئەمجار بەو قەمچییەی بەدەستیەوە بوو بەمست و پێلەقەو هەموو شتێك بەربووە گیانی چاوەشە زەرد. دەم و لووت و مووی سەرو ڕیش و دەست و لاق و کراسی پیرەپیاو شەڵاڵی خوێن بوون. هەتا پتری لێدەدا زیاتر ڕقی هەڵدەستاو لەشی وی دەدایە بەر پێلەقەو هەتا تووڕەتریش دەبوو پتری لێدەدا, تا وای لێهات کە ئیدی خۆشی بەسەر پێوە ڕانەدەگرت و وەك سەرخۆشان بەلادا دەهات. زۆری لەچاوەشە زەرد دا. بەڵام چاوەش متەقی لێوە نەهات, حاشا لە ئاخێکیش...

"ئەگەر ئەمشەو نەمردی, بەیانی بۆخۆم دەت کوژم. دەستی ئەم توتکەسەگەش ببەستن"
دووبارە دەستی عەلی بێچارەیان لەپشتەوەڕا بەستەوە...

"کوێخا, ئەمشەو لێرە دەمێنینەوە, جێیەکی قایم و جێی متمانەمان دەوێ کە ئەمانەی تا بەیانی تێدا راگرین. بەیانی جەندرمە دێن, نیوەڕۆیە ئەم حەیوانانە دەبەینەوە شارۆچکە"

"با هەر لەم ژوورە بن"

"لێرە نابێ. لەوانەیە پیاوەکانیان دێیەکە پەلامار بدەن. نیوەی ئەمانەم خزاندبووە سەقزلی. وەختێك تاژی هات لەوێ بەجێم هێشتن و هاتم. لەوانەیە ئەمشەو هێرش بکەنە سەر ئێرە. ماڵی تۆ بەکەلك نایە..."

سەری دەنێو دەستانی گرت و لەگژ فکران ڕا چوو. ئەمجار سەری هەڵبڕی و گوتی:

"ماڵەکەی خۆمان... ئەوێ وەك قەڵا قایمە. ئەگەر هەزار کەسیش هێرشی بۆ بکەن, سێ کەس دە رۆژان دەتوانن لەپێشیان راوەستن"

کوێخا گوتی: راستە.

"کلیلەکان بەتۆن؟"

بەڵێ لەلای منن"

"یالّلا هەستە ئەم خۆشەویستانەی ئاخرزەمان بەرینە ماڵی ئێمەو میوانداریيیان لێبکەین. ئەم بەرازە پیرە گرۆیێیەش لەونێوە لابەرن, لایبەن. ئەگەر تا سبەینێ ما, ئەویش دەبەینە شارۆچکەو لەداری دەدەین"

هاتنەدەرێ, کەس لەنێو دێی نەبوو, بنیادەم دیار نەبوو. بێدەنگییەکی بەسام گوندەکەی داگرتبوو. ئەم وەزعە سەرنجی مەحموودئاغا, ئەو پیاوە دنیادیدەی راکێشا:

"کوێخا, مەسەلەیەك لەم گوندەدا هەیە"

"چۆن دەفەرمووی ئاغا؟"

"نازانم. دێ زۆر بێدەنگە"

"ئەم دێیە هەمیشە بێدەنگە"

"ئەم بێدەنگییە شتێکی دیکەیە. ئەمن هاتوومە ئاوەدانی, حەمەدۆکم گرتوە, چاوەشە زەردم لەدەست و پێ خستوە, کەچی لەگەڵ ئەوەی هەموو خەلکەکە ئەمەی دەزانن, هەموو جێیەك بێدەنگە..."

"ترساون. ئەگەر ئەتۆ هاتی دێیەکەمان ئاوا بێدەنگ بوو. بەحورمەتی جەنابتە"

"لەوانەشە وابێ..."

کوێخا لەپێش دا دەرگای حەوشەی, کە وەك دەرگای قەڵا قایم و بە تاق بوو, کردەوەو بەدوای ئەودا دەرگای خانووبەرەکەشی هەڵگرت. بەپلیکانان دا وەسەر کەوتن. لاوێك کە چرا فانووسێکی بەدەستەوە بوو لەپێشیانەوە دەڕۆیشت.

"با لەم ژوورەیان دانێین, هەر ئەم شەوە. ئەم ژوورە پەنجەرەی بۆ دەرەوە نیە. بابم ئەگەر رەعیەتێك تاوانێکی کردبایە, لەم ژوورەدا حەپسی دەکرد"

لەپێش دا چاوشە زەردیان هێناو فرێیان دایە نێوەڕاستی ژوورەکە. بەدوای ویش دا ئەوانی دیکەیان هێنان.

"هەموو جێیەکی ماڵەکە با رووناك بێ. لەنێو حەوشەش دا ئاورێکی خۆش بکەنەوە. هەتا بەیانی نابێ چاویش بتروکێنن. ئەمن لەم شەو دەترسم. بریا توانیبامان هەر ئێستا چەتەکان هەڵگرین و بیان بەین... ئەمەش نابێ... لەوانەیە بۆسەمان بۆ بنێنەوە... دەبێ چاوەڕوانی جەندرمە بین. تاژی تەحسین چووە شارۆچکە یان نا؟ سوارێکیش با لەگەڵی بچێ, یەکێك لەپیاوەکانی خۆمان. زوو"

"باشە دەنێرم: تاژی تەحسین لەمێژە رۆیشتوە"

لەهەر قوژبنێکی خانووبەرەکە چرایەکیان هەڵواسیبوو. دەستیان کرد بە وەسەریەك نانی مورەداری گەورە لەنێوەڕاستی حەوشەکەدا.

"چاوتان باش بکەنەوەو چوارچاو بڕواننە دەوروبەرتان, ئەگینا سەرتان تێدا دەچێ"

مەحموودئاغا وەپێش کەوت و کوێخاو پیاوەکانی ئاغاش لەدوایەوە چوونەوە ماڵی کوێخا. کوێخاژن سفرەی راخستبوو. شووشەیەکی گەورەی راکییش لەنێوەڕاستی سفرەکە بوو. دەیان زانی ئاغایان بێ خواردنەوە گوزەران ناکا. چەند کەوی زەردکراو لەسەر سینیەك هەڵمیان لێهەڵدەستا.

"لەم بارەیەوە زۆر خۆشحاڵم کوێخا, بەڵام لەم بێدەنگییەی ئاوەدانی دەترسم"

"خەوتوون ئاغا"

"ئەمن دڵنیام ئێستا لەم گوندەدا هیچ کەس نەخەوتوە, تەنانەت منداڵی شیرەخۆرەش بەخەبەرە"

مەحموودئاغا رەعیەتەکانی خۆی باش دەناسی. لەگەڵ گیرانی حەمەدۆك سرتەو خەڵوەیەکی بێدەنگ دێیەکەی داگرتبوو. ژنان, کچان و کچۆڵان بەچاو پێکەوە دەدوان, پیاوان تەنانەت منداڵە وردکەش گوێیان لەقسەکانیان نەدەبوو. ئەگەر گوێشیان لێبووایە, لەقسەکانیان حاڵی نەدەبوون.

"حەمەدۆکی لەدار دەدەن"

"چەند تازیەیەکی باشمان بۆ گرتبوو"

"ئێستاش لەدێی ئێمەدا گیراوە"

"لەمەولا خەڵك دێیەکەمان بە بەدیومن دەزانن"

"ئەگەر حەمەدۆکی لەدار بدەن..."

"ئەگەر حەمەدۆکی لەدار بدەن..."

"لەئاسمانەوە ئاگر, بەرد, مار, جانەوەر, هەژدیهاو زەرروومان بەسەردا دەبارن..."

"ئەگەر حەمەدۆکی لەدار بدەن..."

"ئەم دێیەو ئەم دنیایە هەمووی وێران دەبێ"

"لەجیاتی ئاو خوێن هەڵدەقوڵێ..."

"هەتا رۆژی قیامەت..."

ئەمیش خان لەگەڵ حەوت گەورە کچ وەنێو دێی کەوتبوون و ماڵ بەماڵ دەگەڕان و قسەیان لەگەڵ ژنان دەکرد.

"ئەمە رەوای ئێمەیە؟"

"دێیەکەمان دەتوانێ قبووڵی بکا کە حەمەدۆکی لێرە بگرن؟ هەتا قیامەت دەبێتە بنێشتەخۆشەی سەر زاران"

"پاشانیش حەمەدۆکی لەسەر ئێمە لەدار دەدەن"

"ئەو بێدینە چاوەشە زەردیشی کوشت"

"جاران خەڵکی لەبن چنگە ئەسپان دا دەپلیشاندەوەو دەیکوشتن"

"ئێستێ بۆخۆی دەیان پلیشێنێتەوە"

"لەجیاتی ئەسپ..."

"ئەگەر چووینە ئەو دنیا چۆن لەڕوومان بێ چاو لەچاوی مردووەکان بکەین؟"

"چاو لەچاوی منداڵەکانمان..."

"چاو لەچاوی خەڵك...؟"

"چۆن چاو لەچاوی ئەم کێوە پیرانەی تووڕووس بکەین؟"

"چۆن تەماشای ئەو ئاکچادنیزە بکەین کە پەمۆی لێدەچێنین؟"

"چۆن دەتوانین چاو لەو چوکووراوایە بکەین کە کشتوکاڵی لێدەکەین؟"

"هەتا دنیا دنیایە خەڵك لێمان دەپرسێ کە بۆچی..."

"چ جوابی خەڵك دەدەینەوە؟"

خەریك بوو کازیوە دەنگووت. هەموو ژنانی ئاوەدانی بێهەست وخوست هاتبوون لەبەر دەرکی باڵەخانەکەی مەحموودئاغا راوەستابوون. سێ ژنی سینی بەدەست کە سێ سینیی پڕ لەخواردنیان پێ بوو, گەیشتنە وێ. هەموو ژنەکان چارشێوی سپییان بەسەرەوە بوو.

"دەرگا بکەنەوە کوڕینە نانمان بۆ هێناون"

ئێشك گر کە گوێی لەدەنگی ژنەکان بوو دەرگای کردەوەو کە چاوی بە حەشیمەتی ژنەکان کەوت, تێك ڕابوو. ئەمیش خان گوتی:

"چیە رۆڵە, ترساوی؟ مەترسە هیچ نیە"

ژنەکان رژانە حەوشەکەو ئێشك گریان دەنێو خۆیان گرت. کابرا بەلەحزەیەك لەنێو ئاپۆرای ژنان دا ون بوو و دەنگیشی لەبەر دەرنەهات. بەشێك لەئاپۆرای ژنەکان لەمێژ بوو چووبوونە ژووری باڵەخانەکە. ئێشك گرەکانی وێشیان دەنێو خۆیان گرتبوو, بێسەروشوێنیان کردبوون. ژنی پیری کوێخا کە یەکێك لەو ژنانە بوو سەردوولکەی بۆ حەمەدۆك دانابوو, لەگەڵ ئەمیش خان چوونە ژووری بەندییەکان.

ئەمیش خان هاواری کرد:

"دەستانیان بکەنەوە"

کچەکان هێندی چاو لەسەر چاو دانێی دەستی هەموانیان کردەوە.

"ئەمەش جلەکانتان, زوو دەبەریان کەنەوە"

چەکی یاغییەکانیش لەبن هەنگڵی کچەکان دا بوو.

"ئەمەش چەکەکانتان وەریان گرن. هێندەی نەماوە بۆ بەیانی, وەختە تاو هەڵێ. روو لەچیا بکەن و بڕۆن. چاوەشە زەردی بەئێمە بسپێرن. ئێمە لێی وریا دەبین"

لەپێش دا حەمەدۆك و دوایە ئەوانی دیکە, تەنانەت مەلافەرهادی برینداریش بەپەلەپەل خۆیان پۆشتە کردەوەو چەکیان لەخۆیان داو ئەمجار گوتیان:

"هەر خۆش بن, زۆر سوپاس, خواحافیز"

بەنێو ئاپۆرای ژنەکان دا کە ببوونە دوو ریز تێپەڕین و تاوێك دواتر رویان لە بەردەڵان کرد.

ژنەکانیش هەروەك هیچ نەقەومابێ, سینییەکانیان لەپێش ئێشك گرەکان داناو گوتیان: بخۆن, نۆشی گیانتان بێ و هەروەك بەبێدەنگی هاتبوون, بێهەست و خوستیش چوونەوە.

ئێشك گرەکان کە ماوەیەك گێژوویژ ببوون, بەغاردان چوونەلای مەحموودئاغا. مەحموودئاغا مەست و سەرۆخۆش کەوتبوو. هەوڵیان دا وەهۆشی بێننەوە. ئاغای شەشدانگ مەست هەرچەندی هەوڵیان لەگەڵ دا تەنیا یەك جار چاوی هەڵێنان. گوتیان:

"حەمەدۆك راى كرد" ئەو گوێى نەدانێ, چاوى لێك نانەوەو دووبارە خەوێكى قورسى لێ‌كەوت.
بەيان داهات, هەتاو كەوت, كەس نەى‌توانى ئاغاى وەخەبەر بێنێ. لەدەورى هەڵدەسووڕان, بەدەنگى بەرزو هات و هاوار بانگيان دەكرد, قيامەتێكيان بەرپا كرد. مەحموودئاغا مێشێكيشى لێ ميوان نەبوو. هەروا لە شيرن خەودا بوو.
وەختێك كەڵەبابى نيوەڕۆيە خوێنديان مەحموودئاغا بۆخۆى وەخەبەر هات. ئافتاوەيەكيان دايەدەست, وەرى‌گرت, بەگێژى و خەواڵوويى‌و بەلاجەلاج چووە بەردەلانى پشت ماڵێ. لەبن بەردێك دانيشت و خۆى سووك كرد. پاش ئەوەى خۆى شوتەوە هاتەوە. دەوروبەرەكەى هەموو قرپوقەپيان كردبوو. لەدێى لەدەنگى كەڵەشێر بەولاوە دەنگێك نەدەهات. لەسەر سينى‌يەكى گەورە بەرچايى‌يان هێنا. مەحموودئاغا هيچ ئاگاى لەوە نەبوو كە بەتاقى تەنيا قاوڵتى دەكا. كە لەسەر سفرەكە هەستا, كوێخاى رووبەڕووى خۆى دى كە دەست لەسەر سنگ وەستاوەو دەڵێى پشيلەيە كيتەڵە شيرى وەرگێڕاوە. لەكوێخاى پرسى:
"جەندرمەكان هێشتا نەهاتوون؟"
"نا, هێشتا ئاغا..."
"چ بووە؟"
"مەبەست ئەوەيە هێشتا نەهاتوون..."
"بڵێ بزانم چ بووە, دەتەوێ چ بڵێى؟"
"مەبەستم ئەوەيە كە... ئاغا بۆخۆى باشتر دەزانێ... ئەمشەو... يانى بەڵێ ئيدى..."
"چيە, چ بووە؟"
"ئەمشەو حەمەدۆكيش..."
"حەمەدۆك چيى بووە؟"
"بردوويانە..."
"كێ؟ جەندرمەكان؟ نيشانيان دەدەم. چەتەيەك كە ئەمن گرتوومە... مومكين نيە. لێيان دەستێنمەوە. بۆچى ئەودەم كە ئەوان هاتبوون هەڵتان نەستاندم؟"
"هەوڵمان دا ئاغا... بەڵام وەخەبەر نەهاتى"
"سوار بن, بەدواى جەندرمەكان دا بڕۆين, بيان گەينێ و حەمەدۆكيان لێ بستێنينەوە"
لەو بەينەدا كابرا قەڵەوە كەڵەگەتەكە هاتە پێشەوەو لەكاتێك دا دەستى رێك دەخشاندن گوتى:
"ئاغا حەمەدۆك جەندرمە نەيان بردوە"
"ئەدى كێ بردوويە؟"

"جندو پەرییان..."

"جندو پەری یانی چی؟ یانی راست و رەوان لەدەستتان دەرباز بووەو ئەها"

هەمووان پێیان وابوو کاتێك مەحموودئاغا بەسەرهاتەکە ببیسێ دەیکاتە هات و هاوارو قیامەتێك بەرپا دەکا. ئەوەندە ئێشك گرەکان و کوێخاو پیاوەکانی دارکاری دەکا, خوێن بمیزن. کەچی راست بەپێچەوانە بوو. دژکردەوەی ئاغا زۆر ئارام و لەسەرەخۆ بوو.

"باشە ئێستا بۆم باس بکە بزانم"

کابرا قەڵەوە کە هێشتا دەستەکانیی رێك دەخشاندن گوتی:

"ئەمن لەحەوشەی ئێشکم دەدا. چووکترین هەست و خوست نەدەهات. کەمێك وێژینگم دەدا کە بەدەنگی ژنێك راچەنیم. ژنە گوتی: نانم بۆ هێناوی. ژنە سەرتاپا سپیپۆش بوو. لەو بەردەڵانەی سەرەوەرا, لەو مەیدانەی خوارێ را, لەم لارا, لەولارا هەر ژنانی سپیپۆش بوون کە بێهەست و خوست دەهاتن. ئیدی نەم زانی چ بوو. وەختێك چاوم هەڵێنان دیتم دەست و دەمم بەستراون, دیتم ئێشك گرەکانی دیکەش هەروا لەنێوەراستی حەوشەیدا لەپەنای یەکتر درێژاو درێژ راکشاون. هەستام غارم دایە ژوورێ, حەمەدۆك لەوێ نەبوو. سەرم هەڵبڕی تەماشای چیام کرد. دیتم هەزار ژنی سپیپۆش ئارام ئارام دەچنەوە سەر دوندی چیا, بەدوایان دا غارم دا. چەند جار تەقەم لێکردن, لەپڕ دیتم هەموویان غەیب بوون. ئەم ژنانە جندۆکە بوون, پەری بوون, ئادەمیزاد بوون؟ ئەمەیان نازانم, خوا دەزانێ"

"ئەوانە ژنە جانەوەرەکانی گەڵی شکۆفە بوون, هەر ئەو ژنانە کە شینیان بۆ حەمەدۆك گێڕا. ئەوانە نە جندۆکەن, نە پەری و نە فریشتە, ئادەمیزادن"

ئێشك گرەکانی دیکەش هەریەکەی شتێکی وەك ئەمەیان گوت. تەنیا بەو فەرقەوە کە پێیان وابوو ژنەکان هەموو رووت و قووت بوون و مەمکی هەموانیشیان هەڵتۆقیوو رەق و خڕ بوون. ئەوانیش بۆنەوەی بیان گرن وەدوایان کەوتبوون, پێشیان گەیشتبوونەوە, بەڵام بۆنی عەترێکی سەیر لەلەشی ژنەکان هەستابوو کە هەموویانی بێهۆش کردبوو.

"ئەو ئەسپەم بۆ بێنن"

دەسبەجێ ئەسپەکەیان بۆ هێناو سوار بوو.

"کوێخا بڵێ هەموو خەڵکی ئاوەدانی کۆوەبن"

دەستووری بەپیاوەکانیشی دا: ئێوەش سوار بن.

کوێخا بەئێشك گرەکەی پەنا دەستی خۆی گوت:

"برۆ لەسەر ئەو بەردەڕا جاڕ ڕاهێڵە. ئاغامان دێ, هەموو خەڵکی ئاوایی دەبێ لێرە کۆ ببنەوە"

ئێشك گر چووه سەر بەردەكەو بەدەنگێكی بەرز رای‌گەیاند كە خەڵك هەموو لەگۆڕەپانی ئاوەدانی كۆ وەبن. ئەمە داب بوو. لەمێژ ساڵ بوو هەركات ئاغا, یان بابی یان باپیری ویستبایان خەڵكی دێ دەسبەجێ و بێ‌ئەوەی دەقیقەیەك خۆ بگنخێنن لەگۆڕەپانی ئاوایی كۆدەبوونەوە. لەماوەیەكی كەم دا سەرانسەری مەیدانەكە پڕ بوو لە حەشیمەت. مەحموودئاغاش لەحاڵێك دا پیاوەكانیی بەدواوە بوون ئەسپەكەی دەنگ داو هات لەپەنای حەشیمەتەكە راوەستا. لەكاتێك دا سمێڵی بادەدان پێ‌كەنی. جووتیارەكان گەیبوونە ئەم تەمەنە, یەكەم جار بوو كە دەیان دی مەحموودئاغا پێ‌بكەنێ.

"كارێكی زۆر باشتان كرد"

بەم رستەیە دەستی بەقسان كرد. راوێژی قسەكانی سارد, رەوان و بڕیاردەرانە بوو, چووكترین نیشانەی تووڕەیی و دڵیەشان لەنێوچاوانی‌دا دیار نەبوو.

"كارێكی زۆر باشتان كرد حەمەدۆكتان ـ كە من گرتبووم ـ ئازاد كردو ئەم گموجانەتان بەجۆرێك هەڵخەڵەتاند كە هاتوون دەڵێن: جندو پەری حەمەدۆكیان لەگەڵ خۆیان بردوە. هەر كارێكتان كردوە زۆر باشتان بەرێوە بردوە. حەمەدۆكتان لێ پیرۆز بێ. لەسەر سەری خۆتانی دانێن, كەلكی لێ‌وەرگرن, خۆشتان بوێ, رێزی لێ‌بگرن. ئێستا ئەمن دەڕۆم, ئەگەر لەرێگا تووشی ئەو جەندرمانە بم كە بەرەو ئێرە دێن پێیان دەڵێم پتەیەكیشتان لێ‌نەدەن. ئێوە ئاوماڵی هەزارساڵەی منن, عێل و عەشیرەتی خۆمن, هەربۆیە قبووڵی ناكەم كەس ئازارتان بدا. ئێستا داوای من لەئێوە ئەوەیە كە لەماوەی دە رۆژدا ئەم گوندە بەجێ بێڵن, لەمرۆ بەدواوە لەم دێ‌یەدا مریشكێك, بزنێك, گایەك و مەڕێك نابێ سەر برن, شوانەكانم دەنێرم هەموویان تەسلیمی وان بكەن. ئێوە دەزانن كە ئەو خانووانەی تێ‌یان دا دەژین, ئەو زەوی‌یەی بەسەری‌دا دەڕۆن و بەكورتی لەدێ‌دا هەرچی هەیەو نیە تەنانەت ئاوەكەش هەمووی هی منە, بگرە دەرپێی بەریشتان ئی منە. دە رۆژی دیكە دێمەوە ئێرە, یەك كەسی لێ‌ببینم خواهاوار. ئیدی خۆتان دەزانن, دیارە خواش دەزانێ"

ئەسپی دەنگ داو بێ‌ئەوەی ئاوڕیش وەدوا خۆی بداتەوە لەئاوەدانی وەدەركەوت.

حەشیمەت تێك چڕژان. هەتا ماوەیەكی درێژ مەعلووم نەبوو دەڵێن چی و پاشانیش دەستە دەستە بڵاو بوونەوە:

"رەبی لاقی شكێن حەمەدۆك چەند بەدیومنە, خوا زەلیلی كا"

"خوا بی‌كوژێ..."

"یاخوا لەبەین بچێ!"

"دێیەکەمانی وێران کرد"
"وەجاخی کوێر کردینەوە"
"بەدفەڕی پێوقەدەم شەڕ"
"چاوی دەڵێی چاوی مارن"
"بەژنیشی هەر بستێك دەبێ"
"رەبی بەژنی بچێتە بن گڵ..."

کەمێك دواتر هاوارو ڕۆڕۆ لەئاوایی بەرز بووەوە, بۆحاڵی خۆیان دەگریان و تووکیان لە حەمەدۆك دەکرد. ئەمیش خان لەبەردەرکی ماڵەکەی دانیشتبوو, ئاگای لەخۆی بڕابوو هاواری دەکردو رۆژانی خۆشی رابردووی وەبیر دەهاتنەوە کە لەو ماڵەدا رایبواردبوون, باسی ئەو رۆژانەی دەکردو لەدوای هەر قسەیەکیش دەیگوت: چۆن دەتوانم لێت دوور کەومەوە ئەی ماڵە جوان و رەنگینەکەم, چۆن دەتوانم لەتۆ جیا ببمەوە ئەی سپیدارە بەکاکۆڵەکەم, چۆن لەتۆ دوور کەومەوە ئەی ئەو ئاوەی وەکوو هەتاو روونی, لەتۆ ئەی چیای سووری پڕ لەبەفر, ئەی دۆڵی پڕ لە گوڵەزەردو شینەگوێنێ, لەتۆ ئەی لێڕەوارەکەم کە بەهارو هاوینان وەك جۆلانە رادەژێی, ئەی ترێ زەردو زۆڵەکەم, ئەی کۆترەکان, ئەی هەنجیرە شیرنە هەنگوینێیەکان, ئەی ئەو مێشەنگوینانە کە لە هەزار هەزار گوڵ هەزار جۆر عەتر کۆدەکەنەوە...

"حەمەدۆك! بریا نەهاتبایە گەڵی شکۆفە"
"ئەو قەڵافەتە سەگباب خێوەتم نەدەدی"
"ئەو چاوە ریپۆقاوییانەت کە دەڵێی چاوی بۆقن"
"روخساری دەڵێی روخساری مردووانە"
"حەمەدۆك! رەبی وەبەر تیرێ نەبەدی کەوی"
"حەمەدۆك! یاخوا هەر کوتەی لەشت بکەوێتە زاری داڵاشێك"
"یاخوا لەدارت دەن حەمەدۆك!"
"رەبی هومێدت ناهومێد بێ"
"رەبی چیی چاکت نەیەتەڕێ"
"رەبی تووشی بای سوور بێ حەمەدۆك!"
"یاخوا گۆڕبەگۆڕ بی"

دەنگی شیوەن و هات و هاوارو دادو بێدادی خەڵکی دێ دەگەیشتە یاغییەکانیش کە لە بەردەڵانەکە خۆیان حەشار دابوو.

"مامۆستا, لەم دێیەدا شتێك رووی داوە, بەڵایەكیان بەسەر هاتوە"

مەلافەرهاد گوتی: بەڵێ, مەحموود بەیانی لەخەو هەستێ...

"چ رەفتارێكیان لەگەڵ دەكا مامۆستا"

"لەگوندەكەی قاسم چیی كردبوو, سەد جار, هەزار جار خەراپتر لەگەڵ ئەمانە دەكا"

"مامۆستا, ئەگەر وایە ئێمە چ بكەین"

مەلا وەڵامی نەدایەوە. بێدەنگییەكی بەردرێژ بەرپا بوو. كەس قسەی نەدەكرد.

لەسەر ئاوایی لێكدا لێكدا باڵندە لەهاتوچۆدا بوون و بەماندوویی و شەكەتی باڵیان دەبزاوتن. ئەوان تازە بەبێدەنگیی ئاوەدانییان زانیبوو.

"چ بووە مامۆستا؟"

"شتێك لەنێو ئاوایی قەوماوە. ئەم بێدەنگییە لەنەكاوە نیشانەیەكی باش نیە"

قاسم گوتی:

"لە دێیەكەی ئێمەش راست وەزعێكی ئاوا ساز بوو. خوا بەڵای وا بەسەر دوژمنیش نەهێنێ"

لەو بەینەدا لەخوارەوە لەنێو كەلێنە شاخەكانەوە سەروسەكوتی موسلیم كە تەقیلەی سووری لەسەر بوو, دەركەوت.

مەلافەهاد سەری خستە سەر:

"ئەو تەقیلەیەت لەكوێ پەیدا كرد؟"

"چاوەشە زەرد دایمێ"

"وەزعی چۆنە؟"

"باشە, بەڵام زۆر دەناڵێنێ"

"وەزعی دێی چۆنە؟"

موسلیم وەزعی ئاوەدانی, وەزعی خەڵكەكەو ئەو جنێوانە كە بەحەمەدۆكیان دەدان, هەمووی بەوردی گێڕایەوە.

"ئاوا!"

موسلیم گوتی:

"بەڵێ ئاوا, سەرم لێی دەرنەچوو. ئاخر كۆچ كردن چیە كە ئەو هەموو شیوەنە دەكەن و قیامەتیان بەرپا كردوە؟ ئێمە هەموو رۆژێكی خوا جارێك كۆچ دەكەین. كۆچ كردن زۆر لەمانەوە لەجێیەك باشترە, وەنا؟"

مەلافەرهاد کە هەستابووە سەرپێ, دەستێکی لەشانی وی دا:

"کورِم کۆچ کردن زۆر باشترە, بەلاّم خەلّك لەزەتەکەییان لەبیر چووەتەوە, موسلیم منداڵەکانی تۆش لەبیریان دەچێتەوەو وەختێك باسی کۆچ کردن ببیسن وەك خەلکی ئەو خوارە قیامەت بەرپا دەکەن"

"دەلّێی دنیا خەراپ بووە..."

مەلافەرهاد دەستی حەمەدی گرت, رایکێشایە لای خۆی و گوتی:

"وەرە, وەرە ئێرە ئەختێك قسان بکەین"

لەبن شاخێك دانیشتن و پالّیان دایەوە.

"کورِم حەمەد, ئێستا باش تێگەیشتم یاغیەتی کاری تۆ نیە. وەختێك گوێت لەدەنگی ئەو خوارە بوو, مردی و زیندوو بوویەوە. ئەگەر دێهاتییەکان دەربکەن, کە وادیارە واشە, ئەگەر گەلّی شکۆفە تووشی چارەنووسی سەقزلی بێ, ئەتۆ خۆ بەسەر پێوە راناگری و ناتوانی بژی, چەتەیی کارێکی ئاسان نیە, کاری پیاوی دلّپاکی وەك تۆ نیە. ئەگەر بزانی دێیەکیان لەسەر تۆ گریاندوە, ئەتۆ لەخەفەتان هەر لەنێو ئەم بەردانە دەکەوی و دەمری. ئەگەر سبەینێ ببیسی کە یاوەر فارووق و ئاغاو خانەکان خەلّکی تووڕووسیان داوەتە بەر داروکوتەك و ئەشکەنجەو ئازارو هۆیەکەشی ئەتۆ بووی و خەلّکی تووڕووس کەوتوونە هاوارو فغان, چیت بەسەر دێ؟"

حەمەد سەری داخستبوو و قسەی نەدەکرد.

"بڕوانە کورِم, ئەتۆ تەنانەت ئەوەندەت پێ تەحەممول ناکرێ کە ئەسپێکی سەرشێت بەتەنیا لەچیا وەمێنێ. ئێستا هێندەی نەماوە لەخەفەتان وەزگ بدەی. ئەگەر بشت کوژن ناتوانی تەقە لەکەس بکەی. ئەمن پێم سەیرە چۆنت عەبدیخان و هەمزەکەچەلّ و عەلیسەفا کوشتوون, دیارە ئەتۆ نەت کوشتوون, یەکی دیکە کوشتوونی. هێندەی نەمابوو یۆبازئۆغلّیی بکوژی کە بۆچی هەلّدێ و ناچێ ئەسپەکەی بگرێتەوە. بڕوانە حەمەد! ئەو کیسەیەی لەبەر پشتێنێت دایە, زێڕێکی زۆری تێدایە. هی وەلی کوزگوون بوو. بەشی عومرێکت دەکا. چاك بوو مەحموودئاغا نەیدی. ئەمنیش نایەلّم ناوی حەمەدۆك لەم چیاو بەندەنانە لەبیر بچێتەوە. هەتا دەمرم وا دەکەم خەلّك پێیان وابێ ئەتۆ هەر لەشاخی ماوی. هەتا ئەمن ماوم کەس نازانێ کە ئەتۆ وازت لەچیاو بەندەنان هێناوەو رۆیشتووی. وەختێك ئەمنیش مردم حەمەدۆکێکی دیکە پەیدا دەبێ"

"پێت وایە پەیدا دەبێ؟"

مەلافەرهاد لەکاتێك دا مستی لەزەوی دەدا گوتی:

"پەیدا دەبێ, ئەتۆ چۆن پەیدا بووی؟ بڕوانە, تەماشای ئەم زەوییە بکە, بزانە ئەم کیفۆکە زەردە چۆنی عەرز دڕیوەو هاتوەتەدەر, بزانە چۆن هەتاو بەروخسارمان پێدەکەنێ, حەمەدۆکیش ئاوا پەیدا دەبێ. نیگەرانی من مەبە. ئەمن ئێستا لە چیاو دارستان ڕا دەچمەوە گوندەکەی خۆمان"

"لەگەڵ عەلی بێچارە بچن"

"باشە"

"ئەمنیش قاسم و موسلیمی لەگەڵ خۆم دەبەم, نازانم دەمێر چیی بەسەر هاتوە"

"ئەتۆ نیگەران مەبە, ئەمن هەر ئەم ڕۆژانە دەیبینمەوە"

"گەردنم ئازا کە مامۆستا"

"خوا منداڵی زۆرت بداتێ"

ئامێزیان لەیەکتر دا. هاتنەوە لای چەتەکان. مەلافەرهاد ریشی دەلەرزی. لێکدا لێکدا چاوی دەترووکاندن و دەستی ڕێك دەخشاندن.

"دەیجا خواحافیز, ئەمن و قاسم و موسلیم دەڕۆین"

حەمەد لەگەڵ هاوڕێیەکانی هاتەوە ئاوەدانی. هەتاو خەریك بوو ئاوا بێ. سێبەر درێژ ببوونەوە. خەڵکی ئاوایی لەخۆڕا لە گۆڕەپانەکە کۆ ببوونەوە. ئەوان حەمەدۆکیان لەدوورەوە, ئەوکاتەی لەبناری دەهاتەخوار, دیتبوو.

وەختێك حەمەدیان هاتەنێو گوێیان نەدایە. نە سەریان وەرگێڕاو نە قسەیەکیان کردو نە جنێوێکیان پێدا. وەك گڵەجان بەجێی خۆیانەوە نووسابوون... تەنیا ئەمیش خان پشتی تێکرد. حەمەد لەگەڵ قاسم و موسلیم نەختێك لەنێو دێی پیاسەی کرد... دەنگێك لەنێو دێی نەدەهات. سەرەنجام چووە لای ماڵی چاوەشە زەرد. کەس لەماڵێ نەبوو. چاوەشە زەردیش بەتاقی تەنیا لەبەر ئاگردان لەسەر تەختێك کەوتبوو, دەیناڵاند.

حەمەد چوو لەپەنا چاوەشە زەرد چۆکی دادا:

"بەڵادووربێ چاوەش ئاغا"

"خۆش بی حەمەد, ئەو کافرە ڕۆیشت, ڕۆیشت, ڕۆیشت, بەڵام جەرگی خەڵکی بەکوچکەوە دا. ئەمن ئەم کارەی لێ خۆش نابم, بەهەڵە چووە. هەر خۆ بەسەر پێوە ڕاگرم دەیکوژم, سەری دەبڕم و بۆ عیسمەت پاشای دەنێرم و نامەشی بۆ دەنێرم, ئەویش چ نامەیەك. ئەو ئاغاو خانانەی شارۆچکە تێدەگەن دنیا چ خەبەرە... ئێستا خەڵکی ئاوایی دەردەکا, مەحموود لەخۆمیز, باشە, ئێمەش دەچینە چوکووراوا, دەچین زییەڵێن و قامیشەڵان و جەگەنەجاڕ

دەردێنین و دەیکەینە کێڵگە. لاوانی گوندەکەمان زۆر بەکارن. لێرەوارێك زیـیەڵێن, ئەوەندەی بەشی دێیەك بکا دەردێنن و دەیکەنە زەویی کشتوکاڵ.

قۆڵی حەمەدی گرت کە لەپەنای چۆکی دادابوو:

"زۆر نارەحەت دیاری. ئەگەر ژنانی ئاوایی قسەی کاڵیان پێ‌گوتووی, وەدڵی مەگرە. دڵبەخەمن. لەدێیەکە دەریان کردوون و بۆیە هێندێك قسەی تاڵ دەکەن. ئەگینا چما دڵیان قبووڵ دەکا ئەتۆ شتێکت بەسەر بێ؟ وەختێك ئەتۆ مردبووی ژنەکانمان شیوەنێکیان بۆ کردی کە بۆ حەزرەتی محمدیشیان ـ کە ناوەکەشی وەك خۆی جوانە ـ نەکردبوو... ئەو ژنانە دوێنێ شەوێش..."

چاوەکانی بریسکەیەکیان داو لەسەر قسەکانی رۆیشت:

"دوێنێ شەوێش پەری هاتن, هەمووان جلی سپیان لەبەردا بوو. ژنەکانی ئێمەش هەر لەبەر خاتری چاوی تۆ پاڕووی هەنگوینیان دانێ و ئەوانیش تۆیان لە درێشووکەی ئەو مارە کە پێی دەڵێن مەحموودئاغا نەجات دا... حەمەد گیان, دڵت لە ژنەکانی ئێمە نەیەشێ. لەگوندەکەی چوکووراواشمان چاوەڕێت دەبم. ئەمنیش تا ئەودەمی مەحموودی دەکوژم. ئەودەم ئەتۆ بێ ژانەسەر هاتوچۆی گوندەکەمان دەکەی"

پاشان لەکاتێك دا زارە بێددانەکەی داپچڕیبوو, لەدڵەوە پێ‌کەنی:

"ئەودەم ئەگەر دیسان لەچوکوورەوا تووشی ژانەسەرێك بووی, دووبارە پەری دێن و نەجاتت دەدەن"

دەستی لەقۆڵی حەمەد کردەوە:

"وەزعم باشە, ناردوومە بەشوێن جەڕاح دا. تاوێکی دیکە دێ. زوو چاکم دەکاتەوە. یاڵڵا هەستە برۆ رێت ئاوەڵاو شمشێرت بەبڕشت بێ..."

حەمەد داهاتەوەو دەستی ویی ماچ کردو قاسم و موسلیمیش هەروا... وەختێك خەریك بوون برۆن چاوەشە زەرد لەنێو جێیەکەی‌دا نەختێك لەگەڵیان هەستا, چاوەکانی پڕ بوون لەفرمێسك.

"ئاخ... ئا...خ. ئەگەر مستەفا کەمال پاشا ئەم ئازایەتی و ئینسانەتی‌یەی تۆی دەدیو دەیبیست, گیانی خۆشی دەدایەی. ئەمن لە جەناق قەڵا شان بەشانی وی شەڕم کردوە. لەگەڵ هەر گوللە تۆپێك کە لەپاپۆڕی دوژمنم دەدا, دەریا دەچووە ئاسمان. پاپۆڕەکانیش دەچوونە ئاسمان"

حەمەد سەری وەرسووڕاند. دەیەویست چەند قسەی جوانی پێ بڵێ, بەڵام قسەیەکی نەدیتەوە بیکا. سەرەنجام تەنیا توانی ئەوەندە بڵێ:

"خوا تەمەنێکی زۆر زۆر درێژت بداتێ مامەچاوەش, عومرت بەقەد عومری نووح بێ"

# (٢٩)

شنەبایەکی نەرمی دەهات و کێڵگە شین و سەرسەوزەکانی لەنێو دەشتی کاکی بەکاکیدا دەخستە کەروێشکە. کێڵگەکان لەبەر رووناکی‌یەکی زۆردا پاڵیان دابووەوەو دەدرەوشانەوە, لەهەوا هەڵۆیەکی گەورە باڵی لێك کردبوونەوە, بێئەوەی باڵ لێك بدا چەرخی دەدان و خەرمانەی دەکێشانەوە.

مانگەشەو لەسەر گۆلاو شەپۆلی دەدان. رووبەری گۆلاوەکە دەلەرزی و گنج و لۆنجی تێدەکەوتن و لەدوور هەناسەی هەڵدەکێشا. سێبەرەکان لەگەڵ ئەو گێژەڵووکانە کە وەك فرفرە بەدەوری خۆیان دا دەسووڕان و تیشکی مانگیان بەدەوری خۆیان دا دەپرژاند بەرەو تووڕووس دەجوولاّن.

سێبەرەکان لەگەڵ گێژەڵووکە گەیشتنە سەر رووبەرە ئاوی‌یەکە. سەدان هەڵۆ باڵیان لێك کردبوونەوەو لەهەوا لەقولاّیی مانگەشەودا چەرخیان دەدان. سێبەرە تاریکەکەیان کەوتبووە سەر زەوی و لەسەر دارەکان, پنچکە درووەکان و گوڵە سوورو سپی و بنەوشەیو زەردەکان گەمەیەکی سەیریان دەست پێکردبوو. سێبەرەکان, باڵەکان, ئەستێرەکان و هیچ شتێك دەنگی لێوە نەدەهات.

بایەکی سارد هەڵی کرد. لەپشت ئالاّداغی‌یەوە کە زۆر دوور بوو, هەورەتریشقە درەوشانەوەو رووناکی‌یەکەیان گەیشتە وێ و بەدوای ئەوەدا لەنەکاو بوو بە رەشەشەوو هەموو جێیەك لە تاریکایی‌یەکی ئەنگوستەچاوو وەك یەك دا ون بوو. لەسەرەوەی شەوو لەنێو شەوەوە ئەسپی بۆرە بە بناریدا هاتنەخوارو چەند هێڵێکی سپیو درێژیان لەسەر رەشەشەو کێشایەوە. ئەسپەکان لەژووورووی شەوو لەژێر باڵی هەڵۆکان دا چەرخیان دەدان, هێڵی سپیو روونیان دەکێشانەوە, دڕیان بەتاریکایی شەو دەداو بەسەرەوژێردا دەچوونەخوار. لەنێو تاریکایی‌یەوە رەوە ئەسپێکی زۆر هاتنەدەرێ کە یاڵو کلکیان بەئەستێرە رازابووەوە. درەوشانەوەو کووژانەوەو سەرانسەری دێیەکەیان پڕ کرد. پاڵیان وێك دا, لمبۆز بەلمبۆزو یاڵ بەیاڵ هەموو سەریان بەرز کردەوەو بە فشقەفشق دەستیان کرد بە هەناسەکێشان و قەوەزەی سنگیان وەك کوورەی

ئاسنگەران هەڵمساو پووکایەوە. سەرو یاڵ و کلك و تەنگەو لاقیان تێکەڵ بوون و دوایە بڵاو بوونەوەو لەنەکاو حیلەحیل هەمموو جێیەکی داگرت. هەمموو ئەسپە بۆرەکان سەریان بڵند کردو گوێیان لەچەرمەوە بردن. ئەسپێکی تەنیا لەوسەری ئاسمانەوە بەحیلەیەکی درێژ جوابی حیلەی وانی دایەوە. حیلەکە نیزیکتر کەوتەوەو لەو بەینەدا تۆپەڵەنوورێك وەك تونێل (نفق) قووڵایی تاریکایی قەڵاشت و هات. ئەسپێکی بۆرە لەنێو نوورەکە هاتەدەر. پیاوێکی سەوزپۆشی مەندیل سەوز سواری ئەسپەکە بوو و شمشێرێکی بەدەستەوە بوو کە نوورێکی سەوزی لێ‌هەڵدەقوڵی. . .

پیاوە بەرگ سەوزەکە دێیەکە ماڵ بەماڵ گەڕاو لەبەردەرکی ماڵێك ڕاوەستا. ئەمجار چووە باڵەخانەکە. دەنگی زنجیر لەشەو هەڵستا, بەردەلانەکان نوقمی تاریکی بوون و ئەستێرەکان لەت و پەت بوون. سوارە سەوز لەبەرەکە ئەسپی بۆلای دیوار دەنگ دا, دیوار لەنێوەڕاستێدا شەقی برد, دەرگاکان یەك لەدوای یەك کرانەوە. حەزرەتی خدر درووددی خوای لێبێ بەهەزار ڕێزەوە بانگی حەمەدۆکی کردو ئەویش خۆی هاویشتە پاشکۆی ئەسپی حەزرەتی خدرو بەرەو ئاڵاداغی کە بنارێکی سوورو گوڵی بنەوشەیی هەبوون, باڵیان گرت. لەدوای وی سوارێك کە کڵاوی سووری بەسەرەوە بوو و بەدوای ویش دا سوارێك کە کڵاوی سپیی لەسەر بوو, هاتن و مەلافەرهادو قاسمیان لەگەڵ خۆیان برد.

لەنێو شاخەکان ڕا دەنگی گوللە دەهات. لەهەمموو جێیەك گڕ هەڵدەستاو دەت گوت جەهەننەمە. قورینگێك لەوسەری ئاسۆوە هاتبوو ئارام ئارام لەئاسمان دا چەرخی دەدان. حەمەدو قاسم و موسلیم گەمارۆ درابوون. پیاوەکانی مەحموودئاغا سەد کەسیش پتر بوون. لەلایەکی دیکەشەوە دەستە دەستە جەندرمە دەگەیشتنەجێ. ڕەنگە هەزار کەس دەبوون ئەو سێ کەسەیان گەمارۆ دابوو. لەو خوارەوە لێڕەوارەکەیان ئاگر دابوو. لێڕەوارو چیا ئاوریان گرتبوو, بڵێسەئاگرەکان بەخێرایی بەرەو حەمەد دەهاتن. مارو ڕێوی‌و گورگ و جرِوجانەوەرو ورچ و کەروێشك بەزریکاندن لەبەر ئاگر هەڵدەهاتن. لەماوەیەکی کەم دا چیایەکە لەگڕی ئاگردا ون بوو. دنیا بوو بە تەپۆلکەیەکی ئاگرین. مارو ڕێوی و گورگ و جرِوجانەوەرو کەروێشك و چەقەڵ دەستیان کردبوو بە زریکاندن, خۆیان لەنێو ئاوێ داویشت. ئاوەکە ڕایدەدان و لەگەڵ خۆی دەیبردنە خوارێ. ئەسپی خەنەییش لەحاڵێك دا کلکی ئاگری تێبەربوو, لەکاتێك دا بڵێسە ئاگر دەگەیشتنە بەرزگی, بەسەر گڕی ئاوردا بازی داو خۆی دەئاوێ هاویشت. حەمەد لەگەڵ هاوڕێیەکانی لەسەر لێوی هەڵدێرێکی بڵند بوون, گڕی ئاگر لێیان نیزیك بووەوەو خەریك بوو دەوری دەدان.

قورینگەکە هات, راست لەژوور سەریان بەسەر گڕو دووکەڵەکەوە راوەستا. ئەسپی خەنەیی خۆی خڕ کردەوەو لەلێڕەواری هاتەدەر. حەمەد یاڵی ئەسپەکەی گرت و قاسمیش کلکیی گرت. موسلیم سواری بوو. ئەسپەکە بەهەڵدێرەکەدا خزی و چووەخوار. ئەمجار لەخوارەوە هەزاران و دەیان هەزار ئەسپ هاتن لەپەنای کانیاوەکە لێك کۆبوونەوەو پاڵیان وێك دا. ئەسپی خەنەیی چووە نێویان و هەموویان دوور کەوتنەوە.

لەگوندی چاملی یۆڵ یاوەر شەوکەت مەلای گەمارۆ دابوو. سەروکەللەی حەمەد دەرکەوت...

مەحموودئاغا, ئاغای گەڵی شکۆفە مەلافەرهادی بریندار کرد, حەمەدۆك و ئەوانی گەمارۆ دا. ئەوان بەهەزار زەحمەت پاش سێ رۆژ شەڕو لێکدان توانیان گیانی خۆیان لەدەستی وی رزگار بکەن. ئەمجار حەمەدو هاورێکانیو مەلافەرهاد بەماندوویىو شەکەتی چوون لەماڵی چاوشە زەرد خەوتن. مەحموودئاغا هات و ئەوانی گرت و دەست و پێیانی لەزنجیر کرد. ئەوان ئەوەندە ماندوو بوون وەخەبەر نەهاتن. چونکی لەخەودا بوون مەحموودئاغا نەیکوشتن. چونکە ئەگەر کەسێکی لەخەودا بکوژی وەك نەت کوشتبێ وایە. ئەوانی بردو لەخانوبەرەکەی خۆیدا حەوت دەرکەی لەسەر داخستن و زیندانیی کردن. لەسەر ئالاداغی هەورێك هەستا, رووناك و نوقمی نوور. دەت گوت خەریکە لەبەر نوور دەتەقێ. هەورێك بوو وەك تیشکی هەتاو, بەلام زۆر گەورە, نیوەی ئاسمانی داگرتبوو. هەورە نوورەکە هات و لەسەر شاخە بەردئەستێیەکان راوەستا. نوور بەسەر شەودا دەباری. لەشاخەکانەوە کۆمەڵێك ژنی سپیپۆش هاتنەخوارێ بۆنێو دێ, دەهاتنەخوار, دەهاتنەخوارو تەواوبوونیان نەبوو. ئەمیش خانی خەڵکی گەڵی شکۆفە بەخێراتنی کردن. ژنە بەرگ سپییەکان لەنێو ئاوایی جەژن و شادییان وەرێخست. تەواوی چیاکانی دەوروبەری, ئاسمانی ژوور سەریان و لێڕەوارەکەی تەنیشتیان لەنووردا نوقم بوون.

کازوکووزی بەیانی ژنەکان هاتنە بەردەرکی خانوبەرەکە, بەچەکدارەکانیان گوت دەرگاکە بکەنەوە, ئێمە دەبێ حەمەدۆکی بەرین. ئەوان حەمەدۆك و هاواڵەکانییان هەڵگرت و بردیاننە ئەشکەوتێك کە لەپشتەوەی ئاوەدانی بوو.

کە بوو بەرۆژ ئەسپی خەنەیی کلکی هەڵگرت, گوێی دەچەرمەوە بردن و یاڵی پەرێشان کردن و سێجار بەتیژی بەنێو دێدا تێپەری. هەرسێك جاریش مەحموودئاغاو پیاوەکانی هەرچی فیشەك لە تفەنگەکانیان دا بوو, پێیانەوە نان, بەلام ئەسپەکە وەبەر نەهات.

ئەمجار ئەسپ بەبناران دا شۆڕ بوونەوە, هەمووی بۆرە. لەدەشتێ یەکیان گرتەوە. هەر ئەسپێك دەهات دەچوو لەنێوەڕاستی دەشتەکە رادەوەستا, کۆدەبوونەوەو کۆدەبوونەوە. دەت

گوت هەورێکی سپی نیشتوەتە سەر دەشتەکە. ئەسپەکان ئەم سەرو ئەوسەری دەشتێیان پڕ کردبوو. حەمەدو مەلافەرهادی برینداریان دەنێو خۆیان گرت و شۆڕ بوونەوە بۆ چوکووراوا. هەتا لێواری مێدیترانە رۆیشتن و چوونە نێو دەریاو لەچاوان ون بوون.

✧ ✧ ✧

سوارێك کە لەکێوپارەوە هاتبوو لەبەردەرکی ماڵی مورتەزاغا جڵەوی توند کرد. مورتەزاغا لەژوورێڕا چاوی پێی کەوت و هاتەخوار.

"مەحموودئاغا حەمەدۆکی گرتوە, دەست و لاقی بەستوون و زیندانیی کردوە. دەپازدە چەکداریشی لەبەردەکی زیندانێ داناون. چاوەڕوانی جەندرمەکانە. ئەگەر ئەوان گەیشتنێ هەڵیدەگرن و دەیبەنە شارۆچکە. بەمنی گوت سەلامی لێبکە. گوتی: بەمورتەزاغا بڵێ چاوودڵت روون. گوتی هەتا بەوان نەڵێی نەچیەوە چیا. بڵێ ببوورن کە بۆخۆم ئەم توانی خەبەریان بدەمێ.

ئەوان خەریکی قسان بوون کە تاژی تەحسین بەلاجەلاج گەیشتەجێ و لەبن پێی ئەسپی سوارەکەدا کەوتە سەرزەوی. کۆڵانیایان بەدەم و چاوان هەڵپرژاندو هێندەی بەدەورەدا هاتن هەتا وەهۆش خۆی هاتەوە. هەر کە هاتەوە هۆش خۆی گوتی:

"بەم دوو چاوانەم دیتم. وەختێك حەمەدۆك و مەلافەرهاد لەماڵی چاوەشە زەرد خەوتبوون, ئەمن چووم بەکوێخام گوت... ئاخر ئەمن شەوێك تا بەیانی لەنێو بەردەڵانەکەی پشت ماڵیان ئێشکم کێشابوو... مەحموودئاغاش هات و توندو قایم گرتی. دەست و پێیانیان زنجیر کردو سەد کەسی چەکداریان لەبەردەرکێ دانان. مزگێنیم دەوێ"

تاژی تەحسین تازە قسەی خۆی تەواو کردبوو کە سوارێکی دیکە هات. کونەلووتی ئەسپەکەی فش ببوونەوەو وەك کوورەی ئاسنگەران دەهەندمی.

"مەحموودئاغا حەمەدۆکی گرت"

ئەو رۆژە تا ئێوارێ هەر سوار بوو دەهات و دەڕۆیشت. تاژی تەحسین وەنێو بازاڕی کەوتبوو و هەرکەسی دەدی داستانی گیرانی حەمەدۆکی بۆ دەگێڕایەوە. بەڵام نەیدەوێرا بەبەردەرکی دوکانی کەبابچیی گۆڕین دا بڕوا. وەختێك دەگەیشتە بازاڕ سێسەد هەنگاو دوورتر لەدوکانی کەبابچیەکە تێدەپەڕی.

سەرەنجام عەلیەیەشەل دیتیەوەو گوتی:

"وەرە بزانم تاژی تەحسین"

تاژی تەحسین لەحالێك دا لەخۆشییان هۆشی بەسەر خۆیەوە نەبوو, بەداووناوو چاوورواو رووداوەکەی بۆ گێڕایەوە.

"هەتیوە تاژی قوون بەگوو, ئەگەر ئەوەی گوتت راست بێ, دەت کوژم"

"بۆچی, چما ئەمن چ خەراپەیەکم بۆتۆ هەبووە؟"

عەلیەیەشەل بەرقەوە چاوی لێدەرپەڕاندن و لەحالێك دا رەگی ملی هەستابوو و مووی سمێڵی وەك نەشتەر راست ببوونەوە بۆی چوو.

ئەگەر تاژی تەحسین خێرا بۆی دەرنەچووباو کەوتبایە دەستی عەلی, جێی ساغی لەلەشیدا نەدەما. عەلیەیەشەل کە هێشتا رقی نەنیشتبووەوە چووە لای مەلادۆران ئەفەندی, مەلادۆران کەچاوی پێی کەوت گوتی:

"بیستوومە عەلی, بیستوومە. زۆرم زگ بەحەمەدۆك سووتا. بەزیندوویی گرتوویانە ئەویش ئەو کافرە گرتوویە. بریا کەلاکی کەوتبایە دەستی مەحموود. خەڵکی دڕندەی شارۆچکە زۆری بەلا بەسەر دێنن. زوڵمێکی وای لێدەکەن شیاوی بنیادەم نەبێ. بەئازارو ئەشکەنجە سووکایەتیی پێدەکەن و دوایە دەیکوژن. بەلایەکی بەسەر دێنن سەدهەزار جار لەمردن خەراپتر. ئەمن ئەوانە باش دەناسم. بنیادەمی قین لەزگ زۆر خەتەرناکە. ئەوان لەئینسانەتی وەرگەڕاون. هیچ جانەوەرێك وەك ئەوانە..."

"ناکرێ نەجاتی بدەین؟"

"سەبرکە عەلی. جارێ راوەستە. لەم کۆڵەکەیە بۆ ئەوکۆڵەکەیە فورجەیەکە. ئێستا سەبرکە بزانم چ دەبێ. زۆر نارەحەت مەبە, ئەوەندە خەفەت مەخۆ. ئەو پێی دەڵێن حەمەدۆك"

"ئەو منداڵێکە, منداڵێك کە دڵی وەك ئاوێنە پاکە, کاری وی تەواوە. ئەمنیش ئەگەر هێشتم مەحموود زیندوو بێ, ناوم عەلیەیەشەل نیە"

"جارێ سەبرکە عەلی. ئەمن ئێستا دەچمە شارەوانی. ئەتۆش بچووە بازاڕ. سەبرکە, نارەحەت مەبە. بەهەرحاڵ ئێمەش هەین. لەم کۆڵەکەیەوە بۆ ئەو کۆڵەکەیە فورجەیەکە"

یاوەر فارووق زۆر نارەحەت بوو. بەنیاز نەبوو داوای قایمەقام و سەرۆکی شارەوانی قبووڵ بکا. هەرگیز نەفەرەکانی خۆی هەڵنەدەگرت بۆ پێشوازی مەحموودئاغاو یاوەر شەوکەت بچێتە "دووەبووینوو" تەنانەت ئەگەر عارف صائم بەگ, فەرماندەری جەندرمەی ناوچەکەو وەزیری نێوخۆش دەستووریان دابایە کاری وای نەدەکرد.

"وەکیل باشی عاصم! ئەمشەو دەبێ لەشارۆچکەدا شتێك بقەومێ تا ئێمەش ناچار بین نەفەرەکانمان هەڵگرین و یان بۆلای چیای دولدوڵ بڕۆین, یان شۆڕ بینەوە بۆلای دەشتێ"

"باشە جەنابی یاوەر. سەرجووخە عەلی بەرگی سیویل لەبەر دەکا, تەقیلەیەکی سووریش لەسەر دەنێ و دەچێتە پشتەوەی شارۆچکەو شارەکە دەداتە بەر گوللە. ئێمە راوی دەنێین بۆ چیای حەمیدیە لەسەرەوەی عوسمانیە"

یاوەر خۆشحاڵ بوو. بەهەر قیمەتێك بووایە بڕیاری دابوو نەچێتە پێشوازی مەحموودئاغا کە بەبێ ئاگاداریی خۆی بۆ گرتنی حەمەدۆك چووبووە چیاو نەچێتە پێشوازی یاوەر شەوکەتی کۆنەشاگرد چێشتخانە کە بۆخۆی یارمەتیی دابوو. یاوەر شەوکەت لەناوچەی ژێر دەسەڵاتی ویدا دەستی کردبوو بەراوی یاغییان.

ئەو بڕیاری دابوو نەهێڵێ نەفەرەکانی گوللەیەکیش بەحەمەدۆکەوە بنێن... نە دێڵێ پەتی باوێنە ئەستۆو لەشارۆچکەدا بیگێڕن, نە کەسیش دەتوانێ تفی لەڕووان کوتێ. ئەو رێگا نادا هیچ کەس چووکترین سووکایەتیی پێ بکا.

"جەنابی یاوەر, ئێمە ئەوە دەڕۆین. بەڵام ئەگەر ئێمە لەنێو شار نەبین نازانی ئەو پیاوکوژە چ بەڵایەك بەسەر حەمەدۆك دێنێ"

یاوەر لەحاڵێك دا مستی خڕدەکردەوە گوتی:

"ئەو ناتوانێ هیچ ناماقووڵییەك بکا. ئەمن وەگوێی قایەقام هەڵدێنم, ئەویش لەقسەی من دەرناچێ. ئەگەر ئێمە نەڕۆین و لە شارۆچکە وەمێنین و نەچینە پێشوازی ئەو پیاوکوژە... پاشانیش پێشی کارەکانی بگرین, ئەودەم خەڵك نالێن یاوەر بەخیلیی پێ‌دەبا؟"

"بۆچی؟ دەشڵێن"

"با چووکترین بێحورمەتی بەحەمەدۆك بکەن, ئەودەم چوارمێخەیان دەکێشم"

"دەترسن"

"بێجگە لەوەش, نابێ رێگا بدەین لەداری بدەن. چما هیچ کەس ئەوی لەوەختی کوشتنی عەبدیخان و هەمزەکەچەڵ و عەلی سەفابەگ دا دیوە؟"

"نا, تەنانەت کەس نەیدیوە ئەو مێرووولەیەکیش ئازار بدا"

"ئەگەر بمانەوێ دەتوانین پاکانەشی بۆ وەرگرین"

"با وابکەین جەنابی یاوەر"

"با تێبگەن کە بەبێ خەبەردانی من گرتنی حەمەدۆك چ تامێك دەدا"

"کەوایە, ئەمشەو لەشارۆچکە دەردەکەوین و هەتا چەند رۆژی دیکەش نایەینەوە. وانیە جەنابی یاوەر؟"

"بەڵێ, ئەمن ئەو پیاوە نیم بچمە پێشوازیی مەحموودئاغای پیاوکوژ, پێشوازیی ئەو زاڵمە کە رەعیەتەکان دەردەکا, دوژمنی هەق و ئینسانەتیيە... لەهەر بارێکەوە تێی فکری, ئەوکاتەی ئەو دێتەوە, ئێمە لەشارۆچکە نەبین باشترە. بابایەکی سەرباز نابێ دەست لەنێو دەستی پیاوکوژێك بنێ و بەخێراتنەوەی بکا. سەربازێك ناتوانێ یاغیيەك لەپیاوکوژێك وەربگرێ"

عەلیيەشەل کە وەك خەوگەڕان لەنێو بازاڕدا دەهات و دەچوو, وەخت بوو لەخەفەتان گیانی دەرچێ. هەرکەس لەسەرەوە لەکێوپارەڕا دەهات خەبەری گیرانی حەمەدۆکی پێبوو, هەرکەسیش گیرانەکەی بەسەلیقەی خۆی دەگێڕایەوە. پیاوماقوولانی شارۆچکەش کە لەشارەوانی کۆ ببوونەوە, گومانێکیان لەگیرانی حەمەدۆك دا نەبوو و بیریان لەوە دەکردەوە کە چۆن پێشوازی لە مەحموودئاغا بکەن و چ جەژنێکی بەشکۆی بۆ بگرن.

مورتەزاغاو زولفۆو تاشکەن خەلیل و زۆری دیکە بەو رووداوە گێژو کاس ببوون. بریا حەمەدۆك لەجیاتی ئەوەی بەدەستی ئەو کابرایە بگیرێ لەکێوان مابایەوەو کەسانی وەك مەحموودئاغا لەترسان زراویان چووبایەو نەیان وێرابا بچنە کۆڵان و بازاڕ. هەموویان بەدڵ وایان دەگوت, بەڵام کەس نەیدەوێرا بەزمان بیڵێ.

ئێستا ئیدی عارف صائم بەگ و مەحموود لەپێش چاوی ئەنکەرە دەبن بەقارەمانێکی نیشتمانی و ئەگەر مەحموودئاغای گەڵی شکۆفە وازی لێبێ دەبێتە نوێنەری مەجلیسیش و ئەودەم پێی شوورەیی دەبێ جوابی سڵاوی خەڵك بداتەوە. ئەودەم ئەگەر کەیفی لێبێ دەتوانێ هەموو خەڵکی دێهاتی چوکووراواو تووڕووس شاربەدەر بکا. هەر لەئێستاوە لەبازاڕ داستان لەسەر ئازایەتی و قارەمانەتیی ناوبراو دروست دەبوون.

"سمێڵە چەخماخیيەکانی بادەدا"

"دوژمنانی لەبن چنگە ئەسپان دا دەکوژێ"

"پێی دەڵێن مەحموودئاغا"

"دنیایە بەسەری قامکی هەڵدەسووڕێنێ"

"بەزەییم بەیاوەردا دێتەوە"

"دەبچۆ نێچیری خۆتی لێبستێنەوە!"

"ئەگەر یاوەر, ئەو پیاوە ڕەسەنە, ئەو تورکە پاکە, ئەم سووکایەتیيە بێسزا بهێڵێتەوە, دەبێ ناوی خۆی بگۆڕێ"

"مومکین نیه"

"تۆڵەی دەستێنیێتەوە"

مورتەزاغا گوڕاندی:

"راوەستن برادەرینە, راوەستن. هیشتا حەمەدۆك نەهاتوەتە شارۆچکەو نەش کەوتوەتە بەندیخانە. ئێوە پێتان وایە هێنانەخواری حەمەدۆك لەو چیایانە کارێکی ئاسانە, تەنانەت ئەگەر لەشکرێکیشیان لەگەڵ بێ؟ کەمێك سەبر بکەین و چاوەڕێ بین. کەس نازانێ ئەو فێڵبازە حەمەدۆکی بە چ فێڵ و تەڵەکەیەك گرتوە. یاوەر دەڵێ نایەڵم هیچ کەس چووکترین نارەحەتی بۆ حەمەدۆك پێك بێنێ, یاوەری بەڕێزمان فارووق بەگ دەڵێ هیچ بەڵگەیەکمان بۆ مەحکووم کردنی حەمەدۆك بەدەستەوە نیە. دەڵێ تا ئێستا هیچ شاهیدێك نیە کە چاوی لێبووبێ حەمەدۆك عەبدیخان و هەمزەکەچەڵ و عەلی سەفابەگی کوشتوە. بەڵێ, راست دەکا. کەوایە دادگای دادپەروەری تورکیە چۆن دەتوانێ مەحکوومی بکا؟ ئەتۆ پێمان بڵێ تاشکەن خەلیل بەگ, ئەتۆ هەم قانوون زانێکی گەورەی و هەم قارەمانی شەری نیشتمانی. نووری چاوی کۆمارەکەمانی, ئەتۆ بڵێ"

"ئەگەر بەڵگەیەك نەبێ کەس ناتوانێ حەمەدۆکی مەحکووم بکا"

مەلادۆران ئەفەندی گوتی:

"باشە دەکرێ یاغییەك کە ئەو هەموو ناوبانگەی دەرکردوە ئازاد بکەن؟"

تاشکەن خەلیل دەستی راستی لەسەر زگی ـ کە ئەم رۆژانە هەر دەهات و گەورە دەبوو ـ داناو ئاوڕی دایەوە سەر مەلادۆران ئەفەندیو پرسی:

"ئەگەر بەڵگەیەك لەدەست دا نەبێ, دادگا دەتوانێ چ بکا؟ تەنانەت ئەو قازییەی دادگا کە دۆسیەکەی دەچێتە بەردەست ئەگەر پیاوێکی وەك ئەو قازییەی خۆشمان بێ کە مووی لەماستی دەردەکێشێ و گوێ لەقسەی هیچ کەس راناگرێ ئەگەر بابیشی بێ و تەنانەت گوێ بۆ قسەی دەوڵەتیش ناگرێو قانوون هەرچی بڵێ مووبەموو جێبەجێی دەکا, بێئەوەی گوێ بداتە پرتەو بۆڵەی هیچ کەس, حەمەدۆکی ئازاد دەکا"

زولفۆ دەستی کرد بەقسان:

"ئەگەر مەحموود بتوانێ حەمەدۆکی لەکێوپارەڕا بێنێتە ئێرە... هەموو کەس دەزانێ ئەو مەحموودە کێیەو چ کارەیە. هیچ کەس ناتوانێ شتێك دژی ئەو منداڵە بەستەزمانە دێهاتییە بدۆزێتەوە. ئەگەر لەولاتێك دا دادپەروەری لەنێو بچێ ریشەی حکوومەتەکەی هەڵدەکەندرێ.

هیچ هێزێك ناتوانێ میللەتێك نەجات بدا کە عەدالەت لەوڵاتەکەیدا لەبەین چووە. حەمەدۆکی یاغیو عیسمەت پاشای سەرۆك وەزیر بەرامبەر بەقانوون وەك یەکن... کەوایە کێ و کام هێز دەتوانێ حەمەدۆکی مەحکووم بکا؟ هەر بەم زووانە حەمەدۆك ئەو پیاوە بەدبەختە, ئەو پیاوە پیرۆزە کە خەڵك گەیاندوویانەتە پلەی نەزەرکردەکان وەك هەموومان دەبێتە هاونیشتمانێکی ئازادو سەربەست و لەم مەملەکەتەدا دەگەڕێ. ئەو کوڕی شەهیدێکە. ئەو کە باپیری لە جەناق قەڵا, بابی لە یۆنان, مامێکی لە گەنالەو مامێکی دیکەی لە قالیچای شەهید بوون, لەهەموومان زیاتر هەقی هەیە ئازادو سەربەست لە وڵاتەکەیدا بگەڕێ. ئەگەر پێویست بوو ئەمن دەچمە لای حاکم بەگ و عارف صائم بەگ. ئەگەر پێویست بێ ئەمن لەبەر خاتری وی هەتا ئەنکەرەش دەڕۆم. ئێوە ناڕەحەت مەبن.ئەمن نایەڵم حەمەدۆك, ئەو پیاوە مەبارەکە لەگەرووی مەحموودی گەڵی شکۆفە ئەو پیاوە زاڵم و خوێنخۆرە, ئەوە کە دێهاتییەکان شاربەدەر دەکا, ئەوە کە وەك زەروو خوێنی خەڵکی ئەم دەشت و کێوانەی مشتوە, بچێتەخوار... خوای لەژوور سەران بەشاهید دەگرم کە لەمەودوا ئەمن یەك دۆنم لەم زەوییانە, دۆنمێك بەجێی خۆی, تەنانەت بستێکیشی نادەم بەو"

باسەکەی شارەوانییان لە گازینۆ لەسەر مێزی ئارەق خواردنەوە درێژە پێدا. هەر کە ڕۆژ بووەوە لەتەپۆلکەی ڕووبەڕوویانەوە هەنگامەیەك بەرپا بوو. دیسان چەتە پەلاماری شارۆچکەیان دابوو. یاوەریش دەسبەجێ بۆ ڕاونانی ئەوانەی هێرشیان کردبووە سەر شارۆچکە, لەشار وەدەر کەوت. لەو بگرەو بەردەیەدا دەبوو مەحموودئاغاش بێتەوە شارۆچکەو پیاوماقووڵانی شاریش دەبوو پێشوازییەکی بەشکۆتر لەهی یاوەری لێبکەن. نەخشەی پەلاماری بەدرۆ بۆسەر شارۆچکە لەلایەن یاوەرەوەو دەرچوون لەشار بەو خێراییە یارییەکی باش بوو. چونکە وەختێك مەترسیی هێرش بۆسەر شارۆچکە لەگۆڕێدا بوو, هیچ کەس لە پێش چاوی وی باوەشی بە مەحموودئاغادا نەدەکردو شاگەشکە نەدەبوو و ئەوی نەدەگەیاندە ئاسمان. مسۆگەر پێشوازییەکی وای لێنەدەکراو دوکانەکانیش بەئاڵا نەدەڕازانەوەو سامی تورقودیش نەیدەتوانی وەك جاران یەخەی دادڕێ و خۆی لەت و پەت بکاو بەوتاری ئاگرین هەمووان وەگریان بخا. جگە لەوە, ئەگەر هەمووی ئەمانەش بکرابایەن, دیسان ڕێوڕەسمێکی بێشۆق و بێتام دەبوو. ڕاستییەکەی ئەوەبوو کە مەحموودئاغا بەگرتنی حەمەدۆك ئەوی کردبووە پووڵەڕەشکەیەك.

لەنیوەشەوێ ڕابردبوو کە مەلادۆران ئەفەندی توانی بچێتەوە ماڵێ. عەلییەشەل بەچاوی هەڵمساوەوەو بەنێوچاوان گرژی لەحاڵێك دا پازدە ساڵ پیرتر ببوو, چاوەڕوانی بوو.

"عەلی چاودڵت ڕوون, مزگێنیم دەوێ"

"حەمەدۆك دەرباز بووە"

"نا عەلی دەرباز نەبووە"

"ئەدی مەسەلە چیە؟"

"باشە حەمەدۆك عەبدی‌خانی کوشتوە؟"

"ئەوەندەی ئەمن بزانم..."

"ئەمن دەزانم ئەتۆ چ دەزانی. حەمەدۆك عەبدی‌خانی نەکوشتوە, هەمزەکەچەڵیشی نەکوشتوە. ئەوەی عەلی سەفاشی کوشتوە حەمەدۆك نەبووە"

"سەرم لێی دەرناچێ ئاغا"

"ئەمنیش سەرم لێی دەرناچێ عەلی, ئێستا با بۆت باس بکەم.دیارە ئەگەر بتوانم روونی بکەمەوە"

مەلادۆران ئەفەندی چوو لەسەر قەنەفە دانیشت, دەسحێبە نەوەدونۆ دەنکی‌یەکەی بەدەستەوە گرت و دەستی کرد بە دوعاخوێندن.

"عەلی وەرە لەکن من دانیشە. وەختێك مەحموودئاغای گەڵی شکۆفە حەمەدۆکی گرت, ئەو جەنابانەی ئێرە مردن و زیندوو بوونەوە. یاوەر زۆر توورە بووە. بۆئەوەی بەپێشوازیەوە نەچێ کەڵەکێکی ساز کردوە. یاوەر دەستووری داوە کەس حەمەدۆکی..." ئەمجار موویەموو مەسەلەکەی گێڕایەوە.

عەلی گوتی: هەموو شتێکم بەفکردا دەهات, ئەمە نەبێ.

"حەمەدۆکیش دێنینە لای خۆمان"

"ئەو هەر بەڕاستییش هەرگیز نەی‌دەویست چەتەیی بکا. بەڕاستی ئەمە باش بوو"

"حەمەدۆك پێنج شەشساڵێك زۆر بەکەلکی ئێمە دێ. پاشانیش نەك هەر چەتەیەکی نەزەرکردە, خوایە تۆبە, پێغەمبەریش بێ لەبیر دەچێتەوە. ئەو پێنج شەش ساڵەمان بەسە. کوڕە زیادیشە"

هەتا بەیانی بێ‌ئەوەی وەنەوزێك بدەن قسەیان کرد. گەڵاڵەیان داڕشتن و خەونیان بۆ پاشەڕۆژ دیتن".

بەیانی عەلی بێ‌ئەوەی شەوێ خەوتبێ, چووە بازاڕ. چووە مزگەوت و نوێژی بەیانیی لەوێ کرد. پاش نوێژکردن سەرێکی دوکانی سالەکوێری دا. هێشتا مشتەری نەهاتبوون. سالەکوێر سەرورِیشی جوان بۆ تاشین. بەدەم ریش تاشین و سەر چاك کردنەوە لەپەستا قسەی دەکرد:

"حەمەدۆك بەبێ‌گوناح دەناسرێ. بەڵام یاغی‌یەك, کەسێکی خووی بەچیاو بەندەنان گرتوە لەدەشتێ دەتوانێ چ بکا..."

"ئەو هێشتا زۆر جحێڵە"

"کەوایە, وادیارە عەبدیخان و عەلی سەفا ئەو نەیکوشتون"

عەلی بەباوەڕێکی تەواوەوە گوتی:

"نا, ئەو نەیکوشتوون, ئەو تەنانەت مێروولەش ئازار نادا, چۆن پیاوی پێدەکوژرێ... بوختانە"

سالەکوێر گوتی: بوختان وەك کراسی ئاگر وایە.

عەلی پارەی بۆ سالەکوێر دەرهێنا, بەڵام سەرتاش پارەی لێوەرنەگرت. پاش ڕۆیشتنی وی موڕتەزاغا هاتە دوکانێ و هەر کە هاتە ژوورێش گوتی:

"سالە, سالە, برالە سالەکوێر. بنیادەم قابیلی خەتایە. ئێمە چەند بەهەڵە چووبووین, چەندیش دەترساین. حەمەدۆك کەسی نەکوشتوە"

"ئەمنیش دەزانم ئاغا, ئەو تەنانەت مێروولەیەکیشی ئازار نەداوە. ئەو منداڵێکی ریوەڵەیە. چۆن دەتوانێ ئەو ئاغا سەرزلانە بکوژێ؟"

موڕتەزاغا نەختێك دەفکرەوە چوو, کەمێك دەستی دەسمێڵی وەردا:

"هەموو کەس دەزانێ ئەو ئاغاو خانانە کێ کوشتوونی. تەنیا ئێمە نازانین. ئەوی راست بێ تەنیا ئەمن نەم دەزانی. ئەگینا هەم یاوەرو هەم تاشکەن خەلیل بەگ, هەم مەلادۆران ئەفەندی, هەم زولفۆو تەنانەت ئەنکەرەو عارف صائم بەگیش هەموویان دەیان زانی. تەواوی تورکیە دەیزانی ـ کەوایە هەر ئەتۆ نەت دەزانی ـ بەڵام ئەوی راست بێ ناتوانم ناوی بێنم"

"کێ ئەوانی کوشتوە؟ دەبەرت مرم ئاغا پێم بڵێ..."

ئاغا دەستی کرد بە نازو نیم ناز.

"کێیە ئاغا؟ ئەمن, ئەمن چۆن نەم زانیوە. چما دەکرێ لەم شارۆچکەیەدا شتێك هەبێ و ئەمن نەیزانم. دەبەرت مرم ئاغا پێم بڵێ کێیە"

"دەڵێن... هەموو خەڵکی شارۆچکە, هەموو چوکووراوا لە منداڵی حەوت ساڵەوە هەتا پیری حەفتا ساڵ لەو بارەیەوە قسە دەکەن, بەداخەوە... دەڵێن... هەم عەبدیخان و هەم عەلی سەفاو هەم هەمزە کەچەڵ مەحموودی گەڵی شکۆفە کوشتوونی"

سالەکوێر هاواری کرد:

"ئەی دادو بێداد. دەبوو بم زانیبایە. دەبوو زانیبام کە غەریبەیەکی کاڵەپێی وەك حەمەدۆك نەیتوانیوە پڵنگی وەك عەبدیخان و هەمزە کەچەڵ و عەلی سەفای بکوژێ. چۆن

بوو، چۆن بوو ئەوەندە بێخەبەر بووم؟ هەتا دەمرم لەخۆم خۆش نابم. ئەگەر وایە تالیب بەگ کێ کوشتوویە؟"

موڕتەزاغا بەگژیدا هات:

"ئەوەندە گەوج مەبە سالەکوێر، کەمێك مێشکت وەکارخە. ئەمەیان دەبێ بۆخۆت بیدۆزیەوە"

"ئای، ئەویش لەبن سەری مەحموودئاغادایە؟ هەی بێناموسی خوێنخۆر هەی! دەڵێن مەحموودئاغا ئەوەندەی زێڕ هەیە هەر خوا بزانێ، هەمووی لەبانك داناوە، یازدە سندووقە..."

"راستە؟"

"هەموو کەس دەزانێ هەیەتی. بۆچی نایبێ؟ عێل و عەشیرەتەکەی پشتێکە تووڕووسی دەخوا. تازە چوکووراواش بووە بە هی خۆی. لەمەودوا تورکیەی وەك پیواز پاك دەکاو رووتی دەکاتەوە. لەمەودوا ئیدی لە شارۆچکەدا کەس ناوێری لەبەری بکۆکێ. لەمەودوا ئەو ئیدی زیاتر ئاغا ئازاو بەجەرگەکان قەتلوعام دەکا"

"لەمەودوا هەر خوا دەبێ پشت و پەنات بێ ئاغا"

موڕتەزاغا لەپشت ملی ڕا هەتا کلێچەی سمتی لەرزی:

"دڵم نایە بیڵێم. بەڵام خوا دەبێ لەدەستی ئەو جۆرە کەسانە بمان پارێزێ. حەمەدۆکی بەستەزمان. منداڵی بەستەزمان بەناهەقی ناڕەواو لەسەر هیچ و خۆڕایی چەندین ساڵ وەك گورگی برسی ئاوارەی ئەو کێوو بەندەنانە بوو. ئەی چ ناهەقییەك، چ زوڵم و بێعەداڵەتییەك..."

سەری چاك کرد. سالەکوێری سەرتاش بە کۆنەبرۆسێك مووەکانی لە جلەکانی کردەوە.

"چاوی بنیادەمی بەتەماع و چاوبرسی هەر بەگڵ پڕ دەبێتەوە. ئێستا دەبێ بەشان و شکۆوە پێشوازی لەو زاڵمە خوێنخۆرە بکەین، دەبێ پیاوکوژی گەڵی شکۆفە بکەینە قارەمانی نیشتمانی. توخوا تەماشا، شتی چۆنمان بەسەر دێ! هەر بۆئەوەی پیاوکوژێك بێگوناحێکی گرتوە، دەبێ جێژن ساز بکەین. چ بکەین. ئەمە دابێکی نەتەوایەتییە لە باب و باپیرانمانەوە بۆمان ماوەتەوە"

لە بازاڕی هێندێك لە دوکاندارەکان ئاڵای سووریان کە مانگ و ئەستێرەی لێکێشرابوونەوە لەبەر دەرکی دوکانەکانیان دابوو. بە دارشمشاڵ و گوڵی خۆڕسك کە لە چیارا هێنابوویان تاقی سەرکەوتنیان ساز کردبوو. سەر سەکۆی قسەکردن و دەوروبەرەکەی بەئاڵا رازابووەوە. دەهۆڵکوت لەپێش هەتاوکەوتنەوە گەیشتبوونە شوێنی بازاڕو چاوەڕێی بەرپرسێك بوون کە بڵێ:

لێدەن! لەئێستاوە دێهاتی‌یەکان لە دێهات و دەشت و چیاکانەوە بەرەو شارۆچکە وەڕێ کەوتبوون.

هەتا لای نیوەڕۆیە هەموو کاردروستایی‌یەك بۆ پێشوازی کرا. هەموو شاگەشکە ببوون. خەڵکی شارۆچکە کە لەمێژ بوو چاوەڕوانی دیتنی حەمەدۆك بوون چاویان پێی دەکەوێ و مەحموودئاغای گەڵی شکۆفەش لەنیزیکەوە زۆرترو باشتر دەبینن.

لەنێوەڕاستی بازاڕ سێ تاقی سەرکەوتن لێ‌درابوون کە هەرسێکیان سەوز بوون. تاقەکان بەسوێسنەو داودی و زۆر گوڵی کێوی رازابوونەوە. ئەو سێ تاقە لەهەموو تاقەکانی دیکە جوانتر بوون. گاوگەردوونیان ئامادە کردبوون. گاو بزن و مەڕ... گایەکە هی مورتەزاغا بوو کە قەرار بوو لەبەر پێی مەحموودئاغا بی‌کاتە گاوگەردوون.

تاشکەن خەلیل دەی‌گوت:

"لەتوانادا نیە. ئێمە ناتوانین بەم جۆرە پێشوازی لەکەسێك بکەین کە دەزانین پیاوکوژە. ئەگەر ئەنکەرە بەم مەسەلەیە بزانێتەوە بۆ ئێمە جوان نابێ"

"باشە چ بکەین. کابرا حەمەدۆکی لەگەڵ خۆی دێنێتەوە. وەك پیاوکوژان زنجیری کردوە"

"ئاخ, بریا یاوەر نەڕۆیشتایە"

"چما فەرقی چ بوو؟"

"نەی‌دەهێشت پێشوازی لەپیاوکوژێك بکرێ"

سەرۆکی شارەوانی هەستایە سەرپێ و گوتی:

"ئەمنیش رێگا نادەم. ئەو کابرایە, ئەو پیاوکوژە دەبێ بێ‌هەست و خوست وەك هەور بێتە نێو ئەم شارۆچکەیە. یاوەریش ئەمەی زۆر پێ خۆش دەبێ"

"ئێستا کەوایە ئالاکان بێننە خوارێ"

"تاقەکانیش هەڵگرنەوە"

"دەهۆڵکوتەکان جواب بکەن بڕۆن"

"ئاوا باشترە. پێشوازێکی لەم بابەتە هەقی خۆیەتی"

"پارێزگاریش پێ‌نازانێ کە حەمەدۆکی گرتوە"

"ئەنکەرەش هەروا"

"بەبێدەنگی"

"پاشانیش حاشا دەکەین"

"لەوانەیە بۆخۆشی شرت و گوم بێ"

"حەمەدۆکیش..."

سەرۆکی شارەوانی لەحالێك دا لەهۆدەکە وەدەردەکەوت گوتی:

"ئێوە لێرە چاوەڕوانی من بن"

ئەو دەیەویست بۆخۆی چاوی لە کۆکردنەوەی ئەو تاقە بەشکۆیانە بێ کە لێ‌درابوون. هەڵاوەسینی تاقە یەك لکەداری سەوز, تاقە گوڵێك و تاقە ئاڵایەکیش لەبازاڕدا, بۆ ئەو پیاوکوژە بەشانازی‌یەکی گەورە دەژمێردرا. لەکاتێك دا سەرۆکی شارەوانی بەخێرایی بەرەو بازاڕ دەچووە خوارێ, سوارێك کە بەچوارناڵی لەوبەرەوە دەهات و ئەسپەکەی شەڵاڵی ئارەق بوو و هەروا کەفی دەپڕژاند, سەری ئەسپەکەی بۆلای وی وەرگێڕاو خێرا دابەزی و هاتە پیادەڕێ‌یەکەو گوتی:

"جەنابی سەرۆك, نەگبەتی‌یە, بەدبەختی‌یە"

"چ بووە؟"

"حەمەدۆکیان بردوە"

"وەرە بچینە شارەوانی"

سەرۆکی شارەوانی لەپێشەوەوە تەتەرەکە بەدوای‌دا, پاش ئەوەی ئەسپەکەی کە وەك کوورەی ئاسنگەران دەهەندمی دایە دەستی یەکێك لە فەرمانبەرەکان, چوونە ژووری سالۆنی شارەوانی.

سەرۆکی شارەوانی گوتی:

"هەڵاتوە"

"کێ؟"

"حەمەدۆك"

هەموو لەجێی خۆیان هەستان و بارانەی پرسیار بەسەر تەتەردا باری. تەتەرەکە هەر ئەوەندەی دەزانی کە حەمەدۆك و هاوڕێکانی لەحالێك دا دەست و لاقیان دەزنجیردا بوون و شازدە پیاوی چەکدار لەبەر دەرگای ژوورەکەیان ئێشکیان داوە لەخانوبەرەی مەحموودئاغای گەڵی شکۆفە کە وەك قەڵا وایە ڕفێنراون. مەحموودئاغا لەوە زیاتر هیچی بەو نەگوتبوو. پاش ئەو تەتەرە خەبەر دوای خەبەر بوو کە دەهاتە شارۆچکە. هەرکەسە بەسەلیقەی خۆی خەبەرەکەی دێنا. هەموو خەبەرێکیش بەچاوترووکاندنێك لەسەرانسەری بازاڕی دەگەڕاو ئەمجار دەگەیشتە چووکترین گەرەکی شارو چووکترین ماڵ.

مورتەزاغا لەشارەوانی‌یەوە ڕاستەڕێ بەرەو بازاڕ غاری داو لە حالێك دا هاواری دەكرد: ئالآیەكانتان مەیەننەخوار, حەمەدۆك لەدەستی مەحموودئاغای بەرێز ڕای كردوە, تاقەكان باشتر برازێننەوە, هاتە شوێنی نیوەڕۆبازاڕ. مەیدانی نیوەڕۆبازاڕ پڕ لە حەشیمەت بوو. دەهۆڵكوت و زوڕناژەنەكان لەبەر بێ‌سەبری ڕەنگیان شین هەڵگەڕابوو. شەكەت و ماندوو بوون. "لێ‌دەن!"

✧ ✧ ✧

لەتاریكەشەودا ژنانی سپی‌پۆش لەچیایڕا دێنەخوار. شمشێری ڕووت بەدەستێكەوەو چرایەك بەدەستی دیكەوە. ژنان لەچیاكان و لە دەشتی خوارەوەڕا وەڕێ كەوتن و هاتن هەتا مەیدانی نێودێ‌و بەردەلآنی پشت دێ‌یان پڕ كردو دوایە هێرشیان كردە سەر خانووبەرەی مەحموودئاغا كە وەك قەلآ وابوو. دیوارەكانیان رووخاند. چەكدارەكان بەدیتنی ئەوانە لەجێی خۆیان وشك بوون, تەنانەت لەجێی خۆشیان نەبزووتن. ژنە سپی‌پۆشەكان چوون زنجیریان لەدەست و پێی حەمەدو برادەرەكانی دەرهێناو ئەوانیان لەنێو خۆیان گرت, ئەمجار چوونە ئەو كێوانە كە شاخەكانیان بەردئەستێن. لەژوور سەری هەركام لەو هەموو ژنە هەلۆیەكی سووریش چەرخی دەدان و لەو نیوەشەوەدا بلێسەی بلآو دەكردنەوە.

وەختێك مەحموودئاغا حەمەدۆكی گرت باران دەباری. سەرچیا بوو و تاریكایی. دنیا سارد بوو. بایەكی ساردی دەهات. حەمەد رای دەكردو مەحموودئاغا بەدوایدا. حەمەد لەپەنا شاخەكان و لەنێو لكەدارەكان و ئەشكەوتەكان دا خۆی دەشاردەوە. بەلآم دەچووە هەر جێ‌یەك مەحموودئاغا هەروەك بەدەستی خۆی لەوێی دانابێ حەمەدی دەدیتەوەو دەری دەكێشا. حەمەد نەی‌دەزانی چ بكاو لەكوێ خۆی بشارێتەوە. لەنێو شاخەكان دا سەری لێ‌شێوابوو. سەرەنجام مەلافەرهاد لەمەسەلەكە حالی بوو, بەحەمەدی گوت:

"چما نازانی حەمەد, ئەو ئەنگوستیلەیەی دەستت ئاشكرات دەكا. بچیە هەر كوێ‌یەك وەك گوڵەئەستێرە, وەك هەتاو دەدرەوشێتەوە..."

حەمەد وەلآمی دایەوە:

"ئەمن ناتوانم ئەم ئەنگوستیلەیە لەدەستم دەربێنم. ئەگەر دەری بێنم تفەنگچی‌یەكانی مەحموودئاغا دابێژ دابێژم دەكەن. حەمەدۆك وەختێك بە ڕێگادا دەڕۆیشت لەنێو پارچە نوورێك دا بوو.

دەت گوت لەتکە هەتاوێك بەرێدا دەڕوا. مەحموودئاغا پاڵی پێ بەدیوارێکەوە داو هەر بیست و حەوت پیاوەکەی دەنگ دان بەڕیز بەرامبەری راوەستن. ئەمجار دەستووری تەقەی دا. هەر بیست و حەوت گوللە پێکەوە کەوانەیان کردو کەوتنە سەرزەوی. دەسرێژ, دەسرێژ, دەسرێژ... مەحموودئاغا لە رقان هار ببوو, حەمەدیش لەنێو نوورەکەدا نوقم ببوو و پێ‌دەکەنی.

مەحموودئاغا خەنجەرەکەی هەڵکێشا, کشایەوە, خۆی شل کرد کردو شل کرد لەنەکاو پەلاماری حەمەدی دا. خەنجەر هەروەك لەپۆلا درابێ تەق لەنێوبەندی‌دا شکا.

مەحموودئاغا خەنجەرەکەی هاویشتە نێو ئاگر. لەنێو گڕی ئاورەکەدا کە هێندی کێوێك کەوتبووە سەریەك, گوڵێکی گەورەی سپی کە ئاونگی لەسەر نیشتبوو پشکووت و لەبەر با دەستی کرد بە ڕاژان. دەست و پێیان دەزنجیر کردن و مەحموودئاغا لەسەر لێوی هەڵدێرێکی زۆر بڵندەوە فرێی دایە نێو ئاو. حەمەد لەحاڵێك دا دەست و لاقی دەبزاوتن وەك تۆپەڵە نوورێك بە پڕیشك هاویشتن هاتەوە سەرێ. مەحموودئاغا ئاگای لەو ئەنگوستیلەیە نەبوو کە لەدەستی وی‌دا بوو. لەدەوروبەری حەمەد گوڵەگێلاسی سوور پشکووتن. پنچکە دڕوو, گیا, کارگ, شاخ, زەوی, ئاسمان, خاك و هەور هەمووی بەجارێك پڕ بوو لەخونچە. عەرزو عاسمان پڕ بوون لەگوڵ.

مەحموودئاغا بەو بەڵایە کە بەسەری هاتبوو, پشتی شکاو دەستی کرد بەگریان. دەروێشێکی کورتەباڵا بەڕیشێکی درێژو سپی و دەم و چاوێکی درێژووکەوە پەیدا بوو, بەمەحموودی گوت: ئەتۆ بەو ناوێری. چونکە دەستی تۆ بەخوێن سوور بووە. چما کوێری نابینی حەمەدۆك لەنێو دەریایەك نووردا نوقمە؟ دەروێشی کورتەباڵا دەستووری دا وەرە ئێرە مەحموود. مەحموود بەئەدەبەوە دەست لەسەر سنگ لە حوزووری‌دا راوەستا. ملی بەلاوەناو گوتی: فەرموو پیر.

"بڵێ بزانم چما ئەتۆ عەبدی‌خانت نەکوشت؟"

"با, کوشتم, ئەمن عەبدی‌خانم کوشت پیر"

"هەمزەکەچەڵ و عەلی سەفابەك و تالیب بەگیش ئەتۆ کوشتن؟"

"ئەمن کوشتمن"

حەمەدۆك گوتی:

"خۆش بی پیر, زۆر سوپاس" و ئەمجار ڕەگەڵ هەزاران سەدان هەزار کچی سپی‌پۆش کە ئەو خوارەیان پڕ کردبوو, کەوت و لەگەڵیان رۆیشت هەتا گەیشتە لێواری دەریای سپی.

دارەپرتەقاڵەکان هەموو وێکڕا خونچەیان کرد. عەرزو عاسمان و دەریا پڕ بوون لە خونچەی گوڵەنارنج. کچەکان گۆرانی‌یەکیان بۆ دەریا گوت. دەریا هەتا نیزیك لاقیان هات. لەوێ ڕا

هەتا تووڕووس ڕەنگێکی شینی نەرم هەموو جێیەکی داگرت. بۆلای ڕەنگە شینەکە ڕۆیشتن. نووری حەمەدۆك لەنێویان دا دەدرەوشایەوە. ڕۆیشتن و لەدووری لەبەرچاو ون بوون.

مەلافەرهاد گوللەی وەباسکی کەوتبوو. برینەکەی ماسیبوو و لە تاوی ژانی برینەکەی خۆی پێ ڕانەدەگیراو ددانی دەچیڕەوە دەبردن. بیستی کە حەمەدۆکیان زنجیر کردوەو لەقەڵای مەحموودئاغادا زیندانیی‌یان کردوە. لەچیایڕا هاتەخوار. دێهاتی‌یەکان و بەردو تاتەبەردەکانیش لەگەڵ وی لەچیاڕا هاتنەخوارێ بۆ سەر گەڵی شکۆفە. دێیەکە پڕپڕ لە جەندرمە بوو. جەندرمەکان وەختێك دیتیان مەلافەرهاد بەشاخ و بەردو ئەو هەموو خەلکەوە کە عەرزو عاسمان هەڵیان ناگرێ روویان کردوەتە ئاوەدانی, لەترسان شێت بوون, سەری خۆیان هەڵگرت و هەتا دەشتێ رایان کرد. مەلا چووە ئەو قەڵایە کە حەمەدۆکی تێدا زیندانی بوو, گوتی: دەرگاکان بکرێنەوە. دەرگاکان کرانەوە. حەمەدۆك لە قوژبنێك هەڵکوشمابوو لە ترسان لەو تاریکایی‌یەدا کسکەی چاوی بوو.

مەلافەرهاد گوتی: تاریکی لاچۆ. تاریکی وەلا کەوت و چاوی حەمەدۆك بەرووناکی‌یەکی توند بەشمواره ئەنگوتن. زنجیرەکان هەڵوەرن. زنجیرەکان لەدەست و لاقی حەمەدۆك بوونەوەو هەڵوەرینە سەرزەوی. لەچیای دوڵدوڵەوە هەتا ئالاداغی پەلکەزێڕینەیەکی گەورە و بەشکۆ دەرکەوت. پەلکەزێڕینە ئەو شەوە هەتا خۆرهەڵات لەئاسمان دا درەوشایەوەو بەیانیی زوو لەگەڵ ئەستێران بڵاو بوو.

حەمەدۆك رووی بۆ هەر لایەك وەردەگێڕا گوڵێکی بەرزتر لە بەژنی خۆی دەپشکووت و لەسەر پەلکەزێڕینەیەکی باریك دەردەکەوت.

باران باری و پاش ئەوەی لافاو هەستاو نیشتەوە, لەجێی لافاوەکان وردە بەردێکی سپی وەدەرکەوت.

✧ ✧ ✧

قایمقام, سەرۆکی شارەوانی, قازی‌یەکان, داواکاری گشتی, مامۆستاکان, مورتەزاغا, تاشکەن خەلیل بەگ و زولفۆو زۆری دیکە لەپشتەوەی شارۆچکە لەنیزیك دارچنارەکە پێشوازی‌یان لە مەحموودئاغا کرد. مەحموودئاغا بەماندوویی و ڕەنگ زەردی لەئەسپەکەی هاتەخوار. ئەویش پێشوازی‌کەرانی لەئامێز گرت. سوارەکانی لەدوای خۆیەوە وەك پەیکەری بەردین بێجووڵە راوەستابون و سەریان داخستبوو.

قایمەقام, مەحموودئاغا, سەرۆکی شارەوانی, مورتەزاغاو مەلادۆران ئەفەندی خۆیان لە ترۆمبێلی هەمزەدایی هاویشت و بەبن ئەو سێ تاقی سەرکەوتنە بەشکۆیەدا تێپەڕین و چوون بۆلای ماڵی مورتەزاغا. وەختێك ئەوان بەژێر تاقەکەدا تێدەپەڕین دەهۆڵکوت و زورناژەن دەستیان کرد بە لێدان و دوکاندارەکان و ئەو خەڵکەی بۆ ئەو ڕۆژە بەشکۆیە لەماڵەکانیان وەدەرکەوتبوون بەئیشتیاو شەوق زەوقەوە دەستیان کرد بە چەپڵەڕێزان.

میوانداری‌یەکی گەورە, وەڕێ خرابوو. سینیی مس لەسەر سفرەی جاجمێ ریز کرابوون. بۆ نان خواردن لەسەر ئەو برادەرانە کە هێشتا نەگەیشتبوونەجێ, راوەستان. ئەوان حەسابوونەوە کەئەوانی دیکەش گەیشتنەجێ. مورتەزاغا بەخۆشیی برادەرە دلێرەکەی کە حەمەدۆکی پیاوکوژ دوژمنی گیان و نیشتمان و میللەتی گرتبوو, خواردنی ئەوەندە خۆش و بەلەزەتی ساز کردبوون کە پیاو دەستی خۆی پێوە دەخواردن.

پیاوەکانی مەحموودئاغا هەمیشە لەچوار سووچی ناوچەکەوە هەنگاو بەهەنگاو خەبەریان پێدەدا کە حەمەدۆك لەکوێیە. هەموو خەڵکی کێوپارەش لەبەر خاتری پیری خانەقای چل چاو کە ئاناجیخ سوڵتانی جندە بوو پارێزگاری‌یان لەو دەکردو پەنایان دەداو دەیان شاردەوە. مەحموودئاغا حەوت جاری رێك ئەو خوێنخۆرەی لەداو خست. بەڵام هەم حەمەدۆك وەك جیوە لەبەر دەستانی دەترازاو هەم خەڵکی کافری چیاکانی توورووس لەبەر خاتری ئاناجیخ سوڵتانی جندە لایەنگری بوون. لەبەر ئەوەی ئاناجیخ سوڵتان برینەکانی وی چاك کردبوونەوەو لەلایەکی دیکەش مۆری خانەقای چل چاوی دابووە دەست, ئەو پیاوکوژە لەبەرچاوی خەڵك ببووە نەزەرکردە. بەڵام کێ دەتوانێ لەدەست کەسێك کە بڕیاری یەکجاریی بۆ بەرێوەبردنی کارێك داوە, رزگاری بێ. مەحموودئاغا سەرەنجام لە گەڵی شکۆفە دەیگرێ و دەزنجیری دەکاو لەخانووەکەی خۆی‌دا کە دەت گوت قەڵایە, حەوت دەرکەی لەسەر دادەخا. نیوەشەوێ هەڵلاو هەنگامەیەك ساز دەبێ. مەحموودئاغا دێتەدەرێ. دوژمن لەماڵێتان نائومێد بێ دەزانن چ دەبینێ. هەموو خەڵکی دێ حەوت ساڵە تا حەفتا ساڵە رژابوونە دەرێ. دەوری ماڵەکەشیان گەمارۆ دابوو. دێ لە حەشیمەت دا شەپۆلی دەدان. پاشان لە چیاکانەوەو هەروەها لەخوارێڕا حەشیمەتێکی زۆر هاتبوون. لەبەر زۆریی حەشامات دەرزیت هەڵاویشتبا نەدەکەوتە زەوی. حەشیمەتەکەش مەعلووم نەبوو بۆچی وردە وردە تووڕە دەبوون و پرتەوبۆڵە دەبوو بە گورەگوڕ. بەیانی کە هەتاو دەکەوێ مەحموودئاغا چ ببینێ باشە؟ دەبینێ هەموو جێیەك بووەتە دەریای حەشیمەت,

چیی لەدەست دەهات؟ جگە لەوە کە سواری ئەسپەکەی بێ و پیاوەکانی هەڵگرێ، دڕ بەحەشیمەتەکە بداو خۆی بگەیەنێتە دەری ئاوەدانی و بەزەحمەت گیانی خۆی نەجات بدا. ئەمجار تەماشا دەکا دەبینێ حەشیمەتەکەو لەسەرووی هەمووانیشەوە خەڵکی دێیەکەی خۆی ـ هەموو ڕەعیەتەکانی کە بەنان و نمەکی وی پێگەیشتبوون ـ بۆلای ماڵەکەی وەڕێ کەوتوون، هێرش دەکەنە سەر ماڵەکەو کاتێك لێی دەکشێنەوە خانووەکە بەردی بەسەر بەردەوە نامێنێ. لەوکاتەدا مەحموودئاغا کە لە هەژدیهاش ناترسێ، لەترسی حەشیمەتەکە زراوی دەچێ. حەشیمەتەکەش مەلافەرهادو حەمەدۆکی هەڵدەگرن و دەسبەجێ لەپێش چاوی مەحموودئاغا زنجیرەکانیان لەت وپەت دەکەن و لەگەڵ خۆیان دەیان بەنە کێوپارە.

مەحموودئاغا کە پێکی راکیی بەدەستەوە بوو، دەستی دەلەرزی و مەشرووبی پیاڵە پڕەکە بەم لاولا هەڵدەپڕژا. تاشکەن خەلیل وەك چەوەندەر سوور هەڵگەڕابوو، رەگی ملی هەستابوون، لەکاتێك دا ڕانەکەوێکی بەدەستەوە بوو لەجێی خۆی رەق رامابوو. مەلادۆران ئەفەندی بەدەم دەسحێب گێڕانەوە دەستی دەڕیشی خۆی وەردەدا. زولفۆ چەنەگەی لەنێو هەردوو دەستی خۆی گرتبوو. قایمەقام لەبن لێوانەوە هێندێ شتی دەگوت و داواکاری گشتی نەیدەتوانی سەرسوڕمانی خۆی بشارێتەوە.

مورتەزاغا ناڵاندی:

"ئەمن ئەم گوت، بەخواتان سوێند دەدەم ئەم گوت مار هەتا چووکەڵەیە دەبێ سەری پان بکەیەوە؟ ئێستا ئیدی پاشای قۆیوەجییش بێ، سوودی نیە. کاڵەلەپێ تازە هار بوون، چێشتە بوون و حەمەدۆکیان لەدەستی مەحموودئاغا پڵنگی چیاکانی تووڕووسیش ڕفاندوە. ئێمە کارمان تەواوە و فاتیحەمان خوێندراوە. حەمەدۆك ئیدی لەم شارۆچکەیەدا نە بەردی لەسەر بەردی دێڵێ و نە سەر بەلەشی بنیادەمەوە. ئەمن گوتم، یەخەم لەبەر دادڕین و گوتم نەکا ئەو دێهاتیانە یەك جار تامی خوێن بچێژن. گوتم براینە دەغیلە بەدبەختمان دەکەن، بەڵام باوەڕیان نەکرد. گوتیان مورتەزا لە ترسان شێت بووەو مێروولەشی لێبووەتە حەمەدۆك. ئێستا فەرموون وەریگرن!

بەڵێ دەرکەوت زۆر بەئەزموون بووین. لەدنیادا زاڵم ترو خوێنخۆرتر لەو کاڵەلەپێیانە کە تامی خوێنیان چێشتوە پەیدا نابێ. لەسەر ئەوەی بابەگەورەی من چەتەیەك، واتە کووزان ئۆغلی گرت و تەسلیمی دەروێش پاشای کرد، خەڵکی چوکووراوا لەگەڵ ئێمە، لەگەڵ عێل و عەشیرەتمان و تەنانەت لەگەڵ سەگ و پشیلەشمان دەنگیان دابڕی. عێل و عەشیرەتی خۆشمان لەو

ڕۆژە بەدواوە چاویان لەچاومان نەکرد. سەدساڵ بەسەر ئەو ڕووداوەدا تێپەڕیوە هێشتا چاومان لەچاوی ناکەن و قسە لەگەڵ من ناکەن. ئێستا فەرموون بزانم لەمەودوا چ بکەین؟"

مەحموودئاغا کە بەخواردنەوەی ڕاکی وردە وردە دەهاتەوە سەرخۆی گوتی:

"ئەو حەمەدۆکەی دووبارە دەگرمەوەو هەر کە گرتم دەیکوژم. زۆری پێناچێ. فەرمانم داوە خەڵکی گەڵی شکۆفە هەتا دە ڕۆژی دیکە دێیەکەم بۆ چۆڵ کەن"

پاشان پیاڵە ڕاکییەکەی دەستی یەك بێ چۆڕبڕ کرد.

مورتەزاغا گوتی:

"ئەو دێیە نابێ بمێنێ. ئەو دێهاتییانەش کە حەمەدۆکیان لەدەست ڕفاندین دەبێ سزا بدرێن. نابێ ڕێگا بدەین بێن لە چوکووراوا بحاوێنەوە"

تاشکەن خەلیل بەگ گوتی:

"دەبێ ئەمانە لەوڵات دەربکرێن. ئەمەشیان لێزیادە. ڕاست و ڕەوان ئەم کارەیان بە یاخیبوون لەکۆمارو دوڵەت و میللەت دەژمێردرێ. ئەوان لەسەر ئەو کارە دەبێ زۆر بەتوندی سزا بدرێن"

زولفۆبەگ گوتی:

"دەرکەوت ئەگەر نەتوانین زۆر زوو چارەیەکی کارساز بکەین لەدەست ئەم فیتنەیە ڕزگارمان نابێ"

قایمقام گوتی:

"هەر لەگەڵکوو حەمەدۆك نەجاتی بوو چەتە هێرشیان کردە سەر شارۆچکەکەمان. دەبوو هەر لەوەڕا زانیبامان حەمەدۆك ڕزگاری بووە. هەر لەبەر ئەوەش بوو کە یاوەر بەشی لەپێشوازی برای بەڕێزمان مەحموودئاغادا نەبوو. لەمەودوا دەبێ زۆر وریا بین"

خواردنەوەو ڕابواردن هەتا نیوەشەوێ درێژەی هەبوو. دە ڕۆژ مۆڵەت بۆ دێهاتییەکانی گەڵی شکۆفە زۆر بوو. ئەوان دەبوو دەسبەجێ دێیەکە بەجێ بهێڵن. مەحموودئاغا دەیگوت: ئەمە ئیمکانی نیە:

"ئەمن هەتا گەیشتوومە ئەم تەمەنە زۆر دێم بەخەڵکەکەیان چۆڵ کردوون. هەرچی بکەین لە دە ڕۆژ زووتر ناتوانن دێیەکە بەجێبهێڵن. بۆخۆشمان دەبێتە ژانەسەر. تکام لەئێوە ئەوەیە کە ئەگەر هاتنە چوکووراوا نەیەڵن لەو خاکەدا کە دەڵێی ئاڵتوونە نیشتەجێ بن. ئەوان دەبێ بچنە سووریە، عیراق و ئێران. چونکە ئەوانەی لەچیا دەردەکرێن ئەگەر بێنە دەشتێو لەوێ دێ

بۆخۆیان دروست کەن وەك ئەوەیە پاداشیان وەرگرتبێ, راست وەك خەڵکی دێی سەقزلی. ئەودەم بۆخەڵکی دیکەش دەبنە نموونە"

زولفۆ نەڕاندی:

"نا, مەحموودئاغا قەولت پێدەدەم ئەو دێهاتیانە نەك هەر لە خاکی کۆماری تورکیەدا بستێك زەوییان دەست ناکەوێ پێی لەسەر دانێن, تەنانەت گۆڕستانێکیشیان بەنسیب نابێ. قەولت پێدەدەم, قەول"

ئیستیکانەکانیان بەخۆشیی یەکتر هەڵدا.

## (٣٠)

لەگەڵ تورکمەنەکانی هەوشار بەخێرایی لە چیاو لێرەوارەکان تێپەڕین, هاتن و لە قامیشەڵان دا خۆیان حەشار دا. ئەو قامیشە بڵندو شینانە کە تازە ریشۆڵەیان دەرکردبوون, بەدەم شنەباوە رادەژان و دەستە دەستە باڵندە لەقامیشەڵانەوە بەرەو دەریای مێدیترانە هەڵدەفڕین, لەسەر گیایەکی ناسك پەپوولەیەکی بەقەد زەرگەتەیەك باڵی لێك دەدان و لێکی دەکردنەوەو ماندوویی خۆی دەحەساندەوە.

شەکەت و ماندوو بوون. لەبەر کفتی و شەکەتی خەویان لێنەدەکەوت. قاسم یەك بێن قسەی دەکرد, بەڵام حەمەد گوێی لێنەدەگرت. چووبووە پاڵ خۆیەوەو لەگەڵ کۆمەڵە فکرێکی دووروودرێژ دەستەویەخە بوو. جاروباریش بریسکە پۆڵای گۆڕین دەهات و لەبنی چاوانیدا هێلانەی دەکرد. هەڵدەستا, گوێی بۆ دەوروبەر هەڵدەخست. گلۆڵەنوورێکی زەرد بڵاو دەبووەوەو دەدرەوشاو پاشان وەك پوولەکە دەڕژایە سەر زەوی.

بێئارام بوو. بۆنی گیای ڕزیو, بۆنی ڕیشە جەگەنەکان و قامیشی ڕزیو, بۆنی ئاوی بۆگەن و باتلاغ لەگەڵ بۆنی گوڵەنارنج و بۆنی لاقی تاوەگازو سنگی هەڵتۆقیوی سەیران کە لەگەڵ بۆنی هەتاوو گەرما تێکەڵ ببوو, دەهاتە بەرلووتی. گۆلاو هەناسەی دەداو دەیئەمراندو لەگەڵ هەر هەناسەدانێکیدا زەوی دەلەرزیەوە. دەبوو لەپێش دا بچێتە لای سەیران, پەنا بۆ باوەشی گەرمی بەرێ و چاوی بەروخساری بکەوێ, ئەو سەیرانە کە وەختێك پێدەکەنیو سەرگۆنای دەچاڵ دەکەوت بەنەوین و خۆشەویستی شێت و شەیدای دەکرد دەبوو بچێ ڕووبەڕووی دانیشێو هەتا ڕۆژی قیامەت بێ ئەوەی چاو بتروکێنێ تەماشای بکا. سەیرانیش لەو جۆرە وەختانەدا هەرگیز قسەی نەدەکرد, ئەویش دادەنیشت و بێدەنگ لە روخساری حەمەدەوە رادەما. ئەگەر جارێکی دیکە چاوی پێیدەکەوتەوە. . .

لەوانەبوو هەرگیز لەو جێگایە کە نیازی هەبوو بیچێتێ، نەگەڕێتەوە. بە بێ دیتنەوەی سەیران ژیان لە مردنیش خەراپتر بوو. بۆنی گوڵەنارنج و بۆنی سەیران ئەوەندە ئاشکرابوو کە دەت گوت دەکرێ دەستی لـێبدەی هەموو شتێکی دەوروبەری لەنێوچوو. دنیا، قاسم و پەپوولە چووکەڵەکە... و ئەو نێوە تەنیا سەیرانی لـێمابوو. هەر لەو کاتەدا کەم کەمە هەستی بە ترسانیش دەکرد. بیرکردنەوە لەوە کە لەوانەیە هەرگیز چاوی بە سەیرانێ نەکەوێتەوە، شێتی دەکرد.

زۆری برسی ببوو. بەبێ خۆراك و بە زگی برسی‌یەوە نەیان دەتوانی بچنەوێ... هەر ئێستا دەبوو بچێتە لای سەیران و خۆی بگەیەنێتێ.

سەیران لە گیا تەڕو تازەکانی چوکووراوا گیابرژیوەی بۆ لـێدەناو تێریان لـێدەخوارد.

دەمێك بوو موسلیم بەدوای عەلی‌یەشەل دا چووبووە شارۆچکە. هێشتا سۆراغی نەبوو. داخوا گیرابوو. گیرابووو دوایەش... نا، نا. ئەم بەچکە عێلاتی‌یە ئەگەریش بگیرێ و تەنانەت بە زیندوویی کەولێشی بکەن، ئەنجن ئەنجنی بکەن و چاوەکانیشی هەڵکۆڵن دیسان ناتوانن یەك قسەی لە زمانی دەرکێشن. بێ گومان وەدرەنگ کەوتنەکەی هۆیەکی هەبوو.

قاسم گوتی: سەبرت بێ حەمەد.

"وەدرەنگ کەوتوە."

"تاوێکی دیکە دێتەوە."

چاوەڕوانی فیتووی موسلیم بوون. قەرار بوو ئەگەر موسلیم هاتەوە، لێرەوە راستەڕێ بچنە لای سەیران تا خواردنیان بۆ دروست بکا... ئەگەر جەندرمە سەیرانیان گرتبایە ژێر چاوەدێریو ئەوانیان گرتبایە، چارەنووسی خەڵکی گەلی شکۆفە چ دەبوو؟ وادیارە چاوەشە زەرد ئەوی بەخشیوە. بەڵام ئەوانی دیکە هەتا دنیا دنیایە لێی‌خۆش نەدەبوون. لەوانەش بوو هەتا هەزار ساڵ، سێ هەزار ساڵ هەتا ناوی هات نەفرینی بکەن. بەڵام ئەش دەکرا سەیرانێ نەبینێ. بە زگی برسییشەوە هیچیان پێ نەدەکرا...

دوودڵ بوو، لە گۆلاوەکە دەهاتە دەرێ، لە پشت پۆلە قامیشەکەوە خۆی حەشار دەداو چاوی لە جادەی دەکرد. موسلیم سەرو سۆراغی نەبوو. گومان هەڵی‌دەگرت، دەهاتەوە لای قاسم و بیری دەکردەوە ئەگەر جەندرمە گۆلاوەکە گەمارۆ بدەن؟... لەو حاڵەدا هیچ رێیەکی دەربازبوونیان نەبوو. ئەو گۆلاوەی خۆیان تێدا شاردبووەوە، ئەو قامیشەڵانە وەك دورگەیەکی چووکەڵە وابوو. ئەگەر لە چوارلاوە گەمارۆ درابان رزگاربوون لە گەمارۆ مومکین نەبوو. جەندرمەو دێهاتی‌یەکان ئابلووقەیان دەدەن، ئەودەم کەلێنێك بۆ دەربازبوون ناهێڵنەوەو لەنێو

باتلاغەکەدا دەیان خنکێنن. داخوا ماڵی سەیران, گوندی وایوای ئەمین تر نەبوو؟ ئەگەر لەوێ گەمارۆ درابان, کۆنەدێ‌یەك لە نیزیك وێ هەبوو دەیان توانی وەك جاری پێشوو بۆی دەرچن و بەرەو ئاکچاسازو ئاناوارزا بڕۆن. لەوانەبوو نەجاتیان بێ. لێرە بەتەواوی لە تەنگانەدابوون. کەوتبووە گومان, بەڵام هیچی بە قاسم نەدەگوت. کەچی قاسم لە ئالآداغیش هێمن ترو قایم تر بووو بە ماندوویی‌و ئارام و بێ‌خەیاڵ پاڵی بە ڕەگە حەیزەرانێکەوە دابوو, لاقی ڕاکێشابوون و چاوی لەسەریەك دانابوون. دیارە حەمەد هەستی کردبوو کە گومان و دوودڵی‌یەکەی, کاری کردوەتە سەر ویش. بەڵام کابرا وەسەر خۆی نەدێناو دەری‌نەدەبڕی. بۆئەوەی وا نیشان بدا کە گوێ‌نەداتە ئەم مەسەلەیەو بۆ ئەوەی ترسەکەی بشارێتەوە, یەك تەکان قسەی دەکرد, یان هەروا چاوی لەسەریەك دادەنان و بە ڕوخسارێکی ئارامەوە رادەکشا. حەمەد کە ئیدی نەی‌توانی لەوە زیاتر گومانەکەی بشارێتەوە بانگی قاسمی کرد: قاسم! قاسم چاوی هەڵێنان.

"قاسم, ئەگەر ئێمە ئاشکرا بین و لێرە گەمارۆمان بدەن, چ بکەین؟ چۆن لەم قامیشەڵانە چووکەڵەیە دەربازبین, ئەودەم چۆن رووم بێ چاو لە چاوی خەڵکی گەڵی شکۆفە بکەم؟"

"هەرگیز ناتوانی چاو لە چاویان بکەی"

"دەردی من بە هیچ جۆر مردن نیە. بریا مردبام و ئەمەم بەسەر نەهاتبایە. بریا مردبام و خەڵکی گەڵی شکۆفەم لەو حاڵەدا نەدیبایە. وەختێك خەبەری مردنم هاتبوو, شیوەنێکیان بۆ کردبووم هەر مەپرسە... تەنانەت بۆ حەزرەتی پێغەمبەریش ئەو شیوەنەیان نەکردبوو, ئەتۆ هیچ ئەو شیوەنەت گوێ‌لێ‌ببوو؟"

"لە کوێم گوێ لێ‌ببایە؟ بەڵام خەڵك باسیان دەکردو لە زمان وانەوە بیستم"

"پێت وایە ئەگەر ئێستا ئەمن لەم باتلاغەدا بکوژرێم, دیسان شیوەنم بۆ دەکەن, یان ئەم جارە نەفرینم دەکەن؟"

"ئەمەیان ئیدی نازانم"

"ئەگەر ئێوە گەیشتنە ئێودێ, هیچ تەماشای ڕەنگ و روویانت کرد؟ ڕەنگ بە ڕوویانەوە نەمابوو. دەت گوت, دەت گوت هەر ماڵەی مەیتێکی لە بەردەستان دایە"

"خوا ئەو بەڵایەیان لەسەر وەلابا. ئەم بەڵایەی بەسەر ئێمە هێنا بەڵام یاخوا تووشی هیچ بەندەیەکی خۆی نەکا. زۆر سەختە"

"ئێستا ئەگەر بکوژرێم... زۆریشمان برسی‌یە. چۆن بچینە وایوای... بۆ لای سەیران... سەیران گیابرژیوەیەکی چوکووراوامان بۆ سازکا... ئێمەش تێروپڕ بخۆین... ئەمنیش..."

دەیەویست بڵێ: ئەمنیش هەر نەبێ جارێکی دیکە چاوم پێیبکەوێتەوە. بەڵام گێرایەوە.
"ئەمنیش..."

"دەبێ لەسەر موسلیمی راوەستین. هەتا بەرەبەری رۆژئاوا ناتوانین لێرە دەرکەوین. چونکە ئەگەر یەکێك بمان بینێ, حیسابمان رۆیشتوە. ئەودەم فاتیحەی خەڵکی گەڵێ شکۆفەش دەخوێندرێ. زیندەبەگۆڕ دەکرێن"

"بەراست قاسم چ قەومابوو! رەنگ و روویانت دی؟ دەت گوت بە زیندوویی لە قەبریان خستوون"

زۆری لە رۆژئاوا لادابوو کە لەو سەری باتلاغەکەوە دەنگی فیتووی موسلیم بەرز بووەوە. قاسم وەڵامی دایەوە. تاوێك پاش بێدەنگ بوونی فیتووەکان موسلیم گەیشتە کنیان. گوتی:

"مام عەلیەشەلیش خواردنی بۆ ناردوون. ئەمن هەر لەوێ نانم خوارد. ئێوە مردوون لەبرسان. وەنا؟"

حەمەد گوتی: ئەدی, لەبرسان مردین.

دەسبەجێ بوخچەی خواردنەکەی لێوەرگرت و کردیەوە: وەرە قاسم. دەستیان بە خواردن کرد. بێ ئەوەی قسەیەك بکەن هەرچی لە بوخچەکەدا بوو, خواردیان و تەواویان کرد.

"مام عەلیەشەلم گوتی هەر ئێستا بێن. یاوەر هەموو جەندرمەکانی هەڵگرتوەو لەگەڵ خۆی بردوونە دەری شارۆچکە. مام عەلیەشەلم گوتی چووەتە پشتی عوسمانیە. یاوەر وەختێك بیستی مەحموودئاغا بەرەو شارۆچکە دێ, جەندرمەکانیی هەڵگرت و ملی رێگای گرت و لەشاری وەدەرکەوت. مام عەلیەشەلم گوتی: راست وەختیەتی, مەحموودئاغاش لەماڵێ مورتەزاغایە. ئێستا راست وەختیەتی. هەرچۆنێك بێ ئەمشەو خۆیان بگەیەننە ئێرە. دەرفەت لەکیس خۆیان نەدەن. ئەمن لەخوارەوەی قاباسەقز بەدوو ئەسپەوە چاوەڕێیانم. مام عەلیەشەل گوتی مەحموودئاغا پیاوەکانیی ناردوونەوە کێلگە - موسلیم بێدەنگ بوو. نێوچاوانی تێك ناو دوایە گوتی - ئەمن ئەسپم نیە"

حەمەد هەستایە سەرپێ, گۆمیلکەیەکی تاوێك پێشتر هەڵکەندبوو, بەدەست چۆڕێکی ئاو لێخواردەوە:

"کەوایە ئەمن تازە ناتوانم سەیرانێ ببینم, لەوانەشە ئیدی هەرگیز نەیبینمەوە. موسلیم! ئەگەر ئەمن کوژرام, ئەتۆ ئەم ئەنگوستیلەیە هەڵگرە, بەهەرجۆرێك بووە بیگەیەنە سەیران..."

هەناسەیەکی هەڵکێشاو لەسەری ڕۆیشت:

"مەیەڵێ تەرمەکەم لێرە, لەچوکووراوا بمێنێ. تەرمەکەم بدەنەوە بە دایەحۆری... ئەو دەزانێ چیی لـێبکاو لەکوێم بنێژێ. بەدایەحۆرییش بڵێ..."

قسەکەی تەواو نەکرد: یاڵڵا بابڕۆین.

کە گەیشتنە قاباسەقز لەدوورەوە تارمایی عەلییەشەلیان بەدی کرد. پیاوێك بەسێ ئەسپەوە لەبن دارێکی ئەستوور...

عەلییەشەل لەپێش دا حەمەدو دوایە قاسمی لەئامێز گرت.

حەمەد گوتی:

"چ بکەین عەلی, چارەنووس ئاوا بوو"

عەلییەشەل پێکەنی.

"حەزم نەدەکرد وا بکەم, بەڵام بۆخۆت دەزانی کە چارەم نیە"

"خوا لەدوو دەستت بدا"

ئەمجار لەسەر بەردان دانیشتن. عەلی هەڵکەوتی ماڵی مورتەزاغای لە پلیکانەکانەوە تا ژوورەکان موویەموو بۆ باس کردو پاشان گوتی:

"ئەمن دەرگاکە دەکەمەوەو دەت بەم هەتا بەردەرکی ژوورەکە. ئەگەر شتێك ڕوویدا نیگەران مەبە. ئەگەر شارۆچکە پڕیش بێ لەجەندرمە ئەمن و قاسم دووبەدوو... هەرسێکمان ملی ڕێگا دەگرین بەرەو چیا"

حەمەد هیچی نەگوت. هەرسێکیان سوار بوون و موسلیم لەوێ مایەوە.

"ئەمن بچمە کوێ؟"

حەمەد جڵەوی ئەسپەکەی توند کردو پاش ئەوەی تاوێك بیری کردەوە گوتی:

"ئەتۆ بچووە لای سەیرانی خوشکت, هەموو شتێکی پێ بڵێ. بڵێ حەمەد دەیگوت بم بەخشێ خواحافیز"

ئەسپیان تاو دان. مانگەشەوێکی ساوو پاك دەشتەکەی پڕ دەکردو چیاکانی وەك ڕۆژ ڕووناك دەکردەوە. بەتوندی بەنێو شارۆچکەدا تێپەڕین. سێبەری خانووەکان کەوتبووە سەر کۆڵان و مەیدانۆکەکان.

لەبەر دەرکی ماڵی مورتەزاغا دابەزین. عەلی بەئاسانی دەرگای حەوشەی کردەوە. لەمێژ بوو کلیلی هەموو دەرکەکانی خانووەکەی پێبوو. چرافانۆسێك لەسەر پلیکانەکان داییسا.

عەلی لەپێشەوە چووە سەری و لەنێو شیپانەکەدا راوەستاو بەسپایی گوتی: ئەم دەرگایەیە. ئەو بەپلیکانەکان دا داگەڕاو حەمەد دەرکی ژوورەکەی کردەوە. چرا لالەیەکی کوپەیی بەدیوارەوە داییسا. کە دەرگا کرایەوە مەحموودئاغا وەخەبەر هات. راست بووەوەو پاڵی وەسەر ئەنیشکی چەپی دا. دەمانچەکەی بەدەستەوە بوو. بەدیتنی حەمەد رەق راما. لەو نێوەدا مورتەزاغاش وەخەبەر هات. ئەویش وەك مەحموودئاغا رەق رامابوو و چاوی لەحەمەدەوە بڕیبوون.

"دەم ناسی مەحموودئاغا؟ ئەمن ناوم حەمەدۆکە"

مەحموودئاغا بەدوا هێزو توانای خۆی دەمانچەکەی دەستیی بەرز کردەوەو راست لەو وەختەش دا ئەو فیلینتایەی بەدەست حەمەدەوە بوو سێ جار دەستی لێ‌کێشرا. بەبای گوللەکان ئەو چرایەی بەدیوارەوە داییسا کووژایەوە. لەگەڵ دەنگی تەقەکە مورتەزاغا لێفەی بەسەر خۆی هەڵکێشاو لەنێو جێیەکەیدا قانگڵە بوو.

حەمەد لەپلیکانەکان هاتەخوار. هەوساری ئەسپەکەی لەدەستی عەلی وەرگرت و خۆی هاویشتە سەر ئەسپ و وەك با بەنێو شارۆچکەدا تێپەڕی. پاش ئەوەی لەشارۆچکە وەدەرکەوت و دوورکەوتەوە لەپشتەوە گوێی لەدەنگی چەند گوللەیەك بوو. شەوو ڕۆژێکی تەواو بەرێگایەکی ناخۆش و بەنێو لێرەوارو بەستێنان دا ئەسپی لینگ دا. لە بەرەبەری تاوهەڵات دا گەیشتە گەڵی شکۆفە. هات لەگۆڕەپانی ئاوەدانی لەبن دارسپیدارە ئەستوورەکە راوەستا. ئەسپەکە کەفی کردبوو. پەڕەی لووتی فش ببوون و سنگی وەك کوورەی ئاسنگەران دەهەندمی. هەتاو کەوت و رووناکایی‌یەکی زۆر هەموو جێیەکی داگرت. سێبەری سپیدارەکەو سوارەکە درێژ بووەوەو گەیشتە بەردەلانەکەی ئەوبەر. دەنگێك لەنێو ئاوەدانی نەدەهات. چەند کچۆڵەو چەند ژن لەکەلێنی دەرگاوە سەرێکیان پێداگرت و چوونەوە ژوورێ. لەچیاکەی ڕووبەڕوویان دەنگی مەلێك هات و پاشان بێدەنگ بوو. سەگێکی گەورەی نازنجیرەنگی قەڵەدەلەملی سەرمێگەل لەحالێك دا مڵومۆی لەزەوی دەکرد هێدی هێدی بەرەو خوارەوەی ئاوایی رۆیشت و لەنێو خانووەکان دا ون بوو. هەورێکی سپی لەسەر دوندی چیا هەستا, هات چەند لەحزەیەك لەسەر سپیدارەکە راوەستاو دوایە بەرەو چیایەکی بەرزی لای رۆژهەڵات وەڕێ کەوت و لەحالێك دا شیخاڵ شیخاڵ دەبوو و لەبەریەك هەڵدەوەشا, بەرەژوور چوو. کەڵەبابێك کە پەڕە سەوزو سوورەکانی لەبەر تیشکی هەتاو دەدرەوشان لەنێو کۆگلێك هاتە دەرو چوو لەپەنا چلە هێرۆیەك دەستی بە پێپڕکە کرد... ژەنگەسوورەیەکی تووڕە کە وەختێك هەتاو لێی دەدا بەهەزار پریشکەوە دەدرەوشایەوە, بە وزەوزو گرمەگرم بەدەوری کەڵەشێرەکەو چلە هێرۆیەکەدا کە گوڵی

گەورە گەورەی دەرکردبوون, دەسووڕایەوە. هەتاو لەبنی ئاوەکەی دابوو و وردە بەردە سپیەکانی لەوێوە تا دەشتاییەکەی خوارێ وەك جادەیەکی سپی بەقۆرت و پێچ راخرابوون.

حەمەد هەروا بەسەر ئەسپەکەوە چاوەڕێ بوو. پوولەکەی تیشك دەکەوتنە سەر گۆنای داگیرساوی‌و گنجی قوولی نێوچاوانی‌یان بەباشی دەردەخست. سەری رووت بوو و فیشەکدانە گولدۆزی‌کراوەکەی و لوولەی تفەنگەکەی دەدرەوشانەوەو مۆنجیان دەدان.

لای نیوەڕۆیە بوو, چووکترین جموجۆڵ لەنێو دێدا نەدەبینرا. حەمەد نەیدەزانی تەگبیری چیە. لەوێ لەپەنا سپیدارەکە راوەستابوو و چاوەڕوانیی دەکرد. کەڵەبابەکەش لەنێو زبڵ‌و زاڵدا لێکدا لێکدا پێ‌پڕکەی لەزەوی دەکرد. ژەنگەسوورەکەش خێرا خێراتر دەی‌وزاندو بەدرەوشانەوەو پریشك هاویشتن چەرخی دەدان. لەو نێوەدا کچێکی کراس سوور کە چل کەزیەی زەنگیانەبەندی بەردابوونەوە لەماڵەکەی ئەوبەر هاتەدەرێ. بەسرکی وردە وردە هات و بەرامبەر بەئەسپەکە راوەستا. بەسەرسوڕمانەوە چاوی لەحەمەدەوە بڕین و هەر لەوێ راوەستا. بەدوای وی‌دا کچۆڵەیەکی دیکە هات. لەگەڵ کچەکەی پێشێ بەموو فەرقیان نەبوو. پاشان کچەکانی دیکەش یەك یەك و دوودوو هاتن و لەپەنا ئەو دوانە بەڕیز بوون. حەمەد بەڕوویانەوە پێ‌کەنی.

ئەسپەکە سەری هەڵبڕی و گوێی دەچەرمەوە بردن. یاڵ و کلکی سەرپاك سپی بوون, لەشی سوور بوو و مووەکانی پێکەوە نووسابوون. بەرەبەرە ڕەنگی کرایەوە. لەپاش کچۆڵەکان گەورەکچان و بەدوای وانیش دا ژنانی سپی‌پۆش بێدەنگ وەك ئاوی مەند هاتن و مەیدانەکەیان پڕ کرد. حەمەد لەنێو حەشیمەتەکەدا چاوی بۆ ئەمیش خان دەگێڕا کە ژنێکی بەخۆوەو زەلامە بوو. ئەمیش خانی لەوبەری ئاوەکە, لەئاخری سێبەری سپیدارەکە لەپەنا بەردێکی سپی بەپێوە دی. ئەسپەکەی بۆلای وی لێ‌خوڕی. حەشیمەت بەئارامی دڕی داو رێگای بۆ کردەوە. کەڵەشێرەکە لەپەنای کۆگڵەکە هەروا پێ‌پڕکەی دەکردو ژەنگەسوورەکەش هەروا خێرا چەرخی دەدان و دنیای پڕ کردبوو لە وزەوز, بەژوور سەری ژنەکان دا دەفڕی هەتا خوار ئاوەدانی دەڕۆیشت و خەرمانەی گەورە گەورەی لەهەوادا دەکێشانەوە.

حەمەد بەئەسپەکەی چەند هەنگاوێك بەرەو ئەمیش خان رۆیشت, کەمێك بەشەرمەوە گوتی:

"ئەمیش خان, ئەم دێیە لەئێستاوە تا رۆژی قیامەت دەمێنێ. گەردنم ئازاکەن" سەری ئەسپەکەی بۆلای یەڵدوزلی‌داغ وەرسووڕاند, ئەسپی لینگ داو وەك بایەکی سوور لەنێو دێدا هەڵی‌کردو رۆیشت. ئەو حەشیمەتەی لەمەیدانەکەدا بوون, دیسان چەند دەقیقەیەك لەجێی خۆیان نەجووڵان و هەتا کاتێك ئەو لەچاوان ون بوو, هەروا لەپشتەوەڕا تەماشایان کرد.

لای ئێوارێ بوو کە یەکەم تەتەری خۆش خەبەر لەگەڵ ئەبداڵ بەیرەمی دەهۆڵکوت و جومەکی زوڕناژەن هاتنە ئاوەدانی. جووتیارەکانی دیکەی تووڕووسیش کە خەبەرەکەیان زانیبوو لە چیاو پێدەشتەکانەوە ڕوویان کردە گەڵی شکۆفە. گەڵی شکۆفە ئەو هەموو حەشیمەتەی هەڵنەدەگرت. بەردەلانەکان و دەشتی خوارەوەش پڕ بوون لە حەشیمەت و شەوێ تا بەیانی دەهۆڵ لێدراو هالای گێرا. جێژنێکی سەیر بەرپا کرا, ئەوەتا تووڕووس هەبوو جێژنی وای بەخۆوە نەدیبوو.

ڕۆژ بووەوە, هەتاو کەوت, چاوەشە زەردیان لەجێیەکەی هێنایەدەرێ, چوونە بن پیلی و هێنایانە نێو حەشیمەت. چاوەشە زەرد گوتی:

"کوڕینە جاران وەختێك حەمەدۆك سواری ئەسپەکەی دەبوو و لەبەرچاو ون دەبوو, خەڵکی دێیەکانی دیکە هێندێ کاریان دەکردن..."

لاوەکان بەبیستنی ئەم قسەیە بەرەو بناری ڕووتەن و هەزار بەهەزاری ئەوبەر وەڕێکەوتن و تاوێك دواتر تەپۆلکەیەکیان لەبڕکەگوێنی کە گوڵی سووراوی و زەردو سووریان پێوە وشك ببوون, دروست کرد. چاوەشە زەرد چەخماخەکەی دەرهێناو پووشووەکەی داگیرساند. جووتیاران بنارەکەیان پڕ کردبوو. لەبەر زۆریی حەشیمەت دەرزیت هەڵاویشتبایە نەدەکەوتە زەوی. ئەبداڵ ئۆغلی بەیرەم لەحاڵێك دا دەهۆڵی دەکوتاو هەڵدەرپەڕی, دەچووە نێو گڕی ئاگرەکەو دەهاتەوە دەرو سەمایەکی کۆن و لەمێژینەی دەکرد. ژنان لەکاتێك دا دەستی یەکتریان گرتبوو ئەلقەیەکی گەورەیان دروست کرد کە تا ئەودەم کەس نەیدیبوو و خۆیان بۆ سەمای هالای ئامادە کرد. بڵێسەئاگر لە تەپۆلکە دوورەکەوە بەرەو بنار ملی پێوەناو بە چاوڵێك نانێك سەرانسەری چیایەکەی داگرت و چیا لەنێو بڵێسەی ئاگردا کەوتە شەپۆل دان.

ئیدی حەمەدۆك بێسەروشوێن چوو و ناوونیشانی ون بوو.

لەو ڕۆژەوە تا ئێستا هەموو ساڵێ جووتیارانی گەڵی شکۆفەو جووتیارەکانی دیکە لەو ڕۆژەدا کە حەمەدۆکی پێ ون بوو, کۆ دەبنەوەو لەجێژنێکی گەورەدا دڕووەلانەکە دەسووتێنن. بڵێسەکان سێ شەوو ڕۆژان وەك لافاوێك بەدەشت و بنارەکان دا دەگەڕێن و دەخولێنەوەو سەرانسەری کێوەکە لەخوارێڕا تا سەرێ دەچێتە نێو گڕی ئاگرو دەشت لەنێو تۆفانێکی ئاگردا وەجووڵە دەکەوێ. دەنگی هاواری ئەو دڕووانە کە دەسووتێن دێتە بەرگوێ. هاوکات لەگەڵ ئەم سووتانە, لەپێش دا لە لووتکەی کێوی یەڵدووزلی و پاشان لە چەخماخلی و پاش ویش لەدوندی چیای بوورانلی تۆپەڵەنوورێك دەتەقێتەوەو دوندی چیاکان سێ شەوان وەك ڕۆژی ڕووناکی لێدێ.

